براوەی خەڵاتی سامۆئێل جانسۆن

# پاریس
# ئەو شەش مانگەی جیهانی گۆڕی
# ١٩١٩

مارگارێت مەکمیلان

ساغکردنەوەی مەدماکس

پێشەکی

ڕیچارد هۆلبرووکی

وەرگێڕانی

مەنسوور سەلیمی

**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **(پاریس) ئەو شەش مانگەی جیهانی گۆڕی ١٩١٩**
- نووسین : مارگرێت مەکمیلان
- وەرگێڕانی: مەنسوور سەلیمی
- نەخشەسازی ناوەوە: تەها حسێن
- بەرگ: هۆگر سدیق
- نرخ: ١٥٠٠٠ دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠١٢
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)
- ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (٦٥) ساڵی (٢٠١٢)ی پێی دراوە.

**زنجیرەی کتێب (٦٩٥)**

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەڕۆك

لە کاری دیپلۆماسیدا، هەروەک لە خودی ژیان هەستی پێدەکرێت، مرۆڤ زۆرجار لە شکستەکان وانە وەردەگرێت تا لە سەرکەوتنەکان، کە پێدەچێ لەوەوپێش چارەنووسیان دیاری کرابێت و زنجیرەیەک لەو خەبات و بڕیارە مەزنانەی کە بوونەتە هۆی سەرکەوتنەکان لەوانەیە لەبەرچاو نەگیرێن و بخرێنە پشتگوێ، بەڵام، شکستەکان، خاڵە لاوازەکان و کۆسپەکان دەخەنە ڕوو تا چیتر دووپات نەبنەوە- بە واتای بۆرۆکراتە مۆدێرنەکانی ئەمرۆکە دەکرێ ئاوڕێک لە ساڵی ١٩١٩ی پاریس بدەینەوە و وانە یە کی تیا وەرگرین، بزانین ئەو ساڵە چی ڕوویدا. شیکاری و ڕوونکردنەوەی سەرنجڕاکێشی مارگارێت مەکمیلان لەسەر ئەم ڕووداوە سەرەکیە، بەدڵنیایەوە، هەندێ چیرۆک و بەسەرهاتی خۆش و سەرکەوتوو لە خۆ دەگرێ، بەڵام لە بەرامبەر بڕیاری مێژوو و ئاکامەکاندا دەسەنگێنرێن، ئەوە لێکۆڵینەوەیەکە لەسەر ئەم بڕیارە چەوتانەی کە ئاکامی دڵتەزێنیان لێکەوتەوە و زۆربەی ئەم ئاکامانە تەنانەت تا ئەمڕۆکەش سەروو دڵی ئێمەیان گرتووە.

لە سەردێری ڕووداوەکانی مێژوودا جادەی هۆڵ ئاف مێرس تا هێرشی ئەڵمان بۆ سەر وڵاتی پۆڵەندا تەنیا بیست ساڵ دواتر وەک هێڵێکی ڕاست ناوی لێدەبرێت. بەڵام هەروەک مەکمیلان بە جوانی دەیسەلمێنێت، ئەم بۆچوونە لە مێژوو کە پەسەندکراوی هەموانە، سروشتی ئەو بڕیارانەی کە لە پاریس ڕاگەیەنران هەڵدەوەشێنێتەوە و لە گرنگایەتی ئەو هەنگاوانەی کە لە ساڵانی دواتردا هەڵێنران کەم دەکاتەوە.

شێوازی کۆتایی هاتنی شەڕ- لە گەڵ "ئاگربەس" و هیچ جۆرە شەڕێک لەسەر خاکی ئەڵمان- ڕۆڵێکی گرنگی لە ڕووداوەکانی دواتردا گێڕا. مەکمیلان دەنووسێ کە: "ئەگەر ئەڵمان بە تەواوەتی تێکبشکێنرایە و شکستی بخواردایە، لەوانەیە دۆخەکە بە بارێکیتر دا بگەڕایە". زۆربەی ئەڵمانیەکان لە دەرەوەی فەرماندەیی عالی لەوە تێنەدەگەیشتن کە ئەڵمان لە باری نیزامیەوە کۆتایی هاتبوو و ڕۆژی ١١ی نوافامبری ١٩١٨یان وەک ڕۆژی شکست و خۆبەدەستەوەدان سەیر نەدەکرد. هیتلێر ئەمەی بۆ خۆی قۆرخ کرد و لە بەرژەوەندی خۆی بە کاری هێنا؛ بەڵێنێک کە ئەو بۆ هەڵوەشانەوەی ڕێکەوتنامەی ویرسای دایە دەرێ لە ماوەی گرتنەدەستی دەسەڵاتیدا تەوەرێکی بەهێز

وبە قوەت بوو. بەڵام مەکمیلان ڕای گشتی بەم شێوەیە ڕاست دەکاتەوە کە پارەیەکە لە لایەن وڵاتانی براوە بۆ نۆژەنکردنەوە داسەپا، ئەوەندە زۆر بوو کە ئاڵۆزی ئابووری ئەڵمانی لێکەوتەوە و ئەمەش بە نۆبەی خۆی ڕێگای بۆ سەرهەڵدانی هیتلێر خۆش کرد.

هەر جۆرێک بێت، هەڵکەوتنی ئەو کاراکتەرانەی کە لە ساڵی ١٩١٩ لە پاریس کۆبوونەوە جێی سەرنج بوو، لە لۆرێنسی عەرەبییەوە بگرە تا دەگاتە کرێکارێکی چێشتخانەیەکی بچووکی ڤیەتنامی کە دواتر بە هۆ چی مینخ ناوی دەرکرد. بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا، ئەمریکییەک لە ناوەندی شانۆگەری گەورەی جیهانیدا، بە ناوی وودرەو ویلسۆن بە دەیان ملوێن کەس کە هەرگیز ئەویان نەدی ئیلهامی بەخشی، و بە ئەوانەشی کە لە گەڵی بوون ئێش و ئازار و مەینەتی. ئەو ئایدیالی و گۆشەگیر بوو ساویلکە و دڵڕەق، خانەدان و نەحەواوە بوو. خاڵەبەقوەتەکان و خاڵەلاوازەکانی ئەو، لەشساخی ئەو، و تەنانەت کاریگەری هاوسەری لووتبەرز و هیچ نەزانی ئەو، لە هێنانەدی ئەو ڕووداوانەی کە مێژوویان درووست کرد ڕۆڵێکی هەرە گرنگیان گێڕا.

لەماوەی ئەو هەشتا ساڵەی کە ئەو کابینەی بەجێ هێشتوە، ناوبانگی ویلسۆن بەردەوام هەوراز و نشێوی بەخۆوە بینیوە. بەڵام بۆ خوێندنەوە و تێگەیشتن لە سیاسەتی جیهانی ئەمڕۆکەی ئەمریکا بایەخێکی یەکجار زۆری هەیە. زۆریەک لە لایەنگرانی ئەو، لە هێربێرت هوڤێرەوە بگرە تا دەگاتە ڕۆبیرت مەکنامارا، باسی ئەوەیان کردووە کە دوژمنانی ئەو هەم لە پاریس و هەم لە ئەنجومەنی پیرانی وڵاتەیەکگرتوەکان بەرپرسی ڕەواندنەوەی یەکێ لە خەونە خۆشەکانی مێژوو بوون. کەسانیتر، وەکوو سێناتۆر جێسی هێلمز دوژمنی سەرسەختی وێلسۆن، سێناتۆر هێنری کابۆت لۆج،یان وەک پارێزەری بەپرەنسیپی سەروەری ئەمەریکی سەیر کردووە و وێلسۆنیان بە هەوڵدان بۆ پێشێلکردنی دەستووری ئەمەریکی تۆمەتبار کردووە. قوتابخانەیەکی تری بیر و هزر، کە بەتایبەت لە ساڵەکانی پاش شەڕی سارد ناوبانگی دەرکرد وێلسۆنی بە دوور لە ڕاستی بوون و سوور لەسەر پیشاندانی چاکەوخراپە تاوانبار کرد. لەو کەسانەی کە کارپێکەری ناسراوی ئەم قوتابخانەیە بوون دەتوانین ئاماژە بە جۆرج ئیف کێنان و هێنری کیسێنگەر بکەین کە وێلسۆنیان بە " زۆر خۆبەزلزان" تاوانبار دەکرد، هەرچەند دانیان بەو ڕاستیەدا دەنا کە ئەو "بناغەی قوتابخانەی بەرجەستەی ڕۆشنبیری سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکای دانا". (بۆ ڕێزنان لە کیسێنگێر، سەرۆک کۆمار، ریچارد نیکسۆن، پەیکەری وێلسۆنی لە شوێنی ڕێزلێنان لە ژووری کابینەدا دانا.) لە ناو تەمومژی ئەم مشتومڕە هەرگیز-بێ کۆتایە یەک شت ڕوون و ئاشکرایە: کاتێ کە وێلسۆن لە دێسامبە ری ساڵی ١٩١٨ گەیشتە فەرانسە، ئەو بە وروژاندنی چارە خاڵەکەی خۆی، بەتایبەت چەمکی نوێی "خودموختاری"

هیوایەکی زۆری بە جیهانیان بەخشی. کەچی ویلسۆن، چونکە زانیاری ئەوتۆ و وردەکاری تەواوی لە وتوویژەکاندا نەبوو، بۆ خۆشی نەیدەزانی چی دەڵێ و مانای ڕاستەقینەی ئەو دەستەواژەیە کە وروژاندبووی چییە. دواتر بۆ خۆی دانی بەوەدا هێنا کە "کاتێکە ئەو وتانەم بە زاری دا هات هیچ زانیاریەکم لەسەر هەبوونی ڕەگەزەکان نەبوو، کە ڕۆژ بەدوای ڕۆژ زیاتر ڕووبەڕویان دەبینەوە".

تەنانەت لەو سەردەمەشدا هەست بەوە دەکرا کە چەمکی خود-موختاری، هەروەک مەکمیلان ئاماژەی پیدەکا، چەمکێکی "تووش و دژوار" بێت.

وەزیری دەرەوە رۆبێرت لانسینگ ئەم پرسیارەی ئاراستە کرد کە " کاتێکە سەرۆک کۆمار باس لە خود-موختاری دەکات مەبەستی ئەم کام یەکەیە؟ ئایا مەبەستی ئەم ڕەگەزێکە، ناوچەیەکە، یان کۆمەڵێکە؟ هیوایەکی زۆر دەبەخشێ بەڵام ڕوون نییە کە چییە و چۆنە. لەوە دەترسم کە نرخەکەی بەرابەر بێت لەگەڵ گیانی هەزاران کەس. ئاشکرایە کە لەکۆتاییدا تووشی ڕیسوایی و شەرمەزاری دێت، وەک خەونی ئایدیالیستێک ناوی لیدەبرێت کە نەیتوانیوە تا درەنگ وەخت هەست بە مەترسی بکات". لانسینگ یەکێ لە یەکەمین کەسانێک بوو کە هەستی بە گێژاوێک کرد کە لە ناو جەرگەی زۆربەی مشتومرە تاڵەکانی ئەمرۆکەدا پەنگی خواردۆتەوە. بەسەر ئەمەشدا ئەوە خەونەکانی ویلسۆن نەبوو بەڵکوو بڕیارەکەی ئەو بوو کە دانووستانی لەگەڵیان کرد (بۆ وێنە ڕێگەدان بە ژاپۆن تا دەست بە سەر دوورگەی شانگتۆنگ لە چیندا بگرێت) کە نرخەکەی بۆ جیهان زۆر گران تەواو دەبوو. کاتێک ویلسۆن گەڕایەوە بۆ وڵات، بە تەوسەوە هەڵەیەکی بەرانبەری لەخۆی نیشاندا: بە گوێ نەدان بە دانوستان و سازشکردن لەگەڵ میانڕەوەکانی ئەنجومەنی پیران، ئەو دەرفەتی بردنە قۆناخی پەسەندکردنی ڕێکەوتنامەکەی (و بەئەندامبوونی ئەمەریکا لە کۆمەڵی نەتەوەکان) لە کیسدا. ڕیشەی هەندێ لە کێشە هەرە ئاڵۆزەکانی جیهانی مۆدێرن لەو بڕیارانەدایە کە درووست دوابەدوای کۆتایی شەڕی گەورە دەرکران. بۆ وێنە دەکرێ ئاماژە بکەین بە چوار شەڕی بۆلکان لەنێوان ساڵەکانی ۱۹۹۱ و ۱۹۹۹؛ و شەڕ و ئاڵۆزی لە سەر ئێراق (کە سنوورەکانی ئێستای ئەو وڵاتە بەرهەمی ڕکەبەرایەتیەکانی فەرەنساو بەریتانیاو نەخشەدانانی کاتییە)؛ هەوڵ و خەباتی بەردەوامی کوردەکان بۆ بەدەستهێنانی خودموختاری؛ ئاڵۆزیەکانی نێوان یۆنان و تورکیە؛ و شەڕی بێ پسانەوەی عەرەبەکان و جوولەکەکان لەسەر خاکێک کە هەر یەکەو بە هینی خۆیان دەزانی.

کاتێک لایەنگرانی ئاشتی لە پاریس کۆبوونەوە، گەلانی تازە سەریان هەڵدەدا و ئیمپراتۆرە گەورەکانیش خەریک بوون لەبەین دەچوون. چوار یاری گەورە بە حەز و خولیایەکی زۆرەوە کەوتنەخۆ و بڕیاریاندا جگە لە چاکسازی و ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی جیهان، لە ئەورووپاوە بگرە تا دەگاتە ئەوپەڕی

نوڤیانووسی ئارام هیچ کاریکی تر نەکەن. بەڵام بە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ گوشارەکانی ناوخۆ، ئەو ڕووداوانەی کە نەیاندەتوانی زەوتیان بکەن و ئەو داخوازیە گێچەڵاویانەی کە نەیاندەتوانی ڕووبەڕوویان ببنەوە، لەکۆتاییدا وتوویژکەران بە ئاسانی تووشی قەڵسبوون و وەڕسبوون هاتن- و خۆیان دا بە دەست دانووستان و سازشگەلێک کە هەتاهەتایە لەمێژوودا زایەڵەی دەنگیان دەنگ دەداتەوە. تەنانەت دواتریش، هەستیان بەوە دەکرد کە خەریکن تۆی کێشەکانی داهاتوو دەچێنن.

جۆرج کلێمەنجوو کە بۆ خۆی لەو شکست و نەهامەتیە دەستی هەبوو پێشبینی کرد کە "ناتوانم بڵێم بۆ ماوەی چەندین ساڵ، باشتر وایە بڵێم بۆ ماوەی چەندین سەدە قەیرانێک کە دەستی پێکردووە درێژەی دەبێت. بەڵێ ئەم ڕێکەوتنامەیە نەهامەتی، گێرە و کێشە، ئاڵۆزی و کارەساتی بەدواوە دەبێ و تا ساڵە های ساڵیش درێژەی دەبێت". مەکمیلان هەندێک لەو شانۆ گەورانە دەژیەنێتەوە: مانگرتنی ئیتالیایەکان بەدوای شکستهێنانی هەوڵەکانیان بۆ دەست بە سەرداگرتنی قەراخ ئاوەکانی یۆگۆسلاڤیا. دەست بەسەرداگرتنی دوورگەی شانتۆنگ لەلایەن ژاپۆنیەکانەوە، کە بزووتنەوەی چواری مەی لە چین ڕێکخست و دەسپیکێک بوو بۆ شەڕ و شۆڕش لە ئاسیادا؛ هەڵوەشانەوەی مەجارستان، کە بە ملوێن مەجاری بۆ هەتاهەتایە ئاوارەی دەرەوەی سنوورەکانی وڵات کرد؛ نەتوانینی چوارپاری گەورە بۆ دانووستان لە گەڵ حکوومەتی نوێی سۆڤیەت، مەگەر بە ناردنی هێزێکی سست بۆ شەڕی ناوخۆی ڕووسیە؛ هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆری عوسمانی و سەرهەڵدانی یەکێ لە ڕێبەرانی هەرە دیار و بەرچاوی سەدەی بیستەم، کەماڵ ئاتاتورک، و دوایەمین نەک کەمبایەخترین، درووستبوونی یۆگۆسلاڤیا (کە لەسەرەتادا ناوچەی ژێر دەسەڵاتی سێربەکان، کرواتەکان، و سلۆڤینەکان بوو) لە خەڵکانی جیاوازی باڵکانەکانی باشوور. ئەم دەوڵەتە بۆ ماوەی چەندین دەیە لەچوارچێوەی دیکتاتۆریەتی کمونیستی مارشاڵ تیتۆ دەوام دینێ و خۆڕاگری دەکات، بەڵام کاتێک چوارپارچەی پێکەوە گرێدراو و پینەکراوی ساڵی ١٩١٩ لە سەرتای دەیاکانی ١٩٩٠هەڵدەوەشێتەوە، چوار شەڕی لێ دەکەوێتەوە، یەکەم: سلۆڤینیا، دواتر کرۆڤاسیا، دواتر بۆسنیا-هێرزەگۆڤینا، و لەکۆتاییدا کۆسۆڤۆ. (و پێنجەمینیان لە مەقدوونیە کە داکووژایەوە)،چونکە لێژنەی وتوویژکەری ئەمەریکی ئێمە لە پاییزی ١٩٩٥ لە هەوڵدان بۆ کۆتاییهێنان بە شەڕی ناو بۆسنیا لە دەورووبەری بۆڵکان دەهاتن و دەچوون، ڕێکەوتنامەی ڤێرسایل زۆر لە بەرچاوم بزر نەدەبوو و لە نزیکەوە لەگەڵی ئاشنابووم. بە خوێندنەوەی چەند بابەتێکی وەرگیراو لە کتێبی *ئاشتیگەری ١٩١٩ی* هارۆلد نیکۆلسۆن، بە شۆخیەوە دەمانکوت کە مەبەستی ئێمە لەم کارە هەڵوەشانەوەی میراتی ودرۆ ویلسۆنە. کاتێک ئێمە بەزۆر ڕیبەرانی بۆسنیا، کرۆواتیا، کۆماری فیدڕڵی یۆگۆسلاڤیا لە دایتۆن،

ئۆهایۆ، لە ١٩٩٥ لەدەوری یەک کۆ کردەوە و بۆ کۆتاییهێنان بە شەڕ وتوویژمان پێکردن، لەڕاستیدا، بەشێکی ترمان لە وێرسای کفنودفن کرد. لەبەهاری ٢٠٠٢دا دوو پارچەی ئاخری دامەزراندنی ڤێرسایلز کە هێشتا هەر بە"یۆگۆسلاڤیا"ناوی دەبرا، هەنگاوێکیتریان هەڵهێنا و لەسەر گۆڕینی ناوی پارچەکان بە "سێربیا و مۆنتێنیگرۆ" ڕێکەوتن، کە بە لەونێ ڕێگەی خۆش دەکرد بۆ جیابوونەوەی تەواو و سەربەخۆیی. لە دایتۆن ئێمە تەنیا لە سەر بەشێکی بچووک لە پرسەکە ئیشمان دەکرد؛ لە پاریس، ئەوان لە سەر تەواوی جیهان کاریان دەکرد. پەیکەری بەرجەستەی پیاوانی پاریس بە دەست مارگارێت مەکمیلان، ئەو کارانەی کە هەوڵیان دا بیکەن، ئەو شوێنەی کە لەویدا سەرکەوتن، و بۆچی شکستیان خوارد، لە باری مێژوویەوە شتێکی هەڵکەوتە و دەگمەنە. ئەم بەسەرهاتە، وەک چۆن تەنیا لە دەست مێژووی گەورە بەردێ، دەتوانێ نەک تەنیا ڕابردوو بەڵکوو ئێستاش بۆ ئێمە ڕوون کاتەوە و بۆمانی شرۆڤە بکات. دەتوانێ لە داهاتووشدا ڕێنوێنیمان بکات. من تەنیا بۆ ئەوە بەداخەوەم کە بۆچی دەیەیەک لەمەوپێش لە بەردەست دا نەبوو. بەڵام ئێستا لەبەر دەست دایە: گەشتێکی سەرنجڕاکێش بە ناو مێژوودا.

## سوپاس و پێزانین

بەسەر بەرگی ئەم کتێبەدا ناوی من هەیە، بەڵام ئەم بەرهەمە نەدەهاتە دی ئەگەر کەسانێکی گەورە نەبوونایە کە منیان هان دا تا لە ئاست کارێکی ئاوا گەورە بەربێم، کاتێک دڵسارد دەبووم دەستی منیان دەگرت و هانیان دەدامەوە، کاتێک من دەمویست باسی کۆمەڵەی گەلان بکەم لەگەڵ من هەڵیان دەکرد و ماندوویەتیان لە لەش دەردەکردم. پێویستە بۆ ڕێز و سوپاسی تایبەت هەندێک لەو کەسانە ناوبژێر کەم: ساندرا هارگرێڤێس، ئاڤی شلایم، پیتێر سنەو و لۆرد ویدێن فیڵد لە گۆڕینی بیرۆکەیەک بۆ پرۆژەیەکی گەورە یارمەتیان دام. گرانت مەکین تایر و ماتیۆ تایلۆر لە لەندەن پێداچوونەوەیەکی ورد و کەم وێنەیان بوو بە سەر کتێبەکە، و تەنیا بە هەوڵ و تێکۆشانی جۆی دێ مێنیل و لێژنەکەی ئەو لە نیۆیۆرک دەکرا بەراورد بکرێت. خۆم زۆر بە قەرزداری هاوکار و هاوڕێم باب بۆتوێل دەزانم، کە ساڵیانی ساڵ لە شرۆڤەکردنی بیروباوەڕەکانی من نەک تەنیا لە پێوەندی لەگەڵ کۆبوونەوەی ئاشتی بەڵکو لە پێوەندی لەگەڵ نووسینی مێژوودا یارمەتی دام. ئۆردی مۆرتۆن، تووماس بارکسەی، دەیوید مەکمیلان، ئالێکس مەکمیلان، مێگان مەکمیلان، ئان مەکمیلان، پیتێر سنەو و باربارا ئیستمەن بەشێکی زۆر لە کتێبەکەیان خوێندەوە و ڕاوێژی پێویستم لە گەڵیان کرد. دایک و بابم ئیلۆنێد و ڕۆبێرت مەکمیلان، بۆ چەندین جار وشە بە وشەی کتێبەکەیان

دەخوێندەوە، بێ ئەوەی گلە یان گازندەیەکیان هەبێت. دوو لیکۆڵێنەری هەڵکەوتەم لەگەڵ بوو: ڕێبێکا سنەو کە دەگەڕا بە دوای وینە و بەڵگەدا، و جان ئۆندرۆڤێسیک، کە بە دەقەکەدا دەچۆوە و بیبلۆگرافی کۆدەکردەوە. باب مانسۆن، ئال وارگۆ و ئێرۆل ئاسپۆڤیگ لە قۆناخی جیاجیادا پاڵپشتیان لە لێکۆڵینەوەکەی من دەکرد.

بەبۆنەی مەینەتیەک کە لە گەڕان بەدوای بابەتی وەرگیراو لە بلاوکراوەکانی خۆیان کە مافی کۆپی ڕایتیان هەبوو، کێشایان، ڕێز و سوپاس و ماندوونەبوونی دەکەم لەم کەسانە: ئارشیڤەکانی نەتەوەیی سکاتلەند بۆ وتارەکانی لۆتیان(GD ٤٠/١٧)؛ نیگێل نیکێلسۆن بۆ هارۆلد نیکێلسۆن، *ئاشتی گەری، ١٩١٩* (لەندەن: میتیوئێن، ١٩٦٤) کارمەندی فایلەکان، دایرەی فایلی ئەنجومەنی دەسەلات دارەکان، کە بەناوی شەریکەی دامەزراوەی بێڤێرسبرووک بۆ وتارەکانی لییۆد جۆرج ماندوویەتیان بینی؛ چاپەمەنی زانکۆی پرینجێتۆن بۆ ئارتۆر ئێس. لینک، ئی دی.، ڕاویژەکانی شۆڕای چوار یار، دوو بەرگ (پرینسێتۆن، ئێن.جی:چاپەمەنی زانکۆی پرینسێتۆن،١٩٩٢)؛ و ئەمیندارەکانی کتێبخانەی بەریتانی بۆ وتارەکانی بالفۆر. هەموو هەوڵێک خراوەتە گەڕ بۆ ئەوەی مافی بلاوکردنەوە بپارێزرێت، بەلام بە ئەگەری هەر سڕینەوە و لابردنێک نووسەر زۆر خۆشحاڵ دەبێ کە بێ خەبەر نەکرێ. هەروەها سوپاس و پێزنین بۆ خاوەنکاری پێشووی خۆم، زانکۆی ریەرسۆن، بۆ ئەوەی کە کاتی خۆی پێدام و بۆ کۆلیجی ئێس.تی. ئانتۆنی، ئاکسفۆرد، بۆ خولێکی سەرنجراکێش وەک ئەندامی لێژنەی پسپۆڕان. سنەوەکان و مەکمیلانەکان لە لەندەن و دانیەل شلایمز لە ئاکسفۆرد زۆر هاندەرم بوون و زۆر میوانداریان لێ کردم. ئەگەر کتێبەکە ڕەنگدانەوەیەکی لە هەمووی ئەمانەی تێدا بەدی ناکرێ، ئەوا کێشەکە لە لایەن منەوەیە.

## سەررنجێک لەسەر ناوی شوێنەکان

زۆریەک لەو شوێنانەی کە لەم کتێبەدا ئاماژەیان پێکراوە چەندین ناویان هەیە. بۆ وێنە: لڤیف (لە ئۆکراینی ئەمرۆدا) بەشێوەی جۆراوجۆر لیۆپۆل، لێمبێرگ، لوەو، لڤۆڤی پێ ئەوترێت. من هەوڵم داوە زۆرتر ئەو ناوانە بە کار بێنم کە باون و لە سەر زارن، بەلام لە شوێنێک کە ناوێکی ئاشنا بە زمانی ئینگلیزی بووبێت، بۆ وێنە، موونیخ، ئەوەم بەکار هێناوە. سەبارەت بە کێشەکانی تایبەت بە کۆڕی ئاشتی ئەمن بەکارهێنانی ١٩١٩م ڕەچاو کردوە: دانزیگ (گدانسک) فیۆم (ڕێژێکا) مێمێل (کلایپێدا)، شانتوونگ (شاندانگ)، تێسچێن (سیزین یان تیسین)، تسینگتائۆ (کینگدائۆ).

# پێشەکی

بۆ ماوەی شەش مانگ لە ساڵی ١٩١٩ پاریس پایتەختی جیهان بوو. کۆڕی ئاشتی وێردی سەر زمانی جیهانیان بوو. ئاشتیخوازان بەهێزترین خەڵکانی ئەم کۆبوونەوەیە بوون. ئەوان ڕۆژ لە گەڵ ڕۆژ کۆبوونەوە و دانیشتنیان دەبوو. ئەوان وت و وێژیان دەکرد، قرەیان لێ ساز دەبوو، مشت و مڕیان دەکرد و سەرلەنوێ دەستیان پێ دەکردەوە. ئەوان وڵاتانی نوێ و ڕێکخراوەی نوێیان دادەمەزراند. ئێوارەخوانیان پێکەوە دەبوو و پێکەوە دەچوون بۆ شانۆ، و لە نێوان مانگەکانی ژانویە و ژووەن دا، پاریس لە ناکاو بوو بە حکوومەتیکی جیهانی. مەکۆی ترس و هیواکانی ئەو شارە دادگای پێداچوونەوە و پەرلەمانەکەی بوو. بە شێوەی فەرمی، کۆبوونەوەی ئاشتی تا ١٩٢٠ی خایاند، بەڵام شەش مانگی یەکەمی ئەو ساڵە زۆر بڕیاردەر و یەکلاکەرەوەیە، لەوکاتەدا بڕیارە هەستیار و یەکلاکەرەوەکان ڕاگەیەنران و زنجیرەیەک ڕووداوی دڵتەزێن هاتنە ئاراوە. جیهان هەرگیز شتی وەکوو ئەوەی بەخۆوە نەدیوە و قەت تازە شتی وەهاش نابینێتەوە.

ئاشتیکەران و ناوبژیکەران لەوێ بوون چون ئورووپای لەخۆبایی دەوڵەمەندی هاری کردبوو و خۆی لەت و کوت کردبوو و چەندین پارچەی لێببۆوە. شەڕیک کە لە ساڵی ١٩١٤ دەستی پێکردبوو بەهۆی قرەیەکی چکۆلە لە سەر گەیشتن بە دەسەڵات و تەشنەکردن لە ناوچەکانی بۆڵکان هەمووی زلهێزەکانی بەلای خۆیدا ڕاکێشابوو، لە ڕووسیەی تزاریست لە ڕۆژهەڵاتەوە بگرە تا دەگاتە بەریتانیا لە ڕۆژئاوا، و زۆربەی دەوڵەتە بچووکەکانی تر. تەنیا ئیسپانیا، سوێس، هۆلەند و وڵاتانی ئیسکاندیناوی بڕیاریان دابوو کە خۆیانی تێوە نەگلێنن. لە ئاسیا، ئەفریقا، و دوورگەکانی ئارام، و لە ڕۆژهەڵاتی ناوین ئاوری شەڕ هەڵگیرسابوو، بەڵام زۆرتر لە سەر خاکی ئەورووپی، بە درێژایی تۆڕێکی هەڵوەشاوە لە خەنەق کە لە بلژیکەوە لە باکوور درێژەی هەبوو بەرەو خوار تا دەگاتە ناوچەکانی ئاڵپ لە باشوور، بە درێژایی سنوورەکانی ڕووسیە لە گەل ئەڵمان و مەجارستان-ئوتریشی هاوپەیمانی، و لە خودی ناوچەکانی باڵکان، درێژەی هەبوو. لە

سەرتاسەری جیهانەوە سەرباز هاتبوون: ئۆسترالیایی، کەنەدایی، نیوزیلەندی، هێندی، دوورگەکانی نیوفاوندلەندی هاتبوون تا بۆ ئیمپراتۆری بەریتانی خەبات بکەن؛ ڤیەتنامیەکان مۆراکۆیەکان، ئەلجەزیرەیەکان، سێنەگالیەکان هاتبوون تا بۆ فەرەنسە خەبات بکەن، و لە کۆتاییدا ئەمریکایەکان، کە بە دەست هێرشەکانی ئەڵمان بۆ سەر کەشتیەکانیان بە تەنگەوە هاتبوون و ئۆقرەیان لیبڕابوو. دوور لە گۆڕەپانەکانی جەنگی ئورووپا هەروەک خۆی مابۆوە و دەستی لێنەدرابوو. شارە گەورەکان وەک خۆیان مانەوە. هێڵەکانی ڕێگای شەمەندەفەڕ کەم تا کورتێک هەروەک خۆیان دەست لێنەدراو مابوونەوە، بەندەرەکان هەروەک جاران خەریکی ئیشی خۆیان بوون. وەک شەڕی دووهەمی جیهانی نەدەچوو، کاتێکە گولە هاون و خشت دەبوون بە خۆڵ و تێکەڵ بە یەک دەکران. لێرەدا ئەوەی دەبوە قوربانی مرۆڤەکان بوون. ملوێنان شەڕکەر-چون هێشتا کۆمەڵکوژی خەڵکانی سیڤیل نەهاتبوە ئاراوە- لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا بوونە قوربانی و لەبەین چوون: ١٨٠٠،٠٠٠ ئەڵمانی، ١٧٠٠،٠٠٠ ڕووسی، ١،٣٨٤،٠٠٠ فەرەنسەوی، ١،٢٩٠،٠٠٠ لە مەجارستان-ئوتریش، ٧٤٣،٠٠٠ بەریتانی (و ١٩٢٠٠٠ لە ئیمپراتۆریەت) و بەم چەشنە لیستەکە بەرەو خوار دەڕوات تا دەگاتە مۆنتێنیگرۆی بچووک کە ٣٠٠٠ قوربانی لێکەوتەوە. منداڵان هەتیوبار کران، ژنان بێ مێرد مانەوە، و شۆڕە کچانیش بێ بەش لە دەرفەتی ژن و مێردایەتی کران. ئەورووپا ئەو کەسانەی لە کیسچوو کە دەبوایە زانیار، هەڵبەستوان، و ڕێبەریان لێدەربهاتایە، و منداڵانێک کە دەبوو لەوان بکەوتنایەتەوە. بەڵام تۆمارنامەی مەرگ خۆ ئەو کەسانە لە خۆ ناگرێ کە یەک لاق، یەک دەست، یەک چاو مانەوە، یان ئەو کەسانەی کە بە گازی ژەهراوی ڕیخۆڵەکانیان بریندار کرا یان مێشکیان تێکچوو و هەرگیز سارێژ نەکرانەوە. بۆماوەی چوار ساڵ پێشکەوتووترین وڵاتانی جیهان لە پیاو، لە سەروەت و سامان، لە بەرهەمەکانی پیشەسازی، لە زانست و تەکنۆلۆجیایان ڕژاندە دەرەوە، لەپێناوی شەڕێک دا کە بەرێکەوت دەستی پیکردبوو و بەریشی نەدەگیرا چون هەردوو لا یەک قورسایان بوو و وەک یەک وابوون. تەنیا لە هاوینی ١٩١٨ دابوو، کاتێکە هاوپەیمانەکانی ئەڵمانی پەکیان کەوتبوو و شپرزە بوون، کاتێکە هێزی تازەی ئەمەریکی ڕژابوونە ناوەوە، و لە ئاکامدا هاوپەیمانان زاڵ بوون بە سەر دۆخەکەدا و هەموو شتێکیان گرتە دەست. کاتێکە لە ١١ی نوامر شەڕ کۆتایی پێهات، لە هەموو شوێنێک خەڵک لەو پەڕی ماندوویەتی و بێ تاقەتیەدا ئاواتی ئەوەیان دەخواست کە لە داهاتوو چیتر شتی وا تاڵ و ناخۆش بەو شێوەی کە کۆتایی پێهات نەیەتەوە دی. چوار ساڵ شەڕ ئەو هەست و سۆزە بەرزەی لە باوەڕبەخۆبوون کە ئەورووپای گەیاندبووە لوتکەی بەرزی دەسەڵات بەسەر جیهاندا خپی کرد و

نەیهێشت سەردەرێنێ. بەدوای وێستێرن فرانتدا [گۆڕەپانی ڕۆژئاوا] ، ئەوروپایەکان چیتر نەیاندەتوانی باس لە ڕاسپاردەیەکی شارستانیەت بکەن بۆ خەڵکانی جیهان. شەڕ حکوومەتەکانی بە لادا خست، زلهێزانی بەخۆدا شکاندەوە، و گشت کۆمەڵگاکانی ئاواژۆ کرد. لە ڕووسیە شۆڕشەکانی ١٩١٧ تزاریسمیان ئاڵوگۆڕ کرد، کەچی کەس تا ئێستا نەیزانیوە. لەکۆتایی شەردا دەوڵەتی مەجارستان-ئوتریش لەبەرچاو بزر بوو، لە ناوەندی ئەوروپا بۆشایەکی گەورەی پا خۆی بەجێهێشت. ئیمپراتۆری عوسمانی بەو هەموو مقەڕ و بنکەی کە لە ڕۆژهەلاتی ناوین هەیبوو، بەو پاروە چەورەی ئەوروپا کە لەبەر دەمیدابوو تواوەیەوە و بوو بە هیچ. ئەڵمانی پاشایەتی ئێستا کۆمارێکی بەخۆیەوەگرتبوو. نەتەوە کۆنەکان -هۆلەند، لیتوانیا، ئێستۆنیا، لاتڤیا- لە مێژوو سەریان دەرهێنا تا سەرلەنوی ژیانێکی تر دەست پێکەنەوە، و نەتەوە نوێکان — یۆگۆسلاڤیا، سزێچسلۆڤینیا- بۆ ئەوەی لە دایک بکەونەخوارێ دەست و لاقیان لێدەدا.

کۆبوونەوەی ئاشتی پاریس لەپیناو پیکهێنانی ڕێکەوتنامەی ئەڵمانی یادی دەکرێتەوە، کە لە ژوەنی ١٩١٩ دا لە ڤێرسایلز واژۆ کرا، بەڵام زۆر زیاتر لەوە مانای لەخۆ دەگرت. دوژمنانی تر- بۆلغارستان، ئۆتریش و مەجارستان، کە لەوە بەدوا لێک جیا کرابوونەوە، و ئیمپراتۆری عوسمانی- دەبوو ڕیکەوتنامەی خۆیانیان پێ بوایە. پێویست بوو لەناو جەرگەی ئەوروپا و سەراسەری ڕۆژهەلاتی ناوین سنووری نوێ دابمەزرێ. لەهەموو ئەمانە گرنگتر، دەبوو دەستووری نێونەتەوەی لەسەر بنەمایەکی نوێ و جیاواز سەرلەنوێ دامەزرێتەوە. ئایا ئێستا ئەو هەلومەرجە بۆ ڕێکەوتنەکان لەسەر کابلەکانی تێلەگرافی جیهانی و فڕۆکەوانی جیهانی، و بۆ ڕێکخراوەی جیهانی کار، کۆمەڵەی نەتەوەکان، لەباروخۆش بوو؟ بەدوای کارەساتێکی گەورەی لەو چەشنە، چاوەڕوانیەکان یەکجار زۆر بوون. تەنانەت بەرلەوەی دەنگی تەقە و تفەنگەکان لە ١٩١٨ نەمێنێ، هاتوهاوار، داخوکەسەر، قەڵسی و وەڕەزی دەستیان پێکرد. بە زمانی جۆراوجۆرەوە دەکەوتنە قسە " چین تایبەتە بە چینیەکان". " کوردوستان دەبێ ئازاد کرێ". "پۆڵەندا دەبێ سەرلە نوێ ژیان دەست پێکاتەوە". داواکاریەکانی ئەوان یەکجار زۆر بوون. ولاتەیەکگرتوەکان پێویستە ببێ بە پۆلیسی جیهان؛ یان، ئەمریکایەکان پێویستە بگەڕێنەوە مالێ. ڕووسەکان پێویستیان بە یارمەتی هەیە. پێویستە ئەوان بە کەرەسەکانیانەوە وێڵ کرێن. کەوتنە گلە و گازەندە: سلۆڤاکەکان سەبارەت بە سزێچەکان، کرۆڤاتەکان سەبارەت بە سێربەکان؛ عەرەبەکان سەبارەت بە جوولەکەکان؛ چینیەکان سەبارەت بە ژاپۆنیەکان. دەنگەکان بۆنی دڵەڕاوکێ و نیگەرانیان لێ دەهات، دڵنیا نەبوون لەوە کە دەستووری جیهانی نوێ لە هینی کۆن باشتر بێت. لە ڕۆژئاوا، سەبارەت بەو بیر و باوەڕە مەترسیدارانەی کە سەرچاوەکەیان ڕۆژهەلات بوو

جیەچپ دەکرا. لە ڕۆژهەڵات، بیریان لە هەڕەشەی ماتریالیزمی ڕۆژئاوا دەکردەوە. ئورووپاییەکان بیریان لەوە دەکردەوە کە بڵێی بتوانن بە خۆیان دا بێنەوە و وەک جارانیان لیببێتەوە و بڵێی بتوانن لە گەڵ هاوپەیمانی نوێ واتە ئەمریکای لەخۆبایی هەڵ بکەن. ئەفریقیەکان ترسی ئەوەیان لە دڵ دابوو کە جیهان ئەوانی خستۆتە پشت گوێ. ئاسیایەکان وا هەستیان دەکرد کە داهاتوو هینی ئەوانە؛ تەنیا کێشەکە لە دەمکاتی ئێستادا بوو.

ئێمە سەبارەت بە ژیانی پاش کۆتایی شەڕێکی گەورە هەندێک شت دەزانین. دەنگەکانی ١٩١٩ زۆر لە دەنگەکانی ئێستا دەچوون. کاتێکە لە١٩٨٩ دا شەڕی سارد کۆتایی پێهات و مارکسیزمی سۆڤیەت چوە ناو زبڵدانی مێژووەوە، هێزەکانی کۆنتر، ئایین و نیشتمانپەروەری، لە یەخسیری و دیلی ڕزگاریان بوو. بۆسنیا و ڕۆڤاندا باشترین بەڵگەن بۆ بەهێزبوونی ئەم هێزانە. لە ١٩١٩، هەر هەمان هەستکردن بە دانانی دەستوورێکی نوێ سەری هەڵدا کاتێکە لەپڕێکدا سنوورەکان گۆڕانکاری بە سەریان دا هات و بیر و باوەڕی نوێی سیاسی و ئابووری هاتنە ئاراوە. ئەوە لە جیهانێکدا کە هەست بە بۆشایەکی مەترسیداری تێدا دەکرا شتێکی سەیر بەڵام تۆقێنەر بوو. هەندێک ڕایان وابوو کە ئیسلامی بووژاوە جێی مەترسیە. لە ساڵی ١٩١٩ بەم لاوە بۆلشویزمی ڕووسی سەری هەڵدابوو. جیاوازیەکە لەوەدایە کە ئێمە نەهاتووین کۆڕێکی ئاشتی جیهانی پێک بێنین. دەرفەتی گونجاو لە ئارادا نیە. سیاسەتمەداران و ڕاوێژکارەکانیان لە کۆڕوکۆبوونەوەی کورت کەم ماوەدا یەکتر دەبینن، بۆ ماوەی دوو یان لەوانەیە سێ ڕۆژ، و ئینجا دووبارە بۆ شوێنێکی تر دەفڕن. کێ چووزانێ بۆ داکووژانی کێشەکانی جیهان کام ڕێگایان باشتر بێت؟

بۆ باس و خواست لەسەر کێشە گەورەکانی ڕۆژ و هەوڵ دان بۆ چارەسەر کردنیان، سیاسەتمەداران، دیپلۆماتەکان، بانگداران، سەربازان، پسپۆڕان، ئابووری ناسان و پارێزەران لە چوار قوڕنووی جیهانەوە هاتن بۆ پاریس: سەرۆک کۆماری ئەمریکا، وودرەو ویلسۆن، و وەزیری دەرەوەی ئەو وڵاتە، ڕۆبێرت لانسینگ؛ جۆرج کلێمەنجوو و ڤیتۆریا ئۆرلاندۆ، سەرۆک وەزیرانی فەرەنسە و ئیتالیا؛ لۆرینسی ئەرەبیبا، کە بە بەرگی عەرەبی و نهێنیەوە داپۆشرابوو؛ ئیلۆتێریاس ڤێنیزێلۆس، ئەو نیشتمانپەروەرەی کە کارەساتی بۆ وڵاتەکەی بەدیاری هێنا؛ ئیگناس پادێرە ڤیسکی، ژەنیارێکی پیانۆ کە بوو بە سیاسەتمەداری پۆڵەندی؛ و زۆر یەک لەو کەسانەی کە هێشتا مابوویان تا ناوێک بۆ خۆیان تۆمار کەن، وەکوو دوو وەزیری دەرەوەی داهاتووی ئەمریکا، سەرۆک وەزیریکی ژاپۆن و یەکەمین سەرۆک کۆماری ئیسرائیل، هەندێکیان بە وەلەد گەیشتبوون بە دەسەڵات وەکوو شاژن ماریای ڕۆمانیا؛ ئەوانیتر، وەکوو دەیڤید لیۆید جۆرج، سەرۆک وەزیری بەریتانیا، کە بە هەوڵ و

ئینگۆشانی خۆیان بە دەستیان هێنابوو. چەقبوونەوەی دەسەڵات گوزارشگەران، تاجران، وتەبێژانی ژن و پیاوی جیهانی لەبەر هەزار و یەک هۆکار بەلای خۆیدا ڕاکێشابوو. باڵوێزی فەڕەنسە لە لەندەن نووسیبووی کە " ئەگەر بتەوێ چاوت بە کەسیک بکەوێ ئەوا ڕوو بکە پاریس. پاریس خەریکە دەبێ بە شوێنێکی سەرنجراکێش بۆ سەدان ئینگلیزی، ئەمەریکی، ئیتالیایی، پیاوماقووڵانی گوماناوی دەرەکی کە بە بیانووی بەشداری کردن لە وت و وێژەکانی ئاشتی دا بەرەو لای ئێمە خەریکن شۆڕ دەبنەوە." مافی دەنگدان بۆ ژنان، ماف بۆ ڕەشپێستان، دەستوورێک بۆ کار، ئازادی بۆ ئیرلەند، چەک دامالین؛ سکاڵانامە و سکاڵانامەنووسان لە هەمووی بەشەکانی جیهانەوە ڕۆژانە دەڕژان بە سەر پاریسدا. لە و زستان و بەهارەدا، لە پاریس منگە منگی پلان دانان بە گوێ دەگەیشت، بۆ زێدی جوولەکەکان، بۆ پۆڵەندای بووژاوە، بۆ ئۆکراینی سەربەخۆ، بۆ کوردستان، بۆ ئەرمەنستان. لە کۆبوونەوەی کۆمەڵانی مافی دەنگدانی جیهانیەوە، لێژنەی کارپاتۆ-ڕاشن لە پاریس، سێربەکانی بانات، کۆبوونەوەی سیاسی ڕووسی دژە-بۆلشویک سکاڵانامە بە لێزمە ڕژان بە سەر شاری پاریسدا. خاوەن سکاڵانامەکان لەو وڵاتانەوە هاتبوون کە لەدایک ببوون یان لەو وڵاتانەوەی کە هێشتا خەونێک بوون و نەهاتبوونە دنیاوە. هەندێکیان، وەکوو زایەنیستەکان، بە ملوێنان کەس دزەیان دەکردە ناو شاری پاریس؛ ئەوانیتر، وەکوو نوێنەرانی دوورگەکانی ئالاند، بۆ چەند هەزار کەسێک. تاقمێکی کەم زۆر درەنگ گەیشتن. کورەیەکان بە پێ لە سێربیاوە لە مانگی فەوریەی ساڵی ١٩١٩ کەوتنە ڕێ و تا کاتێکە بەشی سەرەکی کۆڕی ئاشتی لە ژوەن کۆتایی پێهاتبوو تازە گەیشتبوونە بەندەری ئارچانگێل لە جەمسەری باکوور.٢

هەر لە سەرەتاوە کۆڕی ئاشتی لە ئالۆزی سەبارەت بە ڕێکخراوەکەی خۆی، ئامانجەکانی خۆی، شێوەی هەڵسوکەوتی خۆی ئازاری دەچەشت. چوار یاری گەورە- بەریتانیا، فەڕەنسە، ئیتالیا و وڵاتەیەکگرتوەکان- پلانی کۆبوونەوەیەکی سەرەتایان دارشت بۆ ئەوەی لە سەر چەند تەوەرێک لەگەڵ یەک ڕێکەون، لەوە بەولاوە ئەوان لە هەوڵی ئەوەدا بوون تا کۆڕێکی ئاشتی بەر بڵاو ڕێک بخەن بۆ ئەوەی لەگەڵ دوژمن پێکەوە دانوستان بکەن. هەرخێرا پرسیارەکان سەریان هەڵدا. هێزە هاوپەیمانەکانی تر کەی دەتوانن بۆچوونەکانی خۆیان دەربڕن؟ بۆ وێنە، تازە ژاپۆن ببوو بە زلهێزێکی گەورە لە ڕۆژهەڵاتی دوور. ئەی هێزە بچووکەکانیتری وەک سێربیا و بلژیک چی؟ هەرکیان زۆر زیاتر لە ژاپۆن قوربانیان دابوو.

چوار یاری گەورە نهێنیەکانیان خستە ڕوو، بەڵام دانیشتنە سەرەتایەکانی کۆبوونەوەکە زیاتر ڕەنگ و بۆی تەشریفاتیان بە خۆوە گرتبوو. ئیشی سەرەکی لە لایەن چوار یار و ژاپۆن لە دانیشتنە

عـێرە ڕەسمیەکاندا بەڕێوە دەچوو، و کاتێکە ئەوانەی کە بە نۆبە تووشی هیلاکی و ماندوویەتی دەهاتن، تەنیا لەلایەن ڕێبەرانی چوار یارەوە بەڕێوە دەچوو. دوای تێپەڕبوونی چەند مانگێک، ئەو کۆبوونەوە سەرەتایە بەرەبەرە ڕەنگوبۆی ڕاستەقینەی بەخۆوە گرت. بە هەڵوەشانەوەی پێشینەی دیپلۆماتیک کە ئەڵمانیەکانی تووڕە کردبوو، لەئاکامی ئەوەدا نوێنەرەکانیان بۆ فەڕەنسا بانگهێشت کران تا شێوەی کۆتایی ڕێکەوتنامەکانیان وەرگرن.

ئاشتیکەران بڕیاریان دابوو کە لە جاران گورجوگۆڵتر بن و باشتر خۆیان ڕێکخەن. تەنیا نموونەیەکی بەردەست کە بە وردی توێژینەوەیان لەسەر کردبوو، کۆنگرێسی ڤیەننا بوو، کە شەڕەکانی ناپلیۆنی لێکەوتبۆوە. دایرەی دەرەوە مێژوونووسێکی هەڵکەوتەی ڕاسپارد تا کتێبێک سەبارەت بە کۆنگرێس بۆ ڕێنوێنیکردن لە پاریس بنووسێت. (دواتر ئەو دانی بەوەدا هێنابوو کە بەرهەمەکەی ئەو هیچ کاریگەریەکی دا نەنابوو.۳) ئەو کێشانەی کە لە ڤیەننا ڕووبەڕووی ئاشتیکەران ببوونەوە، هەرچەند گەورە بوون، بە بەراورد لەگەڵ کێشەکانی پاریس ئاسانتر بوون. وەزیری دەرەوەی ئەوکاتەی بەریتانیا، لۆرد کاستلێریخ، تەنیا چاردە ئەندامی لەگەڵ خۆی بۆ ڤیەننا برد. لە ساڵی ١٩١٩ شاندی نوێنەرایەتی بەریتانی نزیک بە چوارسەد کەسی لەخۆی گرتبوو. لە ساڵی ١٨١٥ کێشەکان بە ئارامی داکووژان و لەکاتی خۆیدا پێڕاگەیشتن لەسەریان کرا: کاستلێریخ و هاوکارەکانی لە بەدواداچوون و پشکنینی چرپڕی گشتی ١٩١٩دا دڵیان دادەکەوت. هەروەها بەشداربووانێکی یەکجار زۆرتری لێ دەبوو. پتر لە سی وڵات نوێنەریان ڕەوانەی پاریس کرد: وەکوو ئیتالیا، بلژیکا، ڕۆمانیا و سێربیا، هیچ کام لەمانە لە ساڵی ١٨١٥ دا لە گۆڕێدا نەبوون. نەتەوەکانی ئەمریکای لاتین هێشتا بەشێک بوون لە ئیمپراتۆریەکانی ئیسپانیایی و پۆرتەغاڵی. تایلەند، چین و ژاپۆن وڵاتانی دوورەپەرێز و پڕ لەنهێنی و نەناسراو بوون. ئێستا دیپلۆماتەکانیان بە شەڵواری ڕێڕێ و کۆتی فراک سەریان هەڵێنابوو. بە گرتنەبەری هەڵوێستێکی دوورە پەرێزانە لەو ڕاگەیاندنەی کە بازرگانی کۆیلەی مەحکووم دەکرد، کۆنگرێسی ڤیەننا بایەخێکی بە جیهانی دەرەوەی ئە رووپا نەدا. ئەو تەوەرانەی کە لە پاریس خرانە بەر باس لە جەمسەری باکوورەوە بگرە تا دەگاتە جەمسەری باشوور، لە دوورگەکانی ئوقیانووسی ئارامەوە بگرە تا دەگاتە سەرجەم قارەکانی لە خۆی گرتبوو. هەروەها کۆنگرێسی ڤیەننا لە سەردەمێکدا ڕوویدا کە ئەو سەرهەڵدانانی کە شۆڕشی فەڕەنسەیی لە ساڵی ١٧٨٩ هەڵیگیرساندبوون، داکووژابوون. تا ١٨١٥ شوێنەواری خۆی دانابوو، بەڵام لە ساڵی١٩١٩ شۆڕشی ڕووسی تەمەنی تەنیا دوو ساڵ بوو، کاریگەری لە سەر بەشەکانیتری جیهان

هێشتا نادیار بوو. ڕێبەرانی ڕۆژئاوا هەستیان بەوە دەکرد کە بیر و باوەڕی بۆلشویکی خەریکە لە سەربانی ڕووسیەوە دلۆپە دەکا و لە ئایین، نەریتەکۆنەکان و هەر گرێیەک کە کۆمەڵگاکانی ئەوان پێکەوە گرێ دەدا هەڕەشە دەکات.

لە ئەڵمان و لە ئوتریش، کرێکاران و سەربازانی سۆڤیەت تازە خەریک بوون لە شارەکان و شارۆچکەکان دەسەڵاتیان دەگرتە دەست. سەربازان و مەلەوانەکانی خۆیان لێیان هەڵگەڕابوونەوە. مانگرتنی گشتی لە پاریس، لیۆن، برووسێل گلاسگۆ، سانفرانسیسکۆ، تەنانەت لە وینیپێگی لەگوێی گادانووستووش لەسەر مێرگەکانی کەنەدایی هاتبووە ئاراوە. تۆ بڵێی ئەم سەرهەڵدان و گرە جیاجیا و بەش بەشانە لە ئاورێکی ژێر زەویەوە سەریان هەڵدابێت؟

ئاشتیکەرانی ساڵی ١٩١٩ لە سەر ئەو بڕوایە بوون کە ئەوان زۆر بە پەلەتر و خێراتر لەوەی کە دەبوو کاریان بکردایە لە هەوڵ و تێکۆشان دابوون. ئەوان دەبوو لەسەر نەخشەکانی ئەورووپا هێڵی نوێیان بکێشایە. هەروەک پێشینیانی ئەوان لە ڤیەننا کێشابوویان، بەڵام ئەوان دەبوو بیر لە ئاسیا، ئەفریقا، و ڕۆژهەڵاتی ناڤین بکردابایەوە. "خودموختاری" درووشمی سەر زاران بوو، بەڵام ئەمە بۆ هەڵبژاردنی ناسیۆنالیزمەکانی ڕکابەر هیچ کەڵکێکی نەبوو. ئاشتیکەران دەبوو وەک پۆلیس هەڵسوکەوتیان بکردایە و ئەوان دەبوو نانیان بە برسیەکان بدایە. ئەگەر لە دەستیان بهاتایە، دەبوو دەستوورێکی نێونەتەوەیان دامەزراندایە کە شیمانەی شەڕێکی گەورەی تری لێنەکرایە. هەڵبەت، ئەوان دەبوو پلانی ڕێکەوتننامەکانیان دابڕشتایە. دەبوایە ڕاشکاوانە لەگەڵ ئەڵمان مامەڵە بکرایە، سزا بدرایە چونکە بەرپرسی دەسپێکردنی شەڕ ئەوێ بوو (یان دەبوایە لەبەین بچووایە، هەروەک زۆر لایەن گومانی ئەوەیان دەکرد؟)، داهاتووی ئەو وڵاتە هێڵی زیاتری ئاشتیخوازانەی بۆ خۆی مسۆگەر کردبوو، سنوورەکانی بۆ قەرەبووکردنەوەی فەڕەنسە لە ڕۆژئاوا و نەتەوە تازەکان لە ڕۆژهەڵات هەموار کرابوون. دەبوایە بولغارستان ڕێکەوتنامەی خۆی هەبوایە. ئیپڕاتۆری عوسمانیش هەروەها. مەجارستان-ئوتریش کێشەیەکی تایبەتیان پێشکەش کرد، چونکە چیتر ئەمە لە گۆڕێدا نەبوو. بەگشتی ئەوەی کە بەجێ ماوە ئوتریشێکی بچووک و مەجارستانێکی لەرزۆک بوو، هاوڕێ لەگەڵ ئەوەیکە زۆربەی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان بە نەتەوە تازەکان بەخشی. چاوەڕوانیەکانی کۆڕی ئاشتی لە هەژمار نەدەهاتن؛ مەترسی ناهۆمێدبوونیش لەو ئاستەدا بوو.

ئاشتیکەرانیش بەمشێوەیە نوێنەرایەتی وڵاتانی خۆیان دەکرد، و چونکە زۆربەی ئەمانە[وڵاتەکان] دیموکراسی بوون، دەبوایە بەڕای گشتی ئەوان گرنگیان بدایە. ئەوان دەبوو پێشتر لە هەڵبژاردنی داهاتوو بیرکەنەوە و تێچووەکانی لەخۆ نزیککردنەوە و لەخۆ تاراندنی ڕای گشتی بسەنگێنن. وادەردەکەوێ کە ئەوان بریکاری تەواو ئازاد نەبوون. هەروەها کاتی ئەوە هاتبوو کە داواکاریەکانی کۆن و هینەکانی تازە بخرێنە بەرباس و بێنە ئاراوە. کلێمەنجوو بەمشێوەیەی ژێرەوە گلە و گازەندەی خۆی لای هاوکارێکی باس دەکات: " نانەوەی شەڕ زۆر لە نانەوەی ئاشتی ئاسانترە."٤

لەو چەند مانگەی کە ئاشتیکەران لە پاریس مابوونەوە دەبوایە زۆر شتیان بە دەست هێنابایە: ڕێکەوتنامەیەکی ئاشتی لەگەڵ ئەلمانیا و داڕشتنی بنەماکانی ئاشتی لەگەڵ ئوتریش، مەجارستان و بولغارستان. ئەوان لە ناوەڕاستی ئەوروپا و ڕۆژهەڵاتی ناقین سنووری تازەیان دانا. ڕاستە کە زۆربەی کارەکەیان بە ناتەواوی مایەوە. خەڵک لەو کاتەدا دەیانگوت، هەروەک پێش ئەوەش وتبویان، کە ئاشتیکەران زۆر درێژەیان دایە و بە هەڵەیان دابرد. زۆر بە ئاسایی ئەوترێت کە دانووستانەکانی ئاشتی لە ساڵی ١٩١٩ تووشی شکست هاتن، و ڕاستەوخۆ ڕێگەیان بۆ شەڕی دووەمی جیهانی خۆشکرد. ئەمە بۆ ئەوەیە کە بە شان و باهۆی دەسەڵات و قودرەتی ئەواندا هەڵبلێی. لە جیهانی ١٩١٩دا هەست بە دوو واقعیەت دەکرا و وانەبوو کە هەمیشە بەیەک بخۆن. یەکیان لە پاریس بوو و ئەویتریان لە سەر عەرز، شوێنێک کە لەوێ خەڵک بڕیارەکانی خۆیان ساغ دەکردەوە و شەڕیان دەکرد. ڕاستە کە ئاشتیکەران هێزی ئەرتەش و هێزی دەریاییان هەبوو، بەڵام ڕێگای شەمەندەفەر، جادە و بەندەری کەمیان لەبەردەست دابوو، بۆ نموونە لە ناوەوەی ئاسیا یان قەزاقستان، بزووتنەوەی هێزەکانیان هێواش و ماندووکەر بوو. فڕۆکەی تازە هێشتا ئەو گەورەیی و هێزەی کە دەبوو هەیبوایە، نەیبوو تا ئەو بۆشاییەی پێ پڕ بکاتەوە. لە ناوەڕاستی ئەوروپا، شوێنێک کە ڕێگای شەمەندەفریان بۆ دابین کردبوو، نەمانی دەستوور ئەو مانایەی دەگەیاند کە هەرچەند ڕێگای شەمەندەفەر، مەکینە و سەیارە لە ئارا دابوون، بەڵام سووتەمەنی نا. هێنری وێلسۆن، یەکێک لە ژەنەڕاڵە هەرە زیرەکەکانی بەریتانی، بە لیۆد جۆرجی وتبوو کە " ئابڕووبردنی ئەم یان ئەو دەوڵەتی بچووک هیچ کەڵکێکی نییە. ڕیشەی شەیتانینی کردن لەوە دایە کە *حوکم و فەرمانی پاریس هیچ ڕەوایەکی نییە."* ٥

قودرەت و دەسەڵات پێویستی بە ئارەزووکردن هەیە، هەروەک چۆن وڵاتە یەکگرتووەکان و جیهان تازە ئەمرۆکە ئەوەیان بۆ دەرکەوتووە. فیداکردنی ئارەزوو، جا پارە بێت یان ژیان. لە ساڵی ١٩١٩ لە ئەوروپا ئەو ئارەزوە سەرف کرا. ڕێبەرانی فەڕەنسە، بەریتانیا و ئیتالیا چیتر توانای ئەوەیان نەبوو بە خەڵکانی خۆیان دەستوور بدەن کە لەپێناو دەسەڵات نرخێکی زۆر بدەن. ڕۆژبەدوای ڕۆژ هێزە چەکدارەکانیان لاوازتر دەبوون و ئەوان نەیاندەتوانی پشت بەو سەرباز و مەلەوانانە ببەستن کە بەجێ مابوون. باجدەرەکانیان داوای کۆتاییهێنان بە سەرەڕۆیەکانی زۆر تێچووی دەرەوەیان دەکرد. وڵاتەیەکگرتوەکان بەتاقی تەنیا توانای خەباتکردن و هەنگاونانی هەبوو، بەڵام ئەو ڕۆڵەی لەخۆی ڕانەدەدی، و هێشتا لەباری قودرەت و دەسەڵاتەوە ئەو گەورەیەی کە دەبوو بیبوایە نەیبوو. شیاوی باسە ئەوەش بڵێین: کە بەرلەوەی ئایدئۆلۆجیاکانی ڕکابەری فاشیزم و کمونیزم جێ پێیەک بۆ خۆیان بکەنەوە وڵاتەیەکگرتوەکان دەرفەتی خستنە ژێر ڕکێفی ئەورووپای لە دەست دابوو.

با ئاوڕێک لە ڕابردووی ئەمەریکا بدەینەوە، بزانیین دەسەڵات و قودرەتی لە چ ئاستێک دابوو. لە ساڵی ١٩٤٥ وڵاتەیەکگرتوەکان زلهێزێک بوو و نەتەوەکانی ئەورووپی زۆر لاواز و بێ دەرەتان بوون. کەچی، لە ١٩١٩ وڵاتەیەکگرتووەکان بە بەراورد لەگەڵ هێزەکانی تر توانایەکی ئەوەندە زیاتری نەبوو. لە ئەورووپاییەکان بەر دەهات حەز و خولیاکانی ئەو وڵاتە بخەنە پشتگوێ، و هەر واشیان کرد.

هێزەکانی ئەرتەش، هێزە زەریایەکان، ڕێگاکانی شەمەندەفەڕ، ئایدئۆلۆجیاکان، مێژوو: هەر هەمووی ئەمانە لە ناسینی کۆڕی ئاشتی پاریسدا گرنگن. هەروەها کەسایەتیەکانیش گرنگایەتیەکی ئەوتۆیان هەیە چونکە، لەکۆتاییدا، ئەوە مرۆڤەکانن کە گوزارش ئامادە دەکەن، بڕیار دەدەنە دەرێ، و دەستوور بە ئەرتەش دەدەن کە بکەونە خۆ و خەبات بکەن. ئاشتیکەران بەرژەوەندیەکانی نیشتمانی خۆیان لە گەڵ بوو. هەروەها حەزەکان و ناحەزەکانیشیان پێ بوو. بایەخ و گرنگایەتی ئەمانە لای پیاوانی بەهێزی وەک کلێمەنجوو، لیۆد جۆرج و ویلسۆن کە لە پاریس کۆ دەبوونەوە و پێکەوە دادەنیشتن لە هەموو شوێنێکی تر زیاتر بوو.

# ١

# ودرەو وێلسۆن بەرەو ئە ورووپا دێت

لە ٤ی دێسامبەری ساڵی ١٩١٨دا، جۆرج واشنگتۆن لەگەڵ شاندی نوێنەرایەتی ئەمەریکی، بە مەبەستی بەشداریکردن لە کۆڕی ئاشتی لە دەرەوەی وڵات لە نیۆیۆرک وەدەر کەوت. بە تەقەی تۆپ بەخێرهاتنی فە رمیان لێکرا، بە درێژایی بەراوەکە حەشیمەت لە خۆشیان دەیانقیژاند، کەشتیەکان هۆڕنیان لێ دەدا، فڕۆکەکانی ئەرتەش و باڵۆنەکان بە سەر سەریاندا لە ئاسمان دەخولانەوە. ڕۆبێرت لانسینگ، وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا، بە هیوای سەقامگیربوونی ئاشتی هەتاهەتایی، کۆتری هەڵگری پەیامی ئاشتی ئازاد کرد. کەشتیەکە، کە لە جۆری کەشتی پێشووی نەفەربەری ئەڵمانی بوو، پەیکەری ئازادی بەرەو ئوقیانووسی ئاتلانتیک دەبرد، ئەو شوێنەی کە پاسەوانێک لە پاپۆڕی جەنگی و ڕووخێنەردا وەستابوو تا هاوڕێیەتی کەشتی ناوبراو بکا و باری قورسی چاوەڕونیەکانی ئەو کەشتیە بگەیەنێتە ئەورووپا[٦]

لە دەرەوە باشترین پسپۆڕانی دەم و دەست ئامادەی لێ بوو، کە پاڵێوراوی زانکۆکان و حکوومەتەکان بوون، سندووقێک لە بابەت سەرچاوە و توێژینەوەتایبەتەکان؛ باڵوێزانی فەڕەنسە و ئیتالیا بۆ وڵاتەیەکگرتوەکان؛ و ودرەو ویلسۆن. هیچ کامێک لە سەرۆکانی ئەمەریکی کە هەتا ئەو کاتە کابینەیان بەدەست بوو نەچووبوون بۆ ئەورووپا. نەیارانی بە پێشێلکردنی یاسای بنەڕەتی تۆمەتباریان دەکرد. تەنانەت لایەنگرەکانیشی لایان وابوو کە لەوانەیە ئەقڵی لە دەست دابێت. تۆبڵێی ئەو بە بایەخدان و گرنگیدان بە هەڵیتوپلێتەکانی دانووستان و وتووێژەکان ئەرک و وەزیفەی مەزنی ئەخلاقی خۆی بدۆڕێنێ؟ بۆچوونی خودی ویلسۆن ڕوون و ئاشکرا بوو: بەرەو ئاشتی ڕۆیشتن بە قەد بردنەوەی جەنگ گرنگی هەبوو. ئەو ئەوەی لە خەڵکانی ئەورووپا دەزانی کە بۆ جیهانێکی باشتر

هات و هاواریان بوو. ئەو ئەوەی لە خزمەتگوزارانی ئەمەریکیەوە دەزانی. ئەو بەرلەوەی بڕوات بە کۆنگرێسی نارەحەت و خەم لە دڵی وتبوو کە "ئێستا بە ئەرکی دەزانم لەپێناو ئەو ئاواتانەی کە ئەوان خۆێنیان بۆ ڕشتوە هەوڵ بدەم و ڕۆڵێک بگێرم." دیپلۆماتێکی بەریتانی لەمە زۆر بە گومان بوو. ئەو وتبووی کە ویڵسۆنیان کێشایە پاریس" وەک کوردێکی دۆنەدیو."٧

ویڵسۆن لە نامەیەکدا بۆ هاورێی مەزن و پیرۆزی خۆی ئێدوارد هاوس، کە تازە گەیشتبوە ئوروپا نووسیبووی کە مەبەست لە مانەوەی ئەو لەوێ خۆشکردنی ڕێگایە بۆ قۆناخە سەرەکیەکانی نانەوەی ئاشتی و تەباییە. لەوە نەدەچوو کە بۆ کۆبوونەوەی ڕەسمی ئاشتی لە گەڵ دوژمن بمێنێتەوە. ئەو لە هەڵەدا بوو. کۆبوونەوەی سەرەتایی، بێ ئەوەی کەسێک پێی خۆش بێ، گۆڕا و بوو بە دوایەمین کۆبوونەوە، و ویڵسۆن بۆ زۆربەی ئەو شەش مانگە هەستیارەی نێوان ژانویە و ژوەنی ١٩١٩ لەوێ مایەوە. ئەم پرسیارە کە ئایا ئەو دەبوایە بچوایە بۆ پاریس یان نا، کە زۆریەک لە هاوچەرخانی ئەویێ بەخۆوە خەریک کرد، ئێستا ئیتر زۆر جێی سەرنج نەبوو. لە فرامکلین ڕۆزوێڵت لە یالتاوە بگرە تا دەگاتە جیمی کارتێر یان بیل کلینتۆن لە کەم دەیڤید سەرۆک کۆمارانی ئەمریکا دانیشتنەکانیان لەپێناو دارشتنی سنوورەکان و بنبڕ کردنی ڕێکەوتنامەکانی ئاشتی بوە. ویلسۆن بار و دۆخێکی لەباری ڕەخساند بۆ ئەو ئاگربەستانەی کە کۆتایان هێنا بە شەڕی گەورە. بۆچی نابێ ئەویش ئاشتی بنێتەوە؟

هەرچەند ئەو لە ساڵی ١٩١٢دا وەک سەرۆک کۆماری سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا هێشتا دەستی بەکار نەکردبوو، هەلومەرجەکە و ڕێبازێکی سیاسی پێشکەوتووخوازانە کە گرتبوویەبەر ئەوی بردە ئاستی جیهانی و دەرەوەی وڵات. ئەو وەک زۆريَک لە هاونیشتمانەکانی هاتبوو تا شەڕی گەورە وەک ناکۆکیەکی نێوان هێزەکانی دیموکراسی ببینێت، هەرچەند لەلایەن بەریتانیا و فەڕەنسە بە ناتەواوی نوێنەرایەتی دەکرا، لەلایەن ئەڵمان و مەجارستان-ئوتریش بەجوانی نوێنەرایەتی دەکرا. بەتالان بردنی بلژیک لەلایەن ئەڵمان، زۆربوونی کەرەسەی جەنگی ژێر دەریایی ئەو وڵاتە و بەخۆپەرمانی ئەو وڵاتە لە هەوڵدان بۆ دەستەمۆکردنی مێکزیک بۆ شەڕ دژ بە وڵاتەیەکگرتووەکان، ویلسۆن و ڕای گشتی ئەمریکای بەرەو هاوپەیمانەکان هان دابوو. کاتێک ڕووسیا شۆڕشێکی دیموکراتیکی لە فیبریوەری ١٩١٧ بەخۆوە دی، یەکێک لە دوایەمین گومانەکان کە هاوپەیمانەکان هەستیان بە سەرەڕۆیی و ملهوری تێدا دەکرد- ڕەوایەوە. هەرچەند لە ساڵی ١٩١٦ لە پلانێکی حیزبیدا هەڵوێستی وڵاتی بێلایەنی نیشان دابوو، ویلسۆن لە ئابریلی ١٩١٧ ئەمریکای بە شەڕ دادا. ئەمە بۆ کوڕی وەزیرێکی پرێسبیێری گرنگ بوو، کە با لای باوکی خۆشەویست نەبووبێ بەڵام لە

باوکێکی قووڵی ئایینیدا لە گەڵی شەریک بوو. ویلسۆن لە ساڵی ١٨٥٦ لە ڤێرجینیا لەدایکبوو، دروست پێش دەسپێکردنی شەڕی ناوخۆ. هەرچەند ئەو بە شێوەیەک لە شێوەکان هەموو ژیانی وەک باشووریەک مایەوە- لە پێداگری کردن لە سەر ڕێز و حورمەت و بیروباوەڕی باوک سالارانە سەبارەت بە ژنان و ڕەشپێستەکان- کەچی ئاکامی شەڕی هەر پەسند کرد. ئابراهام لینکۆڵن، هاوڕێ لەگەڵ ئێدمۆند بۆرکێ و ویلیام گلادستۆن، یەکێ لە قارەمانە گەورەکانی ئەو بوون. ویلسۆنی لاو لەپڕێکدا خۆزیا و خولیایەکی پڕ لە تاسە و تینی ئایدیالیستیکی تێدا پەیا بوو. دوای چوار ساڵ خۆش ڕابواردن لە پرینستۆن و سەردەمێکی ناخۆش وەک پارێزەریک، یەکەمین خولی وانەگوتنەوە و نووسینی دەستپێکرد. هەتا ١٨٩٠ ئەو وەک ئەندام ئەستێرەیەکی کۆلیج لە پرینستۆن مایەوە. لە ساڵی١٩٠٢ بوو بە سەرۆکی ئەو کۆلیجە، و لەلایەن کۆلیج و سەرجەم قوتابیانی کۆلیج و ئەمیندارانەوە پاڵپشتی لێکرا.

لە هەشت ساڵی دواتردا ویلسۆن پریستۆنی بۆ پیاوماقوولان لە کۆلیجێکی ئارام و ناچالاک گۆڕی و کردی بە زانکۆیەکی گەورە. ئەو سەرلەنوێ لەسەر بەرنامەی دەرسی کاری کردەوە، بڕە پارەیەکی بەرچاوی تەرخان بەوێ کرد، و باشترین و وریاترین لاوانی وڵاتی خزاندە نێو کۆلیجەوە. تا ساڵی ١٩١٠ ئەو بوو بە کەسایەتیەکی نیشتمانی و پارتی دیموکرات لەنیۆجێرسی، لەژێر ڕکێفی سەرۆکانی کۆنەپارێز بۆ پۆستی پارێزگاری بانگێشتیان لێکرد. ویلسۆن بەوە ڕازی بوو، بەڵام لەسەر بەڕێوەبردنی پلاتفۆڕمێک بۆ خستنە ژێر کێفی بازەرگانیە گەورەکان و پەرەدان بە دیموکراسی پێداگری دەکرد. ئەو وڵاتی ڕاماڵی و تا ساڵی ١٩١١ یانەکانی "ویلسۆن بۆ سەرۆک کۆماری" خەریکبوون سەریان هەڵدەدا. ئەو بۆ مافخوراوان و لێقەوماوان و هەمووی ئەو کەسانەی کە پاشماوەی گەشەسەندنی خێرای ئابووری کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم بوون قسەی کرد. لە ساڵی ١٩١٢دا، لە کۆبوونەوەیەکی دووروودرێژ و تاقەت پڕووکێندا، ویلسۆن پالاوتنی سەرۆک کۆماری بە دەست هێنا. ئەو مانگی نوفامبەر، بە دوو لەتبوونی کۆماریەکان بە بڕیارێکی تێدی ڕۆزڤێلت وەک پێشکەوتنخوازێک دژ بە ویلیام هۆوارد تافت، ویلسۆن هەڵبژێردرا. لە ساڵی ١٩١٦، بە دەنگێکی زیاتر لە پێشوو دووبارە هەڵبژێردرایەوە.

خوولی سەرۆک کۆماری ویلسۆن زنجیرەیەک سەرکەوتنی لەخۆ گرتبوو، بەڵام هەم لەباری سیاسیەوە و هەم لەباری کەسایەتیەوە، بیرەوەری تاڵ و ناخۆش، خەمۆکی، نەخۆشی سەخت و کوت و پریشی تێدابوو. بێجگە لەمانە. ئەو تاقمێک دوژمنی پاش خۆی بەجێ هێشت، کە زۆربەیان دۆستانی پێشووی ئەو بوون. سەرۆکێکی دیموکرات لە نیوجێرسی لە کۆڕێکی خواردنەوەدا وتبووی" درۆزن و ناسپاسە" . ویلسۆن هەرگیز ئەوانەی کە لە گەڵی ڕێ نەدەکەوتن نەدەبەخشی. ئەفسەری

چاپ و بڵاوکراوەکـان و گیانفیـدای ئـەو بـەناوی ڕای سـتانارد بـەیکێر وتبـووی " ئـەو زۆر ڕق ئەستوورە"..١٠پیاوێکی کەلە ڕەق بوو. هەروەک هاوس لـە تاریفاتیـدا دەڵـێ: "هـەرکات کـە پرسـیارێک ئاراستەی دەکرێت بـە مێشـکێکی تـەواو کـراوەوە وەری دەگـرێ و گـوێ بـۆ هـەمووی ئـەو پێشـنیار و ڕاوێژانە ڕادەگرێ کە دەبنە هۆی ڕاستبوونەوەی بڕیارێکی دروست. بەڵام تا ئەوکاتە گوێڕایەڵـە کـە خـەریکی هەڵسـەنگاندنی پرسیارەکەیە و خـەریکی ئامـادەکردنی بڕیارەکەیـە. کاتێـک کـە بڕیارەکـە ڕاست بۆوە ئیتر هەمووشتێک کۆتایی دێت و گوێ بـۆ پێشـنیار و ڕاوێژەکـان شـل ناکـات. دوای ئـەوە هیچ شتێک ناتوانێ ئەو بزوێنێت." ئەوەی کە لای هەنـدێک کـەس پەسـەندکراو بـوو لای کەسـانیتر خۆپەرەستیەکی مەترسیدار بوو. باڵوێزی فەڕەنسە لـە واشـنگتۆن "کابرایـەکی دیبـوو، کـە ئەگـەر دوو سەدە پێشتر ژیابایە، گەورەترین چەوسێنەری جیهان دەبوو، چونکە هـەرگیز بە مێشکیدا نایـە کـە ئـەو لەوانەیە ڕۆژێـک لـەڕۆژان تووشی هەڵەیـەک بێت."١١کاتێـک ویلسـۆن کۆمیسـاریاکانی هاوکـاری خۆی-یـان نوێنـەرانی سـەرەکی و ناسراو- بۆ کـۆڕی ئاشـتی هـەڵبژارد ئـەم تایبەتمەندیـە لـە ڕەفتـار و ڕەوشتی ئەو بە ڕوونی و بە ئاشکرایی دەرکـەوت. ئـەو بۆخۆشـی یـەکێک لەوانـەبوو. هـاوس کـە بـە شانازیەوە دەیگوت "خودی گـۆڕاوی مـن" یـەکێکی تـر بـوو. بەنابەدڵیەوە لانسـینگ، وەزیـری دەرەوەی، وەک کەسایەتی سێیەم هەڵبژارد زیاتر بەهۆی ئەوەوە کە جوان نەدەبوو ئەگەر ئەو بەجێ بمایە. کـاتی خۆی ویلسۆن وەک دەریایەکی بێ بـن لـە زانسـت، وەک مێشـکێکی ژیربێژانـەی وردبـین و لێهـاتووی تەواو بۆ گرتنەدەستی پۆستێکی ڕەسمی بە شان و باهۆی لانسـینگ هەڵیـدەدا، بـەڵام لـە سـاڵ ١٩١٩ ئەم پێداهەڵکوتانە گۆڕا و بوو بە بۆغزاندن و تووڕەیی. دەرکەوت کە لانسـینگ بیروبـاوەڕی قـورس و قایمی هەیە و لەگەڵ باوەڕەکانی ویلسۆن لـە دژایـەتی دایـە. ویلسـۆن لای هـاوس بـەم شـێوەی ژێـرەوە گلەیی لێکردبوو و ئەویش بە خۆشحاڵیەوە یاداشـتی کردبوو"ئـەو بـێ ئەندێشـەیە و توانایـەکی ئـەوتۆی نییـە و لـەڕاسـتیدا لێهاتویـەکی کـەمی هەیـە." چـوارەمین نوێنـەر، ژەنـەڕاڵ بلیسـک تاسـکێر، وەک نوێنـەری شـۆڕای عـالی ئـەمریکایی تـازە گەیشـتبووە فەڕەنسـا. مرۆڤێکـی خـاوەن هـزر و تیـژبین کـە حەزی دەکرد هاوڕێ لەگەڵ خوێندنەوەی تاسیسیدیەکان بە زمانی یوونانی ڕەسـەن بوتریـەک شـەرابی پێ بێت، ئەویش، زۆریـەک لە ئەندامانی پلەخوارتری نوێنەرایەتی لەو بڕوایەدا بوون کە، ئەو بە باشی سەردەمی لاوەتی خۆی تێپەڕاندبوو. چونکە بڕیار وابوو ویلسۆن تەنیا سەبارەت بە پێنج بۆنە لـە مـاوەی کۆڕی ئاشتیدا وتو ویژی لەگەڵ بکات، ئەوە هیچ جێی ئیراد نەبوو.

دوایـەمین هـەڵبژاردەی سـەرۆک کۆمـار، هێنـری وایـت، دیپلۆمـاتێکی ئێسـک سـووک و خـوێن شـیرین بـوو، کـە لووتکـەی بـەرزی کاروچالاکیـەکانی ئـەو دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەردەمی پـێش شـەڕ.

چاوەڕوان دەکرا خاتوو ویلسۆن لەسەر پرسەکانی شێوازی هەڵسوکەوت کردن و هەستان و دانیشتن لە پاریس ئەو بەکەڵک و هەڵکەوتە بزانێت.١٢

هەڵبژاردەکانی ویلسۆن لەوکاتەدا لە ولاتەیەکگرتوەکان بوو بەهۆی ژاوەژاو و دەنگ و هەرایەکی زۆر و لەو سەردەمەوە تا ئێستا ئەو دەمەقرێیە هەر درێژەی هەیە. ویلیام تافت وتبووی "سوێند دەخۆم ئەگەر ئەو هەموو دەست قونجاو و سەقیلانە توانیان کارێک بکەن." ویلسۆن بەئانقەست کۆماریەکانی کەم بایەخ دەگرت و سووکایەتی پێدەکردن، کە زۆربەیان بە تاسە و تینەوە پاڵپشتیان لەشەڕ دەکرد و زۆریەک لەوان ئێستا لە بیرۆکەی کۆمەڵەی گەلاندا لە گەڵی هاوبیر و هاوڕان. ویلیام ڕۆجێرسی قۆشمەچی لە زمانی ئەووەوە بە کۆماریەکان دەڵێت " با ئەوەشتان پێ بڵێم کە ئێمە لێک دادەبڕێین و دەبین بە ٥٠-٥٠ و ئەمن دەڕۆم و ئێوەش هەڤاڵان دەتوانن بمێننەوە." تەنانەت لایەنگرانی حیزبی ئەو کردبوویانە سەری کە پیاوانی وەک تافت یان سناتۆڕی کۆماری پلەبالا لە لیژنەی گرنگ و هێنری کابۆت لۆج لەپێوەندیەکانی نێونەتەوەییدا دابین بکات. ویلسۆن بە بەڵگە و بیانوویەکی زۆری قایلنەکەر ئەمەی ڕەتکردەوە. هۆی ڕاستەقینەی ئەمە ئەوە بوو کە ئەو کۆماریەکانی نەخۆش دەویست و نە باوەڕیشی پێیان بوو. بڕیارێکە ئەو ڕایگەیاند زۆر بە نرخ بوو، چونکە پێگەی ئەوی لە پاریس بنبڕ دەکرد و پلانی خەونێکی ئەوی بۆ دەستووری نوێی جیهانی دادەڕشت کە ولاتەیەکگرتووەکان لەناو دڵی ئەو خەونەدا بوو.١٣

ویلسۆن کەسایەتیەکی ئاڵۆز و نەناسراوی بوو بە شێوەیەک کە هاوڕییانی نزیکی ئەو وەک لیۆد جۆرج و کلێمەنجوو وانەبوون. ئەوە دەبێ هۆکارەکەی بگەڕێتەوە بۆ کوێ کە ڕێبەرێکی ئاوا کە هەوڵ ئەدا لە ڕەسەنترین زمانی ئینجیل نزیک بێتەوە لە بەرانبەر ئەو کەسانەی کە پێی دەگەن دڵڕەق و بێ ڕەحم بێت؟ کەسێکە ئەشقی دیموکراسی بەڵام نەفرەتی سیاسەتمەدارانی هاوڕێی لە دڵ دابوو. کەسێکە دەیەویست خزمەت بە مرۆڤایەتی بکات بەڵام یەکجار کەم پێوەندی تاکەکەسی هەبوو. بڵێی ئەو، وەک تێدی ڕۆزڤێلت، بۆی دەچێ " ئەو هەل پەرستە خائین و لێ نەهاتووە بێ کە ئێمە تا ئێستا لە پۆستی سەرۆک کۆماریدا بە خۆمانەوە نەدیوە"؟ یان ئەو بە قەولی بەیکێر کە وتی، یەکێک لەو ئایدیالیستە دەگمەنانە بێ کە وەک کالڤین یان کڕاموێڵ" جارناجارێک لەسەر گۆی زەوی سەرهەڵبینێ و بۆ ساتێک، تەقینەوەی دەسەلاتێکی سەرسووڕهێنەر، بە شێوەی کاتی مرۆڤی هەڵەکار بگەیەنێتە ئاستێکی بەرزتر لە قەناعەت کە تا ئێستا هەستی پێ نەکرابێ."؟

ویلسۆن بەدوای دەسەلاتەوە بوو لەهەمانکاتیشدا بەدوای کاری گەورەوە بوو. ئەوەی کە دوو لایەنی ڕەفتاری ئەوی پێکەوە گرێ دابوو توانایی ئەو، یان لەوانەیە خۆفریودانی ئەو، لە خستنە ناو چوارچیوەیەکی بڕیارەکانی بوویێت بەشێوەیەک کە زۆر پێویست نەنوێنن، بەلام لەباری ئەخلاقیەوە ڕاست

بیر و ڕەوشت بەرزیان پێوە دیار بێت. هەروەک چۆن هەڵوێستی بێلایەنەی ئەمریکا لە یەکەمین ساڵەکانی شەڕدا، بەلای ئەمریکایەکان و لەڕاستیدا بەلای مرۆڤایەتیەوە، کارێکی ڕەوا و پەسەندکراو بوو، بە ئەگەری تێوەگلانی ولایەتەیەکگرتووەکان لەشەڕدا، لەپێناوی عەداڵەت، ئاشتی و شارستانیەتدا هێرشێکی خاچپەرستانە دەکرایە سەر ئەڵمان، سەر چاوچنۆکی و گێلیێتی. هەرچەند، ئەگەر ئەو باوەڕە لەگۆڕێدا نەبوایە ویلسۆن هەرگیز بۆ ئەو کارەی کە لە پاریس کردی هەوڵی نەدەدا، و هەر ئەمەش ئەوی والێکرد کە نەتوانێ لەگەڵ جیاوازیەکان هەڵ کات و لە بەرانبەر نیگەرانیە ماقووڵانەکانی کەسانی تردا گوێی خۆی کەڕ کات. ئەوانەی کە لەدژی دەوەستان نەک هەڵەکار بەڵکوو پیسیش بوون.

وەکوو ئەڵمانیەکان. بەلای ویلسۆنەوە بڕیاردان لەسەر ڕاگەیاندنی شەڕ شتێکی قزێون و ناشیرین بوو. ئەو لەمێژ بوو لەپێناو نانەوەی ئاشتی و تەبایی لەنێوان هاوپەیمانان و هێزەکانی ناوەندی لە هەوڵ و تیکۆشان دابوو. تەنانەت کاتێکە ئەوان پێشنیاری ئەویان بۆ ناوەنجیگەری ڕەتکردبۆوە، کاتێک ژێر دەریایەکانی ئەڵمانی کەشتیەکانی ئەمریکایان لەئاودا نووقم کردبوو، کاتێک نەیارانی وەک ڕۆزڤێلت تانەی ترسەنۆکییان لێدەدا، کاتێکە کابینەکەی خودی خۆی یەکدەنگ خوازیاری شەڕ بوون، هەر ئەو بوو کە ددانی بە جەرگی خۆیدا دەنا. لەکۆتاییدا بڕیاری دا ئەویش دەست تێوەردات چونکە، وەک خۆی هەستی پێدەکرد، ئەڵمان هیچ ڕێگایەکی بۆ نەهێشتبۆوە. کاتێکە لە ئاڤریلی ١٩١٧ساڵی چوو بۆ بەردەم کۆنگرێس تا شەڕ ڕاگەیەنێت، پێی وتن کە: " خودا هەڵناگرێت ئەم خەڵکە مەزن و ئاشتیخوازە بەرەو شەڕ هان بدەن، بەرەو قزێونترین و پڕ کارەساتبار ترینی شەڕەکان، ئەم کارە دوور لە مرۆڤایەتی بوونە و شتێکی تۆقێنەر و ناخۆشە، شارستانیەت کەوتۆتە سەر دوو ڕێگا کە دەبێ یەکیان هەڵبژێرێت."١٥ بەڕای ویلسۆن ئەڵمان، یان لانی کەم بلێین ڕێبەرەکانی ئەو ولاتە، بارێکی قورسی تاوان و گوناهیان لەسەر شان بوو. لەوانەیە ئەمە ئەڵمانیەکان نەگرێتەوە، بەڵام ئەوانیش پێویستە هەر سزا بدرێن.

ئەو وێنانەی کە لە ساڵی ١٩١٩دا گیراون وەک مردوو شۆرێک ئەو دەخەنە بەرچاوی ئێمە، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت ویلسۆن پیاوێکی کەڵەگەت و بەژن ڕیکوپێک بوو. لە شێوازی ڕەفتار و هەڵسوکەوتیدا وەک پەندبێژێک یان پسپۆڕێکی زانکۆ دەچوو. ئەو ئیمانێکی تەواوی بە ئەقڵ و بە ڕاستیەکان هەبوو. بەڵام نیشتنەوەی خۆی لە ئەوروپا لە ڕۆژی هەینی لە ١٣ دێسامبر بە هێمایەک لە بەختەوەری دەزانی. لای ئەو ژمارەی ١٣ هێمایەک لە بەختەوەری بوو. پیاوێکی هەتابڵێی بەسۆز، ئەو باوەڕی بە سۆزی کەسانی تر نەبوو. کاتێکە خەڵکی هان دەدا بەوەی کە ئاواتەخوازی شتی گەورە و پیرۆز بن ڕەزاشیرین بوون، بەڵام کاتێک، وەک سوسیالیزم، خەڵکی سەرخۆش دەکرد دەتگوت ئاورە. لیۆد جۆرج کە هەرگیز نەیتوانی پێناسەیەکی تەواو و دروست لە ئەو باس بکات، هەندێک لەتایبەتمەندیە باشەکانی ئەو بۆ

هاوڕێیەکی بەمشێوەیە باس دەکات: -"دڵسۆز، ڕاست و دروست، قسە لەڕوو"- و دواتر لە قسەیەکی تریدا دەڵێت "بێ هەست، لاسار و بێ کەڵک".١٦

لەنێو خەڵک و جەماوەردا ویلسۆن وشک و ڕەسمی بوو، لەنێو دۆستان و کەسانی نزیکدا لەدڵەوەنزیک و تەنانەت شۆخی بازیش بوو" بەتایبەت لە گەڵ ژنان زوو خۆی ڕێک دەخست. ئەو لە حاڵەتی ئاساییدا کۆنترۆڵی تەواوی بە سەر خۆیدا هەبوو. بەڵام لەماوەی کۆڕی ئاشتیدا بەردەوام خۆی دەدۆڕاند و تێک دەچوو. (کاتێکە لە پاریس بوو زۆر لە سەکتەوە نزیک ببۆوە). زۆر حەزی لە ڕەگەزدۆزی و پێنج خشتەکی بوو. زۆر حەزی دەکرد قسە و باسەکانی بە نەقڵ و نەزیلە و بەسەرهاتەکانی خەڵکی و کۆمەڵایەتی برازێنێتەوە. لە بەکارهێنانی زاراوەکان چێژی دەبرد: بە ئیسکاتلەندی یان ئیرلەندی وەکوو باب و باپیرانی خۆی، ڕەشپێستی باشووری وەکوو ئەو خەڵکانەی کە لە واشنگتۆن لەگەڵی کاریان دەکرد قسەی دەکرد. لە عادەتەکانیدا پارێزی دەکرد؛ زۆر جار گڵێنەیەکی بچووکی ویسکی لە ئێوارانـدا دەخواردەوە. حەزی لە ئامرازەکان بوو و وێنە بزوێنەرە تازەکانی خۆش دەویست. لە سەفەرەکانی ئە ورووپاییدا بەگشتی سەردانی پێشانگای وێنەکانی کاتی چێشتەنگاوی دەکرد. ئێوارەیەکیان فیلمێکیان بۆ بڵاوکردنەوە ئامادەکردبوو کە بووە هۆی ترس و دڵەڕاوکێی لای جەماوەر و ناوی *ژیانی دووەم* بوو.١٧

پێوەندی ویلسۆن لەگەڵ ژنان هەمیشە قسەلۆکێکی لێدەکەوتەوە. لەماوەی یەکەمین ژیانی هاوبەشیدا ئەو پێوەندی نزیک و تەنانەت ئاشقانەی، لەگەڵ چەندین ژندا هەبوو. یەکەمین ژنی کە زۆری خۆش دەویست نەک خۆشەویستیەکی ئاورین، لە ساڵی ١٩١٤دا کۆچی دوایی کردبوو؛ لە ساڵی ١٩١٥دا لەگەڵ بێوەژنێکی دەوڵەمەندی واشنگتۆنی دووبارە ژیانی هاوبەشی پێکهێناوە، ژنێک کە حەڤدە ساڵ لە خۆی منداڵتر بوو. ئەم قسەلۆکە ئەوی تووڕە و ئاڵۆز کرد. ئەو هەرگیز شۆخی پێکردنی دیپلۆماتێکی بەریتانی نەبەخشی کە دەماودەم لە سەراسەری واشنگتۆن دەهات و دەچوو. خزم و نزیکانی ویلسۆن بە بەراورد لەگەڵ خەڵکانی تر خێرخوازتر و بەڕەحمتر بوون کە دەڵێن: "خاتوو ویلسۆنی تازە دەبێ چی کردبێ کاتێک سەرۆک کۆمار پێشنیاری پێکردبێ؟"یەکێ لە کچەکانی بەسەرسوڕمانەوە وتبووی کە"ئەرێ ئەوە باوکم بۆ وا خۆشحاڵە دەبێ چبووبێ؟"هاوس، دواتر ببوو بە دوژمنی سەرسەختی خاتوو ویلسۆن، لەژیاننامەکەیدا نووسیبووی کە ئۆخەی کەوا ویلسۆن خەمخۆرێکی بۆخۆی دۆزیەوە: "خۆ لە بێ کەسی و تەنیایدا مرد."١٨

ئیدینگ بۆیلینگ، خاتوو ویلسۆنی تازە، بۆ سەفەری ئە ورووپا هاوڕێیەتی سەرۆک کۆماری دەکرد، مافێکی تایبەت کە بە هاوسەرانی لێسێر نەبەخشرابوو. یەکجار ڕووخۆش و ئێسک سووک بوو و هەمیشە پێدەکەنی. ئەو حەزی لە یاری گۆڵف، شت کڕین، گوڵی ئەرخەوانی، و میوانداریتی

بوو. هەموولایەک چاوەکانی ئەویان پێ جوان بوو. هەندێک کەس دەیانوت کە برێک قەڵەو و چوارگۆشە و زۆریش دەمزلە. لە پاریس لەبارەیەوە دەیانوت کە بەرگی تەنگ دەکاتە بەری، سنگی ڕووت و دیارە و دامەنەکەشی یەکجار کورتە. بەڵام لای ویلسۆن ڕەزاشیرین و جوانکیلە بوو. وەک خۆی، ئەویش لە باشوورەوە هاتبوو. لای هاوڕێیەکی ئەمەریکی خۆی وتبووی کە ئەو نایەوێت بە بردنی کارەکەرەکەی خۆی بۆ لەندەن گلاوی بکات، چونکە خەڵکانی بەریتانیا بە باشی لەگەڵ ڕەشپێستەکان هەڵسوکەوتیان دەکرد. هەرچەند شێوازی چاوە بڕکێ کردن و عیشوە فرۆشتنی ژنانی باشووری لەگەڵ بوو، بازرگانێکی زۆر زیرەک و وریا بوو. دوابەدوای مەرگی یەکەمین مێردی، کاروباری دووکانی تەلافرۆشی گرتە دەست. کاتێکە بوو بە شەریکی ژیانی ویلسۆن، بۆی ڕوونکردەوە کە چاوەڕوانە بیکا بە شەریکی کارەکەی. ئەویش بە دڵ و بە گیان پێشنیارەکەی وەرگرت. ڕوناکبیر نەبوو، بەڵام هەتابڵێی بە دەست و برد و جەسوور بوو. وەفاداریەکی زۆری بە هاوسەرە تازەکەی هەبوو. ویلسۆن دەیپەرەست و شەیدای ببوو.١٩

لە دەرەوەی وڵات جۆرج واشنگتۆن، ویلسۆنەکان لە دەوری یەک کۆ دەبوونەوە، زۆربەی ژمەکانیان لە وەتاغی خەودا دەکرد و لەسەر نهۆمی پاپۆڕەکە دەست لەناو دەست پیاسەیان دەکرد. پسپۆڕانی ئەمەریکی لەسەر خەریتەکان و وتارەکانی ئەوان کاریان دەکرد، بە دڵەڕاوکێ و بە ترسەوە لە سەر سیاسەتەکانی داهاتووی وڵاتەکەیان بیروڕایان ئاڵوگۆڕ دەکرد. ویلسۆن لەسەر یاسا گشتیەکان زۆر دەڕۆیی بەڵام زۆر کەم باسی وردەکاریەکانی دەکرد. کوڕێکی لاو بەناوی ویلیام بولیت ئازایانە چوو بۆ لای سەرۆک کۆمار و پێیوت کە ئەوان لەو هەموو بێدەنگیەی ئەو بەتەنگەوە هاتوون. ویلسۆن زۆری پێ سەیر بوو بەڵام بەخۆشحاڵیەوە ڕازی بوو تا لەگەڵ چەندین پسپۆڕ و شارەزا دانیشتنی هەبێ و باس و خواستیان لەگەڵ بکات. بەدوای ئەوەدا یەکێک وتی: "ئەمە یەکەمینجارە کە سەرۆک کۆمار ڕێگە بە کەسێک دەدا تا لە سیاسەت و بۆچوونەکانی سیاسی ئەوسەر دەرهێنی." تا ئەوکات بۆنە و کۆبوونەوەی لەو چەشنە نەهاتبووە ئاراوە. کارناسان و پسپۆڕان بە هیواو و ئاواتێکی زۆرەوە دانیشتنەکەیان کۆتایی پێهێنا. ویلسۆن خۆمانە و خۆڵینە بوو. ئەو سەبارەت بەو ئەرکە قورسەی کە لە سەر ڕێی بوو و بەو باوەڕو متمانەی کە لە کۆکردنەوەی زانیاری بەوانی هەبوو قسە و باسی کرد. بۆ ئەوەی کە ئەوان هەرکات پێیان خۆش بوو بێن بۆ لای دەبوو هەست بە ئازادی بکەن. "ئێوە بەمن دەڵێن کە چ شتێک ڕاست و درووستە و منیش لەوپێناوەدا خەبات دەکەم". ئەو سەبارەت بە باسکردنی بۆچوونەکانی خۆی داوای لێبووردنی کرد: "ئەوان زۆر باش نەبوون بەڵام ئەولای وابوو کە ئەوانە لەهەرچی شتێکە تا ئەوکات ئەو بیستبووی باشتر بوون".٢٠

کاتێک باسی نانەوەی ئاشتی دەهاتە گۆڕێ، ویلسۆن ئەیوت کە وڵاتی ئەوان زۆر بەجوانی ڕۆڵی ناوبژیکەرێک دەگێڕێ. پێویستە ئەوان ژیانی خۆیان تێکەڵ کەن بە نەریتە پیرۆزەکانی دادپەروەری و بەخشندەیی ئەمریکایەکان. بەگشتی، "تەنیا کەسانی بێ مەبەست و پاک لە کۆبوونەوەی ئاشتیدا ئەوان بوون" ئەو ئاگاداری دەکردنەوە کە خراپتر لەوە ئەمە بوو کە " پیاوانێک کە بڕیارە ئێمە دانووستانیان لەگەڵ بکەین نوێنەری خەڵکانی خۆیان نین."ئەمە یەکێ لە باوەڕە قووڵەکانی ویلسۆن بوو، لەپیاوێکدا هەستیان پێدەکرا کە کۆنگرێسەکەی ئەو ئێستا بەدەست دژبەرانی سیاسیەوە گەمارۆ درابوو. لەسەراسەری کۆڕی ئاشتیدا ئەو پشتی بەو باوەڕە دەبەست کە ئەو بۆ کۆمەڵانی خەڵک قسەی کردووەو ئەمە کە ئەگەر تەنیا دەست بگەشتایەتە ئەوان-فەرەنسەیی، ئیتالیایی یان تەنانەت ڕووسیش- ئەوان لایەنگریان لە بۆچوونەکانی ئەوان دەکرد.٢١

ئەو پشتی بە تەوەرێکی پەسندکراوی تر دەبەست: ئەو دانیشتوانی دڵنیا دەکردەوە لەوەیکە وڵاتەیەکگرتووەکان لەبەر هۆی خۆویستی و خۆپەرەستی لە شەڕەوە نەگلا. لەمەدا، وەک زۆر شتی تر، لە وڵاتانی تر نەدەچوو، وەکوو هەرێمی تر، سەرانە یان تەنانەت تۆڵەشی نەدەویست. (هێمای جیاوازی ئەمریکا لە بەشداریکردنی شەڕدا لەگەڵ وڵاتانی ئەوروپایی لەوەدابوو کە ئەمریکا هەمیشە پێداگری لەوە دەکرد کە زیاتر هاریکارێک بێت تائەوەی کە هاوپەیمانێک.) بەگشتی خەباتی وڵاتەیەکگرتووەکان خۆنەویستانە بوو، بۆ وێنە داگیرکردنی کووبا. ئەو پێداگری لەوە دەکرد کە "ئێمە چووین بۆ شەڕی کووبا نەک بە مەبەستی لکاندنی ناوچەی زیاتر بەڵکوو لەپێناو هێنانە دی دەرفەتی ئازادیخوازی بۆ کۆلۆنیەکانی بن دەست و بێ دەرەتان."٢٢

ویلسۆن زیاتر هەوڵی دەدا تەرکیز کاتە سەر نموونەکانی ئەمریکای لاتین، چونکە زۆربەی پێکهاتەی ئەزموونەکانی تایبەت بە پێوەندیەکانی دەرەوەی ئەو ئەوێی دەگرتەوە. ئەو، ئەگەر بۆ بە قەناعەت گەیاندن و ڕازیکردنی خۆشی بووبێت، ڕێبازی مۆنرۆی بووژاندەوە، ئەو بەرەنگاریە مەزنەی کە لە ساڵی ١٨٢٣ هەڕەشەیەکی گەورە بوو بۆ سەر ئەوروپایەکان لەوەیکە بۆ ڕایەکی تر جیهانی نوێ نەخەنەوە بن دەست خۆیان. ڕێبازەکە ببوو بە دەستوورێکی بنەڕەتی لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکادا، زۆر کەس دەیانگوت وەک عەتبایەک وابوو بۆ دەسەڵاتی وڵاتەیەکگرتووەکان بەسەر دراوسێکانی خۆیدا. ویلسۆن زیاتر وەک چوارچێوەیەک چاوی لێدەکرد کە لەناویدا هەمووی نەتەوەکانی قارەی ئەمریکا پێکەوە بە ئاشتی و بەخۆشی ژیان بەسەر دەبەن و مۆدێلێکە بۆ شەڕکردن لەگەڵ نەتەوەکانی ئەوروپایی. لانسینگ لەوە بە گومان بوو، هەروەک زۆرجار گومانی لەبۆچوونەکانی ویلسۆنیش هەبوو: "ڕێبازەکە لەخزمەت سیاسەتی نیشتمانی وڵاتەیەکگرتووەکان دایە و پێوەندی لەگەڵ هێمنایەتی نیشتمانی و بەرژەوەندیە سەرەکیەکانی ئەو وڵاتەوە هەیە."٢٣

ویلسۆن بایەخێکی کەمی دەدا بەو شتانەی کە ئەو وەک ڕەخنەی چزووداز لەلایەن لانسینگەوە ناوی لێدەبردن. ئەو ویژدانی لەوە ڕاحەت بوو کە مەبەست و نیەتێکی باشی هەیە. کاتێک هێزەکانی ئەمەریکی بەرەو هایتی یان نیکاراگوئا یان کۆماری دۆمینیکان ڕۆیشتن، مەبەست لەوە زیاتر ئاسوودەیی و دیموکراسی بوو. لەیەکەمین خوولی سەرۆک کۆماریدا وتبووی کە " من دەمەوێ بە کۆماریەکانی ئەمریکای باشوور فێر کەم کە پیاوچاکان هەڵبژێرن!" ئەو زۆر بەدەگمەن ئاماژەی بەوە دەکرد کە مەبەستی پارێزگاریکردن لە کانالی پاناراما و وەبەرهێنانەکانی ئەمەریکییە. لەماوەی سەرۆک کۆماری ویلسۆندا ولاتەیەکگرتوەکان بەردەوام لە مەکزیکۆ دەستی وەردەدا تا بەمجۆرە لە حکوومەت بگات کە مەبەستی خۆی بوو. ویلسۆن دەیوت: " مەبەستی ولاتەیەکگرتووەکان تەنیا نانەوەی ئاشتی و ئاسوودەییە لە ناوەندی قارەی ئەمریکا بۆ ئەوەی دڵنیا بێت لەوەی کە پرۆسەکانی خودموختاری ئەوێ ناپسێنەوە و هەر درێژەیان دەبێت." کاتێک مەکزیکیەکان نەیاندەویست نیشتنەوەی هێزەکانی ئەمریکا، یان بە واتیەکی تر هەرەشەکانی ئەمریکا ببینن، ئەو هەر بە یەکجاری هەژا.٢٤

سەرەڕۆیی و سەرکەشی مەکزیکی، لەوانەیە بە دەستی ئەنقەست، حەز و خواستی ویلسۆنی بۆ پشت گوێ خستن و لەبەرچاونەگرتنی حەقیقەت دەرخستبێ. کاتێکە ئەو بۆ یەکەمین جار هێزەکانی خۆی حەواڵەی مێکزیکۆ کرد، بە کۆنگرێسی ڕاگەیاند کە ئەوە لە ولامی ئەو سووکایەتی و بەردەوام دەهری کردنەی ولاتەیەکگرتووەکان و هاوولاتیانی ئەوێدایە لەلایەن ژەنەراڵ ڤیکتۆریانۆ هۆئیرتا، ئەو پیاوەی کە شۆڕشی مەکزیکی هەڵگیرساند. لەڕاستیدا، هۆئیرتا زۆر ئاگاداری ئەوە بوو کە هەڵەسوون نەهێنێت. لە کۆبوونەوەی ئاشتی پاریسدا ویلسۆن بڕیاری دابوو تا بانگەشەی ئەوە بکات کە ئەو هەرگیز ڕێکەوتنامە نهێنیەکانی کاتی شەڕی لەنێوان هاوپەیمانانـدا نەدیبوو کە بە ئیتالیا، بۆ وێنە، بەڵێنی ناوچەی ژێردەسەلاتی دوژمنی دەدا. وەزیری دەرەوەی بەریتانیا، ئارتۆر بالفۆر، لە ساڵی ١٩١٧دا ئەوانی بە ئەو نیشان دابوو. لانسینگ بە شێوەیەکی ناشیرین باسی سەرۆک کۆمارەکەی دەکرد و ئەیوت " تەنانەت ڕاستیە چەسپاوەکانیش دەخرانە پشت گوێ ئەگەر ئەوان بۆ دیاری کردنی ڕاستی لە گەڵ ئەم هەستە ژیرانەیە، ئەم هێزە بەناو-ئاسمانیە یەکیان نەگرتایەتەوە"٢٥

هەروەک بارودۆخی ئالۆزاوی مەکزیک سەلماندی، ویلسۆن لەبەکارهێنانی دەسەلاتی و قودرەتی ولاتەکەی، جا چ لەباری ماڵی یان نیزامی، نەدەپرینگایەوە. و تا کۆتایی شەڕی گەورە ولاتەیەکگرتوەکان زۆر بەهێزتر لەو حاڵەتە بوو کە لە ساڵی ١٩١٤دا تێیدا بوو. دواتر بووە بە خاوەنی ئەرتەشێکی زۆر بچووک و هێزێکی دەریایی مام-ناوەندی؛ ئێستا یەک ملوێن هێزی تەنیا لە ئەوروپادا هەبوو؛ و هێزێکی دەریایی کە لەگەڵ هێزی بەریتانیا بەربەرەکانێی دەکرد. ئەوەی ڕاستی بێت، ئەمریکایەکان حەزیان بەوە دەکرد وایدابنێن کە ئەوان شەڕەکەیان بۆ هاوپەیمانانی ئەوروپایی خۆیان

بردۆتەوە. کاتێک وەرزێرانی ئەمەریکی، کارخانەکانە ئەمریکیەکانی گەنم، گۆشتی بەراز، ئاسن، و پۆڵایان لەپێناو خەبات و تێکۆشانی هاوپەیمانان دایە دەرەوە و بەرهەمیان هێنا، ئابووری ئەمەریکی سەری هەڵدا و گەشەی سەند. هاوکات کە ئاستی بەرهەم هێنان و تجارەتی جیهانی تایبەت بە ئەمریکا بێ پسانەوە بەرز دەبۆوە و دەچوە سەرێ، بەڵام هی هێزەکانی ئورووپایی مەنگ دەبوون یان دەچوونە خوارێ. لە هەمووی ئەمانە گرنگتر بۆ پێوەندیەکانی داهاتووی ئەوان، وڵاتیەکگرتوەکان بۆ ئورووپایەکان ببوو بە فەرمانبەرێک. بەگشتی هاوپەیمانانی ئەورووپی بە بڕی ٧$بیلیۆن دۆلار قەرزداری حکوومەتی ئەمەریکی بوون و نزیک بە نیوەی ئەو بڕەپارەیە قەرزداری بانکەکانی ئەمریکایی بوون. ویلسۆن زۆری باوەڕ بەخۆ بوو چون، وای دادەنا کە وڵاتیەکگرتوەکان بە سەپاندنی گوشاری ئابووری زۆر ئاسان ڕێبازی خۆی دەگرێتە بەر و بە ئامانجەکانی دەگات. هەروەک ڕاوێژکارە یاسایەکەی دەیڤید هانتێر میلێر ئاماژەی پێ کرد " ئورووپا لە باری ئابووریەوە تووشی شکست هاتووە و حکوومەتەکانیشی لە باری ئەخلاقیەوە. سووکە ئاماژەیەکی پاشەکشێ کردن لەلایەن ئەمریکاوە بە بیانووی دژایەتیکردنی ئارەزوەکانی ئەو وڵاتە لەپێناو ئاشتی، برایەتی، دادوەریدا دەبێتە هۆی ڕووخانی هەر حکوومەتێکی ئەورووپایی بەبێ جیاوازی و هەڵگیرسانی شۆڕش لەهەر وڵاتێکی ئەو قارەیەدا."[٢٦]

لەو دانیشتنەدا کە تەوەری سەرەکی باسەکە *جۆرج واشنگتۆن* بوو، ویلسۆن بەکورتی باسی لەوکێشانە کرد کە بە سەرهەڵدانی وڵاتانی نوێ دوا هەڵوەشانەوەی قارەی ئورووپا دێنە ئاراوە: پۆڵەندا، چکسلۆڤاکیا، یوگۆسلاڤیا و زۆر وڵاتی تر. ئەوان دەتوانن هەر شێوازێکی حکوومەتی کە پێیان خۆش بێت بگرنە بەر. بەڵام پێویستە کە کەسانێک بخزێننە ناو دەوڵەتانی خۆیان کە خۆیان دەیانەویست. یەکێک لە گوێگرەکانی نووسیبووی کە "مەرج نیە ڕێبەرانێکی ڕۆشنبیر، کۆمەڵایەتی یان ئابووری بن بەڵکوو کەسانێک بن کە دەتوانن کۆمەڵانی خەڵک لە دەوری یەک ڕێک خەن، پێویستە ئازادیان هەبێت-واتە ئەو جۆرە حکوومەتەی کە خۆیان دەیانەوێت."[٢٧]

لەو هەموو بیروبۆچوونانەی کە ویلسۆن پێشکەشی ئەورووپای کرد، چەمکی خودموختاری لەو کاتەوە تا ئێستا هەر بە لێڵی و ئاڵۆزیی ماوەتەوە. لەماوەی کۆڕی گشتیدا سەرۆکی نوێنەرایەتی ئەمەریکی لە ڤییەننا چەندینجار بۆ شیاکاریەک لەسەر مانای وشەکە بۆ پاریس و واشنگتۆن پەیامی نارد. تا ئێستا هیچ وڵامێک نەدراوەتەوە. کەس نەیتوانیوە بە ئاسانی لە مەبەستەکانی ویلسۆن تێبگات. "پەرەسەندنی سەربەخۆیی". " ئەو کەسانەی کە خۆیان تەسلیمی بەرپرسان دەکەن مافی خۆیانە لەناو حکوومەتەکەیاندا دەنگێک یان تریبوونێکیان هەبێت." "مافەکان و ئازادیەکانی نەتەوە بچووکەکان". جیهانێکی ئارام و هێمن بۆ " هەر نەتەوەیەکی ئاشتیخواز کە، وەکوو نەتەوەکەی خۆمان، حەز دەکا ژیانی تایبەت بە خۆی هەبێ، دامودەزگا و ڕێکخراوەی تایبەت بەخۆ دابین

بکات": لە کۆشکی سپییەوە وشە و دەستەواژەی ڕێکوپێک سەر ڕیز دەبوون و بۆ خەڵکانی سەرتاسەری جیهان ئیلهامیان دەبەخشی. بەڵام ئەمانە هەڵگری چی بوون ئاکامەکەیان دەبێ چی بێت؟ بڵێی تەنیا مەبەستی ویلسۆن، وەک جاروبار دەردەکەوت، پەرەدان بە حکوومەتێکی سەربەخۆی دیموکراتیک بووبێ؟ بڵێی پەیامی ڕاستەقینەی ئەو ئەمە بێت کە هەر خەڵکانێک کە بە خۆیان دەڵێن نەتەوە پێویستە دەوڵەتی خۆیان هەبێت؟ لە بەیاننامەیەکدا کە هەرگیز ڕای نەگەیاند و هەر بە ڕەشنووسی مایەوە ئەمریکایەکان بۆ پاڵپشتیکردن لە نانەوەی ئاشتی و تەبایی هان دەدا و دەڵێت : "ئێمە ئەوە دەڵێین کە هەمووی ئەم خەڵکانە مافی ئەوەیان هەیە کە ژیانی خۆیان لەچوارچێوەی ئەو حکوومەتانە بەرنە سەر کە بۆ خۆیان بڕیاریان داوە هەڵیبژێرن. بەمە دەڵێن: یاسای ئەمەریکی."کەچی بۆ نیشتمانپەروەرانی ئیرلەندی و خەباتی لە مێژینەیان بۆ ڕزگارکردنی خۆیان لە دەستووری بەریتانی هیچ هاوخەمی و هاوسۆزیەکی نیشان نەدا. لە ماوەی کۆڕی ئاشتیدا پێداگری لەوە دەکرد کە پرسی ئیرلەند بۆ خەڵکی بەریتانیا بابەتێکی ناوخۆیی بوو. دەستەی نوێنەرایەتی ناسیۆنالیزمی ئیرلەند داوای یارمەتی لێ کرد، ئەوەندە ناشیرین وڵامی داوە کە هەستت دەکرد دەڵێ دەبرۆن چاوتان دەرهات. بۆچوونی ئەو ئاوا بوو کە ئیرلەندیەکان لە وڵاتێکی دیموکراتیکدا دەژیان و تەنیا لە ڕێگای دیموکراسیەوە دەیانتوانی پارچەپارچەی کەن.٢٨

هەتا چەمکی خودموختاری ویلسۆن لێکۆڵینەوەی زیاتری لەسەر بکرێت، گێرە و کێشەی زیاتر سەرهەڵئەدەن. لانسینگ لە خۆی دەپرسی " باشە کاتێکە سەرۆک کۆمار باسی خود-موختاری دەکات دەبێ چ یەکەیەکی لە مێشک دا بێت؟ ئایا مەبەستی ئەو ڕەگەزێکە، ناوچەیەکی ژێردەسەڵاتە، یان کۆمەڵێکە؟" لانسینگ ڕای وابوو کە ویلسۆن بە بەکارهێنانی ئەم جۆرە دەستەواژەیە کارەساتێکی گەورەی ناوە. " هیوا و هۆمێدێک دەبەخشێ کە هەرگیز بە کردەوە دەر نایەت. دڵەڕاوکێی ئەوەم لە دڵ دایە کە ژیانی هەزاران کەس بخاتە مەترسیەوە. ئاشکرایە کە لە کۆتاییدا لە ڕەوایی دەکەوێت، و وەک خەونی ئایدیالیستێک کە نەیتوانی بێت هەست بە مەترسی بکات تا لە وەختی خۆیدا بە ئەو کەسانەدا بچێتەوە کە لە هەوڵی وەگەڕخستنی دان، ڕەد دەکرێتەوە." وەک لانسینگ پرسیاری کرد دەبێ چی بووبێتە هۆی درووستبوونی نەتەوە؟ هاووڵاتی بوون، وەک وڵاتەیەکگرتوەکان، یان هاوڕەگەزبوون، وەک ئیرلەند؟ ئەگەر نەتەوەیەک خۆی بەڕێوە نەبردبێت، ئایا مافی خۆیەتی ببێت؟ ئەگەر وایە، ئەو خۆ-بەڕێوەبردنە تا چ ڕادەیەک بەس دەبوو؟ ئایا نەتەوەیەک دەتوانێ، بە هەر پێناسەیەک، لە چوارچێوەی وڵاتێکی گەورەتری چەندنەتەوەییدا بە خۆشیەوە درێژە بە بوونی خۆی بدات؟ هەندێک جار ویلسۆن وا بیری دەکردەوە. ئەو بۆ خۆی خەڵکی وڵاتێک بوو کە چەندین

نەتەوەی جیاوازی لە خۆ گرتبوو، وڵاتێک کە، بۆخۆی جوان لەبیریەتی، بۆ ئەوەی یەک پارچە بمێنێتەوە شەڕێکی تاڵ و کارەساتباری کردبوو. لە سەرەتادا، ئەو نەیدەویست ئیمپراتووره گەورەکانی چەند نەتەوەیی وەکوو ئوتریش-مەجارستان و ڕووسیە لێک هەڵوەشێنێتەوە. لە فەوریەی ساڵی ١٩١٨دا ئەو بە کۆنگرێسی ڕاگەیاند کە ئاواتە "باش-دیاریکراوەکانی" نیشتمانی دەبێ بێنە دی بەبێ ناساندن یان هەتاهەتاییکردنی تۆوی نوێ یان تازەی دووبەرەکی و قینەبەرایەتی کە دەم و دەست ئاشتی ئەورووپا و لەئاکامیشدا جیهانی دەسڕیەوە."٢٩

ئەمە زنجیرەیەک پرسیاری تری بەدواوە دا هات. ناسیۆنالیزمی باش-دیاریکراو دەبێ کامە بوو بێت؟ پۆڵەندی؟ ئەوە ناسیۆنالیزمێکی بەرچاو بوو. بەڵام ئۆکراینی چی؟ یان سلۆڤاکی؟ و لق و پۆپەکان چی؟ بۆ وێنە، کاتۆلیکەکانی ئۆکراینی، یان، پۆڵەندییەکانی پرۆتێستان؟ ئەگەرەکانی دابەشکردنی مرۆڤەکان هەر کۆتایی نایات، بەتایبەت لە ئورووپای ناوەندی، شوێنێکە مێژوو تێکەڵیەکی چڕ و پڕی لە ئایین، زمان و کولتووری پاش خۆی بەجێ هێشتبوو. نزیک بە نیوەی ئەو کەسانەی کە لەوێ دەژین وەک ئەندامانی کەمینەیەکی نەتەوەیی یان یەکی تر حەسابیان بۆ دەکرێت. کاتێکە هێشتا هێڵی جیاکەرەوەی نێوان نەتەوەیەک و نەتەوەیەکی تر لێڵ و نادیار بوو چۆن مرۆڤەکان بە سەر وڵاتێک یان وڵاتێکی تر دابەش کران؟

ڕێگەچارەیەک ئەوە بوو کە بخرێتە بەردەم پسپۆڕان و شارەزایان. با ئەوان لە مێژوو بکۆڵنەوە، ئامار کۆکەنەوە و لەگەڵ دانیشتوانی ناوچە ڕاوێژ بکەن. ڕێگەچارەیەکی تری، بە ڕواڵەت دیموکراتیکتر، کە لە شۆڕشی فەرەنسا بەملاوە لە پێوەندیەکانی نێونەتەوەیی دەماودەم هاتبوو، ئەوە بوو کە بە دانیشتوانی ناوچە لە ڕێگای ڕای گشتیەوە مافی هەڵبژاردن بدرێ، بە دەنگێکی نهێنی، کە لەلایەن ڕێکخراوەیەکی نێونەتەوەیەوە چاودێری بکرێت. لەوە ناچێ ویلسۆن بیری لەوە کردبێتەوە کە خودموختاری بە لەونێک ڕای گشتی لەخۆ دەگرێت، بەڵام تا ساڵی ١٩١٨ زۆرکەس وابیریان دەکردەوە. کێ بڕیار بوو دەنگی بدایە؟ تەنیا پیاوان، یان ژنانیش؟ تەنیا دانیشتوان، یان هەرکەسێک کە لە ناوچەی قەیراناویدا لەدایک ببووو؟ (فەرەنسەیەکان بەتوندی بەرەنگاری بۆچوونی ڕای گشتی لەسەر پارێزگا لەدەست دراوەکانی ئالساسی و لۆراین دەبوونەوە بەو مانایە کە دەنگدانەکەیان بە نارەوا دەزانی چون ئەڵمان فەرەنسەیی بێژانی بەزۆری دەرکردبوو و ئەڵمانیەکانیان نیشتەجی کردبوو.) ئەی ئەگەر دانیشتوان نەزانن کە سەربە چ نەتەوەیەکن چی؟ لە ساڵی ١٩٢٠دا کاتێکە، لێکۆڵینەرێکی دەرەوە لە گوندنشینێکی دانیشتووی بێلاڕووس پرسیاری لێکرا کە ئەو کێیە و سنووری هاوبەشی ڕووسەکان، پۆڵەندایەکان، لیتوانیایەکان، بێلاڕوسەکان و ئۆکراینیەکان کامەیە تەنیا وڵامێکە درایەوە ئەوە بووو کە"

من كاتۆلیكم لە هەمووی ئەم پارچانە. پسپۆڕانی ئەمەریكی لە كارینتیا لە كێوەكانی ئوتریش ئەم پرسیارەیان لا درووست بوو كە كاتێكە تۆ كەسانێک لە بەردەمی خۆتدا دەبینی كە" نایانەوێ هیچ پێوەندیەكیان بە نەتەوەی برایانی خوێنی خۆیانەوە هەبێت یان ئەوەیكە سەبارەت بە سەرجەم پرسەكانی نەتەوەیی هەڵوێستێكی تەواو بێ لایەنیان هەیە".٣٠ چی دەكەی؟

لە ساڵی ١٩١٩دا ویلسۆنی لەگوناح پابۆوە بە كۆنگرێسی ڕاگەیاند كە "كاتێكە من ئەو وتانەم بە زاری داهات [كە هەمووی نەتەوەكان مافی خۆیانە خودموختاریان هەبێت]، زانیاریەكی ئەوتۆم سەبارەت بە هەبوونی نەتەوەكان نەبوو، كە ڕۆژ بە دوای ڕۆژ ڕووبەڕوویان دەبینەوە."ئەو خۆی لەبەرانبەر پەرەسەندنی بزووتنەوەكانی نەتەوایەتی كە بە دوای دەوڵەتانی خۆیانەوە بوون بەرپرس نەدەزانی- ئەوە لە كۆتایی سەدەی هەژدەهەم بەملاوە درێژەی هەبوو- بەڵام، وەک سیندنی سۆنینۆ، وەزیری دەرەوەی ئیتالیا ئاماژەی پێدەكات: " بێ گومان شەڕ لە بزواندنی هەستی نەتەوایەتیدا كاریگەری هەبووە... لەوانەیە ئەمریكا بەڕوونی و بەئاشكرا خستنە بەرباسی یاسا و ڕێساكان باری هێنابێت."٣١

ویلسۆن زۆربەی كاتەكانی خۆی لە دانیشتن لەگەڵ پسپۆڕان سەبارەت بە بابەتێكە زۆر بە دڵی بوو تەرخان دەكرد: پێویست بوون بە دۆزینەوەی ڕێگایەكی نوێ بۆ بەڕێوەبەرایەتی كردنی پێوەندیەكانی نێونەتەوەیی. ئەمە لەلای گوێگرەكانی ئەو شتێكی سەیر و نامۆ نەبوو. لە چاردە خاڵە ناودارەكەی ژانویەی ساڵی ١٩١٨ی خۆی دا، و لە وتارەكانی دواتردا، بۆچوونەكانی خۆی باشتر شرۆڤە كردبوو. ئەو لە وتاری "چوار یاسا"كەی ژانویەی ساڵی ١٩١٨ی خۆی دا بە كۆنگرێسی ولاتەیەكگرتووەكانی ڕاگەیاندبوو كە هاوسەنگی قودرەت وەک شێوازێک بۆ ڕاگرتنی ئاشتی بۆ هەتاهەتایە لە ڕەوایی و لە متمانەبوون كەوت. چیتر لەو جۆرە دیپلۆماسیە نهێنیە نایەتە ئاراوە كە ئورووپای كێشا بەلای مامەڵەی سوودبەخش، و هاوپەیمانی ئالۆز و تیكەڵ پێكەڵ كرد،و هتد.. كە لەكۆتاییدا بە شەڕی دادا. نانەوەی ئاشتی و تەبایی نابێ بۆ شەڕ و شۆڕەكانی داهاتوو ریگە خۆش كا. پێویست ناكا هیچ سزایەک، هیچ داواكاریەكی ناعادلانە و هیچ پێ بژاردنێكی زۆر- قەرەبووی زیان و زەرەر- لە لایەن دۆڕاوەكانەوە بە براوەكان ببەخشرێت. ئەمە هەر ئەو هەڵەیە كە دوا ئەوەیكە پڕاشا لە ساڵی ١٨٧٠ فەرەنسەی شكست دا هاتە ئاراوە. فەڕەنسە هەرگیز ئەڵمانی لە بەر هۆی ئەو هەموو پارەی كە خەرجی كرد و لەبەرهۆی لەدەست دانی پارێزگاكانی ئالساسی و لۆراین نەبەخشی. پێویستە شەڕ وەک شتێكی ناخۆش و دژوار سەیر كریت. پێویستە بە سەر تەقەمەنیەكان دا، تەنانەت چەک كردنی گشتی كۆنترۆڵ و پشكنین هەبێت. پێویستە كەشتیەكان لە سەراسەری دەریاكانی جیهاندا بە ئازادی بسووڕێنەوە. (هەروەک بەریتانیایەكان بە باشی دەیانزانی، ئەوە بە مانای كۆتایی هێنان بوو بە چەكی كۆن باوی خەفەكردنی

ئابووریەکان دوژمنان لە ڕێگای گەمارۆدانی بەندەرەکانیان و دەست بەسەرداگرتنی کەشتیەکانیان؛ ئەمە ناپلۆئۆنی بەچۆک داهێنابوو، و ئەوان لایان وابوو کە بە سەرکەوتنی هاوپەیمانی بە سەر ئەڵماندا خێرایی بەخشیبوو.) پێویستە بەربەستەکانی تجاری کەم بکرێنەوە تابەڵکوو نەتەوەکانی جیهان پێوەندیەکی زیاتریان بە یەکەوە هەبێت. لە ناو جەرگەی شێوەتێڕوانینی ویلسۆندا کۆمەڵەی نەتەوەکان هەڵکەوتبوو تابەڵکوو هیمنایەتی گشتی دەستەبەر بکات کە، لە کۆمەڵگایەکی باش-بەڕێوەچوو دا، لە لایەن حکوومەت، یاساکانی، دادگاکانی، و پۆلیسەکەی دەستەبەردەکرا. کاتێکە سەرۆک کۆمار قسەی دەکرد پسپۆڕێک بە خێرایی ئەم یادداشتەی نووسیبوو کە "زۆر جار سیستەمەکۆنەکانی دەسەڵات، هاوسەنگی دەسەڵات و قودرەت، تووشی شکست هاتبوون". کۆمەڵەکە ئامادەیی ئەوەی هەبوو کە بە ئەگەری هاتنە ئارای هەر ئاڵۆزی و کێشەیەک بتوانێ شۆڕایەک دامەزرێنێت و بیرەوێنێتەوە. " ئەگەر سەرکەوتوو نەبوو ئەوا نەتەوەی تاوانبار دەبێ نایاسایی بکرێت- و هەنووکە تاوانباران زۆر ناوبانگیان نییە."٣٢

ویلسۆن شێوەتێڕوانینی لیبراڵێک و مەسیحیەکی هەبوو. ئەو شێوەتێڕوانینە لەبەرانبەر ئەو بۆچوونەدا دەوەستا کە باشترین ڕێگا بۆ پاراستنی ئاشتی ئەوە بوو کە نەتەوەکان لەبەرانبەر یەکدا هاوسەنگ کرێن، ئەگەر پێویست بێت لە ڕێگای هاوپەیمانانەوە، و ئەو هێزە، نەک هێمنایەتی گشتی، تەنیا ڕێگای بەرپەرچ دانەوەی هێرش بوو. هەروەها ویلسۆن وڵامێکی توندوتیژی دا بە ژیانێکی ئاڵتێرناتیف کە بۆلشویکەکانی ڕووسی بەڵێنیان دەدایە، بەو مانایە کە شۆڕش جیهانێکی نوێ دێنێتە دی کە لەوێدا چیتر هەست بە هیچ ئاڵۆزی و قەیرانێک ناکرێت. ئەو باوەڕی بە نەتەوەکانی جیاواز و بە دیموکراسی هەبوو، هەرکیانی وەک باشترین شێوەی حکوومەتداری و وەک هاندەرێک بۆ ڕەوشت بەرزی و چاکەکاری سەیر دەکرد. کاتێکە حکوومەتەکان لە لایەن خەڵکەکانیانەوە هەڵدەبژێردران ئیتر لە گەڵ یەکتر شەڕیان نەدەکرد و نەدەکرا تووشی شەڕ بن. ئەو لە ساڵی ١٩١٧ دا بە ئەنجومەنی پیرانی ڕاگەیاند کە "ئەمانە یاسا و ڕێساکانی ئەمەریکین. ئێمە ناتوانین لەگەڵ هیچ یاسایەکی تر هەڵکەین و پەسەندی بکەین، و هەروەها ئەمانە یاساکان و سیاسەتەکانی ژنان و پیاوانی پێشکەوتوو خوازن لە هەرشوێنێکی جیهان، هی هەر نەتەوەیەکی پێشکەوتوو، هی هەر کۆمەڵێکی ڕۆشنبیرن. ئەوانە یاساکانی مرۆڤایەتین و پێویستە پەرەیان پێ بدرێت." ئەو لای وابوو کە بۆ مرۆڤایەتی قسە دەکات. ئەمریکایەکان مەیلی ئەوەیان هەبوو کە جیهان سەیری بیروباوەڕە بەنرخەکانی ئەوان بکەن، و حکوومەت و کۆمەڵگاکەی خۆیان وەک مۆدێلێک بۆ هەمووی نەتەوەکانی تر سەیر دەکرد. بە گشتی، وڵاتیەکگرتووەکان لەلایەن کەسانێک دامەزرابوو کە دەیانەویست جیهانی کۆنی پشت سەری خۆیان بەجێ بێڵن و شۆڕشەکەشی، بەشێوەیەک، لەپێناو هێنانەدی جیهانێکی نوێ دابوو. دیموکراسی

ئەمەریکی، دەستووری بنەڕەتی ئەمەریکی، تەنانەت شێوازگەلی ئەنجامدانی کاروباری بازرگانی ئەمەریکی ئەو نموونانە بوون کە نەتەوەکانی تر لەبەر قازانجی خۆشیان بووە دەبێ ڕەچاویان بکەن. هەروەک یەکێک لە لاوانی ئەمەریکی لە پاریس وتبووی: "بەرلەوەی لەگەڵ ئەم هەڤاڵانە لێرەدا هەڵسوکەوت بکەین پێویستە فێریان کەین شێوازی بەڕێوەبردنی کاروبارەکان چۆن دەبێ و چۆنیش بەخێرایی بە ئەنجامیان بگەیەنن."٣٣

ئەمریکایەکان سەبارەت بە ئەورووپییەکان بۆچوونێکی نادیار و شاراوەیان هەبوو: کۆمەڵێک پێداهەڵکوتن بە سەر دەسکەوتەکانی ڕابردوویاندا، ئەو باوەڕەی دروست کرد کە هاوپەیمانان بەبێ وڵاتەیەکگرتووەکان دەدۆڕان و ئەم گومانەی دانا کە، ئەگەر ئەمریکایەکان هۆشیان نەبایە، ئەورووپایە مەکربازەکان سەرلەنوێ دەیان خستنەوە ناو ئازار و مەینەتی. کاتێک ئەوان خۆیان بۆ کۆبوونەوەی ئاشتی ساز دەدا، نوێنەرانی ئەمەریکی دڵەڕاوکێی ئەوەیان هەبوو کە نەکا فەرەنسەییەکان و بەریتانییەکان دیسان داو و تەڵەیان نابێتەوە. لەوانەیە پێشنیارکردنی کۆلۆنیەکی[وڵاتێکی ژێردەستەی]ئەفریقی، یان فەرمانڕەوایەک بەسەر ئەرمەنستان یان فلستین، وڵاتەیەکگرتووەکان لە خشتە ببا- و ئیتر زۆر درەنگ بکەوێت و کار لەکار بترازێت. ئەمریکایەکان خۆیان سەرەونخوون دەبیننەوە لەکاتێکدا ئەورووپاییەکان لە کەیفخۆشی خۆیاندا سەیریان دەکردن.٣٤

بیروباوەری جیاکاری ئەمەریکی هەمیشە دوولایەنی لە خۆگرتووە: یەکیان خولیابوونی خستنە سەر ڕێگای ڕاستی جیهانیان، ئەویتر ڕوو هەڵگەڕانەوە بە شەرمەزارییەوە ئەگەرهاتوو پەیامەکە وەرنەگیرا و خرایە پشتگوێ. ویلسۆن بە هاوسەفەرانی خۆی ڕاگەیاندبوو کە پێویستە نانەوەی ئاشتی و تەبایی لەسەر بنەمای یاسا نوێیەکان بێت، "ئەگەر وانەبێت، گەرما و دووکەڵ لەجیهان سازدەکات." بە حاڵەتێکی نیوە-شۆخیەوە دەیگوت کە "سەری خۆ هەڵدەگرم خۆ دەکەم بە شوێنێکدا هات و چووم بۆ گوام."ئیمان بە بیروباوەڕی جیاکاری ئەوان هەندێکجار بۆتە هۆی دەبەنگی و بێ میشکی تایبەت لەلایەن ئەمەریکیەکانەوە، مەیل بە ئامۆژگاری کردنی نەتەوەکانی تر تا گوێ شلکردن بە ئەوان، هەروەها مەیل بە وادانانی ئەوەکە هاندەرانی ئەمەریکی لە هی نەتەوەکانی تر خەست و خۆڵترن. و ویلسۆن زۆر ئەمەریکی بوو. لیۆد جۆرج دەگێڕێتەوە کە ئەو وەک مزگێنیدەرێک بۆ ڕزگارکردنی ئورووپایەکانی لەدین هەڵگەڕاوە، بە "کورتە وتارە ئایینیەکان"یەوە پڕ لە سەرنج و تێبینی ڕوون و دیار بەرەو کۆبوونەوەی ئاشتی وەڕێ کەوت.

زۆر ئاسان دەکرا گاڵتە بە ویلسۆن بکرێت، زۆرلایەن وایان دەکرد. هەروەها زۆر ئاسان دەکرێ گرنگایەتی پرەنسیپ و یاساکانی ئەو لە ساڵی ١٩١٩ دا و ژمارەی بەرچاوی ئەو کەسانەی کە،

نەک تەنیا لە وڵاتە یەکگرتووەکان، دەیانەویست بە خەونی گەورەی جیهانێکی باشتری ئەو بڕوا پەیا کەن، لەبیرکرێن و فەرامۆشیان بێت. ئەوان، بەگشتی، خاڵێکی وەرچەرخان لە نەدامەتی و ماڵوێرانیان هەبوو کە پاشماوەی شەڕی گەورە بوو. ویلسۆن ئەم هیوایەی زیندوو ڕاگرتبوو کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی، سەرەڕای بەڵگە و شەواهێد، بەرەو باشی دەڕۆیی، کە مرۆڤەکان ڕۆژێک پێکەوە لە تەباییدا دەژین. لە ١٩١٩ بەرلەوەی تارمایی و لێڵی خەیاڵەکان بڕەوێتەوە، جیهان زۆر ئامادەتر بوو لەوەی کە گوێی بۆ شل بکات. ئەوەیکە ویلسۆن پێویست بوو بیوتایە، نەک تەنیا لای لیبراڵەکان و ئاشتیخوازان بەڵکوو لە نێوان پسپۆڕانی سیاسی و دیپلۆماتیکیشدا بە هەند گیرا و وەریان گرت. سێر مۆریس هانکی، سکرتێری شەڕی بەریتانی و دواتر سکرتێری خودی کۆڕی ئاشتی، هەمیشە کۆپلەیەک لە چاردە خاڵەکە لە سندووقێکدا وەک کەرەسەی ئاماژەی هەستیار، هەڵدەگرت. ئەو دەیوت کە ئەوانە "پێشینەی ئەخلاقی بوون". لە سەراسەری ئەورووپادا گۆڕەپان، شەقام، وێستگەی ڕێگای شەمەندەفەڕ و پارک هەبوون کە هەڵگری ناوی ویلسۆن بوون. پۆستێری سەر دیوارەکان هاواریان دەکرد " ئێمە خوازیاری ئاشتیەکی ویلسۆنین". لە ئیتالیا سەربازان لەبەر وێنەکەی ئەودا چۆکیان دادەدا؛ لە فەڕەنسە ڕۆژنامەی باڵی-چەپ *ل هۆمانیت* ژمارەیەکی دایە دەرێ کە تێیدا ڕێبەرانی ناوداری باڵی چەپی فەڕەنسە بۆ هەڵکوتان بەناوی ویلسۆندا ڕکابەریان پێکەوە دەکرد. ڕێبەرانی شۆڕشی عەرەب لە بیابان، ناسیۆنالیستەکانی پۆڵەندی لە وۆرشۆ، یاخیەکانی دوورگەکانی یۆنان، قوتابیان لە پەکینگ، ئەو کورەیانەی کە لەهەوڵی ئەوەدا بوون کۆنترۆڵی ژاپۆن بەسەر ناوچەدا بخەنە لەرزە، هەرهەموویان چاردە خاڵەکەیان وەک ئیلهامێک بۆ خۆیان وەرگرت. ویلسۆن ئەمەی بە هێمای بەختەوەری دەزانی بەڵام لەهەمانکاتیشدا هەستی بە دڵەڕاوکەیەکی زۆر دەکرد. بە جۆرج کریل، بەرپرسی ناوداری خۆی بۆ کاروباری پرۆپاگەندە و بانگەشەکردن، کە لە دەرەوەی وڵات بوو وتبوو کە: " تۆ بڵێی ئێوە لەڕووی نائاگاهیەوە تەڵەیەکتان بۆ من نەنابێتەوە کە هیچ ڕێگەی دەربازبوونێکم بۆ نەمێنێتەوە." جیهان خەریکبوو ڕووی دەکردە وڵاتەیەکگرتووەکان بەڵام، ئەو لە درێژەی باسەکەیدا دەڵێت:" ئەوان هەردوولا ئاگاداری ئەوە بوون کە کێشەی وەها گەورە بەمزوانە چارەسەری نایەت. " ئەوەی ک من هەستی پێدەکەم- هیوادارم کە بە هەڵەدا چووبێتم- کارەساتێکی بێ هیوا و ئومێدیە."٣٦

جۆرج واشنگتۆن لە ١٣ی دێسامبەری ساڵی ١٩١٨دا گەیشتە بەندەری فەڕەنسای برێست. ماوەی مانگێکی ڕەبەق بوو کە شەڕ کۆتایی پێهاتبوو. لەکاتێکدا سەرۆک کۆمار لەسەر بورجی پاپۆڕەکە وەستابوو، کەشتیەکەی ئەو لە بەینی شەقامێکی گەورەی پاپۆڕەکانی جەنگی لە هێزە

زەریایەکانی بەریتانیا، فەڕەنسا و ئەمەریکا تێپەڕ دەبوو. هەر لە یەکەمین ڕۆژەوە ئاسمان خۆرەتاو بوو. شەقامەکان بە هێڵێک لە پەرچەم و گوڵی لۆرێل ڕازابوونەوە. پۆستەری سەر دیوارەکان بە ویلسۆنیان هەڵدەوت و ڕێزیان لێدەگرت، ئەوانەی لایەنگری باڵی ڕاست بوون بەهۆی ڕزگار کردنیان لە ئەڵمان، ئەوانەشی لایەنگرانی باڵی چەپ بوون بەهۆی جیهانێکی نوێ کە ئەو بەڵێنی دابوویە. ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە خەڵک، زۆریەک پۆشاکی بریتۆنی کۆنیان کردبووە بەریان، قوژبنی هەر شۆستەی شەقامێک، هەر سەربانێک، و هەر دارێکیان گرتبوو. تەنانەت پۆستێرەکانی لامپیش هەڵدرابوون. ئاسمان لە دەنگی زۆرناژەنانی بریتتۆنی پڕ ببوو و یەک بە خۆیان ئەم دروشمەیان دووپات دەکردەوە " بژی ئەمەریکا! بژی ویلسۆن!". وەزیری دەرەوەی فەرەنسە ستێفن پیچۆن بەخێرهاتنی کرد و پێیوت کە" ئێمە زۆر سوپاسگوزارین لەوەیکە تەشریفتان هێناوەو ئاشتی بە مانای ڕاستەقینەکەی بە ئێمە دەبەخشن." ویلسۆن وڵامێکی ساردی دایەوە و سواری شەمەندەفەڕی شەوانە بوو و بەرەو پاریس ڕێکەوت. لە کاتەژمێر سێی بەرەبەیاندا، دکتۆری ویلسۆن بە ڕێکەوت سەرێکی کێشا بۆ پەنجەرەی ڤارگۆنەکەی. " نەک تەنیا ژنان و پیاوان بەڵکوو منداڵانی وردیشم دەدی کە بە سەری ڕووتەوە وەستابوون و لە تێپەڕبوونی قەتاری تایبەت خۆشحاڵی خۆیان دەردەبڕی."٣٧

لە پاریس بە جەماوەرێکی زیاترەوە و بە شادی و خۆشیەکی زیاترەوە پێشوازی لە ویلسۆن کرا: ئەمەریکیەک کە لە پاریس دەژیا گێڕایەوە کە: "دەربڕینی شادی و خۆشیەکی بێوێنە لەلایەن پاریسیەکانەوە کە من تا ئێستا بە حەیاتی خۆم نەمدیوە لە نزیکەوە هەستم پێکرد." قەتارەکەی ئەو بەرەو وێستگەی لوکزامبۆرگ دەڕۆیی، کە بە پارچە و بە پەرچەم گۆڵچن کرابوو و بە دەستە گوڵی جوان ڕازابۆوە. کلیمەنجوو، سەرۆک وەزیری فەڕەنسا، هاوڕێ لەگەڵ دوژمنی لەمێژینەی خۆی و حکوومەتەکەی، سەرۆک کۆمار ڕایمۆند پۆینکارێ، لەوێ بوون. کاتێک بۆ ڕاگەیاندنی گەیشتنی ویلسۆن تەقە لە تفەنگەکان هەستا، جەماوەر ئەو سەربازانەی کە ڕێگای هاتوچۆیان بەستبوو پاڵەپستۆ دەدا. سەرۆک کۆمار و ژنەکەی لە ناو ڤارگۆنێکی کراوەدا لە پالێس دێلا کۆنکۆردەوە تێپەڕین و بەرەو ژورر چوون بۆ چامپس-ئێلیسیس شوێنی دانیشتنیان و دەنگ و هەرای خۆشی جەماوەر. ئەو شەوە لە ئێوارەخوانێکی خێزانی بێدەنگدا، ویلسۆن وتبووی کە بەو پێشوازیە زۆر خۆشحاڵ بووە. بە پێی گوزارشی کەسێک ویلسۆن بە دانیشتوانی خوانەکەی ڕاگەیاندبوو کە " ئەو زۆر بە وردی سەرنجی هەڵسوکەوتی جەماوەرەکەی دابوو و زۆر لەوە خۆشحاڵ بوو کە خزم دۆستی و لەدڵەوە نزیکی لەواندا هەست پێدەکرد."

# ٢

# هەست پێکردنەکانی سەرەتا

ئەو دوانیوەڕۆیە کە ویلسۆن گەیشتە پاریس، بە دیداری ڕاوێژکاری هەرە ئەمیندار و جێی بڕوا خۆشحاڵ بۆوە. کۆلۆنێل ئێدوارد هاوس وەک ئەو دەوڵەمەندەی کە پێشتر بوو نەدەچوو. چکۆلە، زەردهەڵگەڕاو، بێ تەکان کە زۆرجار لەبەر هۆی سەرمابردوویەتی پەتوویەکی بە سەر لاق و قولی خۆی دا دەدا، کشمۆڵەی دەکردو دادەنیشت. دروست لەو کاتەیدا کە کۆڕی ئاشتی خەریک بوو بەڕێوە دەچوو، بە هەڵامەتێکەوە هاتە خوارێ و نزیک بوو بمرێ. کەسێک گێڕایەوە کە هاوس بە دەنگێکی نەرم و نیان کەوتە قسە و دەستە نەرم و ناسکەکانی خستە جموجوڵ وەک بڵێی دەیانهەوێ شتێکیان پێ هەڵگرێت. ئەو هەموو کاتێک بێدەنگ، ژیربێژ و کەیفخۆش بوو.٣٩ خەڵک زۆر جار دەکەوتنەوە بیری قەشەگەورەکانی فەڕەنسەیی ڕابردوو، لەوانەیە بڵێین مازارین.

ئەو لەڕاستیدا کۆلۆنیل نەبوو؛ ئەوە تەنیا نازناوێک بوو بۆ ڕێزلێنان. ئەو هەرگیز لەشەڕدا بەشداری نەکردبوو بەڵام زانیاریەکی باشی سەبارەت بە شەڕ و شۆڕ هەبوو. تێگزاز لە سەردەمی منداڵی ئەودا جیهانێک بوو کە هەر لە یەکەمین بێ ڕێزی و بێ حورمەتی بە یەک کردن دا تفەنگیان لە یەک ڕاست دەکردەوە. هاوس کاتێکە تەمەنی سێ ساڵان بوو لە ئەسپ سواری و تیرەندازیدا شارەزا بوو. برایەکی لە شەڕەتفەنگی منداڵانەدا لایەک لە دەموچاوی ڕۆیشتبوو؛ یەکی تریان لەسەر جۆلانێ[سێرک] کەوتبوە خوارێ و مردبوو. دواتر هاوسیش تووشی کارەساتێک هاتبوو کاتێکە لەسەر تەنافێک کەوتبووە خوارێ و کەوتبوو بە سەر دەستی خۆیدا. قەت ئەو برینەی سارێژ نەبۆوە و هەر لە گەڵی بوو. چونکە لەباری جەستەییەوە قەت دەرەقەتی ئەم و ئەو نەدەهات، فێرببوو کە لەباری دەروونی و سایکۆلۆجیەوە ئەم و ئەوی ببەزێنێ. ژیاننامەنووسێک لە زمانی ئەوەوە گێڕابوویەوە کە :" من عادەتم وابوو کە کوڕان بە شەڕ دادەم تا بزانم چ دەکەن، و دواتر هەوڵم دەدا دووبارە یەکیان خەمەوە"..٤٠

ئەو لە ناسین و خوێندنەوەی مێشکی مرۆڤەکاندا بەڕاستی مامۆستا بوو. هەرکەس کە جارێک چاوی پێکەوتایە و دانیشتنی لە گەڵ هەبایە هەستی بە هاوسۆزیبوون و لەدڵەوەنزیکی تێدا دەکرد. کوڕی یەکێک لە دوژمنەکانی ئەو سەبارەت بە ئەو وتبووی " تەنانەت کاتێکە دەیهەوێ سەریشت بڕێ هەست دەکەی کە هاوڕێیەکی گیانی گیانیە." هاوس عاشقی دەسەڵات و سیاسەت بوو، بەتایبەت کاتێکە دوور لە چاوان خەبات و تێکۆشانی دەکرد. لە پاریس بەیکێر ناوی نابوو " کونی گرێپووچکەیەک کە دەبوایە زۆربەی ڕووداوە گەورەکان لەوێوە تێپەڕ بوونایە." بە دەگمەن ملی بە وت و ویژ دەدا و قەت وەختی ڕەسمی ڕاندەدەگەیاند. هەڵبەت، ئەمە ببوو بە هۆی ئەوە کە ئەم و ئەو بە چڕی لەسەری بکۆڵنەوە. زۆرجار بۆ خۆی دەیوت کە تەنیا مەبەستی ئەو ئەوەیە کە بە کەڵک و بەکارهاتوو بێت. هەرچەند، لە یادداشتنامەکەی خۆیدا بە وردبینیەوە سەرنجی دەدا بەو خەڵکە کۆڵنەدەر و بەهێزانەی کە پشت سەری یەک ڕیزیان دەبەست تا چاویان بە ئەو بکەوێت. ئەو هەروەها گرنگ نەبوو کە چۆن بێ هەموو پێداهەڵکوتانێکی وەر دەگرت.٤١

ئەو وەکوو زۆربەی باشووریەکانی هاوڕەگەزی خۆی دیموکڕات بوو، بەڵام سەر بە لایەنی لیبراڵ، پارتی پێشکەوتووخواز بوو. کاتێک ویلسۆن هاتە نێو دنیای سیاسەتەوە، هاوس، کە پێشتر لە سیاسەتی تێگزازدا خاوەن کەسایەتیەکی تایبەت بوو، ئەو کەسەی دیبۆوە کە دەیتوانی کاری لەگەڵ بکا. ئەم دوو کەسایەتیە بۆ یەکەمین جار لەساڵی ١٩١٩ دا چاویان بە یەک کەوت، ئەو کاتەی کە ویلسۆن خەریک بوو بۆ وەدەست گرتنی ئەرکی سەرۆک کۆماری خۆی ساز دەکرد. دواتر هاوس کەوتەوە یادی ئەو ساڵانەی کە دۆستایەتیان هەر بە یەکجاری براوەوە " هەر لە سەرەتاوە پێوەندی نێوان ئێمە نزیک و برایانە بوو، هەر لە سەرەتاوە دڵ و مێشکمان کەڵکاڵەی یەکتری دەکرد." ئەو بە ویلسۆن سۆز و خۆشەویستی بێ بڕانەوەی دەبەخشی کە پێویستی پێی بوو، و ویلسۆن قودرەتی پێ دەبەخشی. کاتێکە یەکەم ژنی ماڵ ئاوایی کرد، ویلسۆن زیاتر لە جاران پشتی بە هاوس بەست. لە ساڵی ١٩١٥دا بۆ خۆی نووسیویەتی: " تۆ تەنیا کەسێکی لەم جیهانەدا کە من دەتوانم هەموو شتێکی لەلا بدرکێنم. لای هەندێک کەس شتيَک دەڵێم و لای کەسانی تر شتيَکی تر بەڵام لای تۆ یەکسەر مێشکم دادەچۆڕێنم." کاتێک دووهەمین کەس خاتوو ویلسۆن هاتە سەر شانۆ، بە وردیەوە دەیڕوانیە هاوس، چاوەکانی بەخیلی لێدەباری.٤٢

کاتێک شەڕ دەستی پێکرد، ویلسۆن لە هەوڵ و تەقەلایەکی بێدەرەنجامدا بۆ مەبەستی ڕاگرتنی شەڕ ، هاوسی ڕەوانەی پایتەختەکانی ئەورووپای کرد؛ کاتێک شەڕ کۆتایی پێهات، بۆ مەبەستی وتوویژکردن لەسەر مەرجەکانی ئاگربەس ئەوی حەواڵەی پاریس کرد. ویلسۆن پێیوت: " هیچ شتێکم پێ

ڕانەگەیاندووی، چونکە هەست دەکەم زانیاری تەواوت هەیە لەسەر ئەوەی کە دەبێ بیکەیت." هاوس لە ناخی دڵەوە باوەڕی بەوە هەبوو کە دیپلۆماسی نوێی ویلسۆن باشترین هیوای جیهانیان بوو. ئەو وەک بیرۆکەیەکی نایاب و سەرنجڕاکێش سەیری کۆمەڵەی گەلانی دەکرد. هەروەها ئەو لای وابوو کە لە گەیشتن بە ئامانجە هاوبەشەکانیان دەتوانێ باشتر لە ویلسۆن تێ بکۆشێت. لەهەر شوێنێک کە سەرۆک کۆمار خەیاڵی و توندڕەو بوایە، هاوس، دەبوو بە چەسپێنەرێک، بە سەر تەکان دانێک لێرە، شان جووڵانێک لەوێ، یان بە جەختکردنەوەیەک، سەرەتا بە ڕاگەیاندنی بەڵێنیەک بە ئەم و دواتریش بە ئەو، بە هەمواركردنی جیاوازیەکان و بەرەوپێشبردنی کارەکان. ئەوەی ڕاستی بێت ئەو حەزی نەدەکرد ویلسۆن لە کۆڕی ئاشتیدا بەشدار بێت. ئەفسەری وەفاداری پلە یەکی ئەو، چەند مانگ دواتر، بڕیاری دا بە شێوەیەکی مەنهەجی و ڕێکوپێک لە لیستێکدا هەڵەکانی ویلسۆن ڕیز بکات: خولق و خووی هەڵشاخین؛ نەحەواوەیی و ناسازگاری؛ ناقۆڵابوونی ئەو لە وتووێژەکاندا و مێشکی "یەک لایەنەی" ئەو.٤٣

کلێمێنجوو هاوسی یەکجار خۆش دەویست، بەشێکی لەبەرهۆی ئەوە کە دڵی خۆش دەکرد، بەشێکی تر بەهۆی ئەوە کە ئەو شارەزایەکی باشی بە سەر نیگەرانی و دڵەڕاوکێکانی فەرەنسەدا هەبوو. کلێمێنجوو پێی ڕاگەیاندبوو کە "من دەتوانم لە گەڵ تۆ هەڵ کەم. تۆ پیاوێکی کردەوەییت. من لە تۆ حاڵی دەبم، بەڵام قسەکردن لەگەڵ ویلسۆن وەک قسەکردن لەگەڵ عیسا مەسیح دەچێ!" لیۆد جۆرج سارد تر بوو: هاوس لەزۆربەی پیاوان —یان تەنانەت ژنان-ی ناو ئاوە تەنکەکان کە لێرە و لەوێ لە ئۆقیانووسە گەورەکان بەدی دەکرێن، وردبینتر و تێگەیشتووتر بوو." بە بۆچوونی لیۆد جۆرج، پیاوێکی خوێنشیرین بەڵام سنووردار-" هەر لە سەرەتاوە فرۆشیار بووە نەوەک بەرهەمهێنەر." هاوس دەبوو بە باڵوێزێکی باش نەوەک هەرگیز وەزیری دەرەوە. لیۆد جۆرج لەڕووی دڵسۆزیەوە هاتە سەر ئەم ئەنجامە کە " لەوانەیە بە قازانجی خۆی بوایە ئەگەر بەو ڕادەیە کە خۆی بۆ خۆی دانا بوو دۆدە و چارداوەڕوو نەبوایە." هاوس نەیدەتوانی لە گەڵ لیۆد جۆرج هەڵ بکات،. " ناجسن و توخسێکی وا کە هەر تاوێ لە سەر قسەیەکە و شتێکی بە خەیاڵ دادێت. هیچ زانیاریەکی ئەوتۆی سەبارەت بەو پرسیارانەی کە لە گەڵیان ڕووبەڕوو دەبێتەوە نیە." بەڵام لیۆد جۆرج تێبینیەکی باشی هەبوو لە سەر ئامانجەکان و ئاکامەکان. هاوس، کە لای وابوو هەر نەحەوانەوەیەک دەتوانێ گەشە بکات و زیاتر بێت، وابیری نەدەکردەوە. ڕای بەیکێر سەبارەت بە ئەو ئاوا بوو کە " ئەو قایلکارێکی زۆر سەیرە بەڵام لە گەڵ سووچ و تاوانەکانی چاکە خوازی خۆی چون ئەو لە سەر کێشە و ناڕەحەتیە چکۆلەکان تا دەگاتە یاسا گشتیە کان سازشی دەکرد." هاوس لەوەپێش ئەمەی لە ماوەی وت و وێژەکانی ئاگربەسدا ئەنجام دابوو.٤٤

شەڕی گەورە بە زنجیرەیەک هەڵەوە دەستی پێکردبوو و کۆتاییەکەشی پشێوی و ئاڵۆزی بوو. هاوپەیمانان (و هاوکاری ئەوان ولاتە یەکگرتووەکان) کاتێک کەوتن بەسەر سەرکەوتندا چاوەڕوانی ئەوەیان نەدەکرد. لە هاوینی ساڵی ١٩١٨دا لە نزیکەوە هەست بەوە دەکرا کە مەجارستان-ئوتریش خەریکە بەرەو نابوودی دەچێ، بەڵام ئەڵمان هێشتا بەهێزی پێوە دیار بوو. هاوپەیمانان لانی کەم بۆ ساڵێکی تر پلانی شەڕیان دارِشت. لەکۆتایی ئۆکتۆبردا هاوپەیمانانی ئەڵمان خەریک بوون بەرەو نابوودی دەچوون و بۆیە داوای ئاگربەسیان کرد، ئەرتەشی ئەڵمان کەوتە ڕێ بەرەو سنوورەکانی خۆی، ئەڵمان بۆ خۆی لە ناوەوە تووشی هاتبوو بە سەرهەڵدانی شۆڕشگێڕانە. ئاگربەس لە گەڵ ئەڵمان کە لە هەموویان گرنگتر و لە هەمووشیان زیاتر مەیلی بە گفت و گۆ هەبوو، لە دانیشتنێکی سێ-قۆڵی دا لە نێوان حکوومەتی نوێی ئەڵمان لە بەرلین، شۆڕای شەڕی عالی هاوپەیمانی لە پاریس و ویلسۆن لە واشینگتۆن بەڕێوە چوو. هاوس، وەک نوێنەری تایبەتی ویلسۆن، کلیلی پێوەندی نێوان ئەوان بوو. ئەڵمانیەکان کە لێکیان دابۆوە بۆ ئەوەی کە باشترین دەرفەتیان هەبێت یا بە مەرجەکانی میانڕەوانەی ئاشتی بگەن بڕیاریان دا خۆ بکەن بە قوربان و بە سەددەقەی ویلسۆن، و لە سەر بنەمای چاردە خاڵەکە داوای ئاگربەسیان کرد. ویلسۆن کە خولیای ئەوە بوو بە شێوەیەک هاوپەیمانانی تاڕادەیەک بێ خەیاڵی خۆی بەرەو ئاستێک بەرێ کە یاساکانی ئەو پەسەند بکەن، لە چەند خاڵ و سەرنجی گشتیدا لە گەڵیان ڕێکەوت.

ئورووپایەکان لەمە قەڵس بوون. جگە لەمە، ئەوان بە بێ چاکسازی و هەموارکردن هەرگیز خۆیان بۆ پەسەندکردنی چاردە خاڵەکە ساز نەکردبوو. فەڕەنسەیەکان دەیانەویست دڵنیابن لەوەیکە لەو خەسارە گەورەی کە لە لایەن هێرشی ئەڵمانەوە بە سەر ولاتەکەیاندا هاتبوو قەرەبوو کرێنەوە. بەریتانیەکان نە دەکرا مل بدەن بە خاڵی تایبەت بە ئازادکردنی دەریاکان، چون ئەوە ڕێگەی نەدەدا بە ئەوان گەمارۆی دەریایی وەک چەکێک بۆ شەڕ کردن لە بەرابەر دوژمنەکانیان بەکاربێنن. لە زنجیرەیەک دانیشتنی کۆتایی لە پاریس، هاوس لە گەڵ مەرجەکانی هاوپەیمانیدا ڕێکەوت و ملی پێیان دا، و بەم شێوەیە چاردە خاڵەکە خۆش کرا و چاکسازی لە سەر ئەنجام درا تا ڕێگە بدا بەو شتەی کە دواتر ناوی نا قەرەبووی خەسارەت لە لایەن ئەڵمانەوە و بە وتووێژکردن لەسەر ئازادی کورسی لە خودی کۆڕی ئاشتیدا. بێجگە لەمانە، مەرجەکانی نیزامی ئاگربەس، کە نەک تەنیا داوای چۆڵکردنی ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی فەڕەنسە و بلژیکی دەکرد بەڵکوو پاشەکشێ کردنی هێزەکانی ئەڵمان لە لێوی ڕۆژئاوایی خودی ئەڵمان کە ڕێگایەکی دووردرێژی بەرەو چەککردنی ئەڵمان دەپێوا، شتێکە فەڕەنسا لە خوای ئەویست و ئارەزووی دەکرد.٤٥

شێوازێک ئاگربەسی تێیدا هاتە ئاراوە کەشوهەوایەکی گونجاوی بۆ تۆمەتبارکردنی یەکتر لەدواییدا خۆشکرد. ئەڵمانیەکان توانیان بڵێن کە ئەوان تەنیا لەسەر بنەمای چاردە خاڵە سەرەکیەکە ئەوەیان قەبووڵکردووە و بۆیە مەرجەکانی دواتری ئاشتی هەتابڵێ نایاساییین. و ویلسۆن و لایەنگرەکانی توانیان ئەوروپایە ڕاڕاکان لەبەر هۆی تواندنەوەی ئارەزوە پاکوخاوێنەکانی دیپلۆماسی نوێ سەرلۆمە بکەن.

کاتێک هاوس و ویلسۆن یەکەمین وتووێژی خۆیان لە پاریس لەدوا نیوەڕۆی ١٤ی دێسامبەری ساڵی ١٩١٨ دا بەڕێوەبرد، تازە لە ئاواتەکانی ئەورووپی کەوتبوونە گومانەوە. هەرچەند بڕیار نەبوو کۆڕی ئاشتی تا چەند هەفتەیەکی تر دەست پێبکا، مناورەکردن دەستی پێکردبوو. کلیمینجوو پێشتر بە بەریتانیایەکانی پێشنیار کردبوو کە لەسەر مەرجەکانی ئاشتی لەگەڵ ڕێکەوتنێکی گشتیدا ڕووبەڕوو دەبنەوە، و ئەوروپایەکان، بۆ وێنە ئیتالیەکان، لەسەرتای مانگدا لە لەندەن کۆبببوونەوە. کلیمینجوو ژیرانە مافی بیمەی وەرگرت. ئەو لەسەر تەختەی نەخۆشیەکەی چاوی کەوت بە هاوس تا دڵنیای کاتەوە کە دانیشتنەکانی لەندەن هیچ بایەخێکیان نەبووە. ئەو بۆ خۆی دەڕۆیی تەنیا بەهۆی ئەوەوە کە بەشکوو ئەمە لە هەڵبژاردنەکەی داهاتوودا یارمەتی لیۆد جۆرج بدا. هەروەک دواتر دەرکەوت، لە بەینی ناڕەزایەتیەکانی سەر داواکاریەکانی ناوچەیی ئیتالیا لە ئاندریاتیک و مشتومڕی نێوان فەڕەنساو بەریتانیا لەسەر بەخشینی ئیمپراتۆری عوسمانی، دانیشتنەکان نەیانتوانی لێکچوون و لێکنزیکبوونەوەیەکی هاوبەشی ئەورووپی بەرهەم بێنن. هەر سێ زلهێزە ئەوروپایەکە لە دڵەڕاوکێ و نیگەرانی دابوون، حەزیان نەدەکرد ویلسۆن لەوە بگەیەنن کە بەرلەوەی ئەو بێتە بەرەوە ئەوان لە هەوڵی جێبەجێکردنی کاروبارەکان دابوون.٤٦

هاوس کە لەگەڵ ئەو بۆچوونەی ویلسۆن دابوو کە وڵاتە یەکگرتوەکان دەیەویست لەئاشتیدا سەرپشک بێت، بەبێ هیچ بەڵگە و بیانوویەک لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە کلیمینجوو لەوەدەچوو لە لیۆد جۆرج ئەقڵانیتر بیر بکاتەوە. ویلسۆن بە باشی دەزانی، یەکەم جار لە گەڵ کلیمینجۆ کۆبێتەوە و دانیشتنی هەبێت. سیاسەتمەداری ڕاڕای پیر بە بێ دەنگی گوێی شلکردبوو لەکاتێکدا ویلسۆن زۆربەی باسەکەی بۆ خۆی دانابوو، و تەنیا کاتێک باسەکەی دەپچڕی کە پێوەندی بوو بە پەسەندکردنی کۆمەڵەی گەلانەوە. ویلسۆن زۆر چاک کەوتبووە ژێر کاریگەریەوە، و هاوس، کە هیوادار بوو فەڕەنسە و وڵاتەیەکگرتوەکان دژ بە بەریتانیا بەرەیەکی هاوبەش پێک بێنن، زۆر خۆشحاڵ بوو. ویلسۆنەکان ڕۆژی کریسمەسیان لەگەڵ ژنەڕاڵ جان پێرشینگ لەبارەگا گشتیەکانی ئەمەریکی لە پاریس تێپەڕاند و دواتر بەرەو لەندەن وەڕێ کەوتن.٤٧

لە بەریتانیا، ویلسۆن بۆ جارێکی تر لەلایەن جەماوەرێکی زۆر شێت و شەیداوە پێشوازی لێکرا، بەڵام وتووێژە خۆیەکانی ئەو لە گەڵ ڕێبەرانی بەریتانی لەسەرەتاوە بە جوانی نەدەچووە پێشێ. سەرۆک کۆمار پێی خۆش بوو لەوێدا شێوازێکی فەرمی بەخۆیەوە بگرێت، بە تووڕەیەوە ڕایگەیاند کە لیۆد جۆرج و وەزیرانی پلەباڵای بەریتانی بە مەبەستی بەخێرهاتنی ئەو هرووژمیان نەکردبووە فەرەنسە و هەڵبژاردنی گشتی بەریتانیا بە مانای ئەوە بووە کە دەستپێکی کۆڕی ئاشتی دەبوایە یەک خرابایە. ویلسۆن، وەکوو زۆربەی ئەمریکیەکان، سەبارەت بە بەریتانیای گەورە هەڵوێستێکی کەوتنە سەر دووڕێی هەبوو، لە لایەکەوە ئاگاداری قەرزداربوونی وڵاتەیەکگرتوەکان بوو بە داب و نەریتە لیبرالە مەزنەکانی ئەو وڵاتە و لە لایەکیترەوە چاوی بەخیلی و حەسادەتی بڕیبوە هێز و دەسەڵاتی ئەو وڵاتە. ویلسۆن بە ئاندری تاردیۆ، هاوکاری نزیکی کلیمینجۆی وت کە " ئەگەر ئینگلیز لە درێژەدان بە دەسترۆیی دەریایی خۆی پێداگری بکردایە، وڵاتەیەکگرتوەکان دەیتوانی فێری بکا کە چۆن هێزێکی دەریایی دامەزرێنێت!" لە جەشنێکی خواردنەوە و خۆشیدا لە کۆشکی باکینگهام، ویلسۆن ڕشکاوانە بە مەقامێکی ڕەسمی بەریتانی (کە هەرخێرا تێبینیەکانی بۆ باڵادەستەکانی خۆی گێڕابۆوە) ڕاگەیاندبوو کە" ئێمەیەکە دێین بۆ ئێرە بۆتان نیە پێمان بڵێن ئامۆزا یان برا، ئێمە هیچی ئێوە نین." لە درێژەی باسەکەیدا دەڵێ کە باس کردن لە جیهانی ئانگلۆ-ساکسۆن شتێکی فریودەر و بەهەڵەبەرە چون زۆربەک لە ئەمەریکیەکان لە کولتوور و وڵاتانی ترەوە هاتوون؛ هەروەها زۆر حەساب کردن لە سەر ئەو ڕاستیە کە هەردوو نەتەوەکە بە زمانی ئینگلیزی دەدوێن شتێکی قۆڕ و بێ مانایە. " نا، تەنیا دوو شتە کە دەتوانێ پێوەندیەکانی وڵاتی ئێوە و وڵاتی مـن دامەزرێنێت و درێژەی بداتێ: ئەوانیش بریتین لە کۆمەڵێک شتی ئایدیال و بەرژەوەندی دوولایەنە." کاتێکە ویلسۆن وڵامی بەخۆشی خواردنەوەیەک لە لایەن شاوە بۆ هێزەکانی ئەمەریکی و لە گەڵ پێداهەڵکوتنێکی هاوچەشن بە سەر بەریتانیەکاندا نەداوە بەریتانیەکان هەر بە یەکجاری شڵەژان. لیۆد جۆرج بەم شێوە باسی کرد کە " هەست بە هەبوونی هیچ هێمایەک لە دۆستایەتی یان لە خۆشحاڵ بوون لە چاوپێکەوتنی کەسانێک نەدەکرا کە لە خەباتێکی هاوبەشدا هاوڕێ و دۆستی یەکتر بوون و لە مەترسیەکی هاوبەشدا بە سەختی خۆیان دزیبۆوە و خۆیان دەرباز کردبوو."٤٨

لیۆد جۆرج، کە هەستی بە پێویست بوونی پێوەندی برایانە لە گەڵ وڵاتەیەکگرتوەکان کردبوو، بۆ ڕاکێشانی دڵی ویلسۆن بۆ لای خۆی وەخۆ کەوتبوو. یەکەمین وت و وێژی خۆیی ئەوان هیوا و هۆمێدی تێدا بوو. لیۆد جۆرج بە خەیاڵێکی ئاسوودەوە بۆ هاوکارەکانی گوزارشی لەوە دابوو کە ویلسۆن وادیار بوو کە لە بەرانبەر دانووستان کردن لەسەر ئەو کێشانەی کە

بەریتانیا بە گرنگی دەزانی، وەکوو ئازادبوونی دەریاکان، و چارەنووسی کۆلۆنیەکانی[وڵاتانی بندەستی] ئەڵمان، کراوە بێت. ویلسۆن هەستی بەوە کردبوو کە دڵەڕاوکێی سەرەکی ئەو کۆمەڵەی گەلان بوو، کۆمەڵەیەک کە ئەو دەیەویست بە کردنەوەی کۆڕی ئاشتی تێیدا باس و خواستی لە سەر بکات. لیۆد جۆرج ڕەزایەتی دابوو و پێی خۆش بوو. ئەو وتبووی کە ئەوە مامەڵەکردن لە گەڵ بابەتەکانی تر زۆر ئاسانتر دەکاتەوە. هەروەها هەردوو ڕێبەر لە سەر ئەوەی کە لە کۆڕی ئاشتیدا دەبێ بە چ ئاستێک دا بڕۆن باس و خواستیان ئاڵ و گۆڕ کردبوو. دیار بوو کە ئەوان ڕەوتی ئاسایان دەگرتە بەر و لە گەڵ ئەڵمان و گەلانی تری شکست خواردوو دادەنیشن و گرێبەستەکان دێننە ئاراوە.٤٩

مەشق و ڕاهێنانی ڕابردوو هەڵگری ڕێنوێنیەکی کەم و نادیار بوو بۆ ئەو دەستووره نوێیەی کە ویلسۆن دەیویست. مافەکانی سەرکەوتن و وڵاتگیری لە گەڵ مێژووی ئورووپاییدا زۆر ئاڵۆز و سەیر پێکەوە گرێیان خواردبوو، و شەڕە کانی ڕابردوو- بۆ وێنە شەڕەکانی ناپلۆئۆنی- بە هاتنە دی ئەو خواستانەی کە سەرکەوتووەکان هەیانبوو دەهاتنە ئاراوە، واتە زەوی و زار یان کەلەپووری هۆنەری. بێجگە لەمە، شکست خواردوەکان چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد کە بۆ خەرج و مەخارجی شەڕ دەبوایە خەسارەتیان بدایەتەوە و جار و بار دەبوایە قەرەبووی ماڵوێرانیەکانیان بکردایەتەوە. بەڵام ئایا ئەوان هەر هەموویان لەم شەڕەی دواییدا پشتیان لەوە هەڵ نەکرد؟ هەردوو لا لە سەر ئاشتیەکی عادڵانە باس و خواستیان ئاڵ و گۆڕ کردبوو بەبێ هیچ داگیرکاریەک یان دانەدەمی زەوی و زارێک بۆ سەر وڵاتی خۆیان. هەردوولا دەیانەویست بە ڕاکێشانی مافەکانی هەڵبژاردنی خەڵک بیانهێننە سەر ئەو قەناعەتەی کە بە تاسە و تین و دەنگ و هەرایەکی زیاتر لە دەسەڵاتدارانی ناوەندی حاکمانی خۆیان هەڵبژێرن. و تەنانەت بەرلەوەی وڵاتەیەکگرتوەکان لە شەڕەوە بگلێت، دەستەواژەگەلی وەکوو "دیموکراسی" و "یەکسانی" ئامانجەکانی شەڕی هاوپەیمانی تیرەباران کردبوو. ویلسۆن دەستی بە سەر ئاجێندای هاوپەیمانانندا گرتبوو و کردبووی بە کۆمەڵێک قەول و بەڵێنی بۆ بەدی هێنانی جیهانێکی باشتر. بەڵێ ڕاستە، ئەو بە سەرەوتوەکانی شەڕ ڕێگەی دابوو هەندێک قەرەبووکردنەوەیان بۆ بکرێت: فەرەنسە پارێزگاکانی لەدەستچووی بۆ بگەڕێتەوە و ئەڵمانیش قەرەبووی ئەو خەسارەتە بکا کە بە سەر بلژیکیدا هێنا. هەرچەند دەبێ بڵێین کە داواکاری فەرەنسەیەکان زیاتر بوو: تا ئەو جێی دەکرێ زەوی و زار لە ئەڵمانیەکان، گارانتی کردنی هێمنایەتی لەبەرانبەر هەر هێرشێک دا. بەریتانیەکان داوای هەندێ لە ناوچە بن دەستەکانی تایبەت بە ئەڵمانیان دەکرد.

ئیتالیەکان داوای بەشێک لە ناوچەکانی باڵکانیان دەکرد، و ژاپۆنیەکانیش بەشێک لە وڵاتی چین. ئایا ئەوە لە دەستەواژەی دیپلۆماسی نوێدا ڕوون کراوەتە؟ دواتر هەمووی نەتەوەکان لەوێ بوون، هەندێکیان تازە دامەزرابوون بەڵام هەندێکیان، لە ناوەندی ئورووپادا، هێشتا ئاوڵەمە بوون و پێ نەگەیشتبوون و کەس نەبوو گوێیان بۆ بگرێت. و خەڵکانی وڵاتانی بن دەست، داواکارانی تایبەت بە مافی ژنان، نوێنەرانی پارتی کرێکاری، ڕەشپێستەکانی ئەمەریکی، ڕێبەرانی ئایینی، مرۆڤ دۆستان. بە بەراورد لە گەڵ ئەمە کۆنگرێسی ڤییەن زۆر سادە بوو.

هەر لە یەکەمین وت و وێژیاندا لە گەڵ ویلسۆن، هەم کلیمینجوو و هەم لیۆد جۆرج ئاماژەیان بەوە کرد کە پێویستە هاوپەیمانان هەر لە کۆبوونەوەی سەرەتاییدا لە سەر تەوەری ئاشتی هەڵوێستی خۆیان جیاکەنەوە. ویلسۆن هیچی لەدەست نەدەهات. ئەگەر ئەوان پێشتر مەرجەکانی ئاشتیان دیاری کردبێت، ئەوا کۆڕی گشتی ئاشتی فێڵ و تەڵەکی تیا دەبوو. بە واتایەکی تر، ئەو ئامادەیی ئەوەی هەبوو کە بە مەبەستی کارکردن لە سەر هەڵوێستێکی هاوبەشی هاوپەیمانی وت و وێژی نافەرمی بەڕێوە ببات. لیۆد جۆرج گوزارشی ئەمەی بۆ هاوکارەکانی ڕاگەیاندبوو کە " لە ڕاستیدا هەر هەمان شت هاتە دی، بەڵام سەرۆک کۆمار لە سەر هەڵوێستی خۆی سوور بوو و پێداگری دەکرد. ڕێکەوتبوون لە سەر ئەوەی کە لە پاریس چاویان بە یەک دەکەوێت، وتووێژە سەرەتاییەکانیان- ئەوپەڕی تا هەفتەیەک- بەڕێوە دەبەن و دواتریش لە گەڵ دوژمن دادەنیشن. زۆرلەوانەیە ویلسۆن، وەک خۆشی وای بۆ دەچوو، لەو خاڵەدا بۆ وڵاتەیەکگرتووەکان بگەڕێتەوە..ە

دوای ئاشنابوونەکانی سەرەتایی لەگەڵ پیاوانێک کە بڕیار بوو ببن بە نزیکترین هاوکارانی ئەو، ویلسۆن لە درێژەی سەفەرەکەیدا چوو بۆ ئیتالیا، بۆ بەخێرهێنانێکی گەرموگوڕتر. بەڵام هاتوهاوارەکانی خۆشی، میوانداریتیەکانی دەوڵەت، دانیشتوانی تایبەت، نەیاندەتوانی ئەم ڕاستیە بشارنەوە کە کات بە سەر چووە. ئەو دەستی کرد بە پرسیار کردن لە خۆی کە تۆ بڵێی ئەمە بە دەستی ئەنقەست نەبێ. ئەو لای وابوو کە خەڵک ئاشتیان دەویست. وێدەچوو کە حاکمان و دەسەڵات دارانی ئەوان بە لاق ڕایانکێشابێتن، کێ دەزانێ لەپێناو کام ئاوات و ئامانجی گڵاو. حکوومەتی فەرەنسە هەوڵی دا پلانی سەفەرێک بۆ ئەو بۆ ناوچە جەنگیەکان دارێژێ. بە تووڕەییەوە ڕەدی کردەوە. بۆ کۆڕێکی بچووک لە هاوڕێیانی نزیکی گێڕایەوە کە " ئەوان لە هەوڵی ئەوەدا بوون کە زەخت کەنە سەر ئەو تا ناوچە کارەساتاویەکان ببینێ تا بەڵکوو سوور ببینێ و سەمای لەبیرچێتەوە و بکەوێتە ژێر کاریگەری حکوومەتانی ئینگلیز، فەرەنسە، و ئیتالیا." نەدەکرا بەم شێوەیە کاری لە سەر بکرێت؛ پێویستە ئاشتی بە ئارامی و لە سەرەخۆ دوور لە هەڵچوون و توندووتیژی بێتە ئاراوە. "

هەرچەند فەڕەنسا کونی تێببوو، بەڵام لە قۆناخی کۆتاییدا گۆڕانی بە سەر نەدەهات."٥١ فەڕەنسییەکان لەوەی کە وڵامی نەیان پێدرابۆوە زۆر عاجز بوون و کاتێکە لە کۆتاییدا لە مانگی مارسدا بە پەلە سەرێکی لە فەڕەنسە هەڵێنابوو هێور نەبوونەو و هەر لێی ناڕەحەت بوون. ویلسۆن خەریک بوو بەم ئەنجامە دەگەیی کە ئەم و فەڕەنسەییەکان لە بۆچوونەکانیاندا ئەوندە نزیک نین کە هاوس ئەمی هان دا بوو کە وابێ. حکوومەتی فەڕەنسە ئەجێندایەکی ئاڵۆزی دانا تا ئەو تەوەرانەی کە بە پێی پلەی گرنگایەتی ڕیزکرابوون بڕیاریان لە سەر بدرێت و لەو لیستەدا کۆمەڵەی گەلان خرابووە خوارخوارەوە. پائۆل کامبۆن، باڵوێزی زۆر بە ئەزموونی فەڕەنسەیی لە لەندەن، بە دیپلۆماتێکی بەریتانی ڕاگەیاندبوو کە " کاری سەرەکی کۆڕی ئاشتی ئەوە بوو کە شەڕ لە گەڵ ئەڵمان نزیک بکاتەوە." کۆمەڵەکە جۆرێ بوو کە دەکرا پەکی پێ بخرێتەوە و دواخرێت. زۆر لایەن لە دامەزراوەی فەرمی فەڕەنسەدا بیریان لە کۆمەڵەیەک دەکردەوە کە درێژەی هاوپەیمانی کاتی شەڕ بێت و ڕۆڵی سەرەکی بەهێزکردنی مەرجەکانی ئاشتی بگێڕێت. یاداشتێکی ناوخۆیی وتبووی کە هیچ قەی ناکا کە زۆربەی خەڵکی فەڕەنسە خەیاڵی و ئایدیالی بیردەکەنەوە: " ئەوە دەتوانێ یارمەتی ئێمە بات."کلیمینجو لای هەموان گوماندار دەهاتە بەرچاو. ڕۆژێک دوا ئەوەی کە ویلسۆن لە لەندەن وتاربێژی کردبوو و جەختی کردبۆوە لە سەر ئیمان و باوەڕی خۆی بەوە کە کۆمەڵەی گەلان باشترین ڕێگایە بۆ دەستەبەرکردنی ئاسایش و هێمنایەتی بۆ ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە، کلیمینجوو لە وەتاغی نوێنەراندا قسەی کردبوو. بەو هەرا و هۆریایەی ڕاگەیاند کە : "سیستەمێکی کۆنی هاوپەیمانی هەیە بە ناوی هاوسەنگی قودرەت- ئەم سیستەمە لە هاوپەیمانی، کە من هەرگیز دەست بەرداری نابم، بیرۆکەی ڕێنوێنی کەری من دەبێ لە کۆڕی ئاشتیدا. زۆر بە ناشیرینی، ئاماژەی بە *کاندۆری* ڕەسەنی ویلسۆن کردبوو، وشەیەک کە دەتوانێ دوو مانا لە خۆ بگرێ ڕاشکاوی و ڕاستگۆیی یان ساویلکەیی و هیچ نەزانی. (ئارشیڤی فەرمی گۆڕیبووی کردبووی بە *گراندۆر)*. شاندی نوێنەرایەتی ئەمەریکی وتاری کلیمینجووی وەک بەرەنگاریەک لێک دابۆوە.٥٢

لەو وتارە و لە ڕەنگدانەوەی ئەمەریکی بۆ ئەو وتارە تۆوێک چەنرا کە دواتر بوو بە تابلۆیەکی ترسێنەر و درێژخایەن، بە تایبەت لە وڵاتەیەکگرتوەکان. لە لایەکەوە، گالاهاد، پاک و بێ خەوش لە بیر و لە کردەوەدا، ڕۆشنکەرەوەی ڕێگا بۆ داهاتوویەکی پڕشنگ دار؛ لە لایەکی ترەوە، دێوێکی ڕەزاگرانی فەڕەنسەیی، دڵی ڕەشبۆوە بە ڕق و کینە، تەنیا شتێکە بە خەیاڵی دادەهات تۆڵە و خوێن بوو. لە لایەکەوە، ئاشتی و تەبایی؛ لە لایەکی ترەوە، شەڕ و شۆڕ. ئەمە چیرۆکێکی خۆش درووست دەکا و لای هیچ کام لەم پیاوانە خۆش نیە. هەرکیان لیبرال بوون بە بیر و باوەڕی گوماناوی

کۆنەپەرستانە لە گۆڕانکاری خێرا و بەپەلە. ئەوەی کە ئەوانی لێک جیا دەکردەوە ئەزموونی خۆیان و خۆڵق و خووی تایبەت بە خۆیان بوو. ویلسۆن لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە سرووشتی مرۆڤ هەر لە بنەڕەتەوە بە چاکە ڕا هاتووە. کلیمینجوو گومانی تایبەت بە خۆی هەبوو. ئەو، و ئوروپا، زۆر سەرکەوتوو بوون. کەرەتێکیان بە ویلسۆنی وتبوو کە " زەحمەت نەبێ لە ئێمە خراپ تێ مەگەن ئێمەش بە خۆڵق و غەریزەی ڕەسەن و ئاوات و خۆزگەی مەزن و پیرۆزەوە هاتووینەتە دنیاوە هەر بەوشێوەی کە بەرێزتان بە ڕەوانی و بە جوانی باسی دەکەن و لە سەری دەڕۆن. ئێمە بووین بە ئەو شتەی کە هەین چون بە دەستی قورسی گەردوونێک داڕێژراوین کە مەجبوورین تێیدا بژین. و تەنیا هۆی ئەوە کە زیندوو ماوینەتەوە ئەوەیە کە ئێمە چەپکێکی سەخت و لەبن نەهاتووین."ویلسۆن لە جیهانێکدا ژیابوو کە دیموکراسی هیچ مەترسیەکی لە سەر نەبوو. کلیمینجوو وتبووی کە " من لە جیهانێک ژیاوم کە کەش و هەوایەکی گونجاو بوو بۆ تەقە کردن لە دیموکراتێک." لە هەر شوێنێک کە ویلسۆن بەکارهێنانی زەخت و زۆری بە ئاکامێکی ناخۆش و سەرنەکەوتوو ناو دەبرد، کلیمینجوو زۆر جار بە سەرکەوتووی زانیبوو. ڕۆژێکیان لە کاتی نانی نیوەڕۆدا بە دۆستی لیۆد جۆرج، فرانسیس ستێڤێن سان، وتبووی کە " من هاتوومەتە سەر ئەو ئەنجامە کە زەخت و زۆر شتێکی باشە و لە جێی خۆی دەبێ بەکاربێت. ئەم جووجەڵەیە بۆ لە بەردەمی ئێمە دایە؟ چون هێزی ئەوتۆی نەبووە تا لە بەرانبەر ئەو کەسانەی کە ویستوویانە بیکووژن لە خۆی پارێزگاری کات. و شتێکی زۆر باشیشە.!" کلیمینجوو لە گەڵ کۆمەڵەکە دژایەتی نەبوو؛ زۆریش بەهای پێ نەدەدا. حەزی دەکرد هاریکاری زیاتری نێونەتەوەیی بدیایە، بەڵام مێژووی ئەم دواییانە ئەوەی سەلماند کە باشتر وایە باڕووتی گولەکان هەر بە وشکی هەڵگیرێن و تفەنگەکانیش لە سەر ساچمە بمێننەوە. لەمەدا ئەو بە ئیمان و باوەڕێکی قایمەوە ڕەنگدانەوەیەکی باشی هەبوو لە سەر ڕای گشتی فەڕەنسیەکان. کەسانێک کە هەتابڵێی بە گومانەوە دەیانڕوانیە ئەڵمان.٥٣

* * * *

بەڵام هەفتەی دووهەمی ژانویە ویلسۆن گەڕابۆوە بۆ پاریس، چاوەڕوانی ئەوە بوو کە کۆبوونەوەی سەرەکی دەست پێبکات. ئەو لە هوتێل مۆرات، لە ماڵێکی تایبەتدا کە لەلایەن حکوومەتەوە دابین کرابوو، ژیانێکی خۆشی هەبوو و خۆشی ڕادەبوارد. (یەکێک لە قسە خۆشەکانی ویلسۆن ئەمە بوو کە ئەمەریکیەکان لە ڕێگای دانی وام بە فەڕەنسا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ خەرجی ئەمانە دەدەن.) خاوەنی ئەم هۆتێلە وەچەکانی سەربازی گەورە جواچیم مۆرات بوون، کە

لەگەڵ یەکێک لە خوشکەکانی ناپلۆئۆن ژیانی هاوبەشی پێک هێنابوو، و لەلایەن ئەوانەوە بە حکوومەتی فەڕەنسە بەکرێ درابوو. دواتر کاتێک پێوەندیەکانی نێوان فەڕەنسا و وڵاتە یەکگرتووەکان بەرەو ئاڵۆزی چوو، خاتوون مۆرات داوای گەڕانەوەی دووبارەی کردبوو. ئاهەنگی سەرۆک کۆماری، کە پزیشکی تایبەتی ویلسۆن، ئەدمیرل کاری تی.گرەیسۆن، و ئەمینداری کۆمەڵایەتی خاتوو ویلسۆنی لە خۆ گرتبوو، زۆر بە ناخۆشی لە وەتاغی سارد و کەم نوور بەڕێوە چوو، پڕبوو لە گەنجینەی تایبەت بە ڕابردوو کە بە ئاوێنەی زۆر گەورە گەورە بێ ڕانەوە ڕەنگ دەدرانەوە. ڕۆژنامەنووسێکی بەریتانی کە هاتبوو تا لەگەڵ سەرۆک کۆمار وتوویژ بکات ئەوی لە دەستێک جلوبەرگی بۆری فکانێل دی کە لەسەر سەندەڵیەکی بەشکۆی ئیمپراتۆریدا بە هەڵۆیەکی گەورە لە جنسی بڕۆنز لە سەرووی سەریەوە دانیشتوە.٥٤

کەسانی تر لە شاندی نوێنەرایەتی ئەمەریکی تۆزێک لەو لاترەوە لە هۆتێل گریلۆن نیشتەجێ کران، ئەوانیش زۆر چاک ڕایان بوارد. پرۆفیسۆرێکی ئەمەریکی بۆ ژنەکەی نووسیبوو کە "وەتاغێکی قەبەیان بۆ من دیاری کردبوو، بنمیچی بەرز، تابلۆی سپی، شوومینە، حەمامی گەورە و قەبە، تەختی ڕاحەت و خۆش، هەمووی ڕازاوە بە گوڵەسوورەی قیمەت گرانی کۆن." ئەمەریکیەکان لە چێشت و خواردەمەنی ئەوێ حەزیان دەکرد، خزمەتگوزاری ورد و بە سەرنجی ئەوێ کاری تێکردبوون و بە بەرزکەرەوەی هیدرۆلیکی کۆن و هێواش سەرسووڕمابوون، کە هەندێ جار لە بەینی نهۆمەکاندا دەوەستا تا ئاوی تەواو لە تانکێکەوە بۆ یەکی تر بگوازرێتەوە. چون خودی هۆتێلەکە بچووک بوو، نووسینگەکانیان هەر لە دەور و پشت لەو نزیکانە بڵاو ببوونەوە. هەندێکیان کاتی خۆی وەتاغی تایبەت بە ئێوارەخوان بوون کە هێشتا بۆی چێشت و شەرابی کۆنیان هەر لێ دەهات. دوا تێپەڕبوونی چەند مانگ، ئەمریکایەکان شوێنەواری خۆیان لە هۆتێل گریلۆن دانا: سەرتاشخانە، تۆڕێک لە هێڵی تەلەفوونی تایبەتی، سوبحانەی چەسپیوی ئەمەریکی لەباتی سوبحانەی فەڕەنسەیی. و، هەڵبەت، دەرگاوانانی بەردەرگا، و ئەو نیگابانانەی کە لە سەر سەربانی پان و بێ گرێ و گۆڵ دەهاتن و دەچوون و چاوەدێریان دەکرد، هارۆڵد نیکلسۆن، دیپلۆماتێکی لاوی بەریتانی کە باسێک باشی لەسەر کۆبوونەوەی گشتی داوە دەرێ، وتبووی کە " تەواوی شوێنەکە لە پاپۆڕێکی جەنگی ئەمەریکی دەچێ و بۆنێکی سەیر و ناخۆشی لێ دێت." گەشتیارانی بەریتانیش سەریان لەوە سووڕ مابوو کە چۆن ئەمەریکیەکان ئاوا بە جدیەت مەقامیان دەچوە سەرەوە و پۆستیان دەگرت: بە پێچەوانەی شاندی نوێنەرایەتی خۆیان، پیاوانی بەرچاو و دیار هەرگیز لە گەڵ کەسانی پلەخوارتر لە خۆیان لە ژمەکاندا دانەدەنیشتن.٥٥

لانسینگ و دەسەڵاتدارانی بێ سنووری هاوڕێی وایت و بلیس وەتاغەکانیان لە نهۆمی دووهەم بوو بەڵام دەسەڵاتی ڕاستەقینە لە دەست نهۆمی سەرووی ئەوانەوە بوو، شوێنێک کە هاوس زیاتر لە هەرچی کەسە سویتێکی هەبوو بە چەندین وەتاغەوە کە بە توندی پارێزگاری دەکران. لەوێ دادەنیشت، چون ئاشقی دانیشتن لەوێ بوو، و پلانەکانی دادەڕشت و کەسایەتی ناودار و بەهێزی بە لای خۆیدا ڕادەکێشا. سەرۆک وەزیران، ژەنەڕاڵەکان، باڵوێزەکان، ڕۆژنامەنووسان: ئەوان هەرهەموویان دەهاتن تاکوو ئەو ببینن. گرنگترین پێوەندی هەمیشە لە گەڵ سەرۆک کۆمارەکەی بوو. هەردوو پیاوەکە بە شێوەی کەسی و حوزووری یان لە ڕێگای هێڵێکی ڕاستەوخۆی تایبەت کە ئەندازیارانی ئەرتەش دایان مەزراندبوو پێکەوە دانووستانیان دەکرد. هەندێ جار ویلسۆن بە پیاسەکردن دەچوو بۆ کریلۆن؛ هەرگیز لە نهۆمی دووهەم نەدەمایەوە، بەڵکوو هەمیشە ڕاستەوخۆ دەچووە قاتی سەرەوە.

# ٣

# پاریس

کاتێک ئاشتیکەران لەهەموو بەشەکانی جیهانەوە لە ژانویەی ساڵی١٩١٩دا دەیانەویست لە دەوری یەک کۆببنەوە پاریس شارێکی خەمۆک و جوانکیلە بوو. خەڵکەکەی ملکەچ و تازیەبار و خەمۆک بوون بەڵام ژنەکانی هێشتا ئەو تەرپۆشیەی جارانیان هەر پێوە دیار بوو. نوێنەرێکی کەنەدایی بۆ خێزانەکەی خۆی نووسیبووی کە" هەرتاوناتاوێک پیاو چاوی بە دانەیەک دەکەوێ کە دەڵێی تازە لە *لاڤی پاریسین*، یان *ڤەوگ* لە ساتە هەرەخۆش و شادەکانیدا هاتۆتە دەرێ."ئەوانەی کە خاوەن پارە بوون هێشتا دەیانتوانی زێڕوزێو و جلوبەرگی جوان و سەرنجڕاکێش پەیاکەن. چێشتخانەکان، کاتێک بەباشی پێیان ڕادەگەیشتن خواردەمەنی و ئازووقەیان پێدەگەیشت، هەروەک جاران هەر سەرسووڕهێنەر بوون. لە یانەکانی شەوانەدا، جووتە سەماکەرەکان سەمایان دەگێڕا. کەشوهەوایەکی زۆر نەرم و لەسەرەخۆی هەبوو. هێشتا گیا سەوز بوو و چەند گوڵێک تازە لە خوونچە سەریان دەرهێنابوو. بارانێکی زۆر باریبوو و لە سین لافاو هەستابوو. بە درێژایی *کوەیسدا* جەماوەر لە دەوری یەک کۆببوونەوە تا هەستانی ئاوەکان چاو لێکەن، کەچی مووتریبەکان بە سەرکەوتنی فەڕەنسە بە سەر ئەڵماندا و جیهانێکی نوێ کە لە ڕیدا بوو هەڵیان دەکووت.٥٧

هێماکانی شەڕ کە تازە کۆتایی پێ هاتبوو لە هەموو شوێنێک هەستیان پێ دەکرا و دەبینران: ئاوارەکانی ناوچەکانی کارەساتبار لە باکوورەوە؛ تۆپی بەردهاوێژی دەستبەسەرداگیراوی ئەڵمانی لە پلەیس دیلا کۆنکۆرد و چامپس ئیلیسیس؛ کەڵکەڵەی پاشماوەکان و ئەو پەنجێرە تەختەدارانەی کە بۆمبەکانی ئەڵمانی لەوێوە کەوتبوونە خوارێ. ئەو جێگا بۆمبەی کە بە سەر باخی گوڵەسوورەکانی تۆیلیێریزەوە دیار بوو. بە درێژایی بولواردەکانی گراندس ڕیزەکانی داری کەستەنە مەودایان هەبوو کە لەوێدا بۆ مەبەستی داری سووخت دارەکانیان بڕیبۆوە. پەنجێرە گەورەکانی کەلیسای جامیعەی

نۆرتێر-دام شیشەکانی ڕەنگ کراوەیان کە بۆ سەلامەتی هەڵگیرابوون نەمابوون؛ لە جێی ئەوان، شووشەی زەردۆڵەی کەم ڕەنگ هەبوون کە ناوەوەیان بە نووری کەم ڕەنگ شۆردبۆوە. قات و قڕی خەڵووز، شیر، و نان باڵی بە سەر وڵات دا کێشابوو.

کۆمەڵگای فەڕەنسەیی بە دەست ئازاریشەوە دەیناڵاند. لە حاڵێکدا کە ئاڵاکانی سەرکەوتن لە کۆڵەکەکانی سەرشەقام و پەنجەرەکانەوە دەشەکایەوە، پیاوانی کەم ئەندام و سەربازانی دەرکراو لە ئەرتەش بە یوونیفۆڕمی ئەرتەشیەوە لە قووشبنەکانی سەر شەقام داوای گۆڕانکاریان دەکرد؛ لەوانەیە بڵێین کە هەرچی ژنە بەرگی ڕەشی ماتەمینی پۆشیبوو. ڕاگەیاندنی باڵی-چەپ داوای شۆڕشی دەکرد، و باڵی ڕاست داوای سەرکوت کردنی دەکرد.

مانگرتنەکان و نارەزایەتی دەربڕینەکان یەک بە دوای یەک دەهاتنە ئاراوە. شەقامەکان لە زستان و لە بەهاردا بە خۆپیشاندان لە لایەن ژنان و پیاوان لەبەرهۆی خەمۆکی ئاسایی کرێکارانی فەڕەنسەیی و بە دژەخۆپیشاندان لە لایەن چینەکانی مامناوەندیەوە ڕازبۆوە.

نە بەریتانیەکان و نە ئەمەریکیەکان خوازیاری ئەوەنەبوون کۆڕی ئاشتی لە پاریس بەڕێوە بچێت. هاوس لە یاداشتنامەکەی خۆیدا درکاندبووی کە: "هێنانەدی ئاشتیەکی عادیلانە کارێکی سەخت و دژوارە"، تۆ ناتوانی لە کەشوهەوایەکی وەهادا کە پایتەخت لە شەڕ و شۆڕەوە گلاوە لەو پێناوەدا هەنگاو بنێی. لەوانەیە ئاکامی باشی هەبێت و لەهەمانکاتیشدا لەوانەیە بۆ ڕایەکی تر کارەسات و ماڵوێرانی لێبکەوێتەوە." فەڕەنسەیەکان زۆر لە دڵەڕاوکێ دابوون و زۆریش چەوسابوونەوە و زۆر بەرەنگاری ئەڵمانیەکان ببوونەوە تا بەڵکوو کەشوهەوایەکی ئارام ئەو جۆرەی پێویست بوو بێننە ئاراوە. ویلسۆن یەکەمایەتی بە ژنێڤ دابوو تائەوکاتەی کە گوزارشی ترسێنەر و تۆقێنەر کە لە سۆئیسەوە سەریان هەڵدا و ئەویان هێنایە سەر ئەو قەناعەتەی کە ئەو وڵاتە لە سەر لێوی شۆڕشە و لە سیخۆڕ و جاسووسی ئەڵمانی لیپا و لیپ بووە. کلیمینجوو لە پێداگری کردنیدا بۆ هەڵبژاردنی پاریس تەنانەت ساتێکیش هەدای نەدا. لیۆد جۆرج دواترکاتێکە بەشێوەیەکی تایبەت قەڵسیان کردبوو، وتبووی کە "من قەت نەم ویستوە کۆبوونەوە لە پەیتەختی خوێناوی ئەو بەڕێوە بەرم. هەم من و هەمیش هاوس لە سەر ئەو بڕوایە بووین کە باشتر وایە لە شوێنێکی بێ لایەن بەڕێوە بچێت. بەڵام پیرەپیاو هێند گریا و هێند بەخۆی دادا تا ئێمەی بەچۆک داهێنا و ڕازی کردین."٥٨

لەوانەیە ئەمە شتێکی ئەفسانەیی و خەیاڵی بێت کە گوایە کلیمینجوو وەسیەتی کردبوو کە قنج و لەسەر پێ ڕووبەڕووی ئەڵمان بینێژن. بەڵام گومان لەوەدا نەبوو کە ئەو زۆربەی ساتەکانی ژیانی گوێ قوڵاغی دراوسێی گەورەی فەڕەنسە بوو. کاتێکە شەڕی پاڕاشن-فڕانکۆ دەستی پێکرد ئەو

نەیا بیست و هەشت ساڵ تەمەنی بوو، و ئەو ئەندامێک بوو لە گرووپی لاوانی کۆماری باڵی-چەپ کە لە پاریس شۆڕشی گێڕا دوا ئەوەیکە ئەرتەشەکانی فەڕەنسەیی شکستیان خوارد. ئەو بە چاوی خۆی دەیدی کە خەڵکی ناوشار خەریکن لە برسان دەمرن، حکوومەتی فەڕەنسە خۆی بەدەستەوە دەدا و ئیمپراتۆری نوێی ئەڵمانی لە هۆڵی مێرێرس لە ویرسایلس دەسەڵاتی فەرمی خۆی ڕادەگەیەنێت. وەک نوێنەرێکی تازە هەڵبژێردراو، دژبە مەرجەکانی ئاشتی لە گەڵ ئەڵمان دەنگی دا. وەک ڕۆژنامەنووسێک، نووسەرێک، سیاسەتمەدارێک و سەرۆک وەزیرێک هەر هەمان هەڕەشەی دووپات دەکردەوە: ئەڵمان بۆ فەڕەنسە وەیشوومە بووە. بەرلەوەی کۆچی دوایی بکات بە کورتی بە گوێی ڕۆژنامەنووسێکی ئەمەریکی چپاندبوو کە "ڕق و نەفرەتی سەرەکی لە ژیانی مندا لە ئەڵمان بووە بە هۆی ئەو کردەوانەی کە بە سەر فەڕەنسەی داهێناوە." دوا ساڵی ١٨٧١ ئەو چالاکانە بە دوای شەڕدا نەدەگەڕا؛ ئەو لای وابوو کە مەگەر شەڕ دەرکەی پێ بگرێ ئەگینا حەزی لە شەڕکردن نەبوو. ئەو ئەیوت کە کێشەکە لە لەلایەن فەڕەنسەوە نەبووە: "ئەڵمان لە سەر ئەو باوەڕەیە کە لۆجیکی سەرکەوتنی ئەو زاڵ بوون و دەسەڵات دارێتیە، کەچی ئێمە لە سەر ئەم باوەڕەین کە لۆجیکی شکستی ئێمە لە سەر کۆیلایەتی و دەربەگایەتیە."٥٩

کلیمینجوو هەمووکاتێک هەستی بەوە دەکرد کە بۆ ئەوەی دەرفەتێکی هەبێ فەڕەنسە پێویستی بە گرتنی هاوپەیمانی هەیە. بەر لە ساڵی ١٩١٤، ئەڵمانی نوێ دوژمنێکی بەهێزی لێ دەرهاتبوو، پیشەسازیەکەی، هەناردەکانی و سەروەت و سامانی ڕوو لە گەشەکردن بوو بەڵام هی فەڕەنسە نەگۆڕ بوو و ڕێژەی زاو و زێ رووڵە کەمی بوو. ئەمڕۆکە هێنانی ژمارەیەکی زۆر سەرباز لە گۆڕەپانی شەڕدا زۆر شتێکی سەیر نیە بەڵام ڕاکێشانی ئەو هەموو سووپایە بۆ گۆڕەپانی شەڕ دەبێ لەو سەردەمەدا چەندە گرنگ بووبێت. وەک کلیمینجوو لە ماوەی وت و وێژی یاساپەسندکردندا بەئەنجوومەنی پیرانی ڕاگەیاندبوو، بەستنی گرێبەست لە گەڵ ئالْمان "بە مانای ئەوە نیە کە فەڕەنسەیەکان بە ئەرکی دەزانن منداڵی زۆریان هەبێت، بەڵکوو ئەوە یەکەمین شتێک بووە کە گرتوویەتە خۆی." ئەو کەم و کورتیانە بریتی بوون لە ئەوەی کە بۆچی فەڕەنسە هاتبوو بە هانای دوژمنانی بڕبڕەی پشتی خۆی، ڕوسیەی تزاریست لە ڕۆژهەڵات، بەریتانیا لە سەراسەری کاناڵدا، بۆ ئەوەی کە کرێکاری و ڕوسی و پیشەسازی و هێزی دەریایی بەریتانی دژ بە ئەڵمان بخاتە یەک وەزنەوە و بەرابەری لەگەڵ بکات. تا ساڵی ١٩١٨ ناهاوسەنگی بنەڕەتی نەبێ، زۆرشت گۆڕانکاری بە سەردا هاتبوو. هێشتا ئەڵمانیەکان لە فەڕەنسەیەکان زیاتر بوون. بووژاندنەوەی ئابووری ئەڵمان بەو هەموو ژێرخانە دەست لێنەدراوەیەوە، دەبێ چەندە بخایەنێت؟ و ئیتر فەڕەنسە نەیدەتوانی لە سەر ڕووسیە حەساب بکات.٦٠

لەماوەی کۆڕی ئاشتیدا هاوپەیمانانی فەرەنسە هەراسان ببوون بە دەست ئەو شتانەی کە ئەوان وەک لاساری فەرەنسەیەکان، چاوچنۆکی فەرەنسەیەکان و قین لەدڵی فەرەنسەیەکان دەیان دیت. ئەوان بە دەست ئەو شتانە نەچەوسابوونەوە کە فەرەنسە بە دەستیەوە چەوسابۆوە. بیرەوەریەکانی شەڕ، لە هەر شار و شارۆچکە و گوندێک، لەگەڵ لیستەی ئەو هەموو ناوە لە شەڕی یەکەمی جیهانیەوە بگرە تا دەگاتە شەڕی دووهەمی جیهانی، هەرهەموویان باس لە قوربانی و ماڵوێرانیەکانی فەرەنسەیەکان دەکەن. چواریەکی پیاوانی فەرەنسە لە نێوان هەژدە تا سی ساڵ لە شەڕدا گیانیان بەخت کردبوو، زیاتر لە ١.٣ملوێن کەس کە حەشیمەتی پێش شەڕ دەگەڕێتەوە بۆ ٤٠ملوێن کەس. بە بەراورد لە گەڵ شەڕکەرەکانی تر فەرەنسە ڕێژەیەکی زۆر زیاتری لە حەشیمەتەکەی خۆی لەکیسدابوو. سەربازانی ولاتی ناوبراو دوو کەرەت زیاتر لەوانی تر بریندار ببوون. لە باکوور، زەوی و زارێکی بەربلاو و بەرین بە گولە و تۆپ دابێژ دابێژ کرابوو، دەورادەوریان بە سەنگەری قووڵی خەندەقی بریندار کرابوون، هەرشوێن ناشوێنێک نیشانەکانی خاچ کەوتبوون. دەورووبەری قەلای ڤێردوون، شوێنی ڕوودانی ناخۆشترین شەڕی فەرەنسەیەکان بوو، تەنانەت بوونەوەرێک بەدی نەدەکرا، مەلێکت نەدەدی بجریوێنێ. ئەو کانزا خەڵووزانەی کە ئابووری فەرەنسە پشتی پێ بەستبوون لافاو بردبوونی. ئەو کارخانانەی کە لەلایەن ئەم کانزایانەوە دابین دەکران کەوتبوونە بەرهێرش یان بە کالێسکە گوازرانەوە بۆ ئەڵمان. شەش هەزار مایلی چوارگۆشە لە ولاتی فەرەنسە، کە بەرلە شەڕ لە سەدا ٢٠ی دانەوێڵەی ئەو ولاتە، لە سەدا ٩٠ی بەردەکانزای ئاسن و لە سەدا ٦٥ی پۆلای ئەو ولاتەیان بەرهەم دێنا، هەر بە یەکجاری هەپروون بە هەپرون کران. لەوانەبوو ویلسۆن باشتر لە داواکاریەکانی کلیمینجوو تێگەشتایە ئەگەر بۆ خۆی زووتر لە نزیکەوە کاولکاریەکانی بدیایە.٦١

لە کۆڕی ئاشتیدا کلیمینجوو بڕیاری دابوو هەمووی تاڵەدەزووە گرنگەکان بگرێتە دەست خۆی. شاندی نوینەرایەتی فەرەنسە زۆر لەسەر ئەوە پێداگری دەکرد کە دەبوایە دەستپێشخەری یەکەم بۆ پێشنیارەکان فەرەنسە بێت، کەچی لە چوار مانگی یەکەمی کۆبوونەوەکەدا هیچ دانیشتنێکی نەبوو. کلیمینجوو زۆر بە دەگمەن لە گەڵ پسپۆڕانی وەزارەتی دەرەوە لە کوای دی ئۆرسەی ڕاوێژی دەکرد، و ئەمەش بۆ ئەوان زۆر ناخۆش بوو. و هەروەها ئەو بایەخێکی ئەوتۆی نەدەدا بەو پسپۆڕانە کە لە زانکۆکانەوە هاتبوون لە سەر داوای ئەو بۆ کۆکردنەوەی گوزارش لە سەر ئابووری فەرەنسە و داخوازیەکانی هەرێمی و کۆنترۆڵ کردنی لێژنەکانی لێکۆڵینەوە کە لە خوولی کۆبوونەوەکە ژمارەیان جار لە گەڵ جار زۆری دەکرد. پائۆل کامبۆن، پیاوێکی ژیر و بەتەمەن، خەڵکی لەندەن گلەیی کردبوو کە "هیچ پلان و بەرنامەیەکی بۆ بیر و بۆچوونەکانی خۆی نیە. شێوازێکی نیە بۆ

کارکردن. تەواوی ئەرک و بەرپرسایەتیەکانی خستۆتە ئەستۆی خۆی، بۆیە هیچ کارێک بە باشی ناچێتە پێشێ. و ئەم کابرا ٧٨ ساڵیە نەخۆشی دیابتی لە گەڵە.... ڕۆژێ پەنجا کەس وەردەگرێ و گوشاری هەزاران وردەکاری کە دەبێ بۆ وەزیرەکانی دانێ دەخاتە سەرشانی خۆی... ئەوندەی کە ئێستا خۆمم لەپێناو ئاشتیدا خستۆتە زەحمەت و ناڕەحەتی ئەوەندە لە شەردا تووشی ناڕەحەتی و ماندوویەتی نەهاتووم. "٦٢

ستێفن پیچۆن، وەزیری دەرەوەی کلیمینجوو، پیاوێکی لاوز، ڕاڕا و تەوەزەل بوو کە تەنانەت بۆ ساتێکیش بیری لە سەرپێچی و ملنەدان نەدەکردەوە. کلیمینجوو بایەخێکی ئەوتۆی نەدەدایە. ڕۆژێکیان پرسیبووی "پیچۆن کێیە؟" ولامیان دابۆوە " وەزیری کار و باری دەرەوەی ئێوە". تایگێری بەسالاچوو وتبووی کە " ئێ کەوابوو ئەو ئەمەیە. من لە بیرم چووبۆوە." لە بۆنەیەکی تردا پیچۆن و کۆمەڵێک پسپۆڕ و کارناس لە پشتەوە زۆر بە تاسەوە چاوەڕوانی دەستپێکردنی کۆبوونەوەیەکیان دەکرد لەوکاتەدا کلیمینجوو سەبارەت بە ژمارەی ئەو ڕاوێژکارانەی کە بالفۆر هەیبوو گاڵتەی پێ دەکرد. کاتێکە بالفۆر لە ولامدا وتی " ئەوان خەریکن هەرئەو کارە دەکەن کە ژمارەیەکی بەرچاوی خەڵک لە گەڵ بەڕێزتان دەیکەن."کلیمینجوو تووڕە بوو و بە کەس نەدەگیرا، بە دەوری خۆیدا دەخولایەوە. بە پیچۆنی وت "هەرهەمووتان بچنە دەرێ. پێویستیم بە هیچ کامێک لە ئێوە نیە."٦٣

ئەگەر کلیمینجوو لە سەر کێشەکان وت و وێژی کردایە و دانیشتنێکی هەبوایە، ئەو ئێواران لە ناو ماڵەکەی خۆیدا دەیکرد، هاوڕێ لە گەڵ کۆمەڵێکی بچووک کە بریتی بوون لە هاریکاری بە وەفای ئەو ژەنەڕاڵ هێنری مۆرداک، مێشەکەرانەی هەڵکەوتە ئاندری تاردیۆ و پیشەسازی کار لۆویس لاوچێر. هەموو کاتێک لەلایەن پۆلیسەوە چاودێری دەکران و بۆیە گوێڕایەڵی خۆی کردبوون. هەموو بەیانیەک دۆسیەیەکی پێ ئەدان کە هەمووی وردەکاریەکانی تایبەت بە چالاکیەکانی ڕۆژێک پێشتری ئەوانی لە خۆ گرتبوو. ئەوەندەی بۆی بکرایە محەلی بۆ ڕیمۆند پۆینتکارێ، سەرۆک کۆمارەکەی، دانەدەنا چون زۆری لێ وەڕەز بوو.٦٤

لە سەراسەری ژیانی دووروودرێژیدا کلیمینجوو ڕێبازی سەخت و دژواری خۆی گرتبووە بەر. دوژمنەکانی ئەو بانگەشەی ئەوەیان دەکرد چاوە خوار و خێچەکانی ئەو و ملهوڕی و سەرەڕۆیی ئەو میراتێک بوو کە لە هوونەکانەوە پێی گەیشتبوو و ئەوانیش لە ڤێندیەکانەوە وەریان گرتبوو. ئەو لە ساڵی ١٨٤١دا لە دایک بوو، لە خانەدانێکی نادیار و کەم بایەخ لە بەشێکی سەرنجڕاکێش و خۆشی فەرەنسە هاوڕێ لە گەڵ مێژوویەکی پڕ لە هەوراز و نشێو. بەگشتی، خەڵکانی ڤێندی بەشە ناخۆشەکەیان هەڵبژارد: لە شەڕەکانی ئایینیدا، کە کاتۆلیکەکان بردیانەوە، ئەوان پرۆتێستان بوون؛ لە

ماوەی شۆڕشی فەڕەنسەدا ئەوان کاتۆلیکی و سەڵتەنەتخواز بوون. بنەماڵەی کلیمینجوو کەمینەیەک بوو لە ناو کەمینەیەکی تردا؛ کۆماری، توندڕەو و بەتەواوەتی دژە ئاخووند بوون. کلیمینجوو لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە کەسانێکە خۆیان بەزل دەزانن لەڕووی گەوجیەوە وادەکەن، بۆیە هەمیشە سەردانی ماڵە تەنگ و تاریکەکەی دەربەگایەتی دەکرد، کە زەمینێکی بەردچن کرابوو، قانگەیەک، و کەل و پەلێکی سادە و ساکاری لە خۆ گرتبوو.٦٥

وەکوو باوکی، کیمینجوو بوو بە دوکتوور؛ بەڵام، دووبارە وەک باوکی بەکاری نەهێنا و نەیبردە بواری کردەوەوە. توێژینەوەکانی ئەو لە هەر بوارێکدا لەبەرانبەر نووسین، سیاسەت، و بابەتە خۆشەویستیەکانی ئەو هەمیشە لە پلەی دووهەمی گرنگایەتی دابوون. وەکوو لاوانی تری ڕۆشنبیر بەرەو پاریس و جیهانی ڕووناکبیران، ڕۆژنامەنووسان و هۆنەروەرانی ڕادیکاڵ و توندڕەو ڕاکێشرا. لە کۆتاییەکانی دەیەی ١٨٦٠دا ئەو ماوەیەکی زۆری لە وڵاتەیەکگرتوەکان بە سەر برد، کە لەلایەن کۆماریەکانەوە لەهەموو شوێنێک وەک وڵاتی ئازادی تاریف دەکرا. سەفەرەکانی ئەو ببوە هۆی ئەوە کە لە ئینگلیزیدا ڕەوان بێت، زمانێک کە تێکەڵ بوو لەگەڵ زمانێکی کۆنی ناوبازاڕی نیۆیۆرک، بە شێوەزمانێک کە هێواش دووانی ئەمەریکی لە گەڵ "ڕێ"کانی فەڕەنسەیی تێکەڵ دەکرد. ئەو هەروەها هاوسەرێکی هەبوو، بە ناوی مێری پلامێر، کچە ئینگلیزیەکی خوێن شیرین، بێ مێشک و زۆر بە داب و دەستوور کە کاتی خۆی لە قوتابخانەیەکی کچان لە فەڕەنسە کە وانەی وتبۆوە لە گەڵی ئاشنا ببوو. لەگەڵ خۆی هێنابوویەوە بۆ فەڕەنسا و بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ ئەوی لای دایک و بابی و پوورە شوونەکراوەکانی لە ڤێندی نیشتەجێ کردبوو. ژیانی هاوبەشی ئەو زۆری نەخایاند. بەڵام مێری پلامێر لە پاریس درێژەی بە ژیانی دا، و بژیوی ژیانی لە ڕێگای بردنی گەشتیارانی ئەمەریکی بۆ مۆزەخانەکان دابین دەکرد. دوا جیابوونەوەیان کلیمینجووی زۆر بەکەمی دەدی بەڵام وەفادارانە هەمووی ئەو لەت و کوتی بڵاوکراوانەی کلیمینجووی لە گەڵ خۆی هەڵگرتبوو. بە داخەوە، ئەو نەیدەتوانی بیانخوێنێتەوە چون قەت فەڕەنسەیی فێر نەببوو. پاش مەرگی لە ساڵی ١٩١٧ کلیمینجوو پەشیمانی خۆی دەربڕیبوو: " چ کارەساتێک سەد بریا هەر شووی پێم نەکردایە."٦٦

بنەماڵەی کلیمینجوو سێ منداڵیان کە بەرهەمی ئەو هاوسەریە بوون لای خۆیان هەڵ گرتن و بەخێویان کردن، و کلیمینجوو ئیتر لەگەڵ کەس ژیانی هاوسەری دروست نەکردەوە. ئەو حەزی دەکرد لەژیانیدا بە تاقی تەنیا سەفەر بکات. هەڵبەت، هەبوون ژنانێک وەک هاوڕێ و وەک خۆشەویست. ڕایەکیان وتبووی " قەت لە ژیانمدا بە پێویستم نەزانیوە لە ژنان بپاڕێمەوە." و بەگشتی ئەو ڕاست

دەڵێ وابوو. لە ساڵی ١٩١٩دا بە تەشەرەوە گلەیی دەکا و دەڵێ، لە سەروودەمێکدا کە تازە هیچی پێ نەماوە و هیچی بۆ ناکرێت، ژنان دێن و خۆی پێدا دەدەن.٦٧

سیاسەت، و لە سەرووی هەموویەوە، فەڕەنسە خولیا و خۆزگەی سەرەکی ئەو بوون. بە ڕووخانی ئیمپراتۆری ناپلۆئۆنی سێهەم لە ساڵی ١٨٧٠دا و سەرهەڵدانی کۆماری سێهەم، ڕێگە خۆش بوو بۆ ئەو و بۆ سیاسەتمەدارانی تری ڕادیکاڵ تا لە ژیانی گشتی خەڵکدا بەشداری بکەن. کلیمینجوو لە ساڵی ١٨٧٦دا بۆ پەڕلەمانی فەڕەنسە هەڵبژێردرا. ئەو وەکوو ئەو کەسانەی کە بە سەر کۆماری سێهەم دا زاڵ بوون و دەستیان دەڕۆیی کۆماری بوو بەڵام لە مانای ئەمڕۆیی و مۆدێرندا سەربە هیچ حیزبێکی سیاسی نەبوو.(لە ڕاستیدا ئەو جۆرە شتانە لەوە بەولاوە هەر نەمان.) لە دەستەبەندی و گرووپی بچووک بچووک دا بەر لە شەڕی گەورە، ئەو یەکرەنگ و یەکشێوە سەربە باڵی چەپ بوو، هەر ئەم لایەنەی سوسیالیستەکان و ئەو کەسانەی کە سیاسەتی دیموکراتیک و دەستووریان ڕەد دەکردەوە. کلیمینجوو وەک وتاربێژێکی کارتێکەر و قسەخۆش و نەیارێکی سەرسەخت و کەلەڕەق ناوێکی بۆ خۆی تۆمار کرد، لەهەمووکات خۆشحاڵتر ئەو کاتانە بوو کە هێرشی دەکردە سەر ئەو حکوومەتانەی کە ئەو بە کۆنەپارێز و بەرژەوەندخوازی دەزانین. لە گەڵ هاوڕێی کۆنی، ئێمیلی زۆلا، بۆ وێنە، لە هەڵوەشانەوەی حوکمی تاوان کە دژ بە ئالفرێد درەیفووس، ئەفسەری ئەرتەشی جوولەکەکان کە بە هەڵە تاوانی فرۆشتنی نهێنیەکانی فەرەنسەی بە ئەڵمانیەکان لێ درابوو، ڕاگەیەنرابوو زۆری یارمەتی دا. ٦٨ بەڵام تەنانەت لای باڵی چەپیش متمانە و بڕوای نەمابوو. زۆر سەرمایەداری گومانلێکراو لە ژیانی ئەودا هەبوون، ژنان لە ڕاڕایی دا ناوبانگیان هەبوو، قەرزدەرانێک کە داوای پارەکانیان دەکرد. دۆێلەکانی ئەو پاش تەواوبوونی شەڕ ئەو هەستەیان بە جی دەهێشت کە گوایە ئەمە کەسێکە تایبەت بە لاپەڕەکانی دووماس. لە هێرشە یەک بەدوایەکەکانیدا بۆ سەر بەرپرسان ئامادەیی ئەوەی هەبوو کە بە هەر شێوەیەک بێ براوە بێت. پیاوێک کە باشی دەناسی لەبارەیەوە وتبووی کە " ئەو لە بنەماڵەی گورگەکانەوە هاتۆتە دەرێ." کلیمینجوو بە خۆیدا نەدەپەرمی سووکایەتی بە دابونەریتە کۆنەکان نەکا و بۆیە هەتابڵێ مرۆڤێکی گوماندار بوو لە هەرچی شتە." لیۆد جۆرج کەرەتێکیان سەبارەت بە ئەو وتبووی کە " ئەو ئاشقی فەڕەنسە بوو بەڵام لە هەمووی فەڕەنسیەکان بێزار بوو." لە ساڵی ١٩٠٦ دا، کاتێکە تازە چووبۆوە تەمەنی شەست ساڵ، بوو بە وەزیری حکوومەت. ئەو وەزیری ناوخۆی پێ سپێردرا شایەد لەبەرهۆی ئەوەوە کە سەرۆک کۆماری ئەو کاتە بەڵێنی دەینێکی سیاسی پێدابوو، چون زۆر لەوانە بوو، وەک یەکێ لە هاوکارە نوێیەکانی باسی کردبوو ئەگەر بێت و وێڵیان کردایە زۆر جێی مەترسی دەبوو. کاتێکە هەر ئەو ساڵە

حکوومەت بە هۆی لاوازبوونیەوە رووخا، کلیمینجوو بەپێچەوانەی بۆچوونی زۆرکەس وەک سەرۆک وەزیری نوێ و تازە زۆر کارامە هەڵبژێردرا.

نزیکانی ئەو لایەکی تری باسەکەیان دەدی. کلیمینجوو وەفای بوو بۆ هاورێیانی و ئەوانیش هەروا. ئەو هەم لە کات و هەم لە پارەدا بەخشەندە و دڵئاوا بوو. ئەو باخچەکەی خۆی خۆش دەویست، هەرچەند، بە رای میوانێک کە چووبوە سەردانی " ئەو باخچەیە پاشماوەی دانەوێڵەی تێکەڵ و پێکەڵ بوو کە بەبێ سەرنج بە هەمووی لایەنەکانی باخچەکەدا چێنرابوو." ساڵیانی ساڵ بوو کە کلیمینجوو لە نزیک هاورێیەکی خۆشەویستی خۆی بەناوی گیڤێرنی و کلاودی مۆنێت هاوینە هەوارێکی هەبوو. لە پاریس ئەو بەردەوام دەچوو بۆ دیتنی تابلۆ گەورەکانی گوڵەشلێرەی سەر ئاو. " هەرکات کە دەچمە ژووری ئوتاقەکە دیمەنی ئەو تابلۆیانە مەستم دەکەن." (ئەو نەیدەتوانی وێنەی رینۆیر بۆ ساتێکیش چاو لێکات: "ئەو گەڵ و قوونانەی ئەو دەیانخاتە روو و ئەو چەتیو مەتیوە بەرەلایانە نابێ رێگەیان بدرێتێ." ٦٩)

هەروەها کلیمینجوو هەتا بلێی ئازا و نەترس بوو. کاتێکە ئەڵمانیەکان لە ساڵی ١٩١٤ دا دەستدرێژیان کردە سەر شاری پاریس، پەرلەمانی فەرەنسە لە سەر رۆیشتن و چۆڵ کردن مشت و مریان بوو. کلیمینجوو کە لە ساڵی ١٩٠٩ لە دایرە دەستی لەکار کێشابۆوە و گەرابۆوە سەر رۆڵی دژبەرانەی خۆی، بەوە رازی بوو " بەڵێ ئێمە زۆر لە گۆرەپانی شەر بەدوورین." لە رۆژە ناخۆشەکانی ١٩١٧ دا، کاتێکە سووپاکانی فەرەنسە لە گۆرەپانی رۆژئاوا بە تەنگەوە هاتبوون و باس باسی شکست بوو لە ناو خاکی زێدا، کلیمینجوو باوکی سەرکەوتن، هەروەک فەرەنسەویەکان وایان پێ ئەوت، لە کۆتاییدا هاتەوە بە خۆیدا. وەک سەرۆک وەزیر، هەتا سەرکەوتنی کۆتایی ئەو فەرەنسەی پێکەوە گرێ دابوو و رای گرتبوو. کاتێکە ئەڵمانیەکان هەموو هەوڵێکی خۆیان خستبوە گەر تا لە بەهاری ١٩١٨دا بۆ دوایەمین جار پاریس بگرنەوە، کلیمینجوو دڵنیای کردبوونەوە کە هەرگیز خۆ بە دەستەوە نادەن. ئەگەر ئەڵمانیەکان شاریان بگرتایە، ئەو حەزی دەکرد تا دواساتەکان بمێنێتەوە و لە ئاکامدا بە فرۆکە دەرباز بێت. کاتێکە ئەڵمانیەکان رازی بوون بەوەی کە ئاگربەس بکرێت، بۆ یەکەم جار لە ژیانیدا ووشەیەک بە زاری دا نەهات. ئەو سەری خستە ناو دەستەکانیەوە وهۆرە هۆر گریا. سەرلەبەیانی ١١ی نوامبردا لە گەڵ خوشکە خۆشەویستەکەی خۆی، سۆفی پیاسەی دەکرد. کاتێکە دەیدیت کە خەڵک خەریکن چەکە دەستبەسەرداکراوەکانی ئەڵمانی شەق و پەق دەکەن وتی "شەر بە سەرکەوتووی کۆتای پێهات. ئەوانە بدەن بە دەست منداڵانەوە تا کایەیان پێ بکەن." دواتر لە گەڵ مۆرداک لە سەر ئەو کارانەی کە دەبێ بکرێن باس و خواستیان ئاڵ و

کۆڕ کرد: " بەڵێ ئێمە لە شەڕدا سەرکەوتین و بەبێ گیر و گرفت بە دەستمان نەهێنا؛ بەڵام ئێستا دەبێ بەرەو بردنەوەی ئاشتی هەنگاو بنێین، و لەوانەیە ئەوە دژوارتر و ناخۆشتر بێت."٧٠

فەڕەنسە، لە ناو زلهێزەکاندا، لە هەموویان زیاتر لە مەرجەکانی ئاشتی ئەڵماندا کەوتبووە بەر باری مەترسیەوە. بەریتانیا تازە بە زۆربەی ئەو شتانەی کە دەیویست گەیشتبوو، ناوگانی ئەڵمانی و کۆلۆنیە سەرەکیەکانی ئەڵمانی بەبێ مەترسی لە ناو دەستەکانی خۆیدا دەبینی، و ولاتەیەکگرتوەکان کە لەڕێگای ئۆقیانووسی ئاتلانتیکەوە لە بەرانبەر ئەڵمانیا پارێزگاری لێدەکرا، خولیای ئەوە بوو بارگ و بنەی تێک نێ و بگەڕێتەوە بۆ نیشتمان. فەڕەنسە نەک تەنیا لە هەموویان زیاتر چەوسابۆوە؛ لە هەمووشیان زیاتر دڵەڕاوکێی لە دڵ دابوو. بە هەرباریکدا داتبنایە ئەڵمانیا هەر دەکەوتە سەر سنووری ڕۆژئاوای فەڕەنسە. لە جیهاندا هێشتا هەر ژمارەی ئەڵمانیەکان لە فەڕەنسەیەکان زیاتر دەبوو. ئەوە هێمای بەدبەختی بوو کە تەنانەت چەقۆ گیرفانیەکانی یادگاریش کە "فۆچ" یان "لا ڤیکتۆریا"یان بە سەرەوە هەڵکەندرابوو و لە ساڵی ١٩١٩ لە فەڕەنسە بە فرۆش دەگەیشتن لە کارخانەکانی ئەڵمانیا درووست کرابوون. فەڕەنسە داوای تۆڵە و قەرەبووی خەسارەتی دەکرد، بەڵام لە سەرووی هەموویەوە، خوازیاری ئاسایش و هێمنایەتی بوو. کەس زیاتر لە سەرۆک وەزیرەکەی هەستی بەمە نەدەکرد.

کلیمینجوو هاتبوە سەر ئەو قەناعەتەی کە تەنیا شتێکە سەلامەتی و ئاسایشی بۆ فەڕەنسە تێدابێت زیندووڕاگرتنی هاوپەیمانی سەردەمی شەڕە. لە دێسامری ساڵی ١٩١٨دا بە ئەنجومەنی نوێنەرانی وتبوو کە "لەپێناو پاراستنی ئەم هاوپەیمانیەدا هەر قوربانیەک پێویست بێ دەیدەم." لە ماوەی کۆڕی ئاشتیدا، تەنانەت لە نارەزایەتیەکانیش، ئەم پێوەندیەی هەر قورس ڕاگرت. ئەو بە نزیکترین ڕاوێژکارەکانی خۆی ڕاگەیاند کە خەڵکی فەڕەنسە نابێ لەبیریان بچێتەوە کە "بەبێ ئەمەریکا و ئینگلیز، لەوانەیە فەڕەنسە هەر لە گۆڕێدا نەبوایە." لە یەکێک لەو چەلەحانێیانەی کە هەمیشە لە گەڵ لیۆدجۆرج هەیبوو، وەبیری دێنێتەوە کە " سیاسەتی من لە کۆبوونەوەکەدا، کە هیوادارم ئێوەش دانی پێدابنێن، ڕێکەوتنێکی نزیکە لە گەڵ بەریتانیای گەورە و ئەمەریکا."٧١

سیاسەتی کلیمینجوو شتێک بوو؛ هاندانی دەستە و دایەرەی مەقاماتی ڕەسمی فەڕەنسە بۆ ڕەچاوکردنیان شتێکی تر. هانکەی، سکرتێری بەریتانیا لە کۆبوونەوەکەدا گلەیی کردبوو و وتبووی کە "لە ناویاندا هەست بە هەموو جۆرە فێڵ و تەڵەکەیەک دەکەم، بەبێ ئەوەی لەپێناو مەبەستی سەرەکیدا هەوڵێک بدەن."بیرەوەریەکانی ناودارێتی ڕابردووی فەڕەنسەیەکان، بیر و باوەڕی یەکەمایەتی و باڵادەستی شارستانیەتی فەڕەنسەیەکان، وەڕەز بوون لە گەشەسەندنی

ئانگلۆ-ساکسۆن و ترس و دڵەڕاوکێ لە ئەڵمان هەرهەمووی ئەمانە وایان کردبوو لە فەڕەنسەیەکان کە نەکرێ هەروا بە ئاسانی دانووستانی لە گەڵ بکرێت. کاتێکە کارناسێکی بەریتانی سەردانی هێزە داگیرکەرەکانی فەڕەنسەیی لە رینلەند کرد نووسیبووی کە "بەخۆت نیە هەستێک دادەگرێ کە لە ساتەوەختێکدا هەرهەمووی ئەو شتانەی کە لە ماوەی پەنجا ساڵی ڕابردوودا ڕوویان داوە هەپروون بە هەپروون بوون و نەمان؛ سەربازانی فەڕەنسەیی جارێکی تر گەڕانەوە بۆ شوێنێک کە لە سەردەمی دەسەڵاتداریێتی شا و شۆڕش دا عادەتیان بوو بچن؛ باوەڕبەخۆبوون، ئێسک سووکی، گورج و گۆڵی، هەست بە ئاسوودەیی کردن لە بەجێ هێنانی ئەرکی لەمێژینەی خۆیان، واتە هێنانەدی شارستانیەتێکی مەزنتر لەبۆ ئەڵمانیەکان. ئەمەریکیەکان، وەک بەریتانیەکان، فەڕەنسەیەکانیان هەتابڵێی قەڵس و تووڕە دەهاتە بەرچاو. پسپۆڕێکی ئەمەریکی لە یادداشتنامەکەی خۆیدا نووسیبووی کە "کێشەی سەرەکی سەبارەت بە فەڕەنسە ئەمەیە کە هەتا ئەو وڵاتە لە گۆڕێدابێ سەرکەوتن بۆی شتێکی خەیاڵی و ئەفسانەیە و ئەمیش[فەڕەنسە] لە هەوڵی ئەوەدایە کە سەرکەوتن بکا بە شتێکی واقیعی بۆ خۆی و بەخۆی بقەبووڵێنێ کە وابووە." ئەفسەرانی ئەمەریکی بەردەوام لە گەڵ هاوکارانی فەڕەنسەیی خۆیان بە یەکتر دا هەڵدەپڕژان و سەربازانی ئاسایی لە سەر شەقامەکان و لە کافەکان دەیانکردە هەرا و هۆریا.٧٢

ئەوەی جێی داخ بوو، لەوانەیە، ئەمە بێت کە کلیمینجوو بۆخۆی لە گەڵ ڕێبەرانی هیچ یەک لەو وڵاتانە پێوەندی برایانەی تاکەکەسی دانەمەزراند. ویلسۆن و لیۆد جۆرج بەردەوام خۆیان لە یەک هەڵدەقوتانت و لە کاتەکانی نەهار و شامدا لە ماوەی کۆڕی ئاشتی چاویان بە یەکتر دەکەوت، بەڵام کلیمینجوو تەنیا دەکەوت یان لە گەڵ کۆمەڵێکی بچووک لە ڕاوێژکارانی دادەنیشت. لیۆد جۆرج وتبووی کە "ئەو کەم و کورتی تایبەت بە خۆی هەیە. ئەگەر لەبەر هۆکارەکانی کۆمەڵایەتی کۆبوونەوە و دانیشتنت هەبێ، ئەوا دەتوانی باسێک بورووژێنیت. ئەگەر هەستت کرد کە خەریکە بە دڵخۆشیەوە دەڕۆیە پێشێ، دەتوانی درێژەی پێ بدەی، دەنا وازی لێ بێنەو هیچمان لە هیچ."٧٣ کلیمینجوو تەنانەت لە ساتە زۆر باشەکانیشدا قەت بایەخی بە ژیانی ئاسایی کۆمەڵایەتی نەدەدا. لە ساڵی ١٩١٩ ئەو وزە و توانا کەم و لاوازەکانی پاشەکەوت دەکرد بۆ دانووستانەکان.

کلیمینجوو لە هەر سێکیان بە تەمەنتر بوو، هەرچەند ڕواڵەتی دەیکوت کە لە تەمەنی بەهێزترە. ئەکزیمای سەردەستەکانی ئەوەندە ناشیرین بوون کە بۆ ئەوەی حەشاریان بدات دەستکێشی لە دەست دەکرد. ئەو کێشەی بێ خەویشی لە گەڵ بوو. ئەو زۆر زوو لە خەو هەڵدەستا، زۆر جار کاتژمێر سێی نیوە شەو، و تا حەوت بابەتی دەخوێندەوە، سوبحانەیەکی سادەی لە شۆربا بۆ خۆی درووست دەکرد.

دواتر دەستی بە ئیش کردن دەکردەوە تا کاتێک کە ڕاهێنەری وەرزشی و لەش شێل بۆ وەرزش پێ کردنی جەستەیی دەهات (وەرزشێکە لای خۆش بوو شیربازی بوو.) ئەو بەیانیانی تەرخان بە کۆبوونەوەکان کردبوو بەڵام هەمیشە بۆ نەهارێکی ستاندارد کە بریتی بوو لە هێلکەی کوڵاو و لیوانێک ئاو دەچووەوە بۆ ماڵ، دووبارە سەراسەری دوانیوەڕۆ دەست بە کار دەبۆوە، و دوا شێفێکی هەروا سادەی وەک لیوانێک شیر و نانێک، لە کاتژمێر نۆدا دەنووست. هەر جار ناجارێ، چاییەکەی دەبردە شوقەی لیۆد جۆرج لە ڕوو نیتۆت، شوێنێک کە چاپەز چایەکە پێی خۆش بوو، *لانگویس دی چەت*،ی بۆ درووست دەکرد.٧٤

کلیمینجوو لە گەڵ ویلسۆن و لیۆد جۆرج زۆر نێوانی خۆش نەبوو. دەستەواژەیەک هات بە دەمیدا کە کەوتە سەر زاری هەر دانیشتوویەکی شاری پاریس. " من خۆمم لە نێوان عیسا مەسیح لە لایەکەوە و ناپلۆئۆن بناپارت لە لایەکی ترەوە دۆزیەوە." ویلسۆن سەری دەخستە سەری: "پێم وانیە ئەو پیاوێکی خراپ بێت. بەڵام تا ئێستا بۆم ساخ نەبۆتەوە کە چەندەی چاکە لێ هەڵدەوەرێت.!" ئەمێش[کلیمینجوو] ئەوی زۆر بە ئەدادار و مەکراوی و لووت بەرز دەزانی. "بەڕاستی کە ناشارەزای ئورووپا بوو و بەڕاستی ئەستەم بوو لێی تێبگەی کە دەڵێ چی! ئەو ڕای وابوو کە تۆ دەتوانی بە فۆڕمووڵ و بە چارەدە خاڵەکەی ئەو هەموو کارێک بکەی. خوای مەزن بۆ خۆی بە دە فەرمان قەناعەتی کرد. ویلسۆن هاکەزا چاردە خاڵی سەپاند بە سەرماندا.... چاردە خاڵێک کە لە بیرۆکە بێ بەش بووا!"٧٥

ئەوەندەی کە کلیمینجووو لێی حاڵی بوویێت، لیۆد جۆرج کەسایەتیەکی سەیر و سەرسووڕهێنەر و هەروەها دۆدە و دوور لە متمانەی هەبوو. لە دانووستانە دوور و درێژەکاندا سەبارەت بە کۆنترۆڵی ڕۆژهەڵاتی ناڤین، کلیمینجوو لە هەوڵ و تەقەلاکانی لیۆد جۆرج بۆ خۆباریک کردنەوە لە ڕێکەوتننامەکانیان دەهری دەبوو و چاوی عەرزی نەدەدی. ئەم دوو پیاوە هەرکیان لە هەندێک تایبەتمەندیدا هاوبەش بوون- هەرکیان وەک ڕادیکاڵ و تووندڕەو سیاسەتیان دەست پێکردبوو، هەرکیان هەتا بلێی بەتوانا و کارامە بوون- بەڵام هەندێک جیاوازی زەق و بەرچاویشیان پێوە دیار بوو. کلیمینجوو رووناکبیر بوو، لیۆد جۆرج وانەبوو. کلیمینجوو مێشکی و بیرکەرەوە بوو، لیۆد جۆرج لەخۆوەزان بوون. کلیمینجوو بۆن و بەرامەی پیاوماقووڵێکی سەدەی هەژدەهەمی لێ دەهات؛ لیۆد جۆرج مامناوەندیەکی خەست و خۆڵ بوو.

کلیمینجوو لە دەورو بەری ماڵێش هەندێک کێشەی هەبوو. بە تانە و توانجەوە هەچی جار بوو ئەیوت کە "لەم جیهانەدا تەنیا دوو شتی بێ کارە و بێ کەڵک هەن. یەکیان ئاپاندیسە و ئەویتر پۆینکارێیە." پیاوێکی کورتەباڵای ژیکەڵە، سەرۆک کۆماری فەڕەنسە، بەئیراد، یاساپەرست و

بەداب و دەستوور، زۆر ووردبین و زۆر لایەنگری کاتۆلیک بوو. ئەو کۆماری بوو، بەڵام کۆنەپاریز بوو. کلیمینجوو لە ماوەی کار و باری درەیفووسدا هاتبوو کە بە تەواوی ترۆی بکات، کاتێکە پۆینکاریێ زۆر بە سەرنجەوە لە گرتنەبەری هەرجۆرە هەڵوێستێک بەرگری کردبوو. کلیمینجوو بە هاوڕێیەکی ئەمەریکی وتبوو کە " گیانلەبەرێکی چکۆلە و دڕ و چالاک، وشک، نەحەواوە، و بێ غیرەت و ترسەنۆک. ئەم وردبینیە هەتا ئەمڕۆکە پاراستوویەتی، حەیوانێکی قزێون و ناشیرین کە شوکر بۆ خوا تا ئێستا جۆرێکی ناسراوە و ئەویش ئەوەیە کە دەیبینن."کلیمینجوو بۆ چەندین ساڵ هێرشی دەکردە سەر پۆینکاریێ و تەنانەت بۆ خێزانەکەی پۆینکاریێ دەنگۆ و قسەلۆکی ساز کرد. بە دەنگی بەرزەوە دەیگوڕاند " تۆ حەز دەکەی لە گەڵ خاتوو پۆینکاریێ شەوجێی بکەیت. زۆر چاکە ئەوا نۆبەم بۆ دانای و برایەوە." لە ماوەی شەڕدا کلیمینجوو، کە وەکوو زۆربەی سیاسەتمەدارانی ڕێبەری فەرەنسەیی ڕۆژنامەی تایبەت بە خۆی هەبوو، لەبەرهۆی شکستەکانی میلیتاری فەرەنسەیی، زۆرجار ناجوامێرانە، ڕەخنەی لە سەرۆک کۆمار دەگرت. *ئێڵ، هۆمێ لیبری (کە دواتر ناوی گۆڕا بە ئێڵ، هۆمێ چاینا* دوائەوەی کە چەند لاپەڕێکی سانسۆڕ کرا) نووسخە بە دوای نووسخەدا، کە خودی کلیمینجوو دەینووسی، لەوەی کە چاودێری تەواوی پزیشکی بۆ سەربازانی بریندار لەگۆڕێدا نەبوو و لەبەرهۆی کەم و کورتی لە کەل و پەلی حەیاتی جەنگی ڕەخنەی توندی ئاراستە دەکرد. ڕەوتی بەرەوپێش چوونی شەڕ بەرەو کارەسات و نەهامەتی دەڕۆیی، ئەوانەی کە بەرپرس بوون زۆر ناکارامە و نەشیاو بوون. پۆینکاریێ ئاوری تێبەربوو و بەم شێوە گلە و گازەندەی کردبوو "ئەو بۆ خۆی باش دەزانێت کە ڕاستی ناڵێت و درۆم لە گەڵ دەکا و دەشزانێ کە دەستوور[یاسای بنەڕەتی] هیچ مافێکی بۆ من نەهێشتۆتەوە." ٧٦

پۆینکاریێ لە وڵامدا باش بێ فەزیحەتی پێکردبوو. لە یادداشتنامەکەی خۆیدا نووسیبووی "شێتۆکە، خەرەفاو، سووکوچرووک." بەڵام ئەوەی کە زۆر سەیرە ئەمەیە کە لە پرسە هەستیارەکاندا هەرکیان حەزیان لە یەکدەنگی هەبوو. هەرکیان ڕقیان لە ئەڵمان بوو و دڵەڕاوکێیان لێی هەبوو. هەروەها پۆینکاریێ بەدرێژایی ڕۆژەسەختەکانی شەڕ دژ بە بەزێنەران شۆڕشی کردبوو و کلیمینجووی وەک سەرۆک وەزیر هەڵبژاردبوو چوون لەوی ڕاددەی کە ئەڵمان بەچۆک دابێنی. بۆ ماوەیەکی کورت ئاگربەستێک هاتبووە ئاراوە. کلیمینجوو لە نوامری ساڵی ١٩١٧دا لەبەردەم یەکەمین کۆبوونەوەی کابینەکەیدا وتبووی کە "ڕایمۆند هاوڕێی دێرینم ئێستا، بڕیار وایە خۆشەویستی پێک بێنین؟" شەش مانگ دواتر پۆینکاریێ گلەیەکی خۆشی کردبوو کە گوایە کلیمینجوو لە گەڵی ڕاوێژی نەکردبوو. دوا کۆتایی

هاتنی شەڕ و سەرکەوتن، لە بەرانبەر جەماوەدا لە میّتز، پایتەختی نۆژەنکراوەی لۆراین، باوەشیان بە یەک داکردبوو، بەلاّم پێوەندیەکانیان هەر بە ناخۆشی مایەوە. پۆینکارێ سەبارەت بە بەڕێوەبردنی کار و بارەکانی کلیمینجوو دەروونی پڕ بوو لە زووخاو. ئاگربەس زۆر زوو هاتبوە ئاراوە: هێزەکانی فەڕەنسەیی دەبوایە زیاتر بەرەو ئەڵمانیا بچوونایەتە پێشێ. فەڕەنسە لە ئالاس و لۆراین زەختێکی قورسیان لێ دەچوو. پۆینکارێ کە خۆی خەڵکی لۆراین بوو هێشتا هەر پێوەندی لە گەڵ ئەوێ هەبوو و ئاگاداریان کردبۆوە کە زۆریەک لە دانیشتوانی لۆراین ئەڵمانی بەتوانا و کارامە بوون و بەرپرسانی فەڕەنسەیی زۆر دەستەکەمیان دەگرتن و سووک چاویان لێ دەکردن. کلیمینجوو کێشە ئابووریەکانی فەڕەنسەی بە هەند نەدەگرت و دەیخستنە پشت گوێ. سیاسەتی دەرەوەشی کردبوو بە چێشتی مجێور. لەم لاوە بۆ بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان بەری بەرەڵا کردبوو و شانی بۆ شل کردبوون و لەو لاشەوە بە کۆلۆنیەکانی[ناوچەکانی بن دەستی] ئەڵمانی یان ڕۆژهەڵاتی ناڤین بەهایەکی ئەوتۆی نەدەدا. کاتێکە کلیمینجوو ملکەچی ئەوە بوو کە زمانی ئینگلیزی شان بە شان و وێڕای زمانی فەڕەنسەیی ببێ بە زمانی فەرمی لە کۆڕی ئاشتیدا پۆینکارێ لە داخان ئاور بەربووە جەستەی. و نەیتوانی لەبەرانبەر زمانلووسی ڕکابەرەکەیدا ددان بە جەرگی خۆی دابنێت. ئەو ئەمەی نووسی بوو " هەمووی فەڕەنسەیەکان وەک خودایەکی تازە ئیمانیان پێ هێناوە. و منیش لە چاپەمەنیە ناسراوەکانی وڵاتدا سووکایەتیم پێدەکرێت... بێجگە لە سووکایەتی کردن هیچ باسێکی ترم لە سەر نیە."٧٧

سەرەڕای پێناخۆشبوونی پۆینکارێ و لۆبی کۆلۆنی بەهێز کلیمینجوو سەبارەت بە دەستبەسەرداگرتنی کۆلۆنیەکانی ئەڵمانی بایەخێکی ئەوتۆی نەدا و زۆر بە ڕۆژهەڵاتی ناڤین دڵی خۆش نەبوو. کورتەباسێکی ئەو سەبارەت بو ئامانجەکانی شەڕ بەرلەوەی کۆبوونەوەکە دەست پێبکات بەئانقەست بەشێوەیەکی دژوار و تەماوی دەری بڕی و باسەکە ئەوەندە دەبوو کە جەماوەری فەڕەنسەیی پێ دڵنیا بکاتەوە بەلاّم نەک ئەوەندە کە بیبەستێتەوە و ڕێگەخۆش کا بۆ هەندێک داواکاری ناخۆش و چاوەڕوان نەکراو. ڕاگەیاندنە ڕەسمیەکان لە ماوەی شەڕدا تەنیا و تەنیا ئاماژەیان بە ڕزگارکردنی بلژیک و ناوچەداگیرکراوەکانی فەڕەنسەی و ئازادی بۆ خەڵکانی چەوساوە و بەهەرلەونێک کە بووە ڕزگارکردنی ئالاس-لۆراینیان دەکرد. هەروەک بۆ ئەنجومەنی پیرانی ڕاگەیاند، کاری ئەو بریتی بوو لە نانەوەی شەڕ و چیتر نا. سەبارەت بە ئاشتی بە ڕۆژنامەنووسێکی ڕاگەیاندبوو کە "ئایا پێویستە بەرلەوەی داهاتوو بێت مرۆڤ

سەبارەت بە هەمووی ئەو کارانەی کە بڕیارە بیکا قسە بکا و بە ئەم و ئەوی ڕاگەیەنیٚ؟ نا".
لە ٢٩ی دیسامری ١٩١٨ لە ئەنجوومەنی پیران، کلیمینجوو لە لایەن کەسانی ڕەخنەگرەوە گوشاری زیاتری خرایە سەر تا زیاتر لە سەر وردەکاریەکان بکۆڵێت. ئەو وڵامی نەدایەوە. وت و ویژەکان خەریک بوون بە لاڕێدا دەچوون و وتی" پرسی ئاشتی زۆر بەربڵاو و بەرینە. من لێرە لەسەرمە بانگەشە بۆ هەندێک شت بکەم، بەڵام ناڵێم کە ئەوانە چین." لەوانەیە ئەو بیهەوێت هەندێک نهێنی زیاتر لە بەرژەوەندی فەڕەنسە بدرکێنیٚ. ئەو داوای دەنگی متمانەی کرد. ٣٩٨ دەنگی لە بەرانبەر ٩٣ دەنگ لەبەرژەوەندی ئەو تۆمار کرا. لەوە بەو لاوە کێشەی سەرەکی ئەو هاوپەیمانەکانی بوون.٧٨

# ٤

# لیۆد جۆرج و شاندی نوێنەرایەتی ئیمپڕاتۆری بەریتانی

لە ١١ی ژانویەدا، بۆ مەبەستی تێپەڕبوون لە چانێڵ[قەناتی ناو ئاو]،لیۆد جۆرج هەر بەو هێز و وزەی جارانەوە خۆی حەوادا سەر ڕووخێنەری[پاپۆڕ] بەریتانی. بە گەیشتنی ئەو بۆ پاریس سێ ناوبژیکەری[ئاشتیکەرەوی] سەرەکی، کە زۆر لایەن پشتیان پێ بەستبوون، لە ئاکامدا لە شوێنێک یەکیان گرتەوە. هەرچەند لیۆد جۆرج  تازە خەریک بوو لە گەڵ ویلسۆن ئاشنا دەبوو، کلیمینجووی هەر لە ساڵی ١٩٠٨ بەم لاوە کەم تا کورتێک ناسیبوو و ئاشنایەتی لەگەڵی هەبوو. یەکەمین دانیشتنی ئەوان  ئاکامێکی سەرکەوتوانەی نەبوو. لیۆد جۆرج کلیمینجووی تەواو ناشارەزا بە ئورووپا و ولاتەیەکگرتوەکان هاتبووە بەرچاو. هەستی سەرەتایی لیۆد جۆرج سەبارەت بە ئەو "کەلەڕەقێکی پیر، ناسازگار و نەحەواوە و تڕۆ و زمان پیس بوو. سەرێکی زلی پێوە بوو کە خێر و بەرەکەت و ڕێز و خۆشەویستی نەبێ هەچی شتی خراپەیە تێیدا بوو." کاتێکە لە ماوەی شەڕدا هەردوو کەسایەتی لە ڕێگاکان دەپەڕینەوە، لیۆد جۆرج دڵنیا ببۆوە لەوە کە چیتر تووتکە ترساندنەکەی جاران بە سەر چووە و باوی نەماوە. لە کاتی خۆیدا ئەو ئاماژەی بەوە دەکرد کە ئەو لەبەر ئەوە هاتبوو تا ئەوندەی لە دەستی دێ ڕێز و حورمەت لە کلیمینجوو بگرێ لەبەرهۆی نەقڵ و نەزیلە خۆشەکانی، کەسایەتی قورس و بەهێزی، گیانفەدایی و لێبوردەیی لەپێناو ولاتی فەڕەنسەدا. کلیمینجووش، بەش بە حاڵی خۆی، سەبارەت بە لیۆد جۆرج بەخیل و چاوپیس بوو، هەرچەند هەمیشە گلەیی ئەوەی دەکرد کە زۆر خراپ بارهاتبوو. پیرەپیاوی فەڕەنسەیی زۆر بە تووڕەیی دەیگوت کە کەی ئەو لە جوملەی "پیاوماقووڵانی ئینگلیزە!".٧٩

هەریەک لەو سێ کەڵەپیاوە لە ولاتی زێدی خۆیانەوە شتێکیان بە دیاری بۆ کۆڕی ئاشتی هێنابوو. ویلسۆن دڵناوایی ولاتەیەگرتوەکانی پێ بوو، دڵنیایی لە باوەڕبەخۆبوونێک کە شێوازی ئەمەریکی باشترین شێوازی ژیانە. و گومان لەوەی کە لەوانەیە ئورووپایەکان نەتوانن ئەمە ببینن. کلیمینجوو بیر و باوەڕی پتەوی نیشتمان پەروەری فەڕەنسەیەکانی پێبوو، کە لە سەرکەوتن خاترجەم

بوو و بەردەوام ترس و نیگەرانی ئەڵمانێکی بووژاوەی لە دڵدا بوو؛ و لیۆد جۆرج تۆڕێکی بەرینی ناوچە کۆلۆنیەکانی بەریتانیا و هێزی گەورەی زەریایی ئەو وڵاتەی پێبوو. هەر پیاوێک نوێنەری بەرژەوەندیە گەورەکان بوو، هەرچەند هەرکامیان تاکێکی بچووک بوون. ئەوان لە گەڵ خۆیان خاڵەلاوازەکان و خاڵە بەقوەتەکان، ماندوویەتی و نەخۆشیەکان، حەزەکان و ناحەزەکانیان پێبوو تا شەرت و شرووتەکانی ئاشتی پێ دامەزرێنن. لە مانگی ژانویە تا کۆتایی مانگی جوون، بێجگە لە مەودایەکی کورتی نێوان ناوەڕاستی فەوریە تا ناوەڕاستی مارس کاتێکە ویلسۆن گەڕابۆوە بۆ وڵاتەیەکگرتوەکان و لیۆد جۆرج بۆ بەریتانیا، هەرسێکیان ڕۆژانە، زۆرجار بەیانیان و دوانیوەڕۆیان، چاویان بە یەکتر دەکەوت. لە سەرەتاوە سەرۆک وەزیران و ڕاوێژکاران هاوڕێیەتیان دەکردن، بە لام مانگی مارس ئەوان بە نهێنی کۆ دەبوونەوە مەگەر سکرتیرێک یان دوان یان پسپۆڕێکی کاتیان لە گەڵ بایە. لە ڕادەبەدەربوونی ئەم دانیشتنە ڕوودەڕوویانە ئەوانی والێکردبوو کە بەباشی یەکتر بناسن، و یەکتریان خۆش بوێت و لەیەکتر قەڵس بن.

لیۆد جۆرج لە هەرسێکیان لاوتر بوو، دم و چاوێکی پەمەیی و هەمیشە دەم بەپێکەنین و چاوانی شینی دڵڕفێن و کۆیەک لە قژی سپی پێوە بوو. (کەرەتێکیان کیژۆڵەیەک لێی پرسی: "سەلام! ئەوە تۆ چارلی چاپلین نیت؟) کاتێکە شەڕی ناوخۆی ئەمەریکی- شتێک کە ویلسۆن بەجوانی لەبیری مابوو- کۆتایی پێهات ئەو تەمەنی تەنیا دوو ساڵ بوو. کاتێکە کلیمینجووی بیست ساڵ تەمەن شایەتحاڵی لەدایکبوونی ئەڵمانی نوێی پاش شکستی فەڕانسە بە دەست پراشاوە بوو، لیۆد جۆرج هێشتا هەر لە قوتابخانەی سەرەتایی دابوو. ئەو نەک تەنیا لاوتر، بەڵکوو گونجاوتر و لەبارتریش بوو. ویلسۆن ئەوەندە پابەندی پرەنسیپ و یاسا و ڕێساکانی خۆی بوو کە ترسی ئەوەی لێهاتبوو تووشی نەخۆشی بێت، و کلیمینجوو تاشەودرەنگان بە خەبەر دەمایەوە و لە فکری پێداویستیەکانی فەرەنسە دابوو. لیۆد جۆرج بەسەر قەیران و ئاڵۆزیەکاندا هەمیشە زاڵ بوو. هەروەک لۆرد رۆبیل سیسیل، کۆنەپارێزێکی سادە و ساکار، قەت ددانی خێری پێدا نەهێنا، بە دوودڵی و گومانەوە بە سەریدا هەڵدەکوت "ئەوەیکە لە کۆبوونەوەکەدا درێژەی هەبوو و ئەنجام دەدرا، هەرچەند دژوار و ئەرکی قورسیان دەخستە سەر پێگەی ئەو لەو کۆبوونەوەیەدا، لیۆد جۆرج لە لووتکەی بەرزی خۆڕاگریدا هەر مایەوە و تەکانی نەدەخوارد، زیرەک و وریا بوو و سەبارەت بەو کەسانەی کە لە گەڵی ئیشیان دەکرد قەت زمانی تاڵ و پیسی بەکار نەدەهێنا.".٨

لیۆد جۆرج لە نزیکەوە هەستی بە کارەسات و تراجیدیا کردبوو ئەوکاتەی کە کچە زۆر خۆشەویستەکەی لە دەست دابوو، و ئەو ساتە ناخۆش و تەنگانەی کە تووشی ئابرووچوون و

ئاڵۆزی و گێرە و کێشەی سیاسی هاتبوو کە مەترسی بوون بۆ سەر کار و پیشەی ئەو. ئەو لە ماوەی چوار ساڵی ڕابردوودا، یەکەم جار وەک وەزیری کەل و پەلی جەنگی و دواتر وەک وەزیری جەنگ، لە ژێر گوشارێکی قورس و دژواردا درێژەی بە خەبات و تێکۆشانی خۆی دابوو. لە کۆتایی ساڵی ١٩١٦دا، کاتێکە پێدەچوو کە هاوپەیمانان نەمابێتن و کۆتایان پێهاتبێت، لە سەرکردایەتی حکوومەتێکی یەکگرتوودا ئەرکی قورسی سەرۆک وەزیری گرتە ئەستۆ. وەکوو کلیمینجوو لە فەرەنسە، وڵاتی یەکگرتوو کرد و تا سەرکەوتن ڕێبەرایەتی کرد. لە ساڵی ١٩١٩دا لە هەڵبژاردنێکی سەرکەوتوودا ورە و هێزی هاتەوە بەر و یەکیەتیەکی سەخت و دژواری ڕێبەرایەتی کرد. ئەو لیبراڵ بوو؛ زۆربەی لایەنگران و ئەندامانی سەرەکی کابینەکەی کۆنەپارێز بوون. هەرچەند لە گەڵ ڕێبەری کۆنەپارێز، ئاندریۆ بۆنار لۆ، دۆستایەتیەکی گەرم و گوڕی نەبوو، پێویست بوو ئاگاداری ڕابردووی بوایە. ڕکابەری دوورخراوەی ئەو، سەرۆک وەزیری لیبرالی پێشوو هێربێرت ئاسکویت، لە ناو ڕەشماڵەکەی خۆیدا دانیشتبوو و کەوتبوە ناو گێژاوەی خەیاڵ و فکرەوە، و ئامادەیی ئەوەی هەبوو کە لە هەر سووچ و تاوانێک خۆش بێت. زۆریەک لە بەرژەوەندخوازان، وەک قامچیەکی پلە و پایە و مافی تایبەت، ڕابردووی ڕادیکاڵی ئەویان لەبیر بوو، و هەروەک چۆن سەبارەت بە ڕێبەری خۆیان دیزرائیلی لە خۆیان دەپرسی، سەبارەت بە ئەمیش دەیانوت بڵێی زۆر زیرەک و لێهاتوو بێت، بڵێی زۆر چالاک و ئازا بێت، بڵێی زۆر سەربە دەرەوە بێت. ئەو هەروەها لە گەڵ دوژمنانێکی بەهێز و بەتوانا لە ناو چاپەمەنیەکاندا ڕووبەڕوو بوو. بارۆنی[کەڵی گونرەشی] چاپەمەنیەکان، لۆرد نۆرت کلیف، کە ئەو نازناوەی لەبەر ئەوە هەڵبژاردبوو چون پیتەکانی سەرەتا هەر هەمان پیتەکانی سەرەتای نالۆئۆن بوون، خەریک بوو بەخێرایی نەخۆشی مێگالۆمانیا[شەیدای مەزنێتی] بەرەو نەخۆشی پانارۆیا[گومانداریێتی] تێدەپەڕاند، پێدەچوو هێمایەکی زوووەخت بووبێ لە قۆناخی سێهەمی نەخۆشی سیفلیسیس کە لەوانەبوو بوو بیکووژێت. نۆرتکلیف پێی وابوو کە ئەو بە پاڵپشتی کردن و بانگەشەکردن لە لیۆد جۆرج لە ڕۆژنامەکانی خۆیدا بە ناوەکانی، *تایمز و دەیلی مەیل*، ئەوی گەیاندبوە پۆستی سەرۆک وەزیری. ئێستا ئەو لەوەیکە پێکهاتە و دروستکراوی دەستی خۆی ملی نەدەدا بەوە کە ئەم[نۆرتکلیف] لە کابینەی شەڕ جێکاتەوە و یان لە ناو شاندی نوێنەرایەتی بۆ پاریس شوێنێکی بۆ مسۆگەر بکات توورە ببوو. ئەو بە دوای تۆڵەوە بوو.

لیۆد جۆرج وڵاتێکی لەبەر دەمی خۆیدا دەدی کە ئامادەیی تەواوی بۆ ئاشتی نەبوو، وڵاتێک کە کۆتایی هاتنی شەڕ چاوەڕوانی بێ جێ و ناماقووڵی هێنابوە ئاراوە: ئەمە کە

نانەوەی ئاشتی و تەبایی ئەرکێکی ئاسانە؛ ئەمە کە هەقدەستەکان و یارمەتیەکان زیاد دەکەن و باج و ماڵیاتەکانیش کەم دەکەن؛ ئەمە کە سازانی کۆمەڵایەتی دێتە ئاراوە، یان، بەسراوە بە بۆچوونی ئێوە، قەیرانی کۆمەڵایەتی. نەدەکرا ڕای گشتی پێشبینی بکرێت: جارجارە هەڵوێستی تۆڵەئەستێن و جاروباریش هەڵوێستی دوورەپەرێزانە. ناسراوترین کتێبی ساڵی ١٩١٩ بەناوی *میوانانی لاو*، ڕۆمانێکی کۆمێدی بوو کە نووسەرەکەی منداڵێک بوو. هاوکات کە لە پاریس بوو، لیۆد جۆرج دەبوایە بۆ قەیرانی کار، شۆڕشەکانی پەرلەمانی و برینی سارێژنەبۆوەی ئیرلەند کاتێکی تەرخان بکردایە. کەچی وەها خۆی لە وت و وێژەکانی پاریس هەڵدەقوتاند کە گوایە مێشکی بە هیچ کێشەیەکی ترەوە خەریک نیە.

نۆرتکلیفی چەواشەکراوی هەژار و داماو لەکوێ شێوەی ناپلۆئۆنی دەدا، بە پێچەوانە، ئەو لەو کەسانە بوو کە ناپلۆئۆن ڕقی لێیان بوو. ناپلۆئۆن کەرەتێکیان سەبارەت بە خۆی وتبووی" وەکوو کاسە و کەوچکی ناو دۆلابێک، شتی جۆراوجۆر و بابەت و تەوەری جیاجیا لە مێشکمدا ڕێک دەخرێن و خۆیان دەوروژێنن. کاتێکە ئارەزوو دەکەم هەودایەکی خەیاڵ بپسێنم، ئەو ڕاکێشە دەبەستم و یەکیدی دەکەمەوە-کاتێکە ئارەزووی خەو دەکەم، هەرهەمووی ڕاکێشەکان دەبەستم و لەو کاتەدا خەو بردوومیەتەوە." لیۆد جۆرجیش هەر وەکوو ئەو لەکاتی هێرش کردندا هێز و وورەی تازەی دەهاتەوە بەر و تەواو بیر و هەست و هۆشی دەخستە سەر مەبەستەکەی. بۆ هاوڕێیەکی وێلزی گێڕابۆوە کە "ئینگلیزیەکان قەت بۆ هەڤاڵانی خۆیان ڕێز دانانێن مەگین ئەوکاتەی کە ئەم هەڤاڵانە بیانبەزێنن؛ ئیتر لەوە بەولاوە دەبن بە هاوڕێی نزیکی یەک و لە گەڵیان بەسۆز دەبن."٨١

وەکوو ناپلیۆن، لیۆد جۆرجیش لە هەستکردن بەوەی کە کەسانیتر چۆن بیر دەکەنەوە توانایەکی سەیر و سەرسووڕهێنەری هەبوو. بە فڕانسۆ ستێڤێنسۆنی وتبوو کە حەز بە مانەوە لە هۆتێلەکاندا دەکات: " من هیوایەتێکی تایبەتم بەناو خەڵکدا هەیە- لە خۆم دەپرسم بڵێی ئەو خەڵکانە کێ بن- بڵێی چۆن بیر کەنەوە-دەبێ ژیانیان چۆن بەسەر بەرن- بڵێی ژیان چێژیان پێ ببەخشێت یان ژیان لای ئەوان قوزەڵقۆرت و ژەهری مار بێت." هەرچەند لە وت و وێژکردندا زۆر قسەی دەکرد، لە هەمان کاتیشدا گوێگرێکی باش بوو. لە کەسانی زۆر ناودار و بەهێزەوە بگرە تا دەگاتە کەسانی لاواز و نەناسراو، لە گەورەساڵانەوە بگرە تا دەگاتە منداڵان، هەرکەسێک کە لە گەڵی دادەنیشت ئەو هەستەی پێ دەبەخشرا کە دەبێ شتێکی بەنرخی بۆ وتن پێ بێ وا بەجوانی گوێی بۆ شل دەکرێت. لە ڕوانگەی چێرچیلەوە " یەکێک لەو تایبەتمەندیە هەرە جوان و پەسەندکراوانەی کەسایەتی بەڕێز لیۆد جۆرج " لە لووتکەی هەرە بەرزی قودرەت و دەسەلات،

بەرپرسایەتی و بەختەوەری خۆیدا هەتابلێی لەوشتانەی کە پییان دەڵێن فیز و دەعیە و خۆبەزلزانی دوور و ئازاد بوو. هەموو کاتێک خۆڵینە و پۆتینە بوو. سەبارەت بە ئەو کەسانەی کە بەتەواوی لە گەڵی تێکەڵ بوون و باش دەیانناسی لە هەموو کاتێکدا یەک ڕوو و یەک شێوە هەڵس و کەوتی هەبوو. هەموو کاتێک ئامادەیی ئەوەی هەبوو لە سەر هەر بابەت و هەر خاڵێک باس و خواست بکات، گوێ ڕادێرێتە حەقیقەتە تاڵەکان تەنانەت کاتێکە بە ئاڵۆزیەوە پێشکەش دەکران." ئەم ئێسک سوکی و خوێنشیرینیەی ئەم کابرایە لەم خۆتێهەڵقوتاندن وسەرنجدانەی ئەو لەسەر هەر باسێک، سەریان هەڵدابوو.٨٢

لەهەمانکاتیشدا لیۆد جۆرج وتاربێژێکی هەرە مەزن بوو. ئەگەر کلیمینجوو لە ماڵەوە سەرنج و تێبینیەکانی خۆی بە شۆخی کردن و بە شرۆڤەکردن و لە هەمان کاتدا بە ئامۆژگاری کردنی ویلسۆن دەسازاند و ئامادەی دەکرد، وتارەکانی لیۆد جۆرج هەتابلێی خۆڕسک بوون و بە ووردبینیەکی زۆرەوە ئامادەکرابوون، بزوێنەر و پڕ لە نەقل و نەزیلەی خۆش خۆش بوو، ئێلهامیان دەبەخشی و زایەڵەی دەنگیان دڵیان دەبزواند. وەک ئەکتەرێکی گەورە دەست و بردێکی سەیری هەبوو و سەیرکاری دەکردە سەر گوێگرەکانی. ڕایەکیان کەسێک سەبارەت بە ئەم تەکنیکە پرسیاری لێکرد و ئەویش لە وڵامدا وتی "من دەوەستم و لەنگەر دەگرم، دەستم بەرەو جەماوەر ڕادەدێرم و سەرنجیان بۆ لای خۆم ڕادەکێشم. ئەوانیش وەک منداڵ دووم دەکەون. بەڵێ وەک منداڵە وورکە."٨٣

جان هاینارد کاینس کە وەک وەزیری دارایی دەچوو بۆ پاریس و سەبارەت بە کۆڕی ئاشتی زۆری خۆ ماندوو کرد تا ئەفسانەی لێدروست بکات، ئەفسانەیەکی تایبەتی بۆ لیۆد جۆرج چنی. ئابووری ناسی گەورە پرسیاری کرد کە "چلۆن دەتوانم ئەم هەموو هەست و سۆزە لەم کەسایەتیە مەزنەی سەردەمی خۆمان، ئەم هەڵبەستوانە ئێسک سووکە، ئەم میوانە ئاسمانیە بۆ ئەم قۆناغە ژینەی ئێمە لە دارستانە دڵڕفێن و سێحراویەکانی سەردەمانی کۆنی سێلتیکەوە بە خوێنەری هێژا بناسێنم؟". هەر ئەو دەنگە هەم باسی کامبریجی کرد وەک مەڵبەندێکی ڕۆشنبیری و هەم ژان بۆڵ وەک مرۆڤێکی بێ هەست و نەست، بەڵام هەمووی ئەو شتانەی کە باسی کردن هەڵیت و پڵیت و خەیاڵی و دوور لە ڕاستی بوون. بەڵام وێلزی ڕاستەقینە کە لیۆد جۆرجی لێ گەورە بوو ناوچەیەکی بچووک بوو بە کەش و هەوایەکی نەرم و نیانەوە و کانزاکانی خەڵووز و کارگای کەشتی سازی، و ماسیگران و وەرزێرانیش تێدا بەدی دەکرا،٨٤

لیۆد جۆرج حەزی دەکرد باسی سەرەتاکانی ژیانی خۆی بکا لە ناو کۆخێکی سادە و بچووکدا، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت ئەو لە چینێکی ڕۆشنبیری پیشەسازەوە سەری هەڵدابوو. باوکی، کە

کاتێکە ئەو هێشتا زۆر منداڵ بوو کۆچی دوایی کردبوو، بەرپرسی قوتابخانە بووە؛ مامی کە ئەوی بەخێو کرد وەستای پینەچی و ئامۆژگاریکەری ئاسایی کەنیسە و لە گوندە بچووکەکەی خۆیدا خاوەن ڕێز و حورمەتێکی تایبەت بووە. وێلز وەک خاڵێکی گەڕانەوە و ئاماژە لای لیۆد جۆرج زۆر گرنگ بوو، جا ئەم گرنگایەتیە لەبەرهۆی ئەو مەودا دوورە بێ کە ئەو بڕیبووی یان ئەوەتا لەبەرهۆی سۆز و خۆشەویستیەکە سەبارەت بەو شوێنە هەیبوو. (هەرچەند زوو وەڕەز دەبوو ئەگەر کاتێکی زۆری تەرخان بە باس کردنی ئەوێ کردایە.) ئەو زۆر زوو خۆی لە قۆناغێکی بەرزتردا دیبۆوە. چ قۆناغێک بەرزتر لە پێتەختی گەورەترین ئیمپراتۆری جیهان؟ هەروەک بۆ کچێکی لادێی نووسیبوو کە دواتر بوو بە خێزانی"تەنیا شتێکە لە ژیانمدا خەونی پێوە دەبینم ئەوەیە کە بەرەو پێشەوە هەنگاو بنێم."٨٥

ئەو بەبۆنەی مامیەوە زۆر بەختەوەر بوو چونکە ئەوەی پێویست بێ بۆی دابین کردبوو و ژیانی خۆی لەپێناو ئەمەدا دانابوو. و کاتێک هەستی بەوە کرد کە ئیمانی سەبارەت بە خوا لە دەست داوە، ئامۆژگاریکەری ئاسایی لێی خۆش ببوو. کاتێک بڕیاری دابوو لە یاسا سەردەرهێنێ مامی کتێبێکی ڕێزمانی فەڕەنسای لەگەڵ کار دەکرد کە پلەیەک لە سەرووی خۆیەوە بوو تابەڵکوو ئەو مەرجانەی کە پێویستی زمانە فێری بێت. کاتێک بڕیاری دابوو لە سیاسەت سەردەرهێنێ، وەک قومارێکی گەورە بۆ کەسێک کە نە پارەی بوو و نە پێوەندی، ئەمجاریش هەر مامی پشتی گرت. تەمەن ئەوەندە مەودای دا بە کابرای پیر تاکوو بە چاوەکانی خۆی ببینێ کە بەرازکەی دەبێ بە سەرۆک وەزیر.٨٦

لیۆد جۆرج بۆ سیاسەت داتاشرابوو. لە کاری قورس و تاقەتپڕووکێن لە وەتاغەکانی لێژنەوە بگرە تا دەگاتە هەڵمەتە گەورەکان، ئاشقی هەرهەموویان بوو. لە قسەپێبڕین و هەستانە سەرچۆکی کاتی مشت و مڕەکان چێژی وەردەگرت و لەهەمانکاتیشدا هەتا بڵێی لەسەرەخۆ و هێواش بوو. بەپێچەوانەی ویلسۆن و کلیمینجوو قەت لە نەیارەکانی ڕقی هەڵنەدەگرت. ئەو لە سیاسەتیشدا ڕووناکبیر نەبوو. هەرچەند بەربڵاو بابەتی دەخوێندەوە، وای پێ باش بوو مێشکی پسپۆڕان گوڵبژێر بکات. کەس نەیدەتوانی پێی بگاتەوە: ئەو بێ پسانەوە لە سەر بابەتەکەی دەڕۆیی و قسەی دەکرد. کەڕەتێکیان لە سەردەمی کۆڕی ئاشتیدا کەینێس و هاوکارێکی هەستیان بەوە کرد کە بە هەڵە کورتەباسێکیان سەبارەت بە ئادریاتیک پێشکەشی ئەو کردبوو. ئەوان بەپەلە هەڵوێستێکی پێداچوونەوەیان خستە سەر بەرگی کاغەزێک و خۆیان کرد بە ناو کۆڕەکەدا، لیۆد جۆرجیان دیەوە کە تازە بابەتەکەی دەست پێکردبوو. کاتێکە کەینێس بابەتەکەی خستە بەردەمی، لیۆد جۆرج چاوێکی پێدا خشاند و، بێ

پسانەوە، بەرەبەرە باسەکەی ساخکردەوە تا بە گرتنەبەری هەڵوێستێکی دژبەرانە سەبارەت بەو بابەتەی کە دەستی پێکردبوو باسەکەی کۆتایی پێهێنا.٨٧

ئەو هەر زوو وەک سیاسەتمەدارێکی خاوەن بیری ڕادیکاڵ جیگا پەنجەی خۆی دانا و خۆیەکی نیشاندا. ئەگەر ویلسۆن هێرشی دەکردە سەر بانکە گەورەکان و کلیمینجووش سەر کلیسا، خاڵە ئامانجەکانی لیۆد جۆرج خاوەن زەوی و زارەکان و سیستەمی دەرەبەگایەتی بوو. ئەو ئەلاقەیەکی تایبەتی بە تاجران بوو، بەتایبەت ئەوانەی کە لەسەر پێی خۆیان بوون و خۆیان خۆیان دروست کردبوو. (خێزانەکانی ئەوانیشی هەر خۆش دەویست.) وەکوو وەزیری دارایی ئەو باجەکانی ڕادیکاڵی هێنایە کایەوە، بۆ دەوڵەمەندەکان باجی داهات و هاوڕێ لەگەڵ ئەمەش بۆ هەژارانی یارمەتی پێشنیار کرد، بەڵام سوسیالیست نەبوو. ئەویش وەکوو کلیمینجوو لەگەڵ بیروباوەڕی سیستەمی ئابووری هاوچەشن کۆک نەبوو، بەڵام هەموو کاتێک ئامادەیی ئەوەی هەبوو لەگەڵ سوسیالیستە میانڕەوەکان کار بکات هەروەک چۆن ئامادەیی ئەوەی هەبوو لەگەڵ کۆنەپارێزان کار بکات.٨٨

لە سەراسەری ئەو ماوەی کە کاربەدەست بوو ئەو کاری بەڕێوەبەرێکی زۆر کارامەی دەکرد، هەرچەند بەشێوەیەکی فەرمی بەڕیوەبەر نەبوو. ئەو بە هێنانەکایەی پیاوانی بەتوانا و کارامە لە دەرەوی خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی ڕەوتە دامەزراوەیەکانی خستە لەرزین تا بەشە جۆراوجۆرەکانی حکوومەت بخاتە گەڕ و سەرکەوتنی پلانەکانی خۆی بە بانگهێشتکردنی هەموو پارتەکانی قازانجبەر بۆ ئاڵوگۆڕکردنی بیروبۆچوونیان سەبارەت بە پلانەکان مسۆگر کرد. ئەو بە بانگهێشتکردنی هەردوولا بۆ ئەوەی لەگەڵی دانیشن و تاو و توێی کێشەکە بکەن، ناکۆکیەکانی پارتی کرێکاری داکووژاند، ڕەنگە ئەمڕۆکە هەنگاوێکی ئاسایی چارەسەرکردنی کێشەکان بێت بەڵام لەوکاتەدا شتێکی زۆر سەیر و نائاسایی بوو. شایەتحاڵێک سەبارەت بە داکووژانی کێشەیەکی ڕێگای شەمەندەفەڕ بە دەستی ئەو وتبووی کە: "ئەو وەکوو ژێکانی ئامرازێکی مۆسیقا پیاوان بەدەوری مێزێکدا دەژەنێت، بەپەلە یەکبەدوایەک دەیانخاتە ژەنین تاوێک بە پاڕانەوە و لالانەوە، تاوێک بە دنەدان و هاندان، جارجارە قورس و قایم، ڕایەکی تر شۆخی و گاڵتەکردن و لەکاتی خۆشیدا بە هەڕەشە و گوڕەشەکردن. ٨٩"

هەمیشە گەشبین بوو و دڵنیابوو لەوەی کە هیچ کێشەیەک نییە بێ چارەسەری بمێنێتەوە تەنانەت ئاڵۆزترینی کێشەکانیش. هاوڕێی یەکێک لە منداڵەکانی ئەو گێڕابوویەوە کە " لای لیۆد جۆرج هەموو بەیانیەک ڕۆژێکی نوێ نیە، بەڵکوو ژیانێکی نوێ و دەرفەتێکی نوێیە.".٩٠ هەندێکجار ئەو دەرفەتانەی کە ئەو دەیگرت مەترسی دار بوون، و ئەو لە هەندێک مامەڵەی ئاڵۆز و گوماناوی دەئالا-

کانزایەک لە ئارژانتین یان کڕینی سەهام لە شوێنێک کە ئەو زانیاری ناوخۆی هەبوو- بەڵام پێدەچێ کە هاندەری سەرەکی ئەو خولیابوونی سەربەخۆیی ماڵی بوو بێت تاکوو تەماح و چاوچنۆکی. زۆر بە ژیانی تاکەکەسی و خێزانی بەهای نەدەدا. ئەگەر کار و بار و پێوەندی کلیمینجوو لە گەڵ ژنان بوو بە هۆی زیاتر ناوبانگ دەرکردنی، لیۆد جۆرج زیاتر لە دوو کەڕەت لە کارەسات نزیک بۆوە کاتێکە مێردە تووڕەکان هەڕەشەیان لێکرد کە ناوی دەخەنە ناو هەوڵدانەکانی جیابوونەوە. هاوسەرەکەی کە ژنێکی خاوەن ئیرادە بوو لە لایەن شوەکەیەوە پاڵپشتی لێدەکرا، بەڵام تووشی جیابوونەوە هاتن. ئەو[هاوسەرەکەی] حەزی دەکرد لە گەڵ باخچەخۆشەویستەکەی خۆی لە باکوور لە وێلز بمێنێتەوە؛ ئەمیش بە ژیانی هاوبەشی کاتی خووی گرتبوو. لە ساڵی ۱۹۱۹ لەگەڵ مامۆستا ژنێکی تەنیا کە بۆ دەرسدان بە کچە چکۆلەکەی بە شێوەیەکی تایبەت هاتوچۆی ماڵیانی دەکرد، ژیانی خێزانی دروست کرد و لە ڕاکەڕاکە کەوت. فرانسێس ستێڤینسۆن ژنێکی خوێندەوار، کارجوان و خاوەن بیر و هزر بوو، خۆشەویستی پێ بەخشی و بووە هۆی ڕێکخستنی ئۆفیسەکەی جۆرج.

زۆرجار خەڵک بە هەلپەرستێکی تەواو ناویان لە لیۆد جۆرج دەبرد. کەڕەتێکیان کلیمینجوو وەک ڕاوێژکارێکی ئینگلیزی ئەوی دەرکرد: "هەمووی وتووێژەکان لای ئەو باشن کاتێک ئەو ئارەزووی بردنەوەی بابەتێک دەکات، ئەگەر پێویست بێ، ڕۆژی دواتر لەو باسانە کەڵک وەردەگرێت کە ڕۆژی پێشتر بەرەنگاریان بۆتەوە." ویلسۆن، کە لە کاتی پێ هەڵکەوتنی کەسانی تر چاوەکانی تیژ دەبۆوە، لای وابوو کە لیۆد جۆرج دوور لە پرەنسیپ و دابو دەستوورە. ئەو خۆزگەی ئەخواست کە "بۆ دانووستان و مامەڵەکردن تەرەفەکەی کەسێکی هەڵەکار نەبێت وەکوو لیۆد جۆرج چون ئەو هەمیشە خەریکی کات بەفیڕۆدان و مەداراکردنە."ئەوەی ڕاستی بێت، لیۆد جۆرج پیاوێکی خاوەن پرەنسیپ و بەداب و دەستوور بوو؛ بەڵام ئەو هەموو کاتێک حەقیقەتبینیش بوو. ئەو وزە و توانایی خۆی لەسەر بزووتنەوە خەیاڵی و ئارمانیەکان بەفیڕۆ نەدەدا. ئەو دژی شەڕی بۆئێر بوو، کاتێکە بەریتانیا بۆ شەڕی کۆماریەکانی ئەفریقای بچووکی باشوور خۆی دانابوو، چون ئەو لای وابوو کە ئەوە شتێکی هەڵە بووە و دەبوە هۆی ماڵوێرانی. جەماعەتی جەسووری ئۆپۆزسیۆن غیرەتیان بزووت و کاتێکە ئەو خەریکی پێشکەش کردنی وتارێک بوو کۆمەڵێکی ڕق هەستاو لە بێرمینگهام هێرشیان کردە سەر سەکۆیەکە لەوێوە وتاربێژی دەکرد و لەم ڕووداوەدا خەریک بوو بیکووژن وگیانی لە دەست بدا. بەڵام ئەمە لەباری سیاسیەوە بە قازانجی تەواو بوو. کاتێکە حکوومەتی بەریتانی تووشی هەڵە هات و نەیتوانی ئاشتیەکی باش دابین بکات، لیۆد جۆرج وەک ڕێبەرێکی نەتەوەیی دەرکەوت.۹۱

کاتێکە شەڕی گەورە دەستی پێکرد، هێچ گومانێک لەوەدا نەبوو کە ئەو نەتوانێ لە هەڵمەت و تێکۆشانی شەڕی بەریتانیدا ڕۆڵی خۆی بگێڕێ. چێرچیل، هاوڕێیەکی نزیکی ئەو، سەبارەت بە ئەو نووسیبووی " لیۆد جۆرج لە هەرچی کەسە وورەی زیاترە و تێڕوانینی باشتر و درووست تری هەیە. لە ڕاستیدا ئەو قەت قەپاڵی گەورە داناگرێ و بە قەد بەرەی خۆی لاق ڕادەکێشێ و خۆ لە شتێک نادا کە لەخۆی ڕانەبینێت." ئەو بە شاندێکی نوێنەرایەتی پارتی کرێکاری لە ساڵی ١٩١٦ ڕاگەیاندبوو کە قەت شەڕی پێ خۆش نیە، بەلاَم، "کاتێکە بەردەرکەی پێگرتی و تێوەگلای پێویستە خۆی تێهەڵقوتێنی،دەنا لەوانەیە ئەو هەلانەی کە بۆ سەرکەوتن بۆت دەڕەخسێن لە کیسی بدەی." کۆنەپارێزی پیر و ژیر، ئارتۆر باڵفۆر، هاتن و ڕۆیشتنی ڕێبەرانی بە چاوەکانی خۆی دیبوو. سەبارەت بە لیۆد جۆرج وتبووی کە " ئەو سەرەڕۆیە. ئەو بەرلەشەڕ قەت بیر و سەرنجی بە کار و بارەکانی نیزامی نەداوە و بە ووردبینیەوە نەچۆتە پێشێ؛ ڕەنگە خۆی بە خۆی نەزانیبێ کە چەندە ناشارەزایە و دوورەپەرێز لە ڕاستیەکان وەستاوە؛ و ئەو هەندێک تایبەتمەندی تایبەت بەخۆی هەیە کە هەندێک جار وات لێدەکا کە نەتوانی لە گەڵی هەڵکەی."بەلاَم، بە بڕوای باڵفۆر، سەرەڕای ئەمانەش ئەو بۆ ڕێبەرایەتی کردنی بەریتانیا داتاشرابوو و کەسی تر نەیدەتوانی وەکوو ئەو سەرکەوتوانە ئەو ئەرکە بەجێ بینێت.٩٢

هەرچەند لیۆد جۆرج لە گوندەکەی خۆیەوە لە باکووری وێلز ڕێگایەکی دوور و درێژی بڕیبوو، قەت نەیتوانی لەگەڵ چینەباڵادەستەکانی ئینگلیز خۆی یەک خا و خۆی بە ئەندام و بەشێک لە ئەوان بزانێت. نە خۆی و نە خێزانی قەت پێیان خۆش نەبوو سەردانی کۆشکە گەورەکانی ولاَت بکەن، و قەت بەدڵی دانەدەهات لە گەڵ شا و شاژن بمێنێتەوە. کاتێکە جۆرج ڤی لە کردنەوەی پەڕلەماندا، بۆ ڕێز لێنان، داوەتی لێ کردبوو کە شمشێری دەوڵەت هەڵگرێ بەنهێنی پێی وتبوو کە " قەت پێم خۆش نیە نۆکەری بکەم" و تەمەنای کردبوو کە پێداگری نەکات. زۆربەی هاوڕێکانی وەکوو خۆی لەسەر پێی خۆیان بوون و خۆیان خۆیان بارهێنابوو. باڵفۆر، کە سیسیل بوو، لە بنەماڵەیەکی ناودار و کۆن، کەسێکی هەڵکەوتە و دەگمەن بوو. و باڵفۆر، کە بە دڵ پێی خۆش بوو پلەی دووهەم بۆ خۆی مسۆگر بکات، پۆستی وەزیری دەرەوەی بۆ ئەو پڕ بە پێست دەزانی.٩٣

لە پاریس، هەرکات کە لە دەستی دەهات ستافەکەی خۆی، کە لە لاوانی ڕۆشنبیر درووست ببوو، بەکاربێنێت وەزارەتی دەرەوەی لەبەرچاو نەدەگرت و گوێی نەدەدایە. بەتایبەت بۆرۆکراتەکان خۆشیان لە فیلیپ کێرری ڕەوشت بەرز، بەدین و بەفیز، وەک سکرتێری نهێنی ئەو، نەدەهات. چون لیۆد جۆرج خۆشی لە خوێندنەوەی یادداشتەکان نەدەهات، کێر، کە لە گەڵ نامەنووسین و نامەناردن دەست و پێوەندی هەبوو، دەرگای سەرەکی پیاوانی گەورە بوو. تەنانەت بالفۆریش سەرلۆمەکرا

کاتێکە لە کێری پرسی بوو کە ئایا سەرۆک وەزیر بەڵگەیەکی تایبەتی خوێندبۆوە و نەخێری پێ وترابێ. " نەک هەر هەمان هشت، وانیە، فیلیپ؟" دیپلۆماتە لێزانەکان کەوتنە بۆڵە بۆڵ کردن، و لیۆد کۆزن، کە لە لەندەن مابۆوە تا بە کار و باری شتکرین ڕابگات لە حاڵێکدا بالفۆر و لیۆد جۆرج لە پاریس بوون، نارەحەت بوو. سەرۆک وەزیر هەر گوێشی نەدایە.٩٤

ئایا ئەمە بۆ بەریتانیا شتێکی خراپ بوو؟ دیار بوو کە ئەو بە قەد هاوتای پێشوی خۆی، لۆرد سالیسبێری، و جێگری دواتری خۆی، چیرچیل، سەبارەت بە کار و باری دەرەوە شارەزایی نەبوو. لە ئاستی زانیاریدا بۆشایەکی زۆری تێدا هەست دەکرا. لە ساڵی ١٩١٦دا پرسیاری کردبوو کە " ڕاستی سلۆڤاکەکان کێن؟. هەر نازانم لە کوێ هەڵکەوتوون و شوێنی دانیشتنیان کوێیە."لە جوگرافیاشدا هەست بە بۆشایەکی زۆری تێدا دەکرا. چەند سەیرە کە لە ساڵی ١٩١٨دا بە ژێردەستێکی خۆی وتبوو کە تازە بۆی دەرکەوتووە کە نیووزیلەند لە تەنیشت ڕۆژهەڵاتی ئوستراڵیا هەڵکەوتوە. لە ساڵی ١٩١٩ کاتێکە هێزەکانی تورکیە لە مەدیتەرانەوە بەرەو ڕۆژهەڵات پاشەکشێیان کردبوو، لیۆد جۆرج سەرسوورهێنەرانە باسی گەشتیکی ئاسمانی بەرەو مەکە کردبوو. کۆرزۆن بە تووڕەییەوە وتبووی "ئانکارا". لیۆد جۆرج وەک نەبای دیبێ و نەبۆران لە وڵامدا وتی: "جا بەس نیە لۆرد کۆرزۆنمان لە گەڵە لە سەر شتی هەڵیت و پلێیت جار و بار ئامۆژگاریمان دەکا." کەچی زۆربەی جارەکان ڕووبەرووی ئەنجامی شیاو و گونجاو دەبۆوە. (هەرچەند هۆگری و بە تاسەو تینەوە بوونی ئەو بۆ بەئەنجام گەیاندنی ئەرکەکان جاروبار تووشی هەڵەی دەکرد، بۆ وێنە پاڵپشتی کردن لە یوونانێکی گەورەتری بووژاوەدا.) لە جەنگەی شەڕدا بە هەڤاڵێکی خۆی وتبوو کە پێویستە ئەڵمان سزای بدرێت نەک ئەوەیکە برووخێنرێت. ئەمە نە لە قازانجی ئورووپادا بوو نە ئیمپراتۆری بەریتانی، بەڵکوو بۆ ڕووسیەیەکی بەهێز بواری خۆش دەکرد. ئەو باش دەیزانی بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا لەکوێ پەنگیان خواردۆتەوە: تجارەتەکەی و ئیمپراتۆریەکەی، هاوڕێ لە گەڵ دەسەڵاتی دەریایی بۆ پاراستنیان و هاوسەنگیەکی قودرەت لە ئورووپا بۆ بەرگری کردنی هەڕەشەی هەر هێزێک بۆ سەر ئەم بەرژەوەندیانە.٩٥

ئەو ئەمەی بۆ دەرکەوتبوو کە بەریتانیا تەنیا خۆی نەیدەتوانی بە ئەم مەبەستانە بگات. هەرچەند، هێزی نیزامیەکەی گەورەبوو، خێراتر بەرەو لاوازی دەچوو هەتا وڵات زیاتر بۆ دواوە بەرەو قۆناخێکی ئاشتی هەنگاوی بنایە. بە درێژایی ساڵی ١٩١٩دا، قەبارەی ئەرتەش لە سێ بەش دوو بەشی ماوە کاتێکە جار لە گەڵ جار بەرپرسایەتیەکانی بەریتانیا زیاتر دەبوون، لە وڵاتانی بالتیکەوە بگرە تا ڕووسیە تا ئەفغانستان، و زیاتر لەناوی ئیمپراتۆریدا تووشی کێشە دەبوو، لە هێند، میسر و ،

لەبەردەمی خۆی، ئیرلەند. " هیچ هێزێک لە گۆڕێدا نیە تاکوو حەواڵەی بکەین." ئەمە وڵامێکی دڵساردکەرەوە بوو کە لە لایەن ستافی گشتیەوە لە بەرانبەر ئەو داواکاریانەی کە بەردەوام ئاراستە دەکران ڕاگەیەنرا.٩٦ لە بوارەکانی ئابووریدا جارلەگەڵجار ئەرکی دەسەڵات قورس و قورستر دەبوو. چیتر بەریتانیا ناوەندی ئابووری جیهان نەبوو؛ بەڵکوو ئەمە کەوتبووە ئەستۆی وڵاتەیەکگرتوەکان. هەروەک سەرۆک وەزیر بە باشی دەیزانی بەریتانیا بڕێکی زۆر خۆی بە قەرزداری وڵاتەیەکگرتوەکان دەزانیێ. بە گەشبینیەکی هەمیشەیی کە لە گەڵی بوو، ئەو هەستی دەکرد کە دەیتوانی بۆ قەرەبووی لاوازیەکانی بەریتانیا پێوەندیەکی باش لە وڵاتەیەکگرتوەکان دامەزرێنێت. پێدەچوو ئەمەریکا بەرپرسایەتی ئەو ناوچانەی کە لەباری ستراتیجیکەوە گرنگ بوون وەکوو دەربەندەکانی کۆنستانتینۆپل بگرێتە ئەستۆ.

* * * *

بە بەراورد لەگەڵ فەرەنسا و ئیتالیا، بەریتانیا بە دەستێکی باشتر و ئاوەڵاترەوە چووبوو بۆ کۆڕی ئاشتی. ناوگانی ئەڵمانی، کە لەسەرتاسەری جیهان هەڕەشەی لە دەسەڵاتی بەریتانیا دەکرد، بێ گێرەو و کێشە و دوور لە مەترسی کەوتبوە ناو دەستانی بەریتانیەکان، کەشتیەکانی ڕووەکی لە سکاپا فلەو لە ئۆرکنایس و زۆربەی ژێردەریایەکان لە هارویچ لە سەر قەراخ ئاوەکانی ڕۆژهەڵاتی باشووری ئینگلیز. ویژگە خەڵووزیەکان، بەندەرەکان و ویژگەکانی تێلێگراف لە لایەن ژاپۆن یان ئیمپراتۆری بەریتانیاوە دەستبەسەریاندا گیرابوو. لیۆد جۆرج لە پاریس وتبووی کە " ئەگەر دوازدە مانگ لەوە پێش تۆ بە خەڵکی بەریتانیات بوتایە کە ئەو شتانەی کە ئەوان هەیانە بە متمانەوە دەپارێزرێن و مەترسیان لەسەر نامێنێت، گاڵتەیان پێدەکردی و سەرلۆمەیان دەکردی. هێزی زەریایی ئەڵمان خۆی بە دەستەوە داوە؛ کەشتیرانی بازرگانی ئەڵمان خۆی بە دەستەوە داوە، و ناوچە بن دەستەکانی ئەڵمانیا لەکیسچوون. یەکێک لە ڕکابەرە سەرەکیەکانی بازرگانی ئێمە زۆر خراپ تووشی ئیفلیجی هاتووە و هاوپەیمانانی ئێمە خەریکن دەبن بە گەورەترین قەرزدەرەکانی. ئەمەش دەسکەوتێکی کەم نییە. مەترسی و هەڕەشەمان بۆ سەر مڵک و ماڵاتی خۆمان لە هیندستان نەهێشتووە و کۆتاییمان پێهێناون." ڕووسیە، کە لەدرێژەی دەستدرێژیەکانی بەرەوباشوور لەسەراسەری سەدەی نۆزدەهەمدا، بەرەکانی پیاوانی سیاسی بەریتانیای نیگەران کردبوو، لانی کەم بۆ ماوەیەکی کورتیش بێت، وەکوو هێزێک کۆتایی پێهات، و بە درێژایی سەراسەری سنوورەکانی باشووری ئەو وڵاتە، لە ئێران و لە قەزاقستان، هێزەکانی بەریتانی و کاریگەری بەریتانی هەبوو.٩٧

بەشێکی زۆر لە سیاسەتی بەریتانیای پێش شەڕ تەرخان کرابوو بە ڕێگاکانی بەرەو هێندستان لە سەرتاسەری مەدیتەرانە، کانالی سوێز و بەری خوارەوەی دەریای سوور، جا چ بە کۆنترۆڵی ڕاستەوخۆ، بۆ وێنە لە میسر، یان بە پاڵپشتی کردن لە ئیمپەڕاتۆری پیر و لەرزۆکی عوسمانی. ئەو ئیمپڕاتۆریە کۆتایی پێهات، بەڵام سووپاس بۆ ڕێکەوتنامەیەکی نهێنی کە لە گەڵ فەرەنسە بەسترا، بەریتانیا ئامادە بوو تا ئەو پارووانەی کە دەیویست بە دەستیان بێنێت. ڕێگای تازەی تریش هەبوون، لانی کەم لە خەونەکانی وەزارەتی دەرەوە و میلیتاریدا، لەوانەیە لە سەرتاسەری دەریای ڕەش بەرەو قەزاقستان و دواتر بەرەو باشوور، یان بە هێزی ئاسمانی لەڕێگای یوونان و مێزۆپۆتامیاوە، بەڵام ئەم ڕێگایانەش دەکرا پارێزگاریان لێ بکرێت ئەگەر بەریتانیا بۆ گرتنەدەستی ناوچەیەکە پێویستی بوو زوو بکەوتایەتە خۆ و دەست و بردی لە خۆی نیشان بدایە.

زۆرجار خەڵک ڕایان وایە، کە چون لیۆد جۆرج دژی شەڕی بۆویر بوو، ئەو ئیمپریالیست نەبوو. ئەمە زۆر ڕاست نییە. لەڕاستیدا ئەو، هەمیشە بە ئیمپڕاتۆریەتەوە شانازی کردووە، بەڵام قەت بیری لەوە نەکردبۆوە کە بەباشی بەڕێوە دەچوو. هەوڵدان بۆ بەڕێوەبردنی هەرچی شتە لە لەندەنەوە خۆشێت کردن بوو و کاری ئاقڵانە نەبوو، و ئەو زۆر لەم بوارەدا خۆی ماندوو دەکرد. تەنیا شتێکە دەبووە هۆی ڕاگرتنی دەسەڵاتی ئیپراتۆری ئەوەندەی دەکرا ڕێگەدان بوو بە حکوومەتی سەربەخۆی هەرێمی و هەبوونی سیاسەتێکی ئیمپڕاتۆری تەنیا لە سەر بابەتە گرنگەکان ، وەکوو داکۆکی کردن و سیاسەتێکی هاوبەشی دەرەوە. لە ڕێگای حکوومەتی ناوچەییەوە- ئەو بیری لە سکاتلەند، وێڵزی خۆی و هەروەها ئیرلەندی هەمیشە ئاڵۆز دەکردەوە- بەشەکانی ئیمپڕاتۆریەت بە ویستی خۆیان خەرج و مەخارجی پارێزگاری کردن لە خۆیان دەگرتە ئەستۆ. (لە یەکێک لە وتارەکانیدا کەسێک هۆیەکی لێکردوو و قیژاندی "دەسەڵاتی هەرێمی بۆ گۆڕی مردووەکان". لیۆد جۆرج لە وڵامدا وتی" بەڵێ ڕاستە، دەبا هەرکەسێک بۆ وڵاتی خۆی قسە بکات و بدوێت."). ناوچە بندەستەکانی وەکوو: ئۆستراڵیا، کەنەدا، نیووزیلەند، نیووفاوندلەند و ئەفریقای باشوور تازە خەریک بوون حکوومەتی نیمچە سەربەخۆیان دەگرتە دەست. تەنانەت هێندیستانیش خەریک بوو وردەوردە بەرەو حکوومەتێکی سەربەخۆ هەنگاوی دەنا؛ بەڵام چونکە ئەو وڵاتە تێکەڵاوێک بوو لە ڕەگەزی جۆراوجۆر، کە بەشێکی کەمی لە ئەورووپاییبە ڕەسەنەکانی لەخۆ دەگرت، و زمان و کولتووری جیاواز، لیۆد جۆرج لەوە بەگومان بوو کە ئەو وڵاتە بتوانێ خۆی خۆی بەڕێوەبەرێت. (ئەو قەت سەردانی هێندستانی نەکرد و زانیاریەکی کەمی سەبارەت بە ئەوێ هەبوو بەڵام، بەبێ زانیاری تەواو و هەرلەخۆوە، لای وابوو کە هێندیەکان و خەڵکانی تری پێست قاوەیی بەشێکن لە چینی هەژار و کەم بایەخی کۆمەڵگا.٩٨)

لە ساڵی ١٩١٦دا، ماوەیەکی کورت دوای ئەوەی کە لیۆد جۆرج بوو بە سەرۆک وەزیر، بە ئەنجومەنی پیرانی ڕاگەیاند کە کاتی ئەوە هاتوە کە بەشێوەیەکی فەرمی لە گەڵ ناوچەبندەستەکان و هێندستان سەبارەت بە باشترین شێوەی بردنەوەی شەڕ ڕاوێژ بکات. بۆیە بڕیاری دا کابینەیەکی شەڕی ئیمپریالیستی دامەزرێنیت. بزووتنەوەیەکی سەرسووڕهێنەر بوو. هەروەها پێویستی بە بزاڤێکی وەها بوو. ناوچەبندەستەکان و هێندستان بە کەرەسەی خاو، کەرەسەی جەنگی، بە قەرز و وام، و لەسەرووی هەموویەوە بە هێزی ئینسانی- ١،٢٥٠،٠٠٠ سەرباز لە هێندستان و ملوێنێکی تر لە ناوچەکانی تر پاڵپشتیان لە خەباتی چەکدارانەی بەریتانیا دەکرد. ئوستراڵیا، کە بیلی هاگز سەرۆک وەزیری بوو، هەمووجارێک جەماوەری ئاگادار دەکردەوە کە تا ساڵ ١٩١٨ لە وڵاتەیەکگرتوەکان زیاتر سەربازی لە دەست داوە.٩٩

لە ساڵی ١٩١٩ ئەو ناوچانەی کە گوێیان نەدەدایە کێشەکانی وڵاتی دایک، خەریک بوون گەشەیان دەکرد. ئەوان و ژەنەراڵەکانیان زۆریان لەو شتانە دیبوو کە سێر ڕۆبێرت بۆردێن، سەرۆک وەزیری کانادا، ناوی نابوو " ناکارامەیی و هەڵەکاری ستافی خاوەن بیر و هزری ویسکی و سۆدای بەریتانی". ناوچەبن دەستەکان دەیانزانی کە یارمەتی ئەوان چەندە گرنگ بووە، چ خوێنێکیان نەڕشت. لە قەرەبووی ئەمەدا، ئێستا چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد هەم سەبارەت بە شەڕ و هەم ئاشتیەک کە لەسەر ڕێدایە، ڕاوێژیان لە گەڵ بکرێت. ئەوان لە بەریتانیا هەندێک گوێگریان بۆ خۆیان دیتەوە، شوێنێک کە لە سەردەمی پیش شەڕ ئەوەی کە ناوی سووکایەتی کردن و بەکەمزانینی کۆلۆنیەکانی پێ دەوترا ئێستا گۆڕابوو ببوو بە پاڵپشتی کردنی گەرم و گوڕ لە چالاکی ئەوان. بیلی هاجێز کاتێکە لە ساڵی ١٩١٦ سەردانی لەندەنی کرد لەو سەروو دەمەدا باوی بوو و خولیای زۆر بوو. ژنان مارشیان دەدا و هەڵگری ئەم هێمایانە بوون" ئێمە داوای گەڕانەوەی هاجێز دەکەین" یان " هیچ شەڕێک بێ یەکیتر تەواو نابێت."و دواتر کەسێک بە ناوی ژان سمووتس سەری هەڵدا، وەزیری دەرەوەی ئەفریقای باشوور، سەرباز، سیاسەتمەدار، و لای هەندێک کەس فالچی، کە بەشێکی زۆر قۆناخی کۆتایی شەڕی لە لەندەن تێپەڕاندبوو. سمووتس پازدە ساڵی پێشووی لە گەڵ بەریتانیا شەڕی کردبوو؛ ئێستا ببوو بە یەکێک لە ڕاوێژکارە جێ متمانەکانی ئەوان، لە گەڵ لێژنەیەکی بچووکی کابینەی بەریتانی دادەنیشت کە لیۆد جۆرج بۆ مەبەستی بەڕێوەبردنی شەڕ دایمەزراندبوو. ئەو لە هەموو شوێنێک خۆشیان دەویست. لیۆد جۆرج وتبووی کە "زۆر ئەستەمە بتوانین لە ئاست ئەو هەموو یارمەتی و ماندوویەتیەی کە بەڕێزیان بەکردەوە سەبارەت بە شۆڕاکانی ئێمە کێشاویانە بەربێین و بتوانین بە زمان دەریان بڕین."١٠٠

له ڕۆژەکانی کۆتایی شەڕدا لیۆد جۆرج و بالفۆر وەک بەرپرس خۆیان لە دەسک نا تا بە مەبەستی تاو و توێ کردنی مەرجەکانی ئاگربەستی ئەڵمان لە گەڵ هاوپەیمانان، بێ ئەوەی ناوچەبندەستەکانی تێبگەیەنن، بەرەو شۆڕای عالی شەڕ لە پاریس وەڕێ کەون و ئەمەش هاجێز و بۆردێنی زۆر قەڵس کرد. هەروەها هاجێز زۆر دژی ئەوە بوو کە چاردە خاڵەکەی ویلسۆن وەک بنەمایەک بۆ دانووستانەکانی ئاشتی قەبووڵ بکرێت." ئەمە کەلێنێکی گەورەیە لە بیر و باوەری مرۆڤدا هەڵکەوتوە." کاتێکە ڕێبەرانی ناوچەبن دەستەکان واهەستیان دەکرد کە بەریتانیەکان وەک کلکێک یان بەشێکی بچووک لە شاندی نوێنەرایەتی بەریتانیا لە کۆڕی ئاشتیدا چاویان لێدەکەن ئەوەندەیتر قەڵس بوون. لیۆد جۆرج لە هەوڵی ئەوەدا بوو تا بە ئەم پێشنیارە هێوریان کاتەوە کە سەرۆک وەزیری ناوچەبن دەستەکان دەتوانێ یەکێک لەو پێنج نوێنەرەی بەریتانیا بێ کە دەسەڵاتی بێ سنووریان بە دەستە. بەڵام کامیان؟ بە واتەی هانکی کە کوتی "ناوچەبن دەستەکان وەکوو پشیلە بەخیلی بە حاڵی یەکتر دەبەن."وەکوو بۆردێن کە بۆ ژنەکەی خۆی نووسیبووی کێشەی سەرەکی لە نوێنەرایەتی لەوە دابوو کە هەڵوێستی ناوچەبندەستەکان بە ڕێکوپێکی دیار نەکرابوو. ئەو بە حاڵەتێکی بەزەیی پیاهاتن ئاماژەی بەوە کردبوو کە " کانادا نەتەوەیەک بە ناو نەتەوەیە. کاتی ئەوە هاتوو بگۆڕدرێت. سەرۆک وەزیرانی بەریتانی ئەوەی لە دەستیان دێ خەریکن دەیکەن، بەڵام ئەوەی لە دەستیان دێت بەس نییە." بە هانکی وتبوو کە ئەگەر کانادا لە کۆڕی ئاشتیدا نوێنەرایەتی تەواوی نییە چارەیەکی تری نییە بێجگە لەوەی کە " بارگ و بنەی تێک نێ و بگەڕێتەوە بۆ کانادا، بانگێشتی پەرلەمان بکا و هەموو شتێکیان بۆ ڕوون بکاتەوە."١٠١

لیۆد جۆرج پەردەی لە سەر نهێنیەکان لابرد و وتی : "نەک تەنیا یەکێک لەو پێنج نوێنەرە سەرەکیەی بەریتانیا دەبێ لە ناوچەکانی ئیمپراتۆری هەڵبژێردرێت، بەڵکوو بە هاوپەیمانان ڕادەگەیەنێت کە ناوچە بندەستەکان و هێندستان لەکۆڕی ئاشتیدا پێویستیان بە نوێنەری خۆیان و جیاواز دەبێت". کاتێک ئەو لە ١٢ی ژانویەی ساڵی ١٩١٩دا گەیشتە پاریس یەکێک لەو بابەتە سەرەتاییانەی کە وروژاندی ئەمە بوو. ئەمەریکیەکان و فەرەنسەیەکان بێدەنگ بوون، تەنیا سەیری بووکەشووشەکانی بەریتانی و دەنگەکانی لەڕادەبەدەری ئەوانیان دەکرد. کاتێک لیۆد جۆرج بە نابەدڵیەوە پێشنیارێکی ڕاگەیاند بەو مانایە کە ناوچەبندەستەکان و هێندستان پێویستە هەریەکەو نوێنەری تایبەت بە خۆیان هەبێت، دەنگی ناڕەزایەتی و تووڕەیی هاوکارانی ئیمپراتۆری لێکەوتەوە. ئەوان ئەیانوت کەدوای ئەم گشتە قوربانی وماڵوێرانیە خوا هەڵناگرێت هێشتا وەکوو هێزێکی بچووک و کەم بایەخ سەیر بکرێن و مامەڵیان لەگەڵ بکرێت. لیۆد جۆرجی ناقایل دنەی کیمینجوو

و ویلسۆنی دەدا تا ڕێگە بدەن بە وڵاتانی کانادا، ئوسترالْیا، ئەفریقای باشوور و هێندستان هەریەکەو دوو نوێنەری تامولئیختیار[دەسەڵاتداری بێ سنوور]یان هەبێت و نیووزیلەندیش یەکێک.١٠٢

کاتێکە ناوچەکانی ئیمپراتۆری لە سەپاندنی پێشنیارەکانیان سوور بوون، بەریتانیەکان واق مابوون و نەیاندەزانی چی بکەن. دیپلۆماتێک وتبووی کە "زۆر شتێکی ناخۆش و بێزارکەر بوو ڕاستی وەزارەتی دەرەوە بڕیاری دابوو چ دەستەگوڵێک بە ئاو بدا؟" لیۆد جۆرج کە هەر لە سەرەتاوە لایەنگری دەسەڵاتی هەرێمی بوو، کاتێکە هاجێز بە ئاشکرایی لە شۆڕای عالیدا ڕایگەیاندبوو کە ئۆسترالْیا لەوانەیە بەشداری نەکا لە شەڕێکی دواتردا کە بەریتانیا دەیهەوێت، بۆی دەرکەوتبوو کە ڕاستی شتێکی ترە و ئەوە نەبووە کە ئەو چاوەڕوانی دەکرد. (هەردوابەدوای ئەوەدا تێبینیەکە ساخکرایەو، بەڵام ئەفریقای باشوور دووبارە پرسیارەکەی ئاراستە کردەوە.) هاوپەیمانانی بەریتانیا زۆر بە خۆشحاڵیەوە سەیری ئەمەیان دەکرد. لەوانەبوو ئەوان بتوانن ناوچەبندەستەکان دژ بە بەریتانیەکان بەکار بێنن کاتێکە بەریتانیا بهاتایە پلانی مەرجەکانی ئاشتی ئەڵمانی دابین بکردایە و فەڕەنسە بە خۆشحاڵیەوە لەمەی دەڕوانی. هاوس باسی پێشبینیەکی زۆر درێژخایەنتری لەمە کرد: نوێنەرایەتی جیاجیای ناوچەبندەستەکان و هێندستان لە کۆڕی ئاشتی، و لە ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکانی وەکوو کۆمەڵەی گەلان و ڕێکخراوەی نێودەوڵەتی کار، دەیانتوانی بە "ئەگەری هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆری بەریتانی" خێرایی ببەخشن. بەریتانیا لە کوێوە دەستی پێکردبوو لەوێوە کۆتایی پێدەهات، و تەنیا دوورگەکانی خۆی بۆ دەمایەوە.١٠٣

ئەوە شاندی نوێنەرایەتی ئیمپراتۆری بەریتانی بوو کە لیۆد جۆرج بۆ پاریس ڕێبەرایەتی دەکرد. (و هەر ئەم ناوە خۆی لە خۆیدا بۆ ناوچەبندەستەکانی هەڵگەڕاوەی بەریتانی سەرکەوتنێک بوو). بە چوارسەد کەسایەتی لە مەقاماتی ڕەسمی، ڕاوێژکاری تایبەت، کارمەند و تایپیست نزیک بە ئارک دی ترایامفێ پێنج هۆتێلیان بۆ خۆیان داگیر کرد. گەورەترینیان کە ناوەندێکی کۆمەڵایەتی بوو ناوی هۆتێل ماجێستیک بوو کە لە ڕۆژانی پێش شەڕدا ناوەندێکی ناسراو بوو و ژنانی دەوڵەمەندی بەڕەزیلی بە سەفەر دەهاتن بۆ ئەوێ و جل و بەرگی گرانبەهایان دەکڕی. بۆ بەرگری کردن لە هاتنەژوورەوەی سیخۆران (زیاتر سیخۆرانی فەڕەنسەیی تاکوو ئەڵمانی) بەرپرسانی بەریتانی هەمووی ستافی هۆتێلەکەیان گۆڕی، تەنانەت سەرۆکی کابانەکانیشیان گۆڕی، و لە باتی ئەمان ستافی هۆتێلێکی بەریتانیان دانا لە میدلەندس. چێشتەکەیان لە جۆرەچێشتی هۆتێلێکی زۆر چاکی ڕێگای شەمەندە فەڕ بوون: شۆربا و هێلکە و گۆشتی بەراز لە بەیانیان، بڕێکی زۆر گۆشتی سوور و سەوزی بۆ نەهار و شام و قاوەیەکی ناخۆش بە درێژایی ڕۆژدا. خەرج و مەخارجێک کە کرابوو لە

هەژمار نەدەهات، نیکۆلسۆن و هاوکارەکانی پێکەوە قوماریان دەکرد، چون هەمووی ژوورەکان ، پڕ لە بەڵگە و نووسراوەی نهێنی، لە هۆتێلی ئاستۆریا بوون، شوێنێک کە ستافەکەی هیشتا هەر فەڕەنسەیی بوون.١٠٤

بەریتانیەکان هەتا بڵێی لە ئاسایش و هێمنایەتیدا و دوور لە مەترسی دەژیان. نامەکانیان بە سرویسێکی تایبەت لە گەڵ لەندەن ئاڵ و گۆڕ دەکرا کە بەدوور لە دایرەی پۆستی فەڕەنسەیی بوو. پۆلیسی نهێنی لە سکاتلەند یاردەوە چاودێری دەزگای سەرەکی بۆ ماجێستیکان دەکرد، و ئەندامانی نوێنەرایەتی دەبوایە بە وێنەوە پاسەکانیان لە سەر سینگیان بوایە. ئەوان کرابوە سەریان کە کاغەزەکۆنەکانی ناو زبڵدانەکان لەت و پەت کەن و بیان کەن بە هەزار تیکەوە؛ زانرابوو کە لە کۆنگرێسی ڤیەندا، شازادە تالیراند، وەزیری دەرەوەی فەڕەنسە، زۆر سەرکەوتوانە دانووستانی کردبوو چون جاسووسەکانیان هاتبوون بە وردی هەمووی یادداشتە کۆن و دوورخراوەکانی نوێنەرانی تریان کۆکردبۆوە. ژنەکانیان ڕێگەیان پێدەدرا لە ماجێستیک ژەمەکانیان بکەن بەڵام ڕێگەیان نەبوو بمێننەوە- ئەمەش میراتێکە لە کۆنگرێسی ڤیەن کە بەپێی بەڵگە و شەواهیدی ڕەسمی ئەوان لە درکاندنی زۆریەک لە نهێنیەکان بەرپرس بوون.١٠٥

لیۆد جۆرج شوقەیەکی زۆر خۆشی لە ڕوو نیتۆت بۆ مانەوە هەڵبژارد، کۆڵانیکی تەنگ بوو کە کاتی خۆی بۆ مانەوەی کۆنەفرۆشان سەرپەنایەک بوو. شوقەکە لەلایەن ژنێکی دەوڵەمەندی ئینگلیزیەوە بە ئەمانەت پێی درابوو کە بە تابلۆ و وینەی جوان جوانی ئینگلیزی تایبەت بە سەدەی هەژدەهەم ڕازابۆوە، گەینزبۆرۆخەکان، هۆپنێرزەکان و لۆرێنسەکان. فیلیپ کێر و فڕانسیس ستێڤێنسۆن و هەروەها چکۆلەترین کچەکەی کە خۆشەویستی دایە و بابە بوو، مێگانی تەمەن شازدە-ساڵی لە گەڵی بوو. فڕانسێس چاودێری ئەو بوو یان لەوانەیە بە باری پێچەوانەدا بووبێ ئەمیان پارێزەری ئەویان بووبێت. بالفۆر نهۆمێک لە سەرووترەوە دەژیا و ئێوارانە دەنگی سروودی ئایینی تایبەت بە وێلزی دەبیست کە زۆر لای ئەو پیرۆز بوون.١٠٦

بە هەر دانیشتوویەکی ماجێستیک کتێبێک درابوو کە یاساکانی ناو ماڵی لە خۆ گرتبوو. ژەمەکان کاتی دیاریکراویان هەبوو. مەگین یەکێک لەو کەسانەی کە خەڵکی ناوچەبندەستەکان و هێندستان بوایە کە ئەویش حکوومەت پارەکەی دەدا، ئەگینا هەرکەسێک دەبوایە پارەی خواردنەوەکانی خۆی بدایە. کۆپینیش لە ئارادابوو، بەڵام پارەش وەردەگیرا. قەرز لە کەس بۆ هیچ حیسابێک وەرنەدەگیرا. ئەندامانی نوێنەرایەتی بۆیان نەبوو چێشت لێنێن یان کەل و پەلی ناوماڵ خراپ بکەن. ئەوان بۆیان نەبوو سەگ ڕاگرن. دوکتوورێک (بە قەولی نیکلسۆن دوکتوورێکی

ناوداری منداڵ بوون) و سێ پەرستار لە نەخۆشخانە ئامادەی خزمەت کردن بوون. بۆ ڕابواردن ژوورێکی بیلیارد و گوڵدانێک لە ناو ژێرزەمینیەکدا هەبوون. هەروەها دوو سەیارەی لێبوو کە پێشتر دەگیرانەوە. دوو ئاگاداری هەبوون یەکیان دەیکوت تازە چەند پەنجەرەیەک " بە توند پێوەدانی دەرگاکان خرمەیان کردوە و هاتوونەتە خوارێ". ئەویتریان ئەیوت کە " هەمووی ئەندامانی نوێنەرایەتی ئاگادار دەکەینەوە کە هەمووی وت و وێژە تەلەفوونیەکان لە لایەن کەسانی نابەرپرسیار و نەناسراوەوە گوێ دەدرێن."١٠٧

یەکێک لە تازەهاتووەکان وتبووی کە " کاتێک دێیە ناوەوە وەک قووتابیەکی قۆناخی سەرەتایی وایت کە لە هۆڵی قوتابخانە سەرگەردان دێی و دەچی و چاو لە دیوارەکان دەکەی کە لە کاتی ژەمەکاندا ئاگادارت دەکەنەوە و جار لەگەڵ جار منداڵانی تازەهاتوو دەبینی و لەگەڵیان ئاشنا دەبیت." ئەگەر بەریتانیەکان وەستاتر و لیهاتووتر بوون، کانەدایەکان ئەرشەدتر و لەوانەیە تووسقاڵێک جەسوورتر بووبێتن؛ ئەفریقایەکانی باشوور کوڕانێکی تازەپێگەیشتوو بوون کە لە کایەکردندا باش بوون و بە هۆی توانا وەرزشیەکانیانەوە پێیاندا هەڵدەگوترا؛ ئوسترالیەکان بێ شەرم و پڕ ڕوو، هاروهاج و هەڵبەز دابەزیان دەکرد؛ نیووزیلەدیەکان و نیووفاوندێرەکان ڕواڵەتێک ناشیریان هەبوو و پیس و پەڵۆخ بوون، و دواتر هێندیەکان کە سەرەڕای ڕەنگی پێستیان خوێنشیرین و لەدڵەوەنزیک بوون و دایک و بابەکانیان بەردەوام هەڕەشەیان دەکرد کە دەیانکەنە دەرێ و دەیاننێرن بۆ قوتابخانەیەکی پیشکەوتوتر.

کانەدایەکان کە باش ئاگاداری ئەوەبوون کە ئەرشەدتر و پلەبەرزترن، ڕیبەرەکەیان پیاوێکی کەڵەگەت و جوانچاک بوو بەناوی بۆردێن. ئەوان ڕەوشتبەرزیان پێوە دیار بوو (نەک بڵێی بۆ یەکەمین جار لە پێوەندیەکانی نێونەتەوەییدا)، بەردەوام دەیانکوت کە ئەوان هیچ شتێکیان بۆ خۆیان ناوێت. بەڵام چون خۆراکی باشی هەبوو بۆ فرۆشتن و ئورووپای برسی لە بەردەمی خۆیدا دەبینی وەزیری تجاری کەنەدا بڕیاریدا لە گەڵ وڵاتانی فەڕەنسە، بلژیک، یوونان و ڕۆمانیا گرێبەست ببەستی. هەروەها ئەم هەست گشتیە لە لایەن کەنەدایەکانەوە کەوتبووە سەر زاری هەموان کە سنوورەکان دەکرێ گۆڕانکاری بێ بە سەریاندا و شتێکی نەگۆڕ نین. ئەوان زۆر بە کەیفخۆشیەوە لە گەڵ ئەمریکایەکان سەبارەت بە ئاڵ و گۆڕکردنی کەرتی باریکی ئالاسکا لە گەڵ هەندێک لە بەشەکانی هێندستانی ڕۆژئاوا یان ئەگەر بکرێ هۆندووراکانی بەریتانی. هەروەها بۆردێن سەبارەت بە ئەگەری خستنەژێر کونترۆڵی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی هێندستان لەلایەن کەنەداوە لە گەڵ لیۆد جۆرج وت و وێژی کرد.١٠٩

ئەفریقای باشوور دوو کەسایەتی ناوداری هەبوو: سەرۆک وەزیرەکەی، ژەنەراڵ لویس بۆتا، کە کێشێکی زۆری هەبوو و ناساخ بوو و ژان ئیسمووتس. لایەنگرانی بەتاسەوتین و میانڕەوی کۆمەڵەی گەلان کاتێکە نۆبەی مەرجەکانی ئاشتی ئەڵمانی هاتە پێشێ، کێشەیەک هەبوو کە ئەوان لە سەری نەدەسازان و سازشیان نەدەکرد: کۆلۆنیەکانی ئەفەریقی ئەڵمانیا. ئیسمووتس، کە لە دارشتنی پلانی داواکاریەکانی ناوچەیی بەریتانیا یارمەتیدا، ئەیوت کە بەریتانیا پێویستە ئەفریقای ڕۆژئاوا (ئەوەی کە دواتر بوو بە تانگانیکا و ئێستاش بەشی دووهەمی تانزانیایە) ڕاگرێت تابەڵکوو بتوانێ هەمووی ئەو کۆلۆنیانەی هەبێت کە لە باکووری ئەفریقاوە تا باشووری ئەفریقا درێژەیان هەیە و تا ئێستا ئەڵمانیا زۆر نەشیاوانە گەمارۆی داون. هەروەها ئەو وەک ئیمپریالیستێکی ئەفریقای باشوور قسەی دەکرد. وڵاتەکەی ئەو پێویستە باشووری ڕۆژئاوای ئەڵمانی ڕاگرێت(نامیبیای ئەمڕۆکە). ئەو پێشنیاری ئەوەی کرد کە بەشکم پۆرتەغاڵ هان بدرێت بەوەی کە بەشی باشووری کۆلۆنی مۆزامبیکی خۆی لە لای ڕۆژهەڵاتی ئەفریقاوە لە گەڵ بەشێکی بچووک لە ئەفریقای ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانی بگۆڕێتەوە. ئەوجار ئەفریقای باشوور زۆر جوان و ڕێک و پێک دادەڕێژرا بە سنوورێکی قایم و قوڵەوە کە دەورادەوری نووکی قارەکەی گرتبێت. ١١١

ئوستراڵیا لە سەر هیچ شتێک هەڵوێستێکی میانڕەوانەی نەبوو. نوێنەرایەتیەکەی لە لایەن سەرۆک وەزیرەکەیەوە بەڕێوەبەرایەتی دەکرا کە دەم و چاوگرژێکی لەڕ و باریک بوو و بە نان و چایی شیرین بەڕێ دەچوو. وەک شەڕکەرێک لە سەر لەنگەرگاکانی سیدنی، شوێنێک کە ئەو لەوێ بوو بە ڕێکخەرێکی یەکیەتی و وەک کۆنەکارێکی هەرچی پەرچیەکانی سیاسەتی ئوستراڵیایی، هاجێز لە پاریس سیاسەتەکانی ئوسترالیای کردبوو بە هینی خۆی. ئەو هەم لەباری وێژەیەوە و هەم لەباری مەجازیشەوە سەبارەت بەو وت و وێژانەی کە نەیدەویست بیانبیستێ زوو قەڵس دەبوو، خوویەکی تایبەتی هەبوو و خۆشی لێ کەڕ دەکردن. لە نێوان کەسانی دەور و بەریدا، تەنیا گوێی بۆ کەیت مۆردۆخ شل دەکرد، گوزارشگەرێکی لاو بوو کە ئەو وەکوو کوڕی خۆی سەیری دەکرد. مۆردۆخ، کە گوزارشێکی ڕەخنەگرانەی نووسیبوو سەبارەت بە دەستبەسەرداگرتنی زەویەکانی ناوچەی گالیپۆلی بە دەست بەریتانیەکانەوە، شوێنێک کە لەوێدا هێزەکانی ئوسترالیایی بەکۆمەڵ کوژرابوون، لە گەڵ گوماندارێتی هاجێز سەبارەت بە ڕێبەرایەتی بەریتانیەکان هاوبیر و هاوڕابوو. (مۆردۆخ کوڕەکەی خۆی بە ناوی ڕۆپێرت پابەند بە نەریتی بنەماڵە هەر بە چاوی ڕەخنەوە سەیری بەریتانیەکانی دەکرد.) سەبارەت بە هەندێک بابەتی دیاریکراو پێدەچێ هاجێز لە گەڕانەوە بۆ وڵات بۆ ڕای گشتی قسەی کردبێت: ئەو بە دوا

دەرفەتێکەوە بوو تا دوورگەکانی ئوقیانووسی ئارام کە ئوسترالْیا لە ئەڵمانی ستاندبوو پەیوەست بکا بە وڵاتی خۆیەوە، و هیچی لە پەیمانی کۆمەڵانی گەلان نەدەویست کە گوێی نەدەدا بە سیاسەتی سپی پێستی ئوستراليا، و ڕێگای هاتنەژوورەوەی دەدا بە کۆچبەرانی سپی پێست و ئەوانیتریشی لە دەرەوە دەهێشتەوە.١١٢

لیۆد جۆرج، کە لە قوماری وێلزیدا هەمیشە دۆڕاوە بوو، و هاجێز هەتابڵێی تییدا دەست و بردی چاکی هەبوو باش یاری دەکرد، سەرۆک وەزیری ئوسترالیایان زۆر سەیر و سەرنجراکێش هاتە بەرچاو. کلیمینجۆش هەروەها بیری دەکردەوە. ئەو وابیری دەکردەوە کە هاجێز، کە لە گەڵ ئەڵمانیا پێوەندی نەگۆڕ و چەسپیوی هەبوو، بۆ فەرەنسە دۆستێکی باش دەبوو. زۆربەی خەڵک لایان وابوو کە هاجێز خولْق و خووی وابوو کە نەت دەتوانی لە گەڵی هەڵ کەی. ویلسۆن وەک "بەڵایەکی پیس" ناوی لێدەبرد. لەبەرانبەری ئەمەدا هاجێزیش سەرلۆمەی ویلسۆنی دەکرد: ئەو گاڵتەی بە کۆمەڵەی گەلان دەکرد و بە یاسا و ڕێساکانی ویلسۆن پێدەکەنی. نیووزیلەند سەبارەت بە کۆمەڵەی گەلان لە گەڵ ئوسترالْیا مەرجی هاوچەشنی هەبوو، هەرچەند دەنگ و هەرایەکی کەمتری هەبوو، و هەروەها داوای لکاندنی هەندێک لە دوورگەکانی ئوقیانووسی ئارامی دەکرد بە وڵاتی خۆیەوە. سەرۆک وەزیرەکەی، ویلیام مەسێی، بە ڕای کەنەدایەک، " ئەوندە مێشک تەسک و ژان بۆلیش بوو کە کاتێ ڕواڵەتیت دەدی هەستت بەوە دەکرد کە بەڕاستی وایە و لە کاتی قسەکردندا بەردەوام قسەی لێدەپچڕی."١١٣

وڵاتەکەی تر هێندستانە. (هەمیشە ناوی"هێندستان و ناوچەبندەستەکان" لە بەڵگە ڕەسمیەکاندا ناویان دەهات.) هێندستان هاوڕێ لەگەڵ ناوچە بندەستەکانی خودموختار لە کابینەی شەڕی ئیمپریالیستیدا جێی بۆ کرابۆوە و دەبوا شوکری خوای بکردایە لەوەی کە لە شەڕدا بەشداری کرد. بەڵام نوێنەرایەتیەکەی لە نوێنەری نەتەوەیەکی سەربەخۆ نەدەچوو. لە لایەن وەزیری دەرەوەی هێندستان، ئێدوین مۆنتاگۆ، سەرۆکایەتی دەکرا، و دوو ئەندامی هێندستانی، بە ناوەکانی لۆرد ستایندرا سینها و مۆهاراجای بیکانێر، لەبەرهۆی وەفاداری و دڵسۆزیان هەڵبژێردران. سەرەڕای هات و هاوارەکانی گرووپە جیاجیاکانی هێندی ، حکوومەتی هێندی هیچ کامێک لە ڕێبەرانی تازەی ناسیۆنالیستی هێندی هەڵنەبژاردبوو. و لە خودی هێندستاندا گۆڕینی کۆنگرێسی ئیندیەن ناسیۆنال لە لایەن گاندیەوە بە بزووتنەوەیەکی بەکۆمەڵی سیاسی کە داوای حکوومەتێکی سەربەخۆی دەکرد خەریک بوو بە خێرایی هەمووی مشت و مڕەکانی لە سەر ئەوە ساخ دەکردەوە کە چۆن هێندستان بەجوانی و بە ڕێک و پێکی بەرەو حکوومەتێکی تەواو ئاکادمیک ڕێنوێنی بکرێت.

بەریتانیەکان دەبوایە هەبوونی ئەم هەموو سیاسەتمەدارەی ناو شاری پاریس کە لە ناوچەبندەستەکانەوە هاتبوون بە نەعمەتێکی گەورەی بزانیایە. هەرچەند بۆردێن سادقانە لە لێژنەکەدا لە بابەت مامەڵەکردنی سنوورەکانی یوونان و ئالبانیا نوێنەرایەتی بەریتانیای دەکرد، و ئوسترالیاش بە هەمان شێوە مامەلەی چکسلۆواکیای دەکرد، چون ناوچەبندەستەکان خۆیان لە قۆناخێدا دەدیەوە کە مەترسی و هەڕەشەی دۆڕاندنیان لە سەرە دانووستانەکان هەروا بی گێرە و کێشە نەدەچوە پێشێ. لیۆد جۆرج پێشتر بەناوی ناوچەبندەستەکانی خۆیەوە بەرەنگاری هاوپەیمانانی خۆی ببۆوە و پێویستیش بوو بۆ ڕایەکی تر بەرەنگاریان ببێتەوە. ئەوە ئالۆزیەک نەبوو کە ئەو پێویستی بوو چون وتو ویژە تاقەت پڕووکێنەکان دەستیان پێکردبوو.

# ٥

# ئێمەکۆمەڵەی گەلانین

لە ١٢ی ژانویە، ڕۆژێک دوای گەیشتنی بۆ پاریس، لیۆد جۆرج لە وەزارەتی دەرەوەی فەڕەنسا لە شوێنێک بە ناوی "کوای دی ئۆرسای" لە یەکەمین کۆبوونەوەیدا لەو نزیک بە سەد کۆبوونەوەی کە لەوێ هەیبوو چاوی بە کلیمینجوو، ویلسۆن و سەرۆک وەزیری ئیتالیا، ڤیتۆریۆ ئۆرلاندۆ، کەوت. هەرکەس لەگەڵ خۆی وەزیری دەرەوە و شاندێک لە ڕاوێژکار و پسپۆڕی لەگەڵ بوو. ڕۆژی دواتر بۆ ڕێزنان لە ئارەزووەکانی بەریتانیا، دوو نوێنەری ژاپۆنی بە گرووپەکەوە پێوەندیان گرت. ئەمە شۆڕای دە کەسی بوو، هەرچەند زۆربەی خەڵک وەک شۆڕای عالی ناویان دەبرد و ئاماژەیان پێ دەکرد. هاوپەیمانانی بچووکتر و وڵاتانی بێلایەن بانگێشت نەکرابوون، و ئەمەش هێمایەک بوو بۆ ڕووداوەکانی داهاتوو. لەکۆتایی مانگی مارسدا، چون کێشەکان و ئاڵۆزیەکان هەڵەسوونیان هێنابوو، شۆڕای عالی بڕیاریدا وەزیرانی دەرەوە و ژاپۆنیەکان لە کۆڵ خۆی کاتەوە و ببێ بە شۆڕای چوار کەسی: لیۆد جۆرج، کلیمینجوو، ویلسۆن و ئۆرلاندۆ.

شتێکی سەیر و سەرنجڕاکێش ئەمە بوو کە ژوورە گەورەکانی نووستن لە کوای دیئۆرسای لەبەرانبەر تێپەڕبوونی زەمەن و هێرشی ئەم دوایانەی ئەڵمانیەکاندا وەکوو خۆیان مابوونەوە. ئەم شکڵ و شەمایلەی کە ئێستا پێیانەوە دیارە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا پێیان بەخشرا، ئەو کاتەی کە ناپلۆئۆنی سێهەم بە سەر فەڕەنسەدا حکوومەتی دەکرد و هێشتا خەوی بە قودرەتێکی گەورەی جیهانیەوە دەبینی. میوانانی گرنگ و خاوەنڕێز ئێستاش دەچنە ناو ژووری ڕەسمی کە دەڕوانێتە سینە، و دوور لە پلیکانی گەورە گەورە هەڵکەوتووە کە بەرەو ژوو بۆ ناو ژوورە تایبەتی و کەسیەکان هەڵدەکشێ و دواتر چاومان بە ڕیزێک ژووری میوان و دایرە دەکەوێت کە زەمینەی ئەم ژوورانە بە تەختەی پارکویت داپۆشراون و فەرشی ئۆبووسۆنیان بە سەردا ڕاخراوە و کوورەی گەورە گەورەیان لێ

داندراوه. دەلاقە زۆر قەبە و گەورەکان بەرەو بنمیچە بەرز و ڕازاوەکان بە ئاوێزە و چلچرای ووردوورد هەڵدەکشێن. مێز و کورسی قورس قورس بە سەر لاقی ئەستوور و ڕووپۆش بەزێڕ وەستاون. ئەو ڕەنگانەی کە زۆر دێنە بەرچاو تەڵایی، سوور و ڕەشی دار خەیزەرانە.

شۆڕای عالی لە شوێنەپیرۆزە، ژووری وەزیری دەرەوەی فەرەنسە، ستێفۆن پیچۆن، کۆدەبوونەوە. ڕەنگی ئەمڕۆکەی سپی و تەڵاییە؛ لەساڵی ١٩١٩دا تاریکتر بوو. ئێستاش ئەو پارچەدارە هەڵکەندراوە بە دیوارەکانەوە دیارە و ڕازاندوونیەتەوە. ئێستاش ئەو دەستچنانەی سەدەی حەڤدەهەم کە ڕەنگ و بۆیەکیان نەماوە هەر بە سەرووی پارچە دارەکەوە هەڵواسراون. درگا دووتایەکان دەکرێنەوە بە سەر خانوویەکی خڕ و گوومەزدار و ئێستاش باخچەیەک لە گوڵەسوورە لە پشتەوە هەر ماوە. کلیمینجوو، وەک خانەخوێ، لەبەردەم کووەدارەکەدا کە کۆیەک داری سووتەمەنی لە پەناوەبوو لە سەر سەندەڵی دەستەدار سەرۆکایەتی دەکرد. هاوکارەکانی هەریەکەو بە مێزێکی بچووک کە کۆگایەک وتار و بابەتی ئەویان لە سەر بوو، لە پەنا باخچەکەوە ڕووبەڕووی ئەم بوون، بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان شان بە شانی یەک، دواتر ژاپۆنیەکان و ئیتالیەکان دوورەپەرێزتر لە گۆشەیەک. ویلسۆن،و ەک سەرۆکی وڵات، کورسیەکەی چەند ئینچێک لەهی ئەوانیتر بەرزتر بوو. سەرۆک وەزیران و وەزیرانی دەرەوە لە سەرکورسی دەستەدار و ڕاحەت و خۆش دادەنیشتن، و کۆمەڵێک ڕاوێژکار و ئەمینداری پلەخوارتر لە پشتەوە لە سەر کورسی ڕووکەشزێڕی بچووکتر دادەنیشتن.

شۆڕای عالی هەرخێرا و گورجوگۆڵ ڕەوت و ڕێبازی تایبەت بەخۆی گرتەبەر. جاری وابوو کەرەتێک، هەندێکجار دوو کەرەت و زۆرجاریش سێ کەرەت کۆبوونەوەی دەبوو. بەرنامەیەکی جۆراوجۆر و هەمەچەشن هەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شۆڕای عالی لەسەر ئەو تەوەرانەی کە دەهاتنە بەرباس دەڕۆیی. شۆڕا گوێی لە سکاڵاکەران ڕادەگرت، ڕەوتێک کە تا ئەنجامی کۆبوونەوەکە هەر درێژەی هەبوو و کۆتایی پێنەدەهات. کاتێک دوانیوەڕۆیان دەوام نەدەما، پەردە سەوزە ئاوریشمیەکان دادەدرانەوە و لامپە ئەلیکریەکان هەڵدەکران. ناو ژوورەکە هەمیشە گەرم بوو، بەڵام فەرەنسەیەکان هەرکاتێک کە پێشنیاری کردنەوەی پەنجەرەیەکیان پێدەکرا بە ترسەوە وڵامیان دەدایەوە. کلیمینجوو، بە ڕواڵەتێکی ماندوو و لەخۆوەڕەز لە سەر سەندەڵیەکەی بێ کار و بار دادەنیشت و دەیڕوانیە بنمیچەکە؛ ویلسۆن ئارام و قەراری نەبوو، هەرتاوناتاوێک هەڵدەستا سەرپێ و لاقەکانی درێژ دەکردەوە؛ لانسینگ، وەزیری دەرەوەی ئەو، کە کارێکی ئەوتۆی نەبوو تاکوو بیکات، کاریکاتۆری دەکێشایەوە؛ لیۆد جۆرج هەر خەریکی چپەچپ کردن و نووکتەگێڕانەوە بوو. وەرگێڕی ڕەسمی، پۆل

مانتووکس، له فەڕەنسەیی بۆ ئینگلیزی و بە پێچەوانەش وەری دەگێڕایەوە، ئەوەندە چالاکانە خۆی دەخستە ناو باسەکانەوە کە هەستت دەکرد بۆ خۆی دەیەوێ بۆ ناوچەیەک بپارێتەوە. چون کلیمینجوو باش ئینگلیزی قسەی دەکرد و وەزیری دەرەوەی ئیتالیا، سیدنی سۆنینۆ، مامناوەندی قسەی پێ دەکرد، زۆر جار وت و وێژەکانی نێوان چوار یاری گەورە بە زمانی ئینگلیزی بوو. یاریدەدەران خەریتە و بەڵگە بەدەست لە سەر نووکی پەنجە دەهاتن و دەچوون. هەموو دوانیوەڕۆیەک دەرگاکان دەکرانەوە و بەردەستەکان چای و ماکارۆنیان لە گەڵ خۆیان دەهێنا ژووری. ویلسۆن لە سەرەتاوە سەری سوورمابوو و تاڕادەیەکیش شڵەژابوو لەوەیکە لەبەرهۆی ڕووداوێکی وەها بچووک باسکردن لەسەر داهاتووی جیهان بپچرێنن، بەڵام کاتێکە لەگەڵ دوکتۆرەکەی باسی کرد و بۆی گێڕایەوە، بۆی دەرکەوت کە ئەمە نەریتێکی بیانیە و بەهەرجۆرێک بووە دەبێ قەبوولی بکات.١١٤

هەر لە سەرەتای دانیشتنەکیانەوە، کەسایەتیەکانی شۆڕای عالی دەیانزانی کە چون هێزەسەربازیەکانیان لە حالەتی سەربازی هاتبوونە دەرێ، تواناکانیان ڕوو لە کزی بوو. فەرماندەی هێزەکانی ئەمەریکی لە ئورووپا، ژەنەڕاڵ پێرشینگ هەر لەو بەهارەدا بە کۆشکی ڕاگەیاندبوو کە " لەم مانگەدا سێسەد و دوازدە هەزار هێز حەواڵە دەکرێ. ڕێکۆردی مانگی پێشوو سێسەد هەزار سەرباز بووە. لەم ڕێژەیەدا تا ١٥ی مانگی ئۆگست هێزەکانمان لە وڵاتەیەکگرتوەکان دەبێت." ١١٥ ناوبژیکەران پێویست بوو مەرجەکانی ئاشتی بە سەر دوژمندا بسەپێنن کاتێکە توانایان هەبوو. لە هەمان کاتدا، پێویست بوو ئەوان نیگەرانی ئەو کێشانە بوونایە لە نیشتمان کە لە ماوەی شەڕدا بە هەڵواسراوی مابوونەوە. لە گەڵ ئەوەشدا ئەوان دژ بە جۆرەدوژمنێکی تر کەوتبوونە ململانێ، یان هەرشتێک کە ئەوان ناویان بنایە. برسیەتی، نەخۆشی-تیفۆد، کۆلێرا[ڕشانەوە] و ئانفلۆئانزای تۆقێنەر- سەرهەڵدانەکانی شۆڕشگێڕانە شار بە دوای شار، و شەڕە بچووکەکان، کە چەند دانەیەکیان تەنیا لە ساڵی ١٩١٩ هاتنە ئاراوە، هەرهەمووی ئەمانە هەڕەشەی سڕینەوەی پاشماوەکانی کۆمەڵگای ئەورووپیان دەکرد.

تازە دوو مانگ بە سەر کۆتایی هاتنی شەڕ تێپەڕیبوو، کەچی خەڵک بەردەوام دەیانپرسی ئەوە بۆچی دەستکەوتی کەم هاتوونەتە ئاراوە. بەشێکی هۆکارەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەیکە هاوپەیمانان بەڕاستی ئامادەیی ئەوەیان نەبوو کە کوت و پڕی کۆتایی بە شەڕەکە بێنن. و تاکوو ئێستا ئامادەیان هەر نەشبوە. هەمووی هێز و تواناکانیان تەرخانی بردنەوەی شەڕ کرابوو. ویستۆن چێرچیل نووسیبووی کە " دەبوو لە گەڵ ئاشتی چی بکرایە؟ لە حاڵێکدا ئێمە نەماندەزانی کە حەیفە لە بەین بچین. کێ دەیتوانی بیر لە ئاوەدانکردنەوەی بکردایە لە حاڵێکدا سەراسەری جیهان ببوو بە خۆڵەمێش، یان کێ بوو

بێ لە هاتنەدەرێی حاڵەتی نیزامی بکردایە لە کاتێکدا مەبەستی سەرەکی هاویشتنی هەر مرۆڤ و هەر بۆمبایەک بوو بۆ ناو گۆڕەپانی شەڕ؟ ڕاستە کە دایرەکانی دەرەوە، وەزارەتەکانی کۆلۆنی و دایرەکانی جەنگ ئامانجە کۆنەکانیان تۆزتەکێن کردبوو و پلانی تازەیان بۆ داواکاریەکانیان ڕشتبوو بەڵام شەڕ هەر درێژەی هەبوو. چەندین کەڕەت هەوڵ دراوە بۆ ئەوەی کە سەبارەت بە ئاشتی لێکۆڵینەوەیەکی چڕ و پڕ بکرێت. توێژینەوەی تایبەتی بەریتانی، کە لە ساڵی ١٩١٧دا دامەزرا، کۆمیتەی دی ئیتوودێسی فەڕەنسەیی و لە هەمووی ئەمانە بەربڵاوتر توێژینەوەی ئەمەریکی، کە لە ساڵی ١٩١٧دا لە ژێر چاودێری هاوس دامەزرا،هەمووی دیپلۆماتە کارامەکان سەرسام مابوون، ئەوان لە دەرەوە پسپۆڕیان بانگێشت کردبوو، لە مێژوونووسانەوە بگرە تا دەگاتە مزگێنی هێنەران، و لێکۆڵینەوەیەکی چڕ و پڕ و خەریتەیان بەرهەم هێنابوو. ئەمەریکیەکان شەست گوزارشی جیاجیایان تەنیا لە سەر ڕۆژهەڵاتی دوور و ئۆقیانووسی ئارام کۆکردبۆوە، کە زۆر زانیاری بەکەڵک و تێبینی باشیان لە خۆ گرتبوو، بۆ وێنە لە هێندستان " ژمارەیەکی بەرچاو لەو کەسانەی کە هاوسەریان نەکردوە بریتی بوون لە منداڵانی کەم تەمەن." ١١٦ ڕێبەرانی هاوپەیمان بایەخێکی ئەوتۆیان بە توێژینەوەکانی خۆیان نەدا.

لە یەکەمین حەفتەی کۆڕی ئاشتیدا، شۆڕای عالی کاتێکی زۆری سەبارەت بە تاو و توێکردنی شێوازی ئەنجام دانی کارەکان تەرخان کرد. وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا دایەگرامێکی[هێڵکاری] جوان و ڕێک و پێکی بە چەندین ڕەنگ لە شەشگۆشەیەکدا درووست کرد کە لەو چوارچێوەیەدا کۆبوونەوەکە، لێژنەکان، نیمچەلێژنەکان جووت جووت پێکەوە گرییان خواردبوو، بەڵام لە دەرەوە، لێژنەکانی تایبەت بە خودی هاوپەیمانان وەکوو هەسارە بچووکەکان دەهاتن و دەچوون و هەڵدەسووڕان. کاتێکە لیوْد جۆرج ئەمەی دی دای لە پرمەی پێکەنین. فەڕەنسەیەکان بەرنامەیەکی وردداڕێژراویان هێنایە کایەوە کە هاوڕێ لە گەڵ ئەمە لیستێک لە یاسا و ڕێساکانی ڕێنوێنی کردن و لیستێک لەو کێشانەی کە بڕیاربوو بخرێنە بەرباس و بەپێی گرنگایەتی یەک بە دوای یەک ڕیزکرابوون، هەبوون. چون لەپێشدا دانووستان لە گەڵ ئەڵمانیا هاتە ئاراوە و کۆمەڵەی گەلان بایەخێکی ئەوتۆیان نەدایە، ویلسۆن، بە یارمەتی لیوْد جۆرج بەرەنگاری بوونەوە و ڕەدیان کردەوە. (تاردیۆ، دانەرەکەی، ئەمەی وەک "دوژمنایەتی ئاشکرای ئانگلۆ-ساکسۆنەکان ناوبرد کە لەبەرانبەر چوارچێوەیەکی سیستماتیکی مێشکی لاتینیەکان بەکاریان دێنن."١١٧)

شۆڕای عالی بڕیاری دا ئەمینداریک هەڵبژێرێت، بەناوی هێنری دۆتاستا، کە دیپلۆماتێکی پلەخواری فەڕەنسەیی بوو و دەنگۆی ئەوە هەبوو کە کوڕی نایاسایی کلیمینجوو بێت. (مەقامێکی ڕەسمی هەرە کارامە و لێهاتووی بەریتانی بەناوی هانکەی کە بوو بە جێگری وەزیر، هەر خێرا زۆربەی

کارەکانی گرتە ئەستۆ.) دوا مشت و مڕێکی زۆر بڕیار هاتە سەرئەوەیکە زمانەکانی فەڕەنسەیی و ئینگلیزی بۆ بەڵگە و بابەتە نووسراوەکان ببن بە زمانی ڕەسمی. فەڕەنسەیەکان شەڕی ئەوەیان بوو کە تەنیا زمانەکەی خۆیان ڕەسمی بکرێت، و هۆکارەکەشیان دەگەڕاندەوە بۆ ئەوە کە لە هەمووی بوارەکاندا زمانی ئەوان ووردبینتر و جیاوازیە نادیارەکان جوانتر دەردەخا. ئەوان ئەیانوت کە فەڕەنسەیی بۆ چەندین سەدە زمانی نێونەتەوەیی و دیپلۆماسی بووە. بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان دەیانوت کە زمانی ئینگلیزی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ جیگای زمانی فەڕەنسەیی دەگرتەوە. لیۆد جۆرج ئەیوت کە ئەو هەمیشە پەشیمانی ئەوەیە کە فەڕەنسەیی باشتر نەزانیوە.(هەر هیچی لێ نەدەزانی)، بەڵام ئینگلیزیەک کە زمانی ئاخاوتنی ١٧٠ملوێن کەس بوو شتێکی بێ مانابوو کە وەک زمانی فەڕەنسەیی حەسابی بۆ نەدەکرا. ئیتالیەکانیش لەم بارەوە وتیان ئەی زمانی ئیتالی بۆ نا؟ سۆنینۆ وتی کە" ئەگەر وابێ ئەو مانایە دەگەیەنێ کە ئیتالیا دوورەپەرێز خراوە و وەک نەتەوەیەکی پلەخوارتر مامەڵەی لە گەڵ کراوە." لیۆد جۆرج لەو بارەوە وتی کە" ئەی باشە ژاپۆنیەکان بۆ نا؟ نوێنەرانی ژاپۆنی کە باش دەیانزانی ئەگەر لە سەر ئەوە پێداگری کەن کە مشت و مڕەکان دەبێ بە زمانی فەڕەنسەیی بێ یان ئینگلیزی تووشی کێشە دەهاتن بۆیە بێ دەنگەیان کرد و هیچیان نەوت. کلیمینجوو دانی بە هەڵەکانی خۆی دانا و زۆربەی مەقاماتی ڕەسمی ئەو لەم هەڵوێستە سەریان سوور ما.١١٨

لە مانگی دێسامردا وەزارەتی دەرەوەی فەڕەنسە بانگێشتی لە هەمووی وڵاتان کردبوو، لە لیبیریاوە تا دەگاتە سیام، بەو مانایە کە، هەرچەند دژوار و ناخۆش دەبوو، ئەم وەزارەتە جانبی هاوپەیمانانی دەوێ و پاڵپشتیان لێدەکا. تا مانگی ژانویە بیست و نۆ وڵات لە پاریس نوێنەریان هەبوو، هەموویان چاوەڕوانی ئەوە بوون بەشداریان هەبێت. ڕۆڵ و دەوری ئەوان چۆن پێناسەی بۆ دەکرا؟ ئایا ئەوان هەموویان پێکەوە دادەنیشن، هاوڕێ لە گەڵ ئیمپراتۆری بەریتانی بە هەمان دەنگێک کە لە پاناما هەیبوو؟ هیچ یەک لە هێزە گەورەکان ئەوەیان نەدەویست، بەڵام ئەگەر ویلسۆ حەزی بەوە دەکرد کە نوێنەرانێک لە هێزەکانی پلەخوارتر سەبارەت بە کێشەکانی کەم مەترسی وەکوو ڕێگەئاویەکانی جیهان بگرێت، ویلسۆن تا ئەو جێگایەی کە بۆی دەلوا یەکەمایەتی دەدا بە چوارچێوەیەکی بچووکتر. ئەو وتبووی کە " ئێمە جگە لە وت و وێژی ئاسایی پێویستیمان بە هیچ کۆبوونەوەیەکی ڕەسمی نیە."کلیمینجوو ئەمەی لا زۆر ناخۆش بوو: ئەگەر هاوپەیمانان سەبریان کردایە تاکوو ئەوان لە سەر کێشە سەرەکیەکان ڕێکەوتنایە، پێش ئەوەی کۆڕی ئاشتی دەستی بە کارەکانی خۆی بکردایە چەندین مانگی دەخایاند، و ڕای گشتی تووشی ناهومێدی و دڵساردی دەبوو. ئەو لە درێژەی باسەکەیدا وتی کە ئەوان پێویستە بە هەمووی ئەو هێزانەی کە لە پاریس

کۆببوونەوە کاریان پێ بسپێرن. لیۆد جۆرج پێشنیاری تسالُحەیەکی کرد، هەروەک لە زۆر بۆنەیتردا هەوڵی لەو چەشنەی دابوو: لە کۆتایی هەر هەفتەیەکدا دانیشتنێکی گشتی بەڕێوە بچێت؛ لە هەمان کاتیشدا، شۆڕای عالی خۆی بە بابەتیترەوە خەریک بکات.١١٩

ئەندامانی شۆڕای عالی، تەنانەت ویلسۆنیش، بە هیچ شێوەیەک نەیاندەویست بەرنامەی کاری کۆبوونەوە، کە هەڵگری ئەرک و بەرپرسایەتیەکی گەورە بوو، بهێڵن لە کۆنترۆڵ بچێتە دەرەوە. لیستی ڕەدکراوەی فەڕەنسەیی بریتیبوو لە کۆمەڵەی گەلان، کاروباری پۆڵەندایەکان، کاروباری ڕووسیەکان، نەتەوەکانی بالتیک، دەوڵەتانێک کە لە دەوڵەتی پاشایەتی ئوتریش-مەجارستانی پێشوو شکڵیان گرتبوو، ناوچەکانی باڵکان؛ ڕۆژهەڵاتی دوور و ئوقیانووسی ئارام، کاروباری جوولەکەکان، دەریاوانی جیهانی، ڕێگاکانی جیهانی شەمەندەفەر، یاسادانان بۆ مسۆگەر کردنی خودموختاری خەڵکانی جیهان؛ پارێزگاری کردن لە کەمینەکانی ئاینیی و ڕەگەزی، یاسادانانی جیهانی بۆ نیشانەکانی تجاری و مافنامەی دانان، سزادانان بۆ ئەو جەنایەتانەی کە لە ماوەی شەڕدا ڕوو دەدەن، قەرەبووی خەسارەتەکانی شەڕ و کێشەکانی ئابووری و ماڵی. لیستەکە هەموو دووربینی و پێشبینیەکی لە خۆ گرتبوو.١٢٠

لە گەڵ ئەوەش، شۆڕای عالی لە ژێر پشکنین و لێکۆڵینەوەی ووردی جەماوەردا بوو. هەر لە چەند هەفتەی بەر لە دەسپێکی ڕووداوەکان، سەدان ڕۆژنامەنووس خۆیان گەیاندبوە پاریس. حکوومەتی فەڕەنسەیی لە ماڵێکی ملوێنێریدا یانەیەکی چاپەمەنی کەموێنەی دامەزراندبوو. کاربەدەستانی چاپەمەنی، بەتایبەت پیاوان و هەروەها تاقمێکی بچووک لە ژنان، وەکوو ماکراکێری[ کەسێک کە ڕەوشت و کردەوەی ناشیرینی ناوداران دەدرکێنی] گەورەی ئەمەریکی بەناوی ئیدا تاربێل، بەو بارودۆخە ناشکوور بوون و زۆر ڕازی نەبوون. ئەوان گاڵتەیان بە دیکۆڕەکە دەکرد، و ئەمەریکیەکان نازناوی " ماڵی پڕ لە مەمکەشووشە"یان بۆ دانابوو. گرنگتر لەمانە، کاربەدەستانی چاپەمەنی گلە و گازەندەیان بوو لەوەیکە کاروبارەکان بە نهێنی و شاراوە ڕوویان دەدا. ویلسۆن لە چاردە خاڵەکەیدا باسی" پەیمانەکانی کراوەی کردبوو کە بەکراوەیی و بە ئاشکرایی دەبەستران". وەکوو زۆربەی دروشمەکانی تری ویلسۆن مانای ئەم دروشمەش نادیار بوو، تەنانەت بۆ خودی ویلسۆنیش، بەڵام سەرنجی جەماوەری بە لای خۆیدا ڕادەکێشا.١٢١

دیار بوو کە ویلسۆن مەبەستی ئەوەبوو کە هیچ گرێبەستێک بە نهێنی نەبەسرێت، وەکوو ئەو هەموو گرێبەستەی کە ئەو و کەسانیتر وەک یەکێک لە هۆکارەکانی شەڕی گەورە دیتیان، بەڵام ئایا ئەو مەبەستی ئەوە بوو کە هەمووی وت و وێژەکان بۆ لێکۆڵینەوە بە کراوەیی بخرێنە بەردەمی

جەماوەر؟ ئەمە هەر ئەو شتە بوو کە زۆربەی نووسەران و خوێنەرەکانیان چاوەڕوانیان دەکرد. نوێنەرانی چاپەمەنیەکان داوای مافی چوونەژوورەوەی کۆبوونەوەکانی شۆڕای عالیان دەکرد، یان لانی کەم دەسڕاگەیشتن بە کورتەی ڕۆژانەی وت و وێژەکانی ئەوان. کلیمینجووبە هاریکارەکەی خۆی ژەنەڕاڵ مۆرداکی ڕاگەیاندبوو کە ئەو هەمیشە لەپێناو ئازادی ڕاگەیاندندا خەباتی کردوە بەڵام هەندێک سنووری دیاری کراو هەن کە دەبێ لەبەرچاو بگیرێن. ڕێگەدان بە چاپەمەنیەکان تاکوو ڕۆژبە ڕۆژ گوزارشی وت و وێژەکانی شۆڕای عالی بدەنەدەرەوە " خۆکوژیەکی ڕاستەقینە بەوە دەڵێن". لیۆد جۆرج لە درێژەی باسەکەیدا وتی کە ئەگەر بێت و شتی لەو چەشنە ڕووبدات، کۆڕی ئاشتی بۆ هەتاهەتایە بارگوبنەی تێکدەنێ. ئەو پێشنیاری ئەوەیکرد کە بە چاپەمەنیەکان ڕاگەیەنن پرۆسەی گەیشتن بە بڕیارەکان لە نێوان هێزەکاندا دوورودرێژ و هەستیارە و ئەوان حەز ناکەن بە تێگەیاندنی خەڵک و جەماوەر لە ناکۆکیەکانیان شەڕ و قرەی ناپێویست هەڵگیرسێنن. ویلسۆن بەوە ڕازی بوو. ڕۆژنامەنووسانی ئەمەریکی گلە و گازندەیەکی توندیان ئاراستەی ڕاوێژکاری چاپەمەنی ویلسۆن بەناوی بەیکێر کرد، کە بە گوێرەی کەسێک لە ترسان ڕەنگی دم و چاوی زەرد هەڵگەڕابوو. ئەوان بە ویلسۆنیان وت کە ئەو دووڕووە و بەو کارە ساویلکەبوونی خۆی سەلماندووە. لیۆد جۆرج و کلیمینجوو کە دوور لە مەترسی تیشکاوێژی کۆڵینەوەی گشتی بوون، ئەویان هەر بە کەڕاوتەکەی خۆی خەفە دەکرد. ڕۆژنامەنووسان هەڕەشەیان کرد کە پاریس چۆڵ دەکەن، بەڵام تاقمێکی زۆر کەم وایان کرد.١٢٢

هێزەکانی پلەخوارتریش گلە و گازندە و داواکاری زۆریان هەبوو. پۆرتەغاڵ کە نزیک بە ٦٠،٠٠٠ سەربازی بۆ یارمەتی ناردبوو بۆ بەرەی شەڕی ڕۆژئاوا، لای وابوو کە ئەوە ناعادڵانەیە کە ئەوێ تەنیا نوێنەرێکی هەبێت بەڵام بەڕەزیل کە یەکەیەکی پزشکی و چەند فڕۆکەوانێکی ناردبوو، سێ نوێنەری هەبێت. بەریتانیا پاڵپشتی لە پۆرتەغاڵ، هاوپەیمانی کۆن، کرد و ولاتەیەکگرتوەکانیش لە بەڕەزیل. بەسەرەکی ناسراوبوون لە شاری پاریس، ناوەندی دەسەڵاتی جیهان، بۆ دەوڵەتانی دامەزراوە گرنگ بوو، و بۆ ئەو شتەی کە ناوبژیکەرانیش ناوی "ئەو دەوڵەتانەی کە لە پرۆسەی دامەزراندن دان" لێنابوون هەستیار بوو. بە ڕووخانی ڕووسیە، و هەڵوەشانەوەی مەجارستان-ئوتریش و ئیمپراتۆری عوسمانی، زۆریەک لەم بۆنە و کۆبوونەوانە ڕوویان دەدا. هەر وەستان لەبەردەمی شۆڕای عالی و پێشکەش کردنی وتارێک خۆی لە خۆیدا فەخر و شانازی بوو و دوا گەڕانەوە بۆ ولاتی زێد بۆ ناسراو بوون لەوێ زۆر گرنگ بوو.١٢٣

* * * *

بۆ ماوەی شەش مانگی دواتر، تا کاتی واژۆکردنی ڕێکەوتنامەی ئەڵمانی لە مانگی جوون لە ویرسایلێس، پاریس ببوو بە هەوارگەی نیمچەحکوومەتێکی جیهانی. کلیمینجوو ڕۆژێک بەرلەوەی ئەو تەدارەکە گرنگە بگیرێت وتبووی "ئێمە کۆمەڵەی گەلانین."ویلسۆن لە وڵامدا وتبووی "ئێمە دەوڵەتین." و تەنانەت هەر لە یەکەمین کۆبوونەوەکاندا، ئەندامانی شۆڕای عالی وەک کابینەیەک دەستیان کردبوو بە چالاکی، لە چوارچێوەی سیستەمێکی نوێنەری حکوومەت. هەڵبەت ئەوە شوبهاندنێک بوو کە ئەوان بوخۆیان بەکاریان دێنا.١٢٤

لەوانەیە پاریس هەوارگەی حکوومەتێکی جیهانی بووبێت، بەڵام دەسەڵاتی حکوومەتەکەی قەت بەو گەورەییەی کە خەڵک لەو کاتەدا بۆی چوون و ئێستاش بۆی دەچن، نەبوە. تا ئەو کاتەی کە شۆڕای عالی یەکەمین کۆبوونەوەی لە ١٢ی ژانویە بەڕێوە برد، پۆڵەندا سەرلەنوێ درووست ببۆوە، فنلاند و وڵاتانی بالتیک کەوتبوونە سەر شات و بەرەو سەربەخۆیی خولێر ببوونەوە و چۆکۆسلواکی ببوو بە یەک پارچە. لە ناوچەکانی بالکان، سێربیا لە گەڵ ناوچەکانی سلاڤی کورووات و سلۆڤێنی لە باشووری ئوتریش-مەجارستان یەکیان گرتبوو. قەوارەی نوێ هێشتا بێ ناو بوو بەڵام خەڵک باسی وڵاتی یوگۆسلاڤیان دەکرد. لیۆد جۆرج وتبووی کە "ئەرک و وەزیفەی پێکهێنەرانی-ڕێکەوتنامەی پاریسی ئەوە نەبوو کە بڕیار بدەن چ شتێک بە شێوەی عادڵانە بە ناوچە ئازادکراوەکان ببەخشرێت بەڵکوو کاتێکە سنوورەکانی خودموختاریان بەزاندبوو بە شێوەیەکی سادقانە چ شتێکیان لە چنگ دەربێت."١٢٥

بەڵام ئەو سنوورانە چبوون؟ وڵامێکی ڕوونت نەدەبیست، یان ئەوەیکە هەر نەتەوەیەکی ڕکابەر وڵامێکی جیاوازی هەبوو. دانیشتوویەکی ناوچەکە لە ئەمەریکیەک کە هاتبوو بۆ سەردانی لڤۆڤ، سەبارەت بەو سنوورانەی نێوان ڕووسیە و پۆڵەندا کە کێشەیان لەسەرە پرسیاری کردبوو " ئایا تۆ ئەو قوڵکە بچووکانە دەبینیت؟ ئێمە لێرە پێیان دەڵێین "خاڵەکانی ویلسۆن" ئەوانە بە گولە تۆپ درووست کراون؛ مەودا گەورەکان بە نارنجۆکی دەستی درووست بوون. ئێستا ئێمە بە خودموختاریەوە خەریکین و خودا دەیزانێ کۆتایی چی دەبێ و چۆنیش دەبی." لە یەکەمین دانیشتنەکانیدا شۆڕای عالی دەبوایە شەڕی نێوان پۆڵەندا و دراوسێکانی تاووتوێ بکردایە. کاتێکە کۆڕی ئاشتی ساڵێک دواتر بە شێوەیەکی ڕەسمی کۆتایی پێهات، لێرە و لەوێ شەڕ هێشتا هەر درێژەی هەبو. تاسکیر بلیس، ڕاوێژکاری نیزامی ئەمەریکی لە پاریسەوە نامەیەکی پڕلەخەمی بۆ خێزانەکەی نووسیبوو کە لە ئورووپا پێشبینی سی ساڵی تری شەڕی کردبوو. "نەتەوە نووقم بووەکان خەریکن دەکەونە سەر ئاو و هەرکە سەریان دەرهێنا گەرووی نەفەرێک دەگرن. ئەوان وەکوو مێشوولە وان- هەرکە لەدایک بوون پێوە دەدەن."

ئەگەر کەش و هەوای ساڵی ١٩١٩ لە گەڵ کەش و هەوای ساڵی ١٩٤٥ پێکەوە بەراورد بکەین و وەک یەکیان بشوبهێنین خۆمان بە لارێدا بردوە. لە ساڵی ١٩١٩ هیچ زلهێزێک لە گۆڕێدا نەبوو، هیچ یەکیەتیەکی سۆڤیەت بە ملوێنان سەربازەوە کە ناوەندی ئورووپایان داگیرکردبوو لە ئارادا نەبوو و وڵاتێک بەناوی وڵاتەیەکگرتوەکان بە ئابووریەکی بەهێز و بە بۆمبی ئەتۆمی قۆرخکراو لە سەر ڕووی زەوی نەبوو. لە ساڵی ١٩١٩ وڵاتانی دوژمن یەکجێ و یەک کەرەت تێک نەدەشکان. ناوبژیکەران بە چڕ و پڕی و بەربڵاوی سەبارەت بە درووستکردن یان درووستنەکردنی نەتەوەکان وت و وێژیان دەکرد، بەڵام گلەکە ئەوەندە خۆش نەکرابوو و ئەوەندە پتەو نەبوو تاکوو بتوانن بە کەیفی خۆیان ئەمبارەوباری کەن. هەڵبەت ئەوەش بڵێین کە ناوبژیکەران قودرەتی چاکیان هەبوو. ئەوان سووپا و هێزی دەریایان هەبوو. ئەوان چەکی خواردەمەنیان لەبەردەست دابوو و دەیانتوانی بڕیار بدەن و دژ بە ئورووپایەکی لەبرسامردوو بەکاری بێنن. ئەوان دەیانتوانی بە هەڕەشە و گوڕۆشە و بە بەڵێنی کاریگەریان دانایە، بۆ وێنە، وڵاتیکیان بەسەرەکی بناسیایە یان ئەوەتا ڕێگەیان نەدایە. ئەوان دەیانتوانی نەقشە و خەریتەکانیان دەرهێنایە و سنوورەکانیان بەم بار و بەو بار بگۆڕایە و زۆروەخت بڕیارەکانیان قەبووڵ دەکران- بەڵام نەوەک هەمیشە، بۆ وێنە تورکیە بە شێوازێکی سەرسوورهێنەر خۆی نیشان دا. توانایی حکوومەتی نێونەتەوەیی لە پاریس بۆ کۆنترۆڵکردنی ڕووداوەکان لەلایەن چەند هۆکارێکەوە سنووردار کرابوون کە بریتی بوون لە دووری، دەزگای ڕاگواستن و هێزی ئامادە و بێ مەیلی زلهێزەکان بۆ خەرج کردنی سەروەت و سامانیان.

لە ساڵی ١٩١٩ سنوورەکان هێشتا دیاری نەکرابوون- هەم بۆ خودی ناوبژیکەران و هەم بۆ جیهانیان. لە ئاکامدا، زۆر کەس هاتنە سەر ئەو قەناعەتەی کە ئەگەر هەر ئەوان سەرنجی شۆڕای عالی بۆ لای خۆیان ڕاکێشن، هەڵەکانیان ڕاست دەکرێنەوە و داهاتووشیان مسۆگر دەبێت. لاوێکی کرێکار لە چێشتخانەیەک لە ڕیتز لە سکاڵانامەیەکدا داوای سەربەخۆیی و جیابوونەوەی لە فەرەنسە بۆ وڵاتەبچووکەکەی خۆی کردبوو. هوو چین مینە و ڤیەتنام ئەوەندە شاراوە و نادیار بوون کە هەر وڵامیشیان نەدرایەوە. دەرچوویەکی کۆرەیی لە زانکۆی پرینستۆن هەوڵی دا خۆی بگەیەنێتە پاریس بەڵام پاسپۆرتیان پێ نەدا. دوا شەڕی دووهەمی جیهانی، سینگمان ڕی بوو بە سەرۆکی کۆریای باشوور کە تازە سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاندبوو.١٢٧

کۆمەڵانی دەنگی ژنان بە سەرۆکایەتی ژنە ئینگلیزیەکی بە ورەو بەهێز بەنا وی میلیسێنت فاوسێت لە پاریس کۆبوونەوە و داوای نوێنەرایەتی و مافی دەنگدانیان لە کۆڕی ئاشتیدا بۆ ژنان کرد. ویلسۆن کە خۆی بە هاوسۆز و هاوخەمی ئەوان دەزانی، لە گەڵ شاندی نوێنەرایەتی ئەوان

کۆبۆوە و سەبارەت بە لیژنەیەکی تایبەتی کۆبوونەوەکە، بە ئەندامێتی ژنانەوە، بە شێوەیەکی شاراوە بەڵام هاندەرانە، بۆ مەبەستی کۆڵینەوە لە سەر کێشەکانی ژنان وت و وێژی کرد. لە مانگی فەوریەدا، درووست پێش ئەوەی بۆ کورتەسەفەرێک بگەڕێتەوە بۆ وڵاتەیەکگرتوەکان، بە دوودڵیەوە لە ناوبژیکەرانی هاوڕێی خۆی پرسی کە ئایا ئەوان پاڵپشتی لەمە دەکەن. بالفۆر پاڵپشتێکی بەهێزی مافی دەنگدان بوو بۆ ژنان بەڵام ئەو ڕای وابوو کە ئەوان نابێ خۆ لە بابەتی وەهادا هەڵقوتێنن. کلیمینجوو بەوە ڕازی بوو. ئیتالیەکان ئەیانوت کە ئەوە کێشەیەکە تەواو ناوخۆیی. کاتێکە کلیمینجوو بە دەنگی بەرزەوە چرپاندی کە " ئەرێ ئەو کابرا گولەکەیە دەڵێ چی؟"، نوێنەری ژاپۆنی ڕێز و سوپاسی نارد بۆ دەوری گرنگی ژنان لە شارستانیەتدا بەڵام ڕوونی کردەوە کە بزووتنەوەی مافی دەنگدان لە ژاپۆن بە قەدەر چڵەپووشێک ڕێزی لێناگیرێت. باسەکە خەوت و قەت بۆ جارێکی تر نەبیسرایەوە.١٢٨

ناوبژیکەران هەرخێرا هەستیان بەوەکرد کە بەڕێوەبەرایەتی بەشێکی زۆر لە ئەورووپا و زۆریەک لە پارچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناڤینیان گرتۆتە ئەستۆ. شێوازەکانی دەسەڵاتداریتی کۆن نەمابوون و هێزە داگیرکەرەکانی هاوپەیمانان و نوێنەرانی هاوپەیمانان خەریک بوون جێگای ئەوانیان دەگرتەوە. هیچ ڕێگایەکی تریان لەبەر نەبوو؛ ئەگەر ئەوان نەچوونایە، کەسی تر نەبوو بچێ، یان خراپتر لەوە، لەوانەبوو شۆڕشگێڕەکان بڕۆیشتنایە. پیاوەکان ئەوەیکە لە دەستیان هات کردیان. لە بێککگرەید دەریادارێکی بەریتانی چەند بەلەمێک کە هەڵگری خواردەمەنی و کەرەسەی خاو بوون پێکەوە گرێ دان و حەواڵەی دانووبی کردن. زۆر جار کە ڕووبەڕووی کێشە دەبۆوە لەلایەن حکوومەتە جیاجیاکان بە درێژایی ڕووبارەکە، ڕووی دەکردە تجارەت و پیشەسازی و تا ڕادەیەکی کەم بژیوی خۆی لەم ڕێگایەوە دابین دەکرد، بەڵام ئەمە ئاڵتەرناتیڤێک[چارەسەریەکی] کاتی بوو. هەروەک بە پاریسیەکانی ڕاگەیاند، ڕێگەچارەی درێژخایەن کۆنترۆڵی جیهانی دانووب و ڕێگەئاویە گەورەکانی تری ئورووپا بوو. پیلانگێڕی تر و پەرۆشی تریش لە ئارادابوون، بەڵام ئایا ئیرادەی سیاسی هەبوون؟ یان پارە؟١٢٩

گرتنەئەستۆی بابڵێین تەنیا بەرپرسایەتیەکانی ئابووری شتێکی هەروا ئاسان نەبوو و تۆقێنەر بوو. شەڕ ئابووری جیهانی شڵەژاندبوو و بەو زوانەش نەدەهاتەوە سەر قوڵتی خۆی. وڵاتانی ئەورووپی زیاتر لەوەپێش بڕێکی زۆر پارەیان لە وڵاتەیەکگرتوەکان بە قەرز وەرگرتبوو. و ئێستا ئیتر نەدەکرا بۆ نۆژەنکردنەوە، ئاوەدانی و بووژاندنەوەی تجارەت بوودجەیەک وەرگرن و تەرخانی ئەوێی کەن. شەڕ کارخانەکانی بە بێ کەڵکی، مووچە و مەزراکانی بە نەکێڵدراوی، پردەکان و هێڵەکانی ڕێگای

شمەندەفەری بە خاپووری بەجێ هێشتبوو. کەم و کورتی لە کود و پەیین، تۆو و دانەوێڵە، کەرەسەی خاو، کەشتی و لۆکۆمۆتیف و هێزی بزوێنەر هەبوو. ئورووپا بۆ دابینکردنی سووتەمەنی خۆی بەو حاڵەش پێویستیەکی زۆری بە خەڵووز هەبوو، بەڵام کانزاکان لە فەرەنسە، بلژیک، پۆڵەندا و ئەڵمان لافاو بردبوونی. سەرهەڵدانی وڵاتانی نوێ لە ناوەندی ئورووپادا لەپاشماوەی تۆڕەکانی تجاری و گواستنەوە هەرەشەی دەکرد. لە ڤیەن لامپەکانی ئەلیکتریکی پرتەپرتیان تێکەوت و کووژانەوە و ترامەکان[واگۆنی سەربەتاڵی کانزای خەڵووز کە بە سەر هێڵی ئاسندا دەڕوات] لە کارکردن کەوتن چون خەڵووزێک کە جاران لە باکوورەوە دەهات ئێستا لە لایەن سنووری نوێوە بەربەست کرابوو.

لە چوارقوڕنووی ئورووپاوە، لە مەقاماتی ڕەسمی و ئاژانسەکانی یارمەتی نهێنی هەواڵ و گوزارشی ترسێنەر و ناخۆش بە گوێ دەگەیشت: ملوێنان مرۆڤی بێکار، ژنانی نائۆمێد و دڵسارد تەنیا پێخۆرێکە بۆ بنەماڵەکانیان ساز دەکرد پەتاتە و سووپی کەلەم بوو، منداڵانی ڕووتەڵە. هەر لە یەکەمین زستانی سارد و سڕی ئاشتیدا، هێربێرت هۆڤێر، بەڕێوەبەری یارمەتی ئەمەریکی، هاوپەیمانانی ئاگادارکردەوە کە نزیک بە ٢٠٠ملوێن کەس لە وڵاتانی دوژمن و دووبارە بەشێکی زۆر لە خەڵکانی دانیشتووی وڵاتانی سەرکەوتوو و وڵاتانی بێ لایەن ڕووبەڕووی برسێتی و قات و قڕی هاتوون. بە تاقی تەنیا ئەڵمان لە مانگدا پێویستی بە ٢٠٠،٠٠٠تۆن گەنم و ٧٠،٠٠٠تۆن گۆشت هەبوو. لە سەراسەری ناوچەکانی مەجارستان-ئوتریشی کۆندا نەخۆشخانەکان لە باند و نەواری برین و دەوا و دەرمان بێ بەش بوون. لە وڵاتانی چۆکۆسلەواکی یەک ملوێن منداڵ بەبێ شیر هەڵیان دەکرد. لە ڤیەن ژمارەی منداڵانێک کە دەمردن لەوانەی کە دەمانەوە زۆر زیاتر بوون. خۆراکی خەڵک تەپ و تۆزی خەڵووز، تەڵاشەدار و زیخ و لمی چۆمان بوو. کرێکارانی کۆمەک و یارمەتی بۆ ئەو شتانەی کە پێشتر قەت نەیاندیبوون و نەشیانبیستبوون هەر لەخۆوە ناوێکیان بۆ دانابوون، وەکوو نەخۆشی مانگێل-ورزێل، و کەسانێک تووشی دەهاتن کە خۆراکی سەرەکیان لە سەر چەوەندەر دابین کرابوو.١٣٠

نە لایەنی مرۆڤایەتی و نە لایەنی سیاسی شتێکی ئەوتۆیان بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشانە لە دەست نەدەهات. ویلسۆن هاوکارەکانی بەم چەشنە ئاگادار کردبۆوە " هەتا برسیەتی زیاتر پەل بهاوێ، بنەماکانی حکوومەتیش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر هەڵدەوەشێنەوە." ١٣١ ئەوان سەرچاوەی سامانە سرووشتیەکانیان لە بەردەست دابوو. کانەدایەکان، ئوسترالیەکان، نیووزیلەندیەکان و ئەمەریکیەکان هەرهەموویان خۆراکی ئیزافە و کەرەسەی خاویان لە بەدەست دابوو کە ئارەزوویان دەکرد بە فرۆشی

بگەیەنن. دەکرا بۆ ڕاگوێستنیان لە کەشتی کەڵک وەرگیرێت. بەڵام ئەی پارە لە کوێوە دەبوو بهاتایە؟ ئەڵمانیا زەخیرەی تەڵای هەبوو، بەڵام فەڕەنسەیەکان، کە سووربوون لە سەر ئەوەیکە ئەو زەخیرەیە دەبێ تەرخانی قەرەبووکردنەوەی خەسارەتەکان بکرێ، نەیاندەویست هەروا بەفیڕۆ بڕوات و تەرخانی خەرجی هەناردەکان بکرێت. هاوپەیمانانی ئەورووپی نەیاندەتوانی لەو ئاستەی کە پێویست بوو تێچووی یارمەتی و کۆمەک بخەنە ئەستۆی خۆیان و وڵاتانی شکستخواردوو، بێجگە لە ئەڵمان، تووشی مایەپووچی هاتبوون. ئەوە وڵاتەیەکگرتووەکانی تەنیا هێشتبۆوە، کۆنگرێس و خەڵکی ئەمەریکا لەو بەینەدا مابوونەوە و نەیاندەزانی چی بکەن ئایا یارمەتی بدەن یان هەر ئەوەندە کە وڵاتەیەکگرتووەکان لە بردنەوەی شەڕدا ئەوەیکە لەدەستی هاتوە کردوویەتی تەواوە. لە شەڕی دووهەمی جیهانیدا هەڵوێستیان هەر هەمان هەڵوێست بوو، بەڵام جیاوازیەکی گرنگی هەبوو: لەباتی هەڕەشەی بەربڵاوی شۆڕش، تەنیا دوژمنێک لە ئارادابوو، ئەویش یەکیەتی سۆڤیەت بوو. هاوتای مارشاڵ پلان، کە لەو کەش و هەوایەدا لە بووژاندنەوەی ئورووپادا دەستی یارمەتی هەبوو، لە ساڵی ١٩١٩ شتێکی لەو چەشنە لە ئارادا نەبوو.

بێجگە لەمانە وڵاتەیەکگرتووەکان ئەو باڵادەستی دەسەڵاتەی کە بە سەر جیهاندا پاش شەڕی دووهەمی جیهانی هەیبوو لێرەدا نەیمابوو. هاوپەیمانانی ئەورووپی وڵاتەیەکگرتووەکان نائۆمێد و تەنگەتاو نەبوون، ئامادەی یارمەتیدان بوون بە ئەو وڵاتە، تەنانەت ئەگەر بە قیمەتی قەبووڵکردنی پێشنیارەکانی ئەمەریکاش بوایە. لە ساڵی ١٩١٩ ئەوان وەک ئەکتەرانی سەربەخۆی کاروباری جیهان سەیری خۆیان دەکرد و لەڕاستیدا هەرواش بوون. بەرلە کۆتایی هاتنی شەڕ بەریتانیا، فەڕەنسە و ئیتالیا لە چوارچێوەی کۆمەڵێکی یەکگرتوودا بڕیاریان دا بوودجەی هاوپەیمانی، خواردەمەنی، کەرەسەی خاو و کەشتی لەپێناو کۆمەک و ئاوەدانکردنەوەدا دابین بکەن. ئەمەریکیەکان بەرەنگاری ئەمە بوونەوە. ئەوان گومانی ئەوەیان دەکرد کە هاوپەیمانەکانیان دەیانەویست بۆ گوشارخستنە سەر وڵاتانی دوژمن بۆ ئەوەی مەرجەکانی ئاشتی پەسەند بکەن دابەشکردنی سامانەکان دەخەنە ژێر کونترۆڵ خۆیانەوە، هەرچەند بەشی سەرەکی ئەمانە ڕووی لە وڵاتەیەکگرتووەکان کردبوو. کاتێکە ویلسۆن پێداگری دەکرد لەوەیکە هۆڤێر ببێ بە بەرپرسی بەڕێوەبەرایەتی کۆمەکی هاوپەیمانی، ئورووپایەکان دژ بەمە هەڵوێستیان گرت. گلەیی لیۆد جۆرج ئەمە بوو کە هۆڤێر دەبێ بە "دیکتاتۆری خواردەمەنی ئورووپا" و تاجرانی ئەمەریکی لەم دەرفەتە کەڵک وەردەگرن و خۆیان دەخزێننە ناوە. ئورووپایەکان هەموو هەوڵێکی خۆیان خستە گەڕ بۆ ئەوەی ئاستەنگ بخەنە بەردەم ئامانجەکانی هۆڤێر.١٣٢

بە ڕای ویلسۆن و زۆربەی ئەمەریکیەکان، هۆڤێر قارەمان بوو، هەتیوێکی هەژار کە لە زانکۆی ستانفۆڕدەوە ڕێبازی خۆی گرتبوە بەر تاکوو ببێ بە یەکێک لە ئەندازیارە ناودارەکانی جیهان. ئەو لە ماوەی شەڕدا پرۆگرامێکی بەربڵاوی یارمەتی بۆ بلژیکی داگیرکراو-بەدەست ئەڵمان ڕێخستبوو، و کاتێکە وڵاتەیەکگرتوەکان لە ساڵی ١٩١٧ لە شەڕەوە گلا ئەو بەرپرسی هەڵگرتنی خواردەمەنی بوو بۆ کاتی تەنگانەی شەڕ. لە سەر کارتەکانی ڤاڵنتاین ئەم دێڕە نووسرابوو "من دەتوانم هۆڤێرئاسا واز لە خواردنی سەر سفرە بێنم، بەڵام هەرگیز واز لە خۆشەویستی تۆ ناهێنم." ئەو لێهاتوو بوو، تێکۆشەر و چالاک بوو بەڵام لە شۆخی کردن و گاڵتەکردن بەدوور بوو. لیۆد جۆرج ئەوی بێ هەست و ووشک دەهاتە بەرچاو. ئورووپایەکان وەڕەز بوون لەوەیکە هۆڤێر هەرتاوناتاوێک وەبیری دێنانەوە کە بەشێکی زۆر لەو یارمەتیانەی کە بە ئورووپایەکان دەدرا وڵاتەیەکگرتوەکان دابینی دەکرت، و لە شێوازێک کە ئەو پەرەی بە بەرژەوەندیەکانی ئابووری ئەمەریکی دەدا، بۆ وێنە، خاڵی کردنی باری بەرهەمی گۆشتی خووکی کەڵەکەکراوی ئەمەریکی کە لە ڕیشەوە بەرهەمهێنەرانی ئەورووپی هەڵدەقەند.١٣٣

هەرچەند هاوپەیمانان ژمارەیەک ئاژانسی ئابووریان هەبوو، کە لە لایەن شۆڕای عالی ئابووری بە شل و ولیەوە چاودێری دەکرا، کەرتی یارمەتی و خواردەمەنی هۆڤێر لە هەموویان کاراتر و بەهێزتر بوو. بە ١٠٠$ ملوێن دۆلار لە وڵاتەیەکگرتوەکانەوە و نزیک بە ٦٢$ ملوێن دۆلار لە بەریتانیاوە، ئەو لە سیو-دوو وڵات بنکە و ئۆفیسی دامەزراند، چێشتخانەگەلی سووپی کردەوە کە بە ملوێن منداڵانیان تێر دەکرد و تۆنی خواردەمەنی، جل و بەرگ و کەل و پەلی پزیشکی بۆ ناوچە زۆر لێقەوماوەکان حەواڵەکرد. لە بەهاری ١٩١٩دا ڕێکخراوەکەی هۆڤێر وایلێهاتبوو کە ڕێگاکانی شەمەندەفەڕی دەخستە گەڕ و چاودێری کانزاکانی دەکرد. تۆڕێکی تێلێگرافی تایبەت بەخۆی هەبوو. خەرجی هەڵمەتی لەناوبردنی ئەسپێ و ئافەتی گیا وگژەکانی گرتە ئەستۆی خۆی، هەزاران قژگیرەی سەری نارد، تۆنی سووپی نارد، حەمام و ویژگەی بە یارمەتی سەربازانی ئەمەریکی دانا. ئەو گەشتیارانەی کە پێناسەی "ئەسپێ دۆزکراو"یان پێ نەبوو ڕادەگیران و دەیاندۆزین. لە هاوینی ١٩١٩دا هۆڤێر بۆ جارێکی تر ئورووپایەکانی لە دین دەهری کرد. ئەو ئەیوت کە وڵاتەیەکگرتوەکان ئەوەی لە دەستی هاتوە کردوویەتی؛ ئێستا ئیتر نۆبەی ئورووپیەکانە. ئەوان دەبێ خۆیان ماندوو بکەن، قەناعەتیان هەبێت و زەخیرە و ئەندووختە هەڵگرن. بیروبۆچوونەکانی لە واشنگتۆنێک کە جار لە گەڵ جار دوورەپەرێزتر دەخرا وەرگیرا و پەسەندکرا، و بە خێرایی وام و یارمەتی ئەمەریکی کەمی کرد.١٣٤

لەڕاستیدا، تا ساڵی ١٩٢٥ی خایاند تا ئەوروپا توانی ئاستەکانی بەرهەمهێنانی پێش شەڕ بە دەست بێنێتەوە؛ لە هەندێک لە ناوچەکان بووژانەوە و قەرەبووکردنەوە لە ئاستێکی زۆر خوارتر دابوو. زۆریەک لە حکوومەتەکان بۆ ئەوەی وڵاتانی خۆیان بخەنەوە سەر شات، پەنایان هێنا بۆ هەنگاوگەلی وەکوو قەرزوەرگرتن، کەمکردنەوەی بوودجە و کۆنترۆڵکردنی تجارەت. ئابووری ئوورووپا هەروا بە تەسکی مایەوە، هاوڕێ لە گەڵ ئەوەش کاتێکە حکوومەتەکان کەوتنە خۆ بۆ پاراستنی بەرووبوومەکانی خۆماڵی گرژی سیاسی لە ناوخۆی وڵاتان لە دەیەکانی ١٩٢٠ و ئاڵۆزیەکانی دەرەوە کەوتنە سەر یەک و کەڵکەڵەیان کرد. دەکرا بە پارەی ئەمەریکی و بە هاریکاری ئەورووپی ئورووپایەکی بەهێزتر درووست بکرایە تاکوو بیتوانیایە لە بەرانبەر ئاستەنگەکانی ساڵەکانی دەیەی ١٩٣٠ زیاتر دەوامی بێنایە.١٣٥

# ٦

# ڕوسیا

لە ١٨ی ژانویەی ساڵی ١٩١٩دا کۆڕی ئاشتی بە شێوەیەکی فەرمی کرایەوە. کلیمینجوو خاترجەم بوو لەوەیکە ڕێکەوتی کرانەوەی ئەو بۆنەیە لە ساڵیادی ئاهەنگی تاج لەسەرنانی ویلهێڵمی یەکەم وەک قەیسەری ئەڵمانی نوێ لە ساڵی ١٨٧١دا بووە. بۆ ئەو نوێنەرانەی کە لە شوێنێکی ڕازاوە و خۆش بە ناوی سالؑی دی هۆرلۆگ لە کوایدی ئۆرسای کۆببوونەوە سەرۆک کۆمار پۆینکارێ سەبارەت بە پەستی و خوێڕیەتی دوژمنەکانیان، قوربانیە زۆر و بەرچاوەکانی هاوپەیمانان و هیوا و ئۆمێد بۆ ئاشتیەکی هەتاهەتایی قسەی بۆکردن. پێی ڕاگەیاندن کە " داهاتووی جیهان لە ناو دەستەکانی ئێوە دایە." کاتێکە دەچوونە دەرێ بالفۆر هەڵگەڕاوە بەلای کلیمینجوودا و داوای لێبوردنی لێکرد لەوەیکە شەپکەی[کڵاوی سەر] لە سەردانەبوە. ئەو وتی "بە منیان وت کە پێویستە کڵاوم لە سەردابێ." کلیمینجوو بە کڵاوە ڕەشە خڕەکەیەوە وڵامی دایەوە کە "منیش لام هەر وابوو کە پێویستە."١٣٦

چاودێران هەستیان بەوەکرد کە هەندێک کەسایەتی لە دانیشتنەکەدا ئامادەنەبوون: ڤێنیزیلۆس، سەرۆک وەزیری یوونان، لەوەیکە دەبیینی کە سێربیە لە وڵاتەکەی ئەو نوێنەری زیاتری هەیە عاجز بوو. بۆردێن، سەرۆک وەزیری کەنەدا، لەوە ناڕەحەت بوو کە سەرۆک وەزیری نیووفاونلەندی بچووک مافی بەرایی پێ بەخشرابوو؛ و ژاپۆنیەکان، کە هێشتا نەگەیشتبوونە بەرەوە. بەڵام لە هەمووی ئەمانە سەرسووڕهێنەرتر ئامادەنەبوونی ڕووسیە بوو.

لەوانەیە فەڕەنسا لە بەرەی ڕۆژهەڵاتی جەنگ لەبەرانبەر ئەڵماندا تووشی شکست نەهاتایە و ڕزگاری بوایە ئەگەر لە ساڵی ١٩١٤ هاوپەیمانێکی وەکوو ڕووسیەی بگرتایە. بۆ ماوەی سێ ساڵ، ڕووسیە لە گەڵ زلهێزەکان جەنگابوو، زیان و زەرەری قورسی پێ گەیاندبوون بەڵام زیاتر لە ئەوان تووشی ماڵوێرانی هاتبوو. لە ئاکامدا لە ساڵی ١٩١٧ لە ژێر گوشاردا درزی تێکەوتبوو و، لە ماوەی هەشت مانگدا، لە ئوتوکراسیەوە بەرەو دیموکراسی و دواتر بەرەو دیکتاتۆریەتێکی شۆڕشگێڕانە ڕۆیشتبوو بە ڕێبەری تاقمێکی توندڕەوی بچووک لە

سۆسیالیستەکانی ڕووسیە، واتە بۆلشویکەکان، کە زۆربەی خەڵک، وەکوو خودی ڕووسیەکان، هەر ناویشیان نەبیستبوون. کاتێکە ڕووسیە ڕووخا، چەندین پارچە لە ئیمپراتۆریکی گەورەی لێ کەوتەوە: وڵاتانی بالتیک، ئۆکراین، ئەرمەنستان، گۆرجستان، ئازربایجان و داغستان. هاوپەیمانان لە هەوڵێکی بێ کەڵک و بێ ئەنجام هێزیان ڕەوانە کردبوو تا پاڵپشتی لە هاوپەیمانی هەڵوەشاوە دژ بە ئەڵمانیەکان بکەن، بەڵام لە سەرەتای ساڵی ١٩١٨دا بۆلشویکەکان لە گەڵ ئەڵمانیا ئاشتیان کردبۆوە. سەربازانی هاوپەیمان لە سەر خاکی ڕوسیا مانەوە، بەڵام کە چبکەن؟ بۆلشویکەکان و ڕەژیمی سۆڤیەتی ئەوان لەسەرکار لابەرن؟ لایەنگری لە دوژمنانی ناسازگار و نەحەواوەی ئەوان بکەن، سەڵتەنەتخوازان، لیبرالەکان، ئانارشیستەکان، سوسیالیستە ڕوونکراوەکان، ناسیۆنالیستەکانی هەمەڕەنگ؟

لە پاریس نەدەکرا بەو ئاسانیە سەر لە ڕووداوەکانی ڕۆژهەڵات دەرهێنی و بزانی چی بە چیە و کێ سەربە کوێیە. ئەو گوزارش و هەڤاڵانەی کە ڕوویان دەکردە ڕۆژئاوا و واوە دەهاتن باسی هەستان و نیشتنەوەی گرژی و ئاڵۆزیەکانی کۆمەڵایەتیان دەکرد، شەڕوشۆڕی ناوخۆ، سەرهەڵدانەکانی ناسیۆنالیستی، کۆمەڵێک کارەسات و دڕندەیی: دوایەمین تزار و بنەماڵەکەی ترۆر کرابوون و جەستەکانیان فڕێدرابوونە ناو چاڵێک، جەستەی پارچەپارچەکراوی نوێنەرێکی هێزی دەریایی بەریتانیا فڕێدرابۆوە سەر شەقامی پێتێرزبۆرگ. سەربازانی ڕووسی تەقەیان لە ئەفسەرەکانیان کردبوو، دەریاوانان دەستیان بە سەر کەشتیەکانیاندا گرتبوو. لە سەرتاسەری لادێکانی ڕووسیەی گەورە، گوندنشینان، کە لەمێژبوو بەهۆی بێ بەشبوون لە زەوی و زار لە دەست برسیەتی و هەژاری بەتەنگەوە هاتبوون، کەوتبوونە کوشت و کوشتاری خاوەن زەوی و زارەکان. لە شارەکان، هەرزەکارانی چەک بەدەست بەفیزەوە دەڕۆیشتن و هەژارانیش لە گەڕەکە هەژارنشینەکانەوە دەخزین و دەهاتنە دەرێ تاکوو کۆشکەکان و خانووە گەورەکان داگیر بکەن. نەدەکرا بە ئاسانی لێکی بدەیەوە کە ئەو هەواڵانە تا چ ڕادەیەک ڕاستن چون تا ئەو کاتە ڕووسیە ناوچەیەکی نەناسراوبوو. ڕەژیمی نوێ بەتەواو مانا گەمارۆ درابوو. زلهێزەکان پێوەندیەکانی تجاریان لە گەڵ بۆلشویکەکان پساندبوو و دیپلۆماتەکانیان تا هاوینی ١٩١٨ کێشابوە دواوە. لەوانەیە بڵێین هەمووی هەواڵنێرانی ڕۆژنامە بیانیەکان تا سەرەتای ساڵی ١٩١٩ ئەوێیان چۆڵ کردبوو. شەڕوشۆڕ ڕێگاکانی وڵاتی بەستبوو. ئەگەر تیلێگرامەکان بگەیشتایەتن چەندین ڕۆژ یان چەندین هەفتەیان دەبرد. کاتێکە ئەندامانی کۆڕی ئاشتی پێکەوە کۆدەبوونەوە تەنیا ڕێگای گەیشتن بە پەیامەکان ستۆکهۆڵم بوو، شوێنێک کە بۆلشویکەکان لەوێ نوێنەریان هەبوو. لە ماوەی کۆڕی ئاشتیدا ناوبژیکەران چەندە سەبارەت بە

ئەوڵاکەی تری مانگ زانیاریان هەبوو هەر ئەوەندەش سەبارەت بە ڕووسیە زانستیان هەبوو.١٣٧ لیۆد جۆرج بەم شێوەیە دەیگێڕێتەوە: "لەڕاستیدا ئێمە لەگەڵ حەقیقەتێکی ڕوون و بەرچاو ڕووبەڕوو نەبووین. ڕوسیا وەکوو دارستانێک وابوو کە کەس نەیدەزانی لەناو چەند میتری ئەو جەنگەڵە چی هەیە."١٣٨ لە جوگرافیدا هەرەی لە برە نەدەکردەوە و بۆیە وابیری دەکردەوە. وایدەزانی خارکۆف(کە ناوی شارێک بوو لە ئۆکراین) ناوی ژەنەراڵێکی ڕوسیە. لەوانەیە لەباری یاسایەوە پێویستی بە بانگێشتکردنی نوێنەرانی ڕوسی نەبووبێت. باوەڕی کلیمینجوو ئەمە بوو کە : ڕوسیا خەیانەتی بە مەسەلەی هاوپەیمانی کردبوو، لەژێر دەسەڵات و ڕەحمەتی ئەڵمانیەکاندا پشتی لە فەڕەنسا کردبوو.١٣٩ ڕێبەری بۆلشویکی، لنین، کە کاتی خۆی ریالیست و لاگر بوو لە شوێنێک بە ناوی برێست لیتۆسک(برێستی ئەمرۆکە لە پۆڵەندا) زەوی و زار و سەرچاوە سرووشتیەکانی بە ئەڵمانیا بەخشیبوو تا لەباتی ئەمە کەش و هەوایەکی هێمنانە و ئاشتیانەی بدەنێ تابەڵکوو ئەم بتوانێ لە ترووسکەی سەرەکی پارێزگاری بکات کە لەوێوە هەزارەی مارکسیستی سەری هەڵ ئەدا. ئەڵمانیا دەستی بەو کەرەسانە گەیشتبوو کە بەڕاستی پێویستی پێیان بوو و هەلێکی بۆ ڕەخسی بوو تا بتوانێ سەدان هەزار کەس لە هێزەکانی خۆی بۆ بەرەی جەنگی ڕۆژئاوا بگۆزێتەوە. ئەم کردەوەی لنین بۆ هاوپەیمانان، بەتایبەت کلیمینجوو، زۆر ناخۆش بوو، بۆیە لەو هەموو قەول و بەڵێنانەی کە بە ڕووسیەیان دابوو پاشگەز بوونەوە، وەکوو بەڵێنی دەستڕاگەیشتن بە دەربەندە حەیاتیەکان کە لە دەریای ڕەشەوە تا مەدیتەرانە درێژەیان هەبوو. بە واتایەکی تر، ڕووسیە لەباری تەکنیکیەوە هێشتا هاوپەیمان بوو و هێشتا لە گەڵ ئەڵمان لە جەنگ دابوو. بەگشتی، ئەڵمانیەکان ناچارکرابوون کە لە پەیمانی برێست-لیتۆڤێسک وازبێنن، پەیمانێکی ئاشتی کە لە گەڵ ڕووسیە بەستبوویان، کاتێکە ئەوان ئاگربەستی خۆیان لە نوامری ١٩١٨ ڕاگەیاندبوو. بە هەر شێوەیەک بوایە، ئامادەنەبوونی ڕووسیە زۆر ناجۆر دەکەوت. ڕاوێژکارێکی لاوی بەریتانی لە یادداشتنامەکەی خۆیدا نووسیبووی کە" لە وتووێژەکاندا لەسەر هەر تەوەرێک کە دەرۆی بەخۆت نییە و ڕوسیا دەگرێتەوە. بۆیە وتووێژەکان پچڕپچڕن و هیچیان بەسەر هیچەوە نییە؛ هەموویان ڕێدەکەون لەسەر ئەوەی کە هیچ بابەتێک بڕیاری لەسەر لێنادرێ مەگەر سیاسەتی گشتی سەبارەت بە ڕوسیا دیاری بکرێت؛ ئەمە بە خەیاڵ لەسەر ئەمە ڕێکەوتوون، لەباتی ڕوونکردنەوەی ئەم سیاسەتە، خۆ لە باسێکی تر هەڵدەقوتێنن."١٤٠ فنلاند، وڵاتانی بالتیک کە تازە سەریان دەرهێنابوو ئیستۆنی، لاتڤیا و لیتوانیا؛ پۆڵەندا، ڕۆمانیا، تورکیە و ئێران هەرهەموویان لە کۆڕی ئاشتیدا بەشدار بوون، بەڵام هەتا شکڵ و شێوەی داهاتووی ڕووسیە دیاری نەکرایە نەدەکرا هیچ بڕیارێک لە سەر سنوورەکانیان بدرێت.

پرسی ڕوسیا لە ماوەی کۆبوونەوەی ئاشتیدا بەردەوام دەهاتە بەرباس. بەیکێر، کە دواتر داوای لێبوردنی لە ویلسۆن کردبوو، ڕایگەیاندبوو کە ڕوسیا و ترس لە بیروباوەڕی بۆلشویزم چوارچێوەی ئاشتی دارشتوە. ئەو نەڕاندبووی کە "ڕۆڵێک کە ڕوسیا لە پاریس گێڕاویەتی لە ڕۆڵی پڕاشا[فەرەنگ] زۆر گرنگترە!" ئەمە، وەکوو زۆریەک لەو شتانەی کە ئەو بەپێویستی دەزانیێ، پڕووپووچ و بێ مانایە. ناوبژیکەران زۆرتر لە فکری ئاشتی کردنەوە لە گەڵ ئەڵمانێک بوون کە هێشتا وەکوو خۆی مابۆوە و لە فکری گەڕانەوەی ئورووپادا بوون بۆ سەردەمی ئاشتی و تەبایی. نیگەرانی ئەوان سەبارەت بە ڕووسیە تەنیا لەبەرهۆی ئەوە بوو کە ئەوان نیگەرانی ئالۆزیەکی کۆمەڵایەتی بوون کە نزیک بە وڵاتی زێدی ئەوان[ئەورووپیەکان] بوو، بەڵام واش نەبوو کە ئەوان وەک پێویست هەردووکیان بە دوو لای سکەیەک بزانن. لەبەینبردنی بۆلشویکەکان لە ڕووسیە هۆکارەکانی ئاژاوەگەری لە شوێنەکانیتر بەشێوەیەکی سێحراوی نەدەسڕیەوە. کرێکاران و سەربازانی ئەڵمانی توانیان قودرەت بگرنە دەست چون ڕەژیمی قەیسەر لە ناو خەڵکدا متمانەی نەمابوو و تووشی مایەپووچی هاتبوو. حکوومەتی مەجارستان-ئوتریش ڕووخا چون چیتر نەیدەتوانی خۆی لە سەر گۆمەکە ڕاگرێ و نەتوەکانیتری خۆی بخاتە بن گۆمەکەوە. شۆڕشی ڕووسی هەندێ جار ببووە هاندەرێک بۆ نەتەوەکانیتر و شێوەزمانێکی ئاخاوتنی فێرکردبوون. بۆردێن لە یادداشتنامەکەی خۆیدا سەبارەت بە ئالۆزی کار نەک شۆڕش نووسیبووی کە "بیروباوەڕی بۆلشویزم ڕۆژی خۆی هاتوە." "بلشویزم" (یان هاوتاکەی ""کمونیزم") لە ساڵی ١٩١٩دا کورتکراوەیەکی لەبار و پڕ بەپێست بوو. هەروەک بلیس، ڕاوێژکاری نیزامی ویلسۆن، وتبووی "ئەگەر ئێمە بەجێی ئەو وشەیە، وشەی "شۆڕشگێڕی" مان بەکار بێنایە لەوانەبوو ئەمیان ئاشناتر و ئاسانتر بوایە."١٤١

هەڵبەت، ناوبژیکەران نەک بڵێی تەنیا نیگەرانی ئەوان بیروباوەڕی شۆڕشگێڕانەی ڕووسیە بوو، نا، ئەوان بەگشتی لە هەر بیروباوەڕێکی شۆڕشگێڕانە ترسیان لە دڵدابوو. دەربازبووانی شەڕی گەورە پەشێو و ماندوو ببوون. ئەوەیکە دیار و بەرچاو بوو ئەمە بوو کە ڕێکخراوە قایم و قۆڵەکان، ئیمپراتۆریەکان، خزمەتگوزاریەکانی مەدەنی ئەوان و سووپاکانیان، تواببوونەوە و لە زۆربەی ناوچەکانی ئورووپا هێشتا نەزانرابوو چی بڕیارە جێگەی ئەوان بگرێتەوە. ئەورووپا ببوو بە هەوارگەی ئارەزووە نەهاتەدیەکانی بەرلەشەڕ-ئەو سوسیالیستانەی کە بە ئاواتی جیهانێکی باشترەوە بوون، چینی کرێکار بۆ کەش و هەوایەکی لەبارتر، ناسیۆنالیستەکان بۆ نیشتمانەکانیان- و ئەو ئارەزوانە بە هێز و ورەیەکی زیاترەوە سەریان هەڵدابوو چونکە لە جیهانی پڕ جموجۆڵی ١٩١٩ دەکرا خەون بە گۆڕانکاری گەورەوە ببینی یان سەبارەت بە پشێوی و ئالۆزی خەوی ناخۆش ببینی. سەرۆک کۆماری

پۆرتەغالییەکان تیرۆر کرا. دواتر لە ساڵی ١٩١٩، لە پاریس، شێتە پیاوێک هەوڵی کوشتنی کلیمینجۆی دەدا. لە بۆڤارا و مەجارستان، دەوڵەتانی کمونیستی دەسەڵاتیان گرتە دەست، لە موونیخ بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک، بەڵام لە بوداپێست بۆ ماوەیەکی زیاتر. لە بەرلین لە مانگی ژانویەدا، و لە ڤیەننا لە مانگی جووندا، کموونیستەکان هەوڵێکی لەو چەشنەیان دا بەڵام سەرنەکەوتن. نابێ هەمووی تاوانەکان بخرێتە ئەستۆی بۆلشویکەکان.

نەک تەنیا ئەوانەی کە سەر بە باڵی چەپ بوون، بەڵکوو زۆر لایەنی تر هیچ نەخەزڵان و دەست و پێی خۆیان گوم نەکرد. ڕۆژێکیان لە کاتی نانی نیوەڕۆدا لە هۆتێل ماجێستیک، نوێنەری کانادا، ئۆلیویر مۆوات بیگار، لە گەڵ گرووپێک کە فیلیپ کێر، یارمەتیدەری تایبەتی لیۆد جۆرج یەکێکیان بوو، شۆخیان دەکرد و پێدەکەنین. " هەست و باوەڕی ئێمە ئەمە بوو کە پارە لە جیهاندا زۆر شتی بۆ کوتن پێ بوو- واتە پارە خۆپەرست و خۆویستە. ئاکامی لۆژیکانە بیروباوەڕی کمونیزمە. گومان لەوەدا نییە کە هەموولایەک لە چارەگەسەدەیەکی تر یان ماوەیەکی زیاتر بەوی دەگەن."لەهەمانکاتدا، بەوشێوەی کە بیگار بۆ ژنەکەی خۆی لە کەنەدا نووسیبووی، ئەو کاتێکی خۆشی لەوێ بە سەر دەبرد: سەمای ئێوارانی یەکشەنبە لە ماجێستی، فاوست و مادامی باتێرفلای لە ئۆپێرا، هۆڵەکانی موزیک ئەو شوێنەی کە ئەو بۆ خێزانەکەی گێڕابوەوە کە جوانی لەشفرۆشانی ئەوێ سەرنجی ئەمیان بۆ لای خۆیان ڕاکێشابوو. ئەو ئاماژەی بەوە کردبوو کە پێوەرەکان و ستانداردەکانی فەرەنسەیی لە گەڵ هینەکانی کەنەدایی زۆر جیاواز بوون. لە ئۆپێرایەکی کۆمیکدا، ژنە ئەکتەری سەرەکی " لە سەرووی سمتەکانیەوە بێجگە لە چەند زنجیرێک چیتر نەبوو و لەوانی تر لە سەرەوە و لە خوارەوە جگە لە شریت و کەوش هیچیترت نەدەدی. وەک سەماکەرێک زۆر خوێنتاڵ و ناشیرین بوو." کاتێکە خێزانەکەی پێشنیاری پێکردبوو کە لە کاناداوە خێرا خۆی دەگەیەنێتە ئەو بیگار جێگای باشی بۆ تەرخان کردبوو. هەڵبەت کە ئەو پێی خۆش بوو خێزانەکەی خۆی ببینێ بەڵام شوقەکانی ئەوێ زۆرگران بوون تەنانەت ئێستاش وان و حەمامەکانیشیان زۆر ناخۆش و ترسێنەر بوون. و ئەو لە لایەن سیاسەتمەدارێکی پلە سەرتر پێی ڕاگەیەنرابوو کە شۆڕش لەوانەیە هەمووی ئەڵمان بگرێتەوە و ڕووکاتە فەرەنسەش. لە هیچ شوێنێک نە خواردەمەنی و نە سووتەمەنی گیر ناکەوێت. کارەبا نامێنێت، شێرەکان وشکایان دێت. " پێویستە هەر لە ئێستاوە خۆت بۆ هەموو شتێک دانێی و چاوەڕوانی هەر مەترسیەک بکەی."خاتوو بیگار لە کەنەدا مایەوە.١٤٢

بۆلشویزم کەڵک و بایەخی تایبەت بەخۆی هەبوو. کاتێک ڕۆمانیا ڕایگەیاند کە پارێزگای بێسارابیای ڕوسی یان پۆڵەندا چووبوونە ناو خاکی ئۆکراینەوە، بە ئەرکی دەزانی لەبەرانبەر بۆلشویزمدا بوەستێت. نوێنەرانی ئیتالیا هەڕەشەی بەرپاکردنی شۆڕشێکیان کردبوو ئەگەربێت و زۆربەی قەراخ ئاوەکانی داکماتیانیان پێ نەبڕایە. ناوبژیکەران لەوە وەک هەڕەشەیەک بۆ سەر گیانی یەکتر کەڵکیان وەرگرت. ویلسۆن و لیۆد جۆرج وتیان کە ئەگەر ئەوان ئاشتیەکەی زۆر لێ قووڵ کەنەوە لەوانەیە ئەڵمانیا پەنا بۆ بۆلشویک بەرێت. هەلوێستی وڵاتانی ڕۆژئاوا سەبارەت بە ڕژیمی نوێ لە ڕوسیە چەندین لقی لێ ببۆوە. هەڵبەت نەبوونی زانیاری چۆکی بە خەڵکدا نەدەهێنا لەوەیکە خاوەنی بۆچوون و هەڵوێستێکی بەهێز بن. هەرجۆرێک بوایە بۆ ئەوان ئاسان دەکەوت. هەم ڕاسترەو و هەمیش چەپڕەو چاویان بڕیبوە سیاچاڵی ڕۆژهەڵات. ڕۆژنامەنووسی ڕادیکاڵی ئەمەریکی بەناوی لینکۆڵن ستێفێنس، کە بەشێوەیەکی نائاسایی لە ساڵی ١٩١٩ خۆی گەیاندبوە ڕووسیە وتارە بەناوبانگەکەی خۆی بە ناوی " پێشبینی کردنی من لە داهاتوودا بەکەڵک دەبێت " لە ڕۆژنامەدا بڵاو کردەوە. هیچ کام لەو شتانەی کە لە نزیکەوە لە ڕووسیە دیبوونی لە سەر مێشکی کاری نەکرد و نەیگۆڕی. لە لایەن ڕاسترەوەکانەوە هەر بەسەرهاتێکی ناخۆش بەهای پێدەدرا. حکوومەتی بەریتانی لە زمانی چەند شایەتحاڵێکەوە چەند گوزارشی بڵاو کردەوە کە گوایە بۆلشویکەکان مافی سەربەخۆییان بە ژنان داوە و ئەوانیان لە "ئەنجومەنەکانی خۆشەویستی ئازاد"جێکردۆتەوە. کلیساکان گۆڕابوون و ببوون بە فەسادخانە. چەندین تاقمی تایبەت لە مرۆڤکوژانی چینی حەواڵە کرابوون تا تواناکانی کۆنی ڕۆژهەڵاتی خۆیان لە سەر قوربانیانی بۆلشویکی بخەنە گەڕ.١٤٣

چێرچیل، وەزیری جەنگی بەریتانیا لە سەردەمی کۆڕی ئاشتیدا، یەکێک لەو چەند کەسە دەگمەنە بوو کە تێگەیی بوو بۆلشویزمی لنین لە سەر شانۆی سیاسیدا شتێکی تازەیە، کە لە ژێر بەرگی ڕەوانبێژی مارکسیستیدا، پارتێکی تەواو خاوەن دیسیپلین و تەواو ناوەندخوازە کە دەسەڵاتی بە سەر هەمووشتێکدا هەیە. لەپێناو ئامانجی دووردەستی جیهانێکی خەیاڵیدا لە بەکارهێنانی هەرشێوازێک نەدەسڵەمیەوە. چێرچیل لەسەر ئەم بڕوایە بوو کە" بناخەی بۆلشویزم بەپێچەوانەی زۆربەی شێوازەکانی تری بیرۆکەی سیاسی خەیاڵی لە سەر توندوتیژی دارێژراوە". لنین و هاوکارانی خۆیان ئامادە کردبوو تا هەرشتێک کە لەسەر ڕێگای ئەو بیرۆکەیە سەوز دەبێ لەناوی بەرن، جا چ ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای ڕووسی بن یان خودی ڕووسەکان. چێرچیل لەبەرانبەر جەماوەرێکدا لە لەندەن وتبووی کە "لە نێوان هەمووی حکوومەتە ملهوڕەکانی مێژوودا حکوومەتی

ملھوڕی بۆلشویک لە هەموویان خراپتر، کاولکەرتر و گڵاوترە". لیۆد جۆرج کە وتەکانی چێرچیلی لەگوێ ناخۆش بوو: " خوێنی دووکی ئەو بۆ مەبەستی بەکۆمەڵکوشتنی دووکە گەورەکانی ڕووسیە هاتە جۆش." کەسانی تر، و ئەوان کە بریتی بوون لە زۆربەی هاوکارانی خۆی و خەڵکی بەریتانیا وتەکانی چێرچیلیان بە بێ بایەخ و دوور لەڕاستی ناوبرد. سێبەری هەڵمەتی کارەساتباری گالۆپۆلی هێشتا بە سەر سەریدا دەخولایەوە، و زمانی پاراوی ئەو ڕەنگ و بۆی شێتی بە خۆیەوە گرتبوو. ئەو لە وتارێکی هەڵبژاردندا لە نوامری ساڵی ١٩١٨دا وتبووی کە "ئاسەواری شارستانیەت خەریکە لە ناوچە گەورەکان بەتەواوەتی دەسڕدرێتەوە، کەچی بۆلشویکەکان وەکوو پۆلێک عەنتەری شڕودڕ لەناو کاولکاری شاران و لاشەی قوربانیەکانیان هەڵبەزدابەزیانە." دوائەوەیکە ئەندامانی کابینە بە ڕوویدا شاخان بالفۆر لەسەرەخۆ پێی وت "هەرچەند زۆرت پێوە نا بەڵام چون حەقیقەتت وت زۆرم پێ خۆش بوو."١٤٤

لە حاڵێکدا زۆربەی لیبرڵەکانی ڕۆژئاوا لە ساڵی ١٩١٩ خۆیان خوازیاری ئەوەبوون کە بە بۆلشویکەکان قەرز بدەن، گرتنەدەستی دەسەڵاتی شۆڕشگێڕان لە کۆمەڵێکی هەڵبژێردراو بەشێوەی دیموکراتیک، کوشتارێکە کردیان- لە هەمووی دڕندانەتر کوشتنی تزار و بنەماڵەکەی- و وڵامی نەرێنی ئەوان بۆ قەرزەکانی دەرەوەی ڕوسیا ڕای گشتی سەرسام کرد. (فەڕەنسیەکان بەتایبەت لە بابەت مەسەلەی قەرز زۆر ناڕەحەت بوون چونکە ژمارەیەکی زۆر لە چینەکانی مامناوەندی بۆندەکانی حکوومەتی ڕوسیان کڕیبوو.) بەڵام کاتێک لیبراڵە چاکەکان وەبیری خۆیان هێناوە، هەم وڵاتەیەکگرتووەکان و هەمیش فەڕەنسا بەرهەمی شۆڕش بوون. هەر لە سەرەتاوە ویلسۆن وای بۆ دەچوو کە مەبەستی سەرەکی بۆلشویزم خستنە ژێر ڕکێفی قودرەتی بیزنسی گەورە و حکوومەتی گەورە بوو تابەڵکوو بۆ تاکەکەس ئازادی زیاتر دەستەبەربکا. دوکتوری تایبەتی ویلسۆن بەناوی، گرەیسان، هەستی بەوەکردبوو کە ویلسۆن بەشێکی زۆری پرۆگرامی بۆلشویکی بەدڵ بووە: "ئەو ڕایگەیاندبوو کە هەڵمەتی کوشت و کوشتاری ئەوان، داگیرکاری و لەبەرچاونەگرتنی یاسا، مەحکوومن بە نەمان. هەرچەند، هەندێک لە ڕێباز و بیروباوەڕەکانی ئەوان بەتەواوەتی لەڕێگای زەخت و گوشارەکانی کاپیتالیستەکانەوە پەرەیان سەندبوو، کە مافی کرێکارانیان لە هەموو شوێنێک پێشێل کردبوو، و هەمووی هاوکارەکانی خۆی لەوە ئاگادار کردبۆوە کە ئەگەر بێت و بۆلشویکەکان ئەقڵیان بێتەوە سەر خۆ و ڕازی بن بە سیاسەتی یاسا و دەستوور هەر خێرا بە سەرتاسەری ئورووپادا بڵاو دەبنەوە و یەک بەدوای یەک حکوومەتەکانی ئێستا لەبەین دەبەن." لیۆد جۆرج وتبووی کە خاوەنبیرانی پێشکەوتووخوازی وەک بۆخۆی و ویلسۆن وابیریان دەکردەوە کە دەستووری کۆن-

ناکارامەیی، گەندەڵی، ملهوڕی"- شیاوی ئەو شتانە بوو کە بە دەستی هێنابوو: " ئەو دەستوورە کۆنە تاوانی خۆداسەپاندنی بەزۆر و چەوساندنەوەی لە سەر بوو کە هەر ئەم کردەوانەش ببوونە هۆی دروستبوونی دڕندەیی لەلایەن شۆڕشگێڕانەوە." سەبارەت بە پارێزەری لاوی ئازا لە باکووری وێلز کە لەپێناو بەرژەوەندیەکانی ناوچەییدا خەباتی دەکرد شتێک لە مێشکی لیۆد جۆرجدا هەبوو. کۆرزۆن لای بالفۆر گلەیی کردبوو کە " سەرۆک وەزیر بۆخۆی ڕەنگ و بۆی بۆلشویستی لیدی. مرۆڤ واهەست دەکا کە ئەو لە سەر شانۆی جیهانیدا ترۆتسکی وەک تەنیا کەسایەتیەک دەبینی کە بە دڵی خۆیەتی."١٤٥

زۆرلایەن لەسەر ئەو بڕوایە بوون کە بۆلشویکەکان لەکۆتاییدا دادەمرکێن دەبن بە بۆرژوا. ئەگەر بیروباوەڕەکانی بۆلشویکی لە کۆمەڵگاکانی ڕۆژئاوا تەشەنەیان دەکرد بەهۆی ئەوەوە بوو کە خەڵکانی ئەویێ بە تەنگەوە هاتبوون و وەڕەز ببوون. هەم ویلسۆن و هەم لیۆد جۆرج ڕایان وابوو کە بە لەبەینبردنی هۆکارەکانی بۆلشویزم تۆ دەتوانی ئۆکسیژنی ئەو بیروباوەڕە ببڕیەوە. وەرزێرانی بێ زەوی و زار، کرێکارانی بێ کاروبار، ژنان و پیاونی ئاسایی بەبێ هیوا و ئۆمێد، هەر هەمووی ئەمانە تفاق و گزرەی ئەو خەیاڵانە بوون کە بە جیهانیان مزگێنی و بەڵێنی دەدا. ویلسۆن ئەیوت کە ئەو تەنانەت لە وڵاتەکەی خۆشیدا هەست بە گۆڵفێکی مەترسیدار دەکا لەنێوان کار و سەرمایەدا. " تۆو پێویستی بە خاک هەیە، و تۆوی بۆلشویکی ئەو خاکەی کە پێشتر بۆی ئامادەکرابوو دۆزیبۆوە."ئەو لە گەشتێکی دەریاییدا بۆ پاریس پسپۆڕانی ئەمەریکی لەوە دڵنیا کردبۆوە کە ئەوان بە پێکهێنانی دەستوورێکی نوێ دەتوانن بۆلشویکەکان تێکبشکێنن. لیۆد جۆرجیش وەکوو ئەو مەیلی گەشبینی هەبوو، ئەو لە ڕۆژنامەنووسێکی بەریتانی پرسیاری کردبوو کە "ئایا ئێوە پێتان وانیە کە بۆلشویزم خۆی لەخۆیدا کۆتایی پێدێت ئەورووپا زۆر بەهێزە دەتوانێ لەبەرانبەریدا بوەستێت."١٤٦

لیۆد جۆرج وای بە مەسڵەحەت زانیبوو کە ڕوسیا لە ناو کۆڕی ئاشتیدا جێ بکاتەوە. هەروەک لە دانیشتنێکدا لە لەندەن لە دێسامبەری ساڵی ١٩١٨ بە کلیمینجووی ڕاگەیاندبوو کە ئەوان ناتوانن درێژە بە کارەکانیان بدەن ئەگەر وایدابنێن کە ئەو وڵاتە هەر لە گۆڕێدا نەبوە. ئەو وتبووی کە خۆی زۆر بە هاوخەم و هاوسۆزی خەڵکی ڕووسیە دەزانێت. " هێزەکانی ئەوان بەبێ چەک و بەبێ تەقەمەنی خەباتیان کردبوو؛ ئەوان زۆر ناجوامێرانە لە لایەن حکوومەتەکەیانەوە خەیانەتیان پێکرابوو، کێ ئەقڵی بۆوە دەچێ کە خەڵکی ڕووسیە لە ڕووی ڕق و کینەوە بەرەنگاری هاوپەیمانان بووبێتنەوە."ڕووسیە وڵاتێکی گەورە بوو، لە ئورووپاوە تا ئاسیا درێژەی هەبوو، حەشیمەتێکی نزیک بە

٢٠ملوێن کەسی هەبوو. ئەگەر کەسانێک سەبارەت بە خاکی ڕووسیە داخوازیەکیان هەبوایە و ڕێگەی بەشداری کردن لە کۆبوونەوەکانی فەڕەنسەیان بدرایەتێ، لە هەموو کەس شیاوتر ئەوە خەڵکانی خودی ڕووسیە بوون کە مافی خۆیان بوو گۆیان بۆ شل بکرێت. ڕەنگە ئەوە بە مانای بانگێشت کردنی بۆلشویکەکان بێت. لیۆد جۆرج بە شۆڕای عالی ڕاگەیاندبوو کە ئەو خۆشی لە ئەوان نەدەهات بەڵام ئایا دەکرا حاشا لە ناسینیان بکەن و بە ڕەسمی نەیاننناسن؟ " وتنی ئەوە کە ئێمە بۆخۆمان دەبێ نوێنەرانی خەڵکانی مەزن گوڵبژێر بکەین لە گەڵ هەر یاسا و ڕێسایەک کە خەباتمان بۆ کردبوو یەکی نەدەگرتەوە و پێچەوانەی ئەوە دەبوو."حکوومەتی بەریتانیا دوای شۆڕشی فەڕەنسە، کاتێکە پاڵپشتی لە دەرەبەگەکانی ئیمیگرەی کردبوو، تووشی هەر هەمان هەڵە هاتبو. لیۆد جۆرج زۆر سەرسووڕهێنەرانە وتی کە "ئەمە ئەوانی بە شەڕێک دا برد کە نزیک بە بیست و پێنج ساڵی خایاند." ١٤٧

وتەکانی ئەو لە گوێی کلیمینجوو خۆش نەبوون، چون ئەو ڕقی لە بۆلشویکەکان بوو، کە بەشێکی بۆ ئەوە دەگەڕاوە کە ئەو بۆلشویکەکانی بە داردەستی ئەڵمانیەکان دەزانی و بەشێکی تر بۆ ئەوە کە لە شێوازەکانی ئەوان ئەو نەفرەتی هەبوو. کلیمینجوو لای وابوو کە شۆڕش لە جۆری شۆڕشی ١٧٨٩ مەزن و پیرۆزە، بەڵام کاتێکە کەوتە دەست ژاکۆبینەکان، ڕۆسپیێریەکان و لنینەکان کە بۆ دروستکردنی جیهانێکی خەیاڵی و ئایدیال لە گیووتین و تەنافی سێدارە کەڵکیان وەردەگرت، قزێون و ناشیرین بوو. ئەو لەڕێگای توندوتیژی و سەرکوتی خوێناوی کمۆنی ڕادیکاڵی پاریس لە کۆتایی شەڕی فرانکۆ-پڕاشن درێژەی بە ژیان دابوو. هەر لەو ساتە بەم لاوە ئەو لە باڵی چەپی توندڕەو دابڕابوو، لە ساڵی ١٩١٩، وەکوو ڕێبەرانی تری هاوپەیمان، ئەویش پێویست بوو ڕای گشتی بۆ لای خۆی ڕاکێشێ. لە وت و وێژێکی تایبەتیدا ئەو بە باڵفۆری وتبوو کە ئەگەر بۆلشویکەکان بۆ پاریس نوێنەریان بناردایە، ڕادیکاڵە توندڕەوەکان دەکەوتنە خۆ و چینەکانی مامناوەندی لە ترسان دەشلەژان. ئاڵۆزی و پشێوی شەقامەکانی دەگرتەوە، کە لەو حاڵەتەدا حکوومەتەکەی ئەو لە ناچاری پەنای دەبرد بۆ توندوتیژی. ئەوەش بۆ کۆڕی ئاشتی کەش و هەوایەکی باشی نەدەخوڵقاند. کلیمینجوو هەڕەشەی کردبوو کە ئەگەر بێت و هاوپەیمانەکانی زیاتر لەوە پێداگری لە بانگێشت کردنێکی لەو چەشنەیان بکردایە، مەجبوور دەبوو دەست لە کار بکێشێتەوە.١٤٨

ئایا بۆلشویکەکان بە نوێنەرایەتی هەمووی خەڵکی ڕووسیەوە قسەیان دەکرد؟ ئەوان تەنیا کاکڵی زەوی و زارەکانی ڕووسیە، هاوڕێ لە گەڵ شارە گەورەکانی ئیس.تی.پیتیرزبۆرگیان (کە خێرا ناوی گۆڕی و بوو بە لینینگراد) کۆنترۆڵ دەکرد. ئەوان ڕووبەڕووی حکوومەتەکانی ڕکابەر بوونەوە:

حکوومەتگەلێک لە جنسی ڕووسە سپی پێستەکان کە لە باشوور ناسرابوون، یەکیان بە فەرماندەیی ژەنەڕاڵ ئانتۆن دینیکین، یەکێک لە ژەنەڕاڵە باشەکانی تزاری، ئەوی تریان لە سیبیریە بە فەرماندەیی ئەدمیرل ئەلێکساندێر کۆلچاک. لە خودی پاریس، تاراوگەنشینانی ڕووسی، لە بەرژەوەندخوازانەوە بگرە تا دەگاتە ڕادیکاڵەکان، کۆبوونەوەی سیاسی ڕوسیان پێکهێنابوو کە بەناوی هەمووی ڕوسەکانی نا-بۆلشویکی قسەیان دەکرد. سێرگەی سازۆنۆڤ، کە لە ژێر فەرماندەیی تزاردا ببوو بە وەزیری دەرەوە، لە گەڵ بۆریس ساڤینکۆڤ، ترۆریستێکی ناودار، پێوەندی هەبوو و پێکەوە کاریان دەکرد. ساڤینکۆ، بە پرچێکی خاو و نەرمەوە، بە گوڵی گاردۆنیا بە بەرۆکیەوە، هەمیشە تەرپۆش بوو و ورشەی دەهات و لە پاریس لەناو دڵاندا جێی خۆی کردبۆوە. لیۆد جۆرج، کە هەمیشە خۆشی لە لێهاتوویی و کارامەیی دەهات، وتی: " ترۆرەکانی ئەو هەمیشە لەڕووی پلانەوەیە و دەست و بردێکی سەیری لەو کارانەدا بووە و لە هەموو ساتێکدا سەرکەوتوو بووە."١٤٩ بەداخەوە، حکوومەتەکانی دینیکین و کۆلچاک (کە کاتێکی زۆریان تەرخانی ململانێ کردن لە گەڵ یەکتر دەکرد) تەنیا بەزۆری و بەنابەدڵیەوە قەرەی کۆبوونەوەی سیاسی ڕووسیە دەکەوتن و بۆلشویکەکانیش هەر خۆیان لێنەدەدا.

لە ١٦ی ژانویەدا لیۆد جۆرج بەگشتی پرسی ڕووسیەی لە شۆڕای عالیدا پێشکەش کرد و هێنایە بەرباس. بە ڕای ئەو ئەوان سێ ڕێگایان لەبەر بوو: یەکەم، لەبەینبردنی بۆلشویزمی ڕوسی؛ دووەم، بایکۆت کردنیان لە دەستڕاگەیشتن بە جیهانی دەرەوە؛ یان سێیەم، بانگهێشتکردنی ڕوسەکان هاوڕێ لەگەڵ بۆلشویکەکان بۆ کۆبوونەوە لە گەڵ ناوبژیکەران. ئەوان پێشتر بۆ بەئەنجام گەیاندنی دوو ڕێگای یەکەم هەنگاویان نابوو. سەربازانی هاوپەیمانان چووبوونە ناو خاکی ڕوسیە و هاوپەیمانان ڕوسیەیان بایکۆت کردبوو. هیچکام لەم ڕێگایانە کاریگەری نەبوو. بۆیە ئەو بۆخۆی ڕێگای سێیەمی هەڵبژارد. لە ڕاستیدا، ئەوان بە هاندانی بەرەجیاوازەکان بۆ ئەوەی پێکەوە دانیشن و وتوێژ بکەن و بۆ ئاگربەستێکی کاتی هەوڵبدەن، دەیانەویست دەرفەتێکی باش بۆ ڕوسەکان بخوڵقێنن. ئەو بە نهێنی وتبووی کە ئەمە هەر ئەو شتەیە کە ڕۆمانەکان ئەنجامیان دابوو کاتێک خوازیاری ئەوە بوون باربەرەکان ببینن و پێیان وتبوون کە باش هەڵسوکەوت بکەن.١٥٠

ناوبژیکەران نەیاندەتوانی هەروا بە ئاسانی بڕیارەکانی خۆیان ساغ کەنەوە. بۆ هەڵهێنانی هەر هەنگاوێک لەگەڵ دژایەتی ڕووبەڕوو دەبوونەوە. هەنگاونان بۆ لەبەینبردنی بۆلشویکەکان مەترسیدار بوو و گرانیش تەواو دەبوو؛ دوورەپەرێزکردنی ڕوسیە زیانی بە خەڵکی ڕوسیە دەگەیاند. هێنانی نوێنەرانی بۆلشویک بۆ پاریس یان هەر شوێنێکی تر لە ڕۆژئاوا مەترسی ئەوەی لێدەکەوتەوە کە

دەرفەتێکیان گیر کەوێ و پەیام و باوەڕەکانی خۆیان بڵاو کەنەوە، سەبارەت بە تووڕەکردنی کۆنەپارێزان هیچ نەڵێن. ویلسۆن پاڵپشتی لە لیۆد جۆرج کرد. سەرۆک وەزیرانی دەرەوەی فەڕەنسا و ئیتالیا، پیچۆن و سۆنینۆ، متەقیان نەکرد. پیچۆن پێشنیاری کرد کە لانیکەم ئەوان دەبێ بە باڵوێزانی فەڕەنسایی و دانمارکی گوێ شل کەن، کە تازە لە ڕوسیا گەڕابوونەوە. هەرکیان دەمودەست پەیابوون، کە کۆڵێک داستان و چیرۆکی تۆقێنەریان سەبارەت بە ترۆری سوور پێبوو، بەڵام لیۆد جۆرج گوێی نەدایە و وتی هەمووی فڕ و فیشاڵە.١٥١ شۆڕای عالی نەیتوانی هیچ بڕیارێک ساغ کاتەوە.

لە سەرتاسەری کۆڕی ئاشتیدا، سیاسەتی هاوپەیمانان سەبارەت بە ڕوسیا بە لێڵی و بە شاراوەیی مایەوە، ئەوەندە توند نەبوو کە بە یەکجاری بۆلشویکەکان لەبەین بەرێت بەڵام ئەوەندە بۆنی دوژمنایەتی لێدەهات کە حاڵیان بکات کە زلهێزانی ڕۆژئاوا دوژمنانی سەرسەخت و سوێندخواردووی ئەوان بوون. چێرچیل کە لە حکوومەتەکەی خۆی بەردەوام خوازیاری سیاسەتێکی ڕوون و ئاشکرابوو، یەکلانەکردنەوەی بڕیاری هاوپەیمانان مێشکی شڵەژاندبوو." ئایا ئەوان لە گەڵ ڕووسیەی سۆڤیەت کەوتبوونە جەنگەوە؟ بەدڵنیاییەوە نا؛ بەڵام ئەوان لەبەرچاوی هەموان تەقەیان لە ڕووسەکان کرد. ئەوان لە سەر خاکی ڕووسیە وەک داگیرکار وەستابوون. ئەوان دوژمنانی حکوومەتی سۆڤیەتیان چەکدار کرد. ئەوان بەندەرەکانی ئەوێیان گەمارۆ دا، و کەشتیە جەنگیەکانی ئەوێیان نووقمی ئاو کرد. ئەوان بەدڵگەرمیەوە پیلانی ڕووخانی ئەو حکوومەتەیان گێڕا. بەڵام شەڕ و دەستێوەردان لە کاروباری وڵاتانی تر مایەی شەرم و ڕیسوایە."١٥٢

هەڵبەت، چێرچیل باوەڕی بە دەست تێوەردان هەبوو. مارشاڵ فێردیناند فۆچ، سەربازی پلەباڵای فەڕەنسەیی و فەرماندەی عالی هاوپەیمانان، هەروەها بیری دەکردەوە. ئەندام پەرلەمانانی تۆری لە لەندەن و وەبەرهێنەرانی تووڕە و عاجزی فەڕەنسەیی لە سەر هەمان باوەڕ بوون. دژ بە ئەوان گرووپێکی ژاوەژاوکەری دەنگ بەرز ڕیزیان گرتبوو. ئەو یەکیەتیانەی کە لە گەڵ بزووتنەوەی چینی کرێکار هاوکاریان هەبوو، مرۆڤدۆستان لە تاقم و توێژی جۆراوجۆرەوە و ئەو پراگماتیستانەی کە، ڕۆژنامەی ناوداری دەیلی ئیکسپرێسی لەندەنیان لە گەڵ بوو، زۆر بە ئاسانی ئەیانوت "ئێمە لەبۆ خەڵکانی ڕووسیە زۆر بە داخەوەین، پێویستە ئەوان بۆخۆیان لە ناو خۆیاندا شۆڕشێک بەپا کەن.١٥٣

ئەوە لە بۆچوونی ویلسۆن دەچوو. ئەو لە واشنگتۆن درووست بەر لە کۆتایی هاتنی شەڕ بە دیپلۆماتێکی بەریتانی وتبوو " من پێم وایە با هەر لێیان گەڕێین خۆیان بۆ ڕزگاری هەوڵ بدەن.

ئەگەرچی بۆ ماوەیەکی کورت لە ئاژاوەگەری و گێرەشێوێنی دەگەوزێنرێن. من بەم چەشنە ڕووداوەکە دەبینم: کۆمەڵێک خەڵکی نەحەواوە لە سەر هەندێک بابەت لە ناو یەکدا قڕەیانە. تۆ ناتوانی هیچیان لە گەڵ بکەیت. لە ناچاری دەیانکەیە دیوێک و دەرگایان لێ پێوە دەدەی و پییان ڕادەگەیەنی کە هەتا کێشەکانی ناوخۆتان چارەسەر نەکەن دەرگا هەروا داخراوە، بەڵام کاتێکە کێشەکانی ناوخۆتان داکووژاند دەرگاتان لە سەر گازی پشت بۆ دەکرێتەوە." ویلسۆن وای دادەنا کە شێوەی دیوەکە بە هەمان چەشن بمێنێتەوە. ئەو وەکوو بەریتانیەکان کە، هەندێک جار دەکەوتنە بیری تێکشکانی ئیمپراتۆری ڕووسی، قەت لەوە تێنەدەفکری. بە ڕای ئەو خود-موختاری بە مانای بەرێوەبردنی وڵاتی گەورەی ڕووسیە بوو بە دەست خودی ڕووسەکان. ئەو، لە سەر هەمان پرەنسیپ، تەنیا جیاوازیەک کە دەیبینی ناوچەی پۆڵەندای ڕووسیە بوو، کە لەسەر ئەم باوەڕە بوو دەبێ ببێ بە بەشێک لە پۆڵەندای یەکگرتوو. بەڵام سەیر ئەوە بوو کە ئەو بە هەمان شێوە سەیری ناسیۆنالیزمی ئۆکراینی نەدەکرد (ڕەنگە بەهۆی ئەوەوە بێت کە ڕکابەری گەورەی کۆماری ئەو سێناتۆر هینری کابۆت لۆج خوازیاری ئۆکراینێکی سەربەخۆ بوو.) و ئەو بە توندی لەبەرانبەر بەفەرمی ناسینی وڵاتانی بالتیک لەلایەن هاوپەیمانانەوە دەوەستا. بە واتایەکی تر سیاسەتی ئەو سەبارەت بە ڕووسیە بەگشتی سیاسەتێکی نەرێنی و نیگاتیف بوو: دەست تێوەرنەدان و بەڕەسمی نەناسین. شەشومین خاڵ لە چاردە خاڵەکەی ئەو داوای چۆڵکردنی ناوچەیەکی ڕووسی دەکرد کە لەژێر دەسەڵاتی سووپاکانی دەرەوەدا بوو (ئەو مەبەستی سەرەکی لەمە ژاپۆنیەکان بوو) تابەڵکوو خەڵکی ڕووسیە ڕێکخراوەگەلێک دامەزرێنن کە شیاو و گونجاوی خۆیان بێت. کاتێکە ڕووسەکان بڕیاری خۆیان ساخ کردەوە لە سەر ئەوەی کە چ جۆرە حکوومەتێک هەڵدەبژێرن (ئەو هیواداربوو کە بۆلشویکەکان هەڵنەبژێرن)، وڵاتەیەکگرتووەکان ئەو جۆرە حکوومەتە بە فەرمی دەناسێت. ویلسۆن حەزی دەکرد ئاماژە بەوە بکات کە ئەوە هەر ئەو شتەیە کە وڵاتەیەکگرتووەکان لە شەڕی ناوخۆی مەکزیکدا ئەنجامی دابوو.١٥٤

کێشەکە لەوەدا بوو کە هاوپەیمانان پێشتر دەستیان لەو وڵاتە وەردابوو. لە بەهاری ساڵی ١٩١٨دا هێزەکانی بەریتانی چووبوونە ناو بەندەرەکانی ئارچانجێل و مۆرمانسک لە باکوور، و ژاپۆنیەکان ڤلادیڤۆستۆکیان لە ئۆقیانووسی ئارام داگیر کردبوو و بەرەو سیبیریە لە ڕۆژئاوا بەرەوپێش چووبوون تا نەهێڵن ئەڵمانیەکان دەستیان بەسەر کەرەسە خاوەکانی ڕووسی وەکوو دانەوێڵە، نەوت، هەروەها بەندەرەکان، ڕێگاکانی شەمەندەفەڕ و مادە تەقەمەنیەکان ڕا بگات. ئەمەریکیەکان بۆ ئەوەی چاوێکیان لای ژاپۆنیەکان بێت (یان لەوانەبێ بەریتانیەکانیش) و بۆ

ئەوەی لە کۆمەڵێک چەکۆسلەواکی پارێزگاری بکەن کە لە سیبیریە کەوتبوونە چنگ ڕووسەکان و لە کەمپەکانی ئەسیری-جەنگی ڕووسیە دەستبەسەر کرابوون، زۆر بە نابەدڵیەوە هێزەکانیان پیادە کردبوو. (هەر هاوینی ئەو ساڵە ویلسۆن لای هاوس گلەیی کردبوو کە "لە سەر کێشەی ئەوەی کە سەبارەت بە ڕووسیە چی بکرێ باشە و چیمان لە دەست دێت خوێن و ئارەقم تیکەڵ بووە... وەکوو جیوە وایە کە دەستی بۆ دەبەم چەندین لەت و کوتی لێدەبێتەوە".) دواتر بەریتانیەکان کەنەدایەکانیان بەوە قایل کردبوو کە هێزێک دابین بکەن کە هاوسەنگی هێزەکانی ئەمەریکی و ژاپۆنی بێت. هێزێکی تری بەریتانی بۆ خوارێ بۆ باشوور بەرەو کێوەکانی پڕلە نەوتی قەزاقستان وەڕێ کەوت. لە کۆتایی شەڕدا، کاتێکە بەریتانیا بڕیاری هێنا سەر ئەوەی کە نەک تەنیا هێزەکانی خۆی لەوێ بێڵێتەوە بەڵکوو پشتگری لە ڕووسەسپی پێستەکانی دژە-بۆلشویک بکات، بەجوانی دیار بوو کە دەستدرێژیەک کە دژ بە ئەڵمان دەستی پێکردبوو گۆڕابوو و ببوو بە شتێکی تەواو جیاواز.١٥٥

ئەڵمانی تێکشکاو، لە سەر ئامۆژگاریەکانی هاوپەیمانان، دەستی کرد بە کشانەدواوەی هێزەکانی خۆی لە ئۆکراین و وڵاتانی بالتیک. هاوپەیمانان کەوتنە خۆ تا ئەو بۆشایە پڕ کەنەوە. تا کۆتایی ساڵی ١٩١٨، پتر لە ١٨٠،٠٠٠هێزی دەرەوە لە سەر خاکی ڕووسیە بوو و چەندین سووپای سپی پێستی ڕووسی پارەی هاوپەیمانی و چەک و تەقەمەنی هاوپەیمانیان وەردەگرت. بنێشتەخۆشەی سەر زمانی خەڵک هێرشی خاچ پەرستان بۆ سەر بیروباوەڕی بۆلشویزم بوو. درووشمی " دەست لە سەر ڕووسیە هەڵگرن" کەوتبووە سەر زاری هەمووان. لیۆد جۆرج بە کابینەکەی خۆی ڕاگەیاندبوو کە ئەگەر هۆشیان نەبێت لەوانەیە هەوڵدان بۆ سەرکوت کردنی بۆلشویزم بەو ئاسانیە ببێتە هۆی پەرەسەندی. هەر سەربازێکی بەریتانی یان ئەمەریکی لەوەیکە ڕەوانەی ڕووسیە بکرێت نەفرەتی هەبوو. کەنەدایەکان کە بۆ هێرشی سووپایی سێربەکان و بۆ مۆرمانسک هێزیان دابین کردبوو، خوازیاری ئەوە بوون تا وەرزی هاوین پاشەکشێ بکەن. بۆردێن لە شاندی نوێنەرایەتی ئیمپراتۆری بەریتانی بە هاوکارەکانی وتبوو کە لە کەنەدا سەبارەت بەو کێشەیە هەست بە "دڵەڕاوکێیەکی زۆر" دەکرێت.١٥٦

فەڕەنسیەکان، کە بە گەرمە باسی پشتگری کردنیان لە دەست تێوەردان دەکرد، لە ڕاستیدا شتێکی ئەوتۆیان لە دەست نەهات. ئەوان هێزی ئینسانی یان سەرچاوەی سامانەی سرووشتیان لە دەست دا نەبوو. بە پێی پەیمانێکە فەڕەنسە لە گەڵ بەریتانیا بەستی، فەڕەنسە بە شێوەی تئۆریک و بیردۆزانە بەرپرسایەتی باشووری ئۆکراین و کریمی پێ سپێردرا، و بەریتانیاش

قەفقاستان و ناوەندی ئاسیا. (لە پشت پاڵپشتی کردن لە هێزەکانی دژە-بۆلشویکی ناوچەیی ئەمە چ مانایەکی بوو ئێستاش کە ئێستایە بۆ کەس ڕوون نەبۆتەوە.) بەڵام تەنیا تاقمێک لە سەربازانی ڕووسی بەر لەوەی شەڕ کۆتایی بێت گەیشتبوونە ڕووسیە. ژەنەڕاڵی فەڕەنسەیی لە ڕۆژهەڵاتی نزیک، لوویس فرانچێت دی ئیسپێرەی، بە شێوەیەکی زۆر ناخۆش و دڵتەنگ گلە و گازەندەی خۆی دەربڕیبوو "من هێزی تەواوم لە بەدەست دانیە تاکوو لەم وڵاتە نیشتەجێیان بکەم، یان ئەگەر بشبێت پیاوانی ئێمە بە خۆیان ئیزن نادەن هەڤاڵانی خۆیان لە وەرزی تووش و ناخۆشی زستاندا، لە کاتی وچان و پشوودا، وەک یەکەمین ئەزموون حەواڵەی ڕووسیەیان بکەن." هەر گوێشیان نەدایە قسەکانی.

حکوومەتی فەڕەنسەیی هێزێکی هاوبەشی فەرەنسەیی، یوونانی و پۆڵەندی ڕەوانەی بەندەری ئۆدیسا لە دەریای ڕەش کرد. هێرشی سوپایی دەستبەجێ خۆی لە شەڕێکدا بینیبۆوە کە دوژمنەکانیان لە چەند بەرەی جیاواز پێک هاتبوون، بۆلشویکی، ناسیۆنالیستی ئۆکراینی و ئانارشیستی. لە ماوەی زستانی دوور و درێژی ساڵی ۱۹-۱۹۱۸ شەڕکەرەکان لەپڕدا ورەیان لە دەست دا و بۆلشویکەکانیش کاتێکە ئاخێوەرانی فەڕەنسەیان نارد تا خەبەر و باسێک لە هێزەکان بزانن بە ئاسانی زۆر شتی بەنرخیان گیر کەوت. وەک ئەفسەرێکی فەڕەنسەیی لە گوزارشەکەی خۆیدا وتبووی " تاقە سەربازێکی فەڕەنسەیی کە لە ڤێردون و مەیدانەکانی شەڕ لە مارنێ بە سلامەتی ڕزگاری بووە لە مەیدانەکانی شەڕ لە ڕووسیە مل دانانەوێنێت و حازر نیە بیدۆڕێنێ." لە ئاڤریلی ساڵی ۱۹۱۹دا بەرپرسانی فەڕەنسەیی ورەیان لە دەست دابوو و دەیانزانی بەرەو نابوودی دەچن بەپەلە پاشەکشەیان کرد و وازیان لە ئۆدیسی و خەڵکەکەی هێنا و بۆ بۆلشویکەکانیان بەجێ هێشتن. خەڵکانی سیڤیل لە قەراخ چۆمێک بەڕیز وەستابوون و بێ ئەوەی ئەنجامێکی بێت لە فەڕەنسەیەکان دەپاڕانەوە تا لە گەڵ خۆیان بیانبەن. سووپایەکی بچووکتری فەڕەنسەیی بە شێوەیەکی ڕێک و پێکتر بەندەری ریمینی سێباستۆپۆلی بەجێ هێشت و ۴۰،۰۰۰ ڕووسیان لە گەڵ خۆیان برد کە یەکێک لەوانە دایکی تزارێکی کوژراو بوو. دوو هەفتە دواتر ناوگانی فەڕەنسەیی لە دەریای ڕەش هێرشی کرایە سەر.۱۵۷

هەرچەند فەڕەنسە لە دوژمنایەتی کردن لە گەڵ بۆلشویکەکان و شێوازەکانیان هات و هاوار و قیژ و قاوی زۆری کرد، زیاتر لەوە لە دەستدرێژی و دەست تێوەردانی هاوپەیمانی هیچ ڕۆڵێکی تری نەگێڕا. فۆچ لە یەکبەدوای یەکی ئەو پلانانە کە لەگەڵ سوویا جۆراوجۆرەکانی وڵاتانی فنلاند، پۆڵەندا، چکۆسلەواکی، ڕۆمانی ، یوونان و تەنانەت زیندانیانی شەڕی ڕووسیە کە هێشتا لە ئەڵمان

بوون، ڕشتبووی جار لە گەڵ جار لە گەڵ شکست ڕووبەڕوو دەبۆوە و هیچ کامێکیان بە ئەنجام نەگەیشتن، بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە ئەرکێکە بەو وڵاتانە سپێردرابوو لە گەڵ چاوەڕوانیەکانی ئەو یەکیان نەدەگرتەوە، بەشێکی تر بە هۆی ئەوەوە بوو کە لە گەڵ دژایەتی توندی بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان ڕووبەڕوو ببۆوە.١٥٨

سیاسەتی فەڕەنسەیی کە ئاکامێکی هەڵەی لێ کەوتەوە دووهەمین ڕێگایەک بوو لەو ڕێگایانەی کە لیۆد جۆرج پلانی بۆ دانابوون: دوورەپەرێزکردنی بۆلشویزم لە چوارچێوەی ڕووسیەدا. لە کۆڕی ئاشتی و سالآنی دواتردا، فەڕەنسە هەموو هەوڵێکی خۆی خستە کار بۆ ئەوەی وڵاتانێک بە دەوری ڕووسیەوە دامەزرێنێت وەکوو پۆڵەندا بۆ ئەوەی، بە قەولی دەستەواژەیەکی سەردەمانی ناوین دەڵێ، داوێن بەستێکی تەندرووستی ئامێز لە دەوری هەڵگرانی نەخۆشی تاعوون بهاڵێنن. ئەمە زیاتر لە قازانجی فەڕەنسەیەکان بوو چون دەبووە هۆی پێکهێنانی چەند وڵاتی هاوسەنگی ئەڵمان کە بە لەونێک ڕێگرێکیان درووست دەکرد لە بەرانبەر ئەگەری ڕوودانی هێزێکی هاوبەشی ڕووسی-ئەڵمانی. فۆچ و چێرچیل لەو چەند کەسە دەگمەنە بوون لە پاریس کە ئەگەری ڕوودانێکی لەو چەشنەیان بە هەند دەگرت. چێرچیل سەبارەت بە یەکگرتوویەکی داهاتووی بۆلشویکی ڕووسی لە گەڵ ئەڵمان و ژاپۆنی ناسیۆنالیستی هۆشداری دەدا." لە کۆتاییدا ئێمە دەتوانین بیر لە هاوپەیمانیەکی تالانکەر بکەینەوە کە لە ڕاینەوە تا یۆکۆهاما درێژەی دەبێ و هەڕەشە دەکاتە سەر بەرژەوەندیە گرنگەکانی ئیمپراتۆری بەریتانیا لە هیندستان و هەر شوێنێکی تر، کە لە ڕاستیدا هەڕەشە دەبێ بۆ سەر داهاتووی جیهان." ١٥٩

لە کۆتایی ساڵی ١٩١٩دا، کلیمینجووی وەڕەز و ماندوو بە لیۆد جۆرجی وتبوو کە "ئێمە دەبێ چاوێکمان هەر لە ئەوان بێت. وەکوو جاران دەبێ بە سیمی خاردار گەمارۆیان بدەین و هیچ پارەیەکی لەسەر دانەنێین." لە ساڵی ١٩١٩ پارە هەمیشە کێشە بوو. لیۆد جۆرج هەوڵی دا بە گێڕانەوەی وت و وێژێک کە لەگەڵ وەزیری دارایی، ئۆستێن چامبیرلین، هەیبوو لە پەرۆشی چێرچیل بۆ دەست تێوەردان و دەست درێژی کەم کاتەوە. " ئێمە توانایی هەڵگرتنی ئەو بارەمان نیە. چامبیرلین دەڵێ ئێمە لە سەر بنەمایەکی ئاشتی ناتوانین پارەی ئەو خەرجانەی کە دەبێ بیکەین دەرهێنین، ئەویش بەو بڕە کەمە باجەی کە ئێستا دەستمان دەگریت." بەریتانیەکان نزیک بە بڕی ١٠٠£ملوێن لەپێناو سەرکەشی کردن بۆ ڕووسیەیان دانا؛ فەڕەنسەیەکان نزیک بە نیوەی ئەو بڕەیان دانا. کاتێکە پرسی دەستدرێژی میلیتاری لە فەوریەی ساڵی ١٩١٩ هاتە ئاراوە لیۆد جۆرج ئەم پرسیارەی ئاراستە کرد" فەڕەنسە بڕی چەند پارە بۆ ئەو مەبەستە دادەنی؟ من دڵنیام لەوە کە ئەو پارەی کە پێویستە نیەتی؛

من دڵنیام کە ئێمەش نیمانە. ئایا ئەمەریکا ئەو خەرجە وەئەستۆ دەگریت؟ پێش ئەوەی پیلانەکە بە کردەوە دەربێنن ئەو زەمانەتەیان لێ وەرگرن."١٦٠

بەشێکی زۆر لەو یارمەتیانەی کە بە ڕووسە سپی پێستەکان دەدرا بەهۆی ناکارەمەیی و گەندەڵی بە فیڕۆ دەچوون. وردە مەقاماتی ڕەسمی یوونیفۆڕمێکیان دەکردە بەریان کە بۆ سەربازان درووست کرابوون. ژنان و کچانیان دامەنی پەرستارەکانی بەریتانیان کردبوە بەریان. کاتێکە لۆریەکان و تانکەکان لە سەرمان وەستابوون، لە کابارەکان مادەی دژە-سەهۆڵ دەفرۆشرا. هەرچەند بۆلشویکەکان دوای توانیان وێنەیەکی پرۆپاگەندە لە کاپیتالیزمی جیهانی بکێشنەوە کە دژ بە شۆڕشەکەی ئەوان نمایش کرابوو، لە ڕاستیدا یارمەتی هاوپەیمانی بۆ بەرگری کردن لە شکستی سپی پێستەکان کارێکی ئەوتۆیان لە دەست نەهات.١٦١

دەستدرێژی هاوپەیمانی بۆ سەر خاکی ڕووسیە هەمیشە بە ئامانجی جیاجیا و گومانی دوولایەنەوە تێکەڵ کرابوو. ئەمەریکیەکان بەشێوەی فەرمی دژ بە دەست تێوەردان بوون، کەچی بۆ بەربەستکردنی پلان و بەرنامەی ژاپۆنیەکان دوا کۆتاییهاتنی شەڕ هێزەکانیان لە سیبیریە ڕاگرتبوو. لەلایەکەوە فەڕەنسەیەکان بەرلەساڵی ١٩١٤ پشتیان بەستبوو بە ڕوسیایەکی بەهێز بۆ ئەوەی ئەڵمانیان بۆ کۆکاتەوە، لەلایەکی ترەوە بەریتانیەکان ڕوسیەیان بە مەترسی دەزانی بۆ سەر خاکی هێندستان. لە ساڵی ١٩١٩دا فەڕەنسا یەکەمایەتی دابوو بە بووژاندنەوەی ڕوسیای سپی، بەڵام بەریتانیا دەیتوانی بە ڕوسیایەکی سووری لاواز هەڵی کردایە. کۆرزۆن کە لە هەرشتێک کە بۆلشویکەکان پارێزگاریان لێدەکرد ڕقی هەڵگرتبوو، خۆشحاڵ بوو لەوەی کە ڕوسەکان کۆنترۆڵی قەزاقستانیان لە دەست دابووو؛ ئەو بە چیرچیلی وتبوو کە پێویستە بەریتانیەکان هۆشی ئەوەیان هەبێت کە دێنیکین، ڕێبەری ڕوسیای سپی بۆ جارێکی تر دەستی بەو ناوچەیە ڕانەگات. بەریتانیەکان لە ڕەفتار و کرداری فەڕەنسەیەکان کەوتبوونە گومانەوە. لیۆد جۆرج شکایەتی کردبوو کە حکوومەتی فەڕەنسەیی بەبێ هۆ لەلایەن چینە مامناوەندەکانی خۆیەوە، کە پاشەکەوتەکانیان لە ڕووسیە بەجێ هێشتبوو، کەوتە لەرزین. ئەو وتبووی " هیچ شتێک لەوە چاتر نیە بۆ ئەوان کە ببینن ئێمە کەستەنەکانیان لە ئاور ڕزگار دەکەین."١٦٢

*　　*　　*　　*

درووستە کە هاوپەیمانان بۆ ماوەیەکی کورت ئارەزووی دەستدرێژیان بە سەر خاکی ڕووسیە دەکرد، ئەوان ڕێگایەکی تریشیان پشکنی بوو کە پەسەندکراوی لیۆد جۆرج بوو.: ئەویش

دانوستان و وت و ویژکردن بوو. له ۲۱ی ژانویەی ساڵی ۱۹۱۹دا ویلسۆن و لیۆد جۆرج ڕێکەوتنامەیەکیان پێشکەش بە شۆڕای عالی کرد. ڕووسەکان هان بدرێن بۆ دانیشتنێک لە شوێنێکی هاوبەش سەبارەت بە مەرجەکانی ئاشتی لە گەڵ هاوپەیمانان وت و ویژ بکەن. چون فەڕەنسەیەکان خوازیاری ئەوە نەبوون کە بۆلشویکەکان بێن بۆ پاریس، بۆچی ئەمان ئەوان نەبینن، هاوڕێ لەگەڵ نوێنەرانی تری ڕووسی، لە شوێنێک نزیک بە ڕووسیە؟ ویلسۆن لە درێژەی قسەکانیدا وتی کە مادامێکە ئەوان نایانەوێت لە گەڵ بۆلشویکەکان قسە بکەن، خەڵکی ڕوسیا باوەڕ بە پرۆپاگەندەی بۆلشویکی پەیدا دەکەن کە هاوپەیمانان دوژمنانی ئەوان بوون. کلیمینجوو، بە پاڵپشتی سۆنینۆوە، دژی ئەمە وەستا چون ئەو لە سەر ئەم باوەڕە بوو کە هەر خودی هەنگاونان بۆ قسەکردن لە گەڵ بۆلشویکەکان جێ متمانەبوونیان پێدەبەخشێت. ئەو حازر نەبوو لە سەر شتێکی وا لە هاوپەیمانەکانی دابڕێت، و بۆیە، بەنابەدڵیەوە، حازربو لەگەڵیان درێژە بە کارەکانیان بدەن. تەنیا سۆنینۆ بوو کە ملی نەدا. ئەو لەسەر ئەوە پێداگری دەکرد کە ئەوان پێویستە هەمووی ڕووسە سپیەکان لە دەوری یەک کۆکەنەوە و سەربازێکی زۆر یان لانی کەم چەک و تەقەمەنی باشیان بدەنێ تابەڵکوو بتوانن بۆلشویکەکانی پێ لەبەین بەرن. لیۆد جۆرج پرسیارێکی کردەوەیی لە مێشکدا بوو. ئەوان هەریەکەو توانایی ئامادەکردنی چەند سەربازیان هەیە؟ متەق لە کەسەوە نەهات. دواتر وڵام درایەوە، هیچ. ڕێکەوتن لە سەر ئەوەی لەپێناو وت و ویژەکاندا هەوڵ بدەن. هەرخێرا ویلسۆن داوای چاپگەرێکی کرد. دواتر ڕۆژنامەنووسێکی بەریتانی گێڕابوویەوە کە " ئێمە هەر هەموومان دیمەنی نیشانەنووسێکی ژیکەڵەی ئەمەریکی هاتە بەرچاومان."بەڵام نامەبەرێک بە دەزگایەکی کۆن و تێکشکاوەوە سەری هەڵدا، و سەرۆک کۆمار لە گۆشەیەکدا دانیشت و دەستی کرد بە ئامادەکردنی بانگێشت نامەیەک. کاتێک کلیمینجوو لە دیوەکە چووە دەرەوە لە ڕۆژنامەنووسێکی فەڕەنسەیی کە لەوێ چاوەڕوان بوو ددانی چیڕ کردەوە و وتی " بەزێندم نەکرد ئەرەووەڵلا".١٦٣

ڕەشنووسەکەی ویلسۆن، کە باسی لە نیەتی خێر و خۆنەویستانەی هاوپەیمانان بۆ یارمەتی دانی خەڵکی ڕووسیە دەکرد، دەستبەجێ بۆ نوێنەرانی تاقم و کۆمەڵە سەرەکیەکانی ڕووسی حەواڵەکرا، و داوای لێکردن کە لە سەر دوورگەکانی پرینسیس- پرینکیپۆ- لە دەریای مەڕمەڕە نێوان دەریای ڕەش و مەدیتەرانە کۆ ببنەوە. دوورگەکان بۆ دانیشتوانی ناوچەی قۆستەنتەنیە سەیرانگایەکی خۆش و دڵڕفێن بوو. ئەوەش بڵێین کە کاتی خۆی بەر لە دەستپێکردنی شەڕ بەرپرسانی حکوومەتی تورکیە لەو دوورگانە وەک شوێنێک بۆ ڕاگرتنی هەزاران سەگە

بەڕۆڵای ناوشار کەڵکیان لێ وەردەگرت؛ بۆ ماوەی چەندها هەفتە دەنگی سەگوەڕ تا ئەوپەڕی ئاوەکان دەڕۆیی و دەنگی دەدایەوە.

لە ڕێگای ڕادیۆی شەپۆلکورتەوە بانگێشتێک حەواڵەی بۆلشویکەکان کرا، و پاریس چاوەڕوانی وڵام بوو. سەردەرهێنان لە وڵامەکە هەروا ئاسان نەبوو. هەڵبەت پێشتر بۆلشویکەکان بەردەبناخەی ساردی و ناتەبایی و دوژمنایەتیان بە پتەوی داڕشتبوو. لنین لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە شۆڕشی ڕووسیە لەپێشدا ئاور لە ئورووپا بەردەدا و دواتریش لە سەرتاسەری جیهان. سنوورەکان، ئاڵاکان، بیروباوەڕی ناسیۆنالیستی، ئامرازەکانی کاپیتالیزمی مەحکووم بە نەمان لەپێناو هەڵاواردنی کرێکارانی جیهان لە یەکتر، گسک دەدرێن و دەخرێنە زبڵدانی مێژووەوە. یەکەمین کۆمیسەرەکەی بۆ کاروباری دەرەوە، تئۆریستی گەورەی شۆڕشگێڕ، لیۆن ترۆتسکی هەڵوێستەکەی ئەوی زۆر سادە هاتە بەرچاو و وتی:" چەند ڕاگەیاندنێکی شۆڕشگێڕی بە سەر خەڵکانی جیهاندا بڵاو دەکەمەوە و ئیتر بارگ و بنەم تێک دەنێم." (هاوشان لە گەڵ بانگەشەی ویلسۆن بۆ دیموکراسیەکی کراوە بەشێوەیەکی نائاگاهانە، ئەو[ترۆتسکی] لە کۆڵینەوە و توێژینەوە لە سەر پەروەندەکان و بڵاوکراوەکانی تزاری کۆن، ڕێکەوتنامە نهێنیەکانی سەردەمی جەنگ بۆ مەبەستی دابەشکردن بۆ وێنە ڕۆژهەڵاتی ناوین، زۆر کەیفی ساز بوو و هەر ئەمە دڵەڕاوکێ و نیگەرانیەکی زۆری لە دڵی هاوپەیمانانەندا درووست کردبوو.) تەنیا پرسیارێکە لە مێشکی ترۆتسکی و لنیندا درووست ببوو یەکێک لە پلانە جەنگیەکان بوو. ئەگەر بڕیار وابوو شۆڕشی جیهانی بەخێرایی ڕووی بدایە، ئیتر پێویست بەوە نەبوو لە گەڵ دوژمنان دانووستانیان هەبوایە. ئەگەر ئەم شۆڕشە جیهانیە درەنگ بکەوتایە بەپێی پێویست وڵاتێکی کاپیتالیستیان لە گەڵ یەکی تر دەخستە ململانێ و یەکیان بۆ دانووستان هەڵدەبژارد. لە ساڵی ١٩١٧دا، بۆلشویکەکان وایان دانابوو کە یەکەمینیان درووست بێت؛ لە ساڵی ١٩١٩دا، هەرچەند لنین داوای کۆبوونەوەیەکی لە ناوەندەکانی شۆڕشی جیهانی، کمونیست ئینتیرناسیۆنال، کرد، خەریک بوو بەرەبەرە گومانیان تێدا درووست دەبوو.١٦٤

سیاسەتی دەرەوەی سۆڤیەت، کە ڕەنگدانەوەی ئەم دوودڵی و ڕاڕایە بوو، لەپێناو زیاتر کردن و قوولتر کردنی گومانەکانی هاوپەیمانان زۆر هەوڵی دا. لە ئۆکتۆبری ساڵی ١٩١٨دا جۆرجی چیچێرین، توێژینەرێکی سەروپرچ شێواو و خولیایی کە تازە جێگای ترۆتسکی وەک کۆمیسێر بۆ کار و باری دەرەوە گرتبۆوە، بە تەوسەوە پەیامێکی بۆ ویلسۆن نارد، کە تێیدا گاڵتەی بە پرەنسیپ و یاسا و ڕێسا بەنرخەکانی ئەوی کردبوو. چاردە خاڵەکە داوای ئەوەی کردبوو کە ڕووسیە تەنیا بمێنێتەوە بۆ ئەوەی کە خۆی سەبارەت بە چارەنووسی خۆی بڕیار بدات؛ سەیرە شتی وا چۆن دەبێ،

ویلسۆن هێزی ڕەوانەی سیبیریا کردبوو. ئەمەرەکیەکان باسیان لە خود-موختاری کردبوو،؛ زۆر سەیرە کە ئەو بە ئیرلەند یان فیلیپین ئاماژەیەکی نەکردبوو. ئەو بەڵێنی دابوو کۆمەڵەی گەلان بە هەمووی شەڕەکان کۆتایی بێنێت؛ بڵێی ئەمە شۆخی کردن نەبێ؟ هەمووان دەیانزانی کە وڵاتانی کاپیتالیستی لە هەڵگیرساندنی شەڕەکاندا بەرپرس بوون. هەر لەو کاتەدا، وڵاتەیەکگرتوەکان و هاودەستەکانی لە جەنایەتدا، بەریتانیا و فەڕەنسە، بۆ ڕشتنی خوێنی زیاتری خەڵکانی ڕووسیە و بۆ بە زۆر ستاندنی پارەی زیاتر لە ڕووسیە خەریکی پیلانگێڕی بوون. تەنیا کۆمەڵەی ڕاستەقینە کۆمەلانی خەڵک بوون.١٦٥

کەچی بەسەر ئەوەشدا بۆلشویکەکان پەیامی ئاشتیانەیان دەنارد. ماکزیم لیتڤینۆڤ، بریکاری چێچێرین، پیاوێکی هێواش و لە سەرەخۆ بوو. ئەو بۆ ماوەی چەندین ساڵ لە لەندەن ژیابوو، وەک کارمەندێک ژیانی خۆی هەڵدەسووڕاند و لە گەڵ چیرۆکنووسێک بە ناوی ئیڤی لاو کە خەڵکی قەراخ ئاوەکانی بلووزمبێری بوو ژیانی هاوسەری درووست کرد. لە شەوی کریسمەسی ساڵی ١٩١٨، لە ستۆکهۆڵمەوە تێلێگرامێکی بۆ ویلسۆ نارد. باسی ئاشتی، دادوەری و مرۆڤایەتی لە جیهاندا دەکرد. لیتڤینۆڤ لە درێژەی باسەکەیدا وتبووی کە خەڵکی ڕووسیە خۆیان لە یاسا مەزنەکانی ویلسۆندا بە شەریک دەزانن. ئەوان یەکەمین کەسانێک بوون کە بۆ خود-موختاری و دیموکراسی کراوە هاواریان لێ بەرزەوە بۆوە. تەنیا شتێکە ئێستا ئەوان خوازیاری بوون ئاشتی بوو بۆ دروستکردنی کۆمەڵگایەکی باشتر. ئەوان بۆ دانووستان و وتووێژکردن بە تاسەوە بوون، بەڵام دەستدرێژی هاوپەیمانی و بایکۆتکردنی هاوپەیمانی پشێوی و ئاڵۆزی لێدەکەوتەوە. بۆلشویکەکان بۆ ئەوەی وڵات لە ئاڵۆزی ڕزگار بکەن پەنایان بە ترۆر هێنا. ئایا ویلسۆن حازر نابێت کە یارمەتیان بات؟

ئەم وتانە زۆر لە سەر ویلسۆن کاریگەری دانا. کاتێکە تێلێگرامەکەی پێگەیشت لیۆد جۆرجیشی لێبوو. دیپلۆماتێکی ئەمەریکی، بەناوی ویلیام باکلێر، بە مەبەستی وت و وێژ کردن لە گەڵ لیتینۆڤ ڕەوانە کرا. گوزارشەکەی باکلەر کە لە ٢١ی ژانویەدا ویلسۆن بە شوڕای عالی پێشکەش کردبوو، دڵخۆشکەر بوو. حکوومەتی سۆڤیەت، کە لەوە بەولاوە ئیتر بەوە ناوی خۆی دەبرد، ئامادە بوو تا لەپێناوی ئاشتیدا ئەوەی لە دەستی دێت بیکات، جا ئەوە چ بە مانای لانی کەم گەڕانەوەی ئەو قەرزانە بوایە کە ڕەتی دەکردنەوە یان پێشکەش کردنی مافی تایبەت بە شرکەتەکانی دەرەوە. چیتر بۆ شۆڕشی وڵاتداگری جیهانی بانگەواز ناکات؛ ئەو[سۆڤیەت] مەبەستی لە بەکارهێنانی پڕۆپاگەندەی لەو چەشنە تەنیا ئەوەبوو کە وەک ڕێگایەک بۆ پارێزگاری کردن لە خۆی دژ بە ئەڵمان و لەم دوایانەشدا هاوپەیمانان کەڵکیان لێوەرگریت.١٦٦

بەبێ هۆ نەبوو کە ویلسۆن و لیۆد جۆرج چاوەڕوانی ئەوەیان لە بۆلشویکەکان دەکرد کە بەدەم بانگێشت کردنەکەیانەوە بۆ پرینکیپۆ بێن. هەردوو سیاسەتمەدار نوێنەرانی خۆیان هەڵبژارد: ڕۆژنامەنووسێکی لیبراڵ و قەشەیەکی دەرکراو بۆ وڵاتەیەکگرتوەکان، و بۆ بەریتانیا بۆردێنێکی بەکەیف- "شانازیەکی گەورە بۆ کەنەدا" (ئەو ئاگاداری ئەوە نەبوو کە لیۆد جۆرج لە پەیاکردنی کەسێک بۆ ئەوەی بچێت بۆ ئەوێ کێشەی هەبوو.) ئەوان هەر هەموویان چاوەڕوان بوون. وڵامی حکوومەتی سۆڤیەت لە ٤ی فەوریەدا گەیشتە بەرەوە. ئەمە دوایەمین جار نەبوو کە بۆلشویکەکان سەبارەت بە ڕۆژئاوا بڕیاری هەڵەیان دەدا. ئەوان لەڕووی فێڵبازیەوە، بەڵام بە ئاشکرایی، ملیان بە ئاگربەست نەدەدا، یەکێک لەو پێشمەرجانەی کە لەلایەن شوڕای عالیەوە دانرابوو. ئەوان خۆیان نەدەرەنجاند تا بەپێی یاسا مەزنەکانی ناو بانگێشتنامەکە ڕای خۆیان دەربڕن. جوان دەیانزانی کە کاپیتالیستەکان تەنیا لە یەک شت تێدەگەن، بۆیە پێشنیاری زێدەمافی تایبەتی کەرەسەیان پێکردن، وەکوو کەرەسەی خاو یان ناوچەی ژێر دەسەڵاتی خۆیان. بەگشتی، ئەمە لە سەر ئەڵمانیەکان لە برێست-لیتۆسک کاری کردبوو. ویلسۆن پەشۆکابوو. " نەک تەنیا ئەم وڵامە چاوەڕوان کراو نیە، بەڵکوو لەوانەیە بەشێوەیەک بێ حورمەتیش بێت." لیۆد جۆرج هەقی دایە. " ئێمە کەی بەدوای پارەی ئەوان، زێدەمافی ئەوان یان ناوچەی ژێر دەسەڵاتی ئەوانەوەین."١٦٧

لە هەمان کاتدا کەسانی تری بانگێشت کراو بە پاڵپشتی تەواوە لە لایەن فەرەنسەیەکان یان دۆستانی تر وەکوو چێرچیل، خەریک بوون ژێر پاشنەی ئەوانیان خالی دەکرد. هەواڵی پێشنیاری پرینکیپۆ ڕووسە سپی پێستەکانی پەشۆکاندبوو. لە پاریس کۆمەڵی تاراوگەنشین خۆپیشاندانێکی گەورەیان ساز کرد؛ زۆر لەوڵاترەوە لە ئارچانگێل، خێرا وێنەکانی ویلسۆنیان هێنایە خوارەوە. سازۆنۆف، وەزیری دەرەوەی پێشوو، لە دیپلۆماتێکی بەریتانی پرسی بوو کە چۆن هاوپەیمانان چاوەڕوانی ئەوە لەو دەکەن کە چاوی بە کەسانێک بکەوێ کە بنەماڵەکەی ئەویان کوشتوە.١٦٨

ئەگەر ئەمەریکیەکان و بەریتانیەکان گوشاریان بخستایەتە سەریان، پێدەچوو ڕووسە سپی پێستەکان ڕێکەوتنایە، بەڵام نە ویلسۆن نە لیۆد جۆرج ئامادە نەبوون ئەو کارە بکەن. خەریک بوو پرینکیپۆ دەبوو بە کێشەیەکی سیاسی بۆ هەردوو پیاوەکە. بەرپرسانی ڕاگەیاندن و هەندێک لە هاوکارەکانیان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دەنگی ڕەخنەیان بەرز دەبۆوە. لیۆد جۆرج کە بۆ پشتگری کردنی حکوومەتی یەکگرتووی خۆی پێوێستی بە باڵی کۆنەپارێز هەبوو پێشتر لەلایەن بۆنار لۆ، ڕێبەری کۆنەپارێز و جێگرەکەی، هەڕەشەی کرابوە سەر کە حکوومەت لەوانەیە لە سەر ئەو کێشەیە تووشی هەڵوەشانەوە بێت. لە ٨ی فەوریەدا، کلیمینجوو، بە شێوەزمانێکی کەموێنە، بە پۆینکاریی ڕاگەیاندبوو کە کۆبوونەوەی پرینکیپۆ

نوێنی ئاڵۆزی هاتبوو. ویلسۆن هیچ نیشانەیەکی لە خۆی برووز نەدا کە ئەوە بگەیەنێ ئەو خوازیاری ئەوەیە وڵامی پەسەندکردنی کەم تا کورتی بۆلشویکەکان بداتەوە. تەنیا بۆ دڵنیابوون، کلیمینجوو لە بالفۆڕ پاڕابۆوە کە تا سەرۆک کۆمار بۆ سەدانێکی کورت بۆ وڵاتەیەکگرتووەکان وڵات بەجێ دێڵێ دانیشتنەکە یەک بخەنەوە. تا ئەو دەمەی ڕووسە سپی پێستەکان لە ١٦ی فەوریەدا وڵامی ڕەتیان ناردەوە، ویلسۆن لە گەشتی دەریاییدا بوو، لیۆد جۆرج گەڕابۆوە بۆ لەندەن سەرقاڵی مانگرتنێکی گشتی مەترسیدار بوو و پرینکیپۆ تازە مردبوو.١٦٩

ئەوە پرسی گشتی ڕووسیەی وەکوو سەردەمی پێشوو بەبێ چارەسەری هێشتەوە. لە لەندەن، چێرچیل داوای لە لیۆد جۆرج دەکرد کە بڕیارێکی ڕوون و ئاشکرا ساخ کاتەوە، یان ئەوە کە بە زەخت و زۆر دەستدرێژی بکاتە سەر ڕووسیە یان ئەوە کە بۆ هەتاهەتایە پاشەکشێ بکات. لیۆد جۆرج ئامادە نەبوو هیچ کامێکیان بە ئەنجام بگەیەنێت: دەستدرێژی بەربڵاو لەلایەن باڵی چەپەوە کێشەی بۆ درووست دەکرد؛ پاشەکشێ کردن لەلایەن باڵی ڕاستەوە کێشەی بۆ درووست دەکرد. و بۆیە، هەروەک پێشتر لە بۆنەکانی تردا لە کۆڕی ئاشتی کردبووی، ئەو ناڕاستەوخۆ تیوەچوو، لەپێشدا ڕێگایەکی تاقی دەکردەوە و دواتر ڕێگایەکی تر بەبێ ئەوەی خۆی تێوەگلێنێت.

ئەو بە چێرچیلی وتبوو کە هەر بڕیارێک لە سەر ڕووسیە پێویست بوو بە بەشداری کردنی ویلسۆن لە پاریس بدرایە. چێرچیل لە بەیانی ١٤ی فەوریەدا بەپەلە بەرەو کاناڵ ڕۆیی، ئەو ڕۆژەی کە بڕیار بوو سەرۆک کۆمار بەرەو وڵاتەیەکگرتووەکان بڕوات. (لە ژیاننامەکەی خۆیدا، لیۆد جۆرج لەوەی کە چێرچیل سەرەڕۆیانە و "بەپەلە" خۆی دزیبۆوە وگەیشتبوە پاریس ترس و نیگەرانی خۆی دەربڕیبوو.) دوای لێخوڕینێکی بەپەلە بەرەو پاریس- و پێکدادانێک کە شیشەی پێشەوەی ماشێنەکەی یەکسەر هاتەخوارێ- چێرچیل بەپەلە خۆی گەیاندە شۆڕای عالی هەروەک چۆن ویلسۆن بە پێیان دەچوو. کاتێکە چێرچیل ئاماژەی بەوەکرد کە هەبوونی گومان لەبابەت خواست و ویستی هاوپەیمانان بۆ هێزەکان لە ڕوسیە و بۆ ڕووسی سپی-پێستەکان شتێکی خراپە و باش نیە، سەرۆک کۆمار بەڕوویەکی خۆشەوە گوێی بۆ شل کردبوو. ئەو بۆچوونی خۆی ئەمە بوو کە پاشەکشێ کردن کارەساتی لێدەکەوێتەوە. گرتنەبەری سیاسەتێکی لەو چەشنە بە مانای دەرکێشانی بزماری ڕاگرە لە گشت دەزگاکە. لەبەرانبەر بۆلشویکەکانی ڕووسیە چیتر هیچ جۆرە بەرخودانێکی چەکداری نامێنێت، و ئاسۆیەکی دوور و درێژ لە توند و تیژی و پشێوی سەراسەری ڕووسیە دەگرێتەوە." ویلسۆن، کە پێدەچێ لیۆد جۆرج زانیبێتی، دژی پاشەکشێ کردن بوو. ئەو دانی بەوەدا هێنا کە هێزەکانی هاوپەیمان لە ڕووسیە کارێکی باشیان لە دەست نەدەهات، بەڵام دۆخەکە ئاڵۆز و ناخۆش بوو.١٧٠

چێرچیل بۆ ماوەی دوو ڕۆژ کە لە پاریس مایەوە، هەوڵی دا شۆڕای عالی دنە بدات کە لانی کەم سیاسەتێکی ڕوون و ئاشکرایان هەبێت؛ بەڵام ئەمە بە نەبوونی ویلسۆن و لیۆد جۆرج کارێکی دژوار و سەخت بوو. لیۆد جۆرج کە لەلایەن کێری ئەمەکناس و بەوەفا گوزارشی ڕۆژانەی پێدەگەیشت، لە دووردەستەوە ڕێنوێنی دەکرد. ئەو بەخۆشحاڵیەوە بە هاوڕێیەکی وتبوو کە "وینستۆن لە پاریسە. ئەو دەیەوێت دژ بە بۆلشویکەکان شەڕێک بنێتەوە. ئەوە دەبێتە هۆی هەڵگیرسانی شۆڕشێک! خەڵکی ئێمە ڕێگە بە شتی وا نادەن."[١٧١] ئەو چەندین پەیامی تیکەڵپێکەڵی بۆ چێرچیل نارد کە ئاماژەی بە وە دەکرد بەریتانیا لەوانەیە بتوانێ چەک و تەقەمەنی و فیداکەر بۆ ڕووسە سپی پێستەکان دابین بکات بەڵام لە تیلێگرافێکی تردا دژ بە دانانی خەباتێکی میلیتاری دژ بە بۆلشویکەکان ئاگاداری کردبۆوە. لیۆد جۆرج بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە دایرەی جەنگ هەستی بەوە کردوە کە هەبوونی سەربازانی هاوپەیمان لە ڕووسیە هەڵەیە. ئەو بۆخۆشی لەسەر ئەو باوەڕە بوو: " دەستتێوەردان لە کاروباری ئەو وڵاتە بە ئێمە چی، لەوانەیە لە قازانجی ئەوان تەواوبێت: ئەمە دەبێتە هۆی بەهێزکردن و یەکخستنی ڕای بۆلشویکەکان." لیۆد جۆرج کێری لەوە دڵنیاکردەوە کە چەند کۆپلەیەک لە پەیامەکەی بدا بە ئەندامانی تری شاندی نوێنەرایەتی ئیمپراتۆری بەریتانی و هەروەها بە هاوس. لە ناوەڕاستی ئوقیانووسی ئاتلانتیکەوە ویلسۆن ئاگاداری خۆی ڕاگەیاند: ئەو بێسیمی کرد "لە پێشنیاری ڕووسی چیرچیل زۆر سەرم سووڕماوم، لەوەزیاتر چوونە ناو ئاڵۆزیەکانی ڕووسیەوە خۆکوژیە."پێویست نەبوو ئەو نیگەران بوایە. لە ١٩ی فەوریەدا، ئەو ڕۆژەی کە بۆ سەرلەنوێ دەستپێکردنەوەی وت و ویژەکان لەسەر ڕووسیە لە شۆڕای عالی دیاری کرا، کلیمینجوو لە هەوڵێکی ترۆریستیدا تەقەی لێکرا و بریندار بوو، و بڕیاردان بۆ کاتێکی نادیار پەکی خرایەوە. هەمووی هێزەکان لە سەر خاکی ڕووسیە مانەوە، بەڵام هیچ هێرشێکی گەورەی خاچپەرستانە نەهاتە ئاراوە.[١٧٢]

لەوانەیە، چون ویلسۆن شەیدای پێشنیارکردن بوو، ناوبژیکەران هەستیان بە پێویستبوونی زانیاری زیاتر دەکرد. چەند لاوی ئەمەریکی، وەکوو ڕۆژنامەنووسانی ڕادیکاڵ لینکۆلن ستێفێنس و ویلیام بۆلیت، پسپۆڕێکی لاوی ڕووسی لە گەڵ نوێنەری ئەمەریکی کە دیاربوو دژی دەستدرێژی بوو، پێشنیاری لێژنەیەکی لێکۆڵینەوەیان دابوو. لیۆد جۆرج ئەمەی بە کارێکی باش زانیبوو، نەک تەنیا وەک شێوازێک بۆ یەکخستنەوەی بڕیارێکی چەتوون.[١٧٣]

* * * *

لە ١٧ی فەوریەدا، هاوس بە بۆلیتی ڕاگەیاند کە ئەو بۆ دانووستان لە گەڵ ڕێبەرانی بۆلشویک سەبارەت بە جۆری ئەو مەرجانەی کە ئەوان بۆ ئاشت بوونەوە لە گەڵ هاوپەیمانان پەسەندی دەکەن

ڕێبەرایەتی لیژنەیەکی نهێنی بچووکی گرتۆتە ئەستۆ. بۆلیت لەوە خۆشحاڵ بوو. کاری ئەو لە پاریس کارێکی ئاسایی و ڕۆتین بوو؛ ئێستا، بەو جۆرەی کە دەیدیت، بەرەو قۆناخی نەمان هەنگاوی دەنا. وەک بەرهەمی جیهانێکی دوورگەنشین و خاوەن مافی تایبەتی چینە باڵاکانی فیلادلفیا، ئەو یەکجار زۆر باوەڕی بە خۆی و بە بڕیارەکەی خۆی بوو. دایکی کە هەمیشە خۆی بەقوربانی دەکرد و بەدەور و بەریدا دەهات ئەوی بە منداڵێکی هەڵکەوتوو و بلیمەت دەزانی. ئەو لە زانکۆی یالیّ لە ڕێگای دەریاوە خۆی گەیاندبووە ئەویّ. لای هاوچەرخانی ئەو کەم وێنە و هەڵکەوتە بوو، هەرچەند لای هەندێک کەسانی تر ووشک و ماشێنی دەهاتە بەرچاو کە تا کاتێکە کاری بە خەڵکە لە گەڵیانە دەنا وازیان لێدێنیّ و چیتر کاری پێیان نامێنیّ. ئەو یەکجار زۆر ویلسۆن و یاساکانی ئەوی بەدڵ بوو، بەڵام ئەو ئەم پرسیارەی لەخۆی دەپرسی کە بڵێی ئامادە بیّ پارێزگاریان لیّ بکات.١٧٤

هاوس و کێر پێکەوە لیستێکیان لەو بابەتانەی کە لیژنەکە بڕیار بوو لە سەریان باس و خواست ئاڵ و گۆڕ بکەن ئامادە کرد. هاوس نوێنەرانی تری ئەمەریکی لەوە دڵنیا کردبۆوە کە "بۆلیت تەنیا مەبەستی زانیاری بوو." ئەو ئەمەی بۆ خودی بۆلیتیش، تەنانەت کاتێکە گەشتەکەی تووشی پەژارە و نارەحەتی هاتبوو، بەتەواوتی ڕوون نەکردەوە. بۆلیت ئەویوت کە ئەو ڕاسپاردەیەکی هەم لەلایەن هاوس، کە بە نوێنەرایەتی ویلسۆن قسەی دەکرد، و هەم لەلایەن لیۆد جۆرجەوە پێیە تا سەبارەت بە مەرجەکانی ئاشتی لە گەڵ بۆلشویکەکان دانووستان بکات. ستێفێن، کە لە گەڵ لیژنەکە بوو، سازابوو لە گەڵیان "ئامۆژگاریەکانی بۆلیت بریتی بوون لە دانووستان لە سەر ڕێکەوتنامەیەکی سەرەتایی لەگەڵ ڕووسەکان تابەڵکوو وڵاتەیەکگرتووەکان و بەریتانیای گەورە بتوانن فەڕەنسە هان بدەن تا لە بانگێشتێک بۆ وت و وێژێکی دوولایەنە، کە بەدڵنیایەوە ئاکامی باشی دەبوو، پێوەندیان پێوە بگرێت." ئەمە یەکەمین جار نەبوو کە ستێفێن خۆی تووشی هەڵە کردبوو. نە هاوس و نە لیۆد جۆرج لە ڕێکەوتن و دانووستان کردن هیوابڕ نەدەبوون، بەڵام نەشیاندەویست فەڕەنسەیەکان و ڕای گشتی وڵاتانی خۆیان لە خۆیان بتارێنن ئەگەر هاتوو بۆلشویکەکان پێمل نەبوونایە. لەوانەبوو لیژنەیەکی بچووک بە سەرکردایەتی بیست و هەشت ساڵەیەکی نەناسراو و نادیار هەواڵی خۆشی لە گەڵ خۆی بهێنایەتەوە. ئەگەر لەدەستی نەهاتایە دەکرا وازی لێبهێنرێت.١٧٥

بۆلیت و ستیفین هەفتەیەکی خۆشیان لە مۆسکۆ ڕابوارد: شوێنی نووستن و خواردن و خواردنەوە لە کۆشکێکی داگیرکراو، خاویارێکی زۆر، شەوانە لە ئۆپێرا لەناو کۆشکی کۆنی تزاردا و بەرۆژیشدا وت و وێژ کردن لە گەڵ خودی لنین و چیچێرین. ستێفێن لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە بۆلشویکەکان لە دەست هۆکارەکانی برسیەتی، گەندەڵی، زوڵم و شەڕ و شۆڕ بە تەنگەوە هاتبوون. " ئەوان لە هەوڵی دەمەزراندنی دیموکراسی سیاسی، ئازادی یاسایی، و ئاشتی قسەلەسەرکراو نەبوون-ئێستا نا. لە حاڵی حازردا تەنیا لە

هەوڵی خۆشکردنی بنەمای ئەم شتە باشانە بوون." بۆلیت دەیزانی کە کارێکی گەورە لە ڕووسیە دەستی پێکردبوو. هەردوو کەسایەتیەکە زۆر کەوتنە ژێر کاریگەری لنین. بۆلیت وتبووی کە "ئەو ڕاست و قسەلەڕوو بوو. بەڵام خۆشڕوو و هەتابڵێی شۆخی باز و مەجلیس خۆش بوو."ستێفێن سەبارەت بە ترۆری دوژمنانی بۆلشویکەکان پرسیاری لێکردبوو و کاتێکە لنین پەشیمانی خۆی دەربڕیبوو ئەم پەشۆکابوو؛ ستێفێن وابیری دەکردەوە کە ئەو "زگماک ئازادیخواز بوو."١٧٦

لە کۆتایی هەفتەدا بۆلیت هەستی دەکرد کە بە مامەڵەیەک گەیشتوە. هەردوو لا پێکەوە ئاگربەست ڕادەگەیەنن و سازش دەکەن. هاوپەیمانان هێزەکانی خۆیان دەکێشنە دواوە، بەڵام بۆلشویکەکانیش لە سەر کۆتایی هێنان بە حکوومەتە جۆراوجۆرەکانی سپی پێستەکان لە ڕووسیە پێداگری ناکەن. (چون مەرجەکان داوای کۆتایی هێنانیان دەکرد بە یارمەتی هاوپەیمانی بۆ سپی پێستەکان، بۆلشویکەکان دەیانتوانی بەخشندە بوونایە.) گومان لەوەدایە کە بۆلشویکەکان بە باوەڕێکی تەواوەوە دەستیان بە دانووستان کردبێت؛ لنین لە دانووستانکردن لە گەڵ ئەڵمانیەکان لە برێست لیتۆڤێسک نیشانی دابوو کە ئەمادەبوون و ملدانی ئەو بۆ ئەو دانیشتن و سازشانە تەنیا بۆ ئەوە بووە کە کاتێک بۆ خۆی بکرێت. بۆلیت و ستێفێنس " گەوجەپیاوانی بەکەڵک" بوون، مەئموریەتەکەی ئەوان لانی کەم بۆ کاری پڕۆپاگەندەش بووبێت بەکەڵک و یارمەتیدەربوو.

بۆلیت بە هەڵگرتنی ڕێکەوتنامە، و ستێفێنسیش بە وێنەی دڵخۆشکەری داهاتوو، بەرەو پاریس گەڕانەوە. هاوس، وەکوو جاران، هاندەر و دڵخۆشکەر بوو، بەڵام ئەندامانی تری شاندی نوێنەرایەتی ئەمەریکی بە گومانەوە سەیری داهاتوویان دەکرد. ویلسۆن بۆخۆشی کە تازە لە ولاتەیەکگرتوەکان گەڕابۆوە بە دەست دانووستانە سەخت و دژوارەکانی لە گەڵ ئەڵمان بە تەنگەوە هاتبوو و فکر و هۆشی لێبڕابوو. کاتی چاوپێکەوتن لە گەڵ بۆلیتی دانەدەنا. لیۆد جۆرج،کە لە ٢٨ی مارسدا نانی بەیانی لە گەڵ ئەو خوارد، لە ڕاستیدا خەریک بوو لاقەکانی سڕ ببێت. گرتنەدەستی دەسەڵات لە مەجارستان لە لایەن بێلا کۆن بۆ جارێکی تر ترس و دڵەڕاوکێی سەبارەت بە پەرەسەندنی بیروباوەڕی بۆلشویزم بەرەو ڕۆژئاوا زیندوو کردەوە. هەواڵی مەئموریەتەکەی بۆلیت داروديواری تەنی؛ دەنگۆی ئەوە درووست ببوو کە گوایە بەریتانیا و ولاتەیەکگرتوەکان بڕیاریان هێناوەتە سەر ئەوەی کە حکوومەتی سۆڤیەت بە فەرمی بناسن. ئەندامانی کۆنەپارێزی لێژنەی یاسادانانی لیۆد جۆرج و هەروەها ڕۆژنامەکانی نۆرسکلیف وەکوو باز سەیری ئەویان دەکرد. ئەو بەیانیە، دەیلی مەیل سەردێڕێکی توند و دڕندانەی بە قەڵەمی هێنری ویکهام ستید، سەرنووسەری خوشکەڕۆژنامەکەی خۆی تایمز لەخۆ گرتبوو، کە ئەویش بە قەد کلیف ڕقی لە لیۆد جۆرج بوو. "تەڵە"ی پرینکیپۆ

جەزیک بوو سەرلەنوێ دەژیایەوە، سووپاس بۆ پیلانگێڕیەکانی وەبەرهێنەرانی جوولەکەکانی جیهان یان بلێین بەرژەوەندیەکانی ئەڵمانی. لیۆد جۆرج ڕۆژنامەکەی هەڵگرت و فڕێی دا سەر مێزی نانی بەیانی و وتی: "هەتا چاپەمەنیەکانی بەریتانیا کاری لەو جۆرە بکەن، تۆ نابێ چاوەڕوانی ئەوە لە من بکەیت کە ئاگاداری بارودۆخی ڕووسیە بم."١٧٧

لە چەند هەفتەی دواتردا گوشارەکان بۆ سەر لیۆد جۆرج پەرەیان سەند. لە ١٠ی مانگی ئاڤریلدا، زیاتر لە دووسەد ئەندامی کۆنەپارێزی پەرلەمان تێلێگرامێکیان واژۆ کرد کە تێیدا کردبویانە سەر ئەو کە حکوومەتی سۆڤیەت بە فەرمی نەناسێت. لیۆد جۆرج، کە لە لایەکی ترەوە کەوتبوە بەر هێرشی مەرجەکانی ئاشتی ئەڵمان، دەیزانی کەی بەری زەرەر و زیانەکانی خۆی بگرێ. کاتێکە لە ١٦ی ئاڤریلدا ڕووبەڕووی ئەنجومەنی پیران بۆوە، بە توندی وتبووی کە بەفەرمیناسینەکە هەرگیز لە پاریس تاو و توێ نەکراوە و لە داهاتووشدا شتی وا لە بەرنامەدا نیە. کاتێکە بە شێوەیەکی تایبەت سەبارەت بە مەئمووریەتەکەی بۆلیت پرسیاری لێکرا سەربە هەوا وڵامی دایەوە کە "پێشنیارێک بوو کە گوایە لاوێکی ئەمەریکی گەڕابۆوە دواوە." ئەوەی نەدەکوت کە ئایا ئەو لاوە هیچ گوزارشێکی بەکەڵکی لە گەڵ خۆی هێناوەتەوە یان نا.١٧٨

بۆلیت تەواو تێکشکا بوو. هیچ کەس لە پاریس حازر نەبوو سەبارەت بە مەئمووریەتەکەی ئەو شتێک ببیستێ، تەنانەت سەرۆک کۆمارێکیش کە زۆر شانازی پێوە دەکرد. کاتێکە مەرجەکانی گرێبەستی ئەڵمانی لە مانگی مەیدا ئاشکرا بوون، نائۆمێدی ئەو لە ویلسۆن کۆتایی پێهاتبوو. ئەو نامەیەکی دەست لەسەرکارکێشانەوەی پڕ لە قین و تووڕەیی نارد و بەرەو ڕیڤیرا سەری نایەوە، " تا لە سەر ماسە ڕاکشێ و سەری جیهان بکات کە بەرەو قوڕگیران دەچێت." پایزی ئەو ساڵە بۆ وڵاتەیەکگرتووەکان گەڕابۆوە و لە چارەنووسی ویلسۆن و ڕێکەوتنامەی ڤێرسایلێس دەستی هەبوو بە شایەتی دان لە بەردەمی سێنا کە ئەو، و زۆر کەسی تر لە شاندی نوێنەرایەتی ئەمەریکی، زۆریەک لە بەندەکانی ئەو ڕێکەوتنامەیە پەسەند ناکەن. لەگەڵ ئەمانەش ئەو بڕیاری دا گوزارشی مەئمووریەتەکەی خۆی بۆ ڕووسیە هەڵگرێ و بیخاتە ئارشیڤەوە. لە ساڵی ١٩٣٤، وەک یەکەمین باڵوێزی ئەمەریکی بۆ یەکیەتی سۆڤیەت گەڕایەوە بۆ مۆسکۆ. ئەم کەڕەتەیان ئەزموونی ڕابردوو ئەوی کردبوو بە دژە-کمونیستێکی تەواو عەیار.١٧٩

بە دوای ئەمەدا لیۆد جۆرج و ویلسۆن کێشایانە دواوە و ئیتر لە گەڵ حکوومەتی سۆڤیەت پێوەندیان نەگرت، هەرچەند هەر بەو هیوایەوە ژیان کە بەشکەم گۆڕانێکی نائاسا بێ بەسەر بۆلشویکەکاندا و ببن بە دیموکراتی باش. هەردووکیان بۆ ماوەیەک شۆخیان بە بیرۆکەی بەکارهێنانی کەشتی بارهەڵگری خواردەمەنی بە مەبەستی ئارام کردنەوەی بۆلشویکەکان، پیلانێک

کە هۆڤێر، وەک سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی یارمەتی هاوپەیمانی، پێشکەشی کردبوو. بۆچوونەکانی خودی هۆڤێر سەبارەت بە بۆلشویکەکان زۆر نزیک بە بۆچوونەکانی ویلسۆن بوون: واتە وڵامێکی ڕوون و ئاشکرا بۆ هەل و مەرجێکی تووش و ناخۆش. ئەوان مەترسیدار بوون، هەرچەند، پرۆپاگەندەکانی ئەوان تەنانەت لە کۆمەڵگا زۆر بەهێزەکانی جیهانیشدا وەکوو ئەمەریکا سەرنجراکێش بوون. هاوپەیمانان دەبێ ناڕاستەوخۆ بۆلشویکەکان لەوە بگەیەنن کە ئەگەر ئەوان دەستبەرداری هەوڵدانی خۆیان بن بۆ پەرەدان بە شۆڕشەکەیان، لە لایەن هاوپەیمانانەوە یارمەتی بنەڕەتی و زۆر گرنگیان پێدەگات. بە داینی کات و خواردەمەنی، خەڵکانی ڕووسیە لە بیروباوەڕی ڕادیکاڵ توندئاژۆ خۆ دەپارێزن و توخنیان ناکەون. بۆ بەرگری کردن لە هەر شێوەیەکی بە فەرمی ناسینی هاوپەیمانی و ڕێگەنەدان بە هیچ جۆرە نارازیەک لەلایەن فەڕەنسەیەکانەوە، هۆڤێر پێشنیاری کرد کە لە کەسایەتیەکی هەڵکەوتوو لە وڵاتێکی بێ لایەن کەڵک وەرگیرێت تا هەل و مەرجەکە بگرێتە دەست خۆی و خۆی کارەکان بەڕێوە ببات.١٨٠

ئەو بە ڕێکەوت کەسێکی لە مێشکدا بوو " پیاوێکی چوارشانەی کەڵەگەت کە لەباری جەستەیەوە زۆر بەهێز و لەباری ڕۆحیشەوە زۆر بەورە و بەغیرەت بوو."-فریدجۆف نانسێن، گەڕاڵێکی ناوداری نۆرویژی پەیوەست بە جەمسەری باکوور، بەڕێکەوت ڕێی کەوتبوە پاریس و هەڵگری بیرۆکەیەکی نادیار بوو سەبارەت بە دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەک بۆ کۆمەڵەی گەلان. لە ناوەڕاستی مانگی ئاڤریلدا شۆڕای چوار لایەنە پلانەکەی هۆڤێری پەسەند کرد. گرووپێک لە وڵاتانی بێ لایەن، وەکوو نۆرویژی خودی نانسین، هاتنە سەر ئەوەیکە خۆراک و دەواودەرمان بۆ ڕووسیە کۆکەنەوە، و کاتێک بیدەن بە دەست بۆلشویکەکانەوە کە ئاگربەست لە گەڵ دوژمنەکانیان ڕاگەیەنن. نانسین ویستی دەستبەجێ تێلەگرامێک بۆ لنین بنێرێت تا هەواڵی خۆشی پێ ڕاگەیەنێت، بەڵام نە فەڕەنسەیەکان، کە پیلانەکەیان وەک فێڵێک سەیر دەکرد لە لایەن ئەمەریکیەکان، بەریتانیەکان و تەنانەت ئەڵمانیەکانیش بۆ بەدەست هێنانی زێدەماف، نە بەریتانیەکان، کە ئاگاداری هەرشتێک بوون کە ڕەنگ و بۆی بەفەرمی ناسینی بۆلشویکەکانی لێبێت، تێلەگرامەکەیان نەگەیاند. لە ئاکامدا تێلێگرامەکە لە بەرلینەوە ڕۆیی.١٨١

وڵامی سۆڤیەت، بە ڕەشنووسی چیچێرین و لیتڤینۆف، لە ١٥ی مانگی مەیدا لەڕێگای ڕادیۆ و کابلەوە درایەوە. لنین بەم شێوەیە ئەوانی ئامۆژگاری کردبوون "لە گەڵ نانسین هەتا دەتوانن بە ڕێزەوە هەڵس و کەوتی لە گەڵ بکەن، لە گەڵ ویلسۆن، لیۆد جۆرج و کلیمینجوو *هەتا دەتوانن بێ ڕێزی و سووکایەتی* بکەن." سەبارەت بە خودی پیلانگێڕیەکەش وتبووی "تەنیا بۆ کاری *پڕۆپاگەندە*

کەڵکی لێوەرگرن چون ئاشکرایە کە بەکاری هیچ مەبەستێکی بەکەڵک و بەسوود نایەت."
هاوکارەکانی ئامۆژگاریەکەی ئەویان لەگوێ گرت، هاورێ لە گەڵ هێرشی توند و تیژ بۆ سەر هاوپەیمانان ملیان نەدا بە هیچ جۆرە ئاگربەستێک مەگەر کۆبوونەوەیەکی گونجاو و لەباری ئاشتی بهاتایەتە ئاراوە. لە پاریس، ناوبژیکەران بە نارەحەتیەوە سەریان تەکان دا و وازیان لە هەر وت و وێژێکی زیاتر سەبارەت بە یارمەتی مرۆڤدۆستانە هێنا. ئەم ڕووداوە بۆ جارێکی تر مایەپووچی سیاسەتی هاوپەیمانانی سەبارەت بە ڕووسیە نیشاندا.١٨٢

*    *    *    *

تەنیا ترووسکەیەک لە هیوا و ئۆمێد وەک دوایەمین ترووسکە مابۆوە: ئەویش ئەمە کە بەشکەم ڕووسەکان بۆخۆیان گرێپووچکەکە بکەنەوە. بەرلەوەی تاوبانی بەهاری بکەوێت و شەقامەکانی ڕووسیە بە قوڕ و لیتە داگرێت، ڕووسە سپی پێستەکان بڕیاری هێرشێکیان بۆ سەر بۆلشویکەکان ڕاست کردەوە. لە بنکەکەی خۆیەوە لە ڕۆژهەڵاتی سیبیریە، ئەدمیراڵی سپی پێست بەناوی کۆلچاک بە درێژایی بەرەیەکی بەرینی شەڕ هێرشی دەست پێکرد. هێزێک بۆ باکوور بەرەو ئارچانگێل وەڕێکەوت و دەیەویست لە گەڵ گاردێکی پێشەنگ لە هێزی بەریتانی و ڕووسە سپی پێستەکان کە گەمارۆ درابوو یەک بگرێت. یەکی تر بۆ ڕۆژئاوا بەرەو کێوەکانی ئۆراڵ وەڕێکەوت. سێهەمین بەرەو باشوور تا لە گەڵ دێنیکین و سووپاکانی پێوەندی بگرێت. لە ناوەڕاستی مانگی ئاوریلدا کۆلچاک و هاوپەیمانەکانی بۆلشویکەکانیان بە بڕی ٣٠٠،٠٠٠مەتری چوارگۆشە بۆ دواوە ڕادابوو. بەڵام ئەمە ترۆپکی شانس و سەرکەوتنیان بوو.

بۆلشویکەکان خاوەنی دوو قازانجی سەرەکی بوون: یەکیەتی ئەوان و شوێنێکە تێیدا هەڵکەوتبوون. ئەوان کۆنتڕۆڵی ناوەندی ڕووسیە لە دەستیان دابوو، بەڵام دوژمنانی جیاجیای ئەوان بە دەوروبەری ناوچەکەدا پرژ و بڵاو ببوونەوە. زۆر جار، هیچ کام لە فەرمەندەکانی ڕووسە سپی پێستەکان، کە چەندین مایل لێک دادەبڕان و یەکتریان لێ بزر دەبوو، ئاگایان لەوانی تر نەبوو کە چیان بەسەر هاتوە و لەکوێن. هێزە سەربازیەکانی بۆلشویکەکان سێ ئەوەندە دەبوو و زۆربەی کارخانەکانی چەک و تەقەمەنی ڕووسیەیان لە خزمەت دابوو.١٨٣

لە ٢٣ی مانگی مەی ساڵی ١٩١٩دا، هاوپەیمانان بڕیاریان دا تا ڕادەیەک حکوومەتی کۆلچاک بە فەرمی بناسن. چێرچیل دواتر نووسیبووی کە " ئەو کاتەی کە بۆ ڕاگەیاندنەکە دیاری کرابوو زۆر درەنگ کەوتبوو."پەیامێک کە داوای دڵنیابوونی لە ناساندنی ڕێکخراوەکانی دیموکراتیک دەکرد ڕێگایەکی پڕ هەوراز و نشێوی بڕی تا گەیشتە سیبیریە و لە کاتی خۆیدا

وڵامێکی تاڕادەیەک تێکەڵ پێکەڵ ناردرایەوە کە پێدەچوو گەرەنتی پێویستیان دەستەبەر کردبێت. لە گەڵ ئەوەش ماوەیەکی کورت دوا ئەو ڕووداوە هەر هەواڵێک کە لە ڕووسیەوە دەهات بەم لاوە گوزارش لە شکستەکان بوو. لە کۆتایەکانی مانگی جوون دا، سووپای سوور ناوەندی کۆلچاکیان داگیر کردبوو و سپی پێستەکانیش سەدان کیلۆمەتر لەولاترەوە کەوتبوون.١٨٤

لەم کاتەدا کۆڕی ئاشتی بەرەو داخران دەچوو و ئەڵمانیەکان خەریک بوون گرێبەستی وێرسایلێسیان واژۆ دەکرد. بۆ ئەوەی سەبارەت بە ڕووسیە کارێک بکرێت هەچی دەرفەتە لە کیس چووبوو. بەندێکی کورت لە گرێبەستەکەدا کرابۆوە کە بە زمانێکی سادە و ساکار ئەیوت کە هەر گرێبەستێک کە لە داهاتوو لە نێوان هاوپەیمانان و ڕووسیە، یان بەشێک لەو ولاتە، بێتە ئاراوە پێویستە بە فەرمی بناسرێت. بەندێکی تر ئەگەری داواکاری ڕووسیەی بۆ خەسارەکان و زیانەکان بە کراوەیی بەجێ هێشتبوو. بەواتایەکی تر گرتنەبەری سیاسەتێک دەر هەق بە ڕووسیە هەروەکوو جاری جاران بە ئاڵۆزی مایەوە. گەمارۆدانی بۆلشویکەکان هەروا توند و تیژ مایەوە، بەڵام پشتگری لە سپی پێستەکان وردەوردە بەرەو کزی ڕۆیی. بەریتانیا و فەڕەنسە وازیان لە کۆلچاک هێنا وەک هۆکارێکی لەکیس چوو. (ئەدمیراڵ خۆی خستە باوەشی تاقمێک سەربازی چوکسلەواکی، کە هێشتا هەر لە سیبیریە مابوونەوە؛ چوکسلەواکیەکان ئەویان دا بە دەست بۆلشویکەکانەوە، و لە فەوریەی ١٩٢٠دا تیرباران کرا.) لە ئۆکتۆبری ساڵی ١٩١٩دا، دێنینکین بە تەواوەتی لە باشوور پاشەکشێی کردبوو. لە ژانویەی ١٩٢١دا بە هاندانێکی زۆر لە لایە بەریتانیەکانەوە، هاوپەیمانانی ئەورووپی هاتنە سەر ئەو ئەنجامەی کە بە دەستدرێژی نیزامی کۆتایی بێنن و ئابلۆقەکەیان بشکێنن. لە مارسی ساڵی ١٩٢١دا، بەریتانیەکان ڕێکەوتنامەیەکی تجاریان لە گەڵ حکوومەتی سۆڤیەت بەست. تەنانەت تاجرانی بەرژەوەندخوازیش، کە ترسی ئەوەیان بوو دەرفەتێک لە ڕووسیە لە کیس بدەن، پشتگریان لێکرد. لە ساڵی ١٩٢٤دا بەریتانیەکان و یەکیەتی سۆڤیەت، پێوەندی تەواو دیپلۆماتیکیان دامەزراند. فەڕەنسە بە نابەدڵیەوە ڕەچاوی دەکرد. ئەمەریکا تا دەیەیەکی تر، تا FDRمەحتەل ما. بە باش بینینی پاش ڕووداوەکان، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە ڕای چێرچیل و فۆچ سەبارەت بە بۆلشویکەکان ڕاست بوو و لیۆد جۆرج و ویلسۆن لە هەڵەدا بوون. پارتی حاکم لە ڕووسیە وەکوو سۆسیال دێموکراتەکانی سۆئێدی لێدەرنەهات. لنین سیستەمێکی لە قودرەت و دەسەڵاتی بەرین و سەرسووڕهێنەر دامەزراندبوو کە بواری بۆ ستالین خۆش کردبوو تا هەوساری خەیاڵی چەوساندنەوە بە کەیفی دڵی خۆی بادا. خەڵکی ڕووسیە، و زۆر لایەنی تر لە پشتەوە، لەپێناو سەرکەوتنی بۆلشویکەکان لە شەڕی ناوخۆدا نرخێکی گرانبەهای دا، بەڵام لە پاریس سنوورەکانی دەسەڵات بۆ ناوبژیکەران دیاری کران.

* * * *

# ٧

# کۆمەڵەی گەلان

لە ٢٥ی ژانویەدا، کۆڕی ئاشتی بەشێوەیەکی فەرمی پەسەندی کرد کە ئەرکێک بخاتە ئەستۆی کۆمەڵەی گەلان. دوو ئەندام لاوی شاندێکی نوێنەرایەتی ئەمەریکی وابیریان دەکردەوە کە ئەمە فلیمێکی سەرسووڕهێنەر و هیوابەخش درووست دەکات. ئەوان هەستیان وابوو کە بە درووست کردنی ئەم فلیمە ئەوان دەیانەوێت دیپلۆماسی کۆن نیشان بدەن کە چۆن ئەرکە نگریس و شەیتانیەکانی خۆی بە ئەنجام دەگەیاند. خەریتە بزۆکەکان نیشانی دەدەن کە چۆن لە ڕابردوودا تۆوی شەڕوشۆڕ چێنراوە: هاوپەیمانیە نهێنیەکان، شەڕەکانی نابەرابەر، ئەو کۆبوونەوانەی کە تێیاندا دەسەڵاتە کۆن و خۆبینەکانی ئەورووپی هێڵی کاتیان بە سەر خەریتەکاندا دەکێشا. کۆڕی ئاشتی پاریس و کۆمەڵەکە ئەو جۆرەی کە بوون "وەکوو خۆیان" دەخرێنە ڕوو و پیشان دەدرێن. لە گەڵ ئەوەش ئەوان لەوە دڵنیا بوون کە فلیمەکە پارەیەکی باش دەردێنێت.١٨٥

ئەمڕۆکە بە مێشکی کەم کەس دادێ کە لەو سەردەمەدا پڕۆژەیەکی لەو چەشنە توانیبێتی بەهەند وەرگیرێت. ئێستاش تەنیا تاقمێکی بچووک لە مێژوونووسانی هەڵکەوتوو بە خۆیان دەپەرمن لە سەر کۆمەڵەی گەلان کاری لێکۆڵینەوە و توێژینەوە ئەنجام بدەن. ئارشیڤەکانی ئەو کۆمەڵەیە، بە کۆگایەک کەرەسە و بەڵگەوە ئێستاش ناخرێنە بەرچاو و لە بەردەست دانین. هەر ناوی ئەو کۆمەڵەیە وەبیرهێنەرەوەی بۆرۆکراتە جەسوورەکانە لە سەر مەبەستی خۆیان، لایەنگرانی نادیار و شاراوەی لیبراڵ، بریارنامە بێ کەڵک و پڕووپووچەکان، مەئمووریەتە هەقیقەت دۆزەرانی بێ کەڵک ، و بەگشتی لە یەک وشەدا وەبیرهێنەرەوەی شکست و دواکەوتەییە: مانچۆریا لە ساڵی ١٩٣١، ئیتیۆپیا لە ساڵی ١٩٣٥ و لەهەمووی کارەساتبارتر، سەرهەڵدانی شەڕی دووهەمی جیهانی تەنیا بیست ساڵ دوا کۆتایی هاتنی شەڕی یەکەم. ڕێبەرانی چالاکی شەڕەکانی جیهانی- مۆسۆلینی، هیتلێر، میلیتاریستەکانی ژاپۆنی- بە کۆمەڵەی گەلان گاڵتەیان دەکرد و لە ئاکامیشدا

پشتیان تێکرد. لایەنگرانی سەرەکی ئەو کۆمەڵەیە- بەریتانیا، فەرەنسە و دیموکراسیە بچووکەکان — سست و شل و ول بوون. یەکیەتی سۆڤیەت پێوەندی پێوە گرتن تەنیا بەهۆی ئەوەوە کە ستالین، لەوکاتەدا، ڕێگەچارەیەکی باشتری پێشک نەدەهات. ولاّتەیەکگرتووەکان هەر قەرەشی نەکەوت. پەڵەی شکست و سەرنەکەوتن ئەوەندە گەورە بوو کە کاتێکە زلهێزەکان لە ماوەی شەڕی دووهەمی جیهانیدا کەوتنە فکری یەکیەتیەکی هەتاهەتایی نەتەوەکان، بڕیاریان لە سەر دامەزراندنی نەتەوە یەکگرتووەکان بە تەواوی ساخ کردەوە. لە ساڵی ۱۹٤٦دا مەرگی کۆمەڵەی گەلان بەشێوەیەکی فەرمی ڕاگەیەنرا. لە ساڵی ۱۹۳۹دا نەیانهێشتبوو ئەو مەرگە ڕاگەیەنرێت.

لە دوایەمین کۆبونەوەی ئەو کۆمەڵەدا، لۆرد ڕۆبێرت سێسیل، کە لە دامەزراندنەکەیدا بەشداری کردبوو ئەم پرسیارەی ئاراستە کرد "ئایا ئەمە ڕاستە کە هەمووی هەوڵەکانی ئێمە بۆ ئەو بیست ساڵە بەفیڕۆ چووە؟" زۆر بوێرانە هەر خۆی وڵامی پرسیارەکەی خۆی دایەوە: "بۆ یەکەم جار ڕێکخراوەیەک، لە سەر کرۆکی جیهانی، دامەزرا، نەک بۆ مەبەستی بەرژەوەندی نەتەوەیی ئەم یان ئەو ولاّتە.... بەڵکوو بۆ مەبەستی پووچەڵکردنەوەی شەڕ." لە کۆتایی قسەکانیدا وتی " کۆمەڵەی گەلان ئەزموونێکی گەورە بوو." ئەو کۆمەڵەیە بەشێوەیەکی کۆنکریت و بەرچاو خەون و هیواکانی ئەو کەسانەی کە بە درێژایی سەدەکان لەپێناو ئاشتیدا خەباتیان کردبوو هێنایە دی. ئەو کۆمەڵەیە بنەمای یاساکەی خۆی لە سەر ئەم بیرۆکە هەموولا پەسەندکراوە دامەزراندبوو کە نەتەوەکانی جیهان بۆ دابینکردنی هێمنایەتیەک کە هەموویان دەگرێتەوە دەتوانن و پێویستە پێکەوە خەباتی بۆ بکەن. " کۆمەڵەی گەلان دەرد و بەڵای ئێوەی برد: هیوای تەمەندرێژی بۆ نەتەوەیەکگرتووەکان!"[186]

سێسیل ڕاستی دەوت. کۆمەڵەی گەلان نوێنەرایەتی شتێکی زۆر گرنگی دەکرد: هەم بەفەرمی ناسینی ئەو گۆڕانکاریانەی کە پێشتر لە پێوەندیەکانی نێونەتەوەییدا هاتبوونە ئاراوە و هەم لەسەر گرەوێک کە لەسەر داهاتوو بەسرابوو. وەکوو چۆن مەکینەکانی هەڵم شێوازی ڕۆیشتنی خەڵکیان بە سەر زەویدا گۆڕی، وەکوو چۆن ناسیۆنالیزم و دیموکراسی پێوەندی جیاواز لەگەڵ یەکتر و لە گەڵ حکوومەتەکانی خۆیانی پێبەخشین، هەر بەو شێوەیەش شێوازی هەڵس و کەوتی دەوڵەتان لە گەڵ یەکتر لە سەدەیەک پێش دانیشتنی کۆڕی ئاشتی گۆڕانی بەخۆوە دیبوو. هەڵبەت هێشتا دەسەڵات کاریگەری خۆی هەر هەبوو، و هەڵبەت کە حکوومەتەکانی ئاگاداریان لە ولاّتانی خۆیان هەر دەکرد. بەڵام ئەو مانایەی جارانی نەبوو و گۆڕانی بە سەردا هاتبوو. ئەگەر سەدەی هەژدەهەم، لەپێناو قازانجی بەرەی حوکمرانی یان تەنانەت بۆ فەخر و شانازی، هاوپەیمانی درووست دەکرد و هەڵی دەوەشاندەوە، و شەڕەکانی هەڵدەگیرساند و دایدەکووژاند، ئەگەر داگیرکردنی پارچەزەویەکان بەبێ لەبەرچاوگرتنی

دانیشتوانی ئەو ناوچانە بە شتێکی تەواو ڕەوا و درووست دەزانرا، سەدەی نۆزدەهەم بەرەو ڕوانگەیەکی جیاواز هەنگاوی نابوو. شەڕ ڕۆژ لە دوای ڕۆژ وەک گۆڕانێکی کاتی سەیر دەکرا، وەک گۆڕانێکی گرانبەها. لە سەدەی هەژدەهەم هەرکەس کە دەسکەوتێکی هەبوو خۆی دانابوو بۆ ئەوەی ڕۆژێک بیدۆڕێنێ؛ هەمووکەس یەک کفنیان لە بەر دەکرد. ئێستا ئیتر شەڕ بۆ هەموی یاریگەرەکان خەرجی هەڵدەگرت، وەک چۆن شەڕی گەورە سەلماندی. بەرژەوەندیەکانی نەتەوەیی تەنیا لە ڕێگای ئاشتیەوە زیادیان دەکرد، و ئەویش بەنۆبەی خۆی ڕێگای بۆ تجارەت و پیشەسازی خۆش دەکرد تا گەشە بکەن. و خودی نەتەوە شتێکی جیاواز بوو، چیتر نوێنەرەکەی پادشا یان هەڵبژاردەیەکی بچووک نەبوو بەڵکوو جارلەگەڵ ئەو نوێنەرایەتیە لە لایەن خەڵکەوە دادەمزرا و هەڵدەبژێردرا.

لە دیپلۆماسیدا شێوازەکان هەر بەو شێوەی جاران بوون: باڵوێزەکان بەڵگەی باوەڕپێکردنیان پێشکەش دەکرد، گرێبەستەکان واژۆ و سەربەمۆر دەکران. بەڵام یاساکان گۆڕابوون. لە یاری نەتەوەکاندا چیتر باو نەبوو، یان تەنانەت پەسەندکراویش نەبوو، کە نەتەوەیەک دەست بەسەر زەوی و زار و ناوچەی بندەستی نەتەوەیەکی تردا بگرێت کە پڕ لە دانیشتوانێک بێ بە نەتەوەی جیاوازەوە. (کۆلۆنیەکان[ناوچەبندەستەکان] بۆیان گرنگ نەبوو، چون ئەو خەڵکانە وایان بۆچووبوون کە لە پێشکەوتی سیاسیدا لە قۆناخێکی خوارتر دابن.) کاتێکە بیسمارک ئەڵمانی پێکهێنا، ئەو بەناوی یەکیەتی ئەڵمان ئەو کارەی کرد، نەک وڵات داگری بۆ پراشای مامۆستای خۆی. کاتێکە پێکهاتەکەی ئەو لە ساڵی ١٨٧١ ئالساسی-لۆرەینی لە فەرەنسە داگیر کرد، حکوومەتی ئەڵمان هەموو هەوڵێکی خۆی خستە گەڕ بۆ ئەوەی خۆی و جیهانیان بێنێتە سەر ئەو قەناعەتەی کە ئەمە لەپێناو گەندەڵیەکانی کۆنباوی شەڕ نەبوو بەڵکوو لەپێناو خەڵکانی دانیشتووی ئەو ناوچانەدا بوو کە بەدڵ خۆیان بە ئەڵمانی دەزانی.

لە گەڵ ئەمانەشدا لەمەبەولاوە هۆکارێکی تر هاتبوە ناو هاوسەنگیەوە: ڕای گشتی. پەرەسەندنی دیموکراسی، گەشەکردنی ناسیۆنالیزم، تۆڕی هێڵەکانی شەمەندەفەڕ و تێلێگرافەکان، ڕۆژنامەنووسانی سەرقاڵ و دەزگاکانی چاپەمەنی گەڕۆک کە بەکۆمەڵ ڕۆژنامە بەرهەم دێنن، هەرهەمووی ئەمانە بانگێشتی بوونەوەرێکیان دەکرد کە حکوومەتەکان زۆریان خۆش نەدەویست بەڵام بوونەوەرێک کە نەیاندەوێرا بیخەنە پشت گوێ. لە پاریس بیرلەوە دەکرایەوە کە دانووستانەکان لەژێر چاودێری جەماوەردا بەڕێوە بچن.

لای ئایدیالیستەکان ئەمە شتێکی باش بوو. خەڵک بۆ پێوەندیەکانی نێونەتەوەیی ئەقڵێکی گشتی زۆر پێویستیان دەهێنا ئاراوە. ئەوان خوازیاری شەڕ یان ڕکابەریە گرانبەهاکانی

سۆڤیاکان نەبوون. (ئەم باوەڕە نەکەوتە ژێر کاریگەری ئەم ڕاستیەوە کە زۆربەی ئورووپایەکان پێدەچوو تاسەباری شەڕ بن لە دەیەکانی پێش ساڵی ١٩١٤، و لە خودی ساڵی ١٩١٤دا لەباری پۆزتیڤەوە زۆر بەسۆز بوون.) گەشەکردن و پێشکەوتنی سەدەی نۆزدەهەم هاندەری ئەم باوەڕە بوو کە جیهان بەرەو شارستانیەت دەڕۆیی. چینێکی مامناوەندی ڕوولەگەشە مەڵبەندێکی هەلبژاردنی سرووشتی پێکهێنا بۆ بزووتنەوەیەکی ئاشتی کە ئامۆژگاری ئەم شتانەی دەکرد: قازانجەکانی بەزۆر ناوبژی کردنی ئالۆزیەکان، دادگاکانی نێونەتەوەیی، چەکداماڵین، و تەنانەت قەول و بەڵینی قەرەی توند و تیژی نەکەوتن وەک ڕێگایەک بۆ بەرگری کردن لە جەنگەکان. دوژمنانی شەڕ کۆمەڵگاکانی خۆیان وەک نموونە دەهێنایەوە، بەتایبەت کۆمەڵگاکانی ڕۆژئاوای ئورووپا، ئەو شوێنانەی کە حکوومەتەکان لەبەرانبەر ئیرادەی هاووڵاتیان هەستی بەرپرسایەتیان زیاتر بوو، ئەو شوێنانەی کە هێزەکانی پۆلیسی گشتی جێگای گاردە نهێنیەکانیان گرتبۆوە و ئەو شوێنانەی کە دەستووری یاسا بەشێوەیەکی بەربلاو ڕێزی لێدەگیرا. بەدڵنیایەوە دەکرا تەسەوری کۆمەڵگایەکی هاوچەشن لە نەتەوەکان بکرێت کە هێمنایەتی گشتی بۆ ئەندامەکانی دەستەبەر بکات؟١٨٧

لە پاریس، ویلسۆن پێداگری دەکرد لە سە سەرۆکایەتی کردنی مەئموریەتی کۆمەڵەی گەلان، چون ئەو پێی وابوو کە کۆمەڵەی گەلان گوڵی سەرسفرەی هەوڵەکانی نانەوەی ئاشتی بوە. ئەگەر بکرایە ئەوە بهاتایەتە دی، ئەوا هەموو شتێکی تر درەنگ یان زوو بە دوایدا دەهات. ئەگەر لە مەرجەکانی ئاشتیدا هەڵەیەک بەدی بکرایە، ماوەیەکی زۆری دەبرد تا کۆمەڵەی گەلان دواتر ئەو هەڵانەی ڕاست کردایەتەوە. دەبوو زۆر سنووری تازە بکێشرایە؛ ئەگەر زۆر تەواو نەبوونایە، کۆمەڵەی گەلان دیاری دەکردن. کۆلۆنیەکانی ئەڵمان خەریک بوون بەرەو فەوتان دەڕۆیشتن؛ کۆمەڵەی گەلان دڵنیای دەکردنەوە کە بەشێوەیەکی ڕێک و پێک بەڕێوە دەچوون. ئیمپراتۆری عوسمانی هەڵوەشابۆوە و لەکار کەوتبوو. بۆ ئەو خەڵکانەی کە هێشتا ئامادەیی ئەوەیان نەبوو حاکمیەتی خۆیان بگرنە دەست، کۆمەڵەی گەلان ڕۆڵی کەیخودا یان پیاوماقووڵێکی دەگێڕا. و بۆ بەرەکانی داهاتوو کۆمەڵەی گەلان سەرپەرشتی پێشکەوتنی گشتی و ئاشتی بۆ دەکردن، هاندەری هەژاران بوو، بەدڕەوشتانی سەرلۆمە دەکرد و، لە هەرکوێ پێویست بوایە، سەرکێشەکانی سزا دەدا. بەڵێنێک بوو کە مرۆڤایەتی خەریکە بۆ خۆی پەیمانێک دەبەستێ.

* * * *

وێنەی کێشراوی ویلسۆن لە کاتی تێپەڕبوون بە ئۆقیانووسی ئەتلەنتیکدا کە هەڵگری دیاری کۆمەڵەی گەلانە لە جیهانی نوێوە بۆ جیهانی کۆن سەرنجڕاکێشە بەڵام، سەد مەخابن، کە هەڵەکاری و درۆیە. لەمێژبوو کە زۆریەک لە ئورووپایەکان خوازیاری ڕێگایەکی باشتر بوون بۆ بەڕێوەبەرایەتی پێوەندیەکانی نێونەتەوەیی. شەڕێک کە تازە ئەوان لێی دەرباز ببوون و زیندوو مابوونەوە تەنیا کاتێک مانادار دەبوو کە جیهانێکی باشتری بۆ درووست کردنایە و کۆتایی بە شەڕی تر بهێنایە. ئەوە هەر ئەو شتەبوو کە حکوومەتەکانیان لە ڕۆژە سەخت و تەنگانەکاندا بەڵێنیان دەدا ئەوە هەر ئەو شتە بوو کە ورەی بە ئەوان دەبەخشی. لە ساڵی ۱۹۱۹، کاتێکە ئورووپایەکان لەو ساڵەکارەساتبار و ناخۆشانە تێفکرین، لەو هەموو خوێنەی کە بە ناهەق ڕژان، کاتێکە ئەوان هەستیان بەوەکرد کە کۆمەڵگای ئەورووپی هەپروون بە هەپروون ببوو، کۆمەڵەی گەلان، وەک دوایەمین دەرفەت، نەک تەنیا لیبرالەکان و چەپیەکان، بەڵکوو زۆر لایەنی تریشیان کردە ئامانجی خۆیان. هارۆلد نیکۆلسۆن بۆ زۆریەک لە هاوچەرخانی دوا و وتی: "مەبەست لە سەفەرەکانی ئێمە بۆ پاریس تەنیا بۆ سڕینەوەی ئاسەواری شەڕ نەبوو، بەڵکوو بۆ دامەزراندنی دەستوورێکی نوێ لە ئورووپا بوو. ئێمە تەنیا بەدوای نانەوەی ئاشتی بۆ ناوخۆی وڵات نەبووین، بەڵکوو مەبەستی سەرەکیمان نانەوەی ئاشتی دەرەوە بوو. ئێمە تریفەی مەئموورییەتێکی ئاسمانی بە سەرمانەوە بوو. پێویستە کە ئێمە ووشیار، ورەبەرز، ڕاست و درووست و لەخواترس بین. ئەرکی بە ئەنجام گەیاندنی کارە گەورە، پیرۆز و نەمرەکان کەوتبووە سەشانی ئێمە."۱۸۸

لیۆد جۆرج بە پێداگری کردنی ویلسۆن هاتە سەر ئەو بڕوایە کە کۆبوونەوەی گەلان دەبێ یەکەمین ئەرکی کۆڕی ئاشتی بێت، نەک وەک حەزێکی سەرەڕۆیی بۆ دڵخۆشکردنی ئەمەرەکیەکان. ئەو، بەگشتی، لیبڕال بوو، ڕێبەری پارتێک بوو کە مێژوویەکی پڕ لە شانازی دژایەتی کردن لە گەڵ جەنگی هەبوو. ئەو سیاسەتمەدارێکی تەواو عەیار بوو، لە گەڵ ئەوەش خەڵکی بەریتانیای باش دەناسی. لە شەوی کریسمەسی ساڵی ۱۹۱۸، بە هاوکارەکانی ڕاگەیاند کە" ئەوان زۆر لەوە دەترسن کە هەل و مەرجەکە بە بارێکدا بگۆڕێ و بۆ جارێکی تر کارەساتێکی لەو چەشنەی لێ بکەوێتەوە." گەڕانەوە لە کۆڕی ئاشتی بەبێ نەتەوەی گەلان کارەساتێکی گەورە دەبێ. بەڵام ئەو هەرگیز دانی خێری بە کۆمەڵەی گەلاندا نەهێنا، ڕەنگە بەهۆی ئەوەوە بووبێت کە ئەو قەت بە خەیاڵیدا نەدەهات ئەو کۆمەڵەیە کاریگەری هەبێت. ئەو زۆر بەدەگمەن لە وتارەکانیدا ئاماژەی بەو کۆمەڵەیە دەکرد و کاتێکە سەرۆک وەزیر بوو قەت نەدەچوە سەردانی ناوەندەکانی ئەوێ.۱۸۹

لە فەرەنسە، ئەو شوێنەی کە بیرەوەریەکانی دەستدرێژی ڕابردووی ئەڵمان و دڵەڕاوکێ سەبارەت بە داهاتوو بەشێوەیەکی تاڵ و ناخۆش هەر زیندوو مابوونەوە، سەبارەت بە هاریکاری نێونەتەوەیی بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕ هەست بە ڕەشبینیەکی سەیر دەکرا. سەرەڕای ئەمەش هێشتا هەست بەوە دەکرا کە لەناو لیبراڵەکان و چەپڕەوەکان بەتایبەت، مەیلی بەخشینی دەرفەتێک بە کۆمەڵەی گەلان بۆ هەوڵێکی دووبارە لە ئارادایە. کلیمینجوو وای بەباش زانیبوو کە یەکەم جار سەبارەت بە ئاشتی ئەڵمان دانووستان بکات، بەڵام دڵنیا بوو لەوەیکە ئاماژە بەوە ناکرێت کە فەرەنسە کۆمەڵەی گەلانی گەمارۆ دابوو. ئەو بۆخۆی دوودڵ مابۆوە، نەک، وەک هەندێک جار ئەوترێت، دوژمنایەتی هەبێت. وەک هەمیشە بە زمانی دادەهات "ئەمن کۆمەڵەی گەلانم خۆش دەوێت، بەڵام ئیمانم پێی نیە."١٩٠

ڕای گشتی پشتگری گشتی لە کۆمەڵەی گەلانی دەستەبەرکرد، بەڵام سەبارەت بە شێوازی ئەم پشتگریە هیچ ڕێنوێنیەک ڕانەگەیەنرا. ئایا ئەم پشتگریە لە لایەن هێزی ئاسایشەوە دەبێ یان لەلایەن قەشەکانەوە؟ لە هاندەری توند و تیژی کەڵک وەردەگرێ یان ئەخلاقی؟ فەرەنسیەکان، لەبەر هۆکارگەلی دیار و ئاشکرا، بۆ مەبەستی بەرگری کردن بەشێوەیەکی توند و تیژانە لە هێرشبەران، پشتیان بەست بە کۆمەڵەی گەلانەوە. پارێزەران، بەتایبەت لە وڵاتانی ئینگلیزی زمان، بڕیاری خۆیان لەسەر بڕوا بە یاسا و تریبۆنەکانی نێونەتەوەیی ساخ کردەوە. ئاشتیخوازان بۆ توندوتیژی نێونەتەوەیی مەڵهەمێکی تریان پێشک دەهات: چەکداماڵینی گشتی و بەڵێنی ستاندن لە هەمووی ئەندامانی کۆمەڵەی گەلان بۆ ئەوەی خۆیان لە شەڕ ببوێرن. و کۆمەڵەی گەلان دەیەویست چی لێدەربێت؟ دەوڵەتێکی زلهێز؟ شوێنی کۆبوونەوەی سەرانی دەوڵەت؟ هەرکات کە هەست بە ئاڵۆزیەک کرا کۆڕێک ببەسرێت؟ هەرشێوەکی بگرتایەتە بەر، بە ئەندامێتی، یاسا و سکرتاریەت پێویستی دەبوو.

پیاوێک کە کۆمەڵەی گەلانی خستبوە ناو جەرگەی پرۆگرامی ئاشتی هاوپەیمانیەوە لە ماوەی شەڕدا زۆر سەیر بێدەنگەی لەم وردەکاریانە کردبوو. ویلسۆن تەنیا لەسەر باوەڕە گشتیەکان دوا، هەڵبەت ئەوانەی کە بزوێنەر و ئیلهامبەخش بوون. کۆمەڵەکەی ئەو بەرەوی دەبوو، چون باوەڕی ڕێکخراوی مرۆڤایەتی نوێنەرایەتی دەکرد. ئەو لە چاردە خاڵەکەیدا ئاماژەی بەوە کردبوو کە ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە سەربەخۆیی و سنوورەکانی یەکتر گەرەنتی دەکەن. بۆ پاراستنی ئەمانە لەوانەیە لە توندوتیژی کەڵک وەرگرێت، بەڵام شیمانە دەکرێ کە پێویست بەوە نەکات. شەڕ سەلماندبووی کە خەڵکی ئاسایی بۆ ڕێکخراوەیەکی لەو چەشنە بەئاواتەوە بوون؛ ئەوە هەر ئەو شتە بوو کە ئەوان خەباتیان بۆ کردبوو. ئەو لە خانەی ئۆپێرای پایتەخت لە نیۆیۆرک درووست پێش کۆتایی هاتنی شەڕ بە جەماوەرێکی زۆری ڕاگەیاندبوو کە " ڕاوێژی خەڵکی ئاسایی

سادەتر، ڕاستتر و یەکگرتووترە لە خەڵکی شارەزا و دنیادیدە، کە لە گەڵ دەسەڵات مامەڵە دەکەن و بەدوای قازانجی زیاترەوەن."١٩١

ویلسۆن واهەستی دەکرد کە لەکاتێکدا کە شەڕ هێشتا هەر درێژەی هەیە چوونەناو وردەکاریەکانەوە شتێکی هەڵەیە. ئەمە تەنیا دەبێتە هۆی دابڕانی هاوپەیمانان و لەوانەیە ئەو هەستە لەناو وڵاتانی دوژمن درووست بکات کە کۆمەڵەی گەلان بەشێوەیەک بەرەنگاری ئەوان بۆتەوە. بەڕای ئەو ئەوە بۆچوونێکی زۆر ژیرێژانە بوو، گلایەک هەستیان بە پێویستبوونی دەکرد، لەسەر پێی خۆی گەشە دەکا و دەبێ بە ڕوەکێکی ساخ و سەلیم. تەنانەت لە پاریسیش، کاتێکە ڕەشنووسی پەیمانی کۆمەڵەی گەلان خەریک بوو ئامادە دەبوو، ئەو خۆی لە زۆر وردەکاری دەپاراست. لە مەئموریەتەکەی کۆمەڵەی گەلاندا بە هاوکارەکانی ڕاگەیاند کە "برادەرینە من گومانم لەوەدا نیە کە بەرەی داهاتوو لە پیاوانێکی وەکوو ئێوە و من خاوەن بیرو هزر پێک دێت، و من هەست دەکەم کە ئێمە دەبێ متمانەمان بە کۆمەڵەی گەلان هەبێت تا کاروبارەکانی خۆی بەڕێوە بەرێت."١٩٢

بۆچوونی بێ مەبەستی ویلسۆن تەنانەت لایەنگرانی خۆیشی وەخەبەر هێنایەوە. بەختەوەرانە چەندین پلانی وردداڕێژراو خەریک بوون دەخرانە بواری جێبەجێکردنەوە. لەو کاتەوەی کە شەڕ هەڵگیرسابوو، سەبارەت بە شێوازگەلی داکووژاندنی ئاڵۆزیەکەوت و وێژێکی زۆری ورووژاندبوو. لە وڵاتەیەکگرتووەکان، ڕێکخراوەی کۆمەڵەی بەرەو پێشبردنی ئاشتی دیموکراتەکان و کۆماریەکانی پێکەوە یەک خستبوو. لە بەریتانیا، کۆمەڵەی کۆمەڵگای گەلان، چینێکی ماماناوەندی خاوەن ڕێز، ئەندامێتی لیبراڵی بەلای خۆیدا ڕادەکێشا. لەپێناو بیروباوەڕی چەپڕەوانەی خۆیاندا، فابیانەکان پشتگریان لە توێژینەوەیەکی بەربڵاوی بابەتەکە کرد لەلایەن لیئۆنارد وۆڵفەوە. لە سەرەتای ساڵی ١٩١٨دا، حکوومەتەکانی بەریتانیا و فەرەنسە بڕیاریان هێنا سەرئەوەی کە باشتر وایە هەوڵێک بدەن چون، سووپاس بۆ ویلسۆن کۆمەڵەی گەلان ئێستا ببوو بە ئامانجی ئاشکرای شەڕی هاوپەیمانی. لە فەرەنسە کۆمیسیۆنێک بە فەرماندەیی سیاسەتمەدارێکی بەرجەستەی لیبراڵ بەناوی لیئۆن بۆرژوازی پلانێکی پوختی بۆ ڕێکخراوەیەکی نێونەتەوەیی بە سوپای خۆیەوە دارشتبوو. لە بەریتانیا لێژنەیەکی تایبەت بە فەرماندەیی پارێزەرێکی هەڵکەوتە بەناوی، سێر وۆڵتێر فیلیمۆر، کۆمەڵێک وردەپێشنیاریان کۆکردەوە کە زۆریەک لە بیروبۆچوونەکانی پێش شەڕی سەبارەت بە بەزۆر ناوبژیکردنی ئاڵۆزیەکان لەخۆ گرتبوو. بە وریایەوە ڕێبازەکەی گرتبوە بەر، هەم بەرەنگاری بیروبۆچوونە خەیاڵیەکانی فیدراڵیەتی جیهانی دەبۆوە و هەم بەرەنگاری پێشنیاری پراگماتیک بەو مانایە کە کۆمەڵەی گەلان دەبێ تەنیا درێژەی هاوپەیمانی سەردەمی شەڕ بێت. کاتێکە حکوومەتی بەریتانی کۆپلەیەک لە گوزارشەکەی فیلیمۆری بۆ ئەو نارد،

ویلسۆن بەبێ وازی وتی کە هیچ دڵی پێی خۆش نیە و ئەو خۆی بە پلانەکەی خۆیەوە خەریک دەکات، کە لە کاتی خۆیدا پەردەی لەسەر لادەبا و دەیخاتە ڕوو. ئەو ڕێگەی دا بە بەریتانیەکان کە بزانن یاسا سەرەکیەکانی ئەو دوو دانەن: "کۆمەڵەی گەلان دەبێ بێتە دی و ئەمە دەبێ هەقیقەتێک بێت، نەک کۆمەڵەیەکی کاغەزی." لە هیچ شوێنێکی تر بە قەد واشنگتۆن بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە کۆتایی هاتنی شەڕ ڕانەگەیەنرا.١٩٣

لەم کاتەدا بوو کە یەکێک لە پیاوە نوورانیەکانی ئیمپراتۆری بەریتانی هەوڵی ڕەشنووسینی پیلانێکی دا. کەڵەگەت، باریکەڵە، چاوانی شین، ژەنەڕال ژان سمووتس، وەزیری دەرەوەی ئەفریقای باشوور، لە یەکەم نیگادا پیاوێکی بەشکۆ و بەسام نەدەهاتە بەرچاو. (لە لەندەن، ئەمینداری بۆردێن وایزانیبوو کە ئەو هاتبوو بۆ چاککردنەوەی لامپی ئەلەکتریکی و پێی وتبوو کە جارێ لە دەرەوە مەحتەلی بێت.) ئەو خاوەنی هەندێک تایبەتمەندی بوو کە دەچوونە دڵی ویلسۆنەوە، چون ئەو تایبەتمەندیانە زۆر لە هینی ویلسۆن دەچوون. خولیایەکی زۆر بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لە گەڵ پرسە گرنگەکان، بیروباوەڕی قورسی ئاینیی و ئاکاری و خۆزگەخواستنی هێنانەدی جیهانێکی باشتر. هەردوو پیاوەکە لە بنەماڵیەکی قورس و دڵخۆش و لە کۆمەڵگایەکی بچووک گەورە ببوون، ویلسۆن لە باشووری ئەمریکا و سمووتس لە کۆمەڵی وەرزێری نیشتەجێکراوی بۆئێری کەیپ. هەرکیان بیرەوەری خۆشیان لە خزمەتکارانی ڕەشپێستی خۆشحاڵ هەبوو (هەرچەند هەرکیان گومانیان لەوە بوو کە تازە ڕەشپێستەکان وەک سپی پێستەکان ڕەچاو بکرێن.) و بیرەوەری ناخۆش لە شەڕ، ویلسۆن شەڕی ناوخۆ و سمووتس شەڕی بۆئێرەکان دژ بە بەریتانیەکان. هەرکیان لە ڕواڵەتدا هێواش و لەسەرەخۆ بوون، بەڵام لە ناخەوە ئارام و قەراریان نەبوو. هەرکیان هەتابڵێی خۆبەچاکزان و بەرزی خواز بوون. هەرکیان بۆ دیتنی عەیبی ئەم و ئەو دوو چاویان لێدەبوو بە چوار چاو بەڵام لەبەرانبەر عەیبی خۆیاندا چاویان کوێر بوو.١٩٤

ئەو وەکوو زۆریەک لە لاوانی ڕۆشنبیری ناوچەبندەستەکان وەبەر خوێندنیان نا و چوە زانکۆ و دواتر بەرەو ئینگلتێرە وەڕێ کەوت. لە کامبریج بە بەردەوامی و پشوودرێژی خەباتی دەکرد و چەندین خەڵاتی پێگەیشت کە دوەمین دانەیان لە یاسادا بوو. لە لەندەن، کاتێکە بۆ پارێزەری خۆی ئامادە دەکرد، ئەوەندەی زانرابێت، قەت سەردانی شانۆگەری یان کۆنسێرت یان گەلەری هونەری نەدەکرد. لە کاتە چۆڵەکانیدا ئەو هۆنراوەی دەخوێندەوە: شالەی، شێکسپیڕ، و لە هەموویان زیاتر واڵت وایتمەن کە لە جوانپەرستی سرووشتدا وەکوو ئەو وابوو. ئەگەر ویلسۆن دەیتوانی هەستی گوێگرانی خۆی بە پەخشانی سادە بجووڵێنی، ئەگەر لیۆد جۆرج دەیتوانی بە وتارە ڕەنگینەکانی ئەوان بزوێنێت، سمووتس، لە هەمووی ئاشتیکەرەوەکانی تر دەنگ خۆشتر، دەیتوانی گۆرانیان بۆ بڵێت.١٩٥

سمووتس له باسه گرنگه‌کانی شه‌ڕدا ڕاوێژکاری باش بوو؛ ئاسایی بوو که له‌بابه‌ت ئاشتیه‌وه سه‌رنج و تێبینی به که‌ڵکی هه‌بێت. سمووتس به حه‌ز و خولیایه‌کی زۆره‌وه له ده‌رکه‌وتنی ویلسۆن له ئاستێکی جیهانیدا پێشوازی کردبوو. ئه‌و به پۆلێک ڕۆژنامه‌نووسی ئه‌مه‌ریکی ڕاگه‌یاندبوو که "ڕه‌وشت به‌رزی ئه‌م ئایدیالیزمه و بیرۆکه‌ی جیهانێکی باشتر بوو که له ساته ناخۆش و دژواره‌کانی ئه‌م شه‌ڕه‌دا وره‌ی به ئێمه ده‌به‌خشی." جیهان هه‌پروون به هه‌پروون ببوو به‌ڵام ئێستا ئیتر له به‌رده‌می خۆیدا هه‌لێکی باشی ده‌دی که ڕه‌خسیوه. ئامۆژگاریه‌کانی ئه‌و یه‌ک به‌دوای یه‌ک ده‌هاتنه ده‌رێ و سه‌رریژیان کردبوو." خه‌بات و تێکۆشان له‌پێناو نۆژه‌نکردنه‌وه‌ی جیهان، داڕشتنی گه‌ڵاڵه‌ی سه‌رله‌نوێ دامه‌زراندنه‌وه‌ی ئازادی و دادپه‌روه‌ری له ئاستی جیهانیدا. بووژاندنه‌وه‌ی نیه‌تی باش و خێر له‌ناو چین و توێژه‌کان و نه‌ته‌وه‌کاندا که بنه‌مای سه‌ره‌کیه بۆ هه‌ر سیسته‌مێکی درێژخایه‌نی جیهانی، هه‌ر هه‌موویان ئه‌و ئه‌رکانه‌ن که له‌سه‌ر شانی ئێمه‌ن." ئه‌و له جیهانی کولبوو و بێ تاقه‌ت هاواری ده‌کرد" ده‌با ئه‌م ده‌رفه‌ته له کیس نه‌ده‌ین. قه‌ت نه‌ڵێین سه‌رده‌می موعجیزه به‌سه‌ر چوه و ئێمه ناگرێته‌وه." له‌وانه‌یه سه‌رده‌مێک ڕووی تێکردبێتین که ده‌یتوانی بۆ هه‌تاهه‌تایه کۆتایی به شه‌ڕ بێنێت.١٩٦

ئه‌گه‌ر سمووتس نه‌یکرده هه‌را و زۆر ئه‌م و ئه‌وی تێنه‌ده‌گه‌یاند هۆکه‌ی ئه‌وه بوو که کۆمه‌ڵه‌ی گه‌لانیش ده‌توانێت به له‌ونێک له خزمه‌تی ئیمپراتۆری به‌ریتانی دا ببێت و به‌که‌ڵکی بێت. له دیسامبه‌ری ساڵی ١٩١٨دا ئه‌و یه‌کێک له توێژینه‌وه سه‌رسووڕهێنه‌ره‌کانی خۆی له بابه‌ت جیهانه‌وه بۆ هاوکارانی به‌ریتانی خۆی ئاماده کرد. به ڕۆیشتنی زلهێزی ئوتریش-مه‌جارستان، مانه‌وه‌ی ڕوسیا له‌ناو حه‌چه‌لدا و تێکشکانی ئه‌ڵمان، ته‌نیا سێ هێزی سه‌ره‌کی له جیهاندا مابوونه‌وه: ئیمپراتۆری به‌ریتانیا، ولاته‌یه‌کگرتوه‌کان و فه‌ڕه‌نسه. فه‌ڕه‌نسه‌یه‌کان جێی باوه‌ڕ نه‌بوون. ئه‌وان له ئه‌فریقا و له ڕۆژهه‌ڵاتی ناڤین ڕکابه‌رانی به‌ریتانیه‌کان بوون. (فه‌ڕه‌نسه‌یه‌کان تۆڵه‌یان له سمووتس ستاندبۆوه، به‌تایبه‌ت کاتێکه نه‌یزانیبوو که هه‌ندێک له وتاره نهێنیه‌کانی خۆی له دانیشتنێک له پاریس جێ هێشتوه.) سمووتس ئاماژه‌ی به‌وه ده‌کرد که دۆستایه‌تی کردن و هاریکاری کردنی له گه‌ڵ ولاته‌یه‌کگرتوه‌کان لای به‌ریتانیه‌کان زۆر گرنگ و مانادراه. "زمان، به‌رژه‌وه‌ندی، ئاواتی هاوچه‌شن و هاوشێوه" ئه‌و خاڵانه بوون که ئه‌وانی پێکه‌وه گرێ ده‌دا. باشترین شێوه بۆ تێگه‌یاندنی ئه‌مه‌ریکیه‌کان له‌مه‌ڕ پشتگری کردن له کۆمه‌ڵه‌ی گه‌لان بوو. هه‌موان ده‌یانزانی که گرنگترین کاری ویلسۆن پێڕاگه‌یشتن به کۆمه‌ڵه‌ی گه‌لان بوو؛ ئه‌گه‌ر ئه‌و پشتگری به‌ریتانیه‌کانی بۆ لای خۆی ڕاکێشایه، زۆر له‌وه‌دچوو له‌سه‌ر باسه چه‌توون و دژواره‌کانی وه‌کوو پیداگری کردنی ئه‌و له‌سه‌ر ئازادکردنی ده‌ریاکان نه‌ڕۆیشتایه.١٩٧

سمووتس خۆی لە دەسک نا تاکوو ئەرکێک بەجێ بێنێ کە ئەو وەک ساخکردنەوەی "بیروباوەڕە نادیار و شارەوەکانی" ویلسۆن ناوی دەبرد. هەر خێرا و گورج و گۆڵ بابەتێکی نووسی کە ناوی نا "پێشنیارێکی کردەوەیی". کۆڕێکی گشتی لە هەموو ئەندام نەتەوەکان، شۆڕایەکی بەڕێوەبەری بچووکتر، سکرتاریەتێکی هەتاهەتایی، هەنگاونان لەپێناو داکووژاندنی شەڕوشۆڕەکانی نێونەتەوەیی، ماندێت بۆ ئەو خەڵکانەی کە هێشتا ئامادەیی ئەوەیان نیە حکوومەتداری خۆیان بکەن: بەشێکی زۆر لەو ناوەڕۆک و بابەتانەی کە دواتر چووە ناو پەیمانی کۆمەڵەی گەلانەوە لە ڕەشنووسەکەی ئەودا هەبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەش زۆر شتی تری تێدا بەدی دەکرا: ترس و دڵەڕاوکێکانی شەڕی تازە، ئورووپایەک کە هەپروون بە هەپروون ببوو، خەڵکی ئاسایی کە چاوەڕوانی دوارۆژێکی باشتر بوون، و دەرفەتێکی باش کە بۆ ناوبژیکەران ڕەخسا بوو. "بنەماکان کەوتوونەتە لەرەلەر و ئەو قورسی و توندوتۆڵیەی جارانیان نەماوە. هێرش کراوەتە سەر ڕەشماڵان و کاروانی مرۆڤایەتی بۆ کەرەتێکی تر خۆی بۆ شەڕێکی تر ساز و ئامادە دەکات." سمووتس بە شانازیەوە لە نامەیەکدا بۆ هاوڕێیەکی خۆی نووسیبووی کە: " وتارەکەی من لە بازنەکانی سەرەوەدا شوێنەوارێکی باشی داناوە. دەبیستمەوە کە لە کابینێت مینیتس سەرۆک وەزیر وەک "یەکێک لە بەهێزترین وتارەکانی وڵات کە تا ئەو کات خوێندبیەتەوە" ناوی لێبرد. خێرا وەکوو گۆڤارێک بڵاو کرایەوە.١٩٨

پسپۆڕێکی یاسایی ئەمەریکی سەبارەت بەو گۆڤارە وتبووی کە "زۆر جوان داڕێژراوە" بەڵام لە هەندێک شوێندا لێ تێگەیشتنی هەروا ئاسان نیە. بۆ وێنە سمووتس بە ئانقەست لەسەر ماندێتەکانی تایبەت بە کۆلۆنیەکانی پێشووی ئەڵمانیا لە ئەفریقا نەڕۆیشتوە. (ئەمە لەڕووی ئانقەستەوە بوو؛ ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەیکە وڵاتەکەی ئەو دەبێ خۆی بە باشووری ڕۆژئاوای ئەفریقای ئەڵمانەوە هەڵواسێت.) ویلسۆن، کە لیۆد جۆرج کۆپلەیەکی پێدا بوو، خۆشی لێی هات، نەک تەنیا لەبەرهۆی ئەوە کە سمووتس پێداگری لەوە دەکرد کە پێویستە پێکهێنانی کۆمەڵەی گەلان یەکەمین کاری کۆڕی ئاشتی بێت. ویلسۆن لە گەڕانەوەیدا بۆ پاریس دوا سەفەرەکەی بۆ ئورووپا، بۆ مەبەستی بەئەنجام گەیاندنی ئەرکێکە لەمێژ بوو یەکی خستبۆوە، واتە خستنە سەرکاغەزی بیروباوەڕەکانی خۆی، کەوتە خۆ. ئەنجامی ئەم کارە، کە لە ١٩ی ژانویەدا پیشانی بەریتانیەکانی دا، بەشێکی زۆر لە بیروباوەڕەکانی سمووتسی خواستبۆوە. ئەو هەر گوێشی نەدایە، سمووتس بە هاوڕێیەکی وتبوو: " کاتێکە هەست بەوە دەکەی کە نیەت و ئیرادەی تۆ لە گەڵ نیەت و ئیرادەی گەورە و پڕ خێر و بەرەکەت یەکدەگرێتەوە، بەو مانایە کە ئەوەی تۆ بە ناتەواوی هەوڵی ئەنجام دانیت داوە خوا ئاقیبەت بە خێری دەکا من لام وایە مرۆڤ لەو کاتەدا هەست بە خۆشیەکی تایبەت دەکا." ویلسۆن پێی وتبوو "تۆ کوڕی چاکی".١٩٩

لەگەڵ ئەوەش ویلسۆن ئەلاقەیەکی تایبەتی بە ڕۆبێرت سیسیلەوە هەبوو، پسپۆڕێکی تری بەریتانی لە کۆمەڵەی گەلاندا. سێسیل مرۆڤێکی باریکەڵە، مات و لەناوخۆدا بوو، کاتێکە خەڵکی چاویان پێی دەکەوت، وەیان دەزانی ووشکە سۆفیەکی خانەقانشینە. زۆر بەکەمی زەردەی دەگرت، و کلیمینجوو گوتەنی، کاتێکە پێدەکەنی دەتکوت "ئەژدیهای چینیە." ئەو لە بیروباوەڕدا ئانگلیکانیەکی لەخواترس بوو، لە ڕاهێناندا پارێزەر بوو، لە کاروپیشەدا سیاسەتمەدار بوو و بەرەچەڵەک دەرەبەگێکی ئینگلیزی بوو. بنەماڵەکەی ئەو، واتە سیسیلیەکان، هەر لە سەدەی شانزدەهەم بەم لاوە خزمەتگوزاربوون و لە خزمەتی وڵات دابوون. بالفۆر ئامۆزای بوو و باوکی لۆرد سالیسبێری گەورە بوو، سەرۆک وەزیری کۆنەپارێز لە دەیەکانی ۱۸۸۰ و ۱۸۹۰. ڕۆبێرتی لاو چاوی کەوت بە دیزرائێلی و گلادستۆن، سەردانی ویندسۆر کاسێلی کرد و لە بۆنەی تاج لەسەرنانی شازادەی پڕاشا بانگێشت کرا. شێوەی بارهێنان و بەخێوبوونی ئەو، وەک مرۆڤێکی خاوەنمافی تایبەت و سادە و ساکار، لە ئەودا هەستێکی بەهێزی ڕاست و ناڕاست و بەهەمان شێوە هەستێکی بەهێزی خزمەتگوزاری گشتی درووست کردبوو. کاتێکە شەڕ هەلگیرسا، ئەو پەنجا ساڵ تەمەنی بوو، نەیدەتوانی شەڕ بکات، بۆیە ئەو خۆبەخشانە لە فەرەنسە بۆ خاچی سوور دەستبەکار بوو. لە ساڵی ۱۹۱٦دا ئەو لەگەمارۆدان دژ بە ئەڵمانیا بەرپرس بوو.۲۰۰

لەم قۆناخەدا ئەو هاتبوە سەر ئەم باوەڕە قورسە کە بۆ مەبەستی بەرگری کردن لە شەڕ پێویستە جیهان ڕێکخراوەیەک دامەزرێنێت، و بە حەز و خولیایەکی زۆرەوە باوەشی بۆ ڕاگەیاندنەکانی ویلسۆن گرتبۆوە. یەکەمین ڕووبەڕووبوونەوەی لە گەڵ سەرۆک کۆمار لە دێسامبری ۱۹۱۸دا، دڵساردکەرەوە بوو. لە ئاهەنگێکی گەورەی پێشوازی کردندا هەردوو کەسایەتی توانیان تەنیا هەندێک سەرنج و تێبینی پێکەوە ئاڵ و گۆڕ بکەن. لە ئاکامدا لە ۱۹ی ژانویەدا لە پاریس، وت و ویژێکی باشیان بەڕێوە برد. بەڕای سیسیل بەشێکی زۆر لە بۆچوونەکانی ویلسۆن سەبارەت بە کۆڕی ئاشتی لە بەریتانیەکانەوە وەرگیرابوون. سیسیل لە یادداشتنامەکەیدا نووسیبووی کە ویلسۆن بۆخۆی "نەختێک هەژارکوژە، و پێویستە توند و قایم لەبەرانبەریدا بوەستین هەرچەند دەبێ لەوپەڕی ڕێز و ئەدەب و حورمەت دابێت- بەو ئاسانیە ناتوانین لەگەڵی ڕابێین." ویلسۆن کردیە سەر دەیڤید هانتێر میلێر تاکوو چاوی بە سیسیل بکەوێت و ڕەشنووسێکی هاوبەشی لەگەڵ پڕ بکاتەوە، کە هێمایەکە لە هاریکاری ڕوولەگەشەی نێوان ئەمەریکیەکان و بەریتانیەکان.۲۰۱

لە ۲۵ی ژانویەدا، ئەو کاتەی کە کۆڕی ئاشتی لەسەر کۆبوونەوەی گەلان کۆمیسیۆنێکی دامەزراند، دیوەکە ڕەنگ و بۆی هەست و سۆزێکی پاک و بێ خەوشی بە خۆیەوە گرتبوو. کەش و هەواکە بەرەو تووشی و ناخۆشی ڕۆیی کاتێکە نوێنەرانی نەتەوە بچووکەکان، کە پێشتر لەبابەت ڕۆڵێکە

لە پاریس پێیان درابوو ئارام و قەراریان نەبوو، سەبارەت بە کۆمسیۆنێک کە تەنیا لە نوێنەرانی پێنج وڵاتی گەورە، هەریەکەو دوان،- ئیمپراتۆری بەریتانیا، فەرەنسە، ئیتالیا، ژاپۆن و وڵاتەیەکگرتوەکان، پێهاتبوو هەر پرتەوبۆڵەیان دەهات. سەرۆک وەزیری بلژیکیش وتی کە ئەوانیش بەش بە حاڵی خۆیان قوربانیان داوە. کلیمینجوو لە سەرۆکایەتیدا هیچ کام لەمانەی بەخۆوە نەدیبوو. پێنج وڵاتی گەورە نرخی کورسیەکانی خۆیان لە کۆڕی ئاشتیدا بە ملوێنان کوژرا و بریندار کرێبوو. قودرەتە بچووکەکان هەر ئەوەندە کە بانگێشت کرابوون دەبوو خۆیان بە بەختەوەر بزانیایە. وەک زێدەمافێک ئەو رێگەیان پێدەدرێت کە بۆ کۆمیسیۆنی کۆمەڵەی گەلان پێنج نوێنەر ناونووس کەن. کرێوەی شۆڕش لاچوو و نەما، بەڵام ڕق و تووڕەیی هەر مایەوە. کاتێکە بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان پەردەیان لە سەر پلانەکەی خۆیان بۆ کۆمەڵەی گەلان هاوڕێ لەگەڵ شۆڕایەکی بەڕێوەبەری پێنج لایەنە لابرد، قودرەتە بچووکەکان کردیانە قرم و هەرا کە ئەوان مافی دەنگدان بۆ چوار ئەندامی زیاتریان پێ بەخشراوە.٢٠٢

کاتێکە ویلسۆن باسی نووسینی پەیمانی کۆمەڵەی گەلانی لە ماوەی دوو هەفتەدا دەکرد سیسیل لای وابوو کە شێتە، بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت کارەکە زۆر بە خێرایی چووە پێشێ، بەشێکی هۆی ئەم کارە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەدی کە بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان پێشتر پێکەوە ڕێکەوتبوون. لە سێی فەوریەدا یەکەمین دانیشتن بەڕێوە چوو، و لە ١٤ی فەوریەدا ڕەشنووسێکی تەواو ئامادەکرا. نۆزدە ئەندامی کۆمیسیۆنەکە، لە دیوەکانی هاوس لە گریلۆن، ڕۆژانە چاویان بە یەک دەکەوت و بە دەوری مێزێکی گەورەدا کە بە پارچەیەکی سوور داپۆشرابوو کۆ دەبوونەوە. لە پشت ئەوانەوە وەرگێڕەکانیان دانیشتبوون کە بە ئەسپایی بە گوێی ئەواندا چپەیان دەکرد. بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان لە پەنای یەکتر دادەنیشتن و بێ پسانەوە لەگەڵ یەک ڕاوێژیان دەکرد. فەرەنسیەکان لەرێگای ئیتالیەکانەوە لەوان جیا دەکرانەوە. پۆرتەغالیەکان و بلژیکیەکان کۆتایان نەدەهات؛ ژاپۆنیەکان زۆر کەم قسەیان دەکرد. ویلسۆن لە پۆستی سەرۆکایەتیدا زۆر چوست و چالاک بوو و قەرەی وتار و باسوخواستی ورددایێژراو نەدەکەوت و کۆمەڵەی گەلانی بە ڕێیەک دادەبرد کە بۆخۆی دەیەویست. سیسیل لە نووسینەکانی خۆیدا ئاماژەی کردبوو کە" خەریکە دەگەمە ئەم ئامانجە کە من ئەوم خۆش ناوێت. خۆشم نازانم بۆ وا لێی پڕم و چی منی وا پڕ کردۆتەوە: هەندێک سەختی و دژواری، هاوڕێ لەگەڵ خۆبەزلزانی و شوێنەوار دانان." هاوس، نوێنەرەکەی تری ئەمەریکی، هەموو ساتێک لەبن دەستی ویلسۆن دابوو، هەرچەند زۆ کەم قسەی دەکرد. دوور لە چاون لە پشتەوە هەمیشە سەرقاڵ بوو: "من لەپێشدا هەوڵ ئەدەم بزانم لە کوێ هەست بە ئاڵۆزی و مەترسی دەکرێ و بەرلەوەی کێشەکە زیاتر پەرە بستێنی هێوری کەمەوە."٢٠٣

نە لیۆد جۆرج نە کلیمینجوو خۆیان لە قەرەی کۆمیسیۆن نەدەدا. باکێر لای وابوو کە ئەمە بەڵگەیەکی چەسپاوترە، لەو بەڵگانەی کە پێویست بوون، بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کە ئوروپایەکان کۆمەڵەی گەلان بە هەند ناگرن. ئەو بە خراپی باسی دەکردن و ئەیوت کە ئەوان[ئەوروپییەکان] لەوە خۆشحاڵ بوون کە دەیاندیت ویلسۆن سەرقاڵە و ئەمانیش دەسکەوتەکانی جەنگ بە شێوازی ئاسایی خۆیان لەناو یەکدا دابەش دەکەن. بەڵام ویلسۆن بێ پسانەوە لە دانیشتنەکانی شۆڕای عالیدا بەشداری دەکرد و لە هەمووی بڕیارە سەرەکیەکانی ئەو شۆڕایەدا دەستی هەبوو. لیۆد جۆرج، هەروەک لە هەمووی دەورانی سیاسی خۆیدا کردبووی بە پیشە، پیاوانێکی هەڵدەبژارد کە باوەڕی پێیان هەبوو- لەم بوارەدا بۆ وێنە سمووتس و سیسیل- بەرپرسایەتی تەواوی پێدەدان و بەگشتی ئەرکەکەی بۆ ئەوان بەجێ دەهێشت. کلیمینجوو دوو پسپۆڕی سەری دیاری دەکرد، کە وەک یەک لەگەڵیان خراپ هەڵس وکەوتی کردبوو، پرۆفۆسۆر فیردیناند لارنادی، سەرۆکی کۆلیژی یاسا لە زانکۆی پاریس، و لیۆن بۆرژوازی.٢٠٤

پیاوێکی هەڵکەوتە لەبواری زانست و داهێناندا، بۆرژوازی لە یاسادا پسپۆڕ و شارەزا بوو، قوتابی سانسکریت بوو و شارەزای مۆسیقا، لەگەڵ هەمووی ئەمانەش پەیکەرتاش و کاریکاتۆریستێکی کارامە بوو. وەک لیبراڵێک کە چووبوە ناو دنیای سیاسەتەوە، ئەو بەخێرایی هەتا ترۆپکی سیاسەت هەڵگەڕابوو: وەزیری ناوخۆ، وەزیری پەروەردە، وەزیری داد، وەزیری دەرەوە، سەرۆک وەزیر. حەز و خولیابوونی ئەو بە دەستووری نێونەتەوەیی دەگەڕاوە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژی بەر لە شەڕ؛ ئەو بە نوێنەرایەتی فەرەنسە لە کۆڕەکانی ئاشتی هەیگدا بەشداری کردبوو، کە بەبێ سەرکەوتن زۆر لەپێناو دانانی سنوور بۆ جەنگ هەوڵ و تەقەلایان دا. کاتێکە ویلسۆن ئاوات و هیواکانی سەبارەت بە کۆمەڵەی گەلان دەرخست، بۆرژوازی لەخۆشیان فرمێسکی هەڵدەوەراند. بەڵام بەداخەوە لە ساڵی ١٩١٩دا پیری و شەکەتی دەوریان دا. سۆمای چاوەکانی لە دەست دابوو و بە دەست سەرماوە ئازارێکی زۆری دەچەشت.٢٠٥

سەرەڕای کەمئەندام بوونی و چەشتنی ئازارێکی زۆر ئەو هەر کاری دەکرد. زۆریەک لە مەقاماتی فەرەنسەیی کۆمەڵەی گەلانیان وەک درێژەدەری هاوپەیمانی سەردەمی جەنگ سەیر دەکرد، کەچی لەگەڵ ئەڵمانیا بە شەڕیان دەدا. کلیمینجوو بە ئاشکرا بۆرژوازی بە گێل و گەوج دەزانی. کاتێکە هاوس دەپرسێ ئەی باشە بۆ بۆرژوازی کراوە بە سەرۆک وەزیر لە وڵامدا وتبووی کە "کاتێکە کابینەم هەڵوەشاندەوە، کەرەسەم لێبڕا، ئەوانیش بۆرژوازیان هێنایە کایەوە." بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان بە وتارە دوور و درێژەکانی ئەو بە فەرەنسەیەکی شیرین کە هەرجار نەجارێ دەیکردنە خەو گاڵتەیان دەکرد و پێدەکەنین. ویلسۆن زۆری ڕق لێبوو، چون بیستبویەوە کە کلیمینجوو ئامۆژگاری کردبوو کە تادەکرێ هەوڵەکان وەدرەنگ بخات. لەوانەیە ئەمە ڕاست بوویێت. بۆرژوازی

بەبێ ڕاوێژکردن لەگەڵ کلیمینجوو، کە بەتەما بوو لە سەر مەرجەکانی ئاشتی ئەڵمان ویلسۆن بخاتە تەنگەژەوە و مافی زیادی لێ بستێنێت، هیچی نەدەکرد. ئەو بە بۆرژوازی و لارنۆدەی وتبوو کە "دەبا خۆتان تووشی شکست بێن. هیچ قەیناکا. گەڕانە دواوەی ئێوە لە داواکردنی گەرەنتی زیاتر بۆ سەر چۆمی ڕاین یارمەتی من دەدات." بۆرژوازی دنیای لەبەرچاوان تاڵ بوو و دەستی لە کار کێشایەوە. بە پۆینکارێی گێڕابۆوە کە " هەر ئەوەندەی ماوە پێم بڵێ خۆت بهاوێژە ناو قۆرتەکانەوە با بکوژرێیت، و ئەویش بۆ خۆی لە شوێنیتر خەریکی شەڕکردن بێت."٢٠٦

لە دانیشتنەکانی کۆمیسیۆنی کۆمەڵەی گەلاندا، نوێنەرانی فەڕەنسەیی بەرەنگاری هەم بەریتانیەکان و هەم ئەمەریکیەکان ببوونەوە تا بە کۆمەڵەی گەلان ووره ببەخشن، ئەو شتەی کە ویلسۆن کەرتێکیان داوای کردبوو. بۆرژوازی داوای ئەوەی دەکرد کە کۆمەڵەی گەلان دەبێ وەک سیستەمێکی دادپەروەری لە هەر وڵاتێکی دیموکراتیکی مۆدێرندا خەبات بکات، و دەسەڵاتێکی ئەوتۆی هەبێت تا لە هەرشوێنێک کە هەستی کرد لە پرۆسەی ئاشتیدا قۆرت یان لەمپەرێک هاتۆتە سەرڕێ خۆی تێهەڵقوتێنێ و بە زەختی زۆر دەستوور سەرلەنوێ دامەزرێنێتەوە. بەواتایەکیتر ئەگەر هاتو ئەندامانی کۆمەڵەکە ناخۆشی و ئاڵۆزیان کەوتە بەینەوە، ڕاستەوخۆ تەسلیم بە لێژنەی ناوبژیکەری زۆرەملێ بکرێن. ئەگەر هاتو دوڵەت بەرەنگاری پەسەندکردنی بڕیاری کۆمەڵەی گەلان بۆوە، ئەوا هەنگاوی دواتر گەمارۆی ئابووری، و تەنانەت میلیتاریش دەبێت. ئەو پشتگری لە چەکداماڵینێکی چڕوپڕ کرد بە پشتگیریکردنی لێژنەیەک لە کۆمەڵەی گەلان کە دەسەڵاتی پشکنینی تەواوی پێدرابوو و هێزێکی نێونەتەوەیشی لەگەڵ بوو کە لە ئەندامانی کۆمەڵەی گەلان پێکهاتبوون.٢٠٧ بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان کەوتبوونە گومانەوە و واهەستیان دەکرد کە پێشنیارگەلی لەوچەشنە فێڵێکی تری فەڕەنسەیەکانە بۆ مەبەستی دامەزراندنی هاوپەیمانیەکی چەکدارانەی هەتاهەتایی دژ بە ئەڵمانیا. بە هەرشێوەیەک بوایە، لەباری سیاسیەوە ئەگەری هاتنە ئارای ئەم پێشنیارانە ئەستەم بوو. کۆنگرێسی وڵاتەیەکگرتووەکان کە سەبارەت بە بەشداربوون لە کۆنترۆڵی سیاسەتی دەرەوە لەگەڵ سەرۆک کۆمار کێشەی هەبوو، بەدڵنیایەوە نەیدەهێشت نەتەوەکانیتر بڕیار بدەن لەسەر ئەوەیکە کەی و لەکوێ وڵاتەیەکگرتووەکان شەڕ دەکا. کۆنەپارێزان لە حکوومەتی لیۆد جۆرجدا، هێزی سووپا و هێزی دەریایی و بەشێکی زۆر لە ئۆفیسی دەرەوە وایان لا مەسڵەحەت بوو کە بە شێوازەکانی کۆن و هەمیشەسەرکەوتووی پاراستنی بەریتانیا ئیمانیان هەبێت. چێرچیل وتبووی کە کۆمەڵەی گەلان قەت ناتوانێ" جێی ناوگانی کەشتیرانی بەریتانیا بگرێتەوە." هێنری ویلسۆن، سەرۆکی ستافی گشتی ئیمپراتۆری وتبووی کە ئەمانە هەر هەموویان "قۆڕیات" و "شتی هەڵیت و پڵیتن". دەکرا لە سەراسەری قارەکەدا یان دەشتە دوورەکان کە بەریتانیا هیچ قازانجێکی تیاندا بەدی نەدەکرد لە شەڕ و قرمیان وەردایە.٢٠٨

ناوچەبندەستەکانی بەریتانیا لەژێر کاریگەری چەندین نوێنەری دەسەڵاتداری پاریسدا بوو، ئەوە شتێک بوو کە لیۆد جۆرج و هاوکارەکانی نەیاندەتوانی هەروا بەو ئاسانیە لە پەنایەوە ڕەد بن و گوێی بۆ شل نەکەن. بێلی هاچێز، کە وەک بەچکە شەیتانێک کە بە ئاوری شەیتانی و شۆفاری هەڵگیرسابوو، وەک پێشبینی کرابوو ئاوری غەزەبی لێدەباری. ئەو فەڕەنسەیەکانی خۆش دەویست و ڕقی لە ئەمەریکیەکان بوو، نەک تەنیا بەهۆی ئەوەوە کە لە کاتی سەردانێکیدا بۆ واشنگتۆن ویلسۆن ئەوی بێ محەل کردبوو. ئەو دەیکوت کە کۆمەڵەی گەلان بووکەشووشەی دەستی ویلسۆنە: "ئەو تا دەست بە سەریدانەگرێت قەت خۆشی ناچێتە دڵیەوە."بۆ ئوسترلیایەکان قسەی دەکرد و دەیکوت کە ئەو حەز ناکا ببینێت کە ئیمپراتۆری بەریتانی خێشکەخێشک بکەوێتە دوای ئەرابەی سەرکەوتنی ویلسۆن. بۆردێن ڕەخنەی وشیارانەی خۆی لەکاتی گونجاودا ئاراستە کرد. ئەو پشتگری لە بیرۆکەی گەلان دەکرد، بەڵام بەدوای کۆمەڵەیەکەوە بوو کە ئوروپایی زۆری لەخۆ نەگرتبێ. خەوی ڕاستەقینەی ئەو دۆستایەتی هەتاهەتایی بوو لەنێوان وڵاتەیەکگرتووەکان و ئیمپراتۆری بەریتانیا. کەنەدایەکان کە تازە کۆنترۆڵی سیاسەتی دەرەوەی خۆیان لەژێر دەسەڵاتی بەریتانیا هێنابوە دەرەوە، نەیاندەویست هەڵگەڕێنەوە و تەسلیمی زلهێزێکی تری بکەن.٢٠٩

هەوڵ و تەقەلاکانی فەرەنسەیەکان بۆ بەخشینی وورەی زیاتر بە کۆمەڵەی گەلان هاوپەیمانانی قەڵس کرد و هەرەشەیان کردە سەر بەڕێوەچوونی کۆڕی ئاشتی. کاتێکە کۆمیسیۆنی ناو کۆمەڵەی گەلان بەپەلە یەکەمین ڕەشنووسی کۆتایی پێکهێنا بەرلەوەی ویلسۆن بۆ کورتەسەردانێک بگەڕێتەوە بۆ وڵاتەیەکگرتووەکان ئەوەندەی دانیشتنی نهێنی بەڕێوە برد تا دزەیان کرد و خەڵکیان وەئاگا هێنا. هەواڵنێرێکی ئەسەوشیەت پرێسی ئەمەریکی نووسیبووی کە "هەورێکی تاڵ چواردەوری ئاسمانی داگرتوە و خەریکە کەش و هەوایەکی ناخۆش و بێ باوەڕی باڵ بە سەر وڵاتدا دەکێشێ، و چارەنووسی کۆمەڵەی گەلان هێشتا هەر بە لێڵی و نادیاری ماوەتەوە." هێرشکردنی چاپەمەنی فەرەنسە بۆ سەر ویلسۆن یان وت و ویژێک کە کلیمینجوو تێیدا هۆشداری ئەوەی دابوو کە فەرەنسە لەوانەیە بەناوی خەیاڵاتی فکری شاراوە و نادیار ببێتە قوربانی هیچ کاریگەریەکیان نەبوو. لە هەموو قوژبنێک دەنگۆی ئەوە هەبوو کە ویلسۆن دەیەوێ لە تۆڵەدا کۆڕی ئاشتی بەتێکڕایی لە پاریس بگوێزێتەوە یان دەستبەرداری هەوڵ و تەقەلای دامەزراندنی کۆمەڵەیەک بە یەکەوە بێت.

لە یازدەی فەوریەدا، سێ ڕۆژ بەرلەوەی ویلسۆن وەڕێ کەوێت، کۆمیسیۆنی کۆمەڵەی گەلان زۆربەی کاتەکانی ڕۆژ پێکەوە کۆ دەبوونەوە. فەڕەنسەیەکان بۆ دامەزراندنی سوپایەکی تایبەت بە کۆمەڵەی گەلان هەندێک گۆڕانکاریان لە یاساکاندا کرد. ویلسۆن وتی کە ئەوانە "دژی دەستووری

بنەڕەتین و ناکرێ بێنە ئاراوە." کۆبوونەوەکە بەبێ هیچ بڕیارێک دواخرا و پەکی خرایەوە. ڕۆژی دواتر، دەیوید هانتێر میلێر لە یادداشتنامەکەی خۆیدا یادداشتی کردبوو کە سیسیل بە ساردیەوە باسی تەنگەژەکەی ئەوانی بۆ فەرەنسەیەکان گێڕابۆوە: "بە بۆچوونی ئەو ئەوان بە ئەمەریکایان دەوت ، و تاڕادەیەکی کەمتر بە بەریتانیای گەورە، کە چون زیاتریان پێ پێشنیار نەکراوە ئەوان خەڵاتێک کە لەبەردەست دابوو وەریان نەدەگرت، و ئەو زۆر ڕاشکاوانە هۆشداری پێدان کە پێشنیارێکی ئالێترناتیڤ کە ئێمە پێشکەشمان کردوە، ئەگەر هاتو کۆمەڵەی گەلان سەرنەکەوت، هاوپەیمانی نێوان ولاتەیەکگرتوەکان و بەریتانیای گەورەیە." مانگێک دواتر بۆرژوازی لە هەوڵی بێ کەڵکی خۆی پاشگەز ببۆوە کاتێک کە پێشنیاری ئەوەی کردبوو کە کۆمەڵەی گەلان دەبێ ستافی گشتی تایبەت بە خۆی هەبێت. ئەو بە ئارامی وتبووی کە ئەمە دەتوانێ بە شۆڕای کۆمەڵەی گەلان زانیاری ببەخشێت و هەندێک پلان و گەڵاڵەی بۆ دابڕێژێت تابەڵکوو کاتێکە شەڕ داسەپی بە سەریدا دەست و پێی خۆی گوم نەکات و نەخەزڵێت. ویلسۆن ئەوەندەی پێناخۆش بوو کە سوورهەڵگەڕا. ئەو بە گرەیسۆن، پزشکەکەی خۆی، وتبوو کە " زۆر سەیرە نوێنەرانی فەرەنسەیی لەگەڵیان هەلناکرێت، هەر دەڵێن و دەڵێن و دەڵێن و بە خولیا و حەزێکی زۆرەوە بێ پسانەوە ئەو خالانە دوویات دەکەنەوە کە پێشتر بەتێروتەسەلی تاوتوێ کراون و ئیتر شتێکی وایان نەماوە کە باسیان لەسەر بکرێت." بۆرژوازیش لە ولامدا ڕق و نەفرەتی خۆی پێگەیاندەوە. ئەو بە پۆینکارەی وتبوو کە ویلسۆن هەم ملهوڕە و هەمیش هەتابڵێی جیی گومان و دوور لە بڕوا و متمانەیە. " ئەو هەمووشتێکی بە مەبەستی پێداهەڵکوتن و تاریفات لە خۆی بەئەنجام دەگەیاند."٢١.

* * * *

لە ١٣ی فەوریەدا یەکەمین ڕەشنووس ئامادە کرا. ویلسۆن هەم بە ڕێکەوتی موژدەهێنەر هەم بە ئەو ڕاستیە کە وتارەکان ژمارەی بیست و شەش، واتە دوو دانە سێزدەیان بە سەرەوە بوو خۆشحاڵ بوو. چوارچێوە سەرەکیەکانی کۆمەڵەی گەلان لە جێی خۆیان دابوون: ئەنجومەنێکی گشتی بۆ هەمووی ئەندامان، سکرتاریەت و شۆڕای بەڕێوەبەر ئەگەر هاتو پێنج هێزی گەورە زۆرینەیەکی بەرچاویان بە دەست هێنا (نەتوانینی ولایەیەکگرتوەکان لەوەی کە ببێ بە ئەندامی کۆمەڵەی گەلان ئەو بەندەی پووچەڵ کردبۆوە). شتێک بەناوی سوپای کۆمەڵەی گەلان و ناوبژیکردنی زۆرەملێ یان چەکداماڵین نەدەهاتە ئاراوە. بە واتایەکیتر، هەمووی ئەندامانی کۆمەڵەی گەلان بە یەکتر بەڵێنیان دابوو کە لە سەربەخۆیی یەکتر و سنوورەکانی ناوچەبندەستەکانی یەکتر ڕێز بگرن. چون زلهێزەکان ترسی ئەوەیان لە دڵ دابوو کە نەکا هێزە

بچووکەکان یەک بگرن و دەنگێکی زیاتر لە ئەمان بە دەست بێنن، هەمیشە تەدارەکی ئەوەیان دیبوو کە زۆربەی بڕیارەکانی کۆمەڵەی گەلان پێویستە لە سەر یەک بڕیار ساخ کرێنەوە. ئەمە دواتر وەک ناکارامەیی کۆمەڵەی گەلان ناوی لێبرا.٢١١

ئەڵمانیا ڕێگەی پێنەدرا خێرا لەو کاتەدا پێوەندیان پێوە بگرێت. فەڕەنسەیەکان لە سەر ئەمە پێداگریان دەکرد، و هاوپەیمانەکانیان ئامادەیی ئەوەیان هەبوو کە مل بۆ ئەو کارە کەچ کەن. لە ڕاستیدا، ویلسۆن لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە لەگەڵ ئەڵمانیا پێویستە وەک تاوانبارێک هەلس و کەوت بکرێت کە پێویستی بە چاکبوونەوە و گەڕانەوە بۆ سەر باری پێشوو هەیە. " جیهان مافی ئەخلاقی خۆی بوو کە ئەڵمان بێ چەک بکات و تەسلیمی بەرەیەکی خاوەن بیر و هزری بکات." و بەم پێیە دەبوایە ئەڵمانیا لە پێگەیەکی دەگمەن و سەیری ڕێکەوتن لەگەڵ گرێبەستی ڤێرسایلێس بۆ یانەیەک هەڵوێستی بگرتایە کە نەیدەتوانی پێوەندی پێوە بگرێت. هەم بەریتانیەکان و هەم ئەمەریکیەکان ئەم کارەیان بە ناڕەوا دەزانی.٢١٢

لەگەڵ ئەوەشدا، ڕێکەوتنەکە ڕەنگدانەوەی چەندین هۆکاریتر بوو کە لای جیهانیخوازان و مرۆڤدۆستان خۆشەویست بوون. ڕێکەوتنەکە دەیکردە سەر کۆمەڵەی گەلان کە ئەم ئەرکانە بەجێ بێنێت: دامەزراندنی دادگایەکی دادپەروەری جیهانی هەتاهەتایی، تەدارەکاتی دژ بە تجارەتی چەک و تەقەمەنی و کۆیلەتی و پشتگری کردن لە خاچی سووری نێونەتەوەیی. لەگەڵ ئەمانەش ڕێکەوتنامەکە ڕێکخراوەیەکی جیهانی کاری دامەزراندبوو کە لەپێناو ستانداردەکانی جیهانی لەسەر هەل و مەرجی کارکردن خەباتی دەکرد.

ئەمە شتێک بوو کە چاکسازانی چینی-مامناوەندی، پارتەکان و یەکیەتیەکانی باڵی چەپ لەمێژبوو خوازیاری بوون. (ڕۆژانە هەشت-کاتژمێر دروشمی سەرەکی ئەوان بوو کە هاواریان بۆ دەکرد.) زۆرترین دەسکەوتەکانی ئەوان بەرلەوەی شەڕ دەست پێبکات کەمکردنەوەی کاتی ئیش کردنی شەوانە بوو بۆ ژنان و قەدەغەکردنی مادەی فۆسفۆڕ بوو لە شقارتەدرووستکردندا. شۆڕشی بۆلشویکی توانیبووی لە شێوەتێڕوانینی چینەکانی دەسەڵاتداری ڕۆژئاوادا گۆڕانێکی سەرسووڕهێنەر بێنێتە ئاراوە. کرێکاران، تەنانەت لەناو دیموکراسیە سەرکەوتووەکانیشدا، ئارام و قەراریان لێهەڵگیرابوو. کێ دەیزانی ڕێگای گەیشتن بە شۆڕشیان چەندە دوور و درێژە؟ نوێنەرانی کاری ئەورووپی هەڕەشەی بەڕێوەبردنی کۆڕێکیان هاوکات لەگەڵ کۆڕی ئاشتیدا لە پاریس دەکرد، هاوڕێ لەگەڵ نوێنەرانێک هەم لە نەتەوەکانی شکستخواردوو و هەم سەرکەوتوو. هاوکات کە هاوپەیمانان بڕیاریان هێنا سەر ئەوەی کە ئەمە بەرەو بێرنە لە سوئێد وەرچەرخێنن، هەم کلیمینجوو و هەمیش لیۆد جۆرج هەرکیان واهەستیان دەکرد کە دانانی بەندێک لە سەر

کار لە ڕێکەوتنی کۆمەڵەی گەلاندا دەتوانێ لە دامرکاندن و هێورکردنەوەی کرێکاران کاریگەری هەبێت. هەرجۆرێک بێت، باوەڕە سیاسیەکانی خودی خۆیان، وەکوو هینی ویلسۆن، ئەوانی کرد بە هاوڕای بزووتنەوەی کرێکاری، لانی کەم کاتێکە لە سازبوونی شۆڕش بەرگری دەکرد.٢١٣

ئەو ڕۆژەی کە کمسیۆنی کۆمەڵەی گەلان دامەزرا، سەبارەت بە کاری ئینتێرناسیۆنال یەکی تریش دامەزرا. یەکەم جار بە سەرۆکایەتی سەرکردەی بچووک و دڕندەی فیدرالیەتی کاری ئەمەریکی، سامۆئێل گۆمپێرس، و دواتر ڕێبەری کاری بەریتانی جۆرج بارنێرس، وردەوردە کار و چالاکیەکانی خۆی دەستپێکرد. بارنێس لای لیۆد جۆرج گلەیی کردبوو کە ئاشتیکەرەکان "بایەخێکی کەم"یان بە تێکۆشان و چالاکی کۆمیسیۆنەکەی ئەو داوە.٢١٤

لەوانەیە ئەمە شتێکی باش بووبێت: ڕێکخراوەی جیهانی کار بەبێ هیچ هەراوهۆریایەک هاتە دنیاوە و بەرلە کۆتایی هاتنی ساڵی ١٩١٩ یەکەمین کۆبوونەوەی خۆی بەڕێوەبرد. بەپێچەوانەی کۆمەڵەی گەلان، کە ئەم بەوەوە لکێنرابوو، ئەو هەر لە سەرەتاوە نوێنەرانی ئەلمانی لەخۆگرتبوو. و بەپێچەوانەی کۆمەڵەی گەلان ئەو تا دەمکاتی ئێستا دەوامی هێناوە.

لە ١٤ی فەوریەدا، ویلسۆن ڕەشنووسی ڕێکەوتنی کۆمەڵەی گەلانی پێشکەش بە کۆبوونەوەیەکی گشتی لە کۆڕی ئاشتیدا کرد. ئەندامانی کمسیۆنەکە دۆکیۆمێنتێکیان درووست کرد، کە لەهەمان کاتدا هەم کردارخواز و هەم وەحیخواز بوو، هەر هەموویان شانازیان پێوەدەکرد. لە کۆتایی قسەکانیدا وتی " ئەم شەڕە زۆر شتی ئاڵۆز و ناخۆشی لێکەوتۆتەوە بەڵام، هەندێک شتی جوان و سەرنجڕاکێشیشی لێکەوتۆتەوە."ئەو شەوە ئەو پاریسی بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ وڵاتەیەکگرتوەکان، دڵنیابوو لەوەیکە مەبەستی سەرەکی لە بەشداریکردن لە کۆڕەکەی بەجێهێناوە.٢١٥

هەرچەند، ڕێکەوتنەکە بە تەواوی کۆتایی نەهاتبوو. کەچی فەرەنسەیەکان هەر بە تەمای ئەوە بوون لەبابەت هێزی میلیتاریەوە شتێک بۆ خۆیان بچەسپێنن؛ ژاپۆنیەکان هەڕەشەیان دەکرد کە ئەوان خوازیاری پێشکەشکردنی بەندێکی گێچەڵاوی بوون لە سەر یەکسانی ڕەگەزی؛ و لەسەر ناوچەبندەستەکانی پێشووی ئەڵمانیا و ئیمپراتۆری عوسمانی هێشتا وەک پێویست ماندێت و دەسەڵات دەبەخشرا. لەگەڵ ئەمانەش مەسەلەی فیلاوی دۆکترینی مۆررۆ لە ئارادا بوو کە لە سیاسەتی وڵاتەیەکگرتوەکان سەبارەت بە ئەمریکای باشوور و باکوور و ناوەڕاست پشتگری دەکرد. بڵێی کۆمەڵەی گەلان ئەو هێزەی هەبێت، هەروەک زۆربەی نەیارانی کۆنەپارێزی ویلسۆن لێی دەترسان، کە ئەو دۆکترین و ڕێبازە پێشێل بکات و لەبەرچاوی نەگرێت؟ ئەگەر وابوایە، ئەوان لەبەرانبەر کۆمەڵەی گەلاندا دەوەستان، کە لەوانەبوو لەلایەن کۆنگرێسەوە ڕەدکرایەتەوە. هەرچەند ویلسۆن پێی خۆش نەبوو

سازش بکات، بەتایبەت لەگەڵ کەسانێک کە ڕقی لێیان بوو، ئەو ڕەزایەتی دا بەوەیکە بگەڕێتەوە بۆ پاریس تا سەبارەت بە مەرجێکی تایبەتی وت و ویژ بکات بەومانایە کە لە ڕێکەوتنامەی کۆمەڵەی گەلاندا هیچ شتێک ڕێباز و دۆکترینی مۆنرۆی پێشێل نەدەکرد.٢١٦

ئەو ئەم کەرەتەیان خۆی تێوەگلاو لەگەڵ بەریتانیەکان لە جۆرە یاریەکی دیپلۆماتیکدا دۆزیبۆوە کە هەموو دەمێک بە چاوی سووکایەتیەوە سەیری کردبوو. هەرچەند سیسیل و سمووتس لەو گێژاوەی کە تێی کەوتبوون خۆیان بە هاوخەم و هاوسۆزی ئەو دەزانی و ئامادەبوون تا پشتگری لێبکەن، لیۆد جۆرج هەستی بەوەکردبوو کە هەلێکی بۆ ڕەخساوە و دەبێ کەڵکی لێوەرگرێت. ئەو لەمێژبوو بە ناکامی لە هەوڵی ئەوەدابوو کە بۆ مەبەستی بەرگری کردن لە ململانێی هێزی دەریایی لەگەڵ ولاتەیەکگرتووەکان پەیمانێک ببەستێت؛ ئەمجارە ئەو ئاماژەی بەوە دەکرد کە لەوانەیە لەبەرانبەر هەر مەرجێک سەبارەت بە دۆکترینی مۆنرۆ بوەستێت. لەگەڵ ژاپۆنیەکانیش هەست بەوە دەکرا کە کێشەیەک هاتۆتە ئاراوە، چون ترسی ئەوەیان لێدەکرا کە لەوانەیە داوای بەفەرمی ناسینی دۆکترینێکی هاوچەشن بۆ ژاپۆن بکەن تا لەگەڵ نەتەوەکانی ڕۆژهەلاتی دوور بجەنگێت. ئەمەش بە نۆبەی خۆی دەبووە هۆی ناڕەحەت کردنی چینیەکان، کە پێشتر بە دەست ئارەزوەکانی ژاپۆنیەکانەوە بە تەنگەوە هاتبوون.٢١٧

لە ١٠ی مانگی ئاڤریلدا، هاوکات لەگەڵ ئەوە کە مەسەلەی هێزی دەریایی بەتێر و تەسەلی تاوتوێ کرابوو و بەریتانیا کێشابویە دواوە، ویلسۆن بەیاننامەیەکی وردداڕێژراوی پێشکەش کرد تابەڵکوو هیچ شتێک لە پەیماننامەی کۆمەڵەی گەلاندا لەسەر ڕەوایی ڕێکەوتنەکانی جیهانی وەکوو دۆکترینی مۆنرۆ کاریگەری دانەنێت، کە لەپێناو پاراستنی ئاشتیدا دامەزرابوون. فەڕەنسەیەکان، کە بە هەموو هێز و توانایانەوە لە پێکهێنانی کۆمەڵەی گەلان شکستیان خواردبوو و بە تەنگەوە هاتبوون، بە لۆجیکێکی تەواوەوە هێرشیان هێنا. تازە لە ڕێکەوتنامەکەدا مەرجێک چەسپابوو کە دەیکوت هەمووی ئەندامان لەوە دڵنیا دەکرێنەوە کە ڕێکەوتنە جیهانیەکانی ئەوان لەگەڵ کۆمەڵەی گەلان و پرەنسیپەکانی یەک دەگرنەوە. ئایا دۆکترینی مۆنرۆ یەکی دەگرتەوە؟ ویلسۆن وتی هەڵبەت کە بەڵێ یەک دەگرێتەوە؛ لەڕاستیدا ئەوە نموونەیەکە بۆ کۆمەڵەی گەلان. بۆرژوازی و لارنۆدێ وتیان کەوایە بۆ دەبێ پێویست بێ ئاماژە بە دۆکترینی مۆنرۆ بکرێت؟ سیسیل هەوڵی دا ویلسۆن لەم قەیرانە ڕزگار بکات: ئاماژەکردن بە دۆکترینی مۆنرۆ لەڕاستیدا ببوو بە جۆرێک شرۆڤەکردن و ڕوونکردنەوەی مەسەلەکە. ویلسۆن بێدەنگ دانیشتبوو، هەر لێوی خۆی دەکرۆشت. نزیکەو نیوەی شەو دەنگی هەڵبڕی و ولاتەیەکگرتووەکانی وەک پاسەوانی ئازادی دژ بە زۆرەملێ لە دەوروبەری خۆیدا و لە کاتی شەڕی گەورەدا ناوبرد و هەتا توانی پێیدا هەڵکوت. " کەی ڕەوایە لەو ولاتە دیاریەکی بچووک کە لە چەند وشەیەک پێکهاتوە وەرنەگرن کە تەنیا نیشاندەری ئەم ڕاستیەیە کە سیاسەتی ئەو ولاتە لە سەدەی ڕابردوودا تەرخانی پرەنسیپەکانی ئازادی و سەربەخۆیی کراون کە لەم

بەڵگەنامەدا وەک دەستوورێکی هەتاهەتایی بۆ هەموو جیهانیان جێیان بۆ کراوەتەوە؟" ئەمەریکایەکانی ئەوێ کە گوێیان بۆ شل کردبوو بەجارێک هەژان بەڵام، فەڕەنسەیەکان هەر متەقیان لێوەنەهات.٢١٨

لە ٢٨ی ئاڤریلدا، لەو دەمەی کە بەفربارینێکی ناوەخت سەرتاسەری پاریسی داگرت، دانیشتنێکی گشتی کۆڕەکە ڕێکەوتنامەکەی پەسەند کرد. نوێنەرێک لە پاناماوە وتارێکی دووردرێژ و زانایانەی سەبارەت بە ئاشتی ڕاگەیاند، کە بە ئەرەستووەوە دەستی پێکرد و بە ودرەو ویلسۆن کۆتایی پێهات. نوێنەری هۆندووراس سەبارەت بە بەندی دۆکترینی مۆنرۆ بە زمانی ئیسپانیایی دوا بەڵام، چون کەم کەس لێی تێگەیی، ڕەخنەکانی لەبەرچاو نەگیران. کلیمینجوو، وەک سەرۆکی دانیشتنەکە، هاوڕێ لەگەڵ نوێنەری ئاسایی خۆی بابەتەکانیان ورووژاند و هەرتاوناتاوێک بە تەقەیەکی توندی چەکوشەکەی خۆی و "ئادۆپتەیەکی" کورتکراوە نەیدەهێشت تەنانەت نوێنەرەکانی خۆشی لە سەر باسی بەیاننامە تووشەکان بڕۆن.٢١٩

ویلسۆن ناهەقی نەبوو کە زۆر خۆشحاڵ بوو. ئەو ڕێکەوتنامەکەی بەرەو ڕێبازێک بردبوو کە خۆی خوازیاری بوو؛ ئەو داواکاریەکانی بۆ هێزی میلیتاری بەربەست کردبوو؛ و ئەو مەرجێکی لەناو دۆکترینی مۆنرۆ سەپاندبوو کە تێپەڕینی لە ولاتەیەکگرتوەکان مسۆگر دەکرد. ئەو دڵنیا بوو لەوەی کە کۆمەڵەی گەلان لەماوەی چەند ساڵی داهاتوودا گەشە دەستێنێت و گۆڕانکاری بەسەردا دێت. لە کاتی خۆیدا، باوەش بۆ وڵاتانی دوژمن دەگرێتەوە و یارمەتیان دەدا تا لەسەر ڕێبازەکانی ئاشتی و دیموکراسیدا بڕۆن. هەروەک بە خێزانەکەی خۆی ڕاگەیاندبوو، لە هەر شوێنێک کە هەوڵەکانی نانەوەی ئاشتی پێویستیان بە چاکسازی و گۆڕانکاری بوو " یەکبەدوای یەکی هەڵەکان بۆ مەبەستی ساخکردنەوە و چاککردنەوە دەنێردرێنە کۆمەڵەی گەلان، و کۆمەڵەی گەلان وەک فەرمانگەیەکی هەتاهەتایی کە وڵاتانی بچووک و گەورە دەتوانن سەردانی بکەن بە خەبات و تێکۆشانی خۆی درێژە دەدا.".٢٢٠ لە کۆڕی ئاشتیدا ئەوەی کە پێوەندی بە کۆمەڵەی گەلانەوە بوو، ویلسۆن ڕێگەی بە هاتنە ئارای هەر بابەتێکی ترەوە دەدا. ئەو لەبەرانبەر ئەو بڕیارانەدا نەدەوەستا کە، بەپێی بیروباوەڕەکانی خۆی، هەڵە بوون: بەخشینی تیرۆلی ئەڵمانی زمان بە ئیتالیا، یان بردنی بەملوێن خەڵکی ئەڵمانی بۆ ژێردەسەڵاتی حکوومەتی پۆڵەندی یان چکسلەواکی. زۆر سەیر بوو مەرجگەلی لەو چەشنە کە کەڕەتێکیان درووست ببوون زۆر دەوامیان هەبوو، لانی کەم تا دەستپێکی شەڕی دواتر. بە هەرشێوەیەک بوایە کۆمەڵەی گەلان لە تێکۆشان و چالاکیەکانی خۆیدا لەگەڵ گیروگرفت ڕووبەڕوو دەبۆوە، چون یاساکانی ئەو کۆمەڵەیە لەسەر یەکدەنگی لە هەموو بڕیارەکاندا پێداگری دەکرد.

* * * *

# ٨
# ماندێتەکان

تەنانەت بەرلەوەی کۆمیسیۆنی کۆمەڵەی گەلان دەست بە کارەکانی خۆی بکات، پرسی ماندێتەکان لە شۆڕای عالیدا هاتبووە بەرباس. هیچکام لە هێزە سەرکەوتوەکان هەر بە خەیاڵیشیان دانەدەهات کە دەبێ بۆ ئەڵمانیا ناوچەبندەستەکانی خۆی بگەڕێندرێتەوە، کە بریتی بوون لە چەندین زنجیرە لە دوورگەکانی ئارام و پارچەزەویەکانی ئەفریقا و ویلسۆن ڕوونی کردبۆوە کە ئەو چاوەڕوانی لە کۆمەڵەی گەلان دەکا کە ئەرکی بەڕێوەبردنی ئەو ناوچانە بگرێتە ئەستۆی خۆی. بۆچوونەکەی ویلسۆن لە هەندێک شوێن ڕەنگدانەوەی ناخۆشی لێکەوتەوە. فەڕەنسەیەکان خوازیاری تۆگۆلەند و کامێروون و کۆتای هێنان بە مابەکانی ئەڵمانیا لە مۆراکۆ بوون(پاسەوانی کردنی ئەمیان[مۆراکۆ] تەنیا بۆ فەڕەنسە دابنێن). ئیتالیەکان چاویان بڕیبوە پارچەکانی سۆمالیا و زۆر شوێنی تر. لە ئیمپراتۆری بەریتانیدا، ئەفریقای باشوور خوازیاری ڕۆژئاوای ئەفریقای تایبەت بە ئەڵمان بوو، ئۆستراڵیا خوازیاری گینەی نوێ و هەندێک لە دوورگەکانی دەورووبەری دەکرد، و زیلاندی نوێ داوای سامۆئای ئەڵمانی دەکرد. بەریتانیەکان بە تەمای لکاندنی ئەفریقای ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانی بوون بە ناوچەبندەستەکانی خۆیانەوە تا بۆشای پێوەندی نێوان کۆلۆنیەکانی خۆیان لە باشورەوە بۆ باکوور پێ پڕ کەنەوە. لەگەڵ ئەمانەشدا ئەوان لەگەڵ فەڕەنسەیەکان بۆ مەبەستی دابەشکردنی ئیمپراتۆری عوسمانی مامەلەیەکی نهێنیان کردبوو. ژاپۆنیەکانیش مامەلەی نهێنی تایبەت بە خۆیان هەبوو، لەگەڵ چینیەکان بۆ مەبەستی دەستبەسەرداگرتنی مافەکان و زێدەمافەکانی ئەڵمانی، و لەگەڵ بەریتانیەکان بۆ مەبەستی ڕاگرتنی دوورگەکانی باکووری کەمەرەی زەوی.

دەستووری نوێی جیهانی ویلسۆن بێجگە لە کۆلۆنایزکردن و پێوەلکاندنی هەندێک لەو ناوچانەی جیهان کە هێشتا ئامادەیی دەسەڵاتداریێتی خۆیان نەبوو داوای هەندێک تەدارەک و ڕێکخستنی دەکرد. ماندێتەکان، شێوازێک لە کاری پێسپێردراو چ بەشێوەی ڕاستەوخۆ بەسەرپەرشتی کۆمەڵەی

گەلان یان بەسەرپەرشتی ئەو هێزانەی کە لەلایەن کۆمەڵەی گەلانەوە چاودێری دەکران، وەک ڕێگەچارەیەکی گونجاو پێشنیار کران. درێژەی ماندێتەکان دەبەستراوە بە پێشکەوتنی چاودێرەکانیانەوە. ویلسۆن زۆر سەیر سەری لێشێوابوو و بەراوردەکانی درووست دەرنەدەهات. ئەوەی ڕاستی بێت، ئەفریقا پێویستی بە کۆنترۆڵکردنی دەرەوە دەبوو، بەڵام ئەی چارەنووسی ئەو ناوچانەی کە لە ئیمپراتۆرە شکستخواردووەکان ببوونەوە چیان بەسەر دەهات: ڕۆژهەڵاتی دووری عەرەب، یان ئەرمەنستان، گۆرجستان و کۆمارەکانی تری قەزاقستان؟ لە ناوەندی ئورووپادا خەڵکانێک هەبوون کە لەوەندەچوو بتوانن خۆیان بەڕێوە بەرن. لێرەدا ویلسۆن تەنیا ئەوەی بۆ مابۆوە کە بڵێ ئەو بۆ خەڵکانی ئەورووپی ماندێت پەسەند ناکات و بەڕەوای نازانێت.٢٢١

بیرۆکەی پاراستنی هەژاران بەدەست دەسەڵاتداران شتێکی تازە نەبوو. ئیمپریالیستەکان زۆر بەرێک و پێکی ئەو ئەرک و ڕاسپاردانەی کە بەرلە دەستپێکردنی جەنگی گەورە پێیان سپێردرابوو بە ئەنجام گەیاندبوو. پسپۆڕێکی ناسراوی ئەمەریکی وەک پەرپرسی کاروبارەکانی ئەفریقا وتبووی کە ئەڵمان شتێکی جیاواز و دەگمەن بووە لەوەی کە قەت نەیتوانیوە بەرێک و پێکی ئەرک و وەزیفەی خۆی بەجێ بێنێ." خەڵکی ناوچە هەمیشە و بەشێوەیەکی گشتی و جیهانی وەک ئامرازێک بۆ گەیشتن بە ئامانج سەیر کراون، نەک خۆی لەخۆیدا وەک ئامانجێک، و ئاسایشی گشتی ئەو خەڵکانە لەگەڵ وڵاتی داگیرکراویان بەتەواوەتی لە خزمەت بەرژەوەندیەکانی ئەڵمانیەکانی حازر لەو وڵاتانە و وڵاتی ئەڵمانیای دوورەپەرێز بووە."٢٢٢

بەریتانیەکان، کە لە قسە و باسی لکاندنی ناوچەیەکی ئەڵمانی، یان هەرشوێنێکی تر، بۆ سەر ئیمپراتۆری خۆیان خاڵێکیان بەدی نەدەکرد کە ئەمەریکیەکانی پێ قەڵس کەن، لە بیرۆکەی ماندێتەکان پشتگریان دەکرد. سمووتس زمانپاراویەکەی جارانی خۆی خستە گەڕ. ئەو لە یادداشتەکەی خۆیدا لە سەر کۆمەڵەی گەلان کە زۆر کاری کردە سەر ویلسۆن نووسیبووی کە ئیمپراتۆریە گەورەکان خەریکن دەتوێنەوە و کۆمەڵەی گەلان پێویستە خۆی بگەیەنێت. خەڵکانێک کە بەبۆنەی هەڵوەشانەوەی ڕووسیا، ئوتریش و تورکیە بەجێ ماون زۆربەیان لەباری سیاسیەوە ڕانەهاتوون؛ زۆربەی ئەوانە توانا و لێهاتوویی خودموختاری یان سەربەخۆیان نییە؛ زۆربەی ئەوانە نەدار و هەژارن، و لەبابەت سەربەخۆیی ئابووری و سیاسیەوە پێویستیان بە سەرپەرشتی و چاودێری هەیە." ئەگەر ئوروپاییەکان- بۆ وێنە، فنلاندیەکان، یان پۆڵەندیەکان- توانیان هەر خێرا لەسەر پێی خۆیان ڕاوەستن، لە ڕۆژهەڵاتی ناوین ماوەیەکی زۆرتری دەبرد. کۆلۆنیەکانی پێشووی ئەڵمانیا لە ئەفریقا و ئوقیانووسی ئارام شیمانەی ئەوەیان لێدەکرا کە هەرگیز نەتوانن خۆیان بەڕێوەبەرن. دانیشتوانی ئەو ناوچانە باربێری و ڕەشۆکی بوون" و بەکارهێنانی هەر بیرۆکەیەکی

خودموختاری سیاسی بۆ ئەوان لەمانای ئەوروویپیەکەیدا دوور لە کردەوە بوو و جێبەجێ نەدەکرا." باشترین کار هەرئەوە بوو کە ئیمپراتۆری بەریتانی خۆی ڕاستەوخۆ دەسەڵاتی ئەوانی بگرتایەتە ئەستۆ. ئەو بە هاوکارانی بەریتانی خۆی ڕاگەیاندبوو کە ئەگەر هاتو ئەمەریکیەکان دەنگی نارەزایەتیان بەرز بوایەتەوە، ئەوا بەریتانیا دەیتوانی لەڕووی بەخشەندەیەوە ملی خۆی کەچ بکا و لەژێر چاودێری گشتی و زۆرکەمی کۆمەڵەی گەلاندا بەنۆبەی خۆی داوای کۆنترۆڵ کردن بکات. ئەمەش بەنۆبەی خۆی دەیکردە سەر نەتەوەکانی تر، بەتایبەت فەرەنسە، دێوودرنجی سمووتس، تا بۆ کۆلۆنیاکانی خۆیان هەلومەرجی هاوچەشن قەبووڵ بکەن. سیسیل قازانجێکی کردەوەیی لەوەدا دەدیت: تاجران و وەبەرهێنەرانی بەریتانی لەوانەبوو لە ئاکامدا تەشەنەیان کردایەتە ناو کۆلۆنیەکانی پۆرتەغالی و فەرەنسەیی.٢٢٣

هەر وشەی "ماندێت" خۆی لە خۆیدا مانایەکی دڵخۆشکەر و بەخشندەی هەبوو. ئەوەدەمەی کە لە کۆڕی ئاشتیدا بەکاربرا سەرەتا سەرئالۆزیەکی بەرچاوی خستەوە. هەروەک کەسانی گوماندار بۆی چووبوون، ئایا بۆ ناساندنی زەوتکردنی زەوی و زاری کۆنباو ئەوە[ماندێت] بەشێوەیەک خۆڵ بە چاوداکردندا نەبوو، یان نەخێر لە پێوەندیەکانی نێونەتەوەییدا هەنگاوێکی تازە بوو؟ ئایا کۆمەڵەی گەلان هێزەکانی دەسەلاتداری بۆ مەبەستی بەرێوەبردنی ناوچەپێسپێردراوەکانیان تەنیا دەهێشتنەوە یان بۆ هەتاهەتایە درێژەیان بە دەستێوەردانی خۆیان دەدا؟ کاتێکە بە نوێنەرێکی سەرلێشێواوی چینی وترا کە ناوچەکانی ئەڵمانی پێشوو لە وڵاتەکەی ئەو دەسەلاتدارێکی تازەی بۆ دابین دەکرێ، ئەم پرسیارەی ئاراستە کرد: "ماندێتری کێیە؟"٢٢٤

فەرەنسەیەکان لەبەرانبەر گشت بیرۆکەکەدا هەڵوێستێکی دژبەرانەی پڕ لە دڵەڕاوکێیان گرتەبەر. کلیمینجوو لە پڕدا هەڵیدایە و بە پۆینکارەی وت: " کۆمەڵەی گەلان گەرەنتی ئاشتی دەکات، بەڵێ دەبێ بیکا، بەڵام کۆمەڵەی گەلان خاوەنی کۆلۆنیەکانە، نەوەڵا!" کۆلۆنیەکان هێمایەک بوون لە قودرەت و دەسەڵات. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان هەڵگری شتێک بوون کە فەرەنسە یەکجار زۆر پێویست پێی هەبوو: هێزی مرۆڤایەتی. هەمیشە ژمارەی ئەڵمانیەکان لە فەرەنسەیەکان زیاتر بوە، بەڵام لەبابەت کۆلۆنیەکانی ئاسیا و ئەفریقاوە فەرەنسەیەکان بە ناوی " برایانی دوورەپەرێز و دوورەدەستی ئێمە" بەتەمای گەیشتن بە هاوسەنگیەک بوون.٢٢٥

ئەگەر فەرەنسەیەکان لەژێر چاودێری کۆمەڵەی گەلان ماندێتیان پێ بگەیشتایە، ئایا لەبابەت دابینکردنی سەربازانی خۆماڵی بۆ خەبات و تێکۆشان لە پشت دەریاکانەوە گوشاری قورس نەدەهاتە ئاراوە؟ بەداخەوە هەم ئەمەریکیەکان و هەمیش بەریتانیەکان پێدەچوو بیریان خستبێتە سەر ئەم تەوەرانە. مەرجە پێشنیارکراوەکانی ئەوان بۆ ماندێتەکان دەیکردە سەر هێزەکانی بەرپرس کە چالاکی مرۆڤدۆستانە بکەن،

بۆوێنه، بەربەستکردنی قاچاخی کۆیله، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەبەرانبەر بارهێنانی میلیتاری خەڵکانی ناوچه بۆ مەبەستی هەر ئیشێک جگه له پۆلیس و "پاراستنی ناوچەکه" بەرگریان دەکرد.

کاتێکه پرسی ماندێتەکان له شۆڕای عالیدا هاته گۆڕێ، کلیمینجوو و پیچۆن هێرشێکیان هێنا. بۆ دەبێ فەڕەنسه کات و پاره لەپێناو چاودێریکردنی ماندێتەکانی خۆی دابنێ ئەگەر بۆی نیه لەکاتی خۆیدا بۆ مەبەستی پارێزگاری کردن له ئەوان داوا له فیداکەرەکان بکات؟ گرتنەبەری سیاسەتێکی بێ لایەنه لەلایەن وڵاتەیەکگرتوەکان و بەریتانیا بەگشتی هەڵوێستێکی باش بوو، که لەباری جوگرافیەوە لەبەرانبەر ئەگەری هێرشی ئەڵمان پارێزرابوون، بەڵام فەڕەنسه بەبێ سەربازانی کۆلۆنی خۆی نەیدەتوانی لەبەرانبەر هێرشی ئەڵماندا خۆی بگرێت. لیۆد جۆرج هەوڵی سازشێکی دا. بەندێک که فەڕەنسەیەکانی زۆر نیگەران دەکرد لەڕاستیدا دژ به شتێک خرابوه گەڕ که ئەڵمانیەکان کاتی خۆی عادەتیان بوو بەکاری بێنن، واته سازدانی سوویا گەورەکانی خۆماڵی هیرشکردنه سەر کۆلۆنیەکانی تر. فەڕەنسەیەکان بەتەوواوی دەست و باڵیان ئازاد دەبوو بۆ ئەوە که له خۆیان و له هەرناوچەیەک که له بن باڵیان دابوو پارێزگاری بکەن. کلیمینجوو هاتەوه سەر خۆ و ڕقەکەی نیشتەوە: "ئەگەر ئەم بەنده مانای ئەوەی هەبێ که به ئەگەری هاتنەئارای شەڕێکی گشتی و سەرتاسەری ئەو مافی سازدانی هێز و سوویای هەبێت، ئەو بەوه خۆشحاڵ دەبێت." لیۆد جۆرج زۆر بەخۆشحاڵیەوه بەوه ڕازی بوو. "مادامێکه کلیمینجوو سوویای گەورەی له قولڕەشان ساز نەدا، بەندەکه هەڵوێستی دژبەرانەی دەگرت،" ویکسۆن وتی که ئەو لەگەڵ لێکدانەوەکەی لیۆد جۆرجه. کێشەکه لەوەدا بوو که کەس بەڕوونی نەیدەزانی مانای بەندەکه چییه. ئایا فەڕەنسەیەکان بۆیان هەبوو له سەربازەکانی ماندێتەکانی خۆیان کەڵک وەرگرن، یان نا؟ چەند مانگ دواتر، له مانگی مەیدا، فەڕەنسەیەکان هەوڵیاندا که ڕوونکردنەوەکەی خۆیان پێشکەش بکەن کاتێکه ئەوان له دەستەواژەیەکدا سەبارەت به پاراستنی "وڵاتی زێد" تووشی هەڵه ببوون بۆ بەندی ماندێتەکان له چاپی کۆتایی ڕێکەوتنامەکەی کۆمەڵەی گەلان که خەریک بوو ئامادەی چاپ دەبوو. نوێنەری بەریتانیا له کۆڕی ئاشتیدا، بەناوی هاکەی، که شەوێکیان تا درەنگ وەخت گەڕابوو به دوای گۆڕانکاریەکەدا، باوەڕی به خاترجەمبوونی فەڕەنسەیەکان نەدەکرد بەو مانایه که هێزەکانی تر ئەو گۆڕانکاریەیان پەسەند کردبێت. ئەو بەپەله دەربەڕی، هەڵیکوتا سەر ویلسۆن که هێشتا هەر له جێگاکەیدا بوو و لیۆد جۆرج که خەریک بوو جلەکانی دادەکەند. " هەروەک پێشتریش گومانم هەبوو، ئەوه تەنیا تاقیکردنەوەیەک بوو."ویلسۆنی ڕق هەستاو کردیه سەر کلیمینجوو که ئەو دەستەواژەیه بسڕێتەوە.[٢٢٦]

* * * *

بەریتانیایە لە خۆرازیەکان مانۆڕلێدانی فەرەنسیەکانیان لا ناپەسەند بوو، بەڵام لەگەڵ ئەمەریکیەکان کێشەی تایبەتبەخۆیان هەبوو. یان بەواتایەکی تر، ئەوان لەلایەن ئەفریقای باشوور، ئوسترالیا و زیلاندی تازە، کە بەهۆی ئارەزووەکانی ناوچەگەری خۆیان نەیاندەویست خۆیان بە ماندێتەکانەوە خەریک کەن بەناچاری ڕووبەڕوو ببوونەوە. لیۆد جۆرج بابەتێکی لە مێشکی خۆیدا وروژاندبوو کە دەیزانی لەگەڵ دژایەتی ولاتەیەکگرتوەکان ڕووبەڕوو دەبێتەوە. لە ٢٤ی ژانویەدا، ئەو بە نابەدڵیەوە لە شۆڕای عالیدا باسی ئەوەی کردبوو کە لکاندن مانای بەڕێوەبەرایەتی هەیە. ئەو ئەوەی بۆ ڕێبەرانی دەسەڵاتدار بەجێ هێشتبوو تا بۆخۆی بە وت و ویژەکانی تر ڕابگات.

سمووتس و بۆتا کەیسی ئەفریقای باشووریان بۆ مەبەستی لکاندنی باشوری ڕۆژئاوای ئەفریقای ئەڵمان پێشکەش کردبوو. هەردوو کەسایەتیەکە لە هەڵمەتی کورتخایەنی سەرکەوتوانەی ١٩١٥دا کە بۆتا پلانەکەی داڕشتبوو خەباتیان کردبوو. ئەوان هەرکیان داوای خاوەنداریێتی ناوچەیەکیان دەکرد، بە قەبارەی ئینگلیز و فەرەنسە پێکەوە، کە بەگشتی بێ بایەخ و سووک سەیر دەکرا. (سەرچاوە پڕ پیتەکانی کانزاکان لەو ناوچەیەدا هێشتا بەتەواوەتی نەناسرابوون) قەراخ ئاوەکانی ئاتلانتیک چۆڵ و بەرەهووت بوون و بەشێکی زۆر لە زەویەکانی ئەوێ لەوەڕگەی چاک بوون بۆ مەڕوماڵات. چەند هەزار ئەڵمانیەک، کە زۆریان دەنگۆی ئەوەیان لە سەر بوو کە لە ئەڵمانیا تووشی گەندەڵی و ئابڕووچوون هاتبوون، قەڵای ساختە و درۆزنە، گوندی ڕێک و پێک و ڕازاوە و پەیتەختێکی بچووکی خنجیلانەیان لە ویندهۆێک درووست کردبوو. یەکەمین کۆمیسەری ئیمپەراتۆری ئەڵمانی، ئێرنێست گۆئێرینگ (باوکی هێرمان)، بە زۆرەملێ و ملهوڕی دەسەڵاتداریێتی دەکرد بە سەر بەشێکی زۆر لە دانیشتوانی ئەفریقاییدا.٢٢٧

بەشێکی زۆر لەو زوڵم و زۆرەی کە ئەڵمانیەکان بەسەر خەڵکانی ناوچەکەدا سەپاندیان لەلایەن سمووتس و بۆتاوە پلانی بۆ دادەڕێژرا. سمووتس دەیکوت کە سپی پێستەکانی ئەفریقای باشوور بە پێچەوانە لە ئازار و مەینەتیەکانی خەڵکانی ناوچەکە تێدەگەیشتن؛ لەڕاستیدا، ئەوەی لەدەستیان هاتبوو کردبویان تا شێوەی خودموختاریەکیان پێ ببەخشن. " ئەوان شارستانیەتێکی تایبەت بە سپی پێستەکانیان لە قارەیەکی دوور لە شارستانیەت دا مەزراندبوو و ببوون بە نوێنەرێکی مەزنی کولتووری لە ئەفریقای باشوور." ئێستا دەرفەتێک بۆ خەڵکانی باشووری ڕۆژئاوای ئەفریقا ڕەخسیبوو تا ئەوانیش لەم قازانجانەدا هاوبەش بن. پێشتر لەباری جوگرافیەوە ناوچەکە بە ئەفریقای باشوورەوە لکێنرابوو. شتێکی سەیر و بێ مانا نەبوو کە دوو وڵات لە هەموو بوارێکەوە پێکەوە بلکێنرێن و ببن بە دوان. ویلسۆن بە هاوسۆزیەوە گوێی شل کردبوو. ئەو هەردوو کەسایەتیەکەی خۆش دەویست، بەتایبەت سمووتس، و، لەگەڵ ئەوە کە ئەو نەیدەویست پاشگەز بێتەوە، ئەو ڕوونی کردەوە کە هەست دەکا

ماندێتێکی ئـەفریقای باشـوور زۆر سـەرکەوتوو دەبێـت واتـە دانیشـتوانی باشـووری ڕۆژئـاوای ئـەفریقا ڕۆژێک بێ کە بۆخۆیان ئازادانە بڕیار بدەن کە لەگەڵ ئەفریقای باشوور یەک بگرنەوە.[٢٢٨]

کلیمینجوو، وەک سەرۆکی دانیشتنەکە، دواتر "مرۆڤخۆرەکانی" بانگێشت کرد- ئـەوە شـۆخیەک بوو کە لە نێوان خۆی و هاچێز دابوو- تـا مەسـەلەی ئوسـترالْیا و زیلانـدی تـازە بخاتـە بەرباس. هـاجێز بەڕاشـکاوی ئامـاژەی بـە خەریتەیـەکی هەڵوەشـاوە دەکـرد کـە ئـەو دوورگانـەی نیشـان دەدا کـە ئـەو خوازیاریان بوو-گینەی تازە، دوورگەکانی دەوروبەر وەکوو بیسـمارک ئـارچێپێلاگۆ- بـەکردەوە قـامکی ختسبوە سەر ئوستراليا و داوای پێکەوەلکانێکی یەکجاری دەکرد. ئەو ئاماژەی بە بەرخودان ("چەندە ئاو بۆ شارێک پێویستە دوورگەکانیش بۆ ئوستراليا ئەوەندە.") و یارمـەتی ئوسـتراليا لـە جەنگدا، ٩٠،٠٠٠ قوربانی، ٦٠،٠٠٠ کوژراو و وامی جەنگی بـەبڕی ٣٠٠،٠٠٠£. "ئوستراليا حـەزی نـەدەکرد لـەژێر ئـەم بـارەدا بچەمێتـەوە و هەسـت بـە هێمنايـەتی نـەکا." هەرچەنـد نەيـدەتوانی زۆر ڕاشـکاوانە ئامـاژەی پێبکـات، دوژمنـی داهـاتوو کـە هـاجێز لـە مێشـکی دابـوو ژاپـۆن بـوو. ئوستراليايەکان ئـەو بیانوەیان دێنـاوە کـە خـەڵکانی ناوچـە بـە باوەشـی کـراوە بـەخێرهاتنی ئـەمانیان کردبـوو، بـەڵام کاتێکـە حکوومـەتی ئوستراليا گینـەی تـازەی پشـکنی لێکۆڵینـەوەی لەسـەر ئـەنجام دا بۆیـان دەرکـەوت کـە دانیشـتوانی ناوچەکـە زیـاتر یەکەمایـەتیان دەدا بـە مـەقاماتی ئـەڵمانی، کـە ڕێگـەیان پێدابوون تـا لـە شێوازی سەرلێکردنەوەی دوژمن بۆ خۆشیەوە بەکاری بێنن. هـاجێز لـە وڵامـی پرسيارێکی جەسـوورانە لەلایەن سەرۆک کۆمارەوە وتی هیچ کێشەیەک لە دەستڕاگەیشتن بە مـوژدەدەران نابێت: "زۆر ڕۆژ بە بەرەوە هەن کە شەیتانە داماوەکان موژدەدەری تەواو بۆ خواردن دەست ناخەن."[٢٢٩]

ماسـەی، کـە خەریتەکـەی بـە دەسـت خۆيـەوە ڕادەوەشـاند، وتـارێکی دووردرێـژی بـەناوی بانگەشەکردنی زیلاندی تازە بۆ ساموئا پێشکەش کرد. هێزەکانی زیلاندی تـازە، لـە "دۆخێکی تـووش و نالەباردا"، هەر لە دەستپێکی شەڕەکەوە دەستیان بە سەر دوورگەکاندا ڕاگرتبوو. (لەڕاستیدا گـەورەترین مەترسی لـە هیلاکـی و شـەکەتی سـەرچاوەی دەگـرت ئەوکاتـەی کـە داگیرکـەران لـەپای ئابجۆيـەکی یـەکجار زۆردا دادەنیشـتن.) سـامۆئیەکان دڕ و تـووش نـەبوون بـەڵکوو خـەڵکانێکی زۆر خـاوەن هەسـت و نەست بوون، و ئەوان خوازیاری یاسای زیلاندی تازە بوون. (لەهـەمان کاتـدا، سـامۆئەکان خـەریک بـوون سـکالانامەیەکیان پێشکەشـی بەڕێوەبـەری ناوچـەیی زیلانـدی تـازە دەکـرد کـە خوازيـاری دەسـتووری ئەمەریکی، دەستوور لە لەندەن، دەستوور لە هەر جێگایەک جگە لە زیلاندی تازە.[٢٣٠])

ویلسـۆن، کـە قسـەکانی هـاجێزی بەتايبـەت لـەگوێ خـۆش نـەبوو، بەنابەدڵيـەوە گـوێی شـل کردبـوو. فەرەنسەیەکان بەچێژەوە سەیریان دەکرد. ئەوان خوازیاری ماندێتەکان نەبوون و زۆر گوێیان نەدەدا بە پشێوی

لە ناو ئیمپراتۆری بەریتانیدا. ئەندامێکی شاندی نوێنەرایەتی ئوسترالیایی نووسیبووی کە "هاجێزی هەژار و داماو ئەوەندە بە سووک و چرووکی سەیرکراوە لە تاوان وەک ورچی نەعەملیوی لێهاتووە. هەڵبەت وەک داردەستێک وایە بە دەست فەرەنسیەکانەوە کە خوازیاری کامیروون، تۆگۆلەند و سووریەن."٢٣١

چەند ڕۆژ دواتر وەزیری فەرەنسەیی کۆلۆنیەکان، هێنری سیمۆن، لەگەڵ عالی گشتی بە شێوەی میانڕەوانە قسەی دەکرد. فەرەنسە لە ئەفریقا تەنیا خوازیاری دوو پارچە زەوی بچووک بوو. تۆگۆلەند، کە درێژەی دوورگەیەک بوو لە کۆلۆنی داهۆمەی (بێنین) لە ڕۆژئاوای ئەفریقای تایبەت بە فەرەنسە، و کامیروون، ئەویش هەر لە ڕۆژئاوای ئەفریقا بوو، کە ئەڵمان ویستبووی لە ساڵی ١٩١١ لە فەرەنسەی بستێنێت. (لەگەڵ ئەوەش، فەرەنسە خوازیاری چاودێریەکی تایبەت بوو بەسەر مۆراکۆدا، بەڵام پێویستی بە ئاماژە کردن نەبوو.) سیمۆن گێڕایەوە کە ئەو یەکەمایەتی دەدا بە پێوەلکاندن، چون ئەمە بۆ دانیشتوانی ڕەسەنی ناوچەکە باشتر دەکەوت. ئاواتی سەرەکی فەرەنسە ئەوە بوو کە بتوانێ بە خەباتی پەرەدان بە شارستانیەت لە ئەفریقای کەمەرەیی درێژە بدات. کلیمینجوو، کە بایەخێکی ئەوتۆی بە ملک و مالاتی کۆلۆنی نەدەدا، ئاوی بە سەر ئاوردا کرد و وتی کە ئەو ئامادەیی تەواوی هەیە بۆ ئەوەی سازش بکات.٢٣٢

ویلسۆن هەر لە سەر مەبەستی خۆی سوور بوو و هەرچی تێیدا شل و کوت بوون هیچ کەڵکێکی نەبوو. ئەو بە شۆڕای عالی ڕاگەیاندبوو کە " ئەگەر ڕەوتی پێوەلکان درێژەی هەبێت، کۆمەڵەی گەلان هەر لە سەرەتاوە متمانەی نامێنێت." جیهان چاوەڕوانی زیاتری لە ئەوان دەکرد. نابێ ئەوان کای کۆن بەبا بکەن، و خەڵکی هەژار و قوڕبەسەر لەوەزیاتر دەستەدەستە و پارچەپارچە بکەن. ئەگەر ئاگایان لەخۆیان نەبێت ڕای گشتی بەرەگەیان پێدەگرێت. ئەوان لە ئوورووپایەک کە پێشتر گیرۆدەی شۆڕش و سەرهەڵدان بوە دەبێ چاوەڕێی ئالۆزی و قەیرانی زیاتری لێبکەن. ئەو بە دزیەوە وتبووی کە ناتوانێ "کەل و پەلی دزراو" لەناو خۆیاندا دابەش بکات. ئەگەر پێویست بوایە، و ئەمە هەڕەشەیەکی باش بوو، ئەو سەرجەم مەسەلەکەی دەخستە بەردەم ڕای گشتی. بە واتایەکیتر، ئەو خولیای ئەوە بوو کە لە ماندێتەکان دەرباز بێت. چارەنووسی ئوورووپا --هی ئەڵمان، ئوتریش-مەجارستان، ڕووسیە-- پرسێکی گرنگ بوون.٢٣٣

لەپشت شانۆگەریەکانەوە، ژمارەیەکی بەرچاو لە خەڵک لە هەوڵی ئەوەدابوون کە لە ڕووبەڕووبوونەوەکاندا ئاسانکاری بکەن و هێوریان بکەنەوە. کەنەدایەکان، کە هەمیشە لە ئەنجامەکانی قرەی نێوان بەریتانیا و ولاتەیەکگرتوەکان دەترسان، هەیتا هەیتا دەیانکردە سەر هاجێز و ماسەی کە ئاقڵ بن و سنوورەکانی ژیریێژی نەبەزێنن. هاوس، کە لە نەخۆشیەکەی ڕزگاری ببوو، بە بەریتانیەکانی ڕاگەیاند کە ئیتر دەبێ دەست هەڵگرن. هاوس و سیسیل پێشنیارێکیان تاووتوێ

دەکرد کە هاجیز بە بنەمای مامەڵەیەکی دەزانی. ماندێتەکان بە سێ شێوە دەهاتنە ئاراوە: یەکەم بۆ ئەو نەتەوانەی، وەکوو ئەوانەی ڕۆژهەڵاتی ناوین، کە تاڕادەیەک دەیانتوانی کاروبارەکانی خۆیان بەرن بەڕێوە؛ دووهەم ئەو نەتەوانەی کە دەسەڵاتی زۆرەکی بەڕێوەی دەبردن؛ سێهەم ئەو نەتەوانەی کە بە دەسەڵاتی زۆرەکی نزیک بوون، کە ناوچەکەی وەک بەشێک لە هێنی خۆی بەڕێوە دەبرد، بەسرابۆوە بە تەنیا هەندێ قەدەغەکردنی تایبەت، وەکوو فرۆشتنی مەوادی ئەلکولی و کەرەسەی تەقەمەنی. ماندێتەکانی سێهەم، کە زۆر لەبار کەتبوون باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەفریقا و دوورگەکانی ئوسترالیای دەگرتەوە و زیلاندی تازە داوای دەکردن. هاجیز وتی کرێی ۹۹۹-ساڵە لەباتی خاوەندارێتی هەتاهەتایی. ئەو نەهاتبوو هەروا ئاسان خۆی بە دەستەوە بدا.۲۳٤

لە ۲۹ی ژانویەدا، دانیشتنێک بە بەشداریکردنی شاندی نوێنەرایەتی ئیمپراتۆری بەریتانیا، بە قەولی بۆردێن، "شانۆیەکی خنجیلانەی" پێکهێنابوو. لیۆد جۆرج گەڵاڵەی سێ جۆر ماندێتی ڕشت، کە ئەو لای وابوو ئەمەریکیەکان قەبووڵی دەکەن. هاجیز، کە "وەکوو ڕاسۆ" کەوتبوە شەڕەدەندووکە، لە سەر هەر سەرنج و تێبینیەک خۆی تێهەڵدەقوتاند هەتا لیۆد جۆرج ڕەنگی تێکچوو و تاقەتی نەهێنا و پێی وت کە ئەو بۆ ماوەی سێ ڕۆژ ئەم بابەتەی لەگەڵ ولاتەیەکگرتووەکان تاوتوێ کردووە و ئەو حەز بەوە ناکات لەمەڕ دوورگەکانی سۆلۆمۆن لەگەڵ ئەمەریکیەکان بکەوێتە قڕەوە.۲۳٥

بەداخەوە، بەیانی ڕۆژی دواتر *دەیلی مەیل*، کە چاپکراوەکانی پاریسی لەماوەی کۆڕی ئاشتی بڵاو دەکردەوە، بەسەرهاتێکی تێدا بوو کە بەجوانی دیاربوو لە لایەن هاجیزەوە کاری لە سەر کرابوو. وتارەکە بەریتانیەکانی بە ماستاوچێتی لەبەرانبەر ولاتەیەکگرتووەکاندا تاوانبار دەکرد، و ئەو بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە بەرژەوەندیەکانی ئیمپراتۆری بەریتانی خەریکن دەبنە قوربانی جێبەجێکردنی خەون و خەیاڵە خاوە دوورلە کردەوەکانی ویلسۆن. ئەو بەیانیە شۆڕای عالی "هەراوهوریایەکی سەیر و بەتەواو مانای" بەخۆوە دی. لیۆد جۆرج چاک لە هاجیز تووڕە ببوو، و ویلسۆن، کە هەمیشە لەبەرانبەر ڕەخنەگرتندا هەستیار بوو، دەهری ببوو. ئەو ڕەخنەیەکی توند و تیژی ئاراستەی سازشی پێشنیارکراو کردبوو و ڕایگەیاندبوو کە پرسی ماندێتەکان بەگشتی یەک بخرێتەوە تا کاتێک کە کۆمەڵەی گەلان دادەمرکێ و دادەکوژێت. ئەو لەبەرانبەر سەرۆک وەزیری ئوسترالیادا زۆر بێ ئەدەب و قسەلەڕوو بوو. لیۆد جۆرج، کە تازە لە بەستنی ڕێکەوتن و پەیمان هیوابڕ ببوو وتی" بەڕێز هاجیز دوایەمین کەسێک بوو کە من دەموایە هەڵمبژاردایە تا بەو شێوەیە هەڵس و کەوت بکات." ویلسۆن ڕووی خۆی هەڵمالی و لە هاجیزی پرسی:" دەکرێ لەوە تێبگەم کە ئەگەر گشت جیهانی شارستانی داوا لە ئوسترالیا بکات کە سەبارەت بەم دوورگانە ڕەزایەت بە

ماندێتێک بدا، هێشتا ئوسترالیا ئامادەیی ئەوەی هەیە کە لەبەرانبەر گشت جیهانی شارستانیدا بوەستێت و بەرەنگاری بێتەوە؟" هاجێز، کە ئامێری بیستنی ناو گوێچکەکانی وەرەزی کردبوو هەر چیلکەژەنەی پێدەکرد، و ڕایگەیاند کە ئەو پرسیارەکەی هەر نەشبیستوە. ویلسۆن لەبەرخۆیەوە دووپاتی دەکردەوە "قەبارەکەی ئەوەندە مەزەندە دەکرێت سەرۆک کۆمار ویلسۆن." مەسەی هەر مرخەمرخی دەهات پێدەچوو کە پێی خۆش بوویێت. لەڕاستیدا، هاجێز، ئەوجۆرەی کە دەهاتە بەرچاو ئەوەندە ڕژد و کەللەڕەق نەبوو. کاردانەوەی وتارەکە ئەوی شلەژاند و دەبوو چەند ڕۆژی دواتر قەرەی لیۆد جۆرج نەکەوتایە.٢٣٦

لەم کاتەدا بۆتا، کە ڕێزی تایبەتی لێدەگیرا، هێزی ئەژنۆی نەبوو بە ڕێدا بڕوات. ئەو وتاری ڕۆژنامەکەی لە گوێ ناخۆش بوو. وەک پیاوچاکان، ئەوانیش پێویستە ددان بە جەرگی خۆیاندا بنێن و ناکۆکیەکانیان لەخۆیاندا ڕاگرن. ئەو لە ناخی دڵەوە پشتگری لە خەون و خەیاڵە گەورەکانی سەرۆک کۆمار ویلسۆن دەکرد. هەڵبەت هەر هەموویان وابوون. ئەو هیوادار بوو کە ئەوان بە ڕۆحی هاریکاری، و بە خۆبواردن لە شتە هیچ و پووچەکان، لەگەڵ کێشەکان ڕووبەڕوو ببنەوە خەیاڵی گەورەتر بهێنە دی."ویلسۆن کە شەرمی هەڵچوون و بەرووداشاخانەکەی خۆی گرتبووی، تەکانێکی قورسی خوارد. ماسەی لە قسەکانیدا ڕەنگ و بۆی ئاشتبوونەوەی لێدەهات،کەچی هاجێز متەقی لێوە نەهات. پێشنیارەکە، هاوڕێ لەگەڵ سێ چینە ماندێتەکەیدا، وەرگیرا و پەسەندکرا. پرسی ئالۆزی کێ چی بەدەست هێنا لایەکی کەوت بە لایەکدا.٢٣٧

ئەوە دژوارترین ساتی هەفتەیەکی پڕکار بوو. هاوکات لەگەڵ ئەمانە شۆڕای عالی لەگەڵ بابەتی تر ڕووبەڕوو ببۆوە: ئایا لەگەڵ بۆلشویکەکان دانووستان بکرێت؛ پۆڵەندا و پێداویستیەکانی؛ سنوورەکانی چکسلەواکیا؛ مەرجەکانی ئاشتی ئەڵمان. ئەو[شۆڕای عالی] قسەی چینیەکانی بە گوێ گەیشتبوو، کە داوای گەڕانەوەی زێدەمافەکانی ئەڵمانیان دەکرد بۆ وڵاتی چین، و قسەی ژاپۆنیەکانیشی بە گوێ گەیشتبوو، کە هیواداربوو ئەو مافانە بۆخۆی مسۆگر بکات؛ لە بەلجیکیەکانی بیستبوو کە داوای ناوچەکانی ئەفریقایان دەکرد؛ و لە ڕۆمانیەکان و یۆگۆسلاویەکانی بیستبوو کە لەسەر ناوچەکان پێکەوە دەمەقرەیان بوو. هەر ئەو ئێوارەیەی ڕۆژی هەینی، کلیمینجوو لای مۆرداکی یاریدەدەر گلەیی کردبوو و وتبووی کە ئەوەندە ماندوو بوە هێزی ئەژنۆی نەماوە بڕوات بە ڕێدا. مێشکی هەر ئالۆز بوو بەو پرسیارانەی کە هاتبوونە ئاراوە و باس و خواستیان لەسەر کرابوو؛ ئەو پێویستی بە پشوودان هەبوو. هەرکیان پێکەوە چوون بۆ ئۆپێرا-کامیک.٢٣٨

*  *  *  *

له هەموو وتووێژەکاندا، زۆر باس لەوە دەکرا کە کۆلۆنیەکان چەندە بەپەرۆشن لە دەستووری ئەڵمانی ڕزگاریان ببێت. هەرچەند پێنجەمین خاڵ لە چاردە خاڵەکەی ویلسۆن باسی بەهەندگرتنی بەرژەوەندیەکانی دانیشتوانی ڕەسەنی ناوچەکانی دەکرد،کەس بەخۆی نەدەپەرما باس لە ئەفریقیەکان و دوورگەنشینانی ئوقیانووسی ئارام بکات. ڕاستە، کە هیچ کام لە ساموئاکان یان مێلانیسیەکان ڕێگەی پاریسیان نەگرتبوە بەر، بەڵام ئەفەریقیەکان دەبینران و هەست بە بوونیان دەکرا. لەڕاستیدا، بریکارێکی ڕەشپێستی فەڕەنسەیی لە سێنەگاڵەوە، بەناوی بلایس دایەگنێ، و ڕێبەرێکی مەزنی ڕەشپێستی ئەمەریکی، بەناوی دابڵیوو.ئی.بی. دوو بۆیس سەرقاڵی دامەزراندنی کۆنگرێسی پان-ئەفەریکەن بوون. ئەمە وەک چاوەڕوان دەکرا لە مانگی فەوریەدا هاوڕێ لەگەڵ ڕازی بوونی نابەدڵی ئاشتیکەرەکان ڕوویدا. هیچکام لە کەسایەتیە ناودارەکانی کۆڕی ئاشتی لەوێ نەبوون و بەشداریان نەکردبوو. ئەندامێکی شاندی نوێنەرایەتی بەلژیکی بە تاسەوتینەوە باسی ئەو چاکسازیانەی کرد کە لە کۆنگۆ هاتبوونە ئاراوە، و وەزیری پێشووی کاروبارەکانی دەرەوەی پۆرتەغاڵ بە شان و باهۆی بەڕێوەبەرانی کۆلۆنیەکانی وڵاتی خۆیدا هەڵکوتبوو. تاقمێک لە نوێنەرانی ئەفریقای فەڕەنسەیی لەبابەت سەرکەوتنی *میشن سیڤیلیسترمیت* بەڵگەیان هێنابۆوە و بە سەر دەسکەوتەکانی کۆماری سێهەمیاندا هەڵکوتابوو. کۆنگرێس بڕیاری خستبوە بەردەم کۆڕی ئاشتی تا پەسەندی بکەن کە کۆمەڵەی گەلان کۆنترۆڵی ڕاستەوخۆی بە سەر کۆلۆنیەکانی پێشووی ئەڵماندا هەبێت. هاوس وەک جاران بە ڕێز و حورمەتەوە باوەشی بۆ دوو بۆئیس گرتەوە بەڵام سەبارەت بە بڕیارەکان متەقی لێوەنەهات.٢٣٩

دوا تێپەڕبوونی چەند مانگ، هێزەکان لە پشت پەردە و دوور لە چاوی جەماوەر مامەڵەی نهێنییان لەگەڵ یەک کرد. هەندێکیان تەنیا لەسەر ئەو بڕیار و قەرارانەی کە لەماوەی شەڕدا بەستبویان جەختیان دەکردەوە. بۆ وێنە ژاپۆن دوورگەکانی خۆی لە باکووری کەمەرەی زەوی پێبڕا. بەرەو باشوور، زیلەندی تازە و ئوسترالیاش دوورگەکانی خۆیان پێبڕا. کاتێکە نۆبەی ئەوە هات کە هەڤاڵان لەبەرانبەر ویلسۆندا بوەستن، ئەوان بۆ چەند مانگی دواتر لەسەر نائوروو، کە بە هیچ وڵاتێک نەبڕابوو، بەردەوام چەلەحانە و شەڕەدەندووکەیان بوو. دوورگەکە تەنیا ٢٠کیلۆمەتری چوارگۆشە بوو، بەڵام چوون ڕیقنەی زۆری باڵندەکانی لەخۆ گرتبوو، سەرچاوەیەکی هەرە بەنرخی فۆسفات بوو، کە بۆ پەین کەڵکی لێوەردەگیرا. هەم هاجێز و هەمیش ماسەی باسی ئەوەیان دەکرد کە بەبێ نائۆروو کشتوکاڵی وڵاتەکانیان ڕوو لە نابوودی دەڕۆیی. بەریتانیەکان بۆخۆیان بە دەستبەسەرداگرتنی ماندێتی نائۆروو و بەخشینی بەشێکی بچووکی میرانە بە چەند هەزار دانیشتوویەکی ناوچەکە کێشەکەیان دامرکاند. کاتێکە نائۆروو لە ساڵی ١٩٦٨دا سەبەخۆیی خۆی

ڕاگەیاند و دەست بەسەر تجارەتی فۆسفات ڕاگەیی، دانیشتوانی ئەویّ خاوەنی یەکێک لە زۆرترین داهاتەکانی جیهان بوون بەپێی هەر تاکێک و خاوەنی نیشتمانێک بوون کە لەژێر لاقەکانی ئەواندا خەریک بوو دەفلیقایەوە. بوودجەیەک کە برەکەی دەگاتە نزیک ١$بیلیۆن دۆلار تەرخانی کڕینی کەل و پەل لە دەرەوەی وڵات و تەرخانی گیرفانەکانی ڕاوێژکارانی هەرە مەزنی ئوسترلیایی کراوە. فۆسفاتەکان خەریکن کۆتاییان دێت، بەڵام نائۆروو ئەمڕۆکە سەرچاوەیەکی تازەی داهاتە لە لۆندێرینگی پارە[money laundering] بۆ مافیای ڕووسی.٢٤٠)

بەریتانیا و فەرەنسا بە نهێنی لەسەر دابەشکردنی سەرەتایی کۆلۆنیەکانی ئەڵمانی لە ئەفریقا لە ماوەی شەڕدا پێکەوە ڕێکەوتبوون. لە کۆڕی ئاشتیدا، لۆرد میلنێر، ئەمینداری کۆلۆنی بەریتانی، لەگەڵ هاوتای فەرەنسیی خۆی، هێنری سیمۆن، کۆبوونەوە تا وردەکاریەکانی کۆنترۆڵکردنی سێزدە ملوێن کەس پێکەوە تاووتویّ کەن. وەکوو چاوەڕوان دەکرا فەرەنسە بەشێکی زۆری لە تۆگۆلەند و کامەروون پێگەیشت، بەریتانیا کەرتێکی بچووک لە هەریەک کە بە کۆلۆنیەکانی خۆی نزیک بە قەراخ ئاوەکانی گۆڵد و نیجریە، و نزیک بە هەمووی ئەفریقای ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانی بەرکەوت. پۆرتەغالیەکان گلەیان هەبوو؛ ئەوان بەتەمابوون پارچەیەک لە ئەفریقای ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانی بە کۆلۆنی موزامبیکی خۆیانەوە بلکێنن. یەکێک لە نوێنەرانی پۆرتەغاڵ بە کلیمینجووی ڕاگەیاندبوو کە پۆرتەغاڵ خاوەنی ئەو شانازیەیە کە" خزمەتێکی لەبیرنەکراوی بە مرۆڤایەتی و شارستانیەت بەگشتی لە ئەفریقادا کردوە، کە لە سەدەی چاردەهەم بەملاوە بە خوێنی خۆی ئاژین و پاراوی کردوە." لەگەڵ ئەمانەشدا، پۆرتەغالیەکان بەدرووستی گومانی ئەوەیان دەکرد کە هاوپەیمانەکانیان خەریکی داڕشتنی پلانی گواستنەوەی بەشێکی بچووک لە ئانگۆلا بوون بۆ بلژیک بۆ ئەوەی بە کۆنگۆی بلژیکی قەراخئاوێکی لەباری ئەتلەنتیکی ببەخشن. لە ئاکامدا، پۆرتەغاڵ کۆلۆنیەکانی خۆی دەستلێنەدراو هەڵگرتەوە و پارچەزەویەکی بچووکی بۆ مۆزامبیک دەست خست.٢٤١

نەدەکرا هەروا بەو ئاسانیە بلژیکیەکان بخرێنە پەراوێزەوە و لەبەرچاو نەگیرێن. لە ٢ی مانگی مەیدا، ئەوان لای شۆڕای چوار یار گلەیان کردبوو کە ئەوان خراونەتە پەراوێزەوە و هیچیان بۆ نەماوەتەوە جگەلەوەی کە خوازیاری بەشێک لە ئەفریقای ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانی ببنەوە. لیۆد جۆرج وتی "داواکاریەکی بێ مانا و هیچ و پووچ. ئەو کاتەی کە ئیمپراتۆری بەریتانی بەملوێن سەربازی ڕەوانە کردبوو تا لەپێناو وڵاتی بەلژیک خەبات بکەن، تاقمێکی بچووک لە هێزەکانی ڕەشپێست بەرەو ئەفریقای ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانی ڕەوانە کرابوون." لیۆد جۆرج خەریک بوو پێچ و پەنای تێدەکەوت. هێزەکانی کۆنگۆیی بە فەرماندەیی بەلژیکیەکان لە پاشەکشێکردن بە ئەڵمانیەکان لە ئەفریقای ڕۆژهەڵات ڕۆڵێکی گرنگیان گێڕابوو. لە

کۆتایی شەڕدا، هێزەکانی بەلژیکی لە سێ بەش نزیک بە بەشێکی ئەو وڵاتەیان داگیرکردبوو. حکوومەتی بەلژیکی هیچ قازانجێکی لەمەدا نەبرد؛ ئەو خوازیاری ئەوە بوو کە لە ئەفریقای ڕۆژهەڵات بۆ مامەلەیەک لەگەڵ ناوچەیەکی پۆرتەغالی بەدرێژایی ئەتلەنتیکدا کەڵک وەرگرێت. بەریتانیەکان، کە نەیاندەتوانی پرتەغالیەکان بهێنە ناو کایەوە، خۆیان لە دۆخێکی ناخۆش و نالەباردا دیبۆوە. بلژیک بەبێ قەرەبوویەک دەستی لە دەسکەوتەکانی خۆی هەڵنەدەگرت. بەداخەوە، ئەو ناوچە داگیرکراوە باشترین ڕێگایەکی لە خۆگرتبوو کە دەکرێ بۆ ڕێگای شەمەندەفەری باکوور-باشوور دابندرێت کە کەیپتاونی بە قاهیرەوە گرێ دەدا و بەریتانیەکانیش زۆر لەمێژ بوو خەونی دامەزراندیان پێوە دەدی.

لە ٧ی مانگی مەیدا، درووست دوا ئەوەیکە ئەڵمانیەکان مەرجەکانی ئاشتیان وەرگرت، کلیمینجوو، لیۆد جۆرج، ویلسۆن و ئۆرلاندۆ لە دیوێک لە ڤێرسایلێس کۆبوونەوە و لەسەر دابەش کردنی کۆتایی ماندێتەکان بەسەر کۆلۆنیەکانی پێشووی ئەڵمانیا ڕێکەوتن. (ئەوان هێشتا لەسەر پاشماوەی ئیمپڕاتۆڕی عوسمانی لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا مرەمریان بوو.) کاتێکە ئەم باسە کەوتە سەرزاران کە گوایە بلژیک لەوانە نیە شتێکی پێببڕێت، بلژیکیەکان، کە پێشتر هەستیان دەکرد بەشخوراون، توورەیی دایگرتن.[٢٤٣] لە ئاکامدا، بەریتانیا بڕیاری دا کە ئەو دەتوانێ واز لە ناوچەیەکی بچووک بێنێت (و بۆ گەیشتن بە ڕێگای شەمەندەفەر ڕێگایتریش هەبوون) و بۆیە دوو پارێزگای نزیک بە سنوورەکانی کۆنگۆ لە ئەفریقای ڕۆژهەڵات جیاکرانەوە. بلژیک ماندێتەکانی ڕواندا و بۆرۆندی گرتە ئەستۆی خۆی.

کاتێکە لەکۆتاییدا کۆمەڵەی گەلان لە ساڵی ١٩٢٠ پێکهات، جەختی لەسەر ئەو شتانە کردەوە کە ماوەیەکی زۆر لەوەپێش بڕیاریان لەسەر درابوو. لە ساڵەکانی کاتی شەڕدا، ماندێتەکانی ناو ئەفریقا و ئۆقیانووسی ئارام، وەکوو هاجێز کە پێشبینی کردبوو، زۆر لە پێکەوەلکانێکی ڕاستەوخۆ دەچوون. هێزە زۆرەکیەکان ساڵانە گوزارشیان دەدا بەدەست کۆمەڵەی گەلانەوە و لەوەبەولاوە خۆیان کارەکانیان بەڕێوە دەبرد. لە کۆتایی شەڕی دووهەمی جیهانیدا، نەتەوە یەکگرتووەکان ماندێتەکانی گرتە ئەستۆی خۆی و، چون ئیمپڕاتۆرە گەورەکانی کۆلۆنی تواوبوونەوە، سەربەخۆیی بەخشی بە ئەو ناوچانەی کە بە میرات پێی گەیشتبوو-بێجگە لە یەک دانە. ئەفریقای باشوور نەیدەویست دەست لە ئەفریقای باشووری ڕۆژئاوا هەڵگرێت. تەنیا لە ساڵی ١٩٩٠دا بەخێرهاتنی دراوسێی تازەی خۆی کرد، وڵاتی سەربەخۆی نامیبیا. لە ساڵی ١٩٩٤دا، دوایەمین ماندێت کۆتایی پێهات کاتێکە پالائۆ، کە لە ساڵی ١٩١٩دا کەوتبوە ژێر ڕکێفی ژاپۆنەوە و دواتر ژێر ڕکێفی وڵاتەیەکگرتووەکان دوا ساڵی ١٩٤٥، سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند. ٩٩٩-ساڵ کرێچیتی کۆتایی هاتبوو.

# ٩

# یۆگۆسلاڤیا

هاوکـات کـە زلهێزەکـان خۆیـان بـە کۆمەڵـەی گەلانـەوە خـەریک کردبـوو و نیگـەران بـوون، هێـزە بچووکەکان خۆیان بە ڕاستە و پاستەکردنی داواکاریەکانیان خەریک کردبوو. لە ئێوارەی ١٧ی فەوریەی ساڵی ١٩١٩دا، تەلەفوونێک کرا بۆ هۆتێل دی بیوو سایت، نزیکی ئیتۆلی. تۆ بڵێی شاندی نوێنەرایەتی سێربەکان، کۆرواتـەکان و سـلۆڤێنەکان دوانیـوەڕۆی ڕۆژی دواتـر بەخۆشـحاڵیەوە ئامـادە بـن و بەشداری لـە شۆڕای عالیدا بکەن؟ ئەم ئاوڕدانەوە سەرسەری و کوتوپڕیە لەلایەن هێزەکانەوە وەک ئازارشکێنێکی کاتی دەهاتە بەرچاو. شاندی نوێنەرایەتی لە سەرەتای ژانویەوە لە پاریس بوون، بەڵام ڕێبەرانی ئەو شاندە تەنیا کەرەتێکیان، بەر لە شۆڕا، لە ٣١ی ژانویەدا، سەریان هەڵێنابوو، تا بەرەنگاری داواکاریـەکانی ڕۆمانیا بۆ سەراسەر باناتی پڕپیت و بەرەکەت ببنەوە، کە لەنێوان هەردوو وڵاتانی ئەوندا هەڵکەوتبوو.

هۆتێل دی بیوو سایت لەماوەی ئەو چەند هەفتە دوور و درێژەدا شـوێنێکی شـاد و خـۆش نـەبوو. شـاندی نوێنـەرایـەتی، کـە نزیـک بـە سـەد نوێنـەری بـەهێزی لـەخۆگرتبوو، بریتـی بـوون لـە سێربەکان، کرۆواتـەکان، سـلۆڤێنەکان، بۆسـنیایەکان و مۆنتێنیگرینـەکان، مامۆسـتایانی زانکۆکـان، سـەربازان، نوێنـەرانی پێشـوو لـە پەرلـەمانی ڤیـەناوە، دیپلۆماتـەکان لـە بێلگـرادەوە، پـارێزەران لـە دالماتیـاوە، توندڕەوەکان، پاشاپەرستان، ئۆرتۆدۆکسیەکان، کاتۆلیکەکان و موسوڵمانان. زۆریـەک لە ئەندامانی ئەو شاندە یەکتریان نەدەناسی؛ لەڕاستیدا، وەک هاوڵاتیانی سێربیا یان ئوتریش-مەجارستان لـەماوەی شـەڕدا ڕووبـەڕووی یـەک جـەنگا بـوون. شـاندی نوێنەرایـەتی ڕەنگدانەوەیـەکی دەقـاودەقی بیروباوەڕە جیاجیاکـان بـوو کـە لـە ناوچـەکانی باڵکـان پـەنگیان خواردبـۆوە: بیروباوەڕی کـاتۆلیکی ڕۆمـانی لـە ڕۆژئاوا لە لایەک و ئۆرتۆدۆکسی ڕۆژهەڵات لە لەیەکی تر؛ بیروباوەڕی مەسیحیەت لـە باکوور و ئیسلام لە باشوور. شاندی نوێنەرایەتی لەلایەن باڵی ئادریاتیکەوە، کـە زۆربـەیان سلۆڤێنی و کرەواتـی بوو، بە گوڕ و تینێکی زۆرەوە ئاگاداری هێمنایەتی لە ئیتالیا و کۆنترۆڵکردن بە سەر بەندەرەکان و

ڕێگاکانی شەمەندەفە بوون کە کاتی خۆی بەشێک بوون لە دەوڵەتی مەجارستان-ئوتریش، بەڵام سەبارەت بە گۆڕانکاریەکانی سنوور لە ڕۆژئاوا بێ لایەن بوون. لە هەمان کاتدا سێربەکان لە سێربیاوە ئامادەیی ئەوەیان هەبوو کە دالماتیا یان ئیستریا بخەنە مامەلەوە تا بۆ باکوور و ڕۆژهەڵات ناوچەیەکی زیاتر دەست بخەن.

ئەوان لە پاریس بە هۆی یەک بیرۆکەوە لە دەوری یەک کۆ ببوونەوە، یەکێک لەو بیرۆکانەی کە لە ئورووپای سەدەی نۆزدەهەمدا زۆر ناسراو بوو، ئەویش ئەوە بوو کە زمانێکی هاوبەش بەمانای نەتەوەیەکی هاوبەشە. ئەوان هەر هەموویان بە زمانێکی سلاڤی باشوور(یۆگۆسلاڤیا) قسەیان دەکرد. ئەگەر سلۆڤێنی لەماوەی چەندین سەدەدا گۆڕابوو ببوو بە زمانێکی جیاواز، بێجگە لە جیاوازیەکی زەق و دیار سێربی و کرۆواسی وەک یەک دەچوون. سێربی، وەکوو ڕووسی و بۆلغاری، بە ئەلفبای سیریلیک دەنووسرا و ئێستاش دەنووسرێت، لە یوونانی ئیمپراتۆری بیزانتینەوە گیراوە، بەڵام کرۆواسی ڕەنگدانەوەیەک بوو لە هەڵوێستی کاتۆلیکی و ڕۆژئاوایی خەڵکەکەی و لە ئەلفبای لاتین کەڵکی وەردەگرت. هاوکات کە ناسیۆنالیزمی جیاجیا لە ناوچەکانی باڵکان بەر شەڕ ڕوو لە گەشەکردن و نەشەکردن بوو-سێربی یان کرۆواسی بۆ وێنە-ئەو خەونەش ڕوو لە گەشە بوو کە گوایە هەمووی سلاڤەکانی باشوور، چ ئەوانەی کە هێشتا لەژێر دەسەڵاتی عوسمانی دابوون، لەناو مەجارستان-ئوتریشدا یان ئەوانەی کە تازە لە سێربستان و بۆلغارستان جیاببوونەوە و سەربەخۆییان ڕاگەیاندبوو، بەشێکن لە نەتەوەیەکی گەورەتر. ئەو شتانەی کە زۆرتر لەلایەن تاقمێکی بچووک لە ڕۆشنبیرانی کرۆواسی و قەشەکان بەدرێژایی قەراخ ئاوەکانی دالماتیان دەستیان پێکرد لە دەیەکانی ١٩٦٠دا پەرەیان سەند و ناوی *جۆگۆسلۆڤێنتسۆیان* بەخۆوە گرت- بیروباوەڕی یۆگۆسلاڤی- هاوڕێ لەگەڵ ئاکادمی یۆگۆسلاڤی، قوتابخانەکان، گۆڤارەکان، و هەمووی ئەو شتانەی کە پەرەیان بە یەکیەتی لەنێوان سلاڤەکانی باشووردا دەدا. بەڵام ئایا ئەوە لە هەمووی هێزەکانی تر بەقوەتتر بوو، لە مێژوو بگرە تا دەگاتە ئایین، کە ئەوانیان لێک جیا دەکردەوە؟ بیرۆکەی یۆگۆسلاڤ هەمیشە لەنێوان سلاڤەکانی باشوور، بەتایبەت کرۆواتەکان، لەناو ئیمپراتۆری مەجارستان-ئوتریشدا، کە ترسی ئەوەیان هەبوو بەزۆر ئەڵمانی یان مەجاری بکرێن، بەهێزترین بوو.٢٤٤ ئەوانەی کە لە دەرەوە بوون، بۆ وێنە، لە سێربیا، بۆچوونێکی جیاواز و بەهەمان شێوە چەسپاویان هەبوو سەبارەت بە دامەزراندنی دەوڵەتێکی نیشتمانی گەورە کە هەر هەموویانی دەگرتەوە.

دەوڵەتی سلاڤەکانی باشوور- پێکهاتبوو لە سێربستان و بەشەکانی باشووری مەجارستان-ئوتریشی هەڵوەشاوە - کە لە ساڵی ١٩١٩ سەری هەڵدا ئاکامی بڕیارێکی بەپەلە و بەڕێکەوت و زۆر خراپ بوو. تەنانەت ڕوون نەکرابۆوە کە شاندی نوێنەرایەتی یان وڵاتێکی نوێ کە ئەو شاندە بانگەشەی دەکرد کە

نوێنەرایەتی دەکا دەبێ ناوەکەی چی بێت؟ پێکهاتوو لە سێربستان و بەشەکانی باشووری دەوڵەتی مەجارستان-ئوتریشی هەڵوەشاوە، لە ئاکامدا ناوی یۆگۆسلاڤی بەخۆیەوە گرت. کۆڕی ئاشتی، بە پێچەوانەی باوەڕی زۆر کەس لەو سەروودەمەدا، یۆگۆسلاڤیای دروست نەکرد- ئەو بۆخۆی پێشتر لەو کاتەدا کە یەکەم دیپلۆماتەکان هاتبوون بۆ پاریس درووست ببوو. هەفتا ساڵ دواتر، هێزەکان بەهەمان چەشن نەیانتوانیبوو لە هەڵوەشانەوەی بەرگری بکەن. بەڵام ئاشتیکەرەکان لە پاریس توانایی پچڕینی ناوچەیان لە دەوڵەتی تازە هەبوو، یان لەوانەبوو بتوانن هەر بە یەکجاری لە بەینی بەرن. ئەوان زۆر بە سەرنجەوە ئاگاداری نەتەوەکانی ئاواتەخواز بوون لە ناوچەکانی باڵکان. بە بۆچوونی ویلسۆن بەخشینی هێزی دەریایی بە دەوڵەتی سلاوی باشوور هەڵەیەکی گەورەیە: "چۆن ئێستا خەڵکێکی ئاژاوەگەرن ئەو دەمیش نەتەوەیەکی ئاژاوەگەریان لێدەردێت، و بەخشینی هێزی دەریایی بە ئەوان وەک بەخشینی دەمانچەیەک وایە بە منداڵێکی قۆناخی سەرەتایی."٢٤٥

لە فەوریەی ساڵی ١٩١٩دا ئاشتیکەران هێشتا بڕیاریان ساخ نەکردبۆوە کە ئایا دایکانی گیانی دڵسۆز و باش بن یان ئەوەتا خراپ و بێ ڕەحم. بێجگە لە یەک دانە. حکوومەتی ئیتالیای بڕیاری هێنابوە سەر ئەوەیکە هەر بە مەلۆتکەیی بەربینی دەوڵەتی سەر بێشکە بگرێ و بیخنکێنێت. نیشتمانپەروەرانی ئیتالی هەر خێرا یۆگسلاویان وەک دوژمنی سەرەکی خۆیان سەیر کرد، و نەیاندەویست بە لەبەین چوونی ئوتریش-مەجارستان ئەو ڕۆڵە ئەکتەرێکی تری بۆ ساز ببێت. سەرۆک وەزیر ئۆرلاندۆ گلەیی کردبوو کە " یۆگۆسلاڤیا شوێنی ئوتریش دەگرێتەوە و وەکوو ئەو دەوڵەتە وەک جاری جاران دەبێتە هۆی دڵراوکێ و ئازار و مەینەتی بۆ ئێمە." بەریتانیا و فەڕەنسە لە سەرەتا بەنابەدڵیەوە لەگەڵ ئیتالیا یەک کەوتن و دەوڵەتی تازەیان بە فەرم نەناسی. ولاتەیەکگرتوەکان، کە هیچ ددانێکی خێری بە ئیتالیا و ئاواتەکانی ئیتالی لە ناوچەکانی باڵکان دانەدەنا، لە مانگی فەوریەدا یۆگۆسلاڤی بە فەرمی ناسی؛ بەریتانیا و فەڕەنسە تەنیا لە مانگی ژوەندا ئەو بڕیارەی ڕاگەیاند، بەشێکی لەولامی لاساری ئیتالیا بوو، کە لەو کاتەدا هەڕەشە بوو بۆ هەڵوەشانەوەی کۆڕی ئاشتی.٢٤٦

نیکۆلا پاسیچ، کە بۆ ماوەی ساڵیانی ساڵ سەرۆک وەزیری سێربستان بوو، سەرۆکایەتی شاندەکەی دەکرد. ئەو لە تەمەنی شەست و پێنج ساڵیدا، بە چاوە شین و قژاڵیەکانیەوە و بە ڕدێنێکی سپی و درێژ کە تا نێوقەدی دەهات، لە پیرەسۆفیەکی نوورانی دەچوو. ژیانی تاکەکەسی ئەو نموونەیی بوو: ئەو هەتا بڵێی ئایینی بوو، و، سەرەڕای ئەوە کە لەگەڵ ژنێکی دەوڵەمەند ژیانی هاوبەشی درووست کردبوو، ژیانێکی سادە و ساکاری هەبوو. ئەو پێی خۆش بوو لەگەڵ خێزانەکەی و

کچەکانی ئێوارانە دانیشن و پێکەوە گۆرانی ڕەسەنی سێربی بڵێنەوە. کاتێکە ئەو بۆ جەماوەر قسەی دەکرد، کە بە دەگمەن شتی وا ڕووی دەدا، زۆر هێواش و لەسەرەخۆ بوو. (دەیانگێڕاوە کە لە زمانی سێربیدا هەڵەی زۆری دەکرد.) ئەو بە ئەڵمانی و فەرەنسەیی لە ئاستێکی خوارەوەدا قسەی دەکرد و بە ئینگلیزی هەر قسەی نەدەکرد. ڕەنگە هەر بەو بۆنەوە بێت کە تا ڕادەیەکی زۆر ناوبانگی ژیری دەرکردبوو. لیۆد جۆرج ئەوی بە "یەکێک لە سیاسەتمەدارانی هەرە فێڵباز و هەرە توندوچیری ڕۆژهەلاتی باشووری ئورووپا دەزانی". وەکوو ڕێبەرێکی تری سێربی، لە ساڵەکانی دەیەی ۹۰، پیرەپیاوێکی مەترسیدار و فێڵەباز کە حەزی بە دوو شت دەکرد: دەسەلات و سێربستان. تاقمێکی زۆر بچووک لە هاوکارانی باوەڕیان پێی هەبوو؛ بەلام لەگەڵ ئەوانەش لە لادێکان و گوندەکان، ئەو شوێنانەی کە سێربەکان لێی دەژیان خۆشەویست و ناودێر بوو.۲٤۷

زۆرکەس لە پاریس ناوچەکانی باڵکانیان لا سەیر و نەناسراو بوو. لە یەکەمین دانیشتنی لەگەڵ پاسیک، لیۆد جۆرج بەدوائەوەوە بوو کە بزانێ ئایا سێربەکان و کرۆواتەکان یەک زمانیان هەبوو.۲٤۸ تەنیا تاقمێکی بچووک لە پسپۆڕان، یان کرانکەکان، توێژینەی ناوچەکەیان کردبوو بە پیشە. ئەوەیکە زۆربەی خەڵک دەیانزانی ئەوە بوو کە باڵکانەکان بۆ ئورووپایەکان جێی مەترسی بوو؛ دوا هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆری عوسمانی و کەوتنە بەربەرەکانێی دەوڵەتی ئوتریش-مەجارستان و ڕووسیە لەسەر کونترۆڵکردنی ناوچەکەی ئەوان بۆ ماوەی چەند دەیەیەک ببوونە هۆی ئاڵۆزی لەوێ؛ و ئەوان هەڵگیرسێنەری شەڕی گەورە بوون کاتێکە ناسیۆنالیستەکانی سێربی میراتگری تاج و تەختی ئوتریشیان لە سارایەوۆ ترۆر کرد.

کاتێکە تازە سێربستان ئازاد کرابوو، و شازادەی خۆی هەبوو، پاسیک هاتبوە سەرڕووی دنیا بەلام ئەو لە جیهانێک گەورە ببوو کە ئاسەواری ساڵیانێکی دوور و درێژی دەسەلاتی عوسمانی بە سەرەوە بوو. لە باشووری ڕۆمانیاوە تا یوونان، عوسمانیەکان هونەری چێشت لێنان، داب و نەریتەکانیان، بۆرۆکراسیەکەیان، گەندەڵیان و، تا ڕادەیەکی دیار، ئیسلامەکەیان پاش خۆیان بەجێ هێشتبوو. "باڵکان" دەستەواژەیەکی کورتکراوە بوو بۆ ناوچەیەکی جوگرافی هەروەها بۆ حاڵەتێکی مێشک، یان بۆ مێژوویەک کە ئاسەواری بەردەوامی شەڕ و شۆڕی پێوە دیار بێت. ڕابردووی ئەوان بە خەڵکانی ناوچەکانی باڵکان فێر کردبوو کە، پێشینان گوتەنی، "ئەگەر دوژمن دەرەقەتی نەهاتی، ئەوا لەگەڵی یەک کەوە." بیروباوەڕی ئایینی مرۆڤی شەڕکەر بە شان و باهۆی جۆرەپیاوێکیدا هەڵدەکوت، وەکوو پاسیک، کە قەت متمانەی بە کەس نەبوو، قەت ئارەزووە ڕاستەقینەکانی خۆی نەدەدرکاند و قەت ئامۆژگاری هەڵنەدەگرت.۲٤۹

بێجگە لە سێربەکان، کرۆواتەکان، سلۆڤێنیەکان، ئالْبانیایەکان، بۆلغاریەکان و مەقدوونیەکان، خەڵکانی باڵکان یوونانیەکانیان لە خۆ گرتبوو(کە خۆیان وەک ڕەگەزی مەدیتەرانەیی ناوی خۆیان دەهێنا) و، هەرجۆر کە ئێوە پێناسەی دەکەن، ڕۆمانیەکان (کە خۆیان بە نەژادی ڕۆمان دەزانی)، و هەروەها کۆمەڵێک کەمینە کە پاشماوەی هەڵچوون و داچوونەکانی مێژوو بوون. بازرگانە جوولەکەکانی سارایەڤۆ، کۆلۆنیەکانی ئیتالی لە سەر قەراخ ئاوەکانی دالماتیان، بەرەکانی داگیرکەرانی ئەڵمانی لە باکوور، و تورکەکان لە باشوور-ئەمانەش بەشێک بوون لە هەقیقەتی ناوچەی باڵکان.

لە دڵی ناوچەکەدا سێربستان هەڵکەوتبوو. لە سەردەمی منداڵی پاسیکدا شوێنێکی سادە و ساکار بوو. ڕێگاکانی شەمەندەفەڕ و تێلێگرافەکان هێشتا ناوچەی بچووکی شانشینیان بە جیهانی بەرینتر پێوەند نەدابوو. دوور لە بێلگرادی پایتەخت کە ٢٠،٠٠٠ دانیشتووی لەخۆ گرتبوو، شارۆچکەکانی ئەو وڵاتە هەڵکەوتبوون کە لە گوندی گەورەگەورە پێکهاتبوون. خەڵکانی ئەوێ، وەک جاری جاران، بژێوی ژیانیان لەڕێگای کشتوکاڵ و بازرگانیەوە دابین دەکرد. پاسیک یەکێک لەو تاقمەبچووکەی سەردەمی خۆی بوو کە بۆ درێژەدان بە خوێندنی باڵا لە بواری زانستی خۆیدا سەردانی دەرەوەی وڵاتی کردبوو و چووبوو بۆ زووریخ. وڵاتەبچووکەکەی ئەو خەونی گەورەی هەبوو، کە خەونی ئەویش بوو: خەونی سێربستانی گەورەتر، گەیشتن بە ڕۆژهەڵات و ڕۆئاوا بەرەو دەریای ڕەش و ئادریاتیک، سواربوون بەسەر ڕێگاگەورەکان کە لە ئورووپای ناوەندیەوە درێژەیان هەبوو تا دەگاتە ئائێگین. بە پەرەسەندنی ناسیۆنالیزم لە سەدەی نۆزدەهەمدا، مێژوونووسانی سێربی بە کەیفی خۆیان ڕابردوویان هەڵگێڕوەرگێڕ کرد تا داواکاریەکانی خۆیان چەسپاندبێت و هەمووی سێربەکانیان گەڕاندبێتەوە ناو باوەشی نیشتمان. بەرپرسێکی قوتابخانە بۆ گەشتیارێکی گێڕابۆوە لە مەقدوونیە کاتێکە هێشتا لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا بوو کە "ئێمە منداڵەکانمان لە دەوری یەک کۆکردەوە و تێمانگەیاندن کە ئەوان سێربین. ئێمە وانەی مێژوومان بۆ کوتنەوە." لە سەراسەری ناوچەکانی باڵکاندا، مامۆستاکان، هونەرمەندان و مێژوونووسان کەوتبوونە خۆ، بیرەوەریەکانیان زیندوو دەکردەوە، ئەفسانەکانی نیشتمانیان دەبووژاندەوە، جۆرێکی تازە لە ئاگاییان بڵاوەکردەوە.٢٥

کێشەکە لەوەدا بوو کە ئەوە تەنیا سێربەکان نەبوون کە ڕاپەڕابوون. هەروەک چێرچیل بۆیچووبوو، باڵکانەکان زۆر زیاتر لەوەیکە مێژوو بەکار دێنن بەرهەمی دێنن. لەو شوێنەی کە مۆسیقارژەنە کوێرەکانی سێربی لە بیرەوەری میرنشینی گەورەی سەدەی چاردەهەم،ستێفن دووسان، کە لە دانووبەوە درێژەی هەبوو تا دەگاتە ئائێگین، مۆسیقایان لێدەدا، بۆلغاریەکان لە سەدەی دەهەم ڕامابوون، ئەو کاتەی کە ئیمپراتۆری کینگ سیمۆن بەشێکی زۆری لە هەمان

ناوچە خستبوە ژێر کونترۆڵی خۆیەوە. و یوونانیەکان لە هەموان زیاتر بیرەوەریان هەبوو، ئەو کاتەی کە کاریگەری یوونان لە ڕۆژهەڵاتەوە تا ئاسیای بچووک و دەریای ڕەش، و لە ڕۆژئاواوە تا ئیتالیا و مەدیتەرانەی تەنیبۆوە. تەنانەت بۆ ماوەیەکی کاتی و کورتیش کە بوە خاوەنداریێتی پارچەزەویەک چەندین سەدەی ڕابردوو دەکرێ بەڵگەیەکی چەسپاو بێت لە دەمکاتی ئێستادا. گەشتیارەکە بۆ لای بەرپرسی قوتابخانەکە دەستی درێژ کرد و وتی: " لەوانەیە ئێمە داوای کالایس بکەین کە بە ڕەوا و بە مافی خۆمانی دەزانین." ئەویش وڵامی دایەوە "بۆ نەیزانن ئێوە هێزی دەریایتان هەیە."٢٥١

پاسیک یەکێک لە کادرە سەرەکیەکانی پارتی نەشناڵ ڕادیکاڵی سێربی بوو، کە لە ساڵی ١٨٨٠ دامەزرا، و خوازیاری ئازادی و یەکیەتی هەمووی سێربەکانی دەکرد، وەکوو ئەوانەی کە لە وڵاتی ئوتریش-مەجارستان دەژین. وەکوو زۆربەی هەرە زۆری ناسیۆنالیستەکانی سێربی، ئەو بایەخێکی ئەوتۆ نادا بە کرۆواتەکان و سلۆڤێنیەکان؛ ئەوان کاتۆلیکی ڕۆمان بوون و دەیانڕوانیە ڕۆژئاوا، بەڵام سێربەکان ئۆرتۆدۆکس بوون.٢٥٢ ئەگەر کرۆواتەکان و سلۆڤێنیەکان بڕیاریان بدایە کە بە سێربستانەوە پێوەندی بگرن و لەگەڵی یەک کەون، ئەوا کاتێک دەهاتە دی کە بەپێی مەرجەکانی سێربی، لەژێر ڕێبەرایەتی سێربی دا بوایە.

یەک لەدوایەک، لە شەڕی بچووک بچووکدا، کە لە ڕوانگەی ساڵی ١٩١٩ لەو کاتەدا سادە و بچووک دەهاتنە بەرچاو، نەتەوەکانی باڵکان خۆیان لە باوەشی سارد و سڕی تورکەکان ڕزگار کردبوو. لە ساڵی ١٩١٤، بە هەموویەوە پاشماوەی بەشی ئورووپایی ئیمپراتۆریەت کە هەڕەشە بوو بۆ سەر ڤیەنا بە قەدەر پەنجە پێیەک دەبوو لە ترەیس و پایتەختی گەورەی قۆستەنتەنییە (ئیستانبوولی ئێستا). وڵاتانی تازە بەشە سەرەکیەکانی دەوڵەتداریان چنگ کەوتبوو: ڕۆژنامەکان، ڕێگاکانی شەمەندەفەر، کۆلیجەکان، ئاکادمیەکانی هونەر و زانست، سروودەکان، ئیستامپەکانی پۆستێچی، سوپاکان و پاشاکان، زۆربەیان لە ئەڵمانەوە هاتبوون.

لە جیهانی ئاڵۆز و هەرچی پەرچی سیاسەتی سێربیدا، قەدەر وابوو کە پاسیک زیندوو بمێنێتەوە، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا سەرکەوتنێک بوو. لە حوکمی سێدارە، دوورخستنەوە، پیلانگێڕی، هەوڵەکانی تیرۆر، ڕووداوەکانی هاتوچۆ: لە هەر هەموویان ئەو ڕزگار ببوو. ئەویش پاداشی هەرهەمووی زەحمەتەکانی دوژمنانی خۆی دابۆوە. نووسەری ئینگلیزی ڕێبێکا وێست هەروا سەربە هەوا بەرەنگاری ئەو دەنگۆیانە ببۆوە، لەوانەیە ڕاستی وتبێت، کە گوایە ئەو خەبەری لە پیلانی تیرۆرکردنی دووکی گەورەی لە سارایەڤۆ بووبێ: "سیاسەتمەدارانێک کە بە ڕەچەڵەک لە

گوندەکانەوە سەریان هەڵداوە و بەگشتی پەروەردەی نەریتی باڵکانن، وەکوو سەرۆک وەزیری سێربی، بەڕێز پاشیچ، هەستیان بە دڵەڕاوکەیەکی هاوچەشن نە دەکرد لە گوماندارێتی هاودەست بوونیان لە ترۆری دوژمنێکی نەتەوەیی کە لەلایەن هاوچەرخانی ئینگلیزیەوە، واتە بەڕێز بالفۆر یان بەڕێز ئاسکویت، هەستی پێدەکرا."٢٥٣

* * * *

لە ساڵی ١٩١٩، کاتێکە پرسی دابینکردنی ڕێبەرێک بۆ شاندی نوێنەرایەتی کە بڕیار بوو بچێ بۆ پاریس هاتە ئاراوە، شازادە ئەلێکساندری سێربستان، کە وەک جێنشینی پاشا لە جیاتی باوکی پیر و پەکەوتەی خۆی ئیشی دەکرد، زۆر لە سەر پاسیک پێداگری دەکرد، ڕەنگە زیاتر بۆ ئەوە بووبێ کە لە بێلگراد دووری بخاتەوە. پاسیک سەرەڕای ئەوەکە زۆری پێناخۆش بوو دەبوایە لەگەڵ کرۆواتێک، بەناوی ئانتی ترامبیک، وەک سەرۆک وەزیری نوێ شەریکە دەسەڵات بوایە. سێربەکان و کرواتەکان مەیلی ئەوەیان هەبوو کە یەکتر قەڵس کەن. مەقامێکی ڕەسمی سێربی کە کەڕەتێکیان لای میوانێکی بەریتانی گلەیی کردبوو وتبووی کە " بۆ سێربەکان هەمووشتێک ئاسانە؛ بۆ کرۆواتەکان هەمووشتێک سەخت و ئاڵۆزە." و ترامبیک زۆر کرۆواتی بوو. ئەو کە ئیتالیایی بە باشی دەزانی، و هیوایەتێکی تایبەتی بە کولتووری ئیتالی هەبوو خەڵکی قەراخ ئاوەکانی جیهانی دالماتیان بوو. ئەو لەوێ فێرکرابوو کە گوێ لە تانە و توانجەکانی ئەوان و هۆکارەکانی بە ئەنجام نەگەیشتنی کارەکان بگرێ. هەرچەند ئەو بەشێکی زۆر لە ژیانی تەرخانی هەوڵدان بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی یۆگسلاوی کە سێربستانیشی دەگرتەوە کردبوو، ئەو وەکوو باربێری و ڕەشۆکی سەیری سێربەکانی دەکرد، کە ساڵیانی ساڵ کەوتبوونە ژێر کاریگەری دەسەڵاتی عوسمانیەوە. ئەو بۆ نووسەرێکی فەڕەنسەیی ڕاگەیاندبوو کە " هیوادارم ئێوە مەبەستان ئەوە نەبێ کرۆواتەکان، سلۆڤێنیەکان، دالماتیەکان کە چەندین سەدە هاریکاری هۆنەری، ڕەوشتبەرزی و ڕۆشنبیری ئەوان لەگەڵ ئوتریش، ئیتالیا و مەجارستان بیروباوەڕی کولتووری ڕەسەنی ڕۆژئاوای لێکەوتۆتەوە، لەگەڵ ئەم سێربە بەناو شارستانیانەدا، کە دووڕەگەی کۆیلەکان و تورکەکانی باڵکانن، پێکەوە بسەنگێنن."٢٥٤

لە ساڵی ١٩١٤دا، ترامبیک خەریک بوو دەهاتە سەر ئەو قەناعەتە کە داهاتووی نەتەوەکەی ئەو لە دەرەوەی دەوڵەتی مەجارستان-ئوتریش هەڵکەوتبوو. لە ساڵی ١٩١٥دا، بە هاوکاری لەگەڵ ڕۆژنامەنووسێک و پەیکەرتاشێکی لاو، ئەو لێژنەی نیشتمانی یۆگۆسلاڤیای لە لەندەن دامەزراند تا لەپێناو فیدەڕالیەتە کردنی کۆیلەکانی باشوور کە ئەمجارەیان سێربستانیشی لەخۆ دەگرت خەبات

بکەن. ئەمەش لە یەکێکی تر لەو لێژنە خۆ-دامەزراوە سەیرانە دەچوو کە بەدوای دۆزە ڕەواکانی لەدەستچووەوە بوو و بە سەرتاسەری پایتەختەکانی ئەورووپادا پرژوبڵاو ببوونەوە. هەڵوەشانەوەی دەوڵەتی مەجارستان-ئوتریش بە مێشکی هیچ کام لە هێزەکاندا نەدەهات (و تا ساڵی ١٩١٩ پلانێکیان بۆ ئەو مەبەستە لە مێشکدا نەبوو). سێربەکان ئارەزووی فیدراڵیەتیان نەدەکرد، تەنیا بەدوای سێربستانێکی گەورەوە بوون. ئەگەر دوورگەکانی سلاڤی باشووری ئوتریش-مەجارستان بهاتایەتە ناو باسەکانی هاوپەیمانی، تەنیا بۆ مامەلەیەک بوو و چیتر نا. لە ساڵی ١٩١٥، ڕێکەوتنامەیەکی نهێنی نێوان لەندەن، بەریتانیا، فەرەنسە و ڕوسیا بەڵێنی بەشێکی گەورەی لە سلۆڤێنیا و بەشی باکووری قەراخ ئاوی دالماتیان بە ئیتالیا دا. ئاماژە بەوەش کرا کە سێربستان پاشماوەی دالماتیا و بۆسنیا-هێرزەگۆڤینا و تەنانەت بەشێک لە کرۆواسی پێبرا.٢٥٥

ترامبیک، کە ئێستا لە لایەن کۆمەلانی دەوڵەمەندی سلۆڤێنی و کرۆواسی لەباری ماڵیەوە لە ئەمەریکای باکوورەوە پشتگری دەکرا، بە توندی ڕەخنەی گرت. پاسیک و سێربەکان خۆیان لە هاوپەیمانیەکی هاوچەشن نەدا. ترامبیک وەها هیوابڕ ببوو کە باسی ئەوەی دەکرد دەست لە هەمووی ئەمانە هەڵگرێت و لە بۆینسئایرێس ببێت بە شۆفیری تاکسی. سەرباقی ئەمانەش مەسەلەکەی[دۆزەکەی] ئەو تاقمێکی بچووک بەلام بەهێزی لایەنگرانی بە لای خۆیدا ڕاکێشا بوو، وەکوو ڕۆبێرت سێتۆن-واتسۆن، توێژێنەر و زمانەوانێکی دەوڵەمەندی سەربەخۆ، و ویکهام ستید، کە بەر لە دەستپێکی جەنگ هەواڵنێری *تایمز* بوو لە ڤیەن. هەردوو پیاوەکە بە ڕق و تووڕەیەوە سەیری دەوڵەتی مەجارستان-ئوتریشیان دەکرد؛ ئەو وڵاتە وەک شوێنێکی گەندەڵ و نائاسایی سەیر دەکرا و ئەوانیش وەک ئەرک خۆیانیان لێی هەڵمالیبوو تا لەو قەیران و نەهامەتیە ڕزگاری کەن. ویکهام ستید حەزێکی تایبەتی هەبوو بۆ مەسەلەی یۆگۆسلاڤیا. بەبۆچوونی باڵوێزێکی بەریتانی لە ڕۆم، ئەوە بۆ ئەوە دەگەڕاوە کە ئەو " وەک پێوەندی باوک و فەرزەند نەک وەک ژن و مێردایەتی" بۆ ساڵیانێکی دوور و درێژ لەگەڵ ژنێکی زۆر زیرەکی سلاڤی باشوور ژیابوو.٢٥٦

کرۆواسی و سلۆڤێنی، و هەروەها بۆسنیا، لە ماوەی جەنگدا وەک بەشێک لە دەوڵەتی ئوتریش-مەجارستان مانەوە، و زۆربەی سەربازەکانیان تا کۆتایی شەڕ وەفادارانە لەپێناو ئیمپەڕاتۆری کۆندا جەنگان. لە سووپاکانی ئوتریشیدا کرۆواتەکان، سلۆڤێنیەکان و بۆسنیەکان، و تەنانەت سێربیش هەبوون کە پایتەختی سێربی، بێلگراد،یان بۆمباران کرد و هەپروون بە هەپروونیان کرد، سووپای سێربیان تێکشکاند و حکوومەتی سێربیان حەواڵەی هەندەران کرد، سێربستانیان داگیرکرد و دەستدرێژی جنسیان کردە سەر هاووڵاتیان و زەخت و زۆریان سەپاند بە سەریاندا. سێربیەکان بەهۆی هاودەستبوونیان لە ترۆری

دووکی گەورەی ئوتریش فرانز فێردیناند لە سارایەڤۆ، بەهایەکی زۆریان دا. لە حەشیمەتێکی ٤.٥ملوێن کەسی، زیاتر لە ١٢٠،٠٠٠کەس لە جەنگدا بوونە قوربانی. لە کۆتایی شەڕدا، گرنگ نەبوو کە ترامبیک و لێژنەکەی لە لەندەن چەندە باسی یەکیەتی سلاڤی باشووریان دەکرد، بۆ دوژمنانێکی تازەی لەو چەشنە هەروا ئاسان نەبوو کە چیتر وەک خوشک و برا سەیری یەکتر بکەن. بە واتایەکی تر، ڕوون نەکرابۆوە کە ئەوان چ ئاڵتێرناتیڤێکی تریان لەبەر بوو.

حکوومەتی مەجارستان-ئوتریش کە یەک بەدوابییەک دەکەوت بە سەر کارەسات و نەدامەتیدا، سلاڤەکانی باشووری ئەوێ، زۆربەیان لەڕووی بێ مەیلیەوە، بەرەو سەربەخۆیی گەڕان. سێربەکان کە بەشێوەیەکی کاتی بە تێکشکان و ڕووخانی پارێزەری گەورەیان، ڕووسیە، سزا درابوون، لەبەرانبەر بیرۆکەی دەوڵەتی یوگۆسلاودا ملکەچ ببوون. لە هەندەران لە کۆرفوو، پاسیک لەگەڵ ترامبیک کۆبوونەوە و لە مانگی ژوولای ١٩١٨دا، هەردووکیان هاتنە سەر ئەو باوەڕە کە سێربەکان، کرۆواتەکان و سلۆڤێنیەکان، وەکوو ئەوانەی کە لە بۆسنیا دەژیان، چ مسوڵمان و چ غەیری مسوڵمان، لەگەڵ یوگۆسلاڤیا یەک بگرنەوە و پاشای سێربیا وەک دەسەڵاتداری خۆیان قەبووڵ بکەن. یەکیەتی لەگەڵ سێربستان بە هەر کەم و کورتیەکیەوە پێدەچوو کە کەمتر جێی مەترسی بێت تا سەربەخۆیی وەک، بە لایەنی پۆزیتیڤەوە، وڵاتێک کە لە سلۆڤێنیا، کرۆواسی و بۆسنیا درووست ببوو و ، بە لایەنی نێگەتیڤەوە، لە دوو یان سێ وڵاتی بچووک و لاواز پێکهاتبوو. بەهۆی تێنەگەیشتنیان، هەردوو لا باسکردن لەسەر یاسایەکی بنەڕەتیان پەک خستەوە؛ مەسەلەی فیدراڵیەت(کە کرۆواتەکان و سلۆڤێنیەکان خوازیاری بوون) یان دەوڵەتێکی یەکگرتوو (کە هەڵبەت پاسیک خوازیاری بوو) هەرگیز نەچەسپاو نەهاتە قۆناخی جێبەجێکردن. ترامبیک بە ڕوونی دەیدیت کە چۆن سێربەکان سەیری پرۆسەی یەکخستنەوەی خەڵکانی جیاوازیان دەکرد. هەروەک چۆن مەقامێکی ڕەسمی حکوومی سێربی بە خۆشحاڵیەوە بەوی ڕاگەیاندبوو کە لەبابەت بەڕێوەبردنی مسوڵمانانی بۆسنیایی هیچ کێشەیەک لەبەردەمدا نیە. سووپای سێربی مۆڵەتی بیست و چوار کاتەژمێریان- یان نەخێر لەوانەیە چل و هەشت کاتەژمێریان- بداتێ تا بگەڕێنەوە سەر باوەڕی ئۆرتۆدۆکس. ترامبیک بە هاسکە هاسکەوە وتی کە "ئەوانەی کە نەیەنە سەر باوەڕی ئۆرتۆدۆکس دەکوژرێن، وەکوو چۆن پێشتر لە سێربستان کردوومانە. ئەمەمان بە هەند لێ وەرگرن."٢٥٧

چەند مانگ دوابەدوای ڕاگەیاندنەکەی کۆرفۆدا پاسیک بەرەبەرە لە هەر یەکیەتیەکی ڕاستەقینە خۆی دزیەوە. ئەو بە نهێنی و دوور لە ڕای گشتی هەوڵی دا تا دڵنیابێ لەوەیکە هاوپەیمانان ترامبیک و لێژنەی یوگۆسلاڤیان وەک دەنگی سلاڤەکانی باشوور لە دەوڵەتی ئوتریش-

مەجارستان بە فەرمی نەناسیوە. لە مانگی ئۆکتۆبردا، درووست ئەو کاتەی کە شەڕ بەرەو کۆتایی دەچوو، ئەو لەگەڵ ویکهام ستید لە لەندەن کۆبۆوە، ئەو کەسەی کە هێشتا هەر لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە ئەو دەتوانێ پاشماوەکانی دەوڵەتی ئوتریش-مەجارستان هەڵگەڕێنێتەوە و بیانکا بە نموونەی ژیریێژی و مێهرەبانی. پاسیک خۆی بە دەستەوە نەدەدا. ئەو بە ویکهام ستیدی ڕاگەیاندبوو کە سێربستان سلاڤەکانی باشووری لە چنگ دەوڵەتی مەجارستان-ئوتریش ڕزگار کردبوو، کە ڕاگەیاندنەکەی کۆرفۆ تەنیا مەبەستی پڕۆپاگەندەی لەپشتەوە بوە، و ئەوەکە سێربستان دەیهەویست بکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی هەر دەوڵەتێکی تازەوە. کرۆواتەکان و سلۆڤێنیەکان کە حەزیان بەوە نەدەکرد بۆ هەرشوێنێک کە پێیان خۆشبوایە بچن بڕیاردەربوون. ویکهام ستید بە تووڕەییەوە پاسیکی بە هەڵس و کەوت کردنی وەک سوڵتان تاوانبار کرد، و هەردوو کەسایەتی لەوە بەدواوە لەگەڵ یەک قسەیان نەکردەوە. "ئەو بە تاقی تەنیا خۆی لە دەسک ناوە و دەیهەوێ بڕیار بدا کە چ سیاسەتێک ڕەچاو بکرێت؛ و ئەوانەی کە دابین دەکرێن ملکەچی دەستووری ئەو بن."٢٥٨

* * * *

بێجگە لە پسپۆڕانی خۆدابینکراو وەکوو ویکهام ستید، ژمارەیەکی زۆر کەم لە لایەنی هاوپەیمانی مێشکیان بە ئورووپای ناوەندیەوە خەریک کردبوو و تەنانەت کەمتریش لەوە بە ناوچەکانی باڵکان. هەڵوەشانەوەی کوت و پڕی ئیمپراتۆری هابسبێرگ لە هەفتەکانی دوایی شەڕدا ئاڵۆزی گەورەی لێکەوتبۆوە. بلێی بەسەر ئەمانەشدا جۆرە دەوڵەتێکی پاشماوە هەبێ، کە ئوتریش و مەجارستان بە دەست گرووپێکی جیاواز لە هازبێرگەکان سەرۆکایەتی بکرێن؟ لەوانەیە کرۆواسی بتوانێ لە ژێر دەسەڵاتی شازادەیەکی ئینگلیزی میرنشینێکی تازە پێک بێنێ. کێ زیاتر بە کردەوە دەیەویست خاوەنی هێڵەکانی ڕێگای شەمەندەفەر و بەندەرەکان بێت؟ ناوگانی دەریایی دەوڵەتی ئوتریش-مەجارستان چی؟ ئیمپراتۆری لاو کارێل، لە یەکێک لە دوایەمین هەوڵەکانیدا، دابووی بە دەست هاوڵاتیانی دوورخراوەی خۆی. لەوانەیە بە هۆی ئەوەوە کە ناوچەکانی باڵکان پێشتر ببوونە هۆی ئاڵۆزی و گێرە و کێشە، هێزەکان بە نهێنی لەسەر ئەوە ڕێکەوتن کە ئەو سنوورانەی کە بەرلە ساڵی ١٩١٤ گێرە و کێشەیەکی زۆریان هەڵگرت تا داکوژان دەستیان لێنەدرێت.

بەر لە دەستپێکردنی کۆڕی ئاشتی، سلاڤەکانی باشوور هەوساری هەمووی کارەکانیان گرتبوە دەست خۆیان. لە زاگرێب، پەیتەختی کرۆواسیا، شۆڕایەکی نەتەوەیی لە کرۆواتەکان، سێربەکان و سلۆڤێنیەکان سەربەخۆیی خۆی لە دەوڵەتی ئوتریش-مەجارستان لە ٢٩ی ئۆکتۆبری ساڵی ١٩١٨ ڕاگەیاندبوو. ئاشکرا نەبوو کە هەنگاوی دواتر چیە. زۆرلایەن هێشتا هەر بە تەمای وڵاتی سلاڤی

باشووری سەربەخۆ و جیاوازی خۆیان بوون. بە واتایەکی تر، زۆربەی سێربەکان لەگەڵ ئەوە بوون کە بە سێربستانەوە پێوەندی بگرن. ترامبیک و لایەنگرەکانی خوازیاری فیدڕالیتە بوون، بەڵام ژمارەیەکی بەرچاو لە کرۆواتەکان بە دوای کرۆواسیەکی سەربەخۆوە بوون. لەوکاتەدا پێدەچو هەمووی هەڵبژاردەکان خرابێتنە بەردەم. ئەوی ڕاستی بێت، هەل و مەرجەکە وابوو کە دەبوایە پشتی لەوان هەڵکردایە. هەرچەند پاسیک گوشارێکی هاوپەیمانی سەپایە سەری و داوای لێکرد حکوومەتێکی هاوپەیمانی لەگەڵ ترامبیک و نوێنەرانی شۆڕای نیشتمانی لە زاگرێب لە هەفتەی دووهەمی مانگی نوامبردا دامەزرێنن، ئەو دڵنیابوو کە حکوومەتی نوێ بە مردوویی لەدایک ببوو. سێتۆن واتسۆن لە گوزارشەکەیدا هێنابووی کە "کابرای پیر هەر چەند کاتەژمێر کەرەتێک مێشکی دەگۆڕێ و بۆ ئەوە نابێ تەنانەت بۆ ماوەی پێنج خولەکیش باوەڕی پێبکەی."

لە هەمان کاتیشدا، سووپای سێربی لەناو جەماوەرەوە، وەک هێزێکی هاوپەیمانی، خەریک بوو بەرەو ناوچەکانی ئوتریشی ڕای دەدا و پرژوبڵاو دەبۆوە، یەکەم جار بەرەو باکوور و باشوور و دواتر، لە مانگی نوامبردا، بەرەو کرۆواسی و سلۆڤێنیا. بەرپرسانی فەرەنسەیی، کە بەناو بەرێوەبەری کەرتەکە بوون، زۆر پیاوچاکانە و خێرخوازانە سەیریان دەکرد. فەرەنسە هیچ دژایەتیەکی لەگەڵ یۆگۆسلاڤی بەهێز نەبوو، کە وەک وەستێنەیەک وابوو لەبەرانبەر ئیتالیادا. کاتێکە گیانفیداکەرانی یۆگۆسلاڤیا، کە ژمارەیان دەگەیشتە ٨٠،٠٠٠ سەرباز لە دەوڵەتی ئوتریش-مەجارستانەوە هاتبوون و ئێستا لە بن باڵی هاوپەیمانیدا خەباتیان دەکرد، هەوڵیان دەدا هاوپەیمانی وەک هێزێکی داگیرکەر بە فەرمی بناسن، پاسیک، سەرەڕای پێناخۆشبوونی ترامبیک و کرۆواتەکانی تر، دڵنیا بوو لەوەیکە ئەمە نەدەهاتە ئاراوە. بە هاندانی سێربیەکان، کۆمەڵانی خۆ-دابینکراو لە بانات و لە بۆسنی هێرزیگۆڤینا بۆیەکگرتنەوە لەگەڵ سێربستان، بە پەلەلە، دەنگیان دا. لە مۆنتێنگرۆ، هێزەکانی سێربی وەک داگیرکەر هاتبوونە ئەوێ، و کۆمەڵەیەکی نیشتمانی، کە پێدەچوو تەنیا لەو کەسانە پێکهاتبێ کە بیروباوەڕێکی دروستیان هەبوو، بە هەمان چەشن بەپەلە پاشاکەی خۆیان لە سەر تەخت لابرد و لەگەڵ سێربستان یەکیان گرت.٢٥٩

لە زاگرێب، شۆڕای نیشتمانی دەست و پێی خۆی گوم کردبوو و کەوتبووە دڵەڕاوکێ و هات و هاوار. ئەو شۆڕایە خاوەنی هیچ هێزێکی تایبەت بە خۆی نەبوو، و کاتێکە گوندنشینان هێرشیان کردە سەر خاوەن زەوی و زارەکان و چەند تاقمێک لە تالانکەران دووکانەکان و کاروکاسبیەکانیان بە تالان برد یاسا و دەستوور ڕوو لە نەمان دەڕۆیشتن. بە درێژایی ئادریاتیکدا، هێزەکانی ئیتالی خەریک بوون بە سەر بەندەرە سەرەکیەکاندا دەستیان ڕادەگەیشت. خۆپیشاندەران لە شەقامەکانی زاگرێب دەرکەوتن و

داوای یەکگرتنەوەی بەپەلەیان دەکرد لەگەڵ سێربستان. لە ٢٥ی نوامبردا، شۆڕای نیشتمانی بەپەلە بڕیاری هێنا سەرئەوە کە داوای یەکگرتنەوە لە سێربستان بکات. ووردەکاریە قڕاویەکانی تر، وەکوو یاسای بنەڕەتی، دەبوایە دواتر داکووژانایە. ڕێبەرێکی ناسیۆنالیستی کرۆواتی " وەک قازێکی سەرمەست لەناو تەم و مژدا" هەڕەشەی دەکرد و لەخۆڕا بە شاخ و باڵی بێلگرادا هەڵدەپڕژا. زۆرلایەن وابیریان دەکردەوە کە هێزەکان بە دڵنیایەوە لە ئەوان پارێزگاری دەکەن. پیاوێکی میلیتاری ئەمەریکی لە سەرەتای ساڵی ١٩١٩دا لە گوزارشەکەی خۆیدا ئاماژەی بەوە کردبوو کە " حکوومەت و خەڵک متمانەیەکی سەیریان بە وڵاتەیەکگرتووەکان هەیە و بەردەوام جەختی لەسەر دەکەنەوە و وەک قارەمانی خۆیان لە پاریس ناوی دەبەن. ئەوان بەردەوام ئاماژە بە ویلسۆن و ڕێبازەکەی دەکەن، و لەسەر ئەو باوەڕەن کە داواکاریەکانی نیشتمانی و هێمنایەتی نیشتمانی ئەوان، وەکوو هینی حکوومەتە بچووکەکانی تر، تەنیا کاتێک دەستەبەر دەبن کە ئەم ڕێبازانە وەک بنەمای نانەوەی ئاشتی پەسەندکرێن و جێبەجێ کرێن." ٢٦٠

لە ١ی ئۆکتۆبری ساڵی ١٩١٨، شازادە ئەلێکساندری سێربستان میرنشینی سێربەکان، کرۆواتەکان و سلۆڤێنیەکانی ڕاگەیاند. ناوەکە خۆی لە خۆیدا کێشەی درووست دەکرد؛ بەگشتی غەیرە-سێربیەکان یەکەمایەتیان دەدا بە "یۆگۆسلاڤیا" چون ئەو ناوە هەڵگری مانای یەکیەتیەکی هاوچەشن بوو. سێربەکان خوازیاری ناوێک بوون کە گرنگی دەدا بە ناوەندبوونی سێربستان. ئەوە یەکگرتنەوەیەکی نالەبار و نەگونجاو بوو، لەنێوان خەڵکانێک کە بە مێژووی چەند ساڵە، ئایین، کاریگەریەکانی کولتووری و شەڕ دابەش کرابوون. ئایا داواکاریەکانی ڕەگەزایەتی هاوچەشن و زمانی هاوشێوە بەس بوون بۆ ئەوەیکە درێژە بە تەمەنی ئەو ناوە بدەن؟ بیانیەکان بە گومانەوە لەمەیان دەڕوانی؛ چاودێرێکی میلیتاری ئەمەریکی لە بەهاری ساڵی ١٩١٩دا نووسیبووی کە " چون مەقاماتی ڕەسمی حکوومی بە خۆیان ناپەرمن و ناوێرن لەبەرانبەر ئەم هەڵوێستە بوەستن کە گوایە کرۆواتەکان و سێربەکان یەک نەتەوەن، باسکردن لەو شتە شتێکی بێ مانا و هیچ و پووچە. "کەش و هەوا"ی کۆمەڵایەتی شتێکی تەواو جیاوازە. سێربەکان سەربازانی گوندنشینن؛ کرۆواتەکان لە بیروباوەڕدا ڕۆشنبیرانی ناچالاکن، داواکاری گشتی، وەک کەسێک کە چاوەڕوانی بیروباوەڕێکی بەهێزی لێدەکرێ، بەپانەوە و ڕاشکاوانە بە منی ڕاگەیاند کە زۆر لەمێژە کرۆواتەکان لە خەبات دژ بە چەوسێنەرانی ماگیاری خۆیان دەستیان هەڵگرتوە، و ژیانی خۆیان لەسەر هۆنەر و زانست داناوە." ئەو ئاماژەی بەوە کرد کە سووپای سێربی ڕۆژلەدوای ڕۆژ لە سەراسەری ناوچەکانی کرۆوات نشین خەریک بوو ناوی دەزرا و لەبەرچاوان دەکەوت. ٢٦١

به باوەڕی زۆربەی سێربەکان کە گوایە ئەوان لەباتی دامەزراندنی وڵاتێکی نوێ پەرەیان بە ناوچەی سێربی دابوو، و بە گومانی ئەوان کە گوایە کرۆواتەکان و سلۆڤێنیەکان و مسوڵمانانی بۆسنیایی زۆر هەولیان نەدابوو تا خۆیان لە دەسەڵاتی هازبێرگ ڕزگار بکەن کارەکان لایەکیان نەدەکەوت بە لایەکدا و کێشەکان چارەسەر نەدەکران. هەرچەند سێربەکان کەمتر لە نیوەی حەشیمەتیان لەخۆ گرتبوو، ئەوان وڵاتی تازەیان بەڕێوە دەبرد. سوپای سێربی گۆڕا و بوو بە سوپای یۆگۆسلاڤ؛ یەکەکانی کرۆواسی لە سوپای دەوڵەتی مەجارستان-ئوتریش جیابوونەوە. لە بۆرۆکراسی و حکوومەتدا، سێربەکان هەمووی پۆستە گرنگەکانیان بە دەستەوە بوو. بێلگراد وەک پەیتەخت مایەوە و پاشاکانی سێربستان گۆڕان و بوون بە پاشاکانی وڵاتی تازە. ئەلێکساندێر سوێندی ئەمەکدارانەی بۆ یاسای بنەڕەتی لە ٢٨ی ژوەنی ساڵی ١٩٢١دا خوارد، لە ساڵیادی شەڕی کۆزۆوۆ، گرنگترین ڕۆژ لە مێژووی سێربستاندا.٢٦٢ ئەوە دەستپێکێک بوو کە یۆگۆسلاڤیا لەوە بەولاوە قەت خۆی نەگرتەوە.

❊ ❊ ❊ ❊

هەر لە یەکەمین کۆبوونەویدا لە پاریس، شۆڕای عالی خۆی لەبەردەم چەلەحانە و دەندووکە دەندووکە لەگەڵ یۆگۆسلاوی تازە سەرهەڵداو دۆزیبۆوە. ئایا مۆنتێنگرۆ دەبێ وەک وڵاتێکی جیاواز هەڵس و کەوتی لەگەڵ بکرێت یان نا؟ دەنگدانێکی بەپەلە بۆ یەککرتنەوە لەگەڵ سێربستان و لەسەرکارلابردنی بنەماڵەی پاشا شەڕێکی چەکدارانەی لێکەوتبۆوە لەنێوان یوونانیەکان، کە یەکیەتیەکەیان بە فەرمی نەدەناسی و بە بەگشتی پاشاپەرەست بوون، و سپی پێستەکان، کە هەڵوێستی پێچەوانەیان هەبوو. (ڕەنگەکان و جیاوازیەکان بەدوای ڕووخانی یۆگۆسلاڤی تیتۆ لە ساڵی ١٩٩١ سەرلەنوێ سەریان هەڵدایەوە.) سۆنینۆ، کاتێکە بۆ ئیتالیایەکان قسەی دەکرد، ڕەخنەی گرت لە نوێنەرایەتی جیاجیا لەسەر ئەو بوارانەی کە سێربەکان و مۆنتێنگرینەکان هاوبەش بوون. ئیتالیا بە ڕاشکاوی دژی ئەوە بوو کە سێربستان زیاتر لەوەپێش دەنگی تری هەبێت. (ئیتالیەکان زۆر بەوە خۆشحاڵ بوون کە ببینن مۆنتێنگرۆ لەلایەن سێربستانەوە قوت دەدرێت، و هیوادارش بوون کە ئەو پارووە لە گەروویان بە خۆشی نەچێتە خوارێ.) لیۆد جۆرج و ویلسۆن گوێیان بۆ هەرکیان شل دەکرد. بەتایبەت ویلسۆن زۆر بۆ مافی خوموختاری بۆ مۆنتێنگرۆیەکان بە پەرۆش بوو: "بزووتنەوەی سێربستان ببوە هۆی ئەوە کە ئەو دژ بە سێربستان بۆچوونێکی مێشک تەسکانەی هەبێت. پرۆسەکانی خودموختاری کە گوایە دەبێ بە زەخت و بە زۆری بسەپێن ئەوە دژ بە هەموو پرەنسیپ و یاساکان بوو." وەک سەرجەم سیاسەتمەدارەکان بۆی چووبوون کێشەکە لە پەیاکردنی کەسێک دابوو کە بتوانێ لەو هەل و مەرجەی کە لە ئارادابوو بۆ مۆنتێنگرینەکان قسە بکات. ئایا هاوپەیمانان

پێویسته پاشا به فەرمی بناسن؟ بالفۆر زۆر بە توندی وتبووی کە "ئێمە پارەکەی بۆ دەدەین." (بەریتانیا و فەرەنسە لەماوەی شەڕدا یارمەتی نیکۆلاسیان دابوو و هێشتا نەهاتبوونە سەر ئەو بڕیارە کە چیتر بە فەرمی نەیناسن.) ویلسۆن ڕەخنەی گرتبوو لەوە کە پاشا تەنیا لەبەرژەوەندی خۆیدا قسە دەکا نەوەک لەبەرژەوەندی مۆنتێنیگرۆ.٢٦٣

کێشەی زۆر لەوانە گەورەتر چاوەڕوانی ئاشتیکەرانی دەکرد، بەڵام سەبارەت بە مۆنتینەگرۆ شتێکی زۆر سەیر لە ئارادا بوو. ئەو وڵاتە، وەک خاڵێک لە سەر خەریتە لەنێوان کرۆواسی و ئاڵبانیا ئەوەندە بچووک بوو کە کەم کەس دەیدۆزیەوە، نادیار و گرنگ، دوورەپەرێز و ڕازاوە بوو. بە پێی ئەفسانەیەکی کۆنی مۆنتێنیگرینی، کاتێکە خوا دەستی دایە درووست کردنی جیهان ئەو هەموو شاخ و کەژەکانی خۆی خستە ناو جانتایەکەوە و هەمویانی تێکشکاند و بە شێوەیەکی تێکەڵ پێکەڵ ڕژاندی بەسەر شوێنێکدا کە نیشتمانەکەی ئەوانی لێکەوتەوە. مۆنتینیگرینەکان هەربۆخۆیان خۆیان لەگەڵ کێوەکان ڕاهێنا. پێدەچێ ئەوان لەهەموو خەڵکانی ئەوروپا باڵابەرزتر، جوانچاکتر، بەسامتر، بوێرتر و تەمەڵتر بن. هەتابڵێی تامەزرۆی خواردنەوەی قاوە و گێڕانەوەی چیرۆکەکۆنەکانی سەرکەوتن و شەڕوشۆڕە خوێناویەکان بوون. گەشتیارێکی ئازا بەناوی ئێدیت دۆرهام قینی لێ هەڵگرتن کاتێک کە ئەو بێ مەبەست چاوی کەوت بە جانتای شەڕکەرێکی ڕەسەن و لە ناو ئەوشتانەی کە بە تاڵان بردبووی لووتی شەست مرۆڤی تێدا دۆزیەوە؛ لەو کاتە بەولاوە ئەو بڕیاری دا هەر بە ئاڵبانیەکان وەفادار بمێنێتەوە.٢٦٤

لەناو ئەفسانەکانی ئەوان باسی ئەوە کرابوو کە گوایە مۆنتینیگرینەکان بە ڕەچەڵەک دەگەڕانەوە سەر سێربەکان کە لە چەنگ تورکە هێرشکەرەکان لە سەدەی چاردەهەمدا هەڕایان کردبوو، و ئەمەش ڕاستە کە ئەوان وەکوو سێربەکان ئۆرتۆدۆکس بوون و بە شێوە زاراوەیەکی سێربی دەدوان. هەر لە ڕێگای کێوەکانیانەوە لەبەرانبەر تورکەکان شەڕیان کردبوو تا بەچۆکیان داهێنابوون و بۆیە وەکوو دوورگەیەکی سەربەخۆی مەسیحی لەناو دەریایەکی مسوڵمانی تورکی مابوونەوە. دەسەڵاتدارەکانیان، هەتا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم، بیشۆپی شەڕکەر[سەرکردەی قەشەکان] بوون. زنجیرەی حاکمانی سەردەم لەلایەن دوایەمین بیشۆپی هێڵ لە ساڵی ١٨٥١ دامەزرا، ئەوکاتەی کە ئەو لە ڕەبەنی و بێ ژنی ماندوو بوو و ژنی هێنا. نەوەی کوڕی ئەو، نیکۆلاسی دووهەم، لە ساڵی ١٨٦٠ بەم لاوە لە سەر تەخت بوو.

نیکۆلۆس بۆخۆی، بەڕێکەوت، کەوتبوە پاریس، بژێوی ژیانی بە مووچەیەکی کەمی خانەنشینی لە بەریتانیاوە دابین دەکرا هەرچەند کچەکانی خەریکی کاری خەیاتی و دوورینی جل و بەرگی ژنانە بوون. سەبارەت بە ئەو دوو بۆچونی جیاواز هەبوو یەکیان بۆچوونی ڕێبێکا

وێست کە وەک قۆشمەچیەکی دۆدە ناوی دەبرد یان بۆچوونی ئێدیت دۆرهام کە بەرلەوەی شەڕ دەست پێبکات ئێوارەیەکی خۆشی لەگەڵ ئەو ڕابوارد و وەک پاشایەکی شەرکەری گەورە ناوی لێدەبرد. نیکۆلاس پاشا هالاوکی سەدەکانی ناوینی لێدەهات: پێداگری کردنی لەسەر ڕێبەریکردنی هێزەکانی خۆی تا ناوجەرگەی خەبات، پێداگری لەسەر دادوەری کردن بە سەر کورسیەکەی خۆیەوە لەژێر دارێکی کەونارا، تەنانەت ئەو میداڵە پڕ شان و شکۆیانەی کە ئەو بە خۆی و بە هاوڕیکانی بەزۆری دەیبەخشی. پایتەختەکەی ئەو، سێتینجی، گوندێکی یەکجار گەورە بوو، بانک ئاف مۆتینگیرۆ کەپرێکی بچووک بوو، و گڕاند هەوتێل میاونخانەیەکی شەوتارۆژ بوو. بیلجاردە، کۆشکی دێرینی ئەو، کە ناوەکەی لە مێزی بیلیاردی ئینگلیزیەوە کە خەڵاتی زۆری لەسەر بەخشرابوو گیرابوو، پاڵی دابوو بە قەدی کێوێکەوە، و لە مسافرخانەیەکی لادێکانی ئینگلیز دەچوو. کۆشکە تازەکەی ئەو زیاتر لە پانسیۆنێکی ئەڵمانی دەچوو، منالانی پاشا بە بەرگی نەتەوەیەوە لەلایەن مامۆستایەکی تایبەتی سۆئیسیەوە وانەیان پێ ئەوتراوە لەهەمان کاتیشدا پاشا لەسەر پیپلیکانەکانی پێشەوە دادەنیشت و چاوەڕوانی میوانەکانی دەکرد. فرانز لێهار مۆنتێنگرۆی وەک نموونەیەک بۆ پۆنتێڤێدریا لە کتێبی *بێوەژنی ڕووخۆش* دەهێناوە.٢٦٥

لەڕاستیدا، نیکۆلاس کەسایەتیەکی سەیر و سەرنجڕاکێش ئەو جۆرەی کە دەهاتە بەرچاو نەبوو. ئەو لە فەڕانسە، لەنێوان شوێنەکانی تردا، خوێندەواری تەواو کردبوو و ئەو بەرلە شەڕێک کە قەبارەی وڵاتە بچووکەکەی خۆی چوار کەڕەت گەورەتر کردبۆوە لە ناو ئاڵۆزیەکانی سیاسەتی باڵکانـدا زۆر بـەو سـەرکەوتنەوە نـازیبوو. لەگـەڵ ئەمانەشـدا، ئـەو منداڵـەکانی خـۆی بەباشـی داوودامەزراو کردبوو، دوو دانە لە کچەکانی دابوو بە دووکەکانی پاشای ڕووسی، یەکیان بە پاشای ئیتالیا و یەکی تریشیان بە پاشای سێربستان. ئەو لەمێژ بوو بە لکاندنی سێربستان بە مۆنتێنگرۆوە خەونی دەدی؛ هیچ ڕێگایەکی تر بۆ هێنانەدی ئەم خەونە لەسەر ڕێدا نەبوو. لە ساڵی ١٩١٩دا ئەو هێشتا هەر بە تەما بوو تەختی پاشایەتیەک کە لەماوەی شەڕدا لە دەستی دابوو بە دەستی بێنێتەوە.

مۆنتێنگرۆ کاتێک خزایە ناو شەڕەوە کە ئوتریش لە ساڵی ١٩١٦دا هێرشی کردەسەر؛ نیکۆلاس بەرەو ئیتالیا هەڵات، هەلاتنێک کە زۆربەی ئەندامانی هاوپەیمانان بە چالاکیەکی سەرسووڕهێنەر ناویان لێبرد. گومان لەوە کە گوایە بە نهێنی لەگەڵ ئوتریشیەکان مامەلەی کردوە لە پاریسیش هەر لەگەڵی بوو. ئۆفیسی دەرەوەی بەریتانیا ئەوی وەک هاوپەیمانێکی خائین سەیر دەکرد، کە پێدەچێ ئەو تاوانە بە هەق بووبێت. لە باس و خواست کردن لەسەر نوێنەرایەتی مۆنتێنگرۆ دەرکەوت کە هیچ

کەس لە پاریس سەبارەت بەو بابەتە زانیاریەکی ئەوتۆی نیە، هەر بۆیە پرسی مۆنتێنگرۆ بە شێوەیەکی کراوە خرایە بەر باس و خواست. تا کۆتایی هاتنی کۆڕی ئاشتی هەر درێژەی هەبوو.٢٦٦

نیکۆلاس هەوڵی ئەنجامی ئیشگەلێکی دا کە نەیتوانی بە ئەنجامیان بگەیەنێ. ئەو هەوڵی دا بە کۆلۆنێل هاوس یەکێک لە دەستووره هەرە باشەکانی ڕابگەیەنێت؛ ئەو نامەی بۆ ویلسۆن نووسی؛ ئەو یادداشتێکی دڵخۆشکەرانەی بڵاو کردبۆوە کە تێیدا داوای بەشێکی لە بۆسنی کردبوو کە ببەخشرێت بە مۆنتێنیگرۆ. ئەو هیچ وڵامێکی پێ نەگەیشتەوە: ئەو کێشە ئاڵۆزانەی کە هاتبوونە سەر ڕێ بە بەراورد لەگەڵ وڵاتێکی ٢٠٠،٠٠٠ کەسی یەکجار زۆر بوون. لەژێر چاودێری سێربەکان، دەنگدانی تازە بەڕێوە چوو تا بیسەلمێنێ کە مۆنتێنیگرۆکان خوازیاری ئەوە بوون کە ببن بە بەشێک لە یوگۆسلاڤیا. لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٠دا، فەرەنسە لە پاڵپشتی کردن لە نیکۆلاس پاشگەز بۆوە؛ لە بەهاری ساڵی ١٩٢١دا، بەریتانیاش هەر هەمان کاری کرد. نیکۆلاس لە بەهاری ساڵی ١٩٢١ کە هێشتا هەر کە تاراوگە بوو کۆچی دوایی کرد. نەوەی کوڕی ئەو کە لە فەرەنسە ئەندازیاری بیناسازی بوو وتبووی کە ئەو هیچ حەز ناکا بۆ ڕایەکی تر بچێتەوە سەر تەخت. لە ساڵی ١٩١٨ بەم لاوە مۆنتینێگرۆ وەک پینەیەکی ناشیرین بە جەستەی یوگۆسلاڤیا ماوەتەوە و ئێستاش هەر هەیە.

* * * *

کاتێکە شاندی نوێنەرایەتی یوگۆسلاڤیا لە ئاکامدا دەرفەتی پێدرا تا لە فەوریەی ساڵی ١٩١٩دا بۆ شۆڕای عالی قسە بکات، کۆمەڵێک داواکاری هێنایە بەرباس کە وەکوو خودی نەتەوەکە بەپەلە و هەلە و بەناکۆکی خرابوونە سەریەک و کۆکرابوونەوە. لە هەوڵێک بۆ ڕازی کردنی دڵی هەموو لایەک، شەش وڵات لەو حەوت وڵاتەی کە سنووریان پێکەوە هەبوو کەوتنە بەر باس و خواست. تەنیا سنوورێک لەگەڵ یوونان، لە ناوچەی مەقدوونیەی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی پێشوو، تەنیا کەوتەوە. لە ڕۆژئاوا، سلۆڤێنیەکان پێداگریان دەکرد لەسەر کلاگینفۆرت، لە سەر لایەنی باکووری لەغاوی باشووری کێوەکانی ئالپ، وەک هێمنایەتی لەبەرانبەر ئەوشتانەی کە پاشماوەی ئوتریش بوون. بە واتایەکی تر، ئەوان بە سنووره کۆنەکانی نێوان ئیتالیا و دەوڵەتی مەجارستان-ئوتریش خۆشحاڵ دەبوون. پاسیک، وەکوو جاران، سەرقاڵی یاریەکەی خۆی بوو. ئارەزووی سەرەکی ئەو، و سێربەکانی تر، ئەوە بوو کە بەرەو ڕۆژهەڵات بەرەو بۆلغارستان و باکووری دانووب بڕۆن ، تا شوێن پێیەک لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی مەجارستان هەڵگرن. لەگەڵ زۆر شتی تر، ئەمە لە بێلگرادی پایتەخت پارێزگاری دەکرد، کە لە پێگەیەکی دەگمەنی بەربەرەڵا هەڵکەوتبوو، و پانایی

چۆمێک لە وڵاتی مەجارستان-ئوتریشی ناکۆکی جیا دەکردەوە. سێربەکان سەرەڕای ئەم کەم و کوورپە ئەویان هەڵبژاردبوو چون لەگەڵ چۆمی دانووب یەکیان دەگرتەوە کە لە باکوور و چۆمی ساڤا بەرەو خوار سارێژ دەبوو، کە لە ڕۆژئاواوە دەهات، لە یەکێک لە گرنگترین خاڵە ستراتیجیەکان لە ئورووپای باشوورەوە. لە باکوورەوە بەرەو ڕۆژئاوا تاجران، حاجیان یان سووپاکان دەبوایە لە بێلگرادەوە تێپەڕانایە ئەگەر بیانویستایە بچوونایە بۆ یوونان و بەندەری گەورە لە سالۆنیکا، یان بەرەو ڕۆژهەڵات لەڕێگای بۆلغارستانەوە و لەوێوە بۆ قۆستەنتەنیە. ئەو شارە لە لایەن ڕۆمانیەکانەوە، هانسەکانەوە، خاچپەرستانەوە، تورکەکانەوە، ئوتریشیەکان و هەڵبەت خودی سێربەکان گەمارۆ درابوو، پارێزگاری لێکرابوو، بە تاڵان برابوو و شەڕی تێدا کرابوو.٢٦٧

لە دوانیوەڕۆی ڕۆژی ١٨ی فەوریەدا، سێربیەک، بەناوی میلینکۆ ڤێسنیک بە داوای لێبوردنەوە دەستی پێکرد کە ئەو هێشتا بەڵگەی[زانیاری] چەسپاوی لەبەردەم دا نیە تا پێشکەش بە هێزەکانی بکات. ئەو هەر لەبەر خۆیەوە مرەمرِی دەهات و دەیوت کە هەست بە هەندێک "کێشەی تایبەت" دەکرێ. ڤێنسیک، کە لە شاندی نوێنەرایەتیدا لە هەموویان چاکتر قسەی دەکرد زمانلووس، ڕووخۆش و گەڕیدەیەکی چاک بوو. هاوسەری دەوڵەمەند و دڵڕفێنی ئەو لەگەڵ خاتوو ویلسۆنی تازە زۆر بەینیان خۆش بوو. ئەو خەریتەکەی دەرهێنا و بنەمای داواکاریەکانی یوگۆسلاڤیای پێشکەش کرد: خەڵاتی چاکخوازی (سێربستان هاوپەیمانێکی پاشاپەرست بوو، و سلاڤەکانی باشوور لە چوارچێوەی دەوڵەتی مەجارستان-ئوتریشدا ئەوەی لە دەستیان هاتبوو کردبوویان تا هەوڵەکانی شەڕخوازانە دوژمن پووچەڵ کەنەوە)، خود-موختاری، هێمنایەتی. هاوکارانی سلۆڤێنی و کرۆواتی لە درێژەی باسەکەدا ئەو داواکاریە قڕاویانەیان بە خراپ نەدەزانی و بەرەواشیان دەزانی: بەشێکی زۆر کە شاری ئیتالیایی تریستە، پارێزگاکانی مەجاری باکا و باکووری بارایانەی سنووره کۆنەکانی کرۆواسی، بەشەکانی ڕۆمانی وێژی بانات و ناوچەکانی ئاڵمانی وێژی دەورووبەری کلاگینفۆرت. ئەوان بەرەنگاری ئەوە بوونەوە کە داوای ناوچەکانی غەیری-سلاڤیان کردبێت. ئامارەکانی پێشوو جێی متمانە نەبوون، ئەوەی ڕاستی بێت ئوتریشیەکان و مەجارستانیەکان بەئانقەست قوتابخانەکان و کولتووری سلاڤیان سەرکوت کردبوو. بۆچی دەبێ کابرایەک کە لە ئیمپراتۆری پێشو لە سلۆڤێنی داوای بلیتێکی شەمەندەفەری کردبوو دەستگیر بکرێت. تەنانەت لایەنگرانی یوگۆسلاڤیاش تووشی گێرەوکێشە هاتبوون. هاورێیەکی سێتۆن-واتسۆن پرسیاری کردبوو کە" بڵێی ئەقڵیان لە دەست دابێ و نەتوانن چاکە لە خراپە کەنەوە؟"٢٦٨

یۆگۆسلاڤیا پێشتر ببوە خاوەنی بەشێکی زۆر لەو شتانەی کە لە دەوڵەتی مەجارستان-ئوتریش لە کاتی دەستپێکردنی کۆڕی ئاشتیدا خوازیاریان بوو-بوجنی-هێرزەگۆڤینە، زەویەکانی ناودڵی سلۆڤێنیا لە پارێزگای کۆنی ئوتریشی کارنیۆلا، بەشێکی زۆر لە دالماتیا و هەڵبەت میرنشینی کۆنی کرۆواسی- بەڵام هێشتا بە دوای شتی تریشەوە بوو. شاندەکە داوای دوو پارچەی بچووکی دەکرد لە رۆژئاوا کە ناسراو بوون بە مێدجۆمۆرجێ و پریکۆمۆرجێ، شوێنێک کە کرۆواسی لەگەڵ ئوتریش و مەجارستان یەکی دەگرتەوە، و، دوورتر بەرەو ڕۆژهەڵات، بارانیا و باکا، بەشێک لە دەشتە پڕ پیت و بەرەکەتەکانی باشووری مەجارستانی دەگرتەوە. مەجارستا لە پاریس هاوڕێی زۆر کەمی هەبوون: ئەو تەنیا دوژمنێکی شکستخواردوو نەبوو بەڵکوو خۆی لەبەردەم شۆڕشێکدا دەبینددەوە. گرنگترین پرسێک کە دەبوایە لە لایەن کۆڕی ئاشتیەوە بڕیاری لەسەر لێبدرایە ئەوەبوو کە یۆگۆسلاڤیا بە پێی ئەقڵ دەبوایە چەندەی لە مەجارستان پێببڕایە. مێدجۆمۆرجێ و پریکۆمۆرجێ بەگشتی کرۆوات و سلۆڤێنی بوون (هەرچەند مەجاریەکان لە هەوڵی ئەوەدابوون کە بە بارێکیتردا داواکاریەکەیان ئاراستە بکەن) و دوا هەندێک وت و ویژکردن دران بە دەستەوە. چارەنووسی بارانیا و باکا لە کێشەی نێوان ڕۆمانیا و یۆگۆسلاڤیا ئالاّ و ماوەیەکی زیاتری برد تا داکووژایەوە.

بۆ سەرجەم نەتەوەکانی باڵکان، شکستەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی بەرلە شەڕ چەندە دەرفەتێکی شادیهێنەریان هێنا ئاراوە لەبەینچوونی دەوڵەتی ئوتریش-مەجارستانیش بە هەمان ئەندازە. هەریەکەو خوازیاری ئەوەندە بوو کە دەیتوانی لە ئاستی بێت: خودموختاری بۆ خۆی نەوەک بۆ دراوسێکانی. پێشتر لە ماوەی ئەو سەردەمە ئاڵۆزەدا لە ئۆکتۆبری ساڵی ١٩١٨ کاتێکە دەوڵەتی مەجارستان-ئوتریش داوای ئاشتی دەکرد و دواتر لە مێژوودا سڕایەوە، حکوومەتەکانی باڵکان سەرقاڵی دابەشکردنی ملک و ماڵات بوون، و سووپاکانیان دەرژاندە ناوەوە. کۆمەڵانی تازە وەک کارگی پاش هەورەتریشقە هەڵتۆقین: کۆمەڵەی کرێکاران، کۆمەڵەی سەربازان، کۆمەڵەی کرۆواتەکان، مەقدوونیەکان، یوونانیەکان. ئاشکرا نەبوو کە کێ لە پشت سەریانەوەیە، بەڵام لەوەدەچوو کە قەت کۆتاییان نەیەت و داواکاریەکانیشیان سنوورەکانی تێپەڕاندبوو.

یوونان داوای پاشماوەی تورکیەی ئەورووپی دەکرد؛ بۆلغارستانیش هەروابوو. هەم یوونان و هەمیش یۆگۆسلاڤیا کەوتبوونە فکری دابەشکردنی ئالبانیا. ڕۆمانیا و بۆلغارستان نەیاندەتوانی لەسەر خاوەندارێتی دۆبرۆدجا، کە بە درێژایی قەراخ ئاوی ڕۆژئاوای دەریای ڕەش درێژەی هەبوو، بڕیاریان ساخ کەنەوە. یوونان، سێربستان و بۆلغارستان داوای بەشی زیاتریان لە مەقدوونیە دەکرد. بە

کەرمە باس باسی ڕزگارکردنی شارستانیەت و خەبات کردن لەپێناو ڕاستی و شەرەف دابوو؛ و لەژێریشەوە باس باسی حەساب و کتابی سیاسەتی زۆر بوو. لە کەش و هەوای سەرخۆشکەری ساڵی ١٩١٩دا، ئەگەر ئەوەندەی لە دەستت دەهات بۆ خۆتت نەفڕاندایە خۆشێتکردن بوو. سیاسەتمەدارانی باڵکان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە ویلسۆنیان قەبووڵە؛ ئەوان باسیان لە زمانی خودموختاری، دادپەروەری و هەرەوەزی نێونەتەوەیان دەکرد، و ئەوان سکاڵانامەیان درووست دەکرد تا پشتگری لە زەوی ڕفاندنی شێوازی کۆنی خۆیان بکەن، وەک بڵێی ئەمانە نوێنەرانی دەنگی خەڵکن. ئەوان بەجوانی نەقشەکێشراوەکانیان پیشان دا. شارەزایەکی ئەمەریکی نووسیبووی کە "تویژینەوەیەک کە بتوانێ هەمووی جۆرەکانی ساختەکاری نەقشە لەخۆ بگرێت کە شەڕ و کۆڕی ئاشتی داوایان کردبوو پەرتووکێکی قەبە هەڵدەگرێت...ئەوە لە باڵکان بوو کە بەکارهێنانی ئەم ڕەوتە گەیشتە ترۆپکی هەرە بەرزی خۆی." ٢٦٩

لە توانایی ئاشتیکەرەوەکاندا نەبوو کە خۆیان لەگەڵ ئەو هەموو داواکاریە بگونجێنن. ویلسۆن لە چاردە خاڵەکەی خۆیدا ئاماژەی بە ناوچەکانی باڵکان کردبوو، بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ کاتێکە ئەو باسی "ئازادترین دەرفەتی حکوومەتی خودموختاری "خەڵکانی مەجارستان-ئوتریشی کرد، و بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ کاتێکە ئەو وتی کە ڕۆمانیا، سێربستان و مۆنتینەگرۆ دەبێ دووبارە هەستنەوە سەرپێی خۆیان. ئەو بەڵێنی ئەوەشی دا کە سێربستان دەبێ دەستی بە دەریا ڕابگات، بەڵام شی نەکردەوە کە چۆن، و ئەوە کە وڵاتانی باڵکان، لەژێر چاودێری خێروومەندانەی هێزەکان، دەبێ هەرهەموویان "بەدرێژایی هێڵە لەمێژینە دامەزراوەکانی ئەمەکداری و نەتەوایەتی"دا دۆستی یەک بن. مانای ئەو دێڕەی دوایی چبوو خوا ئەیزانێ چیە بەڵام لەبەرچاونەگرتنی هەم مێژووی سەردەم و هەم تێکەڵاوی نەتەوەیی لە ناوچەکانی باڵکانی دەگەیاند.

ئەو هەستەش لە ئارادابوو کە هاوپەیمانانی بە وەفا دەبوو خەڵات بکرێن. سێربستانیش لەبەرانبەر ئەو نەهامەتیانەی کە بەسەری هاتبوو دەبوایە وەک قەرەبوو شتێکی پێبدرێت-بەندەرەکانی ئادریاتیک، یان لانی کەم دەستپێڕاگەیشتن بە ئائێجین. ڕۆانیا و یوونان واباشە لە هەندێک لەو قەول و بەڵێنانەی کە بەخۆڕای لە کاتی شەڕدا دەیاندا کەم کەنەوە. بۆلغارستان و تورکیەی عوسمانی لەبەرهۆی پێوەندی گرتن بە لایەنی دوژمنەوە مافی خۆیان بوو کە سزا بدرێن. سزاکە دەبێ چ بێت ئەوە شتێکی ترە. ئیمپراتۆری عوسمانی لە ناوچەکانی باڵکان شتێکی وای بۆ نەمابۆوە، و بۆلغارستانیش تێکشکا بوو و ئەوەندە نەبوو کە شوێنپێیەکی گرنگی لە ساڵی ١٩١٣دا لە دەست دابوو.

بەریتانیەکان بەگشتی سەبارەت بە ڕووداوەکانی ناوچەکانی باڵکان بێ لایەن بوون، هەروەک بۆ زۆربەی بەشەکانی ئەورووپای ناوەندی وابوون، بە مەرجێک کە بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا، تجاری یان دەریایی، لە مەترسی بە دوور بوونایە. ئەوان گرنگیان دەدا بە وڵاتانی بەهێز و سەقامگیر چون ئەوان وەک ڕێگرێک لەبەرانبەر ئەڵمان یان ڕووسیەی بووژاوە خەباتیان دەکرد. لە حاڵێکدا کە "سێربستانی وردیلەی جەسوور" پێداهەڵدەری تایبەت بە خۆی هەبوو، وەکوو مۆنتینیگرۆ و ئاڵبانیا، حکوومەتی بەریتانی ئامادە نەبوو هێزی بەریتانی یان پارەی بەریتانی بۆ مسۆگرکردنی خۆشی و کامەرانی خۆی تەخان بکات.٢٧٠ فەڕەنسە، بە پێچەوانە، هەمیشە لەبەرانبەر ئەڵماندا پێویستی بە پارێزەرێک هەبوو. سێربستان و ڕۆمانیای گەورەکراوە، بەرەو باکوور، چۆکسلەواکیا و پۆڵەندا کێشێکی هاوسەنگی وەها بەهێزیان دروست دەکرد کە ئەڵمانیا قەت نەخەڵەتابێت بەخۆی بپەرمێ و بۆ جارێکی تر هێرش کاتە سەر فەڕەنسە. و ئەگەر سێربستانێکی بەهێز بیتوانیایە ئیتالیا ئاقڵ بکات، چ باشتر.

جۆگرافیا ئیتالیای هێنابووە سەر ئەوەیکە ناوچەکانی باڵکان بە هەند بگرێت و گرنگی تایبەتی بداتێ. لە حاڵێکدا ئیتالیەکان بەگشتی کەیفخۆش بوون بەوەی کە کۆتایی هاتنی دەوڵەتی مەجارستان-ئوتریشیان بەکۆتایی هاتنی دوژمنێکی لەمێژینە دەدی، و لیبراڵەکان، لانی کەم، لەگەڵ ئەو نەتەوە بچووکانەی کە بۆ گەیشتن بە ئازادی خەباتیان دەکرد هاوسۆزیان دەکرد، ناسیۆنالیستەکانی ئیتالی نەیاندەویست هیچ هێزێکی تر باڵ بەسەر ناوچەکانی باڵکاندا بگرێت، جا ئەوە ڕووسیەی بۆلشویک بوایە یان ئەوەتا دەوڵەتی تازەی سلاڤی باشوور. ناسیۆنالیستەکان سیاسەتی ئیتالیایان بەرەو ئاستێکی داگیرکاری و شەڕخوازی ڕوولەگەشە دەبرد. چون لە دەوڵەتێکی بەهێزی سلاڤی باشوور دەترسا، ئیتالیا ئامادە بوو تا لە داواکاریەکانی دراوسێکانی خۆی ڕۆمانیا، ئوتریش و بۆلغارستان پاڵپشتی بکات. لە پاریس، سۆنینۆ تەنیا لەسەر ئەوە پێداگری دەکرد کە داواکاریەکانی ڕکابەرانەی ئیتالیا و یۆگۆسلاڤیا پێویستە تەنیا لەڕێگای شۆڕای عالیەوە تاوتوێ بکرێن. ئەو لەوە دەترسا، لەوانەیە ترسەکەی بەهەق بووبێت، کە لێژنەیەک لە پسپۆڕان سەبارەت بە ڕەوایی سنوورەکان دڵەڕاوکێیان لە دڵدا بێ، نەک سەبارەت بەو بەڵێنانەی کە ئیتالیا لە کاتی شەڕدا دابووی. ئەو چیرۆکە بەشێکە لە کێشەی گەورەی ئیتالیا و هاوپەیمانەکانی کە کۆڕی ئاشتی لەت و پەت کردبوو.

ئەمەریکیەکان لە ناوچەکانی باڵکان، وەکوو شوێنەکانی تر، ڕۆڵی تێکدەرێکی سادقیان گرتبوە بەر، داری پیری دیپلۆماسیان لە نێوقەددا دەبڕیەوە تا پێوەری تازە و جەسوورانەی خودموختاری بخەنە

گەڕ.۲۷۱ بەداخەوە، هەقیقەتەکان سەبارەت بە حەشیمەتەکانی ناوچەکانی باڵکان بەو ئاسانیە دەرنەدەکەوتن. بەکردەوەکردنی خۆپێناسەکردن لەڕێگای نەتەوەیی بوونەوە ئەوەندە تازە بوو کە زۆربەی دانیشتوانی ناوچەکانی باڵکان هێشتا هەر لەچوارچێوەگەلی ناوچە، خێڵ یان، وەک لە تورکەکانەوە بێرببوون، ئایین پێناسەیان بۆ خۆیان دادەنا. ئایا سێربەکان و کرۆواتەکان وەک یەک وابوون تەنیا لەبەر ئەوەیکە ئەوان بە زمانێکی هاوبەش قسەیان دەکرد، یان لێک جیاواز بوون ئەوی پێشوو بەگشتی ئۆرتۆدۆکس بوو و شێوەنووسینی سیریلیکی بەکار دەهێنا و ئەوی دواتر کاتۆلیک بوو و لاتینی بەکار دەهێنا؟ مەقدوونیەکان تایبەت بە کوێ بوون- بە یوونانیەکان بەهۆی مێژوویانەوە، یان بە بە سلاڤەکان بەهۆی زمانەکەیانەوە؟ چۆن دەکرێ لە شوێنێکی وەهادا کە تێکەڵ پێکەڵێکە لە خەڵکانی جۆراوجۆر سنووری گونجاو و دیار دابندرێت؟ چۆن دەکرێ خەڵکانێک وەها کە ترس و دڵەڕاوکێی یەکتریان لە دڵدایە پێکەوە بەبێ چارەسەری بەجێیان بێڵین؟ لە سەر نەقشەکانی حەشیمەتی ناوچەکانی باڵکان نموونەکان بە خاڵی وردوردی ڕەنگی پرژوبڵاو و جارجارە خاڵی ڕەش ڕازاندرابوونەوە. بەڵام لەسەر عەرزی بەو جوانیە نەبوون، مەنجەڵێک گومان و نەفرەت و قینەبەرایەتی کە لەبنەوە قوڵتیان دەدا.

ئەو سنوورانەی کە بە سەر ناوچەکەدا دەکێشران کەمینەی ناڕازی و دراوسێی تووڕەیان لێدەکەوتەوە. و لەناو جەرگەی ئەمانەدا یوگۆسلاڤیا هەڵکەوتبوو. ئەو وڵاتە بۆخۆی خیۆی درووست کردبوو، بەڵام ئاشتیکەران بە فەرمی دەیانناسی و لە زنجیرەیەک لێژنەی جیاجیادا سنوورەکانی ئەوێیان دیاری کردبوو. ئاکامەکەی وڵاتێک بوو سێ کەڕەت گەورەتر لە سێربستانی کۆن بەڵام بە دوژمنانێکی زیاترەوە. وڵاتی تازەی مۆنتێنێگرۆ، سلۆڤێنیا و بۆسنیای لە ئوتریش گرتبوو؛ کرۆواسی و بەشێک لە باناتی لە مەجارستان گرتبوو؛ و چەند پارچەیەک لە ئاڵبانیا و بۆلغارستان. ئەوەیکە جێی باس بوو، وەک زۆر جار لە کۆڕی ئاشتیدا دەهاتە ئاراوە، تەنیا زەوی و چارەنووسی دانیشتوانی ئەو وڵاتە نەبوو، بەڵکوو تۆڕی داهاتووی هاوپەیمانان بوو کە ئاشتی ئورووپا بەوێوە بەسرابۆوە.

ئوتریش، مەجارستان و بۆلغارستان، کە بەزی بوون، تازیەی ئەو خەسارەتانەیان گرت کە هاتبوو بە سەریاندا، هەم لەباری ناوچەییەوە و هەمیش لەباری خەڵکیەوە. تەنیا یوونان لە باشوور لەگەڵ وڵاتی تازە دۆستایەتی هەبوو. لەناو خودی یوگۆسلاڤیدا، ئەو خەڵکانەی کە جگە لە زمان لە هیچ خاڵێکی هاوبەشدا یەکتریان نەدەگرتەوە هەرگیز سەبارەت بە مانای وڵات لێکدانەوەیەکی هاوچەشنیان نەبوو. یوگۆسلاڤیا بەهۆی دەسکەوتەکانی لە شەڕی دووهەمی جیهانیدا سزایەکی قورس سەپا بە سەریدا،

واتە، دراوسێکانی بە یارمەتیەکی زۆر لەلایەن ئەڵمانیاوە، زەویەک کە لە کۆڕی ئاشتیدا بردبویەوە لێیان ستاندەوە و خەڵکانی ئەویّ بە یەکدا هەڵپڕژابوون. هەرچەند ڕێبەری کمۆنیست تیتۆ بڕیاری دا هەمووی ئەو پارچانە بخاتەوە سەر یەک، حەفتا ساڵ دوا بەفەرمی ناسینی هەبوونی ئەو وڵاتە لەلایەن کۆڕی ئاشتی پاریسەوە یۆگۆسلاڤیا دەستی کرد بە هەڵوەشانەوە و بەشی جیاجیای لێکەوتەوە، و لە مانگی مارسی ساڵی ٢٠٠٢ ناوی یۆگۆسلاڤیا بۆ هەمیشە شوکر بۆ خوا سڕدرایەوە. هەر لە ساڵی ١٩١٩ەوە دراوسێکانی ددانی خێریان پێدا نەدەهێنا و بەدیتنی دادەگیران.

*　　*　　*　　*

# ١٠

# ڕۆمانیا

چەند ڕۆژێک بەرلەوەی کۆڕی ئاشتی بەشێوەیەکی فەرمی دەست بە کارەکانی خۆی بکات، دەنگۆیەیەک گەیشتە ڕۆمانیا کە گوایە تەنیا بلژیک و سێربستان لەنێوان هێزە بچووکەکاندا بۆ مەبەستی بەشداری کردن لەو کۆڕە بانگێشت دەکرێن. ئیۆن براتیۆنۆ، سەرۆک وەزیری ڕۆمانیا، داگیراو "بە سۆز و داخێکی توبدەوە" باڵوێزانی هاوپەیمانی بانگێشت کرد و ڕەخنەی لێگرتن. ئەو وتی کە " ڕۆمانیا وەک کلۆڵێکی داماو کە خێری پێ بشێت هەڵس و کەوتی لەگەڵ دەکرێت. نەک وەک هاوپەیمانێکی خاوەن ماف." ئەو ئامۆژگاری ئەوانی کردبوو کە بە حکوومەتەکانیان ڕاگەیەنن کە ڕۆمانیا هەموو ساتێک هاوپەیمانێکی بە وەفا و ئەمەکدار بوە (وتەیەکی گوماناوی)؛ ئەو ناڕاستەوخۆ ڕەخنەی لە سێربستان دەگرت لەبەرهۆی ئەوە کە تەنیا چون هێرش کرابوە سەری تێکەڵاوی شەڕ بوو؛ ئەو بەشێوەیەکی نادیار سەبارەت بەو کەسانەی کە لە وڵاتانی خۆیان ڕابوون هەر گلە و گازەندەی هەبوو (هەندێک لە دوژمنانی سیاسی ئەو ڕێگایان کەوتبوە پاریس)؛ ئەو هەڕەشەی کردبوو کە ئەگەر بێت و هاوپەیمانان هۆشیان نەبوایە، هیچ شوێنەوار و کاریگەریەکیان لە ڕۆمانیا بۆ نەدەماوە؛ و ئەو هەڕەشەی کردبوو کە پاشەکشێ دەکا (لەچی، خوا ئەیزانی). باڵوێزانی هاوپەیمانی ئەم وتە سەیرەیان هاوڕێ لەگەڵ هەڕەشەیەکی خۆیان دا بە دەست حکوومەتەکەی خۆیانەوە: ئەو نەدەبوە هۆی دوورخستنەوەی ڕۆمانیا، چون ئەو وڵاتە لە بەرانبەر ڕووسیە و بیروباوەڕی بۆلشویزمی ڕووسیدا بەربەستێکی بەکەڵک بوو.٢٧٢ چون هێزە گەورەکان بەتەواوەتی بڕیاریان هێنابوە سەر ئەوەیکە کە ڕۆمانیا دەبێ نوێنەرایەتی خۆی هەبێت، پێویست بە هەڕەشە و گوڕەشە نەبوو جا چ بە کردەوە یان بە زمان.

ڕۆمانیەکان زۆر بەرز و سەیر لەخۆیان دەڕوانی؛ لەگەڵ ئەوەش لە کۆڕی ئاشتی چاوەڕوانی زۆر سەیریان هەبوو. هەر زوو لە ٨ی ژانویەدا، هارۆڵد نیکۆلسۆن، لە لایەن شاندی نوێنەرایەتی

بەریتانیاوە، دانیشتنێکی کورتی لەگەڵ نوێنەرانی ڕۆمانیەوە بەڕێوە برد: " ئەوان دەڵێن کە شەرم دەیانگرێت باسی پرسەکانی ناوخۆ بکەن. هەرچەند، لەبابەت پرسەکانی دەرەوە هیچ شەرمێکیان نیە، داوای بەشێکی زۆر لە مەجارستان دەکەن."٢٧٣ لەگەڵ ئەمانەش ڕۆمانیا خوازیاری بەشێک لە ڕوسیە، بێسارابیا، کە تازە خەریکی داگیرکردنی بوو، و بۆکۆڤینا لە ئوتریش لە باشوور بوو. داواکاریەکانی لەڕادەبەدەر بوون، بەڵام بۆ ئەوەی پێیان بگات زۆرباشی بۆ گرتبوو. هیچ هێزێکی ڕووسی نەیدەتوانی بەری بگرێت، و مەجارستان و ئوتریش فسیان نیشتبۆوە. ڕۆمانیا کەوتە ڕێ تا ترانزیلڤانیای مەجارستان داگیر بکات و بۆکۆڤینا چاوەڕوانی بڕیاری کۆتایی بوو لە پاریس. ئەویش تا بەستنی گرێبەستەکانی ئوتریش و مەجارستان دەهاتنە ئاراوە دەبوایە ماتڵ بمایە.

ڕۆمانیا لە داواکاریەکەی باناتیشدا —ئەویش لە سەر لیستی یۆگۆسلاڤیا لەگەڵ کێشەیەکی ئاڵۆزتر ڕووبەڕوو ببۆوە. ئەم شوێنە چەپەکە لادێیە کە لە بناری کێوەکانی ئاڵپی تایبەت بە ترانسیلڤانیا بەرەو خوارێ بۆ لای ڕۆژئاوا بەرەو کۆتایی باشووری دەشتەکانی مەجارستان هەلکەوتوە لە ساڵی ١٩١٩ قرەیەکی زۆری لە سەر سازبوو. دیاریەکی پڕ پیت و بەرەکەت بوو: ١١،٠٠٠ میلی چوارگۆشەی ئەو ولاتە، هاوڕێ لەگەڵ وەرزێرانی پشوودرێژ و ماندوونەناس، خاکی ڕەشی پڕپیت و بەرەکەت و چۆم و جۆگەلەی فراوان گەنم و گەنمە شامیان بەرهەم دێنا. گاڕانی مووردرێژ لە لەوڕگەکانی ئەوێ لەوەڕ و تفاقی چاکیان هەبوو و باش دەلەوەڕان، جووچک و بەرازی قەڵەو قەڵەو لە حەوشەی کێڵگەکانی ئەوێ ڕایان دەدا و دەچەلین. بانات پیشەسازیەکی ئەوتۆ کە شیاوی باسکردن بێت نەیبوو، شارۆچکەکانی لە ١٠٠،٠٠٠ کەس تێنەدەپەڕین، و مۆنۆمێنت و شوێنەواری کۆنی گەورەی هەر یەکجار کەم بوو. تەنیا لەباری سرووشتیەوە شوێنێکی سەرنجڕاکێش و ڕازاوە بوو دەنا لەباری پیشەسازی وە زۆر گرنگ نەبوو.

لە ٣١ی ژانویەی ساڵی ١٩١٩دا، نوێنەرانی یۆگۆسلاڤیا و ڕۆمانیا لەبەردەم شۆڕای عالیدا ئامادە بوون. چینیەکان، چکسلۆڤاکیەکان و پۆڵەندیەکان هەر لە سەرەتای هەفتەدا لەوێ حازر بوون تا وتارە بە نرخەکانی خۆیان پێشکەش بکەن، پێشینەیەک کە لیۆد جۆرج و زۆر کەسیتریشی نیگەران کردبوو. ڕۆژێک بەرلەوە ئەو پرسیاری کردبوو کە بڵێی ئاجێندایەکی بە تەوژمتر لە ئارادا نەبێت. "ئەو لای وابوو کە باسوخواست لە سەر چکسلۆڤاکیا-سلۆڤاکیا و پۆڵەندا ڕۆژی دواتر هەر لە بنەماوە هەڵەکاری بووە. ئەو لە دەستەواژەی "بەفیڕۆدانی کات" کەڵکی وەرنەدەگرت چون ئەو دەستە واژەیە زۆر وروژێنەر بوو، و ئەو هەر زووتر درەوشانەوەی لە چاوی سەرۆک کۆماردا دیبوو! لە هەمان کاتیشدا ئەو لای وابوو کە ئەوە باشترین شێوازی

دانووستان لەگەڵ بابەتەکە نەبوو." لیۆد جۆرج باسی ئەوەی کردبوو کە ئەگەر ئەوان دەیانەوێ باسی بابەتەکانی هەرێمی بکەن باشتر وایە خێرا پێیان ڕابگەن و هەندێک بڕیاریان لەسەر ساخ بکەنەوە. دوا دانووستانێکی کورت، شۆڕا پێشنیارەکەی باڵفۆری قەبووڵ کرد کە گوایە ئەوانیش ئامادەن تا لە ڕۆمانیەکان و سێربەکان گوێ ڕاگرن چون ئەوە دەبێتە هۆی خۆشحاڵکردنی ئەوان.٢٧٤ وەکوو زۆربەی ڕێگەچارەکانی بالفۆڕ، ئەوە زۆر ڕێک و پێک و جوان بوو، بەڵام بە کردەوە دەرهێنانی دژوار بوو.

ئەو دوانیوەڕۆ سارد و سڕە لە کاتی زەردەی خۆرئاوادا، براتیانۆ وتاری ڕۆمانیای پێشکەش کرد. براتیانۆ ئەوەندە هەستی گرنگیدانی بە خۆی هەبوو کە لە تامی کردبوە دەرێ و زۆری لێ ناشیرین بوو. ئەو لە هۆتێس ئێکۆلێس لە پاریس خوێندنی تەواو کردبوو، و ئەوەشی بە گوێی هەموو کەس دەگەیاند؛ ئەو زۆر تامەزرۆی ئەوە بوو لەسەر قەنەفەیەک ببینرێت کە درێژ ڕاکشابێت و کتێبێک لە دەستە لەرزۆک و بێ تینەکانی دابێ کە لە ناوەڕۆکەکەیدا پەخشان و نووسراوەی فەڕەنسەیی بێت. نیکۆلسۆن، کە هەر زوو لە کاتی نانی نیوەڕۆدا لە کۆبوونەوەکە چاوی بە ئەو کەوتبوو، کاری تێنەکرا: " براتیانۆ ژنێکی ڕیشووە، زمانبازێکی سەیرە، ڕۆشنبیرێکی بۆخارێستیە، هەتابڵێی مرۆڤێکی خوێنتاڵ و ڕەزاگرانە. جوانچاک و چالاکە، سەرە پیرۆزەکەی بەملاولادا دەجووڵێنێ، سێبەری لایەکی سەری دەکەوێتە سەر شیشەکە . ئەوەندە قسەی خۆش لەلایە، کاتێ دەست بە گێڕانەوەیان دەکات ڕەنگ و بۆی قسەخۆشەکانی پاریسیان پێوە دیارە." ژنان بەتایبەت زۆریان حەز لێی بوو. یەکێک لەبارەیەوە وتبووی کە " چاوانی خەزاڵ و شەویلکەی پڵنگ." شاژن ماری ڕۆمانیا، کە شارەزای سەروبنی لەخشتەبردن و هەڵفریودان بوو، بە شەرمەوە یادی ئێوارەیەکی دەکرد کە مانگی چاردە ئەوی "سۆزدار" کردبوو. بە حاڵەتێکی بێ ڕەحمانە، ئەو بە ویلسۆنی وتبوو کە ئەو" کەسێکی ماندووکەر، لینچ و وەڕەزکەرە."٢٧٥

جانتا دەستیەکەی هەر بە حەواوە فڕێ دا و نیکۆلسۆن گوتەنی وەک " منداڵێک کە دەتۆرێ و بیانوو دەگرێ"، داوای سەراسەر ملکی باناتی دەکرد." دڵنیایە لەوەی کە لە دەمکاتی ئێستادا سیاسەتمەداری گەورەتر لە ئەو هەستی پێ ناکرێت. زەردەخەنەیەک بە تەوسەوە و لەڕووی خۆبەزلزانیەوە هەرتاو ناتاوێک سەری لێدەدا. لە لاشانەوە سەرە مەزنەکەی هەر دەجووڵێنێ. کاریگەریەکی زۆر خراپ لەسەر پیاو دادەنێ."٢٧٦ باسەکانی ئەو لە باسی یاسایی توندوتۆڵەوە (لە بەندە نهێنیەکانی ڕێکەوتنامەی بۆخارێستی ساڵی ١٩١٦ ڕۆمانیا بەڵێنی باناتی پێدرابوو کە هاوپەیمانان بەوە ڕۆمانیایان بەرەو شەڕ هان دابوو) بگرە تا دەگاتە باسی تایبەت بە ویلسۆن (واباشە

ڕۆمانیا یەک نەتەوەی لێدەربێت) هەر هەمووی لەخۆ گرتبوو. ئەو لە درێژەی وتارەکەی خۆیدا ئاماژەی بە ڕەگەزناسی، مێژوو، جوگرافیا و قوربانیەکانی کاتی شەڕی ڕۆمانیای دەکرد. ئەو لەگەڵ ئەمانەشدا ئاماژەی بەوە دەکرد کە سێربییەکان لە ڕابردوودا زۆر لەبەرانبەر ئوتریش-مەجارستاندا دەوەستان و بەرەنگاری دەبوونەوە. (سێربەکان خەریک بوون سەبارەت بە ڕۆمانیا هەر هەمان تۆمەتیان درووست دەکردەوە.)

ڤیسنیک و ترامبیک وڵامیان دایەوە. ئەوان ئاماژەیان بەوە کرد کە سێربستان داوای تەنیا بەشی ڕۆژئاوای باناتی دەکرد. چون نەیاندەتوانی باس لە ڕێکەوتنامە نهێنیەکان بکەن، تەنیا بۆیان هەبوو هەر باسەکانی ڕۆمانیەکان بەکار بێنن. ڤیسنیک ئاماژەی بەوە کرد کە " هەر لە سەردەمانی ناوینەوە ئەو بەشە لە بانات کە سێربەکان داوایان دەکرد هەمیشە پێوەندیەکی نزیکی بووە لەگەڵ خەڵکانی سێربی." ئەوە لەپێشدا ڕۆنسانسی سێربی لێکەوتبۆوە و دواتریش ناسیۆنالیزمی سێربی. و کاتێکە بنەماڵەی پاشای سێرب دوورخرابۆوە، ئاسایی بوو کە پەنا بۆ ئەوێ بەرن. (براتیانۆ بە هەق وڵامی ئەمەی دابۆوە و وتبووی کە حۆلحۆلێتەکانی سیاسەتی سێربی هەر جارناجارێک دەسەڵاتدارەکانی خۆی بە لای ڕۆمانیا ڕادەکێشا، بەڵام ئەمە بیانوو نەبوو بۆ ئەوەیکە سێربستانیش ئەو داواکاریەی هەبێت.٢٧٧)

لە وتووێژەکەدا ویلسۆن بە هەندێک سەرسووڕمانەوە ئاماژەی بەوە کرد کە نوێنەرانی نەتەوەکانی باڵکان " بە هەمان چەشن نوێنەرایەتی ڕاستیەکانی خۆیانیان نەدەکرد، و هەمیشە شتێک دەهاتە گۆڕێ کە گوماناوی بوو." ئەو ئەیوت کە وڵاتەیەکگرتوەکان بۆ پەسەندکردنی یاسایەک کە لەسەر بنەمای ڕاستیەکان بێت ئامادەیی هەیە. باڵفۆر کە چاوی چبوە خەو خۆی لە باسەکە هەڵقوتاند و پرسیارێکی سادەی ئاراستە کرد: ئایا لەبابەت تێکەڵاوی ڕەگەزی بانات هیچ نموودارێک لە ئارادا بوو؟ یۆگۆسلاڤیەکان وتیان بەڵێ؛ بەشی ڕۆژئاوا، کە ئەوان داوایان دەکرد، بەزۆری سێربی بوون و، لەگەڵ ئەمەش، دێرەکان و کەنشتەکانی سەراسەری بانات بە هەمان چەشن بوون. هەڵبەت، ژمارەیەکی زۆر ئەڵمانی و مەجارستانی هەبوون کە زیاتر سێربی بوون تاوەکوو ڕۆمانی. براتیانۆ وتی نا ئەگەر بانات وەک یەکەیەک لەبەرچاو بگرین، ڕۆمانیەکان زۆرینە دەبن (لەبەر هۆکارەکانی سیاسی و مێژوویی تەنیا شتێک کە لە دەست دێت)؛ دێرەکان نە لێرە بوون نە لەوێ چون هەموو کەس دەیزانی کە سێربەکان، وەکوو هەمووی سلاڤەکان، زیاتر ئارەزووی ئایینیان دەکرد؛ و، سێربەکان هەروەک لەبابەت ئەڵمانیەکان و مەجارستانیەکان کێشەیان هەبوو و نیاندەتوانی لەگەڵیان هەڵ بکەن، لەگەڵ ئەم کەمینە زۆرانەشدا وابوون.٢٧٨

له یه‌كی مانگی فه‌وریه‌دا، براتیانۆ لیستێكی ته‌واوی له‌ داواكاریه‌كانی ڕۆمانیا پێشكه‌ش كرد: بانات، ترانسیلڤانیا، بێسارابیا له‌ سنووری ڕوسیادا، و بۆكۆڤینا له‌ باكوور، هه‌رهه‌مووی ئه‌و شتانه‌ی كه‌ ئه‌و داوای ده‌كردن له‌باری مێژوویی و له‌باری ڕه‌گه‌زیه‌وه‌ به‌شێك بوون له‌ ڕۆمانیا. هاوپه‌یمانان به‌ بێساربیا به‌بێ چه‌له‌حانه‌ و مشتومڕ قایل بوون؛ ئه‌وان هیچ خوازیاری ئه‌وه‌ نه‌بوون كه‌ یه‌كیان به‌ ڕوسیای بۆلشویك ته‌سلیم بكه‌ن و ئه‌ویتریان به‌وه‌ی كه‌ له‌ مه‌جارستانی بۆلشویكی ده‌چوو. تراسیلڤانیا پارچه‌زه‌ویه‌كی یه‌كجار گه‌وره‌تر بوو و مه‌سه‌له‌یه‌كی یه‌كجار ئاڵۆزتر. هاوپه‌یمانان وایان دانابوو كه‌ له‌ كاتی بێكاری دوا ده‌سته‌به‌ركردنی گرێبه‌ستی مه‌جاری به‌وه‌ ڕاده‌گه‌ن.

براتیانۆ هه‌ڕه‌شه‌ی ده‌كرد كه‌ هێزه‌ گه‌وره‌كان پێویسته‌ داواكاریه‌كانی ڕۆمانیا لایه‌كیان بخه‌ن به‌ لایه‌كدا ئه‌گینا له‌وانه‌یه‌ دۆخه‌كه‌ له‌ژێر كۆنترۆڵیان بێته‌ ده‌رێ و "ڕووداوی دڵته‌زێن و كاره‌ساتبار" بێنه‌ ئاراوه‌. " ڕۆمانیا له‌باری ڕۆحیه‌وه‌ پێویستی به‌ پاڵپشتی هاوپه‌یمانان بوو، ئه‌گه‌ر ده‌بوایه‌ ئه‌و وڵاته‌ بۆ ئه‌و مه‌به‌سته‌ بمایه‌ته‌وه‌ كه‌ تا ئێستا بووه‌- واته‌، خاڵێكی گرنگ كه‌ له‌ ئورووپا له‌به‌رانبه‌ر بیروباوه‌ڕی بۆلشویزمدا پشتگری ده‌كرد."[٢٧٩] هه‌ڵبه‌ت له‌ پاریس ئه‌مه‌ ده‌مه‌ته‌قێیه‌كی ناسراو و ئاشنای لای هه‌موان بوو، به‌ڵام سه‌باره‌ت به‌ ڕۆمانیا، كه‌ له‌نێوان ڕووسیه‌ی تازه‌ی بۆلشویكی و مه‌جارستانی شۆڕشگێڕ هه‌ڵكه‌وتبوو، ده‌مه‌ته‌قێیه‌كی به‌هێز بوو. جوگرافیا به‌ شێوازێكی تر له‌ خزمه‌تی ڕۆمانیادا بوو: هێنده‌ دوور بوو كه‌ هاوپه‌یمانان نه‌یانده‌توانی ئیراده‌ی خۆیان بسه‌پێنن به‌ سه‌ریدا. له‌ كاتی شه‌ڕدا ڕۆمانیا هاوپه‌یمانێك بوو، هه‌رچه‌ند وانه‌بوو كه‌ پشتی پێببه‌سترێت، و ئێستا چه‌نده‌ قه‌ول و به‌ڵێنی بێ كارامه‌ له‌ لایه‌ن فه‌ڕه‌نسه‌ و به‌ریتانیا به‌ ئیتالیا دراوه‌، ئه‌وه‌نده‌ش به‌ ئه‌م درابوو.

ڕۆمانیایه‌ك كه‌ پاریس ناسینی له‌سه‌ری هه‌بوو به‌خێوكراوی ده‌ستی شاژن مارتی بێبێسكۆ بوو، كه‌ مه‌یفرۆشیه‌كه‌ی ئه‌وێ له‌ پاریسی به‌رله‌شه‌ڕ ناسراو بوو، و له‌گه‌ڵ بنه‌ماڵه‌یه‌كی كۆنی ده‌ره‌به‌گی فه‌ڕه‌نسه‌یی خزماته‌یه‌تی كرد و به‌ناوی ئانا دی نۆئایلێس بوو به‌ یه‌كێك له‌ ناسراوترین هه‌ڵبه‌ستوانانی سه‌رده‌می خۆی. چینه‌ زۆرداهاته‌كانی ڕۆمانیا ئاشقی فه‌ڕه‌نسه‌ بوون: ئه‌وان له‌ پاریس بۆ منداڵه‌كانیان خوێندن و بۆ خۆشیان كه‌ره‌سه‌ی ناوماڵ و جل و به‌رگیان ده‌كڕی. و فه‌ڕه‌نسه‌یه‌كانیش ده‌ست به‌جێ قه‌ره‌بووی هه‌مووشتێكیان ده‌كرده‌وه‌. ئه‌وترا كه‌ ڕۆمانیا وڵاتێكی لاتینیه‌، ڕۆمانیه‌كان وه‌چه‌كانی سه‌ربازانی ڕۆمانن و ڕۆمانی زمانێكی لاتینیه‌. فه‌ڕه‌نسه‌ له‌ مه‌سه‌له‌ی سه‌ربه‌خۆیی و جیابوونه‌وه‌ی ڕۆمانیا له‌ عوسمانیه‌كان پشتگری كردبوو؛ له‌ ساڵی ١٩١٩دا، حكوومه‌تی فه‌ڕه‌نسه‌یی له‌گه‌ڵ ڕۆمانیای به‌هێز وه‌ك كێشێكی هاوسه‌نگ له‌به‌رانبه‌ر ئه‌ڵمان و له‌به‌رانبه‌ر بۆلشویزمی ڕووسیدا مامه‌له‌ی ده‌كرد. ڕۆمانیه‌كان بۆخۆیان به‌شێكی زۆر له‌ پێوه‌ندیه‌كانی ڕۆژئاوایان پێك

دەهێنا: ئەوان میراتگرانی ئیمپراتۆری ڕۆمان بوون، بەشێک بوون لە شارستانیەتی ڕۆژئاوا. ئەوان لە دانووستانەکانی لەبار و گونجاو بۆ ئاشتی لە سەر ئەوە دەڕۆیشتن کە سەراسەری پارێزگای داسیای تایبەت بە ڕۆمانیای کۆن کە بەشێک لە ترانسیلڤانیای لەخۆ دەگرد، و لە خزمەت مەجارستان دابوو، دەبێ بە ئەوان بدرێتەوە.

ڕۆمانیایەکی تریش هەبوو، هەرچەند، مێژوویەکی ئاڵۆزتری هەبوو: ڕۆمانیا بۆ ماوەی چەندین سەدە خەڵکانی ڕۆژهەڵات هێرشیان کردبوە سەر و لەوێ نیشتەجێ ببوون؛ ئەو وڵاتە لەنێوان میرنشینانێک کە لە ناوەندی ئورووپادا هاتبوون و ڕۆیشتبوون دابەشکرابوو، و ئەو وڵاتە، بەناوی مۆڵداڤیا و والاچیا، هەر لە سەرەتای سەدەی شازدەهەمەوە لەژێر کاریگەری ئیمپراتۆری عوسمانیدا ببوو. دەربەگەکانی ڕۆمانی کە زۆر بەجوانی بە زمانی فەڕەنسەی قسەیان دەکرد و هاتبوون بۆ پاریس تا جل و بەرگ بکرن لەگەڵ خۆیان وێنەکانی باو و باپیرانیان پێبوو کە کەوا لەبەر و دەسرەوکڵاولەسەر بوون.

کۆمەڵگاکەی ئەوان ساڵیانی ساڵ بوو کە کەوتبوە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆری عوسمانی گەڵاو و گەندەڵەوە. ڕۆمانیەکان پەندێکیان هەبوو کە دەیکوت: "ماسی لە سەرەوە دەگەنێت." لە ڕۆمانیا هەرچی شتە هەڕاج کرابوو و بە فرۆش دەگەیی: ئۆفیسەکان، بڕوانامەی لێخوڕین، پەساپۆرتەکان. لەڕاستیدا، ڕۆژنامەنووسێکی بیانی کە ڕایەکیان هەوڵی گۆڕینەوەی پارەی بەشێوەیەکی یاسایی دابوو لەباتی ئەوەی لە بازاڕی ڕەش بیگۆڕێتەوە لەلایەن هێزی ئاسایشەوە دەستبەسەرکرابوو کە لایان وابوو کەڵەک و کوڵکێکی تایبەتی لە ژوور سەردایە. هەر گرێبەستێکی حکوومی دزی و فزی تایبەت بە خۆی لێدەکەوتەوە. هەرچەند ڕۆمانیا وڵاتێکی دەوڵەمەند بوو، زەوی وزاری کشت و کاڵی باشی هەبوو، لە ساڵی ١٩١٨دا، سەرەڕای پیشەسازی ڕوولەگەشەی نەوت، لە جادە و پرد و ڕێگای شەمەندەفەڕ بێ بەش بوو چون پارەیەک کە لەلایەن حکوومەتەوە تەرخان دەکرا لەلایەن بنەماڵەکانی وەکوو براتیانا دەستی بەسەردا دەگیرا و دەخورا. ڕۆمانیاکان دەچوونە هەرشوێنێک چاویان تیژ دەکردەوە و فێڵ و تەڵەکەیەکیان دەدۆزیەوە. لە پاریس ئەوان ناڕاستەوخۆ ئاماژەیان بەوە دەکرد کە شۆڕای عالی کەوتبوە لەژێر کاریگەری بلۆشویزم یان، بە واتایەکی تر، لەلایەن هێزە وەیشوومەکانی کاپیتالیستیەوە بەرتیلی خواردبوو.٢٨٠

ئەو میوانانەی کە لە ئورووپای ڕۆژئاواوە دەهاتن و سەردانی ڕۆمانیایان دەکرد لەبەرانبەر تام و بۆی سرسووڕهێنەری تایبەت بە ڕۆژهەڵاتی ئەو وڵاتە واقیان دەما، لە گومەزە پیوازیەکانی کەلیساکانی ئۆرتۆدۆکسەوە کە زۆربەی دانیشتوان سەر بە ئەوێ بوون، بگرە تا دەگاتە ئەو ڕاننده

ناکسیانەی کە کەوای ڕێڕێی ئاسمانیان کردبوە بەر و سەر بە تاقمێک بوون کە دوا بوونی دوو منداڵ دەخەسێندران. بەرلە دەستپێکردنی شەڕ بۆخارێستی پەیتەخت دڵرفێن و سەرنجڕاکێش بوو بەڵام حەیف کە دواکەوتە بوو. زۆربەی خانووبەرەکانی نزم و بەربڵاو و پێچەڵاوپووچ بوون، شەقامە بێ شوستەکانی لە فرۆشیاری سەر شەقام جمەی دەهات و خەرکی فرۆشتنی باڵندە زیندوەکان، میوە، شیرینی مەنی یان فەرش و فرووش بوون. کیژۆڵە چاورەشەکانی گیپسی سەرقاڵی گوڵفرۆشتن بوون؛ لە یانەکانی شەوانەدا پیاوەکانیان مۆسیقای گیپسیان دەژەنی یان گۆرانی ناوداری "توو سایس کیوو توو ئێا ژوولی"یان دەکوتەوە. بنەماڵە خواپێداوەکان لەگەڵ مەرومالاتەکەیان لە کۆمپاوندەکان[چەند خانوویەک پێکەوە پەرژینکراو] دەژیان کە لەلایەن ئالبانیایەکانەوە پارێزگاری دەکران.٢٨١

ڕۆمانیا، سەرەڕای ئەوەیکە مێژوویەکی کۆن و کەونارایی هەبوو، کەچی لە وڵاتێکی تازە دەچوو. مۆڵداڤیا و والاچیا لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا نیمچە سەربەخۆیەکیان لە عوسمانیەکان و لە ساڵی ١٨٨٠دا سەربەخۆیی تەواویان ستاندبوو. بەگشتی دەتوانین بڵێین کە ئەوان پێچەوانەی ئێڵێکیL ئینگلیزیان درووست کردبوو، پارێزگای پرپیت و بەرەکەتی والاچیا لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ڕۆژئاوا بە درێژایی بەشی باشووری کێوەکانی ئالپی ترانسیلڤانیای دەگرتەوە، و مۆلداڤیا بەرەو ڕۆژهەڵاتی کارپاتیانەکانی دەگرتەوە. لە ساڵی ١٨٦٦ ئەوان شازادەی ئەڵمانی تایبەت بەخۆیان گیرکەوت، دواتر کارۆل پاشا، کە هەوڵەکانی ئوتریشیەکانی بۆ دەستگیرکردنی ئەو بە گرتنی پاپۆڕێکی هەڵمی دانووبی پووچەڵ کردبۆوە بەناوی فرۆشیارێکی گەشتیاری خۆی گۆڕیبوو. خێزانەکەی سۆفیەکی ناودار بوو کە لەژێر نازناوی کارمێن سیلڤا هۆنراوەی دەنووسی و هەڵبەستی دڵداری دەهۆنیەوە.

ڕۆمانیەکان بۆخۆیان ناپلیتینیەکانی ئورووپای ناوەندی بوون. هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ حەزیان لە بۆن و بەرامەی توند بوو. لەنێوان چینە دەوڵەمەندەکاندا، ژنان ماکیاژێکی زۆریان دەکرد، و پیاوان بە سەرنجێکی زیاترەوە گرنگیان دەدا بە جوانکاری، و تەنانەت بەرپرسانی میلیتاریش دەبوایە تا ڕادەیەکی دیاریکراو بەکارهێنانی جوانکریان بۆ ئەفسەرەکان کەم کردایەتەوە. تەنانەت دوا ئەوەیکە ڕۆمانیا لە شەڕەوە گلا، چاودێرانی بیانی ئابڕوویان چوو کاتێکە دییان ئەفسەرانی پۆلیس پیاسەیان دەکرد و " بە دم و چاوی زەردهەڵگەڕاوەوە، لە قاحبەکان دەپاڕانەوە و داوای کاری خراپیان لێ دەکردن یان خۆیان لەگەڵ یەکتر خراپکاریان دەکرد". ڕۆمانیەکان هەر هەموویان لە هەر پلە و پایەیەک کە بوون دەیانکردە قرمە و دەکەوتنە چەلەحانە و مشت و مڕکرن و بە حەز و ئارەزوویەکی

بێ برانەوە لەبابەت سەردەمانی ڕابردووەوە دەیانکۆڵیەوە و باس و خواستیان ئاڵ و گۆڕ دەکرد. خاتوویەکی ناوداری ڕۆمانی گێڕابوویەوە کە " هاوڕێ لەگەڵ سیاسەتمەدارانی ناوچەکە، خۆشەویست و دڵداری بۆتە کار و پیشەی سەرجەم چینەکانی کۆمەڵگا. ڕەوشتبەرزی لە ناو هاووڵاتیانی من قەت وەک خاڵێکی بەهێز و گرنگ سەیر نەکراوە، بەڵام هەتابڵێی ئەوان دەتوانن بە خوێنشیرینی و جوانی، نەقڵ و نەزیلە، ڕابواردن و ڕۆشنگەری خۆیانەوە بنازن." تەنانەت کەلیسای ئۆرتدۆکسی ڕۆمانیش زۆر کەمتەرخەمانە سەیری زیناکردنی دەکرد؛ هەر تاکێک ڕێگەی سێ کەرەت تەلاقی پێدرابوو تەنیا بە مەرجێک کە هەر دوولا ڕازی بوونایە.[٢٨٢]

بەرلەوەی براتیانۆ بگاتە پاریس، وتەبێژی ڕۆمانی تاکی ئیۆنیسکۆی دڵڕفێن و ناسراو بوو. ئەو بزێو، دەم بەپێکەنین و تێر و تەسەل بوو و لە سۆڕبۆن یاسای خوێندبوو و بەباشی بە زمانی فەرەنسەیی قسەی دەکرد. و بە هەمان چەشن خێزانە دەم بە پێکەنینە ئینگلیزیەکەی، بەناوی بێسی، کچی پاسەوانێکی پانسیۆن لە برایتۆن بوو. ئیۆنیسکۆ هەر لە دەستپێکی جەنگەوە لایەنگری هاوپەیمانی بوو ڕۆڵێکی گرنگی لە ڕاکێشانی ڕۆمانیادا هەبوو بە لای هاوپەیمانیدا. لەسەر داواکاریەکانی ڕۆمانیا لە سەرۆک وەزیرەکەی خۆی میانەڕەوتر بوو. نوێنەرێکی ئەمەریکی لە گوزارشەکەی خۆیدا وتبووی کە "هەڵوێستی ئەو سەبارەت بە سێربەکان زۆر دۆستانەیە: ئەو دەڵێ کە بۆلغاریەکان ڕەوشتیان گۆڕاوە و خراپ بوونە؛ لەو ٢٨٠٠٠زیندانیەی ڕۆمانیا کە لەلایەن بۆلغاریەکانەوە دەستبەسەرکران تەنیا ١٠،٠٠٠ کەسیان لە زیندان ڕزگاریان بوو." سەبارەت بە بانات، ئیۆنۆسکۆ پێی خۆش بوو مامەلەیەک بکات: " پێویستە ئەوان لەگەڵ سێربستان دۆست بن و ئەو نایەوێت بە زۆری گشتی بانات داگیر بکات، بەڵکوو بەشی ڕۆژهەڵاتی باشوریان دەداتێ."[٢٨٣]

و لە ڕاستیدا لە ئۆکتۆبری ساڵی ١٩١٨دا مامەلەیەک کرابوو. ئیۆنێسکۆ لەگەڵ یوگۆسلاڤیەکان کۆ ببۆوە و بە ڕێکەوتنامەیەک گەیشتبوون، و لەڕاستیدا زۆر بەو ڕێکەوتنامەیە نزیک بوو کە چەند مانگ دواتر بەسترا، کە زۆرترین بەشی باناتی بە ڕۆمانیا بەخشی و ئەوی تریشی بە سێربستان. مامەلەکە لە چاپەمەنی ڕۆمانیادا وەک خەیانەت بە نەتەوەی ڕۆمانیا هێرشی کرایە سەر و چون براتیانۆ ڕقی لە ئیۆنێسکۆ بوو لە ئاکامدا لەلایەن ئەوەوە پووچەڵ کرایەوە. کاتێکە شاندی نوێنەرایەتی ڕۆمانیا بۆ کۆڕی ئاشتی هەڵبژێردرا، براتیانۆ دڵنیا بوو لەوەیکە ئیۆنیسکۆ لە قەڵەم کەوتووە.[٢٨٤]

بڵێی و نەڵێی داواکاری ڕۆمانیا لەسەر بانات جەختی دەکردە سەر هۆکارەکانی ڕەگەزایەتی. بێجگە لەوە لەسەر ڕۆڵی ڕۆمانیا لە نانەوەی جەنگ تەرکیزی دەکرد. ڕەنگە

ئەمە بڕیارێکی هەرە ژیرانە نەبوویێت. کاتێکە شەڕ دەستی پێکرد، ڕۆمانیا زۆر ژیرانە هەڵوێستێکی بێ لایەنەی گرتەبەر. براتیانۆ، کە دواتر بوو بە سەرۆک وەزیر، بە هاوکارەکانی ڕاگەیاند کە پێویستە چاوەڕوانی لەبارترین پێشنیار بن. دیپلۆماتێکی فەڕەنسەیی گێڕابوویەوە کە حکوومەتی براتیانۆ، لەڕووی بێ ئەقڵیەوە، ئەمەی لا زۆر ئاسانە و "وەک هەڵس و کەوتی چەرچیەکی بازاڕی ڕۆژهەڵات دێتەبەرچاو." کاتێکە هاوپەیمانان لە هاوینی ساڵی ١٩١٦دا دۆخەکەیان لەژێر ڕکێفی خۆیان دەدی، ڕۆمانیا لە کۆتاییدا بڕیاری دا بچێتە ناو شەڕەوە، وە نرخێک کە دای بەڵێنیەک بوو بەو مانایە کە سەراسەری بانات، ترانسیلڤانیا و زۆربەی بۆکۆڤینا دەگرێت. بەنهێنی فەڕەنسەیەکان و ڕووسیەکان ڕێکەوتبوون کە کاتێک کە ئاشتی باڵی بە سەر وڵات دا کێشا بە سەر گشتی پرێسکەکەدا دەچنەوە.٢٨٥

دانانی کاتی ڕۆمانیا لەبار نەبوو؛ کاتێکە هێزەکانی ئامادەی ڕۆیشتن بوو، هێزەکانی ناوەندی خۆیان ڕێخستبوو. لە کۆتایی ساڵی ١٩١٦دا نزیک بە نیوەی وڵات لەلایان ئەڵمانیەکان و ئوتریشیەکان داگیرکرابوو؛ لە کۆی شەش ملوێن ڕۆمانی ٣٠٠،٠٠٠ کەسیان بە نەخۆشی و بە برسێتی مردن. هاوپەیمانانی ئەو وڵاتە، لەوانەیە لەڕووی ناپیاوییەوە بووبێت، هەمووی کارەساتەکەیان خستە ئەستۆی خودی ڕۆمانیا. لە چوارچێوەی گرێبەستێکی تازەی بۆخاریستدا لەگەڵ هێزەکانی ناوەندی لە مانگی مەی ساڵی ١٩١٨، ڕۆمانیا دەستی لە شەڕ هەڵگرت، ئەمە هەڵوێستێکی ژیرانە بوو بەڵام هەڵوێستێک کە بۆ داواکاریەکانی ناوچەگەریی ئەو وڵاتە مانادار بوو. چون هەر لە سەرەتای گرێبەستی بۆخاریستدا لە ساڵی ١٩١٦دا، ڕۆمانیا بەڵێنی ڕاگەیاندبوو کە بەشێوەیەکی جیاواز دوای نانەوەی ئاشتی ناکەوێت، ئێستا ئیتر هاوپەیمانان خۆیان لە سەر بەڵێنیەکانی خۆیان سوور نەدەبینی. کلیمینجوو قەت براتیانۆی لەبەرهۆی خەیانەتێک کە کردی نەبەخشی. براتیانۆ بە دەست لەکارکێشانەوە و خستەنە ئەستۆی ئەرکەکان بۆ سەر شانی جێگرەکان(کە بۆخۆی هەڵیبژاردبوون) لەگەڵ ئەو دۆخە نالەبارە بەرەنگار بۆوە. ئەو بڕیاری دا کە پەسەندکردنی گرێبەستی تازە لە پەرلەمان پەک خاتەوە و لە دەی مانگی نوامبری ساڵی ١٩١٨دا، دژ بە ئەڵمانیا شەڕی ڕاگەیاند. ئەو بەخۆشحاڵیەوە ڕایگەیاند کە ئەمە ئەو مانایە دەگەیەنێ کە مامەڵە لەگەڵ هاوپەیمانان هێشتا هەر بەردەوامە. ڕۆمانیا تەنیا بۆ مەبەستی ڕاگرتنی هێزی خۆی بۆ کاتی شەڕ ئاشتی کردبۆوە: " نە لەڕووی یاساییەوە، نە بە کردەوە، و نە لەڕووی ڕەوشتبەرزیەوە، لە ڕاستیدا ڕۆمانیەکان لەگەڵ دوژمن پەیمانیان نەبەستبوو." شۆڕای عالی داواکاریەکانی ڕۆمانیای لەڕادەبەدەر و دەمەقرێکردن لەگەڵ یۆگۆسلاڤیا لەسەر باناتی بە تاقەتپڕووکێن دەزانی. (براتیانۆ گلەیی کردبوو کە هەندێکیان لە کاتی وتارەکەی ئەودا خەویان لێکەوتبوو.) دڵەکان

بەرخەیان بوون کاتێک کە ئاشتیکەران پێشنیارەکەی لیۆد جۆرجیان پەسند کرد ، واتە، ڕەوانەکردنی داخوازیەکانی ڕۆمانیا، وەکوو ئەوانەی تایبەت بە بانات، بۆ بەردەم لیژنەیەکی لقی پسپۆڕان بۆ مەبەستی دانووستانێکی دادپەروەرانە. کاتێکە لیژنەکە لەسەر بابەتەکەی کۆڵیەوە، ئەو بە گەشبینیەوە ئەم ڕاستیەی درکاند کە تەنیا چەند بابەتێک ڕێگەدەدرێن بخرێنە بەردەم شۆڕا. ویلسۆن ڕازی بوو، بەڵام بە مەرجێک کە پسپۆڕان نابێ بڕواننە لایەنی سیاسی کێشەکە. (مەبەست لە وشەی "سیاسی" چیبوو و چی دەگرتەوە هیچ پێناسەیەکی نەبوو.) کلیمینجوو، ڕەنگە لە ئاکامی خۆتێهەڵقوتاندنەکەی ویلسۆن دابووبێت، وستەی لێنەهات و ئۆرلاندۆ بۆ مەبەستی داکووژاندنی سنوورەکان لێرە و لەوێ پێشنیارێکی بێ کەڵکی پێشکەش کرد. و بۆیە داهاتووی بانات، هاوڕێ لەگەڵ پارچە خەڵاتیەکانی تری ناوچەیی لە ئورووپای باشوور-ناوەندی، بە کۆمیسیۆنێکی ناوچەیی تایبەت سپێردرا کە لە خڕکردنەوەی لایەنەکانی جیاواز بە دەوری یەکتر هیچ سەرکەوتنێکی بە دەست نەهێنا. لە وەختی خۆیدا، کۆمیسیۆنی تایبەت بە کاروبارەکانی ڕۆمانی و یۆگۆسلاڤی لە سەر هەمووی سنوورەکان دانووستانیان کرد، بێجگە لەوانەی ئیتالیا کە، لەسەر پێداگری ئیتالیەکان، تەرخان بە شۆڕای عالی کرا.٢٨٧

هەرچەند پسپۆڕانی ناو کۆمیسیۆنەکانی هەرێمی (ژمارەیان بەگشتی شەش کەس بوو) شارەزاییان بە سەر ئەوەدا نەبوو، هەمووی پێشنیارەکانیان دەبوایە بەبێ گۆڕانکاری بچوایەتە ناو گرێبەستە جۆراوجۆرەکانی ئاشتیەوە چون ڕێبەرەکانیان کاتی ئەوەیان نەبوو لە سەر ئەوە بەوردی بکۆڵنەوە. کۆمیسیۆنی ڕۆمانی مەودایەکی بلاوتری دا بە بوارەکەی خۆی تا پسپۆڕەکانی قەبارەی داهاتووی یۆگۆسلاڤیا، ڕۆمانیا، یوونان و بۆلغارستان و هاوسەنگی دەسەلات لە ناوچەکانی باڵکان، لەنێوان مەجارستان و دراوسێکانی و لەنێوان ڕووسیەی سۆڤیەت و ئورووپای باشوور-ناوەندی دیاری بکەن. نیکۆلسۆن، یەکێک لە پسپۆڕانی بەریتانی، نووسیبووی کە " مرۆڤ ئالێرەدا چەندە هەست بە هەڵەکاری دەکا! نەخشەیەک-پێنووسێک-کاغەزێکی سەرنەخشە. کەچی غیرەت و پیاوەتی من ناچێتە ناو مێشکی کەسانێک کە هێڵە چەوتەکانی ئێمە لە شادی و خۆشی بێ بەشیان دەکات."٢٨٨

شۆڕای عالی باسی ئەوەی نەکرد کە چ شتێک دانووستانی دادپەروەرانەی دەهێنا ئاراوە. ئایا مەبەستی دانانی سنووری ڕەوا و پارێزەر بوو؟ تۆڕەکانی ڕێگای شەمەندەفەر؟ ڕێگاکانی بازرگانی؟ لە کۆتاییدا پسپۆڕان هاتنە سەر ئەم باوەڕە کە ئەوان هەوڵ بدەن سنوورەکان بە درێژایی هێڵەکانی نەتەوەیی بکێشن. بانات، ئەو پارچە زەویەی کە هەڵگیرسێنەری پرۆسەکە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا سەبارەت بە گێرە و کێشەکانی خۆشی هەڕەشەی دەکرد. ئەوێ تێکەڵاوێکی چڕوپڕ بوو لە سێربەکان، مەجاریەکان، ئەڵمانیەکان، ڕووسیەکان، سلۆڤاکیەکان گیپسیەکان،

جوڵەکەکان، تەنانەت هەندێک لە فەرەنسەیی و ئیتالیەکان کە بەم لاولادا پرژ و بڵاو ببوونەوە. و هەمیشە لە ناوچەیەک کە بەگشتی چەمکی ناسنامەی نەتەوەیی وەک مارماسیەکانی دانووب لووس و خز بوو کێشەی ژماردنی تاکەکان لە ئارادابوو. لەناو ڕووپۆش زێڕ و قوماشە زەرپۆشەکانی دیوی خوانی ڕەسمی لە کوای دیئۆرسای، کۆمیسیۆنی ڕۆمانی نەخشەکانیان دەرهێنا، بابەتەپێشکەشکراوەکانیان خوێندەوە، وتەی شایەتحاڵەکانی بیست و هەوڵی دا دەستوورێکی ئەقڵانی بەسەر جیهانێکی نائەقڵانیدا بسەپێنێ.٢٨٩

لەگەڵ ئەمانەشدا ئەوان، لەبابەت ئورووپایەکانەوە، بەرژەوەندیە نەتەوەیەکانی خۆیان هەر لە مێشکدا هەڵگرتبوو. فەرەنسەیەکان، کە لە ئورووپای ناوەندیدا بەدوای هاوپەیمانان دەگەڕان، خوازیاری بەهێزبوون و دۆستبوونی هەم ڕۆمانیا و هەمیش یۆگۆسلاڤیا بوون. بە مەبەستی بەربەستکردنی داواکاریەکانی یۆگۆسلاڤیا ئیتالیەکان ماستیان لەموو کێشایەوە و کەل و کونی ئەو ڕێبازەیان پشکنی، و دواتر بە ئەم ئاماژەیە ئەمەریکیەکانی تۆقاند کە لەوانەیە ئەوان ڕەزایەت بە هەندێک لەو داواکاریانە بدەن بە مەرجێک کە داواکاریەکانی خودی ئیتالیا لە ئادریاتیک وەرگیرێن. تەنانەت لە شوێنێکدا کە ئەوان دەیانتوانی ژێستێکی جوامێرانە لە قەبووڵکردنی داواکاری یۆگۆسلاڤیا لەسەر ناوچەی کلاگێنفۆرتی ئوتریش بگرن، کە هیچی تێنەدەچوو، نەیاندەکرد. بە قەولی چایلیز سەیمۆر، لاوێکی مێژوونووس لە زانکۆی یەیل "دیپلۆماسیەکی لاواز" بوو. هاوکارێکی فەرەنسەیی ڕاشکاوانەتر وتی: "ئەو باسی ساختەچێتی و دۆدەگەری ئیتالیایی ناکات، بەڵام لەبەرانبەر نەزانکاریدا دەنگ هەڵدەبڕێ." ئەمەریکیەکان زۆر بوێرانە هەوڵیان دا دانووستانی کەڵەکاوی دادپەروەرانە پینە بکەن. و بەریتانیەکان هەوڵیان دا ئەمەریکیەکان و فەرەنسەیەکان پێکەوە ئاشت کەنەوە. سەیمۆر لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە " ئەوەی ڕاستی بێت لە منۆرەکردن بۆ لای وێستگەکە هەڵات هەلاتێکی سەیر بوو. بەریتانیەکان لە داکووژانی ئەمەدا و پێڕاگەیشتن بە کاری سادقانەدا زۆر پشتی ئێمەیان گرت.".٢٩٠

ئەمە هیچ کاریگەریەکی لەسەر براتیانۆ دانەنا، ملی بە سازشکردن نەدا، کاتێکە لە نزیکەوە پرسیاریان لێکرد دەتکوت ورچی نەعەملیوە ئەوەندە ناشیرین و نەمرچ بوو. ئەو شتێکی زۆر سەیری ورووژاند، واتە، بەخشینی سەراسەری بانات بە ڕۆمانیا لەڕاستیدا پێوەندیەکان لەگەڵ یۆگۆسلاڤیا خۆشتر دەکات، وەکوو "دانێک کە دەری دێنی."لەگەڵ ئەمانەشدا ئەو هەڕەشەی دەکرد: ئەگەر بانات بە ئەو نەگات ئەو دەست لە سەر کار دەکێشێتەوە و ڕێگە دەدا بۆلشویکەکان خۆ بە ڕۆمانیادا بکەن. ئەو هەوڵی دا لەبابەت ژمارەی ئەندامانی پسپۆڕ دەستەوداوێنی ویلسۆن بێت، ئەویش ناردی تا

هاوس ببینێت، ئەویش مەجبوور بوو لەبابەت چۆنایەتی خەیانەتکردن بە ڕۆمانیا لەلایەن هاوپەیمانانەوە هەراوهۆریای مەستانە ببیستێت. براتیانۆ هۆڤێری بەوە تاوانبارکرد کە گوایە دەستی بەسەر وام و ئازووقەی خواردەمەنیدا گرتوە تا بەرژەوەندیەکانی ئەمەریکی، هینی جوولەکەکانیش لەوەدا، لە نەوتی ڕۆمانیا مافی زیاتریان پێبگات. ئەو هەوڵانەی کە لە ئورووپای ناوەندیەوە دەهاتن زۆر یارمەتی بابەتەکەی ئەوی نەدا. ڕۆمانیا خەریک بوو سنوورەکانی ئاگربەستی دەبەزاند و بەرەو مەجارستان و بۆلغارستان دەچوە پێش؛ هێزەکانی ئەو وڵاتە لەسەر لێوی باکووری بانات تۆپەڵەیان کردبوو: تۆمەتی نارەوا و دڕندانەی دەناوە کە گوایە سێربەکان خەریکی سەربڕینی هاووڵاتیانی ڕۆمانین. بە بەراورد لەگەڵ ئەمان یۆگۆسلاڤیەکان ژیربێژترو ئەقڵانیتر بوون.٢٩١

* * * *

لە سەرەتای مانگی مارسدا شاندی نوێنەرایەتی ڕۆمانیا ورەیەکی هاتەوە بەر کاتێک کە شاژن ماری، هاوڕێ لەگەڵ سێ کچە خڕوو و خۆڵەکەی، گەیشتنە شەمەندەفەڕی پاشایەتی. کۆلیت بەم شێوەیە باسی ئەوی بۆ *لی ماتین* گێڕایەوە: " بەیانیەکی تەماوی بوو، بەڵام شاژن ماری بە هاتنی ئاسمانی وڵاتی هەساو کرد. بریقەی قژە کاڵە تەڵایەکەی، ڕۆشنایی ڕۆخساری سپی و پەمبەیی ئەو، شۆقدانەوەی چاوەلەخۆبایی و نەرم نیانەکانی- پەکوو لەو دیمەنە کە دەمی مرۆڤی دەکرد بە تاقی چرا."شاژن بە شێوازێکی دڵرفێن و سەرنجڕاکێش باسی ئاواتەکانی دەکرد بۆ یارمەتی و پشتگری کردنی وڵاتەکەی؛ ئەو ئاماژەی کرد بە تێکۆشانی خۆی لە کاتی شەڕدا. " من بەو ئاسانیە دەڕۆیشتم، خوایە گیان! من بۆ هەر شوێنێک کە ئەوان بانگیان دەکردم دەڕۆیشتم، و ئەو لە هەموو شوێنێک پێویستیان بە من هەبوو." ئەو زۆر لەسەرەخۆ وتی کە " من ئالایەک بووم کە بۆ وڵاتەکەم هەڵدرابووم."٢٩٢

لە ڕاستیدا هەرواش بوو. جیی خۆشحاڵی بوو کە میراتگری تەختی پاشایەتی ڕۆمانیا لەگەڵ نەوەی شاژن ڤیکتۆریا ژیانی هاوبەشی درووست کردبوو کە ئەویش لە دەربازبوون لە پەروەردەی ئینگلیزی و خۆڕێخستن لەگەڵ شێوازەکانی وڵاتی نوێی خۆی هیچ کێشەیەکی نەبوو. فێردیناندۆ هەتابڵێی گێل، شەرمێون و دەبەنگ بوو؛ ئەو[شاژن] لەدڵەوەنزیک، وریا، چالاک و زیناکەر بوو. بکەرە تازەکانی ئەو بەمەیان زۆر خۆشحاڵ بوو. ئاشقانی ئەو بریتی بوون لە جەو بۆییل، کانکاری بویری ملوێنێری کەنەدایی لە کلۆندایکەوە، و زڕبرای براتیانۆ، کە، ئەیانوت، باوکێتی هەمووی منداڵەکانی ئەوی دەکرد بێجگە لە دانەیەکیان نەبێ کە توخس و شپرێو بوو و بەناوی کارێل شا

نیوی دەرکرد. لەگەڵ ئەمانەش، ئەو[شاژن] زۆر ئەبلەخەرج بوو. سەردانەکەی ئەو بۆ پاریس چەندە بۆ مەبەستی شتکڕین بوو بۆ وڵاتەکەی هەر ئەوەندەش بۆ خودی خۆی بوو. ئەو هاواری دەکرد "پێویستە ڕۆمانیا ترانسیلڤانیا، بێساربیاشی پێببڕێت. و چی دەبێت ئەگەر بۆ نەبوونی بەرگێکی نووستن، مافێکی زیادی لەکیس بچێت؟" ئەو بەردەوام دەکوت وەزیرەکانی "من"، وڵاتی من و سووپای من. مێردەکەی خۆی کە پاشا بوو نەدەهاتە بەرچاوی؛ ئەو[شاژن] باسی ئەوەی دەکرد کە نامەی ئامۆژگاریەک کە ئەو[پاشا] بۆ پاریسی دەنارد " نەدەکرا بیخوێنیەوە بەڵام چون یەکەمین دێڕی نامەکە بەوەوە دەستی پێدەکرد کە ئەو متمانەی تەواوی بە شاژن هەبوو ئەویش قەت هەوڵی نەدەدا پاشماوەی نامەکە بخوێنێتەوە."٢٩٣

لە سویتەکەی خۆیەوە لە هۆتێل ڕیتز، ئەو پلانی داگیرکردنی وڵاتانی بەهێزی دەڕشت. هەرچی جار بوو لە فۆچ دەپاڕاوە و ئەویش بە قسەی دەکرد تا بۆ مەبەستی شەڕکردنی ڕۆمانیا لەگەڵ بیروباوەڕی بۆلشویزم چەک و تەقەمەنی بنێرێ بۆ ئەوێ. ئەو[شاژن] لەبەرانبەر هاوسدا ماستاوچییەتی دەکرد، کەسێک کە لەبارەیەوە ئەیوت " ئەو یەکێکە لە دڵخۆشکەرترین کەسایەتیەکانی سەرجەم ژنانی بنەماڵەی پاشایەتی کە تا ئێستا لە ڕۆژئاوا چاوم پێیان کەوتوە." باڵوێزی بەریتانی لە پاریس لەگەڵ ئەو شێفی دەخوارد. " ئەو ژنێکی زۆر سەرنجڕاکێش و دڵخۆشکەرە و ئەگەر ئەوەندە سادە و ساکار نەبوایە وات دەزانی کە ئەو زۆر لەخۆبایی و بەفیزە." ئەو زۆر بە جوانی لە بالفۆری دەپرسی کە ئایا باسی کڕیارەکانی پێشووی خۆی بۆبکا یان باسی کۆمەڵەی گەلان لەگەڵ ویلسۆن. ئەویش پێشنیاری دەکرد کە " بە کۆمەڵەی گەلانەوە دەست پێکە و وازبێنە لە ژێرکراسی پەمبەیی ژنانە. ئەگەر بڕیار بوایە لەگەڵ لیۆد جۆرج قسەت بکردایە، باسەکەت دەهێناوە سەر ژێرکراسی پەمبەیی ژنانە!" لیۆدجۆرج ئەوی " بە ژنێکی زۆر لاسار و بزێو دەزانی، لەهەمانکاتیشدا زۆر بە زیرەک و کارامەی دەبینی." سەرنجی کلیمینجۆی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا. ئەو سەبارەت بە پێناخۆشبوونی خۆی لەبابەت ئاشتیکردنەوەی ڕۆمانیا لەگەڵ دوژمن و سەبارەت بە ڕق و قینی خۆی لە براتیانۆ بە پانەوە لەگەڵ ئەو[شاژن] قسەی دەکرد. کاتێکە ئەو ڕۆمانیای بە خوازیاربوونی بەشەشێری بانات تاوانبار دەکرد، ماری سەگانە وڵامی دەداوە کە " بۆیە منیش هاتووم چاوم بە یەکەمین ئامۆزاکەی، واتە، بەورەکە بکەوێت." کلیمینجوو تەقەی دەکردەوە و دەیکوت "قەت بەور دیڵەشێری لێنەکەوتۆتەوە."٢٩٤

تەنیا شتێکە ئازاری دەدا ویلسۆن بوو. هەر لە یەکەمین دانیشتنەکەیاندا بە باسی خۆشەویستی و دڵداری ئەوی هەراسان کرد. گرەیسۆن، دوکتۆرەکەی ویلسۆن، لەبارەیەوە وتبووی کە : "قەتم

نەیتوانیوە خاتوویەک باسی شتی ئاوا بکات. بەڕاستی نەمدەزانی سەیری کوێ بکەم زۆر خەزڵابووم." دواتر ماری خۆی بۆ نەهار بانگێشت دەکرد " لەگەڵ یەک یان دوو کەس لە پیاوماقووڵانی من."کاتەژمێر و نیوێک درەنگ دەکەوت ئینجا لەگەڵ پۆلێکی دەکەسی پەیا دەبوون. میوانێکی تر دەیگێڕایەوە کە " هەموو ساتێک ئێمە چاوەڕوان دەماین. لە چاڵی چەنەی سەرۆک کۆمارەوە دەمدیت کە پارچەیەک لە ڕۆمانیا خەریک بوو دەمبڕ دەکرا." شاژن لای وابوو نەهارەکەی باش بردۆتە سەر؛ لەڕاستیدا، ئەو هەستی بەوە دەکرد کە ئەو کاتەی کە ئەو لە پاریس ماوەتەوە زۆر لەبەرژەوەندی خەڵکەکەیدا بووە. " ئەمن لەپێناو پاراستنی ئەواندا زۆر پاڕامەوە، زۆرم باس وخواست کرد و زیان و زەرەرێکی زۆرم وێ کەوت. من سەری وڵاتەکەی خۆمم بەرز ڕاگرت."٢٩٥

سەد بەبریا باشتر ئامۆژگاری بکرایە کە ماوەیەکی زیاتر لە خزمەت پیاوانی گەورەدا بوایە. لە ١٨ی مانگی مارسدا، کۆمیسیۆنی ڕۆمانی خەڵاتی باناتی دابەش کرد، لە سێ بەشی ڕۆژئاوا دوو بەشی بە یۆگۆسلاڤیا بەخشرا و زۆربەی ئەوەی کە ماوە بە ڕۆمانیا بەخشرا. لەگەڵ ئەوەش لە چوار بەشی بارانیا بەشێک و نیوەی ڕاستی باکای لە کۆتایی ڕۆژئاوای باناتی بە یۆگۆسلاڤیا بەخشی. پسپۆڕانی ئەمەریکی، کە هەمیشە بەدوای تەبای و پێکەوەژیانی برایانەی ڕەگەزەکان بوون، بەرلە هەمووشتێک پێداگریان لە سەر ناوچەی مەجاری نزیک شاری سزێگید دەکرد کە هەر بە مەجارستان بدرێتەوە. لە ٢١ی ژوەندا، سەرەڕای نارەزایەتیەکی چڕ و پڕ لەلایەن ڕۆمانیەکانەوە، شۆڕای عالی پێشنیارەکانی پەسەند کرد. یۆگۆسلاڤیەکان بە چۆڵنەکردنی دوورگەیەک لە دانووب کە بە ڕۆمانیا بەخشرابوو برێک گێرەوکێشەیان درووست کرد، و لە پاییزی ساڵی ١٩١٩دا لەنێوان ڕۆمانیا و یۆگۆسلاڤیا لەناو بانات ئاڵۆزی و ناخۆشی هاتە ئاراوە. تا ساڵی **١٩٢٣** نەبێ کە هەردوو وڵات ئەویش بە نابەدڵیەوە ڕازی بوو بەوەی کە ڕێز لە خەڵاتەکە بگرن دەنا هەر ناکۆک بوون.

کەچی هێشتا هێڵی سەر نەقشە نەیدەتوانی دانیشتوانی ناوچە لە دەوری یەک کۆ کاتەوە. نزیک بە ٦٠ ملوێن سێربی لە ڕۆمانیا بەجێمان، لە هەمان کاتیشدا ٧٤،٠٠٠ ڕۆمانی و نزیک بە ٤٠٠،٠٠٠ مەجاری لە یۆگۆسلاڤیا مانەوە. لە جیهانی تازەی وڵاتانی ڕەگەزی کە لە ناوەندی ئورووپا سەرکەوتوو بوون، بارودۆخی ئەم جۆرە کەمینەکان زۆر لەبار و گونجاو نەبوو؛ ئەوان زۆر جار وەک دەستدرێژکەر لەگەڵیان هەڵس و کەوت دەکرا، هەرچەند بۆ ماوەی چەندین سەدە لەوێ بوون. یۆگۆسلاڤیا و ڕۆمانیا هەرکیان سیاسەتی تواندنەوەیان ڕەچاو دەکرد. یۆگۆسلاڤیا بەگشتی دەسکەوتەکانی لە مەجارستان بەناوی ڤۆژڤۆدینا گرووپبەندی دەکرد؛

بێلگراد وەکوو ئەمڕۆکە دەسەڵاتێکی بەهێزی هەبوو. سێربی وەک زمانی تجارەت بڕیاری لە سەر لێدرا؛ نووسراوەکانی بازاڕ دەبوایە بە ئەلفبای سیریلیک بوونایە، هەرچەند دەکرا لە شێوەنووسینی لاتینیش کەڵک وەرگیرایە بە مەرجێک کە لەژێرەوە بنووسرایە؛ کۆنسێرتەکان دەبوایە چەند پارچەیەک سێربیان لەخۆ بگرتایە؛ ڕۆژنامەکان و کتێبەکانی قوتابخانە بە وردی چاودێری دەکران. لە سیەکاندا،1930s، چاودێرێکی بیانی سەرنجی بەوە دا کە تەنانەت سێربەکانیش لە ڤۆژڤۆدینا گۆرانیەکی خەمبارانەیان دەکوت بەناوی:

**چوار ئەسپم بەخشی**

**بەڵکوو سێربەکان بێنم بۆ ئێرە**

**هەشتیش دەبەخشم**

**تابەڵکوو ئەوان نەمێنن لێرە.٢٩٦**

لە سەردەمی شەڕی دوهەمی جیهانیدا، ئەڵمانی هیتلێر و مەجارستان ناوچەکەیان لەناو خۆیاندا دابەش کرد؛ بۆیە بوو بە گۆڕەپانی شەڕ لەنێوان داگیرکەران و هێزی بەرخودان. سزیگید، ئەو شارۆچکەیەی کە ئەمەریکیەکان لەسەر بەخشینی ئەوێ بە مەجارستان پێداگریان دەکرد، بوو بە شوێنی خێوەتگەیەک کە تێیدا جوولەکەکان لە ڤۆژڤۆدیناوە، و لەڕاستیدا لە سەراسەری ئەو پارچەی ئورووپاوە دەکوژران. ئەمڕۆکە زۆر بە کەمی هەست بە هەبوونی جوولەکە یان گیپسی لە ڤۆژڤۆدینا دەکرێ، بەڵام ئێستاش دانیشتوانی ئەو وڵاتە هەر تێکەڵاون. تەنیا نیوەیان سێربین، و نزیک بە چارەگێکیان مەجارین. بێلگراد تەنیا بە تۆقاندن و سەرکوتکردن توانیویەتی بیخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. چاوەڕوانی داهاتوویەکی ئاشتیانە خەونێکە کە هاتنەدی دژوارە.

لە سەرکەوتووەکانی کۆڕی ئاشتیدا، ڕۆمانیا باشترینی دەسکەوتەکانی گیر کەوت، لە حەشیمەت و لە قەبارەدا دوو کەڕەت زیاتری بەرکەوت. جیالەمانە هەمیشە لەسەر ئەم دەسکەوتانە پێداگری کردوە و بە توندی پاراستوونی.

ڕاستە کە بێسارابیا دوابەدوای شەڕی دووهەمی جیهانی بۆ یەکیەتی سۆڤیەت گەڕایەوە. سۆڤیەتەکانیش نزیک بە نیوەی بۆکۆڤینایان لە باکوور بۆخۆیان گرت، و بۆلغاریەکانیش بەشێک لە دۆبرۆدجا لە باشوور کە قەرەی لەسەر بوو بۆ خۆیانیان گەڕاندەوە. بەڵام ڕۆمانیا ئێستاش باشترین دەسکەوتی ئەوێی هەیە: ترانسیلڤانیا.

# ١١
# بۆلغارستان

با لەلایەکەوە لەسەر بانات وتوویژ کرابێت، بەڵام لەلایەکی ترەوە لەهەموان زیاتر ئەمەرەکیەکان بۆ ئەوەی کە بیکەن بە بەشێک لە زنجیرەیەکی پێچەڵاوپووچ لە مامەڵەکانی زەوی و زار ڕێگەیان بۆاریان خۆش دەکرد. ئەگەر ڕۆمانیا بەشێکی زیاتری لە بانات پێبگەیشتایە، لەوانەبوو دواتر پێی خۆش بوایە بەشێک لەو ناوچانە بگەڕێنێتەوە کە لە ساڵی ١٩١٣ لە بۆلغارستان، دراوسێی باشووری ڕۆژئاوای خۆی، داگیر کردبوو؛ لەوانەبوو دواتر بۆلغارستان هەندێک لە پارچە زەویەکانی بدایە بە دەست یۆگۆسلاڤیا، ئەویش دواتر خۆشحاڵ دەبوو کە واز لە بەشێک لە بانات بێنێت.٢٩٧ جێی سەرسووڕمان نیە کە ئەم دوانە بە هیچ ئامانجێک نەگەیشتن. ڕۆمانیا و یۆگۆسلاڤیا مەیلیان نەبوو پێکەوە دانیشن و دانووستان بکەن.

بۆلغارستان، وەک وڵاتێکی ناوچەی باڵکان کە لەپێناو ئامانجی ئەڵمانیەکان و ئوتریشیەکان خەباتی کردبوو، لە کۆڕی ئاشتیدا نوێنەرایەتی نەبوو. بەڵام ئەوەیکە جێی سەرنج و سەرسووڕمانە ئەوەیە کە لەباتی ئەوەی زەوی و زار لە کیس بدات هینی تریشی پێوە لکاند. لە وڵاتەیەکگرتوەکان بەتایبەت هەندێک دۆستی هەبوون، و تەنانەت دوژمنەکانیشی دوودڵ بوون و بڕیاریکی یەکلاکەرەوەیان نەبوو. لەگەڵ ئەمانەشدا، یاسای خودموختاری لە قازانجی ئەماندا بوو؛ بۆلغاریەکان لانی کەم لە دوو ناوچە لە دەرەوەی وڵات زۆرینەیان هەبوو: لە باشووری دووبروودجا، بەدرێژایی قەراخ ئاوی ڕۆژئاوای دەریای ڕەش؛ و لە ڕۆژئاوات ترەیس لە لوتکەی ئائیگین. هەروەک بۆلغاریەکان باسیان دەکرد، دەکرا ئەوان لە بەشەکانی مەقدوونیەی تایبەت بە یۆگۆسلاڤیا زۆرینەیان هەبوایە، بەڵام، وەکوو زۆر جاران ئەمە لە ناوچەکانی باڵکان ڕوویداوە، دامەزراندنی کارێکی هەتابڵێی دژوار و ناخۆش بوو.

ڕوون نەبوو کە چ شتێک بۆلغارستانی درووست کردبوو. ئایین کە نەبوو، چون، ڕاستە زۆربەی بۆلغاری ئاخێوەران ئۆرتۆدۆکس بوون، هەندێکیان مسوڵمان بوون. پێدەچێ ڕەگەز بووبێت، بەڵام ئایا

ئەوان سلاڤ بوون، یان لە ئاسیاوە هاتبوون و کۆچەر بوون، یان تێکەڵاوێک لەمانە بوون؟ و ئەوان چۆن لە سربەکان و لە مەقدوونیەکان جیاواز بوون؟ بەگشتی زمانەکانیان زۆر لەیەک دەچوون. ناسیۆنالیزمی بۆلغاری وەکوو ئەوانی تر لە ناوچەکانی باڵکان سەرهەڵدانێکی تازە بوو، تازەتریش چون پێدەچوو کە بۆلغاریەکان لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا لە سەدەی چاردەهەمەوە ژیابێتن، زیاتر لە هەر نەتەوەیەکی تری باڵکان. لە ساڵەکانی دەیەی ۱۸۷۰دا، ئەوان لە ئاکامدا شۆڕشیان کردبوو. کاتێکە عوسمانیەکان هەزاران کەسیان لەوان کوشت گلادستۆن هەندێک لە وتارە بەنرخەکانی خۆی پێشکەش کرد. بەڵام لە ساڵی ۱۹۱۹دا، بۆلغاریەکان لە ئورووپای ڕۆژئاوادا زیاتر وەک چەقۆکێش سەیر دەکران تاوەکوو قوربانی.۲۹۸

هەر لەو کاتەوەی کە وەک وڵاتێکی پێشکەوتوو یەکەمجار هاتبووە سەر ڕووی جیهان، بۆلغارستان وەک ئامیبیایەکی باڵکانی هەر هەڵبەز دابەزی دەکرد. لە ساڵی ۱۸۷۸دا بۆلغارستانێکی سەربەخۆ و گەورە لە ئیمپراتۆری عوسمانی سەری هەڵێنابوو، کە بەرەو ڕۆژئاوا دەگەیشتە سنوورەکانی ئاڵبانیا و بەرەو خوار تا لوتکەی ئائیگین دەڕۆیی. ئەوە هەم بۆ دراوسێکانی و هەمیش بۆ زلهێزەکان شتێکی زۆر بوو. سێربستان بەشێکی زۆری لە مەقدوونیە و یوونانیش ترەیسی ڕۆژئاوای بۆ خۆیان ڕفاندبوو. دوا فەراوانکردنێکی کورتخایەن لە ساڵی ۱۹۱۲، بۆلغارستان دۆبرۆجای باشوری تا ڕۆمانیا دۆڕاند. هاوڕێ لەگەڵ ئەو سەردەمە تەلاییە لە سەدەی دەهەم کە تێیدا بۆلغارستان لە ڕۆژئاوا دەستی بە ئادریاتیک و لە ڕۆژهەڵات بە دەریای ڕەش ڕاگەیشت، قەرەبووکردنەوەی خەسارەتەکان بوو بە بەشێک لە خەونی نیشتمانی بۆلغارستان.

ئەگەر ڕۆمانیەکان نێئاپۆلیتانی باڵکانەکان بوون، بۆلغاریەکان، کە لە ساڵی ۱۹۱۹ دەگەیشتنە پێنج ملوێن کەس، سکاتەکانی دەشتی بوون. ئەوان ناوبانگی خیرەسەری، زەحمەتکێشی، دەستپێوەگری و کەم نوتقیان هەبوو. پەندێکی کۆنی ناوچەکە ئەیوت کە " بۆلغاریەکان بە عەرابە کەروێشکت بۆ نچیر دەکەن."۲۹۹ لە شەڕی گەورەدا کەروێشکێک کە بۆلغارستان خوازیاری بوو لە سەرووی هەمویەوە مەقدوونیە بوو، ئاواتێکە لە دڵی پاشاشدا بوو، شازادەیەکی ئاواتەخواز و مەکربازی ئەڵمانی کە لە ئورووپادا بە فێردیناندی ڕێوی ناسرابوو. خاوەندارێتی مەقدوونیە نەک تەنیا ڕێگەی پێدەدان کە بە سەر قەراخئاوی ئائێجین بەڵکوو بەسەر دەر و دۆڵەکان و ڕێگاکانی شەمەندەفەر کە ئورووپای ناوەندی لەگەڵ باشوور و ڕۆژهەڵاتی ناوین پێکەوە گرێ دەدا کۆنترۆڵی هەبێت. فێردیناندۆ و حکوومەتەکەی بڕیاریان دا کە هێزەسەرەکیەکان مامەڵەیەکی باشتریان پێشنیار کردوە و بۆیە لە پاییزی ۱۹۱۵دا بۆلغارستان

هێرشی کردە سەر سێربستان. هاوپەیمانان شەڕیان ڕاگەیاند. بۆلغارستان لە سەرکەوتن بۆ ماوەیەکی کورت چێژی وەرگرت، کە لەو ماوەیەدا دۆبرۆدجای باشوور و بەشێکی زۆر لە مەقدوونیەی داگیر کرد، بەڵام لە ساڵی ١٩١٨دا سووپاکانی، کە چەک و خواردەمەنیان نەمابوو ، نەیانتوانی درێژە بە خەبات بدەن. بۆلغارستان یەکەمین هێزێک بوو لە هێزە ناوەندیەکان کە خۆی بەدەستەوە دا.

دوا شکستخواردنی بۆلغارستان، فێردیناندۆ وازی لە کورسی دەسەڵات هێنا و گەڕایەوە بۆ ملّک و ماڵاتی سەرنجڕاکێشی خۆی لە ئوتریش-مەجارستان و بە سەیرکردنی مەلەکان خۆی خەریک کرد، ئارەزووی گەورەی ئەو لە ژیانیدا بەدوور لە دایکی. جێگرەکەی ئەو کوڕەکەی بوو بەناوی بۆریس، لاوێکی باریکەڵە و نەمرچ. حەزی سەرەکی بۆریس لێخوڕینی شەمەندەفەرەکان بوو؛ شۆفیرەکانی ئۆریەنت ئیکسپرێس ئاگادارکرابوونەوە کە نزیک بە تاکسی لە هیچ شوێنێک ڕێگەی پێ نەدەن. ڕەقیبانی تازەی پاشای لاو ئەویان بە گێل و گەوج یان لەو خراپتریش دەزانی؛ زۆربەی چاودێران لایان وانەبوو کە ئەو بتوانێ لەسەر تەختی پاشایەتی زۆر دەوام بێنیت، بۆچوونێک کە خۆشی هەروای بۆ دەچوو. هاوپەیمانان لە دوورەوە نیگەران بوون. ئایا بۆلغارستان بەرەو کۆمۆنیزم دەڕۆیی؟ چدەبوو ئەگەر ملی بۆ گرێبەستێکی ئاشتیانە کەچ نەکردایە؟ هەروەک نوێنەری میلیتاری بەریتانیا لە هاوینی ساڵی ١٩١٩دا ئاماژەی پێکرد، " هاوپەیمانان هێزێکی ئەوتۆیان نەبوو، و، ئەگەر سەرهەڵدانێکی نیشتمانی هەلگیرسایە، نەدەکرا بەو ئاسانیە بەری بگیرێت."٣٠.

زۆر پشتبەستراو بە کەسایەتی بەکەش و فەش ئەلێکساندێر ستامبۆلیسکی بوو، بە واتەی چاودێرێکی بەریتانی " وەک چەتەیەک وابوو کە لەناو دارستان سەرقاڵی چالاکی و تێکۆشان بێت." کۆمارخوازی ناودار لە بۆلغارستان، ستامبۆلیسکی لە هەموو بوارێکەوە دژی بۆریس بوو: بەهێز، سادەوساکار، متمانە-بەخۆ و بەتوانا. لە خانووی جووتیێری خۆیدا ڕۆژی کاتەژمێرێک ژمناستیکی دەکرد. بەپێچەوانەی بۆریس، لە دوورەوە دەستەونەزەری فێردیناند نەدەوەستا. کاتێکە بۆلغارستان بەرەو ئەڵمانیا و مەجارستان-ئوتریش خۆی لار کردەوە، ئەو نەک تەنیا لە دانیشتنێکی نهێنیدا هێرشی کردە سەر شا بەڵکوو لە وتارەکەی خۆشیدا زۆر زانیاری وردی درووژاندبوو، کە لە سەر ئەوە خرابوە بەندیخانەوە.٣٠١

ستامبۆلیسکی بە پێشینەی گوندنشینی خۆیەوە شانازی دەکرد. هەرچەند لە ئەڵمانیا چوبوە زانکۆ و خوێندنی باڵای تەواو کردبوو، هێشتا هەر زمانی دەگرت وشەکانی بۆڕاست نەدەبۆوە دەتکوت پارووی لەبین گیراوە. وەک زۆرکەس لایان وابوو، ئەو کمۆنیست نەبوو، بەڵکوو

سۆسیالیستێکی گوندنشین بوو، بە گومانەوە دەیڕوانیە هەم کمۆنیزم و هەمیش کاپیتالیزم؛ لە وڵاتێکدا کە وەرزێری بچووکی زۆر تێدا بوو تێکەڵاوێک لەم دوانە سەرنجی ئەوی ڕاکێشا. ئەو سەبارەت بە خەڵکانی دانیشتووی شارەکان و چینەکانی باڵادەست و دەوڵەمەند گومان و دوودڵی دەخستە ناو جووتیارانەوە. ئەو پرسیاری دەکرد "کێ ئێوەی حەواڵەی قۆرتەکان کرد. ئەوان کردیان. کێ وای کرد لە ئێوە مەقدوونیە، ترەیس و دۆبرۆدجا بدۆڕێنن؟"٣٠٢

لە سێپتامری ساڵی ١٩١٨دا، کاتێکە سووپاکانی بۆلغاری تێکشکان، فێردیناندۆ، لە یەکێک لە دوایەمین هەوڵەکانی خۆیدا، ناردرا بۆ لای دوژمنی دێرین.

ستامبۆلیسکی سەربازانی یاخیبووی ئارام کردەوە. لە پاییزی ڕۆژی دواتردا ئەو بوو بە سەرۆک وەزیر. زۆر سەیر بوو کە ئەو بۆ لەبەینبردنی ئاسەواری پاشایەتی هیچ هەوڵێکی نەدا، پێدەچێ کە لەبەرانبەر بۆریس "پاشای بچووک"دا سیاسەتێکی نەرم و نیانی گرتبێتە بەر. ئەوەی ڕاستی بێت، بۆلغارستان نەیدەتوانی لەوە زیاتر لەگەڵ ئاڵۆزی و شەڕوشۆڕ هەڵبکات. ساڵیانی ساڵ بوو کە تورکەکان و بۆلغاریەکان قین لەدڵی یەکتر بوون. ڕۆمانیا لە سنووری باکوور هێزی هەبوو و ئامادەی ئەوە بوو کە بەرەو باشوور وەڕێ کەوێت. یوونان هێزەکانی خۆی لە سنووری باشوور خڕکردبۆوە و سەبارەت بە جەنایەتەکانی بۆلغارستان، وەکوو دزی مانگاکان، گلەو گازندەی هەبو. تەنیا یۆگۆسلاڤیا هیوابەخشی دۆستایەتی بوو. خەونێکی کۆن کە گوایە سێربستان و بۆلغارستان لێیان دێت وڵاتێکی گەورەی سلاڤی باشور درووست بکەن بە تەواوی لە هیچ کام لەو دوو وڵاتە نەڕوابۆوە. (لەڕاستیدا بەدوای شەڕی دووهەمی جیهانی لەلایەن مارشاڵ تیتۆوە سەری هەڵدابۆوە) بەڵام کاتەکەی بۆ باسکردنی یەکگرتنەوەی سلاڤی گونجاو نەبوو، بەو شێوەیەی کە بۆلغاریەکان لەکاتی شەڕدا هەڵس و کەوتیان کردبوو، یەکەم جار هاوڕێ لەگەڵ ئوتریش-مەجارستان و ئەڵمان هێرشیان کردبوە سەر سێربستان بەشێوەی پینکێر، و دواتر ناوچەکانی سیربیان کاول کردبو. لە خاڵێکدا لە ساڵی ١٩١٩، یوونانیەکان و سێربیەکان سەبارەت بە سازدانی شەڕێک دژ بە بۆلغارستان باسوخواستیان کرد، بیرۆکەیەک کە بە توندی لەلایەن کلیمینجووەوە بەرپەرچ درایەوە.٣٠٣

ئەوەی کە زۆر جێی سەرسووڕمانە ئەوەیە کە بۆلغاریەکان بە گەشبینیەکی سەیرەوە چاوەڕوانی دەستپێکردنی کۆڕی ئاشتیان دەکرد. نوێنەری ئەمەریکی لە سۆفیا ئەمەی بە شتێکی "سەیر و نامۆ" دەزانی: ئەوان وەک هاوپەیمانێک سەیری خۆیان دەکرد. " ئەوان لایان وایە کە وەک سەرۆک وەزیر ناوی نابوو تووشی "جەنایەت" هاتون، بەڵام کاتێک کە دانیان بەم ڕاستیەدا نا، ئەوان لایان وایە کە ئەمە ئیتر کۆتایی بابەتەکەیە، و ئیتر مانایەکی نیە کە هاوپەیمانان بە بێڕەحمی و

دووڵڵی سەیری بۆلغاریەکان بکەن و بۆچی دەبێ نەهێڵن بۆلغارستان هەڵوێستی پێش شەری خۆی وەک "منالی خراپکراوی باڵکانەکان" بگرێتەوە بەر. سەرۆک وەزیری بۆلغاری لەرووی سادەیەوە دانی بەوەدا هێنابوو کە ئەم وڵاتە لە پێوەندی گرتن بە ئەڵمان و ئوتریشەوە تووشی هەڵەیەکی گەورە هاتوە: " بۆلغارستان قەت تووشی نەدەبوو بە تووشی شەڕەوە ئەگەر بیزانیایە کە لەگەڵ ئینگلەند و زلهێزەکان رووبەڕوو دەبێتەوە." خەڵکی بۆلغارستان بۆخۆیان دژ بە هاوپەیمانیەکەی خۆیان لە سەردەمی شەڕدا بوون، کە لەلایەن " تاقمێکی بچووک لە سیاسەتمەدارانی بێ باوەڕ و بەکرێگیراوی ئەڵمانیا" سەپا بوو بە سەریاندا. لەڕاستیدا، هاوپەیمانانی سەرکەوتوو خۆیان بە قەرزداری بۆلغارستان دەزانی لەوەیکە دوای ئاگربەست کەوتبوون و ڕەوتێکیان گرتبوە بەر کە کۆتایی بە شەڕ هێنابو.٣٠٤

حکوومەتی بۆلغاری ئیمانێکی تایبەتی هەبوو بە یەک هێز: وڵاتەیەکگرتوەکان. ئەیانوت کە ویلسۆن لەلایەن بۆلغاریەکانەوە ڕێزی لێدەگیراو خۆشەویستی لای هەموان بوو؛ بەتایبەت ئەوان حەزیان لە یاسای خودموختاریەکەی ئەو بوو. ئەمە زیرەکی بوو: بۆلغارستان بەشێوەیەکی فەرمی نەکەوتبوە شەڕ لەگەڵ وڵاتەیەکگرتوەکان، و ئەمەریکیەکان بەگشتی هاوسۆز، و لەلایەن موژدەبەرانی ئەمەریکی لە ئەنجومەنی پرۆتێستانی هان دەدران و پشتگریان لێدەکرا. (قۆشمەچیەک ئاماژەی بەوەکردبوو کە ولاتەیەکگرتوەکان بەشێوەیەکی یەکڕەنگ و نەگۆڕانە لایەنگری بۆلغارستان بوە چون بۆلغارستان تەنیا وڵاتێکی باڵکان بوو کە ئەوان تێیدا چێژیان لە سەرکەوتن بردبوو.) پسپۆڕانی ئەمەریکی پشتگیریان لە بۆلغارستان دەکرد تا بە ئائیجین، دۆبرۆدجای باشوور و لەوانەیە بەشێک لە مەقدوونیە دەستی ڕابگات. بۆلغارستان بە خۆی بوایە تەنانەت زیاتریشی دەویست. وەکوو وڵاتانی تری شکستخواردوو- ئەڵمانیا، ئوتریش، مەجارستان و تورکیە- بەتاسەوەبوو تا مەرجەکانی گرێبەستەکەی خۆی ببینێت. حکوومەت هاوڕێ لەگەڵ داواکاریەکانی خۆی یادداشتێکی بۆ پاریس نارد، کە سەرجەم ترەیسی لە خۆ دەگرت؛ بۆچوونی شاندی بەریتانی سەبارەت بەوێ بریتی بوو لە" ناکارامە و دوور لە ڕاستی بوونی حکوومەتەکەی."٣٠٥

تا لەگەڵ ئیمپڕاتۆری عوسمانی کاری ئاشتیانە نەکرایە، کە بەدڵنیایەوە تا ماوەیەکی بەسەر نەچوایە نەدەکرا، نەدەکرا لەسەر سنوورەکانی باشووری بۆلغارستان بڕیارێک ڕاگەیەندرایە. هەتا مەقدوونیە لە ئارادابوایە، هاوپەیمانان بڕیاریان دابوو کە نیگەرانی ئەو پارچە زەویە نەبن کە قرە و شەڕ و شۆڕی لە سەر بوو، چون ئەوان بە بەشی خۆیان بگرە زیاتریش گەیشتبوون. بەریتانیەکان و فەڕەنسەیەکان ڕێکەوتبوون لەسەر ئەوەیکە بەرلە ساڵی ١٩١٤ هەرجۆرە دەستتێوەردانێک لەو سنوورانەی کە لە ناوچەکانی باڵکان دامەزرابوون جێی مەترسیە و نابێ قەرەی کەون. مەقدوونیە بە

تاقی تـەنیا مایـەوە، هەرچەنـد ئەمـە ژمارەیـەکی بـەرچاوی لـە بۆلغاریـەکانی لـە ژێـر دەسـەڵاتی یۆگۆسلاودا دەهێشتەوە. لەوانـەبوو بەریتانیـەکان و فەڕەنسـەیەکان قایـل بوونایـە بـەوەی کـە یاساکانی خۆیان بخەنە ژێرپێ (هەروەک دواتر ئەوان کردیان کاتێکە ئەوان ترەیسی ڕۆژئاوایان لـە بۆلغارستان گرت و بەخشیان بە یوونان) ئەگەر هەستیان بەوە بکردایە کە بۆلغارستان شیاوی ئەو پێشێلکارییە. ئەوان نـەیان دەکرد. کاتێکە یۆگۆسلاڤیا داوای ناوچەیـەکی کرد لـە بـەرەی ڕۆژئاوای جەنگ تا لـەڕێگای ئـەوەوە هێڵـە هەسـتیارەکانی ڕێگـای شـەمەندەفەڕ و خـودی بێلگـراد لەبەرانبـەر هێرشـی داهـاتوودا بپارێزێت، بەریتانیـەکان و فەڕەنسـەیەکان ئامـادەبوون تـا گـوێ شـل کـەن. ئیتالیـەکان، کـە دوژمنایـەتیان لەگـەڵ یۆگۆسـلاڤیا هـەبوو، بـەرەنگار بوونـەوە. سـەربازانی ئیتالیـایی لـەناو هێـزە داگیرکـەرەکانی هاوپـەیمانی ڕێگایـان دا بـە زینـدانیانی بۆلغـاری تـا دەربـاز بـن، لـە چەکـداماڵینی سووپای بۆلغـاری دەسـتیان کێشـایەوە و تەنانـەت بـە چـەک و تەقەمـەنیش ڕازاندیانـەوە. لەکۆتاییـدا، لەسەر نارەزایەتیەکانی ئیتالیەکان، چوار پارچە زەوی، کە دانیشتوانی سەرەکی ئەو ناوچانە بۆلغاری بوون، پێشکەشی یۆگۆسلاڤیا کران-نەک ئەوەندە کە پێی خۆش بـوو، بـەڵکوو بۆ بۆلغارستان یـەکجار زۆر بوو، کە دەکرووزاوە گوایە هەمووی خاڵە ستراتیژیەکانی لە ئـەو شاخانەی کە وڵاتیـان دابـەش دەکرد لەکیس چوبوو.٣٠٦

دۆبرووجـای باشـوور تەنانـەت کرووزانـەوەی زیـاتریش بـەدواوە بـوو. ئەمەرەکیـەکان لەسـەر ئـەوە پێـداگریان دەکـرد کـە کـۆڕی ئاشـتی بـە ملـک و مـاڵاتی خـۆی زیـاتر ڕابگـات. لـە بوارەکـانی ڕەگەزایەتیدا، داواکاری بۆلغارستان لە هینی ڕۆمانیا زۆر بەهێزتر بوو. دانیشتوانی وڵات تێکەڵاو بـوون: بەگشـتی بریتـی بـوون لـە تاتارەکـان، تورکـەکان، مسـوڵمانانی بۆلغـاری-ئـاخێوەر و بۆلغاریـە مەسـیحیەکان، کـە پێـدەچوو زۆرینەیـەکی نادیاریـان بـە دەسـت بێـت. لـە حەشـیمەتێکی نزیـک بـە ٣٠٠،٠٠٠ کەسی کەمتر لە ١٠،٠٠٠ ڕۆمانیایی لێبوو. بۆیە ڕۆمانیا بریاری دا لە کۆڕی ئاشتیدا پێداگری لەوە بکات، چون ئـەو بابەتـە لـەچاو داواکاریـەکانی تـری ڕۆمانیا بچووک و نادیار بـوو. هـەروەک زۆر جاریتر ڕووی دابـوو، ڕاسـتیەکان هـەر لـەناو ڕای گشـتیدا درووست کرابوون: کاتێکـە کۆڕی ئاشتی دەستی بە کارەکانی خۆی کرد، بەرپرسانی میلیتاری فەڕەنسـەیی لـەناو هێزەکـانی داگیرکەردا ڕێگەیان دابوو بە هێزەکانی ڕۆمانی و مەقاماتی ڕەسمی سیڤیل تـا ناوچەکە بخەنـە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە.٣٠٧

شـاندی نوێنەرایـەتی بۆلغـاری، کـە ستامبۆلیسـکی لـەخۆ گرتبـوو، لـە ژووڵای سـاڵی ١٩١٩دا بانگێشت کرایە پاریس هەرچەند گرێبەستەکەیان هێشتا ئامادە نەبوو. بۆ مـاوەی دوو مـانگ و نیـوی

ناخۆش و دڵتەنگ ئەوان لە هۆتێلەکەی خۆیان دانیشتن، ئەویش قەڵایەک بوو لە گەڕەکی نێئۆلی لەژێر چاودێری پۆلیسدا. ئەوان ڕێگەیان نەبوو بچنە ناو پاریسەوە، نامەکانیان چاودێری دەکران و ئەوان میوانانی قەدەغەکراو بوون. لە نامەیەکی پڕ لە داخ و کەسەردا بۆ کلیمینجوو ئەوان گلەییان کردبوو کە چاپەمەنی فەڕەنسە " وەک خەڵکانێکی ناشارستانی، نەشیاوی دۆستایەتی و متمانەبوونی وڵاتانی پێشکەوتوو" سەیری بۆلغاریەکان دەکا و هێرش دەکاتە سەریان.٣٠٨ ئەوەی کە جێی داخ بوو بۆ بۆلغارستان ئەمە بوو کە وڵاتەیەکگرتوەکان وەک تەنیا وڵاتێک کە پاڵپشتی لە داوکاریەکەی ڕۆمانیا بۆ دۆبرۆدجای دەکرد، کاتێکە بابەتەکە کەوتە بەر باس و خواست خەریک بوو پێوەندی خۆی لەگەڵ ئورووپا و کاروبارەکانی ئەورووپی هەڵدەوەشاندەوە. نوێنەرانی ئەمەریکی کە دوای واژۆکردنی گرێبەستی ڤێرسایلێس لە پاریس مابوونەوە لە هاوینی ساڵی ١٩١٩دا سووربوون لەسەر ئەوەیکە بابەتەکەیان بخەنە بەر باس و لێکۆڵینەوە، بەڵام ئەوان چیتر دەسەڵاتیان زۆر بە سەر هێزەکانی ئەورووپیەوە نەبوو، کە لایان وابوو، بە قەولی باڵفۆڕ کە بەشێوەیەکی بێ لایەنی باسی دەکا، هەرچەند ڕۆمانیا دەبێ پارچەیەک لە ناوچەکەی خۆی " کە ئاشکرابوو هینی ڕۆمانیا نیە"لەکیس بدات، کاتی ئەوە نەبوو کە داواکاریەکی لەو چەشنە بکات.٣٠٩

کاتێکە ڕەشنووسی گرێبەستەکە لە ئاکامدا لە مانگی سێپتامبر پێشکەش کرا، شاندی نوێنەرایەتی هێشتا زۆر شتی تری لەبەردەست دابوو کە دەبوایە گلە و گازندەی خۆی لەبارەیانەوە دەربڕیایە. بۆلغارستان نزیک بە سەدی دەی زەویەکانی خۆی لە دەست دا، وەکوو دۆبرۆجای باشوور و ئەوەی کە هێشتا لە ترەیسی ڕۆژئاوا بۆی مابۆوە، هاوڕێ لەگەڵ دەستپێڕاگەیشتنی بە ئائیجین. (هاوپەیمانان بەشێوەیەکی کاتی دەستیان بە سەر ترەیس دا گرتبوو، بەڵام یوونان، کە بە لیستێکی کڕیاری دووردرێژەوە هاتبوو بۆ پاریس، هەموو هیواو هۆمێدێکی ئەوە بوو دەستی بە سەردا ڕابگات.)

بۆلغارستان دەبوایە قەرەبووی ٩٠$ ملوێن دۆلاری بکردایەتەوە. (چون بەگشتی قەرزی ساڵانە و قەزەکانی دەرەوەی وڵات زیاتر لە بودجەی ساڵانە بوون، بۆلغارستان لە ئاکامدا لە هەرکیاندا کەمتەرخەمی کرد.) لە کۆتاییدا هێزە چەکدارەکان برینێکی کاری کەوتە سەر جەستەیان؛ سووپا دەبوایە تەنیا هێزێکی پۆلیسی ٢٠،٠٠٠ کەسی لێدەرهاتایە. کاتێکە وردەکاریەکانی گرێبەستەکە بڵاوکرانەوە، ڕۆژێک سەرەخۆشی نەتەوەیی لە بۆلغارستان ڕاگەیەنرا.

شاندی نوێنەرایەتی بۆلغارستان داوای چاکسازی دەکرد، بیانووەکەی ئەمە بوو کە لە سەردەمی لەسەرتەخت لاچونی فێردیناند بەم لاوە ئەو وڵاتە ڕەنگ و بۆی وڵاتیکی تازە و دیموکراتیکی بەخۆوە گرتوە، درووست وەک فەڕەنسە دوابەدوای شۆڕشەکەی خۆیدا. هاوپەیمانان بایەخێکی ئەوتۆیان پێ

نەدا؛ تەنیا مافێکە حازر بوون پێی بدەن ئەوە بوو کە بۆی هەیە ناوگانێکی بچووکی پاپۆڕی چەکدار لە دانووبدا بۆخۆی ڕاگرێت. لە بۆرغارستان باسی بەرخودان لە ئارا دابوو بەڵام ستامبۆلیسکی، وەک ڕیالیستێک، ئاماژەی بەوەکرد کە ئەو حازرە "تەنانەت ئاشتیەکی خراپیش واژۆ بکات". لە ٢٧ی نوامری ساڵی ١٩١٩دا بۆنەیەکی سادە لە هۆڵی شارۆچکەیەکی کۆن لە نیۆلی بەڕێوە چو. پاسەوانان بە قامەی سەری تفەنگەوە هێڵێکی پیپلیکانیان درووست کردبوو و جەماوەرێکی زۆر چاوەڕوانی ئەوە بوون تا بۆلغاریەکان سەرهەڵێنن. ستامۆلیسکی، زەردهەڵگەڕاو و نیگەران، بە تاقی تەنیا هاتە ژوورەوە. ئەمەریکیەکی هاوسۆز وتبووی کە لەوەدەچوو "کە گوایە کوڕی ئۆفیس بانگێشت کرابوو بۆ ئەوەیکە بۆ بەستنی کۆڕێک لەگەڵ لێژنەی بەڕێوەبەران." لەنێوان چاودێراندا سەرۆک وەزیرێکی یوونانی هەبوو، بەناوی ڤێنیزێلۆس، " کە هەوڵی ئەدا زۆر خۆشحاڵ نەیەتە بەرچاو". کلیمینجوو لە پشت مێزێکەوە سەرۆکایەتی دەکرد کە بە قوماشێکی سەوز داپۆشرابوو، و واژۆکردن زوو کۆتایی پێهات. لە ئاتێنس پشوویەکی گشتی ڕاگەیەنرابو. لە سۆفیا دەست لەکارکێشانەوەیەکی دڵناخۆشکەر هاتبوە ئاراوە.٣١٠.

هەر لە سەرەتای ئەو مانگەدا، ستامبۆلیسکی لە ڤێنیزۆلیس کەوتبوە پاڕانەوە و لالانەوە تا هەردوو وڵاتەکەیان پێکەوە هاوکاری بکەن: " لەنێوان سیاسەتمەدارانی ناوچەکانی باڵکان، بەڕێزتان لە هەموان لێهاتوترن و دەتوانن بە لێک تێگەیشتن لەنێوان خەڵکانی ناوچەکانی باڵکان پەرە بدەن و کاریگەری و شوێنەواری خۆتان دابنێنن".٣١١ ڤێنیزۆلیس، کە کەوتبوە خەیاڵی یوونانێکی گەورەتر و دڵنیا بوو لەوەیکە لەلایەن بەریتانیاوە پشتگری دەکرێت، هیچ گوێی شل نەکرد. ساڵی دواتر ترەیسی ڕۆژئاوا بە یوونان بەخشرا. هەتا دوایەمین گرێبەستێک کە لەگەڵ تورکیە لە ساڵی ١٩٢٣دا واژۆ کرا، کە لەو کاتەدا ڤێنیزیلۆس، و خەونەکەی، بە ڕاست نەگەڕابوو سنوورەکانی بۆلغارستان هێشتا هەر دیاری نەکرابوون.

ستامبۆلیسکی لە ئاکامدا پیاوێکی سیاسی لێدەرهات. بۆلغارستان سنوورە تازەکانی خۆی قەبووڵ کرد و لە سیاسەتی کۆنی دەستدرێژی کردن تەنانەت لە مەقدوونیەی یۆگۆسلاڤیا دەستی هەڵگرت. ئەو زیاتر لەوەش هەنگاوی نا، پێوەندیەکانی لەگەڵ یۆگۆسلاڤیا خۆش کردەوە و دژ بە ترۆریستەکان ڕێکەوتنامەیەکی لەگەڵ ئەو وڵاتە بەست؛ ئەو زۆر بوێرانە هەڵیکوتایە سەر ترۆریستەکانی مەقدوونیە کە دەیانەویست سۆفیا بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە. ئەو دەستی کرد بە دامەزراندنی ئینتێرناسیۆنالێکی سەوز لە پارتەکانی لادێکان تا لەبەرانبەر ئینتێرناسیۆنالێکی تازەی کمۆنیستیدا کە لەلایەن ڕووسیەکانی سۆڤیەتەوە دامەزرابوو بوەستێت. بۆلغارستان بوو بە یەکێ لە

ئەندامە پڕ هەست و سۆزەکانی کۆمەڵەی گەلان. بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا سیاسەتەکانی دەرەوە و ناوەوەی ستامۆلیسکی دوژمنانیکی زۆری خستەوە: ناسیۆنالیستەکانی بۆلغاری، ئەفسەرانی سووپا، ترۆریستەکانی مەقدوونی، چینەکانی مامناوەندی کە بە دەست هەڵسانی نرخ و ماڵیات بە تەنگەوە هاتبوون، لەوانەیە خودی پاشاش. لە ژوەنی ساڵی ١٩٢٣دا، کوودەتایەک ساز بوو؛ ستامبۆلیسکی لەلایەن پیلانگێڕانی مەقدوونیەوە کوژرا کە بەرلەهەمووشتێک ئەو دەستەیان بڕی کە ڕێکەوتنامەی دژەتیرۆری لەگەڵ یوگۆسلاڤیا واژۆ کردبوو. کاتێکە پاشا ئەمەی بیست لەژێر لێوییەوە وتی " گەورە پیاوی هەژار".٣١٢

ڕێبازێکە ستامبۆلیسکی بۆ کاروباری دەرەوە گرتبویە بەر لەگەڵ مەرگی ئەودا ئەمیش زۆری نەخایاند و مرد. زۆریەک لە بۆلغاریەکان بە ئاواتەوە بوون بۆ ساتێکیش بوە بگەڕێنەوە سەردەمانی پێشووی بۆلغارستانی گەورە؛ ئەوان لە گرێبەستی نیئۆلی نەفرەتیان هەبوو و لە هەڵس و کەوتی هاووڵاتیانی خۆیان لەلایەن ڕۆمانیا، یوونان و یوگۆسلاڤیا بە تەنگەوە هاتبوون و عاجز بوون. هەوڵەکانی سەرەتای سیەکان بۆ بەدیهێنانی ڕێکەوتنێکی گشتی ناوچەی باڵکان کە بتوانێ ڕێز لە سنووره تازەدابینراوەکان بگرێت بە مل نەدانی بۆلغارستان سەری نەگرت. ئاکامی ئەمە ڕێکەوتنێک بوو لەنێوان یوگۆسلاڤیا، یوونان، تورکیە و ڕۆمانیا کە بۆلغارستانی لە دوورەپەرێزیدا دەهێشتەوە. کاتێکە ئورووپا بۆ جارێکیتر ڕووی لە شەڕ کردەوە، بۆلغارستان بەرەو سەربازگەی ئەڵمانی خۆی خولێر کردەوە. لە ساڵی ١٩٤٠دا، لە ژێر گوشاری ئەڵمانیا، ڕۆمانیا دۆبرۆجای باشووری گەڕاندەوە دواوە. لە بەهاری ساڵی ١٩٤١دا، هێزەکانی بۆلغاری، کە هاوڕێ لەگەڵ ئەڵمانیەکان و ئیتالیەکان شەڕیان دەکرد، مەقدوونیە و ترەیسی ڕۆژئاوایان داگیر کرد. بۆلغارستان بۆ ماوەیەکی زۆر لە ناوچە ئازادکراوەکان چێژی نەبەرد؛ لە چوارچێوەی مەرجەکانی ساڵی ١٩٤١ تەنیا دۆبرۆجای باشووری هەڵگرتەوە. لەو کاتەدا ڕەژیمی کمۆنیستی ئەویێ بە تەواوی جێی خۆی کردبۆوە. بۆریس، لەمێژ بوو مردبوو، بە باوەڕی زۆر کەس، دەرمانداوکرابوو. بەڵام فیردیناندۆی ڕێوی سفەت لە تەمەنی هەشتاو حەوت ساڵیدا لە ساڵی ١٩٤٨ لە ئەڵمانیا بە مەرگی خۆی مردبوو.٣١٣

# ١٢

# پشوویەک لە ناوەڕاستی زستاندا

لە کۆتایی ساڵی ١٩١٩دا، پوختەی ڕێکەوتنەکانی ئاشتی خەریکبوون دەردەکەوتن. پرسی ڕوسیا، کۆمەڵەی گەلان و سنوورە تازەکانی ناو ئەوروپای ناوەندی هەرهەموویان کەوتبوونە بەرباس، هەرچەند بە تەواوەتی بڕیاریان لەسەر ڕانەگەیەنرابوو. لەگەڵ ئەمانەشدا لەسەر هەندێک وردەکاری هەستیاری گرێبەستی ئەڵمانی لەلایەن لیژنە تایبەتەکانەوە گەشەکردن هاتبوە ئاراوە: لەسەر خەسارەتەکانی شەڕ و لەسەر توانایی ئەڵمانیا بۆ قەرەبووکردنەوەی خەسارەتەکان؛ لەسەر سنوورەکانی ئەڵمانیا، کۆلۆنیەکانی و هێزەچەکدارەکانی؛ لەسەر سزادانی جەنایەتکارانی شەڕی ئەڵمانی؛ تەنانەت لەسەر کابلە ژێر ئاویەکانی ئەڵمانی. کێشەی گەورە کە بریتی بوو لە -چۆن سزادانی ئەڵمانیا و چۆن خستنەژێر کۆنترۆڵەوە لە داهاتوودا- لەلایەن کلیمینجوو، لیۆد جۆرج و ویلسۆن، تەنیا کەسانێک کە بەڕاستی دەیانتوانی دایکووژێنن، زۆر بەکەمی قامکی خرابووە سەر.

بێجگە لەمانە بە قەولی دیپلۆماتێکی سویسی کە وتبووی " شتێکی زۆر سەیر لە کۆڕی ئاشتیدا" خەریک بوو دەردەکەوت: دۆستایەتی نزیکی نێوان بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان. ڕاستە کە لەسەر ماندێتەکان هەندێک کێشە لەنێوانیان دا هەبوو، بەڵام لە شۆڕای عالیدا، لەناو لیژنەکاندا و کۆمیسیۆنەکاندا و لەناو داڵانەکاندا، بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان سەبارەت بە زۆربەی کێشەکان یەک هەڵوێستیان هەبوو. ویلسۆن، کە لە ناخی دڵەوە لیۆد جۆرجی خۆش نەدەویست، تاڕادەیەک ملی بۆ شۆڕ کردبوو و ئەوی بە زیاتر دەزانی، لەناو کۆڕەکاندا یان لە دەرەوەی کۆڕەکان و تەنانەت کاتێکە جاروبار دەچوون بۆ دەرەوە نەهار یان شێو بکەن زۆر بەینیان خۆش بوو و پێکەوە گاڵتەیان دەکرد و پێدەکەنین. و لەگەڵ ئەمانەشدا ئەو هەستی بەوە کردبوو کە دانووستان لەگەڵ لیبراڵێکی بەهێز وەک سەرۆک وەزیر زۆر زیاتر بە قازانجی تەواو دەبێ تا دانووستان لەگەڵ کۆنەپارێزێک.٣١٤

لە ٢٩ی ژانویەدا، ویلسۆن بە هاوسی ڕاگەیاندبوو کە پێی وایە لەنزیکەوە کارکردنی پسپۆڕانی ئەمەریکی لەگەڵ بەریتانیەکان زۆر بە قازانجەو و بیرۆکەیەکی باشە. هاوس، بە هەر مەرجێکەوە کە لە مێشکیدابوو، ملەکەچی ئەمە بوو و خستیە بەردەم ئەمەریکیەکان و بەریتانیەکان. لیۆد جۆرج، کە زۆر گرنگی دەدا بە پێوەندی برایانە لەنێوان بەریتانیەکان و وڵاتەیەکگرتوەکان، بەمە زۆر کەیف خۆش بوو. کانادایەکانیش هەر وابوون. پسپۆڕێکی ئەمەریکی بەناوی سەیمۆر وتبووی کە " پێوەندیەکانی ئێمە لەگەڵ ئەمەریکیەکان، کە تەنیا کەسانێکن لێرەدا سیاسەتی شۆڤینە و گێرەشێوێنی بەکار ناهێنن، (ڕاستیەک کە هەفتەیەکی پێچوو بوو تا ویلسۆن لێی حاڵی بێت) ئەوندە نزیکن کە بەڕاشکاویەکی تەواوەوە ئێمە لەسەر دابینکرنی سنوورەکانی ناوچەکانی ئەوروپا بیروڕا ئاڵوگۆڕ دەکەین." ئەندامانی هەردوو شاندەکە کەوتنە ڕاو و ڕاوێژکردن لەگەڵ یەک، ئاڵوگۆڕکردنی یادداشتی متمانە و وتوویژکردن لەبابەت هێڵە متمانەکانی تەلەفۆن کە ئەندازیارانی سووپای ئەمەریکی بۆ مەبەستی پێوەند دانی کریلۆن و مەجێستیک خستبویانە گەڕ. نیکۆلسۆن دواتر نوسیبووی کە " ئەوەی ڕاستی بێت ئەوەیە کە یەککگرتوویی ئیمە شتێکی سەرسووڕهێنەر و کەم وێنە بووە- کاتی خۆی شتێک بوو بەناوی *وردەزانیاریەکانی ئەنجومەنی وەزیران* [*cabinets particuliers of Maxim,s*] کە بریتی بوو لە فایلێکی ورددارێژراوی ئەمەریکی-بەریتانی کە سەرجەم سنوورەکانی جۆگۆ-سلاڤیا، چکسلەواکی-سلۆڤاکیا، ڕۆمانیا، ئوتریش و مەجارستانی لەخۆگرتبوو. تەنیا لەبابەت یوونان، ئاڵبانیا، بۆلغاریا و تورکیە لە ئوروپا هەست بە جیاوازیەک دەکرا و ئەم جیاوازیەش تەنیا لە ئاستێکی خوارەوە دابوو نەوەک لە ئاستی یاسایەکدا."٣١٥

چون پێوەندیەکانی نێوان بەریتانیەکان و وڵاتەیەکگرتووەکان ڕوو لە گەشە بوون، پێوەندیەکانی فەرەنسا لەگەڵ وڵاتانی تر ڕوو لە خراپتربوون بوون. بەریتانیەکان وەک ڕکابەری ناوچەکانی عوسمانی و ڕوسی لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین و ئاسیای ناوەندی سەیری فەرەنسەیەکانیان دەکرد. لەگەڵ ئەوەش ئەوان گومانی ئەوەیان هەبوو کە کاتێک ویلسۆن بۆ کورتەسەفەرێک کە گەڕابۆوە بۆ وڵات، فەرەنسەیەکان هەوڵی گۆڕینی مەرجەکانی ئەڵمان بدەن لە قازانجی خۆیان. هانکێی لەمبارەیەوە نووسیبووی کە " من هەست دەکەم هەموو فێڵ و تەڵەکەیەک لەمانەوە دەوەشێتەوە، بێ ئەوەی خۆیان لەو کارانە بدەن کە بریارە بیکەن." کاتێک فەرەنسا لەگەڵ قەیرانی ئابووری ڕووبەڕوو بۆوە و گوشاری دابەزینی خستە سەر فرەنکی فەرەنسا، بەریتانیەکان هەڵوێستێکی ساردوسڕیان لەخۆ نیشان دا. ئەوان بە فەرەنسەیەکانیان ڕاگەیاند کە ئەوان ناتوانن وامێکیان بدەنێ تا لەو قەیرانە ڕزگاریان بکەن. تەنیا بە ناوەنجی گەری هاوس لەگەڵ لیۆد جۆرج

بوو که برێک پارەیان بۆ تەرخان کرا. فەرەنسەیەکان وامەکەیان قەبوڵ کرد بەڵام درەنگ کەوتنەکەشیان هەر لەبیر مایەوە. بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان لەوەی کە وەک ناشارەزایی و نابەرپرسی فەرەنسەیەکان دەیاندیت سەریان سورمابوو.٣١٦

پێوەندیەکانی نێوان فەرەنسەیەکان و ئەمەریکیەکان یەکجار لاواز بوو. دیپلۆماتەکانی فەرەنسەیی ویلسۆنیان لەبەرهۆی گرتنەدەستی کاری ڕاستەقینەی کۆبوونەوەکە- سزادانی ئەڵمانیا- لەگەڵ کۆمەڵەکەی خۆی سەرلۆمە کرد. وەزیری ماڵی فەرەنسە، لۆویس-لوسین کلۆتز، بە هاوکارەکانی ڕاگەیاند کە ئەمەریکیەکان لە هەوڵی ئەوەدان خواردەمەنی ماوەی خۆیان لەبەرانبەر پارەدا بە ئەڵمانیا بفرۆشن، کە، هەڵبەت، لەبەرهۆی ئەمانە کاری فەرەنسەیەکان بۆ کۆکردنەوەی قەرەبووەکان دژوارتر دەبێت. لەبەرانبەر ئەمەدا ئەمەریکیەکانیش گلەییان دەکرد کە گوایە فەرەنسەیەکان لە دابینکردنی شوێنی حەوانەوەی ئەوان لە پاریس و دەستەبەرکردنی خەرج و مەخارجی سووپای ئەوان کێشەیان بۆ درووست کردوون. لە سینەماکان، جەماوەری فەرەنسەیی، کە کاتی خۆی بە هەر دەرکەوتنێکی ویلسۆن لەسەر شاشەی سینەما شاگەشکە دەبوون، ئێستا متەقیان لێوە نەدەهات و وڵات کش و مات دەبو. پۆلیسەکانی فەرەنسەیی و سەربازانی ئەمەریکی لەسەر شەقامەکان بەردەبوونە شەڕە جنێو و هاویشتنی ناونیتکە و ناتۆرە بۆ گیانی یەکتر. لە هەندێک لە ئەمەریکیەکان بیسرابوو کە وتبوویان گوایە ئەوان بە باری پێچەوانەدا شەریان کردوە. پاریسیەکان گاڵتەیان بە خاتوو ویلسۆن دەکرد، و ڕۆژنامەکانی فەرەنسەیی، کە بەگشتی کاتی خۆی پشتگریان لە سەرۆکی ئەمەریکی کردبوو، ئێستا ڕەخنەیان لێدەگرت و سووکایەتیان پێدەکرد.٣١٧

هێرشەکان ویلسۆنیان لەدین دەهری کرد، ئەو باش دەیزانی کە لەلایەن حکوومەتی فەرەنسەوە پلانی ئەمانە دارێژراوە. بە دەنگێکی لەرزۆک و پڕ لە نەفرەت و تووڕەیەوە، ئەو بەڵگەیەکی بڕواپێکراوی نیشانی میوانێک دابوو کە بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە ڕۆژنامەکانی فەرەنسەیی لە ئاژاوەکانی ناو ڕووسیە زێدەڕۆییان کردبوو، لەسەر ئەگەری دژایەتیەکی تازە لە لایەن ئەڵمانەوە جەختیان کردبۆوە و وەبیری ویلسۆنی هێنابۆوە کە ئەو لەگەڵ دژایەتیەکی بەهێزی کۆماری کە گەڕانەوە بۆ وڵات ڕووبەڕوو دەبێتەوە. ویلسۆن ئەوەی بە دەمیدا هات پێی کردن: فەرانسەیەکان "حەپوحۆلن". "هێچ وپووچن". "بێ ئەقڵن". بۆوەنابێ بڕوایان پێبکەیت". "فێڵاوی و دۆدەن". "لەهەمووی ئەوانەی کە تا ئێستا مامەڵەم لەگەڵ کردوون کەلەڕەقترن". بەسەر ئەمانەشدا لای دۆکتۆرەکەی خۆی گێڕابویەوە کە خەڵکی ئاسایی فەرەنسە هەرهەموویان ڕاست و درووستن، بەڵام ئەوە سیاسەتمەدارانی ئەوانن کە ئەمان بە لاڕێدا دەبەن. " ئەوە تەنیا بە هۆی ئەو ڕاستیەوە بوو کە

سیاسەتمەدارانی فەڕەنسەیی ئەوەندە فەرق و جیاوازیان دژ بە ئەمەریکیەکان بەکارهێنابوو کە سەربازانی خەڵکی ولاتیەکگرتوەکان لە لایەنگری کردنی ئەمەریکیەکان هەڵگەڕابونەوە و ڕوویان لە پاڵپشتی کردنی بەریتانیەکان کردبوو. و سەرۆک کۆمار ئاماژەی بەوەکرد کە گوایە بەریتانیەکان بە وەفا بوون و ڕاست و درووست ئەرکی خۆیان بەجێ هێناوە."٣١٨

کەش و هەواش وەکوو پێوەندیەکانی فەڕەنسەیی-ئەمەریکی ڕوولە ساردی و سۆڵی دەڕوویی. شڵێوەیەکی باش بە سەر پاریسدا باری؛ سەربازانی ئەمەریکی لە چامز-ئێلیسیس شەڕە تۆپەڵیان دەکرد. لە بۆیس دی بۆلۆگ خلیسکان و لە ڤێرسایلێس کالێسکەی خلیسکانی لێبوو. لەبەرهۆی نەبوونی خەڵووز، تەنانەت هۆتێلە گەورەکانیش سارد و سڕ بوون. خەڵک ئەوەی دەهاتەخوارێ سەرمایان خواردبوو، یان لەوە خراپتر هەڵاماتێکیان گرتبوو کە لە هاوینی ساڵی ١٩١٨ دەستی پێکردبوو و ولاتی تەنیبۆوە. دۆکتۆرانی نیزامی لە کریلۆن دەواو و دەرمانی قۆخەیان بلاودەکردەوە و ئامۆژگاری خەڵکیان دەکرد. جگەرەکێشان بەرگریکەرێکی باش بوو.٣١٩

بە هەزاران نوێنەر خەریکبوون دەگەیشتن. بەریتانیەکان ١٥،٠٠ کارتی سەردانیان بە سەر ئەواندا دابەش کردبوون تا لەگەڵ هاونەوعانی خۆیان بڕۆن چون ئەوە ئەو کارە بوو کە لە کۆنگرێسی ڤیەن ڕووی دابوو. دوا گلە و گازەندەیەکی زۆر لەبابەت بەفیڕۆدانی کات و سات، کلیمینجوو دەستووری دا کە واز لە مەشقپێکردن بێنن. زۆربەی نوێنەرەکان دیپلۆمات و پیاوانی سیاسی بوون؛ بەڵام بۆ یەکەمجار لە کۆڕێکی سەرەکی جیهانیدا، زۆریان وانەبوون. بەریتانیەکان هەمووی دایرەی ڕۆشنبیری لە وەزارەتی ئیتلاعاتیان هێنابوو، پیاوانی وەکوو ئارنۆڵد تۆئینبی لاو و لۆویس نامیر، دواتریش لەنێوان دیارترین مێژوونووسانی سەردەمی خۆیان. ئەمەریکیەکانیش پرۆفیسۆر و بلیمەتی خۆیان لە دایرەی لێکۆڵینەوەی هاوس، و بانگدارەکانی ۆڵستریت وەکوو تووماس لامۆنت و بێرنارد بارۆخیان لەگەڵ بوو. دیپلۆماتە کارامەکان هەر بۆڵەبۆڵیان دەهات. ژوولیس کامبۆن، ئەمینداری گشتی لە کوای دی ئۆرسای، وتی "ئەمە کارێکی سەرپێیە". بەڵام بیروباوەڕی لەو چەشنە لیۆد جۆرج یان ویلسۆن، یان کلیمینجۆی لە ئەو بابەتە سارد نەدەکردەوە. بە بۆچوونی لیۆد جۆرج " دیپلۆماتەکان تەنیا بۆ بەفیڕۆدانی کات درووستکراون.٣٢٠"

لەگەڵ ئەمانەشدا پاریس لە سکالاکەر، ڕۆژنامەنووس و کەسانێک کە تەنیا پێیان خۆش بوو سەر لە کاروبارەکان دەرهێنن جمەی دەهات. ئلۆنۆر گلین، ڕۆماننووسی ڕۆمانسی و خەیاڵی، کەسایەتیە ناودارەکانی لە پشت مێزەکەی خۆیەوە لە ڕیتز سەرگەرم کردبوو و وتارگەلێکی دەنووسی کە بەم پرسیارانەوە دەستیان پێدەکرد" ئایا ژنان لە حاڵی گۆڕین دان و

ئالۆ گۆڕ بە سەر ژیانیاندا درووست دەبێت؟" و " ئایا جوامێری کۆتایی هاتوە؟" فرانکلین ڕۆزڤێلت، کە دواتر بوو بە جێگری ئەمینداری هێزی دەریایی، ئەوانەی کە لەو پلەوپایەیان بەرزتر بوو بەوە ڕازی کردبوو کە هەبوونی ئەو بۆ چاودێری کردنی فرۆشتنی سامانی دەریایی ئەمەریکی لە ئورووپا پێویستە و هاوڕێ لەگەڵ ئەلینۆریکی نەمرچ و لەخۆڕازی گەیشتبوە پاریس. ژیانی هاوبەشیان ڕوولە تێکچوون بوو؛ ئەو هەستی بەوە کردبوو کە مێردەکەی سەرنجی ژنانی پاریسی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو. ویلیام ئۆرپێن و ئۆگۆسترووس جان لەوێ سەقامگیر ببوون تا شێوەکان و وێنەکانی فەرمی کۆڕەکە بکێشنەوە، هەرچەند ئەمیتریان کاتی خۆی زۆر لە پارتیە ئاژاوەگێریەکان دادەنا. وەزیرانی کابینەی بەریتانی جاری وابوو ڕۆژێک یان دوان لەسەریەک دەچوون بۆ ئەو شوێنە تایبەتانە. بۆنار لۆ، جێگری سەرۆک وەزیر، بوێرانە بە فڕۆکە دەهات و دەچوو، دەستێک جل و بەرگی تایبەتی ڕێڕێی کولکنی لەبەردەکرد. کچە گەورەکەی لیۆد جۆرج بەناوی ئۆلوێن، ژنێکی مێردکردووی لاو و ئێسکسووک، واوەدەهات و کورتە سەردانێکی دەکرد و دەڕۆیی. کلیمینجوو دوانیوەڕۆیەکیان پێشنیاری پێکرد سواری ماشێنەکەی بێت تا پێکەوە دەورێک بدەنەوە،و کاتێکە پێکەوە کەوتبوونە گەرمەی قسە و باس، پرسیاری لێکردبوو کە ئایا حەزی لە کاری هونەری هەیە. ئەویش بە تاسەوە وڵامی دابۆوە بەڵێ و ئەویش کۆمەڵێک پۆستکارت و وێنەی ڕووت و هەوەساوی بۆ دەرهێنابوو.٣٢١

ئێلیسا ماکسوێل، کە هێشتا نەببوو بەو ژنەپلەبەرزەی کۆمەڵگای کافەی جیهانی کە دواتر دەرهات، وەک هاوڕێی ژنێکی دڵڕفێنی تەڵاقدراو کە بەدوای شوویەکی تازەوە بوو سەردانێک لە نیۆیۆرکی بۆ خۆی مسۆگەر کرد. هەردوو ژنەکە لە ماڵێکی کرێچێتیدا چەندین ئاهەنگی سەرسووڕهێنەریان پێشکەش کرد. ژەنەڕاڵ پێرشینگ ئەرکی ئامادەکردنی خواردنەوەی وەئەستۆگرت؛ ماکسوێل لەسەر پیانۆ دوایەمین گۆرانیەکانی کۆل پۆتیری ژەنی؛ و ژنی تەڵاقدراو مێردێکی بۆخۆی دۆزیەوە، کاپیتانێکی جوانچاکی ئەمەریکی بەناوی دۆگلاس مەک ئارتۆر. بەیانیەکیان زوو، لە دەرەوە هەردوو ئەفسەری لاو لەسەر جوانکیلەیەکی تری ئەمەریکی شەڕەشمشێرێکی باشیان کردبوو.٣٢٢

ئەو ساڵە ژنانی دڵڕفێن لە پاریس کاتێکی خۆشیان هەبوو. زۆر بە کەمی نوێنەرەکان خێزانەکانی خۆیان دەهێنا؛ لەڕاستیدا، زۆربەی کەسایەتە پلە بچووکەکان بەئاشکرا لەوە قەدەغەن کرابوون. هانکی بۆ خێزانەکەی خۆی نووسیبوو کە "وادەردەکەوێ کە خاتووە هەرە جوانکیلە و هەرە تەڕپۆشەکانی کۆمەڵگا لەلایەن بەشە جۆراوجۆرەکانەوە هێنرابێتن و بانگێشت کرابێتن. من نازانم چلۆن ئیشەکانیان دەکەن، بەڵام ئێوارانە ئەوان سەما دەکەن و گۆرانی دەڵێن و کایەی وەرەق دەکەن." پووریتانیەکان [دین

پاڵەکان] گومانیان هەبوو بۆیە ئەیانوت بریا هەر کایەی وەرەق بوایە کورە زۆر شتی خراپتر خەریکن سەرهەڵئەدەن. ڕۆژنامەنووسێکی مێینەی ئەمەریکی لەگەڵ ژنەراڵێکی ئیتالی زۆر ڕاشکاوانە و بە حەز و خولیایەکی یەکجار زۆرەوە" سەفەری دەکرد و ئەم لاو لا دەچوو. لەو هۆتێلانەی کە نوێنەرەکان دەمانەوە، ژنان ئازادانە خۆیان دەکرد بە دیوەکانی پیاواندا. دوو کەس لەو پەرستارە کەنەدایانەی خاچی سوور کە ژمارەی دەرکەکەیان بە هەڵە گرتبوو و نەشیاندەویست ئەوێ جێبێڵن دەبوایە بناردرایەتنەوە بۆ وڵاتی خۆیان. جەنگ ڕێگرەکانی پێشووی تەواو شل کردبۆوە. ئیلینۆر گلین زۆر بەتوندی و بە ناڕەحەتیەوە دەیگێڕایەوە کە " گوناح و تاوان باڵی ڕەشی بە سەر شاری پاریسدا کێشاوە، مالۆسەکان لە لۆرێس بەپانەوە، هەندێک جار لە گرووپی شەش کەسیدا، پێکەوە شێو دەکەن... پیاوانیش هەروان. هیچ شتێک پیرۆز نیە، هیچ شتێک ناشاردرێتەوە، تەنانەت تاوان و تەماحیش.[٣٢٣]

پاریس شتی خافڵێنەری زۆری لێبوو: کێبەرکێکان لە ئیس تی.کلاود، چێشتخانەی هەرە باش ئەگەر پارەی چاکت پێبوایە بتوانیایە لە ئاستی نرخەکان بێیت، و ئۆپێرا، هەرەناودارەکان لەوێ بوون: *لیس کۆنتێس دی هۆفمەن، خات و باتێرفلای، لابۆهێمی.* تئاترەکان خەریک بوون بەرەبەرە سەرلەنوێ دەکرانەوە، لە شانۆگەریەکانی تایبەت بە پاریسەوە بگرە تا دەگاتە گاڵتەجاڕیەکان. سارا بێرنهاردێت لە جێژنێک بۆ خێروخێراتی فەڕەنسییەکان، و برای ئیسادۆرا دۆنکان سەماکانی ڕوونکاری نمایش دەکرد. ڕووت دراپێر لە لەندەنەوە واوەهاتبوو تا مۆنۆلۆجەکانی خۆی پێشکەش بکات، و نوێنەرانی کەنەدایی بە مۆسیقای فی فی بە جارێک دەهەژان و کاریان تێدەکرا. نەفەرێک لە نامەیەکدا بۆ خێزانەکەی خۆی نووسیبوو کە "ئمێە ڕێکەوتین لە سەر ئەوە کە شتێک هەبوو کە دەبوایە ڕاشکاوانە ڕاگەیەنرایە. پێم خۆشە بزانم کە ئایا، لەڕێگای زانیاری زیاترەوە، فەڕەنسیەکان بڵێی بتوانن لە کیس ئەو نەخۆشیانەی کە بێ گومان داوێنی ئێمەشیان گرتوە ڕزگاریان بێت." تەنانەت ویلسۆنیش، کە لە جاران کاتژمێر ١٠ی ئێوارە دەخەوت، بۆ شانۆیەکی ڕەخنەگرانە چووە دەرێ و تا درەنگان لەوێ بوو؛ ئەو هەندێک لە نووکتەکان و قسەخۆشەکانی بە خاو و دوور لە ئەدەب دەزانی بەڵام لە "بەشە گونجاوەکان" چێژی وەردەگرت". ئێلیسا ماکسوێل توانی لە ئاستی ڕابواردنێکی شەوانە لەگەڵ بالفۆر بۆ یەکەم جار لە ماوەی ژیانیدا بەر بێت. سیاسەتمەداری پیر بە ڕێز و ئەدەبەوە کە هەمیشە لەگەڵی بوو وتی کە "ڕێگەم بدەن با ئالێرەوە سووپاسی خۆم ئاراستەی ئێوە بکەم لەبەرهۆی ئەو ئێوارە هەرە خۆشە کە یەکەم جارە لە ژیانمدا شتی وا دەبینم."[٣٢٤]

نوێنەرانی تر بەشێوازگەلێکی تر کە دور لە تاوان و گوناە بوون ڕایان دەبوارد: پیاسەی بەیانیانی زوو لە بۆیس دی بۆلۆن، کایەی وەرەق لە ئێواراندا. بالفۆر هەرکات کە پێی بکرایە یاری تێنیسی دەکرد. لانسین ئێوارانە بەبێدەنگی ڕایدەبوارد و خۆی بە خوێندنەوەی بابەتی فەلسەفی خەریک

دەکرد. نوێنەرانی سەرەکی ئیتالیا، سۆنینۆ و ئۆرلاندۆ، لە هۆتێلەکەی خۆیان دەمانەوە و نەدەبزووتن. لیۆد جۆرج ئێوارانە هەرتاو ناتاوێک دەردەکەوت و دەچوو بۆ چێشتخانەکان یان تئاترەکان، هەرچەند فرانسیس ستیڤێنسۆن هەستی بەوەکردبوو کە بە گەیشتنی ئەو هەمیشە ئاژاوەیەکی ناخۆش دەکەوتەوە. جگە لەمە، ئەو[فرانسیس] ئێوارەیەکیان گلەیی ئەوەی دەکرد کە ئەو[لیۆد] لەگەڵ ژنێکی لاو لە شاندی نوێنەرایەتی بەریتانیا چاوبڕکێی دەکرد. " ئەو زۆر ڕاشکاوانە ئەو کارەی دەکرد و زۆریش کەیفی پێی ساز دەبوو، بەڵام من گوێم نەدەدایە."٣٢٥

ژیانی کۆمەڵایەتی لە پاریس خەریک بوو دەبووژایەوە. کاتێکە شازادە مۆرات و ئیلیسا ماکسوێل پێکەوە چوون بۆ کاستۆم بۆڵ- مۆرات وەک کلیمینجوو، و ماکسوێڵ، کە بەخۆوەتر و چوارشانە بوو، وەک لیۆد جۆرج- لە چامپز ئیلیسیز سەیارەکەیان لەلایەن جەماوەرێکی زۆر و کەیفخۆش وەستینرا. لە مەیخانە لە ڕیتز، خەڵک پێکەوە دادەنیشتن و کۆکتێلی تازەیان دەخواردەوە. لە دەرەوە لە ڤێرسایلێز، لە ویلا[خانووی قەراخ شار] ناودارەکەی خۆیدا، دیکۆرساز ئیلسی دی وۆلْفی (کە دواتر بوو بەخاتوو میندیل) بۆ نوێنەرانی هەرە ناودار و ناسراو چایی دادەنا. خاتوو ویلسۆن هەوڵی دا ویلسۆن بێنێتە دەرێ و بە کوێرایی چاوی پێداهەڵدەرەکانی پێکەوە بچن بۆ هەندێک لە پارتیەکان و میوانیەکان.٣٢٦

لە هۆتێل ماجێستیک، ئیان مالکۆلم، ئەمینداری تایبەتی بالفۆر، دەقە نووسراوەکانی هۆنراوە کۆمیدیەکانی خۆی پێشکەش کرد، "سەرهەڵدانی ئاشتی" و "بالادی[گۆرانی] پرینکیپۆ." شانۆگەلی ئاماتۆر و ناشارەزا لە ژێر خان هەبوون. دوائەوە کە ئۆرپێن بۆ بەرهەمێک پۆستەری سازکرد کە دوو منداڵی ڕووت و قووتی نیشان دەدا، شانۆی دواتر وتنی گۆرانیەکی بەکۆمەڵ بوو کە ئەیوت" دوو هەتیوی بچکۆلەین/ بێ جل و بەرگ بەرخۆلەین." ئەفسەرێکی بەریتانی، کە سەدان مایل لە دوورەوە هاتبوو تا لەسەر بارودۆخی ئورووپای ناوەندی گوزارشێک پێشکەش بکات، بە جنێودان و ڕق و توورەیەوە ئەوێی جێهێشت. بە هاوکارێکی ئەمەریکی خۆی گێڕایەوە کە "هەرکەس کە خۆی لە ئاستی ئەودا دەبینێ تاقەتی ئەوەی نیە گوێ لە لێکدانەوەی ئەو لەبابەت کەش و هەوای ناخۆش و دژواری پۆڵەندا بگرێت چون ئەوان تەواو نیگەرانی وتوێژکردنن لەسەر ئەوەن کە ئایا هۆڵی سەما باشتر وایە بێجگە لە سەماکردن لە ڕۆژانی سێ شەممە و پێنج شەممە یان تەنیا لە سێ شەممەکان بۆ شانۆ بەکار ببرێت." کچە چکۆلەکەی لیۆد جۆرج، مێگانی تەمەن شازدە ساڵ، خۆشترین ساتەکانی ژیانی خۆی بە سەر دەبرد. نەقڵبازان دەیانکوت کە باشتر وایە هۆتیلەکە ناونرێت تایبەت بە مێگان. لە ئاکامدا باوکی وەخۆ کەوت و بەریگرت و ناردرایە قوتابخانەی کۆتاییهێنەر[ قوتابخانەیەکە تایبەت بە ژنانی لاو لە بنەماڵە دەوڵەمەندەکان کە فێر دەبن چۆن لە کۆمەڵگایەکی های کلاسدا بژین].٣٢٧

سەماکردن لە ماجێستیکدا دەنگی دابۆوە. پەرستاران و تایپیستەکانی لاو- بە قەولی دیپلۆماتێکی بەتەمەن "وەک پەری دەریا"- لە دوایەمین شێوازەکانی سەماکردندا شارەزا بوون، لە هێزیتەیشن والْتزەوە بگرە تا گەگاتە فاکسترات. تەماشاکەران سەرسووڕمابوون. فۆچکە ڕۆژێک هاتبوو سەردانی ئەوێی کردبوو پرسیاری کردبوو کە "ئەو بۆچی بەریتانیەکان لە سەرەوە خەمین و لە پاشەوە گەشینن؟" سەماکردنەکانی شەوانی شەمە، بەتایبەت، ئەوەندە نابانگیان ڕۆیشتبوو کە دڵەڕاوکێی لە ناخی بەرپرساندا درووست کردبوو کە نەکا هەست بەوەبکرێت کە باشتر وایە بەریان پێ بگیردرێت.٣٢٨

کۆڕی ئاشتی پاریس بە بەراورد لەگەڵ کۆنگرێسی ڤیەن ئاهەنگی سەماکردن و ڕابواردنی لەڕادەبەدەر و نابەجێی کەمتر هەبوو. دیارترین شێوازەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی کاتەکانی نانی نیوەڕۆ و شێوکردن بوو، کە لەو کاتانەدا نوێنەران زۆر کاری بەکەڵک و باشیان دەکرد. لیۆد جۆرج کە لە هەموویان بەتواناتر و بەوەرتر بوو دانیشتی کاتی نانی بەیانیانیشی هەبوو. وڵاتانی تکاکەر ژمەکانیان لە هەژمار نەدەهات و لەوێشدا هەر دەکرووزانەوە و داوای شتی زیاتریان دەکرد. سەیمۆر لە نامەیەکدا بۆ ژنەکەی خۆی نووسیبووی کە " خەریکم وەک کرێکارێکی کۆمەڵایەتی سەرلەنوێ دەست بە کار دەکەمەوە. سبەینێ شێوکردن لەگەڵ براتیانۆ، شەمە نانی نیوەڕۆ لەگەڵ لیبراڵەکانی ئیتالی، ئێوارەخوان لەگەڵ سێربەکان، و دووشەمانە شێوکردن لەگەڵ چکۆسلەواکیەکان- کرامارز[کاریل کرامار] و بێنیسەکان-." پۆڵەندیەکان نەهارێکیان دەبەخشی بەو ئەمەریکیانەی کە تا کاتەژمێر پێنجی دوانیوەڕۆ دەمانەوە؛ یەک بە دوای یەک، مێژنووسان، ئابووریناسان جوگرافیناسانی پۆڵەندی بەڵگەیان لەسەر ڕەوابوونی داواکاریەکانی پۆڵەندا دەهێناوە. چینیەکان ڕاگەیاندنی دەرەوەیان بۆ شێوێکی تایبەت بانگێشت کردبوو. کاتێکە نۆبەی خوولەکان دەهات، یەک بە دوای یەک، کاتەژمێر بە دوای کاتەژمێر، میوانەکانیان چاوەڕوانی ئەوە بوون تا پەروەندەی وڵاتی خانەخوێ ببیستن. بە ئینگلیزیەکی تەواو و بێ خەوش چینیەکان لەسەر ئەم بابەت و ئەو بابەت، لە سەر هەمووشتێک جگە لە کۆڕی ئاشتی وتوێژیان دەکرد. لە کاتەژمێر ٣:٣٠ی بەیانی، هەواڵنێرانی ئەمەریکی گەڕانەوە بۆ وڵات، تەنیا ئەندامێکیان بەجێهێشت ئەویش بۆ ڕاگەیاندنی گوزارشەکان بوو. کاتێکە ئەویش لە کۆتاییدا ئەوێی بەجێهێشت، کازیوە کە دەرکەوت، هێشتا چینیەکان بۆیان دەرنەکەوتبوو کە هۆی ئەو شێوکردنە چیبوە.٣٢٩

هەندێک لە نوێنەرانی وڵاتانی دەرەوەی سنوورەکانی دەریاکان سەردانی گۆڕەپانەکانی شەڕیان کردبوو. لەو نامیلکانەیدا کە بۆ ماڵەوەیان نووسیبوون هەوڵیان دابوو ئەو شتانەی کە بە چاوی خۆیان دیبوویان بگێڕنەوە: دارە سووتاوەکان، پارچەکانی بۆمبا کە بە دەورو بەری جادەکاندا پرژوبلاو

بیوونەوە، جێ خوومپارەکان، تێکاهاڵان و تێکچڕژانی سیمە تەل بڕەکان، ئەو تانگ و تفەنگانەی کە لەناو قوڕ و لیتەدا دیار نەبوون، پاشماوەی جلە یەکدەستەکان، ئێسقانە نەناژراوەکان. گۆردۆن ئۆچینکلۆس، زڕکوڕی هاوس، نوسیبووی کە " لە مەودایەکی دووردرێژدا سەر عەرز بە جێگای قووڵی تۆپ و خومپارە داپۆشراوە، هەرهەمووی ئەم جێگایانە پڕ لە ئاون، و دەیان تانک لەبەرچاوتدا دەبینی، هەموویان لەت و پەت بوون، و بەم لاو لای گۆڕەپانەکاندا کەوتبوون بەلادا. قەت لە ژیانمدا وێرانی ئاوا وەحشیانە و خاپووری ئاوا بەربڵاوم نەدیوە." ئەوان بەناو قۆرتەکاندا تێدەپەڕین و کڵاوەئاسنینەکانی ئەڵمانیەکان و قاپووڕەگولەی خاڵییان بۆ دیاری هەڵدەگرتەوە. یەکێک لە پارتەکان چەند فتێلەیەکی بۆمبای دۆزیەوە، "کەرەسەی یاری بۆ منداڵان." ئەوان لەناو تەپۆڵکە تەپۆڵکەی کەلاوەکان کە کاتی خۆی شار و شارۆچکە بوون سەرسووڕمابوون. جەیمز شاتوێڵ، پرۆفیسۆرێکی ئەمەریکی دوا سەردانی شاری کاتدارئی ڕەیمز، دەیوت کە وەک کەلاوەکانی پامپەی وابوو، هەرچەند کاتێکە زانی لەناو کەلاوەکاندا چێشتخانەیەک ماوە کە سۆسیس و سۆرکرات درووست دەکات زۆر هەستی بە خۆشی و ئاسوودەیی کرد.٣٣٠

* * * *

لە ناوەڕاستی مانگی فەوریەدا، خێرایی کارەکان کەم بۆوە چون ویلسۆن بۆ کورتە سەفەرێک ئەوێی چۆڵ کرد و گەڕایەوە بۆ وڵاتەیەکگرتووەکان- لەڕووی فەرمیەوە، بۆ مەبەستی داخستنی دانیشتنەکانی کۆنگرێس؛ لەڕووی نافەرمیەوە، بۆ مەبەستی دانووستان لەگەڵ دوژمنایەتی ڕوولەگەشەی لەگەڵ کۆمەڵەی گەلاندا- و لیۆد جۆرج گەڕایەوە بۆ لەندەن تا دەستەملانی کێشەکانی ناوخۆ ببێت. بالفۆر لە شۆڕای عالیدا پشتگری لە لیۆد جۆرج کرد ویلسۆن، کە دووبارە بڕیاری دابۆوە تا وەزیری دەرەوە لەبەرچاو نەگرێت، هاوسی وەک جێگری خۆی هەڵبژارد. لانسینگ کە تووشی خەمۆکی هاتبوو و تەواو نەبوو — بەدوای ڕێگەچارەیەکی تازەوە بوو بۆ نەخۆشی شەکرەکەی- بەو بەکەم زانین و بێ محەل کردنە زۆر تێکچوو. هەڵبەت کە ئەمە یەکەم جار نەبوو. کاتێکە لانسینگ وەک پارێزەرێکی بەئەزموونی جیهانی لە دانیشتنێکی شاندی نوێنەرایەتی ئەمەریکیدا سەبارەت بە کۆمەڵەی گەلان هەندێک پێشنیاری ئاراستە کردبوو، وڵامێکی وشکی دابۆوە و وتبوی کە ئەو حەز ناکا پارێزەران ڕەشنووسی گرێبەستی ئاشتی بنووسن. چون ئەو تەنیا پارێزەری حازر لە کۆڕەکەدا بوو، لانسینگ ئەمەی وەک بێ ڕێزی هەم بە خۆی و هەمیش بە پیشەکەی زانی. ویلسۆن بەردەوام کار و پیشەی گرنگی دەدا بە هاوس؛ لانسینگ خرابوە پەراوێزەوە تا گوزارش بە ڕاگەیاندنەکان بگەیەنێت، شتێک کە لێی بێزار بوو. پێدەچێ ویلسۆن لە هەڵگیرسانی

ناخۆشی و ناکۆکی لەنێوان هاوس و لانسینگ کەیفخۆش بووبێت و ئەو شاگەشکە دەیگرت کاتێکە شتێکی لەبابەت بێ ڕێزی کردن بە لانسینگەوە دەبیست. ئەمینداری خاتوو ویلسۆن دوا سەردانێک لە خاتوو لانسینگی چاوبەفرمێسک لە یادداشتەکەی خۆیدا نووسیبووی " هەر کارێک کە بەڕێز لانسینگ دەیکا ئەو پێی عاجز دەبێت، ئەو ڕاستیە کە ئەوان دووبەدو زۆر جاران بۆ شێو دەچنە دەرێ، بانگێشتی کەسانێک وەردەگرێ کە ئەو(سەرۆک کۆمار) خۆشی ناوێن. ئەو لەگەڵ هەموو شێوازێکی ژیان دەتوانێ هەڵ بکات جگە لەو شێوازەی کە ئەو گرتوویەتە بەر."هەڵس و کەوتی ویلسۆن لەڕووی دڵڕەقیەوە بوو و لە کۆتاییدا زۆر گران تەواو دەبوو: کاتێکە ڕێکەوتنەکانی ئاشتی بۆ پەسەندکردن گەڕایەوە وڵات لانسینگ تۆڵەی خۆی کردەوە.٣٣١

هەم هاوس و هەمیش بالفۆر بەتاسەوە بوون تا بە نەبوونی کەسانی پلەسەرتر بە چالاکی کۆڕەکە خێرایی ببەخشن. ئەوان بڕیاریان دابوو تا لانی کەم لەسەر دەستەبەرکردنی مەرجە گشتیەکان بۆ ئەڵمانیا جەخت کەنەوە (وردەکاریەکانیان دانابوو بۆ وتوێژێکی ڕاستەوخۆ لە کۆڕێکی ئاشتی گەشەکردودا کە هەر چاوەڕوانیان دەکرد). بە کۆمیسیۆنەکان و لیژنەتایبەتەکان (کە لە کۆتاییدا ژمارەیان گەیشتە شەست دانە) ڕاگەیەنرا کە تا ٦ی مارس گوزارشەکانیان پێشکەش بکەن. بەرلەوەی ویلسۆن بگەڕێتەوە ئەوە پێویستی بە هەفتەیەک دەرفەت هەبو تا کاروبارەکان ڕیک و پێک بکرێن. پلانەکە وابوو کە بەرلەکۆتایی هاتنی مانگ شاندی نوێنەرایەتی ئەڵمانیا بانگێشت بکرێت. ئەمە یەکجار دڵخۆشکەر بوو.٣٣٢

نوێنەرەکان هەر پرتە و بۆڵەیان دەهات بەڵام بە خێشکە خێشک هاتن. کاتێکە نیکۆلسۆن لە ئێوارەخوانێکدا لە ڕیتز چاوی بە مارسێل پراوست کەوت- "سپیکەلانە، سەروریش نەتاشراو، شڵەژاو، دموچاو تێکقووپاو"-، ئەو هەستی بەوە کرد کە نووسەری گەورە بە وردەکاریەکانی چالاکیەکە سەرسووڕماوە و لای شتێکی سەیر بوو. پراوست دەستوری دا و وتی کە " سەبارەت بە لیژنەکان قسەم بۆ بکەن." نیکۆلسۆن بەم وتەیە دەستی پێکرد کە ئەوان بەگشتی کاتژمێر ١٠ی بەیانی کۆبوونەتەوە و چاویان بە یەک کەوتوە. پراوست داوای وردەکاری زیاتری کرد. " لە شاندی نوێنەرایەتی سەیارەیەک دەگری. لە کوای دی ئۆرسای دەچیە دەرێ. لە پیپلیکانەکان دەچیە سەرێ. دەچیە ناو ژوورەکەوە. و دواتر؟ هاورێم گوێ قولاغ بە بزانە چی دەبیستی."٣٣٣

کاتێکە ویلسۆن پاریسی چۆڵ کرد، پەیمانی کۆمەڵەی گەلان بەشێکی زۆری لێ داڕێژرابوو، لەسەر مەرجەکانی ئەڵمانی هەندێک پێشکەوتن هاتبوە ئاراوە و زۆربەی کۆمیسیۆنەکانی ناوچەیی پێکهاتبوون. بەڵام لەسەر ئیمپڕاتۆری عوسمانی هیچ بڕیارێک ڕانەگەیەنرابوو و ئەو گرێبەستانەی کە لەگەڵ ئوتریش، مەجارستان و بۆلغارستان بەسرابوون زۆر بەکەمی لەبەرچاو گیرابوون. زۆر بە

کەمی باس لە کۆڕی سەرەتایی ئاشتی دەکرا و زۆر باسی چەندێتی کارێک دەکرا کە پێویست بوو بەرلەوەی وڵاتانی دوژمن بۆ پاریس بانگێشت بکرێن کۆتاییان پێ بێنایە. هەرچەند هێشتا زوو بوو و دانی پێنەدێنرا، ئەوەی کە لە پاریس ڕووی دەدا بە مانای ڕاستەقینەی خۆی ناوی کۆڕی ئاشتی بوو. لە هۆتێلەکان و ژوورەکانی کۆبوونەوەدا، هەندێک تێڕوانینی دڵ ساردکەرەوە هەبوون کە ئەیانوت بڵێی بەرلەوەی جیهان ببێ بە بڵێسەی ئاگر ئاشتیەک بێتە کایەوە.

لە ١٩ی مانگی فەوریەدا، کاتێکە کلیمینجوو بۆ مەبەستی بەڕێوەبردنی کۆڕێک لەگەڵ هاوس و بالفوڕ لە کریلۆن خەریک بوو لە ماڵەکەی خۆی لە ڕوو فرانکلین دەهاتە دەرێ ، کابرایەک بە جل و بەرگی کارکردنەوە کە لە پشت یەکێک لە شوێنە گشتیەکانی سەرحەوزکردن خۆی مەلاس دابوو دەرپەڕیە دەرەوە و چەندین کەڕەت تەقەی لە ماشێنەکە کرد. کلیمینجوو دواتر بۆ لیۆد جۆرجی گێڕایەوە کە وامەزانی ئەو ساتە بۆ هەتاهەتایە درێژەی هەیە و بڕانەوەی نیە. گولەیەک لەبەینی پەراسوەکانیەوە ئەوی پێکابوو، تەنیا ئەندامە حەیاتیەکانی نەپێکابوو. (شوێنەکەی زۆر مەترسی دار بوو و نەدەکرا بەو ئاسانیە بێتە دەرێ و بۆیە هەتا کاتی مردن لەگەڵی بوو.) هێرشبەرەکەی کلیمینجوو، ئیۆگۆنە کۆتین، ئانارشیستێکی ناتەواو و کەم ئەقڵ، لەلایەن خەڵکەوە دەستگیرکرا، کە وەک جاران چاوەڕوانی هات و چۆکانی سەرۆک وەزیر بوو، و هەر لەو نزیکانەدا دادگایی سەحرایی کرا و هەڵواسرا. کلیمینجوو گەڕێندرایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی.کاتێکە یاریدەدەری بەوەفای ئەو مۆرداک خۆی گەیاندە ئەوێ، ئەوی دی کە ڕەنگزەردە بەڵام هوشیارە. کلیمینجوو ئاوا بۆ گێڕایەوە کە " ئەوان لە پشتەوە تەقەیان لەمن کرد. نەیانوێرا تەنانەت لەپێشەوە هێرش کەنە سەرم."٣٣٤

کاتێکە هەڤاڵەکان گەیشتە کریلۆن بالفوڕ وتی کە "خۆشەویستم، ئەوە بڵێی نۆڤلانەی چی بێ و بۆ چ کارەساتێک بقرێنێ." زۆر کەس لە پاریس لە شتی ساردتر دەترسان، بەتایبەت کاتێکە دوو ڕۆژ دواتر هەواڵی کوشتنی سەرۆک وەزیری سۆسیالیستی باڤاریا بڵاو بۆوە. لیۆد جۆرج تێلێگرافێکی نارد بۆ کێر لە لەندەن. " ئەگەر ئەو هەوڵی کوشتنە هەوڵێکی بۆلشویکی بێت ئەو دەسەلمێنێ کە ئەم ئاژاوەچیانە چەندە شەل و شێتن و هیچ شتێک ناتوانێ بە قەد سەرکەوتن لە کوشتنی کلیمینجوودا بەهرەیان پێبگەیەنێت و ئەم سەرنەکەوتنە دەبێ بیروباوەڕی گەلاوی ئەوان لە فەڕەنسە بسڕێتەوە و هیچ ڕێگایەکی نەهێشتۆتەوە بۆ ئەوەی لەگەڵیان دانیشین و دانووستانیان لەگەڵ بکەین.٣٣٥

کلیمینجوو وەک جاران زۆر بێ باکانە لەپەنا ئەو ڕووداوەوە تێپەڕی و هەرگوێشی نەدایە. میوانەکان لە سەر کورسیەکی دەسکەدار چاویان پێی کەوت کە دانیشتوە، و سەبارەت بە نیشانەشکاندنەکەی کۆتین گلەیی دەکرد و ئەیوت کە- "کابرای فەڕەنسەیی لە حەوت ڕێگبار

لەسەر یەک شەشی نەهەنگێوی"- و لەگەڵ دۆکتۆرەکانی وت و وێژی دەکرد و ئەیوت: " دۆکتەرەکان، ئەمن ئەوان لەهەموو کەس چاکتر دەناسم چون من خۆم تاکێکم،" بە پەرستارێک کە پێی وت رزگاربوونەکەی ئەو مۆعجیزە بووە لەوڵامدا وتی کە " ئەگەر خوا کەیفی لەوەبوایە مۆعجیزەیەک بکا، باشتر وانەبوو بەرگری بکا لە دەستردرێژکەرەکەی من و نەهێڵێ تەقەم لێبکا!" ئەو نەیهێشت کۆتین مەحکووم بە مەرگ بکرێت: " من ناتوانم کۆنەکۆماریەکی وەک خۆم و هەروەها دژبەرێکی سزای مەرگ لە ئاستێکدا ببینم کە حوکمی سێدارە بۆ مرۆڤێک لەبەرهۆی تاوانی دژایەتی لەگەڵ حکوومەت بسەپێنێ." کۆتین سزای دە ساڵ زیندانی بۆ برایەوە بەڵام چون کلیمینجوو نارەحەت بوو لەوەیکە تاونەکەی ئەو هۆیەکەی دەگەڕایەوە بۆ باڵی چەپ نەیهێشت دە ساڵەکە لە زیندان تێپەڕێنێ و لەنیوەدا ئازدی کرد.

پەیامی هاوسۆزی و هاوخەمی یەکبەدواییەک سەرڕێژ بوون، لەلایەن لیۆد جۆرج و جۆرج پاشا لە لەندەنەوە، لە ئاتلانتیک لەلایەن ویلسۆنەوە، لەلایەن سارا بێرنهاردێت-" هەر ئێستا کلیمینجوو فەرەنسەیە"- و لەلایەن هەزاران فەرەنسەییەوە کە کلیمینجۆیان بە باوکی سەرکەوتنەکانی خۆیان دەزانی. پاپ پەیامی پیرۆزبایی خۆی حەواڵە کرد (کۆنەڕادیکاڵی دژەئاخووندیش بەنۆبەی خۆی پەیامی نارد) و سەربازانی ئاسایی پلیکانەکانی سەردەگای کلیمینجوویان بە گوڵ و رەیحانە رازاندەوە. پۆینکارە کە بەبیستنی هەواڵەکە هەر لە سەرەتاوە وەکوو هەمووان شڵەژابوو زۆر تووڕە و عاجز ببوو. "گەلحۆیی و شێتیەکی ئاوا تایبەتی، ئەفسانەیەکی سەیر و سەرسووڕهێنەر کە ڕاستیەکان حەشار دەدا گومانی تێدا نیە کە مێژووش بە هەڵەدا دەبات." ڕۆژێک بەدوای هەوڵی کوشتنەکە، کلیمینجوو خەریک بوو لە باخەکەی خۆیدا پیاسەی دەکرد؛ حەفتەیەک دواتر گەڕایەوە سەرکارەکەی خۆی. هەرچەند دەبێ بڵێین کە بەتوندی شڵەژابوو. ویلسۆن وەکوو زۆر کەسایەتی تر لای وابوو کە کلیمینجوو تازە ناتوانێ وەک جاران لە هێزی جەختکردنەوە و تەرکیز کردنی خۆی کەڵک وەرگرێت. ٣٣٦.

* * * *

لەگەڕانەوەیدا بۆ لەندەن، لیۆد جۆرج لە بەرەنگاربوونەوەی دژ بە دوژمنەکانی لە جاران سەرکەوتووتر بوو. ئەو لە ١٠ی مانگی فەوریەدا لە شەمەندەفەرەکەی خۆی دابەزی و لەگەڵ بۆنار لۆ و ڕاوێژکاری سەرەکی ئەو لەسەر کێشەی کرێکاران ڕاستەوخۆ چوون لە کۆبوونەوەکاندا بەشداری بکەن. ئەمینداری کابینە لە گوزارشەکەی خۆیدا بۆ هانکەی گێڕایەوە کە "من تۆزێک دواتر چاوم بە ئەو کەوت. و ئەو سەبارەت بە کردەوەکانی تۆ لە پاریس هەتا بڵێی بە کەیف و دڵخۆش بوو و کۆمەڵێک پلان و بەرنامەی پێبوو بۆ دانووستان لەگەڵ کرێکانی کانزاکان و پیاوانی ڕیگای شەمەندەفەر کە بڕیارە لەماوەی یەک

حەفتە یان دوو حەفتەی دواتردا سەر هەڵێنن."لە کۆتاییدا ئەو بڕیاری دا ئەو مانگرتنانەی کە مەترسیان لێدەکرا خێیان کاتەوە، و کۆمیسیۆنەکانی لێکۆڵینەوەی خڕکردەوە و بەشی بەڕێوەبەرایەتی و بەشی کاری لە دەوری یەک کۆکردەوە هەروەک پێشتر زۆر لەو کارانەی دەکرد. لەو چوار حەفتەیەدا کە لە لەندەن مایەوە ئەو وەزارەتێکی تازەی ڕاگواستنی پێکهێنا و کۆمەڵێک پلانی یاسای نوێی پەرلەمانی پێشکەش کرد کە لەگەڵ کێشە کۆمەڵایەتیەکان مامەلەیان دەکرد.٣٣٧

سەفەرەکەی ویلسۆن بۆ وڵات سەرکەوتنێکی کەمتری بەدواوە بوو. جۆرج واشنگتۆن تووشی هاتبوو بە کەش و هەوایەکی تووش و ناخۆشەوە و، کاتێکە لە کۆتاییدا گەیشتبوە قەراخئاوی نیوو ئینگلەند، لەسەر لمێک گیرسابۆوە و گیری کردبوو. و لە سەر زەوی ئاڵۆزی و ناخۆشی چاوەڕوانی دەکرد. لە واشنگتۆن دوایەمین ڕۆژەکانی کۆنگرێسی کۆن بە توندوتیژی پارتیزانی و ڕێگری لە پەسەندکردنی یاساکان لە لایەن کۆماریەکانەوە دستنیشانکرابوو کە هیواداربوون هاوڕێ لەگەڵ شتی تر پلانی یاسا گرنگەکان پەک خەنەوە تا کاتێکە کۆنگرێسی تازەهەڵبژێردراو، بە زۆرینەیەکی کۆماریەوە، کۆدەبنەوە. لەڕووی مەترسیەوە، کۆماریەکان جارلەگەڵجار لە دەرفەت کەڵکیان وەردەگرت و هێرشیان دەکردەسەر کۆمەڵەی گەلان. لە وڵات بەگشتی، لایەنگری لە کۆمەڵەی گەلان هەروەک جاران بەهێز بوو بەلام ئەندامانی ناوداری کۆمەڵەی شوێندانەر بۆ سەقامگیرکردنی ئاشتی خەریک بوون بەشێوەیەکی نهێنی تاوتوێی پێداچوونەوەکانیان دەکرد تا پردیک لەگەڵ کۆماریە میانڕەوەکان سازکەن.٣٣٨

ویلسۆن هیوایەتێکی ئەوتۆی بە سازشکردن و دانووستان نەبوو. ئەو لە ٢٤ی فەوریەدا لە بۆستۆن نیشتەوە و بەپەلە وتارێکی ورووژێنەر و پارتیزانی پێشکەش کرد. ئەو ئەیوت کە ئەو بۆخۆی و وڵاتیەکگرتوەکان خەریکی جێبەجێکردنی کارێکی گەورەن لە پاریس؛ ئەوانەی کە ئەمەیان لا پرسیار بوو خۆبەزلزان و مێشک تەسک بوون. دانیشتوانی کۆڕەکە لەسەر کورسیەکانی خۆیان چەند کۆپلەیەک لە ڕەشنووسی پەیمانی کۆمەڵەی گەلانیان چاو پێکەوت. هێشتا سێناتۆرەکانی دانیشتووی واشنگتۆن چاویان پێی نەکەوتبو. ئەمە شتێک بوو لەڕووی نەزانی و بێ سەلیقەییەوە، و تەنیا هەڵەی گەورەی سیاسی ویلسۆن نەبوو. بۆستۆ زێدی ڕکابەری گەورەی ئەو بوو، سێناتۆری کۆماری لە ماساچووسێتەوە، هێنری کابۆت لاج.

لۆج، کە کەڕەتیکیان لەبارەیەوە گێڕایانەوە کە مێشکی وەک خاکی نیشتمانەکەی وایە، "لەڕووی سروشتیەوە وشک و قاقڕ بوو، بەڵام هەتابڵێی خاوەن پیت و بەرەکەت بوو،" بەرەچەڵەک دەگەڕاوە بۆ چینی خانەدانی نیوو ئینگلەند. ئەو هەتابڵێی خۆبەزلزان و تڕۆ بوو. ئەو لەگەڵ ئەو باوەڕەی ویلسۆن بوو کە وڵاتیەکگرتوەکان بە ئەرکی دەزانێ جیهان بکا بە شوێنێکی باشتر و

بەڵام ئەو بۆ نانەوەی ئاشتی حازرە هەندێک لە ئەرکەکانی کۆمەڵەی گەلان بگرێتە ئەستۆ. بەڵام ئەو لەگەڵ شێوازەکانی ویلسۆندا نەبوو و سەرلۆمەی باوەڕی ئەوی دەکرد کە گوایە کۆمەڵەی گەلان دەتوانێ هەموو کێشەکانی جیهان چارەسەر بکات. و ئەو ڕقی لەو کابرایە بوو- نەک تەنیا، وەکوو ئەوترا، چون ئەوان هاوڕا نەبوون، بەڵکوو چون ئەو لای وابوو کە ئەو ترسەنۆک و خوێڕیە. وتارەکەی ویلسۆن لەو ڕۆژەدا لە بۆستۆن نەک گەلحۆیەتی ویلسۆن، بەڵکوو ناڕاست بوونی ئەویشی بۆ لۆج سەلماند. ویلسۆن داوای لە ئەو و ئەندامانی تری لێژنەی پێوەندیەکانی دەرەوەی سێنای کردبوو کە هەمووی وتوێژەکانی کۆمەڵەی گەلان ڕابگرن تا ئەو لە دەرفەتێکدا بەشێوەیەکی تاکەکەسی لە واشینگتۆن بۆیان شی دەکاتەوە.٣٣٩

ئەو دوو کەسایتیە بۆ ماوەی چەندین ساڵ لەگەڵ یەک دوژمنایەتی و قینەبەرایەتیان هەبوو. ئەوان هەر لە دەستپێکی شەڕەکەوە پێکەوە ناکۆک بوون ، ئەوکاتەی کە لۆج حەزی دەکرد بە پشتگری کردن لە باڵی هاوپەیمانیەوە لە شەڕ تێوەچێ و ویلسۆن حەزی لە هەڵوێستێکی بێ لایەنەبوو، و لەکۆتایی شەڕەکەشدا، لۆج ئەیوت کە ئەو حەز دەکا سەرباز ڕەوانەی بەرلین بکات و ویلسۆنیش بڕیاری دابوو ئاگربەستێک واژۆ بکات. ئێستاش لەسەر ئاشتی هەر پێکەوە ناکۆک بوون. ویلسۆن وەک شێوازێک بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕ بە کۆمەڵەی گەلان و ئاسایشی گشتی پشتی بەست. لۆج، کە ڕەشبین بوو و باوەڕێکی کەمی بە تەواوبوونی سرووشتی مرۆڤ هەبوو، زیاتر پشتی بە هێز و قودرەت دەبەست. ئەو خوازیاری ئەوە بوو کە ئەڵمان لەگەڵ پارێزگا بەهێزەکان ئابلۆقە بدات، پۆڵەندایێکی سەرلەنوێ داڕێژراو، چکۆسلەواکیەکی بەهێز و فەڕەنسەیەکی سەقامگیر هاوڕێ لەگەڵ ئالساس و لۆرەین و تەنانەت ڕینلەندیش. ئەگەر وڵاتەیەکگرتووەکان بڕیارە لە کۆمەڵەیەکدا بەشداری بکات، دەبێ هاوڕێ بێت لەگەڵ دیمۆکراسیەکانی تر، شوێنێک بێت کە کۆمەڵێک بەرژەوەندی تێدابێت، نەوەک کۆمەڵەیەک بێت کە مەترسی درووست کا بۆ سەر وڵات و هەندێک بەڵین و ئیلتزامی نادیار و شاراوەی لێبکەوێتەوە..٣٤٠

لۆج لایەنگری نێوەنجی کردنی میانڕەوانەی پارتی کۆماری بوو. لەلایەکەوە کەسانێک وەستابوون، زۆربەیان لە ناوەڕاستی ڕۆژئاواوە، لە پێوەندی گرتن لەگەڵ ئورووپای بێزارکەر ترسیان هەبوو، و لەلایەکی ترەوە ئینتێرناسیۆنالیستەکان بوون، زۆربەیان لە قەراخ ئاوەکانی ڕۆژهەڵاتەوە هاتبوو، کە بە تاس و تینێکی تایبەتەوە پشتگریان لە کۆمەڵەی گەلان دەکرد. ویلسۆن دەیتوانی لەگەڵ زۆر لایەن لە پارتی کۆماری دانیشێ و بۆ لای خۆی ڕایان کێشێت بەڵام لەباتی ئەمە ئەوانی لەخۆی تاراند و دووری خستنەوە، بە نەبردنی هیچ کام لە کۆماریە

ناوداره‌کان هاوڕێ لەگەڵ خۆی بۆ پاریس، بە پێداگری کردن لەسەر، لە هەڵبژاردنەکانی کۆنگرێس لە نوامری ساڵی ١٩١٨، ئەوە کە دەنگدان بە دیموکراتەکان دەنگدان بوو بە ئاشتی و دەنگدان بە کۆماریەکان شتێکی تەواو جیاوازتر بوو، و ئێستاش بە چالاکیەکانی لە سەفەری گەڕانەوەی بۆ وڵاتەیەکگرتوەکان.

بە داخەوە، هاوکات لەگەڵ ئەمانەش بۆ ئاشتی کردنەوە لەگەڵ رخنەگران و گومانداراانی پارتەکەی خۆی هیچ هەوڵێکی ئەوتۆی نەدا. ئەو قەت نەیدەویست لەگەڵ سێناتۆرێکی باشووری دانووستان بکات کە ئەو ئەیوت لە پیشەی یاسای خۆیدا بێجگە لەوەی " خواخوایبوو پێی کەسێک هەڵکەوێ و ئەمیش قازانجی خۆی بەرێت" هیچ کارێکی تری لە دەست نەدەهات. تەنانەت شۆخیە سادەکانیشی ئێستا وایان لێهاتبوو کە ژەهراوی بوون و ئێشیان هەبوو. یەکێک لەو تەشەرانەی کە کاتێک بۆ یەکەمجار نەوەیەکی کوڕی خۆی دی هاویشتی و دنیای تەنیەوە ئەمە بوو: "بە دەمە زلەکەیدا و چاوەقونجاوەکانیدا، وا پێشبینی دەکەم کاتێکە گەورە بێت ببێ بە سێناتۆر."

لە هۆستۆنەوە ویلسۆن بەپەلە خۆی گەیاندە واشینگتۆن. لە ٢٦ی فەوریەدا بە پێداگری کردنی کۆلۆنێل هاوس، لە کۆشکی سپی بۆ ئەندامانی سێنا و لێژنەکانی پێوەندیەکانی دەرەوەی کۆشکی سپی ئێوارەخوانێکی سازکرد. ئەو ئێوارەیە بە خۆشیەوە نەچوە سەر. لۆج، کە لەپەنا خاتوو ویلسۆنەوە دانیشتبوو، چبوە بنج و بناوانی قسەوباسی خاتوو ویلسۆن کە لەسەر ئەو بەخێرهاتنە گەرمەی کە لە بۆستۆن لە مێردەکەیان کردبوو دەڕۆیی. تاقمێک لە میوانەکان گلەیی ئەوەیان دەکرد کە بەدوای شام جگەرە و خواردنەوەی تەواویان پێشکەش نەکراوە. ئەوان لای خۆیان بەو ئاکامە گەیشتن کە ویلسۆن ئەوانی بەچەترسێن کردوە، هەروەک کەسێک لەوان گێڕایەوە کە " وەک بڵێی ئەوان لەبەرهۆی گوێ نەدان بە دەرسەکانیان لەلایەن مامۆستایەکی زۆر وشک و ساردوسڕەوە لە کلاسێکی قوتابخانەی ڕۆژی شەمە سزادرابێتن." کاتێکە بۆ جارێکی تر سەرۆک کۆمار چاوی بە هاوس کەوتەوە ئەوەندەی کە لەدین دەهری بوو. پێی وت "ئێوارەخوانەکەت سەرکەوتوانە بەرێوە نەچوو."[٣٤١]

ویلسۆن ئەم جارەش وەک زۆر جاری تر بۆخۆی بەو قەناعەتە گەیشتبوو کە با نوێنەرانی خەڵک لەگەڵ ئەو هاوڕا نەبن بەڵام خۆ خەڵک وانین. ڕەنگە ئەو ڕاستی بکردایە. کاتێکە ژۆرناڵێکی ناوداری ئەمەریکی لە خوێنەرەکانی پرسیاری کرد کە ئایا ئەوان لایەنگری لە کۆمەڵەی گەلان دەکەن، زیاتر لە دوو سێهەمی ئەوان وتیان بەڵێ. بەداخەوە جەماوەری گشتی دەنگیان بە گرێبەستەکان نەدا بەڵام سێنا دەنگی دا- و دووسێهەمی زۆرینە کە بۆ پەسەندکردنی گرێبەستێک پێویست بوو، بەو ئاسانیە بە دەست نەدەهات. لە ٤ی مانگی مارسدا، کاتێکە ویلسۆن خۆی بۆ ئەوە ئامادە دەکرد تا

بگەڕێتەوە بۆ ئورووپا، لۆج سکالانامەیەکی مۆرکراو بە شێوەی بازنەیی ئامادە کرد کە ناوەڕۆکی پەیماننامەکەی ڕەد دەکردەوە و داوای لە وتوێژکەران لە پاریس دەکرد تا کۆتایی هاتنی گرێبەست لەگەڵ ئەڵمانیا هەر جۆرە وتوێژێک لەگەڵ کۆمەڵەی گەلان پەک بخەنەوە. سی ونۆ سیناتۆری کۆماری واژۆیان کرد، کە دەیکردە یەک سێهەمی سەرجەم ئەندامانی سێنا. هەڵوێستی سەرەکی ویلسۆن ئەمەبوو کە ئایا ئەو دەتوانێ بە شێوەیەک لە سێنا تێپەڕ بێ و لەبەرچاوی نەگرێ.٣٤٢

کۆنگرێس لەکاتی خۆیدا بۆ ٤ی مانگی مارسی پەکی خرایەوە، کە لەگەڵ ڕۆژژمێری خۆی یەکیان دەگرتەوە، زۆر بابەتی ناتەواوی ئابوری و کاری تری هەروا بەبێ چارەسەری هێشتەوە. ویلسۆن لەبەرانبەر جەماوەردا سەرلۆمەی کردن و ڕایگەیاند کە: "گرووپێک لە ئەندامانی سێنا بە ئانقەست هاتون دڵەڕاوکێ و ترس بخەنە ناو بەڕێوەبەرایەتی حکوومەتەوە، بەرژەوەندیەماڵیەکانی سیستەمەکانی ڕێگای شەمەندەفەری وڵات بخەنە ژێرباری مەترسیەوە و بەشێوەیەکی کاتی لەو هێزانە کەڵک وەرگرن کە بڕیارە لەپێناو بەرژەوەندیەکانی خەڵک بخرێنە گەڕ." ئەو دوانیوەڕۆیە ئەو لە باشورەوە بۆ *جۆرج واشنگتۆن* و ئورووپا دەستی پێکرد. لە ٥ی مانگی مارسدا، لە دوایەمین وتاردا، لە ئۆپێرا هاوسی جیهانی لە نیو یۆرک، ئەو کۆتایی بە سەردانێکی کورتی خۆی لە وڵاتەیەکگرتوەکان هێنا بە هێرشێکی تر لەلایەن نەیارانی کۆمەڵەی ئاشتیەوە: "من لەوە ناگەم کە چۆن ئەم پیاوماقووڵانە دەتوانن بژین و لە کەش و هەوای جیهانیدا هەڵ ناکەن. من لەوە ناگەم کە چۆن ئەمانە دەتوانن بژین و لەگەڵ ڕووداوەکانی سەردەمی خۆیان لەپێوەندی دا نین، و من بەتایبەت لەوە ناگەم کە چۆن ئەمانە دەتوانن ئەمەریکی بن و دامەزرێنەری ڕێبازی خۆبەزلزانی بن کە ورد پلانیان بۆ دارشتبێت."٣٤٣

کاتێکە شەمەندەفەرەکەی ئەو لە ١٤ی مانگی مارسدا خۆی بە پاریس دا کرد، تەنیا گرووپێکی بچووک لە ڕیش سپییەکانی فەرەنسەیی لە وێستگە بەخێرهاتنیان لێکرد. کاتێکە بەرەو شوێنێ تازەی حەوانەوەی خۆی دەچوو، لە کۆشکی دیس ئیتاتس-یوونیس، درووست بەرانبەر بە ئاپارتمانەکەی لیۆد جۆرج، چیتر جەماوەرێکی کەیف-خۆش وەکوو مانگی دیسامری پێشوو لە ئارادا نەبوو. ماڵەکە، کە خاوەنەکەی بانکدارێکی دەوڵەمەند بوو، ئەو شان و شکۆیەی کە هۆتێل مۆرات هەیبو ئەم نەیبوو و ئەوەندەش گەورە نەبوو. گوڵەکانی بەیبوون، و هاوکات کێشەکانی ناو کۆڕی ئاشتی تازە خەریک بوون سەریان دەردێنا.

# ١٣

# سزادان و بەرگریکردن

گەڕانەوەی ویلسۆن سەرەتای قۆناخێک بوو لە چالاکی مەزن لە سەر گرێبەستی ئەڵمان کە تەنیا لە دەستپێکی مانگی مەیدا کۆتایی پێهات، کاتێک مەرجەکان لەئاکامدا پەسەند کران. دواخستنەکە- لەمکاتەدا شەڕ چوارەمین مانگی خۆی تێدەپەڕاند- ئەم پرسیارە چەتوونەی درووست دەکرد کە بەڕاستی تێکشکانی ئەڵمان چ مانایەکی هەیە. ئەڵمان دەبێ چەندە هێزی مابێ؟ هاوپەیمانان دەبێ چەندە بەهێز بن؟ لە مانگی نوامری ساڵی ١٩١٨دا، وڵاتانی سەرکەوتوو قازانجێکی زۆریان کردبوو. ئەگەر لەو کاتەدا ئامادەبونایە ئاشتیان بکردایەتەوە، ئەگەر تێگەیشتنابایە کە چەندە سەرکەوتنیان بە دەست هێناوە، دەیانتوانی هەر مەرجێک کە پێیان خۆش بوو بیسەپێنن.

سووپای ئەڵمان، سەرەڕای ئەو شتانەی کە ژەنەڕاڵەکانی وەک لۆدێندۆرف و هیندێربیرگ- و سەرجووخە هیتلێر- دواتر بانگەشەیان بۆ دەکرد، لە گۆڕەپانی جەنگدا شکستیکی قورسیان دەخوارد ؟بەرلەوەی حکومەتی ئەڵمانی داوای ئاگربەستی بکردایە، و بەرلەوەی ڕەژیمی کۆن لەناو ئەڵماندا لەسەر تەخت لابرایە. لە هاوینی ساڵی ١٩١٨دا، کاتێکە هێزە تازەکان و بەتۆن ئەسباب و کەرەسە لە وڵاتەیەکگرتوەکانەوە خەریک بوون سەرڕێژ دەبوون، هاوپەیمانان هێرشیان کردبوو. لە ٨ی مانگی ئۆگستی ساڵی ١٩١٨دا، "ڕۆژی ڕەشی" سووپای ئەڵمانیا، ئەوان سنوورەکانی ئەڵمانیایان هەپروون بە هەپروون کرد. بۆ ماوەی چوار ساڵ، گۆڕانکاریەکان لە سەر سنورەکانی بەرەی جەنگی ڕۆژ ئاوا بە میتر دەپێوران؛ ئێستا ئەڵمانیەکان بە کیلۆمەتر دەگەڕانەوە دواوە، تفەنگ و تانک و سەربازیان پاش خۆیان بەجێ دەهێشت. هەرلەیەکەمین ڕۆژانی هێرشی هاوپەیمانیدا شانزدە سنووری دانراوی دەستی ئەڵمانیا سڕدرانەوە. لە ١٤ی مانگی ئۆگستدا، لۆندێردۆف بە قەیسەری ڕاگەیاند کە ئەڵمانیا دەبێ بیر لە دانووستان لەگەڵ هاوپەیمانان بکاتەوە؛ لە ٢٩ی مانگی سێپتامردا ئەو بە هەر نرخێک کە بوە داوای

ئاشتی دەکرد. هاوپەیمانان بە ئارامی بەڵام کۆڵنەدەرانە بەرەو سنوورەکانی ئەڵمانیا وەڕێکەوتبوون و فەرماندەی پلە باڵای ئەڵمان هیچی لە دەست نەدەهات تا بەرەگەیان پێبگرێت.

هێزی سەربازی و ئازووقەی ئەڵمانیا خەریک بوو بەرەو کۆتایی دەهات، و خەلکیش چیتر ورەی شەڕکردنیان نەمابوو. لە سەر شەقامەکانی بەرلین، هاوسەران بە کاسە و کەوچکی خاڵیەوە مارشیان دەدا تا نیشان بدەن کە ئەوان چیتر ناتوانن بە بنەماڵەکانی خۆیان چێشت و خواردەمەنی بدەن؛ لە کارگاکانی کەشتی سازی و کارخانەکاندا، کرێکاران ئامێرەکانیان حەوادابوو؛ لە ڕیچستاگ، ئەو نوێنەرانەی کە کاتی خۆی ملکەچ ببوونن و دەنگیان بە شەڕکردن دا بوو ئێستا داوای ئاشتیان دەکرد. یەک بەدوای یەک هاوپەیمانانی ئەڵمانیا هەڵدەبڕان: بۆلغارستان لە کۆتایی مانگی سێپتامردا، تورکیەی عوسمانی مانگێک دواتر، و دواتر دەوڵەتی ئوتریش-مەجارستان. لە مانگی نوامردا، سەرهەڵدانەکان لە ئەڵمانیا دەستیان پێکرد. کاتێکە لە فارگۆنێکی ڕێگەی شەمەندەفەری فەرەنسەییدا لە ١١ی مانگی نوامر ئاگربەست واژۆکرا، ئەڵمانیا خەریک بوو لەناو کاولکاریەکانی سەردەمی شەڕ و ئاڵۆزی سیاسی ناوخۆیدا تلی دەخوارد و خۆی دەگەوزاند. مەرجەکان هیچ گومانێکیان نەهێشتبۆوە بۆ ئەوەی کە هاوپەیمانان سەر نەکەون. هێندێربێرگ کەوتە حاڵەتێکی خەمۆکی و بەجارێک تێکچوو و ئەو ڕەنگ و وورەی جارانی نەما. لۆدێندۆرف، کە لە لاجانگی دەستکرد و لە چاویلکەی دووکەڵیدا خۆی حەشار دابوو، لە حەیبەتدا بەرەو سۆئێد هەڕای کرد.

ئەڵمانیا لە هەمووی ئەو ناوچانەی کە لە ساڵی ١٩١٤ بەم لاوە داگیری کردبوون، وەکوو ئالساسێ-لۆرەین، وازی هێنا، هێزەکانی هاوپەیمانی سەراسەری ڕاینلەند و هەروەها سێ پاسگا لە قەراخ چۆمەکانی ڕۆژهەڵاتیان داگیر کرد. لەگەڵ ئەوانەش ئەڵمانیا بەشی سەرەکی ڕەشاشەی جەنگ دابەدەستەوە- ژێردەریایەکان، چەکە قورسەکان، تۆپە هاوەنەکان، فڕۆکەکان و ٢٥،٠٠٠ دەزگا تفەنگ. (ئەمە هاوارێکی بەسوێی لەلایەن وتوێژکەرانی ئەڵمانی بەدواوە بوو: " بۆ ئێمە شەڕەکەمان دۆڕاند! چۆن بتوانین ئێمە دژ بە بیروباوەڕی بۆلشویزم لە خۆمان پارێزگاری بکەین؟") ناوگانە مەزنەکانی دەریایی، کە ئەوەی لە دەستیان هات کردیان بۆ ئەوەی کە بەریتانیا لە ئەڵمانیا دوورخەنەوە، بۆ دوایەمین جار بە دواوەی خۆیاندا کێشا و شوێنەواریان نەما. لە ڕۆژێکی مژاوی مانگی نوامردا شەست و نۆ کەشتی، لە کەشتی جەنگیەوە بگرە تا دەگاتە کەشتی ڕووخێنەر، لەبەینی هێڵەکانی کەشتی هاوپەیمانیدا لە سەر ڕێگایان بەرەو سکاپا فلەو لە ئۆرکینەکانی بەریتانی تێپەڕین. ئەمە گەمارۆدان بوو و هاوپەیمانان وەک گەمارۆیەک سەیری ئەمەیان کرد.٣٤٤

بالّویزی فەڕەنسەیی ڕۆژێک دوا واژۆکردنی ئاگربەستەکە چاوی بە لیۆد جۆرج کەوت: " سەرۆک وەزیر هەرگیز بە مێشکیدا نەدەهات ئاوا بەزوویی کێشەکە چارەسەر بکرێت یان هێزی ئەڵمان ئاوا بەیەکجاری داتەپێت و هەستانەوەی نەبێت." لەنێوان ڕێبەرانی هاوپەیمانیدا تەنیا ژەنەڕاڵ پەرشینگ، فەرماندەی بەرجەستەی ئەمەریکی، بیری لەوە دەکردەوە کە هاوپەیمانان دەبێ درێژە بە چالاکی و خەباتی خۆیان بدەن، ئەگەر پێویست بوە تەنانەت تا ئەوپەڕی چۆمی ڕاین بڕۆن. فەڕەنسەیەکان پێیان خۆش نەبوو چیتر خوێنی لاوەکانیان بڕژرێت. ژەنەڕاڵی سەرەکی ئەوان، مارشاڵ فۆچ، کە ئەویش فەماندەی مەزنی هاوپەیمانی بووهۆشداری دەدا کە ئەوان مەترسی بەرخودانێکی توند و زیان و زەرەرێکی قورسیان گرتۆتە ئەستۆ. بەریتانیەکان خوازیاری نانەوەی ئاشتی بوون بەرلەوەی کە ئەمەریکیەکان لەوە زیاتر بەخۆیاندا بێن و بەهێزتر بن. و سمووتس بۆ زۆرلایەن لە ئورووپا قسەی دەکرد و بە دڵتەنگیەوە ئاگاداری دەکردن کە " تارمایی مۆنی ئانارشیزمی بۆلشویکی خەریکە بەرەو پێشەوە هەنگاوی شووم دەنێ."[٣٤٥]

هەڵەیەکە هاوپەیمانان کردیان، و تا ماوەیەکی زۆر دواتر ئاشکرا نەبوو، ئەوە بوو، وەک ئاکامی مەرجەکانی ئاگربەست، زۆربەی هەرەزۆری ئەڵمانیەکان قەت ئەزموونی سەرەکی تێکشکانی وڵاتی خۆیان نەبووە. تەنیا لە ڕاینلەند نەبێ، ئەوان هێزی داگیرکەریان نەدیبوو. هاوپەیمانان بە سەرکەوتنەوە بەرەو بەرلین مارشی سەربازیان نەکردبوو، هەروەک ئەڵمانیەکان لە پاریس لە ساڵی ١٨٧١ وایان کردبوو. لە ساڵی ١٩١٨، سەربازانی ئەڵمانی بەشێوەیەکی ڕێک و پێک بەرەو وڵات بە مارشی سەربازی گەڕابوونەوە، بە فیکە و چەپڵەی جەماوەرێکی زۆر لەسەر ڕێگەی گەڕانەوەیان؛ لە بەرلین فریدریک ئیبێرت، سەرۆک کۆماری تازە، بە ئەم دێڕە بەخێرهاتنی لێکردن "هیچ دوژمنێک نەیتوانیوە ئێوە تێکبشکێنێ!"[٣٤٦] کۆماری تازەی دیموکراتیک لە ئەڵمان لەرزۆک ببوو ، بەڵام توانیبووی دەوام بێنێ و خۆی زیندوو ڕاگرێ، دەبێ بە قوربانی ئەو پشتگریە چالاکانە بێ کە پاشماوەی سووپای ئەڵمانی لێی کردن. قازانجی هاوپەیمانی لە ئەڵمان خەریک بوو دەتوایەوە و بە مایەپووچ دەردەچوو.

و هێزەکانی هاوپەیمانی ڕوو لە کزی و داماوی دەڕۆیشتن. لە مانگی نوامری ساڵی ١٩١٨دا، ١٩٨ سنووری هاوپەیمانی لە ئارادابوو؛ لە مانگی ژوەنی ساڵی ١٩١٩، تەنیا ٣٩ دانەیان مایەوە. و ئایا ئەوانە جێی باوەڕ بوون؟ بۆ دەسپێکردنەوەی خەباتێکی تازە هیچ ورەیەکیان نەمابوو. بواردن لە ڕاژەی سەربازی هاوپەیمانی بە دەنگهەڵبڕین و جارجارەش بە سەرکێشی ڕاشکاوەنە خێرایی دەبەخشی. لە بەرەکانی جەنگی وڵات ئاخیان بۆ ئاشتی و باجی کەمتر هەڵدەکێشا. فەڕەنسەیەکان بەتایبەت لەسەر پێویستبوون بە ئاشتی کردنەوە زۆر پێداگریان دەکرد کەچی هاوپەیمانان هەر لەسەر باوەڕی

سەپاندنی مەرجەکان بوون. کلیمینجوو هەر هۆشداری دەدا کە ئەڵمانیەکان بۆ ئەوە نابێ باوەڕیان پێبکەین و پشتیان پێ ببەستین. ئەوان خەریک بوون بۆ جارێکی تر "لەخۆبایی" دەبوونەوە. لە ڤیمار، کۆمەڵەی مەڵبەندی هەڵبژاردن ئاکامی وتوێژەکانی خۆی بەم گۆرانیە ڕاگەیاندبوو" Deutschland ubr Alles " ئەوە نیشانەی شێتی بوو کاتێکە هاوپەیمانان پێیان ئەوتن کە درێژەی پێبدەن. ئەوەی حەزتان لێیە بیکەن. خوا یار بێت ڕۆژێک دێ هەرەشەی پچڕانی پێوەندیەکانتان لێ بکەین؛ بزانن کە هەر لە ئێستا ئەو قورسی و پتەویەی کە پێویستە نیمانە." ئەگەر هێزەکانی ئەمەریکی بگەڕایەتنەوە بۆ وڵات، لە مانگی ئاڤریلدا دۆخەکە چلۆن دەبوو؟ "فەڕەنسە و بەریتانیا تەنیا دەمانەوە تا لەبەرانبەر ئەڵمانیەکاندا بوەستن."٣٤٧

با ڕەشبینیەکەی ئەو پێشوەخت بوویێت، بەڵام ئەمە ڕاستە کە لە بەهاری ساڵی ١٩١٩دا فەرماندەکانی هاوپەیمانی سەبارەت بە توانایی خۆیان بۆ پارەتەرخان کردن لەسەر شەری ئەڵمانی بەشێوەیەکی سەرکەوتوانە کەوتبوونە گومانەوە. سووپای ئەڵمان لە گۆڕەپانی جەنگ تووشی شکست هاتبوو، بەڵام چوارچێوەی فەرماندییەکەی، هاوڕێ لەگەڵ سەدان هەزار سەربازی بارهاتوو، بە ساخی و سەلامەتی مابوونەوە و هیچیان لێنەهاتبوو. هەروەک فۆچ بەردەوام دووپاتی دەکردەوە، ٧٥ ملوێن ئەڵمانی و تەنیا ٤٠ ملوێن فەڕەنسەیی لەوێ بوون. چاودێرانی هاوپەیمانی هەستیان بەوە کردبوو کە خەڵکی ئەلمان دژ بەوە بوون کە ئاشتیەکی وشک و برینگ واژۆ بکەن. کێ دەیزانی کاتێکە سووپای هاوپەیمانان جارلەگەڵجار دەچوونە پێشێ تووشی چ جۆرە بەرخودانێک دەبن؟ کارناسان و پسپۆڕانی سەربازی هۆشداریان دەدا کە لەوانەیە لەگەڵ جەماوەرێکی مرومۆچ، یان لەوانەیە مانگرتن یان تەنانەت تەقەی تفەنگ ڕووبەڕوو ببنەوە. هەر شیمانەی ئەوە نەدەکرا کە هاوپەیمانان بتوانن تا بەرلین بڕ بکەن.٣٤٨

چەکی گەورەی گەمارۆدانی هاوپەیمانی پێدەچوو کە کاتی بەسەر چوویێت و ژەنگی هێنابێت. هەرچەند لە ساڵی ١٩١٩دا هێشتا ئەو هێز و ورەی جارانی هەر بوو، هەرچەند کەشتیەکانی هاوپەیمانی هێشتا ئێشکچێتی دەریاکانیان دەدا و دەگەڕان بە دوای ئەو بارە قاچاخانەی کە ڕوویان لە ئەڵمان بوو، گەمارۆدانەکە جارلەگەڵ جار کز دەبوو و وای لێهات کە نیوە گیان ببوو. لە بەریتانیا، کە هێزی دەریایی ئەو وڵاتە کە بەرپرسی سەرەکی بو لە سەر سەپاندنی بەربەست لەسەر تجارەت کردن لەگەڵ ئەڵمانیا، خەڵکی ئەڵمانیا دەستیان کرد بە وروژاندنی چەند پرسیارێکی تووش و دژوار سەبارەت بەو نەهامەتیانەی کە بەسەر خەلکی سیڤیلی ئەڵمانی داهاتبوو. ژەنەراڵی بەرپرسی هێزەکانی بەریتانی لە ئەڵمانیا بە فڕانسیس ستێڤینسێنی ڕاگەیاند کە "ئەگەر بێتو منداڵانی ئەڵمانیا

ڕێگەیان بدرێ نیوەبرسی بکەونە سەر شەقامەکان و بێ خانەولانە بخولێنەوە ئەو لەبەرانبەر هێزەکانی خۆیدا هیچ بەرپرسایەتیەک وەرناگرێت. ئەدمیرەڵەکان نیگەرانی ڕەوشێک بوون کە پیاوەکانی خۆیان تێی کەوتبوون. یەکەمین دەسەڵاتداری دەریا بە شۆڕای عالی ڕاگەیاندبوو کە "ئەگەر بێتو کوتوپڕ مەرجەکانی کۆتایی بسەپێنرێن، هێزەکانی دەریایی چیتر وەک ئامێری گەمارۆدان پابەند بەو هەڵوێستەی ئێستای خۆیان نامێنەوە." ڕۆحیەتی ئاژاوەگەری لەسەر خزمەتگوزاریەکانی هێزی دەریایی شوێنەواری خۆی دادەنا. ئەگەر بێتو سەپاندنی مەرجەکانی ئاشتی دەریایی لە تازەکردنەوەی ئاگربەستی دواتر شوێنەواری دانایە هێمنایەتی باڵی دەکێشا بەسەر خەڵکانی پێوەندیدار بە سەفەرەکانی دەریایەوە. لە ڕاستیدا مەرجەکانی ئاگربەست ڕێگەیان دا بە کەشتیەکانی بارهەڵگر خواردەمەنی بە ئەڵمان بگەیەنن، هەرچەند ڕاوێژکارانی میلیتاری هاوپەیمانی هۆشداریان دەدا کە ئەڵمانیا ئازووقە دادەخات و ئەمەش بەنۆبەی خۆی لەوانەیە واکا لە ئەڵمانیا کە حازر نەبێ گرێبەستی ئاشتی واژۆ بکات. فەرەنسییەکانیش زۆر بە تاسەوە نەبوون. کلیمینجوو بە تەشەرەوە وتی کە " پێشنیاری کڕینی ئیرادەی ئەڵمانیەکان کرا بە پێشکەشکردنی کەرەسەی خاو و خواردەمەنی بەئەوان. هێشتا هەر هەست بە هەبوونی حاڵەتێکی جەنگی دەکرا، و هەرجۆرە خۆبەدەستەوەدانێک وەک بەڵگەیەک لە لاوازبوون لێکدەدرایەوە." ویلسۆن و لیۆد جۆرج زیاتر نیگەرانی ئەوە بوون کە ئەڵمانی نائۆمێد و هیوابڕاو بەرەو ئانارشیزم و بەرەو بیروباوەڕی بۆلشویکی بکشێ، لیۆد جۆرج دەیکوت کە " ئەڵمانیا وەک ئەستێرێک وایە کە لەوانەیە پەتاکەی خۆی ئاوقای سەرتاسەری ئوروپا بکات."٣٥.

کەشتیە بارهەڵگرەکان زۆر بە هێواشی بەرەو ئەڵمانیا کەوتبوونە ڕێ، هەر لەبەر ئەو هۆیە ئەڵمانیەکان قەت لە هاوپەیمانان خۆش نەبوون. بەشێک لە کێشەکە دەگەڕایەوە بۆ نەبوونی کەشتی بارهەڵگر. هاوپەیمانان پێداگریان لەسەر ئەوە دەکرد کە ئەڵمانیا کەشتی دابین بکات، نەک وەک داواکاریەکی دوور لە ئەقڵ و ژیربێژی: ژمارەیەکی زۆر کەشتی بارهەڵگر هەروا بێ کەڵک لە بەندەرەکانی ئەڵمانیا کەوتبوون. حکوومەتی ئەڵمانیا کە لەلایەن خاوەن کەشتیە بەهێزەکانەوە زەختی کرایە سەر، ئەوی کە بووی خستیە ڕوو، بەڵام زۆریش لەوە دەترسا کە ئەگەر بێت و ڕێگە بدا بە کەشتیەکان کە بڕۆن لەوانەیە هەر نەشیان بینێتەوە. لەگەڵ ئەمانەشدا ئەڵمانیا لەهەوڵی ئەمەدا بوو کە سەبارەت بە ڕێژەکانی خواردەمەنی کە دەبوو دابین بکرایە و، بە نەبوونی ڕیالیزمێک کە دەبوو بۆچوونی خۆی لەبابەت هاوپەیمانانەوە لەم سەردەمەدا دەستنیشان بکردایە، پێشنیاری کرد کە ئەو دەتوانێ بە گرتنی وامێک لە وڵاتەیەکگرتوەکان پارەی خواردەمەنیەکەی خۆی بدایە. کاتێکە بۆی دەرکەوت کە هیچ

هیوای وەرگرتنی وامێکی لەو چەشنە لەڕێگای کۆنگرێسەوە لە ئارادا نیە، حکوومەتی ئەڵمان بەوە ڕازی بوو کە لە زەخیرەکانی تەڵای خۆی کەڵک وەرگرێت. هەڵبەت ئەمە فەڕەنسەیەکانی ئاگادار کردەوە، کە ئەوانیش خوازیاری تەڵای ئەڵمان بوون بۆ قەرەبووکردنەوەی خەسارەتەکان. تەنیا دوابەدوای مشتومڕێکی گەرموگوڕ لە شۆڕای عالیدا بوو، کە لەلایە لیۆد جۆرجەوە ورەی دەگرت و بەڵێنی پرۆگرامێکی دەدا کە بە وتەی خۆی تازە لە سووپای بەریتانی لە ئاڵمان وەری گرتبوو کە هەڕەشەی دەکرد وڵات کەوتۆتە سەر لێواری قاتوقڕی، کە فەڕەنسەیەکان بەنابەدڵیەوە پاشەکشەیان کرد و دەستیان کێشایەوە. لە کۆتایی مانگی مارس لە ساڵی ١٩١٩دابوو کە یەکەمین کەشتیە بارهەڵگرەکانی خواردەمەنی خەریک بوون یەکبەدوای یەک دەگەیشتنە بەرەوە.٣٥١

وەدرەنگ کەوتن لە داڕشتنی مەرجەکانی ئاشتی بەشێوەیەکی تر زیانی بە هاوپەیمانانیش دەگەیاند. شتێکی ئاسایە کە هاوپەیمانیەکانی کاتی شەڕ لە کاتی ئاشتی و تەباییدا هەڵوەشێنەوە چون ڕاستیە هەتا هەتایەکانی بەرژەوەندیەکان و ڕکابەریەکانی نەتەوەیی جێگای سەرکەوتنەکان دەگرنەوە. لە بەهاری ساڵی ١٩١٩دا، باسی هەبوونی بۆچوونی جیاواز لەنێوان هاوپەیماناندا لەسەر ئەو کارانەی کە پێویست بوو لەگەڵ ئەڵمان کرابایە بنێشتە خۆشەی سەرزاران بوو. ئەڵمانیەکان بە وردبینیەکی تایبەتەوە لەسەر چاپەمەنیەکانی هاوپەیمانانیان دەکۆڵیەوە.) وەک زۆر جاریتر باسی کراوە، ئەو باسە باسی فەڕەنسەیەکانی تۆڵسێنەر لەبەرانبەر ئەمەریکیەکانی بەخشێنەر و بە نێوەنجیگەری بەریتانیا نەبوو. گلایەک لەسەر ئەوە کۆک بوون کە پارێزگاکانی ئالساس و لۆرەین، کە فەڕەنسە لە ساڵی ١٨٧١دا بە ئەڵمانی دۆڕاندبوو، پێویستە بە فەڕەنسەیەکان بدرێتەوە. و هەموولایەک دەیانزانی کە خودموختاری پرسێکی تووش و دژوارە، بۆیە بەخۆیان نەدەپەرمی هەر هیچ کە باسی نەکەن بەڵکوو بیریشی لێبکەنەوە؛ کەس لەمەڕ ڕاوێژکردن لەگەڵ دانیشتوانی ناوچەکەی نەدەپرسی، چون لەوانەبوو زۆریەک لەوان بەنابەدڵیەوە ئەڵمانیایان هەبژاردایە. هەموویان لەسەر ئەوە کۆک بوون کە ئەو زیان و زەرەرەی کە بەسەر بلژیک و باکووردا هاتبوو پێویستە قەرەبوو بکرێنەوە. هەمولایەک لەسەر ئەوە کۆک بوون کە ئەڵمان و ئەڵمانیەکان مافی خۆیانە کە سزابدرێن. ئێڤین ویلسۆن، کە لە کاتی شەڕدا پێداگری لەسەر ئەوە دەکرد کە تەنیا کێشەی ئەو لەگەڵ چینە دەسەڵاتدارەکانی ئەڵمانی بوو، ئێستا وادیار بوو ڕووی قسەی لەگەڵ بەگشتی خەڵکی ئەڵمان بوویێت. ئەو بە هاوڕێیانی نزیکی خۆی لە پاریس ڕاگەیاند کە " ئەوان وەکوو پیاوی گول بۆ هەتاهەتایە لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دوور دەخرێنەوە و هەتاکوو ئێستا زۆربەی

ئەوان بۆیان گرنگ نەبووە کە نەتەوەکانی تر چۆن بیردەکەنەوە و لەوەش نەگەیون کە دەخرێنە چ وڵاتێکەوە."٣٥٢ هەمووولایەک لەسەر ئەوە کۆک بوون کە ئەڵمانیا پێویستە بەشێوەیەک لەشێوەکان لە ڕاکێشانی ئەورووپا بەرەو جەنگ بەرەگەی پێبگیرێت. لە ساڵی ١٩١٩دا هەموولایەک لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە ئەڵمانیا هەڵگیرسێنەری شەڕ بووە. (ئەوە دواتر بوو کە گومانەکان درووست بون.) ئەڵمانیا هێرشی کردبوە سەر بلژیکی بێ لایەن، و هێزەکانی ئەڵمانی، بۆ چەواشەکردنی مێشکی هاوپەیمانی و ئەمەریکی، زۆر بەناشیرینی هەڵس و کەوتیان کردبوو. (هەمووی بەسەرهاتە دڕەندایەتیەکان پڕۆپاگەندەی سەردەمی شەڕ نەبوون.) لەگەڵ ئەمانەش ئەڵمان بۆخۆی لەبەرچاوی هاوپەیمانادا بە بەستنی دوو گرێبەستی خەرجهەڵگر، کە ئەمڕۆکە هەر باسیشی ناکرێت، زیانێکی قورسی دانا کە لە ساڵی ١٩١٨دا سەپاندینی. گرێبەستی بۆخارێست کە ڕۆمانیای کرد بە ژێردەستەی ئەڵمانیا. و بە گرێبەستی برێستلیتۆڤسک حکوومەتی تازەی بۆلشویکی ڕووسیە دەسەڵاتی کەرتێکی گەورەی ناوچەکانی ڕووسیەی بە ئەڵمان بەخشی کە لە بالتیکەوە بەرەوخوار تا دەگاتە شاخەکانی قەزاقستانی دەگرتەوە و ڕازی بوو بە بەخشینی یەک ملوێن ڕۆبلی تەلا بۆ مەبەستی بووژاندنەوە و ئاوەدانکردنەوە. دوو دەیە دواتر، هیتلێر لەسەر هەمان مەبەست هەوڵ و تەقەلای دا. ڕووسیە ٥٥ ملوێن قوربانی دا، و لە سێ بەش نزیک بە یەک بەشی زەوی و زارەکانی کشت و کاڵ و بەشێکی زۆر لە پیشەسازی قورس و ئاسن و خەڵووزی خۆی لە دەست دا. بۆلشویکەکانیش مەجبور بوون بەملوێن ڕۆبڵی تەلا پێشکەش بکەن. ویلسۆن لە ئاڤریلی ساڵی ١٩١٨دا وتی کە ڕەنگە ئەڵمانیەکان باسی ئاشتی و تەبایی بکەن، بەڵام کردەوەکانی ئەوان ویست و حەزی ڕاستەقینەی ئەوانی بەجوانی دەرخست. " ئەوان لە هیچ شوێنێک دادپەروەری نانێنەوە، بەڵکوو لە هەموو شوێنێک دەسەڵاتی خۆیان دەسەپێنن و لە هەموو شتێک بۆ قازانجی خۆیان و بەربڵاوکردنی دەسەڵاتی خۆیان کەڵک وەردەگرن." لیۆد جۆرج و ویلسۆن، هەرکیان بە ڕابردوویەکی ئایینیەوە، هەرکیان وەک لیبراڵی ڕەسەن، باوەڕێکی قورسیان بە بەسزادانی هەرچی خوێڕیلە و هیچ و پووچە هەبوو. لەگەڵ ئەوانەشدا ئەوان باوەڕیان بە ڕزگارکردن هەبوو؛ دەبێ ڕۆژێک ئەڵمانیا ڕزگاری بێت.٣٥٣

سزادان، پارەدان، بەرگریکردن- لەسەر ئەم ئامانجە دیارانەدا ڕێکەوتن هاتە ئاراوە. کێشە هەموو لایەنێکی تری دەگرتەوە. ئایا قەیسەر و ڕاوێژکارە ناودارەکانی ئەو دەبێ وەک جەنایەتکارانی جەنگی دادگایی بکرێن؟ ئەو لیستەی کە بڕیارە پێشکەش بە ئەڵمان بکرێت دەبێ چ بەندگەلێک لەخۆ بگرێت؟ کاولکاریەکانی شەڕ (جا هەرچیەک بن)؟ قوربانیانی سیڤیل و خەڵکی ئاسایی؟

ساکالانامەکانی بێوەژنان و هەتیوانی سەربازانی هاوپەیمانی؟ و لەگەڵ ئەمانەش پرسیاری پێوەنیدار لە ئارادابوو کە دەیوت ئەڵمانیا *دەتوانێ* چەندە پارە بدات. دەبێ چ جۆرە هێزە چەکدارێکی پێ ببڕێ؟ دەبێ واز لە چەندەی ناوچەکانی خۆی بێنێ؟ ئایا هاوپەیمانان لەگەڵ ئەڵمانی کۆن دانووستانیان دەکرد یان لەگەڵ ئەڵمانێکی نوێ کە لە کۆتایی جەنگەوە سەری هەڵدابوو؟ ئایا ڕەوابوو دیموکراسیەکی لەحاڵی گەشە بەهۆی تاوانی پێشینیانی ئەو دیموکراسیە سزا بدرێت؟

سزادان، پارەدان، بەرگری کردن- هەرهەموی ئەمانە پێکەوە گرێدرابون. ئەڵمانێکی بچووکتر، و ئەڵمانێکی هەژارتر، بۆ دراوسێکانی خۆی مەترسی کەمتری دەبێت. بەڵام ئەگەر ئەڵمانیا زەوی و زارێکی زۆری لەکیس بدایە، ئایا ڕەوابوو چاوەڕوانی ئەوەی لێبکرێت کە بڕەپارەیەکی زۆر ببەخشێت؟ ڕێکەوتن لەسەر هاوسەنگیەک لەنێوان تاقمەجۆراوجۆرەکانی مەرجەکان کارێکی هەروا ئاسان نەبوو، بەتایبەت چون ویلسۆن، کلیمینجوو و لیۆد جۆرج لەنێوان خۆیاندا، یان، بەردەوام، لەگەڵ هاوکارەکانی خۆیان کۆک نەبوون. ئەوەی کە ئەم کێشانەی زۆرتر لەجاران ئاڵۆزتر دەکرد ئەوە بوو کە هەست بە هەبوونی هیچ یاسایەکی ڕوون و ئاشکرا نەدەکرا کە بەو پێیە بچیە پێشێ. لە ڕابردودا ئەوە ئاسانتر بوو. دەسکەوتەکانی جەنگ، جا کارە هونەریەکان، تۆپی بەردهاوێژ یان ئەسپ بوایە، بە وڵاتی سەرکەوتوو دەبڕا کەچی وڵاتی تێکشکاو دەبوایە وەک قەرەبوو هەمووی خەرج و مەخاریجی شەڕەکەی بگرتایەتە ئەستۆ و لەگەڵ ئەمانەش بەشێوەیەکی ئاسایی ناوچەکانی خۆی لەکیس دەدا. لە کۆنگرێسی ڤیەن، فەڕەنسە دەسکەوتەکانی ناپلۆئۆنی لەدەست دا و بەرپرسایەتی گەڕانەوەی ٧٠٠ ملوێن فرانک و هەروەها خەرجی داگیرکاریەکانی خۆی کەوتە ئەستۆی. دوابەدوای جەنگی فرانکۆ-پڕاشن لە ساڵەکانی ١٨٧١-١٨٧٠، کە زۆر لایەن ئێستاش بەجوانی لەبیریان ماوە، فەڕەنسە بڕی ٥بلێۆن فرانکی تەڵای پێبرا و پارێزگاکانی ئالساسێ و لۆرەینی لەکیس دا. بەڵام لەوەدەچوو ساڵی ١٩١٩ جۆرێکی تازەی لە دیپلۆماسی دەستنیشان کردبێ. "نا بۆ هەر پێوەلکاندنێک و نا بۆ هەر ئاشتیەکی سزادەرانە" ئەو دروشمانە بوون کە لەلایەن لیبراڵەکانەوە و لەلایەن چەپڕەوەکانەوە هاواریان بۆ دەکرا؛ و سیاسەتمەداران لە واشنگتۆنەوە بۆ مۆسکۆ تاوتوێیان کردبوون. لەوەدەچوو خودموختاری، نەک سیاسەتی قودرەت، بتوانێ ئاوری سنوورەکان داکووژێنێت.

ڕای گشتی، ئەو بەشە تازە و گێچەڵاویە، نەیدەتوانی هیچ یارمەتیەک ببەخشێت. هەستێکی وڵاتداگر لە ئارا دابوو کە دەیگوت پێویستە کەسێک قەرەبووی ئەو شەڕە تۆقێنەرە بگرێتە ئەستۆی خۆی؛ بەڵام هاوڕێ لەگەڵ ئەوانەش ئاخێکی قووڵ بۆ ئاشتی هەڵدەکێشرا. کۆماریەکانی هاوپەیمانی بە دەنگی بەرز و لەڕووی دژایەتیەوە قسەیان دەکرد. لە دێسامری ساڵی ١٩١٨دا،

خەڵکی بەریتانیا بەگشتی خوازیاری بەسزاگەیاندنی قەیسەر بوون؛ چوار مانگ دواتر، بەگومانەوە باسی لێدەکرا. فەرەنسەیەکان خوازیاری ئەوە بوون ئەڵمانیا بێننە خوارەوە، بەڵام ئایا ئەوان خوازیاری ئەوە بوون کە بیدەن بە دەست بۆلشویزمەوە؟ ئەمەریکیەکان بە ئاواتەوە بوون کە بتوانن میلیتاریزمی ئەڵمانی تێکبڕووخێنن بەڵام هاوکات لەگەڵ ئەوەش خوازیاری ئەوە بوون کە وڵاتی ئەڵمانیا ببووژێننەوە. سیاسەتمەداران لە پاریس بە خۆیان دا چوونەوە، هەوڵێکی بێ وچانیان دا تا بە دەنگدەرەکانی خۆیان گرنگی بدەن، ملکەچ بە یاساوڕێساکانی خۆیان بمێننەوە، و لەسەر مامەلەیەک دانووستان بکەن کە پەسەندکراوی هەموویان بێت. ڕەنگە زۆر جێی سەرسووڕمان نەبێت کە ئەوان لە سەرەتادا کاتێکی زۆریان تەرخان بە تاوتوێکردنی کێشەیەکی بە بەراورد ئاسان بەڵام زۆر هێمابەخش کرد: چارەنووسی قەیسەر.

* * * *

لە ساڵی ۱۹۱۹ قەیسەر ویلهیلم، سێهەمین و دوایەمین ڕێبەری ئیمپراتۆری کە لەلایەن بیسمارک دامەزرا، لە سەرەتاکانی شەستەکانی تەمەنیدا لە قەڵایەک نزیک بە ئوترێچت دەژیا. لە کۆتایی شەڕدا، کە سووپاکانی ئەو خەریک بون دەتوانەوە، ئەو سەبارەت بە مەرگی خۆی و هێزەکانی دەوروبەری چەند تێبینیەکی خۆهەڵکێشانەی ڕاگەیاند و دواتر بۆ هەندەران بەرەو هۆلەند دوورخرایەوە. تەنانەت ژەنەراڵە هەرە بە ئەمەک و بە وەفاکانی خۆیشی بە ڕۆیشتنی ئەو خۆشحاڵ بوون. هەڵکردن لەگەڵ هەڵشاخانی کوتوپڕی ئەو و پەرۆشی و خولیابوونی کوتوپڕی ئەو هەروا ئاسان نەبوو. ویلهێڵم هەروا منداڵ مابۆوە و ئەقڵی گەشەی نەکردبو؛ منداڵی نەحەواوە و نارەسەن پیاوێکی لێدەرهاتبوو کە خولیای جل لەبەرکردن و شۆخی کردنی نەشیاو بوو. کرداری نەشیاوی ئەو و وتە ناحەز و ناشیرنەکانی ئەو بەر لە دەستپێکردنی شەڕی گەورە زۆر جار ئورووپایان ورووژاندبوو. شێوەی هەڵس و کەوتی لە شێتێکی سەرجێ دەچوو؛ بەرلە ساڵی ۱۹۱٤ بە گەرمە باسی ڕاگەیاندنی تەختی پاشایەتی لێدەکرا.۳٥٤ بێجگە لەو شاژن ڤیکتۆریا نەویکەشی هەبون کە تووشی کێشە و ئاڵۆزی دەکردن؛ هیچ کامێکیان بە قەدەر ئەم ئازاری نەدەدان. بەگوێرەی یەکێک لە ڕەخنەگرەکان، لە چوارچێوەی "ڕژیمێکی بچووکی ئۆپەراییدا" کە ئەڵمانیای بەڕێوە دەبرد، قەیسەر بڕە دەسەڵاتێکی مەترسیداری هەبوو، بەتایبەت بە سەر کاروباری سەربازی و دەرەوەدا. بە کەسایەتیەکی جیاوازەوە، لەوانەبوو دۆخەکە بە باریکی تردا بگەڕایە؛ وەکوو دواتر دەرکەوت، بەهێزترین وڵاتی سەر قارەی ئورووپا بەرەو تەقینەوەکەی ساڵی ۱۹۱٤ ڕێگای گرتەبەر.

قەیسەر هەمووجارێک بە دڵنیاییەوە ئاماژەی بەوە دەکرد کە ئەوە ئەڵمانەکەی ئەو، سووپاکەی ئەو و هێزی زەریایی ئەو بوو. ئامۆزاکەی خۆی بەناوی جۆرج ڤی بەریتانیا لە ساڵی ١٩١٨دا سەبارەت بە ئەو نووسی کە " ئاشکرایە کە ئەو هەم خۆی و هەمیش وڵاتەکەی خۆی لەبەین برد. من ئەو وەک گەورەترین جەنایەتکارێک کە تا ئێستا هەستم پیکردبێت دیوە چون جیهانی بە شەڕێکی قزێوندا برد کە هەموو نەهامەتی و کاولکاریەکی پاش خۆی بەجێ هێشت و ماوەی ٤ ساڵ و سێ مانگی خایاند."٣٥٥ پاشا بۆ زۆر کەس قسەی کرد. جیهانی هەپروون بە هەپرون کراو بە دوای کەسێکدا دەگەڕا تا سەرلۆمەی بکات، ئەو کەسە بێجگە لە قەیسەر، هاوڕێ لەگەڵ کوڕی لاواز و نێرەمۆکی خۆی و ڕێبەرانی سەربازی خۆی کەسیتر نەبو.

لە بەریتانیا، بەرەی هاوپەیمانی بە شێوازێکی ڕێک و پێک کەمپەینی هەڵبژاردنی پاش شەڕی دەستپێکردبوو. لیۆد جۆرج ئەیوت کە " پێویستە ئێمە ڕێگە نەدەین تۆڵە بە هەر مانایەک، چاوچنۆکی بە هەر شێوەک یاسا بنەڕەتیەکانی دادپەروەری ببەزێنن." خێرا بۆ هەموو لایەک دەرکەوت کە لێژنەی هەڵبژێردراو بڕیاری لەسەر هەڵواسینی قەیسەر ساخ کردۆتەوە. لەوەدەچوو لیۆد جۆرج بۆخۆشی بەو دەستەواژەیە هەستی بریندار بوویێت بەڵام لەگەڵ ئەوەش هاوهەستی خۆی دەربڕی. ئەو خۆی کەیفخۆش کرد، هاوکارەکانی خۆی وەکوو چێرچیل تاراند و پاشای بە داڕشتنی پلانێکی ورد بۆ دادگایی کردنی قەیسەر لە لەندەن یان لە قەڵای دۆڤێر لەبەرانبەر جەماوەردا و دواتر دورخستنەوەی ئەو بە کەشتی، دوابەدوای سەپاندنی حوکمی تاوانباری، بەرەو دورگەکانی فاڵکلەند تووڕەکرد. مەقامێکی ڕەسمی کابینەی دەرەوە لە یادداشەکەی خۆیدا هێنابووی کە: "ڕۆژنامەنووسان سەبارەت بە هەڵواسینی قەیسەر ئەوەی شتی هەڵیت و پلیت و هیچ و پووچە دێ بە مێشکیاندا و دەشی خەنە سەر کاغەز. چەندە کاتی خۆی فیلی زەبەلاحیان[Jumbo the Elephant] دەوروژاند و قەڵسیان دەکرد ئێستاش سەبارەت بە قەیسەر وادەکەن. باشتر وایە مێشکمان بە شتی ترەوە خەریک بکەین."٣٥٦

سۆنینۆ، کە کاتی خۆی لەگەڵ هێزە سەرەکیەکان گرێبەستی ئیتالیای بەستبوو و دواتریس پشتی تێکردبوو، بەردەوام بەرەنگاری دەکرد و دژ دەوەستا. ئەمە پێشینەی درووست نەدەکرد. کلیمینجوو لەگەڵ ئەم وت و ویژانە زۆر هەڵی نەدەکرد. " پێشینە چیە؟ من بە ئێوە دەڵێم. مرۆڤێک دێت؛ ئەو بە چاک یان بە خاراپە کارێک دەکا. لە چاکەیەک کە ئەو دەیکا، ئێمە پێشینەیەک درووست دەکەین. لە خراپەیەک کە دەیکا، جەنایەتکارەکان- تاکەکان یان سەرانی دەوڵەت- پێشینەیەک بۆ جەنایەتەکانی ئەوان درووست دەکەن. بۆ جەنایەتەکای ئەڵمانیا، بۆ لەبەیبردنی

سیستەماتیکی سامانەکان بۆ مەبەستی کۆتایی هێنان بە ڕکەبەرایەتی، بۆ زەجردانی دیلەکان، بۆ دزە دەریایەکان، بۆ هەڵس و کەوتی قێزەوەن لەگەڵ ژنان لە وڵاتانی داگیرکراو هیچ پێشینەیەک لەئارادا نەبوو."[٣٥٧]

لە کۆبوونەوەکانی لەندەن بەرلە هاتنی ویلسۆن، باسی سزادانی قەیسەر و بەردەستەکانی کاتێکی زۆری بەخۆوە خەریک کرد بەڵام لە کۆتاییدا هەموویان لەسەر ئەوە ڕێکەوتن کە دەبێ چاوەڕوان بمێنن و بزانن ڕای ویلسۆن چیە. سەرۆک کۆماری ئەمەریکی دڵنیا نەبوو. ئەو سەرلۆمەی میلیتاریزمی ئەڵمانی دەکرد، کە قەیسەر بۆ خۆی هێمایەکی بەهێز لەو میلیتاریزمە بوو، بەڵام ئایا دەکرێ ویلهێلم لەلایەن ستافی گشتی خۆیەوە زۆرەملێی لێکرابێت؟ پسپۆڕانی ئەمەریکی یاسایی بوونی دەستپێشخەری کردن دژ بە ئەڵمانیەکانیان پێ قەبووڵ نەدەکرا.

ویلسۆن لەکۆتاییدا بەنابەدڵیەوە ڕەزامەندی دا بە ئامادەبوونی لێژنەیەک بۆ وەئەستۆ گرتنی ئەرکی لێکۆڵینەوە لەسەر جەنگ و سەپاندنی سزا بە سەر تاوانباراندا. ئەندامانی ئەمەریکی ئەو لێژنەیە کە لانسینگیشیان لەخۆ گرتبوو ملیان نەدا بەوە کە ئەڵمانیەکان لەبەرهۆی ئەوتاوانانەی کە دژ بە مرۆڤایەتی کردبوویان دادگایی بکرێن. ویلسۆن ئاشتیکەرەکانی هاوڕێی خۆی لە شۆڕای چوارکەسیدا ئاگادار کردەوە کە باشتر وایە ویلسۆن هەروا بە ئابڕووچاوی بمێنێتەوە: " چارلزی یەکەم کەسایەتیەکی سووک و هیچ و پووچی هەبوو و بە گەورەترین درۆزن لە مێژوودا ناسرا؛ بەڵام بە لەسێدارەدانی چوە ناو هۆنراوە و هەڵبەستەکانەوە و بە شەهیدبوون ناوی دەرکرد." بە ڕۆحیەتێکی سازشکارانەوە (و ڕەنگە بۆ مەبەستی هەموارکردنی دۆکترینی مۆنرۆ بووبێت کە ئەو لە پەیمانی کۆمەڵەی گەلان خوازیاری بوو)، لە کۆتاییدا ویلسۆن بە بەندێک ڕەزایەتی دا کە ویلهێلمی تاوانبار دەکرد بە " دژایەتیەکی یەکجار زۆر لەگەڵ ڕەوشتبەرزی جیهانی و پیرۆزەبوونی گرێبەستەکان" و داوای لە حکوومەتی هۆلەند دەکرد تا ئەو بدا بە دەستەوە. جەنایەتکارانی ئەڵمانی کەمتر لەلایەن دادگاکانی تایبەتی میلیتاری کە کاتی خۆی حکوومەتی ئەڵمانی گەمارۆی دابوون دادگایی دەکران. بۆچوونی یەکێک لە پسپۆڕانی ئەمەریکی ئەوە بو کە " پێویستە بەر لە هەموو شتێک کەروێشکەکە نچیر بکرێت."[٣٥٨]

لە بەهاری ساڵی ١٩١٩دا، ئیشتیای جەماوەر بۆ دواکەوتنی نچیرەکە ڕوولە کزی بوو. کاتێک هۆلەند دەستبەرداری قەیسەر نەدەبوو، هاوپەیمانان، کە زۆرکەم وابو غەدر لە وڵاتێکی بچووکی بێلایەن بکەن، بێ مشتومڕ ڕەزامەندیان دا. لە ٢٥ی مانگی ژوەندا، ماوەیەکی کورت بەرلە واژۆکردنی گرێبەستی ڤێرسایلێس، شۆڕای چوار کەسی بۆ دوایەمینجار بابەتەکەیان تاوتوێ کرد.

دۆخەکە لەباتی ئەوەی کە تۆڵەسێنەر بێت شادیبەخش بوو. لیۆد جۆرج ئەیوت کە باشتر وایە قەیسەر بۆ ئینگلیز ڕاگوێزرێت. کلیمینجوو ئەیوت کە " ئاگاداربن کە نەخنکێت. بەڵێ، دادگایی کردن لە ئینگلیز، سێدارە لە فەڕەنسە." ئەوەی کە جێی پرسیار بوو بۆ لیۆد جۆرج ئەوە بوو کە دوای ئەوە ئێمە ئەو بۆ کوێ بنێرین؟ کانادا؟ دوورگەیەک؟ "ویلسۆن یەک بەخۆی هاواری دەکرد " زەحمەت نەبێ مەینێرن بۆ بێرموودا. من بۆخۆم دەمەوێ بچم بۆ ئەوێ."٣٥٩

قەیسەر تا ساڵی ١٩١٤ ژیا، بیرەوەریەکانی خۆی دەنووسی، پی.دی.وۆدهاوسی دەخوێندەوە، چایی ئینگلیزی دەخواردەوە، لەگەڵ سەگەکەی پیاسەی دەکرد و لەبەرانبەر پیلانگێڕی جوولەکەکان لە ئاستێکی جیهانیدا کە هەستی دەکرد بوونەتە هۆی سەرشۆڕی ئەو و ئەڵمانیش ئاوری لێدەبۆوە. کاتێکە هیتلێر لە ساڵی ١٩٣٩ شەڕی دەستپێکرد، ئەو "یەکبەدوای یەکی مۆعجیزەکانی" وروژاند، و دروست بەرلە هێرشی ئەڵمان بۆسەر یەکیەتی سۆڤیەت کۆچی دوایی کرد. لەئاکامدا هاوپەیمانان هاتنە سەر ئەم بڕیارە کە بۆخۆیان ئەڵمانیەکان دادگایی نەکەن. ئەوان لیستەیەک ناویان نارد- وەکوو لیندیبیرگ و لۆدێندۆرف- بۆ حکوومەتی ئەڵمانیا، کە دادگایەکی تایبەتی بۆ دامەزراندن. زۆربەیان بە شێوەیەکی کوتوپڕی ئازاد کران. دوو ئەفسەری ژێر دەریایی کە گەمیەکی ڕزگاریکەریان پڕ لە بریندا نووقمی ئاو کردبوو حوکمی چوار ساڵ زیندانیان بۆ بڕایەوە؛ دوا چەند حەفتەیەک دەربازبوون و قەت نەدۆزرانەوە..٣٦٠

# ١۴

# کپکردنی دەنگی ئەڵمان

بەندەکانی میلیتاری گرێبەستەکە، کە شۆڕای چواریار تەنانەت بەرلە ناوەڕاست مانگی زستان دەستیان کردبوو بە سەیرکردنی، هۆشداریان دەدا کە دانووستان لەگەڵ ئەڵمانیا زۆر دژوارترە لە دانووستان لەگەڵ قەیسەر. زۆربەی خەڵک کۆک بوون لەسەر ئەوەی کە میلیتاریزم و هێزە زەبەلاحە چەکدارەکان، بەتایبەت ئەڵمانیا، بۆ جیهان وەیشوومە بوون؛ لەڕاستیدا، ئەو کتێبانەی کە باسی ئەوەیان دەکرد کە هۆکاری سەرەکی هەڵگیرسانی شەڕی گەورە ململانەی چەکدارانە بوو تازە خەریکبوون سەریان دەردێنا. یەکێک لە چاردە خاڵەکەی ویلسۆن باسی لە کەمکردنەوەی تەقەمەنیەکانی نیشتمانی دەکرد " تا نزمترین ئاستێک کە لەگەڵ هێمنایەتی ناوخۆییدا هاوئاهەنگی هەبوایە،" و یەکێک لە تایبەتمەندیە هەرە باشەکانی کۆمەڵەی گەلان ئەمە بوو کە تا ڕادەیەک ئەم هێمنایەتیە دەستەبەر دەکات کە نەتەوەکان بە حەزی خۆیان لە هێزە چەکدارەکانی خۆیان کەم کەنەوە. لیۆد جۆرج کە دەیزانی سەربازی زۆرە ملێ لە بەریتانیا هەرباوی نەماوە لەو بیرۆکەیە بەباشی کەڵکی وەرگرت. چەک کردنی بەهێزترین وڵاتی قارەکە بە دڵنیایەوە یەکەمین هەنگاوی گرنگ بوو بۆ مەبەستی چەک کردنی گشتی کە لەلایەن کۆمەڵەی گەلانەوە بڕیار بوو جێبەجێ بکرێت. هەرچەند بە دڵنیایەوە هیچ کێشەیەکی درووست نەدەکرد، هاوپەیمانان حەزیان لەوە بوو کەش و هەوایەکی سەربازی توند و تۆڵتر بە سەر وڵاتانیتری شکست خواردودا بسەپێنن. لەگەڵ ئەوەش ئەوان سەرنەکەوتووانە هەڤاڵانی خۆیان لە ئوروپا وەکوو چەکسلۆڤاکیا، پۆڵەندا و یوونان هان دەدا تا هێزە چەکداری بچووکتر پەسەند بکەن.٣٦١

چەک کردن خۆی لەخۆیدا کارێکی باش بوو بەڵام ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی کە ئەڵمانیا دەبێ چەندە هێزی بۆ ببڕێتەوە کارێکی دژوار و چەتوون بوو. حکوومەتی تازەی ئەڵمانی پێویست بوو بتوانێ لەناوخۆدا سەرکێشەکان دمکووت بکات. لەگەڵ ئەوەش ئایا دەبێ هێزی ئەوتۆی هەبێت

ناکوو بتوانێت لەبەرانبەر مەترسی بۆلشویکای لە ڕۆژهەڵات بوەستێت؟ هاوپەیمانان نەیاندەتوانی ئەم کارە بۆ ئەوان بکەن. وڵاتانی ئوروپای ناوەندیش هەروا. ئەوان نەک تەنیا لە هەوڵ و تەقەلای ئەوەدا بوون خۆیان زیندوو ڕاگرن، بەڵکو، وەکوو هانکی بە توندی ئاماژەی پێکرد، " هەست بە بچووکترین هێمایەک لە هەوڵ و تێکشانێکی یەک گرتوو نەکراوە کە بەرەنگاری بۆلشویکخوازان لەناو خۆیاندا ببێت. بە پێچەوانە، ئەوان چۆن خراپە ئاوایان کردوە هەروەک لە وڵاتانی باڵکان هەموومان بە جوانی ئاشنایەتیمان لەگەڵی هەیە." سەرەڕای ئەم هەموو کەم و کورتیە، ئەڵمانیەکان" خەڵکانێکی هەتا بڵێی خۆڕاگر، نیشتمانپەروە، جێی متمانە و خاوەن پرەنسیپ بوون" لە روانگەی فەرەنسەیەکانەوە هێزەکانی ئەڵمانی هەمیشە جێی مەترسی بوون. بەتایبەت فۆچ هەر لە سەرەتاوە لەسەر ئەوە دەڕۆیی کە هاوپەیمانان پێویستە دەست بەسەر کەرەسەی سەربازی ئەڵمان دابگرن. ڕاینلەند و پاسگاکانی ئەوێ داگیر کەن، بنکە سەبازیەکانی ئەڵمانیا بە درێژایی سنوورەکانی ئەو وڵاتە لەگەڵ فەرەنسە لەبەین بەرن و سووپای ئەڵمانیا تا ١٠٠،٠٠٠ کەس کەم کەنەوە. ئەو زۆر بەشێوەیەکی ناماقووڵانە دەیگوت کە ئەم داواکاریانە تەنیا سەربازی و میلیتاری بوون.٣٦٢

فۆچ وەک یەکێک لە ژەنەڕاڵە بەرجەستەکانی فەرەنسەیی کە دەبوایە لەو ناوە ناسراوەی خۆی پارێزگاری بکردایە، کەچی بۆخۆی وەک سەربازێکی ئاسایی سەیری خۆی دەکرد. ئەو کورتە باڵا بوو و قژێکی کاڵی پێوە بوو، و لە ڕواڵەتدا زۆر شپرێو و تێکچوو بوو و نەدەچووە دڵانەوە. بە بۆچوونی شارەزایەکی ئەمەریکی " لە مەودایەکی ١٥ پێیەوە قەت هەستت بەوە نەدەکرد کە ئەوە سووپا سالارێکە." لەدایکبووی بنەماڵەیەکی مامناوەندی لە بایرینیس، فۆچ پیاوێکی پاک و بێ خەوش و لەخواترسی کاتۆلیکی بوو و هیوایەتێکی تایبەتی بە باخداری و تێگرتن [ڕاوکردن] و شانۆ هەبوو (هەڵبەت بەو مەرجەی کە زۆر مۆدێرن و پێشکەوتووخوازانە نەبوایە) و لە سیاسەتمەداران و ئەڵمانیەکان بێزار بوو. ژەنەڕاڵی ئینگلیزی بەناوی هێنری ویلسۆن، یەکێک لە هاورێ مەزنەکانی ئەو، بەرێزەوە سەیری ورەبەرزی و ملنەدانی ئەو کابرایەی لە تەنانەت ساتە هەرە سەخت و ناخۆشەکانی شەڕدا دەکرد. ئەو ئەیوت کە فۆچ " غەریزەیەکی سەیری هەیە بۆ بە ئەنجام گەیاندنی کارێکی ڕەوا و درووست. ئەو بە پێویستی نازانێت بۆ هەرکاریک دەیکا بەڵگەیەک بێنێتەوە." بە واتایەکی تر، فەرماندەی ئەمەریکی، ژەنەڕاڵ پێرسینگ، کە لە دوایەمین ڕۆژەکانی شەڕدا لەگەڵی ڕووبەڕوو بوویەوە ئەوی وەک " پیاوێکی مێشک تەسک، بچووک، و خۆبەزلزان هاتە بەرچاو." سەرۆک ویلسۆن مێشک تەسکی و هەستی تۆڵەسەندنەوەی فەرەنسەیەکانی لە کرداری ئەودا بەدی دەکرد. هەڵبەت ئەویش ئەمی بە گێل و نەزان دەزانی.٣٦٣

کلیمینجوو، کە ساڵیانی ساڵ بوو ئەوی دەناسی، هەمیشە ڕاڕا بوو. ئەو لە ساڵی ١٩١٩دا بە شۆڕای عالی ڕاگەیاند کە " ئەو ژەنەڕاڵێکی گەورە بوو، نەوەک پاپێکی سەربازی." لە کاتی شەڕدا ئەو ژەنەڕاڵ پیتەینی وەک فەرماندەیەکی مەزنی هاوپەیمانی لەبەرانبەر فۆچدا دەسەنگاند. " من خۆمم لەنێوان دوو کەسایەتیدا دەدی، یەکیان بە منی دەکوت کە ئێمە تەواو بوین و ئەویتریان وەک شێتێک دەهات و دەچو و خوازیاری شەڕکردن بو. من لەبەر خۆمەوە دەمکوت با فۆچ تاقی کەینەوە." و کلیمینجوو هەستی دەکرد کە ئەو ڕاستی وتووە. ئەو دەیگێڕایەوە کە " من هەموو وەختێک چاوم پێی دەکەوت. لە مانگی مارسی ساڵی ١٩١٨دا، باوەڕی زیاتری بە خۆی هەبوو، زۆر لەجاران بە پەرۆشتر بوو، وەک ڕێبەرێکی گەورە دەهاتە بەرچاوان، و تەنیا یەک بۆچوونی هەبوو: خەبات کردن، و درێژەدان بە خەبات تا بەچۆک داهێنانی دوژمن." بەڵام کلیمینجو هەندێک مەرج و شەرت و شرووتی هەبوو. ئەو ئەیوت کە "لە کاتی شەڕدا پێویست بوو هەر ساتێک لەنزیکەوە چاوم بە فۆچ بکەوتایە تا نەهێڵم خۆی لە کارێکی منداڵانە بدا."٣٦٤

کلیمینجوو قەت بە تەواوەتی باوەڕی بە هیچ سەربازێک نەدەکرد، بەتایبەت سەربازێکی ئایینی. ئەو فۆچی وەک نوێنەرێکی فەرەنسەیی لە کۆڕی ئاشتیدا نەدەزانی و دڵنیا بوو لەوە کە فۆچ تەنیا کاتێک لە کۆبونەوەکانی ئەو کۆڕەدا بەشداری دەکرد کە بانگێشت بکرایە. فۆچ قەت لە ئەو خۆش نەدبوو و نەیدەبەخشی: " زۆر سەیرە ئێم. کلیمینجوو وەک کەسایەتیەکی ئەوتۆ سەیری من ناکا کە لێهاتوویی ئەوەم هەبێ لەبەرانبەر سەرۆک ویلسۆن و لیۆد جۆرج بوەستم."کاتێکە فۆچ و لایەنگرەکانی هەوڵیان ئەدا تەشەنە کەنە ناو دانووستانەکانی کۆڕی ئاشتی، کلیمینجوو خێرا ڕەنگی دەگۆڕا و لە دین دەهری دەبوو. دیمەنی زۆر سەیر و سەمەرە هەبوون. لە شۆڕای عالیدا لەماوەی یەکێک لەو دیمەنانەدا فۆچ مارشی لێدەدا و لە ژوری چاوەڕوانی کردندا دادەنیشت. کاتێکە هاوکارەکانی دنەیان دەدا تا بگەڕێتەوە ناو کۆڕەکە، یەک بەخۆی هاواری دەکرد " قەت، قەت شتی وا هەر مەڵێن." کلیمینجوو هەرتاو ناتاوێک هەوڵی لەسەرکارلابردنی ئەوی دەدا، بەڵام هەرگیز بۆی نەدەلوا. ئەو دەیکوت " با خەڵک ئەو بتانەیان هەر بۆ بمێنێتەوە. پێویستە ئەوان خاوەنی ئەوانە بن هەر شیاوی ئەوەندەن."٣٦٥

فۆچ پێداگری دەکرد لەسەر دانانی بەندی توند و تۆڵ لەناو ڕێکەتنامەی سەرەکی ئاگربەستدا لە ١١ی نوامری ساڵی ١٩١٨دا. لەماوەی کۆڕی ئاشتیدا، ئەو هۆشداری دەدا کە ئەڵمانیەکان ملکەچی مەرجەکانی ئاگربەست نین؛ ئەو خێرایەی کە پێویستە لە هاتنەدەرەی حاڵەتێکی سەربازی بینبێت نیانە، و چەک و چۆڵەکانیان نادەن بە دەستەوە. ئەو دەیکوت کە هاوپەیمانان پێویستە سووپای بەهێز بۆخۆیان ڕابگرن، بەتایبەت لە ڕاینلەند، دەنا ناتوانن مەرجەکانی ئاشتی توند و تۆڵ بگرن.

بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان دوودڵ بوون. ویلسۆن لای وبوو کە فەرەنسیەکان شێت و "هیستریایین" و کاتێکە پێرشینگ پێی ڕاگەیاند کە فۆچ هێزی ئەڵمانی زۆر گەورە دەبینێت، خێرا گورج و گۆڵ ئەم بۆچونەی بۆ لیۆد جۆرج گێڕایەوە.٣٦٦

کاتێکە بۆ مەبەستی بووژاندنەوە و نوێکردنەوە ئاگربەست هاتە کایەوە و بەرباس، کە بەشێوەیەکی مانگانە و بەنۆبە بوو، فۆچ هەوڵی دا بەندی تازە بینێتە کایەوە. ویلسۆن دەیکوت "کەی ئەوە مەرجی پیاوەتیە داواکاریە سووک و چرووکەکان بە کەش و هەوای ئاگربەستەوە بلکێنرێن بەڵام لە هەمان کاتیشدا یەک بە دوای یەکدا گوزارش دەهات کە بەشکەم مەرجە پەسەندکراوەکانی پێشوو جێبەجێ نەکرێن." ئەوان چۆن توانیان ئەڵمانیەکان هان بدەن تا وەریان بگرن؟ وڵامی فۆچ ڕوون و ئاشکرا بوو: "لەڕێگای شەڕەوە". کلیمینجوو بە هەندێک نابەدڵیەوە پشتگری لێکرد. " ئەو بەباشی خەڵکی ئەڵمانیای دەناسی. هەرکات کە کەسێک لەبەردەمی ئەوان دەست لە کار دەکێشێتەوە ئەوان دەهری دەبن."لە ١٢ی مانگی فەوریەدا، دوا باس و خواستێکی باش، شۆڕای عالی بەم ئاکامە گەیشت: دەبوو ئاگربەست بەبێ هیچ گرێ و گۆڵێک تازە بکرایەوەوە، بەبێ پێوەلکاندنی هیچ جۆرە گۆڕانکاریەکی بەرچاو، و فۆرچ بۆ مەبەستی ورد دارشتنی مەرجەکانی میلیتاری بۆ کۆڕی ئاشتی بەرپرسایەتی لێژنەیەکی پێسپێردرا. لە ئالۆزی بەردەوام لەسەر ئەوە کە ئایا ئەوان خەریکی ڕێکەوتنامەیەکی سەرەتایی بوون یان یەکێکی کۆتایی، کەس لەوە دڵنیا نەبوو کە ئایا مەرجەکانی میلیتاری دەبوایە بە شێوەی پلانی بەش بەش سەرەتا پێشکەش کرانایە یان بە شێوەی بەڵگەیەکی کۆتایی و گشتگیر.٣٦٧

کاتێکە لێژنەکەی فۆچ لە ٣ی مانگی مارسدا گوزارشێکی ڕاگەیاند، داوای سووپایەکی بچووکی ئەڵمانی کردبوو لەگەڵ پێداویستی سەرەکی نەک شتی ناپێویست و ناسەرەکی وەکوو ستافی گشتی یان تانک. فۆچ داوای ڕاگەیاندنی بڕیارێکی خێرای لە شۆڕای عالی کرد. ئەو خوازیاری ئەوە بوو کە بتوانێ لەگەڵ نوێنەرانی ئەڵمانی لەماوەی سێ هەفتەدا دەست کات بە دانووستان کردن. دوا ئەوە کە ڕێژەی هاتنەدەرێ لە حاڵەتی سەربازیان بەراورد کرد، ئەو و هاوکارانی هاوپەیمانی خۆی نەیاندەتوانی گارانتی ئەوە بکەن ئەوان بۆ ماوەیەکی دور و درێژتر دەستڕۆییان دەبێت. ئاشتیکەرەکانی بەریتانی و ئەمەریکی بێ هەست و بێ لایەن بوون. بالفۆر وتی کە " ئەمە وەکوو ئەوە وابوو کە دەمانچەیەک بە کەراکە سەری شۆڕاوە بنێیت." لەگەڵ ئەوەش ئەو نەیدەویست بە نەبوونی لیۆد جۆرج بڕیارێک بدات، چون هەندێ لە پێشنیارەکانی فۆچ قراوی بوون و کێشەیان لێ ساز دەبوو.٣٦٨

ئەگەر فۆچ خوازیاری سووپایەکی ١٤٠،٠٠٠ سەربازی ئەڵمانی بوو کە تەنیا بۆ ماوەی یەک ساڵ خزمەتیان دەکرد، نوێنەری بەریتانی لە لێژنەکەی ئەودا، هێنری ویلسۆن، داوای ٢٠٠،٠٠٠

فیداکەری دەکرد کە بۆ ماوەی چەندین ساڵ خزمەتیان دەکرد. بەریتانیاکان هەوڵیان دا کە فەرەنسەیەکان هان بدەن کە بارهێنانی هەزاران پیاو لە ساڵێکدا ژمارەیەکی زۆر سەربازی بەئەزموون و کارامەی لێدەکەوێتەوە. لیۆد جۆرج وتی کە ئەو حەز ناکا ببینێ فەرانسە ڕووبەڕووی ئەو مەترسیە دەبێتەوە. لە وڵامدا فۆرچ وتی کە دڵەڕاوکێی ئەو چەندێتی نیە بەڵکوو چۆنیەتیە. سەربازانی کۆنەکار هەروا بەو ئاسانیە دەیانتوانی ببن بە کرۆکی هێزێکی یەکجار زەبەلاحتر. ئەڵمانیەکان وەکوو " پۆلێک مەڕ" هاوڕێ لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر ئەفسەری شوانکارە بەر خۆیانیان دەدەن و کۆتاییان پێدێنن.٣٦٩

لیۆد جۆرج کلیمینجۆی بردە گۆشەیەک و هانی دا واز لە سەربازگیری سووپای ئەڵمانی بێنێت. فۆچ ئەمەی لە کۆبوونەوەی دواتری شۆڕای عالیدا بۆ دەرکەوت؛ ئەو زۆر ناشیرین بە سەروچاوی کلیمینجوودا هەڵشاخی، بەڵام ئەو وەک نەبای دیبێ و نەبۆران متەقی لێوە نەهات. هەمووی دەسکەوتەکانی ئەو لە ١٠٠،٠٠٠ سووپای ئەڵمانی شەپکەیەکی لار بوو. هێنری ویلسۆن لەم بارەوە نووسیبووی کە " کەوابوو، من بە باوەڕی سەرەکی خۆم گەیشتم، بەڵام بە ژمارە نەگەیشتم، و فۆچ بە ژمارەی خۆی گەیی بەڵام باوەڕی سەرەکی دەست نەکەوت. بەخوا کە حاڵ و هەوایەکی سەیرە."٣٧٠ بەندەکانی میلیتاری خرانە لاوە تا ودرەو ویلسۆن لە وڵات دەگەڕێتەوە.

فۆچ وەکوو زۆریەک لە هاونیشتمانانی خۆی، لە ئەڵمانێکی چەک کراو زۆر لەوەزیاتری دەویست. ئەو خوازیاری ئەڵمانێکی زۆر بچووکتر بوو. هەمووی ئاشتیکەرەکان لەسەر ئەوە کۆک بوون کە ئەڵمانیا پێویستە بتوێتەوە. کێشەکە لە کوێوە دزەی کردبوو و ڕێژەی چەندە دەبوو. پۆڵەندا خوازیاری سیلێسیای سەروو، هاوڕێ لەگەڵ سەرچاوە خەڵووزیەکانی ئەوێ، و بەندەری دانزیگ (گدانسکی ئێستا) بوو. لیتوانیا، ئەگەر دەوامی بێنایە، خوازیاری بەندەری بالتیکی مێمێل (کلایپێدای ئێستا) و پارچەیەک لەو زەوی و زارانە بە پانتایی دوورگەکەدا. ئەو سنوورانەی کە لە ڕۆژهەڵات بوون، و بەشێکی زۆر گەورە بوون لە شوێنی دانیشتنی خەڵکانی ئورووپای ناوەندی، شیمانەی قڕەیەکی گەورەیان لێدەکرا.

لە باکووری ڕۆژئاوا، سنوورەکانی ئەڵمانیا بە بەراورد لەگەڵ شوێنەکانی تر زۆر بە هاسانی دیاری کرابوون. دانیمارکی بێ لایەن داوای بەشی باکووری سچلێسویگ-هۆلستەینی دەکرد، دوو پارچە لەو ناوچانەی ژێر دەسەڵاتی دووک کە لە ناوەڕاستی سەدەی پێشوودا ئورووپایان بە یەک دادابوو. بە حەشیمەتێکی تێکەڵ لە ئەڵمانیەکان و دانیمارکیەکان و پێگەیەکی یاسای لە شوێنەواری دێرین و تێکەڵپێکەڵێکی سەرسووڕهێنەر (هەرچی جار بوو بیسمارک دەیگێڕایەوە کە تەنیا دوو کەس

لەو کێشەیە تێگەیون- بۆخۆی یەکیان بوو و ئەوی تریان لە هەندەران بوو)، ئەوان لەلایەن پڕاشاوە داگیرکرابوون ئەوکاتەی کە هەوڵی دروستکردنی ئەڵمانێکی مۆدێرنی دابوو. حکوومەتی ئەڵمانیا بۆ ئەڵمانی کردنی دانیشتوانی ناوچەکە ئەوەی لە دەستی هات کردی، بەڵام سەرەڕای هەمووی هەوڵەکانی زۆرینەیەکی بەرچاو لە بەشی باکوور هێشتا هەر بە دانیمارکی قسەیان دەکرد. حکوومەتی دانیمارکی زۆر لە کۆڕی ئاشتی پاڕایەوە تا چالاکانە لەو بوارەدا هەنگاو بنێت. رووخانی کۆنەڕژێمی ئەڵمانیا لە سچلێسویگ-هۆلستەین وەکوو شوێنەکانی تر شۆڕای شۆڕشگێڕی دروست کردبوو، بەڵام بەسەر ئەوەشدا هەڵس و کەوتی ئەوان وەک ئەڵمانیەکان وابوو. ئاخێوەرانی دانیمارکی لە بەڕێوەبردنی کۆڕ و کۆبوونەوە بەرگری دەکران، دەلاقەکانیان تێکدەشکێنران و، ڕەنگە لەمان خراپتر لە ناوچەیەکی کشت و کاڵی پڕ پیت و بەرەکەتی وەهادا، ئەوە بێ کە دەست بەسەر مانگاکانیان دەگیرا.٣٧١ کەس خوازیاری ئەوە نەبوو بۆخچەی کێشە کۆنەکانی یاسایی سەرلەنوێ بکرێنەوە، بەڵام بەختەوەرانە یاسای تازەی خودموختاری لە ئارادابوو. شۆڕای عالی بڕیاری دابوو کە دەبێ کێشەکە بگەڕێندرێتەوە بۆ لیژنەیەک کە لەسەر داواکاریەکانی بلژیک دژ بە ئەڵمانیا دەیکۆڵیەوە. ئەویش وەک ئەرک لە پێناو دوو دانە ڕای گشتی گوزارشی ڕاگەیاند، یەکەمینیان لەلایەن تاقمێکەوە بوو کە لەلایەن ئاشتیکەرەکان دەستووریان پێدرابوو. لە ساڵی ١٩٢٠دا کۆمیسیۆنێکی نێونەتەوەیی چاودێری مافێکی دەنگدانی دەکرد بۆ هەمووی ئەو ژنان و پیاوانەی کە تەمەنیان لە سەرووی بیست ساڵەوە بوو. ئاکامەکان باسیان لە ڕەنگدانەوەی جیاوازیەکانی زمانیان دەکرد؛ ناوچەی باکوور لەپێناو یەکگرتنەوە لەگەڵ دانیمارک دەنگی دا، ناوچەی باشور بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەڵمان بمێنێتەوە دەنگی دا. ئەمڕۆکە سنوورەکە هەروا نەگۆڕ ماوەتەوە.

دیاری کردنی سنورەکانی ئەڵمان لە ڕۆژئاوا هەروا کارێکی ئاسان نەبوو، کاتێکە پێویستی فەڕەنسە بۆ قەرەبووکردنەوە و هێمنایەتی لەسەرووی یاسای خودموختاری لەبەرچاو دەگیرا و ترسی لەمێژینەی بەریتانیەکان لە فەڕەنسەیەکی بەهێز کە بتوانێ  قاڕەکە بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. لە ترۆپکی باکووری ئالساسێ سەرچاوە پڕپیتەکانی خەڵووزی ناوچەی ساری ئەڵمانی هەڵکەوتبوو. فەڕەنسە پێویستی بە خەڵووز بوو، و کانزاکانی خۆی بەگشتی لەلایەن ئەڵمانیەکانەوە لەبەین چووبوو. بێجگە لەمانە، هەروەک کلیمینجوو دروست دوابەدوای ئاگربەستەکە باڵوێزی بەریتانیای وەخەبەر هێنابۆوە، بەریتانیا کاتی خۆی لە کۆتایی شەڕەکانی ناپلۆئۆنیدا، بیری لە بەخشینی ناوچەی ساری بە فەڕەنسەیەکان کردبۆوە؛ بۆچی ئێستاکە لەو دەرفەتە کەڵک وەرنەگرێ و " هەر بیرەوەریەکی تاڵ کە لەوانەیە لە واتێرلۆ هەیانبێت" نەیسڕێتەوە؟

هەڵبەت سار تەنیا پارچەیەکی بچووک بوو لە ناوچەیەکی زۆر گەورەتر لە ڕۆژئاوای قەراخچۆمی ڕاین کە لە ئالساسێ-لۆرەین لە باکوورەوە درێژەی هەبوو تا دەگاتە ناوچەکانی هۆلەندا. کلیمینجوو زیاتر لەسەر ئەوە دەڕۆیی کە بۆ ئەوەی ئەڵمانیا لە هێمنایەتیدا بژی ڕاینلەند دەبێ لەژێر ڕکێفی ئەڵمانیا بێتە دەرێ. " ڕاین سنووری سرووشتی گائۆل و ئەڵمانیا بووە." لەوانەبوو هاوپەیمانان بیانتوانیایە وەک بلژیک وڵاتێکی سەربەخۆیان دامەزراندایە کە لەلایەن زلهێزانەوە گارانتی بکرایە. باڵوێزی بەریتانیا لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە " من هەست بەوە دەکەم کە ئەو زۆر خولیایی ئەوەیە و پێداگری لەسەر دەکات." لە ڕاستیدا کلیمینجوو ئامادە بوو تا لەبابەت زۆریەک لە داواکاریەکانی فەڕەنسە سازش بکات تەنیا بەو مەرجەی کە ئامانجی مەزنی هێمنایەتی دەستەبەرکرایە. لەڕاستیدا، ئەو تەنانەت خوازیاری ئەوەش بوو کە لەگەڵ ئەڵمانیا هاوکاریەکی سنووورداری هەبێت، هەرچەند زۆر کەم بوو، هاوڕێ لەگەڵ کارکردنی دوولایەنەی هەردوو وڵات بۆ مەبەستی بووژاندنەوە و ئاوەدانکردنەوەی ناوچە ڕووخاوەکانی فەڕەنسە و پەرەدان بە پێوەندیە بەکەڵکەکانی ئابووری.٣٧٢

فۆچ بیری لە مەرجی لەو چەشنە نەدەکردەوە، بەڵکوو باسی لە دەسەڵاتداریێتی پیاوێکی سەربازی دەکردەوە کە هەمووی ژیانی خۆی تەرخان بە بەرەنگاربوونەوەی مەترسیەک کردبێ کە باڵی بەسەر چۆمی ڕایندا کێشابوو. فەڕەنسە پێویستی بەو بەربەستە چۆمیە بوو؛ ئەو پێویستی بەوە بوو ڕاینلەند بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە تا بە ئەگەری هێرشێک لە ڕۆژهەڵاتەوە کەڵکی لێوەرگرێت؛و لەگەڵ ئەوەش ئەو پێویستی بە حەشیمەتێکی یەکجار زۆر بوو. ئەو لە یادداشتێکیدا بۆ کۆڕی ئاشتی لە ژانویەی ساڵی ١٩١٩ پێداگری دەکرد و ئەیوت کە " لەمەبەدواوە پێویستە ئەڵمانیا لە هەموو ڕێگایەکی هاتنە ژوورەوە و پەرلەمانی بێ بەش کرێت، واتە، لە هەموو دەسەڵاتێکی ناوچەیی بە سەر بەشی چەپی قەراخ چۆمەکە، واتە، لە هەموو کەرەسە و پێداویستیەک بۆ مەبەستی هیرشێکی خێرا، وەک لە ساڵی ١٩١٤ دیمان، بۆ سەر بلژیک، لۆکزامبۆرگ، بۆ مەبەستی دەستپێڕاگەیشتن بە قەراخ ئاوەکانی دەریای باکوور و مەترسی بۆ سەر ئینگلیز، بۆ مەبەستی نەهێشتنی فەڕەنسە لە پارێزگاری کردنی سرووشتی لە وڵاتی خۆی، ڕاین و میئۆسی، بۆ مەبەستی داگیرکردنی پارێزگاکانی باکوور و دەستپێڕاگەیشتن بە ناوچەکانی پاریس."٣٧٣

ئەو بە سیسیلی وتبوو کە ئەگەر بێتو ئەڵمانیا هێرش بێنێت، بەر لەوەی وڵاتەیەکگرتووەکان و بەریتانیا سەرخۆیان بپەرژێن و بتوانن وڵامێک بدەنەوە دەتوانێ بە چڕ و پڕی سەراسەر فەڕەنسە دابێژ دابێژ بکات. " ئەگەر نیشانەیەکی تری جیاکەرەوەی سرووشتی لە ئارادابوایە کە بتوانرایە

هێڵێکی باشی هاوچەشنی پارێزگاریکردنی لێ درووست کرایە ئەو داوای بەرەی جەنگی ڕاینی نەدەکرد، بەڵام هێچ هێڵێک لە ئارادا نەبوو." ئەو یەکەمایەتی دەدا بە ڕاینلەندێکی سەربەخۆ کە بتوانێ لەگەڵ بلژیک، فەڕەنسە و لۆکزامبۆرگ لە چوارچێوەی فیدراڵیزمێکی بەرگریکاردا پێکەوە گرێ بخۆن. هاورێی ئەو هێنری ویلسۆن وتبووی کە "من لام وایە فۆچ زۆر زێدەڕۆیی دەکا، بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئەوە بۆ من ئاشکرایە کە بێ لایەنەکانی وەکوو لۆکزامبۆرگیەکان و بلژیکیەکان بەشێوەیەکی ناشیرین لاکەلەکەی فەڕەنسەیە هەژارەکان هەڵدەماڵن و دەیخەنە ڕوو، و بەم پێیە پێویستە بە وریایەوە هەنگاو بنرێت، وەکوو ئەوە کە هێزەکانی بۆچێ ناشێ لە ناوچەی ڕاینـدا نیشـتەجێ بکـرێن، و ڕێگـە نـەدرێ لـە پارێزگاکـانی ڕایـن سـەربازگیری زۆرەملێـی بێتـە ئاراوە."دووهەمین هەڵبژاردەی فۆچ وڵاتێکی بێ لایەن و نامیلیتاریزە بوو، یان بەشکەم وڵاتانێک، لە ناوچەی ڕایـن. ئـەو هەسـتی دەکـرد کـە دانیشـتوانی ئـەوێ بەشێوەیەکی سرووشـتی مـەیلیان بـە فەڕەنسە زیاتر بووە؛ بە وەختی خۆی، ئەوان بۆیان دەردەکەوێت کە بەرژەوەندی ئـەوان زیـاتر لەوەدایـە کە بەرەو ڕۆژئاوا بڕوانن تا بەرەو ڕۆژهەڵات.٣٧٤

لە ڕاینلەند هێزەکانی فەڕەنسەیی زۆربەی هێزە داگیرکەرەکانیان پێک هێنابوو، و فەرماندەکانی فەڕەنسەیی لەوێ بە تەواوەتی لەگەڵ بیروبۆچوونـەکانی فـۆچ بـوون (وەکـوو مارشـال پیتـەین، کـە لـە شەڕی دووهەمی جیهانیدا هاتبوو تا بە بیرێکی جیاوازترەوە سەیری ئـەڵمانیا بکـات). ژەنـەڕاڵ چارلیز مانگین دەیگوت کە ڕاینلەند هێمای " فەڕەنسەیەکی نەمرە کە بۆ ڕایەکی تر بۆتەوە بە نەتەوەیەکی گەورە." مانگین کە ماوەی کاری خۆی زیـاتر لـە کۆلۆنیـەکانی فەڕەنسـە تێپەڕانـدبوو، هەسـتی بـەوە کرد کە دانیشتوانی ناوچەکە وەک خـەڵکانی خۆمـاڵی دەکـرێ لـەڕێگای ئاهـەنگ، ڕێ و ڕەسـمی مەشـخەڵی، ئاگربـازی و کـۆنترۆڵێکی قـورس دەسـت بگـری بـە سـەریاندا. لەگـەڵ ئەوانەشـدا فەڕەنسەیەکان بە ڕاینلەندیەکان بەڵێنی بەخشینی زێدە مافی ئابووریان دا، و ئەوانیان لـە گـەمارۆدانی بەردەوامی ئەڵمانیا قرتاند.٣٧٥

بۆ چەند مانگێک سـروور و خۆشـی لـە سـاڵی ١٩١٩دا، وادیـار بـوو کـە دەسـەڵاتە بەهێزەکـانی زیـادەخـواز خـەریک بـوون لـەناو زۆربـەی ڕاینلەندیـەکانی کاتۆلیکیـدا دەورووژان، کـە بەگشـتی لـەچوارچێوەی دەسـەڵاتی پڕاشـندا دانـەمرکا بـوون و قـەت ئارامیـان نـەگرتبوو. بـەڵام ئایـا ئـەوان ئامادەبوون خۆیان بخزێننە ناو سووپاکانی فەڕەنسە؟ شارەداری شاری گەورەی کۆلۆن لـە ناوچـەی ڕایـن، سیاسـەتمەدارێکی وریـا و فێڵبـاز، بـۆ میانڕەوەکـان قسـەی کـرد. کـۆنراد ئـەدێنۆر وەک بووکەشووشـە بـە بیروبـاوەڕی جیـاخوازی گاڵتـەی دەکـرد و بەهەنـدی نـەدەگرت بـەڵام لـە وەرزی

بەهاردا وەک بەندێکی دۆڕاو دەستی لێهەڵگرت.٣٧٦ جیاخوازانی توندڕەو وەک کەمینەیەکی بچووک مانەوە.

کلیمینجوو وای لا باش بوو کە بڵێ ئەو نازانێ هێزی سەربازی ئەو دەیانەوێ چی بکەن. لەگەڵ ئەوەش ئەو ڕاستەوخۆ بەرگری ئەوەی لێنەدەکرد کە لەگەڵ جیاخوازان پیلانگێڕی بکات. ئەو بۆخۆی زۆر گوێی نەدەدا بەوە کە ڕاینلەند چۆن بەڕێوە دەچوو، بە مەرجێک کە، بۆ جارێکی تر، نەکرێ بە سەکۆیەک بۆ هێرشکردنە سەر فەڕەنسە. ئەو خوازیاری ئەوە بوو کە داگیرکاری هاوپەیمانی درێژەی هەبێت؛ لە ڕاستیدا، ئەو خوازیاری ئەوە بوو کە تا بەری ڕۆژهەڵاتی ڕاین درێژەی هەبێت تا لە پازگاکان پارێزگاری بکات. ئەگەر ئەو بیتوانیایە گەرەنتی بۆ هێمنایەتی فەڕەنسە دەستەبەر بکا، ئامادە بوو لە داواکاریەکانی تری فەڕەنسە پاشگەز بێتەوە، وەکوو قەرەبووی خەسارەتەکان. ئەو کردیە سەر هاوپەیمانان کە مەرجەکانی ئاشتی وەک پەکێجێک پێکەوە گرێ بدەن. وەک لە مانگی فەوریەدا بە بالفۆری ڕاگەیاندبوو، ئەو خوازیاری ئەوە نەبوو کە مەرجەکانی چەک کردن پێشکەش بە ئەڵمانیەکان بکرێت چون ئەوان هەست بەوە دەکەن ئەوان شتێکیان بۆ نەماوە تا مامەڵەی لەسەر بکەن و بەم پێیە لەمپەر دەخەنە سەرڕێی هەمووشتێک.٣٧٧

پێویست بوو کلیمینجوو بە وریایەوە بەرەو ڕاینلەند وەرێ کەوێت: ڕەخنەگرەکانی لە وڵات بە وردی چاویان تێبڕیبوو. لە ئێلیسێ پالاسەوە، پۆینکارێ هۆشداری دەدا: " دوژمن خەریکە بەخۆی دادێ و ئەگەر ئێمە یەککرتوو و پتەو نەمێنینەوە، هەموو شتێک دەکەوێتە ژێر باری مەترسیەوە." بۆچوونی پۆینکارێ بەو مانایە کە فەڕەنسە دەبێ کۆنترۆڵی ڕاستەوخۆی بە سەر ڕاینلەندەوە هەبێت لە فەڕەنسە بە گەرمی پشتگری لێدەکرا. لە حاڵێکدا کە حکوومەتی فەڕەنسە لە کاتی شەڕدا، لەبەر هۆکارگەلی پرۆپاگەندەییەوە، وردبین بوو لەوە کە ڕاشکاوانە سەبارەت بە لکاندنی پارچەزەویەکانی ئەڵمانیا نەدوێت، دانیشتوانی فەڕەنسەیی بەشێوەیەکی نهێنی کۆڕ و کۆبونەوەیان دادەمەزراند و ئاواتەکانی خۆیان دەخستە سەر پەڕەی کاغەز (بێ ئەوەی هیچ جۆرە چاودێریەک بە سەریانەوە بێت و ڕێگریان بێت). چۆمەکە هەمیشە لەنێوان شارستانیەتی ڕۆژئاوا و شارستانیەتێکی تاریکتر و سەرەتاییتر سنوورێک بوو. ئەوان نووسیبوویان کە فەڕەنسە بە ڕاینلەند شارستانیەتی بەخشی. پێتەختی چارلیمان لەوێ ببوو؛ لۆویسی XIV ئەوێی داگیر کردبوو؛ و سووپاکانی شۆڕشگێڕی فەڕەنسەیی بۆ ڕایەکی تر ئەوێیان گرتبۆوە. (ئەو سەردەمانە دوورودرێژەی کە ڕاینلەند لەژێر دەسەڵاتی شازادەکانی ئەڵمانی-ئاخێوەر دابوو بەخێرایی هاتن و تێپەڕین.) لە ڕاستیدا خەڵکی ڕاین بە جین[gene] و بە دڵ فەڕەنسەیی بوون. خولیای شەرابی چاک بوون، جۆی دی ڤیڤیری

ئەوان، بیروباوەڕی کاتۆلیکی ئەوان (هەروەک نووسەرانی دژە ئاخووندی فەرەنسەیس ئاماژەیان پێدەکرد) هەموویان بەڵگە بوون لەسەر ئەم ڕاستیە. واز لە پڕاسنەکان بێنن، و ڕاینلەند دەگەڕێتەوە سەر سرووشتی فەرەنسەیی و ڕاستەقینەی خۆی. و — ڕەنگە ئەم وت و وێژە لە هەمووی بەڵگەکانی تر چەسپێنەرتر بوو- ڕاینلەند قەرەبوویەکی باش بوو لەبەرانبەر زیان و زەرەرەکانی فەرەنسە.٣٧٨

ئەمەریکیەکان متەقیان لێوە نەهات. کۆڕی ئاشتی، نەوەک ڕاینلەند، کێشەکانی هێمنایەتی فەرەنسەی چارەسەر دەکرد. وەک هاوس کە ئاماژەی پێکرد، " ئەگەر دوا دامەزراندنی کۆمەڵەی گەلان، ئێمە ئەوەندە گێل بین ڕێگە بدەین بە ئەڵمان سووپایەکی بەهێز باربێنێ و چەکداری کا و بۆ جارێکی تر ببێ بە وەیشوومە و مەترسی بۆ سەر جیهان، ئێمە شیاوی چاەنووسێکین کە گەوجی وا بە سەر ئێمەدا دەیسەپێنێ." لیۆد جۆرج هیچ بڕیارێکی ڕانەگەیاندبوو. لەوانەیە ڕاینلەند ڕێگەی بدرێتێ ببێ بە وڵاتێکی گچکەی بێ لایەن. بە واتایەکی تر، ئەو نەیدەویست ئالساسێ-لۆرەینێکی تازە دامەزرێنێت تا بۆ بەرەیەکی تر ئاشتی جیهان بشڵەژێنێت.٣٧٩

مەقاماتی ڕەسمی فەرەنسەیی پلانی جۆراوجۆر و داهێنەرانەیان لە مێشکدا بوو: داگیرکردنێکی هەتاهەتایی لەلایەن هێزەکانی هاوپەیمانیەوە؛ یەکیەتیەکی گومرکی لەگەڵ فەرەنسە کە ڕاینلەندی لەباری تەکنیکیەوە لە ئەڵماندا دەهێشتەوە؛ پلانێک بۆ کردنی ڕاینلەند بە بەشێک لە فەرەنسە لەباری میلیتاریەوە و بەشێک لە ئەڵمان لەباری یاسایەوە. هەندێک خەیاڵی زۆر سەیریان لە مێشک دابوو. وەزیری دەرەوەی فەرەنسە ئەیوت کە " بۆ مەبەستی سەقامگیرکردنی ئاشتیەکی هەتاهەتایی بۆ ئورووپا، پێویستە هەوڵی بیسمارک پووچەڵ بکرێتەوە، کە ئەڵمانێکی دامەزراند بەبێ یاساکانی ئەخلاق و ڕەوشبەرزی، ماشێنێکی نیزامی، بۆرۆکراتیک، مێتۆدی بۆ مەبەستی جەنگ، کە پڕاشای لێکەوتەوە، کە وەک سووپایەک کە نەتەوەیەکی هەبێت پێناسەی بۆ کراوە."٣٨٠ دیتنی باڤاریایەکی سەربەخۆ بۆ جارێکی تر، ساکسۆنیەک، بەگشتی پڕاشایەکی سزادراو، لە ناوەندی ئورووپادا خەوە ناخۆش و ترسێنەرەکانی فەرەنسیەکانی دەرەواندەوە.

کلیمینجوو بۆخۆی ڕیالیستیتر بوو. ئەو دڵنیا بوو لەوەیکە ئەڵمانیا زیندوو دەمایەوە و فەرەنسەش مەجبور دەبێت لەگەڵی دانووستان بکات. ئەو نەیدەتوانی ئەوە لەبیر بکات کە هێمنایەتی داهاتووی فەرەنسە چەندە بەسرابوو بە هاوپەیمانەکانیەوە هەر ئەوەندەش بە هەوڵەکانی خودی خۆیەوە. ڕاینلەند تەنیا پارچەیەک بوو لەو زەویانەی کە فەرەنسە خوازیاریان بوو. ئەگەر ئەو لەپێناو بەدەست هێنانیدا وەخۆ کەوتایە، ئایا هاوپەیمانەکانی لە خەسارەتەکاندا پشتیان دەگرت؟ ئایا ئەوانیش لە چەک کردنی ئەڵماندا ئەوەندە خۆیان بە هاوخەم دەزانی؟ ئەو شتانەی کە لە مێشکی دابوو و ئەو مانۆڕانەی کە

دەیدا بە تەواوەتی بۆ کەس نەناسرابوون، و ئەمە هەر ئەوە بوو کە خۆی دەیویست. کاتێکە وەزیری دەرەوەی فەرەنسە هەوڵی دا کورتەیەک لە دانووستانەکانی ساڵی ١٩١٩ لەسەر ڕاینلەند چەند ساڵێک دواتر ئامادە بکات، نەیدەتوانی تەنانەت تاقە بەڵگەیەکیش لە فایلەکانیدا بدۆزێتەوە.٣٨١ کلیمینجوو بەرلەوەی کۆچی دوایی بکات زۆربەی وتارەکانی خۆی لەبەین برد.

لە مانگەکانی سەرەتای کۆڕی ئاشتیدا، کلیمینجوو ئەوەی لە دەستی هات بۆ دارشتنی بناخەی نیازچاکی لەنێوان هاوپەیمانانی خۆی لەڕێگای هاریکاری و پێکەوەدانیشتن کردی، بۆ وێنە، لە کۆمەڵەی گەلاندا. ئەو لە شۆڕای عالیدا لەسەر ڕاینلەند بێدەنگ بوو، ئەو سەبارەت بە ئالتێراتیڤەکانی پێوەلکانی ڕاشکاوانە یان وڵاتێکی سەربەخۆی ڕاین هەستی لە هاوپەیمانەکانی ڕاگرتبوو. ئەو لەنێوان ئەمەریکیەکاندا، بەتایبەت لەلایەن هاوسەوە هەستی بە هەندێک هاوخەمی کردبوو. ئەو هەستی دەکرد کە فایەق بوون بەسەر بەریتانیەکاندا دژوارتر بێت. وادیاربوو ئەو بەر لە کۆچی ویلسۆن بۆ وڵاتەیەکگرتوەکان لەگەڵی قسەی نەدەکرد. بە قەولی لیۆد جۆرج، بە ناشارەزاییەک کە لە بواری جۆگرافیادا هەیبوو، " پڵنگی پیر خوازیاری گەڕانەوەی ورچی بۆر بو لە شاخەکانی ڕاکی بەر لەوەی دەست بکات بە هەڵوەشانەوەی یەکانەی ئەڵمان!"٣٨٢

*　　*　　*　　*

لە ٢٥ی مانگی فەوریەدا، ئاندری تاردیۆ، یەکێک لە نوێنەرانی ڕەسمی فەرەنسەیی ، لە کۆتاییدا ڕاگەیاندنێکی فەرمی لەسەر ڕاینلەند بۆ کۆڕی ئاشتی پێشکەش کرد. ئەوە نواندنی سەرنجڕاکێشی هەمیشەیی ئەو بوو. تاردیۆ، کە لە بنەماڵەی نەخشەهەڵکەنانی پاریس بوو، ڕووناکبیرێکی هەڵکەوتە (ئەو لە ئیلیت ئکۆلی نۆرمالی سووپیریەر یەکەمی کلاسەکەی بوو)، دیپلۆمات، سیاسەتمەدار، و ڕۆژنامەنووس بوو. لە ساڵی ١٩١٧دا، کلیمینجوو ئەوی وەک نوێنەری تایبەتی خۆی بۆ وڵاتەیەکگرتوەکان نارد. ئەو هەتا بڵێی زیرەک، بەتوانا و لەدڵەوەنزیک بوو. لیۆد جۆرج نەیدەتوانی ملی بۆ شۆڕ کات، و ویلسۆن هەرگیز ئەوی لەبەرهۆی پێوەندیەکانی نزیکی لەگەڵ کۆماریەکان لە واشنگتۆن نەبەخشی. کلیمینجوو فەخری پێوە دەکرد و بە قەد هەمووی ئەوانی تر متمانەی پێی هەبوو. لەگەڵ ئەوەش زۆر چاک ئەوی خستبوە ژێر چاوەدێری خۆیەوە. کاتێکە ترادیۆ لە کۆبوونەوەیەکی کۆڕی ئاشتیدا هەڵەیەکی کرد و لەبەردەمی ئەو ڕاوستا و ڕووبەڕووی بۆوە، کابرای پیر توند مستێکی دا بە مێزەکەدا. " سیئیل ڤاوس پلایت، مۆنسیەر." تاردیۆ لە ڕق هەستاوی خۆیدا نەیدەزانی چی بکا و بەدزیەوە گەڕایەوە سەر کورسیەکەی خۆی، بەڵام نەیدەوێرا وڵامی بداتەوە.٣٨٣

یادداشتەکەی تاردیۆ تایبەت بە ٢٥ی فەوریە، کە لەبابەت دەستوورەکانی کلیمینجووەوەیە، داوای کۆتایی هێنان بە سنوورەکانی ڕۆژئاوای ئەڵمانی لە ڕاین دەکرد و داوای ئەوەی دەکرد کە هێزەکانی هاوپەیمانی بۆ هەتاهەتایە پاسگاکان داگیر بکەن. ئەو لەسەر ئەوە پێداگری دەکرد کە فەڕەنسە لە لکاندنی هەر بەشێک لە ناوچەکانی ڕاینلەند هیچ قازانجێک نابات، بەڵام تاردیۆ ئاماژەی بەوە نەکرد کە ئەی چۆن بەڕێوە دەچێت. لەلایەن هاوپەیمانانی فەڕەنسەوە وڵامێکی قورس بەمە درایەوە. لیۆد جۆرج وتی کە " ئێمە ئەوەمان وەک خەیانەتێکی ئاشکرا و نادرووست بە یەکێک لە یاسا بنەڕەتیەکان سەیر کرد کە هاوپەیمانان خەباتیان بۆ کردبوو، و لە کاتی قوربانیداندا بۆ خەڵکی خۆیان بانگەشەیان بۆ کردبوون." وەک ڕیالیستێک، لێرەشدا ئاماژەی بەوەکرد کە هەوڵدان بۆ دابەشکردنی ئەڵمانیا پێدەچێ لە درێژخایەندا وڵامدەر نەبێت؛ " لە هەمان کاتیشدا دەبێتە هۆی ناکۆکیەکی بێ بڕانەوە و لەوانەشە هەڵگیسێنەری شەڕێکی تازە بێت." ویلسۆن لە وڵاتەیەکگرتوەکان بە هەمان شێوە ئەویش لەسەر ئەم تەوەرە سوور بوو. ئەو بە گرایسانی ڕاگەیاند کە " ئەمە ئارەزووی خەڵکانێک نیە کە لە ڕەوشتدا ئەڵمانین. هەڵاواردنی ئەم ناوچەیە لە ئەڵمان قینەبەرایەتی لێدەبێتەوە و شەڕێکی تازەی لە سەرتاسەری ئەڵماندا لێ هەڵدەگیرسێ کە هاوچەشن دەبێت لەگەڵ قینەبەرایەتیەک کە لەلایەن فەڕەنسەوە هەستی پێدەکرێت دژ بە ئەڵمانیا لەسەر پارێزگا دۆڕاوەکان." سەرۆک کۆمار بە هاوس دەستووری دا کە سەبارەت بە ڕاینلەند هیچ بەڵێنێک بە زاریدا نەیەت. کاتێکە بۆ پاریس گەڕایەوە ئەو بۆ خۆی لەگەڵ کێشەکە ڕووبەڕوودەبێتەوە.٣٨٤

لە هەوڵێکدا بۆ بەستنی ڕێکەوتنامەیەک لە بەینی خۆیاندا، لیۆد جۆرج، کلیمینجوو و هاوس لێژنەیەکی نهێنیان دروست کرد بەرلەوەی گەمیەکەی ویلسۆن بگاتە حەوزی پاپۆڕەکە. تاردیۆ، کە نوێنەرایەتی فەڕەنسەی دەکرد، ئێستا وای لێهاتبوو کە ڕاشکاوانە داوای وڵاتێکی ڕاینی سەربەخۆی دەکرد. ئەو وتی کە " فەڕەنسە هەرگیز قایل نابێت مەگین لە داووپاتنەبونەوەیەکی ساڵی ١٩١٤ دڵنیا بکرێتەوە و ...ئەم دڵنیایە تەنیا بە دارشتنی سنوورێک بە درێژایی ڕاین دەتوانرێ ببەخشرێت. فەڕەنسە مافی خۆی بوو چاوەڕوانی ئەوە بکات کە ئەگەر بڕیار وایە شەڕێکی تر بێتە ئاراوە، ئەوە نابێ لەسەر خاکی فەڕەنسا ڕووبدات." کێر وەڵامی دایەوە کە بەریتانیا ناتوانێ نە جیابوونەوەی ڕاینلەند لە ئەڵمانیا ببینێت و نە نیشتەجێکردنی هەتاهەتای هێزەکان لەوێ. ڕای گشتی بەریتانیەکان دژ بە ئەوە بوو؛ حکوومەتە دەسەڵاتدارەکانیش هەروا، کە نەدەکرا ئارەزووەکانیان بخرێنە پشت گوێ. بە واتایەکی تر، ئەگەر ئەڵمانیا بۆ ڕایەکی تر هێرشی بهێنایە هێزەکانی بەریتانی بۆ یارمەتیدانی

فەڕەنسە خۆیان دەگەیاند. تاردیۆ ئاماژەی بەوەکرد کە لەوانەیە ئەوان بە وەخت خۆ نەگەیەنن. (فەڕەنسەیەکان پێشنیاری لیۆد جۆرجیان بۆ درووست کردنی تونێلێک لەژێر چانێل دا زۆر بە هەند نەگرت.) نوێنەری ئەمەریکی زۆر کەم نوتق بوو. وت و ویژەکان شتێکی بەکەڵکیان لێنەکەوتەوە.٣٨٥

* * * *

کاتێکە ویلسۆن ڕاستەوخۆ لە پاریس گەڕابۆوە دواوە، پێشکەوتنێکی بەرچاو لەبابەت بەندەکانی میلیتاری گرێبەستی ئەڵمانیا هاتبوونە ئاراوە، بەڵام سنوورەکانی ئەڵمانیا، وەکوو ڕاینلەند، دیاری نەکرابوون و پرسی فێڵاوی قەرەبووکردنەوەکان هەروا بە هەڵواسراوی و بێ چارەسەری مابوونەوە. کاتێکە پاپۆڕەکەی ویلسۆن لە ئێوارەی ١٣ی مانگی مارسدا گەیشتە برێست، هاوس هاتە خوارێ تا چاوی پێی بکەوێت. ئەو هەواڵی دڵساردکەرەوەی پێ بوو. تەنیا پووختەی گرێبەستی ئەڵمانی پێبو.

کۆلۆنێل هەستی کرد کە ئەو بەو ئاسانیە توانیویەتی بە سەرۆک کۆمار دەستور بدات. خاتوو ویلسۆن و لایەنگرەکانی کە قەت هاوسیان خۆش نەدەویست، ڕایان گەیاند کە سەرۆک کۆمار بەجاریک لەرز دایگرت. ئەو[خاتوو ویلسۆن] بیست ساڵ دوا ئەو ڕووداوە گێڕایەوە کە "ئەو دەتکوت تەمەنی دە ساڵانە. کاتێکە هەوڵێ زۆری دا خۆی کۆنترۆڵ بکات چەنەگەی شێوەی چەنەگەی دەساڵانێکی بەخۆیەوە گرت." بە بۆچونی خاتوو ویکسۆن ئەو بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە " هاوس هەموو ئەو شتانەی کە من بەرلە چۆڵکردنی پاریس بردبوومەوە ئەو بە بای دا." گرەیسۆن دواتر بە کەیفی خۆی شتی پێوە نا: سەرۆک کۆمار تۆقابوو لەوە کە زانیبووی هاوس نەک تەنیا ڕەزیەتی دابوو بە دامەزراندنی کۆمارێکی جیاوازی راین بەڵکوو لە پلانی نەگریسی بەریتانیەکان و فەڕەنسەیەکان بۆ دەستەکەم گرتنی کۆمەڵەی گەلان بە هێنانەدەرێی پەیماننامە لە گرێبەستی ئەڵمانیدا دەستی هەبوو. هاوس هیچ کامێکیانی نەکردبوو، بەڵکوو تەنیا گومانی ویلسۆنیان ورووژاندبوو، و ئەوانەی کە بە دەوریەوە بون خۆشحاڵ بوون لەوەکە ئەوان زیندوو ڕادەگرن.٣٨٦

ئێمە قەت نەمانزانی ئەو شەوە لەنێوان سەرۆک کۆمار و پیاوێکە ئەو کاتی خۆی ناوی نابوو لقێک لە خۆی چی ڕوویدا، بەڵام ئاشکرا بوو کە لە پێوەندی دۆستایەتی ئەوان درزێک دەرکەوتبوو. ئەوان بەردەوام چاویان بە یەکتر دەکەوت و هاوس بەردەوام بوو لە کارکردن بۆ سەرۆک کۆمار، بەڵام دەنگۆی ئەوە هەبوو کە ئەو چیتر گوێڕایەڵی سەرۆکی خۆی نیە. بە بۆچوونی لیۆد جۆرج کێشەی سەرەکی دواتر، لە مانگی ئاڤریلدا، هاتە ئاراوە کاتێکە ئەو، کلیمینجو و هاوس لە ژوورێکی تردا لە کریلۆن کۆبوونەوە. هاوس لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە زۆر کێشەکە بە هەند نەگرێت، ئەم کەرەتەیان لەنێوان ویلسۆن و ئیتالیەکان لە سەر داواکاریەکانی ئیتالیا لە ئاندریاتیک. سەرۆک کۆمار بە شێوەیەکی چاوەڕوان

نەگراوانە لاقی دەهێنا ژوورەوە و دیاربوو کە هەستی دەکرد لە پشت ئەوەوە شتگەلێک ڕوویان دەدا. لیۆد جۆرج ئەیوت کە " ئەو لانی کەم پێوەندیەکی ئاسمانی هەبوو؛ ئەو بتێکی چاوپیس بوو؛ و بە لەبەرچاونەگرتنی ئەرکێک کە لە سەر شانی ئەو بوو هاوس ئەو لایەنەی لە بتەکەی خۆی لەبیر کردبوو و بەم چەشنە تووشی تاوانێک هاتبوو کە بۆوە نەدەبوو لێی خۆش بێت."٣٨٧

ئەوەی کە هاوس شیمانە دەکرێ لە برێست کردبێتی پێشنیارێک لەلایەن فۆچەوە، لەناو کەسانیتردا، بەگوێی ویلسۆندا دەچەپێنێت بۆ مەبەستی پێشکەشکردنی گرێبەستی سەرەتایی بە ئەڵمان هاوڕێ لەگەڵ مەرجەکانی میلیتاری و لەوانەیە هەندێک مەرجی ماڵیش، و کێشە ئاڵۆزەکانی وەک سنوورەکان و قەرەبووەکان بۆ دواتر بمێننەوە. ویلسۆن هەر کە گەیشتەوە ئەوەی بە گوێ گەیشت. ئەو زوو هەستی کرد کە پیلانێک لە ئارادایە بۆ پەکخستنەوەی پەیمانی کۆمەڵەی گەلان. لە ١٥ی مانگی مارسدا ئەو "زۆر ڕاشکاوانە" بۆ لیۆد جۆرج و کلیمینجوو قسەی کرد. " زۆر پرسیاری پێوەندیدار لە ئارادابوون کە پێویستە بگەڕێندرێنەوە بۆ کۆمەڵەی گەلان کاتێکە درووست بوو واتە دامەزراندنی ئەو کۆمەڵەیە پێویستە یەکەمین ئامانج بێت، و ئەوەکە ناکرێ هیچ گرێبەستێک لەسەر ئەوە ڕێبکەوێت تەنیا پێوەندی دەبێت بە بابەتەکانی میلیتاری، دەریایی و ماڵی." ویلسۆن لە کۆڕی ئەو دوانیوەڕۆیەی شۆڕای عالی بەشداری نەکرد، کە بۆ مەبەستی پەسەندکردنی مەرجەکانی میلیتاری سازدرابوو؛ ئەو دەیکوت کە پێویستی بە کات هەیە تا ئەوان بخوێنێتەوە. ژەنەراڵی بەریتانی هێنری ویلسۆن وتی "ڕەفتاری ناشیرین بەوە دەڵێن". دوو ڕۆژ دواتر کاتێکە پرسیارەکە خرایە بەرباس، سەرۆک کۆمار لەوە تێفکریبوو کە مەرجەکە ڕووبەڕووی سووپایەکی فیداکەری ئەڵمانی بکاتەوە. لیۆد جۆرج کە بە دواخستنەکە ڕقی هەستابوو لەولامدا هەڕەشەی کرد کە ئەو پەیمانی کۆمەڵەی گەلان پەسەند ناکات. مەرجەکان پەسەند کران.٣٨٨

ئەڵمانیا شتێکی نزیکتر بە هێزێکی پۆلیسی تا سووپایەک پێبڕا هەروەک تەنانەت هاوپەیمانانیش دانیان پێدانابوو. کاتێکە بەڵێنی کەمکردنەوە لە هەمووی سووپاکاندا لە ساڵانی دواتردا بە کردەوە دەرنەهاتن، قەڵسبوونی زیاتری بەریتانیەکان سەبارەت بە گرێبەستی ئەڵمانی، و تووڕەیی ئەڵمانیەکانی بە دواوە بو. بە سووپایەکی ١٠٠،٠٠٠ کەسیەوە و هێزێکی دەریایی ١٥٠٠٠ کەسی و بەبێ هیچ هێزێکی هەوایی، تانک، ماشێنی زرێپۆش، چەکی قورس، کەشتی ئاسمانی یان ژێردەریایی، دەبوایە ئەڵمان پێگەیەکی پێبدرایە کە تێیدا نەیدەتوانی پارەی شەڕێکی هێرشبەرانە دەربێنێت. زۆربەی پاشەکەوتەکانی چەک و تەقەمەنیەک کە لە بەردەستی دابوو، و هەمووی ئەو قەڵا و سەنگەرانەی کە لە ڕۆژئاوای ڕاین و بە درێژایی

قەراخئاوەکانی خۆی لە بەردەستی دابوو، دەبوایە هەپروون بە هەپروون کرابان. تەنیا چەند کارخانەیەک لە ئەڵمانیا ڕێگەیان پێدەدرا کەرەسەی شەڕ درووست بکەن، و هاوردەکان بەگشتی قەدەغە بوون. بۆ دڵنیابوون لەوە کە ئەڵمانیا بە دزی و بە نهێنی سەربازی بارنەدەهێنا، خزمەتگوزاریەکانی گشتی، وەکوو پۆلیس، دەبوایە لە ئاستەکانی پێش-شەڕدا بمایەتنەوە، و کۆمەڵگا نهێنیەکان- بۆ وێنە، یانەکانی گەشتیاری یان ڕێکخراوەکانی جەنگاوەرانی کۆن- ڕێگەیان پێنەدەدرا هیچ شێوازێکی میلیتاری بەکار بێنن. لە قوتابخانەکانی دواناوەندی ئەڵمان و زانکۆکان، چیتر قوتابیان نەدەبوون بە کادێت[ قوتابی ئاکادیمیای سەربازی]. هەمووی ئەمانە لەلایەن خودی ئەڵمانیەکانەوە پشتگری دەکران، لەلایەن کۆمیسیۆنێکی نێوان-هاوپەیمانی تایبەت بە کۆنترۆل چاودێری دەکران. کە سەیری ڕابردوو دەکەی وەک تەنافەکانی لیلی پووتیەکان بە سەر گۆلیڤێردا دێنە بەرچاو.٣٨٩

کێشەکانی تایبەت بە مەرجەکانی میلیتاری هێشتا کۆتاییان پێ نەهاتبوو. ویلسۆن ئێستاکوونێ خۆی لە شەڕێکی قورسدا دەبینیەوە لەگەڵ بەریتانیەکان لەسەر مەرجەکانی دەریایی، شەڕێک کە ڕەنگدانەوەیەک بوو هەم لە ڕکابەرەکانی کۆنتر و تازەتر کە خەریک بوون گەشەیان دەکرد کاتێکە وڵاتەیەکگرتوەکان بو بە زلهێزێکی دەریایی جیهان. وەک هۆکاری سەرەکی، وەزارەتی دەریایی بەریتانیا بە ئاواتەوە بوو کانالی کیەل لەبەین بەرێت، کە بالتیک و دەریایی باکووری پێکەوە گرێ دەدا و بەم چەشنە ڕێگەی دەدا بە ئەڵمان تا تەنانەت کەشتیە زەبەلاحەکانی خۆی بخاتە گەڕ بەبێ ئەوەی لەڕێگای کۆپێنهاگنەوە بیانبێرێتە ناو دەربەندەکانەوە. ئەدمیراڵەکان لەوە دەترسان کە بەرژەوەندیەکانی تجاری کەشتیرانی و حکوومەتی ئەمەریکی لەوانەیە دەنگی نارەزایەتیان بەرزبێتەوە و بە ناهەقیش نەدەترسان. ئاڵتێرناتیڤی بەدەستەوەدانی کاناڵ بە دانیمارکیەکان شتێک بوو دوور لە ڕاستی؛ ئەوان خولیایی گلێنەیەکی ژەهراوی لەو چەشنە نەبوون. باشترین ڕێگا ئەوە بوو کە لەژێر کۆنترۆڵی ئەڵمانیا بێتە دەرێ و ڕێگە بدرێ بە کەشتیەکانی هەموو وڵاتان تاکوو کەڵکی لێوەرگرن. ئەمەریکیەکان بەوەش تەنانەت نارازی بوون. ئەدمیراڵ ویلیام بێنسۆن، نوێنەری هێزی دەریایی ئەمەریکا و سەرۆکی ئۆپەراسیۆنەکانی دەریایی، وتی کە " ئەوە هەوڵێکی سزادەرانەیە". ئەمەریکیەکان بە هێنانی کاناڵی تازەی پاناما بۆ ژێر ڕکێفی خۆیان، نەیاندەویست بۆ بەڕێوەبەرایەتی جیهانی ڕێگائاویەکان نموونەیەکی وەکوو خۆیان پەیا بێت. لەگەڵ ئەوانەشدا بێنسۆن بەگشتی لەبەرانبەر سەپاندنی مەرجی سەخت و توند بە سەر ئەڵماندا دژایەتی دەکرد، کە ئەو لای وابوو ئەمە وڵاتەیەکگرتوەکان والێدەکا کە بۆ ئەوەی زەخت کاتە سەریان هەوڵ و تەقەلایەکی لەڕادەبەدەر بخاتە

کار. ڕێکەوتنامەکە، کە دواتر ڕەنگ و بۆی گرێبەستێکی بەخۆیەوە گرت، هەروائاسان ڕێگەی بە هەمووی ئەو وڵاتانە کە لەگەڵ ئەڵمان لە ئاشتی و تەبایی دابوون دا تا ئازادانە لەوێوە تێپەڕن.٣٩٠.

ئەمەریکیەکانیش سەبارەت بە پێشنیارەکانی بەریتانیەکان بۆ هێرش کردنە سەر سەنگەرەکان و قەڵاکانی ئەڵمانیا بە درێژایی قەراخئاوەکانی ئەو وڵاتە گومانی هاوچەشنیان هەبوو. گلەیەک کە لانسینگ هەیبوو ئەمە بوو کە "کەل و پەلەکانی سەربازی ڕووڵە کەم بوونەوە بوون. کەوایە بۆدەبێ ئەڵمانیا ڕێگەی ئەوەندەی پێنەدرێ لە قەراخ ئاوەکانی خۆی پارێزگاری بکات؟" لیۆد جۆرج ڕێگەچارەیەکی بە مێشک داهات؛ قەڵاکانی بەرگریکەر قەبووڵە، بەڵام قەڵای دژبەر نا. لەکۆتاییدا بڕیاردرا کە هەمووی قەڵاکانی ئەڵمانی بەشێوەیەکی گونجاو و لەبار بەرگریکەر بن بێجگە لەوانەی کە بەڕاستی لەژێر چاوەدێری بەریتانیەکاندا بوون.

لە دەرەوە لە دەریای باکوور دوو دوورگەی بچووک نزیک بە ئاستی دەریا هەڵکەوتبوون، هێلیگۆلەند (هێلگۆلەند) و دوونی، کە بەریتانیا لە ساڵی ١٨٩٠ بە ئەڵمانیای بەخشیبوو، لە مامەڵەیەکی باشدا، لەبەرانبەر زانزیبار. بەداخەوە، کات فرۆکە، ژێردەریایی و چەکی دوور-هاوێژ- و ڕکابەری دەریایی ئانگلۆ-ئەڵمانی درووست کردبوو. ئەو پەڵەزەویانەی کە بێ کەڵک مابوونەوە کران بە قەڵا و سەنگەری بەهێز. وەزارەتی دەریایی ڕێگاچارەیەکی زۆر سادەی هەبوو: یەکێک لە ئەدمیراڵەکان ئەیوت کە " پێویستە کلیلی کونی سەگی هار لە گیرفانی خۆمان دابێت چون مەعلووم نیە کەی چوارپێی شڕ و دڕ هێرشێکی تری نەخۆشی هاری دەگرێت." ئەگەر ئەمەریکیەکان ناڕازی بوونایە، یەکێک لە ڕێگاکان ئەوە بو کە هەرکیان لەت و پەت کرێن. سێر ئێدوارد گرەی یەک-چاو کە خانەنشین ببوو و لە ئینگلەند دەژیا پێشنیارەکەی خۆی پێشکەش کرد، تا هێلیگۆلەند بکا بە حەشارگەیەک: " لەبەر هەندێک هۆکار، ئەگەر لەڕووی ئینسافەوە قسە بکەین، ئەم شوێنە دڵتەنگ و قاقڕە شوێنی حەوانەوەی بلوێنان باڵندەی کۆچبەرە." کلیمینجوو پێشنیاری کرد کە لەبەرچی بە هاچەکانی ئۆستراڵیا نەبەخشرێت؟ هەڵوێستی کۆتایی بەریتانیەکان، کە فەرەنسەیەکان پشتگیریان لێدەکرد، ئەوە بوو کە تەنیا قەڵاکان و بەندەرەکان دەبێ لەبەین بچن. سەرۆک ویلسۆن بە تەواوەتی ڕازی بوو بە لەبەینچوونی قەڵاکان لە سەر دوورگەکانی هێلیگۆلەند و دوونێ، بەڵام ئەو واهەستی دەکرد کە لەبەینبردنی شەپۆل شکێنەکان لەڕوانگەی مرۆڤایەتیەوە بابەتێکی هەستیارە، وەکوو ئەوانەی کە بۆ پاراستنی گیانی ماسیگرەکان لەبەرانبەر لافاودا حەشارگەیان بۆ درووست کردن." ئەو ئاماژەی بەوەش کرد کە ئەو نەیدەویست بەبێ هۆ شوێنەواری توندوتیژیەک دابنێت." بە بۆچوونی بەریتانیەکان ماسیگرەکان

دەیانتوانی لە بەندەرە سرووشتیەکاندا بە ئاسانی حەشارگە بدۆزنەوە. بەریتانیەکان لەمەدا ڕێگەی ئەوانیان گرتەبەر، بەڵام دوورگەکان هەر ئەڵمانی مانەوە. لە ساڵەکانی دەیەی سیدا ۱۹۳۰، ئەوکاتەی کە نازیەکان دەسەڵاتیان بە دەستەوە بوو، قەڵاکان ئاوەدان کرانەوە، تەنیا بۆ ئەوەی بۆ ڕایەکی تر دوا شەڕی دووهەمی جیهانی تێک و مەکان بدرێنەوە.[۳۹۱]

کاتێکە باسی ژێردەریایەکانی ئەڵمانیا دەهاتە ئاراوە، بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان خۆیان لە یەک بەرەدا دەدیەوە. کاتیکە بابەتەکە خرایە بەرباس لیۆد جۆرج وتی کە " پێویستە ئەم بەڵایانە لەکۆڵ خۆمان بکەینەوە." ئەمیندارى ئەمەریکی هێزی دەریایی، ژۆسیفووس دانیلس، بۆ جەماوەرێکی زۆر قسەی دەکرد کاتێکە ئەوانی بە گازی ژەهراوی شوبهاند: " من ڕام وایە کە ژێردەریایەکان پێویستە نووقمی ئاو بکرێن و چیتر لەلایەن هیچ وڵاتێکی ترەوە دروست نەکرێن، ئەگەر و کاتێک کە کۆمەڵەی گەلان بوو بە حەقیقەتێک." فەڕەنسەیەکان و ئیتالیەکان بەوە ناڕازی بوون. وەزیری دەریایی وڵاتی فەڕەنسە وتی کە " هیچ جۆرە چەکێک ناتوانێ خائین بێت. بەڵکە خەیانەت لە شێوازێک دایە کە ئەو چەکە بەکاردەبرێت." ئەگەر ژێردەریایەکان لەبەین چوونایە، ئەوان خوازیاری بەشێک لە کارەکە و سوودێک لە پاشماوەکان دەبوون. لە کۆتاییدا، هێزی زەریایی فەڕەنسە دەستی بەسەر ژێردەریایەکاندا گرت؛ ئەوەی کە ماوە هەموو تێکشکێنران.[۳۹۲]

گرژی ڕاستەقینەی نێوان بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان لەسەر پاپۆڕەکانی سەرئاوی ئەڵمانیا بوو. هەر لە سەرەتاوە هەرکیان بۆچوونێکی هاوچەشنیان گرتبوە بەر: ئەدمراڵەکانی ئەوان ئەوانیان نەدەویست؛ خستنی ئەو هەموو پاپۆڕە بۆ سەر ناوگانەکانیان و دابینکردنیان کارێکی ئەستەم و خەرجهەڵگربوو. هەرچەند ویلسۆن لەبەینبردنی پاپۆڕەباشەکان بە یەکجاری بە کارێکی بێ ئەقڵانەی دادەنا، لیۆد جۆر پێی خۆش بوو هەر لە ناوەڕاستی ئاتلانتیکدا بەشێوەیەکی تەدارەکاتی نووقمی ئاویان بکات. فەڕەنسەیەکان و ئیتالیەکان ناڕازی بوون. ئەدمیراڵێکی فەڕەنسەیی وتی کە فەڕەنسە هەمووی سامانەکانی خۆی لە سەر بردنەوەی شەڕ لەسەر وشکی دانابوو. " هێزی دەریایی ئێمە تووشی زیان و زەرەرێکی قورس هات کە ناکرێ بەو هاسانیە قەرەبوو بکرێنەوە، کەچی کەشتیەکانی هاوپەیمانانی ئێمە تا ڕادەیەکی بەرچاو ژمارەیان چوە سەرێ." بە بۆچوونی ئەو دابەش کردنی کەشتیەکان باشترین کارە. ژاپۆنیەکانیش بە شەرمەوە پێشنیاریان کرد کە ئەوانیش لەوانەیە چەند دانەیەکیان پێببرێت.

بەریتانیا بەنیاز بوو لە سەرەتای مانگی مارسدا واز لە دەمەقرێکردن بێنێ کاتێکە هاوس بە لیۆد جۆرجی ڕاگەیاند کە وڵاتەیەکگرتوەکان ناتوانێ پەرەسەندنی زیاتر لە هێزی دەریایی بەریتانیا

قەبووڵ بکات. دابەشکردنی کەشتیەکانی ئەڵمانی لە مێشکی ڕاوێژکاری سەرسووڕماو و لەئینگلیزی ترساوی هێزی دەریایی ئەمەریکی زەنگی مەترسیداری لێدابوو. ئەدمیراڵ بێنسۆن ئاماژەی بەوە کردبوو کە دابەشکردنەکە چ لەسەر بنەمای یارمەتیدان بە هەوڵی شەڕ یان لەسەربنەمای زیان و خەسارەتەکان، بە هەر بارێکدا لێک بدرایەتەوە بەریتانیا زیاترین بەشی دەبرد. لە داهاتوودا تەنیا ڕکابەری هێزی دەریایی ئەو وڵاتە یەکگرتووەکان دەبێت، و هەر کەشتیەک کە لەلایەن بەریتانیای گەورەوە درووست دەکرێت یان دەستبەسەر دەکرێت دەتوانێ تەنیا کەشتی ئەمەریکی لە مێشکدابێت." ئەو موقناع بوو لەوە کە بەریتانیا سوورە لەسەر ئەوەکە باڵ بە سەر دەریاکانی جیهان و تجارەتی جیهان داکێشێ.٣٩٣

لیۆد جۆرج کەوتە هەوڵی ئەوە کە بە خستنەبەرباسی یەکێکی تر لە سێحرەکانی خۆی لەو گرژی و ئاڵۆزیە کەم کاتەوە: کەشتیەکان دەهێنرێنە دەرەوە، بەڵام وڵاتەیەکگرتووەکان و بەریتانیا دەچنەپێشێ و هینەکانی خۆیان نوقمی ئاو دەکەن. ئەو لەوانەیە لەڕووی بێ ئاقڵیەوە ئەمەی گریدابێ " بە تێگەیشتن لەوە کە ئیمە نابێ لە داهاتوودا بچینە ژوری ڕکابەری دژ بە یەکتر." دەنا هێزی دەریایی بەریتانیا زۆر بەئاسانی دەچێتە پێشێ و بەشی خۆی لە کەشتیەکانی ئەڵمانی وەردەگرێت. لەپشت پێشنیارەکەی ئەو دڵەڕاوکێی بەریتانیا سەبارەت بە دەستدرێژی بەردەوامی هێزی دەریایی ئەمەریکا پۆنگی خواردبۆوە، کە هەڕەشەی لە کۆتایی پێکهینانی دەسەڵاتی دەریایی بەریتانیا دەکرد. لە کۆتایی ساڵی ١٩١٨دا دانیلس دووهەمین پرۆگرامی سازێنەری سەرەکی لەبەردەم کۆنگرێسدا پێشکەش کردبوو. ڕوونکاریە گشتیەکان هیوابەخش بوون: واتە لە ڕاستیدا پرۆگرام تەنیا درێژەی پرۆگرامی ساڵی ١٩١٦بوو یان واتە تەنیا مەبەستی پشتگری کردن لە کۆمەڵەی گەلان بوو. لە هەرحاڵدا بێنسۆن لە پاریس بە توندی پشتگری لەوە دەکرد کە وڵاتەیەکگرتووەکان نابێ واز بێنێ تا کاتێکە هێزی زەریاییەکەی دەگاتە هاوشانی هینی بەریتانیا. ئەوە سیاسەتی سەرەکی بەریتانیەکان بوو کە هێزی زەریایی وڵاتەکەیان پێویستی لە هینی هەر وڵاتێکی تر گەورەتر بێت، بەتایبەت لە دوو هێزی تر گەورەتر بێت. بەڵام بەریتانیایەکان ئەوەشیان دەزانی کە ئەوان ناتوانن لە ململانەی دەریاییدا لەباری ماڵیەوە دەوام بێنن؛ لەگەڵ ئەوەش، ئەوان نەیاندەویست پێوەندی تازەی خۆیان لەگەڵ وڵاتەیەکگرتووەکان بخەنە ژێر باری مەترسیەوە.٣٩٤

دانیلس بەنهێنی خۆی گەیاندە پاریس تا لە گرژی و ئاڵۆزیەکە کەم کاتەوە. لە یادداشتەکەی خۆیدا هێنابووی کە " سەرۆک کۆمار بەتەمابوو ئێمە تاووتوێی کەین و بە ڕێکەوتنێکی گونجاو

بکەین." باسەکان بە باری خراپبووندا گەڕان." والتێر لانگ، یەکەمین دەسەڵاتداری وەزارەتی دەریایی، بە بێنسۆن و دانیلسی ڕاگەیاندبوو کە "یەکەمایەتی هێزی دەریایی بەریتانیا پێویستیەکی حاشاهەڵنەگرە، نەک تەنیا لەبەرهۆی هەبوونی ئیمپراتۆری بەریتانیا بەڵکە تەنیا لەبەرهۆی سەقامگیری ئاشتی لە سەرتاسەری جیهاندا." ویلسۆن چالاکانە وڵامی دایەوە کە توانایی ئەوەی هەیە لە نانەوەی ئەو ئاشتیەدا ڕۆڵێکی گرنگ بگێڕێت. ئەو لەگەڵ هاوتای بەریتانی خۆی، "ڕۆسی" وێمیس، ئەوەندە بە ڕقهەستاویەوە لەگەڵیەک دەدوان کە دانیلس لەوەترسا کار بگا بە جێیەک کە دەستەویەخەی یەکتر بن. " ئەدمیراڵی بەریتانی لای وابوو کە وڵاتەکەی ئەو مافی خۆیەتی گەورەترین هێزی دەریایی لە جیهاندا دامەزرێنێت و ئێمە پێویستە پشتگری لێبکەین. بێنسۆن لای وابوو ئەوە خەیانەتێکی گەورەیە بە نیشتمانەکەی ئەو." بەریتانیەکان هەڕەشەیان دەکرد کە بەرەنگاری چاکسازی تایبەت لەسەر دۆکترینی مۆنرۆ لە پەیماننامەی کۆمەڵەی گەلان دەبنەوە. لیۆد جۆرج لە کاتی خواردنی نانی بەیانیدا لە April Fool,s Day بە دانیلسی ڕاگەیاندبوو کە ئەگەر بێت و وڵاتەیەکگرتوەکان ئاوا بە بەرهەمهێنانی[کەشتی] خۆی درێژە بدات ئیتر کۆمەڵەی گەلان بێکەڵک دەبێت. " ئەوان لە سەر کەشتیە جەنگیەکانی خۆیان دەستیان لە کارکردن کێشابۆوە، و پێویستە ئێمەش دەست لە کار بکێشینەوە ئەگەر بەڕاست باوەڕمان بە کۆمەڵەیەک هەیە کە ویلسۆن خوازیاری بوو."٣٩٥

لە کۆتاییدا، چون هیچ کامێکیان، ئەدمیراڵەکان نەبێت، نەیاندەویست دەست هەڵگرن، ئاگربەستێکی کاتی ڕاگەیەنرا. ئەمەریکیەکان بەڵێنیان دا بە پرۆگرامی بەرهەمهێنانی خۆیاندا بچنەوە (کە دەبوایە لە هەرحاڵدا دەستیان هەڵگرتایە، چون کاری کۆنگرێس ڕوولە دژواری دەڕۆیی) و بەریتانیەکان بەڵێنیان دا لەبەرانبەر چاکسازی یان کۆمەڵەی گەلاندا نەوەستن. هەرکیان بەڵێنیان دا کە لەگەڵ یەک ڕاو و ڕاوێژ بکەن. ئەو کەش و هەوا تازەی کە هاتبوە ئاراوە ڕێگەی نەدا ڕێکەوتنێک لەسەر کەشتیەکانی ئەڵمانی کە لە سکاپا فلەو مابوونەوە بێتە بواری جێبەجێکردن. ویمیس بە ژێردەستەیەکی خۆی ڕاگەیاندبوو کە " ئێمە دەبێ بە نووقم بوونی ئەوان کەیفمان سازبێت، بەڵام من ئەوان وەک سەرباز لە کایەی شترەنجدا دەبینم." هاریکاری نێوان بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان کە چاودێرانیشی سەرسام کردبوو تووشی ئاڵۆزی و پشێوی هات کە دواتر ناویان نا " شەڕی دەریایی پاریس". ئەو پشێویە بە کێشەی قەرەبووەکانی ئەڵمانیا ئەوەندەیکە ئاڵۆزتر دەبوو.٣٩٦

# ١٥

# پارە پێدان

لە ساڵی ١٩٩٥دا، ئەو کێشە قڕاویە لە ئاشتی ئەڵماندا دەنگدانەوەیەکی زۆر کەم و لاوازی لێکەوتەوە کاتێکە ئەڵمانیای تازە یەکگرتوو ڕەزایەتی دابوو کە سوودی ئەو وامانە بداتەوە کە لە ساڵانی نێوان شەڕەکان وەری گرتبوون تا قەرەبوو ئەو خەسارەتانەی پێبکاتەوە کە لەڕێگای گرێبەستی ڤێرسایلێسدا سەپابوون. توماس لامۆنت، بانکدارێک کە لە ساڵی ١٩١٩ لە پاریس نوێنەرایەتی خەزێنەداری ئەمەریکی دەکرد، وتبوی کە "تەوەری قەرەبووەکان لە کۆڕی ئاشتی پاریسدا زیاتر لە هەر خاڵێکی تری گرێبەستەکە کێشە، قڕە، هەستی بریندار، و دواخستنی لێکەوتەوە."٣٩٧

قەرەبووی تاوانەکان لە ئاڵۆزکردنی پێوەندیەکانی نێوان ئەڵمانیا و هاوپەیمانان، و لەنێوان خودی هاوپەیمانانـدا، لە بیستەکان و سیەکاندا دەستێکی قورسی هەبوو. کێشەیەک کە ڕووبەڕووی ئاشتیکەران بۆوە هاوکات زۆر ئاسان و زۆریش پێچەڵاوپووچ بوو. ئاسان لەوبارەوە کە بە قەولی لیۆد جۆرج دەڵێ، " دەبوایە کەسێک پارەکەی بدایە. ئەگەر ئەڵمانیا نەیدەتوانی بیدات، بەو مانایە بوو کە باجدەرانی بەریتانی دەبوایە بیاندایە. ئەوانەی کە دەبوایە بیاندایە ئەو کەسانە بوون کە هۆکاری زیان و خەسارەتەکان بوون."٣٩٨ لەوبارەوە پێچەڵاوپووچ بوو کە دارشتنی ڕێژەی پارەکەی دیاری دەکرد و تاووتوێی ئەوەی دەکرد کە ئایا لەڕاستیدا ئەڵمانیا توانایی بەخشینی ئەو پارەیەی هەیە؟ وایلێهاتبوو کە هەرسووکە ئاماژەیەک بە قەرەبووەکان ناکۆکی و ئاڵۆزی لێدەکەوتەوە. ئایا ئەوانە بەوئاسانیە قەرەبوویەک بوون بۆ خەسارەتەکان یان لەڕاستیدا سزایەکی گۆڕدراو بوون، قەرەبوویەک بۆ خەرج و مەخاریجی شەڕ بۆ وڵاتانی سەرکەوتوو؟ ئایا ئەم خەرجانە باجی کۆنەکراوە یان ئەو هەقدەستانەی کە لەبەرهۆی هێرشکردن، مەرگ یان زیان و زەرەر نەدرابوون دەیگرتەوە؟ قەرەبوو بۆ ئەو ئاژەڵانەی کە مردبوون کاتێکە خاوەنەکانیان هەڕایان کردبوو؟ ئایا ئەوانە لەبنەڕەتدا دانپێدانانێک بوون لەلایەن

ئەڵمانیا و هەرکام لە هاوپەیمانەکانی کە کە هێشتا لەبابەت شەڕێکی ماڵوێرانکەردا هەستی بەرپرسایەتی ڕەوشتبەرزیان تێدا بەدی دەکرا؟

فەڕەنسە، بەریتانیا و وڵاتەیەکگرتوەکان، کە ڕێکەوتنامەی کۆتاییان پێکەوە تاوتوێ کردبوو، پێداویستی جیاواز و بۆچوونی جیاوازیان هەبوو. وڵاتەیەکگرتوەکان زیاتر لایەنی ئەخلاقی کارەکەی لەبەر چاو بوو. ئەو هەمووشتێکی بۆخۆی نەدەویست، بەڵکوو ئەو چاوەڕوانی ئەوە بوو کە ئورووپایەکان پارەیەک کە لە کاتی شەڕدا وەریان گرتبوو بگەڕێننەوە. بۆ ئورووپایەکان، قەرەبووەکان ڕێگایەک بوو بۆ گەڕانەوەی قەرزەکانیان و ئاوەدانکردنەوە و بووژاندنەوەی کۆمەڵگاکانیان. هەربۆیە لەناو لیستی قەرەبووەکان چی بنووسرێت یەکجار گرنگ بوو چون ئەوە لەسەر دابەشکردنی دەسکەوتەکانی جەنگ کاریگەری دادەنا. فەڕەنسە لە هەموویان زیاتر زیان و زەرەری ڕاستەوخۆی تووش هاتبوو، دوا ئەو بلژیک بوو، بەڵام بەریتانیا لەهەموویان زیاتری خەرج کردبوو. لەگەڵ ئەمانەشدا لەسەر پرسی ئەوە کە ئەڵمانیا توانایی چەندەی پارەدانی هەیە قرم و قاڵێکی سەیر ساز ببوو. ئەگەر نموودارەکە زۆر بەرز ببوایەتەوە، لەوانەبوو ئابووری ئەڵمانیای ئاڵۆز کردایە، ئەوەش لەبەرژەوەندی هەناردەکەرانی بەریتانیدا نەبوو. ئەگەر زۆر لە خوارێ بوایە، ئەلمانیا بەرەبەرە دەچوە کەنارەوە؛ لەگەڵ ئەوەشدا بەخێرایییەکی زیاتر دەگەڕاوە سەرباری پێشوو، دیمەنێک کە فەڕەنسەی خستبوە دڵەڕاوکێ. بە دەستهێنانی نمووداری ڕوون و ئاشکرا لەوکاتەدا زۆر ئاسان نەبوو، چون زێدەڕۆیی کردن و خۆڵ لەچاوکردن و زانیاری هەڵە ڕاگەیاندن قازانجی گلایەکی تێدابوو. لە هاوپەیمانادا، زیادەڕۆیی لەوە کە چەندەیان دەبوایە پێ ببڕایە، و لە ئەڵمانیەکان، دەبوو چەندە پارەیان بدایە. چون ئاشتیکەران نەیاندەتوانی لەسەر نمووداریێکی کۆتایی یەک کەون، گرێبەستی ئەڵمانی تەنیا بەندێکی بۆ کۆمیسیۆنێکی تایبەت دانابوو، کە لە نوێنەرانی هاوپەیمانان درووست ببوو، ئەویش دوو ساڵی ڕەبەقی دەبرد تا دیاری بکات کە ئەڵمانیا دەبێ چەندە ببەخشێت. ئەمەش بە ئاشکرا لەلایەن ئەڵمانیەکانەوە لەگەڵ تۆمەت هاوڕێ بوو کە گوایە داوایان لێکرابوو کە چەکێکی سپی واژۆ بکەن.

هەرچەند مێژوونووسان جارلەگەڵجار دێنە سەر ئەم ئاکامە کە ئەو ئەرکە قەت بەو گەورەییە نەبوە کە ئەڵمانیەکان و هاوخەمەکانیان بانگەشەیان بۆ کردووە، قەرەبووەکان وەک هێمایەکی مەزن لە ئاشتیەک کە لە پاریس هاتە ئاراوە دەمێننەوە.٣٩٩ هەرچەند زۆربەی ٤٤٠ بەندی گرێبەستی ڤێرسایلیس لەمێژە لەبیرکراون، تاقمێک لەوانە وەک شایەتحاڵێک بە بەڵگەیەکی پڕ لە قین، زۆر مێشک تەسکانە ناوی لێدەبەن. دیموکراسی تازەی ویمار ژیانی خۆی بە بەرپرسیارێتیەکی سەرسوورێنەرانەوە دەست پێکردبوو و نازیەکان دەیانتوانی کایە بە قەڵسبوونی ئاشکرای ئەڵمانیەکان

بکەن. بەم شێوەیە وت و ویژەکە درێژەی دەبێ، بەرپرسی ئاکامە دڵتەزێنەکان بە ئاشتیکەرانی ساڵی ١٩١٩ەوە دەست پێدەکات: کلیمینجۆی ڤین لەدڵ، چاوچنۆک، لیۆد جۆرجی ترسەنۆک، ڕاڕا و ویلسۆنی سەرنەکەوتوو و تێکشکاو، کە، وەک جان مەینارد کێنیس ئاماژەی پێکرد، خێرا خۆی دەدا بەدەستەوە و کڵاو دەکرا سەری. هەڵبەت کینیس تەنیا خۆی وێنەی دروست نەدەکرد، بەڵکوو ئەو تەنیا بۆیەی دەکرد ئەویش لەوپەڕی جوانی و دڵڕفێنیدا. لاوێکی هەتابلێی زیرەک بوو، بەڵام نەدەچوە دڵەوە. بە ناو ئیتۆن و کامبریج گەشتی دەریایی کردبوو، خەڵاتی زۆری وەرگرتبوو و سەرنجی زۆرلایەنی بەلای خۆیدا ڕاکێشابوو. ئەندامێتی ئەو لە بازنەی بلوومزبیریدا تەنیا لەباری ئەخلاقی و ڕەوشتبەرزی ئەوی بەهێزکرد. کینیس وەک ڕاوێژکاری خەزێنەی سەرەکی لە کۆڕی ئاشتیدا بەشداری کرد. لە *ئاکامەکانی ئابووری ئاشتیدا*، کە خێرا دوابەدوای واژۆکردنی گرێبەستی ئەڵماندا نووسرا، توانی بەم چەشنە لەگەڵ بەرپرسی ئاسایی خۆی قسە بکات.

کینیس دەیگێڕایەوە کە ویلسۆن قوربانی حەز و خولیابوونی کوێرەپیاوی تۆقێنەری ئەورووپیەکان بوو. " ئەو زوو دەکەوتە ناو قسەوباسەکەیان و لەسەربنەمای پلانەکان و زانیاریەکانی ئەوان قسەوباسی دەکرد، و خێرا دەکەوتە سەر ڕێبازی ئەوان." ویلسۆن پشتی دەکرد لە یاساوڕێساکانی خۆی، وڵاتەکەی و هیواوهۆمێدی هەمووی ئەو کەسانەی کە خوازیاری جیهانێکی باشتر بوون. لیۆد جۆرج شەیداکەری سەرەکی بوو کە لەناو تەم و مژەکانی ناوچەشاخاویەکانی وێلزەوە هاتبوو تا ساویلکە و بەستەزمانەکان بەرەو زۆنگاوەکان ڕاکێشێ." کینیس لە پارچەنووسراوەیەکی ئەدەبیدا لە کتێبەکەی خۆی هێنابووی کە " مرۆڤ لە هاوڕێیەتی ئەودا هەست بە هەبوونی جۆرە بێ مەبەستیەکی کۆتایی، نابەرپرسایەتیەکی دەروونی دەکا، لەدەرەوە و دوور لە خێر و شەڕی ساکسۆنی ئێمە، تێکەڵ لەگەڵ دۆدەگەری، بێ ڕەحمی، خۆشەویستی دەسەڵات، کە سەرنجڕاکێشی و ترس و دڵەڕاوکێ بە سێحربازە بەڕواڵەت چاکەکانی فۆلکلۆری ئەورووپای باکوور دەبەخشێ."...٤

کلیمینجووی ووشک هەڵاتوو، پیر و لاکەوتە و توورە، مێشکی تەنیا بە فەڕەنسە و هێمنایەتی ئەویۆە خەریک بوو. کینیس هاتبوو کە سەرلۆمەی فەڕەنسیەکان و ئەو شتەی کە ئەو وەک چاوچنۆکی لەڕادەبەدەری ئەوان دەیدیت بکات. ئەو لەگەڵ نوێنەرەکانی ئەوان کەوتبوە شەڕەوە لەسەر ئاسوودەیی بۆ ئەڵمانیا و لەسەر ئەو وامانەی کە فەڕەنسە پێویستی بوو تا لە بەریتانیای بستێنێ. ئەو نوێنەرە ئەڵمانیانەی کە ئەو لە کۆمیسیۆنی ئاگربەست چاوی پێیان کەوت بابەتێکی تەواو جیاواز بوو. لە بیرەوەریەکەیدا کە ئەو بۆ هاوڕێیانی بلوومزبێری خۆی نووسیبووی ئەو بەم شێوەی ژرەوە وەسفی بانکداری ناوداری هامبۆرگ کارێل مێلچیۆری کردبوو: "پیاوێکی هەتابڵێی

پاک و خاوێن، تەڕپۆش و ڕێک و پیک، بە یەخەیەکی بەرز و توندوتۆڵ.....چاوەکانی ڕاستەوخۆ ڕوو لەئێمە دەدرەوشانەوە، کە بە خەم و کەسەریێکی زۆرەوە داگیرابوون، بەسەر ئەوانەشدا وەک ئاژەڵێکی بەستەزمانی دەچوو کە لە کەنداوێک ڕاوەستابێت." بانگەشەی کینیس بەومانایە کە ئەو سەبارەت بە میلچیۆر هەستی بە جۆرەخۆشەویستیەک دەکرد پێویست ناکات زۆر بە هەند بگیرێت. ئەوە بنێشتەخۆشەی سەرزاری هاوڕێیانی دێرینی خۆی بوو کە لە ڕابردووی ئالۆزی سێکسی ئەو باش ئاگاداربوون.٤٠١

ئاشتیکەران کینیسیان هەر بە جارێک تۆقاند. ئەوان ترسی تۆڵەیان هەبوو لە هەمان کاتیشدا شارستانیەتی ئەورووپی لەسەر لێواری نەماندا هەر لارەلاری بوو.

لە پاریس ئەو شوێنەی کە ئەوانەی پێوەندیان بە شۆڕای عالی ئابووریەوە هەبوو کاتەژمێر بە دوای کاتەژمێردا گوزارشیان لە مالۆێرانی، پشێوی، و ڕێکخراوەی گلاوکەری سەراسەری ئورووپای ناوەندی و ڕۆژهەلات، هاوپەیمان و دوژمن وێڕای یەک، پێدەگەیشت، و لە لێوی نوێنەرانی ئەلمان و ئوتریش بەلگەی چەسپاویان سەبارەت بە بەتەنگەوەهاتنی ولاتانی خۆیان بە  دەست دەگەیشت، سەردانی جارجارەی ژووری گەرم، وشک و قاقڕ لە مالی سەرۆک کۆماردا، شوێنێک کە چواریار چارەنووسی خۆیان لە تەلەی پەڕیو و تەقیودا دیاری دەکرد، هەر ناهۆمێدی و ناخۆشی بە سیمایانەوە دیار بوو.٤٠٢

ئەوان لە ژوورە ڕازاوەکانی خۆیان چیان گیر دەکەوت؟ بە بۆچوونی کینیس ئەو ئاشتیەی کە تەواوکەری لەبەینچوونی ئابووری بوو لەلایەن شەڕەوە بە سەر ئەورووپادا سەپا. کاتێکە ئەوان دەبوایە ناوچەیەکی ئازادی تجاریان دامەزراندایە لەسەر نەقشە خەریکی دانانی هیلە تازەکان بوون؛ ئەوان لەسەر ئەو قەرزانەی کە بە یەکتریان دابوو مشت و مڕیان بوو کاتێکە دەبوایە لییان خۆش بوونایە؛ و، ڕەخنەیەک کە دەورادەوری ئەلمانیای داوە، ئەوان قەرەبووی مالۆێرانکەرەیان سەپاند. بەپێی یادداشتنامەکەی خۆی کە لە کۆڕی ئاشتیدا نووسیبووی، کینیس باسی ئەوەی دەکرد کە ئەلمانیا دەتوانێ بەلانی زۆرەوە تا ٢بیلیۆن پۆند(١٠بیلیۆن دۆلار) پێشکەش بکات. زیاتر لەوە بەرەو مالۆێرانی دەبرد، و لەوانەیە بەرەو شۆڕش، هاوڕێ لەگەڵ ئاکامەکانی مەترسیدار بۆ ئورووپا.٤٠٣

کاتێکە کینیس لە پاریس بوو، بۆ چارەسەرکردنی کێشەئابووریەکانی ئەورووپا و کێشەی قەرەبووەکان لە بوخچەیەکی ڕێکو پێکدا بەشێوەیەکی ژیرانە پلانێکی باشی داڕشتبوو. هاوپەیمانانی ئەورووپی پێویستیان بە بەرزکردنەوەی پارە، بە قەرەبووکردنەوەی خەسارەتەکانی شەڕ و بە گەڕاندنەوەی قەرزەکانیان بە یەکتر و بە ولاتەیەکگرتوەکان هەبوو. ولاتانی شکستخواردوو بۆ قەرەبووەکانی خۆیان بەلگەنامەیان بلاو دەکردەوە، بەلام ئەو بەلگانە هەم لەلایەن ولاتانی دوژمنەوە و

هەمیش لەلایەن وڵاتانی هاوپەیمانەوە گارانتی دەکران. چۆمەکانی ماڵی بۆ جارێکیتر سەرریژ دەبنەوە و وڵاتانی ئەورووپی لەپێناو بەرژەوەندی هاوبەشی خۆیاندا یەک دەگرنەوە. لە کۆتاییدا هەمووی ئەمانە بە بەشداری کردنی وڵاتەیەکگرتوەکان دەبەسرێتەوە. هەرچەند بەریتانیا لەسەر کاغەز نەتەوەیەکی قەرزدەر بوو، و فەڕەنسە بەگشتی بڕی ۳.٥بیلیۆن دۆلاری قەرز لە سەر بوو، هەقیقەت شتێکی تەواو جیاوازتر لەوە بوو. هەم فەڕەنسە و هەمیش بەریتانیا بڕێکی زۆر پارەیان بە قەرز بە ڕووسیە دابوو، کە لە گەڕانەوەی قەرزەکانی خۆی کەمتەرخەمی کردبوو، و بە هاوپەیمانانی تری وەک ئیتالیا و ڕۆمانیا، کە بە دەراوەی دەمیان دا هیچ لەوە ندەچوو بیانگەڕیننەوە. بەریتانیا بڕی ٤.٧بیلیۆن دۆلار بە وڵاتەیەکگرتوەکان قەرزدار بوو، و فەڕەنسە ٤بیلیۆن دۆلار بە ئەو و هەوەها ۳بیلیۆن دۆلار بە بەریتانیا قەرزدار بوو. لیۆد جۆرج لە مانگی ئاڤریلی ساڵی ۱۹۱۹دا، کاتێکە یاداشتەکەی کینیسی پێشکەش کرد بە ویلسۆنی ڕاگەیاند کە " میکانیزمی ئابووری ئورووپا تووشی ئاڵۆزی و تەنگ و چەڵمە هاتوە. پێشنیارێک کە دیمەنەکانی داهاتوو دەخاتە بەردەمی ئێمە و بە خەڵکانی ئەورووپا جادەیەک دەناسێنێ کە پێوەندی بە سەرچاوەی خواردەمەنی و کار و پیشە و هێمنایەتیەوە هەیە. هەر ئەو پێشنیارە بەهێزتر لە هەموو چەکێکی تر لەبەرانبەر مترسی بیروباوەڕی بۆلشویزمدا لە نەزمی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی پارێزگاری دەکات کە بە باوەڕی ئێمە باشترین خاڵی دەستپێکە بۆ داهاتوویەکی باشتر و ئاسایشێکی زیاتر."٤.٤

ئەم بیرۆکە کە وڵاتەیەکگرتوەکان دەبێ لە سەرچاوەکانی ماڵی خۆی بۆ مەبەستی وەگەڕخستنەوەی ئورووپای پاش شەڕ کەڵک وەرگرێ بە شێوازگەلی جۆراوجۆر ماوەیەک بوو کە کەوتبوە سەرزاران و باسی لێدەکرا. فەڕەنسەیەکان، کە هەتا بن مل کەوتبوونە ژێرباری قەرزی هاوپەیمانەکانیان و لەگەڵ بڕێکی زۆر پارەی قەرەبووکردنەوە ڕوبەڕوو ببوونەوە، سەبارەت بە درێژ کردنەوە و بەهێزکردنی هاریکاری ئابوری سەردەمی شەڕ لەگەڵ هاوپەیمانان حەز و خولیایەکی تایبەتیان لە دڵدابوو. وەزیری بازەرگانی و پیشەسازی ئەوان، ئیتینی کلیمینتیل، پیاوێکی تێکۆشەر و سوور لەسەر ئامانجەکانی خۆی و لە بنەماڵەیەکی کشت و کاڵی، پلانێکی ورد و ڕێک و پێکی بۆ " سیستەمی تازەی ئابووری" دارشت، کە تێیدا ڕێکخراوە و هاریکاری جێگای ڕکابەرێتی ماڵوێرانکەرانەی دەگرتەوە، سامانە سرووشتیەکان یەکجێ کۆدەکرانەوە و بەپێی پێویست دابەش دەکران، و هەمووی ئەمانە بەگشتی لەلایەن تێکنۆکراتەکانی کارامە و لیهاتووەوە سەرپەرشتی دەکران. کاتێکە ئەڵمانیا خانەی سیاسی خۆی ڕێک خستبوو، ئەویش دەیتوانی ببێ بە بەشێک لە سیستەمی تازە، و دوور لە مەترسی لە ڕێکخراوەیەکی بەهێزدا جێی خۆی بکاتەوە. لەبەرهۆی دژایەتی چالاکانە لەلایەن وڵاتەیەکگرتوەکانەوە و بێ لایەن بەریتانیاوە پلانەکە لە پەلەقاژە

کەوت و لە کۆتاییدا لە مانگی ئاڤریلی ساڵی ١٩١٩دا لەلایەن هاوپەیمانانەوە پووچەڵ کرایەوە. ئەم هەوڵە پاش شەڕی دووهەمی جیهانی بەرهەمێکی چاوەڕواننەکراوی لێکەوتەوە، کاتێکە ژان مانێت، کە لە ساڵی ١٩١٩دا یاریدەدەری کلیمینیتیل بوو، ڕێکخراوەیەکی ئابووری دامەزراند کە دواتر گەشەی سەند و بە یەکیەتی ئەورووپا ناوی دەرکرد.٤٠٥

بەریتانیەکان خوازیاری ئەوە بوون کە وڵاتەیەکگرتوەکان بۆ ماوەی چەند ساڵێکیش بوە واز لە سوودی وامەکانی خۆی بێنێ. لە ئاکامدا، کۆی گشتی خەرجی شەڕەکە ڕابگەیەنرێت و وڵاتەیەکگرتوەکان بەشێکی هەرەزۆری لێ هەڵگرێ بۆ خۆی. لیۆد جۆرج، کە ئەلاقەیەکی تایبەتی بە قسەی زل زل هەبوو، ڕێگەچارەیەکی تەنانەت زۆر خەیاڵی تری لەوە لە مێشکدا بوو، پووچەڵ کردنەوەی یەکجاری هەمووی قەرزەکانی ناو هاوپەیمانی. هەرچەند ئەمەریکیەکان سووربوون لەسەر ئەوە کە نەهێڵن ئەوە ڕووبدات. ویلسۆن لە نامەیەکدا بۆ بێرنارد بارۆخی سەرمایەدار، کە یەکێک لە ڕاوێژکارە سەرەکیەکانی ئەو بوو، نووسیبووی کە " من هەست بەو هەوڵانە دەکەم کە بۆ مەبەستی گرێدانی ئێمە بە چوارچێوەی لەرزۆکی ماڵی ئەورووپا خراونەتە گەڕ. و پشتم بە یارمەتی بەڕێزتان بەستووە تابەشکم ئەو هەوڵانە بڕەوێنیەوە." وەکوو وەزارەتی دارایی لە واشنگتۆن زۆربەی پسپۆڕ و کارناسەکان لەگەڵی هاوڕابوون. ئەوە پێوەندی بوو بە خودی ئورووپایەکانەوە و هەرخۆشیان دەبوایە لەگەڵ کێشەکانی خۆیان ڕووبەڕوو بوونایەتەوە؛ هەتا وڵاتەیەکگرتوەکان زیاتر پشتگری لێبکردنایە، ئەوان کەمتر دەیانتوانی لە سەر پێیی خۆیان بوەستن. هەرجۆرێک بێت، کۆنگرێس هەلی باشی بۆ نەڕەخسابوو، ئەویش ئەوکاتە کە لەلایەن کۆماریەکانەوە گەمارۆ درابوو، تا یارمەتیەکی بەکۆمەڵی ماڵی بۆ ئورووپایەکان پەسەند بکات. پلانەکەی کینیس وەکوو هەمووی ئەوانی تر هەڵوەشێنرایەوە، و ئەو خەمین و مەلوول لە ئاشتیکەرانی دەڕوانی کە بۆ بەرەو پێشبردنی قەرەبووەکان کەوتبوونە خۆ.٤٠٦

*    *    *    *

لیۆد جۆرج لە وڵامی دەربڕینی ترس و گومانی یەکێک لە ئەندامەکانی کابینەی خۆی لە مانگی ئاڤریلدا هێنابووی کە "گومانی تێدا نیە کە باشتر وایە بڕەپارەیەک بچەسپێنین ئەگەر ئێمە بتوانین لەسەر نموودارەک ڕێک کەوین. کێشەکە بەرلەهەمووشتێک لە مسۆگەرکردنی ئەو بڕەپارەیەدایە؛ دواتر ڕیکەوتن لەگەڵ هاوپەیمانانە لەسەر ئەو ڕێژەیە، و جاری سێهەم لەسەر مسۆگەرکردنی ڕێکەوتنە لەسەر ئەو ڕێژانەی کە تێیاندا ئەو بڕەپارەیە دابەش دەکرێت. ئەگەر ئێوە پلانێکتان لەبەردەست دایە کە دەتوانێ لەبەرانبەر ئەم سێ کێشەیەدا ڕاوەستێ ئەوا ئێوە توانیوتانە ئاڵۆزترین کێشەی ناو گرێبەستی ئاشتی چارەسەر بکەن." ماوەیەکی کورت دوابەدوای کرانەوەی

کۆڕەکە شۆڕای عالی کۆمیسیۆنێکی لەسەر قەرەبووی خەسارەتەکان سازکردبوو، کە دەبوایە لەسەر ئەم پرسیارە پێوەندیدارانە بڕۆیشتایە: وڵاتانی دوژمن (مەبەستی سەرەکی لێرەدا ئەڵمانیا بوو) پێویستە لەسەر شانیان چەندە پارە ببەخشن، چەندە دەتوانن ببەخشن، و ئەو بڕەپارەیە چۆن دەبێ ئامادەبکرێت؟ لێژنەی لقی یەکەم زۆر کەم پێکەوە کۆبوودەنەوە، بەڵام دوو لەقەکەی تر ڕۆژ و شەو پێکەوە دانیشتنیان هەبوو، ئەوی پێکیان دەهێنا لە تەپۆڵکەیەک کاغەز تێنەدەپەڕی. کاتێکە ویلسۆن لە ١٤ی مانگی فەوریەدا گەڕایەوە بۆ وڵاتەیەکگرتوەکان، کۆمیسیۆن تووشی وەستان هاوبوو، و ئەمەریکیەکان لە نموودارەکەدا بەبەراورد لە پلەی مامناوەندی دابوون بەڵام فەڕەنسەیەکان خوازیاری زیاتر بوون. ڕۆژنامەنووسێک بە گاڵتەوە وتبووی کە " ئەوان بە ملوێن کایە دەکەن وەک چۆن منداڵان کایە بە بووکە سەماکەرە دەکەن. بەڵام ئەوەی کە ئێمە لەسەری کۆک بین بەگشتی دەبێ بە بەشێک لە تابلۆیەکی وتار، چون ئەڵمانیەکان قەت ناتوانن بڕەپارەیەکی ئاوا زۆر کۆکەنەوە." بەریتانیەکان داوای ٢٤بیلیۆن پۆندیان دەکرد (١٢٠بیلیۆن دۆلار)، فەڕەنسەیەکان داوای ٤٤بیلیۆن پۆندیان دەکرد(٢٢٠بیلیۆن دۆلار)؛ کارناسانی ئەمەریکی پێشنیاری ٤.٤بیلیۆن پۆندیان کردبوو(٢٢بیلیۆن دۆلار).٤٠٧

لەگەڵ ئەمانەشدا، ئەمەریکیەکان خوازیاری ئەوە بوون کە گرێبەستەکە بڕەپارەیەکی چەسپاو بگرێتە خۆ. کاراناسانی ئەوان بیانوویەکە بۆ ئەمە دەیانهێناوە ئەوە بوو کە ئەمە دەبێتە هۆ کۆتایی هێنان بە ئاڵۆزی سیاسیەک کە بەربینگی ئورووپای گرتبوو و نەیدەهێشت بیووژێتەوە. ئورووپایەکان بەمە ناڕازی بوون. مۆنتاگۆ، وەک یەکێک لە وەزیرانی کابینەی بەریتانی کە ئاوێتەی وت و وێژەکان بوو، وتبووی کە "ئەگەر تابلۆکە زۆر نزم بێتە دەرێ ئەڵمانیا بە خۆشحاڵیەوە پارە دەدا و هاوپەیمانان شتێکی وایان گیر ناکەوێت، بەڵام، بە واتایەکی تر، ئەگەر تابلۆیەکی زۆر بەرز پێشکەش بکرێت، ئەو ئیسفەنجەکە حەوادەدا و هاوپەیمانانیش بە هیچ ناگەن.٤٠٨

لەوانەیە کاری ئەقڵانە ئەوە بێ کە وڵاتانی سەرکەوتوو کەمتر خۆیان بەوە خەریک کەن تا ئەڵمانیا والێکەن پارە بدا و باشتر وایە زیاتر بەها بە وەگەڕ خستنەوەی ئورووپا بدەن. بەڵام پاش شەڕێک کە ئەو هەموو ماڵوێرانیەی لێکەوتەوە و کۆمەڵگای ئەورووپی تا ئەو ڕادەیە هەژاند، ڕێبەرانی سیاسی چۆن ڕێگە بە خۆیان دەدەن ئەمانە هەروا ئاسان لەبیر کەن؟ هەر جۆرێک بێت ڕای گشتی هەروائاسان ڕێگەی ئەو کارەیان پێ نادات. بەریتانیەکا دەیانوت کە "واکەن لە هونەکان[تێکدەرانی شارستانیەت] پارە بدەن." ئەو پۆستێرانەی کە بە دیوارەکانەوە هەڵواسرابوون ئەیانوت کە "دەبا ئەڵمانیا لەپێشدا پارە بدات."٤٠٩

ڕێبەرانی ئەورووپی تەنانەت لە لێکدانەوەی توانایی پارەدانی ئەڵمانیا هەستیان بە مەترسی دەکرد، چون تابلۆکە زۆر نزمتر بوو لەوە کە جەماوەر چاوەڕوانی دەکرد. بەریتانیەکان و فەڕەنسەیەکان ئاماژەیان بەوە دەکرد کە لێکدانەوەی ئەوە کە ئەڵمانیا- یان ئەوەی کە پاش ئەو وڵاتە بەجێ مابوو- توانایی بەخشینی چەندە پارەی هەیە کارێکی ئەستەم و دژوار بوو. وڵات ڕێگایەکی هەڵەی بڕیبوو، هەم ئابووریەکەی و هەمیش حکوومەتەکەی وەک یەک لەرزۆک ببوون. ئەڵمانیەکان نەیاندەتوانی ئامارێکی باوەڕپێکراو بدەنە دەرەوە، هەرچەند خوازیاری بوون. تجارەتی دەرەوە پووکابۆوە، و هاوڕێ لەگەڵ ئەوەش سەرچاوەیەکی گرنگی داهات لەکیس چووبوو. کاروباری ماڵی حکوومەت کەوتبوە تەنگەژەوە. لەبەر هۆکارەکانی سیاسی ماڵیاتەکان کەمیان کردبوو و خەرج و مەخاریجەکانی شەڕ بەگشتی لەڕێگای بڵاوکردنەوەی بڕێکی زۆر بۆندی شەڕ و پارەی کاغەزی تایبەت دابین دەکران. ئەڵمانیا هەمیشە پلانەکانی وادارِشتبوو کە شەڕەک بەرێتەوە و خەرجەکانیشی بخاتە سەر شانی دوژمنی شکست خواردوو. لە دوایەمین ساڵی شەڕدا ئەمە ڕووی دابوو؛ گرێبەستەکانی برێست-لیتۆڤسک لەگەڵ ڕووسیە و بۆخارێست لەگەڵ ڕۆمانیا کۆنترۆڵ کردنی سەرچاوەیەکی یەکجار زۆری خستبوە ژێر ڕکێفی ئەڵمانەوە. بۆلشویکەکانیش هاتبوونە سەر ئەوە کە بڕەپارەیەکی ٦٠٠بیلیۆن دۆلاری ببەخشن. لە ئەڵمانی شکستخواردووی ساڵی ١٩١٩دا، کۆنەپارێزان دژ بە هەر هەوڵێکی بەرزبوونەوەی ماڵیات یان هەرجۆرە کەمترخەمیەک سەبارەت بە بۆندەکانی حکوومەتی بە دەنگی بەرز ناڕەزایەتیان دەربڕی، بەڵام چەپڕەوەکان خوازیاری بەخششی زیاتر بوون بۆ جەنگاوەرانی کۆن، بێوەژنان و هەتیوان وەکوو خواردەمەنی سوبسیدە و هەقدەستی زیاتر. حکوومەت بەگوێڕایەڵیەوە بە هەرکیان ڕەزایەتی دا، و کەسری بوودجەی ئەلمانیا چوە سەرێ تا، لە ساڵی ١٩٢١دا، گەیشتە بڕی دووسێهەمی بوودجەکە. بۆمەبەستی کەمکردنەوەی خەرج و مەخاریجەکان یان بەرزکردنەوەی ماڵیاتەکان تەنیا بۆ دانی پارەی قەرەبووەکان هەوڵێکی ئەوتۆ نەدرا.٤١٠

دیاریکردنی لیستەی حیسابی هاوپەیمانیش کارێکی هەروا ئاسان نەبوو. وەزیری ناوچە ئازادکراوەکانی فەڕەنسە وتبووی کە "لە وڵاتی هەژارنشینی من فەڕەنسە سەدان گوند بەدی دەکرێن کە تا ئێستا کەس نەیتوانیوە بگەڕێتەوە بۆ ناویان. تکایە تێبگەن: ئەوێ بیابانە، ئەوێ وێرانەیە، ئەوێ یانی مەرگ و نەمان." ئەندازیاری سووپای ئەمەریکی و تیمێک لە هاوکارەکانی کە لێکۆڵینەوەیەکی چڕوپڕیان لەسەر ناوچە جەنگیەکانی فەڕەنسە و بلژیک ئەنجام دا لە مانگی ژانویەی ساڵی ١٩١٩ لێکیان دایەوە کە بۆ گەیشتن بە بەراوردکردنێکی جێی بڕوای خەرجەکانی

قەرەبووکردنـەوەی خەسـارەتەکان لانـی کـەم دوو سـاڵ دەخایـەنێت. بەریتانیـەکان بـێ ڕەحمانـە لـە هاوپەیمانـەکانیان کەوتبوونـە گومانـەوە و دەیـانکوت کـە ئـەوان جارلەگـەڵ جـار بـە داواکاریـەکانی خۆیانەوە دەنێن و زۆرتری دەکەن، بۆ وێنە لە بلژیک زۆر زیاتر لە سامانی گشتی پێش شەڕی خۆی داوای دەکرد و فەڕنسە نزیک بە نیوەی ئەوە داوای دەکرد. لیۆد جۆرج زۆر بە تووڕەیەوە وتی کە "شتی وا هەرنابێ". هەڵبەت کە هەتا هاوپەیمانەکانی ئەو داواکاریەکانیان زیاتر بوایە، شتێکی وا بۆ بەریتانیا نەدەماوە.٤١١

بێجگە لەمانە قرەیەکی گەورە لە ئارادابوو لە سەر پێناسـەیەک بـۆ خەسارەتەکان. ویلسۆن سوور بوو لە سەر ئەوە کە قەرەبوو دەبێ بۆ ئەو خەسارەتانە بگەڕێتەوە کە لەبەر هۆی هەوڵەکانی نایاسایی شەڕەوە هاتوونەتە ئاراوە نەوەک لەبەرهۆی خودی تێچوەکانی شەڕ. چارەدە خاڵەکەی ئەو تەنیا باسی "بووژاندنەوەی" ناوچە جەنگیەکانی کردبوو، و ئەو بەڵێنی دابوو کە " هیچ جۆرە پێوەلکانێک، هیچ جۆرە یارمەتیەک، هیچ جۆرە خەسارەتێکی سزادەرانە" لـە گۆڕێدا نـەبێت. ئـەو کاتـەی کـە ئـەڵمانیا ڕێکەوتنامەی ئاگربەستی واژۆ کردبوو، تەنیا بۆ ئەو مەبەستە ئەو کارەی کردبوو. بـەم پێیـە ئـەڵمانیا تەنیا لەبەرانبەر قەرەبووکردنەوەی گۆڕەپانـەکانی شـەڕ لـە فەڕەنسـە و بلژیـک بـەرپرس دەبێت نـەوەک لەبەرانبەر پارەیەکدا کە حکوومەتەکانی هاوپەیمانی بۆ کەرەسەی جەنگی و دابینکردنی خواردەمەنی بۆ سـەربازەکانیان تـەرخانیان کردبـوو. کاتێکـە لیـۆد جـۆرج هـەوڵی دا هێڵێکـی لێڵ و نادیار لـە نێوان قەرەبووەکان و بەخشینەکان دابنێت، هیچ کامێکیان ویلسۆنیان نەدەگرتەوە: " جەماوەرێکی چالاک لە خەڵکانی سەراسەری جیهان دژ بە بەخشینەکان نارەزایەتیان دەربڕیبوو، و ئەو لای وابوو کـە دەربڕینـی `قەرەبووەکان گشتگیر دەبێت و مانایەکی تەواوکەری دەبێت."٤١٢

لیـۆد جـۆرج، وەک هەمیشـە گەشـبین بـوو، و بـە هاوکارەکـانی وت کـە ئـەو واینـەدەزانی کـە بەڕاستی ویلسۆن لە بژاردنەکان خۆش بوە. بەریتانیـەکان لـەوە دەترسان کـە، ئەگـەر بێت و ویلسۆن هەڵوێسـتێکی نەگۆڕانـە بگرێـت، لەوانەیـە ئیمپراتـۆری بـەریتانی قـەرەبووی ئـەو کەشـتیانەی بـۆ نەکرێتەوە کە لەلایەن ئەڵمانیەکانەوە نووقمی ئاو کرابوون. فەڕەنسە بەشی شێری بەردەکەوت، کە، بە بۆچونی بەریتانیـەکان، بـە بەرێوەبەرایـەتی ناتـەواوی ماڵییـەک کـە هـەیبوو زۆر لـەوەدەچوو لـە دەستی بدات. بێجگە لەمانە بەریتانیـەکان گومـانی ئـەوەیان هـەبوو کـە فەڕەنسـە بـۆ گەڕاندنـەوەی قەرزەکانی خۆی بۆ بەریتانیا زۆر هەوڵی نەدەدا. ویلسۆن لەم بارەوە بە توندی ئاماژە دەکا و دەڵێت کـە "فەڕەنسـە وەک نەتەوەیـەک بـەرەو ڕووی مایـەپووچی دەڕۆیـی، بـەڵام فەڕەنسـەیەکان وەک تاک بەرەو دەوڵەمەندبوون دەڕۆیشتن."٤١٣

لیۆد جۆرج لەپێشدا داڵدەی ویلسۆنی دەدا و دواتریش هەڕەشەی لێدەکرد. لە کۆتایی مانگی مارسی ساڵی ١٩١٩دا پێی ڕاگەیاند کە ئەو بۆی نیە گرێبەستەکە واژۆ بکات مەگین هەندێک لە خەرجەکانی بەریتانیای تێدا جێ بکاتەوە. بەختەوەرانە، سمووتس بە ڕێگە چارەیەکی تازە گەیشتبوو. ئەو ئاماژەی بەوە کرد کە، کاتێکە ئاگربەست ڕاگەیەنرابوو، هاوپەیمانانی ئەورووپی ڕایانگەیاندبوو، و ئەمەریکیەکانیش قەبووڵیان کردبوو، کە ئەڵمانیا بەرپرسی هەمووی ئەو خەسارەتانە بوو کە بە دەستدرێژی خۆی بە سەر هاووڵاتیانیدا هێنابوو. کەوابوو، پێویستە قەرەبووەکان یارمەتی جیاواز بۆ بنەماڵەکانی سەربازان ببڕێنێتەوە، و مووچەی خانەنشینی بۆ بێوەژنان و هەتیوان دابین بکات. کاریگەریەک کە دەهاتە ئاراوە ئەوە بوو کە لیستەی حیساب تا دوو جار زیاتر بکات. ئەمەش هەر لە سمووتسەوە سەرچاوەی دەگرت کە چوار مانگ زووتر لیۆد جۆرجی لەبەرانبەر داواکاری لەڕادەبەدەر ئاگادار کردبۆوە، و هەر ئەوبوو کە مانگێک دواتر بە توندی ڕەخنەی گرتبوو قەرەبووەکان پشتی ئەڵمان دەشکێنن. سمووتسی خاوەن بیری بەرز، ڕەوشتبەرز و هەژیر، دنەی خۆی دەدا و خۆی بە خۆی دەگوت کە ئەوەی لە دەستی هاتوە کردوویەتی. بۆ مەبەستی داکۆکی کردن لە خۆی، ئەو بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە ئەو بەو ئاسانیە بۆچوونێکی دەربڕیوە کە زۆربەی کارناسانی یاسایی لە کۆڕی ئاشتیدا لەسەری کۆکن. لەمانە ئاشکراتر و ڕوونتر نووسیبووی ئەگەر مووچەکان لەبەرچاو بگیرانایە، فەڕەنسە زۆربەی قەرەبووەکانی پێدەبڕا.٤١٤

لە شوێنێکدا کە ویلسۆن نەدەبوا گوێی بۆ لیۆد جۆرج شل کردایە گوێی بۆ سمووتس شل دەکرد. کارناسانی ئەمەریکی لایان وابوو کە دەمەتەقێکە نایاسایی و پڕووپووچ بوو. ویلسۆن پێی ڕاگەیاندن: " ژیریێژی! ژیریێژی! لای من ژیریێژی بایەخی پەناباتێکی نیە. من دەمەوێ شوێنێک بۆ مووچەکان دابین بکەم!"٤١٥ لە کۆتاییدا بڕیارەکەی ئەو توانی تەنیا لەسەر دابەشکردنی قەرەبووەکان کاریگەری دابنێت، چون تابلۆی کۆتایی دەبوو لەلایەن ئەڵمانەوە دیاری بکرایە کە تا چەندە دەتوانێ پارە ببەخشێت.

هەرچەند ویلسۆن لۆمەی ئەوەی لەسەر بوو کە پاشگەزبۆتەوە، لیۆد جۆرج تەنانەت زیاتر لە ئەویش لۆمەی لێدەکرا لەبەرهۆی، وەکوو کینیس، خۆڵکردنە چاوی ئەمەریکیەکان و ڕێگەدان بە کۆمەڵگای بەریتانی تا خەوی بەزۆرەوەرگرتنی بڕەپارەی زۆر لە ئەڵمانیا ببینن. ئەو بەگشتی لەلایەن جەماوەرەوە وەک لیبراڵێک سەیر دەکرا کە هیچ پابەندیەکی بە یاساکانی خۆیەوە نەبوو. لای هەموو کەس ئاشکرابوو کە ئەو نەگۆڕ نەبوو. کاتێکە هاجێزی ئوسترالیا یەکەم جار باسی ملوێنان پاوندی کرد، لیۆد جۆرج ئاماژەی بەوە دەکرد کە ئەڵمانیا دەتوانێ تەنیا بە پەرەدان بە بەرهەمهێنانی خۆی و پڕکردنی بازاڕەکانی جیهانی بە کەل و پەلی هەرزان بڕیکی زۆر پارە بە دەست بێنێت. " ئەوە بەو مانایە دەبێ کە ئێمە بۆ دوو بەرەی

داهاتوو کرێکارانی ئەڵمانی دەکەین بە کۆیلەی خۆمان." لەوە خرابتر، بە تجارەتی بەریتانی و ئیمپریالیستی خەسارەتی دەگەیاند. بەسەر ئەوەشدا دواتر لیۆد جۆرج هەڵگەڕایەوە و هاجێزی کرد بە سەرۆکی لێژنەیەک کە لە تووندڕەوە ناسراوەکان پێکهاتبوو بۆ مەبەستی لێکدانەوەیەکی سەرەتایی بۆ حکوومەتی بەریتانیا لە توانایی ماڵی ئەڵمانیا. گرووپەکە- سێر جۆرج فۆستێر، لە کەنەداوە وتی کە" بەگشتی ئەوە سەیرترین لێژنەیەک بووە کە من تاکوو ئێستا خزمەتم تێدا کردوە،"- بۆ کۆکردنەوەی بەڵگە هەوڵێکی ئەوتۆی نەدا بەڵام زیاتر بە بۆچوونی تاکەکەسی و بیرکردنەوەی ئارەزوومەندانە پشتی بەستبوو؛ بە وتەی فۆستێر، " بۆ مەجبوورکردنی هوونەکان تا زیاترین پارە بدەن، جا ئەوە ببوایەتە هۆی بەرەیەک داگیرکاری و بەڕێوەبردن، یان نا، بەواتایەکی تر لەبیرکەری ئاکامەکان." ٤١٦

دواتیپەڕبوونی چەندین هەفتە و باسوخواستێکی چڕ و پڕ لەسەر ژمارەکان، لیۆد جۆرج کەوتە ڕاڕاکردن. ئەو لەگەڵ ویلسۆن و کلیمینجوو باسی قەرەبووی زۆریان دەکرد بەڵام دواتر لە کۆتایی مانگی مارسدا لە *فۆرتەینیبلوو میمۆراندۆمە* ناودارەکەی خۆیدا میانڕەوی دەکرد. ئەو دژی دانانی تابلۆیەکی نەگۆڕ بوو لە گرێبەستەکەدا چون لەوانە نەبوو ئەوە زۆر لە خوارێ بوایە؛ دواتر لە مانگی ژوەندا هەر هات و چۆی بوو دوا ئەوە کە ئەڵمانیەکان شکایەتیان کرد و وتیان کە لەوانەیە هاوپەیمانان ڕێژەیەک دیاری بکەن. وادیار بوو کە ئەو جاروبار گوێی بۆ کینیس و مۆنتاگۆ شل دەکرد، هەرکیان میانڕەو بوون، لە کاتی تردا بۆ لۆرد کانلیف، بەڕێوەبەری پێشووی بانکی ئینگلەند، و دادوەرێک، بەناوی لۆرد سامنێر گوێی شل دەکرد. دوانەی ئاسمانی، بە وتەی کینیس کە ناوی لێنابوون، بەگشتی بە دوو پیاوخراپی کۆڕەکە ناسرابوون؛ " ئەوان هەمووکاتێک پێکەوە بۆ ئەم لاو و لا دەڕۆن و کاتێکە بڕیاردراوە بەتایبەت کردەوەیەکی نەشیاو و ناحەز ڕوویدات ئەوان هەرکیان بانگێشت دەکرێن." لیۆد جۆرج ئەو دوانەیەی کردبوو بە نوێنەرانی بەریتانی بۆ کۆمیسیۆنی قەرەبووەکان بەڵام، و کاتێکە لە مانگی مارسدا لێژنەیەکی تایبەت بۆ دەربازبوون لەو تەنگەژەیە دامەزرا، ئەو مۆنتاگۆی هەڵبژارد. ئەمەریکیەک گێڕابوویەوە کە "کاتێک کە ئەو مەبەستی ئەوە بوو کە کارێکی تجاری بکات، مۆنتاگۆ و کینیسی لەگەڵ خۆی دەهێنا؛ کاتێکە ئەو دەیەویست پەرژینێک دابنێت ئەو بانگی سامنێر و کانلیفی دەکرد." کینیس ڕقی لە ڕکابەرەکانی خۆی بوو. لیۆد جۆرج دواتر ڕایگەیاندبوو لەوە کە ئەوان ناتوانن بڕیاری خۆیان ساخ کەنەوە تۆقا بوو. لە ماوەی کۆڕی ئاشتیدا ئەو لەڕووی نادڵسۆزیەوە ئەمەریکیەکانی لەوە گەیاندبوو کە، لەحاڵێکدا بۆخۆی یەکەمایەتی دەدا بە قەرەبووی کەمتر، ئەو ناتوانێت دوانەکان موقناع بکات.٤١٧

هەم کانلیف و هەم سامنێر لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە ئەوەندەی کە لە دەستیان دێت بۆ وڵاتەکەی خۆیان مامەڵەیەکی باش بکەن، بەڵام ئەوان ئامادە بوون دانووستان بکەن- و لە سەرۆک وەزیری خۆیان

دەستوور وەرگرن. کاتێکە سامێر لە کۆمیسیۆنی قەرەبووەکاندا لەسەر کۆمەڵەکردنی خەرجەکان دەڕۆیی و باس و خواستی دەکرد بە هاوکارەکانی ڕاگەیاند کە " پێویستە ئێمە لێرەدا وەک پیاوانی سیاسی هەڵس و کەوت بکەین." ئەگەر لیۆد جۆرج پێی ڕاگەیاندنایە کە وابکەن، هەرکیان بۆ بڕینەوەی بڕەپارەیەکی نەگۆڕ لە گرێبەستەکەدا، و تابلۆیەکی کەمتر، هەنگاویان دەنا. بۆچی وای نەکرد؟ ڕاڕابوونی ئەو لەسەر کەسایەتی ئەو کاریگەری خراپی دانا و بوە هۆی ئاڵۆزیەکی زۆر لەنێوان ئەو و هاوکارەکانی لە پاریس. لامۆنت، کارناسی ئەمەریکی، وتی کە "خۆزگە بەرێز لیۆد جۆرج هەرئەوەندە بە ئێمەی بوتایە کە ئەو خوازیاری چیە، تابەڵکوو ئێمە بمانتوانیایە بزانین کە ئایا بۆچوونەکانی ئەو، و هینەکانی سەرۆک کۆمار هەروەک دەزانین چین، لە ڕاستیدا زۆرلەیەک نزیکن یان ئەوەتا زۆر جیاوازن." بە هەراسانکردنی ئەمەریکیەکان، بۆ وێنە بە ئاراستەکردنی ڕەخنەی توند لە ویلسۆن، لیۆد جۆرج خەریک بوو پێوەندیەک کە ئەو بەهایەکی یەکجار زۆری بۆ دادەنا بخاتە ژێرباری مەترسیەوە. کێشەکە لەوەدابوو کە ئەو بۆخۆشی، و کۆمەڵگای بەریتانی، نەیدەزانی بەدوای چیەوەیە.٤١٨

لەلایەکەوە خوازیاری بەسزاگەیشتنی ئەڵمانیا بوو. لە ناخی دڵەوە - سەرەڕای ئەو شتانەی کە دوژمنەکانی پێیان ئەوت- لیۆد جۆرج لە شەڕوشۆڕ بێزار بوو، و ئەڵمانیا خراپترین شەڕێکی نابۆوە کە تا ئەوکاتە جیهان بەخۆیەوە نەیدیبوو. لەگەڵ ئەمانەشدا ئەو وەک پارێزەرێک سەیری کێشەکەی دەکرد. ئەو بە شاندی نوێنەرایەتی بەریتانیای ڕاگەیاندبوو کە " بەپێی هەر یاسایەکی دادپەروەرانە، بەپێی ئەو یاسایانەی کە سەلمێنراون و بۆ ئەوە دەبێ لەنێوان تاکەکاندا بەکاربرێن، ئەڵمانیەکان لەبەرانبەر سەرجەم خەسارەتەکاندا بەرپرسن و خەرجی قەرەبووکردنەوەشیان هەر لە ئەستۆی ئەواندایە." چون ئەو، بە مانایەک، بۆ بەریتانیا خەباتی دەکرد، ئەو دەبوایە لەوە دڵنیا بوایە کە قەرزدەرانی تری ئەڵمانیا پەرەیان بە داواکاریەکانی خۆیان نەدایە. ئەمە ئامرازێکی کۆنە کاتێک کە دژ بە وڵاتێکی شکستخواردوو بەکاردێت."٤١٩

هەرجۆرێک بێت ئەو سیاسەتمەدارێک بوو. ئەو بەرلە شەڕ وەزیری دارایی بوو، و شارەزای کاروباری ماڵی و تجاری بوو. ئەو دەیزانی کە درەنگ یان زوو بەریتانیەکان دەبێ کەل و پەلەکانی خۆیان سەرلەنوێ بە ئەڵمانیەکان بفرۆشنەوە. ئەو خوازیاری لەناوچوونی ئەڵمانیا نەبوو. لە سەرەتای مانگی مارسدا، کاتێکە سەرۆک کۆمار هێشتا هەر لە وڵاتەیەکگرتوەکان بوو، لیۆد جۆرج لەکاتی نانی نیوەڕۆدا کێشەی قەرەبووەکانی لەگەڵ هاوس تاوتوێ کرد. ئەو بە ئەمەریکیەکەی ڕاگەیاند کە ئەو پێویستی بە ئامادەکردنی " هۆکاریکی پەسەندکراو بۆ خەڵکەکەی خۆی هەیە کە لەبەرچی ئەو سەبارەت بە پرسی خەرجەکانی شەڕ، قەرەبووەکان و شتی تر ئەوانی فریودا. ئەو دانی بەوەدا دەنا کە

ئەڵمانیا توانایی جێبەجێکردنی ئەو بەخشینەی کە بەریتانیەکان و فەرەنسیەکان داوایان دەکرد نەبوە."کاتێکە ویلسۆن لە گەڕانەوەیدا ئەمەی بە گوێ گەیشت لای ناخۆش بوو. ئەو کردیە سەر لیۆد جۆرج کە لەسەر قەرەبووی زیاتر پێداگری بکات. ئەو وتی کە" هیچ شتێک چاتر لەوە نیە کە لەکاتی سەرهەڵدانی قەیرانێکی لەو چەشنە لەپێناو ڕاستیەکدا خۆت لە کار بکێشیەوە." لیۆد جۆرج دڵی بەوە خۆش بوو کە بەرەی داهاتوو بە چاکە نێوی ئەو دەبەن. ویلسۆن بەوی ڕاگەیاندبوو کە "من ئارەزووی شوێنێکی خۆشتر و ڕازاوەتر لە مێژوودا ناکەم."٤٢٠

لیۆد جۆرج ئەم ڕێگا پاکە، بەڵام بێ کەڵکەی، نەگرتە بەر. ئەو سیاسەتمەدار بوو، مەجبوور بوو کە کارێکە عادڵانە بوو لەبەرانبەر واقیعدا بیسەنگێنێت. لەگەڵ ئەمانەشدا ئەو دەبوو لە جیهانێکدا چالاکی بکردایە کە لەوێدا گرنگی بە دەنگی ئازادیخوازی خەڵک دەدرێت. دیاربوو کە لە پاریس گوشارێکی زۆری خرابوە سەر. چاپەمەنیەکانی لیبراڵ بەگشتی داوای ئاشتیگەریان دەکرد، بەڵام ڕۆژنامەکانی کۆنەپارێز بە دەنگی بەرز هاواریان بۆ قەرەبووەی زیاتر دەکرد. نۆرتکلیف بە ئەرکی دەزانی هەتا کۆتایی پشتگری لە لیۆد جۆرج بکات. بارۆنی چاپەمەنیەکان بە بەشێوەیەکی شاراوە و نادیار سەرنووسەرانی *دەیلی مەیل* و *تایمزی* لەوە تێگەیاند کە سەرۆک وەزیر کەوتبوە ژێر کاریگەری هێزەکانی پاڵپشتیکەری ئەڵمانی٤٢١

لەگەڵ ئەمانەشدا لیۆد جۆرج هەستی بەوە دەکرد کە، تا ڕادەیەک، بە هەڵبژاردنەکەی مانگی دیسامری ساڵی ١٩١٨ گەمارۆدرا و مەودای چالاکیەکانی بەرتەسک کراوەتەوە. بەڵێنیەکانی گوشار هێنان بۆ ئەلمانیا- دەستەواژەیەک کەوتبوە سەرزاران " هەتا دەنگی جیکەی لێهەڵدەستێت"- زۆر بەباشی وەرگیران. ئەو لیستەی حەسابی نەتەوەیی هەتاهەتایی بۆ ئەڵمانیا دانابوو. ئەو وتبووی کە " ئێمە بۆ بەدەستهێنانی ئەوە تەنانەت گیرفانەکانیشیان دەدۆزین."دوایەمین بەیاننامەی سیاسی هاوپەیمانی زۆر بە ئاسانی ڕایدەگەیاند کە: " من قەیسەری٢ بە سزا دەگەیەنم. بەزۆری پارە لە ئەڵمانیا بستێنن." زۆربەی ئەو کۆنەپارێزانەی کە لە ئاکامی هەرەس هێنانی هەڵبژاردندا هەلبژێردرابوون تازە هاتبوونە ناو دنیای سیاسەتەوە. بە وتەی کۆنەپارێزێکی ناودار " ئەو پیاوە کەلەڕەقانەی کە گوایە زۆر پیاوانە سەریان لە شەڕی ئەڵمانیا دەرهینابوو" ڕاسپاردەی سەرەکی خۆیان لەوەدەزانی دەنگی جیکە لە ئەڵمانیەکان دەرهێنن. لە مانگی ئاڤریلدا، کاتێکە ئەو لەگەڵ ویلسۆن وتوێژیان دەکرد، لیۆد جۆرج تێلێگرامێکی بەدەست گەیشت لەلایەن ٣٧٠ ئەندام پەرلەمانەوە واژۆ کرابوو و داوایان لیدەکرد کە وتارەکانی هەڵبژاردنی خۆی لەبیر نەچێتەوە و هەر وەفادار بێ پێیان و " لیستەی حەسابەکە بە تەواوی پیشکەش بکات." ئەو بە پەلە گەڕایەوە بۆ لەندەن و لە ١٦ی مانگی ئاڤریلدا بە وتارێکی ترسێنەر لە ئەنجومەنی پیران ڕەخنەگرانی خۆی شۆردەوە. ئەو بە گوێگرەکانی خۆی ڕاگەیاند کە ئەو هەر بە میشکی

دانەهاتوە کە لە بەڵێنەکانی خۆی پاشگەز بێتەوە. پێویست ناکات ئەوان گوێ لە پیاوێکی داخلەدڵ، هەتابڵێی بێ کەڵک بگرن- لێرەدا ئەو بەماناوە لە نێوچاوانی خۆی دەدا- بەڵکوو پێویستە پشت بە سیاسەتمەدارانی جیهان ببەستن تا ئەوەی لەدەستیان دێ بۆ هێمنایەتی و مرۆڤایەتی بیکەن. ئەو هیچ چەپڵە و فیکەیەکی خۆشی پاش خۆی بەجێ نەهێشت. لە گەڕانەوەیدا بۆ پاریس ئەو بە فڕاسیس ستیڤێنسۆنی ڕاگەیاندبوو کە ئەو "بەگشتی ڕای هاوسی بەلای خۆیدا ڕاکێشابوو، بێ ئەوەی سەبارەت بە کۆری ئاشتی شتێکیان بۆ باس بکات."٤٢٢

لەلایەن ئیمپراتۆریشەوە گوشار خرایە سەر. لەلایەک کەنەدایەکان، وەک لە زۆر شوێنی تردا کردبوویان، هەڵوێستی ئەمەریکیەکانیان گرتبوە بەر، ئوستراڵیایەکان داوای زیاترین بەشیان دەکرد. هاجێز سەرلۆمەی کەنەدایەکانی دەکرد، کە ئەو، وەکوو زۆربەی نیشتمانپەروەرانی خۆی، لەمێژ بوو وەک هەرەشەی سەرەکی بۆ ئوستراڵیا سەیری دەکرد، و دژایەتی وڵاتەیەکگرتوەکانی لەبەرانبەر قەرەبووی زۆردا دوور لە پرەنسیپ و خزمەت-بەخۆی دەزانی. بە لیۆد جۆرجی ڕاگەیاندبوو کە وڵاتەیەکگرتوەکانێکی بێ لایەن لە قۆناخەکانی سەرەتای شەڕدا قازانجێکی هەرەزۆری بردبوو، کەچی ئیمپراتۆری بەریتانی خوێن و خەزێنەی ڕژاندبوو و کەلاوەیان کردبوو. بەبێ پارەدانێکی زۆر لەلایەن ئەڵمانیاوە، بەریتانیەکان لە ململانێی داهاتوو لەگەڵ وڵاتەیەکگرتوەکان لەسەر یەکەمایەتیەکی ئابووری جیهانی دۆڕاوە دەبوون.٤٢٣

ڕووبەڕووبوونەوەی لیۆد جۆرج لەگەڵ کێشەی قەرەبووەکان لە ڕاستیدا زۆر سەرکەوتووتر بوو لەوەی کە هاتە بەرچاو. بە دنەدانی ویلسۆن بۆ لەخۆگرتنی مووچەی مانگانە لە قەرەبووەکاندا، ئەو بەشی بەریتانیای بردە ئاستێکی سەرووترەوە. بە ئاماژەنەکردن بە بڕەپارەیەکی نەگۆڕ لە گرێبەستەکەدا (کە ئەویش هۆکاری تەکنیکی ئەقڵانی لەپشت بوو)، ئەو بڕیاری دا لەماڵەوە و لە ئیمپراتۆریەتدا ڕای گشتی بۆ لای خۆی ڕاکێشێ و خۆشحاڵیان بکات. (کاریگەری لەسەر ڕای ئەڵمانیا بابەتێکی تر بوو.) لەگەڵ ئەمانەشدا ئەو بە جۆرێکی تر توانی ئەرخەیانبوونی خۆی مسۆگر بکات کاتێکە ئەو بەنهێنی کۆمەڵناسێکی ناوداری ئەورووپی هێنا سەرئەوە کە دژ بە هەلس و کەوتی زۆر توندوتیژ لەگەڵ ئەڵمانیا ناڕەزایەتیەکی جەماوەری بنێتەوە.٤٢٤ لەکۆتاییدا، ئەو بڕیاری دا کە فەرەنسیەکان وەک مرۆڤانێکی چاوچنۆک و پیسکە، بە لویس-لۆسین کلۆتز، وەزیری ماڵی، وەک هەڵەکاری سەرەکی، بخاتە پەراوێزەوە، ڕۆڵێک کە ئەوان بەگشتی لەگەڵیان بوە و گێڕاویانە.

کلۆتز کە کلیمینجووی وەک " تەنیا جوولەکەیەک کە من تا ئێستا دیتوومە و هیچ شارەزایەکی بەسەر کاروباری ماڵیەوە نەبێت،" ناو لێبرد، لەوەدەچێ لەوڵامی هەمووی ئەو پرسیارانەی

تایبەت بە داهاتووی فەڕەنسەوە وتبێتی کە " ئەڵمانیا پارە دەدات." (لە ڕاستیدا ئەو هۆشداری دەدا کە قەرەبووەکانی ئەڵمانیا نابێ چاوەڕوانیان لێبکرێت کە هەموو شتێک بگرنەوە.) کلیمینجوو زۆر سووک و چرووک لەگەڵ ئەو هەڵس و کەوتی دەکرد، وەکوو هەڵس و کەوت لەگەڵ زۆربەی هاوکارەکانی خۆی. لیۆد جۆرج ئەوی بە بێڕەحم و دڵڕەق دەزانی: " مێشکی و دڵی ئەوەندە بە بۆند پڕکرابۆوە کە شوێنێکی بۆ مرۆڤایەتی نەهێشتبۆوە." تەنانەت ویلسۆنیش کاتێکە نوکتەیەکی سەبارەت بە کلۆتزەوە بیست بزەیەکی هاتێ. کەینیس پێداهەڵکوتنێکی باشی سەبارەت بە کەسایەتی ئەوەوە پاش خۆی بەجێ هێشتوە کە دەڵێ: "جوولەکەیەکی کورتەباڵا، چوارشانەی خڕیلانە، سمێڵ ئەستوور، تەڕپۆش، پاک و خاوێن، بەڵام چاوحیز بوو، و شانەکانی تۆزێک خوار و چەپەک بوون" کە لە هەوڵی ئەوەدابوون نەهێڵێ باری خواردەمەنی کەشتی بەرەو ئەڵمانیای برسی و هەژار بچێت. هەڵبەت، ئەوەی کە کلۆتز دەیکرد وەک بەردەستەی کلیمینجوو دەیکرد. ئەگەر کلۆتز ڕاشکاوانە پشتگری لە قەرەبووی زۆر دەکردەوە، ئەوە دەبوە هۆی ئەوە کە فەڕەنسەیەکان هێرش نەکەنە سەر کلیمینجوو بۆ ئەوەی کە لەبەرانبەر ئەڵماندا هەڵوێستێکی توندی نەبوو. بەنهێنی، کلیمینجوو دانی بەوەدانابوو کە فەڕەنسە قەت بە ئاواتەکانی خۆی ناگات و ئەو لویس لاوچێر، ڕاوێژکاری ئابووری زۆر جێی متمانەی خۆی، ناردبوو تا سەبارەت بە مەرجەکانی میانڕەوانەتر بەنهێنی باس و خواستیان لەگەڵ بکات. لە وت و وێژەکانیاندا، لاوچێر ئاشکرای کرد کە بۆخۆی هەست بە هیچ قازانجێکی درێژخایەن ناکا بۆ فەڕەنسە لە بەمایەپووچ بردنی ئەڵمانیادا.٤٢٥

وەکوو لیۆد جۆرج، کلیمینجوو پێویست بوو کە نیگەرانی ڕای گشتی لە دڵدا بوایە. زۆربەی فەڕەنسیەکان بۆچوونێکی ڕاست و درووستیان گرتبوە بەر. ئەڵمانیا هێرشی کردبوە سەر بلژیک، پەیمانی پاراستنی هەڵوێستی بێ لایەنیەی خۆی خستبوە ژێر پێ، فەڕەنسە، وای نەکردبوو. و هەموو ئەو شەڕە لە سەر خاکی بلژیک و فەڕەنسە بوو. سەردێری ڕۆژنامەیەکی کۆنەپارێز بەناوی *لێ ماتین* ئەم پرسیارەی ئاراستە کردبوو: "پێویستە چ کەسێک لەبەین بچێت؟ فەڕەنسە یان ئەڵمان؟"٤٢٦ بەدڵنیایەوە هێرشبەر و وڵاتی قوربانی بۆی نیە تاوانی خەسارەتەکان بدات. لەوانەبوو ئەمەریکیەکان باسی دیپلۆماسی تازە بکەن بەبێ بژاردنەکان یان سزاکان، بەڵام نەریتە کۆنەکان دەیانوت ئاسایە کە وڵاتی دۆڕاوەش پارە بدات و هێشتا هەر وەکوو خۆی بمێنێتەوە. فەڕەنسە لە ساڵی ١٨١٥دا هەمووی قەرزەکەی دابۆوە، کاتێکە ناپلۆئۆن لە ئاکامدا شکستی خواردبوو، و دوای ساڵی ١٨٧١ بە هەمان چەشن هەر قەرزی دابۆوە. لە هەردوو کەڕەتەکەدا ئەڵمانیا پێی بەخشرابوو؛ ئێستا دەچوو تا پارە بدات. فەڕەنسە و بلژیک لەسەر ئەوە دەڕۆیشتن کە هەر لە سەرەتاوە وڵاتانێکە ڕاستەوخۆ تووشی زیان و زەرەر هاتوون دەبێ لە دابەشکردنی قەرەبووەکاندا

بەکەمایەتیان پێ بدرێت. بلژیک بەخاوێنی هەڵگیرابوو. لە باکووری یەکسەر پیشەسازی فەڕەنسەدا، ئەڵمانیەکان ئەوەی کە بەکاریان هاتبوو بە کەشتی ڕایانگوێستبوو و ئەوەی کە مابۆوە لەناویان بردبوو. تەنانەت کاتێکە هێزەکانی ئەڵمانی لە ساڵی ١٩١٨دا پاشەکشەیان کردبوو، لە دەرفەت کەڵکیان وەرگرتبوو و گرنگترین کانزاکانی خەڵووزی فەڕەنسەیان تەقاندبۆوە. هەروەک کلیمینجوو بە توورەیەوە باسی کردبوو کە :" ئەو دڕندانەی کە لە داهاتوودا مێژوو لەبارەیانەوە دەگێڕێتەوە ئەوەی کە لە ناوچەکانی جەنگی بەردەستیان کەوتبوو لەگەڵ خۆیان بردبوویان، بەڵام هیچ شتێکیان لەبەین نەبردبوو؛ ئەوان سەقامگیر ببوون تا ئەوەی کە لەبەردەستیان داهەیە لەبەینی خۆیاندا دابەشی بکەن. لە هەرحاڵ، ئێستا دوژمن بەشێوەیەکی سیستەماتیک ئەوەی کە هاتبوە بەردەستی لەناوی بردبوو." بەپێی بڕیاری ئەو بەڵگانەی کە لە ئەلمانیەکان داگیرکرابوون، پێدەچوو ئەڵمانیەکان خوازیاری ئەوە بوویێتن کە پیشەسازی فەڕەنسە لەناوبەرن و مووچەیەکی دیار بۆ خۆیان بهێڵنەوە.٤٢٧

فەڕەنسە و بلژیک هیواداربوون کە لە کۆتاییدا خەرجەکانی شەڕ بخەنە حیسابی قەرەبووەکانەوە. لێرەدا، بلژیک، هیچ نەبێ جارێک، باشی بۆ کەوتبوو: ویلسۆن ئەمەی ڕوونکردبۆوە کە کاتێکە ئەو باسی بووژاندنەوەی بلژیک دەکات مەبەستی ئەو هەمووی ئەو خەسارەتانەیە کە بە هێرشی سەرەتایی و نایاسایی ئەڵمانیا لە مانگی ئاگۆستی ساڵی ١٩١٤ هاتنە ئاراوە. کەیسی فەڕەنسە لاوازتر بوو. کلیمینجوو، کە نەیدەویست ئەمەریکیەکان قەڵس بکات چون لە بوارەکانی تر کە بۆ هێمنایەتی فەڕەنسە یەکجار هەستیار بوون پێویستی بە پشتگری ئەوان بوو، بڕیاری دابوو باسی ئەمە هەر نەکات. ئەو هەستی بەوە کردبوو، هەرچەند بە عالەم ئاشکرا نەیدەکوت، کە بۆ بڕەپارەیەک کە ئەڵمانیا دەبوو بیدایە سنوورێک هەیە. کلۆتز لای کۆمیسیۆنی کاروباری دەرەوەی ئەنجوومەنی نوێنەرانی فەڕەنسە دانی بەوەدا هینابوو کە خەرجەکانی شەڕ تابلۆیەک درووست دەکەن کە تەنانەت چیرۆکنووسانیش لە خەونە هەرە ئاڵۆز و دژوارەکانی خۆیاندا لەگەڵی ڕووبەڕوو نەبوویێتنەوە.٤٢٨

لەگەڵ ئەمانەشدا فەڕەنسیەکان هەستیان بەوەکردبوو کە، چون بەریتانیا زیاتر لە فەڕەنسە لە شەڕدا خەرجی کردبوو، وەکوو مەخاریجی کەل و پەلی جەنگی بەڵێنیان دابوو کە ئەڵمانیەکان لە کۆتاییدا هەرچەند بدەن بەشی بەریتانیەکانی بە زۆریەوە لێ بدەن. فەڕەنسەیەکان بەرەبەرە ڕێگاکەی خۆیان گۆڕی، بیانوویەک کە دەیانهێناوە ئەوە بوو کە تەنیا خەسارەتەکانی ڕاستەوخۆ- وەکوو شارۆچکە و گوندەرووخاوەکانی ئەوان، کانزا خەڵووزەکانی لافاوبردووی ئەوان، هێڵە پچڕاوەکانی ڕێگاکانی شەمەندەفەری ئەوان- دەبێ مەبەست بن. ئەوەش لە سەدا حەفتای هەمووی پارەکانی ئەڵمانیای دەگرتەوە، لەوانەیە بەریتانیا لە سەدا ٢٠ و ئەوەی کە دەماوە بۆ داواکارەکانی تر- بلژیک، ئیتالیا، سێربستان- بوو.

دوای چەلەحانەیەکی زۆر، بەریتانیا پێداگری لەسەر سەدا ٣٠ دەکرد، بۆ فەرەنسەیەکانیش لە سەدا ٥٠ و ئەوەشی کە دەماوە لەنێوان هێزە بچووکەکانی تر دەبوو دابەش کرایە. گەیشتن بە ڕێکەوتنامەیەکی کۆتایی لەسەر سەدا ٢٨ بۆ بەریتانیا و لە سەدا ٥٢ بۆ فەرەنسە تا ساڵی ١٩٢٠ی خایاند.٤٢٩

جێی ئاماژەیە کە فەرەنسەیەکان باشترین و زۆرترین زێدەمافیان پێی گەیشت. ئەوان دەبوایە لەسەر کۆی تابلۆیەک کە بڕیار بوو لەلایەن ئەڵمانەوە ببەخشرایە ڕەچاوی نموونەیەکی هاوچەشنیان بکردایە. کلیمینجوو، کە هەمیشە بیری بەلای دانووستانی هەمەلایەنەوە بوو، لەوانەیە هەربەزووی تابلۆیەکی بەرزی دارشتبێت تارادەیەک بۆ هاندانی ئەمەریکیەکان تا پێشنیارەکانی فەرەنسەیەکان بۆ هاریکاری بەردەوامی ئابووری هاوپەیمانی لەبەرچاو بگرن. لە کۆتایی مانگی فەوریەدا، کاتێکە دەرکەوت کە ئەمەریکیەکان ڕازی نین، لاوچێر تا ٨بیلیۆن پۆند هاتەخوارێ (٤٠بیلیۆن دلار)، درووست چارەگێکی ئەو شتانەی کە فەرەنسە داوای کردبوون. کانلیف، نوێنەری بەریتانیا، لە ٩.٤بیلیۆن پۆند کەمتر ڕازی نەبوو (٤٧بیلیۆن دۆلار). بەریتانیەکان گومانی ئەوەیان هەبوو کە فەرەنسەیەکان لەگەڵ ئەمەریکیەکان لەسەر تابلۆیەکی نزمتر دەست بە یەکی بکەن و واکەن لە ئەوان کە داوای زۆرترین بەش بکەن. دیمەنێک کە لەلایەن کەینیس و کەسانی تر لە فەرەنسەی تۆڵەسێنەر زۆر بەجوانی و ڕێک و پێکی کێشرابوو، و مەبەستی وردکردن و هاڕینی ئەڵمانیا بوو، ڕوو لە هەڵوشانەوە بوو.٤٣٠

لە کۆتاییدا، زیاتر بەهۆی پێداگری بەریتانیەکان، دەرکەوت کە ڕێکەوتن لەسەر تابلۆیەک بۆ مەبەستی پێکهێنانی گرێبەستێک دوور لە ڕاستی بوو. لە کۆتایی مانگی مارسدا ڕێبەرانی هاوپەیمانی، کە ئێستا لە شۆڕای چواریاردا کۆبوونەوەیەکیان سازدابوو، لەسەر ئاڵتێرناتیڤی کۆمیسیۆنی تایبەت بڕیاریان ساخ کردبۆوە. یەکێک لە کارناسانی ئەمەریکی لە یاداشتەکەی خۆیدا هێنابووی کە ئەو پەکخستنەوەیە " بەریتانیای گەورە و فەرەنسەی لە کێشەکانی خۆیان ڕزگار دەکرد واتە لە کێشەی تێگەیاندنی جەماوەری خەڵک لە بڕەپارەیەکی کەم کە بڕیار بوو لە قەرەبووەکان پێیان بگات چون هەردوو سەرۆک وەزیر لەسەر ئەو باوەڕەن کە ئەگەر بێتو ڕاستیەکان دەرکەون حکوومەتەکەیان لەسەر کار نامێنێت." ئەو ڕاستی دەکرد. کاتێکە کۆمیسیۆن کۆیەکی کۆتایی بە بڕی ١٣٢بیلیۆن مارکی تەڵا (نزیک بە ٦.٥بیلیۆن پۆند، یان ٣٤بیلیۆن دۆلار) لە ساڵی ١٩٢١دا دابین کرد، هەڵچوونەکان سەبارەت بە ئەڵمانیا، بەتایبەت لە بەریتانیا، ڕوولە دامرکان بوون.٤٣١

*        *        *        *

شاندی نوێنەرایەتی ئەڵمانیا کە لە مانگی مەیدا هاتبوو بۆ ڤێرسایلێس ڕەخنەیەکی توندیان لەبابەت ئەو بڕیارەوە ئاراستە کردبوو کە هەتا دواتر کە گرێبەستەکە واژۆ کرابوو تابلۆکانی کۆتایی قەرەبووەکان

ڕاتەگەیەنرابوون. " بۆ مەبەستی ڕزگارکردنی خەڵکی ئەڵمانیا لە بەخشینی پارەی زیاتر هیچ سنوورێک دیاری نەکراوە، پێوەری ژیانی خەڵک لەبەرچاو نەگیراوە بەڵکوو تەنیا بەپێی توانایی کارکردنیان بۆ وەدیهێنانی داواکاریەکانی دوژمنانیان لەگەڵیان مامەلە کراوە. بەم پێیە خەڵکی ئەڵمانیا بە کاری کۆیلەتی هەتاهەتایی مەحکووم کراون." بەپێی ئەو ترس و دڵەڕاوکێیەی کە لەبابەت مەرجەکانەوە لە ئارادایە، هەڵچوونی وا ئاسایی دەنوێنێت؛ لە هەرحاڵدا لێکدانەوەکە لەخۆڕا ڕەنگ و بۆی ڕەشبینی بەخۆوە گرتوە. کۆمیسیۆنی تایبەت لەسەر قەرەبووەکان پێویست بوو توانایی ئەڵمانیای بۆ بەخشینی پارە لەبەرچاو بگرتایە؛ لەگەڵ ئەوەش پێویست بوو لەگەڵ خودی ئەڵمانیەکان ڕاوێژی بکردایە. بێجگە لە مانە، بابەتەکانی خەسارەت کە بەو پێیە قەرەبووەکان دەدرانەوە زۆر بەرتەسک و سنووردار بوون؛ ڕەنگە تەوا نەبوویێتن، چون ئەوان مووچەیان لەخۆ دەگرت، بەڵام ئاشکرابوو کە بێ سنوور و نەگۆڕ نەبوون.٤٣٢

بەشی یەکەمی ناو گرێبەستەکە لەسەر قەرەبووەکان دوو بەندی لەخۆ گرتبوو- بەندەکانی ٢٣١ و ٢٣٢- کە لە ئەڵمانیا کەوتبوە بەر لۆمەیەکی تایبەتەوە و ببوە هۆی ئازاری ویژدانی هاوپەیمانان. بەندی ٢٣١ بەرپرسایەتی هەمووی ئەو تاوانانەی کە بەهۆی جەنگەوە درووست ببوون دەخستە ئەستۆی ئەڵمان و هاوپەیمانەکانی. بەندی ٢٣٢ بەرپرسیاری بێ سنووری بەرتەسک دەکردەوە بەو مانایە کە چون سامانە سرووشتیەکانی ئەڵمانی لەڕاستیدا تەسک و سنووردار بوون، دەبێ داوای لێکرێت کە تەنیا خەسارەتە تایبەتەکان بداتەوە. بەندی یەکەم- کە دواتر بە بەندی تاوانی جەنگ ناوی دەرکرد- دوا مشت و مڕیکی چڕ و پڕ و پێداچوونەوەیەکی زۆر پێشکەش کرابوون، لە سەرەتا بۆ مەبەستی ڕازی کردنی بەریتانیەکان و فەڕەنسیەکان کە بەرپرسیاری یاسایی ئەڵمانیا بە درووستی دامەزرابوو. ئەمەریکیەکان پشتگریان لەوە کردبوو و یەکێک لە پارێزەرانی لاو و کارەمەی خۆیان کردبوو بە بەرپرسی ئەو ئیشە. جان فۆستێر دۆلێس، سکرتێری داهاتووی وڵات، لای وابوو کە ئەو هەم دامەزرینەری بەرپرسیاری بووە و هەمیش سەرکەوتووانە بەرتەسکی کردۆتەوە و ئەوە کە، بەگشتی، گرێبەستەکە تەوا لەبار و دۆستانە بووە. هاوپەیمانانی ئەورووپی بە پلانەکەی ئەو زۆر خۆشحاڵ بوون. لیۆد جۆر کە هەمیشە لەبەرانبەر تیبینیەکانی سیاسیدا هەستیار بوو وتی کە " کۆمەڵگای ئینگلیزی وەکوو کۆمەڵگای فەڕەنسیی، لایان وایە کە پێویستە ئەڵمانەکان بەگشتی بە ئەرکی بزانن هەمووی ئاکامەکانی دەستدرێژی کردنی خۆیان بۆ ئێمە قەرەبوو بکەنەوە. کاتێکە ئەمە جێبەجێ بوو ئێمەش دێینە سەر پرسی توانایی پارەدانی ئەڵمانیا؛ ئێمە هەرهەمووومان باش دەزانین کە ئەو ناتوانێ زیاتر لەو بڕەپارەیەی کە ئەم بەڵگەیە داوای دەکات ببەخشێ." بەبۆچونی لاوچێر، ئەگەر ئەڵمانیەکان لە داپینی ئەو بڕەپارە تایبەتەی خەسارەتەکان خۆ بدزنەوە، هاوپەیمانان دەتوانن بۆ هەمیشە بە داواکردنێکی بێ سنوور هەڕەشەیان لێبکەن. کەس گومانی بۆ ئەوە نەدەچوو کە لەسەر خودی بەندەکان ئاڵۆزیەک بێتە سەر ڕێ.٤٣٣

# ١٦

# بەبێ چارەسەری مانەوەی مەرجەکانی ئەڵمانیا

کاتێکە ویلسۆن لە ١٤ی مانگی مارسدا گەڕایەوە بۆ پاریس نە چارەنووسی قەرەبووەکان و نە چارەنووسی ڕاینلەند هێشتا دیاری نەکرابوون. سەرۆک کۆمار خێرا لە کۆبوونەویەکی نهێنیدا لەگەڵ لیۆد جۆرج چاویان بە یەک کەوت، لیۆد جۆرج پێشنیاری کرد کە جۆرە گارانتیەکی میلیتاری، هاوڕێ لەگەڵ توونێلی کاناڵی خۆشەویستی ئەو، لەوانەیە بتوانێ فەڕەنسەیەکان ڕازی بکات. هەرکیان بڕیاریان هێنابوە سەر ئەوە کە ئەگەر هات و فەڕەنسە هێرشی هێنا بچن بۆ یارمەتی فەڕەنسە. لەبەرانبەر ئەوەدا، فەڕنسە بە ئەرکی دەزانێت واز لە پلانەکانی خۆی بۆ مەبەستی دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی ڕاین بێنێت. ویلسۆن لای وابوو کە دەکرێ کلیمینجوو بێتە سەر بار: "کاتێکە قولاپەکەتان بۆ هاویشت، لەپێشدا تۆزیکی بۆ شل کەن، دواتر لێگەڕێن با تۆڕەکە تۆزێک بچێتە خوارەوە، دواتر بیکێشنە دواوە، لە کۆتاییدا هەڵیتەکێننە دەرەوە و حەوایدەنە سەر عەرزەکە."٤٣٤

ئەو دوانیوەڕۆیە کلیمینجوو لە کریلۆن پێوەندی بەو دوو کەسەوە گرت. سەرلەنوێ باسی نەهامەتیەکانی فەڕەنسە، ترس و دڵەڕاوکێکانی لە داهاتوو، پێویستبوونی بە ئەڵمانیا بۆ وازهێنان لە ڕاینی بووژاندەوە. ویلسۆن و لیۆد جۆرج پێشنیارەکەی خۆیان پێشکەش کرد. کلیمینجوو گەشبین بوو بەڵام بۆ تاوتوێکردنی بابەتەکە داوای کاتی دەکرد. بۆ ماوەی دوو ڕۆژ کلیمینجوو و نزیکترین ڕاوێژکارەکانی، وەکوو سەرۆک وەزیری دەرەوەی خۆی، پیچۆن، و تاردیۆ زۆر قووڵ لە پێشنیارە تازەکە تێفکرین. ئەو بە خۆی نەپەرمی لەگەڵ کابینەکەی خۆی یان پۆینکاری ڕاوێژ بکات. تاردیۆ دانی بەوەدا هێنا کە ئەگەر بێتو ئەوان بەرەنگاری ئەوە ببنەوە ئەوا تووشی جەنایەت هاتوون، بەڵام هێشتا هەر بەو حاڵەش هەست بە هەبوونی کێشەیەکی تر دەکرا: "حکوومەتێکی فەڕەنسەیی کە تەنیا بەوە و چیتر

ناخۆشحاڵ بێ تووشی جەنایەتێکی هاوچەشن هاتوە." وڵامیکی فەرمی لە مانگی مارسدا درایەوە کە فەرەنسە پێویستی بە گەرەنتی تر هەیە: داگیرکردنی ناوچەی ڕاینلەند و پاسگاکانی بۆ ماوەی لانی کەم پێنج ساڵ؛ نەبوونی هێزی ئەڵمانی لەوێ و لە پەنجا مایلی بەری ڕۆژهەڵاتی قەراخ چۆمەکە. ویلسۆن زۆر تووڕەببوو. قسەکردن لەگەڵ فەرەنسەیەکان وەکوو کۆنترۆڵکردنی تۆپی ڕابێر وابوو: " تۆ هەوڵ ئەدەیت شوێنەوارێک دابنێیت بەڵام هەرکە قامکت دەبزێوی تۆپەکە وەک جاری جاران خرە بە دەستەوە." تەنانەت باڵفۆریش لە بێ دەنگی ئاسایی ئەو وەزمان هاتبوو. ئەو بە لیوْد جۆرجی ڕاگەیاندبوو کە فەرەنسە وای بە قازانجە کە لەپێناو سیستەمێکی بەهێزی جیهانیدا خەبات بکات، "زۆریەک لە ئەوان بە گاڵتەیەکی نیوەنهێنی و نیوەدیار سەیری ئەگەری هاتنەدی ئەو سیستەمە دەکەن." بەبێ ئەوە، " دەستکاری کردنی بەرە جەنگی ڕاین بە هەر شێوەیەک کە بووە ناتوانێ فەرەنسە بە شوێنێک بگەیەنێ جگە لەوەی کە هەر وەک هێزێکی پلە-دووهەم بهێڵێتەوە، بە سەرلەقاندنێکی دراوسێ گەورەکانی خۆی لە ڕۆژهەڵات بکەوێتە لەرزین، و ڕۆژبەدوای ڕۆژ چاولەمستی گۆڕانکاریەکان و شانسەکانی دیپلۆماسیەکی بگۆڕ و هاوپەیمانانی دوودڵ بێت."٤٣٥

مانگی دواتر یاداشت و تێبینی زۆری بەخۆوە بینی کە هەر لە هات و چۆ دابوون چوون فەرەنسەیەکان لە هەوڵی گەمارۆدانی گەرەنتی ئانگلۆ-ئەمەریکەن بە مەرجی زیاتر بوون. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ کلیمینجوو و هاوکارەکانی بە ڕاگەیاندنی پێشنیاری تازە بەرەگەیان بە بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان دەگرتن و لە یەخەیان نەدەبوونەوە: پەرەدان بە ناوچەی غەیری نیزامی لە بەری ڕۆژهەڵاتی قەراخ چۆم، پێکهێنانی لێژنەیەکی لێکۆڵینەوە بە دەسەڵاتی تەواوەوە، یان بەخشینی مافی داگیرکردنی ناوچەی ڕاینلەند بە فەرەنسە ئەگەر هاتو ئەڵمانیا هیچ کام لە مەرجەکانی تری گرێبەستی ئاشتی لەبەرچاو نەگرت، لە چەکداماڵینەوە بگرە تا دەگاتە بەخشینی قەرەبووەکان.٤٣٦

و ئەوان سەرلەنوێ داوای ساریان دەکردەوە، شوێنێک کە لێوی ڕۆژئاوای باشوور لەگەڵ ئالساسێ-لۆرەین یەکیان دەگرتەوە. شوێنێک کە کاتی خۆی ناوچەیەکی بێ دەنگی کشت و کاڵی بە دەر و دۆڵ و چۆمیکی ڕازاوە بوو لە سەدەی نۆزدەهەمدا کرابوو بە کانزای سەرەکی خەڵووز و ناوچەیەکی پیشەسازی. لە ساڵی ١٩١٩دا، کاتێکە خەڵووز نزیک بە هەمووی پێداویستیەکانی سووتەمەنی ئورووپای دابین دەکرد هەر ئەوەش بەهای ناوچەکەی دووچەندان کردبوو. با فەرەنسە پێی ناخۆش بووبێت، نزیک بە هەمووی ٦٥٠،٠٠٠ دانیشتووی ناوچەی سار ئەڵمانی بوون. فەرەنسەیەکان هەوڵی مشت و مڕکردنی زۆر کەم وێنەیان دا: شارۆچکەی سارلوویس لەلایەن لویسی XIV دامەزرابوو، ناوچەکە بۆ ماوەیەکی کورت لە کاتی شۆڕشی فەرەنسەییدا هاتبوە ژێر

ڕکێفی فەڕەنسەیەکان و سنوورەکانی ساڵی ١٨١٤ زۆربەی ئەو ناوچەیەی بە فەڕەنسە بەخشی. ویلسۆن بە کلیمینجووی ڕاگەیاندبوو کە " تۆ بناخەی داواکاریەکەت لەسەر شتێک دادەڕێژی کە سەد و چوار ساڵ لەوەپێش ڕووی داوە. ئێمە ناتوانین لەسەر بنەمای بارودۆخێک کە لەسەردەمێکی ئاوا دووردەستدا هەبووە سەرلەنوێ ئورووپای پێ ڕێک خەینەوە."کاتێکە فەڕەنسەیەکان باسی قەرەبووەکانیان دەکرد باشتر هەڵس و کەوتیان کرد. ویلسۆن لە چاردە خاڵەکەیدا باسی قەرەبووکردنەوەی ئەو خەسارەتانەی کردبوو کە ئەڵمانیا بەسەر فەڕەنسەیدا داهێنابوو، و هەموولایەک لەسەر ئەوە کۆک بوون کە ئەڵمانیەکان بە ئانقەست ناوچەکانی خەڵووزی فەڕنسەیان لەبەین بردبوو. کارناسانی بەریتانی و ئەمەریکی، کە لە مانگی فووریەوە بەشێوەیەکی نهێنی پێکەوە خەباتیان کردبوو، پێشنیاریان دەکرد کە فەڕەنسە دەبێ خەڵووزی ناوچەی سار بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. فەڕەنسەیەکان هەر لەسەر پێوەلکاندنی یەکجاری وەک جاران سوور بوون و پێداگریان دەکرد.٤٣٧

لە کۆتایی مانگی مارسدا، لیۆد جۆرج نیگەرانی شێوازی داڕشتنی مەرجەکانی ئەڵمانی بوو. فەڕەنسەیەکان پێداگریان لەسەر کۆنترڵکردنی چڕوپڕی ناوچەی ڕاینلەند و لکاندنی سار دەکرد. لە ڕۆژهەڵات، پۆڵەندا خەریک بوو دەستی بە ناوچەیەکدا ڕادەگەیشت کە نەک تەنیا سێ ملوێن ئەڵمانی بەڵکوو کانگایەکی گەورەی خەڵووزی لە سیلیسیا لەخۆ گرتبوو. پێدەچوو بۆچوونی گشتی خودی ئەو لەپێنا ئاشتیەکی خێرا و میانڕەوانەی ئەقڵانی کەوتبێتە جموجوڵ. کارناسانی مالی و ئابوری سەبارەت بە تێچوەکانی ئەو هێزە گەورانەی کە بە سەرتاسەری گۆی زەویدا پرژوبڵاو ببوونەوە ئاگاداریان دەکردەوە. ئەو لەمەڕ قەیرانی بێکاری لە وڵات و لەمەڕ شۆڕش لە ئورووپا دڵەڕاوکێی لەدڵ دابوو. لە ٢١ی مانگی مارسدا دەنگۆی ئەوە پەیا بوو کە گوایە کمونیستەکان لە مەجارستان دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست. ڕۆژی دواتر لیۆد جۆرج و چەند کەس لە ڕاوێژکارە هەرە نزیکەکانی خۆی، وەکوو کێر، هانکەی و هێنری ویلسۆن، لە دانووستانەکانی تایبەت بە گرێبەستی ئەڵمان پشوویەکیان خواست تا کۆتایی حەفتە لە هۆتیل دی فرانس یت دیئانگلیتیری لە گەڕکێکی دلڕفێنی پاریس بەناوی فۆینتاینیبلوو تێپەڕ کەن. پارتەکە سەردانی کۆشکەکە و پارکی سەرنجڕاکێشی ئەویی کرد، بەڵام مەبەستی سەرەکی ئەوە بوو چاوێکی تازە بخشێنێ بە گرێبەستەکەدا بەگشتی و بە ئەنجامێک بگات کە بەریتانیا، فەڕەنسە و وڵاتەیەکگرتوەکان بتاوانن پەسەندی بکەن.

هەر ئەو دوانیوەڕۆیە، لیۆد جۆرج بانگی لە تیمەکەی کرد بۆ ژووری نهێنی دانیشتنی خۆی و وەک هاوپەیمانێک یان دوژمنێک بە هەریەکەو ڕۆڵێکی سپارد. ئەوەندەی کە ئێمە بزانین، هیچ

کامیان ڕۆڵی وڵاتەیەکگرتووەکانی نەگرتە ئەستۆ. هانکەی، کە بەریتانیای گرتبوە ئەستۆ، بەڵگەی دێناوە لەسەر ئەوە کە ئەڵمانیا شیاوی ئەوە بوو سزابدرێت و دەبێ خێرا لە کۆلۆنیەکانی خۆی دەست هەڵگرێت. هەجۆرێک کە بوە، هاوپەیمانان پێویست ناکا کیناوی و هەستی تۆڵەسەندنەوەیان بێت، ئەگینا ناوەندی ئوورووپا دەدەن بە دەست وەیشوومەی بۆلشویزمەوە. لەبەر ئەورووپا و خەڵکانی دانیشتووی ئەوێ، پێویستە ئورووپا بگەڕێندرێتەوە سەرباری پێشوو. پێویستە ببێ بە یەکێک لە ئەندامانی کۆمەڵەی گەلان. ئەمە لە بەرژەوەندی بەریتانیا دابوو، چون نەیدەویست بۆ هەتاهەتایە هێزەکانی لەسەر قارەی ئورووپا بمێنێتەوە. لەگەڵ ئەمانەشدا هانکەی گوێگرەکانی لەوە ئاگادار کردەوە کە بەسەر ئەوانەشدا ئەوە هێزی دەریایی بەریتانیا بوو کە بۆ جارێکی تر وڵاتی ڕزگار کردبوو؛ پێویستە ئەوان ئاگاداری هەر هەڕشەیەک بۆ سەر هێزی دەریایی خۆیان ببن.

هێنری ویلسۆن بە حەز و خولیایەکی زۆرەوە خۆی ئاوقای دوو ڕۆڵێکە دەبوا بیگێڕایە کرد. یەکەم جار، شەپکەی نیزامی خۆی هێنایە بەرچاوانی تا ڕۆڵی ئەفسەرێکی ئەڵمانی بگێڕێت. " من سەبارەت بە دۆخی ئێستای خۆم باسم بۆ کردن، بەڵام هەستم بە هیچ هیوایەک نەکرد، چون لەو مەرجە قورسانەی کە بە سەر منیاندا سەپاند ئەوەم بۆ دەرکەوت کە بڕیاریان لەسەر ئەوە ساخ کردۆتەوە کە هەر بە یەکجاری بمکووژن. چون نەمدەتوانی بە تاقی تەنیا لەگەڵیان بەر بێم هەڵگدەگەڕامەوە بۆ ڕووسیە، و بە درێژایی زمەن یارمەتی ئەو وڵاتە هەڵوەشاوەم دەدا تا سەرلەنوێ یاسا و دەستووری بۆ بگەڕێتەوە، و دواتر لەگەڵی پەیمانم دەبەست و دەمکرد بە هاوپەیمانی خۆم." دواتر ئەو کرا بە ژنەفەڕەنسەیەک کە خۆی وتەنی هۆکارێکی سەرەکی بوو لە دامەزراندنی باوەڕی فەڕەنسەییدا. ئەو وێنەیەکی بزوێنەری کێشایەوە لە "قوربانیانی زۆربەی مێردەکان، کوڕان و پیاوانی ئاسای ئەوان، ترس و دڵەڕاوکێی لە تاقەتبەدەر و هەڵاواردنی دووروودرێژ، خەساراتی ماڵی، و هەوڵ و تەقەلای لەڕادە بەدەر بۆ وەکارخستنەوەی وڵاتی خۆیان." هەڵبەت ئەوان خوازیاری تۆڵە و قەرەبووکردنەوە بوون لە ئەڵمان، و ئەوان دەیانەویست لەوە دڵنیا بن کە ئەڵمان قەت بۆ جارێکی تر تووشی ئازار و ئەزیەتیان ناکات.٤٣٨"

لیۆد جۆرج بە سەرنجەوە گوێی شل کرد و دواتریش بۆچوونەکانی خۆی ئاراستە کرد. مەبەستی سەرەکی ئەو ئەوە بوو کە نابێ مەرجەکانی ئاشتی ببنە هۆی لەبەینبردنی ئەڵمانیا. کاتێکە وتوێژەکان درێژەیان هەبوو، کێر ئەرکی ئەوەی پێ سپێردرا کە سەر لە هەمووی ئەمانە دەربینێ و پووختەی وتارەکە ڕاگەیەنێت. بەیانی ڕۆژی دووشەنبە، ئەو ڕەشنووسێکی کۆتایی تایپ کردبوو- یاداشتی فۆنتەینبلوو. لیۆد جۆرج بە وورەیەکی بەرزەوە گەڕایەوە بۆ پاریس. فرانسیس ستێڤێنسۆن لە

گوزارشـەکەی خۆیـدا هێنـابووی کـە " مەبەسـتی ئـەو لـەم حەفتەیـەدا تجارەتـە. ئـەو چیتـر لـە فەڕەنسەیەکان یان ئەمەریکیەکان شتی هیچ و پووچ و هەڵیت و پڵیت قەبووڵ ناکات. ئەو سەبارەت بە ئاشتی شێوەتێڕوانینێکی دوورهاوێژی گرتۆتەبەر، و پێداگری لەوە دەکات کە نابێ شێوەیەک بێت کـە بـۆ سـاڵیانی داهـاتوو ناخۆشـی و دژواری پاشـخۆی بـەجێ بێڵـێ و خواینەخواسـتە ببێتـە هـۆی دروستبوونەوەی شـەڕێکی تـر."٤٣٩ (ئـەو دڵسـۆزی خـۆی بـەجێ هێنـا و نـە لەنانـەوەی ئاسـتەنگ و دژواری و لە لە پەکخستنەوەی داڕشتنی مەرجەکانی ئەڵمان دەستی هەبوو.)

لیۆد جۆرج لـە شـۆڕای چواریـاردا یاداشـتەکەی پێشـکەش بـە هاوکارەکـانی خـۆی کـرد. ئـەو یاداشـتە دەیکـردە سـەر ئاشـتیکەران تـا ئاشـتیەکی میانڕەوانـە بنێنـەوە کـە درێژخایـەن بێـت. ئـەو لـە نووسراوەکەی خۆیدا هێنابووی کە" ڕەنگە ئێوە بتوانن ئەڵمانیا لە کۆلۆنیەکانی خۆی دادچۆڕێنن، لـە چەک و کەل وپەلی سەربازی کەم کەنەوە و تا ئاستی هێزێکی ئاسایشی بەرن و هێزی دەریایەکـەی ئەویێ تا ڕادەی هێزێکی پلە-پێنجەم بەرن. بە هەمان چەشن لە کۆتاییدا ئەگەر هەست بکات کە لـە ئاشـتی سـاڵی ١٩١٩دا نادادپەروەرانـە لەگـەڵی مامەڵـە کـراوە ئـەویش دەگـەڕێ بـە دوای ئـامرازی تۆڵەساندنەوە لە داگیرکەرەکانی." ئەوان نابێ بە نیشتەجێکردنی ملوێنان ئـەڵمانی یان مـەجاری یان کەمینەکانی تر لەچوارچێوەی دەسەڵاتی نامۆییدا میراتێکی ژەهراوی بۆ ئورووپا بـەجێ بێڵن. ئـەوان نابێ هێزەکـانی شۆڕشـگێڕ دنـە بـدەن و ڕێگایـان پـێ بـدەن دزە کـەنـە نـاو خـاکی ئورووپـاوە. بەگشـتی، ئەوان نابێ ئەلمانیا بخەنە پەراوێزەوە. " گەورەترین مەترسیەک کە لـەو هـەل و مەرجەی ئێستادا مـن هەسـتی پێدەکـەم ئەمەیـە کـە ئـەڵمانیا لەوانەیـە چارەنووسـی خـۆی لەگـەڵ بۆلشـویزم یـەکخات و سامانەسرووشـتیەکانی خـۆی، بلیمەتـەکانی، هێـزی بـەربڵاوی ڕێکخەرانـەی خـۆی بخاتـە خزمـەت دەمارگرانی شۆڕشگێڕ کە ئاواتی هـەرە مـەزنیان داگیرکردنی جیهانە بەشێوازی چەکدارانە لـەپێناو ئامانجەکانی بۆلشویزمدا." لیۆد جۆرج وێنەی داهاتوویەکی ئاڵتێرناتیڤی کێشاوە، کە تێیدا بەریتانیا، وڵاتەیەکگرتوەکان، فەڕەنسە و ئیتالیا لەسەر تەسک کردنەوەی دامەزراندنی هێزی دەریایی خۆیـان و سـووپاکانی خۆیـان ڕێدەکـەوتن، و تێیـدا کۆمـەڵـەی گـەلان، سەرپەرشـتیاری " مـافی نێونەتـەوەیی و ئـازادی نێونەتـەوەیی لەسەراسـەری جیهاندا،" دانی بـە ئـەڵمانێکی تـازە، دیموکراتیـک دادەنا، هەرکـە توانی لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێ و سەقامگیری ئەوتۆ بەدەست بێنێ.

ئـەم دەسـکەوتە چـۆن دەهاتـە دی؟ بەسـەر ئەوەشـدا ئـەڵمانیا دەبـێ لـە ناوچـەکانی خـۆی هـەر بدۆڕێنێ، بەڵام نەک بەو ڕادەیەی کە هەندێک خەڵک خوازیاری بوون. بەسەر ئەمەشدا پۆڵەندا دەبێ ڕاڕەوێکی بۆ دەریا هەبێت، بەڵام هەتا دەکرێ نەهێڵن ئەڵمانیەکان بخرێنە چوارچێوەی دەسەڵاتی

پۆڵەندیەوە. ناوچەی ڕاینلەند، کە بەشێوەیەکی ڕێکوپێک لە حاڵەتی نیزامی هاتۆتە دەرەوە، دەبێ لەگەڵ ئەڵمانیا بمێنێتەوە. لیۆد جۆرج هێشتا بڕیاری خۆی لەسەر ناوچەی سار یەکلانەکردبۆوە؛ لەوەدەچوو فەڕەنسە بیتوانیایە سنوورەکانی ساڵی ١٨١٤ی هەبوایە، یان تەنیا خاوەنی کانزاکانی خەڵووز بوایە. هەڵبەت، پێویستە ئەڵمانیا دەست لە هەمووی کۆلۆنیەکانی خۆی هەڵگرێت. و، بەڵی، ئەو وڵاتە دەبێ قەرەبووەکانیش بداتەوە. ویلسۆن هەر ژمارەیەکی پەسەند دەکرد-بەگشتی، ئەو دەیتوانی بۆخۆی بەشێکی زۆر لە یاداشتی فۆنتەینەبلوو بنووسێتەوە. هەرجۆرێک بوایە فەڕەنسەیەکان توورە ببوون. کلیمینجوو لە یاداشتەکەی خۆی بۆ لیۆد جۆرج هێنابووی کە " دەبابیێین کۆلۆنیەکان و کەشتیەکانی ئەڵمانیەکان بدەینەوە بە خۆیان، و زیەدمافەکانی ناوچەیی کە بۆ هێورکردنەوەی هێرشبەری بریندار پێویستن تەنیا بەسەر وڵاتانی قاڕەیی- فەڕەنسە، بلژیک، بۆهێمیا و پۆڵەندا-نەسەپێنین." ئەو لە درێژەی باسەکەیدا هێنابوویی کە باوەڕ بەوە کە لەڕێگای مەرجەکانی میانڕەوانەوە دەکرێ ئەڵمانیا هێور بکرێتەوە ئەوە " خەیاڵێکی خاوە"..٤٤

جا خەیاڵی خاو بێت یان نەبێت، بەریتانیەکان سوور بوون لەسەر ئەوە کە خۆیان لە قاڕەکە و کێشەکانی دەرباز بکەن. هەبوونی هاوسەنگیەکی دەسەڵات لەوێ هەمیشە بەباشی لە خزمەت بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا دابوو؛ تەنیا کاتێک دەستێوەردان پێویست بوو کە تاقەوڵاتێک هێرشی کردایەتە سەر دەسەڵاتی ناوچە بەگشتی. ئەڵمانیا ئەو هەڕەشەیە بوو، بەڵام ڕیگەخۆشکردن بۆ باڵادەستی فەڕەنسە کارێکی بێ ئەقڵانە بوو. کاتێکە هەست و سۆزەکان دامرکان، بەریتانیەکان هەم ململانێی کۆنی خۆیان لەگەڵ فەڕەنسە وەبیر هاتەوە و هەمیش پۆتانسیەلی خۆیان بۆ پیوەندی دۆستایەتی لەنێوان ئەلمانیا و بەریتانیا. پیشەسازیەکانی بەریتانی پێویستیان بە بازاڕ هەبوو؛ ٧٠ ملوێن ئەڵمانی لەوێ بوون. بەریتانیەکان خوازیاری سقامگیری بوون لە قاڕەکەدا، نەک ئەو جۆرە ئاژاوەگەریەی کە لە ڕۆژهەڵاتی دوور بەجوانی هەستی پێدەکرا؛ ئەڵمانێکی پتەو لە ناوەندی ئورووپادا دەیتوانی ئەوە بێنێتە دی.

لە ماوەیەکی کورتدا، یاداشتی فۆنتەینیبلوو دەسکەوتێکی کەمی بە دەست هێنا. بەریتانیەکان و فەڕەنسەیەکان لەسەر بەشی قەرەبووەکان هەر درێژەیان بە شەڕەمنداڵانەکەی خۆیان دا. فەڕەنسەیەکان نە ئەوە بوو مەزندەی خەسارەتەکانی خۆیان ڕاگەیەنن و نە ئەوە کە بڵێن چیان لە ئەڵمانیا دەویست. ویلسۆن لەپڕێکدا هەڵیدایە و بە گرەیسۆنی وت کە "بەفیرۆدانی هەر کاتەژمێرێک کە دەیتوانی لە دابینکردن و دیاریکردنی سنوورەکان ڕۆڵێکی هەرە گرنگ بگێڕێ ئەویش لە کەش و هەوایەکی وەها هەستیاردا تاوانێکی گەورە دەبوو." و بەسەر ئەوەشدا ئەو هێشتا

ترسی ئەوەی هەبوو کە، ئەگەر بێتو تەنگ بە هاوپەیمانەکانی هەڵچنێت، لەوانەیە حکوومەتەکانیان بڕووخێن و ئاشتی بۆ ماوەیەکی تر پەک بخرێتەوە.٤٤١

ئێستا وادیاربوو کلیمینجوو خۆی لە دەسک نابێت بۆ پتەوکردنی هەڵوێستی خۆی لەسەر ئەڵمانیا. ئەو ئاماژەی بەوەکرد کە بەریتانیا و وڵاتەیەکگرتووەکان لەلایەن دەریاوە پارێزگاریان لێدەکرا. " ئێمە پێویستیمان بە هەبوونی هاوچەشنێکی وەک خۆمان هەیە." ئەو داوای ناوچەی ساری دەکرد و چاوەڕوانی ئەوە بوو بەشێوەی نیزامی ناوچەی ڕاینلەند داگیر بکات. ئەو ئەیوت کە " ئەڵمانیەکان خەڵکێکی کۆیلەئاسان و دەبێ زەخت کرێتە سەریان بۆ ئەوەی پشتگری لە دانووستانێک بکەن." لە ٣١ی مانگی مارسدا ئەو ڕیگەی دا بە فۆچ تا بۆ مەبەستی پێکهێنانی وڵاتێکی سەربەخۆ تکایەک پیشکەش بە شۆڕای چواریار بکات. فۆچ وتی کە " ئاشتی تەنیا بە خاوەنداریێتی بەری چەپی چۆمی ڕاین دەکرێ گارانتی بکرێت تا دواتر کە زانیاری ڕائەگەیەنرێت، واتە، تا کاتێکە ئەڵمانیا لە ناخی دڵەوە هەوڵی گۆڕانکاری نەداوە." لیۆد جۆرج و ویلسۆن زۆر بە ئەدەبەوە گوێیان شل کردبوو بەڵام زۆر بایەخیان نەدەدایە.٤٤٢

ویلسۆن هەستی بەوەکرد کە فەڕەنسەیەکان خەریکن هەروا بەو ئاسانیە ئاستەنگ دەخەنە سەر ڕێ. ئەو بە گرەیسۆنی ڕاگەیاند کە " من زۆر دڵساردم، دوا مشت و مڕیکی دوو کاتژمێری لەگەڵ کلیمینجوو و ڕاکێشانی ئەو بەلای خۆمدا، ئەو بە کردەوە لەسەر هەمووشتێک ڕیکەوت، و هەر ئەو کاتەی کە دەیەویست بڕوات لەپڕێکدا هەڵگەڕاوە سەر دەسپێکی باسەکەمان."٤٤٣ خەریک بوو گرژیەک دەکەوتە نێوچاوانی ویلسۆن، بەڵام هەر ئەو وانەبوو هەرهەموویان وایان لێهات. شۆڕای چواریار بەردەوام کۆبوونەوەی ساز دەکرد، دۆخێکی تۆقێنەر هاتبوە ئاراوە و هەواڵی ناخۆش یەک بەدوای یەکدا دەهاتن: لە مەجارستانەوە، شوێنێک کە کمونیستەکان بەتوندی کۆنتڕۆڵی ناوچەکەیان لە دەست دابوو؛ لە ڕووسیەوە، شوێنێک کە بۆلشویکەکان پێدەچوو براوەی شەڕی ناوخۆ بووبێتن؛ لە دانزینگەوە، شوێنێک کە بەرپرسانی ئەڵمانی نەیاندەهێشت هێزەکانی پۆڵەندی بنیشنەوە.

لە ٢٨ی مانگی مارسدا کلیمینجوو بەوحالەش ڕایەکی تر داواکاری فەڕەنسەی لەسەر ناوچەی سار خستەوە بەرباس. ویلسۆن درۆی دەکرد و ئەیوت کە فەڕەنسەیەکان وەک یەکێک لە مەبەستەکانی جەنگی خۆیان ئاماژەیان بەوە نەکردوە و ئەوە، هەرجۆرێک بێ، بەخشینی بە فەڕنسە بەپێچەوانەی چاردەخاڵەکە دەبێت. کلیمینجوو سەرۆک کۆماری بە پشتگریکەری ئەڵمانی تاوانبار کرد و هەڕەشەی لێکرد دەست لەکار بکێشێتەوە و گرێبەستی ئاشتی واژۆ نەکات. ویلسۆن وتی کە

ئەمە درۆیەکی ئانقەست و بەجوانی دیارە کە کلیمینجوو خوازیاری ئەوەیە کە ئەو بگەڕێتەوە بۆ ولاتەیەکگرتووەکان. کلیمینجوو، کە بەهەمان چەشن تووڕە ببووو، بەشێوەی مارشی سەربازی لە ژوورەکە چوە دەرێ. ئەو بۆ مۆرداکی گێڕابۆوە کە ئەو چاوەڕوانی دژایەتیەکی وەها بێ تەکانی لەبەرانبەر داواکاریەکانی فەرەنسەدا نەدەکرد.

لیۆد جۆرج و ئۆرلاندۆ، کە بە ترس و دڵەڕاوکێوە سەیریان دەکرد، ئەوەی لە دەستیان هات کردیان بۆ هێورکردنەوەی دۆخەکە لە کۆبوونەوەی ئەو دوانیوەڕۆیەدا. کاتێکە ویلسۆن لە وڵامی لێبوردنەکەی لیۆد جۆرجدا بەهۆی درەنگ هاتنی وتی لە " بەڕێز لیۆد جۆرج حەز ناکەم دەستەواژەی درەنگ بەکار بێنم" ئەویش لەژێر لێوەوە بزەیەکی ڕازی بوونی هاتێ. کاتێکە تاردیۆ دەستی کرد بە درێژدادڕی سەبارەت بە پێوەندیە دێرینەکانی نێوان سار و فەرەنسە، ئۆرلەندۆ ئاماژەی بەوە کرد کە ئیتالیا، بەپێی ئەم شێوازە لە بەڵگەهێنانەوە، بۆی هەیە داوای ناوچەکانی ئیمپراتۆری ڕۆمانی پێشوو بکات؛ هەرچەند ئەمە بۆ هاوڕێی نزیکی خۆی لیۆد جۆرج زۆر دژوار و چەتوون دەبێت. ئەوەی لەوێ بوو لەناخی دڵەوە پێکەنین، بێجگە لە کلیمینجوو. لیۆد جۆرج پێشنیاری ڕێکەوتنێکی کرد: ساری سەربەخۆ، بە خاوەنداریێتی کانزاکانی خەڵووز لەلایەن فەرەنسەیەکانەوە. هاتنە سەر ئەوە کە پسپۆڕان بەوەدا بچنەوە. کلیمینجوو لێبوردنێکی هەمەچەشنی ڕاگەیاند و باسی لە زنجیرەیەک خۆشەویستی کرد کە فەرەنسە بە ولاتەیەکگرتووەکان دەبەستێتەوە؛ دواتر بۆ بازنەی ڕاوێژکارەکانی خۆی، باسی لەڕادەبەدەر لاساربوونی ویلسۆنی کرد. ویلسۆن ئاماژەیەکی چاکی بە گەورەیی فەرەنسە کرد. بەشێوەی نهێنی گلەیەکی زۆری لەوە بوو کە فەرەنسەیەکان بەگشتی هەر خەریکی دواخستنی کۆڕی ئاشتین. ئەو دەیکوت کە کلیمینجوو وەک سەگێکی پیر وایە: " ئەو بەهێواشی هەر بە دەوری خۆیدا هەڵدەسووڕێت،و دوای کیلکی دەکەوێت، بەرلەوەی پێی بگات."[٤٤٤]

* * * *

دوو ڕۆژ دواتر بەفر باری. سەرەتای مانگی ئاڤریلی ئەو ساڵە لە پاریس دۆخەکە زۆر چەتوون و دژوار بوو و بەخێراییەکی زیاتر ڕوو لە خراپتر بوون. هەرچەند شۆڕای چواریار زۆر بە دزی و فزی کۆبوونەوەکانی بەڕێوە دەبرد، وردەکاریەکانی ئەو وت و وێژانە دزەیان دەکرد و دەهاتنە دەرێ. فۆچ بەجارێک پشتی شکابوو و هیوا و هۆمێدی لێبڕابوو، ویلسۆن لە یاداشتنامەکەی خۆیدا ئەم نهێنیەی درکاند کە : "ئەو پێشبینی کرد کە لە ئێستاوە تا چوار حەفتەی کە کۆڕی پاریس هەڵدەوەشێتەوە."بە واتەی نوێنەرێکی ئەمەریکی، دەنگۆکان " بەشێوەی تەمێکی گۆگردی و شین"

وەیان کردە دەرێ. کانەدایەک لە نامەیەکیدا بۆ ماڵێی نووسیبوو کە ئەلمان تووشی دەبێ بە تووشی شۆڕشەوە. ڕۆژنامەی *دەیلی مەیلی* پاریس وتبووی کە " بەرەو نابوودی ڕێی گرتۆتەبەر." هەواڵنێری هەر ئەو ڕۆژنامەیە لە تێلێگرافێکدا بۆ *نیۆیۆرک تایمز* هێنابووی کە "کۆمەڵەی گەلان کۆتایی بە ژیانی هاتوە و کۆڕی ئاشتی تووشی شکست هاتوە."٤٤٥ بەیکێر وتبووی کە ویلسۆن، هاریکاری چاپەمەنیەکەی ئەو، " هەمیشە مۆن و زەردهەڵگەڕاو بوون." سەرۆک کۆمار لە خەباتی خۆی بۆمەبەستی نانەوەی ئاشتیەکی دادپەروەرانە هەستی بە تەنیایی دەکرد. لیۆد جۆرج بەمانای ڕاستەقینەی خۆی سیاسەتزانێکی کارامە بوو؛ کلیمینجوو دەهات بە ئەنقەست تەگەرەی دەخستە سەرڕێی ویلسۆن و نەیدەهێشت لەڕیگای چاردە خاڵەکەی ئەوەوە ئاشتی مسۆگر کرێت. ویلسۆن بە ئاواتەوە بوو کە پێی بڵێ " ئەو کاتێکە لەگەڵ من لەسەر تەوەرێک هاوڕا و هاوبیرە لەسەر هەمان هەڵوێست هەر دەمێنێتەوە و کاتێکە لەگەڵ منە دەڵێی ڕێگەی پێنەدراوە لەگەڵ من هاوبیر بێت و دەڵێی پێی کوتراوە کە دوا جیابوونەوە لەمن پێوەندی گرتن لەگەڵ باڵی دژبەر هەڵوێستی خۆی بگۆڕێت." ئەمینداری خاتوو ویلسۆن نووسیبووی کە " قەت [ویلسۆن]م ئەوەندە تووڕە نەدیبوو، یەکجار خوێنی هاتبوە جۆش،" " ئەو شێوەتێڕوانینی فەڕەنسەیەکان و دواخستنەکانی ئەوانی لا زۆر ناشیرین و ناپەسەند بوو." لەگەڵ ئەمانەشدا ویلسۆن بە دەست تانە و توانجی چاپکراوەکانی فەڕەنسە وەئەجمان هاتبوو. ڕۆژنامەیەک لە زمانی ئەو گێڕابوویەوە کە " شتێکی زۆر سەیر ئەمن بۆم دەرکەوتووە کە بە دوای زستان بەهار لەڕێیە." ئەو لەگەڵ لیۆد جۆرج " نێوانیان زۆر ناخۆش و ئاڵۆز بوو"، و لەبارەی ویلسۆنەوە ئەیوت کە " ئەو قەت ئاشتی فەڕەنسەیی واژۆ ناکات و دەگەڕێتەوە بۆ وڵات و خۆ لەو ئیشە نادات."٤٤٦

لە ٣ی مانگی ئاڤریلدا ویلسۆن بەهۆی سەرماخواردنێک کەوتەجێ و هاوس لە شۆڕای چواریاردا جێگەی ئەوی گرتەوە. کلیمینجوو گەشبین بوو: "ئەو لە ٥ی مانگی ئاڤریلدا بە لیۆد جۆرجی ڕاگەیاند کە " ئەمڕۆ حاڵی زۆر خراپترە. ئایا تۆ دوکتوورەکەی دەناسی؟ ناتوانی خۆتی تێهەڵقوتێنی و بەرتیلێکی بدەیەی؟" لە ژووری نەخۆشخانەکەدا کابرای دەردەدار هەڵکوورمابوو. ویلسۆن بە گرەیسۆنی ڕاگەیاند کە "من زۆرم بیرکردۆتەوە، بیر لەوە کە ئەگەر ئەم سیاسەتمەدارانەی فەڕەنسە ڕێگەیەیان بدرێتێ ئەوەی کە حەزیان لێیە بیکەن و هەمووی ئەو داواکاریانەی کە شیاوی فەڕەنسەی دەزانن مسۆگر بکەن جیهان لە ئاکامدا چی بەسەر دێت. بۆچوونی من ئەمەیە کە ئەگەر ئەوان ڕێگەیان بدرێتێ ئەوەی کەیفیان لێیە بیکەن لە ماوەیەکی کورتدا جیهان هەپروون بە هەپروون دەبێت و هەزاران پارچەی لێدەکەوێتەوە." ئەو وتی کە ئەو وادیار بوو چاک بوویێتەوە و هەڵگری

بڕاڕێک بێ. ئەو داوای لە گرەیسۆن کرد کە بۆ حازربوونی *جۆرج واشینگتۆن* لە برێست، لەسەر قەراخ ئاوەکانی بەریتانی ڕێگە خۆش کات. " من نامەوێ بڵێم کە هەرکە پاپۆڕێکم گیر کەوت دەڕۆم؛ من دەڵێم دەبێ هەر ئێستا پاپۆڕەکە دەبێ لێرەبێ." ڕۆژی دواتر هەواڵەکان دزەیان کرد، هەڵبەت ویلسۆن گومانی لەوە نەبوو. هەڕەشەکەی ئەو هەستی جەماوەری وروژاند. لە سەردێڕی سەرەوەی ڕۆژنامەی *نیۆیۆرک تایمزدا* نووسراوبوو "ئاڵۆزی لە کۆڕی ئاشتیدا."٤٤٧

فەڕەنسیەکان بە هەندیان نەگرت. کلیمینجوو بەشۆخیەوە بە هاوڕێیەکی خۆی وت کە " هەڵس و کەوتی ویلسۆن لەهی چێشتلێنەرێک دەچێ، کە بە جانتاکەی خۆیەوە ئامادە لە ڕاڕەوەکە وەستابێت. هەرچی ڕۆژە ئەو هەڕەشەی ڕۆیشتن دەکات." وتەبێژێکی کوای دی ئۆرسای لەوپەڕی پڕڕوویيدا وتبوو " ڕۆیشتن بۆماڵێ بۆ لای مەمانی." ئەوەی ڕاستی بێت، فەڕەنسەیەکان زۆر ترسا بوون. سانسۆرەکان لەسەر ئەو بابەتە لە ڕۆژنامەکاندا هەڵوێستێکی وایان نەگرت و *لی تێمپس،* کە بەوە ناسرابوو لەگەڵ بازنەکانی فەرمی پێوەندی نزیکی هەبێت، بە پەلە چیرۆکێکی نووسی کە دەیکوت فەڕەنسە ئارەزووی لکاندنی هیچ ناوچەیەکی لە بەرنامەدا نەبوە کە دانیشتوانی ئەو ناوچەیە ئەڵمانی بووبێتن. جێگری تاردیۆ ڕاگەیاندنێکی پێشکەش بە هەوڵنێرانی ئەمەریکی کرد کە گوایە فەڕەنسە داواکاریەکانی خۆی تا ڕادەیەکی یەکجار زۆر هێناوەتە خوارێ و دڵنیایە لەوە کە، وەکوو هەمیشە کە دڵنیا بوە، سنوورەکانی ساڵی ١٨٧١ پەسەند بکات ، کە تەنیا ئالساسی-لۆراینیان لەخۆ دەگرت و چیتر نا. (ئەمە تاڕادەیەک بوە هۆی پشێوی و سەرلێشێواوی.)٤٤٨

ئەم زێدەمافانە لەباری سیاسیەوە خەرجێکی زۆریان هەڵدەگرت. جێگران و سێناتۆرەکان کردیانە سەر کلیمینجوو تا لەسەر داوا ڕەواکانی فەڕەنسە هەڵوێستێکی قورس بگرنەبەر. فۆچ بۆ مەبەستی داوکاریەک لەسەر داگیرکردنی ناوچەی ڕاینلەند کەمپەینێکی چاپەمەنی سازکرد. فەرمەندەی گشتی خەریک بوو بەشێوەیەکی سامناک و ڕاشکاوانە بەرنگار دەبۆوە. و چیتر لە شۆڕای چواریار دەستووری وەرنەدەگرت و خوازیاری قسەکردن لەگەڵ کابینەی فەڕەنسەیی بوو. ئەمە، لە ولاتێک بە نەریتێکی زیندوو لە کۆدەتاکانی میلیتاری هەوڵدراو، زەنگێکی مەترسیدار بوو. لەگەڵ ئەوەش دڵەڕاوکێ و نیگەرانی درووست دەکرد. بەدوای ڕووداوێکدا ویلسۆن وتی کە "من ناتوانم بەرپرسایەتی سووپایەکی ئەمەریکی بخەمە ئەستۆی ژەنەڕاڵێک کە ملکەچی حکوومەتەکەی خۆی نابێت."٤٤٩

سیاسەتزانانی ناودار، ڕۆژنامەنووسان و سەربازان چوون تا پۆینکارە لەوە ئاگادار کەنەوە کە فەڕەنسە ڕووی کردۆتە کارەسات و بەرەو ئەوێ هەنگاو دەنێت. کلیمینجوو خەریک بوو لە شانسی هێمنایەتی و ئاسایش بۆ ئەڵمانیا دڵسارد دەبۆوە. ڕەنگە باشتر وابێ پۆینکارە بە سەرهەڵدانی

نارەزایەتیەکان دەست لەکار بکێشێتەوە. یان وەکوو فۆچ و کەسانی تر پێداگریان دەکرد ئەوە ئەرکی خۆی بوو کە لە دەسەڵاتەکانی خۆی لەچوارچێوەی دەستوورێک کەڵک وەرگرێ تا بۆخۆی هەوساری دانووستانەکان بگرێتەوە دەست؟ پۆینکارێ، وەک تایبەتمەندیەکی تایبەخۆ خۆ، خۆی لە ڕەخنەکە هەڵقوتاند بەڵام دەترسا لەوەی هەنگاوێک بنێت. کلیمینجوو، کە هەمیشە زانیاری باشی لەبەردەست دابوو، هات بۆ ئەلیسی پالاس و دیمەنێکی سەیری درووست کرد، سەرۆک کۆماری بە بێوەفابوون تۆمەتبار کرد. ئەو یەک بە خۆی هاواری کرد و وتی کە "هەمووی هاوڕێکانی تۆ دژی منن. هەتاکەی ئەم هەموو دژایەتیە؟ من شەو و ڕۆژ لە وت و وێژدام. خەریکم خۆم دەکووژم." ئەو پێشنیاری دەست لەکارکێشانەوەی خۆی پێشکەش کرد. پۆینکارە دەنگی نارەزایەتی هەڵبڕی و هەڵی دایە: " هەتاکوو ئێستا من وەفاداربوونی خۆمم سەلماندووە و وازم لێ نەهێناوە و پێویست بە وتن ناکات؛ بەڵام سەرەڕای ئەوە، من ئەرکی کورپەتی خۆمم بەجێ هێناوە." کلیمینجوو ئەوی بە درۆزن تاوانبار دەکرد. پۆینکارە بە تووڕەیەوە وڵامی دایەوە. کلیمینجوو لەو خراپتر وتی "چاکە، تۆ دەزانی کە بە بێ ڕێزیەوە وڵامی من دەدەیەوە!" هەرجۆرێک کە بێت، لە کۆتایی وت و وێژەکەدا هەرکیان دەستیان خستە ناو دەستی یەک. پۆینکارە بە شێوەی پیاوێکی سیاسی وتی کە " کەش و هەواکە زۆر چەتوون و ئاڵۆز بوە، داهاتوو تاریکە، پێویستە کە مەقاماتی سیاسی کۆمەڵگا یەک بگرن." ئەو هەربەخێرایی هەست و سۆزی خۆی خستە سەر پەڕەی کاغەز و لە یاداشتنامەکەی خۆیدا نووسی: "بەکورتی، ئەم وت وێژە کلیمینجوویەکی بە من ناساند کە مێشک تەسکە، ترۆیە، لەخۆباییە، هەژارکوژە، گاڵتەچیە، هەتابڵێی سەرەڕۆیە، لەباری زەینی و جەستەیەوە کەڕە، ناتوانێ بەڵگەی چەسپاو بێنێتەوە، ورەی درێژەدان بە وت و وێژەکانی نیە."٤٥٠

تەنیا لیۆد جۆرج بوو کە لە ماوەی قەیرانەکەدا بەگشتی خۆشحاڵ مابۆوە. ئەو بە کەسایەتیەکی ناوداری ڕۆژنامەکە بەناوی جۆرج ڕیدێلی ڕاگەیاند کە " ئێمە گەشەی زۆرمان کردوە. ئێمە بەکردەوە هەمووی کێشە سەرەکیەکانمان چارەسەر کردوە جگە لە ئەو کێشەیە کە پێوەندی بە پێشێلکاری یاساکانی جەنگەوە هەیە. حەفتەی داهاتوو دەست دەکەین بە دانانی ڕەشنووسی گرێبەستی ئاشتی." ئەو چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد کە مەرجەکانی کۆتایی ئاشتی بە وەختی خۆی لەکاتی ئیستیرن ساندەی دادەڕێژرێن، واتە دوو حەفتەی دیکە. لیۆد جۆرج بەتایبەت زۆر خۆشحاڵ بوو چون هەڵگری خاڵی تایبەتی خۆی بوو لەسەر قەرەبووەکان: تابلۆی کۆتایی نەدەخرایە ناو گرێبەستەکەوە.٤٥١

کاتێکە ویلسۆن لە ٨ی مانگی ئاڤریلدا بۆ جارێکی تر هەستاوە سەرپێی خۆی، وەرزی بەهار گەیشتبوە بەرەوە و کەش و هەوایەکی لەبارتر و خۆشتر باڵی بە سەر ئاسمانی کۆڕی ئاشتیدا

کێشابوو. ئەو بە ویلسۆنی ڕاگەیاند کە هێشتا تۆزێک "لەرزۆکی" پێوەدیار بوو و گەڵاوگەڵ دەڕۆیشت، بەڵام هەستی دەکرد کە" لەباری دەروونییەوە لەجاران باشترە." هەرجۆرێک بێت، ویلسۆن وای بە باش زانی کە مەترسی *جۆرج واشنگتۆن* دابنێت بۆ کاتی خۆی.٤٥٢ لە نەبوونی ئەودا، بەشێکی زۆر لە بوارەکە بۆ ڕێکەوتنەکانی دواتر خۆش کرابوو. لە ١٣ی مانگی ئاڤریلدا کێشەی ناوچەی سار کۆتایی پێهات و چارەسەر کرا. پسپۆڕان بە ئاکامی پەیمانێک گەیشتبوون کە تێیدا فەرەنسە خاوەندارێتی تەنیا کانزاکانی پێبڕا. کۆمەڵەی گەلان بەڕێوەبەرایەتی ناوچەی ساری گرتە ئەستۆی خۆی و دوا تێپەڕبوونی پازدە ساڵ ئەرکی بەڕێوەبردنی ڕیفراندۆمێکی گرتە ئەستۆی خۆی، واتە، دانیشتوانی ناوچەکە بۆیان بوو لەنێوان سەربەخۆیی، فەرەنسە و ئەڵمانیا یەکیان هەڵبژێرن. (لە ساڵی ١٩٣٥دا ڕەیخی تازەی هیتلێر سەرنجی جەماوەرێکی زۆری بۆ لای خۆی ڕاکێشا و لە سەدا ٩٠ی ئەوان دەنگیان بە یەکگرتنەوە لەگەڵ ئەڵمانیا دا.)

پەکێجی تایبەت بە ڕاینلەند و گەرەنتی ئانگلۆ-ئەمەریکەن بۆ فەرەنسە بۆ ئەوەی بگا بە قۆناخی جێبەجێکردن تەنیا تۆزێک زیاتری برد. ویلسۆن، کە هەستی دەکرد زۆر زیاتر لە ڕادەی خۆی بۆ دەستەبەرکردنی گەرەنتییەک هەوڵی داوە، لە ١٢ی مانگی ئاڤریلدا پەیامێکی توندی بۆ کلیمینجوو نارد بەومانایە کە ئەو هاتۆتە سەر ئەوە کە لەپێناو ڕاینلەندێکی غەیرەنیزامی دانووستان بکات نەک لەپێناو داگیرکاریەکی هەتاهەتایی هاوپەیمانی. کلیمینجوو بەتەواوەتی مێشکی خۆی لەسەر دانا و دوو ڕۆژ دواتر بانگی هاوڕێی دێرینی خۆی هاوسی کرد. ئەو ئاماژەی بەوەدا کە بەڕاستی جێی داخە کۆڕی ئاشتی ئاوا تووشی قەیران و ئاڵۆزی هاتوە. ئیتالیەکان (وەک دواتر دەبینین) هەڕەشەی ڕۆیشتنیان دەکرد بەبێ واژۆکردنی گرێبەستی ئەڵمانی. هەڵبەت ئەو بۆخۆشی ئامادە بوو لەگەڵ هاوکارەکانی چالاکی بکات. ئەو هەڵوێستی ئەمەریکی پەسەند کرد، هەرچەند ئەوە نەبوو کە ئەو خوازیاری بوو، و ئەو لەسەر ئەوە دەبوایە لەگەڵ فۆچ شەڕی بکردایە. لەباتی ئەمە، ئەو تەنیا داوای ئەوەی دەکرد کە ویلسۆن تەنیا داگیرکردنی کاتی سێ ناوچە بە دەوری پاسگا سەرەکیەکان لەلایەن فەرەنسەوە پەسەند بکات: فەرەنسەیەکان لەماوەی ٥ ساڵدا ناوچەی یەکەم، واتە، لە باکووری ڕاینلەند (وەکوو پاسگای دەوری کۆلۆن)یان چۆڵ دەکرد، ناوچەی دووهەم، لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین (وەکوو پازگای دەوری کبلینز)، دوای دە ساڵی تر، و سێهەمین ناوچە، لە باشوور• وەکوو پازگای دەوری مەینز)، دوا پازدە ساڵیکە.٤٥٣

لە ١٥ی مانگی ئاڤریلدا ئاگزیمای سەر دەستەکانی کلیمینجوو زۆر لەجاران خراپتر بوو و ئەو بە دەست سەرەگێژەیی جارجارەوە دەیناڵاناند. ئەو ئێوارەیە، دوا ئەوەکە هاوس هەواڵی ئەوەی هێنا کە

ویلسۆن ڕەزایەتی بە داگیرکردنی کاتی داوە، ئەو پیاوێکی تر بوو. ئەو بە مۆرداکی ڕاگەیاند کە " من چیتر دڵەڕاوکێم لە دڵدا نەماوە. نزیک بە هەمووی کێشە سەرەکیەکانی تایبەت بە فەرەنسە ئێستا دامرکاون. زۆرپێدەچێ لە دە ساڵی داهاتوودا لەسەر هێڵە سەرەکیەکانی گرێبەستەکە بڕیارمان ساخ کردبێتەوە. ئەمڕۆکە، بەتایبەت، دوور لەو دوو گرێبەستەی کە بە ئەگەری هێرشێک لەلایەن ئەڵمانەوە لە ئەمریکا و ئینگلەند یارمەتی میلیتاری دەستەبەر دەکات، من داگیرکردنی ناوچەی ڕاینلەندم بۆ ماوەی پازدە ساڵ مسۆگەرکرد بە چۆڵکردنێکی کاتی لە پێنج ساڵەوە بۆ پێنج ساڵ. هەڵبەت بە ئەگەری لەبەرچاونەگرتنی گرێبەستەکە لەلایەن ئەڵمانەوە، نە چۆڵکردنی کاتی و نە هەتاهەتایش لە ئارادا نابێت". بە خۆشحاڵیەوە، لەبەرانبەر ئەوەدا ئەو بەڵێنی چاکەیەکی بە هاوس دا. کلیمینجوو بە ئەمینداری نهێنی خۆی ڕاگەیاند کە هەمووی هێرشەکانی ناو چاپەمەنی فەرەنسە بۆ سەر ویلسۆن پێویستە هەر ئێستا کۆتاییان پێ بێت. ڕۆژی دواتر تەنانەت ڕۆژنامە ئاسایەکانی باڵی دژبەریش بە سەر سەرۆک کۆماریاندا هەڵدەکوت.٤٥٤

کاتێکە ئەو لە لەندەن گەڕایەوە، و سەرکەوتوانە لە دژایەتی پەرلەمانی سەری دەرهێنابوو، لیۆد جۆرج قەڵس بوو. ئەو چەند ساڵ دواتر نووسی کە "ڕووداوگەلی هاندەرانە ئاکامی ئاشکرای هەر داگیرکاریەکی ناوچەیین لەلایەن هێزەکانی دەرەوە. تووڕەیی و جارجارە نەفرەتێکە هاوڕێ لەگەڵ داگیرکردنی شارۆچکەکانی ئەڵمانی لەلایەن هێزەکانەوە دەهاتنە ئاراوە، کە هەندێکیشیان خوێناوی بوون، زیاتر پێوەندیان بوو لەگەڵ سەرهەڵدانی توندی هەستی نیشتمانپەروەری لە ئەڵمانیا کە بیروباوەڕی نازیسمدا پەنگی خواردۆتەوە."تۆزێک بە نابەدڵیەوە ئەو ڕەزایەتی بە بەندەکانی ناوچەی ڕاینلەند لە ٢٢ی مانگی ئاڤریل دا.٤٥٥

لە ٢٥ی مانگی ئاڤریلدا کلیمینجوو بەندەکانی ناوچەی ڕاینلەندی برد بۆ کابینەکەی خۆی، شوێنێک کە دەبوا گوێی بۆ ڕەخنەی توند و گەرم و گوڕی فۆچ و کەسانی تر بگرتایە. ئەوەی کە جێی سەرسووڕمانی هەموو لایەکە ئەوەیە کە پۆینکارێ تەنیا داوای ڕوونکردنەوەی هەندێک خاڵی دیاریکراوی دەکرد. کلیمینجوو بە مۆرداکی ڕاگەیاند کە " ئەو ڕەخنەگرێکی ناودارە لە ناو کۆماریەکاندا، بەڵام هەرکات کە من لەسەر ژمارەیەکی یەکجار زۆر پرسیاری هەستیار ڕاوێژی ئەوم خواستبێت کە بۆ ماوەی سێ مانگ وت و وێژمان لەسەر کردوە و ئێستاش هەر خەریکی وت و وێژ کردنین لەسەریان، تەنیا وڵامێکە بە من دەگەیشت وڵامی نادیار و ئاڵۆزاوی بوون." کابینە بەگشتی لە چواری مانگی مەیدا مامەڵەکەی پەسەند کرد و مەرجەکانی ئاشتی بەگشتی و بەتێکڕایی دەنگ پەسەند کرد. فۆچ زۆر بە تووڕەیەوە دەیگوت کە کلیمینجوو جەنایەتکارە.

پۆینکاره زۆر بیری له دەست لەکارکێشانەوە دەکرد، بەڵام، وەکوو پێشتر، بڕیاری لەسەر ئەوە نەدا، خەیاڵێکی باشتر هات بە مێشکیدا.٤٥٦

کلیمینجوو هەمیشە وا هەستی دەکرد کە باشترین مامەڵەی بۆ فەڕەنسە کردوە، و هەرواش بوو ئەو ڕاستی دەکرد. ئەو زۆر زیاتر لەو ڕادەیەی کە هاوپەیمانەکانی لە سەرتادا بەڵێنیان دابوو بیبەخشن بردبۆوە؛ ئەو هاوپەیمانی لەگەڵ بەریتانیا و وڵاتەیەکگرتوەکان زیندوو ڕاگرتبوو. ئەو بە هێنانەدەرەوە لە حاڵەتی نیزامیدا و داگیرکردنی پازدەساڵەی ڕاینلەند هەنگاوێکی تری لەپێناو ئاسایشی فەرەنسەیەکان هەڵێنا؛ و ئەو کۆتایی ئەو داگیرکاریەی بە بەئەنجامگەیاندنی بەشەکانی تری گرێبەستەکە لەلایەن ئەڵمانیاوە گرێ دا. وەک چۆن لە مانگی سێپتامری ساڵی ١٩١٩دا لەکاتی دەمەقرێکردن لەسەر پەسەندکردنێک بە ئەنجومەنی نوێنەرانی ڕاگەیاند کە "گرێبەستەکە، بە هەموو مەرجێکی ئاڵۆز و پێچەڵاوپووچیەوە، هەر ئەوەندە گرنگی دەبێت کە گرنگی پێ دەدەیت؛ هەر ئەو شتەی لیدەردێت کە تۆ دروستی دەکەیت... ئەوەی کە تۆ ئەمڕۆکە دەتەوێ دەنگی پێ بدەی تەنانەت دەستپێکێکیش نیە، ئەوە سەرەتای سەرەتایەکە. ئەو بۆچوونانەی کە ئەو لەخۆی گرتوە گەشە دەستێنن و بەرهەمیان لێدەکەوێتەوە. تۆ براوەی دەسەڵاتێکی کە دەتوانی ئەو بۆچونانە بەسەر ئەڵمانی شکستخواردوودا بسەپێنی."٤٥٧ کێشەکە هەمیشە لە زەختکردن دابوو. وەکوو بۆ جێگرەکانی کلیمینجوو، وەک پۆینکارە، دەرکەوت، فەڕەنسە بەبێ پشتگری بەریتانیا و ئەمەریکا شتێکی ئەوتۆی لە دەست نەدەهات. ئەو پشتگریە لە ساڵەکانی دەیەی ١٩٣٠دا لە ئارادا نەبوو، و ساڵەکانی ١٩٣٠دا کلیمینجوویەک لە گۆڕێدا نەبوو تا فەڕەنسەیەکی وورە شکاو دژ بە وەیشوومەی نازی لە ئەڵمان بخاتە گەڕ.

# ١٧

# بووژاندنەوەی پۆڵەندا

سەرلەنوێ هەستانەوەی پۆڵەندا یەکێک لە بەسەرهاتە گەورەکانی کۆڕی ئاشتی پاریسە. بێجگە لەوە بوو بە سەرەتای گیر و گرفتی بێ بڕانەوە. کۆمیدیۆنی بەرپرس بۆ سنوورەکانی پۆڵەندای تازە لە هەمووی ئەوانەی تری ناو کۆڕی ئاشتی کۆبوونەوەی زیاتری هەبوو. ئایا دەبێ ئاکامی ئەو کۆبوونەوانە بەسزاگەیاندنی ئەڵمانیای لێبکەوێتەوە لەبەرهۆی کردەوە خراپەکانی ڕابردووی و تێکشکانی ئێستای؟ ئایا پێویستە پۆڵەندایێکی گەورە بێتە ئاراوە تا وەک ڕێگر و بەربەستێک لەبەرانبەر بیروباوەڕی بۆلشویزمدا تێبکۆشێت؟ بۆ ئەوەی زیندوو بمێنێتەوە پێویستی بە چی هەبوو؟ کانزاکانی خەڵووز؟ ئاسن؟ ڕێگاکانی شەمەندەفەر؟ بەندەرێکی لەبار لە بالتیک؟ ویلسۆن لە سێزدەهەمین چاردەخاڵەکەی خۆیدا بەڵێنی دابوو کە پۆڵەندایێکی بووژاوە پێویستە "بەشێوەیەکی ئازادانە و دوورلەمەترسی دەستی بە دەریا ڕابگات": وەکوو زۆربەی خاڵەکانی تری خۆی، مانای ئەم خەڵەش نادیار بوو و چەندین مانای تری لێدەبۆوە. لەگەڵ ئەوانەشدا ئەو باسی لە بەخشینی ناوچەیەک بە پۆڵەندا دەکرد کە "بەبێ هەر قڕە و باسێک" پۆڵەندی بوون. دۆزینەوەی ناوچەی بێ قڕە لە ناوەندی ئورووپادا بە هەرشێوەیەک کە بوایە کارێکی ئاسان نەبوو. پۆڵەندیەکان بابەتەکانیان خراپتر کردبوو بە ناکۆکبوون لەنێوان خۆیاندا لەسەر ئەوە کە ئایا خوازیاری ئەوەبوون کە وڵاتە تازەکەیان دوورترین ناوچەکانی سەربەرزی ڕابردووی ئەوان لەخۆبگرێت (کە لەو حاڵەتەدا ئەوان خۆیان لەگەڵ ژمارەیەکی یەکجار زۆر ناپۆڵەندی دەدیەوە) یان خۆی لەناو دڵی ناوچەی پۆڵەندیەکاندا ببەستێتەوە (کە زۆربەی پۆڵەندیەکانی دەخستە دەرەوەی وڵات). ئاشتیکەران خەریک بوون دەگەیشتنە سەدان مایل دوورتر لە پاریس تا دەستوور بە سەر جیهانێکی جۆراوجۆر بسەپێنن پڕلە ئەمەکداری لەحاڵی گۆڕان، شەڕی ناوخۆ، پەنابەر و چەتەی سەرڕێ، شوێنێک کە بەڕووخانی ئیمپڕاتۆرە کۆنەکان بە یاسا و دەستوور، تجارەت و پێوەندیەکان هێچیان پێوە نەدەماو هەپروون بەهەپروون دەبوون.

دوو ڕۆژ بەرلە ئاگربەستی هاوپەیمانی لەگەڵ ئەڵمان، بۆرەسەربازێکی پۆڵەندی بە چاوانی شین و پیسەوە لە دم و چاوێکی لەڕی زەردهەڵگەڕاودا بە داخ و حەسرەتێکی زۆرەوە مەرجە پێشنیارکراوەکانی خوێندبۆوە. هیچ ئاماژەیەک بە پۆڵەندا نەکرابوو و ئەو لە زیندانی ئەڵمانیدابوو. ژۆزێف پیلسۆدسکی ماوەیەکی زۆر لە ژیانی خۆی تەرخان کردبوو بە هەوڵدان بۆ سەرلەنوێ-دامەزراندنەوەی وڵاتێک کە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا لەناو چووبوو. ئێستا، بەنەمانی دوژمنە گەورەکانی خۆی- ئوستراڵیا-مەجارستان- ئەڵمان و ڕووسیە- شانس ڕووی لە پۆڵەندا کردبوو. ڕووخانی ئەڵمان ئازادی گەڕاندەوە بۆ پیلسۆدسکی؛ لە ١٠ی نوامری ساڵی ١٩١٨دا، ئەو گەیشتە پێتەختی کۆنی پۆڵەندا، واتە، وۆرشاو. پۆڵەندا بۆخۆی خەونێک بوو، نەوەک حەقیقەتێک. دۆستی کەم بەڵام دوژمنی زۆری هەبوو، هیچ سنوورێکی دیاریکراو و ئاشکرا، هیچ حکوومەتێک، هیچ سوپایەک، هیچ بۆرۆکراسیەکی نەبوو. لە سێ ساڵی دواتردا پیلسوودسکی وڵاتێکی دامەزراند.

ڕەنگە پیلسوودسکی تەنیا پیاوێک بووبێ کە توانیبێتی لە ڕاسپاردەیەکی وەهادا زیندوو بمێنێتەوە و سەرکەوێت. ئەو بەشێوەک هەمووی ژیانی لەپێناوی ئەو وڵاتەدا دانابوو و بۆ ئەو ئامانجە بارهاتبوو. ئەو لە بەشی ڕووسی پۆڵەندا لەدایک ببوو، لە شارۆچکەی ڤیلنا (پۆڵەندی: ویلنۆ؛ ڤیلنیەسی ئێستا، لە لیتوانیا). دایکی ئەدەبیاتی پۆڵەندی بۆ دەخوێندەوە کە شەنسۆرەکانی ڕووسی بە نایاسایان دەزانی. ئەو مێژووی وڵاتە کارەساتبارەکەی بۆ گێڕایەوە لە ڕۆژە گرنگەکانی سەدەکانی شازدەهەم و حەڤدەهەمەو بگرە، کاتێکە ملکی هاوبەشی پۆڵەندا-لیتوانیا لە بالتیکەوە درێژەی هەبوو تا دەگاتە دەریای ڕەش و بەشێکی زۆری لەو شوێنانە دەگرتەوە کە دواتر بە ئەڵمانیا و ڕووسیە ناویان دەرکرد، و کاتێکە حکوومەتی کۆماری پۆڵەندی، فێرکردنی پۆڵەندی، شارەکانی پۆڵەندای لەناودڵانی ئەورووپایەکان دابوو؛ تا دەگاتە پارچەپارچەبوونەکانی ساڵانی دەیەی ١٨٧٠، ئەوکاتەی کە پۆڵەندا لەناو دەستانی دراوسێکانی خۆیدا توایەوە. ئەو سەبارەت بە سەرهەڵدانە ناکام و بەردەوامەکان، سێدارەکان، زیندانیەکان، ڕیزەکانی دووروودرێژی دوورخراوەکان کە حەواڵەی سیبیریا دەکران و هەوڵەکانی بنبڕکردنی کولتووری پۆڵەندی ئاگادارکرایەوە. لە ساڵی ١٧٩٥ بەملاوە، پۆڵەندا تەنیا لە مێشکی نیشتمانپەروەرانی ئەو وڵاتە، لە بەرهەمەکانی نووسەران و ئاوازدانەرانی گەورەی ئەو وڵاتە جێگایەکی هەبوو.

بەبۆچوونی زۆربەی توێژەرانی ئەقڵانیخواز، وادیاربوو کە خولی دەوران جیاکردنەوەیەکی هەتاهەتایی بۆ دانابوو. پۆڵەندیەکانی ئەڵمانیا، ڕەنگە لە کۆی حەشیمەتێکی ٥٦ملوێن کەسیدا ٣ملوێن بوویێتن، لە گەشەکردنی یەکێک لە پێشکەوتووترین نەتەوەکانی ئورووپا بەشدار بوون. شتێکیان لە زمانەکەی خۆیان

هەڵگرتبوو، بەڵام لەڕووی کولتوورییەوە، ئەوان ڕۆژلەگەڵ ڕۆژ دەبوون بە ئەڵمانی.٤٥٨ پۆڵەندیەکانی ئوتریش-مەجارستان لە گالیسیای ئوتریش تەمووڕەیان دابوو، زۆر کەوتبوونە دوا کاروانەوە. گەنیو، هەژار، دواکەوتەترین بەشی ئیمپراتۆریەتێکی بۆگەن، گالسیا لە داماوی و هەژاریدا ببوە بنێشتەخۆشەی سەرزاران. ئەوانەی کە توانیان، واتە زۆربەیان، بەرەو ئەمەریکای باکوور کۆچیان کرد. پاشماوەی پۆڵەندیەکانی ئورووپا، نزیک بە نیوەی کۆی پۆڵەندیەکان، لەژێر دەسەڵاتی ڕووسیەدا ژیانیان بە سەر دەبرد، کە لە دڕندەیی و ملهوڕی و ناکارامەییدا دەستی هەمووی دەوڵەتانی بەستبۆوە.

پیلسۆدیسکی، وەکوو منداڵانی تری پۆڵەندی لە ڕووسیە، قسەکردن بە زمانەکەی خۆی لێ قەدەغەکرابوو. هەرچەند کاتۆلیک بوو، وەکوو زۆربەی هەرەزۆری پۆڵەندیەکان، زەختی لێدەکرا تا لە خزمەتگوزاریەکانی ئۆرتۆدۆکسدا بەشداری بکات. ئەو بوو بە سوسیالیستێکی ڕادیکاڵ، و هەر ئەمەش سەبارەت بە پۆڵەندایێکی بۆلشویکی لەناو ئاشتیکەرەکاندا دڵەڕاوکێ و نیگەرانی درووست کرد، بەڵام لەسەرووی هەمووی ئەمانەوە ئەو ناسیۆنالیست بوو. ڕۆژێک دوائەوە کە گەیشتەوە قۆرشۆ بەدوای ئاگربەستەکەدا، هاوڕێیانی دێرینی سوسیالیستی ئەو هاتن بۆ دیتنی و بە هەڵە بەناوی هەڤاڵ بانگیان لێکرد. ئەو بەوانی ڕاگەیاند کە " برادەرینە ئێمە هەردووک لا وەک هاوسەفەر لە پاسێکدا بووین، بەڵام کاتێکە من لە وێستگەیەک بەناوی *سەربەخۆیی پۆڵەندا* دابەزیم، ئێوە واتان بە سەلاح زانی تا وێستگەی*سوسیالیزم* دانەبەزن. هیوای سەفەرێکی خۆش- بەڵام پیاوی چابن و من بە *بەڕێز!* بانگ بکەن."٤٥٩

ئەزموون و باری هەست و مێشک پیلسۆدیسکی کردبوو بە گورگێکی تەنیا کە نەیدەتوانی باوەڕ بە هەموو کەس بکات. بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٨٨٧دا دەستبەسەرکرا، لەبەرهۆی بەشداریکردن لە پیلانێک کە لەلایەن براگەورەکەی لنینەوە بۆ ترۆرکردنی تزار ڕێکخرابوو، و بۆ ماوەی پێنج ساڵ ناردرایە سێربێستان. (براکەی لنین لەدار درا.) لە ساڵی ١٩٠٠دا ئەو سەرلەنوێ دەستگیرکرایەوە، بەڵام بەخۆشێتکردن توانی ڕزگاری بێت و خۆی دەرباز کرد. ئەو وەک ڕێکخەر و پارەکۆکەر ساڵانی پێش شەڕی لە ژێرزەمینی سوسیالیستیدا تێپەڕاند. (ئەو زۆر بانگ و شەمەندەفەڕی پۆستێتی بە تالان برد.) ئەو لەگەڵ پیلانگێڕێکی هەڤاڵدا ژیانی هاوبەشی درووست کرد، بەڵام پێوەندیەکە پچڕا کاتێکە لەگەڵ ژنێکی لاوتر لە ژێرزەمینیەکە پێوەندی سازکرد.٤٦٠

کاتێکە شەڕ دەستی پێکرد، پۆڵەندیەکان لەناوەڕاستدا گیریان خواردبوو، هەندێکیان بۆ مەجارستان-ئوتریش و ئەڵمانیا شەڕیان دەکرد، ئەوانی تر بۆ ڕووسیە. جاری وابوو ئەوان لە قۆرتەکانی دوژمنەوە گۆرانی پۆڵەندیان دەبیست و بەگوێ دەگەیشت. پیلسۆدیسکی چارەنووسی خۆی دا بە

دەست مەجارستان-ئوتریشەوە، بەڵام لە پاریسەوە خاڵێکی ڕەش بە نێو چاوانیەوە لکێنرابوو. لێکدانەوەکەی ئەو ڕوون و ئاشکرابوو: ڕووسیە تەگەرەی سەرەکی بوو لەبەرانبەر ئاواتەکانی پۆڵەندیەکاندا. کاتێکە ڕووسیە لە ساڵی ١٩١٧دا ڕووخا و ئوتریش-مەجارستان لەرزۆکتر بوو، ئەو هەردوو گوێکانی خۆی قولاغ کردبوو؛ دوایەمین شتێک کە ئەو خوازیاربوو ئەڵمانێکی بەهێز بوو. ئەو نەدەهێشت ئاپۆرەی خەڵکانی پۆڵەندی بچنە ژێردەسەڵاتی فەرمانڕەوایی ئەڵمانیەوە و بۆیە بۆ ڕایەکی تر لە زیندان سەری دەرهێنایەوە.٤٦١

لە گەڕانەوەیدا بۆ ڤۆرشۆ لە ساڵی ١٩١٨دا، پیلسۆدیسکی، کە لەگەڵ ئاپۆرەی هاوڕێی خاوەنی یەکێک لە هێزە یەکگرتوە دەگمەنەکانی بەجێماو لە ئورووپای ناوەندی بوو، لە بەرپرسانی داگیرکاری ئەڵمانیا بەناوی پۆڵەندا دەسەڵاتی گرتە دەست. سیاسەتمەدارێکی پۆڵەندی ڕایگەیاندبوو کە " ناکرێ لێرەدا باسی ئەو هەموو جۆش و خرۆشە کرێ کە سەرتاپای کۆمەڵگای پۆڵەندی داگرتبوو. پاش سەدوبیست ساڵ دامێنبەستەکان[کۆردۆن] پچڕان. " ئەوان نەماون! ئازادی! سەربەخۆیی! وڵاتی تایبەت بەخۆمان!" بنەماڵەیەکی ڕەسەن شەرابی ساڵی ١٧٧٢ی دەرهێنا، ڕێکەوتی یەکەمین دابەشکردن، کە ئەوان هەڵیان گرتبوو تا ئەم ساتەی پێ جێژن بگرن. (دیپلۆماتێکی ئینگلیزی لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە " سەرتان سووردەمێنێ ئەگەر بڵێم کە بۆ خواردن دەبوو."٤٦٢)

پیلسۆدیسکی یەکجار زۆر نەیاری هەبوو: کۆنەپارێزان ترسیان لە سوسیالیزمی ئەو بوو، لیبراڵەکان ڕقیان لە شەیدابوونی ئەو بە توندوتیژی بوو، و ئەوانەی کە چاویان بڕیبوە هاوپەیمانان، تەنانەت ڕووسیەش، بۆ یارمەتی. وتەبێژی ئەوان ڕکابەری گەورەی خۆی، ڕۆمان دمۆویسکی بوو. پیلسۆدسکی لە بنەماڵەیەکی ناسراو و ناودارەوە سەری دەرهێنابوو، بەڵام دمۆڤسکی کوڕە هەژارێکی شاری بوو. وەک بیۆلۆژیستێک ئەو هۆگری زانست، ئەقڵ و ژیربێژی بوو. ئەو لای پیانیستی گەورەی پۆڵەندی وتبووی کە مۆسیقا "جگە لە دەنگەدەنگ" چیتر نیە. ئەو حەزی لە پیلانگێڕی بە کەش و فش، پۆزلێدان و خۆهەڵکێشان، جووڵانەوەی بێ کەڵکی دەست و چاو نەبوو، ئەو واهەستی دەکرد کە ناسیۆنالیزمی لەهێساتنی لەوانەی زۆر بەخۆیەوە دیبوو. ئەو خوازیاری ئەوە بوو کە پۆڵەندیەکان پێشکەوتوو و کارجوان بن. ئەو خولیای گەڕانەوە بۆ ئۆستەلژیای پۆڵەندی کۆنی لەمێشکدا نەبوو، بۆ نەریتی هەڵکردن لەگەڵ ئاییندا یان هەوڵەکانی لەپێناو دانووستان کردن لەگەڵ نەتەوەکانی تر وەکوو لیتوانیەکان یان ئۆکراینیەکان یان جوولەکەکان. وەکوو داروینیدتەکانی سوسیال ئەو لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە ژیان واتە خەبات و تێکۆشان. مرۆڤە بەهێزەکان براوەن و لاوازەکانیش دۆڕاوەن. ئەو بەگشتی لە ئورووپای ڕۆژئاوادا باوی

هەبوو، هەرچەند بەریتانیەکان لەوێ شوێنێکیان بۆخۆیان کردبۆوە. دیپلۆماتێک کە دەبوایە لەگەڵی دانووستان بکات لەبارەیەوە وتبووی کە " ئەو پیاوێکی کارامەبوو، و پیاوانی کارامە جێی متمانە نین: ئەو لە بیرۆکە سیاسیەکانی خۆیدا ژیریێژ بوو، و ئێمە قینمان لە ژیریێژیە: و ئەو سووربوونێکی لەسەر مەبەست پێوە دیار بوو کە والێکدەدراوە هەموولایەک لە دین دەهری بکات."٤٦٣

لێژنەی نەتەوەیی پۆڵەندی دمۆوسکی لە پاریس ئەی‌وت کە وتەبێژی پۆڵەندیەکانە، و لە ساڵی ١٩١٨دا حکوومەتی فەرەنسەیی ڕەزایەتی بەوەدا کە سووپایەک لە پۆڵەندیانی تاراوگەنشین لە فەرەنسە بە فەرماندەیی ژەنەراڵ ژۆزێف هالێر دەبێ بێنە ژێر کۆنترۆڵیەوە. کاتێکە شەڕ کۆتایی پێهات، پۆڵەندا دوو حکوومەتی شاراوەی هەبوو، یەکیان لە پاریس و ئەویتریان لە ڤۆرشۆ، و دوو ڕێبەری ڕکابەر، هەرکیان بە هێزی چەکداری خۆیەوە. بەپێچەوانەی ئەمە، چەکسلەواکیەکان تازە بە دەنگێکی تاک و ڕەسا کەوتبوونە قسەکردن.

پرسیارێک کە بۆ بیانیەکان درووست ببوو ئەوە بوو کە بڵێی ئەمە پۆڵەندیش بگرێتەوە. لە ساڵی ١٩١٩دا، هەمووی سنوورەکانی کەوتبوونە ژێر پرسیارەوە و دوژمن هەموو شوێنێکی تەنیبۆوە: یەکەکانی پاشماوەی سووپای ئەڵمانی، زۆربەی ئەوان بەرەو ڕۆژهەڵات، و ڕووسیەکان (بۆلشویکی و نابۆلشویکی، هیچکامیان خوازیاری پۆڵەندایکی سەربەخۆ نەبوون) و ناسیۆنالیستەکانی تر کە بۆ یەک ناوچە کەوتبوونە ململانێکردن: لیتوانیەکان لە باکوور، ئۆکراینیەکان بەرەو ڕۆژهەڵات، و چەکسلۆڤاکیەکان و سلۆڤاکیەکان بەرەو باشوور. و پۆڵەندا لەڕووی سرووشتیەوە زۆر لاواز بوو و نەیدەتوانی لەخۆی پارێزگاری بکات. لەنێوان ساڵانی ١٩١٨ و ١٩٢٠، پیلسۆدسکی دەبوایە لەگەڵ شەش دانە شەڕی جیاواز ڕووبەڕوو بوایەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دەبوایە ئاگاداری دواوەی خۆی بوایە، بە لایەنگرانی دمۆوسکی لە باڵی ڕاستی خۆیدا و توندڕەوەکانیش لە باڵی چەپیدا.

پیلسۆدسکی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ کەڕتر و ڕەنگزەردتر و جەسوورتر دەبوو. ئەو بە پەشێویەوە کاری دەکرد، زۆر جار شەوی بە دەم ڕۆژەوە دەدا، و بە چای و بە جگەرە تا بەرەبەیان خۆی بەخەبەر ڕادەگرت و نەدەخەوت. لە مانگەکانی سەرەتادا ئەو زۆر جار لە کۆشکێک کە دەستی بەسەردا گرتبوو دەهاتە دەرێ و بە پێیان تێپەر دەبوو تا ژەمێکی سادە لە چێشتخانەیەکی هەرزان بخوات. کارەکەی ئەو زۆر ترسێنەر و سەیر بوو. نزیک بە سەدی دەی سامانی پۆڵەندا لە شەڕدا لەناوچووبوو. ئەڵمانیەکان لە کاتی داگیرکردنەکەی خۆیاندا ناوچەکانی پۆڵەندیان بە تاڵان بردبوو. کەرەسەی خاو، کەل و پەلی درووستکراو، کارخانەکان، دەم و دەزگای قورس و تەنانەت زەنگی کەنیسەکانیش دەرخواردی هەڵمەتی شەڕی ئەڵمانی درابوون. دیپلۆماتێکی بەریتانی کە هەر لە

سەرەتای ساڵی ١٩١٩دا گەیشتبوە ڤۆرشۆ لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە "لە هیچ شوێنێکی تر بە قەدەر ئێرە ئاوا لەنزیکەوە هەستم بە هەژاری و نەداری لە هەر لایەنێکەوە نەکردوە." پیلسۆدسکی دەبوایە ئابووریە جیاوزەکان، یاسا جیاوازەکان و بۆرۆکراسیە جیاوازەکانی پێکەوە گرێ بدایە. ئەو دەبوایە نۆ سیستەمی جیاوازی یاسادانەری ڕێک بخستایە. ئەو دەبوایە پێنج پوولی باوی بکردایە بە یەک پوولی باو، و ئەو تەنانەت ئامێری لەچاپدانی یاداشتەکانی بانکیشی نەبوو. ڕێگاکانی شەمەندەفەر ، بە ٦٦ جۆر هێڵی ئاسنەوە، ١٦٥ جۆر لۆکۆمۆتیڤەوە و چل تیکەیەک لە سیستەمەکانی سیگناڵ لێدان خەونێکی ناخۆش و ترسێنەر بوون.٤٦٥

لەگەڵ ئەمانەشدا ئەو لەگەڵ خەڵکێک ڕووبەڕوو بوو کە حەز و خولیایان، پاش سەدەیەک بێ ئۆمێدی و بێ دەرەتانی، ئێستا سەرڕێژی کردبوو. باڵوێزێکی ئەڵمانی کەمتر لە مانگێک بەدوای ئاگربەستەکەدا لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە " پۆڵەندیەکان وەک زەرنەقووتەیەکی تازە لەهێلکە سەردەرهاتوو هەر دەم دەکەنەوە و داوای شت دەکەن." باسی سنوورەکانی ساڵی ١٧٧٢ لە ئارادا بوو، ئەو کاتەی کە پۆڵەندا زۆربەی لیتوانیا و بێلارووس و بەشێکی زۆر لە ئۆکراینی لەخۆ گرتبوو. لە پاریس دمۆویسکی و لێژنەی نیشتمانی پۆڵەندی ئەو پەرەیان بە پۆڵەندایکی زۆر گەورە دا تا وەک چاودێرێک بە سەر هەم ئەڵمان و هەمیش بۆلشویزم چالاکی هەبێت. پۆڵەندەکەی ئەوان کەمینەی بەرچاوی لە ئەڵمانی، ئۆکراینی، بێلاڕووسی، لیتوانی-لە سەدا ٤٠ی کۆی حەشیمەت- کە هەر هەموویان لەلایەن لەهێستایەکانەوە بەتوندی بەڕێوەبەرایەتی دەکرێن. با دمۆوسکی باسی زمانی خود-موختاری بۆ هاوپەیمانان کردبێت، بەڵام لە ماڵەوە شتی هیچ و پووچی لەوچەشنە هەرباسیشی لێنەدەکرا.٤٦٥

پیلسۆدسکی وورياتر بوو. ئەویش، خوازیاری پۆڵەندایکی بەهێز بوو بەڵام ئامادەبوو کەمتر لە دمۆوسکی قەبووڵ بکات. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو خوازیاری ئەوە بوو کە بیر لە فیدراڵیتەیەک بکاتەوە، کە تێیدا لیتوانیەکان، یان ڕەنگە ئۆکراینیەکان، لەگەڵ پۆڵەندیەکان چالاکی هاوچەشن بکەن. ئەو هەستی بەوە کردبوو کە لەلایەن هاوپەیمانانەوە پێویستی بە یارمەتی هەبێت. " هەمووی ئەو شتانەی کە ئەو دەتوانێ لە ڕۆژئاوای بگرێت بە ئەتەنتە بەسراوەتەوە، لەڕادەیەک کە ئەو دەیەوێت گوشار بخاتە سەر ئەڵمانیا." لە ڕۆژهەڵات، کەش و هەواکە جیاوازتر بوو. "لێرەدا درگاگەلێک هەن کە دەبەسرێن و دەکرێنەوە و بەسراوەتەوە بەوە کە کێ بەزۆری دەیان کاتەوە و تاچرادەیەک."٤٦٦

هەڵبەت، پۆڵەندیەکان لەسەر یەک شت ڕێکەوتبوون: پێویستی دەستڕاگەیشتن بە ناوچەی باڵتیک. ئەفسەرێکی ئەمەریکی لە ڤۆرشۆ لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە ئەوان خەریکن

لەگەڵ دەرد و مەینەتیەکی زۆر هەڵدەکەن چون ئەوان دەیانتوانی پیشبینی بکەن کە پۆڵەندا خەریک بوو بۆ جارێکی تر زلهێزێکی گەورەی لێدەردێت، و تجارەتەکەی بەدرێژایی ڤیستچوولا و ڕێگاکانی شەمەندەفەڕ کە بەرەو دەریا دەکشان خەریکە دووبارە پەرە دەستێنێت. پێویست بوو کە ئەو ئاواتە بە کەم نەگیرێت: "هیوای ئەوان بە داهاتوو کەم بۆتەوە، توندوتیژی دەمکاتی ئێستا بەتەواوەتی خۆی دەردەخات و هەستی نیشتمانپەروەری ئەوان هەر لە بنەڕتدا کەوتبوە لەرزین. بەبێ ئەم داهاتوە بۆدەبێ ئەوان لەبەرانبەر بۆلشویزمدا دریژە بە بەرەنگاربوونەوە بدەن؟" دانزینگ، لەناو دەمی ڤیستچپلادا، بۆ پێکهێنانی بەندەرێک هەڵبژاردەیەکی باش بوو. ئەوێ کاتی خۆی لەچوارچێوەی دەسەلاتی پۆڵەندیدا شارێکی گەورەی ئازاد بوو. بە تجارەتێکی پڕپیت و بەرەکەت، تاجرانی دەوڵەمەند و خانووی گەورەگەورە و سەرنجڕاکێش کە دانزینگ لەخۆی گرتبوو، خەڵک ناویان نابوو ئامێستردامی ڕۆژهەڵات. هەر لە سالانی دەیەی ١٧٩٠ بەم لاوە کەتبوە ژێردەسەلاتی ئەڵمانیەکانەوە. لە ساڵی ١٩١٩دا حەشیمەتەکەی لەسەدا ٩٠ی ئەڵمانی بوو، هەرچەند بەشێکی زۆر لە گوندەکانی دەوروبەری پۆڵەندی بوون٤٦٧

هەرپێش کۆری ئاشتی هاوپەیمانان لەسەرئەوە ڕێکەوتبوون کە پۆڵەندا دەبێ سەربەخۆ بێت. هەڵبەت بەریتانیەکان ئامادە نەبوون بۆ ئەم دەسکەوتە زۆر وەبەربێنن، چون ئەوان قازانجێکی نەتەوەیان لەوێ نەدەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوان لەوە دەترسان، ترسەکەشیان بە هەق بوو، کە پۆڵەندا بارگرانیەک درووست بکات. ئەگەر دراوسێکانی، بەتایبەت ئەڵمان و ڕووسیە، هێرشیان بکردایەتە سەری کێ بوو تا پارێزگاری لێ بکات؟ جگە لەمانە، بەریتانیەکان بەتایبەت زۆر حەزیان لە ململانێی کردن لەگەڵ پۆڵەندیەکان نەبوو. پیلسۆدسکی دژبە ئەوان جەنگابوو و ڕادیکاڵێک بوو کە مەترسی لێدەکرا. دمۆوسکی و لیژنەی نیشتمانی پۆڵەندی زۆر توندئاژۆ بوون. دیپلۆماتێکی بەریتانی لە ڤۆرشۆ وتبووی کە " لەڕاستیدا باوەڕێکی باو کە تاڕادەیەکی زۆر لەوکاتەدا لەسەر من کاریگەری دانا پێدەچێ ئەوە بووبێت کە بەئەنجامگەیاندنی هەرکارێک کە لیژنەی پۆڵەندی داواکاری بوو سەپاندنی ڕژیمێک بوو لەخاوەن زەوی و زارە پەستەکان بەسەر پۆڵەندا کە زۆربەی ژیانی خۆیان بە کاری هیچوپووچەوە تێپەڕاندبوو، و دامەزراندنی حکوومەتێکی ئاژاوەگەر بوو لەوێ مەبەستی سەرەکی داگیرکردنی ئەو ناوچانەبوو کە جەماوەری ناپۆڵەندی لەوێ نیشتەجێ ببوون." دمۆوسکی لە کاتی شەڕدا لە بەریتانیا بە دەربڕینی چەند تێبینیەک لە ئێوارەخوانێکدا کە لەلایەن جی.کەی.چێستێرتۆن درابوو نەیتوانی لەخۆی داکۆکی بکات، واتە " ئایینی من لە عیسامەسیحەوە سەرچاوەی گرتوە کە لەلایەن جوولەکەکانەوە ترۆرکرا." بەریتانیەکان، کە ئەوانیش بەش بەحاڵی

خۆیان دژ بە بیروباوەڕی سامی خوازی بوون، ئەویان وەک پیاوێکی خاو و نەکوڵاو هاتە بەرچاو. جوولەکە ناودارەکانی بەریتانیا سەبارەت بە دانووستانەکانی حکوومەتەکەیان لەگەڵ لیژنەی نیشتمانی پۆڵەندی دەنگی ناڕەزایەتیان دەربڕی. لە ئۆفیسی تایبەت بە کاروباری دەرەوە، لویس نامیر، کە بۆخۆی بە ڕەچەڵەک پۆڵەندی و جوولەکە بوو، دژ بە دمۆوسکی و "تاقمی ئاژاوەگەری هاوڕێی" هەڵمەتێکی سازکرد.٤٦٨

فەڕەنسەیەکان، بەپێچەوانە، تەنیا لایەنگرانی گەورەی دموۆوسکی نەبوون؛ ئەوان لە پۆڵەندا قازانجێکی زۆریان کردبوو. لە پاییزی ساڵی ١٩١٧دا چەندین مانگ بەرلە بەریتانیا و وڵاتەیەکگرتوەکان، پیچۆن ڕاشکاوانە لەبەرابەر جەماوەردا بەڵێنی پشتگری کردنی فەڕەنسەی لە پۆڵەندایێکی سەربەخۆ ڕاگەیاند، "پۆڵەندایێکی زۆر گەورە و بەهێز، یەکجار بەهێز". سیاسەتی فەڕەنسە سەبارەت بە پۆڵەندا تێکەڵاوێک بوو لە سیاسەتێکی خەیاڵی و واقعی. فەڕەنسە چیتر ڕووسیەی نەمابوو تا هاوهێزی ئەڵمان بکات، بەڵکوو پۆڵەندایێکی بەهێزی هەبوو، هاوپەیمان لەگەڵ چۆکسلەواکیا و ڕۆمانیا، دەیتوانی ئەو ڕۆڵە بگرێتە دەست. لەگەڵ ئەوەشدا پۆڵەندا بۆ فەڕەنسەیەکان وەبیرهێنەرەوەی ماریا والیویساک بوو، دۆستی جوانی ناپلۆئۆن (کوڕەکەیان ببوو بە وەزیری دەرەوەی فەڕەنسە)، وەبیرهینەرەوەی تاراوگەنشینانی پۆڵەندی لە پاریس بوو، وەبیرهێنەرەوەی فریدریک چۆپین، خۆشەویستی جۆرج ساندی خۆیان، وەبیرهێنەرەوەی فیداکەرانی پۆڵەندا بۆ خەبات لەپێناو فەڕەنسە دژ بە پڕاشا لە ساڵی ١٨٧٠دا. پۆڵەندا هەم بۆ کاتۆلیکە دیندارەکان و هەمیش بۆ لیبراڵە چاکەکان قیبلەگایەکی هەرە پیرۆز بوو. وەک قوتابیەک، کلیمینجوو سەبارەت بە دەربازبوون لە سەرکوتکردنی تزاریست لەگەڵ پۆڵەندیەکان قسەوباسی زۆری کردبوو. ئەو لە ڕۆژنامەکەی خۆیدا سەبارەت بە شەڕی گەورە نووسیبووی کە "پۆڵەندا بۆ جارێکی تر ژیانی ئاسای خۆی دەگرێتەوە بەر. ئاسەواری یەکێک لە گەورەترین جەنایەتەکانی مێژوو خەریکە دەسڕدرێتەوە." لەکاتی شەردا فەڕەنسەیەکان لەپێناو بووژاندنەوەی پۆڵەندادا پارەیەکی زۆریان وەک یارمەتی دانا؛ لە کاتی کۆڕی ئاشتیدا، ئەوان وەک ڕێزلێنان لە پۆڵەندا ئێوارەخوانەکانیان دەستپێدەکرد.٤٦٩

وڵاتەیەکگرتوەکان لە شوێنێک لە نێوەڕاستدا هەڵکەوتبوو. ئەویش بەش بە حاڵی خۆی بیرەوەری لە لەهێسان هەبوو: تادیۆسز کۆسیۆسزکۆ، قارەمانێک لە شەڕی سەربەخۆیی ئەمەریکیدا؛ پۆڵەندیەکان لە هەردوو لا لە شەڕی ناوخۆدا؛ پادێرێویسکی هۆڵی کۆنسێرتی دادنا. لە ساڵی ١٩١٤دا، پۆڵەندیەکان گەورەترین تاقە گرووپی کۆچبەران بوون لە ناوەندی ئورووپاوە، ژمارەیان ڕەنگە بگەیشتایەتە ٤ملوێن کەس،

بە ڕۆژنامە، قوتابخانە، کەنیسە و دەنگدانی خۆیانەوە. شەڕ هەستی نیشتمانپەروەری شاراوەی ئەوانی وەخەبەر هێنا بەڵام لەگەڵ ئەوەش لەنێوان پۆڵەندیەکانی پشتگری-هاوپەیمانی و پشتگری ئەڵمانی جیاوازی دانا، ئەو هەستەی درووست کرد کە پۆڵەندیەکان هەمیشە بەیەکەوە قڕیان هەیە. بەڵام ئەمەریکیەکان بەو نەدامەتیانەی کە بەسەر پۆڵەندیەکاندا هاتبوو، وەک بەسەر بلژیکیەکانیشدا هاتبوون، هەژان. ویلسۆن وردە وردە هاتە سەر ئەو قەناعەتە کە پشتگری لە پۆڵەندایێکی سەربەخۆ بکات بەڵام سەبارەت بە سنوورەکانی ئەو وڵاتە بێ لایەن بوو. ئەو بە هاوڕێیانی ئاشتیکەری خۆی لە پاریس ڕاگەیاند کە " من لە واشنگتۆن چاوم بە ئێم.دمۆوسکی و ئێم.پادێرێوسکی کەوت، و من داوام لێکردن کە پۆڵەندا بە من بناسێنن، چون ئەوان شارەزا بوون، و ئەوانیش خەریتەیەکیان خستە بەردەمی من کە تێیدا ئەوان داوای بەشێکی قەبەیان لەسەر گۆی زەوی دەکرد."٤٧٠

کاتێکە فەرەنسەیەکان هەوڵیاندا لێژنەی نیشتمانی پۆڵەندی وەک تاقە نوێنەری خەڵکی پۆڵەندا بناسن، بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان پاشەکشێیان کرد. ئەوان کردیان سەر دمۆوسکی تا لەگەڵ پیلسۆدسکی هاوپەیمانیەک پێکبێنێت. ناسراوترین پۆڵەندی لەسەرتاسەری جیهاندا، ئیگناس پادێرێویسکی، بە ئەرکی زانی هەردوو پیاوەکە یەک خات و ئاشتیان کاتەوە. لە مانگی دێسامبری ساڵی ١٩١٨دا، بەریتانیەکان ڕێگایان بۆ خۆش کرد تا لەسەر HMS Condor بگەڕێتەوە بۆ پۆڵەندا. (ئەو لە شەوی کریسمەسدا لە ژووری ئەفسەراندا پیانۆی ژەنی.) گەیشتنی ئەو بۆ پۆسێن (پۆزنان) لە ڕۆژی کریسمەسدا، لە ساڵی ١٩١٨، شادی و خۆشیەکی یەکجار جۆری خستە وڵات. خۆپیشاندانەکانی سەرشەقام ڕەنگی توندوتیژیان بەخۆوە گرت، و کاتێکە لە یەکەمین ڕۆژی ساڵی تازەدا بەرەو ڤۆرشۆ وەڕێکەوت، پۆسێن دژ بە دەسەڵاتدارانی ئەڵمانی خۆی ڕاپەڕیبوو. لەناو دەستانی پەیکەرێکی قەبەی بڕۆنزی لە سەرۆکی مەزنی ئەڵمان، بیسمارک، زمان بازێک بلیتی پلە-چواری دەکرد بۆ بەرلین دانابوو.٤٧١

پادێرێویسکی لە بنەماڵەیەکی مامناوەندی لە گالیسیای ئوتریشەوە هاتبوو، شوێنێک کە باوکی بۆ دەربەگێکی دەوڵەمەند و ناوداری ئەو ناوچەیە کاری دەکرد. دواتر شازادە وەبیری نیکۆلسۆنی هێناوە کە "پیاوێکی هەڵکەوتە، بەڕاستی پیاوێکی هەڵکەوتە. ئایا دەزانی ئەو لە یەکێک لە گوندەکانی من لەدایک بوە؟ لە چیپیتۆوکا؟ و ئێستاش کاتێکە لەگەڵی دەدوێم، من بەتەواوەتی واهەست دەکەم کە لەگەڵ هاوچەشنێکی وەک خۆم قسەدەکەم."٤٧٢ پادێرێویسکی بوو بە ئەستێرەیەکی نێونەتەوەیی. بێرنی-جەونێس بە سەریدا هەڵیکوت، جۆرج بێرنارد شۆ تاریفی لە بەهرەی مۆزیکی ئەو کرد، و ژنان بە سەدان کەس نامەی خۆشەویستیان بۆ نارد.

زمانپاراو، شپرێو و نارێک و پێک، پیاوێک کە وەک منداڵێکی ساوا سەودایەکی سەیری فێربوون و ناسینی دەورووبەری لە سەری دابوو. لە کاتی شەڕدا ئەو بەڵێنی دابوو هەتا پۆڵەندا بۆجارێکی تر ئازاد نەکرێت مۆسیقا نەژەنێت. ئەو ژیانی خۆی بۆ کۆکردنەوەی پارە بۆ مەبەستی ڕزگارکردنی پۆڵەندیەکان و گوشارخستنەسەر ڕێبەرانی جیهان تەرخان کردبوو. لە هاوینی ساڵی ١٩١٦دا ئەو لە داوەتیەکی تایبەتیدا لە کۆشکی سپی مۆسیقای ژەنیبوو، هەڵبەت لەجۆری چۆپین. ویلسۆن دواتر بۆ هاوکارێکی خۆی گێڕابۆوە کە " خۆزگە گوێتان لە وتارەکانی پادێرێویسکی بۆ وڵاتەکەی بوایە، زۆر بەرزتر لەوکاتانەی کە بە ژەنینی پیانۆکەی خۆی سەدان کەسی دەهێنایە جۆش بە وتارەکانی هەستی جەماوەری بزواندبوو." لایانگرانی پادێرێویسکی دواتر ڕایانگەیاند کە ئەوە هەوڵەکانی ئەو بوو بوون بە هۆی وخۆگرتنی پۆڵەندا لەناو چاردە خاڵەکەی ویلسۆندا.٤٧٣

لە یەکەمین کۆبوونەوەکەیاندا لە ڤۆرشۆ، پادێرێویسکی، پیاوێکی جیهانی بە کۆتێکی درێژی فێر لەبەردا، و پیلسۆدسکی، شۆڕشگێڕێکی لەڕی ڕەنگزەرد لە ژاکەتێکی شپرێوی سەربازیدا، بە گومانەوە لە دەوری یەکتر پوورەیان دابوو. پیلسۆدسکی پێویستی هەم بە کارتێکردنی پادێرێویسکی بوو لە سەر لێژنەی نیشتمانی پۆڵەندی لە پاریس و هەمیش بە پێوەندیەکانی ئەوە، بەڵام پادێرێویسکی خوازیاری پۆڵەندایێک بوو کە بە یەک دەنگەوە قسەی دەکرد. هەرکیان لەسەر ئەوە ڕێکەوتن کە پیلسۆدسکی وەک سەرۆکی وڵات و فەرماندەی سەرەکی هێزەکانی سووپا بمێنێتەوە و پادێرێویسکی وەک سەرۆک وەزیر لە سەرکردایەتی حکوومەتێکی هاوپەیمانیدا و هەروەها نوێنەری پۆڵەندا لە کۆڕی ئاشتیدا شان بەشانی دمۆوسکی چالاکی بکات. ئەوان بە یەکەوە لە جەشنەکان، ئێوارەخوانەکان، شانۆکان، تەنانەت لەناو کۆمەڵێک لە کاتیدراڵی ڤۆرشۆ بەشداریان دەکرد، تا لە پەرڵەمانی تازەهەڵبژێردراوی پۆڵەندادا ڕێزیان گرتبێت. پادێرێویسکی و پیلسۆدسکی لەوە بەدواوە بۆ هەتاهەتایە لێک دابڕان.٤٧٤

کاتێکە کۆڕی ئاشتی کرایەوە پادێرێویسکی هێشتا هەر لە ڤۆرشۆ بوو، بۆیە تەنیا دمۆوسکی لەبەردەست دابوو کاتێکە پۆڵەندا بۆ یەکەمجار لە شۆڕای عالیدا لە مانگی ژانویە سەری دەرهێنا. پیلسۆدسکی داوای بەپەلەی جێبەجێردنی ئازووقەی کردبوو، بەتایبەت چەک و تەقەمەنی، بۆ ئەوەی پۆڵەندا بتوانێ بەرەنگاری دوژمنەکانی بێتەوە. فەڕەنسەیەکان داوای گەڕانەوەی سووپای پۆڵەندایان بە فەرمەندەیی ژەنەڕەڵ هالێر کردبوو. فۆچ وتی کە ئاسانترین ڕێگا بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئەم کارە، ناردنی سەرباز بوو بە کەشتی بۆ دانزینگ، کە هێشتا لەژێر کۆنترۆڵی ئەڵمانیەکاندا بوو، و دواتر بەرەوخواری ڕێگەی شەمەندەفەڕ بوو بۆ ڤۆرشۆ. بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان گومانیان هەبوو.

سووپاکەی هالێر لەناو کەمپی دمۆوسکی بوو؛ گەڕانەوەی بۆ پۆڵەندا لەوانەبوو شەڕی ناوخۆی لێبکەوتایەتەوە. ویلسۆن لەبەکارهێنای دانزینگ هەستی بە مەترسیەکی تر دەکرد: "بەگەڕانەوەی هێزەکانی پۆڵەندی بەرەو پۆڵەندا ئێمە خەریک بووین سەبارەت بە سەرجەم پرسی پۆڵەندی قەزاوەتێکی پێش وەختمان دەکرد." هەڵبەت ئەمە هەر ئەو شتە بوو کە پۆڵەندیەکان لە مێشکیان دابوو. کاتێکە ئەڵمانیەکان هەستیان بە پێشنیارەکە کرد، ئەوان زۆر بەرز دەنگی نارەزایەتیان دەربڕی. لە ئاکامدا سووپا لە مانگی ئاڤریلدا بەپێیان گەڕایەوە بۆ دواوە. پیلسۆدسکی بۆ گەڕانەوەی سووپاکە زۆر توند پێداگری نەکرد. ئەو هەر پێی خۆش نەبوو لەوەزیاتر هاوپەیمانان عاجز بکات بە پێداگری کردن لەسەر هێڵی هاتوچۆی دانزینگ ئەوجۆرەی کە دمۆوسکی دەیکرد؛ وادیاربوو ئەو هەر لەبابەت خودی دانزینگیشەوە زۆر بەتاسەوە نەبوو.٤٧٥

لە ٢٩ی مانگی ژانویەدا، دمۆوسکی بانگێشت کرا بۆ شۆرای عالی تا ڕووداوەکانی پۆڵەندا بگێڕێتەوە. ئەو لەو دەرفەتە کەڵکی وەرگرت و ڕیزبەندی داواکاریەکانی پۆڵەندا یان لانی کەم ئەوانەی کە ئەو پشتگری لێدەکردن پێشکەش کرد. ئەو ئەوەشی ڕاگەیاند کە ئەو نایەوێت داوای هەرشتێک بکات کە کاتی خۆی پۆڵەندا خاوەنی بوو. پارچەکانی لیتوانیا و ئۆکراین چیتر تایبەتمەندی پۆڵەندیان پێوە دیار نەبوو. بەسەر ئەوەشدا، پۆڵەندا بەدڵ خوازیاری ئەوە بوو کە یارمەتیان بات چون ئەوان هێشتا زۆریان لەبەر بوو تا بتوانن کاروبارەکانی خۆیان بەڕێوەبەرن. بەواتایەکی تر، پۆڵەندا دەبێ خاوەنی بەشی ڕۆژهەڵاتی ئەڵمان بێت. ڕاستە کە بەشێکی زۆر لەم ناوچەیە هەرگیز پۆڵەندی نەبوون، بەڵام ژمارەیەکی یەکجار زۆر پۆڵەندی لەوێ دەژیان، کە ژمارەیان زۆر زیاتر لەوە بوو کە ژمێرەناسی ئەڵمانی ئاماژەی پێدەکرد. " ئەم پۆڵەندیانە لەوانەبوون کە خوێندەوار و لەباری کۆلتوورییەوە زۆر لەسەرەوە بوون، و خاوەن هەستێکی بەسۆزی نیشتمانی و بیروباوەڕی پێشکەوتن خوازانە بوون." تەنانەت ئەڵمانیەکانی دانیشتووی ناوچەش چاویان تێبڕیبوون. لەگەڵ ئەوانەشدا پۆڵەندا پێویستی بە کانزا خەڵووزەکانی سێلسیا و تێسچێن هەبوو (پۆڵەندی: سیسزین؛ چەکۆسلەواکی:تێسین). لیۆد جۆرج بەدڵەوە گوێی شل کردبوو و ویلسۆن لەو تابلۆیانەی کە بە دیوارەکانەوە هەڵواسرابوون ڕامابوو.٤٧٦

پۆڵەندیەکان بۆ تووڕەکردنی تەنانەت هاوڕێکانی خۆشیان لە پاریس سەلیقەیەکی باشیان هەبوو. خەڵک بەشۆخیەوە دەیانوت کە کاتێک کە ئینگلیزیەک کتێبێکی سەبارەت بە فیلێکەوە دەنووسی، ئەو لەبیری شوێنی حەوانەوەیدابوو تا بتوانێ بەشێوەیەک نێچیری بکات؛ ئەڵمانیەکان سەبارەت بە زیندەوەرزانی ئەو فیلە وتارێکیان نووسی؛ بەڵام پۆڵەندیەکان بەوە دەستیان پێکرد کە "ئەو فیلە پرسی پۆڵەندیانە." تەنانەت فەرەنسەیەکانیش لەرادەی داواکاریەکانی پۆڵەندا لە ڕووسیە تۆقابوون، کە،

بەگشتی، لەوانەبوو ڕۆژێک بۆڕایەکی تر هاوپەیمانیەکی لێدەربێت. بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان سەبارەت بە نوێنەرانی پێشبڕکێکەر گلەیان هەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا چالاکیەکانی پۆڵەندیەکان لە سەر عەرزدا گومانیان درووست کردبوو. باڵفۆر وتی کە "پۆڵەندیەکان خەریک بوون لە پشووی نێوان ڕاگرتنی شەڕ و بڕیارەکانی کۆڕی ئاشتی کەڵکیان وەردەگرت تا داواکاریەکانی خۆیان لەسەر ناوچەکانی دەرەوەی پۆڵەندی ڕووسی بەشتێکی ڕوا بناسێنن، کە لەزۆر بابەتدا هیچ مافێکیان نەبوو، هەرچەند لەوانی تردا داواکاریەکانیان زۆر بەجێ و ڕەوابوو." ویلسۆن ڕازی بوو: لەگەڵ ئەوانەشدا، ڕۆمانیەکان، سێربەکان و مەجاریەکان خەریک بوون هەرهەمان کاریان دەکرد. پیلسۆدسکی خەریکی ڕاگواستنی هێزەکان بوو بەرەو ناوچەی ئەڵمانی بە دەوری پۆسێندا، لە باکوورەوە بەرەو لیتوانیا و لەباشوورەوە بەرەو گالیسیا. کێشەکە لەوەدابوو کە چۆن بەری پێبگیرێت. هاوپەیمانان دەیانتوانی بەری ئازووقەکان بگرن، بەڵام هێشتا شتێکی وایان نەناردبوو. ئەوان دەیانتوانی هەڕەشە بکەن، بەڵام قودرەتێکی ڕاستەقینەی یەکجار کەمیان لە ناوەندی ئورووپادا بە دەستەوە مابوو. لەڕاستیدا، ئەوان زەخت کرابوە سەریان تا لەشوێنێک بەدرێژایی سنووری هاوبەش لەگەڵ ڕووسیە هێزەکانی ئەڵمانی ڕابگرن. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان هەر لە گومان دابوون لەوەکە سزایەکی قورس بەسەر پۆڵەندیەکاندا بسەپێنن. بەواتای ویلسۆن لە مانگی مەیدا ئەوکاتەی کە شۆڕای چواریار، بۆجاریکی تر، سەرقاڵی بیرکردنەوە لەو ڕێگەچارانەبوو تا سووپای پۆڵەندا بێنێتە سەر ئەو قەناعەتە کە کۆتایی بە هێرشکردن بۆ سەر ئۆکراینیەکان بێنێت، " ئەگەر پادێرێویسکی بکەوێ و ئێمەش لە ئازووقەکانی خواردەمەنی بەرەو پۆڵەندا ببڕینەوە، ئایا پۆڵەندا بۆخۆی بۆلشویکی لێدەرنایەت؟ حکوومەتی پادێرێویسکی وەکوو بەربەستێک وایە لەبەرانبەر ئاژاوەگەریدا، و ڕەنگە تەنیا دانەیەک بێت کە شیمانەی دەکرێتێ." ئەگەر ئەو بەربەستە نەمایە، کێ چوزانێ تەوژمی بۆلشویکی تا کوێی ڕۆژئاوای دوور شاڵاوی دەبرد؟

ئاشتیکەران تێلێگرافی گلەیی و پەیامی حەقیقەت-دۆزیان ڕەوانەکرد. لیۆد جۆرج ژیرانە وتی کە "هەنگاوێک کە لەڕووی زانیاریەوە هەڵنەگیرێت لەوانەیە هەرچی پەرچی بەدواوە بێت." ئەوان پسپۆڕی نیزامیان نارد، فەڕەنسیەکان هاوڕێ لەگەڵ کۆلۆنیل چارلێس دی گۆلی، بەریتانیەکان بە ڕێبەرایەتی قارەمانی شەڕ ژەنەڕاڵ ئادریان کارتۆن دی ویارت. بە تاقە دەستێکەوە، تەنیا چاوێک و تەنیا لاقێک، ئەو کاریگەریەکی قورسی لەسەر پۆڵەندیەکان دانا بەبێ ئەوەی گوێی لە مەترسی بێت یان حەز بە شەڕەخەنجێر بکات.٤٧٧

بەواتایەکی تر ئاشتیکەران بەگشتی بابەتەکانی تایبەت بە پۆڵەندایان بۆ پسپۆڕان بەجێ هێشت. لە مانگی فەوریەدا، شۆڕای عالی کۆمیسیۆنێکی لەسەر کاروبارەکانی تایبەت بە پۆڵەندا

دامەزراند، تا بە ئەو گوزارشانە ڕابگات کە لە پۆڵەنداوە دەهاتن. دوو حەفتە دواتر، بالفۆر، کە بەهیوا بوو لە نەبوونی ویلسۆن و لیۆد جۆرج خێرایی بە چالاکیەکانی کۆڕی ئاشتی ببەخشێت، بۆی دەرکەوت کە سەبارەت بە سنوورەکانی پۆڵەندا هیچ شتێک لە ئاست جێبەجێکردندا نەبوو. لەسەر پێشنیاری ئەو، کۆمیسیۆنی پۆڵەندی ئەرکەکەی وەئەستۆگرت. ئەندامانی ئەو کۆمیسیۆنە، بەنەبوونی هەر ئامۆژگاریەکی وورد و پوخت، وایدانا کە ئەوان دەبێ بڕیارەکانی خۆیان لەسەربنەمای هۆکارگەلی ڕەگەزی و لەسەر بەڵێنی ویلسۆن بۆ دەستپێڕاگەیشتن بە دەریا بڕێژن.٤٧٨ ئەمەش بە لەونێک هاتنەدی زۆر ئەستەم بوو.

نەبوونی بەربەستەکانی سرووشتی بۆ پۆڵەندا بەدرێژایی سەدەکان ڕێگەی هاتنەژوورەوەی بە دەستدرێژکەران دابوو. لە ڕۆژهەڵات دانیشتوانی تازەهاتووی پۆڵەندی بەرەو باکوور و باشووری دارستانە گەورەکان و زۆلکاوەکان هەڵکشابوون کە بەدرێژایی سنوورەکانی بێلاڕووس و ئۆکراینی ئێستا هەڵکەوتوون. ئاکامەکە وەک مانگێکی چارەد وابوو، هاوڕێ لەگەڵ ناوچەیەکی پۆڵەندی تەمووردراو بە دەوری ویلا لە کۆتایی باکووری ئەویدا، ئەوی تریان بە دەوری لڤۆڤ (ئەڵمانی: لێمبێرگ؛ پۆڵەندی: لوۆو؛ ئەمڕۆکە، لڤیڤ لە ئۆکراین) لە باشوور. لە باکوور، پۆڵەندیەکان لەگەڵ لیتوانیەکان و ئەڵمانیەکان تێکەڵاو ببوون. یەکێک لە پسپۆڕان لە پاریس وتبووی کە لە ناوەڕاست، ناوچەیەکی گەورە هەڵکەوتبوو " بە حەشیمەتێکی نادیارەوە، کە لەوەدەچێ ڕووسی سپی پێست یان ئۆکراینی بن، بەڵام بەدڵنیاییەوە پۆڵەندی نین."٤٧٩ شارۆچکەکان پۆڵەندی یان جوولەکە بوون (زۆریەک لە جوولەکەکان بە پۆڵەندی ناسرابوون) و لە وڵات هەست بە هەبوونی بەحاڵ پڕیشکەیەک لە خاوەن زەوی و زارەکانی پۆڵەندی دەکرا.

لە ڕۆژئاوا هەست بە هەبوونی هەندێک تێکەڵ پێکەڵی هاوچەشن دەکرا. بۆ ماوەی چەندین سەدە، پۆڵەندیەکان بۆ باشوور بەرەو بالتیک هەڵکشابوون، و ئەڵمانیەکان بەرەو ڕۆژهەڵات ڕۆیشتبوون. بەدرێژایی قەراخەکانی ڕۆژهەڵاتی بالتیک شارەکان بەگشتی ئەڵمانی بوون. لە ناوچەگوندنشینەکان خاوەن زەوی و زارەکان بەگشتی ئەڵمانی بوون- بە بارۆنەکانی بالتیک ناسرابوون- هەرچەند بەرەو باشوور هەندێکیان پۆڵەندی و لیتوانی بوون. زۆرینەیەکی پۆڵەندی بەدرێژایی قەراخەکانی ڤیسچوڵا هەڵکەوتبوو. پڕاشای ڕۆژهەڵات، کە لە گۆشەی ڕۆژهەڵاتی باشوور بالتیک حەشاردرابوو بەگشتی ئەڵمانی-ئاخێوەر و پڕۆتێستان بوون. ئەگەر بێتو پۆڵەندا دەستی بە دەریا بگەیشتایە، بڵێی کۆنترۆڵی بە سەر هەم قەراخەکانی ڤیسچوڵا و هەمیش خودی دانزیگ هەبوایە؟ ئەو سەدان هەزار ئەڵمانی کە لەژێر دەسەڵاتی پۆڵەندیدا دەژیان لەبەرچاو نەدەگرت و

لەوڵەبوو ڕێگەی عەرزی لە بەشی ڕۆژئاوای ئەڵمانەوە بۆ پڕاشای ڕۆژهەڵات بپسانداپە. ژمێرەناسی وەک شوێنەکانی تری ناوەندی ئورووپا جێی باوەڕ و متمانە نەبوو. لە هەرحاڵدا، تەنانەت دانیشتوانی ئەو بەشە لەجیهان دڵنیا نەبوون لەوە کە بەڕاستی ئەوان کێن. ئایا پێناسەی ئەوان ئایینی بوو یان زمانەوانی؟ ئایا پرۆتێستانەکانی پۆڵەندی-ئاخێوەر، لە بەشی باشووری پڕاشای ڕۆژهەڵات وەک گرووپێکی بەرچاو، لەگەڵ هاوتاکانی ئایینخوازی خۆیان پێناسە دەکران، کە ئەڵمانی بوون، یان لەگەڵ پۆڵەندیەکان کە کاتۆلیک بوون؟ ئایا لیتوانیەکان نەتەوەیەکی جیاواز بوون یان جۆرێک پۆڵەندی بوون؟ ئایا ئۆکراینیەکان بەڕاستی ڕووسی بوون؟ لە کۆمیسیۆنی پۆڵەندیدا پسپۆڕانی ئەمەریکی و بەریتانی، کە لەسەر زۆربەی تەورەکان بەشێوەیەکی نافەرمی کۆدەبوونەوە، ڕێکەوتن لەسەرئەوە کە ئەوەندەی دەکرێ سنوورەکانی پۆڵەندا لەسەر بنەمای هێڵەکانی ڕەگەزی بڕێژرێن بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا هۆکارەکانی تر، وەکوو دەسڕاگەیشتن بە باڵتیک، کۆنترۆڵی ڕێگاکانی شەمەندەفەڕ یان بۆچوونە ستراتیژیەکان پێویست بوو لەبەرچاو بگیرانایە. فەڕەنسەیەکان، کە لەلایەن دیپلۆماتێکی پیری بەبیرەوە سەرکردایەتی دەکران، بەگشتی ئەمەیان قەبووڵ دەکرد بەڵام کاتێکە قرەی لەسەر سازدەبوو، بەگومانەوە سەیری مەسەلەی پۆڵەندیان دەکرد. ئەوان دەیانوت کە دەبێ پۆڵەندا خاوەنی سنوورگەلێک بێت کە لەبەرانبەر ئەلمان و ڕووسیەدا پارێزگاری بکرێن هەرچەند ئەوە بەمانای لەخۆگرتنی غەیری-پۆڵەندیش بوایە. ئیتالیەکان بەگشتی لایەنگری فەڕەنسەیەکان بوون. ژاپۆنیەکان، وەکوو جاران، هیچیان نەدرکاند.

کۆمیسیۆن یەکەمین گوزارشی خۆی لەسەر سنووره هاوبەشەکانی پۆڵەندا لەگەڵ ئەڵمانیا پێشکەش کرد، کە بڕیار بوو لە گرێبەستی ئەڵمانیدا تاوتوێ بکرێت، چەند ڕۆژ دوا ئەوە کە ویلسۆن لە ولاتەیەکگرتوەکان گەڕایەوە دواوە. پسپۆڕان هەوڵیان دابوو تا چۆمەکان و گۆلەکان لە یەک ولاتدا بهێڵنەوە، تا دڵنیابن لەوە کە ڕێگاکانی شەمەندەفەڕ بەپانتایی سنوورەکانی نێونەتەوەییدا بەر و دوایان نەدەکرد، و هەتابۆیان دەکرێت ژمارەیەکی کەم پۆڵەندی و ئەڵمانی لە بەرێک کە هینی خۆیان نیە بهێڵنەوە. لە کۆتاییدا، پۆڵەندا دەستی بە ناوچەی باڵتیک ڕادەگات لەگەڵ ڕێزی بۆ باسکێکی درێژ کە بەدرێژای ڤیسچوولادا دەگاتە ناوچەکای باکوور. باسکەکە- بە ڕاڕەوی پۆڵەندی دەکوترا- لە هەنیشکدا بەرە ڕۆژئاوا دەچەمیەوە تا بەگشتی پارێزگای پۆڵەندی بە دەوری پۆسێندا بکێشێت. پڕاشای ڕۆژهەڵات، هاوڕێ لەگەڵ بەندەری کۆنیگسبێرگ (شوێنێک کە کانت تێیدا ژیابوو)، وەک بەشی تایبەت بە ئەڵمانیا دەماوە. نزیک بە دوو ملوێن ئەڵمانی دەچوونە ژێر دەسەڵاتی پۆڵەندەوە. تەنیا ئۆلێنستەین (پۆڵەندی: ئۆلسزتین)، نزیکترین بەشی پڕاشای ڕۆژهەڵات بە

پۆڵەندا، هاوڕێ لەگەڵ پرۆتێستانەکانی پۆڵەندی ئاخێوەری خۆی، ڕای گشتی تێدا بەڕێوە دەچوو. کاتێکە لە ساڵی ١٩٢٠ لەئاکامدا بەڕێوەچوو، ٣٦٣،٠٠٠ تا ٨،٠٠٠ کەس دەنگیان دا لەگەڵ پڕاشای ڕۆژهەڵات بمێننەوە.

شۆڕای عالی لە ١٩ی مانگی مارسدا سەیری گوزارشەکەی کرد، لەگەڵ ئەوەشدا لە کۆبوونەوەیەکدا شەڕی نێوان پۆڵەندیەکان و ئۆکراینیەکانی خستە بەر باس. (تێلێگرافی زۆر حەواڵەی دەرەوە کران، دەستووری ئاگربەست بە هەردوولا ڕاگەیەنرا.) لیۆد جۆرج بەگشتی پێشنیارەکانی بەباش زانی. ئایا پێویست دەکا هاوڕێ لەگەڵ بەندەری دانتزیگ ناوچەیەکی زۆری ئەڵمانی بدرێ بە دەستەوە؟" ئەو ئاماژەی بەوەکرد کە ناوچەیەک هەبوو بە ناوی مارینوێردێر، نزیک بە پەنجا مایل لە باشووری دانزیگ و هاوسنوور لەگەڵ پڕاشای ڕۆژهەڵات، کە زۆرینەیەکی بەرچاوی ئەڵمانی هەبوو. ئاشکرایە کە دانیشتوانی ناوچەکە دەبێ ڕێگەیان بدرێتێ تا لەسەر چارەنووسی خۆیان لە هەڵبژاردنەکان بەشداری کەن؟ ئەو لە درێژەی باسەکەیدا وتی کە ڕارەوی پێشنیارکراو دادوەرانە نەبوو؛ خراپتر لەوە، زۆر مەترسیدار بوو. لەوانەیە ئەڵمانیا بێتە سەر ئەو بڕیارە کە گرێبەستی لەو چەشنە واژۆ نەکات. " ئەو ترسی ئەوەی هەبوو کە داواکاری لەوچەشنە، هاوڕێ لەگەڵ زۆر داواکاری تر کە دەبوایە ئاراستەی ئەڵمانیا بکرایە، ئاکامی ناخۆشی لەسەر ڕای گشتی ئەڵمانیەکان لێدەکەوتەوە. هاوپەیمانان نابێ خۆ لە مەترسی وەها بدەن و وڵات بخەنە ناو دۆخێکی چەتوون و نالەبار کە وای لێبێت هیچ حکوومەتێک نەوێرێت گرێبەستی لەگەڵ واژۆ بکات." ئایا ئەوان بە هێشتنەوەی ژمارەیەکی بەرچاوی ئەڵمانیەکان لە پۆڵەندا ئالساسێ-لۆرەینسی تازەیان دانەدەمەزراند و تۆوی شەڕی داهاتوویان نەدەچاند؟ ئەو لەڕووی دڵڕەقیەوە لەدرێژەی باسەکەیدا وتی کە پۆڵەندیەکان وەک بەڕێوەبەر ناوێکی باشیان پاش خۆیان بەجێ نەهێشتوە. بە کۆمیسیۆن ڕاگەیەندرا کە بە گوزارشکەی خۆیدا بچێتەوە.٤٨١

زۆریەک لە پۆڵەندیەکان، هەم ئەو کاتە و هەمیش دواتر، بەو قەناعەتە گەیشتبوون کە لیۆد جۆرج ڕقی لە ئەوانە، ڕەنگە زیاتر بەهۆی ئەوەوە بووبێت کە ئەو خوازیاری هێورکردنەوەی ئەڵمانیا یان ڕووسیەی بۆلشویک بووبێت، یان ڕەنگە بەهۆی ئەوەوە بووبێت کە ئەو لەڕووی بێ ئەقلیەوە ڕقی لە هەمووی نەتەوە بچووکەکان بووبێت. ئەو لووتبەرز و دوور لە پرەنسیپ بوو، تەنانەت پسپۆڕەکانی خۆیشی لەبەرچاو نەدەگرت و محەلی لێنەدەنان. لەگەڵ ئەمانەشدا ئەو هەتابڵێی نائاگا بوو، بۆوێنە سەبارەت بە ڕادەی هاتوچۆیەک کە لە ڤێسچۆلا ڕووی دەدا. دمۆوسکی بەپانەوە دەیگوت کە لیۆد جۆرج "جاسووسی جوولەکەکانە." ئەو بۆ هەمووی ئەو کەسانە قسەی دەکرد کە لەسەر ئەو باوەڕە

بوون که سەرۆک وەزیری بەریتانیا ئامرازێکی ترسێنەر بوو که هێزەکانی کاپیتالیستی دژ بە پۆڵەندایێکی بەهێز بەکاریان دێنا.٤٨٢

وەکوو زۆربەی لیبراڵەکان، لەڕاستیدا لیۆد جۆرجیش لەو تاوانانەی کە بەسەر پۆڵەندیەکاندا هاتبوو خۆی بە شەریکە خەم دەزانی. ئەو پادێرێوسکی خۆش دەویست و بە سەری سوێندی دەخوارد، کەسێک کە لەسەردەمی کۆڕی ئاشتیدا وەک پیاوێکی سۆشیال هاتە بەرچاوی. بەڵام ئەو لای وابوو کە هەندێک لە داواکاریەکانی پۆڵەندا مەترسیدار و دوورلە ئەقڵ بوون، دوژمنیان بۆ پۆڵەندا سازدەکرد و بۆ ئورووپاش کێشە. بەواتای کێر وەک بالۆیزی بەریتانیا لە ڤۆرشۆ" بەڕێز لیۆد جۆرج هەمیشە وتوویەتی کە باشترین کار بۆ پۆڵەندا نیشتەجێ کردنێکە کە هەم خەڵکی ئەڵمان و هەمیش خەڵکی ڕووسیە بە ڕەوا و بەحەقی بزانن." پۆڵەندیەکان ڕاستیان دەکرد لەوە کە لیۆد جۆرجیان بەوە تاوانبار دەکرد کە مێشکی بەوەوە خەریک بوو کە چۆن ئەڵمان والێکات گرێبەستەکە واژۆ بکات. ئەمە بەبێ هۆ نەبوو. ئەوەش ڕاستە کە لیۆد جۆرج بڕوایەکی قایمی بە زیندوومانەوەی پۆڵەندا نەبوو. ئەمەش بەبێ هۆ نەبوو.٤٨٣

کاتێکە لیۆد جۆرج دوا پشووی کۆتایی حەفتە لە فۆنتەینێبلوو یاداشتەکەی خۆی لەسەر گرێبەستی ئەڵمانی پێشکەش کرد، ئەو دووپاتی کردەوە کە پێویستە پۆڵەندا دەستی بە دەریا ڕابگات بەڵام دژ بە بردنی ٢ملوێن ئەڵمانی بۆ ژێر دەسەڵاتی پۆڵەندی هۆشداری دا. ئەو لە ٢٧ی مانگی مارس بە شۆڕای چوار یاری ڕاگەیاند کە "من دێمە سەر ئەم ئەنجامە کە ئێمە نابێ پۆڵەندایێک درووست بکەین دوورەپەرێز لە سەدەمی لەدەایکبوونی خۆی بە نانەوەی قرەیەکی لەبیرنەکراو لەلایەن دراوسێی هەرە پێشکەوتووی خۆیەوە."خودی دانزیگ بکەن بە شارێکی ئازاد و ڕاڕەوەکە جۆرێک داڕێژن کە ئەوەندەی دەکرێ پۆڵەندیەکان لە پۆڵەندا و ئەڵمانیەکان لە ئەڵمان بمێننەوە. کلیمینجوو، کە خوازیاری ئەوە بوو پۆڵەندا یەکسەر دانزیگ و ڕاڕەوێکی قەبەی پێببرێت، هێرشی کردە سەر شێوازی بەڵگەهێنانەوەی لیۆد جۆرج. ئەو دەیکوت کە لێگەڕێن با ئەڵمانیەکان گلەیی بکەن. " ئێمە جوان لەبیرمانە منداڵان لەبەرهۆی ئەوە کە بە زمانی پۆڵەندی لەخوا دەپاڕانەوە قامچیان دەخوارد، گوندنشینان لە زەوی و زارەکانیان دەردەکران و بێ بەش دەکران تا شوێنی حەوانەوە بۆ داگیرکەرانی ڕەگەزپەرەستی ئەڵمانی بکەنەوە." پۆڵەندا شیاوی ئەوە بوو کە قەرەبووی بۆ بکرێتەوە و پێویستی بە ئامرازێک بوو تا سەرلەنوێ ژیانی خۆی پێ ببوژێنێتەوە.٤٨٤

ویلسۆن لە کۆبوونەوەکەدا شتێکی وای نەدەرکاند بەڵام دڵەڕاوکێکەی لیۆد جۆرجیش خەریک بوو ڕووی لە ئەو دەکرد. لەگەڵ ئەوەش ئەو ڕەنگە مێشکی بە کێشەیەکی ترەوە ئاڵۆز بوویێت کە پێویستی بە

چارەسەرکردن هەبوو: قڕە لەگەڵ ئیتالیا، کە دواتر دەگەڕێینەوە سەری، لەسەر فیووم. ئەگەر مانزیگی بە پۆڵەندیەکان بدایە، لەوانەبوو مەجبوور بوایە فیوومی بە ئیتالیەکان بدایە. هەردوو کەسایەتەکە بەنهێنی کۆبوونەوە و بڕیاریان هێنا سەرئەوە کە دانزیگ دەبێ شارێکی سەربەخۆ بێت و لەگەڵ ئەوەشدا مارینوێردێر لە ڕاڕەوەکە دەبێ لەڕێگای ڕای گشتیەوە لەسەر چارەنووسی خۆی بڕیار بدات. لە یەکی مانگی ئاڤریلدا ئەوان کلیمینجووی دوودڵیان هاندا بەوە کە لەگەڵیان ڕێکەوێت. لیۆد جۆرج سەرلەنوێ دڵنیابوونەوەی خۆی ڕاگەیاند؛ چون پێوەندیەکانی دانزیگ لەگەڵ پۆڵەندا بەهێزتر ببوو، دانیشتوانی ئەوێ وەک گوڵەبەڕۆژە بەرەو ڤۆرشۆ هەڵدەگەڕانەوە، ئەو چاوەڕوان بوو بە هەمان چەشن دانیشتوانی ناوچەی سار لە ئاکامدا بەوەبگەن کە بەرژەوەندی ڕاستەقینەی ئەوان لەگەڵ فەڕەنسە گرێ دەخوا نەوەک لەگەڵ ئەڵمانیا. کاتێکە پۆڵەندیەکان هەواڵەکانیان بەگوێ گەیشت هەڵچوون. پادێرێویسکی وتی کە " دانزیگ گۆشتی لاملی پۆڵەندایە، کە بەبێ دەلاقەی ئەوێ بەرانبەر بە دەریا ناتوانێت هەناسە بکێشێت." بەبۆچوونی کلیمینجوو، کە ئەوی بەنهێنی دیبوو، ئەو گریابوو. ویلسۆن لەڕووی دڵڕەقیەوە وتبووی کە "بەڵێ بەڵام ئێوە دەبێ هەست و سۆزی زیندووی ئەو بەهەند بگرن." ئەم ڕاستیە کە "هەڤاڵانی گێچەڵاوی پۆڵەندی ئێمە" بەواتای ویلسۆن، لەدەوری لڤۆڤ درێژەیان بە چالاکی دا سەرەڕای بانگەوازی بەردەوام لە پاریسەوە بۆ ئاگربەستێک نەیتوانی لە کێشەی پۆڵەندا شتێک کەم کاتەوە.٤٨٥

لە چوارچێوەی بەندەکانی پێداچۆرەوەی گرێبەست لەگەڵ ئەڵمانیا، ڕاڕەوی پۆڵەندایی چووەوە ناویەک و کەمی کرد. لە ئاکامدا پرسێک لە ڕای گشتی لە شاری مارینوێردێر بەڕێوەچوو، و دانیشتوانی ئەو شارە بەگشتی دەنگیان دا کە لەگەڵ ئەڵمانیا یەک بگرنەوە. ئەوە یەکێک لە هێڵەکانی ڕێگای شەمەندەفەڕی کە ڤۆرشۆی بە دانزیگەوە گرێ دەدا خستە ژێر کۆنترۆڵی ئەڵمانیاوە. دانزیگ بۆخۆی لە چوارچێوەی کۆمەڵەی گەلاندا لە یەکیەتیەکی گومرکی لەگەڵ پۆڵەندا بوو بە شارێکی ئازاد. پۆڵەندا و ئەڵمانیا بڕیاریان هێنا سەر ئەوە کە وەک بەئەنجام گەیاندنی ئەرکێک گرێبەستێکی جیا واژۆ بکەن کە گارانتی ئەوەی دەکرد کە پۆڵەندا هەموو ئەو کەرەسانەی کە بۆ کاروباری بازەرگانی پێویستی بوو هەیبێت، لە حەوزی پاپۆڕەوە بگرە تا دەگاتە هێڵەکانی تەلەفوون. کۆمیسارایەکی پلەبەرز، کە لەلایەن کۆمەڵەی گەلانەوە دابین کرابوو، بە ئەگەری هاتنەئارای هەر ئاڵۆزی یان ناخۆشیەک وەک داوەر ڕۆڵی دەگێڕا. بە داخەوە ژمارەیەکی زۆر لەم جۆرە کێشانە لە ئارادابوون: لەسەر ئەوەکە کێ کۆنترۆڵی پۆلیسی بەسەر بەندەردا هەبوایە، لەسەر ماڵیاتەکان، تەنانەت لەسەر ئەوەکە ئایا پۆڵەندا ڕێگای هەبوو سندووقی پۆستی تایبەت بەخۆی دابین بکات. بەشێکی زۆر لە کێشەکە لەوەوە سەرهەڵئەدا کە چون دانزیگ،

پیشەسازیەکەی، بەڕێوەبەرایەتیەکەی و حەشیمەتەکەی، یەکسەر ئەڵمانی دەمانەوە. لەگەڵ ئەوانەش ڕاڕەوەکە ناکۆکی درووست دەکرد؛ ڕێگاکانی شەمەندەفەڕ و، هەڵبەت، چارەنووسی ئەو ئەڵمانیانەی کە لەوێ و لەشوێنی تر لە پۆڵەندا دەژیان کێشەیان لەسەربوو. ئەوەی ڕاستی بیت ئەڵمانیا ملی هەرپێدانەکرد بەوە کە پارچەیەک لە زەویەکانی خۆی بدۆڕێنێ، و بەگشتی هەمووی ئەڵمانیەکان، لیبراڵە ڕەسەنەکان یان ناسیۆنالیستەکانی ڕاست-ئاژۆ، بە چاوێکی سووک و چرووک سەیری پۆڵەندیان دەکرد.٤٨٦ لە مانگی سێپتامری ساڵی ١٩٣٩دا، وەک پێشتر بەڵێنی دابوو، هیتلێر یەکێ تر لەو بەستەرانەی پساند کە ناوی نابوو زنجیرەکانی ڤێرسایلێس، و هێزەکانی خۆی بەلێشاو لەسنوور تێپەڕاند تا دەست بەسەر دانزیگ و ڕاڕەوەکەدا بگرن. لە ساڵی ١٩٤٥دا، پۆڵەندا ئەوێی وەکوو گدانسک گرتەوە. چیتر هیچ ئەڵمانیەک لەوێ ناژیت و شارەکە چون کارگەی کەشتی سازیەکەی لەبەینچوە بەسەر دژواری و ناخۆشیدا کەوتوە.

* * * *

بێجگە لەمانە کێشەی سیلیسای سەروو لە ئارادابوو، ناوچەیەک کە پانتایەکەی نزیک بە ١١،٠٠٠ کیلۆمەتری چوارگۆشە بوو(٤،٢٠٠مایلی چوارگۆشە) ئەو شوێنەی کە سنوورەکانی پۆڵەندا لەگەڵ سنوورەکانی ئەڵمانیا لە باشوور یەکیان دەگرتەوە. خەڵاتێکی بەنرخ بوو، کانزا و ئاسن و کارگەی پۆڵای لەخۆگرتبوو. کۆمیسیۆنی تایبەت بە کاروبارەکانی پۆڵەندا ئەوێی بە پۆڵەندا بەخشیبوو چون نزیک بە سەدی ٦٥ی دانیشتوانەکەی پۆڵەندی-ئاخێوەر بوون. ئەڵمانیەکان بەوە ڕازی نەبوون. کانزاکانی سیلیسی نزیک بە چارەگێک لە بەرهەمی ساڵانەی خەڵووز، سەدی ٨١ی زینکی ئەوێ سەدی ٣٤ی ڕۆحی ئەوێیان لە ئەستۆگرتبوو. بێجگە لەوە حکوومەتی ئەڵمانی بەڵگەی لەسەر ئەوە دێناوە کە ئەو بەخشینە بەشێوەیەک بەزاندنی یاسای خود-موختاریە: خەڵکی سیلسیای سەروو ئەڵمانی و چەکسلۆواکی و پۆڵەندیەکانی ناوچەیی بوون، کە زاراوەکەیان یەکجار زۆر کەوتبوە ژێر کاریگەری زمانی ئەڵمانیەوە، لە مەسەلەی پۆڵەندادا هەرگیز بچووکترین قازانجیان نەسەلماندبوو. چەندین سەدە بوو سیلسیای سەروو لە لەهێستا جیاکرابۆوە؛ هەمووی پێشکەوتنەکەی خۆی لە پیشەسازی ئەڵمان و سەرمایەی ئەڵمان دەزانی. پۆڵەندا پێشتر خەڵووزی باشی هەبوو؛ ئەڵمانیا، بەتایبەت بە لەدەستدانی ناوچەی سار، نەیبوو. ئەڵمانیا ناتوانێ واز لە سیلسیای سەروو بێنێت؛ پۆڵەندا پێویستی بەوێ نیە."ئەگەر ئەڵمانیا سیلسیای سەرووی بدۆڕاندایە، بەپێی ئەنجامێکە تێبینی ئەڵمانی گرتبووی، ناتوانێ مەرجەکانی تر لە چوارچێوەی گرێبەستەکەدا بسەپێنێت.٤٨٧

لە ٣٠ی مانگی مەیدا لیۆد جۆرج هاوڕێی دێرینی خۆی ڕیدێلی، کەسایەتیەکی ناوداری ڕۆژنامەگەری، بۆ ئێوارەخوانێک بانگێشت کرد. ئەو یاداشتەکەی دا بە دەستیەوە و پێی وت " تەنیا بیخوێنەوە و بە من بڵێ تۆ هەستت سەبارەت بە ئەوە چیە." بۆ ئەوەی کەیفی ڕیدێل ساز بکات، ڕۆلی چۆپینی بۆ خستە سەر پیانۆی مۆسیقاژنەکەی خۆی. کاتێکە ڕیدێل بەڵگەی دەهێناوە لەسەر ئەوە کە بەخشینی سیلیسیای سەروو بە پۆڵەندا تێبینی ستراتیژیکی لەپشتە، لیۆد جۆرج ڕازی بوو بەڵام ئاماژەی دەکرد کە قەرەبووەکان هەڕەشەیان لەسەرە. "ئەگەر بێتو پۆڵەندیەکان بە ئەڵمانیەکان بەرهەمی کانزاکان بەپێی مەرجەکان نەبەخشن، ئەڵمانیەکان دەڵێن کە ئەوان ناتوانن قەرەبووی خەسارەتەکان بدەنەوە. کەوابوو لەوانەیە هاوپەیمانان لووتی ئەوان ببڕن بۆ ئەوەی لکەیەک بێت بەناوی چاوانیانەوە ئەگەر ئەوان بەبێ لەبەرچاوگرتنی کێشەی قەرەبووی خەسارەتەکان کانزاکان بدەن بە دەست پۆڵەندیەکانەوە." هەردوو پیاوەکە بۆ پشوودانێک و گوێدان بە گۆرانیەک چوونە قاتی سەرەوەی خانووەکەی بالفۆر.٤٨٨

ڕۆژی دواتر، لیۆد جۆرج ئەندامانی سەرەکی کابینەی لە لەندەنەوە بۆ بەشداریکردن لە کۆبوونەوەیەکی بەپەلە بانگێشت کرد. لە یەکی مانگی ژوەندا، شاندی نوێنەرایەتی بەریتانیا وەک بەرپرس ئەویان حەواڵەی شۆڕای چوار یار کرد و تا لەسەر مەرجەکانی تایبەت بە قەرەبووەکان، لەسەر داگیرکردنی ڕاینلەند و لەسەر سیلسیای سەروو داوای هەموارکردن و چاکسازیاین لێ بکات. بەتایبەت سمووتس لەسەر پێویستبوونی پێداچوونەوە بەسەر سنوورەکانی ئەڵمان-پۆڵەندا زۆر پێداگری دەکرد. " پۆڵەندا شکستێکی مێژوویە، و هەمیشە وەک شکستێک دەمێنێتەوە، و لەم گرێبەستەدا ئێمە ویستمان حوکمێکە مێژوو داویەتی هەڵچەرخێنینەوە." لەگەڵ ئەوانەشدا ئەو بەنهێنی وتی کە بردنی ئەڵمان بۆ چوارچێوەی دەسەڵاتی پۆڵەندی وەکوو ئەوە وایە بیدەی بە دەست ژمارەیەک زۆر کافرەوە. بالفۆر لای وابوو سمووتس تۆزێک سەبارەت بە پۆڵەندا قورسی گرتەوە، بەڵام وەکوو ئەوانی تر ئەمیش بەوەڕازی بوو کە لە سیلسیای سەروو پرسی ڕای گشتی بکەن.٤٨٩

هاوکارەکانی لیۆد جۆرج زۆر پەرۆشی ئەوە نەبوون کە گۆڕانکاری بە سەر مەرجەکاندا بێتە ئاراوە چون ماوەیەکی دوور و درێژی بردبوو تا پێکەوە گرێیان خواردبوو. لە کۆبوونەوەیەکی پڕ لە قینەبەرایەتیدا لە ٣ی مانگی ژوەندا، کلیمینجوو لەبابەت ڕاپرسیەوە هەڵوێستێکی تەواو دژبەرانەی گرتەخۆ. هەرچەند پۆڵەندیەکان زۆرینەیان بە دەست بوو، لەکاتێکدا کە بەرێوەبەرایتی ناوچە هێشتا بە دەست ئەڵمانیەکانەوە بوو نەیاندەتوانی ئازادانە دەنگ بدەن. ویلسۆن ڕەزایەتی لەسەر بوو. پسپۆڕەکانی پێیان ڕاگەیاند کە خاوەن زەوی و زارە گەورەکان و کاپیتالیستەکان هەرهەموویان

ئەڵمانی بوون. لیۆد جۆرج وتی کەوایە پێویستە هاوپەیمانان هێزەکان بکێشنە ناوەوە تا هەڵبژاردنەکان چاودێری بکەن. ئەگەر ئەوە بیتوانیایە بەرگری کێشەی گرێبەستەکەی لەگەڵ ئەڵمانیا بکردایە ئەوە نرخێکی کەم بوو. ڕەوانەکردنی تیپێکی سەربازی ئەمەریکی یان ئینگلیزی بۆ سیلسیای سەروو باشترە لە حەواڵەکردنی سووپایەک بۆ بەرلین." ئەو لەزمانی سەرۆک کۆمارەوە باسی لە چەمکی خود-موختاری کرد. ویلسۆن، کە پیاوێکی بەویژدان بوو، پاشگەزبۆوە و وازی هێنا. کلیمینجوو، کە زۆر پەشۆکابوو، هیچ ڕێگایەکی تری پێ شک نەهات جگە لەوەی کە ئەویش وابکات. ڕاپرسیەک بەڕێوە بوو، بەڵام تا هاوپەیمانان دڵنیا نەبوونایە لەوە کە کەش و هەوایەکی لەبار ڕەخساوە بەڕێوەنەدەچوو. پادێریویسکی دەنگی نارەزایەتی خۆی هەڵبڕی، بەڵام هیچ ئاکامێکی نەبوو. لیۆد جۆرج بەتووڕەییەوە وتی کە " ئەوەتان لەبیرنەچێ کە ئازادی ئێوە بەرهەمی خوێنی خەڵکانی ترە، و لەڕاستیدا، ئەگەر بێتو پۆڵەندا، لە هەل و مەرجێکی لەو چەشنەدا دژ بە بڕیارەکانی ئێمە شۆڕش بکات، شتێکی لێدەردێت پێچەوانەی ئارەزووەکانی ئێمە.".٤٩

بەڕێوەبردنی ڕاپرسیەکە چەندین مانگی گرتەوە، بەشێکیان بەهۆی ئەوەوە کە کەش و هەوای ناو سیلسیای سەروو ڕوو لەگرژی بوو چون پۆڵەندیەکان دژ بە ئەڵمانیەکان ڕاپەڕابوون، بەشێکی تر لەبەرهۆی ئەوە کە هاوپەیمانان لە پەیاکردنی هێز کێشەیان هەبوو. لەگەڵ ئەوانەشدا لەسەر ئەوە کە ئایا تەنیا کەسانێک کە بەڕاستی لە سیلیسیا دەژیان دەیانتوانی دەنگ بدەن (هەڵبژاردەی حکوومەتی پۆڵەندی) یان ئایا دانیشتوانی پێشووش دەیانتوانی دەنگ بدەن (بەپێی بۆچوونی ئەڵمانیەکان). حکوومەتی ئەڵمانی لەو مشتومڕەدا سەرکەوت و لە ڕۆژی یەکشەنبەی مانگی مارسی ساڵی ١٩٢١دا، کاتێکە شەمەندەفەرەکانی پڕ لە مسافیری سیلسیایی ئەڵمانی بەرەو دەنگی مۆسیقای باند وەرێ کەوتن، لە ئاکامدا هەڵبژاردنەکە بەڕێوە چوو. باکوور و ڕۆژئاوا ئەڵمانیایان هەڵبژارد، باشوور پۆڵەندا، و ناوەڕاست، کە هاوڕێ لەگەڵ سەراسەری پیشەسازیەکەیدا هەم پۆڵەندا و هەمیش ئەڵمانیا خوازیاری بوون، بەشێوەیەکی یەکسان دابەشکرا. چەندین مانگ وت و ویژکردن، بە پشتگری کردنی بەریتانیایەکان لە ئەڵمانیا و فەرەنسەیەکان لە پۆڵەندا، ئاکامەکەی تەنیا بێ چارەسەریمانەوە و گیرخواردن بوو. لە ئاکامدا تەواوی کێشەکە گەڕێندرایەوە بۆ کۆمەڵەی گەلان، ئەو شوێنەی کە چوار هێزەکە بەبێ هیچ قازانجێکی ڕاستەوخۆ لە بابەتەکە-بلژیک، چین، ئیسپانیا و بەرەزیل- هێڵیکیان کێشا کە سەدی حەفتای ناوچەکەی لە ئەڵمانیا دەهێشتەوە بەڵام زۆربەی پیشەسازیەکان و کانزاکانی دەدا بە پۆڵەندا. لە ساڵی ١٩٢٢دا، لە یەکێک لە گرێبەستە هەرە دوور و درێژەکانی

کە تا ئێستا بینراوە، ئەڵمان و پۆڵەندا لەسەر هاریکاری ئابووری و سیاسی و پارەیزگاریکردن لە کەمینە خاوەن ڕێزەکانی خۆیان ڕێکەوتن.٤٩١ بەڵام ئەلمانیەکان بەدۆڕاندنی سیلسیای سەروو و هەروەها دانزیگ و ڕاڕەوەکە زۆرپیشیان خواردەوە. لە ساڵی ١٩٣٩دا، هیتلێر هەرهەمووی بە ئەڵمانەوە لکاند. لە ساڵی ١٩٤٥دا، ئەوێ گەڕێندرایەوە بۆ پۆڵەندا و زۆربەی، بەڵام نەک هەمووی، ئەو ئەڵمانیانەی لەوێ دەژیان هەڵاتن یان ئەوەتا بەزۆری دەرکران.

❊ ❊ ❊ ❊

دەستنیشانکردنی سنوورەکانی پۆڵەندا لە ڕۆژهەڵات، شوێنێک کە ئاژاوەگەرەکان، بۆلشویکەکان، ڕووسەسپی پێستەکان، ئۆکراینیەکان، لیتوانیەکان، لاتڤیەنەکان، ئێستۆنیەکان و ئەڵمانیانی باڵتیک بۆ ئەوەی بە دەسەڵات بگەن پاڵیان بە یەکەوە دەنا، تەنانەت زۆر ئەستەمتر و دژوارتر بوو. ئاشتیکەران نەیاندەزانی لەگەڵ چ وڵاتانێک ، یان لەگەڵ چ حکوومەتگەلێک دانووستان دەکەن. کۆمیسیۆنی تایبەت بە کاروبارەکانی پۆڵەندا ئامۆژگاری کرا تا بەهەرشێوەیەک کە بوە درێژە بە چالاکیەکانی خۆی بدات و بەپێی ئەرک سنوورێکی دیاری کرد هەمووی ئەو ناوچانەی کە ئاشکرابوون کە تایبەت بە پۆڵەندان گەڕاندرانەوە بۆ ئەو وڵاتە. لە مانگی دیسامری ساڵی ١٩١٩دا، ئەوەیکە لە شۆڕای عالی مایەوە بە هێڵی کۆرزۆن ناوی دەرکرد (هێڵی سنووری ڕۆژهەڵاتی پۆڵەندی ئەمڕۆکە). حکوومەتی پۆڵەندی هەر بەدڵیشی دانەدەهات ئەمە پەسەند بکات. لەکاتێکدا ئاشتیکەران سەرقاڵی خەریتەکانی خۆیان بوون، هێزەکانی پۆڵەندی بەهەمان شێوە لەسەر عەرز سەرقاڵ بوون. بەدرێژایی هەموو ناوچەقڕاویەکانی سەرسنوور، پۆڵەندا زۆر داواکاری لەوە زیاتر بە مافی خۆی دەزانی، کە دەبوایە بەگشتی بە سەرکەوتن یان سەرنەکەوتن لە کاتی شەڕدا چارەسەرکرانایە.

هەست و سۆزی پیلسۆدسکی زۆرتر ئاوێتەی ڕۆژهەڵاتی باشوور بوو. ئەو لە باوکەوە لە بنەماڵەیەکی لیتوانی-پۆڵەندی بوو؛ یەکێک لە باپیرەکانیان لە پێکهێنانی یەکیەتیەک لەنێوان پۆڵەندا و لیتوانیا لە سەدەی پازدەهەمدا دەستی هەبوو. ڤیلینا تەنیا شوێنێک بوو کە بە ماڵی خۆی دەزانی.٤٩٢ ئەو خوازیاری شوێنی لەدایکبوونی خۆی، و هاوڕێ لەگەڵ پارچەیەک لە لیتوانیای ڕۆژهەڵاتی باشور بوو بۆ پۆڵەندا. ئەمە داواکاریەکانی پۆڵەندی هێنایە بەرباس دژ بە داواکاریانی نەتەوەی تازەسەردەراتووی لیتوانیا و بەرەو نانەوی ئاشتی بەگشتی لە ناوچەی باڵتیک.

نەخشەیەک لە کۆتایی ڕۆژهەڵاتی باڵتیک لە ساڵی ١٩١٩دا زۆر پرسیاری لە مێشکەکاندا دەورووژاند. تەنیا فنلاند لە باکوور، دوا شەڕێکی خوێناوی لەنێوان سپی پێستەکان و

سوورپێستەکان، بڕیاری دامەزراندنی جۆرە سەربەخۆیەکی مەترسیداری لە ڕووسیەوە دابوو. کۆڕی ئاشتی فنلاندی لە بەهاری ساڵی ١٩١٩دا بە فەرمی ناسیبوو. بێجەگە لەمە لە باشووری ئەو وڵاتەدا ئێستۆنیەکان، لاتڤیەکان و لیتوانیەکان هەوڵیان دابوو سەربەخۆیی خۆیان لە ڕووسیە ڕاگەیەنن، بەڵام پێویست بوو لە داگیرکاری ئەڵمانی و لەگەڵ کەمینەکانی ئەڵمانی یان ڕووسی خۆیان دانووستانیان بکردایە. هیچکامیان نەیانتوانیبوو سنوور بۆ خۆیان دیاری بکەن یان حکوومەت دامەزرێنن، و ئەوەیکە ڕووسەکان لە پاشەکشێکەی خۆیاندا لەبەینیان نەبردبوون، ئەڵمانیەکان گەمارۆیان دابوون. ڕووسەسپی پێستەکان، بۆلشویکە سوورپێستەکان، ئاژاوەچیانی سەوزپێست، باڕۆنەکانی بالتیک، چەتەکانی ئەڵمان، سووپاکانی تازەلەهێلکە سەردەراتوو و چەتەبچوکەکان کەوتبوونە سەر عەرز و ڕێچکەیان بەستبوو. شارەکان و شارۆچکەکان بەردەوام دەستاودەستیان دەکرد. لە دەریا، پاشماوەکانی هێزی ئیمپراتۆری دەریایی ڕووسیە، کە ئێستا کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی بۆلشویکەکانەوە، بۆ مەبەستی بڵاوکردنەوەی ئاگری شۆڕش لە پێترۆگرادەوە سەریان دەرهێنا.

هاوپەیمانان دڵەڕاوکەیان لەدڵدابوو و سیاسەتێکی یەکگرتوویان نەبوو. ئەگەر ئەوان نەتەوەکانی بالتیکیان بە فەرمی دەناسی، بە مانایەک، ئەوان لە کاروبارەکانی ناوخۆی ڕووسیە دەستیان وەردەدا. ئەمەریکیەکان پشتگریان لە خود-موختاری دەکرد بەڵام گومانیان بوو لەوە کە بەتەواوەتی بەفەرمی بناسن چون ویلسۆن خوازیاری ئەوە نەبوو کە یەکلایەنە دەستکاری سنوورەکانی ڕووسیە بکات. بەریتانیەکان و فەرەنسەیەکان هیواداربوون، لانی کەم تا هاوینی ساڵی ١٩١٩، کە ئەدمیراڵ کۆلچاک بۆلشویکەکان تێکبشکێنێت، و کۆلچاک زۆر دژی سەربەخۆیی بۆ هەر پارچەیەک لە ئیمپراتۆری ڕووسیە بوو. فەرەنسەیەکان وایان بە مەسلەحەت دەزانی کە ڕێگەبدەن بە بەریتانیەکان تا مشووری ناوچەکانی بالتیک بخۆن بەڵام بۆخۆیان چاودێری پۆڵەندا بکەن. بەریتانیەکان هێزێکی بچووکی دەریاییان حەواڵەکرد- ئەوەیکە لەدەستیان هات بیبەخشن- تابەڵکوو بە کەشتیەکانی ئەڵمانی لە پێترۆگراد/لنینگراد پەنگ بخۆنەوە و ئەگەر لەدەستیان بهاتایە هەندێک هێزی ناوچەیی دیموکراتیک بۆ پاڵپشتیکردن بدۆزنەوە. ئەدمیراڵەکەی ئاگادارکرایەوە کە تووشی نەبێ بە تووشی مین یان سەهۆڵبەندان و لەبەرانبەر هێرشەکانی بۆلشویکیدا نەوەستێت، بەڵکوو تەنیا دوورەپەرێز لە عەرز دوور لە هەر مەترسیەک بوەستێت. لە بەهاری ساڵی ١٩١٩دا دایرەی هێزی دەریایی بۆ ئۆفیسی دەرەوەی نووسی کە " کاری ئەفسەرانی هێزی دەریایی لە بالتیک زۆر ئاسان دەبێتەوە ئەگەر ئەوان لە سیاسەتێکە پێویستە لەسەرشانیان لایەنگری لێبکەن ئاگادار کرێنەوە."٤٩٣

وەک ڕێگەچارەیەکی کاتی، هاوپەیمانان حکوومەتی ئەلمانیان ئامۆژگاری کرد تا بەدوای ئاگربەستەکە هێزەکانی خۆی لە بالتیک بهێڵێتەوە. بالفۆر وتی کە ئەوە زۆر جێی شەرم بوو، بەڵام چی بکەین چارەیەک نەبوو. ئەمە کێشەی تایبەت بەخۆی درووست دەکرد. فەرماندەی پلەبەرزی ئەڵمانی کەیفخۆش بوو. نە هێزی میلیتاری و نە ناسیۆنالیستەکانی ئەڵمانی خوازیاری ئەوە نەبوون کە دەست لە سەرکەوتنەکانی ناوچەی باڵتیک هەڵگرن، کە ئەوان وەک بەربەستێک لەبەرانبەر بۆلشویزمدا و مەترسی سلاڤیک دەیان دی (زۆرجار لە بۆچوونەکانی ترسێنەری باڵی ڕاستیشدا هەستیان بە هەمان شت دەکرد). زەویەکانی ناوچەی بالتیک بە خوێنی پاشاکانی تیۆتۆنیک پیرۆزکرابوو کە چەندین سەدە لەوەپێش خەباتیان بۆ کردبوو؛ بێجگە لەوانە ئەوان وەک قەڵایەک وابوون کە لەوێوە لەوانەبوو ئەڵمانیا دژ بە هاوپەیمانان هێزی تازە درووست بکات.٤٩٤

لە ڕۆژی کریسمەسدا لە ساڵی ١٩١٨، سەرۆکی کاتی لاتڤیان، پسپۆڕێکی کشتوکاڵی لە زانکۆی نێبراسکاوە، لەسەر ڕەزایەتی فەرمەندەی هێزی دەریایی بەریتانیا، لە ئەڵمانیەکان پاڕاوە و داوای یارمەتی لێکردن. هێزەلاواز و بەستەزمانەکانی خەریک بوو لەلایەن بۆلشویکەکانەوە ڕادەماڵدران. پاڕانەوەکەی ئەو دەرگای بە جۆرێکی تازەی پاشای تیۆتۆنیک، فریلکۆرپەکان، کردەوە کە گرووپێک بوون لە سووپاکانی تایبەت کە خەریک بوون لە ئەڵمانیا درووست دەبوو. ئەندامەکانیان بۆ مەبەستی ڕاوەستان لەبەرانبەر بۆلشویزمدا، بۆ ڕزگارکردنی شارستانیەت، بۆ بەڵێنیدانی زەوی و زار یان بۆ سەرکێشی و ژەمێک بەخۆڕایی خۆبزێوانە ڕاستەوەببوون.

لە مانگی فەوریەی ساڵی ١٩١٩دا، فریکۆرپەکان خەریک بوون دەڕژانە ناو شارەکان و شارۆچکەکانی ناوچەی باڵتیک. هەندێک لە هێزەکان لە سەرباز دەچوون؛ ئەوانی تر قژی سەریان زۆر دەهێشتەوە و دەلاقەکان و لامپەکانی سەرشەقامیان دەکردە نیشانە و تەقەیان لێدەکردن. ئەوان لەگەڵ خەڵکانی ناوچە، کە بەلای ناخێریانەوە هاتبوون ڕزگاریان بکەن، هەلسوکەوتی ناشیرینیان هەبوو و سووکایەتیان پێدەکردن. لە مانگی ئاڤریلدا ئەوان حکوومەتی لاتڤیەنیان وەلانا و بەرەو ئێستۆنیا وەڕێکەوتن، هەرچەند بۆلشویکەکان خەریک بوون پاشەکشەیان دەکرد. ئاشتیکەران، کە بایەخێکی ئەوتۆیان بە بالتیک نەدابوو، هەربەجارێک شڵەژان. بالفۆر وتی کە " زۆر سەیرە لەگەڵ ئەوە کە ئاژاوەگەری سەرتاسەری ناوچەکانی گرتۆتە، ئەڵمانیەکان، بە بەرگریکردن لەبەرانبەر درووستبوونی سووپاکانی ناوچەییدا، و بە زەختکردنەسەر وڵاتانێک کە ئەوان داگیریان دەکەن تا بەتەواوەتی دژ بە هێرشی بۆلشویکی پشتیان پێببەستن، خەریکن لەپێناو هەتاهەتایی کردنی کاریگەری و دەسەڵاتداریێتی ئەواندا خەبات دەکەن." لە مانگی مەیدا هاوپەیمانان

پەیامێکیان نارد بەومانایە کە لەڕێخستنی سووپاکانی تایبەت بە حکوومەتەکانی بالتیک یارمەتی ئەو حکوومەتانە دەدەن.٤٩٥

کێشەکە ئێستا لەوەدا بوو کە فریکۆرپەکان هان بدرێن تا پاشەکشێ بکەن. لێدوانی تودئاژۆ لە پاریسەوە بەرەو بەرلین دەڕۆیی. حکوومەتی ئەڵمانی دەستووراتی خۆی حەواڵەی فەرمەندەی فریکۆرپەکان کرد، ژەنەراڵ کۆلمار ڤان دێر گۆلتز، کە دەیخستنە پشت گوێ و بایەخی پێنەدەدان. لیۆد جۆر گلەیی کرد و وتی کە " ئەوە هەڵوێستێکی ناشیرین و مەترسیدارە." لە ئاکامدا لە مانگی ئۆگستدا حکوومەتی ئەلمانی بڕیاری هێنا سەرئەوە کە ڤان دێر گۆلتێز بگەڕێنێتەوە بۆ ئەڵمانیا. سەربازەکانی لەوێ مانەوە، بە فەرمەندەیی دەرەبەگێکی فرەوێژی ڕووسی کە بە ئاواتەوە بوو بۆ جارێکی تر دەست بەسەر ڕووسیەدا بگرێت. چون ڕایگەیاند کە وڵاتانی بالتیک دووبارە ڕووسین و ئەوەکە ئەو مەیلی ئەوەی هەیە کە دانیشتوانی ئەو وڵاتانە وەک کۆیلە بیانکات بە سەربازی تازە، بێجگە لە ئەڵمانیەکانی ناوچە کەسی تر پشتگری لێ نەکرد. لە کۆتایی ساڵی ١٩١٩دا، فریکۆرپەکان بەدزیەوە گەڕابوونەوە ئەڵمانیا، شوێنێک کە دژ بە هاوپەیمانان، کۆیلەکان و حکوومەتەکەی خۆیان ڕاپەڕابوون. زۆرکەس، وەکوو ڤۆن دێر گۆلتێز، دەبوایە بەدوای ماڵێکی ئایینی لەگەڵ هیتلێر و نازیەکان بگەڕانایە. لە ئاکامدا هاوپەیمانان لە ژانویەی ساڵی ١٩٢١دا سەربەخۆیی ئیستۆنیا و لاتڤیایان بە فەرمی ناسی.٤٩٦

لیتوانیا، باشووریترینی وڵاتانی بالتیک، ئەگەر بکرایە، زگێکی پڕئازاریتری بە بەرەوە بوو، چون لەگەڵ ئەمانەشدا دەبوایە لەگەڵ پۆڵەندا دانوستانی بکردایە. لە ساڵی ١٩١٩دا، زۆربەی هەرەزۆری پۆڵەندیەکان خوازیاری بووژاندنەوەی یەکیەتی کۆنی نێوان پۆڵەندا و لیتوانیا بوون، بەڵام ئەم کەرەتەیان بە کۆنترۆڵی تەواوی پۆڵەندەوە. دمۆوسکی بە لەحنێکی ناشیرین وتی کە لیتوانیەکان تەنیا خێڵێکن و بەس؛ زۆربە قازانجیانە ئەگەر ببن بە پۆڵەندی. پۆڵەندا دەبێ هەمووی ئەو ناوچانەی کە زۆرینەیەکی لەهیستانیان لەخۆگرتوە بەلای خۆیدا ڕاکێشێ- هەڵبەت خود-موختاری- بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو شوێنانە کە کەمینەی پۆڵەندیان تێدابوو، کە دەیانتوانی وەک نوێنەری شارستانیەت لەوێ چالاکیان بکردایە. ناوچەکانی بەرەو باکوور ئەو شوێنانەی کە لیتوانیەکان زۆرینەی هەرەزۆریان بەدەست بوو دەکرا بکرایە بە دەوڵەتێکی بچووکی لیتوانی. ئەگەر خوازیاری ئەوەبوایە کە لەگەڵ پۆڵەندا یەکبگرێت، دەیتوانی دەسەڵاتی ماڵیی هەبوایە. پیلسۆدسکی و چەپڕەوەکان ئامادەبوون تا پلانی ڕێکخستنێکی فێدراڵیتەی کراوەتر بڕێژن. کەس حازر نەبوو بەرپرسایەتی خودی لیتوانیەکان بگرێتە ئەستۆ، کە ئێستا گیرۆدەی ناسیۆنالیزمێکی ڕاپەڕاو بوون.٤٩٧

خەونەکانی نیشتمانی لیتوانیا وەکوو هەمووی خەونەکانی تری ساڵی ١٩١٩ نابەجێ و ناواقیعی بوون، و یەکێک لەوانە مسۆگرکردنی ڤیلینا بوو بۆ کردن بە پێتەختی خۆیان. لە مانگی ژانویەی ساڵی ١٩١٩دا، کاتێکە ئەڵمانیەکان ناوچەکەیان چۆڵ کرد، هێزێکی بۆلشویکی کە لە لیتوانیەکان و بلاڕووسەکان پێکهاتبوو دەستی بەسەر شارەکەدا گرت؛ لە مانگی ئاڤریلدا سوپای پۆڵەندی کۆنترۆڵی گرتەدەست. پیلسۆدسکی ڕاگەیاندنێکی بەسەر خەڵکی لیتوانیدا بڵاوکردەوە کە بە وشەی نهێنی " خود-موختاریەوە" دەستی پێدەکرد. ئەو خێرا لەلایەن لایەنگرانی دمۆوسکیەوە درایە بەر هێرش، کە خوازیاری پێوەلکاندنێکی یەکجاری بوون. سەرۆک وەزیری لیتوانی ڕایگەیاند کە وڵاتەکەی بەبێ ڤیلنا حازر نیە ساتێکیش بژی. "خۆپیشاندنێکی تازەی سووپایی ڕاگەیەنرا- ئەم کەڕەتە تەنیا بۆ پۆڵەندیەکان. سەوزپێستەکان، سپی پێستەکان یان سوورپێستەکان چیتر لە ئارادا نەبوون. هەموولایەک یەکشەوە بوون بە پۆڵەندی، بێجگە لە جوولەکەکان. جوولەکەکان بە نەرمیەوە لەگەڵی هەڵیان کرد. ئەوان لەماوەی ژیانی خۆیاندا لەژێر زۆر ئاڵادا خزمەتیان کردبوو."٤٩٨

هەردوولا هانەیان بردە لای کۆڕی ئاشتی. لیتوانیەکان، کە لەگەڵ پۆڵەندیەکان و لەگەڵ یەکتر دەمەقرێیان بوو، نوێنەریان ڕەوانەی پاریس کرد. ئاشتیکەران بۆ مەبەستی ڕاگرتنی شەڕ داواکاری بەربڵاویان ئاراستەکرد و هەوڵیاندا سنوورێکی گونجاو و دوورلەمەترسی دیاری بکەن. لیۆد جۆرج ئەم پرسیارەی لەخۆی دەکرد کە ئایا لیتوانیا بەگشتی شیاوی ئەوە هەیە کە سەربەخۆیی پێ بدرێت؛ لە هەرحاڵدا، حەشیمەتی ئەوێ بە قەدەر حەشیمەتی وەیلز بوو. بەواتایەکی تر، ئاشتیکەران هەستیان بە مەترسی دەکرد لەوەدا کە ڕێگەبدەن بە پۆڵەندا کە بەسەر ناوچەیەکدا خۆی بڵاوبکاتەوە کە تێیدا پۆڵەندیەکان کەمینە بوون. لە هاوینی ساڵی ١٩١٩دا، لیۆد جۆرج سەبارەت بە بۆچوونی لیتوانیایەکی سەربەخۆدا هۆشداری دابوو. هاوڕێ لەگەڵ ئیستۆنی و لاتڤیا، ئەوێ دەیتوانی ببێ بە جۆگەیەکی بەکەڵک بۆ تجارەتی بەریتانیا بەرەو ڕوسیە کاتێکە پێوەندیەکان لەئاکامدا لەگەڵ بۆلشویکەکان، ئەو کەسانەی کە پێدەچوو براوەی شەڕی ناوخۆبن، دادەمەزرا. فەرەنسەیەکان هێشتا گرنگیان بە پۆڵەندایێکی گەورە دەدا. کاتێکە سووپاکان دەستیان بە ڕێپێوان کرد لەڕاستیدا ئەمە گۆڕانکاریەکی ئەوتۆی نەهێنا ئاراوە.

ساڵێک دواتر بۆلشویکەکان پۆڵەندیەکانیان لە ڤیلنا وەدەرنا و دایان بە دەست لیتوانیەکانەوە. لە ئۆکتۆبری ساڵی ١٩٢٠دا، درووست دوابەدوای ئاگربەستێکی کاتی لەنێوان پۆڵەندا و لیتوانیا کە شارەکەی دا بە دەست لیتوانیەکانەوە، یەکەکانی سووپای پۆڵەندی زۆرچالاکانەوە ڕاپەڕان و شارەکەیان خستە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە. دوو ساڵ دواتر ئەو ناوچەیەی کە هێشتا لەژێر کۆنترۆڵی پۆڵەندیەکان

دابوو به دەنگێکی زۆرینەوە خوازیاری یەکگرتنەوە بوون لەگەڵ پۆڵەندا. دوا شەڕی دووهەمی جیهانی یەکیەتی سۆڤیەت ئەوێی دا بە دەست لیتوانیاوە، کە ئەوکات کۆماریەکی سۆڤیەت بوو.٤٩٩

هەر لەو کاتەدا لیتوانیا بە داگیرکردنی بەندەری دوورەپەرێز و بچووکی مەمیل و کەرتی ناوچەیەک کە بەرەو ناوخۆی وڵات دەهات ڕێگای بۆ لەبەینچونی خۆی خۆش کرد. ئەوە هەوڵێکی نەفامانە بوو، کە هەردوو وڵاتی هاوپەیمانی لەیەک جیادەکردەوە، کەسانێک کە ناوچەکەیان لە چنگ ئەڵمان هێنابوە دەرێ تەنیا بۆ ئەوە کە بەندەرێکی ئازاد بۆ لیتوانیا ، و ئەڵمان دەستەبەر بکەن چون حەشیمەتەکە بەشێوەیەکی هاوچەشن لەنێوان ئەڵمانیەکان و لیتوانیەکان دابەشکرابوون. میمیل بۆخۆی سەدی ٩٠ی ئەڵمانی بوو. لە ساڵی ١٩٣٩دا هیتلێر ئەوێی گەڕاندەوە بۆ ئەڵمانیا، بەڵام بەدوای شەڕەکە وەکوو کلایپێدا بۆڕایەکی تر کرایەوە بە لیتوانی. میمیل ئەوەندە نەدەبوو کە لیتوانیا بە لەدەستدانی ڤیلنا لە پۆڵەندا خۆش بێت. هەردوو وڵاتەکە بۆ ماوەی پازدە ساڵ دەنگیان لەیەک داگۆڕی. کاتێکە بڕیاریاندا پێوەندیەکانیان لە ساڵی ١٩٣٨ دەست پێبکەنەوە، زۆر درەنگ کەوتبوو. ئێستاش لیتوانیا لە هەوڵی ئەوەدایە کە واکا لە پۆڵەندا کە لەبەرهۆی ئەو هەڵە کۆنەوە داوای لێبوردنی لێ بکات.

*　*　*　*

بێجگە لەمانە، زۆردوورتر لە ڤیلنا بەرەوباشوور، پۆڵەندا لە ساڵی ١٩١٩ لەگەڵ دراوسێکانی تری خۆی لەسەر شوێنێک بەناوی گالسیا کە پارێزگایەکی ئوتریشی بوو قرەی هەبوو. هەمووڵایەک لەسەر ئەوە کۆک بوون کە نزیک بە هەمووی نیوەی ڕۆژئاوا، هاوڕێ لەگەڵ زۆرینەی بەرچاوی پۆڵەندی ئەوێ، و شاری پۆڵەندی کراکۆڤ، هاوڕێ لەگەڵ زانکۆی کۆنماوی ئەوێ و بینا مەزنەکانی ڕۆنسانسی ئەوێ، دەبێ بۆ پۆڵەندا بگەڕێندرێنەوە. ناوچەی بچووک و پرپیت و بەرەکتی دووکنشین بەناوی تێسچێن، هەرچەند لەلێواری ڕۆژئاوا هەلکەوتبوو، لەگەڵ دەوڵەتی تازەی چۆکسلەڤاکیا شەڕێکی قورسی لەبەربوو. و لەوەدژاوارتر هەڵاواردنی بەشی ڕۆژهەڵاتی گالیسیا بوو. هەروەکوو باکوور، لێرەش زۆربەی شارەکان لەهیستانی بوون، ناوچەگوندنشینەکان زۆربەیان هێشتا بڕیاریان لەسەر لێنەدرابوو. لڤۆڤ وەکوو تارنۆپۆل(تیرنۆپۆل) لە ڕۆژهەڵاتی دوور دوورگەیەکی پۆڵەندی بوو. بەگشتی، پۆڵەندیەکان کەمتر لە یەک سێهەمی حەشیمەتەکەیان لەخۆگرتبوو، و جوولەکەکان، کە لەوانەیە خۆیان بە پۆڵەندی زانیبێ یان نەزانیبێ، نزیک بە سەدی چاردەی حەشیمەتەکەیان لەخۆگرتبوو. زۆربەی هەرەزۆریان ئۆکراینی کاتۆلیک بوون-یان ڕۆتینیەنەکان، جاروبار بەوە بانگ دەکران تا لە ئۆکراینیەکانی ئۆرتۆدۆکسی

ئیمپراتۆری کۆنی ڕووسی جیاکرێنەوە. دمۆوسکی بە شۆڕای عالی ڕاگەیاندبوو کە ڕۆتینیەکان زۆریان مابوو تا بتوانن دەسەڵاتی خۆیان بگرنەدەست. ئەوان پێویستیان بە ڕێبەرایەتی پۆڵەندی و شارستانیەتی پۆڵەندی هەبوو. و لەگەڵ ئەمانەشدا، هەرچەند دمۆوسکی ئاماژەی پێ نەکرد، پۆڵەندا خوازیاری چاڵگەنەوتیەکانی لڤۆڤ بوو. کاتێکە لیۆد جۆرج ئاماژەی بەمە کرد، پادێرێوسکی ڕقی هەستا. پۆڵەندیەکان لەپاراستنی لڤۆڤ لەبەرانبەر هێزەکانی ئۆکراینی و بۆلشویکی بەتوندی بریندار ببوون. "ئایا ئێوە وادەزانن منالانی سێزدەساڵ لەپێناو پیوەلکاندانداندا، لەپێناو ئیمپریالیستەکاندا خەبات دەکەن؟"زمان پاراویەکەی ئەو کاریگەریەکی ئەوتۆی دانەنا؛ تەنیا فەڕەنسەیەکان هاوسۆزی خۆیان دەربڕی.٠٠٠

ڕوون نەکرابۆوە کە ڕۆتینیەکان تایبەت بە کوێ بوون. زمان و کولتوور ئەوانی بەرەو ڕۆژهەڵات ڕاکێشابوو، بەرەو هەڤاڵانی ئۆکراینی ئەوان؛ ڕابردووی ئەوان لەچوارچێوەی ئیمپراتۆری ئوتریشیدا، ئایینی ئەوان، ئەوانی بەرەو ڕۆژئاوا ڕاکێشابوو. لە مانگی نوامری ساڵی ١٩١٨دا، تاقمێک لە ڕۆتینیەکان سەربەخۆیی خۆیان لە مەجارستان-ئۆتریش ڕاگەیاندبوو و لەگەڵ کۆماری ئۆکراینی لە کیەف یەکیەتیەکیان دامەزراندبوو، کە، بەداخەوە، خێرا لەلایەن کۆمۆنیستەکانی ناوچە و بۆلشویکەکانی ڕوسیەوە کەوتە بەرهێرش. نوێنەرانی ڕۆتینی کە بڕیاریان دابوو لە بەهاری ساڵی١٩١٩ بێن بۆ پاریس نەیاندەتوانی ئەوەیکە خوازیاری بوون باسی کەن.

لە گالیسیا ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی هاوکات بوو لەگەڵ دەستپێکی شەڕ لەگەڵ پۆڵەندیەکانی ناوچە لە لڤۆڤ. کاتێکە هێزی تازەی ئۆکراینی و پۆڵەندی هاتنەناوەوە شەڕەکە گەورە بۆوە، و کاتێکە سوورپێستەکان و سپی پێستەکانی هەردوو نەتەوە پێوەندیان بە شەڕی خۆیانەوە گرت ئاڵۆزی و پشێوی چڕتر بۆوە. هاوپەیمانان، بێ ئەوەی بە ئاکامێک بگەن، هەوڵیان دا ئاگربەست بنێنەوە. لە مانگی مەیدا ویلسۆن وتی کە " بەبێ بەراوردکردنی پیگەی خۆمان و ئۆکراینیەکان یان بۆلشویکەکان کە خەریکن لێمبێرگ گەمارۆ دەدەن[لڤۆڤ] دەستێوەردان و خۆتێوەگلان کارێکی هەروا ئاسان نیە." پۆڵەندیەکان ئەوەی لەدەستیان هات کردیان بۆ ئەوەی کە ماوەی دانیشتنەکانی ئاگربەستەکە درێژ کەنەوە هاوکات پیگەی خۆیانیان بەهێزدەکرد. ئەمە ئاڵۆزیەکی زۆری لە پاریس نایەوە، بەڵام کێشەی ئاشتیکەران ئەوە بوو کە بتوانن ئیرادەی خۆیان بسەپێنن، تەنیا کەڕەتێک ئەوان بڕیاریان دابوو ئەوە چی ببوو.٥٠٢

لیۆد جۆرج وتبووی کە" من تەنیا یەک کەڕەت ئۆکراینیەکم دی. ئەوە دوایەمین ئۆکراینیەکە کە من دیومە، و من دڵنیا نیم لەوە کە خوازیاری دیتنی کەسێکی تر بم یان نا." ئەوەندەی کە

خودی ئۆکراین هاتبێتە بەرباس، هیچ کام لە هاوپەیمانان لە سەربەخۆیی ئەویش پشتگریان نەدەکرد. هێشتا فەرەنسەیەکان و بەریتانیەکان بە ئاواتی هاتنەدی وڵاتێکی رووسی بوون کە حکوومەتێکی دژە-بۆلشویکی دەسەڵاتداریتی بکات. بەڵام ئەوان کۆک بوون لەسەر ئەوە کە گالیسیای رۆژهەڵات، وەک ملکی دوژمنێکی شکستخواردوو، پێویستە لەلایەن کۆڕی ئاشتیەوە کێشەکەی چارەسەر بکرێت. لیۆد جۆرج باسی ئەوەی دەکرد کە خود-موختاری ئەوەندە هەڵدەگرێت کە لەگەڵ دانیشتوانی ناوچە راویژی لەسەر بکرێت. لە گرتنەوەی گالیسیای رۆژهەڵاتدا، پۆڵەندا درووست ئەو کارەی کردبوو کە ئەوان نەیانهێشتبوو شەڕ بیکات. "زۆر هەست بە دڵساردی دەکەم کاتێک کە دەبینم نەتەوە بچووکەکان، بەرلەوەی یەکەمین تیری ئازادیان وێکەوتبێ، دەست دەکەن بە چەوساندنەوەی رەگەزەکانی تر تاکوو هینەکانی خۆیان."٥٠٣

بەدوای شەڕوشۆڕێکی زۆر لە سەر عەرز و مشت و مڕێکی لەتاقەتبەدەر لە پاریس، بڕیار لەسەر ئەوە ساخ بۆوە کە ئۆتریش گالیسیای رۆژهەڵات بدا بە دەست زلهێزەکانەوە بۆ کەڵکوەرگرتن، یان رەنگە بەدەست پۆڵەندەوە، یان، وەک بەریتانیەکان ئاماژەیان کردبوو، بەدەست رووسیەوە یان تەنانەت چکسلەڤاکیا. پۆڵەندیەکان، کە تازە لە حکوومەتی بەریتانی زۆر کەوتبوونە گومانەوە، تووڕە بوون. سەرشیری کۆمەڵگای ڤۆرشۆ، کە بۆ سەماکردن بۆ ماڵی باڵوێزخانەی بەریتانیا دروست پێش جەشنی کریسمەس لە ساڵی ١٩١٩ بانگێشت کرابوون، بە خواردنی نانی شەوێ و بەشدارینەکردن لە کۆڕی سەماکردندا بێزاری و نارەزایەتی خۆیان دەربڕیبوو. کارتۆن دی ویارت، سەرۆکی راسپاردەی نیزامی بەریتانیا، لە رقی خۆیدا رەنگێکی هێنا و برد و بە خانەخوێکەی خۆی راگەیاند کە "ئەگەر من لەباتی تۆ بوومایە ئەوەی لەم ماڵەدایە حەوام دەدا دەرەوە."تەواوی بەرەنگاریەکان و دژەبەرەنگاریەکان کە بەدوای ئەم دەمەتەقێە هاتنەئاراوە بەیانی رۆژی دواتر هەرهەموویان دامرکێنران و کۆتاییان پێهات. هاوکات کە زلهێزەکان بیریان لە چارەنووسی گالیسیای رۆژهەڵات بۆ سێ ساڵی تر دەکردەوە، پۆڵەندیەکان بەبێدەنگی دەچوونە پێشێ و کۆنترڵۆی خۆیان بەسەر ئەوێدا مسۆگر دەکرد. لە ساڵی ١٩٢٣دا خاوەنداریتی پۆڵەندا بە فەرمی ناسرا. رۆتێنیەکان گلەوگازەندەی زۆریان هەبوو بەڵام لە کۆتاییدا ئەوان زۆر لە ئامۆزاکانی خۆیان لەسەر سنوور بەختەوەرتر بوون، کە کران بە قوربانی ستالین.٥٠٤

گەورەترین کێشەی پۆڵەندا هەر لە سەرەتای ساڵی ١٩١٩ەوە تا پاییزی ساڵی ١٩٢٠، لەگەڵ بۆلشویکەکانی رووسیە بوو. لەلایەکەوە پۆڵەندیەکان، تەنانەت بەبەراورد میانڕەوەکانی وەکوو پیلسۆدسکیش، خوازیاری بەرەوپێشبردنی سنوورەکانی پۆڵەندا تا رۆژهەڵات و، بەشێوەیەکی

ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، گرتنەدەستی کۆنترۆڵی بێلاڕووس و ئۆکراین بوون، لەلایەکی ترەوە، بۆلشویکەکان خوازیاری ئەوەبوون تا دڵی ناوچەپیشەسازیەکانی ئورووپا پەرە بە شۆڕشەکەیان بدەن. مێژووی ئەوان پۆڵەندیەکانی واباهێنابوو کە وریای سەرجەم ڕووسیەکان بن، تەنانەت ئەوانەشی کە باس لە زمانی برایەتی نێونەتەوەیی دەکەن. بۆلشویکەکانیش بەش بە حاڵی خۆیان ناسیۆنالیزمی پۆڵەندی و کاتۆلیسیزمی پۆڵەندیان وەک ڕێگرێک لەبەرانبەر شۆڕشدا بەدی دەکرد. بەبۆچوونی ئەوان، ناسیۆنالیزم تەنیا بیانوویەک بوو بۆ دەرەبەگە خاوەن زەوی و زارەکان، خاوەن کارخانەکان و کۆنەپاریزان لە هەموو جۆرێک بۆ ئەوە کە دەستیان بە قودرەتەوە بەند بێت. ترۆتسکی نووسیبووی کە " با ئێمە مافی خود-موختاری نەتەوەیی بە فەرمی بناسین، ئێمە ئاگاداری ئەوە هەین کە دەبێ گرنگایەتی بەرتەسکی لەمێژینەی ئەم چەمکە بۆ کۆمەڵانی خەڵک ڕوون کەینەوە و نابێ هەرگیز لە سەرووی بەرژەوەندیەکانی شۆڕشی پرۆلیتاریەوە داینێین."٥٠ ئەمە ئیپریالیزمی کۆنباوی ڕووسی بوو لە جل و بەرگی تازەدا.

لە مانگی فەوریەی ساڵی ١٩١٩ەوە، شەڕی نێوان بۆلشویکەکان و پۆڵەندیەکان بەدرێژایی بەرەیەکی بەرینی جەنگدا بڵاوبۆوە. پۆڵەندیەکان تا نێو دڵی ناوچەکانی ڕووسیە چوونە پێشێ، بەشێکی زۆریان لە بلاڕووس لە باکوور داگیرکرد. وت و وێژی پشت پەردە و بەنهێنی بۆ مەبەستی پێکهێنانی ئاگربەستێکی کاتی لە هاوینی ساڵی ١٩١٩دا هیچ ئەنجامێکی نەبوو کاتێکە پۆڵەندیەکان هەوڵیان دا پێداگری لەسەر ئۆکراینێکی سەربەخۆ بکەن. لە ٢٤ی مانگی ئاڤریلی ساڵی ١٩٢٠دا، پیلسۆدسکی هێرشێکی تازەی سازکرد، ڕوویکردە کیەف، پێتەختی ئۆکراین. لە مانگی مەیدا هێزەکانی لەهیستانی شارەکەیان خستە ژێرڕکێفی خۆیانەوە، بەڵام پیلسۆدسکی خوراڤی و خاوەن بیروباوەڕی پڕووپووچ زۆر پەرێشان حاڵ بوو؛ کیەف بۆ داگیرکەرەکانی شوێنێکی زۆر ناخۆش و ناوبانگ زڕاو بوو. مانگێک دواتر بۆلشویکەکان شارەکەیان گرتەوە و بەرەو ڕۆژئاوا ڕوویشتن. دەستوورێک کە بە هێزەکانیان ڕاگەیەنرابوو ئەیوت کە "بەسەر جەنازەی پۆڵەندی سپی پێستدا جادەیەک هەڵکەوتووە کە بەرەو ئاوری گەورە دەڕوات!." باڵوێزی بەریتانیا لە پۆڵەندا خاو وخێزانەکەی حەواڵەی ماڵێ کردەوە. تا مانگی ئۆگست هێزەکانی سۆڤیەت لە دەرەوەی گەڕەکەکانی ڤۆرشۆ بوون. هەر ئەو باڵوێزە بۆ خێزانەکەی نووسیبوو کە " هەمووی قاپ و کەوچکەکان و وێنەکان، شتە بریقەدارەکان، چینیەکان، باشترین کتێبەکان و فەرش و فرووشەکانم کۆکردوونەتەوە. بەڵام دەستی شکاوم بۆ ئەو هەموو کەرەسە جوانە و بۆ ئەو تەختە باشانە لەسەریان دەنووستین هتد...کە داخەکەم ناتوانم بیانپێچمەوە." پۆڵەندیەکان کەوتبوونە پاڕانەوە و لالانەوە بۆ چەک و تەقەمەنی یان بۆ

گوشارخستنەسەر بۆلشویکەکان بۆ ملدان بە ئاگربەستێکی کاتی. هیچ کامیان نەگەیی. فەڕەنسەیەکان خەریک بوون پاشەکشەیان دەکرد. ئەوان بۆلشویکەکانیان خۆش نەدەویست بەڵام بە دەست حەز و خولیاکانی پۆڵەندیەکانەوە بە تەنگەوە هاتبوون. لیۆد جۆرج کردیە سەر پۆڵەندیەکان کە دەرگای وتویژکردن بکەنەوە. ئەو بە سی.پی،سکات، سەرنووسەری *مانچێستەر گاردیەنی* لیبراڵی ڕاگەیاند کە پۆڵەندیەکان هیوابڕبوون و لە ئیرلەندیەکانیان خراپتر بە سەرداهاتوە. "ئەوان لەگەڵ هەرکام لە دراوسێکانی خۆیان قڕەیان کردوە-ئەڵمانیەکان، ڕووسیەکان، چکسلەڤاکیەکان، لیتوانیەکان، ڕۆمانیەکان، ئۆکراینیەکان- و خەریک بوو لەلایەن ئەوانەوە تووشی تێڵدانیش بێن." بەختەوەرانە لیۆد جۆرج هەڵەی کردبوو. لنین دواتر وتبووی کە " ئەگەر پۆڵەندا ببوایە بە سۆڤیەت، گرێبەستی ڤێرسایلێش پلیتەکەی تێدەکەوت، و بەگشتی سیستەمی نێونەتەوەیەک کە لەلایەن وڵاتانی سەرکەوتوەوە دامەزرابوو یەکسەر لەبەین دەچوو."٥٠٦

خەبات لەپێناوی ڤۆرشۆدا یەکێک لە گەورەترین سەرکەوتنەکانی مێژووی پۆڵەندا بوو. سوویا، چاوپیسی و شەڕەکورسی لەنێوان ئەفسەرەکاندا دزەی تێکردبوو، لەبەرچاوانی دوژمنێکی هاوبەشدا بەخۆی دادەهات و هەرلوولی دەخوارد. دیپلۆماتێکی بەریتانی نووسیبووی کە " من لەوەی کە هەست بە بوونی هیچ دڵەڕاوکێ و ترس و لەرزێک ناکەم سەرسووڕماوم و زۆرم لا سەیرە." پیلسۆدسکی بەئارامی پلانی دژەهێرشێکی ئازایانەی ڕشت. لە ١٦ی مانگی ئۆگستدا هێزەکانی پۆڵەندی هێرشیان کردە سەر هێزەکانی سۆڤیەت لەو دەوروبەرەدا، و هێڵەکانی پێوەندیگرتنی ئەوانیان پچڕاند. فەرمەندەی سۆڤیەت پاشەکشەیەکی بەپەلەی دەستپێکرد. لە کۆتایی مانگی سێپتامری ساڵی ١٩٢٠دا، لێنین داوای ئاشتی کرد. گرێبەستی ڕیگا، کە لە ١٨ی مانگی مارسی ساڵی ١٩٢١دا واژۆکرابوو، لە ڕۆژهەڵات زیاتر لەوەی کە ئاشتیکەران پێشنیاریان کردبوو سنوورێکی بە پۆڵەندا بەخشی و تەنانەت کەمینەی زیاتریشی بە حەشیمەتەکەی ئەویۆە لکاند: ٤ملوێن ئۆکراینی، ٢ملوێن جوولەکە و یەک ملوێن بلاڕووسی.٥٠٧

پیلسۆدسکی نەیتوانی بەباشی خۆی لەگەڵ ئاشتی یان لەگەڵ سیاسەتی دیموکڕاتیک ڕێک بخات. لە ساڵی ١٩٢٦دا ئەو لەڕێگەی کۆدەتاوە دەسەڵاتی گرتەدەست، و تا کاتی مەرگی لە ساڵی ١٩٣٥ بۆ مەبەستی بەڕێوەبردنی پۆڵەندا لەڕێگای هێڵەکانی نیزامیەوە ئەوەی لەدەستی هات کردی. ڕکابەری سەرەکی ئەو دمۆوسکی هەرگیز هیچ چەشنە بەرپرسایەتی نەگرتە ئەستۆ و تەنانەت لەجاران زیاتر بەرەو باڵی ڕاست خۆی نزیک کردەوە. پادێرێویسکی وەک سەرۆک وەزیر لە کۆتایی ساڵی ١٩١٩دا دەستی لەکار کێشایەوە، و لەناخی دڵەوە ئازاری چێشت کاتێکە

سەرلۆمەکرا لەسەر ئەوەی کە بەرەنگاری هاوپەیمانان بۆوە و نەیهێشت ئەوەی پۆڵەندا خوازیاری بوو پێی ببەخشن و کاتێکە هێرش کرایە سەر خێزانەکەی و بە بێ زەوق و دەستێوەردەر لەکاری ئەم و ئەو تاوانباریان کرد (ئەوەی دەوترا ڕاست بوو).٥٠٨ قەت بۆ ڕایەکی تر لە پۆڵەندا ژیانی دەست پێنەکردەوە. لە ساڵی ١٩٢٢دا، چەند نۆتێکی لەسەر پیانۆ تاقی کردەوە و هەستی بەوەکرد کە هێشتا دەتوانێ چێژ لە ژەنین وەرگرێت. کاری دووهەمیشی وەکوو یەکەمینیان سەرکەوتوانە هاتە دەستی. لە هاوینی ساڵی ١٩١٤دا لە نیۆیۆرک کۆچی دوایی کرد، بەگەیشتنی هەواڵی هێرشی ئەڵمان بۆسەر یەکیەتی سۆڤیەت زۆر خۆشحاڵ بوو و ئاوتەخوازی ئەوە بوو کە ڕایەکی تر ترووسکەی هیوا ڕووکاتەوە وڵاتەکەی.

پۆڵەندا بۆخۆی لەو زگە سەختەی کە پێوەی بوو ڕزگاری بوو و تەنانەت بۆ سەردەمێکیش گەشەی سەند.. نەیتوانی هەمووی ناوچە مێژوویەکانی خۆی سەرکەوتوانە بۆخۆی بگەڕێنێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش هێشتا وڵاتێکی گەورە بوو و دەلاقەکانی بەرەو بالتیک هەر ئاوەڵا بوون. هەڵبەت ئەم دەسکەوتانە خەرجی زۆریان هەڵگرت. زلهێزان، تەنانەت فەرەنسەیەکانیش، لایان وابوو کە لەهیستانیەکان چاوچنۆک و بەتەماحن. و دراوسێکانی ئەو وڵاتە لەسەر زۆر شت قەڵس ببوون و بە تەنگەوە هاتبوون: لیتوانیا، ناوچەی ڤیلنا؛ یەکیەتی سۆڤیەت، کەرتی ١٥٠ مایل-پانتایی ناوچەیەک کە کاتی خۆی بەشی ڕووسیە ببوو؛ چکسلەڤاکیا، شەڕوشۆڕ لەسەر ناوچەی تێسچێن؛ و ئەڵمانیا، ڕاڕەو و دانزیگ. لە هاوینی ساڵی ١٩٣٩دا پۆڵەندا بۆ جارێکی تر لەسەر خەریتە سڕدرایەوە. کاتێکە لە کۆتایی شەڕی دووهەمی جیهانیدا هاتەوە سەر نەخشە، پۆڵەندایێکی تەواو گۆڕاو و تێکچوو بوو، لەلایەن نازیەکانەوە جوولەکەکانی لێدەرکرابوو و لەلایەن سۆڤیەتەکانەوە ئەڵمانیەکان، و دووسەد مایل بەرەو ڕۆژئاوا ڕۆیشتبوو.

# ١٨

# چیکەکان و سلۆڤاکەکان

ئەگەر پۆڵەندیەکان هەر ئاخ و دیق بوون، تەنانەت بۆ لایەنگرەکانی خۆشیان، چکەکان بەگشتی ڕەحمەت بوونیان لێدەکرا. پۆڵەندیەکان بەجەرگ و بەغیرەت بوون، بەڵام هەتابڵێی سەرەڕۆ و بێ ئەقڵ بوون؛ ڕۆمانیەکان ژیر و ژیکەڵە بوون، بەڵام هەتابڵێی فێڵاوی بوون؛ یۆگۆسلاڤیەکان تاڕادەیەکی زۆر باڵکانی بوون. چیکەکان ڕۆژئاوایی بوون. ڕاسپێردراوێکی یارمەتی ئەمەریکی کە لە ژانویەی ساڵی ١٩١٩دا بە سەراسەری وڵاتی ئوتریش-مەجارستانی پێشوودا سەفەری کردبوو لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە " لەو هەموو خەڵکەی کە لە ماوەی سەفەرەکەی خۆمدا چاوم پێیان کەوتوە ئەوەم بۆ دەرکەوتوە کە چکەکان هەتابڵێی بەتوانا و خاوەن ئەقڵ و ژیربێژن، باشترین ڕێکخراوەیان هەیە، و باشترینی ڕێبەرانیان هەبووە."٥٠٩

نوێنەرانی چکی، سەرۆک وەزیرەکەی، کارێل کرامار، و وەزیری دەرەوە، ئێدوارد بێنێش، لە مانگی فەوریەی ساڵی ١٩١٩دا کەیسەکەی خۆیان پێشکەش بە شۆڕای عالی کرد. بێنێش زۆربەی باسەکەی بۆخۆی تەرخان کرد. چارلیز سەیمۆر، پسپۆڕی ئەمەریکی، زۆر کاری تێکرابوو: " ئەو زۆر هەوڵی دابوو تا شۆڕشێک ڕێک بخات کە هابسبێرگەکان مشت و ماڵ بدات و سووپای چکسلەڤاکی لە سیبیریە دابمەزرێنێت؛ لێهاتوویی دیپلۆماتیکی ئەو لەگەڵ سەداقەتی لەڕادەبەدەری سەرۆک کۆمار تووماش ماساریک یەکیان گرتبوو تا ڕای هاوپەیمانان بۆ بەفەرمیناسینی وڵاتی مەلۆتکەکراو ڕابکێشێت."٥١٠

هەموولایەک لە پاریس ئاگاداری ئەوە بوون کە چۆن بێنێش و ماساریک ژیانی خۆیان لەپێناو ڕزگارکردنی خەڵکەکەی خۆیان لە چنگ ئیمپڕاتۆڕی ئوتریش دانابوو. هەموولایەک بەسەرهاتی سەیری سووپای چکەکانیان دەزانی کە خۆیان دابوو بەدەست ڕووسەکانەوە تەنیا بۆ ئەوەی خۆیان

لەناوەڕاستی شۆڕشدا ببیننەوە؛ چلۆن ئەوان ڕێگای هەزاران مایلیان بەپانتایی سیبیریە بەرەو ئوقیانووسی ئارام و بەرەو ئازادی بە شەڕ و تێکۆشان تێدەپەڕاند. هەمووﻻیەک لە پاریس چکەکان و ڕێبەرەکانیان خۆش دەویست و بەسەریاندا هەڵیان دەکوت. (لیۆد جۆرج، کە وەک "چەقەڵی وردیلەی فەڕەنسەیی" ناوی لە بێنێش دەبرد و لای وابوو کە داواکاریەکانی چکەکان لەڕادەبەدەربوون، شتێکی جیاواز و دەگمەن بوو.) بێنیش و ماساریک هەتابڵێی لە یەک حاڵی، ژیربێژ و هاندەری یەکتربوون چونکە ئەوان لەسەر نەریتەکۆنباوەکانی دیموکراتیکی چکەکان و ڕق و قینی ئەوان لە میلیتاریزم، ئۆلیگارشی، باری ماڵی زۆر، یان بڵێین بەگشتی هەمووی ئەو شتانەی کە ئەڵمان و ئوتریش-مەجارستانی کۆن لەپشتیانەوە بوون جەختیان دەکردەوە.٥١١

پێویستە ئاماژە بەوەش بکرێت کە نە بەریتانیەکان نە ئەمەریکیەکان بەتایبەت وﻻتی بچووکی تازەیان خۆش نەدەویست، کە وەکوو بۆقێک وابوو کە سەرەکەی لە ڕۆژئاوا و کیلکەکەشی بەرەوڕۆژهەﻻت باریک ببۆوە، لەنێوان پۆڵەندا لە باکوور و ئوتریش و مەجارستان لە باشوور بابۆڵەکرابوو. فەڕەنسەیەکان حەزیان لێی بوو، نەک لەبەرهۆی هەست و سۆزێک کە سەبارەت بەوێ هەیان بوو، بەڵکوو لەبەرهۆی هێمنایەتی و ئاسایش بۆ ناوچەکە. فەڕەنسە خوازیاری وﻻتێکی بەهێز بوو کە لەگەڵ پۆڵەندا و وﻻتی تازەی سﻻڤی باشوور یەک بگرێن تا لەبەرانبەر هەم بۆلشویزمدا و هەمیش ئەڵمانیا بوەستن. ئەوە بەمانای بەخشینی کۆنترۆڵی ڕێگاکانی هەستیاری شەمەندەفەر بە چکسلەڤاکیا، پێگەیەک لەسەر ڕێگای گەورەی ئاویی ئورووپای ناوەندی، دانووب، و خەڵووزی تەواو بوو.٥١٢

بێنێش لە ٥ی مانگی فەوریەدا داواکاریەکانی چکسلەڤاکیای پێشکەش بە شۆڕای عالی کرد، درووست ڕۆژێک دوا ئەوەکە ڤێنیزۆس داواکاریەکانی یوونانیان پێشکەش کرد و ڕۆژێک بەرلەوەی فەیسەڵ بێت و باسی سەربەخۆیی عەرەبەکان ڕاگەیەنێت. کاری ئەو لەوانی تر ئاسانتر بوو، چون چکسلەڤاکیا تازە لەﻻیەن زلهێزانەوە بە فەرمی ناسرابوو، و زۆربەی ئەو ناوچانەی کە ئەو خوازیاری بوو- پارێزگا ئوتریشیەکانی بۆهێمیا، مۆراڤیا و سێلیسیا، و پارێزگای مەجاری سلۆڤاکیا- تازە ببوو بە خاوەنیان. زۆربەی ئەمانە هۆکەیان دەگەڕاوە بۆ خودی بێنێش و یارمەتیەکە ئەو لە فەڕەنسەی دەگرت.

کاتێکە ئەو لە ساڵی ١٩١٥دا گەیشتە پاریس، بێنێش پرۆفیسۆرێکی نادیاری کۆمەڵناسی بوو لە پراگەوە کە نوێنەرایەتی شتێکی دەکرد بەناوی شۆڕای نیشتمانی چکسلەڤاکیا. چوارساڵ دواتر ئەو کرا بە وەزیری دەرەوەی وﻻتێکی تازە. ئەو کەسایەتیەکی ڕۆمانتیک وەکوو ڤێنیزیلۆس یان

فەیسەل یان سەربازێکی گەورە وەکوو پیلسۆدسکی نەبوو، بێنێش کورتەباڵا، وەک مرۆڤێکی ئاسایی دەچوو بەڵام خۆ بەزلزان بوو، نووسەرێکی نادیار و وتاربێژێکی ئاسایی بوو. (فەرەنسەیەکان لایان وابوو کە ئەمە دەبێ بچێتەوە سەر ئانگلۆ-ساکسۆنەکان.) ئەو هیچ سەرگەرمیەک یان عادەتێکی رۆژانە یان هیچ هاوڕێیەکی نزیکی نەبوو. پێوەندیەکانی ئەو لەگەڵ ماساریک، کە خۆی بە فیداکەری ئەو دەزانی، هەمووکاتێک بەشێوەی ڕەسمی بوو. بەڵام بێنێش هەتابڵێی وزەبەخش و کاریگەر بوو. لە پاریس لە سەردەمی شەڕدا ئەو لەگەڵ گلایەک پێوەندی نزیکی هەبوو، لە مەقاماتی رەسمی وەزارەتی دەرەوە بگرە تا دەگاتە ڕۆشنبیرانی هەڵکەوتە، کە لەونەبو یارمەتی مەسەلەی چکیان دابێت. ئەگەر بێنێش سەرنجی فەرەنسەیەکانی ڕاکێشابوو، هاوکاری دڵڕفێن و جوانچاکی ئەو سلۆڤاک میلان ستێفانیک دڵەکانی بردبۆوە.

ستێفانیک، کە بەر لەشەڕ لە پاریس وەک ئەستێرەناسێک ناوبانگی دەرکردبوو، کاتێکە هاووڵاتی فەرەنسەیی خۆی دەرهێنا و لە هێزی ئاسمانی فەرەنسەدا بوو بە یەکەم شوێنەوارێکی باشی لەسەر هەموان دانا.٥١٣

کاتێکە نەتەوەکانی مەجارستان-ئوتریشی هەڵوەشاوە کەوتنە دەست و پێکردن تا سەرنجی زلهێزان بەلای خۆیاندا ڕاکێشن، بێنێش چالاکتر لە جاران تێوەچوو. ئەو فەرەنسەیەکانی لەوە دڵنیاکردەوە کە وڵاتەکەی ئەو، بەپێچەوانەی دراوسێکانی بۆ شەڕکردن لەگەڵ بۆلشویزمدا ئامادە بوو: " چکەکان دەتوانن بە تاقی تەنیا بزووتنەوەکە ڕاگرن." بۆ بەریتانیەکانی شی کردەوە کە مەبەستی ئەو " دامەزراندنی وڵاتێک بوو تەواو وەفادار...بەتایبەت بە ئینگلەند و وڵاتێک کە بتوانێ لەنێوان ئەڵمانیا و ڕۆژهەڵات بەربەستێک بێت." بێنێش داشێکی باشی هەبوو: هێزەکانی چکی کە لە ئۆردووگاکانی زیندانیانی شەڕ هاتبوون تا لە بەرەی هاوپەیمانیدا شەڕ بکەن. لە مانگی ژوەنی ساڵی ١٩١٨دا، لە سەردەمی دوایەمین هێرشی گەورەی ئەڵماندا، کلیمینجوو بە بێنێشی ڕاگەیاندبوو کە " من هەرهەمووی سەربازەکانی تۆم لە فەرەنسە دەوێت. من هەمووی ڕێگاکە لەگەڵ ئێوە دەبڕم."

لە مانگی ژوەندا وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسە بەشێوەیەکی فەرمی شوڕای نیشتمانی چکسلەڤاکیای وەک حکوومەتی داهاتووی چکسلەڤاکیایەکی سەربەخۆ ناساند و گوشاریان خستە سەر هاوپەیمانانیش وابکەن. لەگەڵ ئەمانەشدا فەرەنسەیەکان ئەوکاتە و دواتریش لە بەفەرمی ناسینی سنوورەکانی چکسلەڤاکیا، تەنانەت ئەو سنوورانەشی کە فێڵ و تەڵەکەیان تێدابوو پێشەنگی کارەکەیان گرتە دەست خۆیان. بێنێش، وەک هەنگاوێک بۆ گەیشتن بە دەستکەوتەکانی خۆی،

بانگێشت کرا بۆ شۆڕای عالی جەنگ تا لەگەڵ مەجارستان-ئوتریش باسی ئاگربەستێکی کاتی تاوتوێ بکات. نە یۆگسلاڤیەکان و نە پۆڵەندیەکان بانگێشت نەکران تا پێوەندی لەگەڵ ئەو بگرن. کاتێکە کۆڕی ئاشتی کرایەوە، بێنێش چکسلەڤاکیای لەسەر لایەنی براوە دامەزراندبۆوە، ڕابردووی ئەو وڵاتەی وەک بەشێک لە مەجارستان-ئوتریش ناودەبرد کە دەبێ تەنیا بە داخ و کەسەرەوە ئاماژەی پێ بکرێت. بەپێچەوانەی یۆگۆسلاڤەکان و پۆڵەندیەکان، چکەکان ئەو قازانجەیان بوو کە یەک دەنگ و یەک هەڵوێستیان هەبوو. لەنێوان بێنێش و ماساریکدا هاریکاریەکی لەڕادەبەدەر هەبوو، کە هەتا مەرگی ماساریک درێژەی هەبوو.٥١٤

ئەگەر بێنێش پیاوێکی کۆڵنەدەر و تێکۆشەرێکی باش بوو، ماساریک پیاوێک بوو کە ڕۆحی کردبەر وڵاتی چکسلەڤاکیا. ئەو کەرسەی پێویستی لەبەردەست دابوو: خەڵکێک بە زمان و وێژەی سلۆڤاکی تایبەت بەخۆیانەوە، و بیرەوەری زۆر: لە سەدەی چاردەهەم، ئەوکاتەی کە میرنشینی دەوڵەمەند و بەهێزی بۆهێمیا گەیشتبوە باکوور نزیک بە ناوچەی باڵتیک؛ لە چەند ساڵێکی تەلایی ئەوکاتەی کە پراگ بوو بە پێتەختی ئیمپراتۆری پیرۆزی ڕۆمانی؛ و دواتر بەسەرهاتێکی ناخۆش لە ساڵی ١٥٢٦بەولاوە کاتێکە، یەکبەدواییەک، دوایەمین پاشماوەکانی سەربەخۆیی لەلایەن هابسبیرگەکانەوە سڕدرانەوە. بەڵام ئەم مێژوە سلۆڤاکەکانی نەدەگرتەوە کە پێدەچێ زمانێکی هاوچەشنیان بووبێت و بەڵام لەباری سیاسیەوە لە سەدەی دەهەم بەملاوە هیچ پێوەندیەکیان بە چکەکانەوە نەبووبێت، ئەوکاتە کە سلۆڤاکەکان کەوتبوونە ژێردەسەڵاتی مەجاریەکانەوە. و ئەوان هەر لەوێ مابوونەوە تەنانەت دوای داگیرکردنی مەجارستان لەلایەن هابسبێرگەکانەوە. چاکسازیەکان، کە بەگشتی چکەکانی نارازی کردبوو، ئەوانی هەر لەبەرچاو نەگرتبوو: سلۆڤاکەکان وەک بڕوادارانی قورس و قایم بە کاتۆلیک مانەوە.

ماساریک کوڕی بەڕێوەبەرێکی کشتوکاڵ بۆ خانوە گەورەکان بوو. ئەو لە ساڵی ١٨٥٠دا لەدایک بوو، درووست بەدوای هەڵگیرسانی ناسیۆنالیزم لە سەرتاسەری ئورووپای ناوەندیدا بە دەست شۆڕشەکانی ساڵی ١٨٤٨ەوە. ئەو بەهاندانی دایکی پڕلەخۆزیاو خولیای خۆی هەر لەسەرەتای تەمەنیەوە پشتی لە ژیانی گوندنشینی کرد و گوندەکەی خۆیانی بەجێ هێشت. وورەی بەرزی ئەو زاتە ئەوی گەیاندە زانکۆ تا لەبواری فەلسەفەدا درێژە بە خوێندن بدات. ئەو لاوێکی ووشیار، تێکۆشەر، خاوەن پرەنسیپ بوو و لەگەڵ ئەمانەشدا ئەو باوەڕیکی سەیری بە توانایی و بۆچوونەکانی خۆی هەبوو. هەر لەیەکەمین مشتومڕدا لەگەڵ پرۆفیسۆرێکی پلەبەرز لەسەر تەوەرێک ناکۆکی خۆی دەربڕی و هەر ئەمەش شوێنێکی بۆ کردەوە. کاتێکە چوە ناو دنیای ڕۆژنامەگەری و دواتریش سیاسەت، بە هەمان مەیلەوە بەرەنگاری بەرپرسان دەبۆوە.٥١٥

کاتێکە شەڕ دەست پێیکرد، ماساریک بەرەبەرە هاتەسەر ئەم ئەنجامە کە ئوتریش-مەجارستان چیتر باوی نەماوە و داهاتووی چکسلەواکیا (ئەو هەر لەسەرەتاوە وایدانابوو کە ئەوە ناوچەکانی سلۆڤاکیاش دەگرێتەوە) لە سەربەخۆییدا، و ئەگەر بکرێ بەپاڵپشتی ڕووسەکانەوە، پەنگی خواردۆتەوە. (ئەوە کە سلاڤەکان پێکەوە خەبات دەکەن ئاواتێک بوو کە هەتا کاتی مەرگی خەونی پێوە دەبینی.) لە ساڵی ١٩١٥دا ئەو بە سلامەتی گەیشتە وڵاتی سویس. بەداخەوە، بنەماڵەکەی لە پراگ گیریان خوارد. خێزانەکەی، کە ئەمەریکی بوو، بەدەست نەخۆشی دەروونییەوە گیرۆدەبوو، کە هەتا کاتی مەرگ هەر لەگەڵی بوو، کچە گەورەکەی خرایە بەندیخانەوە، و کوڕەکەی بەناوی ژان لە سووپای ئوتریشدا دامەزرا. ماساریک ڕووی کردە بەریتانیا، شوێنێک کە بۆ ماوەی دووساڵ لە زانکۆی لەندەن وانەی کوتەوە و لەگەڵ کۆمەڵێک کەسایەتی ناودار، لە دیپلۆماتەوە بگرە تا دەگاتە خاوەن بیرۆکەکانی وەکوو ویکهام ستیدی *تایمێز*، لەنزیکەوە ئاشنابوو.٥١٦

لەسەرەتەخت نەمانی تزار لە مانگی فەوریەی ساڵی ١٩١٧دا ماساریکی بەرەو شەقامی پێتێرزبۆرگ ڕاکێشا. ئەو کردیە سەر حکوومەتی لاوزی کاتی تا هێرشەکانی خۆی بۆسەر سووپاکانی ئوتریش دەست پێکاتەوە و هەوڵی دا زیندانیانی شەڕی چکی بەرەو سووپایەک بگوێزێتەوە کە شان بەشان لەگەڵ ڕووسەکان شەڕ بکەن. شۆڕشی بۆلشویکی لە نوامری ساڵی ١٩١٧دا و بڕیاری لنین لەسەر گازندەکردنی ئاشتی بوونە هۆی ئەوە کە ئەو پلانانە سەر نەگرن. لە هەرحاڵدا بۆلشویکەکان لەوە خۆشحاڵ بوون کە تیپی سەربازی چکی، کە ژمارەیان دەگەیی بە ٥٠،٠٠٠کەس، بەرەو بەرەی جەنگی ڕۆژئاوا دەنێرن. تەنیا ڕێگایەکە شکی بۆدەچوو ڕێگایەکی پێچەڵاوپووچ بوو، شەش هەزار مایل بە ڕێگای شەمەندەفەری ترانسیبێریەن هەتا بەندەری ئارامی ڤلادیڤۆستۆک و دواتریش لەڕێگەی پاپۆڕەوە هەتا فەرەنسە. ماساریک کە لەلایەن ڕێبەرانی بۆلشویکیەوە ئەرخەیان کرابوو، یەکەم کەس بوو کە، لە مانگی مارسی ساڵی ١٩١٨دا، ڕۆیی و دڵنیابوو لەوە کە هێزەکانی بەدوای خۆیدا دەکەونە ڕێ. لە هەرحاڵدا لەسەرڕێگەیەکە بە پانتایی سیبیریەدا تێپەڕ دەبوو تیپی سەربازی چکەکان لەگەڵ مەجاریەکان کە بەرەو ڕۆژئاوا ملی ڕێگایان گرتبوە بەر تا لەگەڵ بۆلشویکەکان یەک بگرن تووشی یەکترهاتن. دەنگیان لێک هەڵبەزیەوە و شەڕ دەستی پێکرد ئەوەندە پەرەی سەند کە کاتێکە چکەکان سەریان هەڵێنا خۆیان لە شەڕێکی قورسدا لەگەڵ بۆلشویکەکان دیەوە. تا کۆتایی وەرزی هاوین هێزەکانی چک توانیان زۆربەی ڕێگاکانی شەمەندەفەڕ و، بەڕێکەوت، زەخیرەکانی تەڵای حکوومەتی تزاریست بخەنە ژێرڕکێفی خۆیانەوە. لەم کاتەدا ئاوری شەڕ خەریک بوو لە ئورووپادا دادەکووژا، و چکەکان لەو

شوێنەی کە هەڵکەوتبوون کەڵکیان زیاتر بوو. هێزەکانی هاوپەیمانی کە لە مانگی ئۆگستدا لە ڤلادیڤۆستۆک نیشتبوونەوە لەوانەبوو خوازیاری ئەوەبوونایە کە دژ بە بۆلشویکەکان بەرەو ڕۆژئاوا هەنگاویان بنایە. ئێستاکە سەربازانی دوورەوەتەن گیرۆدەی دەستێوەردانی هاوپەیمانی لە شەڕی ناوخۆدا بوون، دەبوو دوو ساڵی تر لە سیبیریا بمایەتنەوە. بێنێش بەداخەوە نەبوو لەوەی کە ئەمەی دەدیت؛ ئەوەی ڕاستی بێت، ئەو بەڵێنی لە بەریتانیە سووپاسگوزارەکان وەرگرت تا شۆڕای نیشتمانی چکسلەواکی ئەو وەک نوێنەری ڕەسمی چکەکان و سلۆڤاکەکان بە فەرمی بناسن. ماساریک بەوە ڕازیبوو. کاتێکە ئەو لە ڤلادیڤۆستۆکەوە بە پاپۆڕ بەرەو وڵاتە یەکگرتوەکان وەڕی کەوت تا پاڵپشتی بۆخۆی کۆکاتەوە وتی کە " پێویستە کوڕە ئازاکانی خۆمان بۆ ماوەیەک لەگەڵ هاوپەیمانان شان بە شانی ئەوان بوەستن."٥١٧

ماساریک سەرووبنی وڵات گەڕا-شیکاگۆ، واشنگتۆن، بۆستۆن، کلیڤیلەند، هەر شوێنێک کە کۆچبەری چکی و سلۆڤاکی لێ بوو. ئەو لە نیۆیۆرک بۆ پسپۆڕانی لێکۆڵینەوە لەسەر خود-موختاری لە ئورووپای ڕۆژئاوا وتاربێژی کرد. ئەو سەبارەت بە پێکەوەخەباتکردنی ئازادانە و دۆستانە بۆ هەمووی ئەو نوێنەرانەی کە لە نەتەوەکانی تری ئوتریش-مەجارستانەوە هاتبوون قسەی کرد. لە کۆبوونەوەیەکی گەورەدا لە هۆڵی کارنیگ، ئەو و پادێرێویسکی سەبارەت بە یەکتربەدڵبوونیان و خەباتی هاوچەشنیان دژ بە چەوسانەوە قسەوباسیان ئاڵوگۆڕکرد. سێ حەفتە بەرلەوەی شەڕ کۆتایی پێ بێت، یەکیەتی دیموکراتیکی ناوەڕاستی ئورووپا، هاوڕێ لەگەڵ پۆڵەندیەکان، ئۆکراینیەکان، چکەکان، سلاڤەکانی باشوور، ڕۆمانیەکان، ئیتالیەکان و تەنانەت، بەشێوەیەکی دژوار، ئەرمەنیەکان و زاینیستەکان لە فیلادلفیا کۆبوونەوەیەکی چوار-ڕۆژەیان سازکرد. ماساریک ڕەشنووسی ڕاگەیاندنێکی ئامانجە هاوبەشەکانی نەتەوە سەربەخۆکانی ئورووپای ناوەڕاستی ئامادەکرد. کاتێکە زەنگی ئازادی لێدرا، ئەو یەکەمین کەسێک بوو کە واژۆی کرد، قەڵەمەکەی لە شووشەی مەرکەبێک هەڵکێشا کە کاتی خۆی بۆ ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی ئەمەریکا بەکارهاتبوو.٥١٨

لە پیتێرزبۆرگ، ماساریک ڕێکەوتنامەیەکی تری واژۆکرد، ئەمیان هاوڕێ بوو لەگەڵ ڕێکخراوەکانی چکی و سلۆڤاکی، بەڵێنی دەدا کە لەچوارچێوەی وڵاتی تازەی دیموکراتیکدا، سلۆڤاکەکان ئۆتۆنۆمیەکی بەرچاو و هاوڕێ لەگەڵ دادگای تایبەتبەخۆیان، پەرلەمان و زمانی خۆیان دەبێت. هەرچەند نزیک بە یەک سێهەمی سلۆڤاکەکانی جیهان لە وڵاتەیەکگرتوەکان دەژیان، هێشتا ئەوەندە هەستی نیشتمانپەروەریان تێیدا بەدی نەدەکرا. ئەو مرەمرانەی کە لە زمانی

هاوڵاتیانی ئەمریکی ئەوە بە هیچ شێوەیەک دڵخۆشکەر نەبوو. ئەوان دەیانزانی سلاڤەکان ئەو نیشتمانانەی ئەوانەوە لە ئورووپای ناوەندی بەگوێ دەگەیشت کە گوایە هەمووی سلۆڤاکەکان خوازیاری یەکیەتی نین هێشتا لە پانتایی ئاتلانتیکدا ڕێگەیەکی بۆخۆی نەکردبۆوە. دواتر، کاتێکە نێوان چکەکان و سلۆڤاکەکان شێوا، ماساریک ڕێکەوتنامەکەی بە هەند نەگرت. " ئەو ئەنجامە بۆ ئەوە گیرا تا بەرەیەکی بچووکی سلۆڤاکی هێورکاتەوە کە خەونیان بەوە دەبینی کە خوائەیزانێ چ جۆرە سەربەخۆیەکی بۆ سلۆڤاکەکان نابێتەوە."٥١٩

گرنگێتی پەیماننامەی پێتیرزبۆرگ لەوە دابوو کە ئەمەریکیەکانی دڵنیادەکردەوە لەوەکە خود-موختاری سلۆڤاکیا بەرەو چکسلەواکیا دەبات. و هەروەک ماساریک باش هەستی پێکردبوو پشتگری ئەمەریکیەکان گرنگایەتیەکی یەکجار زۆری هەبوو. لەڕێگای چارلێس کرەینەوە کە خاوەن پارەیەکی گەڕیدە و خۆهەڵقوتێنەر لەهەمووشتێک بوو و لەڕێگای درووستکردنی ئاودەست و مەستەڕاح بژێوی ژیانی خۆی دەردەهێنا، ماساریک چاوی بە لانسینگ، هاوس و لە ئاکامدا لە ١٨ی مانگی ژوەندا چاوی بە ویلسۆن کەوت. دانیشتنەکە لەگەڵ سەرۆک کۆمار سەرکەوتووانە نەبوو. هەردوو پرۆفیسۆرەکەی جاران وتاریان پێشکەش بە یەکتر کرد. لەمەش گرەنگتر ئەوە بوو کە ماساریک هەستی بەوەکرد کە ویلسۆن زۆرتر تامەزرۆی ناردنی تیپێکی سەربازی چکە بۆ ناوچەی سیبیریە تاکوو پشتگریکردن لە سەربەخۆیی چکسلەواکیا. ئەمەریکیەکان هێشتا حازر نەبوون بەئاشکرایی دان بەوەدابنێن کە مەجارستان-ئوتریش کۆتایی پێهاتوە.٥٢٠

بەڵام لە وەرزی پاییزدا بە ئاشکرا ڕاگەیەنرا. هێزەکانی ئوتریشی لە گۆڕەپانەکانی شەڕدا هەپروون بەهەپروون ببوون؛ لەناو ئیمپراتۆریەتدا ئیمپراتۆری لاو و خاو بەجوانی هەستی بەوەدەکرد کە پۆڵەندیەکان، سلاڤەکانی باشوور، چکەکان، ئەڵمانیەکان باسی سەبەخۆیی بۆتە بنێشتەخۆشەی سەرزاریان. لە پراگ، خۆپیشاندەران بۆ ماساریک و ویلسۆن چەپڵەیان لێدەدا و شادی و خۆشیان بوو. بە واتای ویلسۆن، "مەجارستان-ئوتریش خانوویەکی کۆن بوو کە تەنیا بە کۆڵەکەکانیەوە ڕاگیرابوو." کاتی ئەوە هاتبوو کە ئەو کۆڵەکانە لەبەین بچن. لە ٣ی مانگی سێپتامردا، ولاتەیەکگرتوەکان شۆڕای نیشتمانی چکسلەواکیایی وەک حکوومەتێکی جەنگی و پەسەندکراو بە فەرمی ناسی. وەکوو بەفەرمی ناسینەکەی پێشووی بەریتانیەکان، ڕاگەیاندنەکە ڕوونی نەکردبۆوە کە ئەو ناوچەیەی دەوڵەتی تازە داگیری دەکا کامەیە.٥٢١

لە پاریسەوە، بێنێش بڕیاری دا تا پلانی حەقیقەتەکان لەسەر زەوی دابڕێژێت. ئەو بۆ هاوکارەکانی نووسی کە "کارێکە دەبوو بکرایە کرا بێ ئەوەی دەنگێک یان گازندەیەک لە کەسێکەوە بەرزبێتەوە و لەم قۆناخەی ئێستادا زاڵبوون بەسەر دۆخە شتێکی پێویست و بڕیاردەرە." لە

ی ۲۸ی مانگی ئۆکتۆبردا، لە پراگ، سیاسەتمەدارانی چکی بە ڕووی خۆشەوە بەڵام قورس و قایم دەسەڵاتیان لە بەڕێوەبەرایەتی دیمۆکراتیزەی ئوتریشی ستاند. بێنێش کردیە سەر هاوپەیمانان تا هێزەکانی ئەڵمانی و مەجاری لە ناوچەکانی چکی و سلۆڤاکیا دەرکەن و هێزەکانی هاوپەیمانان بکەنە ناوەوە. ئەو بە فەرەنسەیەکانی ڕاگەیاند کە داگیرکردنی تێسچێن، ناوچەی هاوسنوور لەگەڵ پۆڵەندا، و براتیسلاڤا (پرێسبۆرگی ئەڵمانیا) لە مەجارستان پێویستی هاوچەشنیان هەیە. چون هاوپەیمانان هێزی کەمیان لەبەردەست دابوو تا بۆ ئەوێی بنێرن، داگیرکاریەکە بەگشتی لەلایەن هێزەکانی چکیەوە جێبەجێکرا کە بە فەرمەندەیی هاوپەیمانانەوە چالاکیان دەکرد.٥٢٢

*　　*　　*　　*

دواخستنی دەستپێکردنی کۆڕی ئاشتی زۆر بە قازانجی چکەکان تەواو بوو. لە مانگی ژانویەی ساڵی ١٩١٩دا، ماساریک گەڕایەوە بۆ پراگ، وەک یەکەمین سەرۆک کۆماری چکسلەواکیا دامەزرا و ژیانی ئاسایی خۆی لەو کۆشکەدا بردەسەر کە کاتی خۆی پاشاکانی بۆهێمیێ تێیدا دانیشتبوون و حکوومەتیان کردبوو. سەرەڕای گلەوگازەندی دانیشتوانی ناوچەکە، هێزەکانی چکی بەرەو ناوچە سنووریەکانی ئەڵمانی-ئاخێوەر ڕۆیشتبوون، شوێنێک کە بۆهێمیا لە باشوور ئوتریش و لە باکوور ئەڵمانی دەگرتەوە. لە سلۆڤاکیا بەرپرسانی نیزامی فەرەنسە دەستووریان بە حکوومەتی مەجاری دابوو تا هێزەکانی خۆی بکێشێتە دواوەی هێڵێکی سنووری کە چکەکان خوازیاری بوون.

سنوورەکانی چکسلەواکیا بەگشتی کاتێک دابینکرابوون کە ئاشتیکەران سەرنجیان دابوویە وڵاتی تازە. بەگشتی، بێنێش خوازیاری بەفەرمیناسین بوو لەلایەن کۆڕی ئاشتیەوە، بەڵام بێجگە لەوە ئەو خوازیاری ئەوەبوو کە لە هەندێک شوێن سنوورەکان بەربڵاوتر بکات و بیانکێشێتە دەرەوە. کاتێکە لە ٥ی مانگی فەوریەی ساڵی ١٩١٩دا لە شۆڕای عالیدا بەشداری کرد، ئەو داوای چەند پارووییەکی لە پۆڵەندا، و هەروەها پارچەزەویەک لە مەجارستان دەکردکە بەدرێژایی دانووبی دەگرتەوە، و، شوێنێک کە تێیدا چۆمی گەورە بەرەو باشوور دەچەمێتەوە و ڕوودەکاتە شاخەکانی کارپاتیان. لەگەڵ ئەوانەشدا ئەو داوای چەند پارچە زەویەکی لە ناوچەکانی ئەڵمانی و ئوتریشی دەکرد لە باکوور و باشوور سنوورەکانی بۆهێمی و مۆراڤی تا بە چکسلەواکیا سنوورێکی لەبارتر و باشتر بۆ پارێزگاریکردن ببەخشێت. لە وتووێژەکانی خۆمانە و نهێنیدا ئەو ڕایگەیاندبوو کە ئەمانە داواکاریەکانی ئەو نەبوون؛ ئە دەیکوت بەداخەوە لەلایەن ناسیۆنالیستەکانی وەکوو کرامارى هاوکاریەوە دنە دەدرا.٥٢٣

لە کیلکی چکسلەواکیا لە ڕۆژهەڵات، بێنێش بەگشتی داوای ناوچەیەکی ئۆکراینی-ئاخێوەری دەکرد لە بەری باشووری کارپاتیانەکان بەبیانووی ئەوەوە کە دانیشتوانی ناوچەکە، بەگشتی ڕۆتێنیەکان، زۆر لە سلۆڤاکەکان دەچوون. ئەو واهەستی دەکرد کە بەجێهێشتنی ئەوان لەژێردەسەڵاتی مەجاریەکاندا لەحاڵێکدا کە چکسلەواکیا ئامادەیی ئەوەی هەبوو کە ئەوان بخاتە ژێر باڵی خۆیەوە کارێکی بێ ڕەحمانە بوو. (کۆچبەرانی ڕۆتێنی لە وڵاتەیەکگرتوەکان بەپێخۆشبوونی خۆیان دەنگیان دابوو تا لەگەڵ چکسلەواکیا یەکبگرنەوە.) لکاندنی ئەو پارچەزەویە بە چکسلەواکیاوە ئەو وڵاتەی لەگەڵ ڕۆمانیا، وڵاتێکی دۆست، هاوسنوور دەکرد.٥٢٤

ئەو دوو دانە داواکاری یان پێشنیاری تری هەبوو. هەندێک سلاڤی هەبوون کە لە بەشی باشووری ئەڵمانیا، درووست لە ڕۆژهەڵاتی دریسدێن، دەژیان کە لە چکسلەواکیا پاڕابوونەوە تا پارێزگاریان لێبکات. ئەمە لەڕاستیدا پرسیارێکی ئەخلاقی بوو ئەو ئەمی بۆ کۆڕی ئاشتی دانا. چکسلەواکیا پێویستی بە دۆستگرتن هەبوو چون لە سێ لاوە لەلایەن ئەڵمانیەکان و مەجاریەکانەوە گەمارۆدرابوو. ڕاڕەوێکی زەمینی پێویستبوو کە لەنێوان ئوتریش و مەجارستان بەرەوباشوور بڕۆیشتایە تا بەڵکوو وڵاتەکەی ئەوی بە یۆگۆسلاڤیاوە گرێبدایە. لیۆد جۆرج لەوڵامدا وتی کە " قسەی حەسابی بەوە دەڵێن بابم." ڕاڕەوەکە، کە قەت نەدەهاتە جیهانی واقیع، ڕەنگدانەوەی خەونە لەمێژینەکانی ماساریک بوو سەبارەت بە فێدراڵیەتی سلاڤەوە. بێنێش فەرەنسەیەکانی لەوە دڵنیاکردبۆوە کە پۆڵەندیەکان، یۆگۆسلاڤەکان و چکەکان هەرهەموویان ئاگاداری ئەوەبوون کە چەندە خاڵی هاوبەشیان هەیە. هەرچەند قڕەیەک لەسەر ناوچەی تێسچێن تازە خەریک بوو پۆڵەندی لەو هاوسەنگیە شادیبەخشە دووردەخستەوە، چکسلەواکیا و یۆگۆسلاڤیا دەبوایە درێژەیان بە پێوەندی برایانەی خۆیان بدایا.٥٢٥

چکەکان بە بەڵگەی چەسپاوەوە پشتگریان لە داواکاریەکانی خۆیان دەکرد: ڕابردووی پیرۆزیان، ئاواتەخوازی ئەوان بۆ گەیشتن بە ئازادی، وریایی و ژیریبوونی ئەوان، ورەبەرزی و ئازابوونی ئەوان. ئەوان لەبەرانبەر بۆلشویزمدا دەوەستان کەچی خەڵکانی پلەخوارتر لەمان کە بەدەوریانەوە بوون چۆکیان دادەدا و خۆیان دەدا بە دەستەوە. ئەوان هاوکات پێشکەوتووترین بەشی سلاڤەکان و سەنگەرێکی بەهێزی شارستانیەتی ڕۆژئاوابوون. بێنێش بە پانەوە دەیکوت کە خەڵکەکەی ئەو هەمیشە هەستیان بەوەکردوە کە پارێزگاریکردنی لە دیموکڕاسی لەبەرانبەر وەیشوومەی ئەڵمانیدا ئەرکێکی تایبەت بوە لەسەر شانی ئەوان. " هەربۆیە وەک هەمووڵایەک ئاگادارن چکەکان ئەوپەڕی ئازایەتی و فیداکاری خۆیان لەم شەڕەدا پیشان دا." داواکاری چکەکان لەڕووی ئەقڵ و دوور لە هەر زێدەخوازیەک بوو. بێنێش وتبووی

كە" پاش ٣٠٠ ساڵ بەردایەتی و تێپەڕاندی قۆناخی جۆراوجۆری دژواریەکان، هەستی دەکرد کە پێویستە ژیرانە و ئاقڵانە بیرکاتەوە و سەبارەت بە دراوسێکانی هەڵوێستێکی دادپەروەرانەی هەبێت؛ و پێویستە کە بەرگری لە سەرهەڵدانی چاوپیسی و شەڕ و شۆڕی تازە بکات کە لەوانەیە بۆجارێکی تر تووشی کەنەوە بە تووشی مەترسی هاوچەشن." ئەو پێداگری دەکرد کە حکوومەتەکەی ئەو " بە ئاواتەوەیە کە ئەوەی لە دەستی دێت بۆ بەدیهێنانی ئاشتیەکی هەتاهەتایی و دادپەروەرانە یارمەتی بات." لیۆد جۆرج کە بەتاقی تەنێ دانیشتبوو متەقی لێوە نەهات. "ئەو وتارەکەی خۆی یەکسەر بە دەستەواژەگەلێک ڕازاندبۆوە کە ڕەنگ و بۆی ئەو بیروباوەڕە مەزنانەی لێدەهات کە هاوپەیمانان لە هێرشی خاچپەرستانەی خۆیان لەپێناو مافی نێونەتەوەییدا بانگەشەیان بۆدەکرد." کاتێکە کرامار، وەک دووهەمین نوێنەری چک، داوای کرد گوێ لە بۆچوونەکانی ئەویش بگرن، کلیمینجوو، سەرەڕای ئەوەکە خۆی بە هاوخەمی چکسلەواکیا دەزانی، قسەکانی پێپچڕی و وتی: " زۆرباشە ئێمە کۆمیسیۆنێکی تایبەت دابین دەکەین و ئێوە دەتوانن بۆ ماوەی دوو کاتەژمێر قسەیان لەگەڵ بکەن. ئێستا باشتر وایە دوو پیاڵە چایی بخۆینەوە."٥٢٦

چکەکان هێواش و لەسەرخۆ تەگەرەکانیان تێپەڕاند. ئەوان دانیان بەوەدا هێنا کە سلۆڤاکیا نزیک بە ٦٥٠،٠٠٠ مەجاری لەخۆی دەگرێت، بەڵام هێشتا ٣٥٠،٠٠٠ سلۆڤاکی لە دەرەوە دەمێننەوە. مەجاریەکان بۆیان نەبوو گلەوگازەندەی خۆیان دەربڕن. ئەوان بێ ئەوەی سەرکەوتنێک بە دەست بێنن هەوڵیان دابوو سلۆڤاکەکان بگۆڕن و بیانکەن بە مەجاری و زەختیان کردبوە سەر هەزاران کەس کە کۆچیان پێبکەن. بێنێش وتی کە بەڵێ هەندێک ئەڵمانی ئاخێوەر هەن کە بەدرێژایی سنوورەکانی ئوتریش و ئەڵمان، لە ڕۆژئاوای بۆهێمیای کۆن دەژین (شوێنێکە ئەڵمانیەکان بۆخۆیان ناویان نابوو سۆدێتێنلەند"ناوچەی باشوور"). بەڵام ژمارەکانی پێش شەڕی ئوتریشی کە باسی چەند ملوێن کەسیان دەکرد هەرگیز جێی باوەڕ نەبوون؛ ژمارەکانی چکی، کە بەپێچەوانە زۆر بە سەرنجەوە ئەنجامدرابوون، تەنیا یەک و نیو ملوێن ئەڵمانیان نیشان دەدا کە نزیک بە سێ ئەوەندەی چکەکانی دەگرتەوە. ئەم تاقمە لە ئەڵمانیەکانی بۆهێم باش دەیانزانی کە چارەنووسی ئەوان بە چکسلەواکیاوە گرێدراوە. ئەوان نەیاندەویست کە ببینن کاروپیشەیان بە ئابووری زۆربەهێزی ئەڵمانیاوە نووقم بێ و لەبەین بچێت. ئەگەر هەندێکیان باسی یەکگرتنەوەیان لەگەڵ ئەڵمانیای گەورەتر یان لەوانەیە ئوتریش دەکرد ، بەهۆی ئەوەوە بوو کە ئەوان لەلایەن ئاژاوەچیانی دەرەوە ترۆر دەکران. لەهەرحاڵدا، ئەمە بە بۆچونی ئەو چەسپاوترین بەڵگەبوون، چکسلەواکیا نەیدەتوانی بەبێ کارگەی سافکەرەوەی شەکر، کارگەکانی شووشەسازی، کارگەکانی قوماش چنین، کارگەکانی تواندنەوە و کارگەکانی بیرەی

سۆڤیێتینلەند دەوام بێنێ. و چکەکان بۆ پارێزگاریکردن لەخۆیان پێویستیان بە سنووره کۆنەکان هەبوو، کە بەدرێژایی کێوەکان و تەپەکان هەڵکەوتبوون. پسپۆڕێکی ئەمەریکی بە تەشەرەوە ڕایگەیاندبوو کە " لە بۆهێمیا ئەوان داوای "سنووره لەمێژینەکانی" خۆیان دەکەن بەبێ لەبەرچاوگرتنی نارەزایەتیەکانی ژمارەیەکی زۆر لەو ئەڵمانیانەی کە حەزناکەن بەم شێوەیە بخرێنە ژێرکۆنترۆڵەوە. لە سلۆڤاکیا ئەوان پێداگری لەسەر مافەکانی نەتەوەیی دەکەن و هیچ بایەخێک بە "سنووره لەمێژینەکانی" کۆن و باش دیاریکراوی مەجارستان نادەن."٥٢٧

چون هاوپەیمانان بەگشتی وڵاتی تازەیان ئەوجۆرەی کە هەبوو پەسەند دەکرد، کۆمیسیۆنێکە دامەزرا تا گوزارش لەسەر چکسلەڤاکیا بکا بە بەراورد کارێکی زۆر ئاسانتری هەبوو. ئەندامانی ئەو کۆمیسیۆنە بەشێوەیەکی دۆستانە چالاکیان دەکرد، سەیمۆر دەیکوت کە بەشێوەیەکی نافەرمی یارمەتی دەدران (کە ڕێگەیان هەبوو تا جگەرەیەک بکێشن) و بەم حەقیقەتە کە بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان بەشێوەی نهێنی کۆدەبوونەوە، وەکوو لە زۆربەی بابەتەکاندا وایان دەکرد، تا لەسەر هەڵوێستە هاوبەشەکان بەرلە کۆبوونەوەکان ڕێبکەون. جاروبار ئەوان لەگەڵ نوێنەری سەرەکی بەریتانیەکان، سێر جۆسێف کۆک ئاف ئۆستراڵیا، کێشەیان هەبوو کە لەگەڵ ئەوەکە هیچ زانیاریەکی نەبوو خاون بیروبۆچوونێکی بەهێز بوو. نیکۆسۆن زۆرکاتی خۆی لەسەر بارهێنانی ئەو دانا. چون بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەرژەوەندیەکانی ئیتالیا نەدەهاتنە بەرباس و لێکۆڵینەوە، نوێنەرانی ئیتالی ئەوجۆرەی کە لەسەر سنوورەکانی یوگۆسلاڤیا ڕێگریان دەکرد لێرە وانەبوون. هیچ یارمەتیەکیشیان لەدەست نەدەهات. نوێنەری سەرەکی ئەوان، دیپلۆماتێکی پیر، بەشانازیەوە دەیگوت: " من ئەم پرسیارە لەخۆم دەپرسم کە ئایا لەم قۆناخەی ئێستادا کارێکی ژیرانە ئەوە نیە کە لانی کەم دوو ئەگەر بخەینە بەردەمی خۆمان."٥٢٨

ئەو سنوورانەی کە کێشەی هەرەگەورەیان بۆ گلایەک درووست کردبوو لەنێوان مەجارستان و سلۆڤاکیا هەڵکەوتبوون. دانیشتوانی ناوچەکە کە زۆربەیان سلۆڤاکی و مەجاری بوون زۆر تێکەڵاو بوون؛ و ڕۆژهەڵاتی دانووب هیچ هێمایەکی دیاری جوگرافی نەبوو. فەرەنسەیەکان پاڵپشتیان لە داواکاریەکانی چکەکان دەکرد لەسەر ناوچەیەک کە بە ڕەچەڵەک مەجاری بوون؛ بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان پشتگریان نەدەکرد. هەموولایەک ڕایان وابوو کە ڕاڕەوێک بۆ یوگۆسلاڤیا بەکردەوە دەرنایەت. دوا چەلەحانە و دانووستانی زۆر، کۆمیسیۆن لە کۆتایی یەکەمین حەفتەی مانگی مارسدا کۆتایی بە کارەکانی خۆی هێنا. سەرۆکی کۆڕەکە لە شاندی نوێنەرایەتی بەریتانیا داوای دەربڕینی ڕای کۆتایی کرد. کۆک وتی کە " زۆرچاکە ئەوەیکە من دەتوانم باسی بکەم ئەوەیە کە

ئێمە بنەماڵەیەکی دڵخۆشین وانیە؟" بێدەنگیەک وڵاتی داگرت چون وەرگێڕی سەرزارەکی خەریک بوو بە فەرەنسەیی وەری دەگێڕاوە.٥٢٩

گوزارشەکە، کە بە چکەکانی هەندێک، نەوەک هەمووی، ئەو ناوچە لکێنراوانەی دەبەخشی کە ئەوان لە ئەڵمان، ئوتریش و مەجارستانیان دەویست، پارچەپارچە پەسەندکرا چون هەرکام لە گرێبەستەکان داڕێژرابوون. لە ٤ی مانگی ئاڤریلدا شۆڕای چواریار، کە کەوتبوە ناوجەنگەی مشتومڕەکان لەسەر مەرجەکانی ئەڵمانی، لەپڕێکدا لەسەر ئەوە رێکەوت کە باشتروایە بەگشتی بنووسێن بە سنوورەکۆنەکانی میرنشینی بۆهێمەوە. لە١٢ی مانگی مەیدا، بە جێبەجێکردنێکی خێرای هاوچەشن، سنوورەکۆنەکانی نێوان چکسلەواکیا و ئوتریشی پەسەند کرد. تاقمێک لە ئاشتیکەران بۆماوەیەکی کاتی دڵەڕاوکێی کەمینەی ئەڵمانیا، سێ ملوێن ئەڵمانی بەهێز، لە چوارچێوەی چکسلەواکیایان لە دڵ دابوو. لانسینگ سەبارەت بە لەبەرچاونەگرتنی یاسای خود-موختاری نیگەرانی هەبوو. واهەست دەکرێ کە ویلسۆن لەوپەڕی سەرسووڕماندا بە دەنگێکی بەرزەوە وتبێتی کە " بۆچی، ماساریک قەت باسی ئەوەی لای من نەکرد!" بەڵام لە کۆتاییدا ئەو بایەخێکی ئەوتۆی بە ئەڵمانیەکانی سۆدیتێن نەدا. لیۆد جۆرج دواتر ڕایگەیاند کە هەستی بە گومان و دڵەڕاوکێیەکی زۆری کردبوو، هەرچەند لەوکاتەدا هیچ کامێکیانی نەورووژاندبوو. کلیمینجوو هیچ نیگەرانیەکی نەبوو: چون ئەو بە شۆڕای چوار یاری ڕاگەیاندبوو کە " کۆڕی ئاشتی بڕیاری داوە بە چەند وڵاتێکی تازە ژیانی نوێ ببەخشێت. ئایا ئەمە کارێکی ناڕەوا و نادادپەروەرانە نیە کە ئەوان بکا بەقوربانی و زەخت کاتە سەریان و سنووری ناڕەوایان بە سەر ئەڵماندا پێ بسەپێنێ؟"بەگشتی هیچ کەس خوازیاری ئەوە نەبوو کە ناوچەکانی ئەڵمانیا بە ناوچەکانی دوژمنانی شکستخواردوو بلکێنرێن. پێدەچێ لەگەڵ ماساریک هاوڕا بووبێت کاتێکە بەبێ ئارامیەوە پێی وت کە " ئەمڕۆکە هەمووی گەلان لەلایەن ئەڵمانیەکان و ماگیارسەکانەوە دەچەوسێنرێنیەوە- ئایا ئەوە هیچ نیە؟" و چکسلەواکیەکان بە بەخشینی گەرەنتی جۆراوجۆر بە کەمینەکانی خۆیان کاریگەریان لەسەر ئاشتیکەران دانا: قوتابخانەی تایبەت بە خۆیان، ئازادی ئایین، تەنانەت نوێنەرایەتی وشیار، واتە ئەوان دەیانتوانی نوێنەرایەتی تایبەت بە خۆیان هەبێت. چکسلەواکیا خەریک بوو دەبوو بە سۆئیسی ئورووپای ناوەندی.٥٣٠

ئەڵمانیەکانی سۆدیتێن بۆخۆیان بەبێ ئەوەی بە ئاکامێک بگەن لە ساڵەکانی ١٩١٨ و ١٩١٩ دژایەتیان دەکرد و بەو بارودۆخە رازی نەبوون. بەگشتی وەرزێرانی دەوڵەمەند و بۆرژوای بەهێز ببوون دوو دەستە یەکیان ئەوانە بوون بە ڕق و نەفرەتەوە دەیانڕوانیە دەسەڵاتدارانی تازەی

چکی و دووهەمینیان ئەوانە بوون کە لە گژەگژی شۆڕشەکانی باڵی-چەپ کە لە ئەڵمان و ئوتریشەوە با واوەی دێنان دەترسان. چکسلەواکیا لانی کەم پێشنیاری سەقامگیری دەکرد. لە هەرحاڵدا، ئەڵمانیا، کە گیرۆدەی کێشەکانی تایبەت بەخۆی بوو، لەو کاتەدا بایەخێکی ئەوتۆی بەوانە نەدەدا. شاندی نوینەرایەتی ئەڵمانیا لە ڤێرسایلێس تەنیا کەرەتێک ئاماژەی پێکردن ئەویش کاتێکە بەشێوەی پێشنیاری نوسراو بە ئاشتیکەران دەبەخشرا. وەزیری دەرەوەی ئەڵمانیا، کاونت ئۆلریچ ڤان برۆکدۆرف-رانتزاو، هاوخەمی خۆی لەگەڵ ئەڵمانیەکانی ستۆدێتێن دەربڕی بەڵام ئەوەشی ئاشکرا کرد کە ئەڵمانیا پێگەی دانووستانی خۆی لەگەڵ هاوپەیمانان ناخاتە مەترسیەوە بە چاودێری کردنی خەڵکێک، کە بەگشتی، قەت بەشێک تایبەت بە ئەڵمانیا نەبوون. یەکگرتنەوە لەگەڵ ئوتریش بە هەمان شێوە لە ساڵی ١٩١٩دا ڕێگەچارەیەکی دوور لەواقیع بوو بۆ ئەڵمانیەکانی سۆدێتین چون ئەڵمانی ئاخێوەران لە هەیقێکدا بەدرێژایی سنوورەکانی ئوتریش و ئەڵمان هەڵکەوتبوون. بێجگە لەمانە، لە ساڵی ١٩١٩دا ئوتریش بۆخۆی شیمانەی کەمی لێدەکرا کە بتوانێ دەوام بێنێت.٥٣١

حکوومەتی چکی زۆریەک لە بەڵێنیەکانی خۆی بردەسەر. لەو ناوچانەی کە ژمارەیەکی بەرچاوی ئەڵمانی لێبوو، ئەوان ڕێگەیان پێدرابوو کە بۆ کاروباری فەرمی زمانی خۆیان بەکاربێنن. قوتابخانە، زانکۆ و ڕۆژنامەی ئەڵمانی هەبوون. بەڵام بەسەر ئەمانەشدا چکسلەواکیا هێشتا وڵاتێکی سلاڤ بوو. پارەی بانکەکان وێنەی ژنانی لاویان پێوەبوو کە جل و بەرگی فۆلکلۆری چکی یان سلۆڤاکیان لەبەردابوو. ئەڵمانیەکان- هاوڕێ لەگەڵ مەجاریەکان و ڕۆتێنیەکان- هەرگیز هەستیان بەوەنەدەکرد کە بەتەواوەتی ئەوێندەری نین و سەر بە وڵاتێکی ترن.٥٣٢ لەوانەبوو ئەوە هیچ کێشەیەکی درووست نەکردایە، ئەگەر خەمۆکی پیشەسازیەکانی نەکردایەتە نیشانە و ئەگەر هیتلێر مەسەلەی ئەڵمانیە بزربووەکانی بە هینی خۆی نەزانیبایە. لە ساڵی ١٩٣٨دا لە شاری موونیخ، ئەڵمانیەکانی سۆدێتێن بیانوویەکیان دا بەدەستیەوە تا چکسلەواکیای پێ لەبەین بەرێت.

* * * *

دامرکاندنی کێشەی سنوورەکانی چکسلەواکیا ماوەیەکی زیاتری دەبرد، بەشێکی بەهۆی ئەوەوە کە گرێبەست لەگەڵ مەجارستان پەکی خرابۆوە، یەکەمجار بەهۆی شۆڕشی کمۆنیستیەوە لە کۆتایی مانگی مارسدا و دواتریش بەهۆی سەرهەڵدانی شەڕی گەورەتر. دوائەوە کە چکەکان لەوە دڵنیابوون کە ئاشتیکەران مەبەستی سەرەکیان شەڕکردن لەگەڵ بیروباوەڕی بۆلشویزمە، ماوەیەکی کورت بەدوای شۆڕشەکەدا کەوتنەڕێ تا دەست بەسەر ناوچەی مەجاریدا بگرن. بە ڕەزایەتی فۆچ، هێزەکانی ئەوان

ڕێگاکانی هەستیاری شەمەندەفەڕ لەسەر خاکی مەجارستانیان داگیرکرد و دواتر بەرەو پێشەوەچوون، ئەولاتری ئەو شوێنانەی کە فۆج سەرپشکی کردبوون، تا دەست بەسەر دوایەمین پاشماوەی کانگای خەڵووزدا بگرن. مەجاریەکان لە سەرەتای مانگی ژوەندا بەرەنگاری هێرشەکە بوونەوە. چکەکان خێرا هانایان بردە لای ئاشتیکەران. ئەوان واقدەمێنن و لەوانەیە هەستیان بریندار بێت ئەگەر کەسێک وابیرکاتەوە کە ئەوان بوون کە مەجاریەکانیان ورووژاند. کرامار وتی کە "من سەبارەت بە دژایەتی چکەکانەوە هیچ زانیاریەکم نیە، ئەوەی کە من دەیزانم پێوەندی هەیە بە پێشکەوتنی بۆلشویزمی مەجاریەوە، تێکەڵاو و ئاڵۆزاو بە شۆوینیزمی ماگیارەوە." بێنێش وێنەی چکسلەوایەکی ئاشتی گرانەی کێشایەوە، بێ ئەوەی ئاگاداری مەترسی بێت بۆ سەر باشور: " ئێمە سەرمان بە چاکسازیەکانی ناوخۆی خۆمان و هەڵبژاردنەکانی داهاتووەوە قاڵ بوو." هێزەکانی چکی بەگشتی لەسەر سنووری ئەڵمانیا خڕببوونەوە، ئامادەی هێرش بوون ئەگەر ئەڵمانیا گرێبەستەکەی واژۆ نەکردایە. " لەوکاتەدا بوو کە ماگیارەکان بەرەوپێشەوە چوون، چون هەستیان دەکرد کە سلۆڤاکیا هیچ دەرەتانێکی نیە." چکەکان لەو دەرفەتە کەڵکیان وەرگرت و سەبارەت بە ناوچەکانی مەجاری داواکاری تازەیان پێشکەش کرد: بۆ وێنە، هێڵەکانی زیاتری ریگەی شەمەندەفەڕ و پاسگایەک لەسەر قەراخئاوەکانی باشوری دانووب. هاوپەیمانان، کە ئێستا زۆر نیگەرانی ئاڵۆزیەکە بوون، بەرەنگاری زۆربەی ئەمانە بوونەوە. لیۆد جۆرج وتی کە " پێویستە ئێمە تەنانەت لەگەڵ مەجاریەکانیش نەرم و نیان بین. ئەوان تەنیا مەبەستیان پارێزگاری کردنە لە وڵاتی خۆیان." جگە لە شارۆچکەی براتیسلاڤای ئەڵمانی لەسەر چۆمی دانووب، کە بە چکسلەواکیا بەخشرا تەنیا لەبەرهۆی ئەوەکە پێویستی بە بەندەرێکی سەرچۆم هەبوو. سەرەڕای ئەوانەش، لە ئاکامدا چکسلەواکیا پارچەزەویەکی باشی لە مەجارستان بە حەشیمەتێکی نزیک بە یەک ملوێن مەجاریەوە پێبڕا.٥٣٣

بێجگە لەمانە چکسلەواکیا لەسەر سێ سووچی تێسچێن، شوێنێک کە سیلێسیای سەروو لێواری ڕۆژئاوای گالیسیای دەگرتەوە، لەگەڵ پۆڵەندا کێشەی هەبوو. وەک بەشێک لە مەجارستان-ئوتریش، تێسچێن ئامادەی قەپاڵێک بوو. ئەوە خەڵاتێکی بەنرخ بوو، بەشێکیان لەبەرهۆی ئەوە کە لە کۆتایی کانگای گەورەی خەڵووزی سیلیسیا هەڵکەوتبوو، بەشێکی تری دەگەڕاوە بۆ ئەوە کە دووڕیانێکی سەرەکی ڕێگەی شەمەندەفەڕ بوو، شوێنێک کە هێڵەکانی سەرەکی باکوور-باشوور و ڕۆژهەڵات-ڕۆژئاوا لە ناوەندی ئورووپادا یەکیان دەگرتەوە. لە پاریس، دمۆوسکی لەسەر بەڵگەکانی ڕەگەزی داوای دەکرد بۆ پۆڵەندا. (لە کۆی حەشیمەتێکی نیو ملوێن کەسی، پێدەچێ پۆڵەندیەکان ژمارەیان دوو یان یەک ئەوەندەی چکەکان بوو‌بێت.) ئەو

دەبکەوت کە زۆرینەی پۆڵەندیەکان باش بارهاتبوون و لە ئاکامدا باری نیشتمانپەروەریان زۆر لەسەرەوە بوو. بێنێش ئەو ژمارانەی کە ئەو ڕایگەیاندبوون ختیە ژێر پرسیارەوە: ژمارەیەکی زۆر لە پۆڵەندیەکان دانیشتوانی کاتی ناوچەکە بوون، کە شێوازی مەزنتری ژیان ئەوانی ڕاکێشابوو یان ئەوەندە لەژێر کاریگەری زمان و کولتوری چکی دابوون کە چیتر پۆڵەندی نەدەمانەوە. ئەو ئاماژەی دەکرد بەو جل و بەرگانەی کە خەڵکی تێسچێن لەبەریان دەکرد و بە هونەری بیناسازی ئەوان. و خەڵووزی تێسچێن بۆ پیشەسازی چک گرنگایەتیەکی یەکجار زۆری هەبوو، وەکوو هێڵی ڕێگای شەمەندەفەر کە، چوون هەردوو نیوەکەی چکسلەواکیای پێکەوە گرێدەدا، نەدەکرا دوور لەمەترسی بکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی پۆڵەندیەکانەوە. نوێنەرانی خەڵکی خودی تێسچێن کە داوای وڵاتێکی سەربەخۆیان دەکرد هەرگیز دەرفەتێکیان بۆ نەڕەخسیبوو.٥٣٤

وەکوو زۆربەی باسەکانی تر کە ئاجێندای ناو پاریسیان درووست کردبوو. ئەمەیان دەکرا بەبەراورد لەگەڵ ئەوانی تر ئاسانتر داکووژایا. ماساریک و پادێرێویسکی هاوینی پێشتر لە واشنگتۆن کۆببوونەوە و هاتبوونە سەر ئەوە کە ئەم باسە دەبێ کاتێکە شەڕ کۆتایی پێهات بەشێوەیەکی دۆستانە تاووتوێ کرێت. لە خودی تێسچێن پۆڵەندیەکان و چکەکانی ناوچە کاتێکە زانیان بەڕێوەبەرایەتی ئوتریشی نەماوە دابەشکردنی بەرپرسایەتیان بەباشی تاووتوێ کرد. حکوومەتی تازەی پۆڵەندی، کە لەڕابردوودا ژیرانە هەنگاوی نەنابوو، ڕایگەیاند کە هەڵبژاردنەکان بۆ پەرلەمانی تازە لە ڤۆرشۆ بەشی پۆڵەندی تێسچین دەگرێتەوە. حکوومەتی پۆڵەندی لە پراگ بەتوندی وڵامی دایەوە و لە کۆتایی مانگی ژانویەی ساڵی ١٩١٩دا دەستووری بە هەمووی هێزەکانی پۆڵەندی دا کە بەپەلە تێسچێن چۆڵ بکەن. چکەکانیش هەورو لەڕووی بێ ئەقڵیەوە چەندین ئەفسەری هاوپەیمانیان هاندا تا ئەم هەستە بخەنە وڵاتەوە کە گوایە ئەم دەستوورە لەلایەن هاوپەیمانانەوە ڕاگەیەنراوە. گولەکان تەقێنران و ئەو کەش و هەوا ناخۆش و چەتوونە قەیرانێکی گەورەی لێکەوتەوە چون هەردوو حکوومەتەکە هێزەکانی خۆیان کێشا ناوەوە. پرۆفیسۆرێکی ئەمەریکی کە سەردانی ماساریکی لە پراگ کردبوو ئەوی شەکەت و وەڕەز هاتە بەرچاو. ئەمەریکیەک لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە " بەشێوەیەک ئەو هەستەم لەناو خەڵکدا بڵاوکردەوە کە ئەو زیاتر ڕێبەرایەتی کراوە تاکوو ئەوەکە بۆخۆی ڕیبەرایەتی کردبێت، و ئەو بەگشتی لەبابەت کێشەکەوە دڵخۆش نیە."٥٣٥

لە پاریس، شوێنێک کە ئاشتیکەران سەرقاڵی کۆمەڵەی گەلان و پرسی ڕووسیە بوون، سەرهەڵدانی ئەم قینەبەرایەتیە لەنێوان هەردوو زلهێزی دۆستدا دابڕانێکی ناخۆش بوو. دواتر هەر لەو ساڵەدا بوو کە لیۆد جۆرج لە ئەنجوومەنی پیرانی پرسی کە " چەند کەس تاکوو ئێستا سەبارەت بە تێسچێنەوە شتێکیان

بیستوە؟ نامەوێت بڵێم کە من هەرگیز سەبارەت بەوە شتێکم نەبیستوە." شۆڕای عالی پۆڵەندیەکان و چکەکانی بانگێشت کرد. هەرکامیان ئەوی تریانی سەرلۆمە دەکرد، و بێنێش لەو دەرفەتە کەڵکی وەرگرت تا ئەو هۆکارانە بێنێتە بەرباس "-ئاماری، مێژوویی و ئابووری"- کە بۆچی تێسچێن تایبەت بوو بە چکسلەواکیا. لیۆد جۆرج بەتوندی دەنگی دایە و پێی وت کە بێ دەنگ بێت. ئاشتیکەران کۆمیسیۆنێکی تایبەتی نێو-نەتەوەیان دامەزراند، کە هەردوو لا بە نابەدڵیەوە قەبووڵیان کرد.٥٣٦

کۆمیسیۆنەکە بڕیاری دا کە ئاگربەستێکی هەمەچەشن بێنێتە کایەوە، بەڵام دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەک کارێکی هەروا ئاسان نەبوو. لیۆد جۆرج دانی بەوەدا هێنا کە ئەو خۆی زیاتر بە هاوخەمی پۆڵەندیەکان دەزانێت. ویلسۆنیش وتی کە ئەویش هەرهەمان هەڵوێستی هەیە. کاتێکە گرووپێک لە گوندنشینانی پۆڵەندی لە ئۆفیسەکەی ئەو دەرکەوتبوون تا لێ بپاڕێنەوە کە ئەوان نەکا بە بەشێک لە چکسلەواکیا ئەو کەوتبوە ژێر کاریگەریانەوە. ئەوان بەویان ڕاگەیاند کە بۆ ئەوەی بگەن بە پاریس شەست مایل بەپێیان ڕێگەیان بڕیبوو تا گەیشتبوونە نزیکترین وێزگەی ڕێگەی شەمەندەفەڕ. فەڕەنسەیەکان، کە بەگشتی پشتگریان لە پۆڵەندا دەکرد، لەم بۆنەیەدا پاڵپشتیان لە چکەکان کرد و بیانوەکەشیان ئەوەبوو کە پۆڵەندا دەتوانێ بەبێ تێسچێن دەوام بێنێ بەڵام چکسلەواکیا، وەک بەشێکی پێویست لە قەڵای پارێزەریدا دژ بە بۆلشویزم، نەیدەتوانی. بێنێش بۆ مەبەستی وروژاندنی تاقمی بۆلشویکی ئەوەی کە لە دەستی هات کردی؛ ئەو ئاگاداری ڕاگەیاند کە گوایە ئاگربەست تەنیا هێزە نادیارەکانی دژە-بۆلشویکی لە بەرلین، ڤیەن و بووداپێست دەورووژێنێت و هانیان دەدات. بەرپرسانی چکی ئەونده نەدەبوو کە پەردەیان لەسەر سیخۆران و ئاژاوەچیەکانی خۆیان هەڵدابۆوە و سەریان لە نامیلکەکان و خەریتەکانی ئەوان دەرهێنابوو.٥٣٧

کۆمیسیۆنی نێوان-هاوپەیمانی پێشنیارێکی ئەوتۆ و بەکەڵکی پێشکەش بە ئاشتیکەران نەکرد. ئاماژەی بەوەکردبوو کە دابەشکردنی ڕگەزی تێسچێن سنوورەکەی لە ناوەڕاستی کانگا خەڵووزەکانەوە دادەنا. ئاڵتێرناتیڤگەلێکی پێشنیار دەکرد کە پۆڵەندیەکان یان چکەکان یان هەردووکیانی دەتاراند. لە مانگی ئاڤریلدا ئاشتیکەران پادێرێویسکی و بێنێشیان هاندا کە ڕاستەوخۆ پێکەوە دانیشتن و قسە بکەن. کاتێکە وتوێژەکان لەئامدا بە ئەنجامێک نەگەیشتن، ئاشتیکەران ڕوویان کردە پرسی ڕای گشتی. لە هاوینی ساڵی ١٩١٩دا حکوومەتی پۆڵەندی، کە لای وابوو دەیباتەوە، ڕەزایەتی دا؛ چکسلەواکیەکان، چون پێچەوانەی ئەمە بیریان دەکردەوە، ڕەزایەتیان نەدا. ساڵێک دواتر چکەکان، کە لە بەشەکەی خۆیان لە تێسچین سەرقاڵی پرۆپاگەندە بوون، هەرهەموویان لەگەڵ ئەوەبوون کە لەگەڵ دانیشتوانی ناوچەکە ڕاوێژبکرێت، بەڵام پۆڵەندیەکان

بڕیارێکی تریان لە مێشکدابوو. مانگرتنەکان و گێرەشێوێنیەکان بەرگریان لە هاتنەئارای دەنگدانێک کرد و لە مانگی ژوولای ساڵی ١٩٢٠دا لە ئاکامدا زلهێزەکان بڕیاری خۆیان ساخ کردەوە. چکسلەواکیا دەستی بەسەر کانزاکانی خەڵووزدا گرت. شاری بچووکی تێسچین کرا بە دوو لەتەوە؛ بەشی کۆنی درا بە پۆڵەندا و گەڕەکەکان لەگەڵ وێزگەی شەمەندەفەڕ درا بە چکسلەواکیا. ولاتێکیان کارگەی هێزی کارەبای پێ برا، ئەوی تریان کارگەی گاز. ئەوە جۆرە دانووستانێک بوو کە سەراسەری ئورووپای ناوەندی گرتبۆوە چون ناسیۆنالیزمی ڕەگەزی پێشکەوتوو خۆی بەسەر جیهانێکی کۆنتر و جیاوازدا سەپاندبوو. و دوو نەتەوەیەک کە دەبوایە دۆستی یەکتر بوونایە ئێستا کەوتبوونە ئەزیەت و ئازاری یەکتر.٥٣٨

پۆڵەندا بیری لە داگیرکردنی تێسچێن دەکردەوە بۆ ماوەیەکی کورت بەڵام خەریک بوو هەمووی سامانەکانی دەبوو بە قوربانی شەڕ لەگەڵ ڕووسیە. قەت چکسلەواکیای بەهۆی کەڵکوەرگرتن لەو شەڕە تۆقێنەرە و لەبەرهۆی نەبوونی بەرچاوی هاوخەمی نەبەخشی- واتە، چکەکان دەستیان بەسەر ئەو تەقەمەنیە یەکجار پێویستانەدا گرت کە خەریک بوون بە کەشتی لە ئوتریشەوە دەهاتن. لە ١ی ئۆکتۆبری ساڵی ١٩٣٨دا ڕۆژێک دوائەوە کە ڕێکەوتنامەی موونیخ چکسلەواکیای لە ئەندامەتی خۆی دەرهێنا، حکوومەتی پۆڵەندی خوازیاری گەڕانەوەی تێسچێن بوو. بەدوا ئەوەدابوو کە مەجارستان داوای سلۆڤاکیا و ناوچەکانی ڕۆتێنی کرد لە نشێوەکانی باشووری کارپاتیان.٥٣٩

* * * *

بناخەکانی چکسلەواکیای دیموکراتیکی تازە دامەزراو لەرزۆک بوون. بەبۆچوونی ڕیبەری سوسیالیستەکانی ئوتریشی هاوپەیمانان لە چەندین نەتەوە ولاتێکیان دامەزراندبوو، " کە هەرهەموویان بە ڕق و نەفرەتەوە لە یەکیان دەڕوانی، ئابووری و پێشکەوتی کۆمەڵایەتی و شارستانیەتی ئەوان بەگشتی گیرۆدەی نەفرەت و ناکۆکی نەتەوەیی بوون، و ژیانی جەماوەری بەگشتی زەلیلی دەستی ملهوڕی و زۆرەملێی بوو."لەو شتانەی کە ئەو باسی کردن هەندێکیان ڕاست بوون. لە کۆی حەشیمەتی ١٤ ملوێن کەسی چکسلەواکیا، ٣ ملوێنیان ئەڵمانی بوون، ٧٠٠،٠٠٠کەسیان مەجاری بوون و ٥٥٠،٠٠٠ کەسیان ڕۆتێنی بوون، هاوڕێ لەگەڵ چەند پریشکەیەک لە پۆڵەندیەکان و جیپسیەکان. چکەکان و سلۆڤاکیەکان پێکەوە دووسێهەمەکەی تریان پێک دێنا، بەڵام زۆرشتیان هەبوو کە ئەوانی لە یەک جیا دەکردەوە. ناوچەکانی چک ئاسەواری لێنەبۆوەی دەسەڵاتداریێتی ئوتریشیەکانی پێوەدیاربوو، وەک ئاسەواری مەجاریەکەن بەسەر سلۆڤاکیاوە. چکەکان واهەستیان دەکرد کە ئەوان خەریکن پێشکەوتەیی و شارستانیەت بۆ ناوچەیەکی دووردەست بەخەڵات دێنن، و

سلۆڤاکەکان بەمە قەڵس بوون. چکەکان، کە بە سەر حکوومەتی نیشتمانیدا زاڵ بوون، بەرگریان دەکرد لەبەرانبەر بەخشینی ئۆتۆنۆمیەک بە سلۆڤاکیا کە ماساریک لە پیتزبێرگ زۆر ئازادانە بەڵێنی دابوو، بەو بیانووەوە کە ژمارەی خوێندەوارانی سلۆڤاکیا ئەوەندە نەدەبوو کە بتوانن حکوومەتی خۆیان بەڕێوەبەرن؛ لەوەش گرنگتر ئەوەبوو کە ئەوان نەیاندەویست ئەڵمانیەکان، یان ڕۆتێنیەکان یان مەجاریەکان هان بدەن کە داوای مافی هاوچەشن بکەن.٥٤٠

هەر لە سەرەتای ساڵی ١٩١٩دا هەڕەشەی هاتنەدی شتێک کە بڕیار بوو ڕوبدات ڕاگەیەنرا ئەوکاتەی کە ئابووری سلۆڤاکیا وەرچەرخانێکی کوتوپڕی بەرەو خراپتر بوون بەخۆوەبینی. ئێستا ئیتر لە بازاڕەکانی مەجاری و خەڵووزی مەجاری دابڕابوو. چەوەندەرەکانی تایبەت بە دروستکردنی قەندوشەکر لە کێڵگەکاندا خەریکبوون لەبەین دەچوون و دەڕزین؛ کارگەکانی پاککەرەوە بەستران. چاودێرێکی ئەمەریکی لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە وەرزێران و کرێکارانی سلۆڤاکی دەستیان کرد بە ئاژاوەگەری و گێرەشێوێنی، و بە حکوومەتەی تازە خۆیان لە پراگ ڕاگەیاند کە " ڕێزوسپاسی ئێمە بۆ ئێوە لەبەر ئەوەکە هیچتان نەکردوە. ئێوە دەڵێن کە گوایە ئێوە ئیمەتان لە چنگ چەوساندنەوەی سیاسی مەجاریەکان ڕزگارکردوە کە بەڕاستی خراپ بوون بەڵام ئێستا ئێمە کەوتووینەتە ژێر دەسەڵاتی یاسای جەنگیەوە، ئێمە هیچ کارێکمان نیە، هیچ خواردەمەنیەکمان نیە، ئێمە بە دەست سەرماوسۆڵەوە دەناڵێنین و داهاتووشمان ڕەشە." قەشەکانی ناوچە سەبارەت بەوە کە کاتۆلیسیزم کەوتبوە دەست چکەکانی پرۆتێستان ترس ودڵەڕاوکێی خۆیان دەربڕی. هەر ئەو هاوینە، کاتێکە چکسلەواکیا و مەجارستان تێکهەڵچوون، هێزەپێشڕەوەکانی چکی لەو نزیکانەدا لەلایەن سلۆڤاکەکانەوە کەوتنە بەرهێرش.٥٤١

لە مانگی سێپتامردا، یاریدەدەرێکی نهێنی هاوس ستێفێن بۆنسال میوانداریێتی دوو کەسی سلۆڤاکی وەرگرت، ئەوان گلەییان لەوە دەکرد کە گوایە نەیانهێشتوە لە چکسلەواکیا بێنەدەرێ و دوا سەفەرێکی دژوار لەڕێگای یۆگۆسلاڤیا، ئیتالیا و سوئیس توانیبوویان بگەنە پاریس. ئەوان لە ئەو دەپاڕانەوە کە چاویان بە ڕێبەرەکەی خۆیان، قەشەیەکی نەخۆش بەناوی باوکە ئاندرێژ هلینکا، بکەوێت. کابرای ئەمەریکی و پارێزەری هاوڕێی بە پەلە خۆیان کرد بە شاری پاریسدا، هەر چەند شەقاوێکیان بە شەقاوێک دەبڕی تا نەهێڵن کەس شوێن پێیان هەڵگرێت، تا گەیشتنە دەرگەی دوورەپەرێزی دێرێک. لەناوەوە، بۆنسال هلینکای زەردهەڵگەڕاوی دۆزیەوە، لە خانەیەکی تەریک ڕاکشابوو کتێبی دۆعا و پاڕانەوەی دەخوێندەوە. قەشە باسی لە تارمایەک کرد کە کەوتبوە نێوان ئەو و وڵاتی چکسلەواکیاوە. مەجاریەکان بەگشتی زۆر خراپیان لێدەر

نەهاتبوو. ئەو وتی کە " ئێمە شان بە شانی ماگیارسەکان بووین و بۆ ماوەی هەزار ساڵە کە پێکەوە ژیاوین. هەمووی چۆمەکانی سلۆڤاکیا دەڕژێنە ناو دەستی مەجاریەوە، و هەمووی جادەکانی ئێمە بەرەو بووداپێست، شاری گەورەی ئەوان، دەچن بەڵام کارپاتیانەکان وەک بەربەست کەوتۆتە نێوان ئێمە و پراگ." سلۆڤاکەکان کاتۆلیکی ڕەسەن بوون؛ چکەکان، ئەوەی کە دەیانوت، لەڕووی بێ باوەڕیەوە بوو. بۆنسال زۆر هیوادار نەبوو چون ئەوەی کە ئەوان کردبوویان ئاشتیکەران هەڵیان وەشاندبۆوە. هلینکا بەنارەحەتیەوە وتی کە "خوا سزای لەمن ستاندوە، بەڵام درێژە بە پاڕانەوەی خۆم لەبەرانبەر خوادا دەدەم و بۆ خەڵکەکەم کە بێ تاوان و بێ گوناهن لە ئەو دەلالێمەوە."٥٤٢

لە بیستەکاندا، باوکە هلینکا پارتێکی دروست کرد، پاپیۆلیستەکانی سلۆڤاک، کە لە سلۆڤاکیادا بوو بە گرنگترین هێزی سیاسی. لە مانگی مەی ساڵی ١٩٣٨دا گرووپێک لە سلۆڤاکەکانی ئەمەریکی توانیان سەرکەوتوانە دەقی سەرەکی ڕیکەوتنامەی پیتزبێرگ لە ساڵی ١٩١٩دا بگەڕێننەوە بۆ ئورووپا، و لە کۆڕێکی گەورەدا لە براتیسلاڤا، هلینکا داوای کرد کە حکوومەت ئەو بەڵینیانەی کە ماساریک ڕاگەیاندبوون جێبەجێ بکات. ماساریک ساڵێک بەرلەوە کۆچی دوایی کردبوو و هلینکا لە وەرزی پاییزدا فەوتی کردبوو، کاتێکە ڕێکەوتنامەی موونیخ دواماوەیەکی زۆر بەستراوەبوون کرایەوە. چکسلەواکیا، کە لەلایەن هاوپەیمانەکانیەوە پشتی لێکرابوو، لەهەموو لایەکەوە بە دەست دوژمنەکانیەوە هەراسان ببوو، لەبەرانبەر داواکاریەکانی جێگری هلینکا، باوکە جیسۆف تیسۆ، ملی کەچ کرد و هەر ئەویش لە پاشماوەی چکسلەواکیا ئۆتۆنۆمیەکی تەواوی بە سلۆڤاکیا بەخشی. هیتلێر، کە بۆنی خوێنی لێدەهات، کردیە سەر تیسۆ کە داوای سەربەخۆییەکی تەواو بکات. لە مانگی مارسی ساڵی ١٩٣٩دا، کاتێکە دوژمنانی نازی بەرەو ناوچەکانی چک مارسی سەربازی دەڕۆیشتن وڵاتێکی تازەی سلۆڤاکیا لەدایک بوو. هەمووی سلۆڤاکیەکان یان تەنانەت باوکەخوای نازیەکانیش کە داوای بەختەوەری دەکرد بە شێوازی هاتنەئارای ئەم ڕووداوە خۆشحاڵ نەبوون.٥٤٣

تیسۆ تەمەنی زۆر زیاتر لە دروستکراوەکەی خۆی نەبوو. لە ساڵی ١٩٤٦دا ئەو بەهۆی خەیانەت بە نیشتمان لە چکسلەواکیایەکی بووژاوە، کە ئەم جارەیان، ئیستالین پارێزەری بوو، لەسێدارە درا. وڵاتی تازە بچووکتر و جیاوازتر لەو وڵاتە بوو کە ئاشتیکەران لە ساڵی ١٩١٩دا پەسەندیان کردبوو؛ پارچەکانی ڕۆتێنی نەمابوون، چووبوونە ناوقوڕگی یەکیەتی سۆڤیەتەوە، و ئەڵمانیەکان هەڕایان کردبوو، بە هاندانێکی بەرچاو لەلایەن چکەکانەوە. وەک سەرۆک کۆمار، بێنێشی پیر و نەخۆش

هەوڵی دا، و بە ئاکامیش نەگەیی، تا وڵاتەکەی خۆی لە تۆڕی سۆڤیەت کە لە ناوەندی ئورووپا خەریکی دامەزراندن بوو ڕزگار بکات. ئەو لە مانگی سێپتامری ساڵی ١٩٤٨دا، دوا کوودەتایەک کە کمۆنیستەکانی گەیاندە دەسەڵات، کۆچی دوایی کرد بەڵام نەیتوانی بە چاوەکانی خۆی ئەو کارەساتانەی کە هاتنە ئاراوە ببینێت. کوڕی ماساریک بەناوی ژان، کە سەرۆک وەزیر بوو، لەو کۆدەتایەدا مرد، پێدەچێ لەلایەن نوێنەرانی کمۆنیستەکانەوە لە دەلاقەوە حەوادرابێتە دەرەوە. لە یەکی مانگی ژانویەی ساڵی ١٩٩٣دا، پاشماوەی بیناکەی ساڵی ١٩١٩ پارچەپارچە بوو چون سلۆڤاکیا و کۆماری چک تەڵاقنامەی خۆیان ڕاگەیاندبوو.

# ١٩

# ئوتریش

لـە ٢ی مـانگی ژوونـی سـاڵی ١٩١٩دا، لـە هـۆڵی گـەورەی قـەڵای کـۆنی سـەڵتەنەتی لـە ئیست.جیرمەین-ئـین-لایـە لـە دەرەوەی شاری پاریس تـەدارەکێکی کـورت گـیرا. شاندی نوێنەرایـەتی ئـوتریش، وەک نوێنـەرانی پارچەیـەک کـە کـاتی خـۆی بەشـێک بـوو لـە ئیمپراتـۆری گـەورە، مەرجەکانی ئاشتی خۆیـان لەسـەر مێزێـک کـە بـە فەرشـی سـوور داپۆشـرابوو وەرگـرت، و هاوکـات چەنـدین ڕیـز لـە شاندی نوێنەرایـەتی هاوپەیمانی چاویـان تێبڕیبـوون. سـەرۆک وەزیـری چـک، کـە چەندین ئوتریشی هەر لـەو دەمـەوەی کـە پێکـەوە هاوکـار بـوون دەناسـی، بەفیزێکـەوە پشـتی تێکـردن. دیوارەکان بـە وێنـەی ئاژەڵانێـک ڕازابوونـەوە کـە دەگەڕانـەوە بـۆ سـەردەمی بـەرد و ئێسـتا ئیتـر باویـان نـەمابوو. مـۆرداک، وەک یاریـدەدەری کلیمینجـوو، وەبیری هێنانـەوە کـە " زۆریـەک لـە ئێمـە مانـان شتێکمان لەدەست نایەت بەڵام سەرنج دەنە ئەوە."٥٤٤

وڵاتـی ئـوتریش-مەجارسـتان کـۆی بـەربڵاوی ئـەو ناوچانـەی کـە بـەوردی لـە سـەدەی سـێزدەهەمەوە لەلایـەن هابسـبێرگەکانەوە خرابونـە سـەریەک، خـەریک بـوون بەرلـە سـاڵی ١٩١٤ لێکدەبوونـەوە و هەڵدەوەشانەوە. لـەناو دڵی خۆیدا پێوەندی نێوان ناوچەکانی ئوتریشی (کـە بریتی بـوون کـە سلۆڤێنیا، بۆهێمیا و مۆراڤیـا و هـەروەها ناوچـەکانی ئـەڵمانی) و میرنشـینی مەجارسـتان (کـە بەسـەر سـلۆڤاکیا و کرۆڤاسیا حکوومەتی دەکرد) بـە قـەدەر هێمای (-)یان لێبـبۆوە کـە دوو ناوەکـەی ئـەوانی پێکـەوە گـرێ دەدا. هابێزبێرگـەکان هەمیشـە وایـان بـە مەسـڵەحەت دەزانـی کـە لەگـەڵ مەجارسـتان دانوسـتان بکـەن. لـە سـاڵی ١٨٦٧دا، بەدەسـت شکسـتێک کـە لەلایـەن پڕاشـاوە خواردبویـان لاواز ببـووون، ئـەوان گـەورەترین دانووسـتانیان پێکهێنـابوو: ئیمپراتـۆر ئێسـتا پاشـایەتی دۆئـال بـوو، دۆسـتایەتیەکی نێـوان دوو وڵات، هەریەکەو بە پەرلەمانی خۆیەوە. ئەوان هێشتا هەر یـەک حاکمیان هـەبوو فـرانس جۆسـێف بـەڵام ئـەو لـە

ناوچەکانی ئوتریشی ئیمپراتۆر بوو و لە مەجارستان پاشا. ئەوان یەک ئیستامپی پۆستە و یەک جۆر پارەی وردەیان بەکاردێنا، سیاسەتێکی هاوبەشی دەرەوەیان هەبوو و، بە دەمەقرِەیەکی زۆر لەنێوان نوێنەرانی هەر پەرلەمانێکەوە، خەرجەکانیان دابەش دەکرد. بەواتایەکی تر، هەر یەکەو کاروباری خۆی دەگرتە دەست خۆی. ناسیۆنالیزمی مەجاری تەنیا ناسیۆنالیزمێک نەبوو کە لە دەیەکانی بەرلە ساڵی ١٩١٤دا بەرەنگاری ئیمپراتۆریەت دەبۆوە. لە باکوور، پۆڵەندیەکان و چکەکان خەریک بوون دەورووژان و لە باشوور ئیتالیەکانی باشوور خەریک بوون بۆ ئەوەی لەگەڵ ئیتالیای تازەیەکگرتوو پێوەندی بگرن دەکەوتنەخۆ. سێربەکان، سلۆڤێنەکان و کرۆواتەکان باسیان لە ئۆتۆنۆمیەکی گەورەتر دەکرد، یان باشتر بڵێین لەوانەیە وڵاتێکی سلاڤی باشووری تایبەت بەخۆیان. ئەگەر مەجارستان ئۆتۆنۆمی هەبوو، ئەی ئەوانیتر بۆدەبێ نەیانبێت؟ فرانس جۆسێف، کە لەژێر کاریگەری ئامانجی گەورە بەلام سادەی بەدەستەوەدانی ئەوەیکە ئەو بۆ جیگرەکانی بەمیرات پێ گەیشتبوو، هەنگاو-بە-هەنگاو خۆی دا بە دەست داواکاریەکانی ناسیۆنالیستیەوە تا لە باڵاخانەی یەکیەتی ئیمپریالیستی پارێزگاری بکەن. لە هەردوو پەرلەمانەکەی خۆیدا، یەکیان لە ڤیەن و ئەویتریان لە بوداپێست، نوێنەران جارلەگەڵجار زیاتر خۆیان بەدرێژایی هێڵەکانی نەتەوەییدا رێک دەخست.

لە ساڵەکانی دەیەی ١٨٩٠دا، ئیمپراتۆری پیر بەسەرئەوەشدا لەگەڵ کێشەیەکی تر ڕووبەڕوو ببۆوە، لەلایەن پارتی تازەی سۆشیال دیموکراتی ئوتریشیەوە. هاندراو لەلایەن کارڵ مارکسەوە و بە کشان بەلای چینی کرێکاری ڕوولەگەشەی پیشەسازی و هەروەها لیبراڵەکانی مامناوەندی لە شارە گەورەکاندا، ئەو پارتە لەناو ئیمپراتۆریەتێکی چاکسازیکراودا داوای شۆڕشی جیهانی دەکرد. دوکتۆر کارڵ رێنیر، کوڕێکی وریا و لێهاتووی گوندنشینێکی مۆراڤی، لێکۆڵێنەرێکی ناوداری سوسیالیستی لەسەر پرسی نەتەوەیی و نوێنەرێکی بەرجەستەی سوسیالیستی تایبەت بە ساڵی ١٩٠٧ بوو، هەڕەشەی تێکدەرانەی ناسیۆنالیزمی بەهیچ زانی. ئەو ڕێگەچارەیەکی تازەی پێشنیار کرد: هەر تاکێک دەچێتە چوارچێوەی نەتەوەیەکەوە و هەر نەتەوەیەک جەستەیەک بەپانتایی ئیمپراتۆریەتێکی پێدەدرێت کە چاودێری ئەو بابەتانە دەکات کە لای ناسیۆنالیستەکان خۆشەویستن وەکوو کولتوور و پەروەردە. ئەو لەوپەڕی سنوورەکانی کاتەوە قسەی دەکرد-یان ڕەنگە زۆرپێشتر لە ئەوانەوە. ناسیۆنالیستەکانی ناو ئوتریش-مەجارستان، وەکوو شوێنەکانی تر، ڕۆژلەگەڵ ڕۆژ زیاتر خوازیاری وڵاتانی خۆیان بوون. تەنانەت پارتەکەی خۆشی، دێموکراتەکانی سۆشیال، لە هەموو باسەکانی تایبەت بە یەکخستنەوەی چینی کرێکار، لەژێرکاریگەری ڕکابەرانی ناسیۆنالیستیدا بوو.

لە دوایەمین ساڵەکانی ئاشتیدا، ئوتریش-مەجارستان لە قەیرانێکی سیاسی و دەستووری بەرەو یەکی تر هەنگاوی دەنا. کاونت ئۆتۆکار سزێرین، یەکێک لە دوایەمین وەزیرەکانی دەرەوەی ئیمپراتۆریەت، وتی کە "ئێمە مەحکووم بە مەرگ بووین. ئێمە لە هەڵبژاردنی شێوازی مەرگی خۆماندا ئازاد بووین، و ئێمە دڕندانەترین شێوەمان هەڵبژارد." بۆرۆکراسیەتەکانی میلیتاری و نا میلیتاری، کە قەت لە باشترین کاتەکانیشدا کارامە نەبوون، لەژێر گوشاری شەڕدا لە یەک دابڕان، و ڕکابەرانی نیشتمانی بەربوونە قینەبەرایەتی لە یەکتر: ئەڵمانیەکان لە مەجاریەکان و سلاڤەکان لە هەرکیان. لە ساڵی ١٩١٥ بەم لاوە، کاتێکە چکەکان، بۆ وێنە، لەخۆیان پرسی کە لەبەرچی ئەوان بۆ ئەفسەرانی ئەڵمانی یان مەجاری دژ بە هاووڵاتانی سلاڤ شەڕ دەکەن هاتنەدەرەوە لە سووپا بەشێوەیەکی بەرچاو پەرەی سەند بەتایبەت کاتێکە شەڕ خەریک بوو بۆ ئوتریش-مەجارستان بە لای خراپیدا دەگرا. لە نیوەی دووهەمی ساڵی ١٩١٦دا، ڕووسەکان لە گالیسیا سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەست هێنا و ڕۆمانیەکان بەپاڵپشتی لە بەرەی هاوپەیمانیەوە لە شەرەوە ئالان، و بۆ ماوەیەکی کورت دەستیان بەسەر ترانسیلڤانیادا گرت. هێزەکانی هاوپەیمانی لەو هەل و مەرجە ڕزگاریان بوو بەڵام ئاکامەکەی ئەوە بوو کە مەجارستان-ئوتریشی وەک هاوڕێی پلەخوارتر لە هاوپەیمانیدا هێشتەوە. کاتێکە حکوومەتی ئۆتریش کردیە سەر ئەڵمانیا کە سەیری ئاشتیەکی وتوێژکراو بکات، لەگەڵ سووکایەتی و کەمتەرخەمی ڕووبەڕوو بۆوە.٥٤٥

لە مانگی نوامری ساڵی ١٩١٦دا، ئیمپراتۆری کۆن، هێمایەکی زەردهەڵگەڕاو لە ڕۆژانی خۆشی، لە ئاکامدا کۆچی دوایی کرد. ڕۆژبەدوای ڕۆژ زیاتر ئاشکرا دەبوو کە خەڵکانی دانیشتووی ژێردەسەڵاتی ئیمپراتۆریەت لە شەڕ وەڕەز بوونە و، لەوەش مەترسیدارتر، وەڕەزبوون لە دەستووری کۆن بوو. لە مانگی فەوریەی ساڵی ١٩١٧دا هەواڵەکان لە ڕووسیەوە هۆشداریان دەدا کە ئەم کەش و هەوایە ئاکامەکەی بەرەوکوێوە دەچێ. سزێرین هەڕەشەی کرد کە "ئەگەر بێتو پاشاکانی هێزەکانی ناوەندی نەتوانن *لەماوەی چەند مانگی داهاتوودا* بە ئاکامێکی ئاشتیانە بگەن، خەڵک بەسەر سەریانەوە بەو ئاکامە دەگەن."٥٤٦ ئیمپراتۆری تازە، کارێل، لاوێکی ماقووڵ و ڕێک و پێک، خاوەن هەستەکانی ئاشتی نارد بۆلای هاوپەیمانان، و زۆر بە وورىایەوە هەنگاوی دنا تا لە ئەڵمانیای بشارێتەوە. ئەمە نەیتوانی بەگشتی بە هیچ ئاکامێک بگات چون ئیتالیەکان، کە دەبوایە لە شکستی تەواوی دەوڵەتی ئوتریش-مەجارستان زۆرشتیان گیرکەوتایە، بەتوندی دژی ئاشتیەکی یەکلایە نەبوون. لە ساڵی ١٩١٨دا، ئیمپراتۆریەت نزیکەو کۆتاییبوونی بوو. مانگرتنەکان شارەکانیان لە جموجۆڵ خستبوو، چەندین کەرتی هێزی دەریایی لە ئاندریاتیک هەڵگەڕابوونەوە و سووپا

زۆریەک لە سەربازەکانی لەدەست دا. بەرپرسان هیچ دەرەتانێکیان نەمابوو و بەچاوانی خۆیان دەیاندیت کە نوێنەرانی چک و سلاڤی باشوور بەئاشکرا داوای وڵاتانی سەربەخۆی خۆیان دەکرد و لە سەراسەری پارێزگاکاندا خۆپیشاندەران بۆ پاڵپشتی کردن ڕژابوونە سەرشاقەمەکان. هەر هەمان مانگی ئۆگست، چکەکان، پۆڵەندیەکان و سلاڤەکانی باشوور لە شاری باشووری لجوبلجانا کۆبوونەوە تا داوای ئازادی پیرۆزی خۆیان بکەن. هاوپەیمانان، کە تا ئەو کاتە پێداگریان لەوەکردبوو کە ئەوان خوازیاری لەبەینبردنی وڵاتی ئوتریش-مەجارستان نین، لەوکاتەدا ئیتر هیوایەکیان نەمابوو و دڵسارد ببوون. هێماکان لەوێ بۆ دۆست و دوژمن وەک یەک داندرابوون کە چاویان لێبکەن: پشتگری هاوپەیمانی بۆ پۆڵەندایکی سەربەخۆ (بەشێوەیەکی سەرسووڕهێنەر لە چاردە خاڵەکەی ویلسۆندا)، بەفەرمی ناسینی شۆڕای نیشتمانی چکسلەواکی لە مانگی ژوەنی ساڵی ١٩١٨ لەلایەن فەرەنسەوە، ڕاگەیاندنەکەی ویلسۆن هەر لەو مانگەدا بەو مانایە کە "هەمووی لقەکانی ڕەگەزی سلاڤ پێویستە بە تەواوەتی لە دەسەڵاتی ئوتریشی و ئەڵمانی ئازادکرێن." بۆ لەهیستانیەکان، چکەکان، ڕۆمانیەکان، سلۆڤاکەکان، سلۆڤێنیەکان یان کرۆواتەکان، دەرگاکانی بەندیخانە خەریک بوون دەکرانەوە، جا ئایا ئەوان ئامادەیی ئەوەیان هەبوو هەڕا بکەن یان نا.٥٤٧

لە ١٥ی مانگی سێپتامری ساڵی ١٩١٨دا، کارێل، کە سووپاکانی ڕوولەنابوودی بوون، بەرەنگاری هاوپەیمانی ئەڵمانی خۆی بۆوە و تکایەکی گشتی بۆ کۆڕێکی ئاشتی بڵاوکردەوە. هاوپەیمانان، کە سەرکەوتنیان لەبەردەمی خۆیاندا دەدی، پێشنیارەکەیان ڕەدکردەوە. دوو حەفتە دواتر، دوا ئەوە کە بۆلغارستان لە شەڕ دەرکرایە دەرەوە، ئەڵمانیا هاتە سەر ئەوە کە هاوپەیمانی دۆئال دەبێ داوای ئاگربەستێک بکات. لە ٣ی مانگی نوامردا نوێنەرانی وڵاتی ئوتریش-مەجارستان ڕێکەوتنامەیەکی ئاگربەستیان واژۆکرد. لە لایەکەوە کاریل چاوەڕوانی کۆتایی هاتنی شەڕەکە بوو، لەلایەکی ترەوە ئەو تۆڕانەی کە ئیمپراتۆریەتەکەی ئەویان پێکەوە گریدابوو لە ئاکامدا لە یەک پچڕان. یەک بەدوای یەکدا نەتەوەکان سەربەخۆیی خۆیان ڕاگەیاند: پۆڵەندیەکان لە ١٥ی ئۆکتۆبردا، ڕۆتێنیەکان لە ١٩ی ئۆکتۆبردا، و سلاڤەکانی باشور لە ٢٩ی ئۆکتۆبردا. لە ٢٨ی ئۆکتۆبردا چکی سەربەخۆ و حکوومەتەکانی مەجاری لە پراگ و بووداپێست کابینەیان گرتەدەست. دوو ڕۆژ دواتر، نوێنەرانی ئوتریشی ئەڵمانی-ئاخێوەر لە پەرلەمان لە ڤیەن حکوومەتێکی ئوتریشی-ئەڵمانیان بۆ پاشماەی ئیمپراتۆریەت دابین کرد. دمۆکراتەکانی سۆشیال، کە لە ڤیەنای شۆڕشگێر قودرەتێکی تایبەتیان هەبوو، ئۆفیسە سەرەکیەکانیان گرتەدەست. ڕێنێر بوو بە یەکەمین سەرۆکی کۆماری تازەی ئۆتریش.

بێ ئەوەی بیڵێ کەسێک بزانێت، کارێل لە ١١ و ١٣ی مانگی نوامردا دەستی لە حکوومەتەکەی هەردوو نەوەی ئیمپراتۆریەتەکەی خۆی هەڵگرت. هەوڵێکی بێ ئەنجامی دا تا جێگری بۆ میراتگرەکانی خۆی زیندوو بێڵێتەوە و بەشێوەیەکی فەرمی وازهێنان لە لورسی دەسەڵاتی ڕانەگەیاند. ئەو نازناوەکانی خۆی، بەرهەمەکانی زۆربەی ژیانە هاوبەشیەکانی خۆی، مامەڵەکان و سەرکەوتنەکان، هەڵگرت: ئیپراتۆری ئوتریش؛ پاشای مەجارستان، پاشای بۆهێمیا، پاشای دالماتیا، کرۆواسیا، سلۆڤێنیا لۆدۆمێریا، گالیسیا، و ئیلیریا؛ ئارکدووکی ئوتریش؛ دووکی لۆترینگیا، سالزبێرگ، ستیریا، کارینسیا، کارنیۆلا و بۆکۆڤینا؛ گراند دووکی ترانسیلڤانیا؛ مارگرەیڤی مۆراڤیا؛دووکی سیلیسیای سەروو و خواروو، دووکی مۆدینا، پارما، پیاسینزا و گواستیلا، ئۆسچویتز و تیرۆل؛ و هتد و هتد. هەر هەموویان بەسەرچوون، و بۆخۆشی لە ئاکامدا لە ساڵی ١٩٢٢ بە نەخۆشی مادەیرای ئانفلۆوانزا گیرۆدەبوو و ئیتر هەڵنەستایەوە. لە مانگی مارسی ساڵی ١٩٨٩دا، چەند مانگێک بەرلەوەی دابەشبوونی ئورووپا بە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا کۆتایی پێ بێت، ژنە ئیمپڕاتۆریەکەی، زیتا، کۆچی دوایی کرد.

چون ئاشتیکەران سەرقاڵی پۆڵەندا، چکسلەواکیا، یۆگۆسلاڤیا و ڕۆمانیای دڵخۆشکەر بوون زۆر بە ئوتریش-مەجارستان بایەخیان نەدەدا. کۆمیسیۆنەکانی ناوچەیی کە سنووری تازەکانیان دادەڕشت وایان دانابوو کە، وەکوو هەمووکەسێکی تر، ئوتریشی بچووک، کە تواوبۆوە و تەنیا ناوچەکانی ئەڵمانی-ئاخێوەری لێمابۆوە، و مەجارستان، کە تازە لە میرنشینی کۆنی کرۆواسی و سلۆڤاکیا جیاکرابۆوە، متەقیان لێوە نەدەهات، و ئامادەی ئەوە بوون کە دابەش بکرێن. بەپێی یاساکانی خود-موختاری، چ شتێک بۆ مەجارستان و ئوتریش باش بوو، چ شتێک پێویست بوو ئەگەر ئەوان بیان ویستیایە دەوام بێنن، ئەمانە ئەو پرسیارانە بوون کە لە پاریس هیچ دڵەڕاوکێیەکیان دروست نەدەکرد. هیچکام لەو وڵاتانە تەنانەت کۆمیسیۆنی تایبەت بە خۆشیان نەبوو.

بە کۆتایی هاتنی شەڕ بەشی گەورەتری ئیمپڕاتۆری کۆن گۆڕابوو و ببوو بە دۆست. ئەمە پرسیارێک دژواری ئاراستە دەکرد. کێ بڕیاربو قەرەبوەکانی ئوتریش-مەجارستان بگەڕێنێتەوە؟ پۆڵەندا یان چکسلەواکیا یان یۆگۆسلاڤیا؟ بێنێش بەتوندیەوە ڕایگەیاند کە " کەی ڕەوایە ئێمە بەرپرسی هەڵگیرساندنی شەڕێک بین کە خۆمان مەحکوومی دەکەین."٥٤٨ هاوپەیمانان کۆک بوون لەسەر ئەوە، کە تەنیا ئوتریش و مەجارستانی وەک دوژمن دەهێشتەوە، کە هەردوو وڵات لە ناوەڕاستی ئیمپراتۆریەتدا پێکەوە گرێیان خواردبوو. نوێنەرانی ئەو وڵاتانە دیانگوت کە نابێ ئەوان وەک میراتگرانی ئەو ئیمپڕاتۆریەتە سەیر بکرێن. وەک سەرۆک وەزیری ئوتریش. کارێل رێنێر، وەبیری ئاشتیکەرانی هێنایەوە، کە ئیمپڕاتۆریەتی کۆن لە

مانگی نوامری ساڵی ١٩١٨دا کۆچی دوایی کردبوو. ئەو هەر ئەو ڕۆژە لە مانگی ژوەندا وتی کە " ئێمە وەک یەکێک لە پارچەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕووخاو و شکستخواردوو لەپشت ئێوە وەستاوین." ئوتریش وڵاتێکی تازەبوو. " بە هەمان چەشنی وڵاتانی نیشتمانی تر کۆماری تازەی ئێمەش ڕێچکەی ژیانی گرتۆتەبەر، کەوابوو چیتر ئەم وەک وەکوو ئەوانەی پێشوو ناکرێ وەک جێگری پاشای کۆچکردوو سەیری بکرێت." پسپۆڕانی یاسایی بەریتانیا لایان وابوو کە ئەمە ماناداره. ئیتالیەکان، کە هیواداربوون لەسەر تێچووی ئوتریش شتێکیان دەسکەوێت، لایان وانەبوو.٥٤٩

هەم ئوتریش و هەم مەجارستان هانایان بردە بەر ئاشتی و تەبایی. ئەوان دانیان بەوەدا دەنا کە لە ڕابردوودا هەڵەکاری،و تەنانەت شڕی و دڕی، هەبوە بەڵام ئەمانە تایبەت بە ئەوان نەبوون. ئەوان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە وەکوو ئەڵمانیا سەرلەنوێ ژیانی تازەیان دەستپێکردۆتەوە و خۆیان خاوێن کردۆتەوە. ئەوان بەدەست ڕەژیمە کۆنەکانەوە ڕزگاریان ببوو و ئێستا یاسا پیرۆزەکانی ویلسۆنیان بەدڵ و بەگیان لەباوەش دەگرت. ئەمەریکیەکان دڵسۆزانە گوێیان شل کردبوو. ویلسۆن بەتەمابوو ئوتریش لە کۆمەڵەی گەلاندا ببینێتەوە هەرکە گرێبەستەکەی واژۆکرد. ئورووپایەکان توندوتیژتر بوون: پێویستە ئوتریش و مەجارستان بەرپرسایەتی شەڕ بگرنە ئەستۆ، وەک چۆن ئەڵمانیا گرتبویە ئەستۆ، و هەر لەسەر ئەو بنەمایە بۆ دەستگیرکردنی تاوانبارانی جەنگ و گەڕانەوەی قەرەبووەکان ئامادەبوونی خۆی ڕاگەیەنێت. کاتێکە ئوتریش پرسیاری چەتوونی بەرپرسایەتی بەشەکانی تری ئیمپراتۆریەتی کۆنی ئاراستەکرد، هاوپەیمانان بە سووکیەوە وڵامیان دایەوە کە ئوتریشیەکان لە هەموو کەس بەسۆزتر پشتگریان لە شەڕ دەکرد: "پێویستە ئوتریش بەرپرسایەتی هەمووی ئەو جەنایەتانەی کە جیهانی بە کارەساتی لەوچەشنە تێک ومەکان داوە بگرێتە ئەستۆی خۆی."٥٥٠

ئەوەی ڕاستی بێت، تەنانەت ئورووپایەکانیش ئامادەیی ئەوەیان هەبوو کە لەبەرانبەر ئوتریشدا بە بەراورد لەگەڵ مەجارستان نەرم و نیانتر بن. هەرچەند دەوڵەتی ئوتریش-مەجارستان ئەوەندەی ئەڵمانیا بەرپرس بوو لە نانەوەی ڕووداوە کاولکەرەکان کە ڕێگایان بۆ سەرهەڵدانی شەڕ لە ساڵی ١٩١٤دا خۆش کرد، تا ساڵی ١٩١٨ تەنانەت دوژمنەکانیشی زیاتر وەک دۆستێکی پلەخوارتر دەیانناسی، کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر دەچووە ژێردەستی ئەڵمانێکی دەستدرێژکەر کە لەسەر داگیرکردنی ئورووپا سووربوو. هەوڵە پڕمانا بەڵام سەرنەکەوتووەکانی ساڵی ١٩١٧ لەلایەن ئیپراتۆری تازەوە بۆ مەبەستی دەستپێکردنی دانووستانەکانی ئاشتیانە کاریگەریەکی لەباری لانی کەم لەسەر بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان دانا.

ئوتریش زۆرزیاتر لە مەجارستان بە دوای شەڕدا لەم شێوەتێڕوانینە قازانجی برد. لیۆد جۆرج لە کۆڕی ئاشتیدا هیچ جۆرە دژایەتیەکی لەگەڵ نەکرد. کلیمینجوو، کە براکەی لەگەڵ ئۆتریشیەک ژیانی هاوبەشیان درووست کردبوو، بەرلەوەی شەڕ دەست پێبکات ماوەیەکی زۆری لەوێ ڕایبواردبوو. وەکوو زۆربەی نیشتمانپەروەرانی هاوڕێی، ئەو لای وابوو کە ئوتریش-مەجارستان خۆی شێت کردبوو لەوەکە لەگەڵ ئەڵمانیا پەیمانی دەبەست، بەڵام ئەو تا ماویەکی زۆر دوا شەڕەکە چالاکانە لەپێناو هەڵوەشانەوەی ئەو دەوڵەتەدا تێوە نەچووبوو. ئۆرلاندۆ بەسەرسووڕمانەوە باسی ئوتریشی دەکرد لەوەکە لەکاتی شەڕدا ببوو بە دوژمنی سەرەکی ئیتالیا، بەڵام سیاسەتی ئیتالیایی سیاسەتێکی ناکۆک بوو. ئوتریش لە ڕابردوودا هەم دوژمن بوو و هەمیش هاوپەیمان. ئیتالیا خوازیاری ئەوەبوو کە ناوچەی ئوتریشی بگرێت، بەتایبەت لە تیرۆل، بەڵام خوازیاری ئەوە نەبوو کە یۆگۆسلاڤیا کاری لەوچەشنە بکات. دیپلۆماتەکانی ئیتالی حکوومەتی ئوتریشیان تێگەیاند کە، ئەگەر هیچ هەراوهۆریایەک لەسەر تیرۆل ساز نەبێت، لەوانەیە هەردوو وڵات بتوانن پێکەوە پەیوەندیەکی ئابووری ببەستن.٥٥١

مەجارستان باسێکیتر بوو. مەجارستان لە ساڵی ١٩١٩دا چووە سەر باوەڕی بۆلشویکی، بەڵام ئوتریش هەر سوسیالیست مایەوە. ئەو لەگەڵ زۆربەی دراوسیکانی کەوتبوە شەڕەوە، بەڵام ئوتریش لە ئاشتیدا دەژیا. مەجارستان مافی خۆی بوو سزابدرێ، بەڵام ئوتریش مافی خۆی بوو خەڵات بکرێ. بەپێچەوانەی ئەڵمان و مەجارستان، ئوتریش زۆر چکۆلەتر و زۆر هەژارتر لەوەبوو کە حیسابی هەڕەشەیەکی لەسەر بکرێت. هیچ جۆرە هەستێکی ناسیۆنالیزمی تێدا بەدی نەدەکرا، چون هەرگیز نەببوو بە وڵاتێک، تەنیا بەشێک بوو لە ناوچەکانی هابزبێرگ. لە ساڵی ١٩١٩دا تەنیا وەک هەتیوێکی لێقەوماو وابوو. کێو و دۆڵە سەرنجڕاکێش و ڕووتەڵەکانی ئەوێ بەدەوری پێتەختی شایانەی پێشووی ڤیەن تەمووریان دابوو، و کۆشکە ڕازاوەکان، ژووره گەورەکان، شەقامە ڕازاوەکان، کەنیسە ڕازاوەکان و عەرزە فەرشچنەکانی ئەو پێتەختە بۆ دەسەڵاتدارانی ٥٠ملوێن کەس درووست کرابوون، نەوەک ٣ملوێن. سەرۆک وەزیر لای ئەمەریکیەکی هاوسۆز گلەیی کردبوو کە "ئێمە هەزاران مەقامی ڕەسمیمان هەیە کە زۆر هەست بەپێویستبوونیان ناکرێت و لانی کەم دوسەد هەزار کرێکارمان هەیە. بەڕاستی بۆخۆشمان نازانین لەگەڵ ئەم هەمووە چی بکەین."٥٥٢ نیوەی حەشیمەتی ڤیەن لە ئوتریش دەژیان، بەڵام ئەوندەی لێنەمابوو کە پاڵپشتیان لێبکات.

بەدوای ڕووخانی ئیمپراتۆریەت ئۆرگانیزمی ئابووریەکیش ڕووخا کە ئوتریش لەناو جەرگەی ئەوێدا هەڵکەوتبوو. دانووب، کە ئێستا بۆ ئەوەدەبوو لە دەریای ڕەشەوە بەرەو باشووری ئەڵمانیا کەشتی پێدا بڕوات، لەوێوە تێپەڕدەبوو. چەرخێکی گەورەی کاترین لە هێڵەکانی ڕێگای شەمەندەفەڕ بەدەوریدا

دەسووڕاییەوە، کە دەبەستراوە بە چەرخەکانی تری دەوری بووداپێست و پڕاگ. لە مانگی نوامری ساڵی ١٩١٨دا، تجارەتێک کە خواردەمەنی و کەرەسەی خاوی بۆ ئوتریش دەهێنا و خواردەمەنی درووستکراوی دەدا دەرەوە، بەواتای ڕۆژنامەیەکی ڤیەن، بە یەکەمین داهێنانەوەی تەورێک وەستێندرا. خەڵوز و پەتاتەیەک کە کاتی خۆی لە بۆهێماوە دەهات و گۆشتی گوێلک و گەنمێک کە لە مەجارستانەوە دەهات کەوتبوونە باری پێچەوانەی سنوورە تازەکانەوە. ئوتریش پارەی تەواوی نەبوو تاکوو بیانکڕێت و دراوسێ تازەکانی زۆرمەیلی بەخشینیان نەبوو. لەڕاستیدا، ئەوان بە داواکردنی بەشی خۆیان لە یارمەتیەکانی شایانە سەریان قاڵ بوو: بەرهەمەکانی هونەری، کەرەسەی ناوماڵ، کۆکردنەوەی ئامرازگەلی زانستی و چەک و چۆڵی تەقەمەنی، کتێبەکان، ئارشیڤەکان، تەنانەت تاقیگەکانیش. ئیتالیەکان داوای ئەو بەرهەمە هونەریانەیان دەکرد کە بەرلەوەی ئیتالیا درووست بێت بۆ ڤیەن ڕفێندرابوون و بلژیکیەکانیش داوای نەخشەیەکیان دەکرد کە ماریا تێرێزا بردبووی.٥٥٣

سەبارەت بە کەش و هەوای ناو ئوتریش گوزارشی سەیرسەیر و تۆقێنەر دەگەیشتە پاریس: لەبەینچونی مەڕوومالاتی گوندەکان؛ تاقچە چۆڵ و هۆڵەکانی ناو دوکانەکان؛ بڵاوبوونەوەی پەتای سیل؛ پیاوانی بەرگ شڕ لەبەر؛ هەزاران هەزار بێکار- ئوتریش بە تاقی تەنیا خۆی ١٢٥،٠٠٠ بێکاری هەبوو. کارخانەکان وەستابوون و شەمەندەفەڕەکان و پاسەکان پچڕپچڕ کاریان دەکرد. فەرماندەی سەرەکی پێشووی سووپاکانی ئیمپڕاتۆڕیەت دووکانێکی بچووکی جگەرەفرۆشی دەگێڕا، و ئەفسەرانی پلەخوارتر کەوشیان بۆیاخ دەکرد. منالانی برسی و هەژار لەسەر شەقامەکان دەگەڕان و سواڵیان دەکرد و لە دەرەوەی چێشتخانەکانی سووپ ڕیزی دووروودرێژیان دەبەست. کچانی بنەماڵە ڕەسەنەکانی چینی مام-ناوەندی بۆ بەدەستهێنانی خواردەمەنی و جل و بەرگ خۆیان دەفرۆشت. کاتێکە چەندین ئەسپی هێزی پۆلیس لە یەکێک لە خۆپیشاندانە هەرە توندوتیژەکاندا کوژران، لەماوەیەکی کەمدا ئێسکەکانیان لە هەرچی گۆشت و چەوریە داماڵدران. قاوەخانەکانی ڤینیس هێشتا دەرکەکانیان هەر ئاوەلا بوو و هێشتا ئۆرکێستراکانی ئەوێ دەهاتنە ژەنین، بەلام مشتەریەکانیان قاوەیەکیان دەخواردەوە کە لە جۆ درووست کرابوو و پاڵتاوەکانیان هەر لەبەردابوو. بۆ مەبەستی هەڵگرتنی سووتەمەنی دووکانەکان و چێشتخانەکان هەربەیانی زوو دەبەستران و شانۆکان حەفتەی کەرەتێک ڕێگەی کرانەوەیان هەبوو. شەقامەکان پیس و پەڵۆخ بوون و چاودێری نەدەکران. دەلاقەکان تەختەپۆش کرابوون چون شووشە لە گۆڕێدا نەبوو تا پێیان چاکرێنەوە. کۆشکەکانی هابسبێرگ تالان کرابوون و ئێستا سچوونبروون ببوو بە شوێنی حەوانەوەی منالانی بێ سەرپەرست، کەچی هافبێر بۆ مەبەستی بەڕێوەبردنی پارتی نهێنی بەکرێ گیرابوو. چاودێرێکی ئەمەریکی لە

ڤینیس وتبووی کە "بۆچوونی ئەوان بەگشتی لە بۆچوونی کەسانێک دەچوو کە تووشیان بوو‌بێت بە تووشی کارەساتی زۆر گەورەی سرووشتی وەکوو لافاو و قات و قڕی. بۆچونی ئەوان و بەڵگە و بیانوویەک کە دەیانهێناوە لەهی شاندی نوێنەرایەتیەک دەچوو کە بۆ قوربانیانی برسیەتی لە هێندوستان بەدوای یارمەتیەوەن، و لایان وابوو کە ئێمە لە هەرچی مەینەتی و ئازارە بێ بەرین و ئاواتی هەرە پیرۆزی ئێمە ئەوەیە کە دەستیان بگرین و بیان خەینەوە سەرڕێ."٥٥٤

لە ژانویەی ساڵی ١٩١٩دا، ویلیام بێڤێرێج، خزمەتگوزارێکی ئاسایی بەریتانی (و دواتر باوکی ئاسایشی وڵات)، لە پاریسەوە حەواڵەکرا تا مەزندەیەک لە پێداویستیەکانی ئوتریش بکات. ئەو هۆشداری دا کە ئەگەر بێتو خێرا فریا نەکەون قەیرانێکی ئاڵۆزی کۆمەڵایەتی لە ئارادا دەبێت. پارێزگاکان نەیاندەهێشت خواردەمەنیەکان بگەنە ڤینیس. ڤۆراڵبێرگ، لە نووکی ڕۆژئاوای ئوتریش، بە هیچ شێوەیەک ملی نەددا بەوە کە لەگەڵ سویس یەک بگرێت. ناوچەکانی تر لەوانەبوو ملیان کەچ کردایە. حکوومەتی سوسیالیستی شتێکی وای لەدەست نەدەهات و چاری نەبوە جگە لەوە کە لەگەڵ میلیشیای خۆ-دامەزراوی خەڵکدا دەسەڵاتەکەی خۆی دابەش بکات. ئاشتیکەران دەیانزانی مانای ئەم هێمایانە چین. ئەوان خوازیاری ئەوەنەبوون کە ئوتریش ڕێچکەی ڕووسیە یان، دواتر، مەجارستان بگرێتەبەر. لە کۆتایی مانگی مارسدا، هەرخێرا بەدوای ئەوەکە کمۆنیستەکان دەسەڵاتیان گرتەدەست، هاوپەیمانان وازیان لە گەمارۆدانەکەی خۆیان هێنا و بە حکوومەتی ئوتریشی پارە و بوودجەیان بەخشی. لەگەڵ ئەوەشدا خواردەمەنی و جل و بەرگیان بەکشتی بۆ ناردن. ئوتریش دوای ئەڵمان، پۆڵەندا و بلژیک بوو بە چوارەمین قازانجکەری گەورەی یارمەتی هاوپەیمانی. لە بەهاری ساڵی ١٩١٩دا، بە واتەی ڕۆژنامەنووسێکی ناوداری ڤینیسی کە بۆ ئەمەریکیەکی گێڕابۆوە، دۆخەکە زۆر ئاڵۆز بوو بەڵام هێشتا هەر دەکرا لەکۆنترۆڵدابێت. هەر ئەو مانگی ژوەنە هەڵمەتی کمۆنیستەکان بۆ گرتنەدەستی دەسەڵات لەڕێگای توندوتیژیەوە زۆر بە ئاسانی پووچەڵ کرایەوە.٥٥٥

* * * *

کاتێکە لە ئوتریشیەکان بانگێشت کرا تا نوێنەرانی خۆیان بنێرن بۆ پاریس گرێبەستی ئوتریشی هێشتا هەرمابووی ئامادەبێت؛ بەڵام، ویلسۆن گوتەنی، ئەوە بۆچونێکی باش بوو بۆئەوەکە نیشانبدرێت کە هاوپەیمانان پشتگریان لە حکوومەتی ئوتریشی دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان نەیاندەتوانی مەجاریەکان بانگێشت بکەن، کاتێکە لە بووداپێست حکوومەتێکی کمۆنیستی هەبوو، کە گومانی تێدانەبوو کە لەگەڵ بۆلشویکەکانی ڕوسیە هاوپەیمان بوون. لیۆد جۆرج نەرم و نیانتر بوو. ئەو بیستبووی کە دووسەد کەس لە چینی مامناوەندی لە بووداپیست کوژرابوون، بەڵام زۆر لەڕاستبوونی

ئەو هەواڵە دڵنیا نەبوو. ئەو وتبووی کە "ئێمە ناتوانین لەگەڵ مەجاریەکان پێوەندی ئاشتیانە ببەستین چون ئێمە حکوومەتەکەی ئەوانمان خۆش ناوێت." لە ئاکامدا، زانرا کە هیچ ڕێگایەک بۆ بانگێشتکردنی مەجاریەکان لە ئارادا نیە، چون شەڕ لەنێوان مەجارستان و دراوسێکانیدا هەڵگیرسابوو.٥٥٦

شاندی نوێنەرایەتی ئوتریش لەلایەن سەرۆک وەزیرەکەیەوە، کارڵ ڕێنیر، خڕەپیاوێکی کەیفساز، شەیدای خواردن و خواردنەوەی باش، یاریەکانی کاردی و ڕەقس و سەماکردن بوو. ڕێنیر نێوانڕەو و ڕاست ئاژۆبوو. کاتێکە پاریسی چۆڵ دەکرد، جەماوەری کۆبۆوە لە سەر وێزگەی ڕێگەی شەمەندەفەڕ هاواریان دەکرد و دەیانوت " ئاشتیەکی باش بە خەڵات بێنە بۆ ئێمە." ڕێنێر لەوڵامدا وتی کە " ئەوەیکە لەپێناو چاکەکردن لەگەڵ خەڵکی خۆشەویستی وڵاتەکەمان لەدەستمان بێت لەسەر ئێمە حیساب بکەن. بەڵام ئێمە نابێ ئەوەمان لەبیر بچێت کە وڵاتی داماوی ئێمە سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە، و تکایەکە من لە ئێوەم هەیە ئەوەیە کە هەرلەخۆوە هیوا و هۆمێدی سەیر لە مێشکەکانی خۆتاند بکەنەدەرەوە." هاوڕێ لەگەڵ ئەو کارناسانەی کە لەگەڵی بوون، ئاشتیخوازێکی ناودار هەبوو؛ ڕۆژنامەنووسێک کە هەر بەر لە دەستپێکردنی شەڕ لە پاریس دۆستانێکی وەکوو کلیمینجووی هەبوون؛ یان ڕۆدۆڵف ستالین، قارەمانێکی ڕەسەنی بەریتانی، کە لە گەشتێکی کارەساتباردا لە سوودان لەگەڵ ژەنەڕاڵ گۆردۆن بوو (ئەو لەلایەن مەهدیەوە بۆ ماوەی چەندین ساڵ زیندانی کرا و دواتر لەلایەن کێچێنەرەوە ئازادکرا و پلەی شۆڕەسواری پێ بەخشرا). سلاتین پاشا، وەک بەریتانیەکان ناویان لێدەبرد، نامەیەکی بۆ هاوڕێی دێرینی خۆی بالفۆر نووسی و داوای کردبوو کە ڕێگە بە نوێنەرانی ئوتریشی بدرێت تا لەگەڵ ئاشتیکەران ڕووبەڕووی یەکتر دانووستان بکەن. بالفۆر بەداخەوەبوو لەوە کە ئەوکارە سەرناگرێت، بەڵام سلاتینی وەک ئامرازێکی نافەرمی پێوەندیەکان بەکارهێنا.٥٥٧

کاتێکە شەمەندەفەڕەکەی ئەو گەیشتە پاریس، ڕێنێر بە فەڕەنسەیی داوای لێبووردنی کرد لەوەکە بەو زمانە نادوێت. ئەو وتی کە چەندە خۆشحاڵە لەوەکە بۆ یەکەم جار پاریسی بەسەرکردۆتەوە. ئەو بە زەردەخەنەوە وڵامی چاپەمەنیەکانی دایەوە. کاتێکە سەبارەت بە کورتەسەفەرێکی شەمەندەفەڕ بەناو گۆڕەپانەکانی جەنگدا پرسیارێکی ئاراستەکرا یەکێک لە ئەندامانی پارتەکەی ئەو وڵامی دایەوە: "کەسێک پێشتر پلانی ئەوەی ڕشتبوو کە شەمەندەفەڕەکە بەهێواشی و لەسەرەخۆ تێپەڕێت تاکوو ئێمە بتوانین بە کەیفی دڵ چاو لە فەڕەنسە بکەین کە لە مانگی مەیدا لە جوانی و لە ڕازاوەییدا بەڕاستی سەرسووڕهێنەرە." ئوتریشیەکان کردەوەیەکی جوانیان لەخۆیان نیشان دابوو، تەنانەت کاتێکە لەڕووی زۆرەوە بەتاسەوە چاوەڕوانی مەرجەکانی خۆیان بوون چون شۆڕای چواریار، کە بەوپەڕی خۆشیەوە ئەوانی بانگێشت کردبوو، دەستبەجێ ئەوانی لەبیرکرد. ئەوان بە کاردەکان یاریان دەکرد، شتیان

دەخوێندەوە و پیاسەی دوور و درێژیان دەکرد. یەکێک لەوان وەبیری هێنانەوە کە " ئێمە خواردەمەنی و شەرابی چاکی فەرەنسەییمان هەبوو کە زۆربەی هەرەزۆری ئێمە دواساڵیانێکی دوور و درێژی برسێتی دڵمان پێی خۆش بوو." کاتێکە دەکرا ڕێکوپێک کرابایە، گاردەکانی ئەوان ئەوانیان بۆ گەشتی کورت کورت دەبردن. ڕێنێر بەشێوەیەکی تایبەتی داوای کرد کۆلێژێکی کشت و کاڵی فەرەنسەیی ببینێت. ئوتریشیەکان هەستێکی پاکیان سەبارەت بەوێ هەبوو- درووست پێچەوانەی ئەڵمانیەکان کە ئەوانیش لەوکاتەدا گەیشتبوونە پاریس. لە ئێس.تی جێرمەین خەڵکانی ناوچە بەتایبەت شەیدای نوێنەرێک بوون لە تیرۆلەوە، بە ژاکەتێکی ڕاوکردنی کەستانی و بە کڵاوێکی سەوزی بچوکەوە کە پەڕەکانی گەورەگەورە و ڕەنگیشیان ڕەش بوون. ئەوان لەوە تێنەگەیشتن کە ئەو تازیەدارە چون بەشی هەرەزۆری باشوری ئەڵمانی-ئاخێوەری تیرۆل تازە بە ئیتالیا بەخشرابوو.٥٥٨

مەرجەکانی ئاشتی زیاتر لەلایەن ئیتالیەکانەوە کونی تێکەوتبوو بۆ ئەوەکە ئوتریشیەکان لەدین دەهری بکەن و عاجزیان بکەن. سنوورەکانی ئوتریش بەگشتی بۆ لێژنەتایبەتیەکان بەجێ مابوون، کە لە وڵاتانی وەکوو چکسلەواکیا و یان ئیتالیا سەبارەت بە داخوازیەکانی ئەوان بیستبوویان، هەڵبەت نەک لە خودی ئوتریش گالیسیا دەچوە سەر پۆڵەندا، بۆهێما دەچوە سەر چکسلەواکیا. نزیک بە سێ ملوێن ئوتریشی ئەڵمانی-ئاخێوەر لەگەڵیان ڕۆیشتن. ئۆتۆ باوۆێر، زیرەکترین سوسیالیستی ئوتریشی و وەزیری دەرەوەی ئەو وڵاتە لە گەڕانەوەدا لە ڤیەن وتارێکی بەسۆزی ڕاگەیاند. " نزیک بە دووسێهەمی خەڵکی ئێمە بیانیەکان دەسەڵات دەگێڕن بە سەریاندا، بەبێ ئەوەی لە ڕای گشتی پرسیارێک بکەن، هەر بەم شێوەیە لە مافی خود-موختاری بێ بەش دەبن." ئەو دەیەویست پەیامێکیان پێ بگەیەنێت، بەڵام ژمارەیەکی بچووک لە شاری پاریس حازربوون تا گوێ بۆ قسەکانی شل بکەن.٥٥٩

لەگەڵ ئەوەشدا هاوپەیمانان بڕیاریان هێنایە سەرئەوە کە ئوتریش ڕێگەی نەدرێتێ لەگەڵ ئەڵمانیا پێوەندی بگرێت و یەک کەوێت. ئەوە شتێک نەبوو کە ئەوان پێشبینیان کردبوو کە دەبێ بیکەن. ئەوان بەگشتی چاوەڕوانی هاتنەئارای وڵاتێک بەناوی ئوتریشیان هەر نەکردبوو. تاقمێکی بچوک لە ناسیۆنالیستەکانی باڵی ڕاست نەبێت هەرهەموو ئوتریشیەکانی ئەڵمانی-ئاخێوەر زۆر هۆگری پێوەندی گرتن لەگەڵ ئەڵمانیا بوون. ئەوان بەگشتی گرووپێکی دەسەلاتداربوون لە ئیمپراتۆریەتێکی گەورەدا. سروودی کۆنی دەیکوت کە " تەنیا خوایە ئاگاداری ئیمپراتۆرە بە تەختی پاشایەتی هابزبێرگەوە، چارەنووسی ئوتریش هەر یەکگرتوو دەمێنێتەوە." *ئانسچلووس*، یان یەکیەتی، هەتا دوایەمین ڕۆژەکانی شەڕی گەورە دەستووری پشتگریەکی بەربڵاوی نەدا. لە ١٦ی مانگی ئۆکتۆبردا، کاتێکە ئوتریش-مەجارستان بە دەست و بەلاق کەوتبوە خۆ تا خۆی لە شەڕ دەربازبکات و لەڕاستیدا خۆی زیندوو

ڕابگرێت، ئیمپڕاتۆر کارێل دەستووری دامەزراندنی ئیمپڕاتۆریەتیکی تازەی ڕاگەیاند " کە تێیدا هەرکەس گرووپی سیاسی تایبەت بەخۆی لەناوچەی دانیشتنی تایبەتبەخۆدا دادەمەزرێنیت." بەپێچەوانەی چکەکان یان پۆڵەندیەکان یان سلۆڤێنەکان، ئەڵمانی ئاخێوەران هەرگیز پەرەیان بە گرووپێکی لەوچەشنە نەدابوو. بە نەمانی هیچ ئیمپڕاتۆرێک، وەک جارلەگەڵجار دەردەکەوت کێ پێویستی بە ئەوان دەبوو؟ ئەوان چۆن دەیانتوانی لەنێوان زۆرینەیەکی سلاڤیدا هەڵ بکەن و بژین؟ ئوتریشیەکانی ئەڵمانیا لەگەڵ داهاتوویەکی نادیار و ڕەش ڕووبەڕوو ببوونەوە، جا ئایا ئوتریش-مەجارستان زیندوو دەمایەوە یان نا، و لەچوارچێوەی ئەو ڕەشبینیەدابوو کە داواکردنی ئانسچلووس لەگەڵ ئەڵمانیا گەشەی سەندبوو.٥٦٠

لە ٢١ی مانگی ئۆکتۆبردا، نوێنەرانی ئەڵمانی-ئاخێوەر لە پەرلەمانی ئوتریشیدا وەک ئەنجومەنی نیشتمانی کاتی کۆبوونەوە. ئەوان ئەوجۆرەی کە نوێنەرانی چک و سلۆڤێنیا بەڕاستیان بوو و نوێنەرایەتی نەتەوەی خۆیان دەکرد ئەوان وانەبوون و، لەو کاتەدا، ئەوان خوازیاری یەکیەتی لەگەڵ ئەڵمانیا نەبوون بەڵکوو خوازیاری خود-موختاری بوون بۆ ئەڵمانیەکان لەچوارچێوەی ئیمپڕاتۆریەتی کۆنی هابزبێرگدا. هەڵبەت تا ١١ی مانگی نوامردا نە ئیمپڕاتۆڕ و نە ئیمپڕاتۆڕیەت هیچیان نەمابوون. لەگەڵ ئەوەش بۆ هەموولایەک ئاشکرابوو ئەو وڵاتانەی کە لە پاشماوەی ڕووخانی ئوتریش-مەجارستان سەریان هەڵدابوو هیچ قازانجێکیان لە هیچ جۆرە تەدارەکی سیاسی لەگەڵ ئوتریشی ئەڵمانی-ئاخێوەر نەدەکرد. لە ١٢ی مانگی نوامردا، ئەنجومەن، کە بەناوی سەرجەم ئەڵمانیەکانی ئوتریشی قسەی دەکرد، بە یەک هەناسە کۆماری ئوتریشی ڕاگەیاند و لە هەناسەیەکی تردا ڕایگەیاند کە ئەو کۆمارە بەشێکە لە کۆماری گەورەتری ئەڵمانیا. ئەو کۆمارە هەوڵێک بوو کە لە ترس و دڵەڕاوکێ درووست ببوو، درووست وەک بڕیارەکەی کرۆواسیا بۆ پێوەندی گرتن لەگەڵ سێربیا دەچوو. ئەڵمانیا، کاتی خۆی دوژمن و هاوپەیمانی بێ متمانە، لە چاوقونجانێکدا وەک پەنابەرێکی لێهات. گرووپە نابەدڵەکانی سیاسی لە دوایەمین ڕۆژە ئاڵۆزەکانی ئیمپڕاتۆریەتدا پێوەندیان بە هێزەکانەوە گرت- دژە-سێمیتەکان، جوولەکەکان، ناسیۆنالیستەکان، سوسیالیستەکان، لیبراڵەکان، تیرۆلیسەکان و ستیریانەکان کە دەترسان لەوەکە بکەونە ژێر دەسەڵاتی ئیتالیا یان سێربستانەوە- تا لەگەڵ ئەڵمانیا داوای یەککگرتنەوە بکەن.٥٦١

لەڕاستیدا زۆربەی ئوتریشیەکان سەبارەت بە *ئانسچلووس* شەرت وشرووتی تایبەت بەخۆیان هەبوو: کاتۆلیکەکان، کە زۆرینەیان لە دەست دابوو، دانیان لەگەڵ پرۆتێستانەکانی ئەڵمانیای باکوور نەدەکولا؛ ئەو تاجرانەی کە لە ململانێکردنی ئەڵمانیا دڵیان تۆقیبوو؛ و ئەو ڤینیزیانەی کە خوازیاری ئەوە نەبوون کە

شارەکەیان لەبەرانبەر بەرلین یان ویمار پلەی دووهەمی پێ ببەخشرێت. ئوتریشیەکان لە هەر چین و توێژێکەوە ململانێی دوور و درێژی نێوان پڕاشا و ئوتریشیان بۆ ڕێبەرایەتی کردنی هەموو ئەڵمانیەکان و ئەو شێوازەی کە بەکاری دەهێنا بۆ ئەوەکە نەهێڵێ ئوتریش-مەجارستان لە سەردەمی شەڕدا ئاشتیەکی جیاواز بنێتەوە هەرلەبیریان مابوو. بەڵام ئێستا چ ئاڵتێرناتیڤێکی تریان لەبەردەست دابوو؟

لەساڵی ١٩١٩دا، زۆربەی ئوتریشیەکان *ئانسچلۆسیان* وەک تەنیا هیوای پارێزگاری کردن و سەرکەوتن بۆ وڵاتەبچووکەکەی خۆیان دەدیت. لە زانکۆکان و لە قاوەخانەکان، ڕۆشنبیرانی لایەنگری یەکێتی-ئەڵمانی بە سەرسووڕمانەوە باسی یەکگرتنەوەی لقی دابڕاویان لەگەڵ داری گەورەی ئەڵمانیا دەکرد. سوسیالیستەکان تاسەباربوون چون، وەک بائۆر بەڵگەی لەسەر دەهێناوە، ئەڵمانیا خەریک بوو بەرەو باڵی چەپ دەگەڕا. یەکگرتنەوەی چینەکانی کرێکاری ئوتریش و ئەڵمانیا سوسیالیزمی لە هەموو شوێنێک بەهێزتر دەکرد. شێوەی تێڕوانینی ڕێنێر زیاتر کرداری و نموونەیی بوو: " ترس لە قات وقڕی و بێکاری و *ئانسچلووس* وەک تەنیا ڕێگەچارەی بەردەست."٥٦٢

ئەنجومەنی کاتی تازە لە ڤیەن لەگەڵ ئەڵمانیا دانووستانەکانی دەستپێکردەوە. ئوتریشیەکان بە ووردبینیەوە هەنگاویان بۆ پێشەوە دەنا و بۆ ئەڵمانیەکانیشیان ڕوونکردبۆوە کە یەکێتی بە هەرشێوەیەک کە بوە پێویستە ڕێز لە تایبەتمەندی کەم وێنەی ئوتریش بگرێت. ئەڵمانیەکان بە هەمان چەشن ووردبین بوون. ئەڵمانیا نەیدەویست هەر لەخۆوە و بەبێ هۆ ببێتە هۆی ئازاری ئاشتیکەران، بەتایبەت بەرلەوە کە مەرجەکانی تایبەت بە خۆی بسەپانایە. وەک برۆکدۆرف-ڕانتزوو، وەزیری دەرەوەی ئەڵمانیا، بۆ بائۆری ڕوون کردەوە، پێویست بوو ئەڵمانیا فکرێکی لە حاڵی خۆی بکردایەتەوە. ئەگەر هاوپەیمانان بیانزانیایە کە خەریکە زەوی و زاری زیاتر لە باشوورەوە دەخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، هەرهەموویان لەسەر ئەوە ڕیدەکەوتن کە لە ڕۆژئاوا و لە ڕۆژهەڵات زەوی لێ بستێننەوە.٥٦٣

ئەم وت و وێژانە ئاکادیمی بوون. هاوپەیمانان بڕیاری خۆیان ڕاستکردبۆوە، بەگشتی بە پێداگری فەڕەنسەوە، لەسەر ئەوەکە لەنێوان هەردوو وڵاتی ئەڵمانی-ئاخێوەر بەربەستی هاتنەئارای هەرجۆرە یەکیەتیەک بکەن. بەکورتی، لە کۆتایی شەڕدا، فەڕەنسیەکان گاڵتەیان بە بیرۆکەی هاندانی ئوتریش و باڤاریا دەکرد بۆ ئەوەی کە یەک بگرنەوە، بۆ ئەوەی کە هاوپەیمانیەکی کاتۆلیکی بەهێز دامەزرێنن تا لەبەرانبەر پڕاشای[ئەڵمان] پرۆتێستانتدا بوەستێت. کاتێکە ئاشکرابوو کە نە بەریتانیەکان و نە ئەمەریکیەکان پاڵپشتی لە هەڵوەشانەوەی ئەڵمانیا ناکەن، سیاسەتی فەڕەنسەیەکان گۆڕا و ئەمجارە نەیاندەهێشت ئوتریش بێتە نێو باوەشی ئەڵمانیاوە. لە ویەن، نوێنەری فەڕەنسەیەکان

بەڵام ئاشکرا ئاماژەی بەوەدەکرد کە ئەگەر ئوتریش خوازیاری مەرجی ئاشتیانەی پەسەندکراوە، ئیرر دەبێ واز لە داواکاری *ئانسچلۆس بێنێت*. کلیمینجوو ئەیوت کە فەڕەنسە پشتگری لە ئاشتی دەکات. " بەڵام ئەگەر ئێمە لە چەک و تەقەمەنیەکانمان کەم کەینەوە، و ئەگەر، لە هەمان کاتدا، ئوتریش حەوت ملوێن دانیشتوو بخاتە سەر حەشیمەتی ئەڵمانیا، هێزی دراوسێکانی ئەڵمانی ئێمە بەشێوەیەکی مەترسیدار دژ بە ئێمە گەشە دەکات." ویلسۆن نیگەرانی ئەوەبوو کە لەوانەیە ئەمە لەگەڵ خود-موختاری ئوتریشی دژایەتی هەبێت، بەڵام لە کۆتاییدا ئەو و کلیمینجوو لە مانگی ئاڤریلدا لەگەڵ یەک ڕێکەوتن کە بەندێک لە گرێبەستی ئەڵمانی بگونجێنن بەو مانایە کە پێویستە ئەڵمانیا ڕێز لە سنوورەکانی ئوتریش بگرێت. لیۆد جۆرج دانووستانێکی ئابڕوومەندانەی پێشنیارکرد: بەو مانایە کە ئوتریش دەتوانێ پێوەندی لەگەڵ ئەڵمانیا بگرێت ئەگەر بێت و کۆمەڵەی گەلان ڕەزایەتی لەسەربێت. ویلسۆن بە خۆشحاڵیەوە پێشنیارەکەی قەبووڵ کرد، و بەندەکان هەر بەومانایە لەناو گرێبەستەکانی ئەڵمانی و ئوتریشی گونجێندران. چون دەنگدان لە شۆڕای ئەنجومەندا پێویست بوو بەشێوەیەکی گشتی و تێکڕایی بێت، ئەمە دەبوە هۆی بەخشینی مافی بەرپەرچدانەوە بە فەڕەنسە و بە ئیتالیا.٥٦٤

لە کۆتایی مانگی مەیدا شاندی نوێنەرایەتی ئوتریش سووکە گلەیەکی کرد بەومانایە کە ئەوان سەبارەت بەوەی کە هێشتا مەرجەکانی ئاشتی وڵاتەکەی ئەوان هەروا "تاڕوون و نائاشکران" پەشێون. گرێبەستی تایبەت بە ئوتریش، هاوڕێ لەگەڵ گرێبەستەکانی تایبەت بە مەجارستان، بۆلغارستان و تورکیە، ئێستاش کە ئێستایە لە ورتکەوپرتکەی دەورووبەری شاری پاریسدا، و لە ئەم کۆمیتە و ئەو کۆمیسیۆندا پەنگی خواردۆتەوە. شۆڕای چواریار، کە لەسەری بوو ڕەشنووسەکانی کۆتایی پەسەند بکات، بە دانووستانەکانی دوایەمین سات لەسەر گرێبەستی ئەڵمانیا و مرەمرکردن لەسەر داخوازیەکانی ئیتالیا تەموورەدرابوو. ئوتریش و کێشەکانی تایبەت بە ئەوێ یەکبەدوای یەک لە لیستەکەدا ڕیزکرابوون. پسپۆڕێکی بەریتانی بەم چەشنە گلەیی کردبوو کە " کەسێکە بەڕاستی زانیاری ئەوتۆ و ئەزموونی باشی هەبێ لەبەردەست دانیە، و هەڵبەت ئیتالیەکان ناحەوێنەوە و هەڵکردن لەگەڵیان دژوارە."٥٦٥

ئەوەیکە شاندی نوێنەرایەتی ئوتریشی لە ئاکامدا لە ٢ی مانگی ژوەندا چاوی پێی کەوت بەڵگەیەکی هەرچی پەرچی بوو- بە واتای هانکی "وێنەیەکی درۆ لە گرێبەستێک". هەندێک لە بەندەکان بەگشتی لە گرێبەستی ئەڵمانی قرتێندرابوون و کاتی ئەوە نەبوو کە بەسەر هەڵەکاندا بچنەوە و خەستیان بکەنەوە. ئوتریشیەکان یەک بەخۆیان هەڵبەزیبوونەوە کاتێکە بۆ وێنە زانیبوویان کە ئەوان ژێردەریایان لێ قەدەغەکراوە و بۆیان نیە خاوەنی بن. لەگەڵ ئەوانەشدا مەرجەکان، وەک

کلیمینجوو بە هەندێک ترس و دڵەڕاوکێیەوە باسی کردبوو، ناتەواوبوون. هاوپەیمانان نەیانتوانیبوو لەسەر هەندێک لە سنوورەکانی ئوتریش پێکەوە ڕیکەون، بەتایبەت ئەو سنوورانەی کە لەگەڵ ئیتالیا هەیانبوو، لە تیرۆل، و ئەوانەی کە لەگەڵ یوگۆسلاڤیا هەیانبوو. بەهۆی ناکۆکیەک لە دوایەمین ساتەکاندا، کلیمینجوو ناچارکرابوو کەرتێک بەبڕی ٦٤٠ئەیکەر لەسەر سنوورەکانی یوگۆسلاڤیا هەڵوەشێنێتەوە درووست بەرلەوەی کە ئەو مەرجەکان بدا بە دەست ئوتریشیەکانەوە.٥٦٦

هەرچەند ئاشتیکەران گرێبەستی ئەڵمانیان وەک نەخشەیەک بەکارهێنا، ئەوان لەسەر ئوتریش زۆر سووریان نەکردبۆوە و ئاسانکاریان بۆ کرد. وەباڵبەئەستۆی شەڕ، بۆ وێنە: سزادانی قەیسەر شتێک بوو، بەڵام، وەک لیۆد جۆرج ئاماژەی پێکرد، ئیمپڕاتۆر کارێل لە ساڵی ١٩١٤دا لەسەر تەختی پاشایەتی نەبوو. هەروەکوو قەرەبووەکان، پسپۆڕان لەبنەڕەتدا لەسەر پلانێکی نەشیاو کاریان دەکرد کە بەپێی ئەو پلانە ئوتریش و مەجارستان زۆربەی قەرزەکانی شەری ئیمپڕاتۆریەتی کۆن و هەروەها قەرەبوەکانیان دەداوە. بالفۆر وتی کە " پیاوێک کە سەدەقەی پێ دەشێت، ناکرێ چاوەڕوانی ئەوەی لێبکرێت کە بتوانێ قەرزەکۆنەکانی خۆی بداتەوە." لە ئاکامدا ئەرکی دابینکردنی تابلۆی قەرەبوەکان خرایە بەردەم کۆمیسیۆنی تایبەت بە قەرەبوەکان، کە ئەوانیش دوو ساڵ دواتر دانیان بەوەداهێنا کە ئوتریش بۆی هەیە هیچ قەرزێکی کۆن نەداتەوە. مەجارستان، کە بەختی نەبوو، پلانی بۆ دارێژرا کە ساڵیانە بە تەڵا و بە کەرەسە قەرزەکانی بداتەوە. بۆ ماوەی چەند ساڵێک توانی ئەرکەکانی بەجێ بێنێت، بەڵام چون ئابووریەکەی زۆر خراپ گەشەی سەندبوو هاوپەیمانان هەم وامەکانیان زۆرتر کرد و هەمیش قەرەبوەکانیان دواخست. لە ساڵی ١٩٣٠دا، لە سەردەمی ناخۆشی و خەمۆکیدا، قەرەبوەکانی مەجارستان سەرلەنوێ پلانیان بۆ دارێژرایەوە، کە بەوپێیە لە ساڵی ١٩٤٤ گەڕانەوەکان دەستیان پێدەکردەوە.

* * * *

کاتێکە ئەو مەرجەکانی وەرگرت، دوائەوەی کە پێشکەش کران خرانە بەردەمی جەماوەر، ڕێنێر وتارێکی شکۆدار و دڵخۆشکەری پێشکەش کرد. ئەو وتی کە " ئێمە دەزانین کە پێویستە ئاشتی لە دەست ئێوەوە بە ئێمە بگات. لە دەست کەسانی سەرکەوتووەوە. ئێمە سوورین لەسەر ئەوەیکە هەر پێشنیارێک کە لەلایەن ئێوەوە دەخرێتە بەردەمی ئێمە، هەر ئامۆژگاریەک کە لەلایەن ئێوەوە بە ئێمە پێشنیار دەکرێت بە ئاگاییەوە لێیان وردببینەوە و بیانسەنگێنین." لە خودی ئوتریشدا، ئەو شوێنەی کە سێ ڕۆژی ماتمین ڕاگەیەنرا، بێ باوەڕی و سەرسووڕمان گەیشتبوە لووتکەی هەرەبەرزی خۆی. سەرنووسەری ڕۆژنامەیەکی باڵی چەپ وتبووی کە " قەت نەبوە وەک ئەم گرێبەستەی بەردەستی

ئێمە ناوەڕۆکی گرێبەستێکی ئاشتی ئاوا ئاشکرا خەیانەت بەو خواستانەی تێدابێت کە گوایە بینای ئەو گرێبەستەیان ڕێنوێنی کردبێت."٥٦٨

ئوتریشـیەکان پێشنیارەنووسـراوەکانی خۆیـان پێشـکەش کـرد و دواتـر مەحتەل مـان تـا ئاشتیکەران، کە لە مانگی ژوولایدا بە ڕۆیشتنی زۆربەی سیاسەتمەدارانی کەم ببوونەوە، لە وڵامەکانی خۆیان بیرکەنەوە. پسپۆڕێکی بواری ماڵی ئوتریشی گێڕابوویەوە کە " جیاوازی نێوان باخەکانی ڕووبەخۆر، کاتی بێکاری ئێمە، خواردەمەنی چاک و چاوەڕوانی درێژخایەنی سزادانی ئێمە کە ئێمە دوژمنانی شکستخواردوو دەبوایە لە داگیرکەرەکانمان چاوەڕوانیمان بکردایە یەکجار زۆر بوو." ئەو کاتی بێکاری خۆی بە خوێندنەوەی ئەلێکساندرا دووماس ڕادەبوارد و لە وتوێژکردنی لەگەڵ نوێنەرانی هاورێی خۆی خۆی دەبوارد و بەشداری نەدەکرد. پلانی ئیستراتیژیکی ئوتریشیەکان ئەوەبوو کە لە سەر چەند خاڵی سەرەکی جەخت بکەنەوە نەوەک لەسەر هەمووی مەرجەکان. ئەوان بەندەکانی تایبەت بە قەرەبوەکانیان لەسەر هەندێک بـواری هەسـتیار بـە تـەنیایی هێشـتەوە کـە هـەرگیز نەیانـدەتوانی بیانبەخشـن. هەڵبـەت ئـەوان بڕیاریاندا کە هەندێک زێدەمافی گرنگ بەدەست بێنن، وەکوو بەندێک کە نەیدەهێشت خەزێنە هونەریەکانی ئوتریش لەنێوان وڵاتانی جێگیر دابەش بکرێت.٥٦٩

لەگەڵ ئەوەشدا لە ناوچەیەک بەدەوری کلاگینفۆرتدا لە باشووری کارینتیا لەسەر گرێبەستێک ڕێکـەوتن، کـە جگـە لـە ئـەمـان یوگۆسـلاڤیاش داوای دەکـرد. پێـدەچێ ئەمـە بـۆ مەبەسـتی قەرەبووکردنـەوەی لەبەرچاونـەگرتنی مافەکانی خود-موختاری ئەڵمانیـەکان بوویێت کە دەچوون بۆ چکسلەواکیا لە باکوور، یان ڕەنگە بەهۆی ئەوەبوویێت کە یوگۆسلاڤیا هاندەری هەمان خۆزیا و خولیا کـە چکسـلەڤاکیا دەیکـرد نـەبوو، یـان ڕەنگبـێ زۆر ئاسـانتر لەوانـە بـەهۆی ئـەوەبوویێت کـە ئەگەری دەستپێکردنی شەڕێکی بچووکیتر بڕەوێنێتەوە.

کلانگینفـۆرت، وڵاتێکـی پڕلـە ئاشـتی و پـڕ لـە گـۆل و کێـو و تـەلان هەڵکـەوتوو لـە نشـێوی باکووری شاخەکانی کاراواکان، تـەمووردراو بە دێرەکـانی سـەدەی نـاڤین، کەنیسـەکانی گۆتیـک، کۆشکەکانی بارۆک و کوختـەکانی بۆیـاخکراو، کـاتی خـۆی لەسـەر سنووره جەنگیـەکانی نێـوان ئیمپراتۆری ئوتریشی و تورکەکانی عوسمانی هەڵکەوتبوو. کۆتـایی هـاتنی شـەڕ بەرێوەبەرایەتیـەکی کـاتی ئوتریشـی لـە بـاکوور بـەجێ هێشـتبوو؛ لـە باشـوور، داگیرکاریـەکی گزوگومـەتی یوگۆسـلاڤیا هەرخێرا هەستی بەرخودانی بزواندبوو. ئاڵۆزی نێوان ئوتریشیەکان و یوگۆسلاڤیەکان بـەدرێژایی هێڵـی ئاگربەسـت گەیشـتبوە لووتکـەی خـۆی و شـەڕی بـەربلاو دەسـتی پێکردبـوو. لـە سـاڵی ١٩١٩دا

حەشیمەتی نزیک بە ١٥٠،٠٠٠کەسی کلاگینفۆرت تێکەڵاو بوو؛ ئاخێوەرانی سلۆڤێنی زۆرینەیان بەدەست بوو، بەڵام شارۆچکە سەرەکیەکان ئەڵمانی بوون. زۆربەی خەڵک بە ئاسانی لەزمانێکەوە بۆ زمانێکی تر دەیانگۆڕی و قسەیان بە هەمووی زمانەکان دەکرد. لە مانگی فەوریەدا، چەند نارداوێکی ئەمەریکی خۆیان کرد بە ناوچەکەدا و بەهەڵکەوت خەڵکیان ڕادەگرت و پرسیاریان لێدەکردن کە سەر بە چ ناوچەیەکن. دەرەنجامەکان ئەوانیان سەرسووڕماو کرد: " سلۆڤێنیەک کە نایەوێت ببێ بە جۆگۆ-سلاڤ لاپرەسنیەکە کە ئەگەر بەچاوەکانی خۆمان، و بە هەژمار نەماندیایە ڕەنگبوو هەر باوەڕمان نەکردبایە.".٥٧٠

ڕێگری سەرەکی لەبەرانبەر هەر بڕیارێکدا ئیتالیا بوو، کە هەر لە بنەڕەتدا دژ بە داواکاریەکانی یۆگۆسلاڤیا دەوەستا بەڵام زۆر بەتاسەی ئەوەشەوە بوو کە نەهێڵێت هێڵێکی ڕیگای شەمەندەفەڕ کە بەندەری تازەی ئەوێ بەناوی تریستی لەگەڵ ڤیەن پێکەوەگرێ دەدا لە ناوچەی یۆگۆسلاڤیاوە تێپەڕ ببێت. کۆمیسیۆنی تایبەت بە کاروبارەکانی یۆگۆسلاڤیا و ڕۆمانیا کێشەکەی نارده بەردەم شۆڕای عالی، هەروا ئاسان بۆ ڕایەکی تر گەڕاندیانە دواوە. لە مانگی مەیدا، کێشەی بچووکتری کلاگێنفۆرت لەنێوان ئیتالیا و هاوپەیمانەکانی لەسەر سنوورەکانی ئیتالی لە ڕۆژهەڵاتی ئەو وڵاتە قڕەیەکی ناخۆشتر سازبوو. یۆگۆسلاڤەکان لەسەر سنوور دەستەوئەژنۆ دانیشتبوون. ئوتریشیەکان هیوایان بەدوا ڕۆژ هەبوو. هەروەک ویکهام ستید لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی " حاڵەتێکی سەیر وەکوو نیگەران بوون لەبابەت ئوتریشەوە لەنێوان سێ یاری گەورەدا شتێکی دیار و بەرچاو بوو. سلاڤەکانی باشوور خەریک بوو ترس لەوە دزەی دەکردە هەناویانەوە، بەڵام ئیتالیەکان خەریک بوون لە ئادریاتیک سەودایەکی باشیان لەگەڵ دەکردن، هاوپەیمانەکانی تر لەسەر لابردنی سنووری سلۆڤینیا لە کارینتیا لەگەڵیان سەودایەکی باشیان دەکرد.٥٧١ شاندی نوێنەرایەتی یۆگۆسلاڤیا خەریک بوو وردە وردە لە داواکاریەکانی خۆی کەمی دەکردەوە، ئەم بزاڤە پووچەڵ کرایەوە کاتێکە هێزەکانی یۆگۆسلاڤیا لە کارینتیا کوتوپڕ لە کۆتایی مانگی مەیدا بەرەو باشوور شاڵاویان هێنا. شۆڕای چواریار دەستووری ئاگربەستی دا؛ ئەوە هەنگاوێکی بەرپرسایەتی لەرزۆکی شۆڕا بوو لە ئورووپای ناوەندیدا بەومانایە کە تەنیا بەدوای چەند حەفتەی دیکەدا شەڕکردن کۆتایی پێدێت. لە هەمان کاتدا، یۆگۆسلاڤەکان دەستیان بەسەر گشت ناوچەکانی دەوری کلاگێنفۆرت و بەشێکی زۆر لە کەرەسەی بەکارهاتووی جەنگی ئوتریشدا گرت، و ئیتالیەکان بەشێک لە هێڵی هەرە گرنگی ڕێگای شەمەندەفەڕیان داگیرکرد.

یۆگۆسلاڤەکان لەبەرانبەر بیرۆکەی دابەشکردندا دەوەستان، کە تازە خەریک بوو پێشنیار دەکرا؛ بێجگە لەمە ئەوان بەتوندی لەبەرانبەر پێشنیاری ئاگربەستێک، کە زیاتر لەلایەن

بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان پێشکەش کرابوو، دژایەتیان دەکرد. (ئەوان گوامانیان لەوەبوو کە ئەوان بیدۆڕێنن.) ئەوان لەلایەن کلیمینجووەوە هەندێک جار پشتگریان لێدەکرا، کەسێک کە هەمیشە لەبیری ئەوەدابوو کە بەشکەم داوای بەڕێوەبردنی ئاگربەستێکی لە ئالساسیێ-لۆرەین لێبکرێت. هەڵبەت ویلسۆن دڵنیا بوو لەوە کە لانی کەم لەم بوارەشدا کە بوە دانیشتوانی ناوچەکە خۆیان بڕیاردەردەبن. لە ٣١ی مانگی مەیدا ئەو لە شۆڕای چواریار سەری دەرهێنا و، کاتێکە فەڕەنسەیەکان سەرسام مابوون، ڕایگەیاند کە " ئەگەر کارناسان لەگەڵ من بن، من بابەتەکەیان بۆ شی دەکەمەوە." چواریاری گەورە سینگیان خستبوە سەر نەخشەیەکی گەورە لەسەر زەوی ناو ژورەکە. ئۆرلاندۆی ڕقهەستاو لەسەر ڕیگا بەرەگەی بە ئەمەریکەیەک گرت و وەک دۆل کوتایی.٥٧٢

یۆگۆسلاڤیەکان سەبارەت بە تەکینەوە لەبەستنی گرێبەست لەگەڵ ئوتریش پێکەوە هەر منجەمنجیان بوو بەڵام لە ئاکامدا لەسەر پەیمانێک پێکەوە ڕیکەوتن. ئەو بەشە لە ئوتریش کە دروست لە باکووری سلۆڤینیا دابوو ئاگربەستی تێدا ڕادەگەیەنرا؛ ئەگەر دانیشتوانی ناوچەکە ڕازیبوونایە بەوەکە لەگەڵ یۆگۆسلاڤیا پێوەندی بگرن، دواتر باکووریەکان، زیاتر بەشی ئەڵمانیەکەی ئەوانیش ئاگربەستیان ڕادەگەیاند. لە ئۆکتۆبری ساڵی ١٩٢٠دا دەنگدانەکە، کە بەبۆچونی هەمووی چاودێران بەشێوازێکی نموونەییی بەڕێوەچو، ڕووی دا؛ زۆرینەیەکی ٢٢،٠٠٠ دەنگی یان ١٥،٠٠٠ دەنگی لەگەڵ ئەوەبوون کە لەگەڵ ئوتریش بمێننەوە. پێدەچوو دەنگدەران لەژێر کاریگەری پێوەندیەکانی ئابووری خۆیان لەگەڵ ئوتریش و ئەم هەستە بوو بێتن کە گوایە ئوتریش لە وڵاتی تازەپێگرتووی یۆگۆسلاڤیا پێشکەوتووترە. بۆ دەنگدەرانی ژن، ئاگاداربوونیان لەوە کە کوڕەکانیان بەپێی یاسای یۆگۆسلاڤیا نەوەک ئوتریش دەبوایە بچوونایە بۆ سەربازی ڕەنگبێ ئەمەش توانیبێتی ڕۆڵێک بگێڕێت. ئەگەر ئەوان بیانتوانیایە پێشبینی داهاتوویان بکردایە، کاتێکە ئوتریش بوو بە بەشێک لە ئەڵمانی نازی، و منالانی سلۆڤێنی بەزۆر خزێندرانە قوتابخانەکانی ئەڵمانیاوە و پێناسەی سلۆڤێنی بەگشتی سەکوت کرا، ئایا ئەوان بەشێوەیەکی جیاوازتر دەنگیان نەدەدا؟٥٧٣

هەرخێرا دوا ڕاگەیاندنی دەرەنجامەکە سووپای یۆگۆسلاڤیا بەشێوەیەکی سەرسووڕهێنەر بەرەو ناوچەی جەنگی بە ڕێپێوانی سەربازی وەڕێ کەوت بەڵام بێ ئەوەی فزە بکات دوو ڕۆژ دواتر گەڕایەوە. سلۆڤێنەکانی ناو یۆگۆسلاڤیا سەبارەت بە سڕینەوەی زەوی و زارەکانی نیشتمانی گلەوگازەندەیەکی زۆریان کرد و وای بۆچوبوون، ڕەنگە ڕاستی بۆی چوو بێتن، کە

رێبەرانی سێربی قەت ئامادەیی ئەوەیان نەبوو ڕووبەڕووی شکست ببنەوە، کە ئەوان زیاتر نیگەرانی سنوورەکانی سێربستان بوون لە باکوور و لە ڕۆژهەلات.٥٧٤ بەسەر ئەمەشدا سکالایەکی تر چوە ناو لیستی ولاتی تازەی یۆگۆسلاڤیاوە و لەگەڵ ئەوەشدا بیرەوەریەکی ئاڵۆزتر لەنێوان دراوسێکاندا بەجێ مایەوە.

ئوتریش لەلایەن هاوپەیمانانەوە داوای زێدەمافێکی تری دەکرد، پارچەزەویەکی درێژکۆڵە لە لێواری ڕۆژئاوای مەجارستان. (لە شێوەدا، نزیک بە ڕاڕەوی پێشنیارکراوی نێوان چکسلەڤاکیا و یۆگۆسلاڤیا بوو، کە کۆڕی ئاشتی پەسەندی نەکردبوو.) ئوتریشیەکان بەڵگەیان لەسەر بەڕەچەڵک ئەڵمانی بوونی دانیشتوانی ناوچەکە دەهێنایەوە. بەداخەوە، ئەوان هەرگیز لە چوارچێوەی دەسەلاتی ئوتریشیدا نەژیابوون و وادیاربوو کە خۆیان بە بەشێک لە مەجارستان زانیبێت. هەڵبەت پسپۆڕێکی بەریتانی دەیگوت کە داواکردن لەوان هیچ سوودێکی نیە چون شۆڕشی کمۆنیستی لە مەجارستان بەتەواوەتی سەری لێشێواندبوون. (حکوومەتی ئوتریشی هەستی کرد کە ئەمە بیانوویەکی بەکەڵکە کاتێکە پرسیاری ئاگربەستێک لەلایەن مەجارستانەوە ئاراستەکرا.) لەگەڵ ئەوە ئوتریش هۆکارگەلی ستراتیژیکی بەکارهێنا-ڤیەن، هاوڕێ لەگەڵ جادەکان و ڕێگا گرنگەکانی شەمەندەفەر، زۆر لە سنوورەکانی مەجارستانەوە نزیک بوون- و، ناخۆشتر لەوانە، هۆکارگەلی تایبەت بە خواردەمەنی. ئەو ناوچەیە هەمیشە خواردەمەنی بۆ ڤینیزیەکان دابین کردبوو، کە لە سەوزە و شیر بێ بەش بوون هەر لەو کاتەوەی کە مەجارستان ببوو بە ولاتێکی سەربەخۆ. مەجاریەکان لەبەرانبەردا بەڵگەی تایبەت بە خۆیان دەهێناوە بەلام ئاشتیکەران گوێیان بۆ ئوتریشیەکان شل دەکرد. زۆربەی ناوچەکە، جگە لە یەک شار، بە ئوتریش برا. مەجارستان هەرچەند سەر نەکەوت لە ساڵی ١٩٣٨دا زۆری هەوڵدا هیتلێر ڕازی بکا تا ئەو ناوچەیە وەک خەلاتێک بەهۆی بێ لایەن بوون لە کاتی *ئانسچلووسدا* بگەڕێنێتەوە. بەم چەشنە ئوتریش بوو بە تەنیا ولاتی شکستخواردوو تا لە کۆڕی ئاشتیدا زەویەک بۆخۆی مسۆگربکات. ولاتی ناوبراو گرێبەستی ئیس.تی. جیرمەینی لە مانگی سێپتامری ساڵی ١٩١٩دا واژۆکرد.

یەکەمین ئەزموونی ئوتریش لەگەڵ سەربەخۆیی خۆش نەبوو. لە دەیەکانی ١٩٢٠دا ئابووریەکەی قەیران بەدوای قەیراندا تووشی وەستان و ئاڵۆزی دەهات، تەنیا بە وامەکانی زلهێزانەوە بەرگەی دەگرت. تەنانەت بەرلە سەردەمی خەمۆکی بێکاری ساڵی سەدی دە بەرزتر بۆوە. لە مانگی مارسی ساڵی ١٩٣٨دا، کاتێکە هیتلێر، بە لەبەرچاونەگرتنی نازیەکانی

ئوتریش، هاتە نێوەوە، ئوتریشیەکان، ئەگەر جوولەکە یان کمۆنیست نەبوونایە، بە ئاسوودەیەکی زیاترەوە مامەڵەیان لەگەڵ *ئانسچلۆس* دەکرد. هیتلێر بەشێوەی مارشی سەربازی لە زێدەکەی خۆیەوە درووست لەسەر سنووری ئوتریش بەرەو ڤیەن ڕۆیشت و هاوکات جەماوەرێکی کەیف خۆش و سەرمەست لەخۆشیان دەیانقیژاند و گوڵیان ئاراستە دەکرد. تەنانەت پیاوانی خاوەن بیروهزری وەک رێنێر بۆ ماوەیەکی کاتی وەلانران. لە ساڵی ١٩٤٥دا ئوتریشیەکی ڕەوشت بەرز سەربەخۆیی ئەو وڵاتەی بەدەست هێنایەوە و ڕێنێری پیر بوو بە سەرۆک کۆمارەکەی. هەر لەو کاتەوە زۆر کەم باسی *ئانسچلۆس* هاتۆتە ئاراوە.

# ٢٠
# مەجارستان

لە ٢٣ی مانگی مارسی ساڵی ١٩١٩دا، کاتێک یەکەمین هێماکانی وەرزی بەهار خەریک بوون سەریان دەردێنا، هەردوو پسپۆڕی ئەمەریکی بە پەشێویەوە لە بۆیس دێ بۆلۆن پیاسەیان دەکرد. کەسێک لە یادداشتنامەکەی خۆی هێنابووی کە " ئێمە تازە لە سەرهەڵدانی ئالۆزیەکانی مەجارستان ئاگادار ببووینەوە، کە، ئەگەر پەرەیان بکردایە، لەوانەبوو بۆ سەردەمێک کۆبوونەوەکانی ئێمەیان پەک بخستایەتەوە."٥٧٦ ئەگەر ئوتریش لە پاریس هۆی نانەوەی دڵەڕاوکێیەکی بچوک بوایە، مەجارستان زەنگی مەترسیداری لێدەدا، بەتایبەت کاتێکە بێلا کۆن، کمۆنیستێکی نەناسیاو، لە بوودابێست دەسەڵاتی گرتەدەست. لەپڕێکدا بیروباوەڕی بۆلشویزم هەنگاوێکی مەزنی بەرەو دەشتی پڕپیت و بەرەکەتی مەجارستان، بەرەو پێگەی هەرە گرنگی ئەوێوە نا. بە بازێکی کورت، دەیتوانی بگەیشتایەتە ئوتریش، کە تازە کەوتبوە ژێر دەسەڵاتی حکوومەتێکی سوسیالیستیەوە، یان ناوچەکانی باڵکان، و بە هەنگاوێکی ترەوە، بەرەو باڤاریا، ئەو شوێنەی کە کمۆنیستەکان بەرەبەرە خەریک بوون لە دەسەڵاتی کورتخایەنی خۆیان نزیک دەبوونەوە. کان بۆخۆی هێماکانی دژایەتی بۆ دەناردن، هاوڕێ لەگەڵ ئەمەش پەیامگەلی دڵنیاکەرەوەی بو ڕێبەرانی هاوپەیمان بەڵام سڵاو و سەباخێری برایانەی بۆ چینەکانی کرێکاری خۆی دەنارد. لەمانە ترسێنەرتر، ئەو پێشنیارێکی بەرەو ڕۆژئاوا بۆ لنین نارد، و داوای گرێبەستێکی لەگەڵ کردبوو. لەوە دەچێ هەردوو وڵاتی کمۆنیستی بیانتوانیایە لەڕێگای ناوچەی جەنگیەوە لە لێوارەکانی ڕۆژهەڵاتی پۆڵەندا و چکسلەواکیا بناخەی پێوەندیەک دامەزرێنن، ئەو شوێنەی کە ئەوترا هێزەکانی بۆلشویکی ناوچە سەرقاڵی مارشی سەربازی بوویێتن.

تەنانەت بەرلەوەی کان بگاتە شوێنەکە، ئاشتیکەران بەگومانەوە باسی مەجارستانیان دەکرد. لەگەڵ ئەوەی کە مەجارستان کەسایەتی گەورەی خاوەن زەوی و زاری باشی هەبوو، جووتێری خاوەن مەڕ و

مەڵات و مێژووی تایبەت بەخۆی هەبوو (ماگیارەکان لە سەدەی نۆهەم لە ئاسیای ناوەندیەوە شاڵاویان هێنابوو)، هەرچی سەیرت دەکرد وەک ئوروپاییەکی تەواو عەیار نەدەهاتە بەرچاو. لیبراڵەکان ڕایان وابوو کە کەم و کورتیە هەرە خراپەکانی ئیمپراتۆریەتی کۆن بخەنە ئەستۆی ئۆلیگارشی مەجاریەکان. لیۆد جۆرج کاتێکە بۆ یەکەم جار هەواڵەکانی بەگوێ گەیشت بە هاوکارەکانی خۆی لە شۆڕای چوارياریدا ڕایگەیاند کە " باسی سەرکوتکردنی شۆڕش لە مەجارستان زۆر بەگوێمان گەیشتوە. من نازانم ئێمە بۆ دەبێ وابکەین: هیچ وڵاتێک ئەوەندە پێویستی بە شۆڕش نیە. هەر ئەمڕۆکە، لەگەڵ کەسێک وت و وێژم کرد کە سەردانی مەجارستانی کردوە و باش شارەزای ئەوێیە؛ ئەو بە منی ڕاگەیاند کە ئەم وڵاتە خراپترین سیستەمی خاوەنداریتی زەوی و زاری لە ئورووپادا هەیە. جووتیارانی ئەوێ بەقەد جووتیارانی سەدەکانی ناڤین دەچەوسێنرێنەوە، یاسای دەرەبەگایەتی ئیستاش کە ئیستایە بەسەر ئەوێدا زاڵە."٥٧٧

ئەم کەرەتە لیۆد جۆرج زۆر بە هەڵەدا نەچووبوو. بووداپێست پێتەختێکی پێشکەوتوو و ڕازاوە بوو، بەڵام ناوچەگوندنشینەکانی وڵات، کە بەشێکی زۆر لە سامانی مەجارستانیان بەرهەم دەهێنا، جیهانێکی جیاواز بوو. لە ساڵی ١٨٤٨دا سیستەمی دەرەبەگایەتی پووچەڵ کرابۆوە، بەڵام بەشێکی زۆر لە زەوی و زارەکان هێشتا لە پارێزگا گەورەکاندا، لەلایەن دەرەبەگەکانەوە، خانەدانەکان یان کەلیساوە ڕادەگیران و بەڕێوەبەرایەتی دەکران. لە ساڵی ١٩١٤دا شازادە ئیستێرهازی خاوەنی ٢٣٠،٠٠٠ هێکتار زەوی بوو؛ یەکێک لە باپیرەکانی ئەو دەستێک جل و بەرگی لەبەردابوو کە هەمووی ئەو دوگمانەی کە پێوەی بوون لە ئەڵماس درووست ببوون و هەمووی تیکەی دروومانەکان بە مرواری دەستنیشان کرابوون. بنەماڵە گەورەکان زۆر بەهایان بە دین نەدەدا و جیهانی و نێونەتەوەیی بیریان دەکردەوە و لە ڤیەن و لە پاریس خانوویان هەبوو، کە لەو خانووانەدا پەرەستار و ئەسپەوانی ئینگلیزی هەبوون، کابانی فەڕەنسەیی و مامۆستای مووزیکی ئەڵمانی هەبوون. ئەوان زۆر بە ئاسانی بە زمانی فەڕەنسەیی یان لاتینی قسەیان دەکرد، و شارەزایی کەمیان بەسەر زمانی مەجاریەکاندا هەبوو. ئەوان ڕێبەرانی سیاسی، ژەنەڕاڵ، جارجارەش تەنانەت چاکسازی لیبراڵیان بەرهەم دەهێنا، بەڵام زۆربەیان هەتابڵێی کۆنەپارێز بوون و بە هەرشتێک کە لە دەرەوەی جیهانی خۆیان بایە زۆر لەگەڵی هەڵیان نەدەکرد. ئەوان بڕوایان بە جوولەکەکان نەبوو، هەرچەند پیشەسازان و بانکدارانی دەوڵەمەندی جوولەکە خەریک بوون لەگەڵ منداڵانی ئەوان دەستیان دەکرد بە درووستکردنی ژیانی هاوسەری؛ ئەوان باوەڕیان بە ڕاگرتنی نا-مەگیارەکان، کرۆواتەکان، سلۆڤاکەکان یان ڕۆمانیەکان بوو کە دەبێ زیاتر لە نیوەی حەشیمەتی مەجارستانی پێش شەڕیان لەخۆ گرتبێت، و بەتوندی لەژێر چاوەدێری دابوون.٥٧٨

کابرایەک بەناوی بێلاکان کە لە مانگی مارسی ساڵی ١٩١٩دا لەسەر تەختی دەسەڵاتداریێتی لاچوو یەکێک لە گەورەترین خاوەن زەویەکانی ئەو سەردەمە بوو. مایکێل کارۆلی، کە لە دوایەمین ساتەناخۆشەکانی شەردا دەسەڵاتی گرتە دەست، خاوەنی ٦٠،٠٠٠ هێکتار زەوی، کارخانەی شووشەسازی، کانزای خەڵووز، خانوویەکی گەورەی تایبەت لە دێهاتدا، خانوویەکی دەرەبەگانە لە بووداپێست و چەندین خانووی تایبەت بە ڕاوکردنی هەبوو. کاتێکە ئەو باندێکی گیپسی لە چێشتخانەیەکدا لەسەر نرخی ئاسایی خۆی کری، مامۆستا تایبەتیەکەی ئەو گێڕابوویەوە، سەرلۆمەی کردبوو. " من دەبێ لانی کەم دوو ئەوەندە زیاتر لە خەڵک پارە بدەم، چون نابێ لەبیرم بچێ کە من کاونت کارۆلیم پێ دەڵێن." چارەنووس زۆر شتی پێ بەخشیبوو بەڵام هێشتا هەر کەسری هەبوو. ئەو منداڵێکی پەژار و تەنیا و ناشیرین بوو و هەمیشە قەڵیشێکی زکماکی بە ئاسمانەی دەمیەوە هەبوو. یەکەم جار کە سەری لە کۆمەڵگای مەجاری هەڵهێنا و دەوروو بەری بە خزمان و خزمەتگوزارانی پارێزەر گەمارۆ درا، زۆر بەخۆیدا شکاوە کاتێکە خەڵک پێی پێکەنین و ژنان لە هاتنەپێشێی ترسێنەرانەی ئەودا خۆیان بوارد و جوابیان نەدایەوە.٥٧٩

کارۆلی لاو شێتانە خۆی لە هەموو شتێک هەڵدەقوتاند. بە کەڵەگایی دەیەویست خۆی بکا بە وتاربێژ و لەسەر سیاسەت دەڕۆیی. ئەو قوماری دەکرد، ئەو دەیخواردەوە، ئەو ماشێنە خێراڕۆکانی زۆر خراپ لێدەخوڕی. ئەو لە بووداپێستدا لە هەمووکەس تەڕپۆشتر بوو، و دواتریش هەتابڵێی خولیای مۆد و شت و شوێنی سەردەمیانە بوو. زۆر نەشیاوانە یاری هۆکی دەکرد، شمشێر بازیەکەی هەرلەڕوی زۆرەملییەوە بوو، یەکەمین بلیتی هەڵفڕینی بەرەو شار دەگرت. ئەو لە ئێوارەخوانەکانی تایبەت بە ڕاوکردن وەڕەز بوو و لەبەرانبەریاندا بڕۆکانی هەڵدەتەکاند، و کاتێکە سەرجێی کردن لەگەڵ کیژۆڵەیەکی گوندنشینی ڕەد کردەوە لە پیاوبوونی خۆی کەوتە گومانەوە (بەپێی داب و نەریتی ئەو شوێنە بە هەمووی میوانانی نێرینەی بەشداربوو لە یاریەکە دەکوترا). بیروباوەڕەکانی ئەو لانی کەم بەپێی پێوەرەکانی جیهانی خۆی، توندڕەوانە بوو. بەرلەوەی شەڕ دەست پێبکات کەسانی زۆر سەیر سەردانیان دەکرد: سوسیالیستەکان، سیاسەتمەدارانی چینی-مامناوەندی، ڕۆشنبیران.٥٨٠

کاتێکە شەڕ دەستی پێکرد، کارۆلی خۆی تێهەڵقورتاند. (فەوجە سەربازیەکەی ئەو لە چالاکی دەستی ڕاگرت هەتا خێزانەکەی ئەو لە یەکەمین زکێک کە بووی بۆوە.) لە ساڵی ١٩١٨دا، ئەو داوای ئاشتیەکی جیاوزای لەگەڵ هاوپەیمانان و، لە ئاکامدا، کۆتایی هێنانی یەکیەتی لەگەڵ ئوتریش کرد. لە ٣١ی مانگی ئۆکتۆبردا کارۆلی بوو بە سەرۆک وەزیری مەجارستان؛ دوو حەفتە دواتر ئەو دەوڵەتی کۆماری ڕاگەیاند. ئەمەریکیەک لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە " ئەو لە هەڤاڵێکی

زۆر باش دەچێت، بەڵام دڵەڕاوکێی زۆرە و هەمیشە دڵەخورپەیەتی، کە ڕەنگە جێی سەرسووڕمان نەبێت."٥٨١ چیتر سووپا ملکەچی دەستوورەکان نەدبوو، بەڕێوەبەرایەتی مەدەنی هەڵوەشابۆوە، سیستەمی ڕاگواستن تووشی وەستان هاتبوو و پارە خەریک بوو نرخەکەی خۆی لە دەست دەدا.

مەجاریەکان، کە ناوچە بندەستەکانی خۆیان خەریک بوو لە کیسیان دەچوو، ڕۆڵی پارێزەرانەیان گرتە دەست. ئامۆزایەکی ئیمپراتۆر، کە خۆی بەناوی جەو هابزبێرگ ناساندبوو، نامەیەکی بۆ جۆرج ڤی لە لەندەن نووسیبوو و تێیدا پێشنیاری کردبوو کە مەجارستان ببێت بە بەشێک لە ئیمپراتۆریەتی بەریتانی. بەڵکوو، مەجاریەکان بە تەمابوون، ئەوان بتوانن شازادەیەکی ئینگلیزی بە قەرز بگرن. وەکوو ئەڵمانیەکان و ئوتریشیەکان، ئەوانیش هیوادار بوون کە بەڵکوو شۆڕشە کۆماریەکەیان هاوپەیمانان نەرم بکاتەوە. ئاکادمی مەجارستان هانای بردە بەردەم تویژەرانی ناوداری هاوپەیمانی کە ڕێگە نەدەن مەجارستان لە ئەندامەتی بکرێتە دەرەوە. کارۆلی فمینیستێکی ناوداری وەک نوێنەری خۆی نارد تا لە وڵاتی سوئیسی بێ لایەن لەگەڵ هاوپەیمانان دانووستان بکات، وای دانابوو، هەرچەند دواتر دەرکەوت کە بەهەڵەچوبوو، کە ئەمە بەڵکوو بتوانێ سیمای تازە و لیبراڵی مەجارستان دەربخات. (ئەو سوئیسی کۆنپارێزی سەرسام کرد و زۆربەی کاتەکانی خۆی تەرخانی مشت و مڕکردن لەگەڵ ستافەکەی خۆی کرد.) چێشتخانەیەکی ناوداری بووداپێستی وەک ڕێزنان لە مارشال فۆچ دەفرێکی خواردنی کرد بە ناوی ئەوەوە. (بەداخەوە، بە زمانی مەجاری وەک "شۆربای سکچوون" ناوی دەرکرد.")٥٨٢

وەکوو هەموولایەکی تر، مەجاریەکان چاویان بڕیبوە ئەمەریکیەکان. پلاتفۆرمی ئاشتی ئەو، کاریل ئەمەریکیەکانی لە بووداپێست دڵنیا کردبۆوە، بریتی بوو لە " ویلسۆن، ویلسۆن، ویلسۆن." سەرتاسەری شارەکە بە وێنەی ویلسۆن و درووشمی " ئاشتی ویلسۆنی تەنیا ئاشتیە بۆ مەجارستان" ڕازابۆوە. مانای ئەوە، لانی کەم بۆ مەجاریەکان، خود-موختاری نەبوو بۆ کەمینەکانی ناو مەجارستان بەڵکوو بەو مانایە بوو کە وڵاتەکەی ئەوان پێویستە سنوورە لەمێژینەکانی خۆی بپارێزێت. باسی سویس، شوبهاندنێکی بەجێ لە ئورووپای ناوەندیدا، باسی ئۆتۆنۆمی هەرێمی، و باسی زمان و مافەکانی تر ببوە بنێشتە خۆشەی سەرزاران. حکوومەتی کارۆلی بۆ ئەم مەبەستە دەستی کرد بە پەسەندکردنی یاساگەلێک.٥٨٣

هات و هاوارەکانی مەجاریەکان هیچ سوودێکیان نەبوو. هاوپەیمانان سەبارەت بە مەجاریەکان هەر گومانداار مانەوە. ئایا کارۆلی بەڕاستی وەک بۆخۆی بانگەشەی بۆ دەکرد لیبراڵ بوو؟ ئەو، بەگشتی، بەگزادە بوو، خزمایەتی لەگەڵ پیاوانێک هەبوو کە مەجارستانیان بە شەر دادابوو. ئەگەر

بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان سارد و سڕ بوون، فەڕەنسەیەکان هەتابڵێی نەیار و توخس بوون. تەنیا ئیتالیەکان بوون کە هاوسۆز و هاوخەم بوون ئەویش زۆر سادە بەهۆی ئەوەوە بوو کە بەتەمابوون مەجارستان دژ بە یۆگۆسلاڤیا بەکار بێنن. ئەوە کە هەم چکسلەواکیا و هەمیش ڕۆمانیا دەیانتوانی داواکاریەکانی خۆیان وەک هاوپەیمانان پێشکەش بکەن مەجارستانی یارمەتی نەدەدا. و تەنانەت ئەم حەقیقەتەش کە لە کۆمیسیۆنی چکسلەڤاکیا و لە کۆمیسیۆنی تایبەت بە ڕۆمانیا و یۆگۆسلاڤیا سنوورەکانی مەجارستان پارچەپارچە بوون، نەیتوانی یارمەتیدەر بێت. نیکۆلسۆن کە نوێنەرایەتی بەریتانیای لەسەر هەرکیان دەکرد دانی پێداهێنا، "تازە زۆر درەنگ کەوتبوو کاتێکە زانرا کە ئەم دوو لێژنە جیاوازە لەدەستدانی ناوچەکان و حەشیمەتێک کە، ئەگەر یەکیان بگرتایە، بەڕاستی بەهێز دەبوون، لەنێوان خۆیاندا بەسەر مەجارستانیاندا سەپاند."٥٨٤

تارادەیەک سپاس بۆ فەڕەنسەیەکان، کە هێزەکانیان بەشێکی زۆر لە هێزەکانی هاوپەیمانیان لە ئورووپای ناوەندی لەخۆگرتبوو، مەجارستان پێشتر کۆنترۆڵی بەشێکی زۆری لە ناوچە بندەستەکانی خۆی لە دەست دابوو بەرلەوەی کە کۆڕی ئاشتی دەست بە کارەکانی بکات. کاتێکە کرۆلی و هاوکارەکانی لە مانگی نوامری ساڵی ١٩١٨دا گەیشتبوونە بێلگراد تا خۆیان بدەن بە دەستەوە، ئەوان بە گەشبینیەکی تەواوەوە هاتبوون، پۆستکاردگەلێکیان پێبوو کە هێنابوویان بۆ ژەنەڕاڵی فەڕەنسەیی بەناوی لویس فرانچێت دئیسپرەی تا بەڵکوو واژۆی بکات. ئەو بەخێرهاتنێکی ساردوسڕی لێکردبوون، داواکاریەکەی ئەوانی بۆ نوێنەرایەتی مەجارستان ڕەدکردبۆوە. ئەو وتی کە " من شارەزایی باشم بەسەر مێژووی ئێوەدا هەیە. ئێوە لە وڵاتەکەی خۆتان کەسانێکتان چەوساندۆتەوە کە مایگاری نین. ئێستا ئێوە چکیەکان، سلۆڤاکیەکان، ڕۆمانیاییەکان، یۆگۆسلاڤیەکان وەکوو دوژمنانی خۆتان سەیریان دەکەن؛ من ئەم خەڵکانەم لەناو دەستە خاڵیەکانی خۆم ڕاگرتوە؛ بێتو ئەمن واژۆیەک بکەم هەرهەمووتان لەبەین دەچن." فەڕەنسەیەکان ڕێگەیان دا بە سێربەکان تا بەرەو باکوو بۆ ناوچەکانی مەجارستان، بە چکیەکان تاکوو دەست بەسەر سلۆڤاکیادا بگرن، و بە ڕۆمانیەکان تا بەرەو ڕۆژئاوا بۆ ترانسیلڤانیای چاوچنۆک هەنگاو بنێن. کاتێکە حکوومەتی مەجاری سکاڵای بردە لای کۆلۆنێل فێردیناند ڤیکس، سەرۆکی ڕاسپاردەی نیزامی فەڕەنسە لە بوداپێست، ئەو سکاڵانامەکانی لێ وەرنەگرتن.٥٨٥

مەجاریەکان ترسی ئەوەیان هەبوو کە داگیرکاریەکانی کاتی لەوانەیە بۆ هەتاهەتایە مافی خاوەندارێتی بەوانەوە نەهێڵن. ئەوان لەناچار وازیان لە کرۆواسی، تەنانەت سلۆڤاکیا هێنا، هەرچەند لە هەردووکیاندا ئەوان بەتەمای سنووری زیاتر بوون تا ئەو سنوورانەی کە لە ئاکامدا بەدەستیان هێنا. ترانسیلڤانیا دووبارە ببوو بە شتیکی تر. لەسەر ئەو تەپۆڵکانەی کە دەشتی مەجارستان لە

ناوچەکوێستانیەکان جیادەکاتەوە، لە چوارچێوەی سەرەتیری کارپاتیانەکان هەڵکەوتوە شوێنێک کە ئەوان بەرەو دەریای ڕەش دەڕوانن. ترانسیلڤانیا نزیک بە نیوەی شانشینی کۆنی مەجارستان دەبوو؛ پڕپیت و بەرەکەت بوو؛ و لەگەڵ مێژووی مەجارستاندا پێکەوە گرێیان خواردبوو.

جوگرافیا بەرگری سرووشتی بە ترانسیلڤانیا بەخشیبوو، بەڵام بە تێپەڕبوونی چەندین سەدە بیانیەکان- ڕۆمانیەکان، ئەڵمانیەکان، سلاڤەکان، ماگیارەکان- ڕێگەی گەیشتن بە ئەوێیان دۆزیبۆوە. لە سەدەی یازدەهەمدا، ئەوێ لەژێر کۆنترۆڵی مەجاریەکان دابوو و هەتا ساڵی ١٩١٨، بەشێوازی جۆراوجۆر، بەوشێوەیە مابۆوە. توێژەرانی ڕۆمانی ئەم مێژوەیان پووچەڵ کردبۆوە، ئەوان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە ڕۆمانیەکان بەرلەهەمووکەسی تر لەوێ بوون. براتیانۆ لە مانگی فەوریەدا بە شۆڕای عالی ڕاگەیاندبوو کە "ئالەم ناوچەدابوو کە نەتەوەی ڕۆمانی دامەزرابوو و لەکڵ دەرهاتبوو؛ و بەدرێژایی مێژوو ئاواتی هەرە پیرۆزی یەکگرتنەوەی سیاسی ئەو ناوچەیە بوە." (براتیانۆ ئاماژەی بەوەنەکرد کە داخوازیەکانی ڕۆمانیا لە سنووره کۆنەکانی ترانسیلڤانیا تێپەر دەبوو، بەشێوەیەکی ڕێک و پێک بەرەو مەجارستان دەڕۆیی.) ئەو لە درێژەی قسەکانیدا هێنابووی کە ڕۆمانیا لە چوارچێوەی گرێبەستی بۆخارێستدا بە ترانسلڤانیا بەڵێن درابوو کاتێکە لە ساڵی ١٩١٦دا کەوتبوە ناو شەڕەوە. ئەمە شتێکی قایلکەر نەبوو، چون هەموولایەک باش لەبیریان بوو کە چۆن ڕۆمانیا لە ساڵی ١٩١٨دا ئاشتیەکی جیاوازیان لەگەڵ ئەلمانیا نابۆوە. لەڕاستیدا، براتیانۆ بەڵگەیەکی زۆر چەسپاوتری دەهێنایەوە: تەنانەت بەپێی ژمێرەناسی مەجاریەکانیش، ڕۆمانیەکان زیاتر لە نیوەی حەشیمەتی ناو ترانسیلڤانیایان لەخۆگرتبوو؛ مەجاریەکان لە سەدا تەنیا ٢٣ی حەشیمەتەکەیان لەخۆگرتبوو، ئەوەی تری دەماوە بۆ ئەڵمانیەکان و کەسانی تر. لە کۆتایی شەڕدا، ئەنجومەنێک لە ڕۆمانیەکانی ترانسیلڤانیا بەشێوەیەکی زۆرینە دەنگیان بە یەکگرتنەوە لەگەڵ ڕۆمانیا دابوو. ئەڵمانیانی دانیشتووی ناوچەکە لە ئاکامدا پشتگری خۆیان ڕاگەیاندبوو. هەڵبەت مەجاریەکان هەروا بەدوژمنی مانەوە. ئاشتیکەران سەبارەت بە کەمینەی مەجاری هەندێک لە ترس و نیگەرانیەکانی خۆیانیان دەربڕی- براتیانۆ وتی کە لەگەڵ ئەوان بەشێوازێکی هەرە لیبراڵ و هەرە دیموکراتیک هەڵس و کەوت دەکرێت- بەڵام باسی ئەوەیان نەکرد کە ترانسیلڤانیا دەبێ بە ڕۆمانیا ببرێت. ئەوەی ڕاستی بێت، فەرەنسەیەکان زۆر پێشتر لەوەی کە مەسەلەی ڕۆمانیا ببیستن بڕیارەکانی خۆیان ساخکردبۆوە.٥٨٦

ئاشتیکەران داوایان لە کۆمیسیۆنی تایبەت بە کاروبارەکانی ڕۆمانیا و یوگۆسلاڤیا کرد تا سنووری تازەی نێوان مەجارستان و ڕۆمانیا دیاری بکات. فەرەنسەیەکان و ئیتالیەکان خوازیاری ئەوەبوون تا کەرتێکی زیاتر لە مەجارستان بە ڕۆمانیا ببەخشن، کەچی بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان

بەدەوای هێڵەکانی ڕەگەزیەوە بوون، کە سنوورەکەیان بەرەو ڕۆژهەڵات گەورە دەکردەوە. بە واتەی یەکێک لە پسپۆڕانی بەریتانی " پێویستە کە هاوسەنگیەکە لەباری سرووشتیەوە بەلای ڕۆمانیای هاوپەیمانی ئێمەدا بشکێتەوە تا بەلای مەجارستانی دوژمنی ئێمە." کۆمیسیۆن لە مانگی مارسدا گوزارشی ناوەڕۆکی سازشەکەی ڕاگەیاند، کە زۆر بەلای جێبەجێکردنی داواکاریەکانی ڕۆمانیا شکابۆوە. کاتێکە دەنگۆی ناوەڕۆکەکانی کۆمیسیۆن گەیشتە مەجارستان، بوونە هۆی ترس و دڵەڕاوکێیەکی زۆر. لەسەر پۆستێرەکان خەریتەکانی مەجارستان هەبوون کە بە چوار پارچە دابەش کرابوون و ئەم پرسیارەیان ئاراستە دەکرد "ڤوولێز-ڤاوسس فەیەری کواتری ئالساسیێ-لۆرەینس؟" (ئایا ئێوە دەتانەوێ چوار ئالساسی-لۆرەین درووست بکەن؟" بەرلەوەی کە شۆڕای عالی بڕیار بدات کە چی بکات، شۆڕش لە مەجارستان سەری هەڵدا، و لکەی بۆلشویزمی بەسەر وڵاتی گەمارۆدراودا دانا.٥٨٧

حکوومەتی کارۆلی لەلایەن لایەنگرانی باڵی ڕاستەوە کەوتبوە بەرهێرش، کە بەدەست هەوڵەکانی تایبەت بە چاکسازی زەویەوە بەڕاستی بە تەنگەوە هاتبوون، و لەلایەن لایەنگرانی باڵی چەپەوە، کە هەستیان دەکرد زۆر لەوەزیاتر درێژەی نابێت. ئاشتیکەران یارمەتیەکی وایان لەدەست نەهات. لە شەش مانگی یەکەمی ساڵی ١٩١٩دا، ئوتریش ٢٨٨،٠٠٠ تۆن خواردەمەنی و جل و بەرگی بەناوی یارمەتی پێگەیشت، کەچی مەجارستان تەنیا ٦٣٥ تۆنی وەرگرت. کارۆلی لە دوورەوڵات بەتووڕەیەوە گێڕابوویەوە کە " بەهۆی بەدخوازی و لێنەهاتوویی نێردراوە جیاوازەکانی بیانی لە بووداپێست ئێمە کێشەکانمان لێ ببوون بە هەزاران کێشە." لە ٢٠ی مانگی مارسدا، کۆلۆنیل ڤیکس دوایەمین گولەی خۆی تەقاند کاتێکە ئەو لە لایەن شۆڕای عالیەوە بڕیارێکی پێشکەش بە کارۆلی کرد بەو مانایە کە لەنێوان مەجارستان و ڕۆمانیا ناوچەیەکی بێ لایەن دامەزرێت. مەجارستان دە ڕۆژ دەرفەتی بوو تا هێزەکانی خۆی بەرەو ڕۆژئاوای ئەم ناوچەیە پاشەکشێ پێبکات، کەچی ڕۆمانیا بۆی هەبوو بەرەو لێواری ڕۆژئاوای خۆی بڕواتە پێشەوە. بەبۆچوونی ئاشیکەران ئەمە بەرگری لە هاتنەئارای تێکهەڵچونەکانی لەنێوان دوو نەتەوەکەدا دەکرد. مەجاریەکان ئەو شێوە تێڕوانینەیان نەبوو.٥٨٨

کاتێکە کارۆلی ئاماژەی بە ڤیکس دەکرد، لە مەجاریەکان داوادەکرا کە درووست لەو ناوچەی کە ڕۆمانیا داوای دەکرد پاشەکشێ بکەن، کەچی هێزەکانی ڕۆمانیایی ڕێگەیان پێدەدرا تا سەد کیلۆمەتر بەرەو ڕۆژئاوا بچنەپێشێ. چ شتێک دەبوایە نەیهێشتایە لەوە زیاتر ئەوان بەرەو مەجارستان بچنەپێشێ؟ ئەو لە درێژەی باسەکەیدا هێنابووی کە ئەگەر ئەو ڕەزایەتی بە درووستبوونی ناوچەیەکی بێ لایەن بدایە، شۆڕش هەڵدەگیرسا و حکوومەتەکەی ئەویش دەڕووخا. ئەو لەژێر لێوەکانیەوە هەر منجەمنجی دەهات و دەیکوت" هەرچی بیری لێدەکەمەوە، من دەبێ خۆشحاڵ بم

لەوەکە بەدەست ئەوەوە ڕزگارم دەبێت." ڤیکس دەستی لێنەدرا؛ ئەو بەردەوام دەیکوتەوە کە ئەوە بابەتی سیاسی نەبوو. پێویستە کە مەجاریەکان هێور ببنەوە و دوامۆڵەت لە پاریس وەرگرن. ئەو دڵنیا بوو لەوە کە هاوپەیمانان ڕۆمانیا بەرتەسک دەکەنەوە. کارۆلی وتی کە لەوانەیە ئەوان بتوانن گشت ناوچەکە داگیربکەن: " ئەویێ بکەن بە کۆلۆنی فەرەنسە، یان کۆلۆنی ڕۆمانیا، یان کۆلۆنی چکسلەڤاکیا." ڤیکس شانێکی هەڵتەکاند. ڕۆژی دواتر حکوومەتی کارۆلی ڕوخا و لە وڵات دووریان خستەوە.٥٨٩ ئەو لەسەر چۆمی ڕیڤێریای فەرەنسەیی لە ساڵی ١٩٥٥دا کۆچی دوایی کرد.

جێگری کارۆلی، وەک خۆی پێشبینی کردبوو، شۆڕشگێڕێک بوو. بێلا کۆن خەڵکی گوندێکی بچوک بوو لە ترانسیلڤانیا و کوڕی دادنووسێکی مەست و ماخولیا بوو. (باوکی ئەو جوولەکەیەکی ناچالاک بوو، حەقیقەتێک کە دواتر لەلایەن دژە-سێمیتەکانەوە وەک بەڵگەیەک لەسەر پیلانی بەربڵاوی جوولەکەیی-مارکسیستی دەستی بەسەرداگیرا.) کۆن پیاوێکی جوان چاک و تەرپۆش و لە هەمان کاتیشدا لووت بەرز، خۆ-بین و قراوی بوو. بێجگە لەمانە، بەگشتی ئەویان بە خوێنتاڵ دەزانی. سەرێکی گەورەی پێوەبوو کە بە جەستەیەکی لەڕ و لاوازەوە بەند بوو. لووت پان و گوێ پان بوو. بەرلە دەستپێکردنی شەر وەک ڕۆژنامەنووسێکی توندئاژۆ و توندڕەو ناوێکی بۆخۆی کردبۆوە. لە ساڵی ١٩١٤دا، ئەو پێوەندی گرت و دژ بە ڕووسەکان لە بەرەی جەنگی ڕۆژهەڵات، شوێنێک کە ئەوی لێ دەستگیرکرا و حەواڵەی کەمپی زیندانیانی شەڕ کرا، شەڕی کرد. شۆڕشی ڕووسی لە ساڵی ١٩١٧دا گۆڕانکاریەکی گورجی هەم لە سیاسەتی ئەو و هەمیش لە سەروەت و سامانی ئەودا درووست کرد. لە ساڵی ١٩١٨دا ئەو ئازادکرا و لە مۆسکۆ لەگەڵ لنین و بۆلشویکەکانی تر و ڕێبەری بزووتنەوەی تازەی کمۆنیستی مەجارستان کۆبۆوە. لە کۆتایی شەڕدا، دوا ئەوەیکە هاوڕێکانی بەڵگەی تەلایی و ساختەییان بۆ درووست کرد، کۆن بۆ مەبەستی پەرەدان بە شۆڕش گەڕایەوە بۆ مەجارستان. کاتی ڕووداوەکە کاتێکی گونجاو بوو.٥٩٠

کۆن وەکوو گێژەڵووکەیەک خۆی کرد بەناو سیاسەتی ئاڵۆزاوی مەجارستاندا، دەستی کرد بە دەرکردنی بەیاننامەی سیاسی و داواکاری، و نانەوەی مانگرتن و خۆپیشاندان. کاتێکە پۆلیس لە بووداپێست وەک دۆل کۆتابوویان نازناوی شەهیدی پێبەخشرا. لە ٢١ی مانگی مارسدا، ڕۆژێک دوای ڕاگەیاندنی ئۆلتیماتۆمی هاوپەیمانی، هاوپەیمانانی سوسیالیستی کارۆلی لەناو حکوومەتدا هاتن بۆ زیندان تا سەردانی کۆن بکەن؛ ئەوان ئامادەبوون تا بە کمۆنیستەکان دەسەڵاتیان تەسلیم بکەن. بێلا کۆن هەر لەوڕۆژەدا بەبێ ئەوەی گولەیەک بتەقێت بە ئازادی، شۆڕش و دەسەڵاتی خۆی گەیشت. ڕۆژی دواتر ئەو کۆماری سۆڤیەتی بۆ مەجارستان ڕاگەیاند.٥٩١

بەبۆچونی ئەفسەرێکی لاوی ئەمەریکی لە بووداپێست، شۆڕش زیاتر ڕەنگ و بۆی ناسیۆنالیستی پێوەبوو تا کمۆنیستی: "ئەو مەجاریانەی کە لەسەر ئەم باوەڕە یەکیان گرتوە کە گوایە مەجارستان نابێ بە هیچ لەونێک لە ئەندام بوون بێتە دەرێ، لە بۆلشویزم وەک دوایەمین ڕێگەچارە کەڵکیان وەرگرتوە تا بەشکەم یەکپارچەبوونی وڵاتەکەی خۆیان بپارێزن." لە پاریس شۆڕای چواریار کەوتبوونە ترس و دڵەڕاوکێ. کلیمینجوو و ڕاوێژکارانی نیزامی ئەو پشتگریان لە ڕۆمانیەکان دەکرد و ڕیگەیان دەدانێ هەم سەبارەت بە بۆلشویکەکانی ڕووسیە و هەمیش مەجارستان ئازادانە بیروباوەڕی خۆیان دەربڕن. فۆچ بە خەریتەیەکی قەبەوە دەرکەوت تا بیسەلمێنێت کە چلۆن ڕۆمانیا دەتوانێ لە نەهێشتنی درووستبوونی بەرەیەکی بەهێزی جەنگی بۆلشویکی لە ناوەندی ئورووپادا ڕۆڵێکی سەرەکی بگێڕێت. ئەو بەشێوەیەکی دڕەندانە وتبووی کە ڕووسە سپی پێستەکان لە ڕوسیەی باشوردا لەبیربکەن؛ ئەوان تازە دۆڕاندبوویان. " بۆیە من بە تۆ دەڵێم: لەسەر ڕۆمانیا حەساب بکەن، چون لەوێ ئێوە نەک تەنیا سووپا، بەڵکوو حکوومەت و خەڵکیشتان لەگەڵە." ویلسۆن دانی بەوەدانا کە ڕەوتی درووستی ڕووداوەکانی لە دەست دانیە. " سەبارەت بە بۆلشویکەکان دەبێ هەڵوێستی درووستی ئێمە چی بێت؟" پێدەچو دامەزراندنی ناوچەیەکی بێ لایەن لەنێوان ڕۆمانیا و مەجارستاندا کارێکی بێ ئەقڵانە بێت: " لەوەناچێت ئەم شێوازە ئاکامێکی باشی خستبێتەوە." ئایا دەبێ کۆڕی ئاشتی بەرەکان هەڵبژێرێت؟ "ئێمە لە حاڵەتی ئاساییدا دۆستانی مەجاریەکانین و تەنانەت دۆستانی باشتری ڕۆمانیەکانین." کلیمینجوو زۆر بە توندیەوە وڵامی دایەوە" مەجاریەکان دۆستانی ئێمە نین بەڵکوو دوژمنانی ئێمەن." لەنێوان هەمووی خەڵکانی مەجارستان-ئوتریشدا، ئەوان لەهەموان لەبەرانبەر خۆبەدەستەوەداندا کەمترخەمتر بوون.٥٩٢

لیۆد جۆرج، کە ئێستا کەوتبوە خۆ بۆ سڕینەوەی دوژمنایەتی کۆن لە گەڵ مەجارستان، لەگەڵ ویلسۆن یەک کەوت. بەگشتی، لەگەڵ ئەمانەدا کرۆواتەکان و سلۆڤێنیەکان هەتا کۆتایی تاڵ و ناخۆش بۆ مەجارستان-ئوتریش خەباتیان کردبوو و ئێستا هاوپەیمانان لەگەڵیان ببوون بە دۆست. " بۆچی نابێ لەگەڵ ماگیارەکانیش بکەونە وت و وێژەوە؟" مەرجەکانی ئاشتی ئەڵمانی دەبێ هەڕەشەیەک بێت بۆ هەرهەمووی ئەوان؛ ئەو کۆتایی حەفتەی لە فۆنتەینبلوو بە سەیرکردنی هەڵەکانی ئەوان ڕایبوارد، واتە، شێوازێک کە ئەوان ئەڵمانیەکانیان لەژێر دەسەڵاتی پۆڵەندیەکاندا جێهێشتبوو. بۆ ئاشتی داهاتووی ئورووپا بە هەمان چەشن مەترسی هەبوو چون ملوێنان مەجاری لەدەرەوەی سنوورەکانی خۆیان دەهێشتەوە. بەهۆی ئەزموونێکە لەگەڵ ڕووسیە هەیانبوو، بێجگە لەمانە ئەو سەبارەت بە دەرفەتەکانی ڕێگەچارەی نیزامی بۆ بۆلشویزم لە گوماندابوو. ئەو کەسانی تری هان

دەدا و دەیکوت کە " دەوەرن با وەک لەگەڵ ڕووسیە مامەڵەمان کرد لەگەڵ مەجارستان وانەکەین. ڕووسیە بەتەنیا خۆی بۆ ئێمە تەواوە." ئەو پێشنیاری کرد کە ئەوان کەسێکی متمانەپێکراو، وەکوو سمووتس، بنێرن تا گوزارشێک لە کۆن و ڕەژیمەکەی ئەو هەڵگرێت. ویلسۆن بەخۆشحاڵییەوە ڕازیبوونی خۆی دەربڕی، کلیمینجوو وانەبوو ئەو دوودڵ بوو. لەژێر گوشاری فەرەنسەیەکاندا، شۆڕای چواریاریش ڕازی بوو بەوەی کە ئازووقەی نیزامی بۆ ڕۆمانیا بنێریت.

لە ئێوارەی ڕۆژی ئەپیرڵ فوولدا، سمووتس و هاریکارەکانی، وەکوو هارۆلد نیکۆلسۆن، بە شەمەندەفەرێکی تایبەت پاریسیان بەرەو بووداپێست بەجێهێشت. وەک دیاربوو، کاری سمووتس هاندانی مەجاریەکان بوو بۆ ئەوە کە ناوچەی بێ لایەنی نێوان مەجارستان و ڕۆمانیا قەبووڵ بکەن؛ مەبەستی سەرەکی ئەو هەڵسەنگاندنی کۆن و بڕیاردان لەسەر ئەوە بوو کە ئایا دەکرێ لە ئەو وەک جۆگەیەکی نافەرمی بۆ لنین کەڵکی لێوەربگیرێت؟ (هاوپەیمانان هێشتا سیاسەتێکی کاریگەریان لەسەر ڕووسیە ساخ نەکردبۆوە.) لەگەڵ ئەوە بەریتانیەکان هیواداربوون بەشکەم ناردراوەکە دژ بە کاریگەری فەرەنسەیەکان لە ئورووپای ناوەندیدا بوەستێت. هەواڵەکان لە بوودابێست هەموولایەکیان سەرسام کرد، چون وەک هێمایەک لێک دەدراوە کە گوایە کۆڕی ئاشتی پاریس ئامادەیە تا حکوومەتی تازە بە فەرمی بناسێت. کۆن خێرا دارایەکانی مەجارستانی- پاشەکەوتەکانی ڕۆنی ئەو وڵاتە- بە ئیتالیای هەرزانفرۆش کرد و دەستووری دا هەمووی ئەو خانووبەرانەی کە لە ویزگەی شەمەندەفەرەوە بەرەو هۆتێلی ناوداری بوودابێست، کە ئەویش بۆخۆی بە ژاکیۆنیەنێکی قەبە و ئاڵایەکی سێرەنگ داپۆشرابوون، لەسەر ڕیدابوون بە برێکی زۆر مەخمەڵی سوور داپۆشن.٥٩٤

کاتێکە ئەو گەیشتە بوودابێست، سمووتس تەنانەت بۆ ساتێکیش بە قسەی نەکرد. ئەو قورس خۆی ڕاگرت و لە شەمەندەفەرە تایبەتیەکەی خۆیدا مایەوە تا کۆن مەجبوور بوو بۆخۆی بچێتە حوزووری. (چەندین مایک مەخمەڵی سوور دەبوایە هەتا مەیدەی[ ڕۆژی مەی] چاوەڕوانی هاتنی ئەوانی بکردایە.) نیکۆلسۆن، کە لە خۆشترین ساتەکانیشدا دۆستایەتی لەگەڵ مەجارستان نەبوو، سەیری کمۆنیستی بە لووتبەرزی چینەکەیەوە کرد. " پیاوێکی بچووکی نزیک بە ٣٠ساڵ تەمەن: دەموچاوێکی سپیکەڵانەی ئەستوور و دەموولێوێکی لیکنی کراوە: سەری تاشراو: نیشانەی قژی سوور بە سەرەوە: چاوپیس و گوماناوی: ئەو ڕواڵەتی ئاژەڵێکی چارەگرژ و گرەزۆکی هەبوو." و وەزیری تازەی دەرەوەی مەجارستان، کە هاوڕێیەتی کۆنی دەکرد، بە هەمان چەشن ئەویش خوێنتاڵ و ڕەزاگران بوو. "کۆتێکی فێری چەوراوی جوولەکەیی لەبەردابوو کە مێلووره تێیدابوو و زۆری خواردبۆوە و یەخەکەی کەراواتێکی چڵکنی سەوزرەنگی پێوەبوو."٥٩٥

وت و ویژەکان، لە چێشتخانەی شەمەندەفەڕەکەدا کە تەنگیان پێ هەڵچندرابوو، بەباشی نەچووپێشێ. کۆن بەدوای ئەوەبوو کە بەفەرمی بناسرێت؛ سمووتس سووربوو لەسەر ئەوەکە لەبەرانبەر ئەمەدا بوەستێت. کۆن خوازیاری ئەوەبوو کە ڕۆمانیەکان بەرەو ڕۆژهەڵاتی ناوچەی بێ لایەن پاشەکشێ بکەن؛ سمووتس ئامادەبوو تەنیا چەند زێدەمافێکی کەم بدات وەکوو ڕێگەدان بە ڕۆمانیا تا ترانسیلڤانیا داگیر بکات. سمووتس بڕیاری هێنا سەرئەوە کە لەوە زیاتر شتێک لە مامەڵەدا نابینێت. لە کۆتایی ڕۆژی دووهەمدا وتی کە " زۆرچاکە بەڕێزان من دەبێ هەرئێستا ماڵئاوایی لە ئێوە بکەم." ئەو زۆر بەڕێزەوە دەستی لێ هەڵێنان و گەڕایەوە ناو شەمەندەفەڕەکەی خۆی، کە ئەویش، بە سەرسووڕمانی مەجاریەکانەوە، وردەوردە لە ویژگەکە هاتە دەرێ و چوە سەر هێڵی سەرەکی.٥٩٦ سمووتس لەو سەردانە کورتەی خۆیدا ئەم ئەنجامەی گرت کە کۆن گەوجەپیاوێک بوو کە حکوومەتەکەی لەوەنەدەچو زۆر بخایەنێت.

بەسەر ئەمانەشدا سمووتس خوازیاری ئەوەبوو، وەک چۆن لە پاریس بە ئاشتیکەرانی ڕاگەیاندبوو، کە ڕەچاوی پێشنیارێکی بەکەڵک بکات کە کۆن ڕایگەیاندبوو: واتە نەتەوەکانی ئوتریش-مەجارستانی پێشوو پێکەوە بانگێشت کرێن تا لەسەر سنوورە هاوبەشەکانی خۆیان و سیاسەتە ئابووریە هاوبەشەکانی خۆیان بە تێروتەسەلی ئیش بکەن. تەنانەت سمووتیش بۆ ماوەیەکی کورت لەگەڵ کەینێس لەسەر پلانێک ئیشی کرد تابەڵکوو بۆ مەبەستی وەگەڕخستنەوەی ئابووریەکانی ناو حەوزی دانووب وامێکی نێونەتەوەیی بگرێت. ئەمانە بیرووبۆچوونگەلێکی هەستیار بوون، بەڵام لە پاریس هیچیان لێ هەڵنەکرا. ئیتالیەکان بەگشتی دژایەتیەکی توندیان هەبوو لەگەڵ هەرشتێک کە شەقەی لە مەجارستان-ئوتریشی تازەبۆوە هەڵدەستاند، و هیچ کام لە هاوپەیمانەکانی تر حەزی تایبەتیان لە وەگەڕخستنی پێشنیارەکانی کۆن نەبوو. هەرچەند ئەوان هەوڵیان دابوو، دوژمنایەتیەکانی دوولایەنەی نێوان جێگرانی مەجارستان-ئوتریش لەوانەبوو تەگەرەیان بخستایەتە سەر گەیشتن بە ئامانجەکە. لەوەدەچو بەدرێژایی دانووب لە سەردەمی ساڵەکانی شەڕدا هیچ جۆرە هاریکاریەک، ئابووری یان شتی تر، نەیەتە ئاراوە. هەرچەند ئەو خەونە هێشتا هەر بە تەواوەتی نەمردوە. کوڕی دوایەمین ئیمپراتۆر، دوکتور ئۆتۆ ڤان هابزبێرگ-لۆترینگێن، کە لە پەرلەمانی ئورووپادا ناسراوە، بێ وچان لە هەوڵی ئەوەدایە کە بۆ هاوکاریکردن لەنێوان ئەو نەتەوانەی کە کاتی خۆی بەشێک بوون لە پێشینیانی ئەو ئەوەی لە دەستی دێت بیکات.٥٩٧

لە مەجارستان ئەو ڕۆژنامانەی کە لەژێر کۆنترۆڵی کمۆنیست دابوون بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە نێردراوی سمووتس مەبەستی ئەوەبوە کە هاوپەیمانان ڕەژیمەکەی ئەوانیان بە فەرمی

ناسیبوو. ئەوان گوزارشیان لەسەر دەرچوونی گوزوگومەتی ئەو نەدا، بەڵام بەشێک لەو ڕووداوانەی کە هاتبوونە ئاراوە دزەیان کرد و هاتنەدەرێ، و ئەوەندەیتر خەڵکیان دڵناخۆشکرد. دەنگۆی ئەوە هەبوو کە گوایە هاوپەیمانان خەریکبوون سووپایان دەنارد تا بووداپێست داگیربکەن، یان ئەوەکە ترۆتسکی و سووپایەکی سوور خەریکبوون لە ڕۆژهەڵاتی باکوور نزیک دەبوونەوە تا پشتگری لە شۆڕشی مەجاری و شۆڕشێک بکەن کە تازە لە باڤاریا هاتبوە ئاراوە. سوورەکانی ئوتریشی لەوەدابوون کە دەست بەسەر ڤیەندا بگرن. کۆمۆنیستەکان خەریک بوون هەزاران کەسیان لە چینەکانی مامناوەندی و باڵادەست دەستگیردەکرد. چەندها پیلانی ڕاست-ئاژۆ بۆ مەبەستی گرتنەدەستی قودرەت، چەندها پلانی چەپ-ئاژۆ بۆ مەبەستی کوشتاری بەکۆمەڵ لە ئارادابوون. هەمووی دەنگۆکان هەڵەیان تێدانەبوو.٥٩٨

ترۆتسکی لەسەر ڕێگەی خۆی نەبوو، بەڵام بۆلشویکەکان بەتەمابوون لەگەڵ هاوڕێیانی کمۆنیستی خۆیان پێوەندی بگرن. لە بێلگراد فرانشیت دی،ئیسپرەی لە هەوڵی ئەوەدابوو یۆگۆسلاڤەکان هان بدات تا بەشێک لە سووپاکەی خۆیان بەرەو باکوور بۆ بووداپێست دژ بە کۆن بنێرن. لە کۆشکێک لە ڤیەن، خانزادەکانی تاراوگەنشین، وەکوو خزموکەسەکانی کارۆلی، بەنهێنی کۆڕیکیان بەستبوو تا پلانێکی دژەشۆڕس برێژن. (لە هێرشێکی جەسوورانەدا بۆ سەر باڵوێزخانەی مەجارساتان،پیلانگگێڕەکان دەستیان بەسەر برێک پارەدا گرت کە کۆن بۆ دەرەوەی وڵاتی ناردبوو؛ بە داخەوە، بەهۆی قرەوقاڵێکە لەسەر چۆن خەرجکردنی پارەکە هەیان بوو نەیانتوانی هیچ تەکانێک بخۆن.) لە گوندەکانی مەجارستان، کە لە هێمنایەتیدا بوو و دوور لە دەستپێڕاگەیشتنی بووداپێستدابوو، ئەفسەرانی سووپا بەڕێبەرایەتی یەکێکی تر لە ئامۆزاکانی کارۆلی پلانی کۆدەتایەکیان دارشت. ئەوان یەکێک کە قارەمانە دەگمەنەکانی شەڕی دەریایی ئوتریش-مەجارستانیان بەناوی ئەدمیراڵ میکلۆس هۆرسیان هان دا تا پێوەندیان پێوە بگرێت.٥٩٩

ڕژیمی کۆن ئاسانکاری بۆ نەیارەکانی خۆی کرد. لە ماوەی ۱۳۳ ڕۆژ دەسەڵاتداریتی خۆیدا چاکسازی درامایی و بەگشتی هێمنانەی هێنا ئاراوە: قەدەغەکردنی ئەلکول، سوسیالیزەکردنی کارخانەکان، دابەشکردنی موڵکە زۆرەکان، پووچەڵکردنەوەی هەمووی نازناوەکان، کولتووری پرۆلیتسری بۆ هەموو لایەک، حەمامکردن بەزۆری و پەروەردەی سێکس بۆ مناڵانی قوتابخانە، سەرلەنوێ دابەشکردنی بەزۆری ماڵ و کەرەسەی ناوماڵ، بەئیستانداردکردنی قەبرەکان. ئەوان بەگشتی هەموو کەرتەکانی کۆمەڵگایان لەیەکتر دابڕاند، لە کاتۆلیکەکانەوە بگرە کە لە پلانگەلێک تۆقێنرابوون کە هەڕەشەی کردنی کەنیسەکان بە سینەمایان لەسەر بوو، تا دەگاتە لیبراڵەکان کە بە سێنسۆڕکردن،

دەستبەسەرکردنی زۆرەملێی پۆلیسی نهێنی تۆقێنرابوون. ڕای گشتی بەگشتی ڕژێمی لەسەر هەڵنەکردن لەگەڵ هەڵسانی نرخەکان و کەموکورتیەکان، و گەندەڵی ناوخۆ مەحکووم دەکرد..٦٠٠

هەڵبەت ئەوەی کە لە ئاکامدا کۆتایی بە حکوومەتی کۆن هێنا دوژمنانی دەرەوەی ئەو وڵاتەبوون. لە مانگی ئاڤریلدا، حەفتەیەک دوائەوەکە سمووتس بوودابێستی چۆڵ کرد، سووپای ڕۆمانیا، بە ئاماژەیەک و بە چاوداگرتنێک لەلایەن میلیتاری فەرەنسەیەکانەوە، لەرێگەی ناوچەی بێ لایەنەوە هێرشی بردەسەر بوودابێست. چکەکان چەند ڕۆژ دواتر بەرەو باکوور وەڕی کەوتن. لە پاریس ڕۆمانیەکان، وەکوو چکسلەواکیەکان ، ڕایانگەیاند کە ئەوان هیچ تاوانێکیان لەسەر نیە. براتیانۆ بە شۆڕای چواریاری ڕاگەیاند کە " ئەمن لەوە دەترسم کە ئێوە زانیاری تەواوتان سەبارەت بە ڕۆڵی سووپای ڕۆمانی و ورووژاندنەکانی مەجاری نیە." بزووتنەوەکانی ئەوان بەگشتی پارێزەرانە بوو. ئەوانە هەرهەموویان چەتەی بچوک بچووکن کە دەیانەوێت ناوچەی زیاتر بۆخۆیان داگیر بکەن. کاتێکە ڕۆمانیەکان بەرەو ڕۆژئاوای ئەو ناوچانەی کە داوایان دەکرد وەڕی کەوتن، تەنانەت کلیمینجووش داواکاریەکانی ئەوانی لا زۆر بوو. و ئەو سەبارەت بە ماناگەلی سیاسی دڵەراوکێی لە دڵ دابوو: هەر باڵی چەپی خۆی ترسی ئەوەیان لەدڵ دابوو کە ئەو دژ بە کمۆنیستەکانی مەجاری پلانی دەستێوەردان بڕێژێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو سەبارەت بە ورەی هێزەکانی فەرەنسەیی کە چاودێری ئاگربەستەکەیان لە ئورووپای ڕۆژهەڵاتدا دەکرد گوزارشی سەیر سەیریان پێدەگەیشت.٦٠١

مەجاریەکان بۆ ماوەیەکی کاتی خۆیان کۆکردەوە و ڕێکەوتن. تەنانەت ئەفسەرانی کۆنەپارێزی سووپاش بێلا کۆنیان لا باشتر بوو تا ڕۆمانیەکان. ڕژیم، بەش بە حاڵی خۆی، زمانی شۆڕشی پرۆلیتاری سڕیەوە و هەەر وا ئاسان دەستەوداوێنی بیروباوەڕی نیشتمانپەروەری بوو. فیداکەران هرووژمیان هێنا تا پێوەندی بە سووپاوە بگرن. ئیتالیەکان کە بەگشتی هاندەرەکەیان دوژمنایەتی ئەوان بوو لەگەڵ دوژمنێکی تری دراوسێی مەجارستان، واتە یۆگۆسلاڤیا، چەک و تەقەمەنیەکانی کۆنیان فرۆشت. بەبۆچونی چاودێرێکی بەریتانی، بێجگە لەمانە ئەوان زانیاریەکانی تایبەت بە پلانەکانی هاوپەیمانیان پەسەند دەکرد. لە نێوەڕاستی مانگی مەیدا هێزەکانی مەجاری پاڵیان لە چکەکان نابوو بۆ دواوە و لەنێوان ئەوان و ڕۆمانیەکاندا پوازێکیان دانابوو.٦٠٢

لە پاریس لە سەرەتادا ئاشتیکەران ملیان بۆ ئەمە کەچ نەکرد. ویلسۆن لای وابوو کە مەجاریەکان پارتێکی بێ تاوانن بەڵام پرسیارێکی زۆر نەشیاوانەی ئاراستەکرد: " ئایا ئێمە شێوازێکمان پێ شک دێت بۆ بەرگریکردن لە بزووتنەوەی ڕۆمانیەکان؟" لیۆد جۆرج و کلیمینجوو توانیان تەنیا پێشنیاری بەتوندی قسەکردن بدەن بە براتیانۆ. پێویستە دان بەوەشدا بنێین کە ئەوان بە

تێگچونی پێوەندی لەگەڵ ئیتالیەکان لەسەر فیۆم سەرسام مان. کاتێکە شۆڕای چواریار چاوی بە پێشنیارگەلی پسپۆڕەکانی خۆی کەوت لەسەر سنوورەکانی مەجارستان لەگەڵ ڕۆمانیا و چکسلەواکیا لە دووهەمین حەفتەی مانگی مەیدا، بەبێ هیچ قسەوباسێک پەسەندی کردن.٦٠٣

ئاوری شەڕ بەخێرایی پەرەی سەند، سەرنجی ئاشتیکەرانی بۆلای خۆی ڕاکێشا. لە مانگی ژوەندا ڕۆژنامەنووسێکی بەریتانی کە تازە لە مەجارستانەوە گەیشتبوە بەرەوە بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ لەگەڵ لیۆد جۆرج و ڕاوێژکاری نیزامی ئەو، هێنری ویلسۆن، بانگێشت کرا تا لەسەر بارودۆخەکە بکۆڵنەوە. ئەو سەرۆک وەزیری بەریتانیای زۆر کەیفخۆش هاتەبەرچاو؛ ئەوان بەیەکەوە چاویان لە خەریتەی ئورووپای ناوەندی کرد. لیۆد جۆرج ئێستا تاوانی ئاڵۆزیەکەی دەخستە ئەستۆی چکسلەواکیا و ڕۆمانیەکان. ئەو لە درێژەی باسەکەیدا ئاماژەی بەوەکرد کە " من لام وایە کە مەجاریەکان لە هەموان باشترن. ئەوان بەهێزترین ڕەگەزن و هەمیشە دەستیان بەسەر کەسانی تردا ڕۆیوە." ئەوان لەسەر دەستێوەردانی هاوپەیمانی دژ بە بێلا کۆن وت و وێژیان کرد. هێنری ویلسۆن بە دڵتەنگیەوە پرسیاری کرد" هێزەکان دەبێ لەکوێوە هاتبێتن؟" لیۆد جۆرج پشتگری لەم بۆچونە دەکرد کە گوایە بۆلشویزم لە ئاکامدا گرێبەستەکە پێشیل دەکا و بە قسەی ناکات. ئەو کەیفی بە ئەم وتوویژە ساز بوو؛ هەرکۆتایی ئەو ڕۆژە بە هاوکارەکانی خۆی ڕاگەیاندبوو کە ئەوە کاریگەری دەبێت. ڕۆژنامەنووسەکە لە ئاکامی قسەکانی خۆیدا هێنابووی کە " ئاشکرا بوو کە شۆڕای چواریار سەبارەت بە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئەڵمان زۆر کەمترخەم بوون، زیاتر سەریان قاڵ بوو بە تاوانباری سەرەکی بۆ ئەوەکە نۆکەرانی کەم دەسەڵات ئازار و ئەشکەنجە بدات."٦٠٤

شۆڕای چواریار یەکبەدوای یەک هەڕەشە و گوڕەشەکانی خۆی دەنارد، وەک چۆن بەسەر پۆڵەندی داهێنابوو و سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەست نەهێنابوو. بە ڕۆمانیەکان ڕاگەیەنرابوو کە پێویست ناکات ئەوان بوودایپیست داگیربکەن. براتیانۆ ڕەوتێکی ڕەوشتبەرزانەی گرتەبەر و وتی کە " ئێمە خوازیاری ئەوەبووین کە بە ڕۆحیەتێکی یەکگرتوویەوە لەگەڵ ئانتێنتێ بەرەو پێست بە مارشی سەربازی بڕۆین تا لە دوبارە-دامەزراندنەوەی دەستووردا دەستێکمان هەبوویێت." ئەمە بانگەشەیەکی ئاشنا بوو؛ تۆمەتی بەردەوامی ئەویش هەر ئاشنا بوو واتە هاوپەیمانان خەریک بوون بەدوای خزمەتە گەورەکانی ڕۆمانیا لە سەدەمی شەڕدا بە سوکایەتیەوە مامەڵەیان لەگەڵ دەکرد. مەجاریەکان دەستووریان پێدرا کە دەست لە شەڕکردن هەڵگرن. کۆن لە وڵامدا وتی کە ئەگەر ڕۆمانیا و چکسلەواکیا دەست لە شەڕکردن هەڵگرن مەجارستان ئامادەیە.٦٠٥

هاوپەیمانان نەیاندەزانی دوائەوە چی بکەن باشە. میلیتاری فەرەنسەیەکان خوازیاری ئەوەبوون کە سووپایەک بنێرن کە لە هێزەکانی رۆمانی، یۆگۆسلاڤی و فەرەنسەیی درووست بوبێت تا بەشێک لە مەجارستان کە مابۆوە داگیربکەن؛ ئەمەریکیەکان ئاماژەیان بەوەدەکرد کە رۆمانیەکان کەرەتێک هاتبوونەژووریَ و لەوانەبوو هەر قەت ولآت چۆڵ نەکەن. لیۆد جۆرج ئاماژەی بەوەدەکرد کە لەوانەیە ئەوان بۆ سەر ئەو ئازووقانەی کە بەرەو رۆمانیا دەچن مەترسی درووست کەن و بیانبرن. لە ١٢ی مانگی ژوەندا، شۆرای چواریار لەسەر ناردنی چەند تێلێگرام بۆ مەجارستان، چکسلەواکیا و رۆمانیا ریکەوتن، و ئەوانیان لە سنوورە تازەکانی خۆیان کە بریاربووو پێیان برێت ئاگادارکردبۆوە و دەستووریان پێدابوون هێزەکانی خۆیان بەرەو ناوچەکانی خۆیان بکێشنە دواوە. لەوە دەچوو داگیرکاری زەوی و زار بە هەرشێوەیەک کۆتایی پێهاتبێت؛ هاوپەیمانان "بە بەکارهێنانی سەرەرۆیانەی شێوازگەلی میلیتاری" نەدەهاتنە سەر ئەوەکە بریارەکانی خۆیان بگۆرن. بۆ ئەوەکە دڵنیا ببنەوە لەوە کە هێزە جۆراوجۆرەکان پاشەکشێ دەکەن نوێنەری ئەمەریکی، ژەنەرال بلیس، راسپێردرا. ئەو بۆ خێزانەکەی خۆی نووسیبووی کە "خۆخاڵیکردنەوە بەسەر پیاوێکی ئاشتیخواز و ئاشتیخۆشەویست کارێکی باشە، وانیە؟"٦٠٦

لیۆد جۆرج هۆشداری بە ویلسۆن و کلیمینجوو دەدا کە " پێویستە ئێمە هەرئێستا ئیرادەی خۆمان بسەپێنین؛ چیتر ناتوانین دەستووری هیچ و پووچ بەم و ئەو بدەین." بەڵام شەرکردن درێژەی هەبوو. رۆمانیەکان نەیاندەویست بەرەو رۆژهەڵات بگەرێنە دواوە. ئەو دەیکوت کە براتیانۆ لە هێرشێکی هاوکات دەترسێ لەلایەن کۆن و بۆلشویکەکانی روسیەوە، یان رەنگە هێرشێک لەلایەن بۆلغارستانێک کە بە واتای ئەو هەتا بینەقاقای چەک کرابوو. لە مانگی ژوولایدا، مەجاریەکان داوای لیبوردنیان لێکرد لەبەرهۆی ئەوەکە دەستیان بە دەستدرێژی کردبۆوە کاتێکە کۆن، لە دوایەمین قوماری نائومیدی خۆیدا، هەوڵی دا رۆمانیەکان حەوا داتە ئەوپەری چۆمی تیسزاوە، نزیک بە سەد کیلۆمەتر لە رۆژهەڵاتی بووداپێستەوە. رۆمانیەکان بە ژمارەیەکی یەکجار زۆرەوە دژەهێرشێکیان سازکرد. چەندین لە یەکەکانی سووپای مەجارستان کە لە دەوروبەری ئەدمیراڵ هۆرتی لەگەڵ باڵی دژبەر لەپێوەندی دابوون شەریان راگرت، و هێڵەکانی بەرەی جەنگی مەجاری هەپروون بە هەپروون بوون. کۆن بەرەو ئوتریش و دواتریش بەرەو یەکیەتی سۆڤیەت هەڵات. ئەو لە ماوەی بژارکردنەکانی ستالین لە ئەندامانی ناپاک لەوێ دەستبەسەرکرا، بە هاودەستبوون لەگەڵ پۆلیسی نهێنی رۆمانیایی تاوانبارکرا، و لە پاییزی ساڵی ١٩٣٩ لە دار درا.٦٠٧

* * * *

لە ٣ی ئۆگستی ساڵی ١٩١٩دا، هێزەکانی ڕۆمانیایی چونە ناو بووداپێستەوە. یۆگۆسلاڤیەکان و چکسلەواکیەکان لە دەرفەت کەڵکیان وەرگرت تا بەرەو ناوچەکانی مەجارستان بەدرێژایی سنوورەکانی خۆیان دەستدرێژی بکەن. سەرەڕای گلەو گازەندەیەکی زۆر لەلایەن هاوپەیمانانەوە، هەمووی دوژمنانی مەجارستان هەر لەوشوێنەی کە لە پاییزی ساڵی ١٩١٩دا مابوونەوە سەقامگیربوون. زنجیرەیەک لە حکوومەتە لاوازەکانی مەجارستان نەیانتوانی نە لەگەڵ ئەوان و نە لەگەڵ هێزەکانی هۆرتی، کە لە ناوچەگوندنشینەکان لە هێزێکەوە بەرەو هێزێکی تر دەڕۆیشتن دانووستان بکەن. نوێنەری میلیتاری ئەمەریکی لە بووداپێست لە یادداشتەکەی خۆیدا هێنابووی کە " ئەگەر هەرسێک زلهێزەکە بیانتوانیایە دوژمنانی خۆیان ڕابگرن، و بیانتوانیایە خێرا بۆ هەرشوێنێک کە کێشەی تێدا هەڵدەگیرسا بناردایە، دۆخەکە بە بارێکی تردا دەگەڕا، بەڵام لە کەسایەتی شۆڕای عالی کەم دەبۆوە ئەگەر ئەو ئۆلتیماتۆمە هیچ کاریگەریەکی لەسەر ئەو نەتەوە بچوکە خەمبارەی ڕۆمانیا دانەنایە." کۆڕی ئاشتی لەوکاتەدا دەیەویست پشوویەکی بێتەوەبەر. ویلسۆن گەڕابۆوە بۆ وڵاتەیەکگرتوەکان، بەبێ هۆ خەریکی ئەوەبوو کە پەسەندکردنی کۆمەڵەی گەلان لەلایەن کۆنگرێسەوە وەرگرێت، لیۆد جۆر زۆربەی کاتەکانی خۆی لە لەندەن بەسەر دەبرد، و کلیمینجوو خەریک بوو خۆی بۆ سەرۆک کۆماری فەڕەنسە سازدەکرد.٦٠٨

ڕۆمانیەکان، کە ئێستا دەستیان بەسەر زۆربەی مەجارستاندا گرتبوو، ئەوەیکە پاش کۆن و ڕەژیمەکەی مابۆوە بە تالانیان برد. تەلەفوونەکان، ئەسپەانی بەخەڵاتدراو، ماتۆڕگەلی ئاور، کەوش، فەرش و فرووش، ئۆتۆمۆبیلەکان، دانەوێڵە، ئاژەڵ، و تەنانەت ماشێنەکانی ڕێگەی شەمەندەفەڕ و لۆکۆمۆتیڤەکان بەرەو ڕۆژهەڵات پرژ و بڵاو بوون. شاژن ماری بە خۆشحاڵیەوە بە ئەفسەرێکی ئەمەریکی ڕاگەیاند کە " لەوانەیە تۆ ناوی بنێی دزی کردن یان هەر ناوێکە خۆت پێت خۆشە. من وا هەست دەکەم کە ئێمە بە تەواوەتی ئەوەیکە داوای دەکەین بە مافی خۆمانی دەزانین." کاتێکە ڕاسپاردەی میلیتاری هاوپەیمانان لە بووداپێست دەنگی نارەزایەتی هەڵبڕی، ڕۆمانیەکان لە وڵامدا وتیان کە ئەوان خەریکن تەنیا ئازووقە بۆ سووپاکانی خۆیان دەبەن. براتیانۆ وتی کە بەگشتی ڕۆمانیا شارستانیەتی لە چنگی بۆلشویزم ڕزگار کرد.٦٠٩

لە مانگی نوامبردا زلهێزەکان، بەتایبەت فەڕەنسە و بەریتانیا ژمارەیان تەواو بوو. ڕۆمانیا، چکسلەواکیا و یۆگۆسلاویا هەرهەموویان دەستووریان پێدرا تا بەخێرایی هێزەکانی خۆیان لەو ناوچانەی کە لە مەرجەکانی ئاشتیدا بە مەجارستان بڕابوون بکێشنە دواوە. ڕۆمانیا بەنابەدڵیەوە و دوا

بەقۆگداخستنێکی زۆر ملی دا و ڕازی بوو. کاتێکە حکوومەتێکی تازە و سەقامگیرتر لە مەجارستان هاتە سەرکار، لە ئاکامدا هاوپەیمانان بڕیاریان دا کە ئەوان دەتوانن ئاشتی بنێنەوە. لە یەکی مانگی دێسامردا، مەجارستان بانگێشتی لێکرا تا نوێنەرەکانی خۆی بۆ پاریس بنێرێت، و لە ٥ی مانگی ژانویەی ساڵی ١٩٢٠دا، شەمەندەفەرێک بوداپێستی بەجیهێشت. کاتێکە شەمەندەفەرەکە لەناوەڕاستی وڵاتەوە تێپەر دەبوو جەماوەرێکی زۆر لەسەر ڕێگاکانی شەمەندەفەر وەستابوون و خۆزگەیان بە موسافیرانی ناو شەمەندەفەرەکە دەخواست.٦١٠.

کاونت ئالبێرت ئاپۆنی، ڕێبەری بەتەمەنی شاندەکە، لە بنەماڵەیەکەوە هاتبوو کە بە ڕەچەڵەک وەک کۆچبەر لە سەدەی دوازدەهەمدا لە ناوەندی ئاسیاوە هاتبوون و کۆچیان کردبوو. بیروبۆچوونە سیاسیەکانی ئەو لە شوێنێک لە سەدەی هەژدەهەمدا تووشی گیروگرفت هات. ئەو دڵسۆز و زمانخۆش بوو، هەتابڵێی زانابوو، هەتابڵێی ئایینی و بیروباوەڕی نیشتمانپەروەری مەجاری لە ناخیدا جێی کردبۆوە. ئەو بە هیوا و هۆمێدێکی کەمەوە بەرەو پاریس ڕۆیشتبوو: " من نەمدەتوانی لەبەرانبەر ئەم ئەرکە ناخۆشەدا بوەستم و بڵێم نایکەم، هەرچەند بە خەیاڵم دانەدەهات کە من لەسەر هێورکردنەوەی چارەنووسی خۆمان بتوانم دەستێکم هەبێت و مسۆگری بکەم." مەجارستان شتیکی وای نەبوو کە بەکاری مامەڵەکردن بێت. کاتێکە کۆن هەڕای کرد، سنوورەکانی ئەویێ بەگشتی دابینکرابوون و هاوپەیمانان تازە گریبەستەکانیان لەگەڵ دراوسێکانیان واژۆکردبوو.٦١١

مەجاریەکان بەخیرهاتنێکی سارد بەڵام درووستیان لەلایەن فەڕەنسەیەکانەوە لێکرا و ڕەوانەی چاتوو دی مادرید، هۆتێلێک لە هاوینەهەوارێک لە بۆئیس دی بۆلۆندا کران. ئەوان زۆر باشتر لە ئەڵمانیەکان هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کرابوو؛ ئەوان دەیانتوانی لەناو بۆئیسدا بسسووڕێنەوە، تەنانەت بچن بۆ چێشتخانەکانی دەورووبەریش. ئەوان مەرجەکانی ئاشتی خۆیان لە بۆنەیەکی کورتخایەندا لە کوای دئۆرسای وەرگرت. کلیمینجوو سیخورمەیەکی لە ئاپۆنی کوتابوو و ئاگاداری کردەوە کە ڕۆژێک دواتر ئەو ڕاگەیاندنێک دەداتە دەرەوە بەڵام بەشێوەی نووسین نەبێت هیچ جۆرە وتویژێکی زارەکی لە کەس قەبووڵ ناکات. کاتێکە لە ژوورەکە دەچوە دەرێ، سەرۆک وەزیری فەڕەنسە تێپیڕماند و قاقایەکی توندی لێدا.٦١٢

بەبۆچونی لیۆد جۆرج ڕاگەیاندنەکەی ئاپۆنی شاکار بوو. ئەو بە ڕەوانی بە فەڕەنسەیی قسەی دەکرد، دواتر گۆڕی و کردی بە ئینگلیزی هەر بە هەمان چەشن قسەی بەو زمانەش کرد و لە ئاکامدا هاتە سەر زمانی ئیتالیایی بەبێ گرێ و گۆڵ بەو زمانەش پووختەی قسەکانی

خۆی ڕاگەیاند. ئەو ئاماژەی بەوەکرد کە مەجارستان خەریک بوو زۆر خراپتر لە وڵاتەشکست خواردووەکانی تر دەدرا. ئەو وڵاتە خەریک بوو دووسێهەمی ناوچەکانی خۆی و حەشیمەتەکەی خۆی لەکیس دەدا، ئەو وڵاتە خەریک بوو لە بازاڕەکانی خۆی و لە سەرچاوەکانی کەرەسەی خاوی خۆی بێ بەش دەکرا، و چاوەڕوان دەکرا قەرەبووی زۆر قورس بسەپێت بە سەریدا. سێ ملوێن و نیوی مەجاریەکان خەریک بوون لە دەرەوەی مەجارستان سەریان دەردێنا. ئەگەر یاسای خود-موختاری شتێکی باش بوایە، و ئەو لای وابوو کە باشە، کەوابوو دەبی بۆ مەجاریەکان بەکردەوە دەربێت. لانی کەم لەوناوچانەی کە خەریک بوون لە مەجارستان دەستێندرانەوە دەبێ ئاگربەستی کاتی جێبەجێ بکرێت. (لەڕووی بێ ئەقڵیەوە، دەستوور ئەم بابەتەی بە گلەیی کردن لەوەکە مەجاریەکان خەریکن مەحکووم بە ژیانێک دەکرێن لەژێردەسەڵاتی دەستووری شارستانیەتەکانی پلەخوارتر، لاواز دەکرد.٦١٣)

لە وڵامی پرسیارێک لەلایەن لیۆد جۆرجەوە، ئاپۆنی خەریتەیەکی قەبەی ئەتنۆگرافی کردەوە کە ئەو لەگەڵ خۆی هێنابووی، و ئاشتیکەران لە دەوری کۆبوونەوە. لیۆد جۆرج بە گوێی ئاپۆنیدا چرپاند کە "ئەتۆ یەکجار ڕەوان قسەت کرد." تەنانەت کلیمینجووش ڕێزی هەبوو. کاتێکە مەجاریەکان گەڕانەوە بۆ هۆتێلەکەی خۆیان تا لێدوانە نووسراوەکەی خۆیان ئامادە بکەن، هەست بە هیوایەک دەکرا. لە بەریتانیا، سەبارەت بە مەرجەکانی مەجاری پرسیارگەلی سەیرسەیر ئاراستە دەکران. چەندین تاجری گەورەی فەرەنسەیی لەوەیکە پێوەندیەکانی ئابووری نێوان فەرەنسە و مەجارستان سەرلەنوێ دەستیان پێدەکردەوە زۆر خۆشحاڵ بوون و لەوەپێش دانیشتنی نافەرمی دەستی پێکردبوو. حکوومەتی ئیتالی، بە ڕیبەرایەتی سەرۆک وەزیری تازە، لە دوژمنایەتی پێشووی خۆی دەستی هەڵگرتبوو و کردبویە سەر هاوپەیمانەکانی خۆی تا نارەزایەتیەکانی مەجاریەکان بەهەند بگرن. هێشتا هەر مابووی و ئەوە تەواو نەبوو. لە کۆتاییدا، بەریتانیەکان و فەرەنسەیەکان ئامادە نەبوون گرێبەستەکانی خۆیان سەرلەنوێ دەستپێکەنەوە؛ ئیتالیەکان نەیاندەویست زەخت بکەنە سەر بابەتەکە. لەوانەیە ئاشتیکەرانیش بکەوتنایەتە ژێر کاریگەری یاداشتێک لەلایەن ڕۆمانیا، یوگۆسلاویا و چکسلەواکیا کە پێداگریان لەسەر ئەوەدەکرد کە هەر هەوڵێک بۆ مەبەستی سەرلەنوێ دیاریکردنەوەی سنوورەکان خەیانەتە و بەس. ئەوەیکە لە ئاکامدا قورسایی دەخستە سەر شانی مەجارستان کەمترخەمیەکی تەواو بوو و بەس. بەواتەی چاودێرێکی لاوی ئینگلیزی کە لە ساڵی ١٩١٩دا بە کارۆلی وتبوو کە " حکوومەتەکانی ئەنتێنتە زۆر شتی گرنگتر لە چارەنووسی دە ملوێن خەڵکی مەجارستان لەبەردەستیان دابوو کە دەبوایە بە خەمیانەوە بوونایە."٦١٤

مەجارستان تەنیا چەند زێدەمافێکی بچوکی پێبڕا: بۆ وێنە، ژمارەیەکی زۆرتر قایەقگەلی بەنزینی. لە ٤ی مانگی ژوەنی ساڵی ١٩٢٠دا، لە بۆنەیەکی کورتخایەندا لە کۆشکی ترایەنان، نوێنەرانی ئەو وڵاتە گرێبەستەکەیان واژۆکرد. لە مەجارستان، لەسەر بینا گشتیەکاندا ئاڵاکان تا نێوقەدی دارئاڵاکان بە نیشانەی ماتەمین هاتبوون. "ترایانان" کورتکراوەی ملهوڕی هاوپەیمانان بوو و ئەو بیرەوەریە لە سەرتاسەری جیهاندا مەجاریەکانی هان دەدا تا بۆ مەبەستی سڕینەوەی مەرجەکانی هەوڵ بدەن. کەسایەتی دیاری سیاسی لە ساڵانی سەردەمی شەڕدا هۆرتی بوو، ئێستاش جێنشینی هەڵبژێردراوی پاشا بوو لە ناو خەڵکی ئاساییدا چون مەجارستان هێشتا لەسەر سیستەمی پاشایەتی بەڕێوە دەچوو. (هەرگیز بۆ ڕایەکی تر بڕیاری پەیاکردنی شایەکی تری نەدا، کە هەم بەدڵ بەریتانیەکان و هەمیش بەدڵی خۆی بێت) هۆرتی و هاوڕێیانی ئەو بە هێرشکردن بەگاز بۆ سەر سەربازان لە سەربازگەکان و هێرشبردن بۆ سەر هێزەکانی مەجاری گاڵتەیان بەو پلانانە دەکرد کە بۆ مەبەستی گەڕاندنەوەی سنوورەکانی پێش شەڕی مەجارستان بۆ سەر خاکی ئەو وڵاتە دارێژابوون. میانڕەوەکان بە ترانسیلڤانیا ڕەزایەتیان دەدا.٦١٥

لە دەیەکانی ١٩٣٠دا، مەجارستان بە وورییایەوە لە زلهێزانی بیروباوەڕی گۆڕین، ئەڵمانی هیتلەر و ئیتالیای مۆسۆلینی، نزیک بۆوە. دوائەوەکە گرێبەستەکەی موونیخ لە ساڵی ١٩٣٨دا چکسلەواکیای تەنیا هێشتەوە و بەری بۆ هیتلێر بەڕەڵاکرد، مەجارستان سەرکەوتوانە داوای پارچەیەک لە سلۆڤاکیا و گشت ناوچەی ڕۆتێنیای کرد. لە ساڵی ١٩٤٠دا نۆرەی ڕۆمانیا هات، و لە ساڵی ١٩٤١دا نۆبەی یۆگۆسلاڤیا. بە پاڵپشتی هیتلێر، مەجارستان نزیک بە دووپێنجەمی ترانسیلڤانیا و بەشێک لە باناتی لە باشور بۆ گەڕایەوە. تەنیا بۆ ماوەیەکی کورت توانی دڵی بە ناوچە گەڕێندراوەکان خۆش بکات. لە ساڵی ١٩٤٥، هاوپەیمانانی سەرکەوتوو سنوورەکانی ترایانانیان دەست کەوتەوە و هەرلەویش مانەوە، یەکێک لەو گرێبەستانەی کە تائێستاش کە ئێستایە نەسڕدراونەتەوە.

# ٢١

# شۆڕای چواریار

لە ساڵی ١٩١٩ وەرزی بەهار درەنگ گەیشتە شاری پاریس، بەڵام لە ناوەڕاستی مانگی ئاڤریلدا گوڵەکانی مەگنۆلیاس خونچەی تەواویان کردبوو و دارەکانی کەستانی بەدرێژایی بۆلوارەکاندا خەریک بوون تازە گوڵیان دەکرد. نوێنەرانی یۆتۆپیایی پێشوەخت گەیشتنە بەرەوە، کەڵەگەت و چوارشانە لە عەبای سپیدا دەرکەوتن. مۆزەخانە گەورەکانی خەریک بوون بەرەبەرە دەکرانەوە و منالانیش لە پارکەکاندا سەرقاڵی کایەکردن بوون. لە ڕۆژی دەی مەیدا، شار چۆڵ بوو دوکان و بازاڕ بەسرابوون چون چەپڕەوەکان هەزاران خۆپیشاندەریان هێنابوە دەرێ بۆ ڕێپێوانی ساڵیانەی سوسیالیستی و حکوومەت بە بانگێشت کردنی هێزەکانی خۆی بۆ سەر شەقام وڵامی دابۆوە. لە سەرتاسەری ناوەڕاستی شاری پاریسدا شەڕ و تێکهەڵچوون هاتە ئاراوە؛ دەنگۆی ئەوە هەبوو کە نزیک بە دوو هەزار برینداری سەختەبرین لە نۆخشانە کەوتبوون.٦١٦

تا مانگی مەی، مەرجەکانی ئەڵمانی بەگشتی کۆتاییان پێیاتبوو، زۆربەی سنوورەکانی ئورووپای ناوەندی و باشور لانی کەم لەسەر کاغەز دیاریکرابوون، و هەنگاوی یەکەم سەبارەت بە گرێبەستەکان لەگەڵ ئوتریش، مەجارستان، بۆلغارستان و ئیمپڕاتۆری عوسمانی هەڵێنرابوو. شۆخیەکی تاڵ کەوتبوە سەرزاری هەموان لە پاریس کە گوایە ئەوان خەریکی سازکردنی "شەڕێکی عادلانە و درێژخایەن" بوون.٦١٧ لەناو دڵی کۆڕەکەدا شۆڕای تازەی چواریار هەڵکەوتبوو- کلیمینجوو، لیۆد جۆرج، ئۆرلاندۆ و ویلسۆن- کە لە دوایەمین حەفتەی مانگی مارسدا پێکهاتبوو. بیرۆکەکە ئەوە بوو کە بەبێ هاندانی ئاسایی پسپۆڕان و سکێرتێرەکان لە دەوری یەک کۆببنەوە، تا کێشە گەورەکانی نێوان خۆیان چارەسەر بکەن. لیۆد جۆرج سەبارەت بە دزەکردنی بەردەوام لە شۆڕای عالی و بە هێواشبوونەوەی ڕەوتی نانەوەی ئاشتی دڵەڕاوکێی هەبوو. کلیمینجوو ڕەزایەتی دا: کۆبوونەوەکە لە ماوەی دوو مانگدا دەسکەوتێکی

وای نەبوو. ویلسۆنیش هەر ڕازی بوو، ئەو هەمیشە گرووپگەلی بچووک و نافەرمی لاپەسەند بوو چون دەیتوانی ئازادانە لەگەڵیان قسەبکات و، ئەگەر پێویست بوایە، دەیتاوانی ڕای خۆی بگۆڕێت. گاڵتەچیەکان دەیانوت کە لەگەڵ ئەمانەشدا شۆڕا بیانوویەکی باشە بۆ ڕزگاربوون لە وەزیری دەرەوەی ئیتالیا، سۆنینۆ، کە لاساری لەڕادەبەدەری ئەو لەم قۆناخەدا تەنگی بە هەموولایەک هەڵچنیبوو، تەنانەت سەرۆک وەزیرەکەی خۆشی نەپاراستبوو.٦١٨

شۆڕای چواریار بەشێوەی ئاسایی ڕۆژی دوو کەڕەت پێکەوە کۆدەبوونەوە، وەکوو ڕۆژانی یەکشەنبە ئەگەر ئاڵۆزیەکی تایبەت ناوچەکەی بگرتایەتەوە. ئەوان جارجارە لە ئۆفیسی ناخۆش و تەڕشۆحی کلیمینجوو لە وەزارەتی جەنگ دادەنیشتن، بەڵام زۆربەی کاتەکان ئەوان لە ژووری لێکۆڵینەوەی ویلسۆن بوون. ویلسۆن لەوێ قورس و قایم لە سەر کورسیە قۆڵدارەکەی خۆی دادەنیشت، بەواتەی تاردیۆ کە چاودێرێکی کاتی بوو، " لە مامۆستایەکی زانکۆ دەچوو کە سەرقاڵی ڕەخنەگرتنە لە بیرۆکەیەک." لە حاڵێکدا کە ویلسۆن پوخت و پاراو و لەسەرەخۆ قسەی دەکرد، لیۆد جۆرج، ئەژنۆکانی دەگرتە باوەش، بە هەڵپەهەڵپ پڕی دەدایە باسەکە، جاروبار ڕقهەستاو، جاروباریش کەیفخۆش، "لە وتووێژکردندا ئەوەی نەیدەزانی تەکنیکی قسەکردن بوو، بەخۆی نەبوو هەر ڕیگەچارەیەک کە دەیدۆزیەوە کوتوپڕ و بێ بیرکردنەوە بوو، بەڵام پڕ لە نەقڵ و نەزیلەی سەیرسەیر بوون." کلیمینجوو لەسەر کورسیەکەی خۆی کەوتبوو بە پشتدا، دەستە دەستکێش لەبەرەکانی بەم لاولادا کەوتبوون. ئەو کەمتر لەو دوانەی تر قسەی دەکرد، بە حەزوخولیایەکی زیاتر لە ویلسۆن و بە ژیریێژیەکی زیاتر لە لیۆد جۆرج. هەرچی جاربوو بۆئەوەکە باشتر ببیستێت سەری دەهێنا نزیک کوورەکەوە. ئۆرلاندۆ لە حاڵەتی ئاساییدا لە تەنیشت کوورەکەوە دادەنیشت، ڕووبەڕووی ئەو دوانەی تر. ئەو لە ڕێگاکانی ترەوە دوورەپەرێز بوو؛ سەرقاڵ بە داواکاریەکانی ئیتالیاوە، لە وتووێژەکانی تر کەمتر بەشداری دەکرد و کاتێکە کەسانی تر پێکەوە بەخێرایی بە ئینگلیزی قسەیان دەکرد کەمتر بەشداری دەکرد. کەڕەتێکیان، کاتێکە هاوڕییەک سەبارەت بە کۆبوونەوەیەکی لەوەپێش پرسیاری لێکرد، ئەو بە مۆنەوە وڵامی دابۆوە کە ئەو تازە لە شۆخیەک سەبارەت بە ڕەشپێستەکان تێگەییبوو کە ویلسۆن بۆ جاری شەشەم گێڕابوویەوە.٦١٩

ژاپۆنیەکان، کە ئێستا خرابوونە پەراوێزەوە، زۆر لەسەرخۆ نارەزایەتیان دەربڕی. ئەوان ناردران بۆ شۆڕای پێنج یار، شوێنێک کە ئەوان لەگەڵ وەزیرانی دەرەوەی بەریتانیا، فەڕەنسە، ئیتالیا و وڵاتەیەکگرتووەکان کۆبوونەوە تا ئەو بابەتانە تاوتوێ کەن کە لەلایەن شۆڕای چواریارەوە بۆیان بەجێمابوو. بەنەمانی شۆڕای عالی و جێگرتنەوەی لەلایەن دوو جەستەی تازەوە دیپلۆماتە کارامەکان

ئاڕوویان پێوەنەما. پائۆل کامبۆ وتی کە "ئەمە پیلانی هیچ و پووچ و بۆچونی سەرەڕۆیانەی پێدەڵێن." دەزگای ڕاگەیاندن، کە تازە کەتبوە ژێر باری گوشارەوە لەسەر گوزارشەکەی خۆی، هەر پرتە و بۆڵەی گلەییبیان لێوەدەهات. هەواڵنێری *فیگارۆ* وتی کە کۆڕی ئاشتی وەکوو قوماشێک وایە کە بە وێنەی ڕەش داپۆشرابێت، و سەردێڕەکەی بە *شەڕی ڕەشپێستەکان لە شەودا لەناو تۆنێلێک* ناودێرکرابێت. کارتۆنێک لە نیویۆرک هێراڵد ویلسۆنی وەک " قارەمانێکی تازەی زۆرانبازی" نیشان دابوو کە بەهێز و قەوەتی خۆی دەزگای چاپەمەنی بە عەرزدا دەکوتا..٦٢٠

هانکی، سکرتێری ووردبینی بەریتانی لە کۆڕی ئاشتیدا، سەبارەت بە بڕیاری شۆڕای چواریار لەوەکە ناتوانێ یاداشتەکان هەڵگرێت ترس و دڵەڕاوکێی لە دڵ دابوو، "عاجز لە هەبوونی بۆچونی ئەمیندارانە". دوا تیپەڕبوونی دوو هەفتە شۆڕای چواریار بۆی دەرکەوت کە بێجگە لەوە لە بۆچونی جێبەجێکردنی هەرکارێکی تر عاجزە. ئەوان لەبیریان نەبوو کە چ بڕیارێکیان ساخ کردبۆوە یان کێ بڕیاربوو سەبارەت بە ئەوە کارێک بکات. لە ناوەڕاستی مانگی ئاڤریلدا، هانکی گەڕایەوە و یاداشتەکانی هەڵگرتبوو. دواتر دەرکەوت کە وەرگێڕەکەش، پائۆل مانتۆکسی مێژوونووس، هەروابوو، کەسێک کە کۆکراوەکانی خۆی لە دانیشتنەکانی ڕۆژی پێشتر هەرچی بەیانیە لەناو یاداشتێکی متمانەدا بۆ کلیمینجوو دەنووسی. (مانتۆکس کۆپلەیەکی لای خۆی هەڵدەگرت، کە کاتێکە ئەڵمانیەکان لە ساڵی ١٩٤٠ دەچوونە ناو شاری پاریس لەبەردەست لای دەبرد؛ بە هەرشێوەیەک کەبوو بە ساخی لە شەڕ بەجێ ماوە.) لە کۆتایی مانگی ئاڤریلدا، ئۆرلاندۆ ئەمیندارێکی ئیتالیایی دەست خست. لە ئاکامی ئەوەدا، وێنەیەکی تەواو عەیار لە چوار سیاسەتمەداری ناوداری جیهان بۆ ئێمە ماوەتەوە کە ڕۆژێک لەناوەوە و ڕۆژێکیش لە دەرەوە بۆ ماوەی سێ مانگ زیاتر لە دووسەد دانیشتن پێکەوە دەدوان و قسەیان دەکرد. لە شوێنێک کە گێڕانەوەکەی[ڤێرژن] هانکی وەکوو خزمەتگوزارێکی سیڤیلی ووریا هەموان تێدەگەیەنێت و لە ئاڵ و گۆڕە تووشەکان تێپەڕ دەبێت، هەم مانتوکس و هەمیش ئادرۆڤاندی ئیتالیایی، تێبینی سەرەڕۆیانە و لێکدوانی توند دەخەنە ناو وەرگێڕانەکانی خۆیان.٦٢١

چواریار لەسەرشتی هیچ و پووچ یەکتریان دەبوغزاند، دەنگیان لە یەکتر هەڵدێنا و سوێندیان لەسەر شتی سووکەڵە دەخوارد، بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا، تەنانەت ئۆرلاندۆش، یەکتریان ئەزێت دەکرد، شۆخی و گاڵتەیان بە یەکتر دەکرد، و دڵی یەکتریان دەدایەوە. ئەوان بەووردبینیەکی زۆرەوە دەیانڕوانیە خەریتەکان و تەنانەت لەسەر خەریتە قەبەکەی ئەورووپای ویلسۆندا لەسەر سینگ ڕادەکشان، کە دەبوایە بکرایەتەوە و لەسەر عەرزەکە ڕاخرایە. لیۆد جۆرج و ویلسۆن سەبارەت بە ڕۆیشتن بۆ کلیسا

پێکەوە وتوێژیان دەکرد؛ کلیمینجوو دەیکوت کە ئەو بە حەیاتی کەلیسا نەچوە. ئەوان سەبارەت بەوشتانەی کە ئەوانی تووشی خەمۆکی و نارەحەتی دەکرد پەیام و یاداشتیان بۆ یەکتر دەنارد. کلیمینجوو بە کەسانی تری ئەوت کە ئەو قەت بە خراپەکاری وەخبەر نەدەهات بەڵام کاتێکە هەستی دەکرد خۆی شێت کردوە و هەڵەکاریەکی کردوە تووشی کێشەی بێ خەوی دەهات. ویلسۆن و لیۆد جۆرج هەرکیان بەباشی دەیانزانی کە ئەو مەبەستی چیە. کەسانی تر بە ڕێزەوە گوێیان بۆ قسەخۆشەکانی ویلسۆن شل دەکرد و بە خۆیان دەپەرمان قسەخۆشەکانی خۆشیان دەگێڕایەوە. ڕۆژێکیان ویلسۆن لە دەستپێکی باسێکدا کە بۆ کلیمینجۆی دەگێڕاوە بەم دەستەواژەوە دەستی پێکرد:" هاوڕێی خۆشەویستم"، کلیمینجوو قسەکەی پێ بڕی و وتی " تکات لێدەکەم مەڵێ هاوڕێی خۆشەویستم چون هەرکات کە ئەوە بە زارت دادێ ترسێک من دادەگرێت." ویلسۆن لە وڵامدا وتی کە " دەسا بەخوا هیچی تر نازانم بڵێم. بەڵام ئەگەر پێت خۆش بێت، دەڵێم "هاوکاری ناوداری من". بەرەو کۆتایی دانیشتنەکان، کلیمینجوو لە لیۆد جۆرجی پرسی، " چۆنە کە ویلسۆنت خۆش دەوێت؟" لیۆد جۆرج وڵامی دایەوە کە " خۆشم دەوێ و ئێستا زۆر زیاترم لە جاران خۆش دەوێت." کلیمینجوو وتی کە " منیش هەروا خۆشم دەوێت،" ئەوان لە خاوەنداریێتی قودرەتی بێ کەس و تەنیا شەریکی یەکتر بوون، و ئەوان یەکتریان لە هەمووکەس چاکتر دەناسی.٦٢٢

کارەکان جارلەگەڵ جار جوانتر دەچونەپێشێ. بۆوێنە، لە دوایەمین ڕۆژی مانگی مارسدا چواریاری گەورە قەرەبوەکانی تایبەت بە ئەڵمان، ناوچەخەڵوزیەکانی سائار، داگیرکردنی ناوچەی ڕاینلەند لەلایەن هاوپەیمانانەوە، ئەگەری هاتنەدی تۆنێلیکی چاناڵ، داواکاریەکانی بلژیک، شۆڕش لە مەجارستان، تێکهەڵچوونەکانی چەکدارانە لەنێوان مەجارستان و ڕۆمانیا و ڕاپەڕاندنی نێردراوی سووتەکانیان بەتێروتەسەلی تاوتوێ کرد. لەگەڵ ئەمانەشدا ویلسۆن لە دەرفەتێک دەگەڕا تا لەگەڵ ئەمینداری هێزی دەریایی خۆی سەبارەت بە ملمڵانەی چەکدارانە لەگەڵ بەریتانیا قسە بکات. لیۆد جۆرج نانی بەیانی لەگەڵ دوو کەس لە ڕاوێژکارەکان خوارد تا سەبارەت بە کەش و هەوای پۆڵەندا پێکەوە قسە بکەن. کلیمینجوو لەگەڵ فۆچ تووشی ئاڵۆزی و ناخۆشی هاتبوو، و دەبوایە لەگەڵ شەپۆلێک مانگرتن هەڵی بکردایە.٦٢٣

لەو چواریارە، لیۆد جۆرج لە هەموویان خۆڕاگرتربوو. ئەو دواتر وەک عادەتی دەیگێڕایەوە کە ئەو شەش مانگەی کە ئەو لە پاریس ڕایبوارد خۆشترین ساتەکانی ژیانی بوون. ئەو بە چاوەکانی خۆی سەرکەوتنی بەریتانیای لە سەردەمی شەڕدا دیبوو، و ئەو لە وتوێژکردن سەبارەت بە ئاشتی دڵخۆش بوو. ئەو ڕۆژەی کە پاریسی بەجێهێشت، بە هاوڕیی دێرینی خۆی ڕیدێلی وت کە " من هەستم کرد کە کتێبێکم بەست

کە تازە قەت کرانەوەی دوبارەی نیە- کتێبێک پڕ لە بەرامەی خۆشەویستی. سەردەمێک بوو پڕ لە دڵەڕاوکێ و ترس، بەڵام لە هەمان کاتیشدا زۆر خۆش بوو. من کەیفم پێی سازبوو. تۆبڵێی سەردەمێکی تری وەها بە خەونیش ببینمەوە. سەردەمێکی هێندە پڕشەنگداربوو کە لە تاریف نایەت."٦٢٤

ویلسۆن بەپێچەوانە بەتەمەنی پێوەدیاربوو، و گرژیەک بە سەر ڕومەتیەوە دیار بوو. ئەو لەسەردەمی وتووێژە ڤیناویەکانی تایبەت بە مەرجەکانی ئاشتی نەخۆشیەکی قورسی گرت؛ ڕەنگە ئەمە بە بەراورد لەگەڵ سەکتەیەکی گەورەتر کە چوار مانگی دوایی تووشی هات ئەمەیان زۆر بچوکتر بوو. بەیکێر، ئەمینداری چاپەمەنیەکانی ئەو،لە سەرەتای مانگی مەیدا نووسیبووی کە " قەت ئەوەندە ویلسۆنم ماندوو و شەکەت پێشتر نەدیبوو. ئەو لەبیری نەبوو کە کاتی چێشتەنگاوتان شۆڕا چی کردبوو."ویلسۆن لەباری دەروونیەوە تەواو تێکشکابوو. ئەو ڕۆژێکیان ڕایگەیاندبوو کە "من لام وایە ئەگەر بێتو هەواڵێکی خۆشم پێ بگات هەر لەڕێوە سەکتە بکەم." ئەو زوو تووڕە دەبوو، ئەقڵی زوو لە دەست دەدا و هەمیشە ترس و دڵەڕاوکێی لە دڵ دابوو. ئەو زۆر بایەخی بە بەکارهێنانی سەیارە فەرمیەکان دەدا. ئەو سەرەڕای هەمووی سەنەد و بەڵگەکان، پێداگری لەسەر ئەوە دەکرد کە ستافی فەرەنسەیی ناوماڵەکەی ئەو بە ڕەوانی ئینگلیزیان قسەدەکرد و لەوانەیە هەرهەموویان سیخۆربن. ئەو کوتوپڕ تەدارەکی ژوورەکەی خۆی دیەوە. ئەو بە دوکتورەکەی خۆی ڕاگەیاند کە " من ڕەنگەکانی کەرەسەی ناو ئەم ژوورەم بەدڵ نیە چون بە یەک ناشێن. ڕەنگە سوورەکان و ڕەنگە سەوزەکان پێکەوە تێکەڵن و لەگەڵ یەک دژایەتیان هەیە." سووچی ئەمەریکی بۆ کۆبوونەوەکانی شۆڕای چواریار سوور دەبوو، هی بەریتانیەکان سەوز، و فەرەنسەیەکان دەیانتوانی ڕەنگی تێکەڵ پێکەڵیان هەبوایە.٦٢٥

لە ١٤ی مانگی ئاڤریلدا شۆڕای چواریار بە بانگێشت کردنی حکوومەتی ئەڵمانی بۆ ئەوەکە نوێنەرەکانی خۆی بۆ پاریس بنێرێت گوشاری تازە خستە سەری. گرێبەستی ئەڵمانی، کە دەبوایە هێشتا هەر لەلایەن سەرجەم ئەندامانی کۆڕی ئاشتیەوە پەسەند بکرایە، دووڕەگەیەکی نائاسایی و سەیر بوو، تاڕادەیەک بەخشینێکی کۆنباو بوو بۆ دوژمنێکی شکستخواردوو، تاڕادەیەک پلانێک بوو بۆ دەستووری تازەی جیهان. ئەو گرێبەستە باسی لە پەیکەرەکانی یادگاری جەنگ دەکرد- ئەڵمانیا دەبوایە هەمووی ئەو ئالایانەی کە لە ساڵی ١٨٧١دا لە فەرەنسە داگیرکرابوون و کەللەی سەری دەسەڵاتدارێکی ئەفەریقی کە بۆ بەرلین گوێزرابۆوە بگەڕێندایەتەوە - بەڵام بێجگە لەمانە پەیکەرەکانی خود-موختاری بۆ وڵاتانی وەک پۆڵەندا و چکسلەواکیا. ئەو مەرجانەی کە باسیان لە خەسارەتەکانی ناوچەگەری ئەڵمان و سزادانی ئەو کەسانەی کە بەرپرسی نانەوەی شەڕبوون خرانە پاڵ ئەو کۆمەکانەی کە بۆ دەستوورێکی تازەی جیهانی دانرابوون- وەکوو ڕێکخراوەی جیهانی کار-

وەک ویلسۆن پێداگری لەسەر دەکرد بەگشتی بە پەیمانی کۆمەڵەی گەلانەوە دەستی پێکرد. چون گرێبەستی ئەڵمان یەکەمین و گرنگترین گرێبەست بوو، ویلسۆن و لایەنگرەکانی لایان وابوو کە ئەو گرێبەستە دەبێ هەمووی یاسا بنەڕەتیەکان و نەریتەکانی دیپلۆماسی تازە لەخۆبگرێت.

لێژنەی سەرەکی ڕەشنووسەکە بۆ ئەوە دابینکرابوون کە مەرجەکان بەوردی پێکەوە بەراورد بکەن و دڵنیابن لەوەکە شێوەی داڕشتنی وشەکان جوان و ڕێکوپێکن. یاریدەدەری بەیکێر چوو بۆ کوای دی ئۆرسای و لەوێ چاوی پێی کەوت. ئەو لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە " کۆمیسیۆنی ئامادەکردنی ڕەشنووس کارێکی قورسیان لەبەربوو، چون کاتێکە ئەوان بەرپرسایەتیان گرتە ئەستۆ بەڵگە و کەرەسەیەکی وا کۆنەکرابۆوە، بەشێکی زۆر لە ڕەشنووسەکە خراپ ئامادەکرابوون، و زۆربەیان پێکەوە دژایەتیان هەبوو، بۆ وێنە کاتێکە قەرەبووەکان، بەندەرەکان، باری ماڵی، و ئابووریەکان لەگەڵ یەکتر بەراورد دەکران." هەتا ساتێک کە هەمووی بەڵگەکە ناردرایە بەردەم چاپگەرەکان لەلایەن ئاشتیکەرانەوە بەردەوام دەگۆڕدرا و شتی تازەیان پێوەدەلکاند. شۆڕای چواریار بۆی دەرکەوت کە سەبارەت بە قاچاخی تریاک یان لۆکزامبۆرگ هیچی تێدا نەهاتوە. لیۆد جۆرج خوازیاری بابەتێک بوو سەبارەت بە گازی ژەهراوی؛ بۆردێن، سەرۆک وەزیری کانادایی، لە بەندەکانی تایبەت بە ڕێکخراوەی کرێکارانی جیهان داوای گۆڕانکاری دەکرد. فۆچ و یاریدەدەرەکانی بەگومانەوە دەیانڕوانیە لێژنەی چارەنووس لەوەکە بەندەکانی تایبەت بە چەکداماڵین بە هەند نەگرێت و بۆیە لەسەر هێنانەباسیان لە کۆبوونەوەکاندا پێداگری دەکرد.٦٢٦

سەرلەبەیانی ڕۆژی ٢٩ی مانگی ئاڤریل، وەکوو میوانی بانگێشت نەکراو لە داوەتیەکی خۆمانەدا، نوێنەرانی بەلژیکی لە ژوورەکەی ویلسۆن سەریان هەڵێنا تا بڵێین کە ئەوان ناتوانن ئەو جۆرەی گرێبەستەکە دەڵێ قەبووڵی بکەن و واژۆی بکەن. لە وڵاتی خۆیان، ڕای گشتی تێکڕا دەیانوت کە بلژیک باش مامەڵەی لەگەڵ ناکرێت و پێی ڕادەبوێرن. خۆپیشاندەران لەسەر شەقامەکان هەڵگری ئالاگەلێک بوون کە ئەم درووشمانەی ژێرەوەیان لەسەر نووسرابوون: " ئایا ئینگلەند مانگی ئۆگستی ساڵی ١٩١٤ی لەبیر چۆتەوە؟" "لەبەرچی ویلسۆن نایەت سەردانی کەلاوەکانی ئێمە بکات؟" "قارەمانەکانی بلژیک لە ئەفریقای ڕۆژهەڵات نێژراون! کێ پارێزگاری لە مەرقەدەکانیان دەکات؟" سەردێری ڕۆژنامەیەک لە براسێل ڕایگەیاندبوو کە " بلژیک لەلایەن هاوپەیمانەکانیەوە وەدەر نرا و سووکایەتی پێکراوە." ئەو زێدەڕۆیی نەدەکرد و سنوورەکانی نەبەزاند؛ وڵاتێک کە بە هێرشەکەی خۆی ئاڵۆزی گشتی ئورووپای دەستپێکرد بەگشتی لەلایەن کۆڕی ئاشتیەوە خرایە پشت گوێ و بایەخێکی پێ نەدرا.٦٢٧

بەڵام لەنێوان هەمووی هاوپەیمانانـدا، بلژیـک لەلایەن ئەڵمانەوە قورسترین زیانی بەرکەوتبوو. جگەلەپارچەیەکی زۆر بچووک کە لە قەراخ ئاوەکانەوە بەرەو یەپریس بۆناوخۆی وڵات درێژەی هەبوو، لە سەردەمی جەنگدا سەرتاسەری وڵات داگیرکرابوو. با بەشێکی زۆر لە پرۆپاگەندەی هاوپەیمانی سەبارەت بە کردەوەی ئەڵمان لە بلژیک هەڵە بووبێت، بەڵام خۆ هەرهەمووی هەڵە نەبوو. ئەڵمانیا زۆر دڕندانەوە زۆر نەشیاوانە ئەو وڵاتەی ڕووتاندبۆوە. پارچەکانی مەکینە، پارچەکانی یەدەکی، هەمووی ئەو کارخانانەی کە بانی ئوتۆمۆبیلیان درووست دەکرد، و بەرەو ڕۆژهەڵات درێژەیان هەبوو لەناوچووبوون. بلژیک بەرلە ساڵی ١٩١٤ وڵاتێکی دەوڵەمەند و پڕ پیت و بەرەکەت بوو. لە ساڵی ١٩١٩دا، سەدی ٨٠ی هێزی کارکردنی ئەو وڵاتە بێکارکران. بەرهەمهێنانی پۆڵا دە یەکی جارانی لێمابۆوە. وەرزێران لە هەرجۆرە پەیین و سەمادێک و لە هەرجۆرە ئامێرێک بێ بەش بوون، و مەڕوماڵاتێکی یەکجار کەمیان هەبوو، چون بێجگە لەمانە بەملوێن ئەسپ، مانگا، مەڕ و تەنانەت مریشک و جووجەڵەش بەرەو ڕۆژهەڵات ڕۆیشتبوون. ئەگەر بەهۆی هەوڵ و تەقەلاکانی ڕزگاریکەرانەی هاوپەیمانان نەبوایە، بلژیکیەکان هەر لە یەکەمین زستانی ئاشتیدا تووشی قات و قڕی دەهاتن.٦٢٨

بەداخەوە، بلژیک قارەمانی یەکجار کەم بوو. ویلسۆن، کە بووژاندنەوەی وڵاتەکەی خۆی کردبوو بە یەکێک لە چارەدە خاڵەکەی خۆی، مێشکی سەرقاڵی کێشە و مەسەلەی گەورەتر بوو. فەرەنسەیەکان لە هەوڵەکانی بلژیکیەکان بۆ لکاندنی ناوچەیەکی بچووکی دووکەکانی لۆکزامبۆرگ ترسیان هەبوو، و بەریتانیەکان لایان وابوو کە ئەوان تەماحاویین. لیۆد جۆرج لەسەر داواکاریە "پڕووپووچەکانی" بلژیک لەگەڵ سەرۆک وەزیری بلژیک تووشی گرژی و ئاڵۆزی هاتبوو: " پێویست بوو زۆر ڕاشکاوانە بە ئەوم بوتایە کە بلژیکیەکان لە کاتی شەڕدا بە بەراورد لەگەڵ وڵاتانی تر پیاوانی کەمیان لەدەست دا، و بەگشتی بلژیک بە بەراورد لەگەڵ بەریتانیای گەورە هەر قوربانی نەداوە."٦٢٩

وەزیری دەرەوەی بلژیک لەبەرانبەر مەسەلەی وڵاتەکەی خۆیدا هیچی لەدەست نەدەهات تاکوو بۆی بکات. پیاوێکی کورتەباڵای تەڕپۆش و وریا، بەناوی پائۆل هایمەنز، کە داوای وڵاتەکەی خۆی بەڕەوادەزانی و سووربوو لەسەری، بۆ شۆڕای چواریار وتارێکی ڕاگەیاند و بە دەنگی بەرز و بە تێروتەسەلی گلەو گازەندەی خۆی لەوە کە ئەو یان وڵاتەکەی ئەو سووکایەتیان پێکراوە و مافیان لەبەرچاونەگیراوە دەربڕی. لە بۆنەیەکدا، کاتێکە ئەو هێقی کردبۆوە نەیدەتوانی لەوەزیاتر خۆی ڕاگیربکات، یەک بەخۆی هاواری کردبوو و وتبووی کە "خۆزگە ئاخ بمتوانیایە شتێکم بۆ بلژیک بکردایە." کلیمینجوو لەپڕدا ڕاچەنی و وتی "باشترین کارێکە ئێوە دەتوانن بۆ بلژیکی بکەن ئەوەیەکە یان بمرن یان ئەوەکە دەست لە کار بکێشنەوە." ٦٣٠

بلژیکیـەکان بەتـەمای ئـەوەبوون کـە زلهێـزان گوشـاری زیـاتر بخەنـە سـەر هۆلەندیـەکان تـا سـنوورە ناپەسندەکانی نێوان هەردوو وڵاتی خۆیان دابەش بکەن و جیایان بکەنەوە، بەتایبەت ئەو سنوورانەی کە بە درێژایی چۆمی سچێڵدت هەڵکەوتبوون، ئەو چۆمەی کە لە بەندەری گەورەی بلژیکی ئانتوێرپەوە سەرچاوەی دەگرت و لەناو خاکی هۆلەندەوە دەڕژایە ناو زەریاوە. هۆلەندیەکان، لەگەڵ ئەوەیکە بەندەری خۆیان لە ڕۆتێردام هەبوو، بۆ مەبەستی باشترکردنی دەریاوانی، بۆوێنە، لەڕێگای دەرهێنانی قوڕ و لمی ناودەریا بەرلە دەستپێکردنی شەڕ شتێکی وایان نەکردبوو. هۆلەند، کە وەک هێزێکی بێ لایەن لە کۆڕی ئاشتیدا بەشداری نەکردبوو، حازر نەبوو بستێک لە خاکی خۆی ببەخشێت، تەنانەت لەبەرانبەر دەسکەوتەکانی هەرشوێنێک لە ئەڵمانیادا. زلهێزان بێ دەنگەیان لێکرد و هیچیان نەوت.٦٣١

بێجگەلەمانە بلژیک خوازیار باشترکردنی سنوورەکانی خۆی بوو لەگەڵ ئەڵمانیا. کۆمیسیۆنی تایبەت بە کاروبارەکانی بلژیک پێشنیاری کرد کەلەنێوان شارۆچکەکانی ئیۆپێن و مالمێدی پارچەزەویەکی بچووک بە بلژیک ببەخشرێت. بەگشتی ناوچەی زۆری بە بەرەوە نەبوو، چوارسەد مایلی چوارگۆشە پانتایی هەبوو بە حەشیمەتێکی نزیک بە شەست هەزارکەسی، بەڵام دارستانی بەنرخی هەبوو کە دەیانتوانی قەرەبووی هەمووی خەسارەتەکانی سەردەمی شەڕ بکەنەوە. هاوڕێ لەگەڵ ئەوانە، پسپۆڕان مایلێکی چوارگۆشە ناسراو بە مۆرێسنێتی بێ لایەنیان خاندە ناو گرێبەستەکەوە، کە هەروا بەبێ چارەسەری و بە هەڵواسراوی مابۆوە چون بەندەکانی پێوەندیدار بەوە لە گرێبەستی ساڵی ١٩١٥دا زۆر بە خراپی و بە نارێکی داڕێژرابوون. شۆڕای چواریار ڕازی بوون.٦٣٢

کاتێکە نۆبەی قەرەبوەکان هاتەپێشێ چواریار هاوخەمی یەکتر نەبوون. بلژیک بەدوای ئەوەوە بوو کە ڕێگەی بدرێتێ تا خەرج و مەخاریجی شەڕ بخرێتە ناو داواکاریەکانی خۆیە. ئەمە ئەوجۆرەی کە دەهاتە بەرچاو کارێکی زۆر بێ ئەقڵانە نەبوو چون، لەگەڵ ئەوەیکە حکوومەتی بلژیکی زۆربەی وڵاتەکەی داگیرکرابوو، چارەیەکی نەبوو جگە لەوەی کە لەڕێگای قەرزەوە باری ماڵی خۆی بەرێتە سەرێ. لەگەڵ ئەوانەشدا کاتێکە نۆبەی گەڕاندنەوەی ئەو بڕەپارەیە هات کە بلژیکیەکان لە ئەڵمانیان وەرگرتبوو داوای مافی بەراییان دەکرد. هەرکە ئەڵمانیا پارەکانی بگەڕاندیاتەوە و ڕێژەیەک لە قەرەبووەکانی بدایەتەوە بلژیک نزیک بە ٥٠٠ملوێن دۆلاری پێدەگەیشت. بەریتانیا و فەڕەنسە ئەوەی لەدەستیان هات کردیان تا لە چەندساڵی داهاتوودا داواکاریەکانی بلژیکیەکان کەم کەنەوە، و ئەڵمانیا ئەوەی کە لەدەستی هات کردی بۆ ئەوەی هەر هیچ نەگەڕێنێتەوە. هەتا بلژیک توانی بەتەواوەتی پارەی مافی بەرایی خۆی بەدەست بێنێ تا ساڵی ١٩٢٥ی خایاند؛ لە کۆتاییدا، وەکوو هاوپەیمانەکانی خۆی، بەلژیک توانی تەنیا بەشێکی بچووک لەو شتانەی کە دەیویست بە دەست بێنێت.٦٣٣

# ٢٢

# ئیتالیا سەری خۆی هەڵدەگرێت و دەڕوات

لە ٢٠ی مانگی ئاڤریلدا، نۆ ڕۆژ بەرلە ئۆلتیماتۆمی بەلژیک، فرانسیس ستیڤێنسۆن لە بەردەم دەلاقەی ئاپارتمانی لیۆد جۆرج لە ڕۆ نیتۆت بوو و چاوی بڕیبوە خانووەکەی ویلسۆن تا بزانێت ئایا کۆبوونەوەیەکی بەپەلەی شۆڕای چواریار ڕادەگەیەنرێت. ڕۆژی ئیستێر ساندەی بوو، ڕۆژێکی خۆشی بەهاری بوو، و لیۆد جۆرج بەڵێنی بە ئەو دابوو پێکەوە بچن بۆ سەیرانێک. " کوتوپڕ ئۆرلاندۆ لەبەر دەلاقەکەدا پەیابوو، پاڵی دا بە نەردەیەک کە بە دەلاقەکەوەبوو، و سەری خستە ناو دەستەکانی ئەو. من لام وابوو کە ئەو خەریکە دەگری، بەڵام باوەڕم نەدەکرد وابێت هەتا بە چاوی خۆم دیم کە خەریکە دەسرە سڕەکەی دەردێنیت و دم و چاوی وشک دەکاتەوە." لەپەنا ئەودا، خزمەتکارەکەی لیۆد جۆرج دەنگی هەڵبڕی و وتی" دەبێ لەگەڵ ئەو پیرە پیاو ماقووڵە هەژارە چیان کردبێت؟"

لەناو ئۆفیسەکەی ویلسۆندا، کلیمینجوو ساردو بێ تین ڕامابوو. بەریتانیەکان ترس و دڵەڕاوکێ دایگرتبوون؛ هانکی وتی کە شەرتبێ دەبێ کوڕەکەی خۆی دارکاری بکات چون ئەو ئاوا لەبەردەم جەماعەتێکدا حەیای پێوەنەهێشتوە و بێ ئابڕووی کردوون. تەنیا کەسێک کە تەکانێکی خوارد ویلسۆن بوو، ئەویش چوو تا دڵخۆشی سەرۆک وەزیری ئیتالیا بداتەوە، تەکانێکی هێند بەخشەندە کە لەم ساتەدا دوژمنی لەنێوان ئەمەریکیەکان و ئیتالیەکان هەڵگیرساند.٦٣٤

سەرهەڵدانی ئاڵۆزی هەرەتوند و ناخۆش لە نێوان هاوپەیمانان لە کۆڕی ئاشتیدا تازە گەیشتبوە قۆناخی هەرە تیژی خۆی. لەوەخراپتر لە هیچ کاتێکی تردا نەدەهاتە ئاراوە: بە نزیکبوونەوەی نوێنەرانی ئەڵمانیا لە پاریس، پێویست بوو لەسەر شانی ئاشتیکەران بەرەیەکی یەکگرتوو پێک بێنن. هەرچەند داواکاریەکانی ئیتالیا لە کۆڕی ئاشتیدا سێ ناوچەی بەربلاوی لەخۆدەگرت-ئەفریقا، ڕۆژهەلاتی ناڤین و ئورووپا- ئەوە

بەندەری فیووم لە ئادریاتیک بوو کە کێشەی دروست کردبوو. قرەکە قرەی ناوچەکان بوو هەرچەند لەسەر یاساش قریان لێ پەیا بوو، چون ئیتالیەکان خوازیاری ئەو شتانە بوون کە لە لەچوارچێوەی دیپلۆماسی کۆندا بەڵێنیان پێدرابوو، کەچی ئەمەریکیەکان لەسەر دیپلۆماسی تازە زۆر پێداگریان دەکرد. و ئەمە تێکهەڵچوونی کەسایەتیەکان بوو، لەنێوان ویلسۆن و ئیتالیەکان، بەتایبەت سۆنینۆ، وەزیری دەرەوەی ئەوان. پرسیارەکە ئەوەبوو کە ئایا ئاشتی بە مانای دابەشکردنی شتە تالانکراوەکان بوو، وەک ئەمەریکیەکان لەوپەڕی بێ ئابڕووییدا دەیانوت، یان دانانی سنوورەکان لەسەربنەمای هێڵەکانی ڕەگەزایەتی. ئەو ناوچانەی کە ئیتالیەکان داوایان دەکرد یان لەلایەن بەریتانیا و فەرەنسەوە لە چوارچێوەی گرێبەستێکی نهێنی لەندەن بەڵێنی بەخشینیان درابوو (کە ویلسۆن قینی لێی بوو) یان بەگشتی سلاڤەکان (کە یاسای خود-موختاریان پێشێل کردبوو) لەوێ نیشتەجێ ببوون، یان هەرکیان.

ئۆرلاندۆ بەتەمایەر بوو نەهێڵێت تێکهەڵچوون ڕووبدات. ئەو بەرهەمی جیهانێکی تاریکی سیاسەتی ئیتالیایی بوو، سیاسەتێک کە مامەڵە، تەدارەک و پشتیوانی جیاجیای لێدەکرا، ئەو بە زگماک سیسیلی بوو و بە کاروپیشە پارێزەر بوو و هەمیشە لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە بە زمانی خۆش هەموو کێشەیەک چارەسەر دەکرێت. ئەو پیاوێکی کورتەبالای چوارشانە بوو و هەم بە وڵاتەکەی خۆی و هەمیش بە بنەماڵەکەی خۆی زۆر دەنازی و شانازی دەکرد. لە پاریس، ئەو لەسەر سفرەی ئەمەریکیەکان بەخۆی دەنازی و دەیکوت کە لەماوەی سی و یەک مانگدا سێ منداڵی داوەتە دەرێ؛ دەیکوت لەوە خێراتر کەس ناتوانێت. نیکۆلسۆن هەربەجارێک ئەوی شۆردەوە و بە "پیاوێکی خاو و لاوازی سپی پێست" ناوی لێبرد، بەڵام ئۆرلاندۆ کاتێکە وڵاتەکەی تووشی شکست هات کۆی کردەوە و خستیەوە سەرپێ.٦٣٥

شەڕ گرژیەکی سەرسووڕهێنەری بۆ کۆمەڵگایەک دروست کردبوو کە تازە لەنێوان باکووری ڕوولەگەشە، ڕوولەپیشەسازی و باشووری کشتوکاڵی و پێچراو بەداب و نەریتی کۆنەوە دابەش کرابوو. بەڵێنی گەورەی یەکگرتنەوەی دەیەکانی ١٨٦٠ هێشتا نەهاتبووە دی. ئابووری ئیتالیا بەهێواشی گەشەی سەندبوو و هێرشەکانی ئەو وڵاتە بۆ کاروباری دەرەوە ترسێنەر بوون یان، لەبابەت شکستخواردنی ئەووڵاتە بە دەست ئیتیۆپیەکانەوە لە ئەدووا (ئادوا) لە ساڵی ١٨٩٦، مایەی سەرشۆڕی و شەرمەزاری بوو. وەکوو ئەڵمانیا، وڵاتێکی تازەی تر، ئیتالیا سیستەمێکی سیاسی هەبوو بە دوژمنانی یەکجار زۆرەوە: ئەو کاتۆلیکانەی کە کەلیساکەیان دەوڵەتی تازەی هێشتا نەهاتبووە بەردڵ، سوسیالیستە ڕادیکاڵەکان کە لە چوارچێوەی پێکاتەکانی حازردا وازی لە چاکسازی هێنابوو، و ناسیۆنالیستە ڕاست ئاژۆکان کە بە ئاواتەوەبوون کەش و هەوای نالەبار و ماندووکەری سەردەمی ئێستا بگۆڕن.

له جەنگەی شەڕدا، ئیتالیا، هەژارترینی زلهێزان، پارەیەکی خەرج دەکرد کە هێنی خۆی نەبوو. تا ساڵی ١٩١٩دا بڕی ٧٠٠ملوێن پۆند (٣.٥ بیلیۆن دۆلاری ئەمەریکی) بە هاوپەیمانەکانی قەرزدار بوو و ئاوسانی دراوی سەردەمی جەنگی ئەووڵاتە لە هەرچی وڵاتە زیاتر بوو بێجگە لە وڵاتی ڕووسیە. لە بەرەی جەنگی ئوتریش-مەجارستاندا، سەربازانی ئیتالیایی، کە خراپ ڕێنوێنی دەکران و کەرەسەی جەنگی باشیان پێ نەبوو، کاتێکە لە بەرزایەکانی ئاڵپدا تووشی شەر هاتن زۆر بە هاسانی دەکوژران و لەبەین دەچوون. لە ساڵی ١٩١٧دا سووپا لە کاپۆرێتۆ شکستێکی چاکی خواردبوو؛ ئیتالیەکان ژەنەڕاڵەکانی خۆیان و هەروەها سیستەمەکەیان سەرلۆمە کردبوو. تا ساڵی ١٩١٨دا نزیک بە نیو ملوێن کەس مردبوون و زیاتر لەو ژمارەیە بریندار ببوون. ئەمانە لەپێناوی چیدا بەخشرابوون؟ دەستەواژەیەک کە نرخ و مانای خۆی لە دەست دابوو- "سەرکەوتنی چەندلایەنە"-تازە خەریک بوو لە ئیتالیا بەگوێ دەگەیشت، و بۆیە باسی شۆڕش دەکرا.

لیبراڵەکان و سوسیالیستە میانڕەوەکان وازیان لە پشتگری کردنی حکوومەت هێنا چون لێی کەوتبوونە گومانەوە و ترس و وەحشەتیان لێی بوو، و ئۆرلاندۆ ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پێویست بوو پشت بە باڵی ڕاستی ناسیۆنالیستیەوە ببەستێت. ئەو زۆر پێویستی بە سەرکەوتن، یان دەرکەوتنی دانەیەک، لە پاریس هەبوو. ئەگەر سۆنینۆ و هاوڕییانی کۆنەپارێزی ئەو بڕیار وابوو لەسەر نامەی گرێبەستی لەندەن پێداگری بکەن، دواتر پێویست دەبوو کە ئەو گرێبەستەیان هەبێت. ئەگەر هەندێک لە ناسیۆنالیستەکان تەنانەت خوازیاری ناوچەی زیاتر لەوەبوون کە لە لای ڕۆژهەڵاتی ئادریاتیک، بۆ وێنە فیووم، بە ئیتالیا بەڵێن درابوو بەم پێیە ئەمیش دەبوایە شتێکی وەهای پێک بهێنایە. ئەوە ئۆرلاندۆ بوو کە لە ئاستی فۆرموولێک هات کە ناسیۆنالیستەکانی خۆشحاڵ دەکرد و هاوپەیمانای ئیتالیای تووڕە: "گرێبەستی لەندەن هاوڕێ لەگەڵ فیووم." کاتێکە فیووم بوو بە باسی مان و نەمان بۆ ناسیۆنالیستەکانی ئیتالیا و تەگەرەیەک لەسەر ڕێی ویلسۆن ئەویش وەکوو هەموولایەک سەری سووڕما.٦٣٦

سۆنینۆ، کەسایەتیەکی تری بەهێز لە شاندی نوێنەرایەتی ئیتالیا، پشتگری لە گرێبەستی لەندەن کرد (ئەو بەگشتی دانووستانی لەسەرکردبوو) بەڵام زۆر دڵی بە فیووم خۆش نەبوو. بە بۆچونی لیۆد جۆرج " ئەو نیگەران بوو نەکا ئیتالیا بێتو لەوەزیاتر شێلگیرانە لەپێناو داواکاریەکی وەها هیچ و پووچدا قوربانی بدات." ئەو دەبوایە هەمووی بەرپرسیارێتی سیاسەتی ماڵوێرانکەرانەی ئیتالیای لە پاریس بگرتایەتە ئەستۆ. ئۆرلاندۆ بە ئەسپایی خۆی دزیەوە و دەرباز بوو، بەشێکی بەهۆی ئەوەوە بوو کە ، بە پێچەوانەی سۆنینۆ، ئەو بەباشی ئینگلیزی قسەی نەدەکرد؛ زۆربەی ئەمەریکیەکان و بەریتانیەکان تێنەدەگەیشتن کە ئەوە دیەوێت چی بڵێت. و، بە واتەی لیۆد جۆرج، " ئەو کەسایەتیەکی لەدڵەوەنزیک

و خۆێنشیرینی هەبوو کە ئەوی کردبوو بە پیاوێکی بەڕاستی خۆش مەشرەف کە مرۆڤ حەزی دەکرد هەرلەگەڵی بێت." لیۆد جۆرج هەرچی جاربوو لەڕوی هەڵەوە دەیکوت کە "لە ڕواڵەت یان لە باوەڕدا هیچ جیاوازیەک لەنێوان ئەو و سەرۆک ویلسۆندا نابینیت." ئۆرلاندۆش لەناو ئەمەریکیەکاندا " بەڕاستی ناوداربوو." هاوس بۆ ویلسۆنی نووسیبوو کە " ئەگەر ئۆرلاندۆ لێرەبایە لام وایە بمتوانیایە کارێکم بکردایە، بەڵام داخەکەم لەگەڵ سۆنینۆ هیچم پێناکرێت."٦٣٧

* * * *

لە ساڵی ١٩١٩دا سیدنی سۆنینۆ لە سەرەتای حەفتاکانی تەمەنی خۆیدابوو. بە قژێکی ئاڵۆسکاوی سپیەوە، سمێڵێکی ئەستوور و بادراو، چاوانی قووڵ لەژێر ئەبرۆی پڕ و تووکن، و بە دەم و چاوێکی گرژەوە، ئەو وێنەی سیاسەتمەدارێکی کۆن-شێوازی ئەورووپی بەخۆوە گرتبوو. لەڕاستیدا، ئەو شتێکی زیاتر هەبوو: پرۆتێستانێک لە وڵاتێکی بەگشتی کاتۆلیکدا، ڕۆشنبیرێک کە بەعەشقەوە سەبارەت بە دانتێس بیتریس دەینووسی، و مشت و مڕکەرێک تەواو عەیار. لەدایکبووی وڵاتی میسر و لە تاجرێکی جوولەکەی ئیتالیایی و بە هاوسەری وێلزیەوە، سۆنینۆ پیاوێکی نەناسیاو و بیانی بوو کە هاتبوە ناودڵی سیاسەتی ئیتالیاوە. وەک لیبراڵێک کۆن-شێواز لەماوەی چەندین ساڵدا هاتبوە سەر بیروباوەڕی توند-ئاژۆکان. ئەو باوەڕی بە یارمەتیدانی کۆمەڵانی خەڵک بوو، بەڵام ئیمانی بە ئەوان نەبوو کە بتوانن یارمەتی خۆیان بدەن. بەر لە شەڕ ئەو وەک سەرۆک وەزیر خزمەتی دووچەندانی دەکرد، تەنانەت لەلایەن دوژمنەکانیشیەوە وەک سیاسەتمەدارێکی ڕاست و بێ لایەن ڕێزێکی تایبەتی لێدەگیرا. لە ساڵی ١٩١٤دا ئەو بوو بە وەزیری دەرەوە.

لیۆد جۆرج گوتەنی " دڵڕەق، تووڕە و نەحەواوە" زۆر گڵاو قسەی دەکرد و لە پاریس دۆستایەتی کەسی نەدەکرد. بە واتەی کەسێک کە بەهیچ جۆرێک لەڕوی دوژمنایەتیەوە نەیدەکوت شانازی بەخۆوە دەکرد لەوەکە لە کەس نەدەچوو: " کاتی خۆی کە من وەک دیپلۆماتێکی لاو بەرلە شەڕ جارجارە لە ماڵە دوورەپەرێز و جوانکیلەکەیدا نزیک بە تراژان فۆرم وەک عادەت دەچوومە سەردانی، بە دەست خۆم نەبوو دەکەوتمە بەر تیری خۆبەزلزانی ڕاست و ڕەوانی ئەو کابرایە کە لام وایە ئەو دەبێ یەکەم قوربانی ئەو نەخۆشیە دەروونیە بوویێت." بە سەر ئەمانەشدا سۆنینۆ لایەنێکی تری هەبوو. ئەو کاتی لاوەتی بەدڵ هەستی بە خۆشەویستی کردبوو و خۆشەویستیەکەی سەری نەگرتبوو. ئەو لە یاداشتەکەی خۆیدا هێنابووی کە " کێیە دەتوانێ و یان دەبێ ئەم مرۆڤە هیچ و پووچەی خۆش بوێت کە لە هەرچی جوانی ئەخلاقی و جەستەییە بێ بەشە؟ تەنیا شتێک کە لای من پڕ بایەخە خۆنواندنە! تەنیا خۆنواندنە کە دەتوانێ ئەم تەب و یاوەی کە جەستەی منی داگرتوە، و منی لای خۆم ڕەزاگران کردوە، بۆتە مۆتەکەی

سەرشانم و نایەڵێت هیچ هەنگاوێکی گەورە بنێم." کاتێکە وت و وێژەکان لە پاریسدا بەلاڕیدا ڕۆیشتن، ئەو لای ئەمینداەرەکەی خۆی درکاندبووی کە لەباری جەستەیەوە هەست بە ناتەواوی دەکات.[٦٣٨]

بۆچوونی سۆنینۆ لەبابەت پێوەندیەکانی نێونەتەوەییەوە بیسمارکی بوو: ئەو لەسەر ئەم باوەڕە بوو کە هاندەری سەرەکی نەتەوەکان شتێکە کە وەزیرێکی تری دەرەوەی ئیتالیایی ناوی نابوو "خۆپەرەستی پیرۆز" و ئەو سیاسەتە لەسەرووی هەموویەوە سەبارەت بە دەسەڵات بوو. وەک ناسیۆنالیستێکی ئیتالیایی، سۆنینۆ خوازیاری هێمنایەتی بوو بۆ وڵاتەکەی خۆی؛ ئەوە بە مانای زەوی و زار، هاوپەیمانیەکان، مامەڵەکان، دۆستگرتن دژ بە دوژمنانی شیمانەلێکراو. کلیمینجوو ڕایەکیان ئەوی لەبەرهۆی ئەوەکە " زۆری باوەڕ بە شێوازی ئیتالیایی بوو شێوازێک کە مامۆستا گەورەکەی ماکیاولی بوو و هیچ ڕێگەچارەیەکی دیاروئاشکرای پێ شک نەدەهات" سەرلۆمەکرد.[٦٣٩] سۆنینۆ متمانەی بە باسی بیروباوەڕ یان ڕەوشتایەتی یان کراوەیی لە پێوەندیەکانی نێونەتەوەییدا نەبوو، و لەوە تێنەدەگەیی کە کەسانی تر هەیانە.

کاتێکە شەڕ دەستی پێکرد، ئیتالیا لەگەڵ کۆنەدوژمنی خۆی مەجارستان-ئوتریش و لەگەڵ ئەڵمانیا پەیمانی بەست. هەڵبەت لە چوارچێوەی مەرجەکانی هاوپەیمانی سێ قۆڵیدا، ئیتالیا تەنیا لەسەری بوو کە پارێزگاری لە هاوپەیمانان بکات ئەگەر هاتو یەکەمجار ئەوان کەوتنە بەر هێرش. ئیتالیەکان لەم حەقیقەتە کە ئوتریش-مەجارستان دژ بە سێربیا شەڕی ڕاگەیاندبوو وەک بەڵگەیەک بۆ بێ لایەنی مانەوە بەکاریان هێنا. ئیتالیا لەو قۆناغەدا هیچ دڵی خۆش نەبوو بکەوێتە ناو شەڕێک کە هیچ جۆرە بەرژەوەندیەکی خۆی تێدا بەدی نەدەکرد. سۆنینۆ، هاوڕێ لەگەڵ تاقمێکی بچووک لە هاوڕێیانی نیشتمانپەروەری خۆی، بەرەو هێزەکانی ناوەندی چەمیەوە. ئەو لای وابوو کە ئەوان براوەن، گریمانەیەکی ئاقڵانە بوو، هەرجۆرێک بوایە، ئەو یەکەمایەتی بە ئورووپایەک دەدا کە هێزەکانی کۆنەپارێز باڵیان بە سەردا کێشابایە. هەرچەند، زۆربەی ئیتالیەکان وایان لا مەسڵەحەت بوو بێ لایەن بمێننەوە. ئەوە کاتێک بوو کە شەڕ دووبەرەکیەکی گەورەی لەنێوان ئەوانەی کە پشتگریان لە بێ لایەن مانەوە دەکرد، زۆربەیان کۆنەپارێز و هەندێکیشیان چەپڕەوەکانی توند-ئاژۆ بوون، و ژمارەیەکی ڕوولەزۆربوون لەو کەسانەی کە پشتگریان لە بەرەی هاوپەیمانی دەکرد بۆ ئەوەی کە دەستدرێژی بکەنە سەر وڵاتانی تر. گرووپی دووهەم تیکەڵاوێکی سەیر بوو- لیبراڵەکان و کۆماریەکان، هەروەها سوسیالیستەکان و ناسیۆنالیستەکانی بەدڕەوشت- و ئەو گرووپە دەیەویست ئامانجەکانی شەڕی ئیتالیا بگرێتە بەر. دوا ڕاوێژکردنێکی زۆر، سۆنینۆ بڕیاری هێنا سەرئەوەکە دەستدرێژی کردن بە پاڵپشتی بەرەی هاوپەیمانیەوە باشترین بڕیارە.

ئەو بڕیارەکەی خۆی گۆڕی چون بەئەنجام گەیاندنی ئەو کارە شتیکی گونجاو و لەبار بوو. لە ساڵی ١٩١٥دا، کاتێکە ئەو دانووستانەکانی دەستپێکرد، وادەردەکەوت کە هاوپەیمانان بەباشی تێوەچوویبێتن. هەرچەند، ئەوان ئامادە بوون مامەڵەیەکی باشتر لە هێزەکانی ناوەندی بە ئیتالیا پێشنیار بکەن، زیاتر لەبەرهۆی ئەوەوە کە ئەوەی کە ئیتالیا خوازیاری بوو ناوچەکانی ئوتریش-مەجارستان بوو. هاوپەیمانانیش بەش بە حاڵی خۆیان بە تاسەوە بوون کە بە هێرشکردنە سەر دوژمن لە هەرشوێنێک کە بوایە گرێ پووچکەی بەرەی جەنگی ڕۆژئاوا بکەنەوە. دەستێوەردانی ئیتاڵیا هاوسەنگی هێزی دەریایی لە مەدیتەرانەدا لەبەرژەوەندی ئەوان تەوا دەبوو و هێرشێک لەلایەن سووپای ئیتالیاوە دژ بە ئوتریش-مەجارستان زیانێکی قورسی بەسەر شەرێکی لاوازتر لەناو هێزەکانی ناوەندی دێنا.

سۆنینۆ خوازیاری ئەوەنەبوو کە شکستی ئوتریش-مەجارستان بەتەواوەتی ببینێت؛ لەڕاستیدا، ئەو قەت بە مێشکی دانەدەهات کە بە یەکجاری لەبەین بچێت. ئەو لەگەڵ هێزەکانی ناوەندی هەستی بە هیچ جۆرە دوژمنایەتیەک نەدەکرد؛ ئەو پێوەندی بە هاوپەیمانانەوە گرت چون ئەوە باشترین ڕێگا بوو بۆ بەدەست هێنانی ناوچەیەک کە ئیتالیا بەدوایەوە بوو. سۆنینۆ هەمیشە ئاگاداری ئەوەبوو کە شەڕی ئیتالیا لە شەڕێکی گشتیتر جیابکاتەوە. وەک لە ساڵی ١٩١٧دا بۆخۆی دەڵی: "ئەگەر بڕیار وایە ئاشتیەکی هەتاهەتایی مسۆگر ببێت، پێویستە کە ئیتالیا سنوورە هێمنەکانی نەتەوەیی بەدەست بێنێت- مەرجێکی پێویست بۆ سەربەخۆیی تەواوی خۆی." لە ساڵی ١٩١٨دا، ماوەیەکی کورت دوائەوەکە ویلسۆن چاردە خاڵەکەی خۆی ڕاگەیاندبوو، سۆنینۆ ڕەخنەیەکی توندی گرت و وتی کە " کۆمەڵێک پڕۆپاگەندەی دەرەوە بەدزیەوە لە هەوڵی ئەوەدابوون ناڕاستەوخۆ ئەوە بگەیەنن کە ئاواتگەلی ئیتالیەکان لەژێر کاریگەری چەمکگەلی ئیمپریالیزم، دژە-دیموکراسی، دژە-ناسیۆنالیزم، هتد. بوون. ئەمە شتێکی تەواو هەڵەیە." بەپێچەوانە، داواکاریەکانی ئیتالیا لەسەر ناوچەکانی ئوتریشی بەگشتی لەسەر بنەمای " ئەتنۆگرافی و پارێزگاری کردنی ڕەوا لەڕێگای زەوی و دەریاوە" داڕێژراوە. ئەو دەیکوت کە ئیتالیەکان بەدوای ئەوەوە بوون کە لەگەڵ دراوسێکانیان پێوەندی برایانەیان هەبێت..٦٤

لە کاتی شەڕدا هاوپەیمانانی ئەورووپی، کە هەمیشە حەزیان لێبوو ناوچەیەکە هینی خۆیان نەبوو بیکەن بەبەلاش و ببیەخشن، بەڵێنی تەواوکردنی خەونی نەتەوەیی ئیتالیایان دا، بە واتەی درووشمێکی ئیتالیایی، لە ترێنتەوە تا تریستێ، بە پانتایی سنووری لاوازی ڕۆژهەڵاتی باکوور کە ئوتریش-مەجارستان هەرلەسەردەمی دروستبوونی ئیتالیاوە هەڕەشەی داگیرکردنی دەکرد. بەڵام

لە ساڵی ١٩١٥دا، کاتێکە گرێبەستی لەندەن بەسترا، بەریتانیەکان و فەرەنسەیەکا شتێتریشیان لەگەڵ ئەوان تێخست: دوورگەکان و پارچە زەویەکی دالماتیا بەدرێژایی قەراخ ئاوەکانی ئادریاتیکی ئوتریش-مەجارستان؛ بەندەری ڤلۆری لە ئالبانیا (ئیتالیایەکەی: ڤالۆنا) هەروەها پاراستەیەک بەسەر ئالبانیای ناوەندیدا؛ دوورگەکانی دۆدێکانیس بەدرێژایی کەنارئاوەکانی ئاسیای بچووکدا: و بەشەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی ئەگەر پارچەپارچە کرایە. (ئەمە لە کۆری ئاشتیدا تا ڕادەیەک کێشەی درووست کرد، چون لیۆد جۆرجیش بەڵێنی بەشێکی لە هەمان ناوچە، دەورووبەری سیمیرنای، بە یوونان دابوو.) ئیتالیا هەر ئەو مافانەی پێدەبەخشرا کە بەریتانیا و فەرەنسە لە دوورگەی عەرەبیدا و لە دەریای سوور هەیان بوو. لای سۆنینۆ گرێبەستی لەندەن بەمانای ڕێکەتننامەیەکی تەواو عەیار بوو؛ بۆ بەریتانیا و فەرەنسە تا ساڵی ١٩١٩ ئەوە ببوە هۆی ترس و دڵەڕاوکێ.

باش یان خراپ بەریتانیەکان و فەرەنسەیەکان هەستیان دەکرد کە ئیتالیا لە سەرکەوتنی هاوپەیماناندا ڕۆڵێکی گرنگیان نەگێڕابوو. سووپاکانی ئیتالیا هێرشی خۆیان بۆ سەر مەجارستان-ئوتریش وەدرەنگ خستبوو، و دواتر هەمووشتێکیان دابوو بە سەر یەکدا و کارەکەیان خراپ کردبوو. کەشتیەکانی ئیتالیایی سەرەڕای قەول و بەڵێنی بەردەوام بۆ ئێشگری مەدیتەرانە و ئادریاتیک ئەوەندە ورەیان بەرخۆیان نەدەدا تەنانەت هەر لە بەندریش دوورکەونەوە. حکوومەتی ئیتالیایی بەزۆری سەروەت و سامانەکانی لە چنگ هاوپەیمانانی دەست-قونجاو دەرهێنابوو و بۆ هیچ هەوڵێکی تایبەت بە شەڕ بەکاری نەهێنابوون. کلیمینجوو گوتەنی "ئیتالیەکان ئەویان بە کۆدەتایەکی شکۆداری جۆری سەدەی حەڤدەهەم ناسی، و دواتر دیتیان کە کڵاوی گرتۆتەوە و داوای سەدەقە دەکات و کرنۆش دەبات." باڵوێزێکی بەریتانی لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە هەڵوێستێکە سەبارەت بە ئیتالیا لە پاریس هەستی پێ دەکرێت، "هەتاکوو ئێستا بە شەرمەوە نێویان بردوە و ئێستا ناولێبردنی هۆی سەرشۆڕی و ملکەچیە. ئەوان هەرهەموویان دەڵێن کە دەرختنی هەر هێمایەک بۆ مەبەستی ئاگربەست بۆ ئیتالیا بەمانای دەستپێکردنی شەڕ بوە."٦٤١

چون بەریتانیا و فەرەنسە بەرتیلیان دابوو بە ئیتالیا و بەڵێنی ناوچەیەکیان دابوویە تابەڵکوو لە شەڕدا بەشداری بکات کاتێکە دیان کە هاوپەیمانی تازەیان بە واتەی لیۆد جۆرج " ڕۆحیەتێکی هاکسینگی huxtering" لەخۆی نیشان داوە بەوە یەکجار قەڵس بوون. کاتێکە سووپاکانی ئیتالیایی لە کۆتایی شەڕدا بەخێرایی تێپەڕ بوون تا هەمووی ئەو ناوچانە داگیر بکەن کە لە دەورووبەری ئادریاتیک، پیچۆن بە ئیتالیا بەڵێن درابوون، وەزیری دەرەوەی فەرەنسە، ڕەخنەیەکی

دوورودرێژی ئاراستەی باڵوێزی بەریتانی کرد کە گوایە هێزەکانی بەریتانی بە ئانقەست هەوڵی نانەوەی شەڕیان لەگەڵ دانیشتوانی سلاڤی ناوچەکە داوە. " ئەوان پەرۆشی خوێنڕشتنن چون لەم ڕێگایەوە دەتوانن دەست بە سەر هەمووی ئەو ناوچانەدا بگرن کە بەدڵنیایەوە لەڕێگای هیچ جۆرە گرێبەستێکی ئاشتیەوە پێیان نابەخشرێت."٦٤٢

شیمانەی ئەوەکە لەڕاستیدا تا مانگی دێسامری ساڵی ١٩١٨ سێربستان لەگەڵ خەڵکانی سلاڤی باشووری مەجارستان-ئوتریش بە لەونێک وڵاتێکی تازە درووست دەکات، بوو بە هەوێنی گرژی و ئاڵۆزیەکی تازە لەنێوان ئیتالیا و هاوپەیمانەکانی. بەریتانیا و فەڕەنسە، لەبەر هەر هۆیەک کە هەبێتیان، خۆیان بە هاوسۆز و هاوخەمی وڵاتی تازە دەزانی. بەدڵنیایەوە ئیتالیا دەیتوانی ببینێت کە لە هەل و مەرجی گۆڕاودا کاری ئاقڵانە ئەوەیە کە چیتر داوای ناوچەی سلاڤی باشوور نەکات. بەگشتی، هەمووی بەڵێنەکان لەسەر بنەمای ئەم گریمانەیە بوون کە لە کۆتایی شەڕدا ژیانی ئوتریش-مەجارستان هەر باقیە. کاری ئاقڵانە ئەوەبوو کە دوژمن لە بەندەرەکان و لە بنکەکانی دەریایی خۆی بێ بەش بکرێت. بەڵام ئێستا ئیتر ئاقڵانە نەبوو لەگەڵ نەتەوەیەکی دۆستدا هەرهەمان کار بکرێت. کابینەی شەڕی بەریتانیا هاتە سەر ئەم ئەنجامە کە "پێویستە هەموو هەوڵێک بخرێتە گەڕ بۆ ئەوە کە ئیتالیا هان بدرێت تا سەبارەت بە ئەم پرسیارانە هەڵوێستێکی ئاقڵانە بگرێت." کلیمینجوو چەندین کەڕەت لەگەڵ ئۆرلاندۆ قسەی کرد تا هانی بدات واز لە گرێبەستی لەندەن بهێنێت.٦٤٣

حکوومەتی ئیتالی ئامادە نەبوو تا وابکات. ڕای گشتی لە ئیتالیا لەبەردەم ئەوەدا ئاستەنگیان درووست دەکرد. کەچی لیبراڵەکان، کە ئیمانیان بە ڕۆحی گیۆسیپی مازینی گەورە هەبوو، لەمێژبوو بە ئاواتەوە بوون خەڵکانی چەوساوە ئازاد بکەن، بەتایبەت ئەوانەی کە لەژێر دەسەڵاتی حکوومەتی ملهوڕی چەوسێنەری پێشووی خودی ئیتالیا بوون، زۆربەی ئیتالیەکان کرۆواتەکان و سلۆڤێنیەکانیان وەک دوژمنانێک دەدی کە وەفادارانە بۆ ئوتریش-مەجارستان شەڕیان دەکرد و پێدەچوو هەرکە دەرفەتیان گیر بهێنایە دووبارە وایان بکردایەتەوە. کاتێکە هێزەکانی ئیتالیایی لە کۆتایی شەڕدا هرووژمیان هێنا تا کرۆواسیا و سلۆڤێنیا داگیر بکەن، ئەوان زیاتر وەک داگیرکەر چالاکیان دەکرد تا وەکوو ڕزگاریکەر. ئایا سێربەکان چیتر جێی متمانە بوون؟ ژەنەڕاڵ پیترۆ بادۆگلیۆ، فەرمەندەی پلە دووهەمی سووپای ئیتالیا، حکوومەتەکەی خۆی لەوە ئاگادار دەکردەوە کە کرۆواتەکان و سلۆڤێنەکان، کە لە سێربەکان زیرەکتر بوون، لە ئاکامدا زاڵ دەبن بە سەریاندا. دوابەدوای ئەوە ئەو پلانێکی وردی داڕشت، کە سۆنینۆ و ئۆرلاندۆ لە مانگی دێسامری ساڵی

١٩١٨دا چەسپاندبوویان، تا یۆگۆسلاڤیا لەبەین بەرێت و کۆنترۆڵی ئیتالیا لەڕێگای ناونەوەی شەڕ و کێشە لەنێوان کرۆواتەکان، سێربەکان و سلۆڤێنیەکان و لەنێوان جووتێران و خاوەنزەویەکان بە سەر بەشی ڕۆژهەڵاتی ئادراپاتیک بەهێزتر بکات. بادۆگلیۆ پێشنیاری کرد کە لە بۆسنیا دەیانتوانی لە جیاوازیەکانی ئایینی کەڵکیان وەرگرتایە. ئەو پێشتر لەوێ بریکاری بۆ خۆی دانابوو. تەنانەت سەربازانی ئاسایی ئیتالی دەیانتوانی لەگەڵ ژنانی "گوماناوی" ناوچە پێوەندیان هەبێت.٦٤٤

هێزی دەریایی ئیتالیاش هەر هەمان هەڵوێستی هەبوو. ئەم هێزە زۆر تووڕە بوو کاتێکە ئیمپراتۆر هابزبێرگ، لە یەکێک لە دوایەمین چالاکیەکانی خۆیدا، هێزی دەریایی ئادریاتیکی خۆی و بنکەی گەورەی دەریایی لە پۆلا لەگەڵ لێژنەیەکی کاتی یۆگۆسلاڤی گۆڕیەوە. ڕۆژی دواتر بۆمبێکی دەریایی ئاراستەی پۆلا کرا و *یووریباس یوونیتیس* نەترسی، کە جێی شانازی و فەخر بوو بۆ هێزی دەریایی ئوتریشی، نووقمی ئاوکرد و کاپیتان و مەلەوانانی ناوکەشتیەکەی لەناوبرد. بەدوای پێداگریەکی زۆری ئیتالیەکان، پاشماوەی کەشتیەکە لەلایەن هێزەکانی هاوپەیمانەوە گەمارۆ درا، و هێزەکانی ئیتالیایی توانیان پۆلا داگیر بکەن. چەند مانگی دواتر ئالۆزی بەردەوامی بەخۆوە بینی لەنێوان هێزی دەریایی ئیتالیایی و هاوپەیمانان، بەتایبەت ئەمەریکیەکان، لەسەر هەڵس و کەوتی ئیتالیایەکان لەگەڵ سلاڤەکانی ناوچە. ئیتالیەکان لە یاداشتێکی دووردرێژدا داکۆکیان لەخۆیان کردبوو و هێنابوویان کە فەلەک داوێکی پیسی بۆ ئیتالیەکان ناوەتەوە؛ کەچی بەشی ڕۆژئاوای ئادریاتیک بەندەری کەمی هەبوو و ناوچەی سرووشتی زۆری هەبوو بۆ پارێزگاریکردن، " بەربەستێکی پەرەسەندووی سەیر کە لە دوورەگە و تاشەبەردی ناودەریا درووست ببوون" پارێزگاریان لە بەشەکەی تر دەکرد. " لە ڕۆژهەڵاتدا، دەریا ڕوون و مەندە و بە زەحمەت دەکرێ لە کانزاکان کەڵک وەرگیرێت؛ لە ڕۆژئاوادا، ئاوەکان لێڵ و قوڕاوین و دەڵێیی بە ئانقەست دابین کراون تا لەبەرژەوەندی چەکەکانی دەریایی ئیش بکەن." دەستبەسەرداگرتنی ئەو ناوچەیە لە بەشی ڕۆژئاوادا بۆ ئیتاڵیا زۆر پێویست بوو.٦٤٥

ناسیۆنالیستەکان هێشتا مشت و مڕیتریان لەبەر بوو. ئیتالیا نەیدەتوانی گرووپە پرژوبڵاوەکانی ئیتالی لە خزمەت سلاڤەکاندا بەجێ بێڵێت. چاپەمەنیەکان بەسەرهاتی دڵتەزێن و نادرووستیان سەبارەت بە ژنان و منداڵانی ئیتالیایی کە لەناو شارەکانی ئیسرا و بەدرێژایی کەنارئاوەکانی دالماتیان دەکوژران دەگێڕایەوە. " چەوساندنەوە و زوڵمی یۆگۆسلاڤیا لە دالماتان گەرووی حەشیمەتی ئیتالی لەبندا بڕیوە و یەکبەدوای یەک دەیانکووژن." مامۆستایانی پسپۆڕ دەیانگێڕایەوە کە " ئەوەیکە لە دالماتان ئیتالی نیە بەربەریەت و وەحشیگەریە." فەرمەندەی نیزامی ئیتالی لە دالماتان بەڕەحمتر بوو: " ئەم حەشیمەتە هەر لەبنەڕەتدا چاک بوون، چاک بە قەدەر خەڵکانی ساکار و

سەرەتایی. بەڵام بێجگەلەمە خەڵکانی ساکار و سەرەتایی هەتابڵێی هەستیار و گوماناوین و لە ژێربێژییدا سەرەڕۆن." پەیامی شارستانیەتی ئیتالیا ئاشکرا بوو. ڕۆژنامەکانی ئیتالیایی هەڵگری وێنەگەلێک بوون لە جووتیّرانی ناوچەکە کە بەرەو کەنیسە دەڕۆیشتن و لەژێر وێنەکانەوە هێنابوویان کە ئەوان دەیانەوێت بچن ڕێز لە فەرمەندەی هێزەکانی ئیتالیایی بگرن، یان هەڵگری وێنەگەلێک بوون لە ڕزبەستنی جەماوەر بۆ وەرگرتنی خواردەمەنی کە، ئەیانوت، ئەوانە سلاڤەکانن کە ڕیزیان بەستوە بۆ ئەوە کە بلێن ئیتالیا هەر هەیە و درێژە بە مانەوەی خۆی دەدا.٦٤٦

کاتێکە ساڵی ١٩١٨ کۆتایی پێهات، لە ڕۆم لە ڕۆژانی پرۆ-دالماتان، جەماوەری بەگڕووتینی ژێنێڤیانە و ناپلیانەوە ڕژانە سەر شەقامەکان. باڵوێزی ئەمەریکی لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە حکوومەت دەستی لەو خۆپیشاندانەدا هەیە. ئەو باڵوێزە لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە سۆنینۆ بە توندی ئاماژەی بەوەکردبوو کە ئیتالیا پێویستە لە ئادریاتیک ئاسایشی خۆی لەسەرووی هەموویەوە دابنێت و ئەوەش بەمانای کۆنترۆڵکردنی ناوچەکە بوو، نەک پارێزگاری کردن لەلایەن ئەنجومەنی گەلانەوە. " تەنانەت هێزی پۆلیس داوای کردبوو کە خەڵکانێک کە ئەوان پارێزگاریان لێدەکردن پێویستە کاتی ئێوارە درگاکانیان بژەنن تا لانی کەم ئاژاوەگەران دەرکەنە دەرەوە تا هێزی پۆلیس بانگێشت دەکرێت." سۆنینۆ، وەکوو ئۆرلاندۆ، بۆچوونەکانی ویلسۆنی لا پڕووپووچ بوو. " ئایا دەکرێ لە ژوورێکەوە، لەرێگای چالاکی هەندێک دیپلۆماتەوە جیهان ئاڵوگۆڕ بکرێت؟ بچن بۆ ناوچەکانی باڵکان و بۆ جارێکیش بوە چاردە خاڵەکە تاقی بکەنەوە."٦٤٧

حکوومەتی ئیتالی ئەوەی کە لە دەستی هات کردی بۆ ئەوە کە هاوپەیمانەکانی بێنێتە سەر شێوازی بیرکردنەوەی خۆی. لە لەندەن لە دێسامبری ساڵی ١٩١٨دا، بە بەریتانیەکان و فەرەنسەیەکانی ڕاگەیاند کە یۆگۆسلاڤەکان خەریک بوون " بەڕاستی ئیتالیەکان بچەوسێننەوە.؛ سەربازانی ئیتالی خەریک بوو هێرش دەکرایە سەریان، ژنانی ئیتالی لەبەرهۆی ئەوەکە ڕەنگی ئیتالیان دەپۆشی ئازار دەدران. ئەو بە توندی دژی ئەوەبوو کە ولاتی تازەی یۆگۆسلاڤیا بە فەرمی بناسێت. فەرەنسە و بەریتانیا بە نابەدڵیەوە ڕەزایەتیان دا. ئەوان لە ناچاری ڕێزیان لە گرێبەستی لەندەن دەکرد، بەڵام باپێشیان ناخۆش بوویێت دەیانکرد. وەک ڕۆبێرت سیسیل بۆ باڵوێزی بەریتانیا لە ئیتالیا نووسیبوو کە " ڕاستیەکە ئەمەیە کە چاوچنۆکی سیاسەتی دەرەوەی ئیتالیا لە هەموو بارێکەوە خەریکە ئیتالیا لە گێرەوکێشە نزیک دەکاتەوە... یۆگۆسلاڤەکان زۆر زیاتر لەوەکە مافی ڕەوای خۆیان بێت داوادەکەن، بەڵام کەللەڕەقی سۆنینۆ و سرووشتی دەستبلاوی داواکاریەکانی ئیتالیا وای لێکردوون کە لە ئورووپادا بێجگە لە ئێمە هاورێیەکی بۆ

نەمێنێتەوە، و ئەو وڵاتە[ئیتالیا] ئەوەی لە دەستی هاتوە کردوویەتی تا بە تەواوەتی خۆی دوورەپەرێز بگرێت و کەس لێی نەپرسێت."٦٤٨

ئەوە ئەمەریکیەکانی تەنیا هێشتەوە. ڕەنگە ویلسۆن لەسەر هەندێک لە وردەکاریەکانی تایبەت بە داواکاریەکانی ئیتالیا زانیاری کەمی بووبێت (وادیار بوو لە سەرەتادا ئەو لای وابووبێت کە تریستی شارێکی ئەڵمانیە)، بەڵام باش دەیزانی کە سنووری یاساکان نابێ ببەزێنێت. ئەو لەوە دڵنیا بوو کە وڵاتەیەکگرتوەکان بە ڕێکەوتنامەی نهێنیەوە گرێی نەخواردبوو. لە کاتی شەڕەکەدا گرێبەستی لەندەن پیشانی سەرۆک کۆمار درابوو، هەرچەند دواتر وای دەنواند کە قەت چاوی پێی نەکەوتوە.) پسپۆڕانی یاسایی ئەو بەڵگەیان دەهێناوە، و ئەویش قەبووڵی دەکردن، کە کاتێکە ئیتالیا لەسەربنەمای چاردە خاڵەکە بەدوای ئاگربەستی کاتی لەگەڵ زلهێزانی ناوەندی بوو، لەژێرەوە قەبووڵی کردبوو کە ئەمانە گرێبەستی لەندەنیان بەزاندوە. چاردە خاڵەکە بەڵێنی ئەوەی دابوو کە " سەرلەنوێ دیاریکردنەوەی سنوورەکانی ئیتالیا دەبێ کاریگەری هێڵەکانی دیار و ناساراوی ڕەگەزنامەی لەسەر بێت." ئەوە بەشێک لەو زەویانەی بە ئیتالیا دەبەخشی کە لە سنووری باکووری ڕۆژئاوای خۆیەوە خوازیاری بوو بەڵام بەشێکی زۆری لە ئیستریای نەدەگرتەوە و هیچ بەشێک لە دالماتیای لەخۆ نەدەگرت. لە دانووستانەکانی تایبەت بە ئاگربەستدا، ئۆرلاندۆ سەرنەکەوتوانە هەوڵی دابوو تا مەرجێکی ئیتالی وەک یاداشت لە گرێبەستەکەدا هەڵبگرێت تابەڵکوو سنوورەکانی ئیتالی دابینکردنی پێداویستیەکانی ئاسایش وەک ئەرک بخەنە بەرچاو. ئیتالیەکان دواتر ڕایان گەیاند کە مەرجەکەیان بەهەند وەرگیراوە؛ ئەمەریکیەکان پێداگریان دەکرد کە ئەوە درۆیە و وانیە.٦٤٩

لەگەڵ ئەوەشدا ئۆرلاندۆ و سۆنینۆ بە گەشبینیەکی زۆرەوە چاوەڕوانی گەیشتنی ویلسۆنیان بۆ ئورووپا دەکرد. هاوس ئەوانی هان دەدا کە وەک هاوڕێیەک بیر لە وڵاتەیەکگرتوەکان بکەنەوە و، وەک نوێنەری ویلسۆن، ئەو ڕێگەی دا ئاگربەستەکە لەگەڵ مەجارستان-ئوتریش بە شێوازێک داڕێژرێت کە هێزەکانی ئیتالیایی هەمووی ئەو ناوچانە داگیر بکەن کە لە چوارچێوەی گرێبەستی لەندەندا بەڵێن درابوون. ئەو سۆنینۆی بە بەکارهێنانی تەکنیکی دانووستان و پێکەوەدانیشتن ئامۆژگاری دەکرد. ئەگەر ئیتالیا دانی بە جەرگی خۆی دابێنایە و جاریێ داواکاریەکانی خۆی پێشکەش نەکردبایە هەتا بەریتانیا و فەرەنسە ئەو شانەی کە بەدوایانەوە بوون دەستیان کەوتایە، کۆڕی ئاشتی نەیدەتوانی لەبەرانبەریدا ڕاوەستێ و بڵێ نا. هاوس لە یاداشتنامەکەی خۆیدا هێنابووی کە " ئەمن ئەمەم بە ڕۆحیەتێکی خەست و خۆڵی شەیتانیەوە کرد. کاتێکە سۆنینۆ و ئۆرلاندۆ مشت و مڕەکەی خۆیان لەسەر بنەمای

داواکاریەکانی بەریتانی و فەرەنسەییدا دارِشت، ئەو کاتە ئەمن خۆشحاڵ دەبم لەوەکە بەشداری بکەم." هاورِێ لەگەڵ ئەوە ئیتالیەکانیش لەلایەن بارۆن ماچی دی سێلێری، باڵوێزی ئەوان لە واشنگتۆن، پیاوێک بە توانایەکی لە رِادەبەدەر لە پووشبەسەرکردنی رِاستیەکان، کەسێک کە ئەوانی ئەرخەیان دەکرد لەوە کە ویلسۆن داکۆکیکەری ئیتالیا و داواکاریەکانی ئەو وڵاتەیە، خراپ ئامۆژگاری دەکران و بە هەڵەدا دەچوون. ئۆرلاندۆ دانی بەوەدا هێنا کە " ئەو پیاوێکی باشە، بەڵام بۆ ئەو کارە دانەتاشراوە و ... هەربۆیە ئێمە ئیتالیەکان گوێمان نەدا بە هەستی رِاستەقینەی ویلسۆن و لە کۆرِەکە بەشداریمان کرد." باڵوێزی ئەمەریکی لە رِۆم لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە " بارۆن سۆنینۆ سەبارەت بە ئەمەریکا شارەزایەکی یەکجار کەمی هەیە یان باشتر وایە بڵێین هەر نەیبوو و من لام وانیە ئەو زۆر لە مەبەستی سەرەکی ئێمە تێگەیشتبێت.".٦٥٠

ویلسۆن عادەتی بوو بە گومانەوە سەیری ئیتالیەکان بکات چون ئەو لای وابوو کە ئەوان بە رِۆحیەتێکی "تەواو درِندانەوە" هاتبوون و بەشداریان لە شەرِەکەدا کردبوو. کاتێکە لە مانگی دێسامری ساڵی ١٩١٨دا گەیشتە پاریس یەکەمین کارێکە کردی ئەوەبوو کە ناردی بەدوای کۆپلەیەک لە گرێبەستەکەی لەندەندا. چەند رِۆژ بەرلە دەستپێکردنی جەشنی کریسمەس ئەو بۆ یەکەم جار چاوی بە سۆنینۆ و ئۆرلاندۆ کەوت و وتوێژێکی دوورودرێژی سەبارەت بە داواکاریەکانی ئیتالیا لەسەر ئاداریاتیک بردە سەر. ئیتالیەکان لایان وابوو کە دانیشتنەکە بە باشی بەرِێوە چوە. باڵوێزی بەریتانی، کە رِۆژی دواتر لەگەڵ ویلسۆن قسەی کرد، بۆچوونێکی جیاوازی هەبوو: " ئەو زۆر دژە-ئیتالیە... ئەو لەبابەت ئۆرلاندۆ و سۆنینۆ و شێوازەکانی ئەوان تاڵ و توونی تێکەڵ کردوە و بەتایبەت ئەو نەیدەویست لەگەڵیان هیچ جۆرە وتوێژێک دەست پێبکات." بە پەک کەوتنەوەی دەستپێکردنی کۆرِی ئاشتی، ویلسۆن رِازی بوو تا بە سەردانێکی فەرمی بچێت بۆ رِۆم. بەداخەوە ئەمە تەنیا لێک تێنەگەیشتنەکانی قووڵتر کرد.٦٥١

ئەو لەلایەن جەماوەرێکی زۆر و بەتاسەوتینێکی تایبەتەوە پێشوازی لێکرا. دواتر گێرِابوویەوە کە " وام زانی لەناو کۆمەڵێک هاورِێی رِاستەقینەی خۆم دام." ئەو بەهەڵە ئەم ئەنجامەی گرتبوو کە خەڵکی ئیتالیا لەپشت پرۆگرامەکەی ئەوەون. دوکتوورەکەی ئەو لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە " سەرۆک کۆمار وتبووی کە ئەو واهەستی دەکرد کە خەڵکی ئەو وڵاتە تامەزرۆی هێنانەدی ئاشتیەک بوون کە ئەوانی بە شەرِێکی تردا دەبرد، وەک شەرِێکە ئەوان پێشتر لێوەی تێپەرِیبوون. ئەو هەستی دەکرد کە ئەوان بیرۆکەی کۆمەڵەی گەلانیان وەک ئامرازێک بۆ گەیشتن بە ئاواتی

مەزن هەنگاوتبوو." چوار مانگ دواتر، کاتێکە پێوەندیەکانی ئەو لەگەڵ بزووتنەوەی ئیتالی بەوپەڕی خراپی خۆی گەیشتبوو، ئەو دەبوایە ڕاستەوخۆ بەرۆکی خەڵکی ئیتالیای بگرتایە.

ئۆرلاندۆ بەش بە حاڵی خۆی پێداگری لەسەر گەشبینیەکەی خۆی دەکرد. ئەو بەخۆشحاڵیەوە بە هاوڕێیەکی خۆی وتبوو کە " من باوەڕم بە ویلسۆن و بە بیروباوەڕەکانی ئەوە. هەتا بیروباوەڕەکانی ویلسۆن مافەکان و بەرژەوەندیەکانی ئیتالیا لەخۆبگرێت ئەمن سوورم لەسەر ئیمانێکە بە ئەوم هەیە." سۆنینۆ گومانی هەبوو. ویلسۆن لەبەرانبەر ئەم هەستەدا هەڵوێستی گرت؛ ئەو هاتە سەر ئەم ئەنجامە کە ئەو وەکوو" مارماسی یان وەک یەک ئیتالی لووسە و بەدەست ناگیرێت." لە ١٣ی مانگی ژانویەدا، ویلسۆن ئۆرلاندۆی ئاگادار کردەوە کە ئەو بڕیاری داوە چیتر لەوە بەولاوە گرێبەستی لەندەن بە فەرمی نەناسێت. لەوێ بۆ ماوەی چەند حەفتەیەک باسەکە درێژەی هەبوو، کەچی شۆڕای عالی خۆی بە کۆمەڵەی گەلانە و بابەتی ئاڵۆزاوی وەکوو ئایا دەبێ بۆلشویکەکانیش بۆ پاریس بانگێشت بکرێن خەریک کردبوو.٦٥٢

* * * *

شاندی نوێنەرایەتی ئیتالی لە هۆتێلی ڕازاوەی ئێدواردیVII، نزیک بە ئۆپێرا، سەقامگیر بوون. تەنیا نوێنەرێک ڕێگەی درایە کە خێزانەکەی بێنێتە ژووری، ڕەنگە بەهۆی ئەوەوە بووبێت کە تازە ژیانی هاوبەشیان درووست کردبوو. تەلەفۆنێکی لێبوو، و نوێنەرەکان بۆ ئەوەی کەڵکیان لێوەرگرتبایە دەبوایە ئیزنیان لە ئۆرلاندۆ بگرتایە. شاندی نوێنەرایەتی خۆی لەخۆیدا ڕەنگدانەوەی بەشە جیاجیاکانی سیاسی لەناو حکوومەت دابوو. یەکێک لە ئەندامانی لاوتر لەوانی تر بەم شێوەیە تاریفی کرد کە "پارچەیەکی بچووک لە ڕۆم هاوڕێ لەگەڵ هەمووی کەم و کورتیەکانی بۆ پاریس گوازرایەوە، سەد مەخابن لە هەڵبژاردنی ستاف، قسەلۆک و پاش ملەقسەکردندا بێ بەش لە ڕێکخراوە، باوبوونی کیمیای پەرلەمانی بوو (ئێستا و داهاتوو)".

هەموولایەک لەسەر ئەم باوەڕە بوون کە ئەو شاندە لە بەهێزی و کاریگەری بوون بێ بەشن. بە واتەی ماچی دیدێلێری، کە ئێستا لە واشنگتۆنەوە ناردرابوو تا یارمەتی گومانلێکراوی خۆی پێشکەش بکات، بە شان و شکۆیەکی سەیرەوە بۆ ئەمەریکیەکی شیکردەوە کە " ئیتالیا هیچ بەند و باوێکی تایبەت بە خۆی نیە؛ ئەو وڵاتە کۆنە و ڕەگەزێکە لەوێندەرێ دەژی لەخۆبایی و لووت بەرزن." ژمارەیەکی زۆر کەم لە ئەندامانی ئەو وڵاتە لەگەڵ ئەو نوێنەرانەی کە بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان پێوەندی نافەرمیان هەبوو لە پێوەندی دابوون. لەنێوان ڕێبەرانی شاندەکەدا، ئانتۆنیۆ سالاندرا، سەرۆک وەزیری پێشوو، زۆر نیگەرانی سەلامەتی ئەو بوو، کەچی ئۆرلاندۆ لەدڵەوەنزیک

بەڵام دالْغە بوو. سۆنینۆ دوورەپەرێز خۆی دەگرت و هەمووشتێکی شاراوە بوو، هەرچی زانیاریە لای خۆی هەڵی دەگرت تەنانەت ئەگەر یارمەتی هاوڕێیانی شاندی خۆیشی بدایە. لە کاتی بێکاریدا بە تاقی تەنیا دەچوو بۆ پیاسەکردن. ئەو پشتگری لە ئیتالیا نەدەکرد: " پەنابردن بۆ شێوازگەلی لەو چەشنە واتە نزمبوونەوە تا ئاستی ئەو وڵاتە بچووکانە کە لە ڕای گشتی جیهانی دەپاڕانەوە و سواڵی ناوچەکانیان لێدەکردن." دوا تێپەڕبوونی چەند مانگێک پێوەندیەکانی ئەو لەگەڵ ئۆرلاندۆ خراپتر بوون. چەند دیمەنێکی تووڕاوی بەدی کرا کە لەوێدا سۆنینۆ کە لە حاڵەتی ئاساییدا خۆی پێرادەگیرا نەیتوانی خۆی ڕاگیربکات و لە تووڕەییدا سوور هەڵگەڕابوو.٦٥٤

هیچ کە لەناو خۆیاندا ناکۆک و بەش بەش بوون، متمانەشیان بە هاوپەیمانەکانی خۆیان نەبوو. دیپلۆماتێکی بەریتانی وتی کە " ئەوان لایان وابوو کە لەلایەن هێزەکانی ترەوە ئەوان وەکوو یەک سەیر نەدەکران؛ ئەوان لە هەموو لایەکەوە هێرش دەکرایە سەریان و ڕەخنەیان لێدەگیرا؛ بەوان ڕادەگەیەنرا کە چی بۆ ئەوان باشە، بەڵام بە مانای ڕاستەقینەکەی وتوێژیان لەگەڵ نەدەکرا." سۆنینۆ مشەمشێکی کردوو و وتی کە ویلسۆن *سێپیسی دی کلێرجیمەنە*، وڵاتەیەکگرتووەکان، بە واتەی ماچی دی سێلێری، "بەرتیل خۆرێک، کە دەیەویست بە زۆری ئاشتی بسەپێنێت. لە کۆتایی مانگی ژانویەدا، ویکهام ستید لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە ویلسۆن لەگەڵ سۆنینۆ " وتوێژێکی چەتوونیان بردۆتە سەر کە گوایە ئەو خۆی پێ ڕانەگیراوە و ئارادەیەک چۆتەپێشێ کە بە ویلسۆن بڵێ لە کاروباری ئەورووپیدا دەست تێوەر مەدە و باشتر وایە بە ئەمریکاکەی خۆتەوە بچەسپێ و سەرت بە ئەوێوە قاڵ بێت."٦٥٥

لەنێوان ئەورووپیەکان، ئیتالیەکان لەگەڵ بەریتانیەکان نێوانیان زۆر خۆش بوو و لەگەڵ یەک باش هەڵیان دەکرد. ئۆرلاندۆ بە شان و باهۆی لیۆد جۆرجدا هەڵی کوتبوو و وتبووی کە: " خوێنی سێلتیکی ئەو ئەوی وەکوو ئێمە مەدیترانەیەکان وریا و زیرەک بارهێناوە." و هیچ شتێک نەیدەتوانی هەردوو وڵاتی ئەوان لەیەک بکات. ئەمە فەرەنسەی نەدەگرتەوە. ئیتالیا یەکگرتنەوەکەی خۆی قەرزداری فەرەنسە دەزانی، بەڵام ئەو هەستە هەبوو کە فەرەنسە کاتێکە نایس و ساڤۆی گرتبۆوە قازانجێکی باشی کردبوو. هەردوو وڵات بە ئاواتەوە بوون ڕۆژێک ببن بە زلهێزێکی مەدیتەرانە، و بەرلە دەستپێکردنی شەڕ ئەوان لەسەر توونیسیا و مۆراکۆ لەگەڵ یەک تێکهەڵچووبوون. ئیتالیا لەگەڵ هاوپەیمانی سێ قۆڵە یەک کەوتبوو تا بەڵکوو دژ بە فەرەنسە هاوپەیمانێک بۆ خۆی بگرێت. وەکوو ئەو پێوانەگەلەی کە سیاسەتمەدارانی جیهانی بەخۆیەوە خەریک کردبوو، ئیتالیا لە پۆلا، خەڵووز و زاووزێدا کەوتبوە دوای فەرەنسەوە. لیۆد جۆرج وەبیری هێنانەوە کە " لە هەمووی ئەو

دانیشتنانەی کە لەگەڵ ئیتالیەکان بوومە، ئەوەم بۆ دەرکەوتوە کە سیاسەتی دەرەوەی ئەوان بەگشتی لەژێر کاریگەری کۆمەڵێک تایبەتمەندی وەکوو چاوپیسی، ڕکابەری، وەرەزبوون، بەتایبەت ترس لە فەرەنسەدا بوە."٦٥٦ بۆ فەرەنسە ئەوە زۆر مەسەلەی ترس نەبوو (هەرچەند لەسەر ڕادەی لەدایکبوونی ئیتالی هەست بە بوونی هەندێک دڵەڕاوکێ دەکرا) بەڵکوو مەسەلەی هەڵکردن کە ڕەنگ و بۆی ڕق و قینی پێوە دیارە. لە مانگی دیسامری ساڵی ١٩١٨دا، دوابەدوای دانیشتنەکانی هاوپەیمانان لە لەندەن، ئۆرلاندۆ و سۆنینۆ هاوڕێ لەگەڵ کلیمینجوو بۆ پاریس سەفەریان کرد. یاریدەدەرەکەی کلیمینجوو لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە " لەماوەی ئەو سەفەرەدا تەنانەت بۆ جارێکیش چاومان پێیان نەکەوت، و ئەوان لە گار دۆ نۆرد، بەبێ ئیزن وەرگرتن لە بەڕێز کلیمینجوو، کە نەک تەنیا زۆر سەری سووڕمابوو بەڵکوو زۆریشی پێ ناخۆش بوو، لەبەرچاو گوم بوون." کلیمینجوو ڕێزێکی تایبەتی بۆ سۆنینۆ هەبوو بەڵام ئۆرلاندۆی نەدەهاتە بەرچاو: " هەموو شتەکان بۆ هەمووی پیاوەکان، زۆر ئیتالیایی کەوتوون."٦٥٧

هەڵوەشاندنەوەی ئوتریش-مەجارستان ناوچەگەلی تازەی بۆ ململانێ کردن خستە بەردەم چون ئیتالیا و فەرەنسە لەسەر تەشەنەکردن بۆ ناوەندی ئورووپا پێکەوە ململانەیان هەبوو. لە ئادریاتیک، فەرەنسە لەنێوان برادەرانە مامەلەکردن لەگەڵ یۆگۆسلاڤیا و ڕاگرتنی پێوەندی ژیرانە و دۆستانە لەگەڵ ئیتالیا گیری کردبوو و لەوانەبوو بپسێ. دیپلۆماتێکی فەرەنسەیی نووسیبووی کە " ئەمن لە کێشەکانی تایبەت بە ئادریاتیک بەڕاستی بەتەنگەوەهاتووم، بە هەمان چەشن ئێمە نابێ دەست لە یۆگۆسلاڤەکان هەڵگرین. ئەوان بە قەدەر ئەمانەی تر ناماقووڵن، بەڵام ئەوەی هەیە کە ئەوان لاوازن. ئەوان لە ڕۆم چاک خۆیان لێ کەر بوە!" وەک چۆن ڕۆژێکیان کلیمینجوو دەهری ببوو و وتی، هەرچەند ئۆرلاندۆ زۆری پێناخۆش بوو، " ئەرێ خوایە کامیان هەڵبژێرم ئیتالیا یان یۆگۆسلاڤیا؟ خورما یان کشمیش یان هەرکیان خورمیش؟" لە مانگی ئاڤریلی ساڵی ١٩١٩دا کلیمینجوو سووربوو لەسەر ئەوە کە کشمیش هەڵبژێرێت. ئەو زۆر لەوە قەڵس بوو کە ئیتالیەکان لەسەر ناوچەی سار یان مەسەلەی دادگایی کردنی ئەڵمانیەکان لەبەرهۆی تاوانەکانی جەنگ پشتگریان لە فەرەنسە نەکردبوو. لەگەڵ ئەوەش ئەو ئەوەی بە هەند گرتبوو کە ئەو بۆ منۆرەکردن مەودای باشی هەیە چون، لە ئاکامدا، ئیتالیا پێمل دەبێت کە لەگەڵ فەرەنسە ڕێگەی دۆستایەتی بگرێتە بەر.٦٥٨

ئۆرلاندۆ و سۆنینۆ، بەگومان لە هاوپەیمانانی خۆیان، ناکۆک لەگەڵ دراوسێی یۆگۆسلاڤی خۆیان و گیرۆدەی هاوپەیمانیەکی تووش کە هیچ کامیان نەیاندەوێرا لە ترسی ڕووخاندنی

حکوومەتەکەیان پشتی تێکەن، بە هەر سەختی و مەرارەتێک کە بوو درێژەیان بە چالاکی دا. وەک بۆمبێک بە پلێتەیەکی هێواش-لەحاڵی سووتاندا، یاداشتی فەرمی ئیتالی لە ٧ی مانگی فەوریەدا بەرەو کۆڕی ئاشتی وەڕێ کەوت. ئەوە بەڵگەیەکی سەرنجڕاکێشە کە، هەرچەند بەدەگمەن ئاماژە بە گرێبەستی لەندەن دەکات، مەرجەکانی خۆی وەک خۆیان نەگۆڕاو دوویات دەکاتەوە، ئەم جارەیان بە بەرگی بەبەرنەبووی دێمۆکڕاسی تازە لەبەردا. بەم شێوەیە دەستی پێکرد کە " داواکاریەکانی ئیتالی ڕۆحیەتێکی وەها دادپەروەرانە، ڕاستبوون، و نێوانڕەوی نیشان دەدەن کە بە تەواوەتی لەچوارچێوەی ئەو پرەنسیپانەدا دێن کە لەلایەن سەرۆک ویلسۆنەوە تاوتوێ کراون و پەسەندکراون و بەم پێیە پێویستە کە لەلایەن هەموانەوە بەفەرمی بناسرێن و پەسەند بکرێن." داواکاریەکانی ئیتالیا بەگشتی لەسەربنەمای خود-موختاری بوون، هەڵبەت بۆ ئیتالیەکان؛ چەند نموونەیەکی بچووکی تر لەناو یاداشتەکەدا کە داوای ئەو زەویانەیان دەکرد کە کەسانی تر تێیاندا نیشتەجێ بوون تەنیا بۆ ئەوە بوو کە سنوورەکانی پێ ئارام کەنەوە.٦٥٩

ئۆرلاندۆ و سۆنینۆ، سەرەڕای پێناخۆشبوونی کۆلۆنیالیستەکانی خۆیان، لەسەر ئورووپا تەرکیزیان کردبۆوە. وەزارەتی کۆلۆنیایی ئیتالی بەتاسەوتینێکی زۆرەوە خۆی خستبوەگەڕ تا پلانی گەورەگەورە، بەتایبەت بۆ ئەفەریقا، دابڕێژێت. بۆ ناسیۆنالیستەکانی ئیتالی، "ساڵی ڕیسوایی" ١٨٩٦، بە شکستخواردن لە ئادۆوا، تەنیا لەڕێگەی وڵاتگیری و سەرکەوتندا دەکرا بسڕدرایەتەوە. وەزیری کۆلۆنیایی، گاسپاریێ کۆلۆسیمۆ، کردیە سەر حکوومەتەکەی کە پێویستە بەریتانیا و فەڕنسە دوورەپەرێز بوەستن و ڕێگە بدەن بە ئیتالیا تا بەشێوەیەکی تایبەت تەشەنە بکاتە ناو خاکی یۆتۆپیا. بێجگە لەوانە، بۆ مەبەستی بەهێزکردنی کۆنترۆڵی ئیتالیا بەسەر ئەو ڕێگایانەی کە لە دەریای سوورەوە و لە ئۆقیانووسی هێندەوە بەرەو ئیتۆپیا دەکشان، بەریتانیا پێویستە بەشی خۆی لە سۆمالیا بە پارچە زەویەک بلکێنێ کە تازە کەوتبوە ناودەستانی ئیتالیەکان و بەشی ڕۆژهەڵاتی باکووری کێنیا بدا بە دەستەوە. فەڕنسە دەبێ واز لە پارچەی بچووکی خۆی لە سۆمالیا، هەروەها ڕێگەی شەمەندەفەرێک کە لە بەندەری دژیبۆتیەوە بەرەو ئادیسابابا درێژەی هەیە بێنێت. بێجگە لەوانە کۆلۆسیمۆ خەونی لیبیایەکی دەدی کە بە ناوچەیەک لە میسری ژێردەسەڵاتی بەریتانیا گەورەدەبۆوە و لە زەویوزارەکانی فەڕنسەیی و، ئەگەر کۆلۆنیەکانی پۆرتەغاڵی بە پارانەوەی خۆیان درێژەیان بدایەتێ، خەونی دەستبەسەرداگرتنی ئانگۆلاشی لەمێشکدابوو. درووست بەرلە دەسپێکی شەڕ ئەو یاداشتێکی بۆ بالفۆڕ و هاوس نارد کە تێیدا ڕیزبەندی ئەم ئامانجانەی هێنابوو. شێوەی داڕشتنی وشەکان بە وردبینیەوە هەڵبژێردرابوو تا لەهی ویلسۆن بچێت؛ لە هەر حاڵدا، مەبەست ئەوە بوو کە شوێنەواری چاوچنۆکی ئیتالیەکان دابنێت.٦٦٠

ئۆرلاندۆ و سۆنینی ئامادە نەبوون تا بەگوڕ و بەتینەوە داواکاریەکانی ئەفەریکی لە پاریس پێشکەش بکەن و لەوەندەچوو فەڕەنسە و بەریتانیا بایەخێکی ئەوتۆ بەوە بدەن. ئەوان هەرخێرا بەبێ ئەوەی لەگەڵ ئیتالیا ڕاوێژ بکەن کۆلۆنیەکانی ئەڵمانیایان دابەش کرد و، سەبارەت بە بەدەستەوەدانی ناوچەی خۆیان بە ئیتالیا، هەر وڵاتێک پێخۆشبوونی تەواوی خۆی بۆ ئەنجامی ئەو کارە دەربڕی بە مەرجێک کە ئەوی تریان وای بکردایە. ئەم جارەش ئیتالیەکان خورپەیەک و ئەم جارەش خەونێکی ناخۆشیان بۆ بەجێ مایەوە.٦٦١

مۆسۆلینی ئەوەی لە ئاکامدا بەکەڵک زانی.

لە ئورووپا، تەنیا یەکێک لەو داواکاریانەی ئیتالیا کە بەئاسانی وەرگیرا پارچەزەویەکی مەجارستان-ئوتریش بوو لە باشووری برێنێر پاس، تیرۆلی باشوور و لەژێر ئەوەدا ترێنتینۆ. ترێنتینۆ، کە بەگشتی ئیتالی-ئاخێوەر بوون، کێشەی دروست نەدەکرد، بەڵام تیرۆل زۆربەی هەرەزۆریان ئەڵمانی بوون. تیرۆلیەکان بە دابەشکردنی پارێزگایەک بە مێژوویەکی دوورودرێژی خود-موختاری بەرهەڵست بوونەوە. هاوڕێ لەگەڵ ئەوەش حکوومەتی وڵاتی تازەی ئوتریش هەروا بوو: " لەڕاستیدا ئەوە تیرۆلە، بێجگە لە سویس، کە هەتاکوو ئێستا ناوەندی هەرە گەرم و گوڕی ئازادی و بەرخودان لەبەرانبەر هەمووی دەسەڵاتە دەرەکیەکاندا بووە، کە دەبێت بە قوربانی لێکۆڵینەوەکانی ستراتیجیک، وەک پێشنیارێک لەسەر کورسی پیرۆزی بیروباوەڕی میلیتاریزم." ئیتالیەکان لەسەر ئەوە دەڕۆیشتن کە تەنیا ئەگەر ناوچەیەک کە بەرەو برێنار پاس خواردەبێتەوە بە ئیتالیا ببڕێت ئەو وڵاتە هەست بە هێمنایەتی و ئاسایش دەکات. هەر سنوورێکی تر لەسەر باشوور تەنیا بڕینەوەیەکی دەستکرد دەبێت کە بەپێچەوانەی ئەو یاساگەلەی کە بنەماکانی ئاشتی دەبێ لەسەریان داڕێژرێن سەرپەرشتیاری و چاککردنەوەی چەک و تەقەمەنیە بەنرخەکان بە ئەرک دەزانێت." ویلسۆن، ڕەنگە بۆ ئەوە بە ئیتالیەکان نیشان بدات کە ئەو پیاوێکی ژیربێژە، بەرلەوە کە کۆڕی ئاشتی دەست بە کارەکانی خۆی بکات تێی گەیاندن کە ئەو سەبارەت بە گۆڕانکاری لە سنووری باکووری ئیتالیا بەرەنگار نابێتەوە. هاوڕێیانی ئاشتیکەری ئەو بێ ئەوەی مرەیەکیان لێوەبێت ڕەزایەتیان دا. بەبۆچوونی هاوس، بۆ ماوەیەکی کورت لیۆد جۆرج دڵەڕاوکێی تیرۆلی لە دڵ دابوو، چون کاتی خۆی بۆ پشوودان سەردانی ئەوێی کردبوو و ئەوێ یەکێک لەو بەشە دەگمەنانە بوو کە ئەو شارەزایی باشی بە سەریدا هەبوو. ویلسۆن دواتر پەشیمانی ئەوەبوو کە ئەو ژمارەیەکی یەکجارزۆری تیرۆلی ئەڵمانی-ئاخێوەری-نزیک بە ٢٥٠،٠٠٠ کەس- دابوو بە دەست دەسەڵاتی ئیتالیەوە. ئەوانیش ئەو کارەیان کرد، بەتایبەت دوا ساڵی ١٩٢٢، کاتێکە فاشیستەکان بڕیاریان دابوو ئەوان بکەن بە ئیتالی. کوتوپڕ، قوتابخانەکان

و ئۆفیسەکانی حکوومی بە زمانی ئیتالی کاروبارەکانیان دەست پێکرد؛ نەدەکرا منداڵان ناوگەلێکیان لێبنرایە کە "هەستی ئیتالیەکانیان بریندار دەکرد." ئەوە تەنیا لەچوارچێوەی ئیتالیایەکی تەواو گۆڕاودا و ئوروپایەکی دەیەکانی ۱۹۷۰دابوو کە تیرۆل لە ئاکامدا بەشێک لە ئۆتۆنۆمی کۆنی خۆی گیر کەوتەوە.٦٦٢

ویلسۆن ئامادە بوو نابەرانبەریەک لەبابەت ئەڵمانیەکانی تیرۆل قەبووڵ بکات بەڵام ئەو داواکاریەکانی ئیتالیای لەشوێنێک کە ئەوان لەگەڵ داواکاریەکانی یۆگۆسلاڤەکان بەرەنگاری یەک دەبوونەوە قەبووڵ نەدەکرد. لە دەرەوەی شارەکان، حەشیمەتێکە بەدرێژایی بەشی ڕۆژهەڵاتی ئادریاتیک نیشتەجێ بوون هەرهەموویان سلاڤی بوون: نزیک بە ۷٥۰،۰۰۰ کرۆواتی، سلۆڤێنی، سێربی و بوسنیایی. لەگەڵ ئەمانەشدا، ئیتالیەکان خوازیاری ئەوەبوون تا سنووری کۆن لەگەڵ ئوتریش-مەجارستان لەنێوان پەنجا و یەک سەد کیلۆمەتر بەرەو ڕۆژهەڵات بۆ شوێنێک کە ئەمڕۆکە سلۆڤێنیا و کرۆواسی پێدەڵێن، و بەرەو باشوور بۆ خوارەوەی کەنار ئاوی دالماتیان بەرەو سپلیت (ئیتالی: سپالاتۆ) بجووڵێنن. ئاکامەکە گشت دوورگەی ئیستریەن لەخۆ دەگرێت، وەکوو بنکەی هێزی دەریایی لە پۆلا و دوو بەندەری سەرەکی مەجارستان-ئوتریش بەناوەکانی تریستێ و فیووم، پێوەندیەکانی ڕێگەی شەمەندەفەڕی ئەو دوو بەندەرەوە بە ئوروپای ناوەندی؛ چەندین دوورگەی گرنگ لە کۆتایی ڕۆژهەڵاتی باکووری ئادریاتیک؛ و پارچە گەورەکانی دالماتیا بە دەوری شارەکانی زادار (ئیتالی: زارا) و سیبینیک (ئیتالی: سیبێنیکۆ). بێجگە لەوانە ئیتالیا خوازیاری بەندەری ئالبانیایی ڤلوورە لە باشوور بوو. بە ئەم دەسکەوتانەوە، ئیتالیا بەسەر ئادریاتیکدا زاڵ دەبوو، و وڵاتی تازەی یۆگۆسلاڤیا بە کەنار ئاوێکی کورت، بەبێ هیچ بەندەرێکی لەبار و باش و تەنیا یەک هێڵی ڕێگەی شەمەندەفەڕی لەنێوان دەریا و ناوەوەی وڵات دەمایەوە. ئەمە هەر ئەو شتە بوو کە ئیتالیا بەدوایەوە بوو.

هەڵبەت ئیتالیەکان ئەو شێوە مشتومڕەیان لە پاریس بەکار نەدەهێنا. ئەوان باسیان لە پێداویستیە سەرەکیەکان دەکرد و مێژوویان بەکاردێنا. " لە سەدەکانی ڕۆم و ڤێنیس، لەبەر قازانجی خۆی و ئاشتی جیهانی، دالماتیا بەگشتی لەگەڵ ئیتالیا یەکی گرتەوە. ئەوان ئاماژەیان بە شێرەکانی ڤێنێتی، کەنیساکانی کاتۆلیک، کۆڵکە چەقاوەکانی گۆڕەپانەکانی ناوشار بەدرێژایی کەنار ئاوەکان، بەرخودانی زمانی ئیتالی سەرەڕای زوڵم و زۆری ئوتریشیەکان. ئەوان باسیان لە نابەرانبەری تۆقێنەر دەکرد ئەگەر بێتو ئیتالیەکان بەزۆر بخرانایەتە پاڵ سلاڤەکانی "نیوە باربارێک".٦٦٣

لە هەرحاڵ، هەواڵی سەیر و تۆقێنەر دەگەیشتە پاریس: هەواڵی دوورخستنەوەی ناسیۆنالیستەکانی سلاڤ، دەستبەسەرداگرتنی نابەجێ، داخستنی ڕۆژنامەگەلی سلاڤ و پچڕانی هێڵەکانی ڕێگەی

شەمەندەفەری یوگوسلاڤیا. ئەفسەرێکی بەریتانی یاداشتێکی تووڕەی بۆ باڵفۆر نووسی: " دالماتیا خەریک بوو لەبرسان دەمرد و ئیتالیەکان تەنیا خواردەمەنیان بۆ ئەو کەسانە دابین دەکرد کە پەیمانی وەفاداریان لەگەڵ ئیتالیا واژۆ کردبوو." هوڤێر، کە بەرپرسی هەڵمەتی ڕزگاریکردنی هاوپەیمانی بوو، لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە بەرپرسانی ئیتالی لە تریستێ کەشتیەکانی بارهەڵگری خواردەمەنیان ڕاگیر کردبوون و ئەوە کە لە ٢٢ی مانگی فەوریەدا ئەوان کوتوپڕ هەمووی پێوەندیەکانیان لەگەڵ ناوەوەی وڵات پچڕاندبوو. "ئەمە نەک تەنیا سلاڤەکانی-جۆگۆ دوور دەخاتەوە بەڵکوو ڕێگەی سەرەکی شەمەندەفەڕ بەرەو ئوتریش و چکسلەواکیا دەپسێنێت." ویلسۆن لەگەڵ ئەنجامەکەی هوڤێر بوو کە " ڕاگرتنی خواردەمەنی ئەمەریکی بە خەڵکانی برسی ناکرێ وەک ئامێرێکی سیاسی بەکاربێت" و پێشنیارەکەی ئەوی قەبووڵ کرد بەومانایە کە وڵاتیەکگرتوەکان بە دەستهەڵگرتن لە بەخشینی یارمەتی بە ئیتالیا تۆڵە بستێنێ. ئەم کێشەیە لەوەبەولاوە پێوەندیەکانی ئەمەریکی-ئیتالی لە کۆڕی ئاشتیدا ئاڵۆز کرد.٦٦٤

هەر لە سەرەتادا ئەمەریکیەکان، بە پاڵپشتی لەلایەن بەریتانیەکان و فەڕەنسەیەکان، ئیتالیا و یوگوسلاڤیایان هان دا تا سنوورەکەی خۆیان تاوتوێ بکەن. ئەوان دەیانوت کە یوگوسلاڤەکان حەزیان بە دانووستان دەکرد. لەوانەبوو ویلسۆن بیتوانیایە ناوبژیوی هەر ناکۆکیەکی بکردایە. شاندی نوێنەرایەتی ئیتالی سەرسام مابوو. ئۆرلاندۆ لای ئەمەریکیەک دانی بەوەدا هێنابوو کە " هەرچەند پێشنیاری سلاڤی باشوور ئەوی زۆر سەرسام کرد، هیچ هۆکارێکی تایبەت بەدی ناکات لەوەی کە قەبووڵ نەکات." لە وتوێژێکدا لەگەڵ ویلسۆن، ئەو " گریابوو و گازندەی کردبوو و وتبووی کە سلاڤەکانی باشوور بەربینگی ئەویان گرتبوو، بەڵام لە کۆتاییدا بەڵێنی دابوو هەرکە چاوی بە شا و بە هاوکارەکانی لە ڕۆم بکەوێت و ڕاوێژیان لەگەڵ بکات وڵام بداتەوە." کاتێکە لە مانگی فەوریەدا ویلسۆن لە گەڕانەوەدا بوو بۆ وڵاتیەکگرتوەکان، ئیتالیەکان بەرەنگاری ناوبژیکردنەوەکەی ئەو بوون، بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە ئەوەیان تەنیا بۆ ئەوە کردوە کە چون یوگوسلاڤەکان، " بەشێوەیەکی دڕەندانە،" و پێشوەخت پێشنیارەکەیان بڵاو کردۆتەوە.٦٦٥

هەر لە دەسپێکی کۆڕی ئاشتیەوە ئاشکرابوو کە ئیتالیەکان بەهیچ لەونێک ئامادەنەبوون لەگەڵ یوگوسلاڤەکان یان کەسانی تر دانووستان بکەن. ئەوان بەرەنگاری هەر هەوڵێک دەبوونەوە کە باسی سنوورەکانی ئیتالیای بخستایەتە بەردەم لێژنەی پسپۆڕان. دوای کۆبوونەوەیەک لە مانگی مارسدا کلیمینجوو گلەیی کردبوو کە " ئەم دوانیوەڕۆیە ئۆرلاندۆ وتارێکی درێژدادڕی بە سەر ئێمەدا سەپاند تا داواکاریەکانی ئیتالی پێشکەش بکات و نیشانمان بدات کە بە بۆچوونی ئەو

کامیەک لە سنوورەکان پێویستن و ئەو بە ڕەوایان دەزانێت." و دواتر " پێویست بوو ئێمە گوێڕایەڵی وتارێکی دووهەم بین لەلایەن سۆنینۆوە، ئەمیشیان وەڕەزکەر بوو." پەیمانی کۆمەڵەی گەلان و مەرجەکانی ئاشتی ئەڵمانیا بەبێ هیچ مشتومڕێک لەلایەن ئیتالیەکان تاوتوێ کرا." (دواتر ئۆرلاندۆ بەڵگەی قایلنەکەری دەهێناوە کە ئەمە هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەکە ئیتالیا هەست دەکات خراوەتە پەراوێزەوە.٦٦٦)

پلانە جەنگیەکانی ئیتالیا هیلاککەر، ڕوون و هەتابڵێی ناکارامە بوون. ئەو وڵاتە سەبارەت بە داواکاریەکانی یۆگۆسلاڤیا لەسەر ناوچەگەلێک لە بۆلغارستان و مەجارستان دژایەتی هەبوو و لەبابەت ناوچەی بانات پشتگری لە ڕۆمانیا دەکرد. چەک و تەقەمەنی بە مەجارستان فرۆشت، و تەنانەت ڕێکەوتنامەیەکی نهێنی لەگەڵ حکوومەتی بێلا کۆنی هیچ و پووچ واژۆکرد. سۆنینۆ لەڕووی بێ ئەقڵیەوە یوونانی لە یۆگسلاویا نزیکتر کردەوە بە گوێ نەدان بە داواکاریەکانی یوونان لە ئالبانیا و بە هەوڵدان بۆ هەڵگرتنی زۆربەی دوورگەکانی دۆداکانی یوونان بەدرێژایی قەراخ ئاوەکانی ئاسیای بچووک، کە هەر لە کۆتایی شەڕەکانی باڵکان داگیری کردبوو. کاتێکە سەرۆک وەزیری یوونان داوای دانیشتنێکی کرد سۆنینۆ ڕازی نەبوو لەگەڵ وێنەزۆلائیەکان دانیشێت. سەبارەت بە لێژنەکان ئیتالیەکان یەکدەنگ دژە-یۆگۆسلاڤ و بە هیچ جۆرێک حازر نەبوون یارمەتیدەربن. ئەگەر گوشار بخرایەتە سەریان، ئەوان بەشێوەیەکی ئاسایی ڕایان دەگەیاند کە لەلایەن حکوومەتەکەیانەوە ڕانەهاتوون و هیچ جۆرە ئامۆژگاریەک نەکراون. ئایری کرۆوی لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا بەگژی دیپلۆماتێکی ئیتالیدا چوو، تەنیا لەسەر ئەوەندە کە وتی "کاتێکە ئێمە لە مانگی دێسامردا هاتین بۆ لەندەن ئێوە بەتەنیایی لەگەڵ ئێمە وتوێژتان نەکرد، و ئێوە لە پاریس لەگەڵ ئێمە وتویژ ناکەن یان حازر نابن هیچ جۆرە تەدارەکێک ببینن، و لە کۆتاییدا ئێمە نامانەوێت لەسەر ئەم پرسیارانە هیچ جۆرە بۆچوونێکمان هەبێت."٦٦٧

کاتێکە داواکاریەکانی ئیتالیا لە مانگی ئاڤریلدا کەوتنە بەر باسوخواست، هێزەکانی تر هیچ هاوخەمیەکیان لەخۆیان نیشان نەدا. تێبینیەکەی بیسمارک بەومانایە کە قەپاڵێکە ئیتالیا گرتوویەتی زۆر لە دەمی گەورەترە بەرێزەوە دەگێڕدرایەوە و باسیان لێدەکرد. بالفۆر بەتووڕەیەوە نووسیبووی کە "پێویستە ئیتالیەکان بەشێوەیەک هێور بکرێنەوە، و تەنیا پرسیارێک کە دێتە ئاراوە ئەمەیە کە چۆن بە کەمترین خەرج بۆ مرۆڤایەتی ئەوان هێور بکرێنەوە." لەو کاتەدا نوێنەرانی ئیتالی نائۆمێد ببوون. ئەو دەیکوت کە ئۆرلاندۆ باش دەیزانی کە کۆمەڵێکی نهێنی هەڕەشەیان لێکردبوو کە ئەگەر بەبێ دالماتیا بۆ ئیتالیا بگەڕێتەوە بەدڵنیایەوە دەیکوژن. چاپەمەنیەکانی ناسیۆنالیستی بەشێوەیەکی

دڕندانـە هەڵمـەتیان دەبـردە ئادریاتیـک تابیخنـە ژێـر کـۆنترۆڵی ئیتالیـاوە، و سیاسـەتوانان لـە ئەنجومەنەکانی شۆڕا دەهاتنەدەرێ و دەڕژانە سەر شەقامەکان. پارتی سوسیالیستی کە بەخێرایی ڕوولەگەشە بوو، وە ئێستا کەوتبوە ژێر دەسەڵاتی ڕادیکاڵەکانەوە، سەربازانی خۆی، و باڵی ڕاستی ناسیۆنالیستی *فاسی دی کامباتیمێنتی* خۆی ڕژاندە دەرەوە. کاتێکە لیئۆنیدا بیسۆلاتی، نەیارێکی ناسراوی داواکاریەکانی ئیتالیا، هەوڵی دا لە کۆبوونەوەیەکی گەورەی کۆمەڵەی گەلاندا لە لاسکالا لـە میلان وتارێـک پێشکەش بکات، ناسیۆنالیستە هار و توونـدڕەوەکان، وەکـوو مۆسـۆلینی، لـەناو جەماوەرەکەدا بوون. ڕۆژنامەنووسێکی ئیتالی سەبارەت بە دیمەنێک کە جارلەگەڵجار بەگوێی ئەم و ئەو دەگەیی لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی:

*دواتـر، لـە کـاتێکی دیاریکراودا، وەک بڵێی باتۆنێکی نادیار سیگناڵەکەی لێدابێت، سیمفۆنی دۆزەخ دەستی پێکـرد. جووکـەجووک، قیژەقیژ، فیکـەفیک، بۆڵـەبۆڵ، کـە لـە دەنگـی مـرۆ نزیـک بوون، و هـەمووی ئـەو سـەگوەڕە درووستکراوانە کـۆی شـەپۆلی دەنگـەکانیان درووست کردبوو؛ بەڵام هـاوارێکی ئینسـانی، نیشـتمانپەروەرانە هـەرتاوناتاوێک هەسـتی پێـدەکرا و بـە ئاهـەنگی مارشـێکی ملهوڕانەوە کۆمەڵەی بێ دەم و زمانی ڕێبەرایەتی دەکرد. ئـەوان دەیانوت: " کرۆواتـی نـا! کرۆواتـی نا!" بەومانایە بوو کە ئەوان حەزیان بە دۆستایەتی لەگەڵ کرۆواتەکان یان یۆگۆسلاوەکان نەدەکرد؛ و هەروەها مەبەستیان ئەوەبوو کە بیسۆلاتی کرۆوات بوو.*٦٦٨

بەگشتی فیووم پشتگری لە هەم پرۆگرامی ناسیۆنالیستی ئیتالی دەکرد و هەمیش سووربوونی ویلسۆن لەسەر بەرەنگاربوونەوەی ئەو پرۆگرامە. ئەوێ شوێنێک بوو کە بەکەمی شیمانەی لێدەکرا ببێتە هۆی قەیرانێکی لەو چەشنە. فیووم جوانیەکی تایبەت یان تایبەتمەندیەکی دیاری نەبوو، ئەوەی کە ئەوێی جیاواز کردبوو ئەوەبوو کە وەک بەندەرێکی بچووکی قەرەباڵغ بەر لەدەستپێکی شەڕ دەرگایەک بوو کە مەجارستانی بە ئادریاتیک پێوەند دەدا. حەشیمەتی دانیشتووی ئورووپای ناوەندی وەک تایبەتمەندیەکی تایبەخۆ، تێکەڵاوێک بوو لە ژمارەیەکی بچووک لە مەجاریەکان، چینی دەوڵەمەندی مامناوەندی ئیتالیەکان و چینێکی زۆرینەی کرێکاری کرۆواتی. لە خودی فیووم، ئیتالیەکان زۆرینەیەکی نادیاریان بە دەست بوو بەڵام، ئەگەر گەڕەکەکانی سووساکی پێوە بلکایە، زۆرینە بە دەست کرۆواتەکانەوە بوو. بەر لەشەڕ، دەکرا ئیتالیەکانی ناوچەکە بە هەست و سۆزەوە باسیان لە ئیتالیا بکردایە و بۆڵەیان بە سەر بەرپرسانی مەجاری بکردایە، بەڵام ئەوە تەنیا لە ساڵی ١٩١٨دا بوو کە یەککگرتنەوە لەگەڵ وڵاتی دایک وەک خەونێک هاتەدی. کۆمەڵێک چەتەی لاو و کەم تەمەن کە ناوی خۆیان نابوو گیۆمانی فیۆمانی لەپڕدا قاوەخانەکاندا سەریان

هەڵێنا، بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە ئۆرکێستراکانی ئەوان هەر پەنجا خولەک کەرەتێک سروودی نیشتمانی ئیتاڵی دەڵێنەوە و هەمووی دانیشتوانی کۆڕەکە دەهەژێنن و قنجەپێ ڕایان دەگرن.٦٦٩

وەکوو هەمووی ئەو شتانەی کە دوو ساڵ دواتر لە فیووم هاتنە ئاراوە، ڕووداوەکانی ئەو سەردەمە لە کۆتایی شەڕدا لە ئیتالیا ڕەنگ و بۆی ئەفسانەیان بەخۆیانەوەگرت. قارەمانانی گیانفیدا-ئارگۆنۆتەکانی مەسیحی کراو- تیرهاوێژانی بوێری ئوتریشی، بە قایەقی توندڕۆ لە ئاوەکانیان دەدا و دەپەڕانەوە و بەرەو ڤینیس دەچوون تا هێزی دەریایی ئیتالی بۆ ڕزگارکردنی فیووم بێنن. ئەو حەقیقەتانە، بەگوێرەی گوزارشی باڵوێزێکی ئەمەریکی، کە گوایە پێنج لاو لە فیوومەوە بە بەلەمی داگیرکراوی ماتۆڕیەوە تێپەڕیون و گوایە هێزی دەریایی ئیتالی بە هەڵە تەقەی لێکردوون، واخرایە پشگوێ وەک هەر ڕووی نەدابێت. میلیتاری ئیتالی کە ئێستا فیوومی لە چوارچێوەی ڕێکەوتنەکانی ئاگربەستدا داگیر کردبوو سووربوو لەسەر ئەوە کە دەبێ ئیتالی بمێنێتەوە. ئەدمیراڵێک وتبووی کە وتووێژە دیپلۆماتیکیەکان لە دەرەوەی بابەت بوون و هیچیان بە هیچەوە نەبوو؛ ئەم وتوێژانە تەنیا مشت و مڕی دیپلۆماتەکان و پیاوانی سیاسی بوون؛... فیووم سەربە ئیتالیا بوو و هەر ئیتالیش دەمێنێتەوە؛.... هیچ جۆرە دەستێوەردانێک ناتوانێت بەهیچ شێوەیەک مافەکانی ئیتالیەکان پێشێل بکات."٦٧٠

پێوەنووسانی گوزوگومەتی ئیتالیا بە فیوومەوە هۆکارێکی کردەوەیی هەبوو. یەکێک لە نوێنەرانی ئیتالی لە پاریس بە ئاشکرا وتبووی کە " ئێمە ناتوانین لەگەڵ تجارەتی تریستێ هەڵکەین مەگین بتوانین فیوومە بخەینە ژێر کۆنترۆڵی خۆمانەوە و تجارەتەکەی بەرەو تریستێ بقۆزینەوە." هەڵبەت فیوومە " گەوهەری ئادریاتیک" وەک هێمایەک لای ناسیۆنالیستەکانی ئیتالی گرنگیەکی تایبەتی هەبوو. هاوس لە یاداشتەکەی خۆیدا هێنابووی کە " بۆچی ئەوان مێشکیان بە شارۆچکەیەکی بچووکی ٥٠،٠٠٠ کەسیەوە، بە ژمارەیەکی تۆزێک زیاتر لە نیوە ئیتالیایی خەریک کردبوو، لای من وەک نهێنیەک یان وەک مەتەڵێک ماوەتەوە." لە مانگی ئاڤریلی ساڵی ١٩١٩دا، کاتێکە هاتوهاواری تایبەت بە فیووم گەیشتبوە لووتکەی هەرەبەرزی خۆی، ئۆرلاندۆ بە دڵتەنگیەوە لای هاوس درکاندبووی کە باشتر وابوو کە داواکاریەکانی ئیتالیا درووست لە کۆتایی شەڕدا جێبەجێ کرابانایە: " فیووم هەرگیز لەلایەن ئیتالیەکانەوە مەرجەکانی بەسەردا نەدەسەپا."٦٧١

زۆر جار ڕای گشتی خۆی بە شتی هیچ و پووچەوە خەریک دەکات. لەگەڵ ئەوەش لە ئیتالیا لە ساڵی ١٩١٩دا لەلایەن کەسایەتیەکی یەکجار تایبەتیەوە بەناوی گابریەل دئانۆزیۆ داڵدە دەدرا کە

فیوومی کردبوو بە کێشەیەکی تایبەت بە هی خۆی. ئەو کورتەبالا، کەچەڵ، ناشیرین و هەتابڵێی خوێنشیرین بوو. کاتێکە بۆ جەماوەرێک وتاربێژی دەکرد، دەیخستنە ژێر کاریگەری وتەکانی خۆیەوە و دەمیانی دەکرد بە تاقی چرا. ئەو پرسیاری لێدەکردن " ئایا ئێوە حازرن گیانفەدایی بکەن ژیانی خۆتان قوربانی بکەن؟"، و ئەوانیش لە وڵامدا پڕ بە دەمیان هاواریان دەکرد " بەڵێ". ئەوە هەر ئەو شتە بوو کە ئەو چاوەڕوانی دەکرد. ئەو بەرلە مۆسۆلینیش ڕێبەر یان دۆسێ بوو؛ بە واتای نیتزچیێ، ئەو پیاوێکی لەڕادەبەدەر توانا بوو. کە هەڵبەت باوەڕی تەواوی پێی هەبوو. بێجگە لەوانە دئانۆنزیۆ هەڵبەستوان، شانۆنووس و فیلمساز بوو. بوێری جەستەیی ئەو، ڕق و قین لێهەڵگرتن لەلایەن سیاسەتمەدارانی ئاسایەوە و بیروباوەڕی پاکی ناسیۆنالیستی ئەو بنێشتەخۆشەی سەرزاران بوو و بە گوێی هەمووی هاوڵاتیان گەیشتبوو؛ گوێ نەدانی ئەو بە نەریتەکان، هەست و سۆزی خەیاڵاوی ئەو و خولیابوونی ئەو بە دڵداری و دۆستگرتن ئەوی لە سەرتاسەری ئورووپادا کردبوو بە قارەمانێکی تەواو خەیاڵی. تەنانەت لە تەمەنی شازدە ساڵیدا، کاتێکە دەیەویست یەکەمین کتێبی پەخشانی خۆی بەفرۆش بگەیەنێت دەنگۆی ئەوەی سازکرد کە کۆچی دوایی کردوە، بۆی دەرکەوت کە چەندە لەناو جەماوەردا ڕێزی هەیە. ژیانی ئەو ئەفسانەیی بوو: دۆستێکی ئەو، ژنە ئەکتەرێک بەناوی ئێلۆنۆرا دووس، لە کەنار ئاوەکەدا بە جلێکی گەورەی ئەرخەوانی چاوەڕوان دەما تا ئەو بە ڕووتوقووتی لە مەلەکردنی ئێواران بگەڕایەتەوە؛ ژووری توێژینەوە، کە شتگەلی سەیر سەیر و جوانی تێدا پرژ و بڵاو ببۆوە، شوێنێک بوو کە هونەروە دانیشتنەکانی خۆی تێدا بەڕێوە دەبرد؛ ڕاکردن لە خاوەن قەرزەکانی.

کاتێکە ئیتالیا هاتە ناو شەڕەوە، دئانۆنزیۆ، کە لەو دەمەدا تەمەنی پەنجاودووساڵ بوو، پێوەندی بە تاقمێک هێزی زرێپۆشەوە گرت. هەر جۆرێک بێت ئەو لە بەرەی جەنگدا، لە ژێر دەریا و لە هەوادا شەڕی کرد. (لەگەڵ ئەوەشدا هەرکات پێی خۆش بوایە پشوویەکی چەند ڕۆژەی دەگرت.) ئەو چاوێکی لە دەست دا بەڵام بەهۆی بوێری و ئازایەتی چەندین میداڵی گرت. کاری هەرە لێهاتوانەی ئەو لە مانگی ئۆگستی ساڵی ١٩١٨دا هاتە ئاراوە، کاتێکە ئەو لە فڕۆکەکەیدا بە سەر ئاسمانی ڤیەندا دەفڕی، و بەڕەنگ و بۆی ئیتالیەوە ئاسمانی پڕ لە نامیلکە کرد کە تێیاندا داوایان لە ئوتریش کردبوو خۆی بدا بە دەستەوە. لە شەڕێکدا لەگەڵ چەند قارەمانێک، ئەو لە هەموویان باشتر دەرچوو.

دئانۆنزیۆ لەسەر داواکاریەکانی ئیتالیا بە خۆشحاڵیەوە باسوخواستی کرد. ئەوە ئەو بوو کە دەستەواژەی " سەرکەوتنی چەند لایەنە"ی داهێنا و لە مانگی ژانویەی ساڵی ١٩١٩دا ئەو " نامەیەکی بە دالماتیەکان" کە ئاگری دەکردەوە لە ڕۆژنامەی مۆسۆلینیدا بڵاو کردەوە. نامەکە لە هاوپەیمانان، "دەرمانەکانی ڕەوانی ئەتلەنتی بری بێ هێزکەر کە لەلایەن دوکتور ویلسۆنەوە پێشنیار

دەکران" و لە " نەشتەرگەری ترانزەلپایینی دوکتور کلیمینجوو" بە توندی ڕەخنەی دەگرت، و بە سەر ئازایەتی ئیتالیا لە کاتی شەڕدا هەڵی دەگوت. " و لە ئاکامدا چ جۆرە ئاشتیەک بە سەر ئێمەدا دەسەپێت زەردو سوورەکانی مەسیح؟ ئاشتی گالیکی؟ ئاشتی بەریتانی؟ ئاشتی بە ئەستێرە-نەخشێنراو؟ کەوابوو نا! بەسە ئیتر. ئیتالیای سەرکەوتوو- سەرکەوتووتر لە هەمووی نەتەوەکان-سەرکەوتوو بەسەر خۆیدا و بەسەر دوژمندا- بەسەر کێوەکانی ئالپ و بەسەر دەریای پاکس ڕۆمانا، تەنیا ئاشتیەک کە گونجاو بێت پاش خۆی بەجێ دێڵێت."٦٧٢ (هەرچەند نووسراوەکانی دیئانۆنزیۆ لەناو پێڕستی ڤاتیکاندا هاتوە، ئەو لە پەیکەری کاتۆلیکدا بەرێزەوە سەیری دەکرێت.)

با هەرا و هۆریا لەسەر فیووم و پاشماوەی داواکاریەکانی ئیتالیا لە ئادریاتیک کەڵەکەیان کردبوە سەریەک، کۆڕی ئاشتی بە باسیترەوە خۆی سەرقاڵ کردبوو. لەنێوان ١٤ی مانگی فەوریەدا و ١٤ی مانگی مارسدا، ویلسۆن بۆ وڵاتەیەکگرتوەکان گەڕایەوە. لەگەڵ ئەوە ئۆرلاندۆش گەڕایەوە بۆ وڵات، لەوێ ئەو وتارێکی ئاسایی لە پەرلەمانی ئیتالیا پێشکەش کرد کە ئەو هەستەی گەیاند گوایە لە پاریس هەمووی کارەکان بەباشی بەڕێوەدەچن. (کاتێکە ئەو ئاماژەی بە فیووم کرد، دانیشتوانی کۆڕەکە هەستانە سەرپێ و پربە دەمیان هاواریان کرد " سڵاو لە فیووم!"٦٧٣) لە مانگی ئاڤریلدابوو، تائەو کاتە ئاڵۆزیەکانی تایبەت بە مەرجەکانی ئەڵمانی هێشتا لە ئاستێکی بەرزدا هەر درێژەیان هەبوو، کە ئاشتیکەران بە سنوورەکانی تایبەت بە ئیتالیا و یۆگۆسلاڤیا نووسان و تاوتوێیان کردن.

لە کۆبوونەوەیەکی شۆڕای چوار یاردا لە ٣ی مانگی ئاڤریل، لیۆد جۆرج داوای لە ئیتالیەکان کرد تا پێگەی خۆیان لە ئادریاتیکدا ڕوون بکەنەوە. ئۆرلاندۆ بە بەڵگەی چەسپاو و بە تێروتەسەلی لەسەر ئەو بابەتە ڕۆیی. ئەو پێشنیاری کردنی فیووم بە وڵاتێکی ئازاد لە چوارچێوەی کۆمەڵەی گەلاندای ڕەد کردەوە. کاتێکە یۆگۆسلاڤەکان بانگێشت کران تا بۆچوونەکانی خۆیان ئەو دوانیوەڕۆیە پێشکەش بکەن، ئۆرلاندۆ بەتوندی وتی کە ئەو بەشداری ناکات چون ئەو هەرگیز لەگەڵ وڵاتانی دوژمن دانووستان ناکات. لە چەند حەفتەی دواتردا، کۆمەڵێک دانیشتنی نهێنی لەنێوان ئیتالیەکان و هاوپەیمانەکانیان نەک شتی کەم بەڵکوو هەست و سۆزی خراپیشی درووست کرد. دەنگۆی ئەوە ساز بوو کە گوایە ئۆرلاندۆ بیری لەوە کردۆتەوە کە لە کۆڕی ئاشتی بێتە دەرێ. لە ١٣ی مانگی ئاڤریلدا، کاتێکە شۆڕای چوار یار هەوڵی دا سەبارەت بە کاتی بانگێشت کردنی نوێنەرانی ئەڵمانی بۆ پاریس بڕیار بدات، ئۆرلاندۆ داوای کرد کە لەپێشدا کێشەکانی تایبەت ئیتالیا چارەسەر بکرێن. " ڕای گشتی ئیتالیەکان سەیر و سەرسووڕهێنەرە. من خەریکم ئەوەی کە لە دەستم دێ بۆ هێورکردنەوەی ئەوە دەیکەم؛ بەڵام ئاکامەکانی دڵساردبوونەوەی ئەم جۆرە زۆر کاریگەر دەبێت." ئەگەر ئەو نەیتوانیایە

گوزارش لە پێشکەوتن بدات لەوانەبوو حکوومەتەکەی ئەو برووخایە. دانیشتوانی کۆڕەکە خۆیان بە هاوسۆز دەزانی بەڵام جووڵەیان نەدەکرد. " من دڵنیام لەوە کە لە قازانجی گشتیدایە کە نوێنەرانی ئەڵمانی بەخێرایی بانگێشت بکەین و بەم چەشنە خۆمان بۆ دانووستان لەگەڵ تەنیا وڵاتی دوژمن کە ئێستاش هەر درێژەی هەیە ساز بکەین." پێشنیاری ویلسۆن، کە وەرگیرا، پەکخستنەوەی بانگێشتەکان بۆ ئەڵمانیا بوو بۆ ماوەی دوو ڕۆژ. لە هەمان کاتدا ئەو وتویژکردن لەگەڵ ئیتالیەکانی خستە ئەستۆی خۆی. ئۆرلاندۆ بە نابەدڵیەوە قەبوولی کرد. ئەو زۆر لەوە قەڵس بوو کە هەستی دەکرد لەلایەن کلیمینجووەوە و بەتایبەت لیۆد جۆرجەوە خەیانەتی پێکراوە، لیۆد جۆرجێک کە ئەو وەک "جادووگەرێکی فێڵباز" نەوەک پیاوماقووڵێک لای هاوس باسی کردبوو.٦٧٤

لیۆد جۆرج و کلیمینجوو بە قەد یەکیان پێ ناخۆش بوو. کلیمینجوو وتی کە " من بە ئۆرلاندۆم ڕاگەیاند کە ئەو لای وابوو من ستانیسلاس پاشای مەزنی پۆڵەندام کە، کاتێکە سەگێک پەلاماریدابوویە و گازی لێگرتبوو، نەک تەنیا داوای لێخۆشبوونی لە سەگەکە کردبوو بەڵکوو سەلکە پەنیرێکیشی دابوویە. زۆرباشە، ناوی من جۆرجسە، ستانیسلاس. من حازر نیم پەنیر بەو کوڕانە بدەم کە لە کاپۆرێتۆ هەڕایان کرد. من هەڵگری ئەو پەیمانەم کە بەستوومە و بەڵێنێم لەسەر داوە، و بێجگە لەمانە ئەمن بە ئاشکرا و بێ ڕوودەربایسی دەڵێم کە هەڵگری نەفرەت و ڕقێکی زۆرم. بەڵام شتی زیادە نابەخشم." ئیتالیەکان دووپاتیان کردەوە کە پێویستە گرێبەستی لەندەن هەڵگیرێت.

ویلسۆن، هیچ سەیر نەبوو، ملی نەدا دانووستانێک ساز بکات. پسپۆڕەکانی ئەو ئاگاداریان کردەوە کە بەو تێبینیەی کە ئەو لەسەر ڕێگای چوون بۆ ئورووپا ڕایگەیاندبوو-" بە من بڵێین ڕاستی کامەیە تامن خەباتی بۆ بکەم"- جێ پێی لە خۆی لێژ دەکرد. ئەو بەردەوام کەسانی نزیک بە خۆی دڵنیا دەکردەوە ئەو نایەوێت ڕێگە بدا بە ئیتالیەکان دەست بەسەر فیوومدا بگرن. کاتێکە بەیکێر، کە هەموو ئێوارەیەک چاوی بە ئەو دەکەوت، لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنای کە ئەو بە نوێنەرێکی ئیتالی ڕاگەیاندبوو کە ئەگەر ئیتالیا بڕیاری بدایە لەسەر فیووم کۆڕەکە جێبێڵێت، ئەوا وڵاتەیەکگرتوەکان بە هیچ شێوەیەک حازر نابێت درێژە بە یارمەتی ئابووری خۆی بدات، ویلسۆن لە وڵامدا وتی کە: " ئەوە بەڕاستی هەر ئەو شتەیە کە تۆ دەبوایە بتدرکاندایە."٦٧٦

بە بۆچوونی ئیتالیەکان، کۆبوونەوەیەک لە ١٤ی مانگی ئاڤریلدا لەنێوان ویلسۆن و ئۆرلاندۆ " زۆر ئاڵۆز و تووش" بوو. ویلسۆن ئەوەی بۆ ویلسۆن وەک یەکێک لە ناخۆشترین بەسەرهاتەکانی ژیانی خۆی، بە بەراورد لەگەڵ کاتێکە دەبوایە گوێی بۆ دایکی قوتابیەک شل کردایە کە لە پرینستۆن و بۆ ئەوی دەگێڕایەوە کە کوڕەکەی دەبێ عەمەلیات بکرێت و لەوانەیە بە ساخی لەژێر

نەشتەرگەری نەیەتە دەرێ وەسف کرد. ویلسۆن یاداشتێکی بە ئۆرلاندۆ دا کە تێیدا ئەو ئاماژەی بەوەکردبوو کە ئەو ئاشتی ئەڵمانی لەسەر بنەمای چاردە خاڵەکە دانابوو و ئەوەکە ئەو نەیدەتوانی لەسەر بنەمایەکی جیاواز لەگەڵ ئۆتریش ئاشتی بکات. ئۆرلاندۆ بە شاندی نوێنەرایەتی خۆی ڕاگەیاند کە یاداشتەکە هیچ شوێنێکی بۆ وتوێژکردن نەهێشتبۆوە.٦٧٧

*　　*　　*　　*

لە ١٩ی مانگی ئاڤریلدا، یەکشەنبەی بەرلە ڕۆژی ئیستێر، ئەو شەس ڕۆژە سەختەی کە ناوی دەرکرد دەستی پێکرد. ئیتالیەکان، کوتوپڕ، باسی حەفتەی سۆزیان هێنا ئاراوە. ئۆرلاندوو وتی کە " لەڕاستیدا من مەسیحیەکی تازەم و پێویستە هەست و سۆزی خۆم لەپێناو ڕزگارکردنی وڵاتەکەمدا دانێم." ئەو هەڕەشەی کرد کە ئاکامەکان هەرچیەک بێت دەڕوا و ئەوێ بەجێ دێڵێت. " من مانگی کارەساتباری ئەم ساتە جوان دەرک دەکەم. ئیتالیا لەم وتوێژەدا زەجر دەبات. لای ئەو، ئەوە بەمانای هەڵبژاردنی نێوان دوو مەرگە." لیۆد جۆرج پرسیاری کرد: " بەهۆی فیووم؟ بەهۆی شارێک کە ٢٤،٠٠٠ ئیتالیایی تێدایە و شوێنێکە کە، ئەگەر دانیشتوانی گەڕەکەکان ببژێریت، زۆرینەبوونی ئیتالی گومانی تێدا بەدی دەکرێت." ئەو لە ئیتالیەکان پاڕاوە کە چی ڕو دەدات ئەگەر بێتو ئەمەریکیەکان بە پاشەکشێکردن وڵام بدەنەوە. " من نازانم ئورووپا چۆن دەتوانێ بگەڕێتەوە سەرپێی خۆی ئەگەر وڵاتیەکگرتوەکان لەگەڵ ئێمە نەمێنێتەوە لە وەگەڕخستنەوەی مەکینەکان یارمەتی ئێمە نەدات."٦٧٨

ویلسۆن کردیە سەر ئیتالیەکان تا بیر لە مەرجی تازە بکەنەوە. " لە ئەمەریکا سەبارەت بە ڕەوتی بەرەوپێشچوونی کارەکان لە ڕابردوودا هەست بە بێزاری دەکرێت؛ بەڵام نەک تەنیا لە ئەمەریکا: هەمووی جیهان لەوە بێزارە." ئیتالیەکان متەقیان لێوە نەهات.

وەک چۆن سۆنینۆ گێڕایەوە کە "بەدوای شەڕێک کە قوربانیەکی ئاوا زۆری لێکەوتەوە، کە تێیدا ئیتالیا ٥٠٠،٠٠٠ کوشتە و ٩٠٠،٠٠٠ کەم ئەندامی لێکەوتەوە، بۆدەبێ بۆ دۆخێکی ئاڵۆزتر لە سەردەمی بەرلەشەڕ بگەڕێینەوە؛ هەندێک دوورگە لەسەر قەراخ ئاوەکانی دالماتیان تەنانەت لەلایەن ئوتریش-مەجارستانەوە بە ئێمە بەنابەدڵیەوە بەخشرا تا بێ لایەنبوونی ئێمە مسۆگر بکەن. تەنانەت ئێوەش ئەم مافانە بە ئێمە ڕەوا نابینن؛ ئەوە ناکرێ بۆ خەڵکی ئیتالیا شی بکرێتەوە." ئەو پەشیمان بوو لەوە کە وتووێژی لەسەر چوونە ناوشەڕی ئیتالیا بە پشتگری کردن لە هاوپەیمانانەوە کردبوو. " بەش بە حاڵی خۆم، من مەرگی خۆم لە هەمووی ئەمانەدا دەبینم- مەبەستم مەرگی ڕەوشتی خۆمە. من وڵاتەکەی خۆمم کاول کردوە کەچی لەسەر ئەو باوەڕەبووم کە ئەرکی خۆمم بەجێ هێناوە."٦٧٩

ئۆرلاندۆ هۆشداری دا کە لەوانەیە شەڕی ناوخۆ لە ئیتالیا سازبێت. سۆنینۆ پرسیاری کرد: " چی لە وڵات ڕوو دەدات؟ ئێمە نەک بۆلشویزمی ڕووسی بەڵکە ئاژاوەگەریمان لە وڵاتدا دەبێت." بەپێی ئەو گوزارشانەی کە لە ئیتالیاوە دەهاتن ئەم هەڕەشە و گوڕەشانە لەخۆوە نەبوون: مانگرتنەکان، مارشەکانی سەربازی، تێکهەڵچونەکان، ئەم بینایانەی کە لە کاردەکەوتن، ئەو خۆپیشاندەرانەی کە کوژران، تێکهەڵچوونی قورس لەنێوان باڵی ڕاست و باڵی چەپ. ئەو دەنگۆیانەی کە لە پاریسەوە دەهاتن دۆخەکەیان ئاڵۆزتر دەکرد؛ ئۆرلاندۆ خەریک بوو وەڕەز دبوو؛ هاوپەیمانان بڕیاریان دابوو تا یۆگۆسلاڤیا وەک هێزێکی دژە-بۆلشویزم درووست کەنەوە؛ ویلسۆن سوور بوو لەسەر ئەوە کە دالماتیا لە چنگ ئیتالیا بێنێتە دەرەوە؛ فیووم دەبوایە بەندەرێکی ئازادی لێدەربهاتایە. تێلێگراف لە ئیتالیاوە دەهات، و شاندی نوێنەرایەتی بە خۆڕاگری هان دەدا.٦٨٠

خۆڕاگری تەنیا شتێک بوو کە ئۆرلاندۆ و سۆنینۆ دەیانتوانی لەم قۆناخەدا بیکەن. ئەوان خۆیان خستبوە دۆخێکەوە کە هەر دانوستانێک بە مانای خۆبەدەستەوەدان بوو. لیۆد جۆرج و کلیمینجوو ئەوەی کە لە دەستیان هات کردیان بۆ ئەوە کە کەلێنی نێوان ئیتالیەکان و ئەمەریکیەکان پڕ کەنەوە: ئەوان حازر بوون دوورگەکان نەوەک وڵاتی سەرەکی دالماتیان بە ئیتالیا ببەخشن؛ فیووم و ڕەنگە هەمووی شارەکانی قەراخ ئاوەکانی دالماتیان دەکرا بە شارە ڕزگار کراوەکان بکرانایە؛ دەکرا لە ئاسیای بچووک ئیتالیا قەرەبووی بۆ بکرایەتەوە؛ لەوانەبوو فیوومیش پێ ببڕایە ئەگەر لە شوێنێکی تر بەندەرێکی تازە بۆ یۆگۆسلاڤیا درووست بکرایە. ویلسۆن بە نابەدڵیەوە هەوڵەکانی ئەوانی پەسەند دەکرد: "من زۆر حەز ناکەم لەگەڵ خەڵکانێک دانووستان بکەم کە سنوورەکانی ژێرپێژی دەپسێنن. ئەوان هەمیشە لەسەر ئەو باوەڕە دەبن کە، بە پێداگری کردن لەسەر داواکاریەکانی خۆیان، ئەوان دەتوانن شتی زیاتر چنگ بخەن." بەدوای پەیامێکی بێ کەڵک بۆ ئیتالیەکان هێشتا بە کۆمەڵێک پێشنیارەوە، هانکەی لە یاداشتەکەی خۆیدا درکاندبووی کە: "ئێمە ئێستا لەگەڵ کۆڵانە کوێرەیەک ڕووبەڕوو بووینەتەوە. ئیتالیەکان دەڵێن کە ئەوان گرێبەستی ئەڵمانی واژۆ ناکەن مەگین فیووم و گشت گرێبەستی لەندەنیان پێ بەڵێن بدرێت. کەس فیووم بە ئەوان نابەخشێت، و سەرۆک ویلسۆن دالماتیا بە ئەوان نابەخشێت، کە بە واتەی ئەو، یاسای ڕەگەزی دەپسێنێت." ئیتالیەکان " تەواو بە نەچەماوەیی" مانەوە. و ئێستا یۆگۆسلاڤەکان، کە بەبێ دەنگی سەیری بەرەوپێشچوونی ئاڵۆزیەکەیان دەکرد، هەڕەشەیان کرد کە ئەگەر بێتو ئیتالیا دەست بەسەر فیووم یان کەنارئاوی دالماتیان بگرێت ئەوان دەکەونە شەڕەوە.٦٨١

کات خەریک بوو ڕوو لە کۆتایی دەڕۆیی. بڕیار وابوو ئەڵمانیەکان لە ٢٥ی مانگی ئاڤریلدا مەرجەکانی ئاشتی خۆیان وەرگرن، و تا ئەو دەمە ئیتالیەکان تەنیا کەسانێک نەبوون کە هەڕەشەی

پاشەکشێیان دەکرد. ژاپۆنیەکان، کە هەمیشە بێ دەنگ بوو، ڕووی داواکاریەکانی خۆیان کردە زەوی و زارەکانی ئەڵمانیای پێشوو لە چین و دوایەمین هەوڵی خۆیان دا بۆ ئەوە کە بەندێک لەسەر بەرابەری ڕەگەزی لەناو پەیمانی کۆمەڵەی گەلاندا دانێن. نوێنەرانی ژاپۆنی، بە ڕێز و حورمەتی ئاسایی خۆیانەوە، ئاماژەیان بەوەکرد کە لەوانەیە ئەوانیش نەتوانن گرێبەستی ئەڵمانی واژۆ بکەن. بلژیک لەوە کە داواکاریەکانی لەسەر قەرەبوەکان بە هەند نەگیرابوو عاجز بوو. دوایەمین شتێک کە ویلسۆن، لیۆد جۆرج و کلیمینجوو خوازیاری بوون ئەوەبوو کە ئەڵمانیەکان تێگەیەنن کە هاوپەیمانان بە یەکەوە لەناو خۆیاندا شەڕ و چەلەحانەیانە.٦٨٢

هەموولایەک ناوچاوانیان گرژ کردبۆوە. بە دووروپەرێزی ئێدواردVII، ئیتالیەکان یەکتریان بە لاوزبوون تاوانبار دەکرد. لە یەکشەنبەی ئیستێردا ئۆرلاندۆ فرمێسکەکانی لەسەر چاوانی حازربوون. ویلسۆن دموچاوی گیرابوو و دەنگی لەرزۆک بوو. بەتایبەت کلیمینجوو هەر تەشەری لە ئیتالیەکان دەدا و لەبەرانبەریان دا ڕادەوەستا. تەنانەت لیۆد جۆرجیش ترس و دلەڕاوکێی لە دڵدابوو. سۆنینۆ چیتر نەیدەتوانی ڕق و قینی خۆی لە ویلسۆن بشارێتەوە؛ ئەو بە کلیمینجوو و لیۆد جۆرجی ڕاگەیاند کە " ئێستا سەرۆک ویلسۆن، دوا لەبەرچاونەگرتن و پشتگوێ خستنی چارەد خاڵەکەی خۆی، دەیەوێت پاکیزەیی ئەوان بە بەکارهێنانیان لەو شوێنەدا کە ئاماژە بە ئیتالیا دەکەن بگەڕێنێتەوە."٦٨٣

تۆمەتەکە چزوودار بوو چون هەندێک ڕاستی تێدابوو. ویلسۆن یاسای خود-موختاری خۆی لەسەر تیرۆل و ڕاڕەوی پۆڵەندی پیادە کردبوو. حەفتەیەک بەدوای ئیستێردا ئەو بە سەر چاردە خاڵەکەی خۆیدا چووەوە و سەرلەنوێ بیری لە دیپلۆماسیەکی تازەکردەوە کە هیواداربوو پێشکەش بە جیهانیانی بکات. ئەو دووپاتی دەکردەوە کە پێویستە پرسەکان لەسەر بنەمای حەقیقەتەکان بڕیاریان لەسەر لێبدرێت. ئەو هاوڕێ لەگەڵ کارناسەکانی خۆی بە نەخشەکان و بە ژمێرەزانیدا چووەوە. تێکەڵی ڕەگەزی فیووم یان دالماتیای بە بەشی ئیتالیا نەدەزانی: خەڵکی ئیتالیا لەلایەن حکوومەتەکەی خۆیانەوە حەقیقەتیان پێ ڕانەدەگەیەنرا. ویلسۆن ئێستا کەوتبوە بیری کورتەسەفەرێک کە چوارمانگ لەوەپێش بۆ ئیتالیای کردبوو و خراپ لێکی دابۆوە. ئەو زۆر کەتبووە ژێر کاریگەری ئەو بەخێرهاتن و ڕێزنانەی کە لێی گیرابوو؛ ئەو دڵنیا بوو لەوە کە ئەوان پشتگریان لە ئەم دەکرد. ئەو بڕیاری هێنا سەر ئەوە کە ڕاستەوخۆ لە خەڵکی ئیتالیا بپاڕێتەوە.٦٨٤

لە ٢١ی مانگی ئاڤریلدا ئەو بڕیارنامەیەکی بە لیۆد جۆرج و کلیمینجووی نیشان دا کە بۆخۆی تاییچنی کردبوو. بە زمانێکی پانەوە لەسەر ئەوە ڕۆیشتبوو کە بۆچی گرێبەستی لەندەن

دەبێ بخرێتە پەراوێزەوە. ئەو وەبیر ئیتالیەکانی هێنایەوە کە وڵاتەکەی ئەوان لەوەپێش دەسکەوتەکانی چەندە بوون. " هێڵەکانی ڕێگەی شەمەندەفەری ئەو وڵاتە هەتا دیوارە گەورەکان کە بوون بە پارێزەری سرووشتی بۆ ئەو وڵاتە درێژەیان هەیە." ئیتالیا دەرفەتی ئەوەی پێدرابوو کە لەگەڵ وڵاتی تازە بەپانتایی ئادریاتیک پێوەندی دۆستایەتی ببەستێت. ئەو داوای لە ئیتالیەکان کرد کە لەگەڵ ئەو کاربکەن تا دەستوورێکی تازە لەسەربنەمای مافگەلی خەڵک و لەسەر مافی هەبوونی ئاشتی بۆ جیهانیان دامەزرێنن. لیۆد جۆرج و کلیمینجوو کەوتنە ژێرکاریگەریەوە بەڵام ووریا بوون. لیۆد جۆرج ئاگاداری کردنەوە کە بڵاوکراوەکان " دەتوانن لەڕاستیدا دەورێکی باش لە ئیتالیا بگێرن، بەڵام تەنیا دواتێپەڕبوونی ماوەیەکی دیاریکراو. لە دەمکاتی ئێستادا ئێمە پێوستە چاوەڕوانی ئاڵۆزی بین." بە پاڵپشتی کلیمینجوو، ئەو ویلسۆنی هان دا چاوەڕوان بێت تابەڵکوو ئەو لە هەوڵێکی تردا بتوانێت لەگەڵ شاندی نوێنەرایەتی ئیتالی قسە بکات. کاتێکە ئەمەش سەری نەگرت، ویلسۆن لە دوانیوەڕۆی ٢٣ی مانگی ئاڤریلدا ئەم بڕیارنامەی بۆ ڕۆژنامەکان نارد.٦٨٥

کاتێکە چاپێک لە ڕۆژنامەی لی تێمپس گەیشتە ئێدواردVII، هەست بە تووڕەیەکی زۆر کرا بەڵام هیچ جێی سەرسووڕمان نەبوو. ئیتالیەکان سەبارەت بە هەبوونی بڕیارنامەکەی ویلسۆن لەماوەی یەک دووڕۆژدا ئاگادار کرابوونەوە و تەنانەت بۆ ماوەی زیاتریش بیریان لە پاشەکشێکردنی خۆیان لە کۆڕی ئاشتی کردبۆوە. ئۆرلاندۆ بڕیاری دا ڕۆژی دواتر بۆ ئیتالیا بگەڕێتەوە. دوای دانیشتنێکی شۆڕای چوار یار، کە تێیدا ئەو و ویلسۆن بەتوندی بەڵام بەڕێزەوە لەگەڵ یەکتر قسەیان کردبوو، ئەویان بەجێ هێشت تا بە شەمەندەفەرەکە بگات. سۆنینۆ دووڕۆژ دواتر بەدوایاندا ڕۆیی. لیۆد جۆرج وتی کە "بەخوا ئەوی ڕووی داوە تازە ناگەڕێتەوە!"٦٨٦

ڕۆژنامەکانی ئیتالی بڕیارنامەکەی ویلسۆنیان لەپەنا وڵامەکەی ئۆرلاندۆدا هەڵگرتبوو، ئەمیان بە تایپێکی گەورەترەوە لەچاپ درابوو. کاتێکە شەمەندەفەرەکەی ئۆرلاندۆ تێپەڕی جەماوەر بە چەپڵە و بەفیکە پێشوازیان لێکرد. لە شاری ڕۆم بە گەیشتنی ئەو زەنگەکانی کەنیسە پڕبەشارەکە لێدران، لە هەمان کاتدا لە ئاسماندا فڕۆکەکان نامیلکەی نیشتمانیان بڵاو دەکردەوە و خۆپیشاندەران دروشمیان دەدا " بژی ئۆرلاندۆ! بژی فیووم! بژی ئیتالیا!" حکوومەتی ئیتالی کێشکچی لە دەوری باڵوێزخانەی ئەمەریکی دانا. سەرتاسەری دیوارەکانی ئیتالیا بە داواکاریەکان بۆ لکاندنی فیووم و کاریکاتۆرەکانی ویلسۆن لە کلاوئاسنی ئوتریشیدا پیسکرابوون. لە توورین، قوتابیان زەختیان کردبوە سەر خاوەنی قاوەخانەی سەرۆک ویلسۆن تا تابلۆکەی ئەو بێنێتە خوارێ؛ ئەوان بە کۆرسۆ ویلسۆندا هەڵگەڕان و هێنایانە خوارێ، وەک ڕێزلێنان لە سەردانەی تازە سەرۆک کۆمار ناوەکەیان گۆڕی،

هەمووی تابلۆکانی سەرشەقامەکانیان گۆڕی و کردیانن بە کۆرسۆ فیووم. لە خودی فیوومدا، ئیتالیە لاوەکان بەشێوەیەکی نائاسایی دەیاننەڕاند" نەمان بۆ ویلسۆن! نەمان بۆ سووررپێستەکان!" چاپەمەنیەکانی ناسیۆنالیستی داوای لکاندنی خێرای فیووم و دالماتیایان دەکرد.٦٨٧

لە وتارێکدا بۆ پەرڵەمانی ئیتالیا کە بە پاڕانەوە بۆ "ئاشتی و هێمنایەتی" دەستی پێدەکرد، ئۆرلاندۆ تاوانی ئالۆزی دۆخەکەی گەڕاندەوە بۆ هاوپەیمانەکانی و پێداگری لەوە کرد: "بەرلەهەمووشتێک ئیتالیا باوەڕێکی قورسی بەوە هەیە کە کۆی گشتی داواکاریەکانی لەسەربنەمای هۆکارگەلی ئاوا بەرز و مەزن لە ڕاستی و لە دادپەروەریە کە پێویستە بە تێکڕایی بەفەرمی بناسرێن." حکوومەتەکەی ئەو دەنگی متمانەی بۆخۆی مسۆگەرکرد، ٣٨٢ دەنگ لەبەرانبەر ٤٠ دەنگدا. ناسیۆنالیستەکان، فاشیستەکان کە لەناویاندا بەرچاو و دیار بوون، لە سەرانسەری ئیتالیا کۆڕ و کۆبوونەوەی جەماوەریان بەڕێوە برد. دی ئانۆنزیۆ هەتابڵێی بەکەیف بوو، بە خەیانەتکردنی هاوپەیمانان دەوەڕی و گاڵتەی بە ویلسۆن، " کوەیکەری کرۆواتیکراو" دەکرد، بە " دم و چاوی درێژی لە ئەسپچوو، بە دەمی زل کە " سی و دووددانی چەپ و چیر"ی تێدابوو. ئەمە کەی لە مرۆڤ دەچو نەخێر مرۆڤ نەبوو بووکە شووشە بوو. نابێ ئیتالیا بکەوێتە ناو داو و تەڵەکانی خەیانەتکارانەوە. دی ئانۆنزیا یەک بەخۆی هاواری کرد و وتی کە "هەر لە خوارەوەی ئەو شوێنە، لەسەر جادەکانی ئیستریا، لەسەر جادەکانی دالماتیا، گوێتان کەڕە کە دەنگی پێی سەربازانی سوپا نابیستن کە خەریکن بە مارشی سەربازی دەڕۆن؟"٦٨٨

ئاشتیکەران بە ترسەوە سەیری ئەمەیان دەکرد. بلژیکیەکان هەڕەشەیان دەکرد کە گرێبەستی ئەڵمانی واژۆ ناکەن و بێجگە لەمە لەبابەت داواکاریەکانی ژاپۆنەوە ناکۆکیەکی ئالۆز هاتبوە ئاراوە. نوێنەرانی ئەڵمانی خەریک بوون لە ٢٩ی مانگی ئاڤریلدا دەگەیشتنە بەرەوە و هێشتا مەرجەکانیان کۆتایی پێنەهاتبوو. لەوە مەترسیدارتر، ئایا کۆڕێکی ئاشتی کە کەوتبێتە تەنگەژەوە دەتوانێ زەخت کاتە سەر ئەوان بۆ ئەوە کە گرێبەستێک واژۆ بکەن؟ لە سەردێڕی ڕۆژنامەیەک لە پاریس نووسرابوو " پشێوی". ڕۆژنامەنووسێکی ئەمەریکی لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە "نوێنەرانی جیاجیا خەریکی بەڕێوەبردنی کۆڕوکۆبوونەوەن تا سەیرکەن لە داهاتوودا چی ڕوودەدەن، چون هەست بەوە دەکرێت کە خەریکە مەترسی دەکەوێتە سەر ژیانی کۆڕی ئاشتی." سکرتاریەتی کۆڕەکە دەستی کرد بە پێداچونەوە بەسەر ڕەشنووسی گرێبەستەکە لەگەڵ ئەڵمانیا تا هەمووی ئەو بەشانەی کە ئاماژە بە ئیتالیا دەکەن لابەرن. لە دانیشتنێکی گشتیدا، نوێنەری پاناما مل پێچێکی ڕەشی بە سەر کورسیە چۆڵەکەی ئۆرلاندۆدا ڕاخست. دواتر لەلایەن نوێنەرێکی پۆرتەغالیەوە لابرا، کە دەیوت هێشتا بۆ سەرەخۆشی زووە.٦٨٩

لە پشت ڕووداو و دیمەنەکانەوە هەم حکوومەتی ئیتالی و هەمیش هاوپەیمانان دەگەڕان بەدوای ڕێگایەک کە ئیتالیا پێیدا بگەڕێتەوە. ئیتالیەکان بەجارێک هەژان لەوە کە هێزەکانی تر پێدەچوو بەبێ ئەوان ئامادەیی ئەوەیان هەبێت درێژە بە کارەکان بدەن. کلیمینجوو گوشارەکانی زیاتر کرد کاتێکە ئەو ڕایگەیاند کە نوێنەرانی ئوتریشی بانگێشت کراون تا لە ناوەڕاستی مانگی مەیدا بێن بۆ پاریس. ئەندامانی شاندی نوێنەرایەتی ئیتالی کە لە پاریس مابوونەوە بەردەوام ئۆرلاندۆیان ئاگادار دەکردەوە کە پێگەی ئیتالیا بەخێرایی ڕوولەخراپ بوونە. ولاتەیەکگرتووەکان دەستی بەسەر بڕەپارەیەکی ٢٥ملوێن دۆلاریدا گرتبوو کە یەکجار پێویست بوو. بەریتانیا و فەڕەنسە دەیانگوت کە پاشەکشێکردنی ئەو ئەمانی لە بەجێگەیاندنی ئەرکی ڕێزنان لە گرێبەستی لەندەن ڕزگار کرد. ئەوان بەرەو پێشەوە هەنگاویان نابوو و کۆلۆنیەکانی ئەفەریکیان دابەش کردبوو. تەنیا لیۆد جۆرج بوو کە ئاماژەی بە ئەگەری جێبەجێبوونی دانووستانێک دەکرد.٦٩٠.

لە ٥ی مانگی مەیدا، ئیتالیەکان ڕایانگەیاند کە ئۆرلاندۆ و سۆنینۆ خەریکن دەگەڕێنەوە. سەیمۆری ئەمەریکی لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە "ئۆرلاندۆ دڵێی سپی هەڵگەڕاوە و لە شەکەت و ماندوو دەچێت و زۆر کەم دەدوێت. ئەو دە ساڵ تەمەنی زیاتر دیارە. سۆنینۆ بەڕواڵەت نەگۆڕاوە و هەندێک شەرفرۆشی پێوەدیارە، بەڵام هێرشبەر نیە."٦٩١ سکرتاریەت وشەگەلی "ئیتالی" و "ئیتالیایی" بە دەستنووس خستیانە ناو مەرجەکانی ئەڵمانیاوە.

کێشەیەک کە هۆکاری تەقینەوەکەبوو هێشتا تا قۆناخی چارەسەرکردن ڕێگایەکی دوور و درێژی لەبەر بوو. ویلسۆن سارد بوو و حازر نەبوو بۆ هەر وتویژیکی تر لەگەڵ ئیتالیەکان دانیشێت. ئەو وتبووی کە "زۆر شتێکی سەیرە کە ئەم ئیتالیانە ناتوانن لەسەر پرەنسیپێک خۆیان ساخ کەنەوە و پێوەی بنووسێن." تروسکەی هیوایەک، کە هاوس دەیگەشاندەوە، ئەوە بوو کە لەوانەیە ئیتالیەکان و یۆگۆسلاڤەکان بە دانیشتن و وتویژکردنی ڕاستەوخۆ لەگەڵ یەکتر بتوانن بەسەر تەنگ و چەڵەمەکاندا تێپەڕن. لە ١٦ی مانگی مەیدا، هەردوولا هاتن بۆ سویتەکەی هاوس لە کریلۆن، و، لە جۆرێک وتویژدا کە لە دەیەکانی ١٩٩٠ باو بوو، لە ژووری جیادا دانیشتن و لەهەمان کاتیشدا ئەمەریکیەکان لەنێوان ئەواندا بەپەلە دەهاتن و دەچوون. کاتێکە کلیمینجوو ڕۆژی دواتر پرسیاری لێکرد کە چی ڕووی داوە بە دڵتەنگیەوە وڵامی دابۆوە: "هیچ. شتی واهەرنابێت." ئەم حەقیقەتە کە هاوس لە هەوڵی ئەوەدا بوو تا پردێک لەنێوان پێگەی ئەمەریکی و ئیتالی دابنێت لەوانەیە لە بێ ڕەحمی ڕوولەزۆربوونی ویلسۆن سەبارەت بە هاوڕێی دێرینی خۆی دەستی بووبێت.٦٩٢

بەشی سەرەکی کۆڕی ئاشتی لە کەش و هەوایەکی قینەبەرایەتی دوولایەنەدا ئالأبوو. ویلسۆن سەبارەت بە ئیتالیە چاوچنۆکەکان بە توندی لەگەڵ بەیکێر قسەی کردبوو. فەڕەنسیەکان گلەیان دەکرد کە گوایە ئیتالیا خەریکە دەست بەسەر ڕێگاکانی شەمەندەفەڕدا دەگرێت کە بە پارەی فەڕەنسەیی کرِدراون. کلیمینجوو یەک بەخۆی هاواری کرد: " فەڕەنسە بەوە تووڕە دەبێت. قەت لەبیری ناچێتەوە. من چاوەڕوانی برایەتی لە ئێوە ناکەم." کاتێکە چەندین سەربازی فەڕەنسەیی لەلایەن جەماوەری ناسیۆنالیستیەوە لە فیووم بەبێ دادگایی کردن لەسێدارە دران، ئەو بە دەنگی بەرزەوە " پیۆپل دی ئەساسین"[ کوشتاری بەکۆمەڵ]ی لە شۆڕای چوار یاردا مەحکووم کرد. ئیتالیەکان بەشی سەرەکی ژەهرەکەی خۆیان هەڵگرت بۆ ویلسۆن. کاتێکە جێگرێک بۆ سۆنینۆی گێڕابۆوە کە " ویلسۆن ئەم بەیانیە کەیفخۆشە،" باڵادەستەکەی لە وڵامدا وتبووی کە " خوا ئەیزانێت پلانی چ جۆرە پێشنیارگەلی تازە، چ جۆرە بەرتیلێک داڕێژرابێت؟" ئۆرلاندۆ لە بیرەوەریەکانی خۆیدا هێنابووی کە ئەو دڵنیابوو لەوە کە " ویلسۆن پێوەندی تایبەت بەخۆی لەگەڵ یۆگۆسلاڤەکان هەیە؛ چ جۆرە پێوەندیەک نازانم بەڵام دەزانم کە پێوەندی بوە." چاپکراوەکانی ئیتالی هەڵگری چیرۆک گەلێک بوون کە گوایە ویلسۆن لەلایەن یۆگۆسلاڤەکانەوە بەرتیلی دراوەتێ یان گوایە ئەو ژنە دۆستێکی یۆگۆسلاڤی هەیە. سۆنینۆ و کەسانی تر زیاتر لەسەر ئەم باوەڕە بوون کە ئەو گیرۆدەی بەرژەوەندیەکانی ماڵی ئەمەریکایە چون بەدوای ئەوەبوو کە لەبەر خۆیان ئادریاتیک پێش بخات، و ڕەنگە لە خاچی سوور وەک سەرپۆشێک کەڵک وەرگرێت.٦٩٣

بەرلەوەی ویلسۆن لە ئاکامدا لە کۆتایی مانگی ژوەندا دوابەدوای واژۆکردنی گرێبەستی ڤێرسایلێس بەرەو وڵات بگەڕێتەوە، ئیتالیەکان بە پێداگری نەکردن لەسەر هەمووی ئەو ناوچانەی کە لەلایەن گرێبەستی لەندەنەوە بەڵێنیان درابوویە زۆر بەبێدەنگی و بە ئەسپایی پاشەکشێان کردبوو. بەڵام سەبارەت بە فیووم ئەوان وەکوو پێشتر هەروا ڕژد بوون. ئۆرلاندۆ و سۆنینۆ خەریک بوون یاریەکی پڕلەمەترسییان دەبردە سەر. نەیاری سەرەکی ئەوان، ویلسۆن، لەوەدەچوو لە هەژدە مانگی داهاتوودا لە دەرەوەی ئۆفیس بێت. بەواتایەکی تر، دیمۆکراسی ئیتالیا لەوە نەدەچوو زۆر لەوە زیاتر بخایەنێت. کاتێکە ئۆرلاندۆ بە لیۆد جۆرجی ڕاگەیاند کە " پێویستە من ڕێگەچارەیەک بدۆزمەوە. ئەگینا لە پەرلەمان یان لە سەر شەقامەکانی ئیتالیا پشێوی و ئاڵۆزی ساز دەبێت." لیۆد جۆرج پرسیاری کرد، " ئەگەر ڕێگەچارەت بۆ نەدۆزرایەوە، کێ بەڕای خۆتان جێی ئێوە دەگرێتەوە؟" ئۆرلاندۆ لە وڵامدا وتی کە " ڕەنگە دی ئانۆنزیۆ بتوانێ جێی من بگرێتەوە."٦٩٤

لە ١٩ی مانگی ژوەندا حکوومەتی ئۆرلاندۆ لە ئاکامدا ڕووخا، بەڵام سۆنینۆ و دوو کەسی تر مانەوە تا گرێبەستی ڤێرسایلێس لەباتی ئیتالیا واژۆ بکەن. ئۆرلاندۆ لە ساڵانی دواتردا بەو حەقیقەتەوە دەنازی کە ئەو گرێبەستەکەی واژۆ نەکردوە؛ ئەو بەرانبەر بە خەڵکی ئیتالیا دەپاڕایەوە و بەڵگەی لەسەر ئەوە دەهێنایەوە کە لەڕاستیدا ویلسۆن ئەوی لە کۆڕی ئاشتی تاراند. هەرچەند ئیتالیا ڕۆڵیکی کەمی لە داڕشتنی گرێبەستەکە هەبوو، ڕۆڵێکی خراپی نەگێڕا: ئەو وڵاتە لە کۆمەڵەی شۆڕای گەلاندا کورسیەکی هەتاهەتایی هەبوو، خاوەنی تیرۆل و بەشێک لە قەرەبووەکانی ئەڵمانیا بوو. هەرچەند ئەم شێوەتێڕوانینە لە ئیتالیا هەستی پێنەدەکرا. بەواتەی باڵوێزێکی بەریتانی کە بۆ هاوڕێیەکی خۆی نووسیبووی: " بەداخەوەم کە دەڵێم ئەوان لێرە زۆر خەمۆک و دڵتەنگن. ڕەنگە بەهۆی ئەوەبێت کە ئەوان هەست دەکەن کە نوێنەرانی خۆیان لەزۆر بواردا کاروبارەکانیان بەڕێکو پێکی نەبردۆتەپێشێ و هەڵەکاریان کردوە."٦٩٥

* * * *

حکوومەتی فرانسیسکۆ نیتی، کە جێی حکوومەتی ئۆرلاندۆی گرتبۆوە، بە کێشەکانی ناوخۆی ئیتالیاوە خۆی سەرقاڵ کردبوو. لەشوێنێک کە دەیتوانی کێشە زەقەکانی دەرەوە چارەسەر بکات، مەیلی نەبوو هەنگاوێک هەڵێنێت. وەزیری تازەی دەرەوە، تووماسۆ تیتۆنی، لەگەڵ ڤێنەزۆلایەکان کۆبۆوە و لەنێوان ئیتالیا و یوونان سەبارەت بە ئاڵبانیا و دۆدێکانیس ڕێکەوتنێکیان تاوتوێ کرد. تەنانەت لە ئادریاتیکیش هەست بە هەبوونی هەندێک بزووتنەوە و جموجۆڵ دەکرا. لە مانگی ئۆگستی ساڵی ١٩١٩دا، تیتۆنی لەگەڵ لیۆد جۆرج و کلیمینجوو ڕیکەوتن کە فیووم لەچوارچێوەی کۆمەڵی گەلاندا وەک شارێکی بێ لایەن بمێنێتەوە و هەروەها گشت ناوچەی دالماتیا بە یۆگۆسلاڤیا ببەخشرێت. پێشنیارەکە خرایە بەردەم ویلسۆن، کە لەوکاتەدا گەڕابۆوە بۆ وڵاتەیەکگرتوەکان، بەڵام بەرلەوەی وڵامێک بدرێتەوە، دی ئانۆنزیۆ بڕیاری دابوو بەشێوازی تایبەت بە خۆی کێشەکە چارەسەر بکات.

گرووپگەلی جۆراوجۆر، هەندێکیان لە هێزی نیزامی، هەروەها کۆمەڵانی سەربازانی کۆن، فاشیستەکان و ئانارشیستەکان، کەم تا زۆر ڕاشکاوانە هەمووی ئەو هاوینەیان بە داڕشتنی پلانی دەستبەسەرداگرتنی فیووم تەرخان کردبوو. دی ئانۆنزیۆ، کە کەوتبوە داوی خۆشەویستێکی تازەوە، لە ئاکامدا بەوەڕازیکرا کە ڕێبەرایەتی ئەوان بگرێتە دەست. لە ئێوارەی ١١ی مانگی سێپتامبردا (هەڵبژێردراو لەبەرهۆی ئەوەکە ئەو لای وابوو ژمارەی ١١ هێمای بەختەوەریە)، لەگەڵ نزیک بە دووسەد پیاو وەڕێ کەوت. ڕۆژی دواتر، چون سەربازانێک کە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو هاتبوون

پێوەندیان بە ئەوەوە گرت، ئەو بەخۆشحاڵیەوە بەرەو فیووم بە مارشی سەربازیەوە وەڕێ کەوت. فەرمەندەی هێزی نیزامی ئیتالیا بەبێ هیچ مرەیەک پاشەکشێی کرد، هێزەکانی تری هاوپەیمانی بە نابەدڵیەکی زیاترەوە. شار، لانی کەم بەشەکانی ئیتالی، بە ئاڵۆزی و پشێویەوە پێچران. هەر ئەو ئێوارەیە دیئانۆنزیۆ لە باڵکۆنی کۆشکی حاکمەوە یەکەمین وتارە خەیاڵاویەکانی خۆی پێشکەش کرد.

لەماوەی پازدەمانگی دواتردا، فیووم بە ئاهەنگی جەشن و بۆنەو و شانۆگەری گشتی ڕازایەوە. بیناکانی شارۆچکە بە ئاڵا و بە درووشمی جۆراوجۆر داپۆشرابوون، باخەکانی ئەو شارۆچکەیە لە گوڵ تالان کران تا ئاهەنگەکانی پێ برازێننەوە. لە تاووتینی ناسیۆنالیزم و شۆڕشدا، کە بە خواردنەوە و بە مادەسڕکەرەکان سووختی دابین دەکرا، قەشەکان مافی ژیانی هاوبەشییان بە ڕەوا زانی و ژنانی لاو شەوتابەیانی نەخەوتن لە دەرەوەی ماڵ مانەوە. چاودێران وتبوویان کە شار بە زاقوزریقی خۆشەویستی دەنگی دەداوە. نەخۆشخانەیەک بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی تایبەت بە ئالەتەکانی زاووزێ تەرخان کرابوو.٦٩٦ فیداکەران و تاقمێکی زانخواز لە سەرتاسەری ئیتالیا و ئورووپاوە ئابلۆقەی کەم کاریگەری هاوپەیمانیان وەلانا: ئی.ئێف.تی.مارینێتی، هونەرەوەری داهاتووزان؛ ئاستۆرۆ تۆسکانۆنی لاو، بە ئۆرکێستراکەی خۆیەوە؛ گۆگلیمۆ مارکۆنی، دامەزرێنەری بێ تەل؛ سیاسەتمەدارانی دژبەر لە ڕۆمەوە؛ چەتەکان و فاحیشەکان؛ فرۆکەوانانی تەکخاڵ بە فرۆکەکانیانەوە؛ و مۆسۆلینی. دزانی مۆدێرنی دەریایی بە قایەقی دەستبەسەرداگیراو بەپەلە دەهاتن ناو فیوومەوە و دەچونە دەرێ تا دەست بەسەر ئازووقەکانی سەرەوە و خوارەوەی ئادریاتیکدا بگرن. پیاوانی سووپا بە یوونیفۆرمی تایبەت بە دیزاینی خۆیان لە سەر شەقامەکان دەهاتن و دەچوون. ئۆسبێرت سیتوێڵ لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە " هەندێکیان ڕیشیان هێشتبۆوە، و سەرکانیان پاک تاشیبوو. کەسانی تر چەپکە قژی گەورەیان بەستبوو، نیوەپێیەک درێژ بوون، کە لەبەر نێوچاوانیان بەشێوەی فۆکلە هاتبوە خوارێ، و لەپشت کاسەی سەریانەوە کڵاوی فیسیان بەشێوەیەکی هاوسەنگ لەسەردابوو." ئەوەیکە زۆر ترسێنەر بوو بۆ حکوومەتی ئیتالی ئەوە بوو کە زۆربەی ئەفسەرانی ئەو حکوومەتە، لە قارەمانانی جەنگەوە بگرە تا دەگاتە ژەنەراڵە ناودارەکان، چارەنووسی خۆیان بە دیئانۆنزینۆوە بەستبۆوە.٦٩٧

وتاربێژی دیئانۆنزیۆ گەیشتبوە بەرزایە تازەکان. فیووم شوێنێکی پیرۆز بوو، شاری ئازادی، لەوێوە ئەو هێرشی خاچپەرستانی ڕێنوێنی دەکرد، تا لەپێشدا دالماتیا ڕزگار بکەن، دواتر ئیتالیا، و لە کۆتاییدا جیهان. ئەو لەگەڵ بۆلشویکەکان، لەگەڵ ناسیۆنالیستەکانی میسر، لەگەڵ کرۆواتەکان کە لەگەڵ یۆگۆسلاڤی تازە ناکۆک بوون، و لەگەڵ سین فین پێوەندی هەبوو. دەنگۆی زۆر سەیر و

ترسێنەر لە فیوومەوە بەگوێ دەگەیشت کە هەندێکیشیان ڕاست بوون، دەنگۆی ڕەوانەکردنی ترۆریست بۆ کوشتنی نیتی و تیتۆنی. و هاوکات لە ئیتالیاگوزارشی ترسێنەر سەبارەت بە کۆدەتا دارِێژراوەکانی نیزامی سەرهەڵدانەکانی چەکداران بەگوێ دەگەیشت. تا هاوینی ساڵی ١٩٢١، بەشە گەورەکانی ئیتالیای باکوور لەژێر کۆنترۆڵ چوبوونەدەرێ چون تیپەسەربازیەکانی فاشیستی لەگەڵ دوژمنانی باڵی چەپ و دیموکراسی خۆیان بەشەڕ هاتبوون.٦٩٨

ئەوە بۆ حکوومەتی ئیتالی کەش و هەوایەکی ناخۆش و تووش بوو، حکوومەتێک کە بە چنگ و ددان لە هەوڵی ئەوەدابوو تا ڕێگەچارەیەک بدۆزێتەوە کە لەوەزیاتر نە باوەڕی ناسیۆنالیستی لەناوخۆی وڵات یان هاوپەیمانەکانی لە دەرەوەی وڵات تووڕە بکات. نیتی لە هەوڵی ئەوەدابوو کە بە سەپاندنی گەمارۆی ئابووری بەسەر فیوومدا دیئنۆنزیۆ لەبرسان قڕ بکات، هەرچەند مەرجەکان ڕیگەیان بە خاچی سووری ئیتالی دەدا تا ئازووقە سەرەکیەکانی خۆیان بێنێتە ناوەوە.٦٩٩ مۆسۆلینی سەیری دەکرد و چاوەڕوان بوو.

وتویژەکان لەگەڵ هاوپەیمانانی ئیتالی بێجگە لە پێشنیاری ئاڵۆز و پێچەڵاوپووچ هیچی تریان لێنەکەوتەوە. لە واشنگتۆنەوە، ویلسۆن هەر ڕێگەچارەیەک کە کۆنترۆڵی فیوومی بە ئیتالیا دەبەخشی بنبڕ کرد. لیۆد جۆرج بەتوندی ئاماژەی بەوەکرد کە وڵاتەیەکگرتووەکان هێشتا لە هەوڵی ئەوەدایە کە پەرە بە دەسەڵاتی خۆی لە ئورووپادا بدات بەڵام حازر نیە هیچ جۆرە بەرپرسایەتیەک بگرێتە دەست. بەریتانیا و فەرەنسە دەترسان لەوەکە زۆر گوشار بخەنە سەر ئیتالیا. "کلیمینجوو بە لیۆد جۆرجی وت کە " تۆ وڵاتێکت هەیە کە تێیدا پاشا هیچ بایەخێکی پێ نادرێت، شوێنێک کە سوویا ملکەچی دەستووران نیە، شوێنێک کە لەلایەکەوە خاوەنی ١٨٠ سوسیالیستی، & لەلایەکی ترەوە خاوەنی ١٢٠ پیاو کە تایبەت بە پاپن!".٧٠٠

لە ئاکامدا، لە مانگی نوامری ساڵی ١٩٢٠دا، ئیتالیا و یۆگۆسلاڤیا سەرەڕای هەموو ناکۆکیەکان بڕیاریان دا لەگەڵ یەک ڕێکەون. حکوومەتێکی نوێی ئیتالیایی (لە مانگی ژوەندا نیتی لەسەرکار لاچوبوو) لەچوارچێوەی گیۆڤانی گیۆلیتی ڕیالیستی کۆنی بەزەبروزەنگ خوازیاری گەڕاندنەوەی دەستوور بوو بۆ نیشتمان و دەربازکردنی وڵات لە سەرەڕۆیە ڕوخێنەرەکانی دەرەوە بوو. ئیتالیا هێزەکانی خۆی لە ئالبانیا کێشایە دەرەوە، وڵاتێک کە لە کەمکردنەوەی ئاڵۆزیەکان لەگەڵ یۆگۆسلاڤیا یارمەتی دابوو. بەش بە حاڵی خۆی، حکوومەت لە بێلگراد یەکجار پێویستی بە بووژاندنەوەی تجارەتی یۆگۆسلاڤیا لە بێلگراد هەبوو، شتێک کە جێبەجێ نەدەکرا هەتا ئیتالیەکان لە بەندەرەکانی ئادریاتیک تەگەرە بخرایەتە سەر ڕێگاکانیان. کاتێکە

هەڵبژاردنەکانی سەرۆک کۆماری نوامبر لە وڵاتەیەکگرتووەکان کۆماریەکی خزاندە ناو کۆشکی سپییەوە، یۆگۆسلاڤەکان لە دەستێوەردانی ناتاسا لەلایەن ئەمەریکیەکانەوە هیوابڕ کران.٧٠١ ماوەیەکی بەدوای ئەمەدا، نوێنەرانی ئیتالی و یۆگۆسلاڤیا لە ڕاپالۆ کۆبوونەوە و جیهانیانی سەرسام ئاگاداربوونەوە کە گرێبەستێک بەستراوە کە کێشەی سنوورەکانی نێوان هەردوو وڵاتی ئەوانی چارەسەر کردوە. ئیتالیا نزیک بە هەمووی دوورگەی ئیستری، زادار (تەنیا شارۆچکەیەک بە زۆرینەیەکی ئیتالیەوە لەسەر کەنارئاوی دالماتیان) و هەندێک دوورگەی بچوک و نادیار لە ئادریاتیکی پێبڕا. ئەوەی کە ماوە بە یۆگۆسلاڤیا بڕا، لە هەمان کاتیشدا فیووم بوو بە وڵاتیکی ئازاد کە پارچەیەک زەوی بە ئیتالیاوە گرێی خواردبوو.

زۆریەک لە ناسیۆنالیستەکانی ئیتالی، وەکوو مۆسۆلینی، وەک سەرکەوتنێک سەیری گرێبەستەکەیان کرد چون ئەو گرێبەستە بەگشتی فیوومی لەچنگ سلاڤ هێنابۆوە دەرێ. لە یۆگۆسلاڤیا، کرۆواتەکان و سلۆڤینەکان گازندەی ئەوەیان دەکرد کە بۆ رایەکی تر بەرژەوەندیەکانیان لەلایەن سێربەکانەوە کرا بە قوربانی. لە خودی فیووم، دیئانۆنزیۆ پاشەکشێی کردوو و لە دۆخێکی ناخۆشدا دوورەپەرێز خۆی ڕاگرد و جاربەجارێک سەری هەڵدەهێنا و پێداگری دەکرد کە ئەو حازرە بمرێ بەڵام ئەوێ چۆڵ نەکات. لە یەکی مانگی دیسامری ساڵی ١٩٢٠دا، ئەو شەڕی دژ بە ئیتالیای ڕاگەیاند. لە ئاکامدا هێزی نیزامی ئیتالیا وورووژا و کەوتە بەرەنگاربوونەوە. لە شەوی کریسمەسدا تەقە لە تفەنگەکانیان بەرز بۆوە. کاتێکە گولەیەک لەپەناگوێەوە تێپەڕبوو، دیئانۆنزیۆ بەپەلەوهەلە کەوتە باسوخواستی خۆبەدەستەوەدان، خەڵکی ئیتالیای لەبەرهۆی ترسەنۆکیان و "زگەڕۆیی کریسمەس" بەتوندی سەرلۆمەکرد و بەدزیەوە گەڕایەوە بۆ ئیتالیا.٧٠٢

دوو ساڵ دواتر، مۆسۆلینی سەلماندی کە چەند بەجوانی ئەو وانەکانی فیووم فێربوە. ئەو بەرەو ڕۆم بە مارشی سەربازی ڕۆیی، و دێموکراسی ئیتالی، کە بە شەڕ و بە دڵساردی گشتگیر لە "سەرکەوتنی چەندلایەنە" لاواز کرابوو، بەبێ تەنانەت مرەیەکیش خۆی دا بەدەستەوە و کۆتایی پێهات. لە مانگی ژانویەی ساڵی ١٩٢٤دا، مۆسۆلینی فیوومی بە ئیتالیاوە لکاند؛ لە ساڵی ١٩٤٠دا، ئەوەی لە دەستی هات کردی بۆ ئەوە کە یۆگۆسلاڤیایی نگریس لەسەر خەریتە بسڕێتەوە. لە ساڵی ١٩٤٥، هێڵەکان دووبارە گوازرانەوە و بەشێکی زۆر لە ئیستریا، بێجگە لە تریستی، بە یۆگۆسلاڤیای تازەئاوەدانکراو برا. نزیک بە ٣٠٠،٠٠٠ ئیتالیایی بەرەو ڕۆژئاوای ئیتالیا دەربازبوون. فیووم ئێستا ڕیجێکایە و تەنیا بەرەی کۆنتر ئێستاش ئیتالیەکیان لەبیرماوە.

دیئانۆنزیۆ لەسەر پارەی دەوڵەت درێژەی بە ژیانی ئاسایی خۆیدا. دۆستێی تازە ڕەخنەی گرتبوو کە ئەو وەکوو ددانێکی کرمۆڵ وایە کە دەبێ لەبندا بێتە دەرێ یان ددانی زێڕی لەباتی دانرێت. ئەو ڕۆڵێکی کەمی لە ژیانی گشتیدا دەگێڕا، یەکەمایەتی بە ژیانی خۆی بە جادووگەریەکەیەوە، ژنانی تایبەت بەهی خۆی و کۆکاینی تایبەت بە خۆی دەدا. ئەو دۆستایەتی ڕوولەزیادبوونی ئیتالیای لەگەڵ ئەڵمانیا بەڕەوا نەدەزانی و لە ساڵی ۱۹۳۸دا لە کەش و هەوایەکی ئاڵۆز و تەماویدا کۆچی دوایی کرد. ژنەلاوێکی ئەڵمانی لە ترۆلەوە کە وەک بریکار و وەک ژنەدۆستی ئەو کاری دەکرد لەپڕێکدا ماڵەوەی بەجێ هێشت و دواتر زانرا کە لە ئۆفیسی وەزیری دەرەوەی هیتلێر، ژۆچیم ڤان ڕیبێنتراپ. سەرقاڵی کارکردنە.٧٠٣

سۆنینۆ، کە کەللەڕەقی ئەو مەترسی بۆ لەناوبردنی کۆڕی ئاشتی پاریس سازکردبوو، هەرگیز وڵامی ڕەخنەگرەکانی خۆی نەداوە و قەت بۆ ڕایەکی تر لە ئیتالیا لەبەرانبەر جەماوەردا قسەی نەکرد. ئەو لە کۆتایی ساڵی ۱۹۲۲دا کۆچی دوایی کرد؛ تەنیا وەسیەتێک کە بۆ وڵاتێک کە ماوەیەکی دووردرێژ خزمەتی پێکردبوو کرد ئەوەبوو کە لە تابووتێک سیمانکراو لەناو لێژایەکی خوار ماڵەخۆشەویستەکەی خۆی لە کەنارئاوی تووسکانی بنێژرێت.٧٠٤ ئۆرلاندۆ لە هەموویان زیاتر عومری کرد و لە لەسەرکارلابردنی فاشیستەکان لە ساڵی ۱۹٤٤دا ڕۆڵێکی گرنگی گێڕا. ئەو وەک سێناتۆرێکی خاوەنڕێز لە ئیتالیای دیمۆکراتیکی ساڵی ۱۹٥۲ کۆچی دوایی کرد.

# ٢٣

# ژاپۆن و بەرابەری ڕەگەزی

لە بەهاری ساڵی ١٩١٩دا، چاپەمەنی فەڕەنسا بۆماوەیەکی کاتی لە قەیرانی ئیتالی دابڕا و سەری قاڵ بوو بە کێشەیەکی ئاڵۆزەوە. ئایا شازادە کیمۆچی سایۆنژی، سیاسەتوانی ناودار بە سەرۆکایەتی شاندی نوێنەرایەتی ژاپۆنی، هەر لە پاریس بوو؟ ئەو زۆر بەکەمی دەکەوتە بەرچاوان و دەنگۆی ئەوە هەبوو کە ئەو نەخۆشیەکی قورسی گرتوە یان تەنانەت گەڕاوەتەوە بۆ ژاپۆن. ستێڤێن بۆنسال، چاو وگوێی دەمودەست حازری هاوس، دەیگوت کە ئەمە کردەوەی تایبەت بە ڕۆژهەڵاتی ناڤینە، کە شازادە وای بە مەسڵەحەت دەزانی دوورەپەرێز بمێنێتەوە و " کورتەباڵاکانی وەک بووکەباخە لەسەر کۆشی خۆی هەڵپەڕێنێت."٧٠٥

ئەو ڕۆژاوایانەی کە سەریان بە ژاپۆنەوە قاڵ بوو حەزیان دەکرد سەبارەت بە ڕۆژهەڵاتی تەماوی پشت بە کلێشەکانەوە ببەستن. زۆر شتی سەیر وسەمەرە سەبارەت بە ژاپۆن لە ئارادابوو، وەکوو پێگەی ئەو وڵاتە لە جیهاندا. ئایا ئەو وڵاتە هێزێکی سەرەکی بوو یان نا؟ ئایا ئەو وڵاتە ژمارەی نوێنەرەکانی بەقەدەر هێزەگەورەکانی تر دەبوو؟ سەبارەت بە هەردوو شێوازەکە مشتومڕ دەکران. ژاپۆن لەسەر شانۆی جیهاندا زۆر غەریب و تازە بوو و تا ساڵی ١٩١٤ سەرنجی دابوە ئاسیای ڕۆژهەڵاتی دراوسێ. هەرچەند دژ بە ئەڵمانیا شەڕی ڕاگەیاندبوو، لەبەرەی هاوپەیمانیدا هیچ هەوڵێکی ئەوتۆی نەدابوو. بەواتایەکی تر، ئەو وڵاتە یەکێک لە سێ یان چوار هێزی گەورەی دەریایی جیهانی هەبوو (بەسرابۆوە بەوە کە ئایا هێزی دەریایی ئەڵمانیا حەسابی لەسەر دەکرا)، سووپایەکی کاریگەر و هاوسەنگیەکی زۆر لەباری تیجاری. بەبۆچوونی بۆردێن، سەرەک وەزیری کەنەدایی، تەنیا سێ هێزی سەرەکی لە جیهاندا مابوونەوە: وڵاتەیەکگرتوەکان، بەریتانیا و ژاپۆن." کاتێکە کۆمەڵەی گەلان لە ئاکامدا هاتە

سەرڕووی جیهان، ژاپۆن لەبواری ئەو یارمەتیانەی کە چاوەڕوانی لێدەکرا بەگومانەوە شەرەفی پلەی پێنجەمی پێبەخشرا.٧٠٦

هەروائاسان نەدەکرا زلهێزەکان موقناع بکرێن. بەپێداگری بەریتانیا، هاوپەیمانی ژاپۆن، ئەوان ڕیگەیان دا ژاپۆن پێنج نوێنەر بۆ کۆڕی ئاشتی بنێرێت، وەکوو خۆیان حەسابیان بۆ کرد، بەڵام لە شۆڕای عالیدا ژاپۆنیەکان بەگشتی لەبەرچاونەدگیران و کەوتبوە بەر گاڵتە و پێکەنینی ئەم و ئەو. کلیمینجوو لە کۆبوونەوەیکدا بە دەنگی بەرز بەگوێی وەزیری دەرەوەی سرکاند کە " لە جیهانێکدا کە ژنی قژکاڵ و زەردۆڵەی تێدایە حەیف نەبێ لێرەدا لەناو ژاپۆنی ناشیرین و خوێنتاڵ حەپس بکرێین."٧٠٧ کاتێکە بڕیار درا بۆ خێرابەرەوپێشبردنی کارەکان شۆڕای چوار یار بخرێتە گەڕ، ژاپۆنیانی لە قەڵەم خست. بیانوویەک کە هێنایانەوە ئەوەبوو کە شاندی نوێنەرایەتی ژاپۆن، سەرەڕای نوێنەرانی زلهێزەکانی تر، لەلایەن سەرەک وەزیر یان سەرەک کۆمارەوە ڕێبەری نەدەکران.

شاندی نوینەرایەتی ژاپۆن وەکوو شازادە سایۆنژی- بەناوبانگ بەڵام کەمدوو بوون. هەرچەند هۆتێلی بریستۆل لە کارناس جمەی دەهات و لە هەموو بابەتێکی تیدابوو لە کێشەکانی تایبەت بە هێزی دەریایەوە بگرە تا دەگاتە کێشەکانی تایبەت بە کار و کریکاری، نوێنەرانی ژاپۆنی لە بوارە جیاجیاکانی کۆڕەکەدا، بەواتەی ڕاڤەکەرێکی بەریتانی ،" وەک بەشێکی سەیرکەر و چاوەڕوان" ڕۆڵیان دەگێرا. کاری بەوەنەبوو کە زۆربەیان تەنیا بە ئینگلیزی یان فەرەنسەیی سەرەتایی قسەیان دەکرد. کاتێکە، لە لێژنەیەکدا، سەرۆکی لێژنەکە لە ئەندامێکی ژاپۆنی پرسیاری کرد کە ئایا ئەو بە ئایە یان نایە دەنگی داوە، لە وڵامدا وتی " بەڵێ[yes]". لە هەرحاڵدا ژاپۆن وەکوو ئیتالیا وابوو؛ لە پاریس مەبەستی تایبەت بەخۆی هەبوو، بەڵام بە شتی تر بایەخێکی ئەوتۆی نەدەدا. ئەفسەری چاپەمەنی ویلسۆن، بەیکێر، نووسیبووی کە " ئەوان تاجرانی یەک-نرخی کۆڕەکە بوون. ئەوان خاوەن بەهرەی-ڕەنگە بەهرەی ڕۆژهەڵاتی ناوین- زانینی چۆن سەبرکردن بوون."٧٠٨

ناسراوترین کەسایەتیەکانی ناو شاندی نوێنەرایەتی ژاپۆنی دوو دیپلۆماتی بەئەزموون بوون، بارۆن نابۆئیکی ماکینۆ، کە وەزیری دەرەوە بوو، و ڤیسکۆنت سووتەمی، لە بەریتانیای گەورە باڵوێز بوو. هاوس ئەوانی " بێ دەنگ، بێ هەست، سەیرکەر" هاتە بەرچاو و لەنێوان ئاشتیکەرانی تردا سەبارەت بە وێکچوونی ئەوان هەندێک شۆخی و گاڵتە هەستی پێدەکرا. ئەمەریکیەکان ناویان نابوون دوو ماکیدۆکە[نازناوی ئیمپراتۆری ژاپۆنی]. بەڵام لەنێوان هەردوو کەسایەتییدا هەست بە جیاوازی بەرچاو دەکرا. ماکینۆ لیبراڵێک بوو کە حەزی لە دیپلۆماسی تازەی ویلسۆن بوو و پشتگری لە کۆمەڵەی گەلان دەکرد. بەداخەوە، چون ئینگلیزیەکەی تەواو

بەبوو، نەیدەتوانی ئەم مەبەستە بگەیەنێت. ئینگلیزی چیندا باشتر بوو و کاتێکە کێشەگەلی تووش و دژوار دەهاتە ئاراوە ئەو وەک تووندئاژۆیەک دەهاتە بەرچاو. هەمووی نوێنەرانی ژاپۆنی شێلگیرانە لە تۆکیۆوە چاودێری دەکران، شازادە سایۆنژی نەبێت، کە ناسراوتر لەوەبوو کە کۆنترۆڵ بکرێت و بخرێتە ژێر ڕکێفەوە.٧٠٩

و ئەو لە سەرەتای مانگی مارسدا گەیشتە پاریس، هەرچەند درەنگ گەیشتبوە ئەوێ. کاتێکە ژاپۆن بۆی دەرکەوت کە ویلسۆن، لیۆد جۆرج، کلیمینجوو و ئۆرلاندۆ خەریکن شاندی نوێنەرانی تایبەت بەخۆیان لە پاریس ڕێبەری دەکەن، حکوومەتی ئەو وڵاتە بەپەلە بڕیاری هێنا سەرئەوە کە ئەو بنێرێت، تا قەرەبووی نەناردنی سەرەک وەزیرەکەیان (کەسێک کە پێگەی سیاسی ئەوەندە لەرزۆک بوو کە نەیدەوێرا بۆ سەفەر بچێت) یان وەزیری دەرەوە (کە یەکجار نەخۆش بوو) بکەنەوە. هەڵبژاردنی سایۆنژی هێمای ئەوەبوو کە ژاپۆن کۆڕەکەی بە هەند گرتوە. لەگەڵ ئەوەش حکوومەت بەتەمابوو کە، ئەگەر ژاپۆن لە کۆڕەکەدا هەرشتێک کە خوازیاری بوو بەدەستی نەهێنایە، سامی ئەو[سایۆنژی] ئەو وڵاتەی لەبەرانبەر هێرشی دوژمناندا و لەبەرانبەر ئاژاوەگەلی وەکوو ئەوانەی کە لە بەکۆتایی هاتنی شەری ژاپۆن-ڕووسیە ڕوویان دابوو دەپاراست.٧١٠ لە پاریس، سایۆنژی وای پێ مەسڵەحەت بوو نەکەوێتە بەرچاوان، و لەرێگای کۆڕوکۆبوونەوەی تاکەکەسی و نافەرمی بۆ هاوکارەکانی ئاسانکاری بکات درووست هەر بەوشێوەی کە لە ژاپۆن کردبووی.

لە ١٥ی مانگی ئاڤریلدا بۆنسال وەک ڕێزلێنان لە شازادەی فێڵباز لە خانوەکەی خۆیدا لە نزیک پارک مۆنجوو چوە سەردانی. ئەو دیداری کۆنی تازە دەکردەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش سەردانەکەی ئەو هەوڵێک بوو بۆ چاکردنەوەی پەرژینەکانی نێوان ژاپۆن و هاوپەیمانەکانی؛ پێوەندیەکان گرژ ببوون. ئەو لەلایەن دوو پۆلیسی نهێنی و ترسێنەری ژاپۆنیەوە بەخێرهاتنی لێکرا، دواتر لەرێگای چەندین ژوورەوە بۆ شوێنی پیرۆزی ناوەوە ڕێنوێنی کرا. " نوورێکی ئاسمانی و پیرۆز تەواوی ژوورەکەی گرتبۆوە و چەند چرکەیەک تێپەڕی و چاوم کەوت بە زەلامێکی باڵابەرز، لاواز و زەدەهەڵگەڕاو بە جل و بەرگی ژاپۆنیەوە و دەستە ڕاداشتکراوەکانی کردە ڕووی من.... دیمەنی ئەو وەکوو دیمەنی بوودای گەورە لە کاماکۆرا کە دەڕوانێتە دەریا بێ دەنگ و دوورلە هەروهۆریا وابوو."٧١١

هەردووکەسایەتی سەبارەت بە سەردەمانی ڕابردوو و هاورێیانی دێرین بەڕووی خۆشەوە قسەوباسیان کرد. ئەوان قامکیان خستە سەر کێشەی ڕووسیە و حکوومەتی بۆلشویکی بەڵام ئەوان بەسەرنجەوە دوور لە ئاڵۆزیەکانی نێوان ژاپۆن و ڕۆژئاوا وەستان و قەرەی ئەو باسانە نەکەوتن-هەندێ ئاڵوگۆڕکردنی نادیار و لیڵ نەبێت. بۆنسال سەبارەت بە بەسەرهاتێک پرسیاری کرد کە گوایە

وەزیری دەرەوەی ژاپۆن لە دەیەکانی ١٨٩٠دا بەسەری هاتبوو، کاتێکە ئەو هەوڵی دابوو پارچەی دار لەدەرەوەی وڵات بە داری کورتەباڵای سنەوبەر لە پەرستگەی ئیسەوە، پیرۆزترین پەرستگە لە ئایینی هەمەلا-پەسەندکراوی شینتۆ، متۆربە بکات. شازادە ئەوی گەڕاندەوە سەردەمی حازر: "ئەو قەدی داری پیرۆز و پارچەکانی داری سەروی لە نۆرویژ و لە سکاتلەند، لە ڕووسیە و لە کالیفۆڕنیاوە پێکەوە متۆربەکردبوو. لە ئاکامی ئەم زەبرانەدا بۆماوەیەکی کاتی قاتی ئەو دارە پەیابوو، بەڵام خێرا جۆری ڕەسەنی سەروی شینتۆ لە ئیساوە بڵاوبۆوە."٧١٢

شازادە باش دەیزانی دەیهەوێ چ مەبەستێک بگەیەنێت. ئەو لەماوەی ژیانی خۆیدا وڵاتەکەی خۆی دیبوو کە لە کۆمەڵێک دوورگەی شاراوە لە باکووری ئۆقیانووسی ئارام گۆڕابوو و ببوو بە هێزێکی سەرەکی. ئێستاش کە ئێستایە ژاپۆنیەکان لە گرنگی ئەو گۆڕانە تێنەگەیون. نەتەوەیەک کە جاران لەناوخۆدابوو و لەلایەن چینی دەربەگەوە بەڕێوەدەچوو گۆڕابوو و ببوو بە هێزێکی مۆدێرن و سەردەمیانە بەهەمووی ڕاگرەکانیەوە: ئابووریەکی پیشەسازی کە لە ساڵی ١٩١٩دا هەرخێرا بوو بە ڕکابەری ئابووری فەڕەنسە؛ هێزی میلیتاریەک کە شمشێری پۆڵا و نێزەی لەگەڵ چەک و تەقەمەنی و کەشتیگەلی جەنگی ئاڵوگۆڕ کردبوو؛ و ژێرخانی ڕیگاکانی شەمەندەفەڕ، تێلێگرافەکان، قوتابخانەکان و زانکۆکان. ئاغاکانی دەربەگ، وەکوو خودی شازادە، ببوون بە دیپلۆمات، سیاسەتزان و پێشەسازی کار؛ گزیر و خزمەتکارەکانیان پێوەندیان بە سووپا یان بە پۆلیسەوە گرتبوو و ببوون بە ئەندام لەوێدا.

شازادە هەتابڵێی بلیمەت بوو و هەمیشە لەناوخۆدا بوو، وەکوو نەتەوەکەی دووڕەگە بوو. سەفەری ئەو بۆ پاریس نەک یەکێک لەو سەفەرە دووروودرێژانە بەڵکوو یەکێک لەو سەفەرانەبوو کە بە تێپەڕبوونی چەندین سەدە دێنەدی. ئەو لە ساڵی ١٨٤٩دا لەدایک بوو، لە ژاپۆنێک کە هێشتا لەگەڵ جیهانی دەرەوە بەگشتی دابڕاو بوو. داری دووروودرێژی بنەماڵەی ئەو، کە ئەوپەڕی وردبینی و سەرنجی تێدا بەکاربرابوو، هاوسەریەکانی نیشان دەدا لەگەڵ ماڵەگەورەکانی تر و تەنانەت خودی بنەماڵەی ئیمپراتۆر بەبەراورد، خێڵی تۆکۆگاوا، کە لە ساڵی ١٦٠٠ بەم لاوە بەناوی ئیمپراتۆریکی یەککەوتە بەسەر ژاپۆندا حکوومەتی کردبوو، تازەبەسەرداکەوتووی بێ نەزاکەت و بێ ئەدەب بوون. ئەو وەک کوڕیکی هاوپۆل و هاوچینی خۆی نرایە بەرخوێندن: زمانوویژەی کلاسیک، هەم بەژاپۆنی و هەمیش بە چینی؛ خەتخۆشی؛ ئامرازە کۆنەکان و چەقاندنی دارگەلی بچووک و بۆنسای تەواو. بێجگە لەوانە کاتێکە دەیەویست فێری ئەسپسواری بێت هەمووی هەڤاڵەکانی سەرسام کردبوو، شتێک کە بۆ پلە و پایەی کۆمەڵایەتی ئەو شەرمەساری بوو. ئەگەر کارەکان بە

ڕۆتی ئاسایی خۆیاندا تێپەڕانایە، ئەو ژیانی خۆی لە جیهانی خامۆش و بەسراوی دادگای کۆندا دەبردەسەر، بە پێگەیەکی مەزنی کۆمەڵایەتیەوە و بە خێزانێکی هەڵبژێردراو لەنێوان تاقمێکی بچوکی کیژگەلی ڕێک و لەبار. ئەو قەت سەفەری بۆ دەرەوەی وڵات نەدەکرد، چون ئەوە قەدەغەن بوو و، لەوەگرنگتر، بەمێشکدا نەدەهات. ئەو قەت لە دەسەڵاتی ڕاستەقینە چێژی وەرنەدەگرت، چون ئەوە کەتبوە دەستانی چینی دەربەگی نیزامی.٧١٣

ئەفسانەیەکی ژاپۆنی دەیکوت کە دوورگەکانی ئەوقان لەسەر پشتی کیسەڵێکی گەورە هاوسەنگ بوو؛ کاتێکە کیسەڵ دەکەوێتە جم و جوڵ، ئاکامەکەی بوومەلەرزەکانە. لە ساڵی ١٨٥٣دا بوومەلەرزەیەک لە جۆرێکی تەواو جیاواز زەوی لەراند. دەریاوانێکی هێرشبەری ئەمەریکی، کۆمۆدۆر ماتیو پێری، کە بەنوێنەری حکوومەتی ئەمەریکی چالاکی دەکرد، لە کەنداوی تۆکیۆ دەرکەوت و داوای کرانەوەی بازاڕی تجاری لەنێوان ژاپۆن و وڵاتەیەکگرتوەکان دەکرد. گەشتەکەی ئەو لەلایەن گەمیە جەنگیەکانی بەریتانی، فەڕەنسەیی و ڕووسی درێژەی پێدرا کە هەڵگری داواکاری هاوچەشن بوون بۆ ئالووێرکردنی مافەکانی تایبەت، بۆ ماف بۆ هاووڵاتیانی ئەوان تا ژاپۆن بکەنە ناوەوە، و بۆ پێوەندیەکانی دیپلۆماتیک. بازنەکانی دەسەڵاتداری ژاپۆنی بۆ ماوەی سەدەونیوی داهاتوو لەسەر ئەوە مشتومڕیان بوو کە ئایا بەرەنگاری بیانیەکانی بێ شەرم و کەم ڕێز ببنەوە یان ئەوەتا لەگەڵیان بسازێن و هەڵکەن لەگەڵیان، بەڵام جیاخوازەکانی توند-ئاژۆ نەیاندەتوانی لەبەرانبەر ڕۆژئاوای هێرشبەر و دەستدرێژکەر بوەستن. تەنانەت لەنێوان چینی خانەدانیشدا، توندڕەوانی لاو دەیانکردە سەر دەسەڵاتداران بۆ ئەوەکە دەرگای جیهانی دەرەوەیان بۆ بکرێتەوە و ڕێگە بە ئەوان بدرێ تا بۆ دەرەوە سەفەر بکەن. دەنگدانەوەکانی مشتومڕەکە ڕێگای گەیشتن بە بارەگای بێ دەنگ و دوورەپەرێزی پاشایان لە کیۆتۆ گرتەبەر و گەیشتە گوێی ئەوێ، و سایۆنژی لاو لایەنی توندڕەوەکانی گرت. ئەویش بڕیاری دا ئەگەر بۆی بلوێت بۆ دەرەوەی وڵات بچێت.

لە ساڵی ١٨٦٨دا خانەدانە چاکسازەکان دەسەڵاتیان لە ڕەژیمی کۆنی تۆکۆگاوا ستاند بەناوی هاوپۆلێکی قوتابخانەی سایۆنژی، کە لەو دەمەدا ئیمپراتۆری مەیژی بوو. سایۆنژی لە بەرەی ئەواندا لە شەڕی ناوخۆدا شەڕی کرد کە بەدوای ئەوەدا هات. کاتێکە ئەو گەڕایەوە بۆ بارەگای پاشا، بە دەرکەوتن بە بەرگی ڕۆژئاواییەوە و پرچی قوڵەکراوی، بووە هۆی ئابڕووبەرەیی و شەرمەساریەکی تازە.٧١٤ گەڕانەوەی ڕەژیمی پاشایەتی مەیژی (بە هەڵە ناوی کۆدەتایان لێنا) سەرەتای هەوڵێکی تەواو نیشتمانی بەخۆوە بینی چون لاوانی ژاپۆنی بە سەدان کەس لەڕێگای کەشتیەوە دەناردران بۆ دەرەوەی وڵات تا درێژە بە خوێندن بدەن و بەلاش پارە بە کارناسان و

پسپۆڕانی ڕۆژئاوایی دەدرا تا بچن بۆ ژاپۆن و بەم شێوەیە مێشکەکانی ئەوان بدزرێت. پوختەی مەبەستی حکوومەت لەم درووشمەدا خۆی دەردەکەوێت: "نەتەوە دەوڵەمەند بکەن و سووپا بەهێز بکەن." ژاپۆن بەریتانیای وەک نموونەیەک بۆ هێزی دەریایی خۆی، پڕاشا بۆ سووپای خۆی و یاسای بنەڕەتی خۆی، وڵاتەیەکگرتووەکان بۆ سیستەمی بانگداری خۆی و جیهان بەگشتی بۆ ئابووری خۆی هەڵبژاردبوو.

سایۆنژی پێشنیارگەلی کارپیشەی ئاسوودە حکوومی گل نەداوە و ملی سەفەری گرتەبەر تا جیهان بەچاوی خۆی ببینێت. لە ساڵی ١٨٧٠دا ئەو گەیشتە فەڕەنسە، شوێنێک کە دەبوایە دە ساڵی دوایی لەوێ تێپەڕاندایە. ئەو لە سۆڕبۆن لە بواری یاسادا بڕوانامەی وەرگرت، ئەو شوێنەی کە یەکێک لە هاوڕێیان و هاوپۆلانی خۆی کلیمینجووی لاو بوو، کە ئەوی وەکوو "بلیمەتێک" و "ڕووخۆشێک" ناو دەبرد. ئەو چاوی بە برایانی گۆنکۆرت و فرانز لیسزت کەوت. ئەو سەوداسەری زمانی فەڕەنسەیی، کولتووریان و نەریتەکانی لیبراڵی ئەوان بوو. ئەو تەنانەت لە خەویشدا بە زمانی فەڕەنسەیی قسەی دەکرد. لە کۆتاییەکانی ژیانیدا ئەو ئاوی ڤیچی دەخواردەوە و لە ئۆتکلۆنی هۆبیگانت کەڵکی وەردەگرت، کە دەبوایە بەشێوەیەکی تایبەت بۆ ئەویان بهاوردایە.٧١٥

ئەو کەسایەتیە تەڕپۆشەی کە گەیشتەوە ژاپۆن لەدڵەوەنزیک، نەقڵباز و لە ڕەوشت و لە ڕەفتاریدا هەندێک بێ لایەن بوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو لای هاوڕێیانی ژاپۆنی خۆی کەمدوو و نەناسراوبوو. ڕەخنەگرێک لە سێ ووشەی ئینگلیزیدا ئەوی ناساند: " وریایی، تەوەزەلی و کەمتەرخەمی." لە هەرچی لاوەتیدا قەت بەدڵیدا نەدەهات ژیانی هاوبەشی درووست بکات، هەرچەند لەگەڵ ژنەدۆستەکانی نزیکایەتی دووروودرێژی هەبوو. (کاتێکە لە ساڵی ١٩١٩دا هات بۆ پاریس، ئەو ژنەلاوێکی لەگەڵ بوو کە پەنجا ساڵ تەمەنی لە خۆی خوارتر بوو؛ چون ژنەلاوێکی هەڵەشە و بێ نەزاکەت بوو لەگەڵی هەڵگیرابوو.) ئەو قەت ترسی نەداری و نەبوونی نەبوو؛ برایەکی لەخۆی لاوتر ببوو بە سەرۆکی یەکێک لە شەریکە تازە و گەورەکانی پیشەسازی ژاپۆن و لەوێوە یارمەتی باشی وەردەگرت.٧١٦

سایۆنژۆ لە ژاپۆنی تازەدا وەک دیپلۆمات، وەزیری دەرەوە و دواتر، لە دەیەکانی ١٩٠٠دا، وەک سەرەک وەزیرێک خزمەتی دەکرد. لە ساڵی ١٩١٣دا ئیمپراتۆری تازە ئەوی کرد بە *جەنرۆ*، دەستەواژەیەک کە بە ناتەواوی بە "کۆنە سیاسەتمەدار" وەرگێڕدرایەوە. با *جەنرۆ* لەچوارچێوەی دەستووری تازەی ژاپۆندا هیچ ڕۆڵێکی فەرمی نەدرابێتێ، هەر ناوەکە خۆی لەخۆیدا هەڵگری کاریگەریەکی باش، بەتایبەت لەسەر دامەزراندنی حکوومەتگەلی تازە و سیاسەتی دەرەوەیە. لە کاتی پشێوی و ئاڵۆزیدا، تەنیا وتەیەک لەلایەن *جەنرۆ*وە بەس بوو بۆ ئەوە بڕیارێک ڕاگەیەنرێت. بە واتەی

ئەمەریکییەکان ئەوە دەبێ ویلیام هۆوارد تافت و تۆئۆدۆر ڕۆزڤێڵت بووبێتن کە ویلسۆنیان نەک تەنیا وەک سەرەک کۆمار هەڵبژارد بەڵکوو هەمیشە چاوێکیان بە سیاسەتەکانی ئەووەوە بوو.

وڵاتی سایۆنژی بەرلە ساڵی ١٩١٤ بەسەرهاتێکی سەیر و سەرکەوتوو بوو؛ ئەوێ تەنیا نەتەوەیەکی ئاسایی بوو کە هەم لەبەرانبەر ئیمپریالیستەکانی ڕۆژئاوادا بەرخودانی کرد و هەمیش پێوەندی پێوە گرتن. کۆی وەبەرهێنانی ناوخۆی ئەو وڵاتە- کۆی نرخی هەمووی کەل و پەلەکان و خزمەتگوزاریەکان- نزیک بە سێ کەڕەت لەبەین ساڵەکانی ١٨٨٥ و ١٩٢٠ چوە سەرەوە، لەبوارەکانی کانکاری و وەبەرهێناندا نزیک بە شەش کەڕەت چوە سەرەوە. گۆڕانکاری خێرای لەوچەشنە هەم ئێشی بەدواوەبوو و هەمیش نۆش؛ زۆربەی هەرەزۆری ژاپۆنیەکان ئارەزووی گەڕانەوە بۆ ڕابردوویەکی ساکارتریان لە دڵدا بوو. بەڵام سایۆنژی هاووڵاتیانی هاندا تا چاوەڕوانی داهاتوویەکی دیموکڕات و لیبراڵ بن و وەخەبەری هێنانەوە کە تەنیا پشت بە هێزی میلیتاری نەبەستن. ئەو وەخەبەرهێنانەوەیە پێویست بوو چون هەتا ژاپۆن بەهێزتر بوایە، هەندێک دەنگی بەهێز هەبوون کە شیمانەی ئەوەیان دەکرد ئەگەر پێویست بێ لەوانەبوو ئیرادەی خۆی بە سەر دراوسێکانیدا بسەپێنیت.٧١٧

لە ساڵەکانی بەرلە ساڵی ١٩١٤دا، پێدەچوو تونددوتیژی سەرکەوتنی بەدواوە بهاتایە، وەک ژاپۆن کە کۆمەڵێک سەرکەوتنی میلیتاری بۆخۆی مسۆگر کرد، یەکەمیان بەسەر چیندا لە ساڵی ١٨٩٥، ئەوکاتەی کە دەستی بەسەر تایوان و پێگەیەکی سەرەکی لە کۆرە دا گرت. لە ساڵی ١٩٠٢دا، وەک ڕێزێک لە پەرەسەندنی دەسەڵاتی ژاپۆن لە ناوچەکەدا، وازی لە دوژمنایەتی درێژخزایەنی خۆی لەگەڵ هاوپەیمانان هێنا. هاوپەیمانی هێزی دەریایی ئانجلۆ-ڕاشن، کە هێشتا لە ساڵی ١٩١٩دا هەر برەوی هەبوو، هێمایەک بوو، بەتایبەت بۆ ژاپۆنیەکان، واتە ژاپۆن گەیشتۆتە ئاستێکی جیهانی. لە ساڵی ١٩٠٤دا ژاپۆن دەستی بەسەر دەسەڵاتی بەهێزی ڕووسیە لە مانچوورا داگرت، سووپاکانی لەسەر عەرز تێکشکاند و نەک یەک دانە بەڵکوو دوان لە کەشتیەکانی لێ نووقمی ئاوکرد. لەو ئاشتیەی کە لە ساڵی ١٩٠٥دا واژۆ کرا، ژاپۆن مافگەلی یەکجارزۆری لە مانچوورە گیر کەوت. چەند ساڵ دواتر، لە ساڵی ١٩١٠، بەشێوەیەکی فەرمی کۆریایی لکاند، بەم شێوەیە ئەوەیکە جیهان ملی بۆ کەچ کردبوو ئەم جەختی دەکردەوە. ( شاندێکی بچووکی خەماوی لە کۆرەیەکان لە کۆڕی ئاشتیدا سەریان هەڵێنا تا داوای سەربەخۆیی ئەوان بکەن.)

هێزەکانی تر هەم بەسەریان هەڵدەکوتان و هەمیش نیگەرانیان بوون. بۆ وێنە تا ساڵی ١٩١٤، یەک لە چواری هەناردەکانی دەزووی کەتانی جیهان ژاپۆنی بوون.٧١٨ بەریتانیەکان ترسی زاڵبوونی

ژاپۆنیەکان بەسەر بازاڕەکانی چین و هیندستان دایگرتن. ولاتەیەکگرتووەکان سەبارەت بە بەرژەوەندیەکانی خۆی لە ئاسیا خەم دایگرتبوو، کە نەک تەنیا تجارەتی چینی بەڵکوو ملکی تازەی ئەوێ، فیلیپین،ی دەگرتەوە. لەنێوان ئاسیایەکاندا، دەبێ بڵێین، ژاپۆن ئیلهامبەخش بوو، سەلمێنەری ئەم ڕاستیە بوو کە بەڵێ تێکشکانی ئیمپریالیستەکانی ڕۆژئاوا خەون نیە و حەقیقەتی هەیە. تەنانەت چینیەکانیش، کە لە ژاپۆنێکی بەهێز زۆرشتیان پێ دەدۆڕاند، هیوایان بە نموونەی ژاپۆنی هەبوو. هەزاران لاوی چینی لە باکووری ئۆقیانووسی ئارام بە کەشتی دەپەڕینەوە ئەوبەر تا لە زانکۆکانی ژاپۆنی درێژە بە خوێندنیان بدەن.

لە سەرتاسەری ژاپۆندا، تەنیا خودی ژاپۆن لە دەسەڵاتی ژاپۆنیەکان گومانی هەبوو. ئابووری تازەپەروباڵگرتوو نەیدەتوانی لەبەرانبەر شەڕ لەگەڵ ڕووسیە تاقەت بێنێت. ئایا ئەو شەڕە ئەوەندەی تێدابوو کە خۆی لێبدات؟ هێزەکانی تر سەبارەت بە سەرکەوتنی ژاپۆن چۆن بیریان دەکردەوە؟ ژاپۆنیەکان شتێکی وایان لەدەست نەدەهات بەڵام دەیانتوانی ببینن کە جیهانی ڕۆژئاوا ئەوانی وەک هاوچەشنی خۆیان زۆربەکەمی قەبووڵ بوو. سیاسەتمەدارێکی ناودار بەتوندی لای هاوڕێیەکی خۆی گلەیی کردبوو، " هەڵبەت، هەڵەیەکە ئێمە کردوومانە ئەوەیە کە ڕەنگی پێستمان زەردە. ئەگەر پێستی ئێمەش وەکوو هینی ئێوە سپی بوایە، هەمووی جیهان بە هانای دەنگی ئێمە بۆ ڕاگرتنی دەستدرێژی بێ پسانەوەی ڕووسیە دەهات."٧١٩

ژاپۆنیەکان باش ئاگاداری لاوازبوونی خۆیان بوون. ئەوان هیچ سەرچاوەیەکی سرووشتی تایبەت بە خۆیان نەبوو. چدەبوو ئەگەر نەتەوەکانی تر نەیانهێشتایە ئەوان دەستیان بە کەرەسەی خاو و بازاڕەکان ڕابگات؟ ڕێگەچارەی ناسیۆنالیستەکان بۆ ژاپۆن ئەوەبوو کە ڕەچاوی نموونەی هێزەکانی تر بکات و ئیمپراتۆریەت دامەزرێنێت. باس باسی پەیامی لەمێژینەی ژاپۆن بوو بۆ ڕێبەرایەتی کردنی ئاسیا. بەتایبەت، چین، پێشنیاری فریودانێکی جانانەی دەکرد. دوایەمین زنجیرەی دەسەڵاتداریێتی ئەو ولاتە ڕوولەنەمان بوو و ولات خەریک بوو بەهۆی گەندەڵی کۆنترۆڵنەکراو دەپووکایەوە. شۆڕشێکی سەرنەگرتوو لە ساڵی ١٩١١دا تەنیا گێرەشێوێنی و ناکۆکی زیاتری لێدەکەوتەوە. چین ئەوەی کە ژاپۆن پێویستی پێی بوو هەیبوو، لە کەرەسەگەلی خاوەوە بگرە تا دەگاتە بازاڕەکان. و مانچورا درووست لەپشت کۆریاوە، چۆڵ و هۆڵ بوو، حەقیقەتێکی گرنگ لە ولاتێک کە حەشیمەتەکەی لەنێوان ساڵەکانی ١٨٨٥ و ١٩٢٠ تا سەدی ٤٥ زۆری کردبوو و ڕێبەرەکانی لەوە دەترسان کە زۆربوونی حەشیمەت قەیرانی کۆمەڵایەتی، تەنانەت شۆڕشی لێبکەوێتەوە. بەڵام ئەگەر هێزەکانی تر حەزیان بکردایە ڕێگەیان بە ژاپۆن بدایە لە مانچوورا بە بەراورد دەستی ئاوەڵاتر بوایە،

ئەوان لەکاتی خۆیدا لە چین هێڵیان دادەنا، شوێنێک کە ئەوان بەرژەوەندی خۆیانیان هەبوو تا پارێزگاری لێبکەن.

خەونگەلی ناسیۆنالیستی لیبراڵەکانی وەکوو سایۆنژی نیگەران کردبوو. ئەو وتبووی " من ترسی ئەوەم نیە کە بەگشتی بیروباوەڕی نیشتمانپەروەری کۆتایی پێهاتبێت بەڵام لەوەدەترسم کە بیروباوەڕی بەکۆمەڵی نیشتمانپەروەری بڵێی ئێمە بەرەوە چ ئاقارێک بەرێت." ئەو بەرلە هەمووشتێک ئینتێرناسیۆنالیست بوو، کەسێک کە باوەڕی بە دەستوورێکی توندوتۆڵی جیهانی بوو کە ڕێگە بە ژاپۆن و هاوڕێ لەگەڵ نەتەوەکانی تریش بدات تا لە ئاشتی و تەباییدا گەشە بکەن. ئەگەر دەستدرێژی بۆ سەر ئاسیا زیانی بە پێوەندیە باشەکانی ژاپۆن لەگەڵ هێزەکانی تر بگەیاندایە، ئەوا پێویستە بەری بگیرێت..٧٢٠ سەرهەڵدانی شەڕی گەورە تەنیا پەرەی بە ناکۆکیەکان دەدا.

ژاپۆنیەکان بێ لایەن سەیری خودی قەیرانەکەیان دەکرد- بە واتەی کۆنە سیاسەتمەدارێک، " وەکوو ئاورێک لە ئاسۆیەکی دەوری قەراخ چۆمێک." بەرلەهەمووکەس حکوومەت دەترسا لەوەکە چکارێک بکات. ئایا دوور لە شەڕ چاوەڕوان بێت و هیچ نەکات؟ پشتگری لە هێزەکانی ناوەندی بکات؟ (زۆربەی ئەفسەرەکانی ناو سوویا لە ئەڵمان بارهاتبوون و ڕێزێکی زۆر تایبەتیان بۆ هێزەکانی ئەوێ هەبوو.) پشتگری لە هاوپەیمانان بکەن؟ (بۆچوونی هێزی دەریایی، کە پێوەندی نزیکی لەگەڵ بەریتانیا هەبوو.) چەلەحانەکانی ناو کابینە بەگشتی پراگماتیک بوون بەدوای ئەوەوەبوون کە لە کوێ ژاپۆن دەتوانێ باشترین قازانج بکات. بڕیار بۆ هاوپەیمانان مابۆوە. کاتێکە حکوومەت لە ٢٣ی مانگی ئۆگستی ساڵی ١٩١٤دا شەڕی ڕاگەیاند وتبووی " پێویستە کە ژاپۆن لە دەرفەتی هەزارەیەک کەڵک وەرگرێت تا مافەکانی خۆی و بەرژەوەندیەکانی خۆی لە ئاسیادا مسۆگر بکات." لە هێرش کردن بۆسەر ئەڵمانیا، ژاپۆن شێوازێکی بۆ نزیکبوونەوە لەو بەرژەوەندیانە بەکاردەهێنا کە دوور لە مەترسی بوو. ئەڵمان لە چین لە دوورگەی شانتوونگ (شاندۆنگ) هەندێک زێدەمافی هەبوو و لە باکووری ئۆقیانووسی ئارام کۆمەڵێک دوورگەی بچووکی هەبوو- مارشالەکان، کارۆلاینەکان، ماریاناسەکان- و بێ بەش لە هەر شێوازێک بوو بۆ پاراستنی ئەوان. لە مانگی نوامبری ساڵی ١٩١٤دا کەمپەینەکە کۆتایی پێهات.٧٢١

لەوەبەولاوە شەڕەکە بەهەمان چەشن لەقازانجی ژاپۆن دابوو. نەک تەنیا وەبەرهێنەرانی ژاپۆنی ڕێک و پێک کرد بەڵکوو بەشێکی زۆر لە ڕەکابەری پێش شەڕی لەکارخست. کەشتیگەلی بازەگانی ژاپۆن دوو ئەوەندەیتر زیادی کرد چون هەناردەکان بۆ بەریتانیا و بۆ وڵاتەیەلگرتوەکان دووکەرەت زیاتر بوو، هەناردەکان بۆ چین چوار کەرەت و بۆ ڕووسیە شەش کەرەت زیاتر بوو. لە ساڵی ١٩١٨دا، هاچێز باڵفۆڕی وەخەبەر هێنا کە ژاپۆنیە چالاکەکان خەریکن ڕوو لە هەموو

شوێنێک دەکەن. " پێویستە ئێمەش بەڕۆژ کاربکەین ئەگینا دەبێ وەکوو باپیرانی من لە دەشتە پڕپیت و بەرەکەتەکان بەرەوە تەپە ڕووتەڵە و بێ سەمەرەکان کۆچ بکەین و دوورەپەرێز بوەستین." و ئەوە تەنیا هەڕەشەی ئابووری نەبوو کە بەریتانیەکانی خستبوە دڵەڕاوکێ؛ لە دەریا، ژاپۆن بەهێزتر بوو لەوەی کە لە ساڵی ١٩١٤دا بوو، و لە وشکی، ئەو وڵاتە خەریک بوو تەشەنەی دەکردە ناو چین و بەرەو ڕووسیەی سیبیری دەچوو.٧٢٢

وەڕەزبوون ژاپۆنیەکانی تووشی ترس و دڵەڕاوکێ کردبوو. لە کاتی شەڕدا کۆنەسیاسەتمەدار شازادە ئاریتۆمۆ یاماگاتا وتبووی کە " هەنگاونان بەرەو نەهێشتنی دامەزراندنی هاوپەیمانی سپی پێستەکان دژ بە خەڵکانی زەردپێست بەڕاستی گرنگە و دەبێ بایەخی بدرێتێ." لە ساڵی ١٩١٧دا ستافی گشتی ژاپۆنی وتبووی کە ناردنی هێز بۆ شەڕکردن لە ئورووپا دوور لە ڕاستیە و نایەتە دی. کاتێکە شەڕ کۆتایی پێهات پێویستی بە ئەوان دەبێت بۆ ئەوەکە یارمەتی ژاپۆن بدەن تا لەبەرانبەر ڕەکابەرێتی ڕۆژئاوا لە چیندا بوەستن. ماوەیەکی کورت بەرلەوەی شەڕ کۆتایی پێبێت ڕۆژنامەیەکی ژاپۆنی لە سەرکردایەتی پرسی بوو کە بەبۆچوونی ئەوان ژاپۆن دەبێ دەسکەوتەکانی لە شەڕ چێ بێت. وڵامەکان ڕەشبینیەکی بەرچاویان سەبارەت بە پێگەی جیهانی ژاپۆن و سەبارەت بە پیلانەکانی بەریتانیا و وڵاتەیەکگرتوەکان لە چیندا دەرخست. ترسی هاوپەیمانیەکی دژە-ژاپۆنی لە هێزە سپیپێستەکان ئەوەندەش خەیاڵی کە دەهاتنە بەرچاو نەبوون. دوا کۆتایی هاتنی شەڕ تەنانەت ڕێبەرانی بەرپرسی ڕۆژئاوایی بە نابدڵیەوە هاتبوونە ئەم ئەنجامە کە ڕۆژێک هەمووشتێک بخرێتە ڕوو و ناکۆکیەکان کۆتاییان پێبێت. لە ساڵی ١٩١٧دا، لە یاداشتێکدا بۆ کابینەی شەڕ، بالفۆڕ، وەک یاریدەدەرێک، لێدوانێکی دا دەرەوە کە ئەگەر بێتو ژاپۆن هێرش بکات ئەوا بەدڵنیایەوە بەریتانیا لە وڵاتەیەکگرتوەکان پارێزگاری دەکات. ژاپۆن کەوتبووە سەر دووڕێ، کە لە دەیەکانی ١٩٣٠دا زیاتر هەستی پێدەکرا، ئایا باوەڕ بە هێزەکانی سپی پێست بکات، لەبەهێزکردنی دەستووری جیهانی کاریان لەگەڵ بکات، یان نەخێر باشتر وایە ئاگای لەخۆی بێت و قەرەی هیچ شتێک نەکەوێت.٧٢٣

بێجگەلەوانە حکوومەت دەبوایە گوێی بۆ ڕای گشتی شل بکردایە، کە داوای قەرەبووکردنەوە بوو بۆ تێچوەکانی هێرش بۆ سەر ئەڵمانیا، کە لە چین بەتاقی تەنیا گیانی نزیک بە دوو هەزار ژاپۆنی گرت و بڕی پەنجا ملوێن خەرجی دابەدەستەوە. و ڕای گشتی بریتی بوو لە شتێک کە هەڵبژاردەکانی بەڕێوەبەرایەتی ژاپۆن ترسیان لێی هەبوو. گەشەسەندنی شەڕ هەمووی بەشەکانی کۆمەڵگای وەکوو یەک نەگرتبۆوە و سەبارەت بە زەنگینی تازە هەست بەهەندێک وەڕەزی دەکرا. شۆڕشی ڕووسیە نموونەیەکی ئاڵۆز لەو

شتانەبوو کە لەوانەبوو بێنە ئاراوە. لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩١٨دا لەسەر نرخی برنج هەندێک تێکهەڵچوون هاتنە ئاراوە کە بوونە هۆی ڕووخانی حکوومەت.٧٢٤

حکوومەتی تازە کە دەسەڵاتی گرتەدەست سووربوو لەسەر ئەوەکە دەسکەوتەکانی ژاپۆن لای خۆی هەڵگرێت بەڵام بەتەمابوو ئەوکارە بەبێ ئاگادارکردنەوەی هێزەکانی تر بکات. شاندی نوێنەرایەتی ژاپۆن بە سێ ئامانجی ڕوونەوە ڕەوانەی پاریس کرا: دانانی بەندێک لەسەر بەرانبەری ڕەگەزی لەناو پەیمانی کۆمەڵەی گەلاندا، هێنانەژێر ڕکێفی باکووری دوورگەکانی ئۆقیانووسی ئارام و ڕاگرتنی زێدەمافەکانی ئەڵمانیا لە شانتۆنگ. ئەگینا، بەپێی ئامۆژگاریەکان، دەبوایە لەگەڵ چاردە خاڵەکەی ویلسۆن ڕێکەوتایە. سەرەک وەزیر بەشێوەیەکی نهێنی بە ماکینۆی ڕاگەیاند تا لەگەڵ بەریتانیەکان و ئەمەریکیەکان هاریکاری بکات.٧٢٥ ئەمە بەچاو نزیک و ئاسان بوو بەڵام بەلەش دوور و گران.

دوورگەکانی ئۆقیانووسی ئارام- مارشاڵەکان، ماریانەکان و کارۆلینەکان- یەکەم جار لە شۆڕای عالیدا کەوتنە بەرباس. هەزاران دوورگەی بچووک و تیرەی بەردینی قەراخ ئاو بەدرێژایی ئۆقیانووسی ئارام لەنێوان دوورگەکانی هاوایی و فیلیپیندا، ئەوان هاوڕێ لەگەڵ خەڵکانی دانیشتووی ئەوێ بە درێژایی چەندین سەدە لە ئاشتی و تەبایەکی نادیاردا ژیابوون. ململانێی ئیمپراتۆری، پەرەسەندنی تەکنۆلۆجیایی مۆدێرن و گەشەسەندنی هێزەکانی مۆدێرنی دەریایی نرخی ئەوانی بیانیەکان بردبوە سەرێ، سەرەتا لای ئەڵمانیەکان و ئێستا لای ژاپۆنیەکان. هێزی نیزامی ژاپۆن پێداگری لەسەر ئەوەدەکرد کە ژاپۆن دەبێ ئەوەندە کۆنترۆڵی بەسەر ئۆقیانووسی ئارامدا هەبێت تا لەخۆی پارێزگاری بکات و تا بەسەر بازاڕەکاندا و کەرەسەی خاوی ناودڵی ئاسیا کۆنترۆڵی هەبێت. ئەوەش بەنۆبەی خۆی بەمانای توانینی دانووستان لەگەڵ هێزەکانی تری دەریایی بوو. ژاپۆن بەرلەساڵی ١٩١٤ هەم چین و هەمیش ڕووسیەی بەچۆک داهێنابوو و گرێبەستێکی دەریایی لەگەڵ بەریتانیا بەستبوو- بەڵام لەگەڵ وڵاتەیەکگرتوەکان بە ڕێکەتنێکی دڵخۆشکەر نەگەیشتبوو. تەنانەت شیمانەشی نەدەکرا.

لە ساڵی ١٨٩٨دا، لە ماوەی شەڕی ئیسپانی-ئەمەریکیدا، وڵاتەیەکگرتوەکان دەستی بەسەر فیلیپین و بنکەی گرنگی گوام بۆ ڕۆژهەڵات گرتبوو. تارادەیەک بۆ مەبەستی پارێزگاری کردن لە دەسکەوتە تازەکان، بێجگە لەوانە دوورگەی هاوایشی لکاندبوو. لە هەنگاوێکدا وڵاتەیەکگرتوەکان هەزاران مایل نزیکتر بەرەو ژاپۆن هاتبوو. هەتا شەڕی یەکەمی جیهانی، هێزی دەریایی ئەمەریکی هێشتا بنکەی لە ئادریاتیکدا هەبوو، بەڵام هێمای ئەوە لە ئارادابوون کە گوایە ستراتیژی ئەمەریکا

بەرەو هەڵکردن لەگەڵ بەرپرسایەتیەکانی ئاسیایی خۆی دەگەڕێ. لە ساڵی ١٩٠٨دا، سەرەک تئۆدۆر ڕۆزڤێڵت کەشتیەکی هەڵمی ڕەوانەی دەورادەوری جیهان کرد. ئەوە پارە زۆرکراوەکانی تەرخانکراو بە هێزی دەریایی پێشکەش بە کۆنگرێس کرد و لەسەر بەندەری پێرل هاربێر لە هاوایی دەستی بە کارکردن کرد. لە ساڵی ١٩١٤دا ولاتەیەکگرتوەکان دوا بەریتانیای گەورە و ئەڵمانیا سێهەمین هێزی گەورەی دەریایی جیهانی هەبوو. ساڵی دواتر کاناڵی پاناما، کە بە پارەی ئەمەریکی درووست کرابوو، کرایەوە، ڕێگای جموجۆڵی کەشتیەکانی لە ئۆقیانووسێکەوە بۆ یەکی تر خۆشتر و ئاسانتر کرد. لە ساڵی ١٩١٦دا حکوومەتی ئەمەریکی بەئاشکرا ئەرکی هێزی دەریایی " هەردوو- ئۆقیانووسەکەی" پێسپێردرا.٧٢٦ هەندێک لە ئەمەریکیەکان سەبارەت بە چارەنووسی دیارو بەرچاو قسەوباسیان دەکرد، سەبارەت بەوە کە چۆن ولاتەیەکگرتوەکان بەئەرکی زانیبوو کە بەرەو ڕۆژئاوا پەرە بە دەستدرێژیەکانی بدات.

بەداخەوە،وا بۆ چارەنووسی ئەمەریکا دیاری کرابوو کە لە ئاکامدا لەگەڵ ژاپۆنیەکان تووشی شەڕ بێت، و ئەوەیکە لە ولاتێکیان بەرخودان و پارێزگاری پێ ئەوترا لە ولاتەکەی تر وەک دەستدرێژی ناوی لێدەبرا.

پلان داڕێژەرانی نیزامی هەم ئەمەریکا و هەمیش ژاپۆن لەوە ئاگاداربوون کە ولاتانی ئەوان خەریکن لەگەڵ یەکتر دەستەویەخە دەبن. وەک وریابوون هەرکامیان پلانی داڕشتنی ئەگەری هاتنەئارای شەڕێکیان لەگەڵ ئەویتر دەڕشت. هەرچەند، لە هەردوو لاوە کەسانێک هەبوون کە ئاسۆی شەڕیان بەهەند دەگرت یان بەعەشقەوە لێیان دەڕوانی. لە ولاتەیەکگرتوەکان، لە ساڵانی بەرلە ١٩١٤ڕۆمانووسین دەستی پیکرد و ڕۆمانەکان خوێنەرانی خۆیان لە دێوەزمەی دەستدرێژیەکی سەرکەوتووی ژاپۆنیەکان دەترساند. ئەمانە بەتایبەت لە کەنارئاوەکانی ڕۆژئاوا باش بەفرۆش دەگەیشتن. کاتێکە گرووپێک ماسیگری سادەی ژاپۆنی ویستبوویان کەنداوێک لە باژا کالیفۆرنیای مەکزیک بەکرێ بگرن ڕۆژنامەی هێرست دەستی کرد بە ورژاندنی باسەکە و لەسەر " مەترسی زەرد" زۆر ڕۆیی و یەکجار کەیفی سازبوو و هەتا توانی لەسەر پیلانەکانی حکوومەتی ژاپۆنی بۆ دامەزراندنی بنکەیەکی دەریایی ڕۆیی. ئەفسەرێکی خانەنشینی هێزی دەریایی ژاپۆن سەبارەت بە داهاتوویەک کە تێیدا ژاپۆن هێرش دەکاتە سەر ولاتەیەکگرتوەکان و دەست بەسەر دوورگەکانی ئەمەریکی لە ئۆقیانووسی ئارامدا دەگرێت ڕۆمانێکی لەژێرناوی شەڕێکە *لەسەرڕێمانە* نووسی. دوائەوەکە ژاپۆن لە ساڵی ١٩١٤دا سازبوو تا دەست بەسەر زێدەمافەکانی ئەڵمانیا لە چین دابگرێت، زۆربەی ئەفسەران و پیاوان لایان وابوو کە وادیارە ئەوان بۆ مەبەستی

شەڕکردن لەگەڵ وڵاتەیەکگرتووەکان بانگێشت کراون و خراونەتە ڕێ. هێزی دەریایی ژاپۆن بە حکوومەتەکەی خۆی پێشنیار کرد کە ژاپۆن پێویستە دوورگەکان وەک چوارچێوە دیوارێک بۆ چاودێری کردنی دەستدرێژی ئەمریکیا یان، بەپێچەوانە، وەک داشێک بۆ گۆڕینەوەی ڕێکەوتنامەیەک لەسەر نامیلیتێرازەکردنی لە ئۆقیانووسی ئارامدا بەکاربێنێت.٧٢٧

ژاپۆن دەیتوانی پشت بە یارمەتیەک ببەستێ کە لە پاریسەوە حاسابی بۆ دەکرد. لە مانگی فەوریەی ساڵی ١٩١٧دا، وەک وڵامێک بۆ یارمەتی هێزی دەریایی ژاپۆن، بەریتانیا داواکاریەکانی ژاپۆنی لەسەر دوورگەکان بە فەرمی ناسی، و ئیتالیا، فەڕەنسە و ڕووسیە هەر هەمان ڕێچکەیان گرتبوە بەر. بەڵام ناوچە ژێردەسەڵاتەکانی بەریتانیا وەکوو نیووزیلەند، ئوستڕالیا و، تاڕادەیەک کەمتر، کەنەدا سەبارەت بە هاتنەناوەوەی ژاپۆنیەکان بۆ ناوچەکانی ناو ئوقیانووسی ئارام ترس و نارەزایەتیان لێ پەیاببوو. لە بەریتانیا ئەو هەستە درووست ببوو کە گوایە یارمەتی ژاپۆن لەکاتی شەڕدا بەهێواشی و بەنابەدڵیەوە دەهات. ئەوەکە سەرۆکی کۆمپانیایەکی گەورەی کەشتی سازی ژاپۆنی ناردرایە لای سەربازانی بەریتانی لە بەرەکانی جەنگدا و یارمەتیەکی بەکەڵکی وەک ناردنی پۆلێک فرۆکەی دەریایی بۆ مەدیتەرانە لە ساڵی ١٩١٧دا بەریتانیەکانی زۆر دڵخۆش نەکرد. (فەڕەنسەیەکانیش وەکوو ئەوان سەبارەت بە یارمەتی ژاپۆن بیریان دەکردەوە؛ وەک چۆن کلیمینجوو لە مانگی ژانویەی ساڵی ١٩١٩دا بە ئاشتیکەرانی هاوڕێی خۆی ڕاگەیاند، " کێیە بڵێ ڕۆڵێک کە ژاپۆن لە کاتی جەنگدا گێڕای لەگەڵ ڕۆڵێکە فەڕەنسە گێڕای هاوچەشنی یەکن؟ ژاپۆن لە بەرژەوەندیەکانی خۆی لە ڕۆژهەڵاتی دوور پارێزگاری کرد، بەڵام کاتێکە داوای لێکرا خۆی لە کاروبارەکانی ئورووپا هەڵقورتێنێ، هەمووڵایەک باش دەزانن وڵامی ژاپۆن چیبوو.") هەمووی سیاسەتمەدارانی ئەورووپی، کاتێکە کەوتنە ناو شەڕی مان یان نەمان، دەیانزانی کە هۆی دەستێوردانی ژاپۆن لە ئورووپا چیە. پێوەندیەکان لەلایەن هەستکەرانی ئاشتیەوە کە ئەڵمانیا بۆ ژاپۆنی ناردبوون باشتر نەبوون. هەرچەند ژاپۆنیەکان وڵامی ئەوانیان نەداوە، هەستێکە درووست بوو بریتی بوو لە هاوپەیمانیەک کە پشتی پێ نابەسرێت. هێزی دەریایی بەریتانیا سەبارەت بە شەڕێکی داهاتوو دژ بە ژاپۆن ڕاما.٧٢٨

کەچی سەرەڕای ئەمانە، هەڵوێستی فەرمی بەریتانیا لە کۆڕی ئاشتی پاریسدا ئەوەبوو کە لە داواکاریەکانی ژاپۆن پشتگری بکات. ئەندامانی شاندی نوێنەرایەتی بەریتانیا ئەمەیان جوان ڕوونکردەوە کاتێکە ژاپۆنیەکان بەتاسەوە داوای ئەوەیان کردبوو کە ئەرخەیان بکرێنەوە. لەبەرچی بەریتانیا تەنیا ئەوەی دەگوت کە پشتگری لە داواکاریەکانی ژاپۆن دەکات، نەوەک گارانتی کردنی ژاپۆن لەوەکە ئەو ناوچانەی کە بەدواوەیەتی گیر دەکەوێت؟ چون ئەوە هەر ئەو شتەبوو کە

بەریتانیەکان لە ڕێکەوتنێکی نهێنی لە ساڵی ١٩١٧دا بەڵێنیان دابوو. لیۆد جۆرج بۆخۆی گوتبووی کە بەریتانیا حەزدەکات ئەو بەڵێنە هەتا سەر ڕاگرێت.٧٢٩

ویلسۆن هیچ بەهایەکی بە دیپلۆماسی نهێنی نەدەدا و بەجوانی ڕوونی کردبۆوە کە، ئەوەندەی ئەو بزانێت، ڕێکەوتنامەی ساڵی ١٩١٧ تەدارەکێکی نهێنی بوو کە ولاتەیەکگرتوەکانی نەدەگرتەوە. بێجگە لەوە ئەو لەژێر گوشار دابوو تا سەبارەت بە ژاپۆن خۆی قورس و قایم ڕابگرێت و شانی بۆ شل نەکات. هەست و سۆزی دژە-ژاپۆنی لەنێوان جەماوەری ئەمەریکیدا بەهێز بوو، بەشێکی دەگەڕاوە بۆ کۆچکردنی ژاپۆنیەکان، وەک دیاردەیەکی ناخۆش، هەروەها بەشێکی دەگەڕایەوە بۆ بزووتنەوەکانی ئاشتی ئەڵمانی. مەکزیکۆ کێشەیەکی تر بوو؛ ژاپۆن لە شەڕی خوێناوی ناوخۆی مەکزیکدا چەک و تەقەمەنی بە لایەنێک فرۆشتبوو کە زۆربەی ئەمەریکیەکان بە لایەنی پێچەوانەیان دەزانی، و دواتر لە ساڵی ١٩١٧دا، لە هەوڵێکی شپرێودا بۆ مەبەستی ڕاکێشانی ژاپۆن بۆ لای هێزەکانی ناوەندی، وەزیری دەرەوەی ئەڵمانیا، لە تێلیگرامێکی ئابڕووبەرەی زیمێرماندا، داوای لە مەکزیکۆ کردبوو کە بانگێشت لە ژاپۆن بکات  تا دژ بە ولاتەیەکگرتوەکان پێوەندی بە هاوپەیمانانەوە بگرێت. ئەمەش بۆ جارێکی تر، شوێنەوارێکی خراپی دانا. لە کۆتایی شەڕدا، کاتێکە ژاپۆن بە تاسەوتینێکی تایبەتەوە بەرەو سیبیریا دەچووەپێشێ، لەژێر درووشمی دەستدرێژی هاوپەیمانی دژ بە بۆلشویکەکان، ویلسۆنیش وەک کەسانی تر لە ژاپۆنی لاسار و لاپرەسەن قەڵس بوو. ئەو ئێستا لەوە دەترسا کە ئەگەر ژاپۆن کۆنترۆڵی بەسەر دوورگەکانی باکووری ئۆقیانووسی ئارام هەبێت، ئەو ولاتە بە پانتایی ئۆقیانووسی ئارام بەرەو هاوایی زنجیرەیەک بەردەپێی لەسەرێدا دەبێت. ڕاوێژکارانی هێزی دەریایی ئەویان وەخەبەرهێنایەوە کە لەوانەیە لە داهاتوو بنکە و فڕۆکەخانەی ژاپۆنی لەوێ بەدی بکرێت..٧٣٠

لە ٢٧ی مانگی ژانویەی ساڵی ١٩١٩دا، ماکینۆ ڕاگەیاندنێکی بۆ شۆڕای عالی خوێندەوە کە تێیدا ئەو وەبیر بیسەرانی هێنایەوە کە دەرهێنانی دوورگەکان لەچنگ ئەڵمانیا چۆن ڕێگەی کەشتیەکانی لە کاتی شەڕدا ئەمن و دوور لەمەترسی ڕاگرتبوو. ئەو وەکوو هەر ئیمپرایالیستێکی تر ڕایگەیاند کە خەڵکانی ناوچەکە خەڵکی سەرەتایین کە تەنیا لە پاراستن و لە چاکەکاری ژاپۆن قازانج دەکەن. ویلسۆن لەسەرخۆ دووپاتی کردەوە کە ئەو یەکەمایەتی بە ماندێتەکان دەدات وەک هەڵوێستێکی دژبەرانە لەبەرانبەر خاوەنداریێتی ڕاستەوخۆدا. ئەو حازر نەبوو کە سەبارەت بە دوورگەکان بەرەنگاری ژاپۆن ببێتەوە، چون لەسەر داواکاریەکانی تری ئەو ولاتە قرەی دەکرد، بۆ وێنە بۆ زێدەمافەکانی ئەڵمان لە چین. ئەو خۆی بەم وتەیە بەرتەسک کردبۆوە کە ولاتەیەکگرتوەکان ناتوانێت ماندێتێکی ژاپۆنی بەسەر یاپدا قەبووڵ

بکات، کە لە کۆتایی ڕۆژئاوای کارۆلین هەڵکەوتووە و بۆ کابلەکانی نێونەتەوەیی پێوەندیەکی سەرەکی بوو. ئەمەریکیەکان بەنیازبوون لە چەند ساڵی داهاتوودا باسی هێنانەژێرڕکێفی سەرتاسەری جیهان هەرتاوناتاوێک بورووژێنن، بەڵام هیچ ئاکامێکیان نەبوو. کاتێکە لە ئاکامدا لە مانگی مەی ساڵی ١٩١٩ ماندێتەکان دابەش کران، ژاپۆن هەمووی ئەو دوورگانەی کە خوازیاری بوو گیرکەوت.٧٣١

لە ساڵانی سەردەمی شەڕدا ژاپۆن هەر ئەوکارەی کرد کە هێزی دەریایی ئەمەریکی ترسی لێی هەبوو. هەرچەند مەرجەکانی ماندێتەکان دامەزراندنی بنکەکانی نیزامی یان درووستبوونی پایەگاکانی قەدەغەن کردبوو، ئەمەیان بۆ نەچوە سەر. هەرچەند بیانیەکان جارلەگەڵ سەردانی دوورگەکانیان بە ئەستەم و دژوار دەزانی، ژاپۆن هێزی نیزامی و کەسانی داگیرکاری خزاندە ئەوێوە. قۆنتەراتچیەکانی ژاپۆنی بەندەری تازە و گەورەیان پێکهانی و تراک، لەناو کارۆلاینەکاندا، گۆڕا و کرا بە بنکەی سەرەکی ژاپۆن لە باشوری ئۆقیانووسی ئارامدا.٧٣٢ لەو شەڕەی کە لەسەرڕێدابوو، ئەو دوورگانەی کە نادیار و شاراوەبوو-تینیان، سایپان، تراک- بوونە گۆڕەپانی شەڕی قورس و گەورەگەورە.

* * * *

ئەوەیکە لە پەیمانی کۆمەڵەی گەلاندا بە "بەندی نابەرابەری ڕەگەزی" ناسرا لە ئاکامدا ئەوەندەیتر ئاڵۆزتر بوو. لە ساڵانی بەرلەشەڕ، بازەرگانانی ژاپۆنی گازندەی ئەوەیان دەکرد کە کاتێکە ئەوان بۆ دەرەوە سەفەر دەکەن بەردەوام سووکایەتیان پێدەکرێت. لە کالیفۆڕنیا، دانیشتوانی ژاپۆنی یەکەمجار مافی زەوی کڕینیان لە دەست دا و دواتریش مافی بەکرێدایینی زەوی و زار، و لە کۆتاییدا مافی پێوەندی گرتنی هاوسەرەکانیان بە ئەوانیان لێ زەوت کرا. لە ساڵی ١٩٠٦دا بۆردی قوتابخانەی سان فرانسیسکۆ دەنگی دا تا منالانی ژاپۆنی و چینی (کە بەگشتی ژمارەیان لە سەد کەس تێنەدەپەڕی) ڕەوانەی کلاسی دەرسی جیاواز بکەن چون لەوانەیە ببنە هۆی ئازار و ئەزیەتی منالانی سپی پێست. کۆچبەرانی ژاپۆنی (و چینی و هێندی) لایان ئەستەم بوو بتوانن بگەنە کانادا و وڵاتەیەککرتوەکان، و نەدەکرا بچنە ناو ئوسترالیاوە. تەنانەت لە سەردەمی شەڕیشدا، کاتێک ژاپۆن وەک هاوپەیمانێکی ئیمپراتۆری بەریتانی کەوتە شەڕەوە، ئەندامانی نەتەوەکەی بەردەوام دەخرانە پەراوێزەوە. حکوومەتی ژاپۆنی قایلکرابوو، ڕازیکرابوو کە لە کۆچبەری کەم کاتەوە، بەڵام لەلایەن ڕای گشتی ناوخۆوە لە گوشار دابوو. لە ساڵی ١٩١٣، بیست هەزار ژاپۆنی لە خپشیان کردیانە هەراوهۆریا کاتێکە وتەبێژێک ڕایگەیاندبوو کە باشتر وایە ژاپۆن لە شەڕ بەشداری بکات

ناکوو ئەوەکە یاساکانی کالیفۆڕنیا لەسەر خاوەنداریێتی زەوی وزار قەبووڵ بکات. لە ساڵی ١٩١٦دا حکوومەت بەپێی پێوەرەکانی ژاپۆن شتێکی بەناوی پەیامێکی ڕوون و ئاشکرا بۆ بەریتانیا نارد: " هەستێکی گشتی پەشیمانی لەناو ئیمپێریەل دایەتدا باوە بەومانایە کە ئێستاش هەستێکی دژە-ژاپۆنی لەنێوان کۆلۆنیەکانی بەریتانیادا باوە." کاتێکە ژاپۆن ئامادە بوو تا لە کۆڕی ئاشتیدا جێی خۆی بکاتەوە، ڕۆژنامەگەلی ژاپۆنی لەخۆشیان کردیانە قرم و قاڵ. سەرنووسەرێک وتی کە " ئێستا کاتی ئەوە هاتوە بەرەنگاری جیاوازی ڕەگەزی جیهانی ببینەوە."٧٣٣

سیاسەتمەدارانی پلەبەرزتر حکوومەتیان ئاگادار کردەوە کە باشتر وایە ژاپۆن بە وردبینیەکی زۆرەوە لە کۆمەڵەی پێشنیارکراوی گەلان نزیک بێتەوە. چووزانی ڕێگایەکی تر نەگرێتەبەر و کارێک بکا کە دۆخی ئێستا وەکوو خۆی هەلگرێت و ژاپۆن لە پلەی دووهەمدا بیلێتەوە؟ تەنانەت بەلێنیەکانی ویلسۆنیش لەبابەت دیپلۆماسی تازەوە گومانیان تێدا بەدی دەکرا. لاوێکی نیشتمانپەروەر لە وتارێکدا کە قرموقالێکی سەیری لێکەوتەوە هێنابووی کە دیموکراسی و بیروباوەڕی مرۆڤدۆستانە هەست و سۆزی جوانیان تێدایە، بەلام وەکوو داردەستێک وان بەدەست ولاتەیەکگرتوەکان و بەریتانیاوە کە زۆربەی سامانەکانی جیهانی پێ کۆنترۆڵ دەکەن. نووسەری ئەو وتارە، شازادە فۆمیمارۆ کۆنەو نوسیبووی کە ئەگەر بێتو ژاپۆن درێژە بە بوونی خۆی بدات، لەوانەیە لە جاران هێرشبەرتر یان دەستدرێژتری لێدەربێت. شاندی نوێنەرایەتی ژاپۆن بۆ مەبەستی وەدرەنگخستنی دروستبوونی کۆمەڵەی گەلان ڕەوانەی پاریس کران، و، ئەگەر ئەوەش جێبەجێ نەبوو، دڵنیابوونایە لەوە کە پەیمانی کۆمەڵەی گەلان تەگەرەیەک لەسەر ڕێگای جیاوازی ڕەگەزیی دابنێت. کۆنەو وەک یاریدەدەری سایۆنژی لەگەڵی چوو. چەند ساڵ دواتر کاتێکە ولاتەکەی ئەو لەگەڵ ولاتەیەکگرتوەکان کەوتە شەڕەوە ئەو کرا بە سەرەک وەزیری ژاپۆن. لە ساڵی ١٩٤٥ بەرلەوەی لەسەر تاوانی جەنگ دادگایی بکرێت ژەوهری خواردەوە.٧٣٤

چون ویلسۆن پێداگری دەکرد کە کۆمەڵەی گەلان دەبێ یەکەمین باس لەناو کۆڕی ئاشتیدابێت، نوێنەرانی ژاپۆنی بە ئەسپایی لەپشت دیمنەکانەوە بۆ بەندی بەرابەری ڕەگەزی کاریان دەکرد. لە سەرەتای مانگی فەوریەدا، ماکینۆ و چایندا هاوسیان بانگێشت کرد، کە وەکوو جاری جاران هاندەر و لەدڵەوەنزیک بوو. ئەو دەیگوت هەمیشە ڕقی لە لایەنگریی ڕەگەزیە و ئەوەی لەدەستی بێت دەی کا بۆئەوەکە یارمەتی ئەوان بات. کاتێکە هاوس دوو ڕۆژ دواتر لەگەڵ بالفۆر کۆبۆوە، ئەو کەمتر گەشبین بوو. نوێنەری بەریتانی چەندین شێوەی داڕشتنی تاقی کردبۆوە بەلام کێشەکە لەوەدابوو کە ژاپۆنیەکان بەتەواوەتی شێوەی داڕشتنی ئازارشکێنیان نەدەویست، کەچی بۆ کەسانیتر-بۆوێنە، بۆ

ئوستراليايەكان- هەرجۆرە ئاماژەیەكی ڕەگەزی ناپەسەند بوو. بالفۆر هەر ئەو بالفۆرە بێ لایەنەی جاران بوو: ئەو لای وابوو بیرۆكەی هاوچەشن درووستبوونی مرۆڤەكان شتێكی سەرنجڕاكێش و باشە بەڵام باوەڕی پێی نەبوو. زەحمەتە بڵێین مرۆڤێک لە ئەفریقای ناوەندی وەكوو مرۆڤێكی ئەورووپی وایە. بێجگە لەوە ئە هاوسی ئاگادار دەكردەوە كە خەڵكی وڵاتیەكگرتوەكان و ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا بەندی پێشنیاركراویان وەک یەكەمین هەنگاو بۆ ناياسایی كردنی گوشارەكانی سەر پەنابەرێتی ژاپۆنیەكان دەبینی. هاوس لە وڵامدا وتی كە ئەو لەمە ئاگادارە بەڵام ژاپۆن كێشەی زۆربوونی حەشیمەتی هەیە. ئەو لە درێژەی باسەكانیدا هیوای خواست كە ئەوان بتوانن هەموویان پێكەوە بچن بۆ سیبیریا-یان برازیل.٧٣٥

لە كۆمیسیۆنی تایبەت بە كۆمەڵەی گەلان، ماكینۆ و چایندا ژیرانە دەورووبەری خۆیان لەوەتێگەیاند كە ئەوان خەریكن لەسەر بەندێک كار دەكەن كە ، لەكاتی گونجاو لە داهاتوودا، دەیخەنە بەردەم و پێشكەشی دەكەن. لە ١٣ی مانگی فەوریەدا، كاتێكە یەكەمین ڕەشنووسی پەیمانەكە خەریک بوو دەخوێندرایەوە، ماكینۆ ڕاگەیاندنێكی دوورودرێژی خوێندەوە. ئەو ئارەزووی دەكرد بەندی " ئازادی ئایین" بگۆڕێت و ڕاستی كاتەوە، كە لەلایەن ئەندامانی كۆمەڵەی گەلانەوە بەڵێنێكی لەخۆگرتبوو كە دژ بە هیچ كەسێک لەچوارچێوەی دەسەڵاتی یاسایی خۆیاندا لەسەربنەمای بیر، باوەڕ و ئایین جیاوازی نەنێنەوە. ئەو ڕاستكردنەوەكەی خۆی خوێندەوە:

بەرابەری نەتەوەكان وەک یاسایەكی سەرەكی كۆمەڵەی گەلان حەسابی بۆدەكرێت، پارتە مەزنەكانی گرێبەستوو ڕێكەوتوون لەسەر ئەوەكە، هەتابۆیان دەكرێ، لەگەڵ هەمووی ئەندامانی نەتەوە جیاوازەكانی كۆمەڵەی گەلان لە هەموو بوارێكدا وەكوو یەک هەڵس و كەوت بكرێت، و لەسەر حیسابی ڕەگەز یان نەتەوایەتی، چ لەڕوی یاساوە و چ لەڕووی حەقیقەتەوە، وەک یەک حەسابیان بۆبكرێت.

ماكینۆ لەوەتێگەیبوو كە مێشک تەسكی ڕەگەزایەتی لق و پۆپی بە دەورووبەری خۆیدا بە چڕوپڕی هاویشتبەوە، بەڵام ئەوەیكە گرەنگە ئەوەیە كە یاساكە پەسەند بكرێت و دواتر ڕێگە بدرێ بە نەتەوەكانی بەتاكی لەسەر سیاسەتی خۆیان بەتێروتەسەلی كاربكەن. ئەوان هەر هەموویان نیازیان وابوو چاو بۆ یەكتر بگێڕن. داواكردن لە هاونیشتمانانی وڵاتێک بۆ ئەوە كە قوربانی بدەن، یان ئەگەر دەكرێ تەنانەت گیانی خۆشیان بخەنە مەترسیەوە، بۆ كەسانێک كە وەک یەک لەگەڵیان هەڵس و كەوتیان نەدەكرد، كارێكی بێ ئەقڵانە و دوور لە یاساكانی ژیربێژی بوو. لە شەڕی گەورەدا، ڕەگەزە جیاوازەكان شان بە شانی یەک شەڕیان كردبوو: " پەیوەندیەكی هاوبەشی هاوسۆزی و هاوخەمی درووست ببوو كە پێشتر نموونەی وا ڕووی نەدابوو."

ئەوە ڕاگەیاندنێکی بزوێنەر و لیبڕاڵ بوو، و هیچ جۆرە جیاوازیەکی درووست نەدەکرد. سێسیل، کە لەبەرژەوەندی بەریتانیا قسەی دەکرد، وتی کە، سەد مەخابن، ئەمە بابەتێکی یەکجار قڕاوی و ئاڵۆز بوو. پێشتر لەناو شاندی نوێنەرایەتی ئیمپڕاتۆری بەریتانیا ببوە هۆی نانەوەی گێرەوکێشە. ئەو وای بە باشتر دەزانی کە کێشەکە بەگشتی بۆ کاتێکی تر لە داهاتوو دابنێت. هەست بە مرەمرێک دەکرا کە گوایە ڕازی بووبێتن. ڤینەزۆئلایەکان پێشنیارێکی بەکەڵکیان پێشکەش کرد کە بەشکەم ئەوان لە سەر ئازادی ئایین بەندێکی گشتی دابنێنن، چون ئەوەش بۆخۆی تەوەرێکی ئاڵووساکاو بوو. ئەمە ڕەخنەیەکی توندی لەلایەن نوێنەری پۆرتەغالی بەدواوە بوو، کە ئەویوت حکوومەتەکەی ئەو قەت گرێبەستێکی واژۆ نەکردوە کە ناوی خوای نەهێنابێت. سێسیل، بەشۆخیەوە، لە وڵامدا وتی کە ئەم کەڕەتە ئەوان هەرهەموویان پێویستە لەو دەرفەتە کەڵک وەرگرن. ڕەشنووسێک کە ئێستا پێشکەش بە دانیشتنێکی گشتی کۆڕی ئاشتی کرابوو تا باسوخواستی لەسەر بکەن هیچ جۆرە ئاماژەیەک بە بەرابەری ڕەگەزی یان ئایینی تێدا بەدی نەدەکرا. ژاپۆنیەکان سووربوون لەسەر ئەوە کە بۆ جارێکی تر باسەکە بوروژێنن.٧٣٦ ڕۆژی دواتر، ١٤ی مانگی فەوریە، ویلسۆن بۆ وڵاتەیەکگرتوەکان گەڕایەوە، و کۆمەڵەی گەلان بە لایەکدا کەوت.

لە هەرحاڵدا بەندی بەرابەری ڕەگەزی خەریک بوو سەرنجی جەماوەری بەلای خۆیدا ڕادەکێشا. لە ژاپۆن کۆڕوکۆبوونەوەی گشتی بەڕێوەچوو تا "ئەو نیشانەی شەرمەزاریە بسڕنەوە". بەدرێژایی کەنار ئاوەکانی ڕۆژئاوای وڵاتەیەکگرتوەکان ڕێبەرانی سیاسی هۆشداریان دەدا کە ئەگەر بێتو بەندەکە پەسەند بکرێت ئاکامی دڵتەزێنی بۆ سپی پێستەکان لێدەکەوێتەوە. لیۆد جۆرج ئاماژەی بەوەکرد کە بێجگە لەمانە ئەو بەندە، کە لێکتێنەگەیشتنێکی تری هاوبەشی دووپات دەکردەوە، جیاوازیەکی لێدەکەوێتەوە کە ژاپۆنیەکانی دانیشتووی وڵاتانی وەکوو ئوسترالیا و وڵاتەیەکگرتوەکان لە سایەیدا چەوسابوونەوە.٧٣٧

لە ساتە هەرە باشەکانیشدا ژاپۆنیەکان پاڵپشتیەکی ساردیان لە پاریسەوە لێدەکرا. چینیەکان، کە هاونیشتمانیەکانیان لە جیاوازی هاوچەشن ئازاریان دەچەشت، هەستیان دەکرد کە پێدەچێ دەنگ بە بەندەکە بدەن بەڵام، وەک نوێنەرێکی چینی بە ئەمەریکیەکی ڕاگەیاندبوو، ئەوان زۆرشتیان لەبەردەست دابوو کە دەبوایە نیگەرانی بوونایە- بەتایبەت، داواکاریەکانی ژاپۆن لە چین. ویلسۆن نەدەبوو کەمتەرخەمی ڕای گشتی ناوخۆی وڵات بوایە، و ئەو خەریک بوو لەبابەت ژاپۆنیەکانەوە گومانی لە دڵدا درووست دەبوو. ئەو بە یەکێک لە کارناسەکانی خۆی ڕاگەیاند کە هەرچەند ئەو پێشتر باوەڕی پێیان هەبوو "لەڕاستیدا ئەوان پەیمانێکە لەگەڵ سیبیریا بەستبوویان

پێشکێشیان کردبوو." بێجە لەوانە، ویلسۆن بۆخۆی بەتایبەت کاتێکە باسی ڕەگەز دەهاتە ئاراوە خۆشحاڵ نەدەبوو. ئەو لە هەرحاڵدا باشووری بوو و هەرچەند بۆ هەڵبژاردنی سەرەک کۆماری لە یەکەمین کەمپەینی خۆیدا هانای بردبۆوە لای ڕەشپێستەکان تا دەنگی پێبدەن، کاتێکە کابینەی گرتە دەست هیچی بۆ ڕەشپێستەکان نەکرد و ڕێگەی نەدا بە هێزەکانی شەڕکەری ڕەشپێست شان بە شانی ئەمەریکیەکان لە شەڕدا بەشداری بکەن، وای بە مەسلەت دەزانی کە لەژێر دەسەلاتی فەرەنسەیەکاندا بیانهێڵێتەوە.٧٣٨

دژایەتی هەرە قورس لەبەرانبەر بەندی بەرابەری ڕەگەزی لەلایەن شاندی نوێنەرایەتی بەریتانیاوە سەرچاوەی دەگرت، بەتایبەت لەلایەن بیلی هاچێزەوە. وەکوو زۆربەی هاونیشتمانیەکانی خۆی، هاچێز بەتوندی لەسەر ئەم باوەڕە بوو کە ئەو بەندە یەکەمین کەلێنێک بوە کە لە بەربەستێک کە پارێزگاری لە ئوسترالیا دەکات دروست بوە. یەکێک لە ژێردەستەکانی ئەو لە پاریس نووسیبووی کە " هەر حکوومەتێک کە بیهەوێت لە ئوسترالیای سپی پێست خۆهەڵقورتێنێت و دەستکاری بکات سێ ڕۆژ دەوام ناهێنێت. هەڵوێستێک کە دەگرترێتە بەر لە دوو حاڵەت بەدەر نیە یان پێشنیارەکەی ژاپۆن مانادارە یان بێ مانایە: ئەگەر یەکەمینە، بڵێ تابزانم چیە؛ ئەگەر دووهەمینە، ئەی پێشنیارت لەپای چی؟"

هاچێز هیچ کام لەو سازشانەی قەبووڵ نەدەکرد کە هاوس پێشکەشی کردبوون. ئەو بەپەلەوەهەلە نووسیبووی کە " لەوانەیە ئەمە شتێکی باش بێت، بەلام زۆر زووتر لەوە کە تەئکیدی بکەم بە ڕووت و قووتی بەپێیان دەچم بۆ سین- یان فۆلیس بێرگێریس-." ماسەی نیووزیلەند بەدەم ئاگاداریەکەی هاچێزەوە هات.٧٣٩ ئەمە بەریتانیای خستە هەل ومەرجێکی ناخۆشەوە. ئەوان زۆر خوازیاری ئەوەبوون کە بە هاوپەیمانێتی لەگەڵ ژاپۆن درێژەبدەن بەلام، ئەم جارەش، دەبوایە ئاگایان لە ناوچە بندەستەکانی خۆیان بوایە.

لەو دەمەیدا کە ویلسۆن لەگۆڕێدا نەبوو و لە ولاتەیەکگرتوەکان بوو، بەریتانیەکان بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە ئەوەی کە لەدەستیان هات کردیان. فەرەنسەیەکان، کە هیچیان نەبوو تا بیدۆڕێنن، بە خۆشیەوە سەیریان دەکرد. بۆردێن و سمووتس لەنێوان هاچێز و نوێنەری ژاپۆنی هەر هاتووچۆیان بوو. ئەوان بۆ ماکینۆ و چایندا پلانێکیان ڕشت تا چاویان بە هاچێز بکەوێت. (سایۆنژی، وەکوو جاران هەر دوورەپەرێز خۆی ڕاگرت.) ژاپۆنیەکان لایان وابوو کە هاچێز "ڕەشۆکیە"؛ ئەو گلەیی دەکرد لەوەکە ئەوان " بە کڕنۆش کردن و ڕاگرتنی دڵی من منیان فریو داوە". ئوسترالیایەکە بە مەرجێک بەندەکەی قەبووڵ دەکرد کە ئەوەی تێدا هاتبێت کە لەسەر

سیاسەتەکانی کۆچبەری نیشتمانی هیچ کاریگەریەک دانەنێت. نۆبەی ژاپۆن بوو کە بەرەنگار بێتەوە. ماکینۆ و چایندا بەردەوام داوای یارمەتیان لە هاوس دەکرد، بەڵام ئەوان دەستیان لە هەمبانەوە دەرچووبوو.

هاوس ئامادە نەبوو بۆ شتێک خەبات بکات کە بەدڵنیاییەوە لە ولاتەیەکگرتوەکان نائاسایی بوو. لە نهێنیدا، ئەو خۆشحاڵ بوو بەوە کە ڕووی ڕەخنەکان لە بەریتانیەکان بوو. " زیرەکی و وورییایەکی زۆری ویستوە تا توانیومانە بارەکە لەسەر شانی خۆمان لابەرین و بیخەینە سەر شانی بەریتانیەکان، بەڵام بەختەوەرانە، ئەوەی کە دەبێ بکرێ کراوە."٧٤.

نوێنەرانی ژاپۆنی، لەژێر گوشاری تۆکیۆدا، بڕیاریان دا کە شان بە شانی بەندەکە بەرەو پێشەوە بڕۆن. وەک چایدا وتی، شکستێک لانی کەم بە جەماوەرەکەی خۆیان نیشان دەدات کە ئەوان هەوڵیان داوە. لە ١٠ی مانگی ئاڤریلدا، لە کۆبوونەوەیەکی کۆمیسیۆنی تایبەت بە کۆمەڵەی گەلان، ژاپۆنیەکان ئاشکرایان کرد کە ئەوان ڕۆژی دواتر ڕاستکردنەوەکەی خۆیان پێشکەش دەکەن. کوڕەزای هاوس، گۆردۆن ئۆچینکلۆس، وتبووی کە ئەوان ئەوەندە پەکیان خستۆتەوە کە بوە بە بنێشتەخۆشەی سەرزاران و هەرکەس هەڵدەستێت شۆخی پێدەکات. لە ١١ی مانگی ئاڤریلدا، کۆمیسیۆن تا درەنگانی ئێوارە دانیشتن، لە هەوڵی ئەوەدابوون تا فۆرمولێک بدۆزنەوە تا ڕێگە بە ولاتەیەکگرتوەکان بدات دۆکترینی مۆنرۆ هەڵبگرێت و پێوەندی بە کۆمەڵەی گەلانەوە بگرێت. کاتێکە ژاپۆنیەکان کەوتنە جموجۆڵ و لە ئاکامدا ڕایانگەیاند کە دەبێ بەرابەری ڕەگەزی لە پێشەکی پەیماننامەکەدا ئاماژەی پێبکرێت هێزی ئەژنۆی لە هەموان بڕی. ئەوان تا ئەو کاتە پێشنیاری سەرەکی خۆیان جوان ڕاستەوپاستەکردبوو تابەڵکوو بەندەکە بەئاسانی داوای " یاسای بەرابەری نەتەوەکان و پێچارینی دادپەروەرانەی هاوولاتانی ئەوان" بکات. ماکینۆ و چایندا هەرکیان بەنەمی و لەسەرەخۆ قسەیان دەکرد. ئەوان توانیان کاریگەریەکی باش دابنێن. یەک بەدوای یەک نوێنەرانی تری کۆمیسیۆن- ڤێنەزۆلائیەکان، ئۆرلاندۆ، وێلینگتۆن کوو لە چین، نوێنەرانی فەرەنسە، بۆرژوایەکان و لارنۆدێ، و سەرەک وەزیری چکسلەواکیا- لە بەرژەوەندی ڕاستکردنەوەکە قسەیان کرد. سێسیل کە زۆر لە نارەحەت دەهاتە بەرچاو بەکورتی ئاماژەی بەوەکرد کە ئەو ناتوانێت پاڵپشتی لەوە بکات، دواتر بە چاوای شۆڕەوە بە نارەحەتیەوە دانیشت.

هاوکات کە کەسانیتر قسەیان دەکرد، هاوس بەپەلە یاداشتێکی بۆ ویلسۆن نووسی، کە کۆڕەکەی سەرۆکایەتی دەکرد: " کێشەکە لەوەدایە کە ئەگەر بێتو کۆمیسیۆن ئەوە پەسەند بکات، بەدڵنیایەوە کێشەی ڕەگەز لە سەرتاسەری جیهاندا دەورووژێنێت." ویلسۆن دەیزانی کە

هەر ئاماژەیەک بە بەرابەری ڕەگەزی سیاسەتمەدارانی هەڵکەوتە لە کەنارئاوەکانی ڕۆژئاوا دەتارێنێت، و ئەو بۆ تێگەیاندنی کۆمەڵەی گەلان لە کۆنگرێس پێویستی بە دەنگی ئەوان هەبوو. ئەو ژاپۆنیەکانی هاندا تا لە ڕاستکردنەوەکەی خۆیان پشگەز ببنەوە. ئەو ئاماژەی بەوەکردکە هەراوهۆریاسازکردن سەبارەت بە مێشکتەسکی ڕەگەزی هەڵەیەکی تەواو هەڵەیە. ئەوە تەنیا گڕی ئاورەکان بەرزتر دەکاتەوە و لە ئاکامیشدا دەبێتە هۆی بریندارکردنی کۆمەڵەی گەلان. هەموولایەک لەناو ژوورەکەدا دەیانزانی کە کۆمەڵەی گەلان لەسەر بنەمای بەرابەری نەتەوەکان بوو. پێویست بە وتنی شتی زیاتر لەوە نەبوو. ئەو لە چوارچێوەی دۆستایەتیەکی هەرەنزیک و پاکدا لەگەڵ ژاپۆنیەکان قسەی دەکرد. ئەو دەیزانی کە ئەوان نیازێکی پاکیان لەدڵدایە، بەڵام ئەو هەستی دەکرد کە بەئەرکی دەزانێ ئاگاداریان کاتەوە کە ئەوان بەهەڵداچوون و ڕێگەی دروستیان لێ بزر بوە.

نوێنەرانی ژاپۆنی پێداگریان لەسەر دەنگێک دەکرد. دوائەوەیکە زۆرینەیەکی بەرچاو دەنگیان بە ڕاستکردنەوەکە دا، ویلسۆن، بە کارامەیەک کە بێ گومان وەک سەرۆکێکی زانکۆ فێری ببوو، ڕایگەیاند کە چون ڕەخنەی توند لە ڕاستکردنەوەکە گیراوە لەوەناچێت سەربگرێت. ژاپۆنیەکان بڕیاریان دا بەرەنگاری ئەم حوکمە گوماناویە نەبنەوە و هەربۆیە بەندی بەرابەری ڕەگەزی نەکرا بە بەشێک لە پەیماننامەکە.٧٤١

چاپەمەنیەکانی ژاپۆن بەتوندی ڕەخنەیان ئاراستەی " جیهانی بەناو شارستانی کراو" کرد. ژاپۆنیە لیبراڵەکان، ئەوانەی کە لە ئاستی جیهانیدا ناسراو بوون، ترس دایگرتن. یاریەکە ئەوان کردبویان، ئەوان ئامادەبوونی خۆیان نیشان دابوو تا لە کۆمەڵگای نێونەتەوەییدا بەشداری بکەن، و هێشتا بەسەر ئەوەشدا ئەوان وەک چینی خوارەوە سەیر دەکران. ماکینۆ لە کۆبوونەوەیەکی گشتی کۆڕی ئاشتیدا لە ٢٨ی مانگی ئاڤریل هۆشداری دا کە ئەگەر بێتو نەتەوەکان وەک یەک و دادپەروەرانە هەڵس و کەوتیان لەگەڵ نەکرێت لەوانەیە چیتر هیوایان بە ئەو یاسایانە نەمێنێ کە کۆمەڵەی گەلانی ڕێنوێنی کردوە. " من لەوە دەترسم کە ئەم شێوە بیرکردنەوە بۆ ئەو پێکەوەسازان و هاریکاریە زیان بگەیەنێت، کە تەنیا هەر لەسەر ئەبنەمایە کۆمەڵەی گەلان دەتوانێ دوور لە هەر مەترسیەک بناخەی بڕێژرێت." ئەو ڕاستی دەکرد. شکستخواردن لە مسۆگەرکردنی بەندی بەرابەری ڕەگەزی لە ساڵانی سەردەمی شەڕدا هۆکارێکی گرنگ بوو لە دوورخستنەوەی ژاپۆن لە هاریکاری کردن لەگەڵ ڕۆژئاوا و بردنی ئەو وڵاتە زیاتر بەرەو سیاسەتەکانی هێرشبەرانەی ناسیۆنالیستی.٧٤٢

هەرچەند دەبێ ئەوەش بڵێین کە لە ماوەیەکی کورتدا ژاپۆن توانی ئەو شکستە لە قازانجی خۆی بگۆڕێت. ویلسۆن لە کۆتایی مانگی ئاڤریلدا لە گوازرشەکەی خۆی بۆ ئاشتیکەرانی هاوڕێی هێنابووی کە " ژاپۆنیەکان بەهەموو ڕێز و ئەدەبی ڕۆژهەڵاتی خۆیانەوە بە منیان ڕاگەیاند کە ئەگەر بێتو ئێمە لەم بەندە لە گرێبەستەکەدا لایەنی ئەوان نەگرین، ئەوان ناتوانن گرێبەستەکە واژۆ بکەن." لیۆد جۆرج لەسەرەخۆ و نەترس هاتەبەرچاو. کلیمینجوو درێژەی دایە وتی کە " خۆشەویستان! خۆشەویستان ئەگەر ئەوە زیاتر لەوە عاجزتان ناکات، لەوەناچێت من لە ئێوە عاجزتر بم." ئەوەی ڕاستی بێت ئەوان هەرهەموویان دڵەڕاوکێیان هەبوو. کۆڕەکە نەیدەتوانی لەگەڵ هەڵگەڕانەوەیەکیتر هەڵبکات. ویلسۆن، کە لە ڕزگارکردنی کۆمەڵەی گەلان هیوابڕ کرابوو بەڵام نەیدەتوانی بەندی بەرابەری ڕەگەزی قەبووڵ بکات، ئێستا لەگەڵ بەشینی شتێک بە ژاپۆن ڕووبەڕوو ببۆوە کە لە چین بۆخۆی خوازیاری بوو. ئەوەیکە پێگەی ئەوی زۆر دژوار کردبوو ئەوەبوو کە چینیش حاڵەتێکی زۆر ناخۆشی هەبوو.٧٤٣

# ٢٤

# ئەو خەنجەرەی کە بۆ ناو دڵی چین داهێنرایەوە

کاتێک هەواڵی کۆتایی هاتنی شەڕی گەورە گەیشتە وڵاتی چین، حکوومەت پشوویەکی سێ ڕۆژەی ڕاگەیاند. شەست هەزار کەس، زۆربەی ئەوانە خوێندکارانی ناسیۆنالیست و مامۆستاکانیان، بۆ بەڕێوەبردنی ئاهەنگی سەرکەوتنی پەکینگ وەدەرکەوتن. بۆ خۆشی جەماوەر پەیکەرێکی یادگاری لەلایەن حکوومەتی قەیسەرەوە بۆ ئەڵمانیەک داندرا کە لەسەردەمی سەرهەڵدانی بۆکسێردا کوژرابوو سەرهەڵدانێک کە دوو دەیە پێشتر سەرکووت کرابوو. چاپەمەنیەکانی چین پڕبوون لەو وتارانەی کە باسی سەرکەوتنی دیموکراسیان بەسەر زۆرداری دەکرد و پڕ لە سۆزوخۆشەویستی سەبارەت بە چاردە خاڵەکەی ویلسۆن. بەتایبەت لەنێوان چینیەکاندا، بەسەر دیموکراسی ڕۆژئاوادا، بیروباوەڕەلیبراڵەکانی ڕۆژئاوا و ڕەچاوکردنی ڕۆژئاوا سەیر هەڵدەکوترا. هاوڕێ لەگەڵ ئەوانە زۆربەی چینیەکان بەهیوابوون کە ئاشتی بتوانێت کۆتایی بە دەستێوەردانی زلهێزان لە کاروبارەکانی چین بهێنێت.

لە هاوینی ساڵی ١٩١٧دا چین دژ بە ئەڵمانیا شەڕی ڕاگەیاندبوو و لەپێناو سەرکەوتنی هاوپەیماناندا یارمەتیەکی باشی دابوو. قۆرتەکانی بەرەی جەنگی ڕۆژئاوا پێویستیان بە ڕێژەیەکی یەکجار زۆر هەڵکەندن و پاراستن هەبوو. تا ساڵی ١٩١٨ نزیک بە ١٠٠،٠٠٠ کرێکاری چینی بە کەشتی حەواڵەی فەرەنسە کرابوون، ئەو شوێنەی کە ئەوان سەربازانی بەنرخی هاوپەیمانیان ڕزگار دەکرد تا دژ بە ئەڵمانیەکان ڕێگەی هێرشێک خۆش بکەن. زۆربەی چینیەکان لەڕێگەی بۆمبا و نەخۆشیەوە تیاچوون. کاتێکە ژێر دەریایەکانی ئەڵمانی کەشتیەکی فەرەنسەییان لە مەدیتەرانە نووقمی ئاوکرد زیاتر لە پێنج سەد کەس کەوتنە ناو ئاو و خنکان.

پەیاکردنی کرێکار بۆ شەڕکردن تا پەیاکردنی دیپلۆماتی ئەزمووده بۆ ئاشتی بۆ چین ئاسانتر بوو. پەکینگ وەزارەتی دەرەوەی خۆی لە باشترین بلیمەتەکانی خۆی بێ بەش کرد، و باڵوێزەکانی

خۆی لە واشنگتۆن، برۆسێل و لەندەن و وەزارەتی دەرەوە بانگێشت کرد. شاندی نوێنەرایەتی نە سەرەک کۆماری چین و نە سەرەکوەزیری ئەو وڵاتەی لەخۆ دەگرت، زیاتر بەهۆی ئەوەوە بوو کە کەش و هەوای سیاسی چین ئەوەندە ئاڵۆز و ترسناک بوو کە هیچ کامیان نەیاندەوێرا لەوێ بچنەدەرێ. لەبەرانبەردا چەندین ڕاوێژکاری دەرەوەی بەکرێ گرتبوو کە بە قەرار دەبوایە وڵاتی چینیان بۆ دەرەوە و بەباری پێچەوانە ڕوون کردایەتەوە. (حکوومەتی ئەمەریکی، کە هیواداربوو لە پاریس دەڵاڵێکی سادق بێت، بە هیچ یەک لە هاووڵاتیانی خۆی ڕێگەی نەدەدا کە بۆ چینیەکان کاربکەن- لانی کەم لەڕووی فەرمیەوە ڕێگەیان نەبوو.)

گرووپێکی شەست کەسی چینی و پێنج ڕاوێژکاری بیانی هاوڕێیان کە لە ئاکامدا لە لە پاریس لە هۆتێل لۆتێتیا کۆببوونەوە نموونەیەک بوون لە خودی چین، لەنێوان کۆن و تازەدا، باکوور و باشوردا، و هاوڕێ لەگەڵ کاریگەریەکی قورسی دەرەوە بەبێ ئارامی لەنگەریان دەگر. ئاشکرا نەبوو کە ئەوان نوێنەرایەتی چیان دەکرد، چون چین خەریک بوو پارچەپارچەدەبوو. هاوکات کە گرووپێک سەرباز و لایەنگرەکانیان پایتەخت، پەکینگ، و باکووری چین،یان خستبوە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان گرووپێکیتر لە باشوور، لە کانتۆن، حکوومەتێکی سەربەخۆیان ڕاگەیاندبوو. تەنانەت کاتێکە کۆڕی ئاشتی پاریس کۆڕیان دەبەست و کۆدەبوونەوە، کۆڕێکیتری ئاشتی خەریک بوو لە شانگهای بەڕێوە دەچو تا بکەوێتە هەوڵ و هەردوو حکوومەتەکە پێکەوە ئاشت کاتەوە. شاندەکە لە پاریسەوە لەلایەن هەردوولاوە هەڵبژێردرابوو و ئەندامانی ئەو شاندە متمانەیان بە یەکتر یان حکوومەتی ناوی خۆیان لە پەکینگ نەبوو.

ڕێبەری ئەو شاندە، لوو زێنگخیانگ، پیاوێک لە کۆتایی چلەکانی تەمەنیدا، چاکی بۆچوبوو کە چین جلۆن گۆڕانکاری بەسەردادێت. ئەو لە شانگهایەوە هاتبوو، بەندەرێکی گەورە کە لەژێر کاریگەری تجارەتی و وەبەرهێنانی ڕۆژئاوادا گەشەی سەندبوو. باوکی ئەو، مەسیحیەک، بۆ مۆژدەدەرانی دەرەوە کاری دەکرد و ئەویان بۆ ئەو قوتابخانە ناردبوو کە بەشێوازی ڕۆژئاوا دروست کرابوون، ئەو شوێنانەی کە ئەو زمانەکانی بیانی لێ فێربوو، نەوەک زمان ووێژەی چینی کە چەندەها بەرە لە کوڕانی چینی فێریببوون.٧٤٤ وەها پیاوانێک لای بەرەی پێشووی توێژەران بە لادەر یان مۆڕتەد ناسرابوون (ڕۆژئاوایەکان ناویان نابوون مەندەرینەکان)، کە بۆماوەی چەندین سەدە ڕێبەرایەتی چینیان کردبوو. ئەم توێژەرانە مێشکی تایبەتیان هەبوو کە زۆربەی ڕۆژئاوایەکان هەر نەیاندەزانی دەڵێن چی؛ کۆنترۆڵی تەواویان بە سەر خۆیاندا هەبوو و لە کردەوەدا بێ غەل و خەوش

بوون. باپیرانی ئەوان بۆماوەی چەندین سەدە حاکمڕانێتی چینیان کردبوو، بەڵام هەمووی توانایەکانی ئەوان لەبەرانبەر چەک و تەقەمەنی و کەشتیەکانی هەڵمی ڕۆژئاوای هێرشبەر هەرهیچ نەبوون.

لوو لە سەردەمێکدا گەشەی کردبوو کە شارستانیەتی کۆن خەریک بوو لەبەرانبەر شەڕێکی دۆڕاوەدا دژ بە هێزەکانی گۆڕانکاری دەجەنگی. چینیەکان وڵاتەکەی خۆیان ناونابوو شانشینی ناوەڕاست- "ناوەڕاست" نەک لە گرنگایەتیدا بەڵکوو چون لە ناوەڕاستی جیهانی ناسراودا هەڵکەوتبوو. کاتێکە یەکەمین ڕۆژئاوایەکان- "ڕەشوورووتە قژ درێژەکان"- لە لەوەڕگاکانی چین سەریان هەڵێنابوو، زیاتر لە شوێنەوارێک کە مێشوولەیەک لەسەر فیلێکی دادەنێ هیچ شوێنەوارێکیان پاش خۆیان دانەنابوو. بەڵام لە سەدەی نۆزدەهەمدا ناوچەکانی دەوروبەر لە ناوەندی وڵات دەستیان کردبوو بە نانەوەی ئاڵۆزی و پشێوی ، فرۆشتنی تریاک، دەستێوەردان لە کاروباری تاجرانی ئەوێ، لە مۆژدەدەرانی ئەوێ و لە بیروباوەڕەکانی ئەوێ. چینیەکان بەرەنگار ببوونەوە، چەندین کەڕەت تووشی شکست هاتبوون. تاکۆتایی ئەو سەدەیە، حکوومەتی چینی کۆنترۆڵی کاروباری ماڵی خۆی و لیستەی نرخی تایبەت بەخۆی لەدەست دابوو، و وڵاتی چین بە ناوچەی گەمارۆدراوی بیانیەکان، بەندەرەکان، ڕێگاکانی شەمەندەفەڕ، کارخانەکان و کانزاکان داپۆشرابوو، و هێزە بیانیەکان پارێزگاریان لێدەکردن. هێزە گەورەکان عەبای دوولەسنوورەکانی وڵاتیان بەسەر بندەستەکانی خۆیاندا دادابوو بەومانایە کە یاساگەلی چینی و دادوەرانی چینی زۆر خێڵەکی و سەرەتایین کە ناتوانن لەگەڵ بەرهەمەکانی شارستانیەتی ڕۆژئاوا هەڵس و کەوت بکەن. تەنانەت ئەوترا کە سەردەرگای چوونە ناو ژوورەوەی پارک لە ناوچەی ژێردەسەڵاتی بیانیەکان لە شانگهای نووسرابوو کە "سەگ و چینی بۆیان نیە بێنە ژوورەوە." هەر لەو سەردەمەوە چینیەکان لە هەوڵی ئەوەدابوون کە لەگەڵ بێ ڕێزی و بێ حورمەتی بە دەستووری چەسپاوی جیهانی خۆیان هەڵ بکەن.

بە واتەی بیرکارێکی ناسراو و ناوداری چینی کە پرسیبووی" لەبەرچی ئەوان بچووکن و کەچی بەهێزن؟ لەبەرچی ئێمە گەورەین و کەچی کەم هێزین؟" بەرەبەرە، چون خستنەژێرباری مەترسی خووخدەی دووهەزار ساڵە هەروا کارێکی ئاسان نەبوو، چینیەکان دەستیان کرد بە فێربوونی هۆنەر و زانست لە بیانیەکان، قوتابیانیان نارد بۆ دەرەوەی وڵات و لە پسپۆڕانی دەرەوە کەڵکیان وەرگرت. لەڕێگای ئەو مۆژدەدەرانەی کە کۆلیژ و قوتابخانەیان دەکردەوە، لەڕێگای ئەو تاجرانەی کە لە بەندەرە گەورەکانی وەکوو کانتۆن و شانگهای سەقامگیر دەبوون، و کە ڕێگای ئەو چینیانەی کە دەچوون بۆ کاروکاسبی بۆ دەرەوە و دەگەڕانەوە بۆناو خاووخێزانیان، بیروباوەڕ و تەکنیکی تازە ڕوویاندەکردە ناوەوەی وڵات.

لوو هەڵگری ئەم بیرۆکە تازەبوو کە چین پێویستی بەوە هەیە کە هەست بکات کە ئایا زیندوو دەمێنێتەوە یان نا. ئەو چووە ناو خزمەتی دیپلۆماتیکەوە، خۆی لەخۆیدا ئەمە داهێنان بوو، و چەندین ساڵی بەر لە دەستپێکردنی شەڕی گەورەی لە پایتەختێکی ئورووپایی یان شوێنیکی تر دەبردە سەر. ئەو بووە هۆی بێ ئابڕوی، یەکەم جار بە درووستکردنی ژیانی هاوسەری لەگەڵ ژنێکی بلژیکی، دواتر بە تاشینی کەزیەی درێژی خۆی. ئەو جارلەگەڵجار بیروباوەڕی ڕادیکاڵی دەنایەوە، زنجیرەی فەرمانڕەوایی لەبەرهۆی نانەوەی گێرەوکێشە بۆ وڵاتی چین سەرلۆمەدەکرد و پشتگری لە کۆماریەک دەکرد.

کەش و هەوای ناوچین تووش و ناخۆش بوو. هاووڵاتیانی دەرەوە خەریکی چاودێری کردنی ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی خۆیان بوون: ڕووسەکان لە باکوور، بەریتانیەکان لە دۆڵی یانگتزە (یانگتزە لە دەریای چینەوە تا تبت بەبری ٣،٥٠٠ مایل درێژەی هەبوو)، فەرەنسەیەکان لە باشوور، ئەڵمانیەکان لە دوورگەی شانتۆنگ- و ژاپۆنیەکان لێرە، لەوێ و لە هەموو شوێنێک. ئەو ئەمەریکیانەی کە پێوەندیان نەگرت- بە واتەی ڕەخنەگران بەشێک لە هۆکەی دەگەڕایەوە بۆ ئەوەکە ئەوان خاوەنی هیچ سامانێکی سرووشتی نەبوون- خەیاڵاوی بیریان لە دەرگەیەکی کراوە دەکردەوە کە لەڕێگەی ئەو دەرگایەوە هەمووکەس دەیتوانی چینیەکان هاوچەشن وەک یەک بچەوسێنێتەوە. مەترسیەکە، وەک ناسیۆنالیستەکانی چینی بەڕوونی دەیاندی، ئەوە بوو کە چین بەئاسانی پارچەپارچە دەبێت و گەلی چین و ئەوەیکە لە شارستانیەتی چینی بەجێ مابوو لەناودەچن. ئەگەر بەهۆی ئەو ڕاستیەوە نەبوایە کە لەنێوان هێزەکان لەسەر چلۆن پارچەپارچەکردنی چین وەستانێک هاتە ئاراوە، لەوانەبوو ئەمە لەسەردەمی شەڕی گەورەدا زۆرچاک ڕووی بدایە.

ترس و دڵەڕاوکێی سەرهەڵدانی بیروباوەڕی ناسیۆنالیستی سەردەمیانەی چینی دنەدا. دەستەواژەگەلی وەکوو "مافگەلی شانشاه" و "گەل" لە زمانی چینیدا جێگایان بۆخۆیان کردەوە، کە قەت لەوەپێش هەست بە پێویستبوونیان نەدەکرا. شانۆکان و گۆرانیەکان باسی چینی خەواڵوویان دەکرد کە لە خەو ڕاچەنیبوو و ڕێیی نەیاران کەوتبوو. ڕادیکاڵەکان کۆمەڵەی نادیار و نهێنیان پێکهێنابوو تا زنجیرەی حاکمانی بپسێننەوە، کە ئیستا وەکووڕێگرێک لەبەردەم ڕزگارکردنی چیندا دێنە بەرچاو. یەکەمین بایکۆتەکانی خواردەمەنی لەلایەن دوژمنانی چینەوە هاتنە ئاراوە، و یەکەمین خۆپیشاندانەکان، دوا ساڵی ١٩٠٠ شارە گەورەکانی چینی هەژاند. کۆمەڵێک خۆکوژی نیشتمانی ڕوویاندا. ئەمانە پلانگەلی جەنگی بوون کە نیشانەی لاوازی بوون نەوەک بەهێزیی، بەڵام نیشانەی یەکەمین هاندەرە بەهێزەکان بوون. چینیەکان جارلەگەڵجار زیاتر ژاپۆنیان بە دوژمنی سەرەکی خۆیان دەزانی.

لە ساڵی ١٩١١دا لوو و ناسیۆنالیستەکانی تر بە بەشێک لە ئاواتەکەی خۆیان گەیشتن کاتێکە شۆڕشێک بەبێ خوێنڕێژی دوایەمین ئیمپراتۆر، کوڕێکی هەشت ساڵانی، لەسەر تەخت لابرد. چین کۆماری لێدەرهات زیاتر بەهۆی ئەوەوە کە ڕێکخراوەگەلی سەردەم بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ جیهانی سەردەم بەپێویست زانران. ژمارەیەکی یەکجار کەم لە چینیەکانی دەرەوەی شارەکان وشەی کۆماریان بەگوێ گەیشتبوو. لە گوندەکان و شارۆچکەکانی ناوەوەی وڵات، زۆر لایەن تەنانەت نەشیاندەزانی کە زنجیرەی دەسەڵاتدارێتی کۆتایی پێهاتوە. (ئەوەی ڕاستی بێت، گاردێکی سوور کە لە دەیەکانی ١٩٦٠دا حەواڵەی دارستانە دووردەستەکان کرابوو کاتێکە لەلایەن وەرزێرانی ناوچەوە پرسیاری لێکرا کە " دەکرێ پێمان بڵێی، ئێستا لەسەر تەختی دراگۆن کێ دانیشتوە؟" یەک بەخۆی هەڵبەزیبۆوە.)

لوو هەم وەک وەزیری دەرەوە و هەمیش وەک سەرەک وەزیر سادقانە خزمەتی کۆماری تازەی دەکرد. هەست بە ترووسکەی هیوا دەکرا. ئابووری چین خەریک بوو دەبزووت- لە شارە گەورەکان ئەو شوێنانەی کە پیشەسازیەکان خەریک بوون لە دایک دەبوون. کاتێکە زانستی نوێ تەشەنەی کردە ناو قوتابخانەکان و زانکۆکان، چین دەستی کرد بە وەلانانی هەندێک لە شێوازەکانی کۆن و دواکەوتوو. بەداخێکی زۆرگرانەوە یەکەمین سەرەک کۆماری چین، ژەنەراڵێکی خاوەن شان و شەوکەت بەناوی یووان شیکای، لە جیهانی کۆنەپارێزی دواکەتووەوە سەری هەڵێنابوو.

لەماوەی چوار ساڵی شۆڕشدا، ئەو لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە ئیمپراتۆرێک لەخۆی درووست بکات. هەرچەند بەرلەوەی سەرکەوێت کۆچی دوایی کرد، میراتێکی باشی پاش خۆی بەجێ هێشت: وڵاتێکی دابەشکراو، پەرلەمانێکی لاواز و ناکارامە و، لەهەمووی ترسێنەرتر، کۆمەڵێک سووپای ناوچە کە لەلایەن ژەنەراڵەکانی تایبەت بەخۆیانەوە سەرۆکایەتی دەکران. چینی ساڵی ١٩١٦ خەریک بوو دەچوە ناو سەردەمێکی پڕ لە ئاڵۆزی و پشێوی ناوخۆ و دەسەڵاتی سپاسالاری کە هەتا کۆتایی دەیەکانی ١٩٢٠ هەر درێژەیان هەبوو.

نووسەری گەورەی چینی لوو خوون هاووڵاتیانی خۆی بە خەڵکانێک شوبهاند کە لە ماڵێکدا نووستبێتن کە لە ئاسن درووست کرابێت. ماڵەکە ئاوری تێبەربوە و نووستووانیش مەگین وەخەبەر بێن ئەگینا دەسووتێن و لەبەین دەچن. بەڵام پرسیارەکە ئەمەیە کە ئەگەر لەخەو ڕاچەنن بڵێی بتوانن خۆیان دەرباز بکەن؟ ئایا باشتر وایە لە نەزانییدا بمێننەوە تا قڕیان تێدەکەوێ یان بە ئاگاداربوونی تەواو لە چارەنووسی خۆیان مەرگ هەڵبژێرن؟ بەو هەموو ترس و گومانەوە، لوو خوون و ڕۆشنبیرانی ڕادیکاڵی تری سەردەمی خۆی وەخۆکەوتن تا چین وەخەبەر بێنن. ئەوان بە لابردنی چڵ و چێوی ڕابردوو وەک ئەرک گۆڕانکاریەکەیان خێراتر کرد و چینیەکانیان هان دا تا چاوەڕوانی داهاتوو بن.

ئەوان گوڤارگەلی ساڵانەیان دایەدەرێ وەکوو *لاوانی نوێ* و *شەپۆلی نوێ*. ئەوان شانۆ و چیرۆکی پلارهاوێژی و دەمەلاسکەییان نووسی کە سەرلۆمەی نەریتەکۆنەکانی دەکرد. ڕێبازی ئەوان بۆ چین لەم درووشمەی ژێرەوە بەکورتی باسی کراوە "بەڕێز زانست و بەڕێز دیموکراسی"- زانست بەمانای ژیربێژییە، و دیموکراسی لای ئەوان بە مانای ئەوەبوو کە حکوومەت و خەڵکی پێکەوە گرێ دەدا و وڵاتی چینی بەم شێوەیە بەهێزتر دەکرد. ئەوان بە سەر هاوپەیمانانیاندا هەڵدەکوت و هیواداربوون کە ئەوان هەڵس و کەوتێکی دۆستانەیان لەگەڵ چین هەبوایە، بەگوێرەی یاساکان ڕێبەرانی ڕۆژئاوا لە سەردەمی شەڕدا زۆرجار لەسەر ئەمە ڕۆیشتبوون و دانیان پێدا هێنابوو. شانتوونگ تاقی دەکرایەوە.

* * * *

شانتۆنگ دوورگەیەکی گرداوی، و قەرەباڵغ بوو کە بەرەو باکووری ئۆقیانووسی ئارام دەکشا درووست لەژێر پەکینگەوە و ئاساسیی-لۆراین چەندە بۆ فەڕەنسە گرنگ بوو ئەمیش ئەوەندە بۆ چین. ئەوێ شوێنی لەدایکبوونی کۆنفۆسیۆسی گەورە بوو، کەسێک کە بیروباوەڕەکانی بۆ سەردەمانێکی دوورودرێژ وەک چەسپ وابوو کە وڵاتی چینی پێکەوە دەلکاند و یەکی دەخست. (تەنانەت ئەمڕۆکەش، دوا تێپەڕبوونی چەندین سەدە بەسەر لەدایکبوونیدا، هێشتا بنەماڵگەلێک لە شانگتۆن بەدی دەکرێن کە خۆیان بە لایەنگر و موریدانی ئەو دەزانن.) هەرکەس دەستی بەسەر شانگتۆندا بگرتایە نەک تەنیا فەرمەندەیی ناوقەدی باشوری پەکینگی دەکرد بەڵکوو هەڕەشەیەکیش بوو بۆ چۆمی زەرد و گراند کاناڵ کە دەیتوانی باکوور و باشووری چین پێکەوە گرێ بدات. لای ڕۆژئاوایەکان، ناوی ئەو شوێنە وەبیرهێنەرەوەی قوماشی پەشمی نەرمی ناسراو بوو کە لەوێ درووست دەکرا و، بیرەوەرییەکی ناخۆشی لێ بەجێ مابوو، بەو مانایە کە بنکەیەکی لێبوو کە لەوێوە شەڕکەرانی ڤژدرێژی باکسێر هاتبوون تا ڕاسپاردەیەکە لەسەر شانیان بوو بەجێ بێنن کە بریتی بوو لە بنەبڕکردنی هەمووی ڕۆژئاوایەکان و هەرچی شوێنەواری ڕۆژئاوایە لە وڵاتی چین.

بەدڵنیایەوە پێشبینی ئەوەدەکرا کە لەماوەی هەڵپەهەڵپ کردنی گشتی بۆ بەدەستهێنانی مافی زیاتر و تەشەنەکردن لە چین، شانگتۆن سەرنجی هێزەکانی دەرەوەی بۆلای خۆی ڕادەکێشا. حەشیمەتی سی ملوێن کەسی ئەوێ بازاڕ و کاری هەرزانی پێشکەش دەکرد. ئەوێ خەڵووز و مادەی تری کانزایی هەبوو کە بۆ بەکارهێنان و کەڵکوەرگرتن هاواریان دەکرد. کاتێکە گەشتیارێکی ئەڵمانی بەناوی فێردیناند ڤان ڕیچتهۆفێن سەرنجی قەیسەر و هێزی دەریایی ئەڵمانیای بۆ ئەو ڕاستیە ڕاکێشا کە ئەوێ یەکێک لە بەندەرە سرووشتیە هەرە باشەکانی کەنار ئاوەکانی چینی- لە کیاچۆڤ (ژیازۆڤ) لە بەشی باشووری دوورگەکە- لەخۆگرتبوو ئەوان بەدڵ و بەگیان

کۆیان شل کرد. ئەڵمانیا بەدوای دەسەڵاتێکی جیهانییەوە بوو، و ئەوە لەو ڕۆژگارەدا بەمانای کۆلۆنیەکان و بنکەکان بوو. خواڕاستان، دوو مۆژدەدەری ئەڵمانی لەناو ئاڵۆزیەکانی ناوچەگەری ساڵی ١٨٩٧ کوژران. قەیسەر وتی کە " دەرفەتێکە و خوا داویە"، و بەدوا ئەوەدا پۆلێک فرۆکەی دەریایی نارد تا کیاچۆف بگرێت. حکوومەتی چینی بەبێ ئەوەی بە ئاکامێک بگات نارەزایەتیەکی دەربڕی و لە ساڵی ١٨٩٨ڕێکەوتنامەیەکی واژۆکرد کە بەپێی ئەو ڕێکەوتنامەیە کرێی نەوەدونۆساڵەی لەبابەت سەد مایلی چوارگۆشە لە زەوی وزارەکانی چینی لە دەوروبەری بەندەری کیاچۆڤی بە ئەڵمانیا بەخشی. هاوڕێ لەگەڵ ئەوەش ئەڵمانیا مافی دروستکردنی ڕێگای شەمەندەفەڕ، و کردنەوەی کانزاکان و دیاریکردنی شوێن بۆ هێزەکانی ئەڵمانی تا بتوانن پارێزگاری لە بەرژەوەندیەکانی ئەڵمانیا بکەن پێ بەخشرا.

حکوومەتی ئەڵمانی بەلێشاو پارەی لەسەر ملکی تازەی خۆی خەرج دەکرد، زۆر زیاتر لەو پارەیەی کە لەسەر هەرکام لە کۆلۆنیەکانی ئەفریقای زۆر گەورەتر خەرجی دەکرد. حکوومەت دنەی بازەرگانی ئەڵمانی دا، کە بەشێوەیەکی زۆر نائاسایی و سەیر لەبابەت وەبەرهێنان لە شانگتۆنگ دوودڵ بوو، تا ڕێگایەکی شەمەندەفەڕ درووست بکات و کانزاکان هەڵکەنێت. (هەتاکوو ئێستا هیچ کامێکیان قازانجیان نەکردوە.) هێزی دەریایی بەندەری تازەی لە کیاچۆڤ خستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. تسینگتائۆ (قینگتائۆ)، بەگوێرەی خەڵک، نموونەیەک لە پێشکەوتن بوو بە کەرەسەی بەندەری زۆر سەردەمیانە، شەقامگەلی فەرشچن، ئاو و ئاوەڕۆی پایپکراو، و تۆڕی تەلەفوونی ئەمڕۆیی، قوتابخانەگەلی ئەڵمانی، نەخۆشخانەکان، و تەنانەت کارگەیەکی بیرەسازی کە بیرەی هەرەباش و ڕەسەنی ئەڵمانی درووست دەکرد، کە تەنانەت ئەمڕۆکەش هەر لە گەڕدایە. میوانێکی هۆگری بیانی تسینگتائۆی ناونابوو " برایتۆنی ڕۆژهەڵات." لە ساڵی ١٩٠٧دا ئەوێ حەوتەمین بەندەری گرنگ لە وڵاتی چین بوو. تەنیا خەوشێک کە هەیبوو ئەوەبوو کە لە نزیکترین کۆلۆنیەکانی ئەڵمانی و لە خودی ئەڵمانیا هەزاران مایل دوور بوو.٧٤٥

سەرەڕای ئەو هەموو گژەگژەی کە قەیسەر لە داواکارکردنی بۆ مافی زیاتر لە شانگتۆنگ لەخۆی نیشانی دابوو، حکوومەتی ئەڵمانی لە ساڵانی بەرلە ساڵی ١٩١٤ لە دانووستان لەگەڵ بەرپرسانی چینی زمانپاراویی و ژیربێژیەکی سەیری لەخۆی نیشان دابوو. ئەو حکوومەتە ڕێگای بە هێزەکانی چینی دەدا  تا پارێزگاری لە هێڵی ڕێگای شەمەندەفەڕی و کانزاکانی ئەو حکوومەتە بکەن هەرکات کە پێویستی بە سەربازەکانی خۆی هەبوو؛

حکوومەتی ئەڵمانی لە مافی درووستکردنی هێڵەکانی تر دەستی هەڵگرت؛ و ڕێگەی دا تا تسینگتۆ ببێ بە بەشێک لە سیستەمی گومرکی چینی تا ئەوەیکە وەک بەندەرێکی ئازاد ڕابیگرێت. ئاکامەکە ئەوەبوو کە لە ساڵی ١٩١٤دا زێدەمافەکانی ئەڵمانیا زۆر بەرتەسکتر لەوانەبوو کە لە ڕێکەوتی ساڵی ١٨٩٨دا پێی بەخشرابوو و پێوەندیەکانی سینۆ-ئەڵمانی بە بەراورد دۆستانە بوو. کاتێکە شەڕ هەڵگیرسا ئەو حەقیقەتە نەیتوانی یارمەتی ئەڵمانیا بات. بەرپرسانی کاروبارەکانی ئەڵمانیا لە چین تێلێگرافێکیان بۆ بەرلین نارد کە وتبووی " شیمانەی تێکەڵچوون لەگەڵ خاتوو باتێرفلای دەکرێت"- پەیامێک کە بەریتانیەکان، لە هەمووی ئەو تێلێگرافانەی کە لە ڕۆژهەڵاتەوە دەهاتن دەیانخوێندنەوە، هیچ کێشەیەکیان لە کردنەوە و تێگەیشتنی نەبوو. کاتێکە ژاپۆن هێرشی کرد حکوومەتی چینی هەڵوێستێکی وای نەبوو کە بتوانێ خۆی تێهەڵقورتێنێ، و خودی ئەڵمانیا هیچی لە دەست نەدەهات تاکوو بیکات. قەیسەر تەنیا ئەوەی لە دەست هات کە هاوخەمی خۆی دەربڕێ و بڵێ: " خوا ئاگای لێتان بێت! لە شەڕێکە لەسەررێیە من هەست و بیرم هەر لای ئێوە دەبێت." و بەم چەشنە زێدەمافەکانی ئەڵمانیا لە شانتۆنگ، ڕێگای شەمەندەفەڕ، بەندەری بچووک و خنجیلانە و کانزاکان کەوتنە ژێر ڕکێفی ژاپۆنەوە.٧٤٦

ژاپۆن باسی گەڕاندنەوەی زێدەمافەکانی بۆ چین دەکرد، بەڵام چینیەکان، جێی سەرسووڕمان نەبوو، زۆر باوەڕیان بەمە نەبوو. لە کاتی شەڕدا ژاپۆن ئەوەی لە دەستی هات کردی بۆ ئەوەکە دڵنیابێت لەوەکە ئاگای لە دەسکەوتەکەی خۆی دەبێت. هەر لە سەرەتاوە بەرپرسانی داگیرکاری سەریان بە درووستکردنی ڕێگاکانی شەمەندەفەڕ، هێنانەدەرێی تێلیگرافەکان و دایرەی پۆست لە چنگ چینیەکان، و لێکێشانەوەی باج و کار لە دانیشتوانی ناوچە قاڵ بوو. ژاپۆن شانتۆنگی خستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە هەرچەند ئەڵمانیا بەوە خۆشحاڵ نەبوو.٧٤٧

بێجگە لەوانە ژاپۆن ئەوەی لە دەستی هات بۆ بەستنەوەی یاسایی و بوارەکانی تری حکوومەتی ناکارامەی چینی کردی. ئەو وڵاتە بڕەپارەیەکی زۆری بە چین دا، هەندێک لەو پارەیە گومانی بەرتیل و ڕشوەی لێدەکرا، تا مەقاماتی ڕەسمی چینی هان بدات پشتگری لە ئامانجەکانی ئەو وڵاتە بکەن. گرووپگەلی نهێنی ناسیۆنالیستی ژاپۆنی، تاقمگەلی ناو هێزی میلیتاری، و پسپۆڕانی ماڵی، زۆر جار بە پێچەوانەی مەبەستەکانی حکوومەتی خۆیان بەدوای ئامانجەکانی خۆیانەوەبوون. سووپاکان بەرەو ئەو باشووریانە کەوتبوونە ڕێ کە دژ بە حکوومەت لە پەکینگ ڕاپەڕابوو، حکوومەتێک کە ژاپۆن بە فەرمی ناسیبووی. لە باشووری مانچورا و بەشی پێوەلکاوی مۆنگۆلیای

ڕۆژهەڵات، بەرپرسانی میلیتاری ژاپۆن و سەرەڕۆکان کەوتنە داوی فەرمەندە یاخیەکان. ئاکامەکەی ئەوەبوو کە سیاسەتی ژاپۆنی لە چین هەتابڵێی ڕێگەگومکەرەی لێدەرهات کاتێکە لەڕاستیدا زیاتر لەجاران ناکۆکیی و ئاڵۆزیی پێوە دیار بوو.

لە ئاستێکی فەرمیدا، حکوومەتگەلی ژاپۆنی یەک بە دوای یەک لە هەوڵی ئەوەدابوون، زیاتر لەڕووی زرپۆیی و هەڵەشەیەوە، وڵاتی چین بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە. لە مانگی ژانویەی ساڵی ١٩١٥دا، وەزیری ژاپۆنی لە پەکینگ دانیشتنێکی فەرمی لەگەڵ سەرەک کۆماری چین بردە سەر. وەزیری ژاپۆن باسی لە پێوەندی نزیک و دۆستانەی خەڵکانی هەردوو وڵات بەدرێژایی چەندین سەدە کرد و ڕایگەیاند کە جێی شەرمە ئەگەر ڕیگە بدەن زلهێزانی دەرەوە بەزۆر ئەمان لەیەک بکەن. ئەو لە درێژەی قسەکانیدا ئاماژەی بەوەکرد کە هەندێک کێشەی ئاڵۆز هەن کە باشتر وایە چارەسەر بکرێن. ئەو دواتر لیستەیەکی بیست و یەک داواکاری خستە بەردەم سەرەک کۆماری سەرسووڕماو. ئەگەر بێتو چین لەگەڵ ئەمان ڕێنەکەوێت، لەوانەبوو ژاپۆن ڕێگایەکی بگرتایەتە بەر کە بەشێوەیەکی شاراوە ناوبوو " شێوازی توند." هەندێک لە داواکاریەکان لەسەر چالاکیەکانی حازری ژاپۆن لە چین بە ئاسانی جەختیان دەکردەوە، کۆمەڵێکی تر لە داواکاریەکان داوایان لە حکوومەتی چینی دەکرد کە لەسەر هەر تەگبیر و تەدارەکێک کە ژاپۆن و ئەڵمانیا سەبارەت بە زێدەمافەکانی ئەڵمانیا پێیان خۆش بوو بیگرنەبەر ڕێگەیان بداتێ و هیچ نەڵێت. هێشتا لەوانەش خراپتر کۆمەڵێک داواکاری نهێنی کۆتایی بوون کە بەکردەوە چینیان دەخستە ژێر ڕکێفی ژاپۆنیەکانەوە. (هەر لەو بوارەدا حکوومەتی چینی خاوەنی بیری دووهەم بوو، کاغەزێک کە ژاپۆنیەکان تێیدا لیستەکەی خۆیان پێشکەش کرد هێمای بەرگی بارانی یان چەک و تەقەمەنی پێوەبوو.٧٤٨)

حکوومەتی چینی لەسەر هەر بابەتێک زمانبازی دەکرد و بە فێڵ و تەڵەکە دوای دەخست. بێجگە لەوانە ئەو حکوومەتە داواکاریەکانی بڵاوکردەوە، کە لە سەرتاسەری چین نارەزایەتی ناسیۆنالیستی لێکەوتەوە. ژاپۆن بەنابەدڵیەوە کۆتایی بە ئازووقە بنچینەیەکان هێنا بەڵام لە ٢٥ی مانگی مەی ساڵی ١٩١٥دا، زەختی کردە سەر حکوومەتی چینی تا گرێبەستێک واژۆ بکات کە گەرەنتی ئەوەبکات ژاپۆن ئەوەیکە لە شانگتۆنگ بەدوایەوە بوو بەدەستی دێنێت. ناسیۆنالیستەکانی چینی ڕۆژی مرۆڤایەتی نەتەوەییان ڕاگەیاند. لە تۆکیۆ، سایۆنژی لە ناکارامەیی حکوومەتەکەی خۆی ئەوەندە خۆی خواردەوە کە بە تەگەرەخستنە سەر ڕێی هەوڵەکانی وەزیری دەرەوە بۆ ئەوەی کە ببێ بە سەرەک وەزیر نارەحەتی خۆی دەربڕی.٧٤٩

نەتەوەکانی تر بە نیگەرانیەوە سەیریان کرد بەڵام شتێکی وایان لەدەست نەهات. بەریتانیا زۆر پێویستی بە یارمەتی ژاپۆن هەبوو. کەشتیەکانی ژاپۆنی تازە لە ئۆقیانووسی ئارامەوە دەستیان کردبوو بە ڕاگواستنی بەنزین، و بەریتانیەکان هیواداربوون کە ئەوانیش بتوانن بۆ ڕێگایەکە بەدەوری کەیۆ ئاف گود هەویەوە بوو یان تەنانەت لە مەدیتەرانە هەر هەمان کار بکەن.٧٥٠ فەڕەنسە و ئیتالیا بەو قەناعەتە گەیشتبوون کە بەریتانیەکان ڕەچاو بکەن، و ڕووسیە، کە بەردەوام لە ئورووپا قوربانی دەدا، هیچ حەزی نەدەکرد دراوسێی بەهێزی خۆی لە ڕۆژهەڵاتی دوور عاجز بکات. لە ڕێکەوتنە نهێنیەکانی خۆیدا لە ساڵی ١٩١٧ لەگەڵ بەریتانیا، فەڕەنسە و ئیتالیا، ژاپۆن سووربوو لەسەر ئەوە کە پشتگری لە خاوەندارێتی بەردەوامی خۆی لە ملک و ماڵات و مافە تایبەتیەکانی ئەڵمانیا لە شانگتۆنگ بکات.

تەنیا هێزێک کە بە ئاشکرا لەبەرانبەر چالاکیەکانی ژاپۆن لە چین دەوەستا وڵاتەیەکگرتوەکان بوو، کە جارلەگەڵجار نیگەرانی سەبارەت بە زۆربوونی دەسەڵاتی ژاپۆن لە ئۆقیانووسی ئارام و لە بەشی سەرەکی قارەی ئاسیا زیاد دەبوو. تەنانەت بەرلەو شتەی کە ویلسۆن ناوی نا " بابەتی هەرە ئاڵۆز"ی بیست و یەک داواکاریەکە، لەسەر بابەتگەلی وەکوو داواکاریی هێزی دەریایی ئەمریکی بۆ دانانی وێزگەیەکی کانکاری لە کەنارئاوەکانی چین و ئەو نرخە زۆرانەی کە ڕێگای شەمەندەفەڕی وەگەڕ-خستووی ژاپۆنیەکان لە مانچۆرا دەیخستە سەر کەلوپەلەکانی ئەمریکی ناکۆکی لەنێوانیاندا هەبوو.٧٥١ بازەرگانانی ئەمریکی گازەندەیان لەوە دەکرد کە ململانێ کردنی ژاپۆنیەکان خەریکە ئەوان لە بازاڕی چین دەتارێنێت. لەماوەی دانیشتنە دووروردرێژەکانی نێوان چین و ژاپۆن، حکوومەتی ئەمریکی کردیە سەر ژاپۆن تا بە هەڵوێستی خۆیدا بچێتەوە؛ لە پەکینگ باڵوێزی ئەمریکی دژە-ژاپۆنی چینیەکانی هاندا تا بەتوندی خۆڕاگری بکەن. ئەمریکیەکان لێدوانێکیان نارد بۆ حکوومەتەکانی هەم چین و هەمیش ژاپۆن کە گوایە ئەوان حازرنین هەر ڕێکەوتنێک کە مافەکانی گرێبەستی ئەمریکی لە چین یان یەکگرتوویی ناوچەیی و سیاسی خودی وڵاتی چین لەبەرچاو نەگرێت قەبووڵ بکەن. (دانانی ئەو مەرجە لە ساڵی ١٩٣١دا زۆر گرنگ بوو، لەکاتێکدا کە وڵاتەیەکگرتوەکان وەک بنەمایەک بۆ بەرەنگاربوونەوەی خۆی لەبەرانبەر داگیرکردنی مانچۆرا لەلایەن ژاپۆنەوە بەکاری دەهێنا.)

حکوومەتی ژاپۆنی لە ساڵی ١٩١٥دا دانی بە شکستی خۆی هێنا، بەڵام لە هەوڵدان بۆ هەبوونی دەستێکی باڵاتر لە وڵاتی چین نەوەستا. لە ساڵی ١٩١٦دا، ئەو حکوومەتە لەگەڵ ڕووسیە گرێبەستێکی واژۆ کرد کە بەپێی ئەوە ڕووسیە پێگەی تایبەتی ژاپۆنی لە باشووری مانچۆرا و

ڕۆژهەڵاتی مانگۆلای بە ڕەسمی دەناسی. هاوکات، ڤیسکاونت کیکۆ ژیرۆی بۆ واشنگتۆن نارد تا هەوڵ بات ئەمریکیەکان لە بەڕەسمی ناسینی پێگەی ژاپۆن لە چین موقناع بکات. ئاکامی وتویژەکانی نێوان ئیشی و لانسینگ ئاڵو گۆڕکردنی چەند لێدوانێک بوو کە هەرلایەن لێکی دەداوە خۆی ڕێ بخات. ئەمریکیەکان لەسەر ئەم باوەڕە بوون کە لەبەرهۆی باری جوگرافی ئەوان زۆر بەئاسانی ئەوەیان بەفەرمی ناسیبوو کە ژاپۆن پێشتر لە وڵاتی چین بەرژەوەندی تایبەت بەخۆی هەبوە؛ ژاپۆنیەکان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە ئەمریکیەکان لە مانایەکی زۆر بەرینتردا پێگەی تایبەتی ژاپۆنیان قەبووڵ کردوە.٧٥٢

شۆڕشی ساڵی ١٩١٧ی ڕووسیە ئەوەندەیکە ژاپۆنیەکانی سوورترکرد لەسەر ئەوەکە لە وڵاتی چین بمێننەوە. وەک ئیشی لە یاداشتەکەی خۆیدا دانی بەوەداهێنابوو کە "هەتا حکوومەتەکانی دەرەوە هەست بە مەترسی لە کارەسات، پەتا، شەڕی ناوخۆ یان بۆلشویزم لە وڵاتی چیندا نەکەن، ژاپۆن ناتوانێ بەبێ چین بژیت و خەڵکانی ژاپۆنی ناتوانن بەبێ چینیەکان بژین."٧٥٣ هەر بەم بۆنەوەبوو کە ژاپۆنیەکان زۆرجار ئاماژەیان بە " ڕێبازی مۆنرۆی ئاسیایی" دەکرد. درووست وەکوو وڵاتەیەکگرتوەکان کە لەبەرهۆی ئاسایشی خۆی لەگەڵ ئەمریکای لاتین وەک حەوشەی پشتەوەی خۆی هەڵس و کەوتی دەکرد، ژاپۆنیش بە هەمان چەشن دەبوایە سەبارەت بە وڵاتی چین و دراوسێکانی وەکوو کۆرە و مۆنگۆلیا کەمتەرخەم نەبایە.

لە ساڵی ١٩١٨دا، ئەوەندەی نەمابوو شەڕ کۆتایی بێت، ژاپۆن لە دوهەمین هەوڵیدا ویستی کێشەکانی ناو وڵاتی چین لە قازانجی خۆی داکووژێنێت. لە مانگی مەیدا گرێبەستێکی داکۆکی کردنی لەگەڵ حکوومەتی چینی واژۆ کرد، و لە مانگی سێپتامردا لێدوانی نهێنی ئاڵووگۆڕ کرد کە ڕێکەوتنەکانی ساڵی ١٩١٥ی سەبارەت بە شانگتۆنگ دووپات دەکردەوە. لە دەستەواژەیەکدا کە بەتایبەت زیانی بۆ پەروەندەی چین لە پاریس دەبوو، نوێنەری چینی لە تۆکیۆ ئاماژەی بەوەکرد کە حکوومەتەکەی ئەو "بەخۆشحاڵیەوە لێدوانەکان پەسند دەکات." بە واتایەکیتر حکوومەتی چینی پێگەی سەوداگەری تایبەت بەخۆی سووک کرد بەرلەوە کە شەڕ کۆتایی پێبێت. نوێنەرانی چینی لە پاریس بانگەشەیان دەکرد کە ئەوان سەبارەت بە ڕێکەوتنە نهێنیەکان هیچ شارەزاییەکیان نەبوو هەتاکاتێک کە ئەوان لەلایەن حکوومەتی ژاپۆنیەوە لە مانگی ژانویەی ساڵی ١٩١٩دا درووست ببوون.٧٥٤

لە ساڵی ١٩١٩دا، مانۆڕەکانی ژاپۆن لە چین کاریگەریەکی خراپی لەسەر زۆربەی چاودێرانی دەرەوە دانابوو. تەنانەت بەریتانیەکانیش، کە بە ئەرکیان دەزانی پشتگری لە ژاپۆن بکەن، ئەوەیکە ئەوان بە بەرزخوازی و لەخۆباییبوونی ژاپۆنیەکان لێی تێگەیشتبوون کەوتنە دڵەڕاوکێ و دڵەخورپێ.

بەریتانیەکان بەتایبەت لەوە دڵەخورپەیان هەبوو کە ژاپۆن هێرشی کردبوە ناوچەی ئابووری ئەوان لە دۆڵی یانگتزێ. باڵویێزی ئەوان لە تۆکیۆ بەشێوەیەکی شاراوە هۆشداری دابوو کە " ئەمڕۆکە ئێمە ئەوەمان لێ حاڵی بووە کە ژاپۆن-ژاپۆنی ڕاستەقینە- وڵاتێکی، نەک بڵێین خۆویست، بەپانەوە دەرفەتخوازە کە بە بەراورد لەگەڵ زلهێزانی شەڕی گەورە گرنگایەتیەکی مامناوەندی هەیە، بەڵام بۆچوونێکی لەڕادەبەدەر سەبارەت بە ڕۆڵی ئەو وڵاتە لە جیهاندا لە ئارادایە." بەریتانیەکان زیاتر لە شێوازی ڕەخنەگرتنی چاپەمەنیەکانی ژاپۆن قەڵس بوون کە دەگەڕاوە بۆ دەستبەسەرداگرتنی زێدەمافەکانی ئەڵمانیا لە چین لەلایەن سەربازانی بەریتانیەوە. کێشەکە لەوە دابوو کە چین وەک مەسەلەیەکی دڵسارکەرەوە دەهاتە بەرچاو. کۆرزۆن، جێگری بالفۆڕ وەک وەزیری دەرەوە، بەراوردێکی ڕێکی لەگەڵ ژاپۆن داڕشت: "لەچوارچێوەی کەنارەکانی ئەواندا بەشی سەرەکی بێ دەرەتان، هیوبڕاو و بێ تەکانی وڵاتی چین دەبینی، یەکێک لە وڵاتانی هەرە قەرەباڵغ لە جیهاندا، کە لە یەکگرتووی و لە بەهێزبووندا زۆر ناتەواوە، تێکئاڵاو بە کێشەی هەتاهەتایی باشوور و باکوور، بێ بەش لە توانایی یان حەزبی میلیتاری، نچیرێکی خۆشدەست بۆ نەتەوەیەک بەو تایبەتمەندیانەوە کە من باسم کرد."٧٥٥ فەرەنسەیەکان، لانی کەم لەسەر پرسی وڵاتی چین، لەگەڵ بەریتانیەکان کۆک بوون.

هاوسیش هەر کۆک بوو. وەک چۆن لە کاتی شەڕدا بە ویلسۆنی ڕاگەیاند، مەئقوولە لە ژاپۆن چاوەڕوان بکرێت کە بچێتە ناو بەشی سەرەکی وڵاتی چین لەحاڵێکدا کە ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە سپی پێستەکانی جیهان لە ژاپۆنیەکان نزیک بووبێتنەوە. ئەو بە گەشبینیەکی یەکجار زۆرەوە لە درێژەی باسەکەیدا هێنای کە "ئێمە ناتوانین هەروائاسان شان بۆ ژاپۆن شل کەین ئەوەی پێی خۆشە لەبابەت زەوی و زار و لەبابەت کۆچبەریەوە بیکات، و مەگین ناوچەی دەسەڵاتداریێتی ئەو لە ڕۆژهەڵات دیاری بکەین بۆی، ئەگینا دڵنیایین لەوە کە درەنگ یان زوو ئاژاوە ساز دەبێت. دەکرێ سیاسەتێک بخەینە گەڕ کە بەو پێیە دەرگا ئاوەڵابێت، چین ئاوەدان بکرێتەوە، و ژاپۆن ڕازی کرێت." کاتێکە ژاپۆنیەکان لەسەر شاندی نوێنەرایەتی ئەمریکیان لە پاریس کۆڵیانەوە، ئەویان بە کەم زانی و وەک هاوڕێیەک سەیریان کرد. ٧٥٦ ئەوان نەیاندەتوانی زۆر لایەنی تر بدۆزنەوە.

چەند ساڵ دواتر برێکینریج لانگ، کە سێهەمین وەزیری دەرەوە بوو هاوڕێ لەگەڵ بەرپرسایەتیەکی تایبەت بۆ کاروبارەکانی ڕۆژهەڵاتی دوور لە سەردەمی کۆڕی ئاشتی پاریسدا و پێشتریش، بە وتوێژکەرێکی ڕاگەیاندبوو کە لە ساڵی ١٩١٧ بەم لاوە ترس لە ژاپۆن ببوە خۆرەیەک لە مێشکی ئەمریکیەکاندا. تەنانەت لانسینگیش، کە شانازی بەوەوە دەکرد هەڵگری ڕێبازێکی مەئقوولانەیە لەبۆ جیهانیان، هەستی بە گۆڕانکاری کرد. لە ساڵی ١٩١٥دا، ئەو بە بەڵگەوە

دەهێنایەوە کە ئاشتی کردنەوە لەگەڵ ژاپۆن کارێکی زۆر پێویستە، تەنانەت پێشنیاری بەخشینی دوورگەکانی فیلیپینی بەو وڵاتە دەکرد، و ڕەخنەی لەو کەسانە دەگرت کە " سەبارەت بە پیلانی نگریس و شوومی ژاپۆن بەتەنگەوەبوون." بەڵام، هەتا چین لە گۆڕێدا بوایە، ئەو سووربوو لەسەر ئەوە کە هێڵێک دابنێت. ئەو دواتر وتبووی کە سەفەری دەریایی ئەو بۆ پاریس بەدڵنیاییەوە بۆ ئەوە بوە کە " بە یەکجاری و بۆ هەتاهەتایە لەکۆڵی خۆی کاتەوە و بە ژاپۆنی ببەخشێت." بێجگە لەوانە ئەو وەک "پڕاشا" ئاماژەی بە ژاپۆن دەکرد، کە ئەوە بە مانای پێداهەڵکوتن نەبوو.٧٥٧

کاتێکە کۆڕی ئاشتی دەستی پێکرد، لەوەدەچوو ویلسۆنیش هەرهەمان بۆچون بگرێتە بەر. ئەو دژی گرێبەستە نهێنیەکان بوو وەکوو ئەوانەی کە ژاپۆن دەیبەستن، و دژی بەخشینی مرۆڤەکان و ناوچەکان بوو بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئاواتەکانیان. هاوڕێ لەگەڵ ئەوانەش ئەو هیوایەتێکی تایبەتی بە وڵاتی چین بوو، هیوایەتێک کە لەلایەن زۆربەی موژدەدەرانی ئەمریکی کە لەوێ ئیشیان دەکرد پەرەی پێدەدرا. یەکێک لە ئامۆزاکانی ئەو سەرنووسەری حەفتەنامەی مۆژدەدەری پرێسبیتێریەن لە شانگهای بوو. ئەو باسی پێویستبوونی یارمەتیدانی چینی دەکرد، باسی بووژامدنەوەی باری ئەخلاقی و ڕەوشتبەرزی ئەو وڵاتە، ئەرکێک کە وڵاتیەکگرتوەکان وەک " هاوڕێیەک و نموونەیەک" ئامادەبوو لەوپێناوەدا ئەوەی لە دەستی دێت بیکات. باڵوێزی ویلسۆن لە پەکینگ، پائۆل ئێس.ڕەینسچ، مامۆستای زانکۆیەکی پێشکەوتوو لە ویسکۆنیسین، واشنگتۆنی بە تۆمەت داگرت، هەندێکیان ڕاست بوون، بەومانایە کە ژاپۆنیەکان لە چین خەریکی ئاژاوەگەریی بوون، خەریکی فرۆشتنی مۆرفین و بەرتیل دان بە مەقاماتی ڕەسمی بوون، هەرهەمووی ئەمانە بۆ مەبەستی زاڵ بوون بەسەر گشت ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا بوو. ئەو هۆشداری دا کە "ئایا ئەمە درووستە ڕێگە بە ژاپۆن بدرێ دەستێکی ئاوەڵای هەبێ و چە لە فۆڕمی بەناو ڕێبازی مۆنرۆ یان هەر شێوازێکی تر کارێک بکرێت کە پێگەی تایبەتی ژاپۆن بە فەرمی بناسرێت، هێزەکان دەخرێنە گەڕ کە ڕێگە بۆ شەڕێکی قورسی وازلێنەهاتووی چەکداری لە بەرەی داهاتوودا درووست دەکات. هیچ کێشەیەک لە ئورووپا ناگاتە ئاستی گرنگایەتی ئاشتی داهاتووی جیهان، پێویستبوونی داکووژانێکی ئاشتیانەی کێشەکانی وڵاتی چین."٧٥٨

ویلسۆن لەوەدەچوو کە گوێی شل کردبێت. لە ساڵی ١٩١٨دا، ئەو لە بووژاندنەوەی کۆنزێرتیوومی بەگیانەلاکەوتووی چەند نەتەوەییدا بۆ مەبەستی درووستکردنی وام بۆ حکوومەتی چینی ڕچەی شکاند. باسی هیچ و پووچ باڵی بە سەر کۆڕی ئاشتیدا لە هەموو کات و ساتێکدا دەکێشا، هاوڕێ لەگەڵ ئەوە ژاپۆن لەسەر ئەوە سوور بوو کە بچێتە ناو کۆنسێرتیووم لە هەمان

کاتێشدا دڵنیا بێت لەوە بەهیچ لەونێک پارە بۆ ئەو پێشکەوتنانەی کە لەوانەیە ببنە هۆی لاوازبوونی کاریگەری ئەو وڵاتە نەخاتە گەڕ. ئەوە درووست هەر ئەو شتە بوو کە ئەمریکیەکان بەتەمابوون بیکەن. مەقامێکی پلەبەرزی ئەمریکی وتی کە "سەبارەت بە *ئامانجی کۆتایی، وەدەرنانی ژاپۆن لە* چین، هیچ ئاماژەیەک نەکرا."٧٥٩

بەڵام ئایا ئەوە هەر ئەو شتە بوو کە وڵاتەیەکگرتوەکان بەڕاستی بەدوایەوە بووً؟ ئەگەر ژاپۆن نەیتوانیایە بەرەو ڕۆژئاوا بۆ وڵاتی چین دەستی درێژ بکات و پەل بهاوێت، بڵێی بەرەو ئۆقیانووسی ئارام، بۆ دوورگەکانی فیلیپین، یان لەوانەبێ بەرەو ڕۆژهەڵاتی دوور وەرنەگەڕایە؟ ویلسۆن و ڕاوێژکارەکانی، وەکوو جێگرەکانیان لە دەیەکانی ١٩٢٠، لەنێوان ئامانجی کرداری هاریکاریکردن لەگەڵ ژاپۆن و ئامانجی خەیاڵی یارمەتیدانی چین مابوونەوە و سەریان لێ شێوابوو. ئایا هەر دەکرا چین یارمەتی بدرێت؟ ئایا شیاوی ئەوەبوو قڕەیەک لەسەری لەگەڵ ژاپۆن سازکرێت؟

درووست بەرلەوە کە ئەو بەرەو پاریس بڕوات ویلسۆن وێلینگتۆن کووی، باڵوێزی چینی لە واشنگتۆن، بۆ وتوێژی خۆمانە بانگێشت کرد. کوو، کە لە ساڵی ١٩١٩دا تەنیا سی و دوو ساڵی بوو، کەسایەتیەکی بەهێز و ناسراو بوو. کلیمینجوو، کە قەت بەسەر کەسیدا هەڵنەکوتبوو، ئاوا تاریفی ئەوی کرد کە "وەک پشیلەیەکی کەم تەمەنی چینی دەچوو، لەزمان و بەرگدا پاریسی، دڵخۆش بەوە کە دەستی بە سەر و گوێی مشک دادێنێت، هەرچەند لەوەپێش بۆ ژاپۆنیەکان داندرابوو." کوو زۆر چاک وڵاتەیەکگرتوەکانی دەناسی. لە زانکۆی کلۆمبیا لە نیۆیۆرک، ئەو شوێنەی کە ئەو هەم بڕوانامەی پێش دەرچوون و هەمیش دەرچوونی گرتبوو، ئەو خوێندکارێکی سەر و ناسراوبوو. (لە پاریس ئەو لەگەڵ مامۆستای پێشووی خۆی کە یەکێک لە پسپۆڕانی ئەمریکی بوو، دوانیوەڕۆیەکی خۆشی بە کوتنەوەی گۆرانیە کۆنەکانی زانکۆ ڕابوارد.) بێجگە لەوانە ئەو لە لیژنەی دەمەقاڵێکەری زانکۆدا ئەندام بوو، وەک چۆن نوێنەرانی ژاپۆنی بە هەر نرخێک بوایە فێری دەبوون. کوو لە دانیشتنەکەی خۆی لەگەڵ ویلسۆن دوورکەوتەوە ئەرخەیان لەوە کە وڵاتەیەکگرتوەکان دەیەویست لە کۆڕی ئاشتیدا پشتگری لە وڵاتی چین بکات. بەشێوەیەکی دۆستانە ویلسۆن پێشنیاری کردبوو کە کوو هەر بەو پاپۆڕانەی کە ئەمریکیەکان بۆ سەفەرکردن بەکاری دێنن سەفەر بکات..٧٦٠ چینیەکان ئەمەیان بە هێمای بەختەوەری لەسەر شانیان زانی.

هێمایەکی تر شێوازی پێکهاتنی خودی شاندی ئەمریکی بوو. لانسینگ، لە کاری پێشوویدا لە واشینگتۆن، وەکوو ڕاوێژکار بۆ حکوومەتی چینی چالاکی کردبوو، و یەکێک لە پسپۆڕانی شاندەکە، ئی.تی.ویلیامز، سەرۆکی دابەشکردنی کاروبارەکانی ڕۆژهەڵاتی دوور لە بەشی دەرەوە لەماوەی جەنگدا،

هەم وەک مۆژدەدەر و هەمیش وەک دیپلۆمات لە چین ژیابوو. کەش و هەوای زاڵ بەسەر شاندەکە دژە-ژاپۆنی بوو. تەنانەت ئەوانەشی کە ئامادەبوون سەیری پەروەندەی ژاپۆنی بکەن قینێکی یەکجار زۆریان لە بەرەی ناسیۆنالیستی، میلیتاری ژاپۆن هەبوو، کە ئەوان لایان وابوو، بەسەر هەمووی ئامانجەکانی شەڕی ژاپۆندا زاڵ بووە. سەرەڕای ئەوەکە ویلسۆ ئاواتەخوازی ئەوەبوو کە ولآتەیەکگرتوەکان لە کاروبارەکانی ئاسیاییدا هەڵوێستێکی بێ لایەنە بگرێتە بەر، شاندی نوێنەرایەتی ئەمریکی لە پاریس لایەنگرییان لەخۆیان نیشان دابوو، یارمەتی چینیەکانیان دابوو تا داواکاریەکانیان پێشکەش بکەن و زانیاریان خستبوە بەردەمیان. چینیەکان بە داواکردنی ڕاوێژ لە ئەمریکیەکان ولآمیان دابۆوە.٧٦١

لەبەرهۆی کێشەی ناوخۆیەوە، حکوومەتی چینی بەتەواوەتی شاندی خۆی بۆ پاریس ئاگادار نەکردبۆوە، بەلآم تەنیا ئاگاداریەک بەڕوونی باسی لێکرا: پێویستە چین زێدەمافەکانی ئەڵمان لە شانگتۆنگ بگەڕێنێتەوە. لە مانگی دێسامری ساڵی ١٩١٨دا، کاتێکە شاندەکە ئامادە بوو تا ڕێکەویت، کۆڕێکی چاپەمەنی (ئەم بۆخۆی هێمایەکە لەو گۆڕانکاریانەی کە لە مێژوو لە چین هاتە ئاراوە) بەڕێوەبرد هاوڕێ لەگەڵ لیستەیەکی گەشبینی کریاری بۆ کۆڕی ئاشتی. چین دەیەویست داوای بڕینەوەیەکی یەکجاری پێوەندیەکان لەگەڵ زلهێزەکاندا بکات، وەکوو هەڵوەشاندنەوەی دەسەلآتداریتی دەرەوە بەسەر ولآتدا، کۆنترۆڵی زیاتر بەسەر گومرکەکانی تایبەت بەخۆی و ڕێگاکانی شەمەندەفەری خۆی، و گەڕاندنەوەی ناوچەی ئەڵمانی لە شانگتۆنگ. لەبەرانبەر ئەمانەدا، چین ڕێگای بە تجارەتی دەرەوە لە مۆنگۆلیا و تبت دەدا.٧٦٢

بەداخەوە، شاندی نوێنەرایەتی چین ڕەنگدانەوەیەکی باش بوو لە جیاوزیەکانی ناوخۆی ولآت. ئەندامانی ئەو شاندە ترسی ئەوەیان بوو لە یەکتر کە هەرچی شتە بۆ ژاپۆنیەکان هەڕاج کەن. تەنانەت لەسەر ڕێی ڕۆیشتن بۆ پاریس هەندێک شتی سەیر ڕوویان دابوو. لوو لەگەڵ وەزیری دەرەوەی ژاپۆن لە تۆکیۆ دانیشتنێکی دوو-کاتەژمێری بەڕێوە بردبوو. گێڕانەوەی ئەو شتانەی کە لە دانیشتنەکە ڕوویان دابوو جیاواز بوون: وادیار بوو کە ژاپۆنیەکان وای بۆچووبوون کە ئەوان بەڵێنیان لە چین ستاندوە کە لە کۆڕی ئاشتی هاریکاریان لەگەڵ بکات؛ چینیەکان دواتر، بەناقایلیەکی بەبەراورد زیاترەوە، بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە لوو تەنیا هەبوونی ڕێکەوتنەکانی ساڵی ١٩١٨ی نێوان چین و ژاپۆنی بە فەرمی ناسیوە، بەبێ ئەوەی ڕاستی ئەوان قەبووڵ بکات. لەماوەی ئەو لادانە کاتیەدا لە تۆکیۆ، بوخچەیەک لەناو بارگ و بنەی چینیەکاندا کە سەنەد و بەڵگەی گرنگی لەخۆگرتبوو، وەکوو دەقی تەواوی ڕێکەوتنە نهێنیەکانی نێوان چین و ژاپۆن، دزرا. لە پاریس، سی.تی.وانگ، دەرچوویەکی کۆلیژی یاسا لە زانکۆی یەیل کە نوێنەرایەتی بەرەی باشووری

چیلی دەکرد، تێلێگرافیکی بۆ ڕۆژنامەکانی شانگهای نارد کە تێیدا هەندێک لە هاوکارەکانی خۆی بە "خائینی نادیار" تۆمەتبار کردبوو. ڕەنگە مەبەستی ئەو کوو بووبێت، کە دەنگۆی ئەوەی لەسەر بوو کە لەگەڵ کچی مەقامێکی ئابڕووچواوی لایەنگری ژاپۆن نزیکی بووبێت. (لەڕاستیدا کوو لەگەڵ میراتگرە مێینەیەکی ژیکەڵەلاوی ئەندۆنیزیایی دڵداری دەکرد.) گوزارشەکان بەئاشکرا باسی ئەوەیان دەکرد کە لوو لەلایەن ژاپۆنیەکانەوە بەرتیلی وەرگرتبێت. ئەو دوا تێپەڕبوونی چەند مانگ ڕووگرژ و دوورەتەریکی لێدەرهاتبوو.٧٦٣

هەتا کۆتایی مانگی ژانویە شانگتۆنگ لە پاریس نەهاتبوە بەر باس و خواس. ویلسۆن هێشتا بڕیاری نەدابوو کە دەبێ چ بکات. ئەو ڕێگاچارەی جۆراوجۆری پشکنیبوو. ئەو بە کووی ڕاگەیاندبوو کە سەرەڕای هاوپەیمانی ئانگل-ژاپۆن بەڵکوو بەریتانیا موقناع ببێت و یارمەتی چین بدات. بەڵکوو ژاپۆنیەکان خۆنەویستانە دەست لە داواکاریەکانی خۆیان لەسەر شانگتۆنگ هەڵگرن. بەگشتی، مەقاماتی جیاجیا ڕایانگەیاندبوو کە ژاپۆن خوازیاری ئەوەبوو کە زێدەمافەکانی ئەڵمانیا بۆ چین بگەڕێنێتەوە. بەڵکوو ژاپۆن بتوانێ بە خاوەندارێتی فەرمی و بەخشینی ئەو خاوەندارێتیە بە چین ئابڕووی خۆی بکڕێتەوە.٧٦٤

ژاپۆنیەکان مەیلی دانووستانیان نەبوو. سەرلەبەیانی ٢٧ی مانگی ژانویەدا، کاتێکە شۆڕای عالی ئاورێکی لە چارەنووسی کۆلۆنیەکانی ژاپۆن لە ئۆقیانووسی ئارامدا دایەوە، ماکینۆ کەوتە هەوڵی ئەوەکە زێدەمافەکانی شانتۆنگ لەگەڵ دوورگە جۆراوجۆرەکان کە لە جنگ ئەڵمانیا هاتبوونەدەرێ پێکەوە بلکێنێتەوە. ئەو بەڵگەی لەسەر ئەوە دەهێنایەوە کە شانگتۆنگ بابەتێکە تەنیاوتەنیا پێوەندی بە ژاپۆن و ئەڵمانەوە هەیە و ئەوەکە کاتێکە ئەو باسە دێتەگۆڕێ چین هەربۆی نیە لەو کۆبوونەوەیەدا بەشداری بکات. ئەو بە ئاواتەوە بوو هەرچی خێراتر شانگتۆنگ، هاوڕێ لەگەڵ دوورگەکانی ئۆقیانووسی ئارام، وەک بەشێک لە دەسکەوتەکانی جەنگ لایەکی بکەوێ بەلایەکدا. هێزەکانی تر بڕیاریان هێنا سەر ئەوە کە باشتر وایە شانگتۆنگ بەشێوەیەکی جیاواز وتوێژی لەسەر بکرێت و ئەوەکە باشتر وایە چین دواتر هەر ئەو دوانیوەڕۆیە بۆ وتوێژەکە بانگێشت بکرێت.٧٦٥

لە وچانی نێوان دانیشتنەکانی بەیانی و دوانیوەڕۆ چینیەکان ئەوەیکە توانیان بۆ گوشارهێنان بۆ سەر هاوڕێکانیان کردیان. لوو، بەناو ڕیبەری ئەوان، لە هیچ شوێنێک نەدەبیندرا؛ ئەوە کووی لاو بوو کە لاسینگی بانگێشت دەکرد تا داوای لێبکات کە ئایا چین دەتوانێ چاوەڕوانی پشتگری کردن لە وڵاتەیەکگرتوەکان بکات. لانسینگ ئەوی دڵنیا دەکردەوە بەڵام لە درێژەی قسەکانیدا هێنای کە ئەو ترسی هێزە ئەورووپیەکانی لە دڵ دایە.٧٦٦

ئـەو دوانیوەڕۆیــە چینیــەکان لەســەر کورســیە ناخۆشــە زیڕپۆشــەکان لــە کــوای دی ئۆرســای هەڵکرووشمابوون بۆ ئەوە گوێ لە ماکینۆ ڕاگرن تا کورتەیـەک دوور لـە هەست و بـەترس و لـەرزەوە لـە پەروەندەی ژاپۆن پێشکەش بکات. (کوو بانگەشـەی دەکرد کە دواتر ویلسۆن بـە ئـەوی ڕاگەیانـدوە کـە ئەو وتارە بەڕاستی ئـەوی تووشی دڵەخورپێ کردبوو.) کـوو دوانیـوەڕۆی ڕۆژی دواتـر وڵامـی بـە چـین دابـۆوە. هەرچەنـد لـە سـەرەتادا دەنگـی لـەرزۆک بـوو، وتـارێکی سەرسـووڕهێنەری بـە زمـانی ژاپـۆنی ڕاگەیاند کە بە دەستەواژەگەلی یاسای نێونەتەوەیی ئاخنراوبوو. ئەو دانی بـەوەدا هێنـا کـە ڕاسـتبوو چـین ڕێکەوتننامەگـەلێکی لەگـەڵ ژاپـۆن لـە سـاڵی ١٩١٥ و ١٩١٨ واژۆکردبـوو کـە گوایـە بـەڵێن درابـوو کـە ژاپۆن لە شانگتۆنگ مافەکانی ئەڵمانی وەردەگرێت، بەڵام چین لـەژێر گوشـار و زەخـت و زۆردا واژۆی کردبـوون و نـاتوانێ پابەنـدی ئـەو ڕێکەوتننامەگەلـە بێـت. لـە هـەر حاڵـدا، هـەمووی ئـەو پرسـیارانەی کـە پێوەندیان بە مڵک و ماڵاتی ئەڵمانەوە هەبوو دەبوایە لە کۆڕی ئاشتیدا باسوخواستیان لەسەر بکرایە.٧٦٧

کوو لـە درێژەی باسـەکەیدا هێنـای کـە چـین لەبـەرهۆی ئەوەکـە ژاپـۆن شـانگتۆنگی لـە چـنگ ئەڵمانیــەکان دەرهێنــا و ڕزگــاری کــرد مەمنوونیــەتی. " بــەڵام ئــەوان سووپاســگوزاربوون، شــاندی نوێنەرایەتی چـین هەسـتیان دەکـرد کـە ئـەوان لـە جێبـەجێکردنی ئـەرکێک کـە لەسـەر شـانیان بـوو بـۆ وڵاتی چین و بۆ جیهانیان قسووریان کردوە ئەگەر ئەوان دەنگی نارەزایەتیان لەبەرنابەر وڵامـی پیاوەتـی بە فرۆشتنی مافی زگماکی هاووڵاتیانی خۆیان و لەئاکامدا چانـدنی تـۆوی نیفـاق و دووڕوویـی بـۆ داهــاتوان هەڵنەبڕیایــە." خــود-موختــاری نیشــتمانی و یــەکگرتوویی ناوچــەکان، کــە بەشــێک لــە پرەنسیپەکانی ویلسۆن بوون، زلهێزانی هان دا تا شانگتۆنگ بۆ وڵاتی چین بگەڕێننەوە.٧٦٨

کــوو دەیکــوت کــە شــانگتۆنگ " لانکــەی شارســتانیەتی چینیەکانــە، شــوێنی لــەدایکبوونی کۆنفیووسیووس و مێنسیووسە، و وڵاتێکی پیرۆزە بۆ چینیـەکان." بێجگـە لەوانـە، ڕێگـەدان بـەوە کـە شانگتۆنگ بچێتە ژێر ڕکێفی بیانیەکانەوە بەمانای ڕیگەدان بـە "خەنجەرێکـە کـە ڕووی لـە دڵـی وڵاتـی چـین بێـت." بـەباری پێچەوانـە، ئـەوە بەشـێکی زۆری لـە بۆچـوونی میلیتـاری ژاپـۆنی لـەخۆ دەگرت: وەزیری جەنگ لە تۆکیۆ بە حکوومەتەکەی خۆی ڕاگەیاند کە ڕێگـای شـەمەندەفەرێک کە لە کەنارئاوی ناو شانگتۆنگەوە دەچووە ناوەی وڵات "خوێن بەرێک" بوو کە هێزی ژاپۆنی بـەرەو وڵاتی دایکی ئاسیا ترۆمپا دەکرد. بـۆردێن وتـاری چینیـەکانی لا "زۆربـەهێز" بـوو، و لانسـینگ لای وابوو کە کوو بەو ئاسانیە توانی ژاپۆنیەکان تەنگەتاو بکات. پیرۆزبایە گەرمەکانی کلیمینجـوو، کـە بڕیاربوو بەشێوەیەکی نهێنی بمێننەوە، دواتر هەر ئەو ئێوارەیە بوون بە بنێشتەخۆشەی سەرزاران.٧٦٩ تەنیا لە قسەڕەوانیدا، چینیەکان عالەم ئاشکرا براوە بوون.

بەداخەوە، کێشەی شانگتۆنگ لە مانگی ژانویەدا بڕیاری لەسەر نەدرا. دەبوایە هەتا کێبەرکێی ئاگرکەوەرەوە لە مانگی ئاڤریلدا چاوەڕوان بمایە، ئەو کاتە کە بەندە کۆتایەکانی گرێبەست لەگەڵ ئەڵمانیا دەخرانە سەریەک. تا ئەو کاتە ئاشتیکەران سەدان بڕیاریان هێنا و برد، لە دانیەک دڵسارد دەبوون، پێداگریان لە دانیەکی تر دەکرد، هەوڵیان ئەدا داواکاریە نەشیاوەکان جێبەجێ بکەن تابەڵکوو گرێبەستێک بۆ ئەڵمانیەکان بێتەدی کە هەمووی هاوپەیمانان واژۆی بکەن. چینیەکان و هیوا و ئاواتەکانی ئەوان بەشێکی بچووک و نادیار لە پلانەکانی ئەوێ بوو. ویلسۆن خەریک بوو لە چەلەحانەیەکدا دەئالا کە بۆخۆی ڕقی لێی بوو، بەدوای ڕەزایەتی ژاپۆنەوە بوو بۆ پەیمانی کۆمەڵەی گەلان، تەنانەت بەبێ بەندی بەرانبەری ڕەگەزی، لە سەر نرخی پرەنسیپەکانی خودی ئەو. ئەگەر کۆمەڵەی گەلان باشترین هیوای جیهانیان بوو، ئەوا شیاوی ئەوەبوو کە بەشێکی بچووک لە چینی قوربانی بکرێت.

* * * *

لە دابڕانی دووروودرێژدا، نوێنەرانی چینی و ژاپۆنی سەرقاڵ بوون. کاتێکە پەروەندەکەی خۆیان لەبەرانبەر جەماوەردا لەڕێگای وتار و وتوێژەوە باس دەکرد هەردوولا نیشانیان دەدا کە ئەوان بەشێکی گرنگ لە پێوەندیەکانی نێونەتەوەییان دەست خستوە. هاوکات کە شاندی نوێنەرایەتی ژاپۆن لە پاریس بەشێکی هەرە گرنگی زانیاریەکانی پێبوو، زۆربەی ئەو کەسانەی کە لە دوورەوە وەستابوون هەستیان دەکرد کە چین باشترینیان چنگ کەوتوە، ڕەنگە بەهۆی ئەوەوە بێت کە داواکاریەکانی ئەوان لەگەڵ کەش و هەوای ڕۆژدا سازگار بوون. لەماوەی نیوەی یەکەمی مانگی فەوریەدا، لەسەر دەرخستنی ڕێکەوتنامە نهێنیەکان کە چین لەگەڵ ژاپۆن واژۆی کردبوو قرەیەکی گشتی سازبوو. شاندی نوێنەرایەتی ژاپۆن بەجارێک هەژا کاتێکە کلیمینجوو و ڕێبەرانی تر پێشنیاریان کرد کە ڕەنگبێ کاری باش ئەوەبێت کە بەڵگەکان بخرێنە بەردەم کۆڕی ئاشتی. کوو، کە بەدوای دەرفەتێکەوە بوو کە ژاپۆنی پێ بترسێنێت، زۆری پێخۆش بوو و تێلێگرافێکی بۆ حکوومەتەکەی خۆی نووسی تا چەند کۆپلەیەکی بۆ بنێرن. لە پەکینگ، باڵوێزی ژاپۆن هەوڵێکی زۆری دا تا حکوومەتی چینی هان بدات کە بەبێ ڕەزایەتی حکوومەتی ژاپۆن هیچ بەڵگەیەک نەداتە دەرێ. ئەم هەواڵە دزەی کرد و بەگوێی چاپەمەنیەکان گەیشت و هیچ کە بۆچوونی چینیەکانی زیاتر چێوەختە دا بێ باوەڕی ئەمریکای بە ژاپۆن قووڵتر کرد..٧٧

نوێنەرانی چینی پسپۆڕانی و ڕۆژنامەنووسەکانی دەرەوەیان بە خواردن و خواردنەوە سەرقاڵ کردبوو. لوو بواری خۆش کرد تا حکوومەتی چین پارەیەک کۆ کاتەوە و بیدا بە حکوومەتگەلی

فەڕەنسە و بلژیک تا لە ڤێردۆن و یاپرێس قوتابخانەکان سەرلەنوێ درووست کەنەوە. بەڵام لە پشت دیمەنەکانەوە ژاپۆنیەکان باشتر هەنگاویان دەنا. هەر ئەو بەهارە لە وتوویژە نهێنیەکاندا لەگەڵ لیۆد جۆرج و بالفۆر، لەگەڵ کلیمینجوو و وەزیری دەرەوەی ئەو، پیچۆن، ئەوان ئەو دڵنیابوونەی کە بەدوایەوە بوون بەدەستیان هێنا. هەرچەند ئەوان چاوەڕوانی زۆریان لە شاندی ئەمریکی نەدەکرد، ئەوان لەگەڵ هاوس دانیشتنی زۆر نزیکیان هەبوو. بە واتەی ژاپۆنیەکان، چینیەکان تەنیا لەبیری ئەوەدابوون پەیمان شکێنی بکەن. ئەوەیکە لە هەمووی زیاتر یارمەتی پەروەندەی ژاپۆنی دا بەتاسەبوونی ئەوان بوو بۆ ئەوە کە بەندی بەرابەری ڕەگەزی پێشکەش نەکرێت.٧٧١

لە ٢١ی مانگی ئاڤریلدا، دروست بەرلەوە کە ئیتالیەکان بچنە دەرەوەی کۆڕی ئاشتی، ماکینۆ و چایندا داوایان لە ویلسۆن و لانسینگ کرد بەوان بلێت کە ژاپۆن خوازیاری ئەوەبوو کە بەرلە کۆتایی هاتنی کاتی گرێبەست لەگەڵ ئەڵمانیا قرە لەگەڵ چین داکووژێت. ئەوان هەڕەشەیان دەکرد کە ئەگەر بێتو نەتوانن ئەوە بکەن وەڕەزیەکی زۆر سەرتاسەری جەماوەری ژاپۆن دەتەنێتەوە. ویلسۆن ئەو دوانیوەڕۆیە لەگەڵ کلیمینجوو و لیۆد جۆرج کۆڕێکی بەست؛ هەرسێ ڕیبەرەکە، کە بەتەمابوون بڕیاری سەر شانگتۆنگ وەدرەنگ بخەن، هەستیان بەوەکرد کە پێویستە بەرپەرچی داواکەی ژاپۆن بدەنەوە. بەواتەی هانکەی " لەدەستدانی لێژنەی ئیتالی بەرلە پێشکەشکردنی گرێبەستی ئەڵمانی زۆر خراپ دەکەوت، بەڵام ئەگەر پێنجەمین هێزی بانگێشتکەر [ژاپۆن] ئەویش نوێنەرەکانی خۆی کشاندبوە دواوە، سێ هێزەکەی تر کە بەرپرسی گرێبەستەکە بوون دەکەوتنە حەچەلێکی ناخۆشەوە." لانسینگ گازندەی لە کەش و هەوای ناو پاریس دەکرد کە گوایە جۆرێکە لە " ماتریالیسزمی خۆویست کە بە لەبەرچاونەگرتنی مافە ڕەواکان گڵاو کراوە" و پرسیاری دەکرد کە " بلێی بیروباوەڕی ئەمریکی لەبەرانبەر ئەم ڕۆحە شەیتانیەی سەردەمانی ڕابردوو ملکەچ بێت.؟"٧٧٢

سەرلەبەیانی ٢٢ی مانگی ئاڤریلدا، ماکینۆ بە شۆڕای چواریاری ڕاگەیاند کە داواکانی ژاپۆن سەرلەنوێ بخاتەوە بەرباس. بێجگە لەوانە ئەو بە ووردی ڕەشنووسەکانی بەندەکانی بۆ گونجاندن لەناو گرێبەستی ئەڵمانیدا ئامادەکرد. ویلسۆن دەستەوداوێنی ژاپۆن بوو تا بیر لە بەرژەوەندیەکانی دوورمەودای ژاپۆن و هینی جیهان بکاتەوە. نەتەوەکان بەرەو ئەوە دەچوون کە زیاتر بیر لەیەکتر بکەنەوە تا لەخۆیان. ئەوە، بەگشتی، ئامانجی کۆمەڵەی گەلان بوو. ئەگەر ژاپۆن پێداگری لە مافەکانی خۆی لە چین بکردایە، ڕقی چینی هەڵدەستاند و لەخۆی دەتاراند. و ئەوە زیانی بۆ گلایەک دەبوو. " سووتەمەنیەکی زۆر لە وڵاتی چین هەبوو کە ئەگەر ئاوریان بگرتایە، لەوانەبوو

هەر نەکووژێتەوە." نوێنەرانی ژاپۆنی بەرێزەوە گوێیان شل کردبوو بەڵام سیاسەتمەدارانی کۆڕەکەیان ئاگادار کردبۆوە، ئەگەر ئەوان ئەو شتانەی خوازیاری بوون نەتوانن بەدەست بێنن، ئەوان ناتوانن گرێبەستەکە واژۆ بکەن.٧٧٣

ئەو دوانیوەڕۆیە نۆرەی چین بوو. ژاپۆنیەکان لە دانیشتنەکەدا ئامادە نەبوون، ئەوان ژیرانە بیریان کردەوە و بڕیاریان دا کە نایانەوێت لەگەڵ کووی بەهێز بکەونە چەلەحانەوە. شاندی نوێنەرایەتی ژاپۆن گوێی دایە ئاشتیکەران و هەوڵی دا ئەوان لە مەبەستەکانی خۆی تێبگەیەنێت. لیۆد جۆرج باسی ئەوەی کرد کە بۆچی بەریتانیەکان بەڵێنیان دابوو کە پشتگری لە داواکانی ژاپۆنیەکان بکەن. ئەو ئاگاداری دەکردنەوە کە ئەو هەل و مەرجە تووشەی کە لە ساڵی ١٩١٧ تووشی بەریتانیا هاتبوو وەبیری خۆتانی بێننەوە. بەریتانیا پێویستی بە یارمەتی ژاپۆن بوو بۆ ئەوە کە لە هەڵمەتی ژێردەریایی ئەڵمانیا ڕزگاری بێت. ئێمە چارمان نەبوو جگە لەوە کە داوای ناردنی پاپۆڕی ڕووخێنەر لە ژاپۆن بکەین، و ئەویش ئەوەندەی کە لەو مامەلەیە بە قازنجی دەبوو بۆی دەناردین."٧٧٤

ویلسۆن پێشنیاری ئەرخەیانبوونی کرد. کۆمەڵەی گەلان لەوە ئەرخەیان دەبوو کە چیتر چین پێویست ناکا ترسی هێرشێک لەلایەن ژاپۆن یان هەر وڵاتێکی تری لەدڵ دابێت. و ئەو پاڕاوە تا لەوە تێبگەن. زلهێزان بەهۆی ئەوەکە هەمووی ڕێکەوتنەکان لە سەردەمی شەڕدا واژۆ کرابوون کەوتبوونە ناو هەڵوێستێکی زۆر ترسێنەرانەوە. ئەو زۆر خۆی بە هاوخەمی چینیەکان دەزانی بەڵام ئەوانیش دەبێ لەوە تێبگەن کە گرێبەستەکان، وەکوو گرێبەستی خۆیان لەگەڵ ژاپۆن، پیرۆز بوون. " چون ئەم شەڕە لەڕێگای ناڕازیبوونی وڵاتانی ڕۆژئاوا بە پێشێل کردنی گرێبەستەکە دەستی پێکرد، پێویستە ئێمە بەگشتی ڕێز لە گرێبەستەکان بگرین." لیۆد جۆرج ڕازی بوو: " ئێمە نابێ وەک کوتە کاغەزێک سەیری گرێبەستەکان بکەین کە هەرکات پێمان خۆش بوو بیاندڕین و فڕێیان بدەین." بە واتەی چاودێرێکی تووڕەی چینی کەش و هەوایەکی کەمتەرخەمی، بێ لایەنی و نەزانکاری باڵی بە سەر وڵاتدا کێشابوو"، کلیمینجوو ئاماژەی بەوەکرد کە ئەوەی لیۆد جۆرج بە زاری داهات ئەمیشی دەگرتەوە.٧٧٥

کوو هەرچی قسەڕەوانی و لێهاتوویە ختیە گەڕ تا ڕەوتی شەپۆلەکەی پێ بگۆڕێت. بۆ ڕایەکی تر ڕاپگەیاندەوە کە ئەو ڕێکەوتنەکانی کە چین لەگەڵ ژاپۆن بەستوونی هیچ ڕەواییەکیان نیە. لە چەند وتەی نوقڵانەبەخشدا، ئەو بیسەرانی خۆی بەئاگا هێنایەوە کە چین کەوتۆتە سەر دوو ڕێ. زۆربەی هەرەزۆری چینیەکان بە ئاواتەوەبوون لەگەڵ ڕۆژئاوا هاریکاری بکەن، بەڵام ئەگەر ئاشتیکەران دادپەروەرانە لەگەڵیان هەڵس و کەوتیان نەکردبایە لەوانەبوو

هەڵگەڕاپەتنەوە، ڕەنگە بەڵای ژاپۆندا. " لە چین پارتێک هەیە کە ئاسیا بە ملْکی ئاسیایەکان دەزانێت." (لە دەیەکانی ۱۹۳۰دا، کاتێکە ژاپۆن دەستی بەسەر بەشە گەورەکانی چین داگرت، لەڕاستیدا هەستی کرد لەگەڵی بەڕووی خۆشەوە هاریکاری دەکرێت.) ئەو بە ئاگادارییەک کۆتایی بە قسەکانی هێنا. "پرسیارێکە دێتە ئاراوە ئەمەیە کە ئایا ئێمە دەتوانین ئاشتیەکی نیو سەدەیی بۆ ڕۆژهەڵاتی دوور مسۆگەر بکەین. یان نەخێر کەش و هەوایەک دێتە ئاراوە کە دتوانێ لەماوەی دە ساڵدا شەڕێکی گەورە ساز بکات." بێجگە لە پێداهەڵکوتن بە هەوڵ و بڕیارەکەی ئەو بۆ گەڕاندنەوەی کێشەی شانگتۆنگ بۆ لیژنەی پسپۆڕان کوو نەیتوانی هیچ شتێکی دەست کەوێت. ئەمانە دەبوایە تا ۲۲ی مانگی ئاڤریل بۆ شۆڕای چواریارگوزارش بدرانایە لەسەر پرسێکی بە بەراورد ناگرنگی وەک ئایا چین بە قازانجی تەواو دەبوو ئەگەر ژاپۆن زێدەمافەکانی ئەڵمانیای پێببەخشرێت کە لە ساڵی ۱۹۱٤دا لەگۆڕێدا بوون یان ئەو زێدەمافانەی کە لە ڕێکەوتنەکانی سەردەمی جەنگدا بەدەستی هێنابوون. لیژنەکە لەماوەی دوو ڕۆژدا گوزارشێکی درووست کرد کە یەکەمینیانی لا پەسەند بوو.۷۷٦

چەند ڕۆژی دواتر کۆڕی ئاشتی ئاڵۆزترین ڕۆژانی خۆی تێپەڕکرد. لە ئاکامدا ئیتالیا هاتبوە دەرێ. ویلسۆنی ترساو بۆ ڕێنوێنی کردن بەسەر چاردە خاڵەکەی خۆیدا چوەوە. پرەنسیپی خود-موختاری ئاشکرا بوو: نابێ ئیتالیا فیوومی پێ بگات و نابێ ژاپۆن شانگتۆنگی پێبگات. قەیرانی ئیتالیا مانۆڕەکانی سەر شانگتۆنی چڕوپڕتر کرد. چینیەکان یاداشتێک و چەند نامەیەکیان بۆ ویلسۆن نارد؛ نوێنەرانی ژاپۆنی بەدەم بانگێشتەکەوە هاتن. لەگەڵ ئەوەش ماکینۆ و چایندا چاویان بە بۆنسال، یاریدەدەری هاوس، کەوت تا لەبابەت ئەو شتە نارەوایانەوەی کە چاپەمەنیەکانی چینی دەیخەنە پاڵ ژاپۆنیەکان گلەیی بکەن و بۆ ڕایەکی تر هەڕەشە بکەن کە ژاپۆن گرێبەستەکە واژۆ ناکات. بۆنسال ئاماژەی بەوەکرد کە ماکینۆ ئاوری لێدەبۆوە. سایۆنژی پەیامێکی ڕیزلینانی بۆ ئاشنای دێرینی خۆی کلیمینجوو نارد، کە دەیگوت ژاپۆن خوازیاری ئەوەیە کە کێشەی شانگتۆنگ هەرچی زووتر داکووژێت.۷۷۷

لە ۲٥ی مانگی ئاڤریلدا شۆڕای چوار یار (کە ئێستا بە هەڵگەڕانەوەی ئیتالیا ببوونە سێ یار) بالفۆری نارد تا سەبارەت بە ئەگەری دانووستانێک لەگەڵ ژاپۆنیان وتویژ بکات. بلێی ئەوان بەڵێن بدەن ڕۆژێک مافەکانی ئەڵمان بگەڕێننەوە؟ بە دەستپێشخەری خۆی، ویلسۆن لەسەر ڕاسپاردەیەکی هاوچەشن لانسینگی خستە دەرەوە، نە بالفۆر و نە لانسینگ زۆر دوور نەکەوتبوونەوە؛ ژاپۆنیەکان لەسەر مافەکانی خۆیان پێداگریان دەکرد. ئەوان پێشنیاری مامەڵەیەکیان بە بالفۆر دا. ئەگەر زلهێزان داواکانی ئەوانیان لەسەر شانگتۆنگ قەبووڵ بکردایە، ژاپۆن بەڵێنی دەدا کە سەبارەت بە لابردنی

بەرابەری رەگەزی کاتێکە کۆمەڵەی گەلان لە دانیشتنی گشتی کۆڕەکەدا بۆ پەسەندکردنی کۆتایی کۆبوونەوە نەیکاتە هەراوهۆریا. ئەوان لای لانسینگ گلەییان کردبوو کە وڵاتەیەکگرتوەکان هەمووکاتێک گومانی لەسەرە کەچی ژاپۆن تەنیا بە بیروباوەڕێکی درووستەوە هەنگاو دەنێت و گومان لە هیچ کارێکیدا نیە.٧٧٨

لە رۆژی شەنبەی ٢٦ی مانگی ئاڤریلدا، ئەو کاتەی کە بالفۆر گوزارشەکەی خۆی لەسەر هەڵوێستی ژاپۆن ئامادە دەکرد، لەلایەن ماکینۆوە سەردانێکی تری لێکرا، و مامەڵەیکی نادڵنیا لەسەر شانگتۆنگ هاتە ئاراوە. ئەگەر ژاپۆن بیتوانیایە دەستی بەسەر مافەکانی ئابووری ئەڵمان لە شانگتۆنگدا بگرتایە، بەندەری ناو تسینگتائۆ، رێگاکانی شەمەندەفەڕ (وەکوو ئەو رێگایانەی کە هێشتا درووست نەکرابوون) و کانزاکان، ئامادەیی ئەوەی دەبوو کە پاشەکشێ بە هێزە داگیرکەرەکانی خۆی بکات. بالفۆر لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە ژاپۆن لەڕووی دڵئاواییەوە رێگە بە هاوڵاتیانی نەتەوەکانی تر دەدا تا لە بەندەر و رێگاکانی شەمەندەفەڕ کەڵک وەرگرن. بێجگە لەوانە، ئەو وڵاتە ئامادەبوو تا کۆنترۆڵی سیاسی بەسەر ناوچەی جەنگیدا هەرچی زووتر بگەڕێنێتەوە دەست چینیەکان. کاتێکە چینیەکان بەم بەڵێنەیان زانی کەوتنە گومانەوە. هەرجۆرێک بێت، لەم قۆناغەدا شانگتۆنگ کێشەیەکی وەها نیشتمانی لێدەرهاتبوو کە قەبووڵکردنی هەر جۆرە کۆنترۆڵێکی ژاپۆنی بۆ ئەوان گران تەواو دەبوو. ژاپۆنیەکان بەش بە حاڵی خۆیان هەستیان دەکرد کە ناتوانن لەوەزیاتر زێدەماف وەرگرن. دەستوورەکان لە تۆکیۆوە داوای بەرخودانیان دەکرد؛ ئەگەر چین رێگەی بدرایەتێ کە بە سووک و چرووک لەگەڵ ژاپۆن هەڵس و کەوت بکات ژاپۆن لە سەرتاسەری رۆژهەڵاتی دووردا قورسایی و پرستیژی خۆی لەکیس دەدا.٧٧٩

سەرلەبەیانی رۆژی دووشەنبە دوا ئەوەیکە بالفۆر گوزارشی خۆی بە شۆڕای چوار یار ڕاگەیاند، ماکینۆ " زۆر بە نەرم و نیانی بەڵام بە سووربوونێکی تەواوە" ئاماژەی بەوەکرد کە داواکانی ژاپۆن پێویستە وەک یەکێجێک هەڵس و کەوتیان لەگەڵ بکرێت. ژاپۆن تازە لەسەر بەندی بەرابەری رەگەزی دۆڕاندبووی؛ ئەگەر بێتو لەسەر شانگتۆنیش بیدۆڕاندایە " زۆر بۆی گران تەواو دەبوو". کاتی زۆری بە بەرەوە نەبوو؛ کۆبوونەوەی گشتی کۆری ئاشتی هەر ئەو دوانیوەڕۆیە بەرێوەدەچوو تا دوا پەسەندی خۆی بدا بە دەست کۆمەڵەی گەلانەوە. ئەگەر بێتو ژاپۆن سەبارەت بە لابردنی بەرابەری رەگەزی لە پەیماننامەکەی خۆیدا بەتوندی نارەزایەتی خۆی دەربڕیایە ترس و دڵەڕاوکێ دەکەوتە هەناوی زلهێزانەوە. لەوەخراپتر ئەوەبوو ئەگەر ژاپۆن بهاتایە و دژ بە کۆمەڵەی گەلان دەنگی بدایە. بە ڕازیبوونی نابەدڵی ویلسۆن، شۆڕا بریاری هێنا سەر ئەوە کە بالفۆر نامەیەک بۆ ژاپۆنیەکان بنووسێت تا مامەڵەی سەر شانگتۆنگ قەبووڵ بکەن.٧٨٠

بەیکێر، ئەمینداری چاپەمەنی ویلسۆن، سەرەک کۆماری ئاگادار کردەوە کە ڕای گشتی جیهانیان سەبارەت بە کێشەی شانگتۆنگ پشتگری لە چین دەکات. ویلسۆن لە وڵامدا وتی کە " بەڵام ئەگەر ئیتالیا دوورەپەرێز بوەستێت و ژاپۆن بگەڕێتەوە وڵاتی خۆی، کۆمەڵەی گەلان چی بەسەر دادێت؟" دوائەوەی کە ماکینۆ لە ٢٨ی مانگی ئاڤریلدا لە دانیشتنی گشتی وتارێکی ووشک و ناخۆشی پێشکەش کرد کە تێیدا ئەو بەحاڵ پەنجەی بۆ بەندی بەرابەری ڕەگەزی درێژ کرد، لانسینگ، کە لەبابەت مامەلەی کۆتایی هیچی پێ نەوترابوو، خێرا تێگەیی کە چی ڕووی داوە. ئەو بەگوێی هاوسی چرپاند کە ئەوە بەمانای پشتکردن لە یاسایە. هاوس لە وڵامدا وتی کە "ئێمە دەبوایە پێشتر بمانکردایە." لانسینگ بەتووڕەییەوە وتی کە " بەڵێ، ئەوە کراوە و ئەمە شوومی ئەم کۆڕەیە." لە ڕاگەیاندنێکدا کە ئەو دواتر بۆ چاپەمەنیەکانی دارِشت، ویلسۆن تەکبیرەکەی بە " تەکبیرێکی دڵخۆشکەر وەسف کرد کە دەکرا لە کۆمەڵێک گرێبەست کە تێیاندا خودی چین بەشداری هەبێت گیر کەوێت."٧٨١

چینیەکان هەپروون بەهەپروون ببوون. لوو پەیامێکی شکۆداری بۆ ویلسۆن نارد. چین پشتی بەستبوو بە چارەە خاڵەکەوە و بە بەڵێنی ڕێگایەکی تازە بەرەوپێشبردنی پێوەندیە نێونەتەوەییەکان. " ئەو، بەگشتی، پشتی بە ڕاستی و درووستی پەروەندەی خۆی بەستوە. بەڕای ئەو ئاکامەکەی دڵساردیەکی ناخۆش بوە." ڕاوێژکارانی خودی ویلسۆن یەکدەنگ کردیانە سەری تا بەرەنگاری داواکاریەکانی ژاپۆن بێتەوە، ئاکامەکەی هەرچی دەبێت بابببێت." بلیس بیری لە دەستلەکارکێشانەوە دەکرد تابەڵکووگرێبەستەکە واژۆ نەکات؛ بە یارمەتی هاوکارەکانی خۆی لانسینگ و وایت، ئەو نامەیەکی توندوتیژی بۆ ویلسۆن نووسی کە تێیدا هێنابووی "ئەگەر ڕەوا بێت پۆلیسێک، کە جانتای دەستی تۆ دۆزیوەتەوە، شتی ناوجانتاکە هەڵگرێ و بانگەشە بکات کە ئەو لە گەڕاندنەوەی جانتای خاڵیدا ئەرکی خۆی بەجێ هێناوە، ئەوسا دەکرێ لەگەڵ ڕەوشت و ئاکاری ژاپۆن هەڵبکەین." و ئەو قامکی خستە سەر کێشەی ئەخلاقی. ئەگەر شانگتۆنگ بە ژاپۆن ببرێت، بۆچی ئیتالیا فیوومی پێ نەبرێت؟ ئەو هاتە سەر ئەم ئەنجامە کە " ئاشتی شتێکی پەسەندکراو و باشە، بەڵام شتیتر هەن کە لە ئاشتی خۆشەویسترن، دادپەروەری و ئازادی."٧٨٢

ویلسۆن ئەوەی لەدەستی هات بۆ کەمکردنەوەی زیان و زەرەر کردی، و تەنانەت ئەوەندەی هەوڵدا کە نزیک بوو گیانی خۆشی لەسەر دانێت. ئەو بە دوکتوورەکەی خۆی ڕاگەیاندبوو کە " دوێشەو نەمتوانی ساتێک هەدا بدەم، مێشکم بە کێشە و ئاڵۆزی ژاپۆنیەکان و چینیەکانەوە خنڕابوو." گرەیسان لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە قەت ئەوەندە ماندوو و شەکەت ئەوی نەدیبوو. ویلسۆن پێداگری لەسەر ڕوونکردنەوەیەکی وردی ئەو شتانە کرد کە ژاپۆن خەریک بوو لە چین بەدەستی

دێنا، درووست بەرەوخوار بۆ پێکهێنانی پۆلیسی ڕیگای شەمەندەفەڕ لە شانگتۆنگ. (ئەوان دەبوایە، لە هەرشوێنێک کە پێویست بوایە، چینی لەگەڵ فێرکاری ژاپۆنی بوونایە.) ئەو کاتەی کە بەندەکانی گرێبەستی شانگتۆنگ لە دانیشتنی شۆڕای چوار یاردا لە ٣٠ی مانگی ئاڤریلدا بۆ مەبەستی کۆڵینەوەی کۆتاییان بهاتنایەتە بەرباس، هاوڕێ لەگەڵ ئەوەش ئەو لەلایەن نوێنەرانی ژاپۆنیەوە سەرزارەکی دڵنیا کرایەوە کە ژاپۆن لە ئاکامدا دەسەڵاتی خۆی بەسەر شانگتۆنگدا دەگەڕێنێتەوە بۆ چین. ژاپۆنیەکان قایمکاریان کرد و نەیانهێشت ئەمە بچێتە سەر کاغەز چون لایان وابوو کە ئەگەر بێتو ئەم زانیاریە دزە بکات و بەگوێی خەڵکی ئاسایی بگات ئاورێک لەناو ڕای گشتی لە ژاپۆن ساز دەکات.[٧٨٣]

لەم قۆناخەدا، هەواڵی ئەوە کە کارەکان دژ بە وڵاتی چین دەچێتەپێشێ دزەی کردبوە دەرەوە. پاریس لە دەنگۆی جۆراوجۆر جمەی دەهات، کە چاپەمەنیەکان هەڵیان دەگرتنەوە. سەرلە ئێوارەی ٢٩ی مانگی ئاڤریلدا، خوێندکارانی چینی لە پاریس کۆبوونەوەیەکی چڕوپڕیان لە هۆڵێک لە ڕوو دانتۆن ساز دابوو. وتەبێژەکان یەک بە دوای یەک ڕۆژئاوایان دەکوتا. وانگ چینگوەی، کە دواتر وەک سەرۆکی حکوومەتێکی بێ دەسەڵاتی ژاپۆنی لە چین ناوی دەرکرد، بە ئینگلیزیەکی ڕەوان لەبابەت هەڵوێستی بەرەنگاربوونەوەی چینیەکان هۆشداری دا. ژنەخوێندکارێکی لاو لە بواری هونەردا داوای کۆتایی هێنانی باسی ئاشتی کرد: " پێویستە کە ئێمە بە زۆرەملێ بچینە پێشێ." ئیوجێنێ چێن، ڕۆژنامەنووسێک کە دواتر بوو بە وەزیری دەرەوەی چین، ڕیگەچارەیەکی پێشنیار کرد کە چوار یاری گەورەی دەکوتا و ویلسۆنی بەجیا دەهێشتەوە بۆ دادگایەکی تایبەت. بەکۆی دەنگ ئەو ڕێگەچارەیە پەسەندکرا. ئەو شەوە ئاسایشی ویلسۆن زیاتر لە جاران بەهای پێدرا.[٧٨٤]

شاندی نوێنەرایەتی چینی لە ٣٠ی مانگی ئاڤریلدا وردەکاریەکی تەواوی لەسەر تەکبیرەکە پێگەیشت. یەکێک لە ئەندامەکان بەناهۆمێدی خۆی دا بە عەرزدا. کاتێکە بەیکێر ئێوارە درەنگ وەخت گەیشتە هۆتێل لووتیتیا تا باسی لێبووردنی ویلسۆن و هاوخەمی ئەو بۆ جەماوەر بگێڕێتەوە، چاوی بە جەماوەرێکی دڵتەنگ کەوت کە سەرلۆمەی سەرەک کۆماریان دەکرد لەوە کە ئەوانی سەرشۆڕ کردوە. هەندێک لە ئەوان خوازیاری ئەوەبوون کە خێرا پاریس چۆڵ کەن و حازر نەبن گرێبەستەکە واژۆ بکەن. (کوو دواتر بە بۆنسالی ڕایگەیاند کە تەنیا کاتێک حازرە واژۆی بکات کە لەلایەن حکوومەتەکەیەوە دەستووری ڕاستەوخۆی پێبدرێت: " هیوادارم کە ئەوان من مەجبوور نەکەن واژۆی بکەم. ئەوە بە مانای حوکمی ئێعدامی من دەبێت.")[٧٨٥]

لە لایەکی تری جیهانەوە وتووێژەکانی پاریس بە سەرنجێکی تایبەتەوە سەیر کرابوون. شاندی نوێنەرایەتی چینی بە تێلێگرام بۆمباران کرابوون، لەلایەن ڕێکخراوەکانی خوێنداکارانی چینیەوە، ژووری بازەرگانی، تەنانەت یەکیەتیەکان، هەر هەموویان باسیان لە ئیمان و باوەڕی ئەوان دەکرد بە چارەد خاڵەکەی ویلسۆن و دڵنیابوونی ئەوان لەوە کە کۆڕی ئاشتی ڕێز لە داواکاریەکانی چین دەگرێت.٧٨٦ لە یەکەمین حەفتەی مانگی مەیدا، ڕۆژنامەکان لە شارە گەورەکانی چین گوزارشیان دەدا کە مافەکانی شانگتۆنگ خەریکن دەکەونە دەست ژاپۆنیەکان. ناسیۆنالیستەکانی چین بە دەست حکوومەتەکەی خۆیانەوە بەتەنگەوە هاتبوون بەڵام لە حکوومەتەکەی خۆیان زیاتر بە دەست زلهێزانی ڕۆژئاواوە.

لە شەوی ٣ی مانگی مەیدا، شەنبەیەک، خوێندکاران لە زانکۆی پەکینگ، شوێنێکە سەنتەری ورووژانی ناسیۆنالیستی بوو، لە هەمووی زانکۆکان و کۆلیژەکانی شارەوە نوێنەریان لە دەوری یەک کۆکردەوە تا پلانی خۆپیشاندانێک بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر لە گۆڕەپانی گەورەی تینامێندا برێژن. کۆبوونەوەکە جمەی دەهات و هەست و سۆزێکی بەرزی نیشتمانپەروەری باڵی بەسەردا کێشابوو. خوێندکاران بڕیاریان هێنا سەر ئەوە کە بۆ شاندی نوێنەرایەتی چین لە پاریس تێلێگرام بنێرن و داوایان لێبکەن کە گرێبەستەکە واژۆ نەکەن. کوڕێکی گەنج قامکی خۆی بڕی و بە خوێن بە سەر دیوارەوە داوای گەڕاندنەوەی تسینگتائۆی کردبوو.٧٨٧

ڕق و تووڕەیی ناسیۆنالیستەکانی چینی تەنیا مەحکووم کردنی بڕیارەکەی شانگتۆنگی نەدەگرتەوە. یەکێک لە خوێندکارەکان ڕووداوەکەی ئاوا بۆ گێڕاوینەتەوە:

ئەو کاتەی کە هەواڵی کۆڕی ئاشتی پاریس بەگوێی ئێمە گەیشت ئێمە هەرهەموومان سەرسام ماین. ئێمە خێرا ئەم ڕاسیتیەمان بۆ دەرکەوت کە وڵاتانی دەرەوە ئێستاش هەر لووتبەرز و نیزامیگەرن و ئەم ڕاستیە کە ئەوان هەر هەموویان کەڵە درۆزنن. دووهەمین شەوی مانگی مەیم جوان لەبیرە کە هیچ کامێکمان نەنووستین. گرووپێک لە هەڤاڵانی من و خودی خۆن تەواوی شەوەکەمان بە قسەوباس بردەسەر. بەم ئاکامە گەیشتین کە شەڕێکی گەورەتری جیهانی درەنگ یان زوو لە ئارادایە، و ئەوە کە ئەم شەڕە گەورە لە ڕۆژهەڵات بەری پێدەگیرێت. ئێمە لەگەڵ حکوومەتەکەی خۆمان هیچمان لە دەست نەدەهات، حکوومەتێک کە باشمان دەناسی، و هاوکات ئێمە نەماندەتوانی پشت بە پرەنسیپەکانی بەناو ڕێبەری گەورەی وەکوو ودرۆ ویلسۆن ببەستین. کە سەیری کۆمەڵگا و کۆمەڵانی بەستەزمانی لەدنیا بێ خەبەرمان دەکرد، هیچمان لە دەست نەدەهات بەڵام هەستمان دەکرد کە ئێمە پێویستە خەبات بکەین.٧٨٨

سەرلەبەیانی ڕۆژی ٤ی مانگی مەی هەوای سارد بوو و بای دەهات. لە کاتی نانی نیوەڕۆدا زیاتر لە ٣،٠٠٠ خۆپیشاندەر لە گۆڕەپانی تینانمێن لەدەوری یەک کۆ ببوونەوە. زۆربەیان بەرگی هاوریشمی خوێندەوارانیان لەبەر کردبوو، بەڵام وەک نیشانەیەک لەبەرانبەر جیهانی ڕۆژئاوادا هەندێکیان کڵاوی خڕ و ڕەشیان لەسەر کردبوو. خۆپیشاندەران هەڵگری پلاکاردگەلێک بوون کە لێیان نووسرابوون" تسینگائۆمان بۆ بگەڕێننەوە" یان " دژ بە سیاسەتی قودرەت بوەستن" یان " چین تایبەتە بە چینیەکان." ڕێبەران هەڵگری بەیاننامەیەکی سیاسی بوون کە بەشێوەیەکی دراماتیک دەیگوت" لە شەڕی مان و نەماندا ئەمە دوایەمین دەرفەتە بۆ چین." لە دەورووبەری کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆدا حەشامەتەکە زیاتر بوو و بەرەو گەڕەکی باڵوێزخانەی بیانیەکان وەڕێکەوتن. کاتێکە حەشامەتەکە گەیشتە ماڵی وەزیرێک کە بەگشتی گومانی سیخوڕی بۆ ژاپۆنیەکانی لێدەکرا، حاڵەتێکی ناخۆش دەستی پێدان. خۆپیشاندەران ڕژانە ناو ماڵەکە، کەل و پەلی ناوماڵەکەیان ووردوپرد کرد و، چون نەیانتوانی خودی وەزیرەکە بدۆزنەوە، هەتا توانیان باڵوێزی چین بۆ ژاپۆنیان، کە خۆی حەشار دابوو، وەک دۆل کوتا. حکوومەت هەوڵی دا بە دەستگیرکردنی زیاتری ڕێبەرانی ناوداری خوێندکاران ڕاپەڕینەکە سەرکوت بکات بەڵام ئەمە تەنیا ئاورەکەی خۆشتر دەکرد. سەرۆکی کۆلیژی زانستە مرۆڤایەتیەکان دەبینیدرا کە لە سووچێکی شەقامەکە نامیلکەی بڵاو دەکردەوە. خۆپیشاندەران بەرەو شارە گەورەکانی تری چین پەرەیان سەند، و غەیرەخوێندکاران، لە کرێکارانی کەشتیەکانەوە بگرە تا دەگاتە بازاڕیان، لەگەڵیان یەک دەکەوتن. حکوومەت بەچۆک داهات؛ لەوپەڕی سووکایەتیدا داوای لێبوردنی کرد و خوێندکارەکانی ئازاد کرد.٧٨٩

ئاژاوەکان کۆتاییان بە ئەو کۆڕە ئاشتیەی تر هێنا- کۆڕێک لە شانگهای کە لە هەوڵی ئەوەدابوو باکوور و باشوری چین پێکەوە ئاشت کاتەوە. بەرەی باشوور بە داواکردنی ئەوە کە حکوومەتی پەکینک هەمووی ڕێکەوتنەکانی سەردەمی شەڕ لەگەڵ ژاپۆن هەڵوەشێنێتەوە و بڕیاری تایبەت بە شانگتۆنگ قەبووڵ نەکات هەوڵی دا سواری شەپۆلێکی ڕاپەڕاوی هەست و سۆز بێت. ئەمە لەلایەن بەرەی باکوورەوە شتێکی پەسندکراو و باش نەبوو، کە لەو کاتەدا میلیتاریەک کە ژاپۆنیەکان پشتگریان لێدەکرد باڵی بەسەردا کێشابوو، و کۆوونەوەی شانگتۆنگ بۆ ماوەیەکی نادیار پەکی خرایەوە..٧٩٠ بە نەمانی تەنانەت ئەو ترووسکایە کەمە لە هیوا بە داهاتوو، چین بە نۆ ساڵی تری پشێوی و شەڕی ناوخۆ مەحکووم کرا.

چوارەمی مانگی مەی لە گەشەسەندنی بیروباوەڕی ناسیۆنالیستی چینی قۆناخێکی زۆر گرنگ بوو. ئەو ڕۆژە بەگشتی وەبیرهێنەرەوەی سەردەمێک ڕاپەڕینی ڕۆشنبیری لە چیندایە؛ بەڵام

لەوە گرنگتر، ئەو ڕۆژە نیشانەی بەرەنگاریە لەلایەن زۆربەی ڕۆشنبیرانی چینی ڕۆژئاواوە. ئەوان بەرلە ساڵی ١٩١٩ ڕوویان کردبوە دیموکراسی و لیبراڵیزمی ڕۆژئاوا، زیاتر لەبەرهۆی ئەوەوە کە ئەوان مۆدێلێکیتریان پێ شک نەدەهات. هەندێک کەس سەبارەت بە باسوخواستی چاپەمەنیەکانی ڕۆژئاوا لەبابەت سەربەخۆیی مرۆڤ و ڕکابەری هەمیشە ترس و دڵەڕاوکێیان لە دڵدا بوو. شکستخواردنی کۆماری چین و دیمەنی لێکپچڕانی وڵاتانی ئەورووپی لە کاتی شەڕدا نیگەرانیەکەی زیاتر کردبوو. زانایەکی ناسراو کە لە سەردەمی کۆڕی ئاشتیدا وەک چاودێرێک لە پاریس بوو لە نامەیەکدا بۆ ماڵێی نووسیووی کە ئورووپایەکان وەک گەشتیارانێک وان کە لە ناوەڕاستی بیاباندا ڕێگایان ون کردبێت... ئەوان تەواو دڵسارد و بێ هیوان... ئەوان سەردەمێک بە خەیاڵی ئەوەوە دەژیان کە ڕۆژێک دەستێکی باڵایان بەسەر زانست دا هەبێت. ئێستا لەناو ئەو وڵاتانەدا باس باسی مایەپووچیە."٧٩١

زۆرجار ڕووداوەکانی مێژوو بەرێکەوت ڕووئەدەن تائەوە کە پێشتر پلانێکیان بۆ دارێژرابێت، و لە ساڵی ١٩١٩دا ئاڵتێرناتیڤێک خۆی خستە بەردەم چینیەکان. نەک ئالتێرناتیڤی گەڕاندنەوە بۆ نەریتە کۆنەکانی چین، بەڵکوو دەستووری تازە لە ڕووسیە. شۆڕشی ڕووسی نموونەیەک لە کۆمەڵگای کۆنی دەخستە بەردەم، وەکوو کۆمەڵگای چینی، کە وادیاربوو لە هەنگاوێکی جەسوورانە و شکۆداردا بەرەو داهاتوو قەڵمبازی دابوو. نائۆمێدی لە ڕۆژئاوا، ئەزموونی تاڵی ئەوان لە دیموکراسی بەشێوازی ڕۆژئاوا دواساڵی ١٩١١، و ئاڵتێرناتیڤێکی ئاشکرا کە لەلایەن ڕووسیە خرایە بەر دەم هەرهەموویان بەیەکەوە بیروباوەڕی کموونیستیان وەک ڕێگەچارەیەک بۆ کێشەکانی چین پێشکەش کرد. ئەگەر پێویستی بە جەختکردنەوەیەکی زیاتر هەبوایە، لەلایەن کۆمیسارییای تازەی بۆلشویکی بۆ کاروبارەکانی دەرەوە هەنگاوێکی کەم وێنە نرا، کەسێک کە لە هاوینی ساڵی ١٩١٩دا پێشنیاری کرد کە واز لە هەمووی ئەو داواکاری و زێدەمافانە کە لە ڕۆژانی تزاردا لە وڵاتی چین بەزۆر ستێنراون بهێنێت. (حکوومەتی بۆلشویکی قەت وەفای بە بەڵێنەکەی خۆی نەکرد، بەڵام چینیەکان لەوکاتەدا کەوتبوونە ژێرکاریگەری دڵئاوایەکەوە کە هیچ هێزێکی تر لەخۆی برووزی نەدابوو.)

ساڵێک دوا کۆڕی ئاشتی، گرووپێک لە ڕادیکاڵەکانی چینی کۆبوونەوە تا پارتێکی کموونیستی چینی دامەزرێنن. زۆربەی خۆپیشاندەرە ڕێبەرەکانی مانگی مەی ساڵی ١٩١٩ لەوێدا بەشدار بوون. سەرۆکی کۆلیژی زانستە مرۆڤایەتیەکان کە نامیلکەی بڵاو کردبۆوە یەکەمین کەسایەتی پارتەکە بوو. بەڕێبەرایەتی مائۆ-تسێ توونگ و چوو ئێن لای، کە ئەوانیش لە

سەرهەڵدانەکەی ٤ی مانگی مەیدا چالاکیان هەبوو، ئەو پارتە توانی لە ساڵی ١٩٤٩دا لە چین دەسەڵات بگرێتە دەست.٧٩٢

* * * *

لە پاریس، کوو هەوڵێکی ئازایانە بەڵام ڕوولەشکستی نا تا لە قازانجی چین بەرێکەوتنامەکەدا بچێتەوە. ئەو دەبوو لانی کەم ژیانی خۆی نەخستایەتە ژێر باری مەترسیەوە، چون چین لە مانگی ژوەنی ساڵی ١٩١٩دا گرێبەستی ڤێرسایلێسی واژۆ نەکردبوو. حکوومەت لە پەکینگ نەیدەتوانی بڕیارەکەی خۆی ساخ کاتەوە و بۆیە هیچ دەستوورێکی ڕانەگەیاند. لە هەر حاڵدا، خوێندکارانی چینی لە پاریس بە دەوری هۆتێل لۆتیتا خڕ بوونەوە تا نەهێڵن هیچ کام لە نوێنەرەکان دەربازبن.٧٩٣ لە کۆتاییدا چین لە سێپتامری ساڵی ١٩١٩ لەگەڵ ئەڵمانیا ئاشت بۆوە.

ژاپۆن لەڕێگای بەکارهێنانێکی جەسوورانەی گوشار توانی شانگتۆنگ بەدەست بێنێت. وەک هێزەکانی تر بۆی چووبوون ئایا تەفرە دەرۆیی یان ملی نەدەدا بە واژۆکردنی گرێبەستەکە؟ بەڵگەی جۆراوجۆر لەبەردەست دان. لە مانگی ئاڤریلی ساڵی ١٩١٩دا ئەو دەمەی کە وتوێژەکان گەیشتبوونە لووتکەی هەرە بەرزی خۆیان، حکوومەت لە تۆکیۆ بە شاندەکەی خۆی دەستووری دا کە بڕوایان بە پەیمانی کۆمەڵەی گەلان نەبێت ئەگەر داواکاریەکانی ژاپۆن ڕەد کرانەوە. ئایا حکوومەت لەوە ێگەیبوو کە ئەو پەیماننامە بەشێک لە گرێبەستەکە بوو لەگەڵ ئەڵمانیا؟ ڕوون نیە. هەر لەو سەردەمەدا، هەڵبەت، بەپێی بەڵگە و دۆکیۆمێنتەکانی ناوخۆی حکوومەت ژاپۆن لەوەکە دوورەتەریک و دوورەپەرێز بمێنێتەوە ترسی لە دڵدابوو. بە ئەگەری هەڵوێستێکی جەسوورانە لەبەرانبەر ئەو وڵاتەدا بۆ ئەوە کە لە مافەکانی شانگتۆنگ بێ بەش کرێت لەوانەبوو وازی بهێنایە. بەرلەوەی بەندەکانی شانگتۆنگ لەلایەن شۆڕای چوار یارەوە لە ٣٠ی مانگی ئاڤریل بڕیاریان لەسەر بدرێت، سەرەک وەزیری ژاپۆن، کەی هارا، بە نوێنەرەکانی خۆی لە پاریس ڕاگەیاند کە بە ئەگەری هەر بەرەنگاریەکی لەوچەشنە بۆ زانیاری زیاتر مەحتەل بمێنن.٧٩٤

ژاپۆنیەکان بە هەست و سۆزی جۆراوجۆرەوە پێشوازیان لە سەرکەوتنەکەی خۆیان لە پاریس کرد. کاتێکە شاندی نوێنەرایەتی گەیشتەوە وڵات، ئەندامانی ئەو شاندە لەلایەن جەماوەرێکەوە پێشوازیان لێکرا کە لەوەکە شاندەکە نەیانتوانیبوو بەندی بەرانبەری ڕەگەزی بۆخۆیان مسۆگر بکەن دەنگی نارەزایەتیان لێوەهات. سایۆنژی لە گوزارشی فەرمی خۆیدا لە ئیمپراتۆڕ داوای

لێبووردنی کردبوو: " لەوەکە نەمانتوانیوە بەتێکڕای ئاواتەکانی خۆمان بگەین هەست بە ناڕەحەتی دەکەم." هەرچەند، ئەو ئاماژەی بەوەکرد کە پێگەی ژاپۆن لە جیهاندا بەرزتر لەوەیە کە لە ساڵی ١٩١٤دا بوو.٧٩٥ بەواتایەکی تر، نوێنەران لە پاریسەوە دەهاتن و دڵنیابوون لەوەکە ولاتەیەکگرتووەکان لە چین بەرهەڵستیان دەبێتەوە. ڕەنگە ئەوان ڕاستیان کردبێت. لە هەڵبژاردنەکەی ساڵی ١٩٢١ کە وارێن هاردین بە سەرەک کۆماری هەڵبژێردرا ڕێبەرایەتیەکی ئەمریکی زیاتر دژە-ژاپۆنی هاتە ئاراوە. بەهۆی ناکۆکیەکانی ناو ولاتی چین- لەسەر کۆنسۆرسیوومی وام، بۆ وێنە، هەرکیان تێیدا ئەندام بوون- و بەهۆی جیاوازی بەردەوام دژ بە هاوولاتیانی ژاپۆنی لە ولاتەیەکگرتووەکان پێوەندی لەوەپێش ناخۆش لەگەڵ ولاتەیەکگرتووەکان لە دەیەکانی ١٩٢٠دا ئاڵۆزتربوو.

سەرکەوتن بەسەر شانگتۆنگدا لە ڕێگاگەلی تروەە خەرج هەڵگربوو. لە چین، سەرهەڵدانی ناسیۆنالیستی، کە نیشتنەوەی نەبوو، ڕەنگ و بۆی توندوتیژی بەخۆوەگرت، و لەبەرانبەر بازاڕی ژاپۆنیدا تەگەرەیەکی گەورەی دانا. لەگەڵ ئەوانەشدا، پێوەندیەکانی ژاپۆن لەگەڵ هێزەکانی تر کەم و کەمتر دەبۆوە. بەریتانیەکان سەبارەت بە داهاتووی هاوپەیمانی دەریایی ئانگلۆ-ژاپۆن چاک بەخۆیان داهاتنەوە. ئەم بیرۆکە کە ژاپۆن " ڕووسیەی زەردپێستە" لە ڕۆژئاواوە ڕیشەی داکوتابوو. لە هاوینی ساڵی ١٩١٩دا، کۆرزۆن سەبارەت بە هەڵس و کەوتی ژاپۆن لەگەڵ چین وتارێکی پێشکەش بە چایندا کرد، کەسێک کە لەو کاتەدا باڵوێزی ژاپۆن لە لەندەن بوو. ژاپۆن کارێکی بێ ئەقڵانەی کردبوو لەوە کە پێداگری لەسەر مافەکانی خۆی لە چین کردبوو؛ لە چین دوژمنایەتی و لە بەریتانیا دڵەڕاوکێی نابۆوە. کۆرزۆن کردبویە سەر باڵوێزی ژاپۆنی تا بیر لە داهاتووی هاوپەیمانی نێوان ژاپۆن و بەریتانیا بکاتەوە، و داهاتووی پرسی گشتی هێمنایەتی لە ڕۆژهەلاتی ناقیندا.٧٩٦

حکوومەتی ژاپۆنی، کە بەراوردی قوولایی دوژمنایەتیەکەی نەکردبوو، کەوتە بیری ئەوەکە دەبێ بەڵێنیەکەی خۆی کە لە پاریس ڕایگەیاندبوو هەڵگرێ واتە دەستهەڵگرتن لە زێدەمافەکانی خۆی لە شانگتۆنگ. لە سەرەتای ساڵی ١٩٢٠دا، هەوڵی دا لەگەڵ حکوومەتی چینی دەرگای وتوێژ بکاتەوە تا پاشەکشێ بە هێزەکانی ژاپۆنی لە پارێزگاکە بکات. چینیەکان هیچ مەیلێکیان نەبوو تا بابەتەکە تاووتوێ بکەن. لە پایزی ساڵی ١٩٢١دا، ژاپۆن هەوڵێکی تازەی خستە گەڕ؛ باسی لەو مەرجانەکرد کە لە چوارچێوەیاندا دەیتوانی واز لە مافەکانی خۆی لە شانگتۆنگ بێنێت. حکوومەتی چینی ولامێکی ڕوون و ئاشکرای نەدایەوە.

لەکۆتاییدا، لە کۆبوونەوەی چەکداماڵینی هێزی دەریایی واشنگتۆن، بە ناوەنجیگەری بەریتانیەکان و ئەمریکیەکان، ژاپۆن چینی بە ڕێکەوتنێک ڕازی کرد کە لەو چوارچێوەدا چین لە ٤ی مانگی فەوریەی ساڵی ١٩٢٢دا دەسەڵاتی تەواوی خۆی بەسەر شانگتۆنگدا بەدەست دەهێنایەوە. ڕیگای شەمەندەفەر کە لە بەندەری تسینگتائۆ بەرەو ناوخۆی وڵات دەچوو، و ببوە هۆی ئاڵۆزیەکی لەوچەشنە، لە چوارچێوەی پیلانێکی پێچەڵاوپووچدا بە چین فرۆشرایەوە کە بۆ ماوەی دەیەی دواتر دەیخستە ژێر کۆنتڕۆڵی ژاپۆنەوە. پێدەچوو چین لە بوارگەلی مالیدا دۆڕاوە بووبێت: ڕێگای شەمەندەفەر، وەک ژاپۆنیەکان بۆیان دەرکەوتبوو، هیچ کەڵکێکی نەبوو.٧٩٧ لە واشنگتۆن لە ساڵی ١٩٢٢دا، ژاپۆنیش گرێبەستێکی لەگەڵ هێزەکانی تر واژۆ کرد کە دەسەڵاتی چینی و سەربەخۆیی ناوچەیی ئەو وڵاتەی گارانتی دەکرد. ئەو گارانتیە کۆتایی پێهات، کاتێکە ژاپۆن هێرشی بردە ناو دڵی وڵاتی چین، و شانگتۆنگ، هاوڕێ لەگەڵ هەمووی پارێزگاکانی کەنارئاوەکان درووست بەرەو خوارەوەی باشور، کەوتنە ژێر کۆنتڕۆڵی ژاپۆنیەکانەوە.

ئەو کەسانەی کە لە پاریس ڕۆڵی خۆیان گێڕابوو پیشەی جۆراوجۆریان دەگۆڕی. دوابەدوای ڕووخانی حکوومەت لە مانگی ژوەنی ساڵی ١٩١٩دا، لوو خێنگزیانگ هیچ هیوایەتێکی بە دیپلۆماسی نەما. چەند ساڵیکی بێ دەردیسەری وەک وەزیری چین لە سۆئێد تێپەڕاند؛ دواتر، کاتێکە خێزانە خۆشەویستەکەی لە ساڵی ١٩٢٦دا کۆچی دوایی کرد، ئەو لە بلژیک چوە ناو دێرێکی بەنیدیکتین، شوێنێک کە ئەو لە ئاکامدا بوو بە سەرەک پەرستگەی ئەوێ. ئەو لە ساڵی ١٩٤٩دا کۆچی دوایی کرد و لە برووگێس نێژراوە. کوو هەروا درێژەی بە سەرکەوتەکانی خۆی دەدا، چەندین کەڕەت وەک وەزیری دەرەوە، وەک سەرەک وەزیر، و وەک باڵوێز لە لەندەن، واشینگتۆن و پاریس خزمەتی بە وڵاتی چین کرد. ئەو لە کۆمەڵەی گەلاندا نوێنەرایەتی وڵاتی چینی کرد و لە دامەزراندنی نەتەوەیەکگرتوەکاندا بەشداری هەبوو. لە ساڵی ١٩٦٦ تا ساڵی ١٩٧٦، ئەو کورسی دادوەری لە دادگای نێونەتەوەیی عەدالەت لە هەیگ بە دەستەوە بوو. لە ساڵی ١٩٧٧دا، زانکۆی کلۆمبیا بەبۆنەی نەوەدومین ساڵی لەدایکبوونی چەندین جەشنی بەرێوەبرد. مادام کوو، میراتگرێکی ژیکەڵەی لاو لە ئەندۆنیزیا کە لە ساڵی ١٩١٩ لە پاریس ئەوی یەخسیری خۆی کردبوو، لە بیرەوەریەکانی خۆیدا بەدڵتەنگیەوە نووسیویەتی: "ئەو ژیانی خۆی لەپێناو وڵاتەکەی دانابوو. ئەم ڕاستیە کە ئەو منی وەک تاکێک قەت سەیر نەدەکرد جێی سەرسووڕمان نیە. ئەو پیاوێکی خاوەن ڕێزی تایبەت بوو، لەو

پیاوانەی کە چین پێویستی پێی بوو، بەڵام نەدەکران ببێ بە مێردی مـن."٧٩٨ ویلینگتـۆن کـوو لە ساڵی ١٩٨٥دا لە تەمەنی نەوەد و هەشت ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

چەندین ئەندامی پلەخواری شاندی نوێنەرایەتی ئـەمریکی بـەهۆی هەڵوێستێک کـە ئـەمریکا لە شانگتۆنگ گرتبویـە بـەر دەستیان لەسـەر کـار کێشایەوە. لانسینگ سـەرەڕای پێناخۆشبوونی خـۆی وەک وەزیـری دەرەوە هـەر مایـەوە. ئـەو هـەمووکاتێک هەسـتی بـەوەدەکرد کـە وڵاتەیـەکگرتوەکان نابێـت لەسـەر چـین پـەنا بـۆ توندوتیژی بـەرێت. وەک پێشـتر لـە بۆنەیەکـدا هەڕەشەی کردبوو کە "ڕێگەدان بە وڵاتەیەکگرتوەکان تا بەهۆی پرسی یەکگرتوویی ناوچەگەری چـین دەسـت لـە کێشـەکانی نێونەتەوەیـەوە وەربێنـێ کـارێکی تـەواو شـێتانەیە." کاتێکـە ویلسـۆن سـەرنەکەوتوانە لەهـەوڵی ئـەوەدابوو تـا خـەڵکی ئـەمریکی هـان بـدات تـا پشـتگری لـە ڕێکەوتننامەکانی ئاشتی بکەن، یەکێک لەو باسانەی کە بەردەوام لە کۆبوونەوەی گشتیدا و لە سێنادا دەهاتە بەرباس لەسەر شانگتۆنگ پشتکردن لە چین بوو. بەبۆچوونی دەڤید هانتێر میلێر، پسـپۆڕی یاسـایی ئـەمریکی لـە کـۆڕی ئاشـتیدا، " زۆربـەی ئـەو فرمێسـکانەی کـە بـەهۆی "دەستدرێژی بۆسـەر شانگتۆنگ" دەڕژان فرمێسکی کۆماریـە تیمسـاحەکان بـوون، کـە ئەوەنـدەی بـەهایان بـە هێکووبـا دەدا ئەوەنـدە چینیـان لا گرنـگ نـەبوو." لـە دوایـەمین حەفتـەی خۆیـدا لـە ئۆفیسەکەی خۆی، ویلسۆن پەیامێکی نارد تا بـۆ بوودجەی یارمـەتی قـاتوقڕی چینیـەکان چەنـد بلیتێک بۆ تۆپێک بکڕێت. ئەو نووسیبووی " زۆر حەز دەکەم یارمەتیەکم کردبێت با زۆر کـەم و نادیاریش بێت."٧٩٩

* * * *

# ٢٥

# گەورەترین سیاسەتمەداری یوونان لە سەردەمی پێریلوکسەکان بەملاوە

لە مانگی دیسامری ساڵی ١٩١٨دا، کاتێکە شاندی نوێنەرایەتی یوونان بە مەبەستی گەیشتن بۆ کۆڕی ئاشتی ئاتێنیان بەجێ هێشت، ئەندامانی پەرلەمان یەک بە دوای یەک ڕیزیان بەست تا دەستی ڕێبەری ئەو شاندە، سەرەک وەزیر ئیلوتیریاس ڤێنیزیلۆس، ماچ بکەن. شانۆیەکی سەیر بۆ پیاوێک کە، لانی کەم لە ڕۆژئاوای ئورووپا، وەک دیموکراتێکی گەورە سەیر دەکرا. شاندەکە لە ڕۆم ڕاوەستا، ئەو شوێنەی کە ڤێنیزیلۆس لەگەڵ سەرەک وەزیری ئیتالی و وەزیری دەرەوە سەبارەت بە ململانێکردنی داواکاریەکانی ئیتالیا و یوونان بۆ ناوچەکانی تورکیە و ئالبانیا قسەوباسیان کرد. بەهیچ ڕێکەوتنێک نەگەیشتن. چاپەمەنی ئیتالیا، کە هەر لە سەرەتای سەردانەکەوە دوژمنایەتی دەکرد، کاتێکە شەمەندەفەری هەڵگری یوونانیەکان لە ئیتالیاوە بۆ فەرەنسە بەرێکەوت و دوو کرێکاری ڕێگای شەمەندەفەڕی کوشت ئاستی دوژمنایەتیەکەی بگرە لە جاران زیاتریش بوو. لە پاریس، نوێنەرەکان دەستیان بە سەر سێ نهۆم لە هۆتێل مێرسێدێس گرت، کە نزیک دەبۆوە بە هینی بەریتانیەکان. هەرچەند ژمارەی ئەوان تەنیا نۆزدە کەس بوو، ئەوان ژووری هەشتا کەسیان گرتبۆوە...٨ داواکاریەکانی یوونان لە کۆڕی ئاشتی گەشبینیەکی هاوچەشنی دەسەلماند.

شاندی نوێنەرایەتی یوونان بریتی بوو لە وەزیری دەرەوە و سەرەک کۆمارێکی داهاتوو، بەڵام تەنیا کەسێک کە حەسابی بۆ دەکرا ڤێنیزیلۆس بوو. فرانسێس ستێڤێنسۆن وتبووی کە " زۆرێکی شکۆدار لە یوونانیەکان هەم لەباری زەینیەوە و هەمیش لەباری جەستەییەوە خرابوە ناو قاڵبی کلاسیکەوە." ئەو هەتا بڵێی بەوورە بوو، هاندەر بوو، ماندوویی نەناس بوو و بەسەر بەریتانیەکانەوە بوو، ماستاوچێتی بۆ فەرەنسەییەکان دەکرد، ئەمریکیەکانی دڵنیا دەکردەوە و لەبەرانبەر ئیتالیەکاندا هیچ کاریگەریەکی

نەبوو. ئەو ڕۆژانی پازدە کاتژمێر کاری لە پاریس تێپەڕاندبوو؛ ئەو نامە و یاداشتنامەی نووسیبوو، وتویژگەلی پێشکەش کردبوو و بەسەر کەسایەتیە ناودارەکانیدا هەڵی کوتبوو. تەنانەت هانکەی کەللەڕەق و خۆبەزلزانیش گیرۆدەی ڤێنیزیلۆس بوو لە کاتی نانی نیوەڕۆدا کە " بە فەڕەنسەییەکی قزێون" مشتومڕی دەکرد یان کاتێکە " دەیکردە باری گەمژێتی"؛ " پیرەکوڕێکی کەیفخۆش؛ پیاوێکی بەڕاستی زل و ئەستوور." تەنیا چەند کەسێک پرسیاری ئەوەیان بۆ درووست دەبوو کە بلێی کاریگەری ئەو بەسەر ئاشتیکەراندا شتێکی باش بووبێت؛ چاودێرێکی ئەمریکی وتبووی کە "گومان لەوەدانیە کە ئەو نیازی پاکی هەمووی ئەو کەسانەی هەیە کە ئەو بە باشی دەناسن. بەڵام ئایا ئەمە بەڕاستی یارمەتیدەرە؟ ئەو دڵی بە هاوسۆزی و ڕێزگرتنی هەمووی نوێنەرەکان و هەمووی کەسایەتیە خاوەن دەسەڵاتەکان خۆشە، بەڵام ئەوانیش بەهۆی لەدڵەوەنزیکبوونی گشتگیر و ناسراوی ئەو ترس و نیگەرانیان لێی هەیە." ڤێنیزیلۆس گەورەترین سامانی یوونان و، لە درێژ خایەندا، گەورەترین بەرپرسیاری ئەو وڵاتە بوو. بەبێ ئەو یوونان هەرگیز ئەو شتانەی کە لەسەر کورسی کۆبوونەوەکەدا کردی نەیدەبردەوە؛ بەبێ ئەو یوونان پارووەیەک لە ئاسیای بچووکی بۆ قووت نەدەچو.٨٠١

ڤێنیزیلۆس لە ناو ناز و نەعمەتدا لەدایک ببوو، کوڕی تاجرێکی دەوڵەمەند لە کرێتی، لە سەردەمێکدا کە بەشێکی زۆر لە ناوچەکانی یوونان (وەکوو خودی کرێتی) هێشتا لەژێر دەسەڵاتی تورکیە دابوون. ئەو ئیلیتۆریاسی مەسیحیکراو بوو، " ئازادیخواز"؛ باوکی لەپێناو سەربەخۆیی یووناندا خەباتی کردبوو و سێ کەس لە مامەکانی لەو کێشەیەدا ببوونە قوربانی. ئەو کاتەی کە ڤێنیزیلۆس تەنیا دوو ساڵ تەمەنی بوو، لە ساڵی ١٨٦٦دا، ڕووداوێکی ترسێنەر هاتە ئاراوە کە ئەو قەت لەبیری نەدەچۆوە. شۆڕشێک، وەکوو زنجیرەیەک لەو شۆڕشانەی کە بەردەوام دوورگەکەی دەلەراند، کۆتاییەکی کارەساتباری بوو کاتێکە یاخیانی شەڕکەری کریتینی خۆیان لە دێرێکدا تەقاندەوە. ئەوانەی کە زیندوو مانەوە لەلایەن تورکەکانەوە بەکۆمەڵ قڕ کران.٨٠٢ کەلەپووری ئەو، مێژووی ئەو و کەسایەتی تایبەت بەخۆدی خۆی دەستیان دا بە دەستی یەکەوە و ناسیۆنالیستێکی بەسۆزی یوونانیان لێ درووست کرد.

لە ساڵی ١٨٨١ ڤێنیزیلۆس بەرەو ئاتێن ڕۆیی تا لە بواری یاسادا درێژە بە خوێندن بدات. تەنانەت لەو کاتەشدا ئەو باوەڕی تەواوی بەخۆی هەبوو، خۆی سەرومڵێک بە زیاتر دەزانی و لەناو هەڤاڵانی قوتابیدا ڕێبەر دەرکەوتبوو. ئەو زۆر لەسەرخۆ بەرەنگاری مامۆستاکانی دەبۆوە، تەنانەت کاتێکە لە تاقیکردنەوەیەکدا دەرنەدەچو هەروا بەئاسانی پێملی شکست نەدەبوو. کاتێکە گوزارش درا سیاسەتمەدارێکی میوانی بەریتانی، جۆسێف چامبێرلین، تێبینیەکی

ڕەخنەگرانەی سەبارەت بە ناسیۆنالیزمی کریتان ڕاگەیاند، ڤێنیزیلۆس داوای وتویژێکی کرد و ڕێگری نەبوون. ئەو ڤێنیزیلۆسی ئاگادار کردەوە کە تەواو لە هەڵەدایە، و بەشێوازێکی تایبەت بەخۆی ئەوی بە حەقیقەتەکان و تابلۆکان داگرت کە بەشێوەیەکی هونەرمەدانە هەموویانی پێکەوە گرێ دابوو.[۸۰۳]

زانکۆی ئاتێن، کە درووست دوابەدوای ئەوەکە یوونان سەربەخۆیی خۆی لە عوسمانیەکان ڕاگەیاند دامەزرابوو، بڕیاری زیندووکردنەوەی کولتووری کلاسیکی هەر لە سەرەتاوە ڕاگەیاند؛ تەنانەت زمانی فێرکاریش هەر زمانی سۆقرات و ئەرەستوو بوو، نەک زمانی یوونانی سەردەم. زۆربەی قوتابیانی ئەو زانکۆیە، وەکوو ڤێنیزیلۆس، خۆیان ڕاسپاردەی جیهانی هێلێنیک بۆ هاوولاتیانی خۆیان دەزانی کە هێشتا لەژێر دەسەڵاتی تورکدا بوون و هەڵنەگەڕابوونەوە. ڕۆژێکیان ڤێنیزیلۆس لە ژووری تویژینەوەکەی خۆیدا هەڤاڵانی خۆی بە دەوری نەقشەیەکدا خڕ کردەوە. بە سەر ئەو نەقشەدا ئەو سنوورەکانی یوونانی کە خۆی خوازیاریان بوو کێشایەوە: نیوەی ڕاستی ئاڵبانیای ئەمڕۆکە و نزیک بە هەمووی تورکیەی ئەمڕۆکە. قەستەنتەنیە دەبوە پێتەخت.[۸۰٤]

ئەمە *باوەڕی مێگالی*یان پێدەگوت- " باوەڕی گەورە". ناسیۆنالیستێکی سەردەمی پێشوو وتبووی کە "سرووشت ئاواتگەلی خەڵکانی تری بەرتەسک کردۆتەوە، بەڵام نەیتوانیوە لەگەڵ یوونانیەکان وابکات." *باوەڕی مێگالی* (وشەی " مێگالۆمانیا" هەر لە هەمان ڕیشەوە سەری هەڵداوە) لە خەون و خەیاڵەوە درووست بووە، لە ئیمپراتۆرێکی زیندووبۆوە کە ڕەنگدانەوەیەک بوو لە سەردەمی تەلایی ئەوکاتەی کە زمانی یوونانی لە ڕۆمەوە بگرە تا دەگاتە کریمی قسەی پێدەکرا.[۸۰٥]

لە کۆتاییەکانی سەدەدا، کاتێکە بۆیەکەم جار کریتی خۆی لە دەسەڵاتی تورکی دەرباز کرد و دواتریش پێوەندی بە یوونانەوە گرت، ڤێنیزیلۆس لەو خەباتەدا دەورێکی کاریگەری گێڕا. لە ساڵی ۱۹۱۰دا ئەو کرا بە سەرەک وەزیر. لە شەڕەکانی ناوچەی باڵکان لە ساڵانی ۱۹۱۲ ا ۱۹۱۳دا، ئەو لە قۆناخی نێونەتەوەییدا کەوتە مانۆڕلێدان کە سەرکەوتنێکی بەرچاوی بەدەست هێنا بەومانایە کە یوونان لە باکوور بەشێکی زۆری ناوچەکانی ئەوێی لەخۆ دەگرت، لە ئیپرووسەوە لە ڕۆژئاوا بەرەو مەقدوونیە و بەشێک لە ترەیس لە ڕۆژهەڵات. قەبارەی ناوچە تازەکان تا دوو کەڕەت بگرە زیاتریش زۆری کرد. هەرکە ڤێنیزیلۆس گرێبەستی ساڵی ۱۹۱۳ی بۆخارێستی واژۆ کرد، کە جەختی لەسەر دەسکەوتەکانی یوونان دەکردەوە، وتی کە " دەبا ئێستا ڕووکەینە ڕۆژهەڵات."[۸۰٦]

ڕۆژهەڵات بەمانای تورکیەی عوسمانی بوو. بەشێکی زۆر لە ڕابردووی یوونان لەوێ پۆنگی خواردبۆوە: ترۆی و دەوڵەت-شارە گەورەکان بەدرێژایی کەنارئاوەکانی ئاسیا-پێرگامووم، ئیفیسووس،

هالیکارناسووس. هێرۆدۆکتووس، باوکی زانستی مێژوو، و هەروەها هیپۆکراتێس، باوکی زانستی پزیشکی، لەوێ لەدایک بوون. لەسەر لیسبووەکان، سافۆ هەڵبەستی دانابوو، و لەسەر ساموٚکان، پیساگۆراس زانستی ئەندازەزانی داهێنابوو. لە هێلێسپانت (داردانێلێسی ئێستا)، لیندێر لەسەر خۆشەویستی هێرۆ خنکابوو؛ جەیسۆن و ئارگۆنۆتەکانی ئەو بەرەو کۆتایی ڕۆژئاوای دەریای ڕەش بە ئاودا ڕۆیشتبوون تا لە کۆلچیس (لە گۆرجستانی ئەمڕۆکە) فلیسی تەڵایی بستێننەوە. ئیمپراتۆری بیزانتین و مەسیحیەت تویژێکی تر لە بیرەوەریەکان و بنەمایەکی تر لە داواکاریەکانیان زیاد کرد؛ بۆماوەی یەک هەزار ساڵ، لەوکاتەوەی کە قەستەنتەنیە بوو بە یەکەمین ئیمپراتۆری مەسیحی، جێگرەکانی ئەو لە شاری قەستەنتەنیەی ئەودا (ئیستانبوولی ئەمڕۆکە) دانیشتبوون، بە زمانی یوونانی قسەیان دەکرد و نەریتە کۆنباوە مەزنەکانیان زیندووڕادەگرت. گەورە خانەدانی ئۆرتۆدۆکسی یوونان هێشتا لەوێ دەژیا، نەک لە ئاتێن. سانتا سۆفیا، کە ئێستا کرابوو بە مزگەوت، پێشتر کەنیسە بوو کە لەلایەن جاستینیانی گەورە لە سەدەی شانزدەهەمدا دروستکرابوو. پێشبینیەکانی چەندەها سەدە لەوەپێش باسی ئەوەیان دەکرد کە ڕۆژێک دادێت شارەکە لەچنگ تورکە کێویەکان بێتە دەرێ، کەسانێک کە لە ساڵی ١٤٥٣دا دەستیان بەسەر ئەو شارەدا گرتبوو؛ چەندنین بەرەی یوونانیەکان ئاواتەخوازی ڕەخسینی ئەو هەلە بوون.

ڤێنیزیلۆس لە پاریس سوێندی بۆ زلهێزەکان خوارد کە یوونان بەدوای قەنستەنتەنیەوە نیە. لەوانەیە ماندێتێکی ئەمریکی شتێکی پەسندکراو بێت. بەشێوەیەکی نهێنی، ئەو ئەوانەی کە لێوەی نزیک بوون دڵنیاکردبۆوە کە یوونان بەو زوانە بە خەونەکانی خۆی دەگات؛ هەرکە شار لەژێر ڕکێفی تورکەکان هاتەدەرێ، یوونانیەکان، بە پیشەسازی سرووشتی و بە دانامیزمی خۆیان، بەخێرایی دەستی بەسەر دادەگرن. ئەو بە لیۆد جۆرجی ڕاگەیاند کە " تورکەکان لێهاتوویی بەڕێوەبردنێکی شیاو و لەباری شار و بەندەرێکی لەو چەشنەیان نیە." لە ماوەی کۆڕی ئاشتیدا ڤێنیزیلۆس بۆ جەختکردنەوە لەسەر یوونانی بوونی ئەو شارە هیچ دەرفەتێکی نەبوارد.٨٠٧

چون بەگشتی یوونان و کۆمەڵگای یوونانی شوێنەواری ڕابردووی عوسمانیەکانی پێوەدیار بوو، ڤێنیزیلۆس بۆ زۆریەک لە یوونانیەکان وتاربێژی کرد و پێی ڕاگەیاندن کە ئەو پێداگری لەسەر ئەوە دەکات کە خەڵکی وڵاتی ئەو بەشێکن لە جیهانی سەردەم و ڕۆژئاوایی. یوونانیەکان لەڕووی سرووشتیەوە باری شارستانیەتی تورکەکانیان دەبردە سەرەوە، دروست وەکوو بەریتانیەکان و فەڕەنسیەکان کە خەریک بوون باری شارستانیەتی ئەفریکیەکان و ئاسیایەکانیان دەبردە سەرێ. ئەو لەسەر ئەوە دەڕۆیی کە بۆچی مرۆڤ دەبێ تەنیا چاوی لە ڕێژەی زاو و زێی یوونانیەکان بێت

(بەنایبەت لە کریتێ)؛ ئەم ڕاستیە کە لە جیهاندا بەرزترین بوو بەڕوونی هێزی زایندەیی نەتەوەی یوونان دەگەیەنێت. لە ساڵی ١٩١٩دا، ئەو ڕایگەیاند کە نزیک بە دوو ملوێن یوونانی لەژێر دەسەڵاتی تورکیەدا دەژیان.٨٠٨

پێدەچوو تابلۆی درووست نزیک بە یەک و نیو ملوێن کەسی نیشان دابێت.٨٠٩ هەڵبەت هەمووی ئەو ژمارەیە، بەپێچەوانەی ئەوەی کە ڤێنیزیلۆس بانگەشەی بۆ دەکرد، خۆیان بە بەشێک لە یوونانی گەورەتر نەدەزانی. هەموویان لەڕێگای تورکیەی عوسمانیەوە کۆلۆنی یوونانی بوون؛ هەندێکیان، وەکوو ئەوانەی ناو پۆنتووس بە دەوری تریبیزۆند لە باشووری کەنارئاوەکانی دەریای ڕەش، ماوەیەکی زۆر لەوەپێش دامەزرابوون کە دانیشتوانی ئەو شوێنانە توسقاڵێ بە زمانی یوونانی قسەیان دەکرد. لەناوەوە هەست بە هیچ جیاوازیەک لەنێوان تورکی و یوونانیدا نەدەکرا. ڕەنگە نزیک بە ٤٠٠،٠٠٠ بەناو یوونانی لە دراوسێ تورکیەکانیانەوە جیاکرابێتنەوە تەنیا لەڕووی ئایینەوە و لەڕووی ئەم ڕاستیەوە کە ئەوان بۆ نووسینی وشە تورکیەکان لە هێماکانی یوونانی کەڵکیان وەردەگرت. بەگشتی ئەوە لە بەندەرە گەورەکانی وەکوو سمیرنا (ئیزمیری ئێستا) و قەستەنتەنیە بوو کە ناسیۆنالیزمی یوونانی مانای هەبوو.

لە دەیەکانی بەرلە ساڵی ١٩١٤، هەزاران یوونانی بەرەو تورکیە کۆچیان کرد تا بەدوای کار و دەرفەتدا بگەڕێن. ئەوان لەگەڵ خۆیان هیوای هاوولاتیانی خۆیانیان پێبوو تا بەڵکوو بەو شێوەیە یوونانیەکانی تورکیە ڕزگاریان بێت.٨١٠ گۆڕانکاریەکانی ناو خودی تورکیە هاندەری ناسیۆنالیزمی یوونانی بوون. کاتێکە لاوانی تورک لە ساڵی ١٩٠٨دا دەسەڵاتیان گرتە دەست، ئەو هەڵکردنەی ئاسانەی جاران کە عوسمانیەکان بە کەمینەکانیان پیشان دابوو باوی نەما؛ لە ساڵانی ١٩١٢ و ١٩١٣، کاتێکە مسوڵمانانی ئاوارە لە ناوچەکانی باڵکانەوە بەرەو تورکیە گەڕانەوە، تۆڵەسەندنەکان دژ بە کەمینە مەسیحیەکان لەوێ دەستیان پێکرد. سەرەڕای ئەم ڕاستیەش، بەرلە شەڕی گەورە ڤێنیزیلۆس زۆر ئاگاداری قسەکردن لەبابەت پاراستنی یوونانیەکانی تورکیە یان یەکخستنەوەیان لەگەڵ یوونان بوو؛ وڵاتەکەی ئەو دەبوایە لە شەڕەکانی ناوچەی باڵکان خۆی ببووژاندایەتەوە و بەرەو سەرکەوتن هەنگاوی بنایە. لەڕاستیدا، لە ساڵی ١٩١٤ ڤێنیزیلۆس ئامادەیی خۆی دەربڕی تا سەبارەت بە ئاڵوگۆڕکردنی ئاشتیانەی حەشیمەتی هەردوولا وتوێژ بکات، یوونانیەکان لە ترەیسەوە و ئاسیای بچووک بۆ تورکەکان لە یوونانەوە. ئاڵووگۆڕکردنەکە، هەشت ساڵ دواتر، نە وتوێژی لەسەر کرا و نە ئاشتیانەش بەڕێوە چوو.

شەڕی یەکەمی جیهان بەتەواوەتی دیمەنی جیهانی گۆڕی. عوسمانیەکانی بەری دۆڕاوەی شەڕیان هەڵبژارد، ڤێنیزیلۆس و یوونان بەری براوەی شەڕ. لە ساڵی ١٩١٩دا ئیمپراتۆری عوسمانی

هەڵوەشایەوە و تەنانەت تورکیەش چارەنووس بەرەوە نەمانی دەبرد. ڕادەی سەرکەوتن و دەسەڵاتی هەڤاڵانی یوونانی سەرسووڕهێنەر بوو؛ ڕۆژنامەکانی یوونان باسی " وەدیهاتنی خەونەکانی ئێمەیان" دەکرد. تەنیا قەستەنتەنیە ئاماژەی پێ نەکرا، چون سانسۆڕەکان نەیاندەهێشت. لەڕاستیدا، تورکیە شکستی خوارد، بەڵام زۆری مابووی تا بەیەکجاری کۆتایی پێ بێت؛ هەڤاڵانی یوونان نە ئەوەندەی ڤێنیزیلۆس بەهێز بوون نە ئەوەندەش خاوەن باوەڕێکی پتەو بوون؛ و خودی یوونان لەنێوان لایەنگران و دوژمنانی ڤێنیزیلۆس بەش بەش کرابوو.٨١١

دابەشکردنەکان میراتی لەشەڕەوەگلانی یوونان بوون. هەرچەند ڤێنیزیلۆس هەر لە سەرەتاوە عالەم ئاشکرا لایەنگری هاوپەیمانان بوو، کۆنستانتین پاشا، کە لەگەڵ خوشکی ئیمپڕاتۆری ئەڵمان ژیانی هاوبەشی درووست کردبوو و، لەوە گرنگتر، ڕیئالیست بوو، خوازیاری ئەوەبوو کە یوونان بێ لایەن بهێڵێتەوە. پاشا و لایەنگرەکانی لەبەرانبەر خەونی ئاڵۆزی ولاتێکی گەورەتردا بەرگریان دەکرد؛ ئەوان " یوونانێکی بچوک و خاوەن ڕێزیان" بەباش دەزانی.٨١٢ قەیرانێکی درێژخایەنی سیاسی لەنێوان ساڵانی ١٩١٥ و ١٩١٧دا ڤێنیزیلۆسی لەسەر کار لابرد؛ لە ساڵی ١٩١٦دا ئەو لەپێناو پاراستنی پاشا حکوومەتێکی کاتی دامەزراند، کە نیوەی خەڵکی یوونانی هێنایە ناو گۆڕەپانی شەڕەوە؛ و لە ساڵی ١٩١٧دا کۆنستانتین مەجبوورکرا یوونان بەجێ بێڵێت. یوونانێکی یەکگرتوو بە پشتگری لە هاوپەیمانانەوە چوە ناو شەڕ، بەڵام یەکگرتنەکە بە قەدەر ئەو پەڵپ و بیانووانەی کە ڤێنیزیلۆس بەکاری دەهێنا تا نەیارەکانی لە دەوری یەک کۆکاتەوە لاوز و بەرتەسک بوو. حکوومەت، داداگا، خزمەتگوزاری ناوخۆ، سووپا، تەنانەت کەنیسەی ئۆرتۆدۆکس، هەرهەموویان لە شەیتان و شۆفار خاوێن کرانەوە، ناکۆکیەکی پاش خۆی بەجێ هێشت کە بۆ ماوەی یەک بەرە لە کۆمەڵگای یووناندا دەوامی هێنا.

لە کەمپی هاوپەیمانیدا ئەم چالاکیانە، ئەگەر گرینگایەتیشیان پێبدرایە، زیانێکی بە ناوبانگیی ڤێنیزیلۆس نەدەگەیاند. ئەو زۆر ئازایانە ڕێگەی بە هێزەکانی بەریتانی و فەرەنسەیی دابوو تا لە سالۆنیکا بنیشنەوە (تێسالۆنیکی ئەمڕۆکە) لەکاتێکدا کە یوونان هێشتا هەر بێ لایەن بوو؛ ئەو بەملوێن خەرجی کردبووکە یوونان نەیدەتوانی لە نیزامیگەریدا ئەوەندە سەرف کات؛ و هێزەکانی یوونانی نەک تەنیا لە شەڕدا جەنگا بوون بەڵکوو بۆ مەبەستی یارمەتی هێزەکانی دژە-بۆلشویکی هاوپەیمانی لە ڕووسیە دەربەڕیبوون. ئەو هاوپەیمانێکی بەوەفا بوو، تەواو لەگەڵ ڕۆژئاوا و بیروباوەڕەکانی ئەوێ کۆک بوو، و دژ بە میلیتاریزمی ئەڵمانی دەوەستا. هەرکات کە بکرایە ڤێنیزیلۆس لەزمانی پرەنسیپەکانی ویلسۆنەوە قسەی دەگێڕایەوە؛ ئەو بوو بە پشتگرێکی بەتاسەوتینی کۆمەڵەی گەلان.٨١٣

ڤێنیزیلۆس ئەستێرەیەکی کۆڕی ئاشتی بوو، ویلسۆن دەیگوت "گەورەترین پیاوێک کە من تا ئێستا چاوم پێی کەوتوە" و حەز و خولیایەکی تایبەت بەخۆی لەمێشکدا هەیە. ئەو ئێوارانە لەسەر سفرەی نان خواردن بەسەرهاتەکانی ژیانی خۆی وەک گریلایەک لە کێوەکانی کریتێن دەگێڕایەوە، کە چلۆن بە خوێندنەوەی *تایمز* و دەمانچەیەک لەسەر کۆشی خۆی فێری ئینگلیزی کرد. و هەمیشە وتوێژەکانی ئەو باسی ڕابردووی پرشنگدار و داهاتووی گەورەی یوونانی لەخۆیان گرتبوو. هارۆلد نیکۆلسۆن لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە " بەگشتی هەست بە هەبوونی کۆمەڵە تایبەتمەندیەکی سەیر دەکرێت وەک تەلیسم، چەتەگەری، سەرهەڵدان- سیاسەت، نیشتمانپەروەری، بوێری، زمان و وێژە- و لەسەرووی هەمووی ئەمانەوە پیاوێکی لێوبەزە، کەڵەگەت و چوارشانە، بەچاوانی تیشک هاوێژ لەژێر چاویلکەکەیەوە، و بە کڵاوێکی چوارگۆشەی ئاوریشمی ڕەش بە سەرەوە.[٨١٤]

لە ٣ی مانگی فەوریەی ساڵی ١٩١٩دا، ڤێنیزیلۆس بەنۆبەی خۆی دەرفەتی درایە تا پەروەندەی یوونان پێشکەش بە شۆڕای عالی بکات. ئەو سەرنج و تێبینی تایبەت بەخۆ، ژمێرزانی خۆی، تەنانەت ئالبۆمی وێنەی پێبوو کە ماسیگرانی دڵخۆشی یوونانی لەسەر ئەو دوورگانە نیشان دەدا کە ئەو بەدوایانەوە بوو. ئەو بەیانیە و ڕۆژی دواتریش ئەو زۆر ماقووڵ، و زۆر هاندەر بوو. مێژوو، زمان، ئایین و هەڵبەت، هاوڕێ لەگەڵ سووکەئاماژەیەک بە ئەمریکیەکان، باوەڕبەخۆبوون- ئەو هەرهەموویانی بەکاردێنا. ئەو بەڵگەی دەهێناوە کە ئەوە زۆر ئاسانە؛ لە ئورووپا، یوونان پێویستە بەشی باشووری ئالبانیای بدرێتێ (وەک خۆی ئاماژەی پێدەکرد ئەپیرووسی باکوور) و، لە ڕۆژهەڵاتی دوور، لەنێوان ئائێجین و دەریای ڕەش، ترەیس (لەو پەڕی باشوور)، چەند دوورگەیەک و پارچەیەکی قەبەی ئاسیای بچووک کە لەنیوەی ڕێ لەسەر خاڵێک دەست پێدەکا بەدرێژایی کەنارئاوی باشووری دەریای مەڕمەڕە نزیک بە چوارسەد مایل بەرەوخوار بۆ کەنارئاوی باشووری ئاسیای بچوک بەرەو سمیرنا. ئەو ئاماژەی بەوەکرد کە یوونان داوای قەنستەنتەنیە ناکات. ئەو تەواوکەری ئیتالیەکان بوو و لەو بەشە تایبەتەی خۆیدا لە جیهان کاری مامۆستایانی ئەمریکی زۆر بەرزتر لە ڕادەی خۆی گەورە دەکردەوە. ئەوە شانۆگەریەکی سەروەری و کارامەیی بوو: بەبۆچوونی دیپلۆماتێکی پلەخوار " بەهێزیەکی وەها سەرسووڕهێنەر و وردبینیەکی تایبەت لە بەڵگەهێنانەوە لە ئەودا بەدی دەکرا." هەروەها مەترسی بوو بۆ یوونان بۆ یوونانیەکان و بۆ ئاشتی داهاتووی ڕۆژهەڵاتی ناڤین. هەر لەو کاتی سەرکەوتنەدا لە کۆڕی ئاشتی، ڤێنیزیلۆس فیووزێکی هەڵکرد کە بوو بەهۆی لەناوچوونێکی کارەساتباری کۆمەڵە بچووکەکانی کەنارای یوونان لە تورکیە و هۆی دوژمنایەتی لەنێوان یوونان و تورکیە کە تەنانەت ئەمڕۆکەش هەر درێژەی هەیە.[٨١٥]

بە سیلەچاوێک بەسەر نەخشەیەکدا بێجگە لەوە ئەوەشی نیشان دەدا کە ڤێنیزیلۆس دەیەویست ولاتێکی زۆر سەیر پێشنیار بکات کە دەورادەوری دەریای ئاجیئینی دەگرتەوە. یوونانی ئەو قامکێک بەرەو باکوور بەلای ئادریاتیکدا درێژەی دەبوو، و قامکێک کەمتر بەدرێژایی لوتکەی ئائیجین بەرەو کۆنستەنتەنیە درێژەی دەبوو؛ دواتر بە پانتایی بەشێکی بچوک لە خاکی تورکیە و داردانێلیس دەپەڕی تا نزیک بە دووسێهەمی کەنارئاوەکانی ئاسیای بچوک لەخۆبگرێت، هاوڕێ لەگەڵ بەشێکی گەورە بەرەو ناوەی ولات بۆ سمیرنا. ئەم یوونانەی " دوو قارە و پێنج دەریایە" ولاتێک بوو کە ناودڵی هاتبوە دەرەوە ڕووی لە ولاتانی دەرەوە بوو، لێوارەولێوار زەوی و زار بە دەوری ئەو ئاوانەی کە لەژێر کۆنترۆڵی خۆیدا نەبوون. دوژمنانێکی دەبوو: بەدڵنیایەوە یەکێک لەوانە تورکیە دەبوو، و یەکێ تر بۆلغارستان دەبوو، هەرکیان خۆیان مەلاس دابوو تا بەشێک لە زەوی و زارەکانیان پێبگات، یان ئیتالیا، کە بۆ ئادریاتیک، ئاڵبانیا و ئاسیای بچووک پلانی تایبەت بەخۆی هەبوو. ڤێنیزیلۆس بۆخۆشی دانی بەوەدا دەنا کە بەڵێ شێوازی دارشتنی ولاتەکەی ناجۆر بوو. " بەلام بۆماوەی سی سەدە یوونانیەکان لە هەل و مەرجێکی وەهادا ژیابوون، و توانیبوویان بە سەر کارەساتی گەورەگەورەدا قەڵمباز بدەن، تا بەرەو بەختەوەری و بەرەو گەشەسەندن هەنگاو بنێن."٨١٦

کەوایە ولاتێک بە حەشیمەتێکی کەمتر لە پێنج ملوێن کەسی چلۆن دەتوانێ خۆ لە بارێکی وەها قورسدا بدات؟ ولاتێکی وەها هەژار کە لە سالانی بەرلە ١٩١٤ یەک شەشەمی حەشیمەتەکەی، نزیک بە هەمووی لاوانی بەهێزی، کۆچیان کردبوو؟ ئەوەندە بەش بەش کرابوو کە لە سالی ١٩١٧دا شەڕێکی ناوخۆ سازببوو؟ باسکردن لە هەمووی یوونانی کەونارا لە کۆڕی ئاشتیدا شتێکی تازە و نامۆ بوو. وەکوو خەونەکانی ولاتانی تری بالکان، ڕابردووی پڕشنگدار ناتەواویەکانی دەمکاتی ئێستای قەرەبوو دەکردەوە.

ئەو بەلگانەی کە ڤێنیزیلۆس لەسەر یوونان پێشکەش بە کۆڕی ئاشتی کرد زۆر زیرانە بوون بەلام بە قەدەر یوونانێکە بەدوایەوە بوو چاڵە و چۆڵەی تێدا بوو. ژمێرەزانی ئەو وەکوو ئەوانەی بالکانەکان گومانی لێدەکرا، تێکەلاوێک بوو لە ژمارەکانی عوسمانی لەکارکەوتوو و بۆچوونی ئارەزوومەندانە. بۆوێنە، شێوازی بەلگەهێنانەوەی بۆ ئاڵبانیای باشوور وەها بوو کە خەڵکانێک کە لە ئاڵبانیایی دەچوون بە ئاڵبانی قسەیان دەکرد لەڕاستیدا یوونانی بوون؛ ئەگەر ئۆرتۆدۆکس بوونایە، پڕ بەپێستیان یوونانی دەبوون. لەبەرچی، میلیتاری یوونان پڕ لە کەسانێک بوو کە بەرەچەڵەک ئاڵبانیایی بوون. ڤێنیزیلۆس لەگەڵ تابلۆکانی حەشیمەت وەکوو جادووگەرێک مامەلەی دەکرد: لە

ئیپیرووسی باکوو ١٥١،٠٠٠ یوونانی لێ بوو، لە کۆی حەشیمەتێکی ٢٣٠،٠٠٠ کەسی. ئەگەر ناوچە ڕەسەنەکانی ئاڵبانیمان جیابکردایەتەوە، ١٢٠،٠٠٠ یوونانی و تەنیا ٨٠،٠٠٠ ئاڵبانی دەماوە. هەڵبەت ناوچە زۆرینەکانی یوونانی دەبێ بچنەوە سەر یوونان (خود-موختاری) بەڵام ئایا دەبێ هەمووی ئەو ناوچانەی کە بەبێ زۆرینەیەکی بەرچاون بگەڕێنەوە: " چون ئەوە پێچەوانەی عەداڵەت و یەکسانیە، لە خەڵکێک، زۆرینەیەک کە خاوەنی شێوازێکی مەزنتر لە شارستانیەتە بێتو ملکەچی کەمینەیەک بێت کە خاوەنی شارستانیەتێکی پلەخوارتر بێت." لەڕاستیدا، ئاڵبانیایەکان خۆیان بە بەختەوەر دەزانی ئەگەر یوونان بە مەیلی خۆی ئەوانی هەڵبگرتایەتەوە.٨١٧

* * * *

ڕابردووی ئەو وڵاتە بە یوونانی سەردەم بازنەیەکی ئامادە لە لایەنگرانی پێ دەبەخشی. کلیمینجوو، بە حەزوخولیایەکی تەواوەوە، بە ئەمیندارەکەی خۆی، جین مارتێت، ڕاگەیاندبوو کە مرۆڤایەتی لە یوونانی کەونارا گەیشتبوە لووتکەی هەرە مەزنی خۆی: "مارتێت خۆت لە یوونان بگلێنە. ئەوە شتێکە کە منی زیندوو ڕاگرتوە. هەرکات کە شەکەت دەبووم و قۆڕیاتی سیاسەت ماندووی دەکردم، ئاوڕم دەدایەوە یوونانی کەونارا. ئەوانی تر دەچوون بۆ ڕاوەماسی. هەرکەسەو شتێکی دەکرد." (کلیمینجوو بەگومانەوە سەیری یوونانیە سەردەمیەکانی دەکرد، کەسانێک کە ئەو لای وابوو هەتابڵێی سەبارەت بە ڕابردووی پڕشنگداری خۆیان ناشارەزان.٨١٨) یوونانیەکان وەچەکانی هۆمێر و پێریکلێس و سۆقراتەکان بوون. ئەو قەڵایانەی کە بێ دەنگ بەڵام هەڵگری مێژوویەکی کۆن بوون، پەیکەهاویژەرانی تەواو شارەزا، ئەو تیشکە تەڵاییەی کە لەلایەن یوونانی کلاسیکەوە وئیمپراتۆریەتی بیزانتین دەهاوێژرا و لەنێوان سیاسەتمەدارانی ناو پاریس دەهاتودەچوو و حەقیقەتی نەتەوەیەکی بچووک، دواکەوتوو و بەڕێوەچووی تاقمێکی بچووک. لە بەرلینەوە بۆ واشنگتۆن، پەرلەمانە نەتەوەییەکان، مۆزەخانەکان و گەلەریەکان، تەنانەت کەنیسە سپیکاریەکان لە شارۆچکە بچووکەکانی ئینگلەندی تازە، باسیان لە دەسەڵاتی بەردەوامی یوونانی کلاسیک بەسەر شێوەتێڕوانینی ڕۆژئاوا دەکرد. ئەوەی ڕاستی بێت، وڵاتەیەکگرتوەکانی لاو بەگشتی زمانی یوونانی کلاسیکی بە زمانی فەرمی خۆی قەبووڵ کردبوو. خزمەتگوزاریەکانی دەرەوە و حکوومەتەکانی بەریتانیا، فەرەنسە و وڵاتەیەکگرتوەکان لە بەرهەمەکانی پەروەردەی کلاسیک خندرابوون و جمەیان دەهات، ئاشنایەتی نزیکی ئەوان لەگەڵ جیهانی مۆدێرندا لە خۆشەویستی ئەوان سەبارەت بە یوونانی کەونارای کەم نەدەکردەوە.

بێجگە لەوانە، خەباتی خەڵکی یوونان بۆ سەندنی ئازادی لە دەسەڵاتی تورکی کە لە دەیەکانی ١٨٢٠ەوە دەستی پێکردبوو یەکێک لە مەسەلە گەورەکانی لیبراڵی ئورووپا بوو. لۆرد بایرۆن ژیانی خۆی بەخشی، دێلاکرۆئیکس هەندێک لە گەورەترین وێنەکێشراوەکانی خۆی دانا. و هەتا یوونانیەکان لەژێر دەسەڵاتی تورکیدا بوونایە، مەسەلەکەش هەر درێژەی دەبوو. لە ساڵی ١٩١٩دا، لە شارەکانی سەرتاسەری ئورووپا و وڵاتەیەکگرتوەکان، لایەنگرانی یوونان و داواکاریەکانی ئەو وڵاتە کۆبوونەوە تا پارە کۆکەنەوە و بڕیاری ڕەسمی پەسەند بکەن. *دەیلی تێلێگراف* وەرگێڕانی ڕوودیارد کیپلینگ لەسەر سروودی نیشتمانی یوونانی بەناوی "سروودی ئازادی" بڵاو کردەوە. لای جوولیاس کامبۆن، کۆڕی ئاشتی "باشترین شێوازی جێبەجیکردنی داواکاریەکانی کەونارای نەتوەی هێلینیکی و لانی کەم باشترین شێوازی تەواوکردنی خەباتی سەربەخۆیی هێنابوە ئاراوە کە لەلایەن نەتەوە لیبراڵەکانی ئورووپا سەدەیەک لەوەپێش دەستی پێکردبوو."٨١٩

ئەگەر یوونان تەڵا بوو، تورکیە لە تاریکایی بیرەوەریەکان حەشار درابوو: کۆمەڵێک سوارچاکی دڕندە لەلایەن ئاسیای ناوەندیەوە؛ ئاڵاکانی خاچی سوور کە لە دەرەوەی ڤیەن دەشەکانەوە؛ بەکۆمەڵکوشتنی بۆلغاریەکان لە دەیەکانی ١٨٧٠ و، زۆرلەوەنزیکتر، هەزاران هەزار ئەرمەنی. سووڵتان لەو وڵاتەدا میراتگری سوپاسالارانی گەورە و دڵڕەقی جەنگ بوو کە ئورووپایان بەچۆک داهێنابوو. (لەڕاستیدا، ئەو پیاوێکی نیوەتەمەنی شەل بوو کە بەدەست نەخۆشی ڕۆماتیزمەوە دەیناڵاند.) یەکێک لە خەونە ناخۆشەکانی هاوپەیمانی لەسەردەمی شەڕی پێشوودا ئەوەبوو کە سۆڵتان، کەسێک وەکوو خەلیفە کە ڕێبەری ڕۆحانی مسوڵمانان لەسەرتاسەر جیهان بوو، بەملوێن تاک کۆدەکاتەوە و بۆ شەڕ دژ بە بەریتانیا لە هێندستان، یان فەرەنسە لە ئەفریقای باشوور دەیانخاتەگەڕ. تورکیەی عوسمانی لەپێناو ئیسلامدا دژ بە مەسیحیەت دەوەستا، و لەوکاتەدا بۆ بردنەوە لە شەڕی درێژخایەنی چەندین سەدەی شارستانیەتەکان دەرفەتێکی باش ڕەخسیبوو. لە بەریتانیا، مەترانی کانتێنبێری و کەسایەتیە ناودارەکانی تر بەپەلە کەوتنەخۆ تا لێژنەیەکی ڕزگاریکەری سانتا سۆفیا دامەزرێنن.٨٢٠

جیهانیان تەنیا دەسەڵاتێکی پووکاوە، خوێنمژ، ناکارامەیان دەدی کە بۆ ئەوە نابێت درێژە بەژیانی خۆی بدات. پارێزگا عەرەبەکانی ئەوێ تازە سەریان هەڵگرتبوو، بە هەوڵی خۆیان ئازادکرابوون یان لەڕێگای هێزە گەورەکانەوە ئازادکرابوون، هەرجۆرێک کە ئێوە لێکی دەدەنەوە؛ پاشماوەکانی ئەرمەنیەکان لە مانگی مەی ساڵی ١٩١٨دا بۆ کۆماریەکی سەربەخۆ بانگەشەیان کردبوو، و کوردەکان لە سنوورەکانی ڕۆژهەلات ورووژابوون و داوای وڵاتی خۆیان دەکرد. لەبەرهۆی

چارەنووسی ناوچەی سەرەکی تورکی-ئاخێوەر، چارەنووسی تریس لە ئورووپا و چارەنووسی ئاناتۆلیا لە ئاسیای بچووک، ئەوە لە کۆڕی ئاشتیدا دوا جێبەجێکردنی داواکاریەکانی ئیتالیا و یوونان لەیەک جیا دەکرانەوە.

بەریتانیەکان، کە بۆماوەیەکی دوورودرێژ پشتگریان لە تورکیەی عوسمانی کردبوو، ئێستا پێویستیان بە هەڤاڵ ئاڵتێرناتیڤێک بوو تا بەشی کۆتایی ڕۆژهەلاتی مەدیتەرانە بۆ کەشتیرانی خۆیان دوور لە هەر مەترسیەک و لە هێمنایەتیدا بهێڵنەوە. بەدڵنیایەوە ئەوان خوازیاری ئیمپراتۆرێکی بەربلاوی فەرەنسەیی لەوێ نەبوون، و ئەوان خوازیاری ئەوە نەبوون کە پارە خەرج کەن ئەگەر شتێکیان لەدەست بهاتایە بۆی بکەن. ئەوە یوونانی، یوونانێکی بەهێزی، زۆر دیار و بەرچاو دەکردەوە. پرەنسیپەکان و بەرژەوەندیەکان بەشێوەیەکی لەبار دەکەوتنە سەر یەک. یوونان ڕۆژئاوایی و خاوەن شارستانیەت بوو، تورکیەی عوسمانی ئاسیایی و بەربەری بوو. و ڤێنیزیلۆس زۆر پەسەندکراو بوو، بەبۆچوونی لیۆد جۆرج " لە ڕۆژانی پێریکلووس بەم لاوە ئەمە گەورەترین سیاسەتمەدارێک بوو کە یوون خستبویە سەر تەخت." لیۆد جۆرج و زۆریەک لە ئەندامانی ئۆفیسی دەرەوە لایان وابوو یوونانێکی بەهێزتر هاوپەیمانێکی زۆر بەکەڵک دەبێت. وەک ڤێنیزیلۆس خێرا ئاماژەی پێدەکرد، یوونان دەیتوانی بۆ هێزی دەریایی بەریتانیا بەندەر پێک بێنێت و بۆ ڕێگایەکی تازەی گرنگی گەیشتن بە هێندستان فرۆکەخانە دامەزرێنێت. دەسەلاتی یوونانی دەیتوانی بۆشاییەک کە بەڕووخانی عوسمانیەکان درووست ببوو پڕکاتەوە. تەنیا میلیتاری، کە کارەکەی سەیرکردنی خەریتەکان و هەڵسەنگاندنی خاڵە بەهێزەکان و بەقوەتەکان بوو، هەستی بەگومان دەکرد، سەبارەت بە هەم میلیتاری یوونان و هەمیش بە ڕادەیەک کە تێیدا تورکیە بەڕاستی بەچۆک دادەهات. کاتێکە ستافی گشتی بەریتانیەکان داوایان لێکرا کە لەسەر داواکاریەکانی یوونان لە ئاسیای بچووک ڕای خۆیان دەربڕن، ئەوان هۆشداریان دا کە داگیرکاری یوونانی " دەبێتە هۆی نانەوەی سەرچاوەیەکی ئاژاوەگەری بەردەوام کە زۆرپێدەچێ ببێتە هۆی درووستبوونی هەوڵێکی ڕێکخراو لەلایەن توورکەکانەوە بۆ گرتنەوەی دووبارەی ئەم ناوچەیە."[٨٢١]

هەرجۆرێک بێت لیۆد جۆرج پشتگری لە ڤێنیزیلۆس دەکرد چون ئەو پشتگری لە کەس نەدەکرد. لیۆد جۆر وتبووی کە " ئەو هەر لەبنەڕەتدا لیبراڵ و دیموکرات بوو، و هەرهەمووی ئەندامانی کۆنەپارێز لە بیروباوەڕەکانی ئەو، یاسادانانی ئەو و کەسایەتی ئەو ترس و دڵەڕاوکێیان هەبوو." دەکرا بۆخۆی باسی خۆی بکات: شەڕکەر، وتاربێژ، بت شکێن، پیاوێک کە، وەک ئەو کارانەی کە لیۆد جۆرج لە شەڕی بۆئێردا کردبووی، دژ بە سیاسەتێکی نابەرانبەر و دژ بە حکوومەتەکەی خۆی

دۆستا. هەردوو پیاوەکە یەکتریان باش دەناسی و یەکتریان زۆر خۆش دەویست؛ لە یەکەمین دانیشتنیاندا، لە ساڵی ١٩١٢، نەدەکرا بەو ئاسانیە بزانرێ کە کامیان زیاتر سەرنجی ئەویتریانی بۆلای خۆی ڕاکێشا. لای ڤێنیزیلۆس، لیۆد جۆرج وەکوو پێغەمبەرێکی سەردەمانی کۆن وابوو، "بە توانایی سەرسووڕهێنەرەوە و تێبینی ڕوون لەسەر خەڵک و لەسەر ڕووداوەکان."؛ لای لیۆد جۆرج، هاوتاکەی "پیاوێکی گەورە بوو، پیاوێکی یەکجار گەورە." بەگشتی ئەوان تۆوی بناخەی هاوپەیمانیەکی بەهێز لەنێوان یوونان و فەڕەنسە و بەریتانیایان چاند، کە لە بەرژەوەندی هەرهەموویاندا کۆنترۆڵی هەبوو بەسەر ڕۆژهەڵاتی مەدیتەرانەدا.

لەکاتی شەڕدا، هەردوو پیاوەکە پێوەندیان بە یەکەوە بوو. لیۆد جۆرج دواتر ڕایگەیاندبوو کە ئەو و ڤێنیزیلۆس پیلانی لەسەرتەخت لابردنی کۆنستانتینیان بەیەکەوە ڕشتبوو. لە مانگی ئۆکتۆبری ساڵی ١٩١٨دا، کاتێکە شەڕ گەیشتبوە قۆناخی کۆتایی خۆی، لیۆد جۆرج لە دەرفەت کەڵکی گرتبوو و بە پەلە دانیشتنێکی لەگەڵ ڤێنیزیلۆس دروست کردبوو و سەبارەت بە داواکاریەکانی یوونان قسەوباسی لەگەڵ کردبوو. دانیشتنەکە دۆستانە بوو، و لیۆد جۆرج هاندەربوو، هەرچەند لەم قۆناخەدا باش دانی پێدانەدەهێنا کە پشتگری لە هەمووی داواکاریەکانی یوونان بکات. ڤێنیزیلۆس لەدرێژەی باسەکەیدا یادداشتێک و نامەیەکی نهێنی دەرهێنا کە تێیدا ئەو جەختی لەسەر ئەوەکردبۆوە کە یوونان چەندی بەتاسەوەیە هاوکاریان لەگەڵ بکات. لەسەر تەوەرێک کە ئەو دەیتوانی ببێتە هۆی ئاڵۆزی و کێشە بۆ بەریتانیا، کێشەی سایپرووس، کە نزیک بە سەدا ٨٠ی یوونانی بوون، ڤێنیزیلۆس زمانپاراوی خۆی ڕاگرت. ئەگەر بەریتانیەکان خوازیاری ئەوەبوونایە کە سایپرووس بدەن بە دەست یوونانەوە، بۆچی ئەوە دڵخۆشکەردەبوو، و هەڵبەت یوونان هەمیشە ڕێگای هێزەکانی بەریتانی دەدا کە لە بنکەکانی ئەوێ کەڵک وەرگرن؛ ئەگەر بەریتانیا بیویستایە ئەوێ هەڵگرێت، ئەوەش دیاربوو لەبەر چیە.٨٢٣

کاتێکە ڤێنیزیلۆس پەروەندەکەی خۆی پێشکەش بە شۆڕای عالی کرد، ئەو دڵنیا بوو لەوە کە بەریتانیەکان لەپشت ئەوەوە وەستاون. ئەو بیری لەوە دەکردەوە کە ئەو لەوانەیە بتوانێ پشت بە فەڕەنسەیەکانیش ببەستێت: هێزەکانی یوونانی لەگەڵ فەڕەنسەیەکان دژ بە بۆلشویکەکان شەڕیان دەکرد. ئەمریکیەکان خۆیان بە هاوسۆز دەزانی؛ تەنیا دڵەڕاوکێی سەرەکی ئەو ئیتالیا بوو. هەرجارناجارێک لیۆد جۆرج چەند پرسیارێکی ڕێکوپێکی ئاراستەدەکرد؛ ویلسۆن داوای ڕوونکردنەوەیەکی بچووکی دەکرد لەسەر کاولکاریەکانی تورکی، کلیمینجوو زمانی نەدەگەڕا و هیچی نەدەکوت؛ و ئۆرلاندۆ بەئەسپایی ئاماژەی دەکرد بە جیاوازیەکانی نێوان یوونان و ئیتالیا کە، ئەو

بەتەمابوو، هەرچی زووتر چارەسەربکرێن. (لەسەر ئەوە ، وەکوو زۆر شتیتر، ئۆرلاندۆ لە هەڵەدابوو.)
ڤێنیزیلۆس بە دڵنیایەکی تەواوەوە نامەیەکی ناردەوە بۆ ئاتێن: "من لام وایە کاریگەریەک کە گوزارشەکەی من داینا کاریگەریەکی ئەوتۆ بوو. ویلسۆن، کلیمینجوو، لیۆد جۆرج و تەنانەت ئۆرلاندۆ منیان لەمە دڵنیا کردەوە کاتێکە ماڵ ئاواییم لێدەکردن." وەزیری دەرەوەی یوونان، کەسێک کە شیەتحاڵی ڕووداوەکە بوو، بەهەمان چەشن دڵخۆش بوو: " لەڕاستیدا ئێمە هەمووی هێزە گەورەکانمان لەپشتە- ئیتالیا نەبێت، ئەویش لەخۆڕا لەبیری ڕێکەوتننامە و سازشکردن دایە"٨٢٤

ڕەنگبێ ئیتالیەکان بیریان لە سازش کردبێتەوە بەڵام دەکرێ بیریان لە ئاڵبانیا و ئاسیای بچووکیش کردبێتەوە، شوێنێک کە ئەوان چاویان لە هەندێک لەوشتانەی کە یوونان خوازیاری بوو بڕیبوو. بێجگە لەمانە ئەوان بەتەمابوون دوورگەکانی دۆدێکانیس بۆخۆیان هەڵگرن، هەرچەند دانیشتوانی ئەو شوێنانە بەڕەچەڵەک یوونانی بوون. ڕۆژنامەکانی ئیتالی هەرشتیک کە ئیتالیا بەڵێنی پێدرابوو، و بگرە زیاتریش، داوایان دەکرد.

نووسەران هێرشیان کردە سەر سێربە ناشارستانیەکان و هاوڕێیانی ئەوان واتە یوونانیەکان. کەش و هەوای ناو ئاڵبانیا، شوێنێک کە یوونانیەکان و ئیتالیەکان لەڕاستیدا ددانیان لەیەک چیڕ کردبۆوەوە و بەسەروبەچکی یەکتردا هەڵپڕژابوون، کێشەکانی ئاڵۆزتر کرد. لەکاتی شەردا ئیتالیا بەشێکی زۆری لە ئاڵبانیا داگیرکردبوو؛ یوونانیانی ناوچە و حکوومەتی یوونانی بەردەوام لەبابەت ڕەوشت و کرداری هێزەکانی ئیتالیایی ڕەخنەیان دەگرت. دەوترا کە ئیتالیەکان لە هەوڵی ئەوەدابوون بە قەوڵ و بەڵێنی لەڕادەبەدەر لە ئیتالیەکان ببنەوە، وەکوو وەرنەگرتنی هیچ چەشنە باجێک. لە یوونان ڕۆژنامەکان بەسەرهاتی ترسێنەریان دەگێڕایەوە وەکوو دەستدرێژی جنسی و هۆڤانیەتی. بەبۆچونی باڵوێزی بەریتانیا لە ئاتێن "ئەگەر دەستووری شەڕ دژ بە ئیتالیا ڕاگەیەنرێت تەواوی حەشیمەتەکە ڕیز دەبەستن و ئامادەیی خۆیان ڕادەگەیەنن."٨٢٥

لەکاتی شەڕدا، یوونان و ئیتالیا بەشێوەیەک دوور لە بەرنامە سەبارەت بە پێکەوەسازشکردن قسەوباسیان کردبوو، و زووتر لە پاریس، سۆنینۆ و ڤێنیزیلۆس، جووتەی خێروشەڕ، چەندین کەڕەت پێکەوە دانیشتبوون تا بزانن ئایا ئەوان دەتوانن پێکەوە مامەلەیەک بکەن. سۆنینۆ پێشنیاری کرد کە یوونان ڕێگە بدات بە ئیتالیا هەمووی کەنارئاوەکانی ئاڵبانیا و نزیک بەنیوەی ناوچەکەنی ناوخۆی وڵاتی هەبێت؛ لەبەرانبەر ئەمەشدا یوونان بتوانێ ناوچەی دەورووبەری کۆرچی (یوونانیەکەی: کۆریتسا)، دۆدێکانیسەکان، و ناوچەی دەرووبەری سمیرنا لە ئاسیای بچووک بۆخۆی مسۆگەر بکات. با هەردوو پیاوەکە ئامادەبوبێتن لەسەر ئاڵبانیا و دۆدێکانیس پێکەوە

مامەڵەیەک بکەن، هیچ کامیان حازرنەبوون لەسەر ئاسیای بچووک پارە خەرج بکەن. هەر مامەڵەیەک پەژارەیەکی بەدواوە دەبوو، هەرچەند دەرفەت بۆ هیچ مامەڵەیەک نەهاتە ئاراوە. هیچکام لەو پیاوانە متمانەیان بە یەکتر نەبوو؛ هەرکیان لایان وابوو وڵاتانی ئەوان وایان باشە کە ڕاستەوخۆ لەگەڵ هێزە گەورەکان دانووستان بکەن.٨٢٦

لە مانگی فەوریەی ساڵی ١٩١٩دا ڤێنیزیلۆس دەتکووت کەوتۆتە سەرڕێی قومارکردن. تەنیا هێمایەکی گەورەی پرسیارکردن وڵاتەیەکگرتوەکان بوو، و ڤێنیزیلۆس بەهەموو هۆکارێک لای وابوو کە ئەو دەتوانێ دڵی ئەمریکیەکان وەکوو دڵی بەریتانیەکان سەرکەوتوانە بە دەست بێنێت. ئەو لەگەڵ هاوس وتوێژی دوورودرێژیان پێکەوەکرد، کەسێک کە ئەوی دڵنیاکردبۆوە لەوە کە وڵاتەیەکگرتوەکان دەتوانێ بەکاربێت. نیکۆلسۆن ڕێگای بۆخۆش کرد تا چاوی بە هەندێک لاوانی ئەمریکی بکەوێت؛ " ئەو نێوانرەوە، دڵرفێنە، ماقووڵە، لەبارو هەڵکەوتەیە. نانەنیوەرۆیەکی حازر و ئامادە." ڤێنیزیلۆس هەمیشە لە بەڵگەهێنانەوە لەبەرانبەر بیسەرانیدا سەرکەوتووو بوو. سایمۆر، پسپۆڕیکی ئەمریکی، باسی دانیشتنێک لەگەڵ بنەماڵەکەی ئەو ئاوا دەگێڕێتەوە: "کاتێکە هەستی بەوەکرد کە بەهێزترین یارمەتی ئەو باوەڕی ئێمە بە ڕاستبوونی ئەو دەبێت، ئەو سووربوو لەسەر ئەوە کە هەمووشتێک بخاتەڕوو و بەئاشکرایەکی تەواوەوە هەمووشتێک بدرکێنێت، و من لام وایە کە ئەو وای کرد. ئەم جۆرە سیاسەتە لە زیرەکیدا لە سیاسەتی بیسمارکی دەچێت." ئەمریکیەکان خۆیان بە هاوسۆز دەزانی، بەڵام نەک بەشێوازێکی سەرەڕۆیانە. ئەوان سەبارەت بە داواکاریەکانی یوونان لە ئالْبانیا و ترەیس شوێنی دیاریکراویان دانابوو. هەڵبەت کاتێکە باسی ئاسیای بچووک دەهاتە گۆڕێ ئەوان زیاتر یەکەمایەتیان بە داواکاریەکانی یوونانیەکان دەدا تا ئیتالیەکان. تەنانەت هەر لە سەرەتاوە، پێوەندیەکانی ئەمریکیەکان لەگەڵ ئیتالیا ڕوولەخراپ بوون دەچوو.٨٢٧

کاتێکە کۆمیسیۆنی تایبەت بە کاروبارەکانی یوونان و ئالْبانیا لە دووهەمین حەفتەی مانگی فەوریەدا پێکەوە کۆبوونەوە، ڤێنیزیلۆس لە گوشار و خێرایی ئاڵۆزی بەرەوپێشچوونی چالاکیەکان تێگەیی. ئەو وتارێکی تری پێشکەش کرد: نیکۆلسۆن لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە "هەتابلێی ئەو قسەلەڕوو، ژیربێژ و هەڵکەوتەیە." نیوەڕۆخوانەکان و ئێوارەخوانەکان درێژەیان هەبوو؛ نامە و یاداشتنامە لە پێنووسی ئەو دەباری. لە وڵاتەیەکگرتوەکان و لە ئورووپا هاوسۆزانی ئەو کۆڕوکۆبوونەوەیان درووست دەکرد؛ لە ناوچەکانی باڵکان و لە تورکیە، بریکارەکانی ئەو کۆمەڵانی یوونانیان هان دەدا تا یارمەتی بنێرن بۆ کۆڕی ئاشتی و داوا بکەن کە ئەوان بکرێن بە بەشێک لە وڵاتی یوونان. مامۆستایانی زانکۆکان پێداگریان دەکرد کە نابێ یوونانیەکان بخرێنە ژێر دەسەڵاتی

ئاڵبانیایەکانەوە، "ڕکابەریەک کە ئورووپا نەیتوانیوە بەخۆوەی بگرێت." (بەش بە حاڵی خۆیان، ئاڵبانیایەکان لە وڵاتە یەکگرتوەکان دەپارانەوە کە ماندێتی وڵاتەکەی ئەوان بگرێتە ئەستۆ.) لە ئاتێن یەکێک لە ئەندامانی حکوومەت وتبووی هۆشداری دابوو کە هۆشتان بێت: "تراۆ دی زێلی لەوانەیە زیان بە ئێمە بگەیەنێت."٨٢٨

هەر لە یەکەمین کۆبوونەوەی خۆیدا، کۆمیسیۆن لە ڕیزەکانی نیشتمانی هاتە دەرەوە، هاوکات لەگەڵ ئەوە بەریتانیەکان و فەرەنسەیەکان پشتگریان لە داواکاریەکانی یوونان کرد، ئاڵبانیایەکان هەڵوێستێکی بێ لایەن و میانڕەوانەیان بەخۆوە گرت و ئیتالیەکان بڕیاریان دابوو لەبەرانبەر هەموو شتێکدا بوەستن. ئیتالیا خوازیاری یوونانێکی بەهێز درووست بەپانتایی ئادریاتیکدا نەبوو. باریکترین بەشی ئادریاتیک لەسەر پاژنەی چەکمەی ئیتالیا هەڵکەوتبوو؛ شەست مایل بەرەو ڕۆژهەڵات، لەسەر کەنارئاوەکانی ئاڵبانیا، بەندەرێکی پڕپیت بەشێوەیەکی سرووشتی بەناوی ڤلۆرێ هەڵکەوتبوو، کە لەلایەن دوورگەی سازانەوە پارێزگاری لێدەکرا (ئیتالیەکەی: ساسێنۆ). ئەگەر ئیتالیا دەستی بەسەر هەم دوورگەکە و هەمیش بەندەرەکە بگرتایە، دەیتوانی دەستی بەسەر دەرگای چوونەژوورەوەی بۆ ئادریاتیک بگرتایە. هەڵبەت هەرکە قودرەتێکی نەیار بەسەر کەنارئاوی ڕۆژهەڵات بنیشتایەتەوە، ئیتالیا بۆ هەتاهەتایە لە خزمەتیدا دەبوو. کاتێکە سێربستان داوای خۆی بۆ پارچەیەک ئاڵبانیای باشوور پێشکەش کرد، ئیتالیا بەباشی دژی ئەویش وەستا. ئیتالیا بەرژەوەندی تریشی لەوێدا هەبوو؛ کەمینەی کاتۆلیک لە باکوور، کە لەلایەن قوتابخانەکانی ئیتالی و قەشەکانی ئیتالیەوە سەرپەرشتی دەکران. بەبۆچوونی ئیتالیەکان، ئاسانترین ڕێگا ئەوەبوو کە ڕاستەخۆ دەستیان بەسەر ئەوێدا بگرتایە، یان لانی کەم بەشێکی زۆر لە ناوچەکانی ئاڵبانیان بخستایەتە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە.

دوا ئەوەی کە مانگی فەوریە و مارسی بەسەر داهات، قەیرانی نێوان ئیتالیا و هاوپەیمانەکانی کاری کۆمیسیۆنی تەنانەت زیاتر لەجارانیش ئاڵۆزتر کرد. هەدوو نوێنەری ئیتالی هەوڵیان ئەدا کۆبوونەوەکان دوابخەن؛ بە تانە و توانج قسەیان دەکرد؛ هەڕەشەی پاشەکشێکردنیان دەکرد؛ لەبەشداریکردن لە کۆبوونەوەکان خۆیان دەپاراست، دەیانکوت کە نەخۆشن (زۆر جار دەکەوتن بەسەریاندا لە دەرەوە کە خەریکی خواردنی نانی شەوێ بوون و ئەمەش ساتێکی ناخۆشی لێدەکەوتەوە.) نیکۆلسۆن لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە هەرکیان " وەکوو منداڵ، ئەویش منداڵی چارەگرژ، هەڵس و کەوت دەکەن. ئەوان ڕێگرن و لەبەرانبەر هەمووشتیکدا دەوەستن."

❊ ❊ ❊ ❊

داواکاریەکانی یوونان لەسەر ئالْبانیا کێشەی بەرینتر لەوەی وروژاند وەکوو ئەوەکە ئایا وڵاتێکی بچووکی وا کە تازە دامەزراوە بڵێی بتوانێ درێژە بە ژیانی خۆی بدات. یوونان لەسەربنەمای ژمێرەزانی نیشتمانی نادیاری خۆی خوازیاری بەشێکی زۆر لە باشوور بوو. و، چون لە پاریس هیچ شتێک هەر وا ئاسان ڕووی نەدەدا، کێشەی تر لە پشتەوە خۆیان حەشار دابوو. ئەگەر ئیتالیا لە ناوچەکانی باشووری باڵکان شتێکی گیر بکەوتایە، بڵێی وازی لە داواکاریەکانی خۆی لە لووتکەی ئادریاتیک بهێنایە؟ بڵێی یوونان لەبەرانبەر ئاسیای بچووکدا وازی لە ئالْبانیا بهێنایە؟ خود-موختاری خەڵک لەکوێ مانای ڕاستەقینەی خۆی دەدۆزیەوە؟ ئەویش ئالْبانیای هەژار و بچووک، بە دوژمنانێکی بەهێزی لەوچەشنە و دۆستانێکی یەکجار کەمەوە. بێ بەش لە هەر پیشەسازیەک، تجارەتێکی بچووک، بێ بەش لە هەر ڕێگایەکی شەمەندەفەڕ بە تەنیا دووسەد مایلێک جادەی خۆشکراوەوە. ئالْبانیا درووست بەرلە شەڕ سەری هەڵێنا، لە چوار ناوچەی ئیمپراتۆری عوسمانی درووست ببوو. کەم کەس لە بیانیەکان سەردانی ئەویان کردبوو؛ سەبارەت بە مێژووەکەی یان خەڵکەکەی زانیاریەکی ئەوتۆ لەبەردەستی کەسا نەبوو. تەنیا کەرەتێک یان دووان ئالْبانیەکان- ئیمپراتۆرە گەورەکانی ڕۆمانیا وەکوو دیۆکلیتیان و کۆنستانتین- لە مێژووی ئورووپادا خۆیەکیان نیشان دابوو. بەبۆچوونی هەندێک کەس، ئالْبانیەکان دانیشتوانی سەرەکی ئیلیری لە ناوچەکانی باڵکان بوون، کەسانێک کە بە ڕاماڵینی لەسەرخۆی بەرەو باشوور و ڕۆژئاوای سالاڤەکان حەواڵەی ناوچە هەرە هەژارنشینەکان و هەرە دووردەستەکان کرابوون. گومان لەوەدا نەبوو کە زمانی ئەوان لەگەڵ زمانەکانی دراوسێکانی خۆیان وەکوو مۆنتینگرین، سێربی و یوونانی جیاوازیان هەبوو. لە ئیمپراتۆری عوسمانیدا، ئەوان لەبەرهۆی توانایەکانی شەڕکردنیان و جوانبوونی ئەوان بایەخیان پێدەدرا.

مێژوو و جوگرافیا- کۆمەڵێک شاخ و کێو و دەرووەدۆڵ کە بەدرێژایی دوورگەکە لە کەنار ئاوەکانەوە دەستیان پێدەکرد- هەزاران خێڵ و عەشیرەتی درووست کردبوون، کە لە بیانیەکان و تەنانەت لەخۆشیان بە ترس و گومانەوە دەیانڕوانی. گێگەکانی باکوور و تۆسکەکانی باشوور بە زاراوەی جیاواز دەدوان و داب و نەریتی جیاوازیان هەبوو. وەکوو هەمووی شوێنەکانی تر لە ناوچەکانی باڵکان، ڕابردوو کۆمەڵێک ئاینی جیاوازی پاش خۆی بەجێ هێشتبوو؛ لە سەدا حەفتای حەشیمەتی ئەوێ موسوڵمان بوون کە دوو بەرەی شیعە و سووننەی لێدەکەوتەوە؛ کەمینەیەک لە دەروێشەکانی لێ بوو. کەمینەی مەسیحی لە باکوور کاتۆلیک و لە باشور ئۆرتۆدۆکس بوون. کۆمەڵێک یاسای پێچەڵاوپووچ لەبابەت باشە و خراپە ژیانی ڕۆژانەیان

بەڕێوەدەبرد. لە هەندێک ناوچە، لە هەر پێنج پیاو یەکێک بەهۆی کێشەی خێزانییەوە گیانی لەدەست دەدا.

گەشتیارانێک کە بەرێکەوت بە پێیان یان بە سواری ئەسپ ڕێگایان دەکەوتە ئەوێ حەزیان دەکرد لەگەڵ خەڵکی ئەوێ و لەگەڵ سرووشتی ئەوێ پێوەندی خۆشەویستی ببەستن. بایرۆن وێنەی خۆی بە جل و بەرگی ئاڵبانیاییەوە کێشابۆوە؛ ڕەنگە لەناچاری ژنەدۆستێکی ئاڵبانیایی هەڵگرتبێت. لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، ڕۆژنامەنووسێک بەناوی ئدیت دۆرهام لەسەر پێشنیاری دوکتەرەکەی خۆی چووبوو بۆ ئەوێ. ئەو گێڕابوویەوە کە سەفەرەکەی بۆ ڕۆح و بۆ مێشکی ئەو باش بوو، بەڵام ئاڵبانیا ئەو شتە نەبوو کە ئەو لە مێشکی دابوو. ئەو بەرلە دەستپێکردنی شەڕ قوژبن بە قوژبنی ئەو وڵاتە گەڕابوو، زۆر جار بە تاقی تەنیا و زۆر جاریش لەگەڵ خزمەتکارێکی. ئاڵبانیایەکان نەیاندەزانی لەگەڵ ئەم بوونەوەرە خڕیلانەیە چی بکەن؛ لە ئاکامدا، ئەوان بڕیاریان هێنا سەر ئەوە کە وەک مرۆڤێکی خاوەن ڕێز هەڵس و کەوتی لەگەڵ بکەن. لەسەردەمی شەڕدا کاتێکە سەربازانی بەریتانی خەریک بوون لە ئاڵبانیای ڕۆژهەڵاتەوە تێدەپەڕین، هەستیان بەوەکردبوو کە ئەگەر بڵێن "دۆرهام"، وەک پاسپۆڕتیان پێبێت وابوو.٨٣٠

کاتێکە دۆرهام بۆیەکەمین جار ڕووی کردە ئاڵبانیا، هەستی نەتەوایەتی بزووتبوو. پرۆفیسۆرێکی ئوتریشی فەرهەنگێک و ڕێزمانێکی ئاڵبانی کۆکردبۆوە؛ ئەمە ئاڵبانیە باسەوادەکانی موقناع کرد کە لەوانەیە ئەوانیش مرۆڤ بن. دوا وتوێژێکی زۆر ئەلفبێی لاتین هەڵبژێردرا و یەکەمایەتی بە سەر شێوەنووسینەکانی یوونانی و عەرەبی پێدرا. کتێبگەلی ئاڵبانیایی بڵاوکرانەوە؛ چیرۆک و بەسەرهاتی فۆکلۆر، مێژوو، هۆنراوە. قوتابخانەکانی ئاڵبانیایی کرانەوە، زۆر جار بەنهێنی دەکرانەوە. هەتا دەسەڵاتی تورکی ڕێگەی بدایە و زەختی کەمتر بکردایە، زۆریەک لە ئاڵبانیەکان ڕازی بوون بەوە کە وەک سەرباز یان بەڕێوەبەر بۆ عوسمانیەکان کار بکەن. کاتێکە لاوانی تورک درووست بەرلە دەستپێکردنی شەڕی گەورە کەوتنە هەوڵی ئەوەکە ورەیەکی تازە بە ئیمپراتۆری عوسمانی ببەخشن، سەرکوتی چڕوپڕ و بەربڵاوی ئەوان بوو بەهۆی سەرهەڵدانی هاندەرێکی بزربوو؛ ڕاپەڕینەکانی ناسیونالیستی سەرتاسەری وڵاتی داگرت، و ڕزگاربوون لە دەست عوسمانیەکانیان کرد بە ئامانجی سەرەکی خۆیان. کۆمەڵێکی گەورەی ئاڵبانیایی لە دەرەوەی وڵات لایەمگری پڕ لە گڕوتینی خۆی ڕاگەیاند.

کاتێکە پێدەچوو کە دراوسێکانی ئاڵبانیا- یوونان و سێربستان لەهەموویان بەرچاوتر- هاتبوونەسەر ئەوەیکە بەیەکەوە عوسمانیەکان لە ئورووپا وەدەر نێن و دەسکەوتەکانی جەنگ دابەش کەن،

سەربەخۆیی بوو بە بابەتێکی زیندوومانەوەی نەتەوەیی لە ساڵی ١٩١٢دا. ئەمە لەگوێی زلهێزەکان خۆش نەبوو، کەسانێک کە ترسیان لە شەڕێکی تر لە ناوچەکانی باڵکان هەبوو؛ بۆیە، لە ساڵی ١٩١٣دا، ئەوان ئاڵبانیایان درووست کرد. سنوورەکانی ئەو وڵاتە لەلایەن کۆمیسیۆنی نێونەتەوەییەوە دیاری کران کە هاوڕێ بوون لەگەڵ نارەزایەتی سێربەکان و یوونانیەکان. کاتێکە کۆمیسیۆن سەردانی ئاڵبانیای باشووری کرد، ڕۆژنامەنووسێکی چاوتیژ سەرنجی دایە کە هەر ئەو خەڵکە لە هەر وێزگەیەکەوە دێن و هەڵگری تابلۆیەکن کە لێیان نووسراوە، " بۆ شارێکی یوونانی بەخێربێن." ئەو هێزە یوونانیانەی کە بۆ ماوەیەکی کاتی وەک داگیرکەر لەوێ بوون زەختیان دەکردە سەر منداڵان کە گۆرانی یوونانی بڵێن و بە خاوەن ماڵەکانیان دەستوور دابوو تا لە ناو ماڵەکانیان لە ڕەنگەکانی نیشتمانی یوونانی کەڵک وەرگرن. تەنانەت دوا ئەوەیکە یوونان هێزەکانی خۆشی کێشابوە دواوە، بە قاچاخ کەسانێکی ئاژاوەگەری خزاندبوە ئەو ناوە، کە لە هەوڵی ئەوەدا بوون شۆڕشێک بنێنەوە.

کورتەچیرۆکی ئاڵبانیا بەسەرهاتێکی ناخۆش و دڵتەزێن بوو. سەرۆک عەشیرەتەکان، چەتە و ڕێگرەکان، سەڵتەنەتخوازانی تورک، بریکارانی یوونانی، سێربی و ئیتالی هەرهەموویان دژ بە حکوومەتی لاوازی ناوەندی بەدوای ئامانجەکانی خۆیانەوە بوون. تەنیا یەک کەسایەتی لەو ناوەدا دیار بوو: کەسێکی بێ خێر و فریودەر بەناوی ئەسەد پاشای تۆپتانی. ئەیانوت کە هەرچەند هیچ کام لە زمانە ئەورووپیەکانی بەباشی نەدەزانی، لە هەمووی وڵاتانی ئەوێ دەیازانی نرخی پارە چەندەیە. ئەو بەشێوەی جیاواز بۆ عوسمانیەکان کاری کردبوو، وەک سەرۆکی پۆلیس لە شکوودێر (ئیتالیەکەی: سکووتاری)؛ بۆ لاوانی تورک؛ بۆ مۆنتینیگرینەکان (کە لە باکووری ئاڵبانیا پلان و گەلاڵەی تایبەت بەخۆیان هەبوو)؛ و بۆ ئیتالیەکان، بەڵام ئەوەش بڵێین کە هەمیشە بۆخۆی کاری دەکرد. هاووڵاتیەکانی هەمیشە لێی دەترسان و ڕقیان لێی بوو. کاتێکە یەکەمین ژنەکەی هەڕەشەی لێکردبوو کە بەهۆی ئەوەکە ژنی دووهەمی گرتوە دەرمان داوی دەکا (ئەو مسوڵمانێکی هەژار بوو بەڵام زۆرجار ئایینەکەی خۆی بۆ پێداویستیەکانی ماڵی بەکاردێنا)، ئەوەی هەڵدەستا ئافەرینی پێ دەگوت.٨٣١

لەم کەش و هەوا ئاڵۆزەدا هێزە گەورەکان بەپێی ئەقڵ و ئەزموونی خۆیان کەسێک بەناوی ویلهێلمی وید، شازادەیەکی ئەڵمانی،یان خزاندە ناوەوە- بەگوێرەی دوورهام " داردەستێکی لاواز، بێ بەش لە هەر وزە یان لێهاتوویەک و ناشارەزایەکی تەواو بەسەر وڵاتدا." لە هەوڵێکی تەواو بێ ئەقڵانەدا، پاشای تازە ئەسەدی کرد بە وەزیری جەنگ. ویلهێلم بەرلەوەی بگەڕێتەوە بۆ ئەڵمانیا شەش مانگ دەوامی هێنا، پێنج ڕەژمی جیاوازی پاش خۆی بەجێهێشت کە هەرکامیان خۆیان بە

حکوومەتی ئاڵبانیا دەزانی. لەو سەرووددەمەدا شەڕی گەورە سەری هەڵدابوو و ئاڵبانیا، بەهۆی پێگەیەکە هەیبوو، کوتوپڕ خرایە نێو کایەوە. ئیتالیا گەیشتە ئادریاتیک تا ڤلووڕێ داگیر بکات. یوونان بەرەو باشوور وەڕێ کەوت. ئەوکاتەی سووپای سێربی لە ساڵی ١٩١٥دا لەبەرانبەر ئوتریشیەکاندا خۆی نەگرت و خۆی دەربازکرد، لە ناو وڵاتی ئاڵنانیاوە بە مارشی سەربازیەوە تێپەڕ بوو. مێژووی دوورودرێژی گومانداریتی دوولایەنەی نێوان سێربەکان و ئاڵبانیایەکان لەوکاتەدا کەوتبوە قۆناغێکی تازەوە، چون چەتەکانی ئاڵبانیایی سێربە داماوەکانیان لەسەررێگای ڕۆیشتن بەرەو ئادریاتیک ڕووتاندبۆوە.٨٣٢

لە کۆتایی شەڕدا، زۆربەی ناوچەکانی ئاڵبانیا داگیرکران: بە دەست سێربەکانەوە لە باکوو، ئیتالیەکان و یوونانیەکان لە باشور، ئیتالیەکان لە زۆربەی شارچۆچکە کەنارئاویەکان و فەرەنسەیەکان لە بەشەکانی ناوخۆی دەورووبەری شکوودێر لە باکوور و کۆرچێ لە باشووری ڕۆژئاو، ئەو شوێنەیە کە ئەوان ئالایەکی سیریان هەڵدابوو کە ڕەنگەکانی نیشتمانی فەرەنسەیی لەگەڵ نەخشێکی کۆنباوی ئاڵبانی تێکەڵ کرابوون. لە باشوور، یوونان قوتابخانەکانی کردەوە و بۆ نوێنەرانی پەرلەمانی یوونانی هەڵبژاردنی سازکرد. سێربستان و یوونان بە دڵنیایەوە باسیان لە دابەشکردنی ئاڵبانیا لەنێوان خۆیاندا کرد، بەڵام ئەوە ئیتالیای دەخستە پشت گوێ، وڵاتێک کە لە گرێبەستی لەندەندا بەڵێنی ڤلرۆی پێدرابوو. (لە ساڵی ١٩١٧دا ئیتالیا هەوڵی دابوو هەمووی وڵات بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە بەڵام ناچارکرا دەست هەڵگرێ و پاشکشێ بکات.) گرێبەستەکە ئاماژەی بە تەکبیرێکی تر دەکرد: ئاڵبانیا لەنێوان سێربیا، مۆنتێنێگرۆ و یوونان دابەشکرا، و لەناوەڕاستدا ناوچەیەکی بچووک خرایە ژێر کۆنترۆڵی ئیاتلیایەکانەوە.٨٣٣

ئاڵبانیایەکان لەبەر دەم ئەم هەڕەشانەدا بۆ سەر وڵاتی خۆیان، هەوڵیان دا بەخۆیان دابێن و یەک بگرنەوە. لە کۆبوونەوەیەکدا لە مانگی دیسامری ساڵی ١٩١٨، نوێنەرانی بەشە جیاجیاکانی وڵات حکوومەتێکی کاتیان بە سەرۆکایەتی تورکهان پاشا دامەزراند، ڕیشسپیەکی دێرین کە کاتی خۆی بەناوی دیپلۆماتی عوسمانی چالاکی کردبوو. ئەسەد، وەک جاری جاران، لێرەشدا ڕۆڵی خۆی گێڕا، پێداگری دەکرد کە ئەو سەرەک کۆماری ئاڵبانیا یان، بەواتایەکی تر، پاشای ئەو وڵاتەیە. (ئەو بەشێک لە کاتی شەڕ بە دانانی دیزاینی یوونیفۆڕمێکی سەیر بۆ خۆی تەرخان کردبوو کە بە نەخش و نیگاری سەیر ڕازاندبویەوە.) کاتێکە حکوومەتی کاتی شاندێکی بە ڕێبەرایەتی تورکهان پاشا بۆ پاریس نارد، ئەسەد سەربەخۆ چوو بۆ ئەوێ و لەگەڵ نوێنەرانی ڕەسمی زۆر بەشێوەیەکی ناشیرین دەمەقرێی کرد، کەسانێک کە ئەو بە هاودەستی ئیتالیایەکانی تۆمەتبار دەکردن.٨٣٤ ئەو

بەجارێک پەکی کەوتبوو چون لە ترسی ئەوە کە یەکێک لە دوژمنە زۆرەکانی ئەو نەیکوژێت سەری لە هۆتێلەکەی نەدەهێنا دەرەوە.

هاوڕێیانی ئاڵبانیا لە دەرەوە، گرووپێکی جۆراوجۆر، لە هەر یارمەتیەک کە لە دەستیان دەهات درێخیان نەکرد. یەکێک لە گرووپەکان خانەدانێکی لەدڵەوەنزیکی مەجاریان بەکرێ گرت تا گوشار بخاتە سەر ئەمریکیەکان؛ بەداخەوە، دەرکەوت کە خولیای سەرەکی ئەو لە ژیاندا، و تەوەری هەمووی وتوێژەکانی ئەو، شێوەی دارشتنی ددانی دایناسۆرەکان بوە. فێدراڵیەتی پان-ئاڵبانیایی ئەمریکا موژدەبەرێکی فەلەی ئەمریکی حەواڵە کرد، ئەویش بە هەمان چەشن ناکارامە بوو. دواتر ئۆبرەی هێربێرت ناردرا، گەنجێک کە کوری یەکێک لە بنەماڵە خانەدانە گەورەکانی بەریتانیا بوو. (کورەزاکەی ئەو خانەدانی کارنارڤۆن گۆری تووتان خوومانی هەڵدایەوە.) ئەو ماوەیەکی زۆر لە تەمەنی خۆی بەرلە دەستپێکردنی شەڕ تەرخانی سەفەر کردن بەناو ئیمپراتۆری عوسمانیدا کردبوو، ئەو ناوچانەی کە کەش و هەوایەکی هەرە ناخۆش و مەترسیدار زاڵ بوو بەسەریاندا. ئەو بە چەندین زمان بەرەوانی قسەی دەکرد، وەکوو تورکی و ئاڵبانی، و وەک بریکارێک بەخۆرایی بۆ دایرەی دەرەوەی بەریتانیا کاری دەکرد. جان بووچان ئەوی وەک نموونەیەک لە قارەمانی *گررین مانتیل* بەکاردێنا، پیاوێک "کە بۆ هەر چەتەیەکی ئاڵبانیایی برایەکی خوێنی بوو." ئاڵبانیایەکان پێشنیاری تەختی پاشایەتیان بە ئەو دا. هێربێرت قەبوولی نەکرد بەڵام کۆمەڵەی ئانگلۆ-ئاڵبانی دروست کرد تا لەپێناو سەربەخۆیی ئاڵبانیادا خەبات بکات. ئیدیت دۆرهام ئەمینداری ئەو کۆمەڵەیە بوو.[٨٣٥]

شۆرای عالی لە ٢٤ی مانگی فەوریەیدا رێگەی دا بە تورکهان پاشا تریبۆن و گوێگری تایبەت بەخۆی هەبێت. نیکۆلسۆن لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە "لە حاڵێکدا ئەمە درێژەی هەیە دەکەسەکە هەر خەریکی گاڵتەکردن و چەلەحانێن. زۆر شتێکی ناخۆشە."[٨٣٦] ئاڵبانیایەکان خۆیان سپاردبوو بە رەحم و بەزەیی کۆری ئاشتی، بەتایبەت، بە ئەمریکیەکان. لە راگەیاندنە نووسراوەکەی ئەواندا هاتبوو کە " ئەوان باوەریان بەوەیە کە یاسای نەتەوەیی کە بەروونی و بەئاشکرا لەلایەن سەرۆک ویلسۆن و هاوکارە مەزنەکانی بانگەشەی بۆ دەکرێت بەبێ هۆ بانگەشەی بۆ ناکرێت، و باوەریان بەوە هەیە کە مافەکانی ئەوان- کە، هەتاکوو ئێستا، لەژێر پێ پێشێل کراون- رێزی لێدەگیرێت."

ئاڵبانیەکان لەبەرامبەر داواکاریەکانی یوونانیەکاندا وەستان، ژمێرەزانی تایبەت بەخۆیان دروست کرد. ئەوان لەو شوێنانەی کە یوونان لە باشوور حەسێبی ١٢٠،٠٠٠ یوونانی بۆدەکردن، ئاڵبانیایەکان دەیانتوانی تەنیا ٢٠،٠٠٠ کەس لەو شوێنانە بدۆزنەوە. ئایین هەمووشتێکی دەرنەدەخست؛ مەسیحی

یان مسوڵمان ، هەمووی ئاڵبانیایەکان لە خۆشەویستی نیشتمانی خۆیان یەکگرتوو بوون، و بەدرێژایی چەندین سەدە ئەمەیان سەلماندبوو. یوونانیەکان بانگەشەی ئەویان دەکرد کە لە ئاڵبانیایەکان پێشکەوتووترن، کەچی تووشی کارەساتی دڵتەزێن دەهاتن. سێربەکانیش هەر وابوون. لەکاتی شەڕدا، ئاڵبانیایەکان ئەوەیکە لە دەستیان هاتبوو بۆ یارمەتیدانی هاوپەیمانان کردبوویان. ئاڵبانیا نەدەبوو هیچ ناوچەیەکی لە دەست بدایە؛ ئەوەی ڕاستی بێت، لە توندترین دادوەریشدا، دەبوایە بەشێک لە ناوچەکانی سێربیا، مۆنتێنیگرۆ و یوونان ئەو شوێنانەی کە ئاڵبانیەکان زۆرینەیەکی بەرچاویان بەدەستەوە بوو بە ئاڵبانیا ببڕایە.

داواکاری ئاڵبانیا کۆزۆڤۆی دەگرتەوە، ناوچەیەکی بەبەراورد پڕ پیت و بەرەکەتی وەرزێری لە سنووری باکووری ڕۆژئاوای ئاڵبانیا، شوێنێک کە، نوێنەرانی ئاڵبانی دەیانکوت، ئاڵبانیایەکان لە "سەردەمانی کۆن کە لەبیری کەسدا نەماوە" لەوێبوون؛ سێربەکان، کە ئەوانیش داوای کۆزۆڤۆیان دەکرد، هەتا سەدەی حەڤدەهەم نەگەیشتبوونە ئەوێ. بێجگە لەوانە، سێربستان، کە لە ساڵی ١٩١٣وە کۆزۆڤۆی خستبوە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، زۆر بە ناشیرینی و ترسێنەرانە هەڵس و کەوتی کردبوو. ئەگەر ئاڵبانیایەکان لەناچاری دەبوایە لەژێر دەسەڵاتی سێربیدا ژیانیان بەسەر بردایە لە داهاتوودا کێشە دروست دەبوو.٨٣٧ (سێربەکان سەبارەت بە ئاڵبانیایەکان هەر هەمان شتیان دوویات دەکردەوە.)

سەبارەت بە ڕابردوو کێ ڕاست دەڵێ و کێ درۆ دەکا (وڵامێکی دروست تایبەت بەم پرسیارە سەبارەت بە ناوچەکانی باڵکان هەمووکاتێک کارێکی دژوار بووە)، بەڵام ئاشکرابوو کە ئاڵبانیایەکان پەروەندەیەکی باشیان بەدەستەوە بوو. زۆربەی دانیشتوانی کۆزۆڤۆ ئاڵبانیایی بوون. بەڵام کۆزۆڤۆ بۆ سێربەکان ڕانیمیدی ئەوان بوو، دۆڵی فۆرجی ئەوان بوو، و لۆرەینی ئەوان بوو. کۆزۆڤۆ ئەو شوێنە بوو کە لە ساڵی ١٣٨٩دا عوسمانیەکان سێربەکانیان تێدا شکست دابوو و خستبوویاننە ژێر دەسەڵاتی ئیسلامیەکانەوە. شکستێکی کوتوپڕی بوو و، بەبارێکی تر، سەرکەوتنێکی گەورەی سێربەکان، کە بەدرێژایی سەدەکاندا جێژنی بۆ دەگیرا. وەک ئەفسانە دەیانگێڕایەوە کە پیاوچاکێک، لە شێوەی هەڵۆیەکدا، بە شازادەی سێربی پێشنیار کردبوو کە لەنێوان بردنەوەی شەڕ لەسەر عەرز و بردنەوە لە ئاسمانەکاندا یەکیان هەڵبژێرێت؛ ئەویش دووهەمینیانی هەڵبژارد و، هەرچەند کۆچی دوایی کرد، ڕزگاربوونی ئەو و سێربە مەسیحیەکان مسۆگەر کرابوو. یاریدەدەری هاوس بەناوی بۆسال وتبووی کە " گومان لەوەدا نیە کە ئەم ئاینە لە سەدەی نۆزدەهەمدا بەشێک لە ئیمپراتۆری گەورەی سێربی بووە، خواهەڵدەگرێت بچێتەوە سەر بۆلغارستان؟ خواهەڵدەگرێت کالیفۆرنیا و نیو مەکسیکۆ بگەڕێنەوە سەر ئیسپانیا یان مەکسیکۆ؟ من نازانم." ڕێگاچارەیەکی ئاسان

لەوانەیە ئاڵوگۆڕکردنی خەڵکانی دانیشتووی ئەو شوێنانە بێت. " ئەگەر پێوەندی برایانە لەنێوان ناکۆکیکەراندا درووست بێت لەبەرژەوەندی هەموولایەک دایە، بەڵام بەداخەوە هەمووی پسپۆڕان دەڵێن کە ئەوە ناکرێ و نابێت؛ لانی کەم لەسەر ئەم خاڵە ئەوان لە گەڵ یەک تەواو کۆکن."٨٣٨

لە ساڵی ١٩١٩دا کۆزۆڤۆ نەبوو بە کێشەیەک چون هێزە گەورەکان لە گەورەکردنەوەی سنوورەکانی ئالبانیا بە هەر بارێکدا هیچ هۆیەکیان نەدەبینی. ئالبانیا لاواز بوو، حکوومەتەکەی ناکارامە بوو. چدەبوو ئەگەر چەند وەرزێری ئالبانی نیو-ملوێن کەس لەژێر دەسەلاتی سێربی یان یووگسلاڤیدا بژینایە؟ لە سالانی دواتردا، جاروبار جیهانیان دەنگ و هەرای بۆڵەبۆڵ کردن و ناڕەزایەتیان بەگوێ دەگەیشت. قەشەکانی ئالبانی لە کۆمەڵەی گەلاندا دەرکەوتن تا گلەیی ئەوەیان بەگوێ بگەیەنن کە قوتابخانەکانی ئەوان خەریکن دادەخرێن. لە سەردەمی شەڕی دووهەمی جیهانیدا، بە پشتگری ئەڵمانیا و ئیتالیا، ئالبانیا توانی لە ئاکامدا دەست بەسەر کۆزۆڤۆدا بگرێت؛ بەڵام تیتۆ، دەسەلاتداری تازەی یووگۆسلاڤیا، لە کۆتایی شەڕەکەدا توانی بیگرێتەوە. ئالبانیا هەر بۆڵەبۆڵی دەهات بەلام نەیدەوێرا بە ئاشکرا هیچ کارێک بکات. و دەسەلاتی تیتۆ بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی کە دواتر هاتە ئاراوە زۆر سووکەڵە بوو. لە ساڵی ١٩٨٩، حەفتا ساڵ دوا کۆڕی ئاشتی پاریس، ئالبانیا داواکاریەکانی خۆی سەبارەت بە کۆزۆڤۆ زیندوو کردەوە.

* * * *

کۆمیسیۆنی یوونانی پشتی لە ئالبانیا و داواکاریەکانی کرد و زۆربەی کاتی خۆی تەرخان بە هەوڵدان بۆ پێڕاگەیشتن بە داواکاریەکانی ڕکابەرانەی ئیتالیا و یوونان کرد. پلانی جۆراوجۆر بە هەڵواسراوی مانەوە؛ بۆ ئیتالیا هەبوونی ماندێت بەسەر گشت ئالبانیادا، یان یوونان هەبوونی ماندێتێک بەسەر باشووردا. فەڕەنسیەکان، زیاتر بۆ بەرگری کردن لە دەستدرێژی ئیتالیا، پێداگریان دەکرد کە کۆرچی لە باشوور پێویستە بە یوونان ببرێت چون ئەو ولاتە تەنیا جادەیەکی کۆنترۆڵ دەکرد کە بەشی ئادریاتیکی یوونانی بە مەکدۆنیای یوونان گرێ دەدا. دەنگۆی ئەوە هەبوو کە یوونان و ئیتالیا خەریکن بۆڕایەکی تر سەبارەت بە مامەلەیەکی جیاواز قسەوباس دەکەن؛ ئەوەکە ئیتالیا خەریک بوو چەتە دۆستەکانی ئالبانی چەکدار دەکرد؛ ئەوەکە فەڕەنسیەکان حەزیان دەکرد بە داگیرکاری خۆیان لە کۆرچێ درێژە بدەن مەگین بە یوونان ببەخشرایە. ئەمریکیەکان زۆر سەیر ناچالاکیان لێهاتبوو، ڕەنگە بەهۆی ئەوەکە بازنەی ناوخۆ بە دەوری ویلسۆنەوە بەلای گرێبەستێکی ئەڵمانی و پێوەندیە ڕوولەخراپەکان لەگەڵ ئیتالیا ڕاکێشرابوو. لە نائومێدیدا، نیکۆلسۆن پشتی بە

پیلانێکی پڕووپووچ بەست: سەبارەت بە ئاڵبانیا کە دەبوو دابەش کرایە، سەبارەت بە باکوور کە دەبوو بە سێربیا گرێ بدرایە، دەوڵەتێکی مسوڵمان لەو ناوەندا لەژێر ماندێتێکی ئیتالیدا، باشوور لەژێر دەسەڵاتێکی یووناندا، و کۆرچێ زێدی زانکۆیەکی ئاڵبانیایی ناوەندی لەژێر پارێزگاری ئەمریکایەکان دابوو.[٨٣٩]

ویلسۆن لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە ئاڵبانیایەکان تۆقابوون کەسانێک کە ژمارەیەک یارمەتیان وەرگرتبوو، بە ئەگەری ماندێتێکی ئیتالی. لەوانەیە ئەوان باشتر وابێت کە سەربەخۆیی خۆیان هەبێت. لیۆد جۆرج لە وڵامدا وتی کە " من لە ڕاستیدا نازانم ئەوان لەگەڵ ئەوە چی دەتوانن بکەن جگە لەوەکە بەربینگی یەکتر بگرن و یەکتر بکوژن." ئاڵبانیا وەکوو کوێستانەکانی ئیسکاتلەند لە سەدەی پازدەهەمدا وابوو. ویلسۆن وتی " باشە بەستی کە کێوەکانی ئیسکاتلەند گلاو مەکە ئەوێ نیشتمانی باوباپیرانی منە." و هەتا شۆڕای چوار یار بهاتایەتە گۆڕێ ئەوە کۆتایی باسەکە بوو.[٨٤٠]

لە هاوینی ساڵی ١٩١٩دا، کاتێکە حکوومەتێکی تازە و زیاتر ئاشتەوایی لە ئیتالیا دەسەڵاتی گرتە دەست، لەگەڵ ڤینزیلۆس ڕێکەوتنامەیەکی بەست، بۆخۆی لەژێر گوشاردا داواکاریە ئاڵۆزاوەکانی یوونانی داکووژێنێت. مامەلەکە بابەتێکی تجارەتی ئەسپ بەشێوازی کۆن بوو: ئیتالیا لە داواکاریەکانی یوونان پشتگری دەکرد، وەکوو ئەوانەی تایبەت بە ترەیس، ئەگەر یوونان وازی لە داواکاریەکانی خۆی تایبەت بە ناوچەکە بهێنایا ئیتالیا بەشی باشووری ئاسیای بچووکی دەویست. هاوڕێ لەگەڵ ئەوە ئیتالیا هەمووی دوورگەکانی دۆدیکانیسی دەدا بە دەستەوە بێجگە لە گرنگترینی ئەم دوورگانە، ڕۆدیس. (ئەو جۆرەی کە دەهاتە بەرچاو قوربانی نەبوو، چون ئیتالیا هیچ داواکاریەکی یاسایی سەبارەت بە ئەوان نەبوو.) سەبارەت بە ئاڵبانیا، ئیتالیا لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە دەبێ یوونان باشووری پێ ببەخشرێت؛ لەبەرانبەر ئەمەدا، یوونان خاوەندارێتی ئیتالیای بەسەر بەندەری ڤکووری و ناوچە دوورە ئاوەکانی ئەوێ، و ماندێتێکی ئیتالی بەسەر ئەو ناوچانەی کە بەجێمابوو بە فەرمی دەناسی. وەک هێمایەک لە ڕۆحیەتی تازەی دانووستان، ڕێگایەکی شەمەندەفەڕ لە ڤلوورەوە بەرەو ئاتێن درووست دەبوو.

هەر خێرا بەدوا ئەوەدا، هێزەکانی تر دەنگی نارەزایەتیان بەرز دەبۆوە. هەتا دانووستانێکی گشتیتر نەهاتایەتە ئاراوە فەرەنسەیەکان حازر نەدەبوون کۆرچێ بەجێ بێڵن. بە ئەگەری هەبوونی ناوچەیەکی یەکجار زۆری ئیتالی بەدرێژایی سنوورەکانی دەوڵەتی تازەی یۆگۆسلاڤیا ئەو دەوڵەتە بەوە عاجز دەبوو. و ئەگەر یوونان و ئیتالیا چەند پارچەیەک لە ئاڵبانیایان پێببڕایە، ئەویش داوای هەندێک ناوچەی لە باکوور دەکرد.

دوایەمین تەقە لە ڕێکەوتنامەکە لە مانگی فەوریەی ساڵی ١٩٢٠وە لەلایەن کۆمەڵێکی چاوەڕواننەکراوەوە ئاراستە کرا. سەرۆک ویلسۆن، کە لە خەباتی خۆی بۆ جێبەجێ کردنی گرێبەستی ڤێرسایلێس کە لەلایەن کۆنگرێسەوە پەسەندکراو بوو، هێشتا هەر بە پرەنسیپەکانی خۆیەوە دەئالا. لە پەیامێکدا بۆ هاوپەیمانانی ئەورووپی خۆی ئەو وتبووی کە ولاتەیەکگرتوەکان ئامادە نیە لەبەرنبەر خەڵکی ئەورووپادا هەڵس و کەوتێکی نادادوەرانەی هەبێت. لە وەرزی بەهاردا، ئالبانیایەکان دژ بە داگیرکاری ئیتالی شۆڕشێکی بەرینیان ساز کرد. لە مانگی ئۆگستدا، ئیتالیا ئامادە بوو تا ئاگربەستێک واژۆ بکات کە تەنیا دوورگەی سازانی بۆ دەهێشتەوە، کە ڕووبەڕوی بەندەری ڤلوورە بوو. ڕۆژنامەیەکی ئیتالی ڕایگەیاندبوو کە " دوا ڕژاندنی خوێنێکی بەنرخ و بەخشندەی ئیتالی قوربانی بەملوێن کەسایەتی گەورە لەپێناو شارستانیەت و لەپێناو هێمنایەتی سنوورەکانی ئێمە شایەتحاڵبوونی کارەساتێکی لەو چەشنە جێی داخ و کەسەرە."٨٤١ فەرەنسەیەکان لە کۆرچێ پاشەکشێیان کرد، و یوونان و یۆگۆسلاڤیا، تا ماوەیەکی تر، لە داواکاریەکانی خۆیان وازیان دەهێنا. لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٠دا ئالبانیا وەک دەوڵەتێکی سەربەخۆ لەلایەن کۆمەڵەی گەلانی دانی پێدانـدرا، سنوورەکانی هەر ئەوانەی ساڵی ١٩١٣ بوون.

بەبێ هۆ نەبوو کە ئالبانیا بوو بە شوێنی لەدایکبوونی پاشایەک کە ناوی خۆی بە سەرکەوتنی پیرلیک بەخشی. سیاسەتی ناوخۆ بەشێوازی ئالۆز و شێواوی خۆی درێژەی پەیاکرد. ئەسەد بە ئاواتی پاشابوونی خۆی گەیشت، بەڵام قەت لەسەر تەختی پاشایەتی دانەنیشت. سەرەڕای ئەوەکە لەلایەن بادی گارد و دەمانچە بەدەستانەوە پارێزگاری دەکرا، کاتێکە هۆتێل کانتینێنتالی لە پاریس بەجێهێشت کۆنە دوژمنێک بە گوللە کوشتی. بە دەستووری نەوەی ئەسەد، کە وەک چاوەڕوان دەکرا ببێ بە پاشا، قاتڵەکەش بەنۆبەی خۆی کوژرایەوە.

ئیتالیا قەت نەیتوانی بەتەواوەتی واز لە پلانەکانی خۆی بێنێت. لەژێر دەسەڵاتداریێتی مۆسۆلینیدا، کاریگەری ئیتالیا ڕوولە گەشە بوو؛ لەکۆتاییدا، لەو شەوەی کە بۆ سبەینێدا شەڕی دووهەمی جیهانی دەستی پێدەکرد، ئیتالیا ئالبانیای بەخۆوە لکاند. دوا کۆتایی هاتنی شەڕ، مامۆستایەکی پێشووی زمانی فەرەنسەیی، ئەنوەر هۆخا، یەکێک لە ڕەژیمە کمونیستە هەرە کۆنەپارێزەکانی دامەزراند. هەوڵی بەردەوام لەلایەن بەرخودانی ئالبانیایەوە و لایەنگرانی ڕۆژهەڵاتی ئەوانەوە بۆ هێنانەوە سەرکاری زۆگ پاشا بە هیچ ئەنجامێک نەگەیی، زیاتر بەهۆی ئەوەوە بوو کە ئەوان لەلایەن سیخۆڕی سەر بە سۆڤیەوەوە، کیم فیلبای، لە ڕۆژئاوا خەیانەتی پێکرا. لە دەیەکانی

ساڵی ١٩١٠دا، دوا کۆتایی هاتنی شەڕی سارد، نەوەی گەورەی ئەسەد، تاجرێکی چەک و تەقەمەنی لە ئەفریقای باشوورەوە، داوای چونە سەرتەختی زیندوو کردەوە.

* * * *

یوونان لە ترەیس زۆر شتی باشی بە ئەنجام گەیاند، شوێنێک کە ڤینزیلۆس بەگشتی داوای دەکرد. ئەوەی کە ئەو ختیە پشت گوێ و لەبەرچاوی نەگرت، بە کایەپێکردنێکی زیرەکانەی ژمێرەزانی، تێکەڵی حەشیمەت بوو. پێدەچوو ترەیسی ڕۆژهەڵات زۆرینەیەکی یوونانی بەدەستەوە بووبێت؛ لە بەشی ڕۆژئاوادا، کە لە ساڵی ١٩١٣ەوە بە بۆلغارستان بڕابوو، تورکەکان سێ بە یەک ژمارەیان لە یوونانیەکان زیاتر بوو. هاوکات لەگەڵ ئەوانەش زۆرینەیەکی بەرچاوی بۆلغاری هەستی پێدەکرا. ئەمە زۆر خراپ بوو؛ ئەگەر پرەنسیپی نەتەوایەتی بۆ ئەو شتەی کە ئەمریکیەکان هەمیشە پشتگریان لێدەکرد بەکاربهاتایە، لەو حاڵەتەدا یوونان دەیتوانی تەنیا داوای ترەیسی ڕۆژهەڵات بکات. ترەیسی ڕۆژئاوا دەبێ بۆ تورکیە بگەڕێندرێتەوە یان هەر لەگەڵ بۆلغارستان بمێنێتەوە، کە پێویستی بە بەندەرە دەریایەکانی ئەوێ بوو. ئیتالیایەکان، کە دەنگۆی ئەوەیان لێدەکرا لەگەڵ حکوومەتی بۆلغاری دژ بە سێربیا پیلانەیان گێڕابێت و هاودەست بووبێتن، پشتگریان لە چارەسەری دووهەم کرد. لە هەرحاڵەتێکدا، وڵاتێکی تر لەنێوان بەشی سەرەکی یوونان و پارێزگای تازەی ترەیسی ڕۆژهەڵاتی ئەوێ درووست دەبوو. یوونانیەکان بەڵگەیان لەسەر ئەوە دەهێنایەوە کە بۆلغاریەکان، و زۆربەی تورکەکان، لەڕاستیدا یوونانی بوون. وەک نوێنەرێک بۆنسالی دڵنیاکردبۆوە" ئەوان بەڕەچەڵەک وەچەی ڕەسەنی ئاتیکین و وڵات لە ئەوان پڕە؛ بەڵام بۆ ئەوەکە دراوسێ سلاڤە دڕەندەکانی خۆیان هێور کەنەوە، و بەڵکوو لە مافی ژیانی ڕۆژانەی خۆیان بێ بەش نەکرێن، زۆربەی ئەوان هەموو زانیاریەک سەبارەت بە زمانی دایکی خۆیان دۆڕاندوە." هەڵوێستی گەڕانەوەی یوونانیەکان ئەوەبوو کە زۆرینەی مسوڵمان لە ترەیسی ڕۆژئاوا، چ بۆلغاری -یان تورکی- ئاخێوەر، دەسەڵاتێکی یوونانیان لا باش دەبوو. بە وەختی خۆی، ڤینزلۆس نامەیەکی پاڕانەوەی لە زمانی مسوڵمانەکانەوە درووست کرد: " خوا هەڵناگرێت ڕێگەبدەن ئێمە لە کۆیلەتیەکی وەها دژوار و دڵتەزێندا کە تا ئێستا بە مێشکی کەس دانەهاتوە بمێنینەوە- لەژێر کۆیلەتیەکی بۆلغاریدا."[٨٤٢]

هەرجۆرێک بێت، یوونانیەکان پێداگریان دەکرد، لەبەرچی دەبێ دوژمنانی شکستخواردوو بایەخیان بدرێتێ؟ ڤینزلۆس ئامادەبوو ڕێگە بە تورکیەی عوسمانی بدات تا پارچەیەکی بچووک لە

تریێس درووست بەرەو باکووری کۆنستانتینۆپل بۆخۆی هەڵگرێت. (هەڵبەت ئەو بەهیوابوو کە شار و دەوروبەری ناوشار بەو زوانە یوونانی بکرێن.) وەک بۆ ترەیسی ڕۆژئاوا، لەبەرژەوەندی ئاسایشی داهاتووی جیهاندا دەبوو، هەڵبەت باڵکانەکانی لێدەرچێت، ئەگەر بۆلغارستان لە هەمووی وازی بهێنایە و بە یوونانی ببەخشیایە. "هەرجۆرێک مافەتایبەتەکان بدرانایە بێ کەڵک دەبوون، چون بۆلغارستان قەت ڕووی ئاسایشی بەخۆوە نەدەدی مەگین ئەوەکە هەمووی ناوچەکانی باڵکانی پێببەخشرایە. بۆلغارستان داوای دەسەڵاتداریێتی تەواوی بەسەر هەمووی نیمچە دوورگەکاندا دەکرد، و لە هەموو دەرفەتێک کەڵکی وەردەگرت تا بە خولیاکانی خۆی بگات. بۆلغارستان نوێنەرایەتی ناوچەکانی باڵکانی دەکرد، پڕاشای ئورووپای ڕۆژئاوا."٨٤٣ بەریتانیەکان و فەڕەنسەیەکان، کە قینیان لە بۆلغارستان بوو، ڕێکەوتن. دوور لە هەر تەماحێک، بۆ پێوەندی گرتن لەگەڵ ترەیسی ڕۆژهەڵات یوونان پێویستی بە پارچە زەویەک بوو.

لەبەرانبەر ئەو نارەزایەتیانەی کە لەلایەن ئەمریکیەکان و ئیتالیەکان بەرزدەبوونەوە کە گوایە بۆلغارستان لەباری ئابووریەوە زیان دەبینێت ئەگەر هەمووی بەندەرەکانی سەر دەریای مەدیتەرانە لەکیس بدات، ڤینزلۆس، وەک جاران، وڵامێکی بەدەستەوە بوو: " پرەنسیپی نەتەوایەتی دەبێ بەسەر یاساکانی ئابووریدا یەکەمایەتی هەبێت. لەسەر دەریای ڕەش بۆلغارستان بەندەری پڕپیت و بەرەکەتی هەبوو." و، بەپێی ڕابردووی بۆلغارستان، ئەو وڵاتە توانایی تەواوی لە دروستکردنی بنکەی ژێردەریاییدا لە ئاجین هەبوو و دەیتوانی بۆسەر یوونان هەڕەشەیەکی تەواو گەورە بێت. ئەگەر بۆلغارستان بەڕاستی پێویستی بە دەرچەیەک هەبوایە، یوونان ڕێگەی پێدەدا لە یەکێک لە بەندەرەکان کەڵک وەرگرێت. (کاتێکە لە ئاکامدا پلانێکی بۆ دارێژرا، بۆلغارستان بەئاشکرا ڕەتی کردەوە: " دەرچەیەکی بۆلغاری بەرەو دەریا لەڕێگای ناوچەکانی تورکیە و یووناندا نەک تەنیا ناکرێت، بەڵکوو لەباری دەروونناسیشەوە پەسەندکراو نیە."٨٤٤)

هەرچەند کۆمیسیۆنی یوونانی لە ئاکامدا پێشنیاری بەخشینی هەردوو پارچەی ترەیسی بە یوونان کرد، کۆڕی ئاشتی بەبیانووی ئەوە کە پێشوەخت بڕیاردراوە ڕاگەیاندنی هەرجۆرە بڕیارێکی وەدرەنگ خست، چون چارەنووسی کۆنستانتینۆپل هێشتا دانەکووژابوو. ئەوەدەمەی کە بەرلە دەستپێکردنی دووبارەی کۆڕی ئاشتی لە هاوینی ساڵی ١٩١٩، وڵاتەیەکگرتووەکان لە بیرۆکەی ماندێت دەستی هەڵگرتبوو و لەوکاتەدا ئەویش بەتوندی دژ بە بەخشینی ترەیسی ڕۆژئاوا بە یوونان دەوەستا. لەبەرانبەردا، ئەمریکیەکان پێداگریان لەسەر بەخشینی ئەوێ بە بۆلغارستان دەکرد، کارێک کە بەریتانیەکان زۆریان پێ ناخۆش بوو، ئەوان ئاماژەیان بەوەدەکرد

کە ئەگەر یەکێک لە داواکاریەکانی یوونان بەرپەرچ بدرێتەوە، هەمووی کارەکان دەشێوێت و دەبێ سەرلەنوێ پێیاندا بچنەوە. ڤینزلۆس لەناوخۆی وڵاتەوە خەریک بوو هێرش بکرێتە سەری؛ ئەو بە لیۆد جۆرجی ڕاگەیاند کە هەڵوێستی ئەو زۆر مەترسیدار دەبێت مەگین ئەو بتوانێت هەندێک لە دەسکەوتەکان دەربخات.[845]

پاشەکشێکردنی بەرەبەرەی وڵاتەیەکگرتوەکان لە ئورووپا وای کرد لە هێزە ئەورووپییەکان کە حەز و خولیاکانی ئەو وڵاتە بە هەند نەگرن. لە گرێبەستی نیۆلی لەگەڵ بۆلغارستان، کە لە مانگی نوامری ساڵی ١٩١٩دا واژۆکرا، بۆلغارستان ترەیسی ڕۆژئاوای دۆڕاند. شاندی بۆلغاری دوایەمین هەوڵی بێ کەڵکی خۆی خستە کار: " بێ بەشکردنی بۆلغارستان لە ترەیسی ڕۆژئاوا، ئەو شوێنەی کە تەنانەت دوژمنانی ئێمەش یوونانیەکان و سێربیەکان، کە لە شەڕی ساڵەکانی ١٩١٢-١٩١٣ ئێمەیان بەزاندبوو، ورەی ئەوەیان نەبوو ئێمە بێ بەش بکەن....لەباری جوگرافیەوە بۆلغارستان زیاتر لە فەرەنسە و زلهێزانی دەریایی دادەبڕێنێت."[846] لە ساڵی ١٩٢٠دا، ترەیسی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، کە لەوکاتەدا لە تورکیە گیرابۆوە، لەلایەن هاوپەیمانانەوە درایەوە دەست یوونان. قەدەر وابوو یوونانیەکان لە دەسکەوتی تازەی خۆیان بۆ ماوەی دوو ساڵی ڕەبەق لە ئاشتی و تەباییدا چێژیان وەرگرتایە. زۆر لەولاترەوە بەرەو باشوور، لە ئاسیای بچووک، "بیرۆکەی مەزن" بەتوندی بەرەنگاری ڕاستی ببۆوە. یوونان یەکجار زۆر خۆی بڵاوکردبۆوە؛ بە ئەنجامدانی ئەم کارەی هێزەکانی ناسیۆنالیزمی تورکی بزواندبوو.

* * * *

# ٢٦
# کۆتاییهاتنی عوسمانیەکان

زۆر لەولا پاریسەوە، لەسەر نووکی ڕۆژهەڵاتی باشووری ئورووپا، شارێکی گەورەی تر ڕابردووی خۆی دەلاواندەوە و سەبارەت بە داهاتوو بە ڕەشبینییەوە دەیڕوانی. شارێک لای یوونانیەکان و ڕۆمانیەکان ناسراو بە بیزانتیووم، لای ئاشتیکەران ناسراو بە کۆنستانتینۆپل، لای تورکەکان بەناوی ئیستانبول، کاتی خۆی پێتەختی ئیمپڕاتۆری پیرۆزی بیزانتین بوو و دواتر، دوای ساڵی ١٤٥٣، پێتەختی تورکە سەرکەوتووەکانی عوسمانی بوو. لەو کاتەدا ئیمپڕاتۆری عوسمانی بەنۆبەی خۆی گلۆڵەی کەوتبوە لێژی. شار لە ئاوارەکان و سەربازانی سووپا شکستخواردووەکان جمەی دەهات، و بێ بەش لە هەر سووتەمەنی و خواردەمەنی و هەر هیوا و هۆمێدێک بوو. چارەنووسی ئەوان- لەڕاستیدا، چارەنووسی گشت ئیمپڕاتۆریەت- لەوەدەچوو بە کۆڕی ئاشتی بەسرابێتەوە.

چەندین تویێی مێژوو کەوتبوو بەسەر کۆستانتینۆپلدا، کەنیسەکان، مزگەوتەکان، نەقش و نیگارەکان، موزائیکەکان، کۆشکەکان، بازاڕە سەرگیراوەکان و گوندەکانی ئەوێ ماسیگیریان پاش خۆیان بەجێ هێشتبوو. دیوارە زەبەلاحەکانی شار لەلایەن ئەرووپاوە و ڕۆژهەڵاتەوە، ئێرانیەکان، خاچپەرستان، عەرەبەکان و لەکۆتاییدا تورکەکان هێرش کرابوونە سەریان. دوایەمین ئیمپڕاتۆری بیزانتین لە ساڵی ١٤٥٣دا لەوێ مەرگی هەڵبژاردبوو، ئەو کاتەی کە تورکەکانی عوسمانی داگیرکاری ئیمپڕاتۆریەتی خۆیان بەکۆتایی گەیاندبوو. لەژێر شەقامەکانی ئیستانبول لەت و پەتی ئاسەوارەکۆنەکان خۆیان مڵۆس دابوو؛ دیوارەکان، گۆڕەکان، ڕاڕەوەکان، ئاوپارێزێکی گەورەی بیزانتین کە تێیدا کۆڵەکەکانی یوونانی و ڕۆمانی سەربانەکەیان ڕاگرتبوو، منارەکانی مزگەوتەکان- هەندێکیان، وەکوو ساتنتا سۆفیەوەی زەبەلاح، لە کەنیسەکانی مەسیحی هەڵگەڕابوونەوە- برجی گەورە کە بە دەستی جینۆئیزەکانەوە دروست کرابوو کەسانێک کە لەسەر

نەبەکانی دەورووبەری شار هەڵدەکورمان و هەڵدەنیشتن. بەپانتایی کەنداوگەی قووڵی گەوڵدن هۆڕن، شاری کۆنی ئیستانبول، هاورێ لەگەڵ پیسی و پەڵۆخی و شکۆداریەک کە هەیبوو، ڕووبەڕووی ئەوێ شوێنێکی پێشکەوتووی هەرە بەربڵاو بوو کە بیانیەکان لەوێ دەژیان. شارێک بوو بە بیرەوەری و خەڵکانێکی یەکجار زۆرەوە.

دەورووپشتی ئەوێ ئاو بوو. بەرەو ڕۆژئاوای باکوور، بۆسفۆرس بەرەو ڕووسیە و ئاسیای ناوەندی درێژەی هەبوو و دەچووە ناو دەریای ڕەشەوە؛ لە ڕۆژئاوای باشووردا، دەریای مەرمەرە بەرەو داندانیلەکان و مەدیتەرانە درێژەی هەبوو. جوگرافیا شارەکەی درووست کردبوو، و بەدرێژایی سەدەکاندا جوگرافیا گرنگایەتی ئەوێی هەڵگرتبوو. هەر لە سەردەمانی کۆنەوە، ئەوکاتەی جەیسۆن لەڕێگەی دەریاوە خۆی گەیاندە ئەوێ و ئەلێساندێری گەورە لەو نزیکانەدا ئێرانیەکانی بەچۆک داهێنا و سەرکەوتنێکی مەزنی بەدەست هێنا، تا سەردەمانی نزیکتر و مۆدێرنتر، ئەوکاتەی کاترین گەورەی ڕووسیە و ویلهێڵمی دووهەمی ئەڵمانیا هەرکیان خۆیان گەیاندە ئەوێ تا داگیری بکەن، ئەو شارە هەمیشە وەک خەڵاتێکی گەورە شەڕی بۆ کراوە.

بەشێکی زۆر لە دیپلۆماسی سەدەی نۆزدەهەم بە کۆنترۆڵکردنی ئاوەڕۆ هەستیارەکانی وەکوو ئەمە سەری خۆی شلووق کردوە. ڕووسیە بە ئاواتی بەندەرەکانی ئاو-گەرم بوو تا بتوانێ دەستی بە دەریاکانی جیهاندا ڕابگات. بەریتانیاش بەنۆبەی خۆی پشتگری لە ئیمپراتۆرێکی پەرێشانی عوسمانی دەکرد تا ڕووسەکان لە دەریای ڕەشدا لە هێمنی و ئاسایش و دوور لە هەر مەترسیەک بیڵێتەوە. (تەنیا لە ساتە هەرە ناخۆشەکانی شەڕدا بەریتانیەکان شانیان بۆ ڕووسەکان شل دەکرد تا بەسەر دەربەندەکاندا کۆنترۆڵیان هەبێت؛ بەختەوەرانە، بەهۆی شۆڕشەکانی ساڵی ١٩١٧ەوە، ڕووسیە خەڵاتەکەی خۆی کۆ نەدەکردەوە.) تورکەکانی عوسمانی کە کاتی خۆی تا نزیک دەرکەکانی ڤیەن گەیشتبوون، شتێکی وایان بۆ کوتن پێ نەبوو. تەنانەت شۆڕشی لاوانی تورکیش درووست بەرلە شەڕی گەورە نەیتوانی نەهێڵێت ئەوان لەبەین بچن. لە ناوچەکانی باڵکان و بەپانتایی ئەفریقای باکوور ئیمپراتۆری ئەوان چووبوە ناو یەک.

لە ساڵی ١٩١٤دا، ڕێبەرانی عوسمانی بڕیاریان دا بەرەنگاری ڕووسیە ببنەوە، لەوکاتەدا لەگەڵ هاوڕێی کۆنی خۆیان بەریتانیا هاوپەیمان بوون: ئیمپراتۆریەت بە پشتگری لە ئەڵمان و ئوتریش-مەجارستان بە شەڕەوە پێوەندی گرت. ئەوە قومارێک بوو کە سەری نەگرت. ئیمپراتۆری عوسمانی سەرەڕای لاوازیەکە هەیبوو زۆر بوێرانە و ئازایانە شەڕی کرد. لە مێزۆپۆتامیا و گالیپۆلی، سەربازانی تورک هاوپەیمانانیان سووک و چرووک کرد، کەسانێک کە چاوەڕوانی سەرکەوتنێکی خێرابوون.

بەڵام لە ساڵی ١٩١٨دا، شانسی عوسمانیەکان کۆتایی هاتبوو. ڕووخانی بۆلغارستان لە مانگی سێپتامبردا لە ڕۆژهەڵاتەوە جادەیەکی بەرەو کۆنستانتینۆپل دەکردەوە، لە هەمان کاتیشدا هێزەکانی بەریتانی و هێندی لە باشوور و لە ڕۆژهەڵات خۆیان خزاندبوە ناوەوە. لە دەرەوە لە کۆتایی ڕۆژهەڵاتی مەدیتەرانە، کەشتیە جەنگیەکانی هاوپەیمانی بە ژمارەیەکی ترسێنەرەوە لە دەوری یەک کۆببوونەوە. تەنیا لە سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی باکوورەوە، شوێنێک کە ئیمپراتۆری کۆنی ڕووسی لەوێوە خەریک بوو هەڵدەوەشایەوە، ڕێگەی هەناسەدان هەبوو، بەڵام عوسمانیەکان لاوازتر لەوەبوون کە بتوانن کەڵکی لێوەرگرن. ئیمپراتۆریەتی ئەوان بەرلەوەی شەڕ دەست پێبکات پارچەپارچە ببوو؛ وەکوو بەفر لەوکاتەدا خەریک بوو دەتوایەوە. ناوچەکانی عەرەبنشین نەمابوون، لە میزۆپۆتامیاوە بگرە تا دەگاتە فلستین، لە سووریەوە بگرە بەرەوخوار تا دەگاتە نیمچەدوورگەکانی عەرەبی. لە کۆتایی ڕۆژهەڵاتی دەریای ڕەش، خەڵکانی بندەست- ئەرمەنیەکان، گۆرجێستانیەکان، ئازەربایجانیەکان، کوردەکان- خەبات و چالاکیان دەکرد تا لە ناوچە سنووریەکانی ڕووسیە دەوڵەت و وڵاتی تازە دامەزرێنن. دیپلۆماتێکی ئەمریکی لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە " بەپێی بۆچوونی گشتی تورکەکان هیچ هیوایەکیان لێ بەدی ناکرێت، دەستەوئەژنۆ چاوەڕوانی ئەنجامەکانی کۆڕی ئاشتین." وەکوو زۆربەی خەڵکانی تر ئەوانیش چاوەڕوانن ئەمریکیەکان ڕزگاریان بکەن؛ ڕەنگە خود-موختاری بتوانێ لانی کەم ناوچەکانی تورکی-ئاخێوەر لە ترەیسی ڕۆژهەڵات و ئاناتۆلیا ڕزگار بکات. لە کۆنستانتینۆپل، ڕۆشنبیران " کۆمەڵەی پرەنسیپەکانی ویلسۆنی"یان دامەزراند.[٨٤٧]

ئەو پیاوانەی کە ئیمپراتۆریەتیان بە شەڕ دابرد لە یەکەمین حەفتەی مانگی ئۆکتۆبردا دەستیان لەکار کێشایەوە و بە کەشتیەکی جەنگی ئەڵمانی دەرباز بوون، و حکوومەتێکی چاودێریکەر وشەی نهێنی بۆ بەریتانیەکان نارد کە گوایە ئەو حکوومەتە خوازیاری ئاشتیە. حکوومەتی بەریتانی سەبارەت بە کردنەوەی دەسبەجێی وتوێژەکان لە دوورگەی ئائیجینی مۆدرووس ڕەزایەتی دا، بەشێکی لەبەرهۆی ئەوەبوو کە فەرەنسەیەکان لەسەر هێڵەکانی لاوەکی بهێڵێتەوە. هەرچەند بەریتانیەکان لەگەڵ فەرەنسەیەکان لەسەر مەرجەکانی ئاگربەستی کاتی ڕاوێژیان کردبوو، ئەوان بیانوویەکی ئاڵۆزیان دەهێنایەوە کە چون ئیمپراتۆری عوسمانی یەکەمجار لەگەڵ ئەوان پێوەندیان گرتبوو، ئەوە ئەرکی بەریتانیەکان بوو کە کۆنترۆڵی وتوێژەکانیان لەدەست دابێت. حکوومەتی فەرەنسەیی و ئەدمیراڵی پلەباڵای فەرەنسەیی لە موودرووس هەرکیان ناڕەزایەتیەکی بێ کەڵکیان دەربڕی. هەمووی وتوێژەکان لەلایەن فەرمەندەی بەریتانیەوە، ئەدمیراڵ ئارتۆر کاڵتۆرپەوە بەڕێوە دەچوو.[٨٤٨]

نوێنەرانی عوسمانی لەلایەن حوسەین ڕەئووفەوە ڕێبەرایەتی دەکران، قارەمانێکی لاوی دەریایی و وەزیری تازەی هێزی دەریایی. لە ٢٨ی مانگی ئۆکتۆبردا ئەوان گەیشتنە کەشتی جەنگی کالتۆرپ، بەناوی *ئاگامیمنوون*. وتویژەکان مەدەنی و تەنانەت دۆستانەش بوون. ڕەئووف کالتۆرپی وەک مرۆڤێکی ڕاست و قسەلەڕوو هاتە بەرچاو- و ئەرخەیان بۆوە کاتێکە ئەو بەڵێنی دا کە بەریتانیا لەگەڵ تورکیە، چون لە تەواوی ئیمپراتۆریەت هەر ئەوێ مابوو، هەڵس و کەوتێکی ئینسانی دەبێت. لەوەدەچوو کۆنستانتینۆپل داگیر نەکرێت: بەدڵنیایەوە هیچ هێزێکی یوونانی یان ئیتالی، دێو و درنجە تایبەتەکانی تورکەکان، ڕێگەیان پێنەدەدرا لەوێ بنیشنەوە. کاتێکە ڕەئووف گەیشتەوە وڵات بە گوزارشگەرێکی ڕاگەیاند: " من دڵنیاتان دەکەمەوە کە تاقە سەربازێکی دوژمن لە ئیستانبوولی ئێمە لاق لەسەر عەرز دانانێت." بەریتانیەکان هەتابڵێی بەچاکی هەڵس و کەوتیان لەگەڵ کردبوون: "ئاگربەستێکی کاتی کە ئێمە پەسەندمان کردوە لەوپەڕی هیوا و ئارەزوەکانی ئێمەودیە." هەرچەند ئەوان هەمووی ئەو مەرجانەی کە لەلایەن بەریتانیەکانەوە پێشکەش کرابوون پەسەندیان کردبوون، ڕەئووف باوەڕی بە کالترۆپ بوو، کەسێک کە بەڵێنی دابوو مەرجەکانی ئاگربەست خراپ بەکار نابرێن. لەڕاستیدا بەریتانیەکان تەنیا ئارەزووی ڕاڕەوێکی ئازادیان لەناو دەربەندەکانەوە دەکرد؛ لەبەرچی ئەوان دەیانەویست کۆنستانتینۆپل، یان ئەوەی ڕاستی بێت هەرشوێنێکی تر داگیر بکەن؟ ڕەئووف بە خۆی دەگوت کە، بەگشتی، بەریتانیەکان تازە ناوچەکانی عەرەبنشینیان داگیرکردبوو: " من لام وایە ئەوان لە ڕوانگەی بەرژەوەندیە نەتەوەیەکانی خۆیانەوە خوازیاری هیچ ناوچەیەکی تر نین و هەوڵ نادەن هیچ شوێنێکی تر داگیر بکەن."٨٤٩

کاتێکە لە ٣٠ی مانگی ئۆکتۆبردا هەردوو پیاوەکە ئاگربەستەکەیان واژۆکرد، بەخۆشحاڵیەوە پیاڵەی شەرابیان لەیەک دا و بەخۆشی یەکەوە خواردیانەوە. ڕەئووف، کاپیتانی *ئاگامینۆن* لە نامەیەکدا بۆ خێزانەکەی خۆی نووسیبووی کە "بەهۆی میوانداریێتی من و بەهایەکی تایبەت کە وەک دوژمنێکی تەکنیکی بە ئەوم بەخشی کورتە وتارێکی سووپاسگوزاری پێشکەش کردم." ڕەئووف وتی کە وێنەی دوانەی کوڕە لاوی کاپیتان ببوون بە سەرچاوەی ئیلهامێک بۆ ئەو. " ئایا ئەوە شتێکی باش نەبوو؟".٨٥٠

لە لەندەن، کابینەی بەریتانی هەواڵی ئاگربەستەکەی بەخۆشحاڵیەوە پێگەیشت و کەوتە وتویژکردن لەسەر ئەوەکە چلۆن کۆنستانتینۆپل دەبێ داگیر بکرێت، " بە هۆشیێتی ڕۆژهەڵاتیەوە." بەریتانیەکان و هاوپەیمانەکانیان هەموو هەستێکی خۆیان خستەبوە کار تا بە ووردی و لەسەرەخۆ ئاگربەستەکە بسەپێنن. دەبوایە هەمووی پاسەوانە تورکیەکان گەمارۆ بدرانایە؛ هەمووی ڕێگاکانی

شەمەندەفەڕ و تێلێگرافەکان لەلایەن هاوپەیمانانەوە بەڕێوە دەچوون؛ و دەبوایە بەندەرەکانی تورکیە بۆ کەشتیە جەنگیەکانی هاوپەیمانی ئامادە کرانایە. بەڵام لەهەمووی کارەساتبارتر بەندی حەوتەم بوو، کە زۆر بە هاسانی دەیگوت: " بە ئەگەری هاتنە ئارای هەر کەش و هەوایەک کە بۆسەر ئاسایشی هاوپەیمانان هەڕەشە بێت هاوپەیمانان مافی ئەوەیان هەیە دەست بەسەر هەر خاڵێکی ستراتیژیکدا بگرن." چەند ساڵ دواتر ڕەئووف سەیری ڕابردووی کرد: " لە ولاتی ئێمە باوەڕێکی گشتی هەبوو کە گوایە ئینگلەند و فەڕەنسە وڵاتانێکن کە نەک تەنیا وەفادار بە پەیمانە نووسراوەکانی خۆیان دەمێننەوە، بەڵکوو لەسەر بەڵێنەکانی خۆشیان هەر سوورن. و منیش هەر لەسەر هەمان باوەڕ بووم. جێی شەرمە کە ئێمە لە بیروباوەڕەکانی خۆماندا تووشی هەڵە هاتبووین!"٨٥١

لە پۆستەکەی خۆیەوە زۆر دوور بەرەو باشوور، نزیک سنووری سووریە، هەڤاڵێکی ڕەئووف کە ئەویش قارەمانێکی جەنگی بوو بە دڵتەنگیەوە بۆ حکوومەتەکەی خۆی نووسیبوو: "باوەڕی ڕاست و ئاشکرای من ئەمەیە کە ئەگەر ئێمە هێزەکانی خۆمان لە ڕاژەی سەربازی بهێنینە دەرێ و هەرشتێک کە بەریتانیەکان خوازیارین بیبەخشین، بەبێ ئەوەی بۆ کۆتایی هێنان بە لێکتێنەگەیشتنەکان و لێکدانەوە هەڵەکان لە ئاگربەست هەنگاوێکمان هەڵێنابێت، ناتوانین لەبەرانبەر پلانە پڕ لە چاوچنۆکەکانی بەریتانیادا هەر وەستێنەیەک دابنێین." مستەفا کەماڵ- کە ئەمڕۆکە بە ئاتاتۆرک ناسراوە- بەپەلە بەرەو باکوور بۆ کۆنستانتینۆپل چوو و کردیە سەر هەرکەسێک کە چاوی پێدەکەوت، لە سیاسەتمەدارانی ناوادارەوە بگرە تا دەگاتە خودی سوڵتان، تابەڵکوو حکوومەتێکی ناسیۆنالیستی بەهێز دامەزرێنن تابەڵکوو بتوانن لەبەرانبەر بیانیەکاندا بوەستن. ئەو لە زۆربەی شوینەکان پشتگری لێکرا، بەڵام سوڵتان، محەمەدی IV، وای بەباش زانی کە هاوپەیمانان هێورکاتەوە. لە مانگی نوامری ساڵی ١٩١٨دا، محەمەد پەڕلەمانی هەڵوەشاندەوە و هەوڵی دا لەڕێگای پیاوانی خۆیەوە حکوومەت بکات.٨٥٢

زنجیرەی گەورەی سوڵتانەکان کە سولەیمان پاشای گەورەی لێکەوتبۆوە بە محەمەدی IVکۆتایی پێهاتبوو. دەسکەوتی گەورەی ئەو ئەوە بوو کە دەسەڵاتی سێ برای زیندوو ڕاگرتبوو: یەکیان کەسێک بوو کە کاتێکە تووشی نەخۆشی شێتی هات لەسەر تەختی دەسەڵات خرایە لاوە؛ جێگری گومانگرتوو و دڵڕەق، ئەوەندە لە دوژمنان ترسی لە دڵ دابوو کە هەرچی جار کە دەیەویست جگەرەیەک داگیرسێنێت پیاوێکی خەساو یەکەمین مژی بۆ لێدەدا؛ و پیرە پیاوێکی ترسەنۆک کە هەتا هاوینی ساڵی ١٩١٨ دەسەڵاتی بە دەستەوە بوو. محەمەدی IV پیاوێکی ژیر بوو نەدەکرا بەو ئاسانیە سەر لەو بیرۆکانەی کە لە مێشکی دابوو سەر دەرهێنی. ئەو مەقامی سوڵتانی گرتە

ئەستۆی خۆی بەڵام ترس و دڵەراوکێی زۆری لە دڵدابوو. بە ڕێبەرێکی ئایینی ڕاگەیاندبوو کە " من تووشی زیان هاتووم. تکایە دۆعام بۆ بکە."٨٥٣

قودرەتی تەختی پاشایەتی، کە کاتی خۆی جیهانی دەلەرزاند، هیچی پێ نەمابوو. نوێنەرێکی ئەمریکی لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە دەستووراتی حکوومی " زۆرجار لە پارێزگاکان کەم بایەخ وەردەگیرێن و ئاسایشی گشتی لە سەرتاسەری ئاسیای بچوکدا زۆر کەم بوە." هەرچەند کۆنستانتینۆپل یەکەم جار بەشێوەیەکی فەرمی داگیر نەکرا، سەربازان و دیپلۆماتەکانی هاوپەیمانی " لە هەموو شوێنێک بوون- ڕاوێژیان دەکرد و دەستووریان دەدا و پێشنیاریان دەکرد." کەشتیە جەنگیەکانی هاوپەیمانی ئەوەندە چڕوپڕ لە دەوری یەک لە بەندەر کۆببوونەوە کە لە دوورەوە لە کۆگایەکی زەبەلاح دەچوون. سوڵتان لەبن لچیەوە هەر ورتەی دەهات و دەیگوت" من نەخۆشم. ناتوانم لە دەلاقەکەوە سەر بەرمە دەرێ. حەز ناکەم بیانبینم." ئاتاتۆرک بۆچوونێکی جیاوازتری هەبوو: " چۆن هاتوون، هەر ئاواش دەڕۆن."٨٥٤

ئاتاتۆرک پیاوێکی قورس، ئازا، جەسوور و سامدار بوو کە ئێستاش وێنەکەی، بە چاوە شینە تۆقێنەرەکانیەوە، لە هەموو شوێنێک لە تورکیە بەدی دەکرێت. لەساڵی ١٩١٩دا بیانیەکان بەوشێوەیە نەیاندەناسی: چوار ساڵ دواتر ئەو کڕنۆشی بۆ فەڕەنسە و بەریتانیا بردبوو و دەوڵەتی-نەتەوەیی تازە تورکیەی دامەزراندبوو. دەیەمین ڕۆژی مانگی نوامر، ساڵوەگەڕی مەرگی ئەو، ڕۆژێکی نەتەوەییە. وەک هەردوو هاوڕێکەی و دوژمنەکانی بۆیان دەرکەوتبوو ئەو لێی دەهات کە دڵڕەق بێت؛ دوا سەرکەوتنە گەورەکانی، ئەو چەند کەس لە هاوڕێ کۆنەکانی خۆی، وەکوو ڕەئووف، دادگایی کرد و خستنیە بەندیخانەوە. هاوکات لەگەڵ ئەوانەش ئەو لەدڵەوەنزیک بوو، وەک زۆربەی ژنان ئەمەیان بۆ دەرکەوتبوو. منداڵان خۆشیان دەویست، و ئەویش ئەوانی خۆش دەویست؛ هەڵبەت ئەو هەموو کاتێک ئاماژەی بەوە دەکرد کە ئەو کارە حیکمەتی تێدایە چون منداڵانی پیاوانی گەورە سووکەڵە و ڕەوشت نزمن. ئەو مێشکێکی زانستیانە و ژیرانەی پێوەبوو. لە ژیانی دواتریدا ئەو لەلایەن تاقمێکی شاراوە و خاوەن ژیانی تایبەت و نهێنی سەرنجی ڕاکێشرا. ئەو ڕێگەی نەدەدا بە ڕادیۆی ئانکارا مۆسیقای کۆنباوی تورکی بخاتە سەر؛ بەڵام بەنهێنی ئەو لەگەڵ هاوڕێکانی خۆی گوێی بۆ شل دەکرد. ئەو دەیەویست لە دەست ژنانی تورکی ڕزگاری بێت، لەگەڵ ئەوەش کاتێکە تەنیا یەکەمین ژنە مارەکراوەکەی خۆی تەڵاق دا، بەپێی داب و نەریتی کۆنباوی ئیسلام ئەو کارەی کرد. ئەو دیکتاتۆڕ بوو کەسێک کە دەیەویست بەزۆرەملێ دێمۆکراسی داسەپێنێت. لە ساڵی ١٩٣٠دا ئەو پارتێکی دژبەری دامەزراند و ڕێبەرەکانی هەڵبژارد؛ کاتێکە هەر ئەو پارتە دەستی بە بەرەنگاربوونەوە لەبەرانبەر ئەودا کرد، هەڵی وەشاندەوە. ئەو هەوەسکار بوو، بەڵام بە شێوازی تایبەت بەخۆی.

ڕژێدەستەکانی لەوە تێگەییبوون کە لە کاتی خواردنەوەی بەردەوامی شەوانەدا نابێ دەستوورەکانی ئیجرا کەن و هەمووشتێکی بەقسەبکەن.٨٥٥

ئەو پیاوەی کە تورکیەی درووست کرد لەسەر لێوارەکانی ئیمپڕاتۆریەتی کۆنی عوسمانی لە دەریابەندەری سالۆنیکای مەقدوونی لەدایک بوو. دایکی گوندنشینێک بوو کە توزقاڵە سەوادێکی خوێندن و نووسینی هەبوو، باوکی تاجرێکی سەرنەکەوتوو بوو. وەکوو خودی ئیمپڕاتۆری عوسمانی، سالۆنیکا نەتەوەی زۆری لەخۆ گرتبوو. تەنانەت کرێکارانی سەر پاپۆڕەکانیش بە پێنج شەش زمان قسەیان دەکرد. نزیک بە نیوەی خەڵکی سالۆنیکا جوولەکە بوون؛ ئەوانی تر تورک، یوونانی، ئەرمەنی و ئاڵبانیایی بوون.٨٥٦ درووست وەک چۆن نەتەوەکانی ئەورووپی بەسەر ئیمپڕاتۆری عوسمانیدا زاڵ بوون ئەوروویپەکانی ڕۆژئاواش بەسەر تجارەت و بازەرگانیدا زاڵ بوون.

هەر لە سەرەتاوە ئاتاتۆرک توخمی ڕق و قینی سەبارەت بە ئایین لە ناخی خۆیدا چاند کە بۆ هەمیشە لەگەڵی بوو. ئیسلام-و ڕێبەران و پیاوانی پیرۆزی ئەو ئایینە- "خەنجێرێکی ژەهراوی بوون کە لە دڵی خەڵکی ئێمەدا چەقیوە." ئێوارانە کاتێکە، وەک قوتابیەک، ئەو چاوی بە شێخ و دەروێشان دەکەوت کە بە قامچی جەماوەریان دەکوتا، ئەو ئەوەی بە دەمارگریەکی سەرەتایی دەزانی و لێی بێزاربوو. " من بەئاشکرا ئەمڕۆکە ڕایدەگەیەنم کە، لە دنیایەکدا کە زانست و زانیاری و شارستانیەت لە هەموو بوارێکدا باڵی بەسەردا کێشابێت، لە کۆمەڵگای شارستانیکراوی تورکیەدا، زۆر جێی شەرم و ڕیسواییە کەسانێکی سەرەتایی هەبن کە کەرەسەی پێویستی خۆیان و گەشەسەندنی ئەخلاقی خۆیان لە ڕێنوێنی کردنی ئەم شێخ و ئەو شێخدا بدۆزنەوە."٨٥٧

لەگەڵ ئەوەی کە دایکی زۆری پێناخۆش بوو، ئەو پێداگری لەوە دەکرد کە لە قوتابخانەکانی نیزامی درێژە بە خوێندن بدات. لەو ڕۆژگارەدا ئەم قوتابخانانە تەنیا ڕێبەرانی داهاتوویان بار نەدەهێنا؛ بەڵکوو ببوون بە سەنتەری گەشەسەندنی هەستی ناسیۆنالیستی و شۆڕشگێڕی. بەهرە تایبەتیەکانی ئاتاتۆرک لە بیرکاری و سیاسەت دابوون. ئەو زمانی فەرەنسەیی فێربوو تا بەڵکوو بتوانێت نووسراوەکانی فەیلەسووفانی سیاسی وەکوو ۆلتیر و مۆنتێسکیوو بخوێنێتەوە. کاتێکە تەمەنی چووە نۆزدە ساڵ، لە کۆلێژی هێزی پیادە لە کۆنستانتینۆپل پلەیەکی تایبەتی پێ بەخشرا. ئەو پێتەختێکی جیهانی دۆزیبۆوە. نزیک بە نیوەی حەشیمەتەکەی مسوڵمان بوون. ئەوەیتری تیکەڵێک بوو لە جوولەکەکانی سێفاردیک کە باووباپیرانیان چەندین سەدە لەوەپێش لە ئیسپانیای مەسیحەوە دەربازببوون، هاووڵاتیانی پۆڵەندی کە لە دەست دەسەڵاتی تزارەوە هەڵاتبوون، و ئەرمەنیەکانی ئۆرتۆدۆکس، ڕۆمانیەکان، ئاڵبانیایەکان و یوونانیەکان. سەرەڕای ئەوەکە یوونانیەکان چوار ساڵ

لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا بوون، هێشتا بەسەر بازەرگانیدا هەر وا زاڵ بوون. (تەنانەت دوا شەڕی دووهەمی جیهانیش، نیوەی ئەندامانی ژووری بازەرگانی ئیستانبول یوونانی بوون.) گرنگترین پیشەسازیەکان بەدەست ئەوروپایەکانەوە بوو، و قەرزدەرانی ڕۆژئاوایی پارەی تەواویان بە حکوومەت دەدا و کاروباری ماڵیان سەرپەرەشتیاری دەکرد. لەوکاتەدا عوسمانیەکان ئەوەندە لاواز ببوون کە ناچارکرابوون تەنانەت لەوە زیاتریش مافی تایبەت بە ڕۆژئاوایەکان ببەخشن، کە یەکەم جار لە خۆبەدەستەوەدانەکانی سەدەی شانزدەهەم دەستیان پێکرد، وەکوو ڕزگاربوون لە دەست باجەکانی تورکی و دادگاکانی تورکی. ڕۆژنامەنووسێکی تورک زۆر بە پەرێشانی نووسیبووی: " ئێمە تەنیا وەک بینەر ماوینەتەوە لەحاڵێکدا بازەرگانی ئێمە، تجارەتەکانی ئێمە و تەنانەت کەپرە ڕووخاوەکانی ئێمە بە بیانیەکان بەخشراون."٨٥٨

کۆلیژی هێزی پیادە شوێنێک کە ئاتاتورک خوێندنی لێ تەواوکرد لە بەشی باکووری گۆلدێن هۆڕن هەڵکەوتبوو، لە بەشی تازەتری شاردا، بە شەقامی بەربلاو، ڕۆشنایی گاز، ئۆپێرا هاوس، قاوەخانە، ژووری بازەرگانی، بانگەکان، دووکانەکان بە تازەترین شێوازەکانی ئەورووپیەوە، تەنانەت شوێنی ئافرەتانی لەشفرۆش بە قەنەفەی نەرمی پەمەییەوە درووست وەکوو ئەوانەی ناو شاری پاریس ڕازێندرابوونەوە. ئاتاتورک بە حەزوخولیایەکی زۆرەوە دەگەڕا، دەیخواردەوە و فاحیشەگەری دەکرد چۆنی پێ سەلاح بوو وای ڕادەبوارد، بەڵام سەبارەت بە شاری کۆنستانتینۆپل هەر دوودڵ مابۆوە. ئەوێ بۆ ڕابواردن شوێنێکی خۆش بوو بەڵام بۆ حکوومەتەکان مەترسیدار بوو.٨٥٩ ئەو دواتر پێتەختی بۆ ناوەوەی وڵات بۆ شارێکی نادیار و شاراوە بەناوی ئانکارا گواستەوە.

وەکوو زۆربەی ئەفسەرانی لاو لە ساڵانی بەرلە ساڵی ١٩١٤، خۆی لە کۆمەڵانی نهێنیدا هەڵدەقورتاند و لەوێدا سوێندیان دەخوارد تا بە ئیمپڕاتۆریەت دەستوورێکی حکوومی سەردەمیانە ببەخشن. ئەو لە هیواوهۆمێدەکانی شۆڕشی ساڵی ١٩٠٨ دا و لە نائۆمێدیەکان ئەو کاتەی کە شۆڕش نەیتوانی ئیمپڕاتۆریەت بەهێزتر بکات بەشدار بوو.٨٦٠ لە ساڵی ١٩٠٨دا ئوتریش بۆسنی و هێرزەگۆڤینی بەخۆیەوە لکاند و بۆلغارستان سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند. لە ساڵی ١٩١١دا ئیتالیا، لاوازترینی هێزەکانی ئەورووپی، شەڕی ڕاگەیاند و دەستی بەسەر لیبیادا گرت. بە دوای شەڕەکانی باڵکان لە ساڵەکانی ١٩١٢دا و ١٩١٣دا، ئاڵبانیا، مەقدوونیا و بەشێک لە ترەیس، بەناوی سالۆنیکا، لەکیس چوون. لە ساڵی ١٩١٤دا بەشی ئەورووپی ئیمپڕاتۆریەت، کە کاتی خۆی تا مەجارستان درێژەی هەبوو، تواوبۆوە و شوێنێکی بچووکی گەمارۆدراو لەژێر دەسەڵاتی بۆلغارستانی لێ مابۆوە. لەماوەی شەش ساڵدا، ٤٢٥،٠٠٠مایلی چوارگۆشە لەکیس چووبوو.

کاتێکە شەڕی گەورە دەستی پێکرد، ئاتاتۆرک وەک دیپلۆماتێک لە بۆلغارستان ژیانێکی خۆشی بەسەر دەبرد. ئەو لە سۆفیا چوو بۆ یەکەمین ئۆپێرای خۆی؛ پازدە ساڵ دواتر، ئەو پلانی دانانی ئۆپێرا هاوسێکی بۆ پێتەختی تازەی خۆی ئانکارا دارِشت. ئەو سالۆنی سەماکردنی درووست کرد؛ دواتر لە کۆماری تازەی خۆیدا، خزمەتکارانی مەدەنی کرایە سەریان تا لە سالۆنەکاندا سەماکەن چون " ئەوە هەر ئەو کارەیە کە هاوکارانی ئەوان لە ڕۆژئاوا دەیان کرد." لە سەرەتای ساڵی ١٩١٥دا، پێشنیاری فەرمەندەیی تیپێکی تازەی سەربازی پێکرابوو کە بۆ مەبەستی داکۆکی کردن لە نیمچە دوورگەکانی گالیپۆلی حەواڵەی ئەوێ دەکران. هاوپەیمانان لە گالیپۆلی بەجارێک بێ ئابڕووکران؛ ئەویش هەر بەو دەردە برا. وەک نووسەری مێژووی فەرمی بەریتانی دواتر نووسیبووی "زۆر دەگمەن لە مێژوودا هەڵ دەکەوێت کە هەوڵ و تەقەلای تاقە فەرمەندەیەکی تیپێکی سەربازی بتوانێ، لە سێ بۆنەی جیاوازدا، لەماوەی شەڕێکدا لەسەر چارەنووسی کەمپەینێک یان تەنانەت چارەنووسی نەتەوەیەک شوێنەوارێکی وەها قورس پاش خۆی بەجێ بێڵێت."٨٦١

ئەو کۆنستانتینۆپلەی کە ئاتاتۆرک لە کۆتایی شەڕدا لەنزیکەوە دی لەو شارەی کە ئەو لەبیری مابوو زۆر جیاوازی هەبوو. هیچ خەڵوزێک نەمابوو و خواردەمەنیەکی کەم بەرچاو دەکەوت. تورکێک کە لەو سەردەمەدا کوڕێک بوو دایکی وەبیر هاتەوە کە بە چنگ و بە ددان پێخۆری بۆ منداڵەکانی ساز دەکرد: " ئێمە لامان وابوو کە پێخۆر هەر سووپی کەلەم و نیسکێنەیە و بەس و خۆمان بە مشکڵۆزمەی نان دەزانی." حکوومەت مایەپووچی لێهات. لەسەر قوژبنەکانی شەقامەکاندا ئەفسەرانی ناسراو لیمۆیان دەفرۆشت چون مووچەی خانەنشینی ئەوان بەشی هیچی نەدەکرد. و جارلەگەڵ جار ژمارەی ئاوارەکان زۆرتر دەبوو: ڕووسەکان لە شەڕی ناوخۆ هەڕایان کردبوو، ئەرمەنیەکان دارودیواریان کردبوو و بەدوای ئاسایشدا دەگەڕان، و تورکەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین و ئەورووپاوە دەرباز ببوون. لە کۆتایی ساڵی ١٩١٩دا ١٠٠،٠٠٠کەس دەبوو کە لەسەر شەقامەکانی شار نووستبوون. تەنیا تورکانی بەختەوەر جەنایەتکاران و کەسانێک بوون کە لە بازاڕی ڕەشدا ئیشیان دەکرد. دەنگۆی سەیر و ناخۆش سەرتاسەری شاری تەنیبۆوە: ڕۆژێکیان جەماوەر خۆیان کرد بە سانتا سۆفیادا چون بەگوێی یەکیان دەسرکاند کە زەنگۆڵەکانی مەسیحی خەریکن بۆ جارێکی تر هەڵدەواسرێنەوە.٨٦٢

یوونانیانی ناوچە، کە سەرمەستی هیوای زیندووبوونەوەی دەسەڵاتی هێلینیک بوون، ئاڵای شین و سپی یوونانیان هەڵدا؛ لە یەکێک لە گۆڕەپانە سەرەکیەکانی شاردا وێنەیەکی گەورەی ڤینزلۆسیان هەڵدابوو. ڕیش سپی یوونانی داوای هێرشبەرانەی بۆ پاریس نارد، بە سەروسەکتی

تورکـەکانی دادا و داوای ئـەوەی کردبـوو کـە بـۆ جـارێکی تـر کۆنسـتانتینۆپل بـە یوونـان ببەخشرێتەوە. ئۆفیسەکەی ئەو بە مەسیحیە یوونانیەکانی ڕاگەیاند تا کۆتایی بە هاوکاریکردن لەگەڵ بەرپرسانی تـورکی بێنن. دیپلۆمـاتێکی ئینگلیـزی وتـی کـە یوونانیـەکان مـافی خۆیانـە لووت بەرز بن."٨٦٣ لەسەر شەقامەکان چەند کەسێکی سەرشێت شانیان لە شانی تورکەکان دەدا و دەیانکردە سەریان کە کڵاوە فێسەکانیان داگرن.

ئەفسـەرانی هاوپـەیمانی و بۆرۆکراتـەکان بـە ژمارەیـەکی زۆرەوە گەیشـتن تـا لـە ئاگربەسـتەکە ئاگاداری بکـەن. لاوێکی ئینگلیـزی وەبیری هێنایـەوە کـە " ژیـان لـەو پـەڕی خۆشی و کامـەرانی دابوو. قاوەخانەکان سەما و خواردنەوەیان تێدا دەکرا." لـە یانـەکانی شـەواندا، ڕووسە سپی پێستەکان گۆرانی مات و مەلوولیان دەکوتەوە و ئاوارە کەم تەمەنەکان بۆ تێرکردنی زگیان لەشیان دەفرۆشت. بە پانتـایی دەریـای مەڕمـەڕەدا دەکرا لـە کێبـەرکێی پاپۆڕی ماتۆڕیدا بەشداری بکـەیت، لـە بەشـی ئاسیایی بۆسفۆسرۆسدا سـەگەکانی نێچیر بۆ ڕاوکـردن بەنیـە دەرێ و کـەل و پەلـە کۆنـەکان و ژێر زەویـەکان بـە پـارە کۆبکەیـەوە. هاوپـەیمانان بەشێوەیەکی نافـەرمی کۆنسـتانتینۆپلیان بـە ناوچـەکانی ژێردەسـەڵاتی خۆیـان دابـەش کردبـوو و بەشـێکی زۆری ئـەو شـارەیان بـەڕێوە دەبـرد؛ ئـەوان ئاسایشـی ناوچەیان دەستەبەر کـرد و دادگـای تایبـەت بـەخۆیان دامەزرانـد. کاتێکە چاپەمەنیـەکانی تورکیـە لـە میوانـەکانی خۆیـان کـەوتنـە ڕەخنـەگرتن، هاوپـەیمانان دەسـتیان بەسـەر ئـەوانیش داگـرت و سانسـۆڕیان دەکردن. کاتێکە کۆنستانتینۆپل لـە مـانگی مارسی ساڵی ١٩٢٠دا بەشێوەیەکی فـەرمی داگیرکرا، دەربڕینی جیاوازی کارێکی دژوار بوو.٨٦٤

لە دەرەوەی شار، لە ترەیس و ئاسیای بچووک، ئەفسەرانی هاوپەیمانی بڵاوەیان کرد تا چاودێری گەمارۆدانەکـە بکـەن. فەڕەنسـەیەکان شـاری گرنگـی باشـووری بـەناوی ئەلێکسـاندریتایان داگیـر کرد.(ئێسکەندەروونی ئەمڕۆکە) و لە سەرەتای ساڵی ١٩١٩دا بەرەوە ناوچەکانی ناوەوەی وڵات وەڕێ کەوتن. بەگشتی، بەریتانیەکان خۆشەویستتر بوون؛ بـەگوێرەی خاتوویـەک لـە باشـور" لـێس ئـانگلایس ئۆنـت ئینڤـۆیس لـیس فـیلس دی لیـۆرس لـۆردس مـایس لـیس فرانچـایس ئۆنـت ئینڤـۆئیس لیـۆرس ڤالیتس" (" ئینگلیزیـەکان کـوڕە ئاغاکـانی خۆیـان ناردبوو، بـەڵام فەڕەنسـەیەکان کـوڕانی گزیـر و بەردەست").٨٦٥ حکوومەتی سوڵتان، وەکوو سەرۆکێکی بێ دەسەڵاتی وورەنزم و ترسەنۆک، هیچی لەدەست نەدەهات، تەنیا بەدوای ئەوە بوو کە هاوپەیمانان هێور کاتەوە.

هاوپەیمانان لە ئاستێکدا نەبوون کە هێور بکرێنەوە. هەندێکیان، وەکوو کۆرزۆن، کە سەرۆکایەتی لیژنەی کابینەی دەکرد و بەرپرسی سیاسەتی بەریتانی لە ڕۆژهەڵات بوو، لای وابوو کە کاتی ئەوە

هاتووه " له دەست ئەم خۆرەیە کە لە ژیانی ئەورووپای داوە" ڕزگارییان بێت. گەندەڵی، داو و تەڵەی بێ ناو و نیشان لە کۆنستانتینۆپلەوە سەریان هەڵدابوو و ڕوویان کردبوو ئەورووپایە بێ تاوانەکان تابەڵکوو هەرهەموویان بەیەکجاری بتەننەوە. کۆڕی ئاشتی دەرفەتێک بوو بۆ بنەبڕکردنی یەکجاری سەرچاوەی ئەو شۆفاریە: "ئەوەتا تورکەکان ڕوویان لە ئەورووپا کردوە هەموو ئاژاوە و ئاڵۆزیەک ناوچەکەی تەنیوەتەوە. من تاقە کەسێک شک نابەم، تورکی یان غەیری تورکی، کە لەماوەی هەبوونی نزیک بە ٥٠٠ساڵی ڕابردووی ئەواندا قازانجێکی کردبێت. "هەرچەند وەک قوتابیەکی بواری مێژوو ئەو دەبوایە زانیاری باشتری هەبوایە، کۆرزۆن ئاوا بەڵگەی دەهێنایەوە: " ئەوەی ڕاستی بێت، ڕابردوو باس لە هەرچی پەرچی، کۆیلەتی، پیلانگێری، و کۆمەڵکوژی دەکا کە تاکوو ئێستا لەمێژووی جیهانی ڕۆژهەڵاتدا وێنەی نەبوە." سەرەک وەزیرەکەشی وەکوو ئەو خۆی بە خاوەن هەست و سۆز دەزانی؛ وەکوو زۆربەی لیبراڵەکان، لیۆد جۆرج قینەبەرایەتی خۆی سەبارەت بە تورکەکان لە گلادستۆنی گەورەوە بەمیرات پێگەیشتبوو.٨٦٦

پرسیارێکە بۆ کۆرزۆن درووست ببوو ئەوەبوو کە کێ بلێی جێی ئیمپراتۆری عوسمانی بگرێتەوە؟ بەریتانیا هێشتا خوازیاری ئەوەبوو کە لەوە ئەرخەیان بکرێت کە کەشتیە جەنگیەکانی دژبەر لە دەربەندەکان کەڵکیان وەرنەگرتوە. هێشتا پێویستی بەوەبوو لەڕێگای کانالی سوئیسەوە پارێزگاری لە هێلی هاتووچۆی ئینگلستان بکات. بێجگە لەمانە هۆکارێکی تازەی تریش هەست پێدەکرا: ئازووقە گرنگەکانی ڕوولەزۆربوونی نەوت لە موسڵەوە لەناو ئیمپراتۆری عوسمانیدا و لە ئێرانەوە. بەریتانیا نەیدەویست هەمووی بەرپرسایەتیەکە بخاتە ئەستۆی خۆی، و ئاشکرا بوو کە یوونانیش نەیدەتوانی؛ بە واتایەکی تر، ئەو نەیدەویست قودرەتێکی سەرەکی تر، وەکوو فەرەنسەی هاوپەیمان، بێتە ناوەوە. بەگشتی، هەردوو وڵات لەسەر ئەورووپا، ئەمریکای باکوور، هێندستان، ئەفریقا و ڕۆژهەڵاتی ناڤین بۆماوەی چەندین سەدە پێکەوە شەڕیان کردبوو. دۆستایەتی ئەوان، بە بەراورد، شتیکی تازە بوو. لە تاقیکردنەوەی شەڕدا باش دەرچووبوو بەڵام دڵنیا نەبوو لەوەکە لە تاقیکردنەوەی ئاشتیشدا باش دەربچێت. لەسەر ناوچە عەرەبنشینەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی تازە شەڕ و کێشە هاتبوونە ئاراوە. ئایا بەڕاستی بەریتانیا حەزی بەوە دەکرد کە کەشتیەکانی فەڕەنسەیی لە کۆتایی ڕۆژهەڵاتی مەدیتەرانەدا هەبن، بنکەکانی فەڕەنسەیی لە کەنار ئاوەکاندا هەوراز و نشێو بکەن؟ کۆرزۆن دڵنیابوو کە حەزی لێنەبوو:

بەشێکی زۆر لە ژیانی کۆمەڵی من لە پێوەندی لەگەڵ ئارەزووە سیاسیەکانی فەڕەنسە تەرخان کراوە، کە من بۆخۆم لە توونێس، لە سیام، و لە هەر ناوچەیەکی دووردەست کە فەڕەنسەییەکان تێیدا کەوتبێتن لەنزیکەوە دەستەملانیان بووم. بەهۆی ئاسایشی نەتەوەییەوە ئێمە لەگەڵ فەڕەنسەییەکان

هاوپەیمان بووینە، کە من بەش بەحاڵی خۆم هیوادارم درێژەی هەبێت، بەڵام کاراکتەری نەتەوەیی ئەوان لەگەڵ هینی ئێمە جیاوازن، لە زۆر بواردا بەرژەوەندیە سیاسیەکانی ئەوان لەگەڵ هینەکانی ئێمە یەک ناگرنەوە. من زۆر لەوە دەترسم کە هێزێکی گەورە کە لە داهاتوودا لەوانەبێت لە هەموو هێزێکی تر زیاتر لێی بترسین فەرەنسە بێت.

ئەو لە درێژەی قسەکانیدا باسی ئەوەی کرد کە ڕێگەدان بە فەرەنسەیەکان بۆ ئەوەی کە لە ڕۆژهەڵاتی ناڤیندا شوێنەوارێک دابنێن هەڵەیەکی تەواو هەڵەیە: "فەرەنسە وڵاتێکی تەواو ڕێکخراوە، وورە و ئەندێشەیەکی بێ سنووری هەیە، و سەبارەت بە دانووستان لەگەڵ خەڵکانی ئەورووپی خاوەن توانایەکی تایبەتە." ٨٦٧

بەریتانیەکان باوەڕیان بە فەرەنسەیەکان بوو بەڵام ئەوان بۆ ئەمان وانەبوون. و فەرەنسە لە ئیمپراتۆری عوسمانیدا بەرژەوەندی بەرچاوی هەبوو، لە پارێزگاریکردنی هاووڵاتیانی مەسیحیەوە بگرە تا دەگاتە وەبەرهێنانی بەربڵاوی فەرەنسییەکان. هەرچەند بۆ فەرەنسە ئەوەی کە لە ئیمپراتۆری عوسمانیدا یان لە ناوچەکانی باڵکاندا ڕووی ئەدا زۆر لە دانووستان کردن لەگەڵ ئەڵمانیا کەم بایەختر بوو. کلیمینجوو، بە هەر بۆچوونێکی کۆلۆنیایی کە هەیبوو، لەگەڵ بەریتانیا سازشی دەکرد چون ئەو پێویستی بە پاڵپشتی ئەو وڵاتە لە ئەورووپا هەبوو. هەرچەند ئەو خوازیاری ئەوە نەبوو کە بەشی ئاسیایی تورکیە بەتەواوەتی لەبەین بچێت، کلیمینجوو، لانی کەم لەسەرەتاوە، سەبارەت بە داواکاریەکانی یوونان لەوێ زۆر جەسوور نەبوو. هەتا ئورووپا لە گۆڕێدا بوایە، ئەو پشتگری لە داواکاریەکانی یوونا لەسەر ترەیس دەکرد.٨٦٨

لە کاتی شەڕدا، بەریتانیا، فەرەنسە و ڕووسیە سەبارەت بە داهاتووی ئیمپراتۆری عوسمانی چەندین کەرەت وتووێژیان کرد. لە ساڵی ١٩١٦دا، نوێنەرانی بەریتانی و فەرەنسەیی، بەڕێز مارک سایکێس و جۆرجیس پیکۆت، لەسەر ئەوە ڕێکەوتبوون کە هەردوو وڵاتەکەی ئەوان ناوچەکانی عەرەب-ئاخێوەر دابەش بکەن و ئەوە کە، لە بەشەکانی تورکی-ئاخێوەردا، فەرەنسە ناوچەیەکی دەبێت کە بۆ باکوور بەرەو سیلیسیا لە سوریەوە درێژەی دەبێت. ڕووسەکان، کە تازە بەڵێنێکیان ستاندبوو کە گوایە ئەوان کۆنستانتینۆپل و ناوچە دەربەندەکان بەخۆیانەوە دەلکێنن، بە مەرجێک ئەوەیان پەسەند دەکرد کە پارێزگاکانی تورکی کە لە قەزاقستان لەگەڵیان هاوسنووربوون بەمان ببرێت. بڕیاری حکوومەتی تازەی بۆلشویکی بۆ ئاشتی کردنەوە لەگەڵ هێزە ناوەندیەکان ئەو ڕێکەوتنامەیەی پووچەڵ کردەوە. بەریتانیا و فەرەنسە وەک هێزە سەرەکیەکانی ناو ڕۆژهەڵاتی ناڤین مابوونەوە، و هەتا شەڕ بەرەو کۆتایی دەچوو، گومانی ئەوان سەبارەت بە یەکتر زیاتر دەبوو.

لە شۆرای عالی لە ٣٠ی مانگی ئۆکتۆبردا، لیۆد جۆرج و کلیمینجوو لەبابەت پێداگری کردنی بەریتانیا لەسەر وتویژکردنی یەک لایەنەی ئاگربەستی کاتی تورکی دەمەقرەیەکی سەیریان بوو. هاوس لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە " ئەوان وەکوو ژنانی دەم حیز دەمیان لە دەمی یەک نابوو و ئەوەی خراپ بوو بە یەکیان گوت." لیۆد جۆرج بە کلیمینجووی ڕاگەیاندبوو کە:

بەریتانیای گەورە نەبێ هیچ لایەک زیاتر لە تاقمێکی بچووکی هێزی ڕەش هیچ یارمەتیەکیان لەپێناوگەشتێک لەناو فلستیندا نەدا. لەوەی کە حکوومەتی فەرەنسە هیچ دڵئاواییەکی لەخۆی نیشان نەدا من بەڕاستی سەرم سووڕما. بەریتانیەکان لەوکاتەدا نزیک بە ٥٠٠،٠٠٠پیاویان لەسەر خاکی تورکی هەبوو. بەریتانیەکان دەستیان بەسەر سێ یان چوار سووپای تورکیدا گرتبوو و لە شەڕکردن لەگەڵ تورکیەدا سەدان هەزار قوربانیان بەسەر خۆیاندا هێنابوو. حکوومەتەکانی تر تەنیا چەند پۆلیسێکی قولڕەشیان خزاندبوە ناوەوە بۆ ئەوە بزانن کە ئێمە مەرقەدی پیرۆزمان نەدزیوە! هەڵبەت کاتێکە دەبوو ئاگربەستەکە واژۆ بکرێت، هەمووی ئەو هەراوهۆریایە ساز بوو.

ئەوە مشت و مڕێکی ناڕاست و نابەرانبەر بوو؛ وەک کلیمینجوو لە بۆنەیەکی دواتردا ئاماژەی پێکرد، بەریتانیەکان لەبەرانبەردا هێزی کەمتریان بۆ بەرەی ڕۆژئاوا ناردبوو. " من لەسەر ئەم باوەڕە بووم و ئێستاش هەر هەم کە ئەگەر هێزە سپی پێستەکان ئەوانەی کە تۆ بۆ ئەوێت ناردن بەرەنگاری ئەڵمانیەکان بکرانایەتەوە، لەوانەبوو چەند ساڵ زووتر شەر کۆتایی بهاتایە." بە واتەی پیچۆن، لەگەڵ ئەوەشدا فەرەنسەیەکان " بە ڕۆحیەتێکی ئاشتەوایی بووندا کە حکوومەتی فەرەنسەیی هەمیشە هەستی دەکرد لە مامەلەکردن لەگەڵ بەریتانیادا دەبێ بەکاری بێنێت" لە ئاگربەستەکە دەستیان کێشایەوە. کاتێکە نۆبەی دابەشکردنی دەسکەوتەکانی شەڕ هاتە پێشێ ئەو ڕۆحیەتە هیچی پێوە نەمابوو.٨٦٩

* * * *

ئاشتیکەران هەتا ٣٠ی مانگی ژانویەی ساڵی ١٩١٩ دەوریان بە ئیمپڕاتۆری عوسمانی هەڵنەگرت، و ئەوە تەنیا بەدرێژایی ئەو وتویژە ئەستەمە بوو لەسەر ماندێتەکان بۆ کۆلۆنیەکانی ئەڵمانیای پێشوو. لیۆد جۆرج، کە سەرتاسەر حەفتەی پێشتر سەرقاڵی لەیەک ڕازیکردنی ئەمریکیەکان و هەمووی ژێردەستە سەرکەشەکانی خۆی بوو، وەک نموونەیەک لەو شوێنەی کە ماندێتەکانی پێ پێویستە ئاماژەیەکی کورتی بە ئیمپڕاتۆری عوسمانی کرد. چون تورکەکان لە بەڕێوەبردنی خەڵکانی ژێردەستی خۆیاندا زۆر خراپ بوون، باشتر وایە ئەوان کۆنترۆڵی هەمووی ناوچە عەرەبنشینەکانی خۆیان لە دەست بدەن- سووریە، مێزۆپۆتامیا، فلستین و خودی عەرەبستان

چونن عەرەبەکان شارستانیەتیان لە سەرەوە بوو بەڵام یەکگرتوو نەبوون، ئەوان پێویستیان بە ڕێنوێنیکردنی دەرەوە بوو. عوسمانیەکانیش دەبوایە ناوچەی سەر سنووری ڕۆژهەڵاتی باکووریان بدۆڕاندایە. ئەوان کاتی خۆی لەگەڵ ئەرمەنیەکان زۆر وەحشیانە هەڵس و کەوتیان کردبوو، و مافی خۆیان بوو وڵاتێکی ئەرمەنی، وەک ماندێتی دەسەڵاتێکی دەرەوەیان، درووست کردایە. لە باشووری ئەرمەنستان دەبوایە وڵاتێک بەناوی کوردستان درووست بوایە. ئەوەش هێشتا ناوچەکانی تورکی-ئاخێوەری دەهێشتەوە، پارچەیەک لە ئەورووپا، دەربەندەکان و ئاناتۆلیا نە ئاسیای بچووک. لیۆد جۆرج بەجوانی ئاماژەی بەوەکرد کە ئەوانە دەبێ "بەپێی تواناکانی خۆیان" دانووستانیان لەگەڵ بکرێت. (ئەو ئاماژەی بەو پارچە زەویانە نەکرد کە لە کەنارئاوەکانی ئاسیا بچووکەوە بەرەو ناوەوەی وڵات درێژەیان هەبوو و بە فەرەنسەیەکان، ئیتالیەکان یان یوونانیەکان بەڵێن درابوون.)

لیۆد جۆرج لەسەر ئەوە دەڕۆیی کە لەوە گرنگ تر نەهێشتنی هەمووی گرووپە جیاوازەکانی ناو ئیمپراتۆریەت بوو لەوە کە هێرش نەکەنە سەر یەک. ئەم ئەو ئەرکە نەبوو کە بەریتانیا خوازیاری بوو. بە واتەی لیۆد جۆرج، هاوپەیمانان نزیک بە یەک ملوێن هێزیان لە سەرتاسەری ئیمپراتۆری عوسمانی بڵاوکردبۆوە و بەریتانیا خەریک بوو خەرجی هەمووی دەکێشا. " ئەگەر هەتا کاتێکە لەگەڵ تورکیە ئاشتیان دەکردەوە ئەوانیان لەوێ ڕاگرتبایە، و هەتا کاتێکە کۆمەڵەی گەلان دادەمەزران و دەستیان بە کار دەکرد و هەتا کاتێکە لە دەست ئەم کێشەیە ڕزگاری دەبوو، خەرجەکەی لێ گەورە دەبۆوە، و لەڕاستیدا ئەوان نەیاندەتوانی بەرەنگاری ببنەوە.".٨٧ ئەو دەبوایە وڵامی پەرلەمانی بدایەتەوە.

لیۆد جۆرج بەهیوا بوو ویلسۆن لە مەبەستەکە تێبگات و وڵاتە یەکگرتوەکان وەک هێزێکی سەرپەرشتیار لانی کەم بۆ ئەرمەنستان و بۆ دەربەندەکان بناسێنێت. هێشتا لەوەباشتر، لەوانەیە ئەوەبێت کە ئەمریکیەکان بڕیار بدەن تا هەمووی ناوچەکانی تورکیە بەڕێوەبەرن. هاوس بەدڵنیایەوە ئاماژەی بە ئەگەری هاتنەدی شتێکی وادەکرد. هەڵبەت، ئەمریکیەکان هەڵوێستێکی پڕ لە ڕق و قین سەبارەت بە تورکەکان نەبێ هیچ هەڵوێستێکی تریان لەبابەت ئیمپراتۆری عوسمانیەوە نەگرتبوە بەر. مـوژدەدەرانی پرۆتێستانی ئەمریکی، کە لە دەیەکانی ١٨٢٠وە لە تورکیەی عوسمانیدا چالاک بوون، وێنەیەکی تازیەباریان لە ڕژێمێکی شکستخواردوو کێشابۆوە. بەشێکی زۆر لە چالاکیەکانی ئەوان لەنێوان ئەرمەنیەکان دابوو، بۆیە ئەوان لە کاتی شەڕدا یەکەمین هەواڵەکانی تایبەت بە کۆمەڵکوژیەکانیان ڕادەگەیاند. لەدواوە لە وڵاتەیەکگرتوەکان بڕەپارەیەکی زۆر بۆ مەبەستی

رزگارکردنی ئەرمەنیەکان کۆکرابۆوە. هاوس بە خۆشحاڵیەوە لەگەڵ بەریتانیەکان سەبارەت بە شێوازەکانی پارچەپارچەکردنی ئیمپراتۆری عوسمانی وتوێژی کردبوو، و ویلسۆن بەدڵنیایەوە هەستی دابوویە لەناوچوونی یەکجاری ئەو ئیمپراتۆریەتە.[٨٧١]

وڵاتەیەکگرتوەکان بۆسەر ئیمپراتۆری عوسمانی هەرگیز شەڕی ڕانەگەیاندبوو، و کاتێکە باسی دیاریکردنی چارەنووسی ئەو ئیمپراتۆریەتە دەهاتە ئاراوە هەڵوێستی فێڵاوی لەبارەیەوە دەگرت. تەنیا خاڵێک لە چاردە خاڵەکەی ویلسۆن کە باسی دەکرد لێڵ و نادیار بوو: "بەشەکانی تورکی ئیمپراتۆریەتی ئێستای عوسمانی دەبێ دەسەڵاتێکی دوورلەمەترسیان بۆ تەرخان کرێت، بەڵام نەتەوەکانی تر کە ئێستا لەژێر دەسەڵاتی تورکی دان دەبێ ژیانێکی هێمنانەی دوور لە هەر مەترسیەک و دەرفەتێکی لەبار بۆ گەشەسەندێکی بەربڵاویان بۆ تەرخان بکرێت." بەشەکانی تورکی کامانە بوون؟ عەرەبەکان؟ ئەرمەنیەکان؟ کوردەکان؟ کۆمەڵانی پرژوبڵاوی یوونانیەکان؟

کاتێکە لیژنەی لێکۆڵینەوە، ئەو کۆمەڵە پسپۆڕە ئەمریکیە، یادداشتەکەی خۆی لە مانگی دیسامبری ساڵی ١٩١٨ ئامادەکرد، ئاماژەی بەوە دەکرد کە هەم تورکە ڕەسەنەکان پێویستە دادوەرانە لەگەڵیان هەڵس و کەوت بکرێت هەمیش ڕەگەزە بندەستەکان لە ژێر باری زوڵم و دەسەڵاتی زۆرەملێدا ڕزگار کرین، کە ئەوەش بەنۆبەی خۆی بە مانای "سەربەخۆیی" بۆ ئەرمەنستان و "پارێزگاریکردن" لە ناوچە عەرەب نشینەکان بوو. ئەوەیکە زۆر سەیر بوو و لەبەرانبەر ئەمەدا دژایەتی هەبوو ئەوەبوو کە ڕاگەیاندنی فەرمی لەسەر چاردە خاڵەکە کە لە مانگی ئۆکتۆبری ساڵی ١٩١٨دا هاتبوە دەرێ، باسی کۆنترۆڵی جیهانی کۆنستانتینۆپل و دەربەندەکانی دەکرد، یان ڕەنگە ماندێتیکی یوونانی لەسەر کەنارئاوەکانی ئاسیای بچووک، ئەو شوێنەی کە بە نادرووستیەوە ئەوترا کە یوونانیەکان زۆرینەیان بەدەستە، و لەوانەیە ماندێتەکانی ئەمریکی بۆ کۆنستانتینۆپل، ئەرمەنستان، تەنانەت مەقدوونیە لە ناوچەکانی باڵکان. بەرلەوەی کۆری ئاشتی دەست پێبکات، بەگشتی وایان دانابوو کە لانی کەم وڵاتەیەکگرتوەکان بۆ ئەرمەنستان و دەربەندەکان ماندێتیک دەگرێت. هەموولایەک بەوە دڵخۆش نەبوون. ئەدمیراڵەکانی بەریتانیا، دوا ئەوە کە لە دەست وەیشوومەی ڕووسی ڕزگاریان بوو، نەیاندەویست وڵاتەیەکگرتوەکانێکی بەهێز لە کۆتایی ڕۆژهەڵاتی مەدیتەرانە بە چاوانی خۆیان ببینن. ئۆفیسی هێندستانیش نیگەران بوو. موحەممەدی VI نەک تەنیا سوڵتانی عوسمانیەکان بەڵکوو خەلیفەش بوو، نزیکترین شت بۆ ڕێبەرێکی ڕۆحانی سەرجەم مسوڵمانان. لیۆد جۆرج هەروا بە هاسانی ڕەخنەکانی ئەوانی خستە پشت گوێ.[٨٧٢]

وەکوو زۆر جاری تر، کۆڕی ئاشتی ئەم جارەش بڕیارە دژوارەکانی وەدرەنگ خست. لەو کۆبوونەوەی مانگی ژانویەدا، ویلسۆن پێشنیاری کرد کە ڕاوێژکارانی نیزامی سەیر بکەن کە چۆن ئەرکی داگیرکردنی ناوچەکانی تورک نشین بە باشترین شێوە دابەش بکرێت. لیۆد جۆرج وتی کە " ئەمە کێشەکە ڕوونتر دەکاتەوە." هەڵبەت، ئەوە وای نەدەکرد. گوزارشەکە لە وەختی خۆیدا هات و لە ١٠ی مانگی فەوریەدا بۆ ماوەیەکی کورت وتوێژی لەسەر کرا؛ خرایە ناو لیستەی باسەکان بۆ ڕۆژی دواتر بەڵام قەزائەن سنوورەکانی بلژیک سەرنجی زیاتریان پێدرا.٨٧٣

لە ٢٦ی مانگی فەوریەدا، دەرکەوتنی شاندێکی ئەمریکی لە بەردەم شۆڕای عالیدا بۆماوەیەکی کورت وەبیر ئاشتیکەرانی هێنایەوە کە دامرکاندنی کێشەی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی بە هەڵواسراوی دەمێنێتەوە. بۆگۆز نوبار پاشا پیاوێکی هێواش، قورس و لێهاتوو بوو؛ کاتی خۆی باوکی سەرەک وەزیری میسر بوو. هاوڕێی ئەو، ئەڤێتیس ئاهارۆنیان، شاعیرێکی ڕەخنەگر و کەللەڕەق و بەرەچەڵەک قزاقستانی بوو. بۆگۆز بۆ ئەرمەنیەکانی تاراوگەنشین و دوورەوڵات قسەی دەکرد، ئاهارۆنیان لە ناوچە شاخاویەکانی سەرسنووری نێوان ڕووسیە، ئێران و تورکیە بۆ وڵاتی زێد قسەی دەکرد. لە شتێکدا کە لەو سەردەمەدا نموونەیەکی ئاشنا بوو ئەوان پەنایان بۆ مێژوو- ئەو چەند سەدەیەی کە ئەرمەنیەکان لەوێ ژیابوون، پێداگریکردنی مەسیحیگەری ئەرمەنیەکان- بۆ خزمەتگەلی ئەوان بە هاوپەیمانان (هەندێک لە ئەرمەنیەکان لەناو سووپاکانی ڕووسیەدا شەڕیان کردبوو) و بە بەڵێنیەکانی هاوپەیمانی دەبرد و، وەکوو شاندەکانی تر، ئەوان لەسەر ناوچەیەکی بەربڵاوی زەوی و زاردا داواکاریەکەی خۆیان ساخ کردەوە، کە لە قەزاقستانەوە بەرەو باشوور و ڕۆژئاوا بۆ خوارێ بەرەو مەدیتەرانە درێژەیان هەبوو. بێجگە لەوە، ئەوان خوازیاری پارێزگاریکردن لەلایەن دەسەڵاتێکی دەرەوە بوون، داوایەکی ژیرانە بۆ وڵاتێک بە دراوسێگەلی لەو چەشنە ڕابردوویەکی لەو چەشنە. ئەوان هیوایان بە وڵاتەیەکگرتوەکان بوو. پسپۆڕێکی ئەمریکی وتبووی کە " زۆر بەکەمی هەڵدەکەوت ڕۆژێک ئەرمەنیە تازیەبارەکان، ڕیش هاتوو و ڕەشپۆش، شاندی نوێنەرایەتی ئەمریکی یان، کەمتر، سەرەک کۆمار گەمارۆ نەدەن، و لە وڵاتی دایکی خۆیاندا نەیانخەنە ناو کەش و هەوایەکی هەرە تووش و نالەبار."٨٧٤

* * * *

ئەرمەنیەکان یەکێک لە ناخۆشترینی مێژووەکانیان پێشکەش بە کۆڕەکە کرد. لەنێوان ساڵی ١٩٧٥، ئەوکاتەی کە دەست بەسەر دوایەمین وڵاتی سەربەخۆی ئەرمەنیدا گیرا، و بەهاری ساڵی ١٩١٨، ئەوکاتەی کە هێزەکانی ناسیۆنالیستی لە شوێنێک کە پێشتر خاکی ڕووسەکان بوو

کۆماری ئەرمەنستانیان ڕاگەیاندبوو، ئەوان لەژێر دەسەڵاتی بیانیەکاندا ژیابوون. دوا ئەوەیکە ڕووسەکان لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا بەرەوخوارێ بۆناو قەزاقستان دەستدرێژیان کردبوو، زەویەکانی ئەرمەنستان لەنێوان خودی ڕووسیە، تورکیەی عوسمانی و ئێراندا دابەش کرابوون. ئەرمەنیەکان کە زۆربەیان وەرزێرانی ڕەش و ڕووت بوون، ببوون بە ڕووسی، تورکی یان ئیرانی، بەڵام کاتێکە بیروباوەری ناسیۆنالیزم و خود-موختاری بەرەو ڕۆژهەڵات پەرەیان سەند، هەوێنی بیرۆکەی نەتەوەیەکی تازە لەدایکبوو درووست بوو. ئەو بیرۆکەیە یەکگرتوو نەبوو- مەسیحی، سێکۆلار، بەرژەوەندخواز، ڕادیکاڵ، تورکی-خواز یان ڕووسی-خواز، کەس نەیدەزانی ئەرمەنستان چی بەسەر دێت- بەڵام ڕۆژلەدوای ڕۆژ بەهێزتر دەبوو. هەڵبەت جێی داخ بوو کە ناسیۆنالیزمی ئەرمەنی تەنیا ناسیۆنالیزمێک بوو کە لەو بەشەی جیهاندا خەریک بوو گەشەی دەکرد.

هیتلێر لەڕووی ڕەشبینیەوە پرسیاری کرد" کێیە ئەمڕۆ ئەرمەنیەکانی لەبیر مابێت؟" لە کۆڕی ئاشتی پاریسدا، ترس و وەحشەتی ئەو کارانەی کە تورکەکان بەسەر ئەرمەنیەکانیاندا هێنابوو هێشتا هەر تازە بوو، و هێشتا جیهانیان خوویان بە هەوڵ و چالاکی بۆ مەبەستی قڕکردنی خەڵک نەکردبوو. کوشتارەکان لە دەیەکانی ١٨٩٠دا دەستیان پێکردبوو، ئەوکاتەی کە ڕەژیمی کۆن ڕوویەکی وەحشیانەی لەبەرانبەر هەر گرووپێک کە دژایەتی دەکرد نیشان دابوو. هێزەکانی عوسمانی و کوردەکانی ناوچە، کە بۆخۆیان وەک نەتەوەیەک ڕاپەڕابوون، لەناو گوندەکانی ئەرمەنیەکاندا ئاژاوەیان دەناوە. لاوانی تورک، کە لە ساڵی ١٩٠٨دا دەستیان بەسەر حکوومەت داگرت، بەڵێنی سەردەمێکی تازەیان دا هاورێ لەگەڵ باسی وڵاتیکی سێکۆلار و فرەڕەگەزی، بەڵام بێجگە لەوە ئەوان لەخەیاڵی پێوەندی گرتن لەگەڵ تورکەکانی تر لە ئاسیای ناوەندیدا بوون. لەو جیهانە پان-تۆرانیەدا، ئەرمەنیەکان و مەسیحیەکانی تر هیچ جێگایەکیان نەبوو.

کاتێکە ئیمپراتۆری عوسمانی تێکەڵاوی شەڕ بوو، ئەنوەر پاشا، یەکێک لە سێ دەسەڵاتدارەکەی لاوانی تورک کە لە ساڵی ١٩١٣ەوە لە کۆنستانتینۆپل دەسەڵاتیان گرتبوە دەست، کۆمەڵێکی زۆر لە سوپاکانی ئەو ئیمپراتۆریەتەیان بەرەو رۆژئاوا دژ بە ڕووسیە نارد. لە ئاکامدا، لە ساڵی ١٩١٥، کارەسات کەوتەوە. ڕووسەکان هێزێکی قەبەی عوسمانیان تێکڕووخاند و درووست کاتێکە هاوپەیمانان لە گالیپۆلی نزیک بە ڕۆژئاوا دەنیشتنەوە هەستیان ڕاگرتبوو تا بەرەو ئاناتۆلیا دەستدرێژی بکەن. دەسەڵاتی سێ کەس دەستووریان دا تا ئەرمەنیەکان بەبیانووی ئەوە کە خائینن بەرەو ئاناتۆلیای ڕۆژهەڵات دوورخەنەوە. زۆربەی ئەرمەنیەکان بەرلەوەی کە بتوانن دەرباز بن

کۆمەڵکوژکران؛ کەسانی تر لە مارشدانی بەزۆری بەرەو باشور لە برسێتی و لە نەخۆشیدا قڕیان کرد. ئەوەکە ئایا ئامانجی ڕاستەقینەی حکوومەتی عوسمانی ژینۆسایدبوو ئێستاش هەر ڕوون نەکراوەتەوە؛ هاوڕێ لەگەڵ ئەوە ژمارەی مردووەکانیش هەر نادیارە، لە ۳۰۰،۰۰۰ کەسەوە تا ۱.۵ملوێن کەس دەڵێن.٨٧٥

ترس کەوتبوە دڵی ڕۆژئاوایەکان. لە بەریتانیا، کێشەی ئەرمەنستان لە دووکی ئارگیلەوە بۆ ئارنۆڵدی تاینبی لایەنگری بەلای خۆیدا ڕادەکێشا. منالانی بەریتانیا کاتێکە کاسە و کەوچەکانی خۆیان نەدەشۆرت ئەوترا کە ئەرمەنیە لەبرسامردووەکان وەبیرخۆیان بێننەوە. لە ولاتەیەکدرتوەکان، بڕەپارەیەکی زۆر بۆ لێقەوماوان کۆکرایەوە. کلیمینجوو لە پێشەکی کتێبێکدا بە ووردی ئاماژە بە کارەساتەکان دەکات: "خواهەڵناگرێت لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، بە ڕێگایەکی پێنج ڕۆژە لە پاریسەوە، کارەساتی وەها دڵتەزێن بەشێوازێک ڕوودەن کە تا ئێستا بە خەیاڵی کەسدا نەهاتبێت. "لانسینگی هەمیشە زەخت لێکراو نامەیەکی بۆ ویلسۆن، کە بەهەموو هێزیەوە پشتگری لە ئەمریکا دەکرد نووسی و لەو نامەیەدا هێنابووی کە " ئەوە یەکێک لە لاپەڕە ڕەشەکانی مێژووی ئەم شەڕەیە." ئۆرلاندۆ دەنگی هەڵبڕی و ڕایگەیاند: " بە ئەرمەنیەکان بڵێین کە ئەمن کێشەی ئەوان دەکەم بە کێشەی خۆم." لیۆد جۆرج بەڵێنی دا کە ئەرمەنستان قەت بۆ " دەسەلاتی زۆرەملێی" تورکەکان ناگەڕێتەوە. ئەو لە بیرەوەریەکانی خۆیدا نووسیبووی:" هەمووی سیاسەتمەدارانی ناو پارتەکانی بەریتانیا بەو خەیاڵەوە ژیاون کە ئەگەر لە تێکشکانی ئەم ئیمپراتۆرە نامرۆڤەدا سەرکەوتووبوون یەکێک لەو مەرجانەی کە بۆ مسۆگرکردنی ئاشتی دایاننواە ئەوە دەبێ کە دەروودۆڵەکانی ئەرمەنستان بۆ هەتاهەتایە لە چنگ تورکە خوێنمژەکان ڕزگار بکەن."٨٧٦

ئەو هەموو هەست و نەستە بەسۆز و جوانە لە ئاکامدا بوون بەهیچ و هیچیان پێوەنەماوە. لە کۆڕی ئاشتیدا، تەنانەت ئەو ڕێکەوتنامەیەی لەدڵەوە و لەسەر بنەمایەکی ئەخلاقی داڕێژرابوو لەبەرانبەر بەهاکانی تردا خۆی نەگرت و تووشی هەڵوەشانەوە هات. ئەرمەنستان زۆر دوورەپەرێز وەستابوو؛ دوژمنان گەمارۆیان دابوو و هاوپەیمانان هێزی زۆر کەمیان لە ناوچەکەدا هەبوو. گەیاندنی هێز و یارمەتی بۆ ناوەوە، لە کاتێکدا کە سامان و داهاتەکان ڕوولەکۆتایی بوون، ئەرکێکی سەرەکی بوو؛ ئەوەی ڕێگەی شەمەندەفەرە لەناوچوبوو و جادەکان هەروا سەرەتایی بوون. یارمەتی زۆر دوورەدەست بوو، بەلام دوژمنانی ئەرمەنستان نزیک بوون و لەبەردەست دابوون. ڕووسەکان، چ سووپاکانی سپی پێست یان بۆلشویکەکان، کە خەریک بوون بەرەو باشور دەستدرێژیان دەکرد، لەگەڵ ئەرمەنستان یان هەر ولاتێکی سەربەخۆی تر لە قەزاقستان هەڵیان نەدەکرد. لە لایەکی تری

ئەرمەنستان، تورکەکان بە لەدەستدانی ناوچەیەکی تورکی تەواو عاجز دەبوون، و لە داواکاریەکانی ئەرمەنیەکاندا هەست بە زیانی زیاتر دەکرا.

لە پاریس، هاوڕێیانی ئەرمەنستان ئەو گەرم و گوڕییەی جارانیان پێوە دیار نەبوو. بەڵێ ڕاستە کە بەریتانیەکان لە گرتنی ماندێتێک بۆ ئەرمەنستان قازانجی تایبەتی خۆیان دەدی: پارێزگاریکردن لە پاشەکەوتیە نەوتیەکان کە لە باکۆوە لە دەریای خەزەرەوە بەرەو بەندەری باتۆم لە دەریای ڕەش دەهاتن، و دانانی لەمپەرێک لەنێوان بۆلشویزم و ملک و مالاتی بەریتانیەکان لە ڕۆژهەلاتی ناڤیندا. (خەونی هەرە ناخۆشی بەریتانیەکان ئەوەبوو کە لایان وابوو بۆلشویزم لەگەڵ ئیسلامی بووژاوە یەکدەگرن و ئیمپراتۆری بەریتانی بە قوڕدا دەبەنەخوارێ.) بەواتایەکی تر، بەگوێرەی وتەکانی دایرەی جەنگ، سامان و داهاتەکانی بەریتانیا تازە کۆتاییان پێهاتبوو. دایرەی دەرەوەی فەڕەنسەیەکان، بەش بەحاڵی خۆی، لەگەڵ بۆچوونی ئەرمەنستانێکی گەورە لەژێر کۆنترۆڵی فەرەنسەیەکان گاڵتەی دەکرد چون ئەوە ڕێگای بۆ وەبەرهێنانی فەڕەنسەیی و پەرەسەندنی کولتووری فەڕەنسەیی خۆش دەکرد. هەر جۆریک بوایە، کلیمینجوو زۆر دڵی بەو بیرۆکەیە خۆش نەبوو. ئیتالیەکان، وەکوو فەڕەنسەیەکان، وایان بەباش دەزانی کە هەوڵەکانی خۆیان لەسەر بەرژەوەندیەکانی تایبەت بە کەنار ئاوەکانی مەدیتەرانەی تورکیە و ئورووپا چەق ببەستن. ئەوە ئەمریکیەکانی تەنیا دەهێشتەوە.٨٧٧

لە ٧ی مانگی مارسدا، هاوس لیۆد جۆرج و کلیمینجووی لەوە ئەرخەیان کرد کە ولاتەیەکگرتوەکان بەبێ هیچ گومانێک ماندێتێک دەگرێت. لیۆد جۆرج لە دیمەنی بەجێ گەیاندنی "ئەرکی پیرۆز" لەلایەن ئەمریکیەکانەوە دڵخۆش بوو، و خەیاڵی لەوە ئاسوودە بوو کە فەڕەنسەیەکان ماندێتیک ناگرنە دەست. هاوس، وەکوو جاری جاران، زۆری پێوە دەنا. ویلسۆن بە شۆڕای عالی هۆشداری دابوو کە "ئەگەر بەرپرسایەتی نیزامی لە ئاسیادا نەبێت ئەو ناتوانێ بیر لە هەر شتێک کە خەڵکی ولاتەیەکگرتوەکان پەسەندی ناکەن بکاتەوە." ڕەنگە ئەوە ڕادەی خراپ بوونی بڕیارەکەی ویلسۆنی هەڵسەنگاندبێت. لە ١٤ی مانگی مەیدا، کاتێکە ئەرمەنستان لە شۆڕای چوار یاردا کەوتە بەرباس، ئەو لەبابەت قەبووڵکردنی ماندێتێک ڕازی بوو، بەلام، لەدرێژەی قسەکانیدا وتی کە، ئەوە بەسراوەتەوە بە ڕەزایەتی ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکا. ئەم فەڕەنسەیەکانی ئازار دەدا چون ماندێتی پێشنیارکراوی ئەمریکی دەبوایە لە دەریای ڕەشەوە هەتا مەدیتەرانە درێژەی هەبوایە، ناوچەیەکی لە سیلیسیا دەگرتەوە کە لەچوارچێوەی ریکەوتنامەی ساکێس-پیکۆت بە فەڕەنسە بەڵێن درابوو. هەرچەند کلیمینجوو، کەسێک کە هیچ هیوایەتێکی بە ناوچەکانی تورکی-ئاخێوەر نەبوو، هیچ ناڕەزایەتیەکی لەخۆی نیشان نەدا، هاوکارەکانی

زۆر تووڕە بوون. لە لەندەنەوە، پائۆل کامبۆن گازندەی کردبوو: " دەبێ ئەوان مەست و سەرخۆش بووبێتن دەنا چۆن ئاوا خۆیان دەدەن بە دەستەوە....خوێڕیەتی و هەرپەرچی و ئاژاوەگەری ئەوەندە!" هەرچەند کەس لەو دەمەدا گومانی لێنەدەکرد، هەر تەدارەکێک کە لە پاریس دەگیرا مەبەستی ئەوە نەبوو کە جیاوازیەکی تەنانەت زۆر نادیاریش بۆ ئەرمەنستان دابنێت.٨٧٨

ئەو بەهارە لە دەورووبەری ژوورەکانی کۆبوونەوەکە و مێزەکانی شام لە پاریس زۆر پیلانی تر بۆ ئیمپڕاتۆری عوسمانی پێشنیار کرا. نەقڵێک بوو لە کۆنستانتینۆپل کە دەیگوت "هەر ماندایەک[گامێش] دێت دەبا بێت، هەر گایەک دێت دەبابێت، هەر ئاژەڵێک دێت دەبابێت؛ بەڵام دەبا تۆزیک خێرا بێت." ئەگەر هەمووی داواکاریەکان، پاراستەکان، وڵاتانی سەربەخۆ و ماندێتەکان کە لەڕاستیدا تاووتوێ کران بهاتنایەتە دی، تورکیەیەکی زۆر بچوک و سەیر لە ناوەوەی ئاناتۆلیای لێ بەجێ دەماوە، بەبێ هیچ دەربەندێک، هیچ بەشێک لە کەنار ئاوەکانی مەدیتەرانە، کەنار ئاوێکی چکۆلەبۆوە و قرتاوی دەریای ڕەش، هیچ ناوچەیەکی ئەرمەنی یان کوردی لە ڕۆژهەڵاتی باشوور. ئەوەی کە لە پلانەکەی ناو پاریس، لەنێوان شتیتردا، بەجێ دەماوە نەتوانینی هێزەکان بوو بۆ سەپاندنی ئیرادەی خۆیان. هێنری ویلسۆن، سەرۆکی ستافی گشتی ئیمپڕاتۆری بەریتانیا، لای وابوو کە سیاسەتمەداران بەگشتی ناواقیعین: "ئەوان پێدەچێ وابیرکەنەوە کە دەستوور و دەستڕۆیی ئەوان لە تورکیە لە ئاسیا هەر برەوی هەیە. ئێمە، تەنانەت بەدوای ئاگربەستیشدا، هەرگیز هەوڵمان نەداوە بچینە ناو بەشەکانی دەورپشت و نابەرچاو." هاوڕێ لەگەڵ ئەمانەشدا خودی تورکەکان بەهایان نەدەدرایە و دەخرانە پشت گوێ. ئەوەی کە لەپاریس بوو بەگشتی لایان وابوو کە ئەوان ئەوەی کە پێیان وتراوە بە ئاسانی جێبەجێی دەکەن. کاتێکە ئیدوین مۆنتاگۆ، ئەمینداری بەریتانیا لە هێندستان، هاواری کرد" دەبا بەخاتری خواش کەبووە بە مسوڵمان نەڵێین چۆن بیربکاتەوە، دەبا شێوازی بیرکردنەوەی ئەوان بە ڕەسمی بناسین،" بالفۆر بە بێ لایەنیەکی ترسینەرانەوە وڵامی دایەوە" من لەوە سەرم سووڕماوە کە لەبەرچی خوا یان هەر قودرەتێکی تر دەبێ بەرەنگاری ئێمە بێتەوە لەوە کە بە موسوڵمان بڵێین چۆن بیر بکاتەوە." ئەوە عەرەبە بندەستەکانی ئیمپڕاتۆری عوسمانیشی دەگرتەوە.٨٧٩

❊ ❊ ❊ ❊

# ٢٧

# سەربەخۆیی عەرەب

ڕۆژێک لە سەردەمی کۆڕی ئاشتیدا، ئارنۆڵد تۆئینبی، ڕاوێژکارێکی شاندی نوینەرایەتی بەریتانیا، دەبوایە چەند وتارێکی پێشکەش بە سەرەک وەزیر بکردایە. " شانسی خۆم لیۆد جۆرج چوونەکەی منی لەبیر چوبۆوە و دەستی کردبوو بە قسەی زل زل. 'مێزۆپۆتامیا...بەڵێ...نەوت...ئاودێری...پێویستە ئێمە خاوەنی مێزۆپۆتامیا؛ فلستین...بەڵێ...وڵاتی پیرۆز...زایۆنیزم...بین...پێویستە ئێمە خاوەنی فلستین؛ سووریە بین...بەڵێ...لە سووریە چی هەیە؟ دەبا فەرەنسەیەکان ئەوەیان هەبێت.'"٨٨. بەم شێوەیە نیشانەکانی تەدارەکی کۆڕی ئاشتی لە ڕۆژهەڵاتی ناڤیندا خرانە ڕوو: بەریتانیا دەرفەت لەکیس نەدات؛ پێویستبوونی فرێدانی شتێک بۆ فەرەنسەیەکان؛ وڵاتیکی زێد بۆ جوولەکەکان؛ نەوت؛ و بیرۆکەیەکی بێ دەنگ بەومانایە کە ئاشتیکەران بتوانن لەکیس ناوچەکانی عوسمانی پێشوو خۆیان ڕزگار کەن تا ئەوەی پێیان خۆشە بیکەن. بۆ ڕۆژهەڵاتی ناڤینی عەرەب، تەدارەکاتی ئاشتی بۆڕایەکی تر ناسیۆنالیزمی کۆنی سەدەی نۆزدەهەم بوون. بەریتانیا و فەرەنسە لەگەڵی ڕاهاتبوون-بەشێوەیەکی کاتی- چون وڵاتەیەکگرتوەکان بریاری نەدابوو خۆی تێوەگلێنێت و چون ناسیۆنالیزمی عەرەب هێشتا ئەوەندە بەهێز نەبوو تا بتوانێ بەرەنگاری ئەوان بێتەوە.

لە کۆبوونەوەکەی خۆیاندا لە لەندەن لە مانگی دیسامری ساڵی ١٩١٨، درووست بەرلەوەی ویلسۆن بگاتە ئەورووپا، لیۆد جۆرج و کلیمینجوو بە دەرفەتیان دەزانی تا لەسەر دابەش کردنی ناوچە بەربڵاوەکانی عەرەب نشینی ئیمپراتۆری عوسمانی، کە لە مێزۆپۆتامیاوە لەسەر سنوورەکانی ئیمپراتۆریەتی فارسەوە بەرەو مەدیتەرانە درێژەیان هەبوو ڕێکەوتنێک ببەستن. هەردوو پیاوەکە هێشتا بە سەرکەوتنی خۆیان بەسەر ئەڵمانیا و بە دۆستایەتی تازە بەڵام وەک دیاربوو بە دۆستایەتی گەرمی نێوان هەردوو نەتەوەی خۆیان کەیفخۆش و دڵگەرم بوون. کلیمینجوو لەو پێشوازیەی کە لێی کرا

خۆشحاڵ بوو چون خەڵکی لەندەن بەکۆمەڵ هاتبوون و لە خۆشیان دەیانقیژاند و فیکەیان لێدەدا و کڵاو و داردەستەکانیان بە ئاسماندا حەوا دەدا. مۆرداک، یاریدەدەری کلیمینجوو، وتبووی: "بەڕاستی لەنێوان خەڵکێکی وەها سارد و سڕدا، ئەوە بۆخۆی زۆرشت دەگەیەنێت." وتویژ لەسەر ڕۆژهەڵاتی ناڤین کورت و دڵخۆشکەر بوو. کلیمینجوو وتی:" کەوایە ئێمە لەسەر چی وتویژ بکەین؟" لیۆد جۆرج لەوڵامدا وتی:" میزۆپۆتامیا و فلستین." کلیمینجوو:" پێم بڵێ داوای چی دەکەی." لیۆد جۆرج:" من موسڵم دەوێت." کلیمینجوو:" ئەوەش بۆ تۆ. چیکەت دەوێت؟" لیۆد جۆرج:" بەڵێ جرووسلمیشم دەوێت." کلیمینجوو:" بۆ تۆ بەڵام لەبابەت موسڵەوە پیچۆن گێرەوکێشەت بۆدرووست دەکات."٨٨١ (موسڵ بەهۆی نەوتەکەیەوە خەریک بوو گرنگی دەدرایە.)

وادیاربوو لیۆد جۆرج لەبەرانبەردا بەڵێنی بە کلیمینجوو دابوو: بەڵێنی ئەوە کە بەریتانیا پشتگری لە فەرەنسە دەکات، تەنانەت دژ بە ئەمریکیەکان، لە هەبوونی کۆنترۆڵ بەسەر کەنار ئاوەکانی لوبنان و ناوچەکانی ناوەوەی سووریە، و ئەوە کە فەرەنسە بەشێک لەو نەوتەی پێدەبرێت کە لە موسڵ هەڵدەگوێزرێت. فەرەنسەیەکان دواتر ڕایانگەیاند کە کلیمینجوو زۆر دڵئاوابوە چون لیۆد جۆرجیش ئەوی ئەرخەیان کردبوو کە ئەو دەتوانێ سەبارەت بە داواکاریەکانی خۆی لە ئەورووپا، بەتایبەت بەدرێژایی چۆمی ڕاین، پشت بە یارمەتیەکانی بەریتانیا ببەستێت. لیۆد جۆرج لە بیرەوەریەکانی خۆیدا ئاماژە بەو بەشە لە مامەڵەکە ناکات. ئایا فەرەنسەیەکان هەڵەیان دەکرد یان بەریتانیەکان (بۆڕایەکی تر) خەیانەتیان دەکرد؟ بەداخەوە ئەو وتووێژە بەشێوەیەکی فەرمی هەڵنەگیراوە. ئەوە بۆ کێشەیەک کە پێوەندیەکانی نێوان فەرەنسە و بەریتانیای لەماوەی کۆڕی ئاشتیدا و بۆماوەی چەندین ساڵ دواتر ژەهراوی دەکرد دەسپێکێکی ناخۆش بوو.٨٨٢

ئەوەی کە بەناوی پرسی سووریە ناوی دەرکرد (هەرچەند بە هەمووی ناوچەکانی عەرەبنشینی عوسمانیەوە پێوەندی هەبوو) پێویستی بە زیانێکی زۆر نەدەکرد. بەریتانیا و فەرەنسە بە ڕێکەوتنێکی نهێنی ساکیس-پیکۆتی ساڵی ١٩١٦ پێشتر مامەڵەی خۆیان لەسەر ڕۆژهەڵاتی ناڤین بەئەنجام گەیاندبوو. لە هەرحاڵدا، ڕووخانی چاوەڕواننەکراوی ئیمپراتۆری عوسمانی خەونە کۆنەکان و ململانێ دێرینەکانی ورووژاندبوو. ئەو شەڕەدەندووکەیە، کە لە ساڵی ١٩١٩دا درێژەی هەبوو، ناوچە و زەوی و زاری تێپەڕاندبوو. لەبابەت ژوان ئاف ئارکەوە و ویلیامی ولاتگر، بەرزایەکانی ئابراهام و پلاسی بوو، لەبابەت هێرشەکانی خاچپەرستان، لەبابەت ناپلۆئۆن لە میسر و لەناوبردنی کەشتیەکانی نیکۆلسۆن بە دەستی خۆی لە شەڕی نیل، لەبابەت حەول و تەقەلا لەسەر ئەفریقا، کە ئەوەندەی نەمابوو لەسەر فاشۆدا، سوودان، لە ساڵی ١٨٩٨ شەڕێکی گەورە سازبێت، و لەبابەت ڕکابەرایەتی

نێوان شارستانیەتی فەرەنسەیەکان و ئانگلۆساکسۆن بۆ تەشەنەکردن و کارتێکردنی زیاتر بوو. لیۆد جۆرج، لیبراڵیک کە زەوی رفێنەری لێدەرهاتبوو، ئەوەندەی کە کارەکەی خراپ کرد. وەکوو ناپلۆئۆن، سەرخۆشی ئەگەرەکانی ڕۆژهەڵاتی ناڤین بوو: جیهانێکی هێلینیکی بووژاوە لە ئاسیای بچووک؛ شارستانیەتێکی تازەی جوولەکەکان لە فلستین؛ دوورلەمەترسی بوونی سوویز و هەمووی ئەو ناوچانەی کە بە هێندستانەوە پێوەندیان هەبوو؛ وڵاتانی عەرەبنشینی بەوەفا و ملکەچ بەدرێژایی فێرتایل کرێسێنت و دەرووڕۆڵەکانی دجلە و فۆرات؛ پارێزگاری کردن لە پاشەکەوتە نەوتیەکانی بەریتانیا لەبەرانبەر ئێراندا و ئەگەری سامانە تازەکان لەژێر کۆنترۆڵی ڕاستەوخۆی بەریتانیەکاندا؛ ئەمریکیەکان لەڕووی خزمەتگوزاریەوە لێرە و لەوێ ماندێتیان دەگرت؛ فەرەنسەیەکان ئەوەی کە پێیان دەوترا بە ئەنجامیان دەگەیاند. لە ئێوارەخوانێکی تایبەتیدا درووست بەر لە کۆتایی هاتنی شەڕ نزیکترین ڕاوێژکارەکانی ئەویان "لەباری هەست و هۆشدا زۆر شکۆدارانە" هاتە بەرچاو. "زۆر ڕژد و لاسار". ئەو خوازیاری ئەوەبوو کە هەتابۆی دەکرێ فەرەنسە لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین بێ بەش بکات، تەنانەت ئەگەر بە قیمەتی شکاندنی بەڵێنیەکانی پێشووش بوە. و ئەوە بەگشتی بە مانای ساکیس-پیکۆت بوو، بە واتەی کۆرزۆن، " ڕێکەوتنامەیەکی بەد شووم کە وەکوو بارێکی قورس لەو کاتەوە بە ملی ئێمەوە بوو."[٨٨٣]

وەکوو زۆربەی مامەڵەکانی تر کە وەکوو میوانی بانگێشت نەکراو سەرودڵی کۆڕی ئاشتیان گرتبوو، ساکێس-پیکۆت لە جەنگەی شەڕدا بەسترا، ئەو کاتەی کە بەڵێنەکان هەرزان و داهاتووی شکست زۆر نزیک بوو. لە ساڵی ١٩١٦دا، شەڕ خەریک بوو بۆ هاوپەیمانان بەلای خراپەدا دەگەڕا. لە ڕۆژهەڵات نیشتنەوەکانی گالیپۆلی سەریان نەگرتبوو و لە مێزۆپۆتامیا هێزێکی گەورە لە هێندستانەوە خۆی بە دەستەوە دابوو. بەریتانیەکان خوازیاری ئەوەبوون کە دوژمنایەتیەکی تازە دژ بە عوسمانیەکان لە میسرەوە ڕێک بخەن بەڵام بۆ ئەوەی کە سامان و داهاتەکان لە بەرەی جەنگی ڕۆژئاوا ببرن دەبوایە ڕێکەوتنامەی فەرەنسەیان هەبوایە. ئەوەیکە ئەوان وەک هەویرە گۆشتێک پێشنیاریان دەکرد ڕێکەوتننامەیەک بوو لەسەر ڕێکخستنی داهاتووی ئیمپراتۆری عوسمانی.

هەردوو وتوێژکەرەکە کاتۆلیک بوون، و هەرکیان ڕۆژهەڵاتی ناڤینیان وەکوو بەری دەستیان دەزانی. پیکۆت بەرلە شەڕ لە بەیرووت کۆنسول-ژەنەراڵ بوو، و ساکیس لە قاهیرەوە بۆ بەغداد گەڕابوو. پیکۆت لەدایکبووی چینی سەرووی مامناوەندی فەرەنسەیەکان بوو کە زۆربەی دیپلۆماتەکانی فەرەنسە، حاکمانی کۆلۆنی و بۆرۆکراتە پلە-بەرزەکانی خستبۆوە. ئەو باڵابەرز و بەدەعیە، کۆنەپارێز و دیندار بوو و وێڕای یەک بەهای بە هەیبەتی خۆی و بە هەیبەتی

فەڕەنسە دەدا. ئەو نزیک بە گرووپە بەهێزەکانی لۆبی کۆلۆنی لە فەڕەنسە بوو؛ براکەی خەزێنەداری کۆمیتە دی لئاسی فرانچایس بوو، کە بەپێچەوانەی ناوەکەی خۆی زیاتر بەهای بە ڕۆژهەڵاتی ناڤین دەدا.٨٨٤

ساکێس، بەپێچەوانە، یەکێک لە نەزانە دەوڵەمەندەکانی دەربەگایەتی بوو کە بە شان و شەوکەتی دیپلۆماسی بەریتانیدا هەڵیدەکوت. ئەو قەت مامۆستای تایبەتی قوتابخانە بەشێوەی فەرمی لە یۆرکشایەر نەبوو، ماوەیەکی زۆر کورت لە قوتابخانەکانی خانەخۆ مایەوە و نزیک بە دوو ساڵیش لە کامبریج بوو، ئەو شوێنەی کە ئەو لە شانۆگەری ئاماتۆڕدا ناوێکی بۆخۆی خستەوە. ئەو بە وورە و سەوداسەر بوو بەڵام کردەوەیی نەبوو. تی ئی.لۆرێنس لەبارەی ئەوەوە وتبووی: " ئەو خاڵی لاوازی لە هەموو شتێکدا بەدی دەکرد و خاڵە بەقوەتەکانی نەدەدی. ئەو خێرا بە هەڵپەهەڵپ جیهانێکی تازەی وەسف دەکرد، دوور لە هەر پێوەرێک، بەڵام وەکوو بینینی هەندێک لایەنی ئەو شتەی کە ئێمە وەسفمان دەکرد وابوو." ئەو حەزی لە جۆکی واقیعی بوو، کاریکاتۆر، گوندەکانی یۆرکشایر و ئیمپراتۆری بەریتانی دەکێشایەوە. ئەو حەزی لە شارەکان، کاری ڕۆژانە و ئاشتەوەران نەبوو. ئەو ژیانی خۆی تەرخان بە ژنەکەی و شەش منداڵەکەی کردبوو، ڕەنگە ئەوە بەهۆی ژیانی ناخۆشی منداڵی خۆیەوە بووبێت بە دایکێکی هەمیشە سەرخۆش و مێ باز و باوکێکی ساردوسڕ کە زوزوو تووشی گەشکە دەهات. ئەو شەیدای ڕۆژهەڵاتی ناڤینی کۆن و گەلاو نەبووی گوندنشینانی بێ تروپۆ بوو؛ ئەو سەرلۆمەی فەڕەنسەیەکان و ئابووری جیهانی دەکرد لەوەکە کۆمەڵگای کۆنیان مۆدێرنیزە و گەلاو کردبوو. ئەو بەسەر کلتووری فەڕەنسەیەکانیدا هەڵدەکوت بەڵام لای وابوو فەڕەنسە شیاوی ئەو ئیمپراتۆریەتەی خۆی نیە. ئەو دوای سەردانی ئەفریقای باکووری فەڕەنسەیەکان وتبووی " فەڕەنسەیەکان توانایی فەخرفرۆشیان نیە، ئەوان ساهیب[sahib] نین، ئەوان پیاوماقووڵیان نیە، ئەفسەرەکان ئەسپ یان چەک یان سەگیان نیە."٨٨٥

ئەوەی کە زۆر سەیر بوو ئەوە بوو کە پیکۆت و ساکێس هەرکیان بڕیاریان دابوو پێکەوە چالاکی بکەن. پلانەکەی ئەوان، کە لەلایان حکوومەتە بەڕێزەکانی ئەوانەوە لە مانگی مەی ساڵی ١٩١٦دا پەسەند کرابوو، ئەگەر تۆ ئیمپریالیستێکی ڕۆژئاوایی بوویتایە، کارێکی تەواو ئاقڵانە بوو. کەنارئاوەکانی سووریە، بەشێکی زۆر لە لۆبنانی ئەمڕۆکە، دەبوایە بە فەڕەنسە ببڕایە، کەچی بەریتانیا کۆنترۆڵی ڕاستەوخۆی بەسەر مێزۆپۆتامیای ناوەندی، بەسەر بەغدا، و بەشی باکووری دەورووبەری بەسرا دەبوو. فلستین، کێشەیەکی ئاڵۆز بەهۆی بەرژەوەندی چڕوپڕی هێزە مەسیحیەکانی تر(بەتایبەت ڕووسیە)، بەڕێوەبەرایەتیەکی نێونەتەوەیی دەبوو. ئەوەی کە

دەماوە، ناوچەیەکی گەورە کە سووریەی ئێستاشی دەگرتەوە، مووسڵ لە باکووری ئێراق، و ئۆردۆن، سەرۆکەکانی عەرەبی ناوچەیان لەژێر چاودێری فەرەنسەیەکان لە باکوور و بەریتانیەکان لە باشوور دەبوو. (دوورگەی عەرەبستان ئاماژەی پێ نەکرا، لەوانەیە بەهۆی ئەوەوە بووبێت کە کەس بیری لەوە نەدەکردەوە کە ئەو هەموو ناوچە شنیە شیاوی دڵەڕاوکێ بووبێت.)

ڕێکەوتنامەکە فەرەنسەیەکانی ئارام کردەوە، کەسانێک کە بەدرێژایی کەنارئاوەکانی سووریە وەبەرهێنانی بەرچاویان هەبوو و کەسانێک کە خۆیان بە پارێزەرانی کۆمەڵانی گەورەی مەسیحی ناوچەکە دەزانی، وەکوو هارۆنایتەکانی دەورووبەری ماونت لێبنان. بۆ بەریتانیەکانیش باش کەوتبوو، و ئەوان بە وریایی فەرەنسەیەکانیان خستبوە نێوان خۆیان و ئیمپراتۆری ڕووسی چون ڕووی کردبوە بەشی باشوور.٨٨٦

بەگشتی هەرکە مامەڵەکە سەری گرت، بەریتانیەکان پەشیمانی خۆیان دەربڕی. ئایا ئاقڵانە نەبوو فلستین، زۆر نزیک بە کاناڵی سوئیز، ڕاستەوخۆ کۆنترۆڵ بکرایە؟ ئەمە زیاتر لەلایەن مەقاماتی ڕەسمی بەریتانی لە میسر پێداگری لەسەر دەکرا. بۆدەبێ فەرەنسەیەکان موسڵیان پێببڕێت؟ کاتێکە ڕووسیە لە شەڕی ساڵی ١٩١٧دا فلی کرد، لە پڕێکدا وادەرکەوت کە پێویست نەبێ فەرەنسە بە ڕێگر بزانێت. کاتێکە هەواڵی خۆبەدەستەوەدانی عوسمانیەکان بەگوێ گەیشت هاوکارێک لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە سایکێس" پلانێکی تازە و زیرەکانەی دارشتوە کە بەپێی ئەو پلانە فەرەنسەیەکان دەبێ لە هەمووی ناوچە عەرەبنشینەکان بێجگە لە لوبنان بسرڕدرێنەوە و لەبەرانبەردا پارێزگاریکردنی هەمووی ناوچەی کۆردۆ-ئەرمەنستان لە ئاداناوە تا ئێران و قەزاقستان بگرنە دەست."٨٨٧

لە فەرەنسە، لۆبیەکی کۆلۆنیستی هەمەچەشن،- بەرهەمهێنەرانی قوماش لە لیۆن، کەسانێک کە هەستیان بەوەکردبوو کە موسڵ وڵاتێکی گونجاوە بۆ سەیارە لێخوڕین؛ قەشەکانی جیسووت، کە لەژێرچاوەدێری ئەوان زانکۆیەک لە بەیرووت بەڕێوەدەچوو؛ سەرمایەداران، مەقاماتی ڕەسمی و ڕۆشنبیران لە کۆمیتە ل،ئاسی فرانچایس- کردبویانە سەر حکوومەت تا قورس و قایم خۆڕاگری خۆی ڕاگرێت. سووریە، بۆ ئەم لۆبیە، سووریەیەکی گەورەتر بوو، کە لەباشوورەوە بەرەو سینای و لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو مووسڵ درێژەی هەبوو. گرووپگەلی پەرلەمانی ئاماژەیان بە فەرمایشتە ستراتیجیەکان دەکرد. فەرەنسە تازە ئەلجەزیرە و تونسی بەدرێژایی کەنارئاوەکانی باشووری مەدیتەرانە پێبڕابوو؛ ئێستا کاتی ئەوە هاتبوو مۆراکۆ بەخۆیەوە بلکێنێت. بەداخەوە بۆ میسر زۆر درانگ بوو، وڵاتێک کە لە مانۆڕێکی فێڵبازانەدا لە ساڵی ١٨٨٢ لەلایەن بەریتانیەکانەوە لەغاو

کرابوو. بەڵام بۆ لۆبنان و ناوچەکانی ناوەوەی سووریە و فلستین زۆر درەنگ نەبوو. کوای دی ئۆرسای لەسەر " ئەم ئەرکە قورسە بەڵام پیرۆزە" یاداشتێکی بۆ کلیمینجوو ناردبوو. پێوەندی فەرەنسە لەگەڵ سووریا دەگەڕایەوە بۆ هێرشی خاچپەرستەکان. ئەم پێوەندیە ببوە هۆی پارێزگاری کردن لە مەسیحیەکان و هێنانەدی شارستانیەت بۆ هەمووی عەرەبەکان. ئێستا دانیشتوانی ناوچە بۆ چاککردنەوەی زیانێک کە بە چەند ساڵ دەسەڵاتی تورکی درووست ببوو پشتیان بە فەرەنسەوە بەستبوو. پێویست ناکات فەرەنسە دەست لە سووریە هەڵگرێت. ڕای گشتی فەرەنسەیەکان لەکاتی خۆیدا سوورهەڵدەگەڕا ئەگەر " بەدوای شەڕێکی لەو چەشنە و سەرکەوتنێکی لەو چەشنە، کە ڕۆڵ باڵادەستی فەرەنسەی لە جیهاندا مسۆگەر کردوە، پێگەی ئەو وڵاتە خوارتر لە پێگەی بەر لە مانگی ئۆگستی ساڵی ١٩١٤ بوایە."٨٨٨

پێگەی بەریتانیەکان قایمتر بوو. لێژنەی ڕۆژهەڵاتی کابینەی شەڕ، کە لە ساڵی ١٩١٨دا بۆمەبەستی تاوتوێکردنی سیاسەتی بەریتانیا لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین دابین کرابوو، بەردەوام ئاماژەیان بە پێویستبوونی لەخۆگرتنی هاوپەیمانەکەی خۆیان دەکرد. ئەگەر فەرەنسە فلستین و سووریەی پێببڕایە، بەریتانیا، بەبۆچوونی کۆرزۆن، سەرۆکی لێژنەکە و ڕۆح بزوێنەر، مەجبوور دەبوو هێزێکی گەورە لە میسر بۆمەبەستی پارێزگاریکردن لە کاناڵی سوێز و ڕێگای سەرەکی بۆ هێندستان دەبوو. و ڕێگای تریش هەبوون، بەسەر وشکیدا یان لەڕێگای ئاسمانەوە (ئەگەرێکی تازە)، لە کۆتایی ڕۆژهەڵاتی مەدیتەرانەوە لەڕێگای سووریە و مێزۆپۆتامیاوە، یان دوورتر لە باکوور بەدرێژایی دەریای ڕەش و لەپشت قەزاقستانەوە. بالفۆر ئاماژەی بەوەدەکرد کە ئەمە مشتومڕێکی مەترسیدارە: " هەرکاتێک کە من لەگەڵ وتوێژێک ڕووبەڕوو دەبمەوە- بابڵێین ناوبەناوێکی پێنج ساڵە- هەست بە بوونی ناوچەیەکی تازە دەکەم کە پێویستە لەسەر شانمان ئاگاداری لێ بکەین، کە پێدەچێ بتوانێ پارێزگاری دەرگا سەرەکیەکانی هێندستان بکات. ئەو ڕێگا سەرەکیانە خەریکن لە هێندستان دوور و دوورتر دەکەونەوە، و من نازانم لەلایەن ستافی گشتیەوە بڕیار وایە چەندە بەرەو ڕۆژئاوا دوور بکەونەوە." هاوکارەکانی ئەو سوور مانەوە لەسەر ئەوە کە ساکێس-پیکۆت لەناوبەرن.٨٨٩

تەنانەت بەرلەوەی فەرەنسیەکان لەمە تێبگەن، چالاکیەکانی بەریتانیەکان ترس و گومانی ئەوانیان وروژاندبوو. کاتۆلیکەکانی فەرەنسەیی تۆقابوون کاتێکە دروست بەرلە کریسمەسی ساڵی ١٩١٧ هێزەکانی بەریتانی بە فەرمەندەیی ژەنەڕاڵ سێر ئێدمۆند ئالێنبای تورکەکانیان بۆ دەرەوەی جرووسلم ڕادابوو. " مەترسی پرۆتێستان" خەریک بوو بەسەر وڵاتی پیرۆزدا زاڵ دەبوو. لۆبی کۆلۆنیایی فەرەنسیەکان بەتاسەوە سەیری دەکرد چون پۆندی میسری بوو بە پووڵی باوی ناو فلستین و دواتر ناو

سووریە، و تجارەت بەسەر باشوردا ڕژا. کاتێکە پیکۆت بەرەو فلستین هەڕای کرد تا پارێزگاری لە بەرژەوەندیەکانی فەرەنسە بکات، ئالێنبای و ستافەکەی ئەوی زۆر سارد و سڕ هاتە بەرچاو. لە هاوینی ساڵی ١٩١٨دا، ئەو کاتەی کە دوایەمین دژایەتی گەورەی ئەڵمانیەکان چەند جار بەتوندی بەرەی جەنگی ڕۆژئاوی دابێژ دابێژکرد و بەریتانیەکان دوژمنایەتیەکی سەرەکی تریان دژ بە سووریا سازکرد، کوای دی ئۆرسای هۆشداری دا کە ڕای گشتی فەرەنسەیەکان قەبووڵ ناکات کە " فەرەنسە لەو بەرژەوەندیانەی کە مافی ڕەوای خۆی بوون لەلایەن کەسانێک کە هێزەکانی خۆیان لە کاتی هەستیاری جەنگدا لادا بێ بەش بکرێت." بە بەرەنگاری بەردەوامی بەرپرسانی میلیتاری بەریتانی بۆ بەدەستەوەدانی دەسەڵاتی تەواو بە نوێنەرانی فەرەنسەیی لە ناوچەکانی سووریە کە لەچوارچێوەی گرێبەستی ساکێس-پیکۆتدا بۆ فەرەنسە جیاکرابوونەوە ترس ودڵەڕاوکێی فەرەنسەیەکان کەم نەبۆوە. بەریتانیەکانیش لەبابەت پلانە درێژخایەنەکانی خۆیانەوە بێ دەنگیەکی ترسێنەریان ڕاگرتبوو. پیکۆت، کە لە زۆربەی هاوکارەکانی خۆی کەمتر توندڕۆ بوو، هەوڵی دا لەبابەت کەش و هەوای ناو فەرەنسە ساکێس ئاگادار بکاتەوە: "دوژمنان ئەوە وەک بەڵگەیەک لەسەر ئارەزوە شاراوەکان دەبینن. تەنانەت کەسانی تریش خەریکن هۆگر دەبن." بەریتانیەکان نیگەرانیەکانی فەرەنسەیەکان یان خودی پیکۆتیان بەهەند نەگرت ئەفسەرێک وتبووی: "پیاوێکی قزە و بێ کەڵک کە چاوی پیسی لە پێگەی خودی خۆی و پرستیژی فەرەنسە بڕیوە."٨٩٠

هەرچەند بەریتانیەکان و فەرەنسەیەکان وا تێوەچووبوون کە گوایە ڕۆژهەڵاتی ناڤین ملکی باوکیان بێت قڕەی لەسەر دەکەن، دەبوایە ئاوڕێکیان لە هاوپەیمانەکانی خۆیان بدایەتەوە. ئەو بەڵێنیە نادیارانەی کە لە کاتی شەڕدا بە ئیتالیا درا- بەڵێنی دەستڕاگەیشتن بە بەندەرەکانی وەکوو هایفا و ئاکرێ؛ بەڵێنی باسێک لەسەر بەڕێوەبەرایەتی فلستین؛ بەڵێنی مامەڵەی هاوچەشن لە دوورگەی عەرەبستان و دەریای سوور- دەکرا بەبێ هیچ مەترسیەک بخرانایەتە پشت گوێ و بەگشتی وایان لێهات. وڵاتەیەکگرتوەکان شتێکی جیاواز بوو. با ویلسۆن وایدانابێت کە عەرەبەکان پێویستیان بە ڕێنوێنی دەبێت، لەوانەبوو لەلایەن فەرەنسە و بەریتانیاوە، ئەو بیرۆکەی ڕاوێژکردن لەگەڵ ئارەزووەکانی خەڵکانی ناوچەکەی بەهەند دەگرت. ئەو لە وتاری "چوار پرەنسیپەکەی" ١١ی مانگی فەوریەی ساڵی ١٩١٨دا وتبووی:" هەر دانووستانێکی ناوچەیی کە لەم شەڕەدا دێتە ئاراوە پێویستە لە بەرژەوەندی و لە قازانجی ئەو خەڵکانە بێت کە دەکەونە بەرباس." گاستۆن دۆمێرگۆ، وەزیری پێشووی کۆلۆنیەکان و جێگری سەرۆکی لێژنەی فەرمی فەرەنسەیەکان بۆ دارشتنی ئامانجەکانی کۆلۆنی فەرەنسە، زۆر بەوەختی خۆی ڕایگەیاند:" تەنیا ڕێگرێک کە هەیە ئەمریکایە!"٨٩١

زۆر بە ئاستەم و لەسەرەخۆ، ئەورووپییەکان دەستیان کرد بە باسکردنی زمانی ئەمریکییەکان. دۆمێرگۆ وتی کە ئاشکرایە کە "ئێمە بۆ قازانجی مرۆڤایەتی پێویستیمان بە ئیمپراتۆرێکی کۆلۆنیایی هەیە تا لەسەر هەڵوێستی تایبەتی شارستانی هێنەری فەرەنسە کاربکات." بەریتانییەکان لە کارامەیەکی هاوچەشنیان لە کردنی بەرگی تازە بەبەر ئامانجە کۆنەکانی ئیمپراتۆریەت هەبوو. ئەوە ئەمریکییەکانی دڵتەنگ نەدەکرد؛ وەک سمووتس لەسەر لێژنەی ڕۆژهەڵات بە هاوکارەکانی خۆی ڕاگەیاندبوو: " ئێوە ناتانەوێت ماڵە تالانکراوەکان دابەش بکەن؛ ئەوە بۆ داهاتوو سیاسەتێکی هەڵە دەبێت." بە واتایەکی تر، ئەگەر ئەمریکییەکان هان بدرانایە کە بەریتانییەکان ڕێز لە ئاواتەکانی نەتەوەی عەرەب دەگرن، لەوانەبوو ئەوان گوشاریان بخستایەتە سەر فەرەنسەیەکان تا واز لە هەندێک لەو شتانەی کە لە چوارچێوەی ساکێس-پیکۆتدا بەڵێن درابوون بهێنن. سیسیلی ڕەوشت بەرز و زیرەکی فێڵباز هەرەشەی کرد کە " ئەمریکییەکان تەنیا لە حاڵەتێکدا پشتگری لە ئێمە دەکەن ئەگەر لایان وابێت کە ئێمە مەبەستمان دروستکردنی حکوومەتێکە لە خەڵکانی خودی ناوچەکە." کۆرزۆ لەسەر ئەم باوەڕەبوو:" ئەگەر ئێمە نەتوانین بە هیچ شێوەیەک لەم گیروگرفتانە ڕزگاریمان بێت دەبێ بۆ هەرشوێنێک کە شیاوی بێت خود-موختاری بەکاربێنین، هەرشوێنێک کە ئێمە لەگەڵ فەرەنسەیەکان، عەرەبەکان، یان هەرکەسی تر تووشی گێرەوکێشە بین، و کێشەکە دانێین تا لەلایەن ئەو وتوێژەوە چارەسەر کرێت کە لە هەناوی ئێمەدایە و زیاتر لە خۆمان کەسی تر نیە بەهرەی لێ وەرگرێت."٨٩٢

حکوومەتەکانی بەریتانی و فەرەنسەیی، لە ڕاگەیاندنێکدا کە بە زمانی عەرەبی هەموو شوێنێکی تەنیەوە، بە وەختی خۆی بۆیان دەرکەوت کە مەبەستی سەرەکی ئەوان لەسەر عوسمانیەکان " ڕزگارکردنی ئەو خەڵکە بوو کە زۆر لەمێژ بوو بە دەست تورکەکانەوە دەچەوسانەوە و دامەزراندنی حکوومەتگەل و ڕێکخراوەگەلی نیشتمانی بوو کە بەرپرسایەتی خۆیان لە هەوڵ و هەڵبژاردنی ئازادی دانیشتوانی ڕەسەنی ناوچەکە وەردەگرت." قسەکردن هیچی تێنەدەچوو. بە واتەی کۆرزۆن کە وتبووی بەریتانییەکان دڵنیابوون لەوەکە عەرەبەکان بە حەزی خۆیان پارێزگاریکردنی بەریتانیا هەڵدەبژێرن. فەرەنسەیەکان ناسیۆنالیزمی عەرەبیان قەت بە هەند نەدەگرت. پیکۆت وتبووی کە " تۆ ناتوانی ئەو هەموو عەشیرەتە لە دەوری یەک کۆ کەیەوە و بە کردەوە بیانکەی بە گشتێک." هەردوو قودرەتەکە ئەو خولیابوونەیان خستە پشت گوێ کە ڕاگەیاندنەکەی ئەوان لە جیهانی عەرەبدا وەریگرتبوو؛ لە دەمێشق، ناسیۆنالیستەکانی عەرەب کابلە ئەلیتریکیەکانیان پچڕاندبوو و ژمارەیەکی زۆر مادەی تەقەمەنیان لە شادی و خۆشیدا تەقاندبۆوە.٨٩٣ بەریتانیەکان و فەرەنسەیەکان کە لە کاتی

شەڕدا دژینی[djinn] ناسیۆنالیزمیان بۆ یارمەتی خۆیان بانگێشت کردبوو خەریک بوون بۆیان دەردەکەوت کە ئەوان ناتوانن بەو ئاسانیە بۆ ڕایەکی تر لە کۆڵ خۆیانی بکەنەوە.

❊ ❊ ❊ ❊

لە کۆتایی مانگی نوامری ساڵی ١٩١٨دا، لاوێکی ڕەش ئەسمەری جوانچاک کە، بە هەندێک ڕوونکاریەوە، بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە وتەبێژی عەرەبەکان بێت بۆ مەبەستی ڕۆیستن بۆ مارسیل و کۆڕی ئاشتی لە بەیرووت سواری کەشتیەکی جەنگی بوو. فەیسەڵ، نەوەی پێغەمبەر و ئەندامی عەشیرەی کەونارای هاشمیە، مرۆڤێکی زیرەک، سوورلەسەر مەبەست و پڕ لە خۆزیا و خولیا بوو. جگە لەوانە هەتابڵێی سەرنجڕاکێش و خوێنشیرین بوو. کاری بەوەنەبوو کە ئەو لە کۆنستانتینۆپل گەورە ببوو؛ عەرەبێکی ڕەسەنی دەشتەکی دەبێ چۆن بێ باشە ئەو وابوو. لانسینگ، کە لە حاڵەتی ئاساییدا هیچ هەستێکی شاعیرانەی نەبوو، هەستی جوولابوو. " ئەو هەڵگری ئاشتی و بێ دەنگی بیابان بوو، ناوەنجیگەری کەسێک کە لە بۆشایە بەربلاوەکانی زەویدا دەژی، سامگرانی بیرۆکەی کەسێک کە زۆرجار بەتاقی تەنیا لەگەڵ سرووشت دەردەدڵ دەکات." ئالێنبای، کۆنە ژەنەراڵی بەهێزی بەریتانی، " پیاوێکی زۆر پەرۆش و بەهێزی بەدی" دەکرد. دەست و پلی لە هینی ژن دەچن ئەوەندە جوانن؛ و کاتێکە دەکەوێتە قسەکردن قامکەکانی بەهۆی دڵەڕاوکێ هەر لە جووڵەدان." بە " هێزی زرێپۆشی ئیس تی. جۆرج" (شانشایانی تەلا)، چەک و ڕاوێژاکارانی بەریتانی، فەیسەڵ دژ بە تورکەکان شۆڕشێکی عەرەبی ڕێکخستبوو.٨٩٤

بەریتانیەکان لە پشتگیریکردنی ئەودا بە یەکەوە قوماریان کردبوو، و بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئەم کارە ئەوان چەندین بەڵێنی فەرمیان پێشنیار کردبوو کە لەگەڵ کۆمەڵێک بەڵێنی تر لە گرێبەستی سایکێس-پیکۆت یەکیان نەدەگرتەوە. لە ساڵی ١٩١٥دا سێر هێنری مەکماهۆن، مەقامێکی ڕەسمی پلەبەرز لە قاهیرە، لەگەڵ باوکی فەیسەڵ، حوسەین، شەریفی مەکە " کۆنە پیاوماقووڵێکی کورتەبالای تەرپۆش بە شان و شکۆیەکی تایبەتەوە و لەدڵەوەنزیکیەکی سەیر" دەرگای وتوێژیان کردبۆوە. حوسەین زیاتر لەفکری سەروەت و سامانی خۆیدا بوو تا خود-موختاری عەرەب. ئەو هەتابڵێی بە ڕەگەزی خۆیەوە شانازی دەکرد، ڕەگەزێک کە ئەو دەیگەڕاندەوە بۆ دەیان بەرە لەوەپێش (و بەردەوام وای دەکرد)، ئەو سەرۆکی یەکێک لە بنەماڵە هەرە کۆن و ناودارەکانی جیهانی عەرەب بوو، پارێزەری پیرۆزترین شوێنەکانی سەرتاسەری حەجاز، و خاوەنی فەخری ژمارەتەلەفوونی یەکی مەکە بوو. مەکماهۆن، لە شەڕە نامەیەکدا لەگەڵ شەریف کە ئێستاش هەرماوەتەوە، بەڵێنی دا کە، ئەگەر عەرەبەکان دژ بە تورکەکان ڕاپەڕن، ئەوان یارمەتی بەریتانیا و، لەوەگرنگ تر، سەربەخۆیی

خۆیان پێ دەبڕێت. بۆ پارێزگاریکردن لە بەرژەوەندییەکانی فەرەنسە و بەریتانیا چەند ناوچەیەک بەتایبەت لە دەسەڵاتی عەرەب هاوێردران: لە ناوچەیەکی ڕۆژئاوا هێڵێک کە لە ئالێپۆ لە باکوورەوە درێژەی هەبوو هەتا دەمێشق لە باشوور- بە واتایەکی تر، کەنار ئاوەکانی سووریا و لوبنان- هەروەها پارێزگا کۆنە تورکیەکانی بەغدا و بەسرە. سنوورەکانی نێوان ناوچە دابڕاوەکان و ئەوانی تر دیاری نەکرابوون. دواتر بەریتانیەکان، لە داکۆکیکردنی جوگرافیا، بەڵگەیان دەهێنایەوە کە فلستینیش لە ڕۆژئاوای هێڵی ئالێپۆ-دەمێشق هەڵکەوتبوو. و مانای سەربەخۆیی چی بوو؟ حوسەین و لایەنگرەکانی لایان وابوو کە، تەنانەت لە ناوچە دابڕاوەکانیش، حکوومەت لەژێر چاودێری ئەوروپییەکاندا دەبێ بە حکوومەتێکی عەرەبی؛ ئەوانی تر، لە دوورگەی عەرەبییەوە، بۆسەرێ لەنێوان فلستین هەتا ناوچەکانی ناوخۆی سووریە و هەتا مووسڵ لە باکووری مێزۆپۆتامیا، دەبوو بە وڵاتێکی سەربەخۆی عەرەبی. ئەمە بەتەواوەتی ئەو شتە نەبوو کە بەریتانیەکان چاوەڕێیان دەکرد.٨٩٥

لە ساڵی ١٩١٥دا وردەکاریەکانی ئاڵوگۆڕکردنی بەڵێنیەکان، نەک گرێبەستێکی پتەو، زۆر بایەخیان نەدەدرایە. ڕەنگە باشتر وابێ بڵێین کە هیچ کامێکیان بە باوەڕێکی تەواوەوە وتوێژیان نەدەکرد. کاتێکە حوسەین ئاماژەی بە پیلانە زۆر و بەربڵاوەکانی عەرەب دەکرد کە چاوەڕوانی سیگناڵیکی ئەو بووبێتن زۆر گرنگی بە کاریگەری خۆی دەدا. لە ساڵی ١٩١٥، هەڵوێستێکی ترسێنەرانەی گرتبوە بەر. ئەو ماوەیەکی زۆری لە ژیانی خۆی بە چاوەڕوانی لە کۆنستانتینۆپل تەرخان کردبوو تا عوسمانیەکان پلەی شەریفی بۆ دیاری کەن و ئەو پێشتر بۆی دەرکەوتبوو کە ئەوان کەوتبوونە بیری لەسەر کار لابردنی ئەو.٨٩٦ دەم و دەست لەبەردەمی خۆی، ئەو لەگەڵ ڕکابەرێکی بەهێز لە ئیبنی سەعوود ڕووبەڕوو ببۆوە، کەسێک کە هەمووی عەشیرەتەکانی ناوخۆی لە دەوری یەک کۆکردبۆوە تا بەرەنگاری ئەو ببنەوە. لە ڕوانگەی بەریتانیەکانەوە، ئاشکرا نەبوو کە عەرەبەکان بتوانن ڕاپەڕن، یان ئیمپراتۆری عوسمانی بڕووخێت، یان تەنانەت هاوپەیمانان لە شەڕەکەدا سەرکەون. وەکوو ڕێکەوتنامەی ساکێس-پیکۆت، نامەکانی حوسەین-مەکماهان ڕێگەچارەیەکی کورت-خایەن بوون هەتا بەشێک لە ستراتیژیەکی درێژخایەن. و بەسەر ئەمانەشدا هێشتا بەڵێنیەکی تر لەو چەند ساڵەی شەڕدا ڕاگەیەنرا کە مەبەستی ئەوەبوو کێشە بۆ ئاشتیکەران درووست بکات. ڕاگەیاندنەکەی بالفۆر، ڕاگەیاندن بە جوولەکەکانی جیهان کە ئەوان دەتوانن لە فلستین نیشتمانێکیان هەبێت، لەلایە حکوومەتی بەریتانیەوە بڵاوکرایەوە و لەلایەن فەرەنسەیەکان و دواتریش لەلایەن ئەمریکیەکانەوە پەسەند کرا. ئەو سفتانەی کە لە سەردەمی شەڕدا بەخشراون کۆکردنەوەیان لە کاتی ئاشتیدا

هەروا شتێکی ئاسان نیە بەڵام لە ساڵی ١٩١٦، کاتێکە شۆڕشی عەرەب دەستی پێکرد، بەریتانیەکان بە دیپلۆماسی خۆیانەوە دڵخۆش بوون. لەپرێکدا شەریف خۆی وەک پاشای عەرەب ناساند، هەرچەند بەریتانیەکان ئەویان تەنیا وەک پاشای حەجاز دەناسی. چوار دانە لە کوڕەکانی لەگەڵ تورکەکان شەڕیان کردبوو، بەڵام ئەوەی کە لە هەموان خۆڕاگرتر بوو فەیسەڵ بوو. هاوقەتاری فەیسەڵ ئەفسەرێکی قژ-فڕی چاوشینی پێوەندیەکانی بەریتانیا بوو، کە دواتر وەک لۆرێنسی عەرەبستان ناسیاوتر لە جارانی لێدەرهات.

تویژێنەرێکی ناسیاو و پیاوێکی کرداری، سەرباز و نووسەر، خۆشەویستێکی بەسۆزی هەم ئیمپراتۆری بەریتانی و هەمیش عەرەبی، تی.ئی.لۆرێنس، بە واتای لیۆد جۆرج، "واق وڕێن و لەقیمەت نەهاتوو." ئەو وەک مەتەڵێک ماوەتەوە، ئەفسانە دەورەی داوە، هەندێکیان بنەمایەکی واقیعیان هەیە و هەندێکیشیان درووستکراوی دەستی خۆین. ئەوە ڕاستە کە لە ئاکسفۆرد کەس نەیدەتوانی شان لە شانی بدات، کە ئەو دەکرا ببێ بە شوێنەوارناسێکی گەورە و ئەوە کە ئەو هەتابلێی بەغیرەت و ورەبەرزبوو. ئەوە ڕاست نیە کە گوایە ئەو بۆخۆی شۆڕشی عەرەبی هەڵگیرساندبێت. وەک خۆی دانی پێدا هێناوە کاری گەورەی ئەو، *حەوت کۆڵەکەی زانایی*،ە بەشێکی مێژووە و بەشێکی تری ئەفسانەیە. ئەو بۆخۆی ڕایگەیاندبوو کە وەک عەرەبێک هیچ کێشەیەکی نیە و بەخۆشی ژیان تێپەڕ دەکات بەڵام عەرەبەکان دەیانکوت کە عەرەبیەکەی ئەو پڕ لە هەڵەیە. کاتیکە ڕۆژنامەنووسێکی ئەمریکی ئەوی ناسراو کرد لە ترسان دەلەرزێ، بەڵام ئەو چەندین کەڕەت هات بۆلای ئالبێرت هۆڵ تا گوێ لە وتارەکانی ئەو بگرێت. تووماس دەیگوت " ئەو لە هاندانی ڕای جەماوەردا بەهرەیەکی تایبەتی هەبوو." کاتێکە هەڵیدەبژارد، هەتابڵێ سەرنجڕاکێش و لەدڵەوەنزیک بوو. لەسەرتاسەری جیهان لە هەموو چین و توێژێکدا دۆست و هاوڕێی هەبوو، لە عەرەبە دەشتەکیەکانەوە بگرە تا دەگاتە ئی.ئم فۆرستیر. لەگەڵ ئەوانەشدا زۆر قسە لەڕوو بوو. کاتێکە دراوسێیەکی لەسەر سفرەی نانی شەوێدا لە سەردەمی کۆڕی ئاشتی بەترسەوە پێی گوتبوو " لەوە دەترسم وتوێژەکەی من نەتوانێت زۆر سەرنجی تۆ ڕابکێشێت،" لۆرێنس لەولامدا وتبووی " ئەو وتوێژە لای من هەر سەرنجڕاکێش نیە."٨٩٧

لە *حەوت کۆڵەکەی زانیاریدا*، وەسفی یەکەمین دانیشتنی لۆرێنس لەگەڵ فەیسەڵ داستانێکی هەیە: " من لە یەکەمین نیگادا وا هەستم کرد کە ئەمە ئەو کابرایەیە کە من لە عەرەبستان لەدووی دەگەڕێم- ڕێبەرێک کە شۆڕشی عەرەب بە ئەنجامی پیرۆزی خۆی دەگەیەنێت." لەوکاتەدا باری مرۆڤدۆستی فەیسەڵی هاتەبەرچاو: " ئەو خۆبەزلزان، نەحەواوە و تووڕەبوو، هەندێک جار ئەقڵی لە

دەست دەدا، و زۆر بەئاسانی سنوورەکانی دەبەزاند. لە براکانی دڵرفێن تر بوو، بەڵام دووربینی کەمتری هەبوو. ئاشکرابوو کە زۆر زیرەکە، بەڵام زۆر ووردبین نەبوو."٨٩٨

ئەو دوایەمین تایبەتمەندیە لۆرێنیشی دەگرتەوە. لای فەیسەڵ ئەو هەڵگری بۆچوونی چوونە سەر تەخت لە وڵاتێکی سووری سەربەخۆدا بوو، بۆچوونێک کە لوبنانیشی دەگرتەوە، و لە گرنگبوونی بەڵێنیەکانی تر کە بەریتانیەکان بە فەرەنسەیەکان و بە جوولەکەکانیان دابوو کەمی دەکردەوە. ئەو دڵنیابوو لەوە کە هێزەکانی فەیسەڵ بۆ داگیرکردنی دەمێشق پارەیان وەرگرتبوو، هەرچەند ئوسترالیایەکان زۆریان لا سەخت بوو چون لەڕاستیدا ئەوان کارەکەیان کردبوو. فەیسەڵ وەک بەڕێوەبەری سەرەکی سووریە داندرا. لۆرێنس هەرهەمووی ئەمانەی لەپێناو عەرەبەکان و لەپێناو بەریتانیەکاندا کرد. ئەو بۆخۆشی نەیدەزانی کە کامیان لای ئەو گرنگیان زیاترە. هەندێک جار ئەو وەک "ئێمە" باسی عەرەبەکانی دەکرد و وەک " ئێوە" باسی بەریتانیەکانی دەکرد. وەکوو لایەنگرانی تری عەرەب، ئەو هیواداربوو کە عەرەبەکان بەخۆشحاڵی و بە ئارەزووی خۆیان لەژێر چاودێری و کۆنترۆڵی بەریتانیەکان خود-موختاریەکی بەرتەسک هەڵبژێرن. ئەو بە لیژنەی ڕۆژهەڵاتی کۆرزۆن ڕاگەیاند کە خود-موختاری " لە زۆر لاوە بۆچوونێکی شێتانەیە. دەکرێ ڕێگا بە کەسانێک بدەین کە هاوڕێ لەگەڵ ئێمە شەڕیان کردوە بۆ ئەوەی کە دەسەڵاتیان بەسەر خۆیانەوە هەبێت." پێداویستیەکانی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا بەم چەشنە بە ڕێک و پێکی لەگەڵ ناسیۆنالیزمی عەرەب پێکەوە گرێ دەخۆن- و ئەو مەجبوور نابێت لەنێوان ئەو دوانەدا یەکیان هەڵبژێرێت.٨٩٩

فەرەنسەیەکان لۆرێنسیان وەک " جندۆکە"ی فەیسەڵ ناودەبرد کەسێک کە توانیبوو عەرەبە بێ دەم و زمانەکان دژ بە ئەوان ڕاپەڕێنێت. کاتێکە لە مانگی نوامری ساڵی ١٩١٨دا لۆرێنس هاوڕێ لەگەڵ فەیسەڵ گەیشتنە مارسیلی، وەک کۆلۆنێلێکی فەرەنسەیی لە نەفرەتدا ئاماژەی پێکردبوو، " جل و بەرگی زۆر سەیری ڕۆژهەڵاتی خۆی" کردبوە بەر، ئەوان بە ئەویان ڕاگەیاند کە تەنیا وەک ئەفسەرێکی بەریتانی بەخێرهاتن لە ئەو کرا. لۆرێنس بەتووڕەیەوە فەرەنسەی چۆڵ کرد، بەڵام هەر بە بەرگی عەرەبیەوە بۆ دەسپێکردنی کۆڕی ئاشتی سەری هەڵهێنایەوە. هاوکات کە بەریتانیەکان و ئەمریکیەکان ئاهەنگیان بۆ دەگێڕا، فەرەنسەیەکان لەبابەت ڕق و قینی پەسەندنەکراوی ئەو لە وڵاتەکەی ئەوان هەر بۆڵەبۆڵیان بوو. دەیانکوت کە ئەو کرۆئیکس دی گۆری خۆی بردوە و لەسەر بەرۆکی سەگێک ئاهەنگسازی بۆکردوە. کلیمینجوو، کە هیواداربوو لەسەر سووریە تووشی شەڕ لەگەڵ بەریتانیا نەیەت، ڕازی بوو کە چاوی بە ئەو بکەوێت. ئەو وەبیری لۆرێنسی هێنایەوە کە

فەڕەنسەیەکان لە هێرشەکانی خاچپەرستاندا لەوێ شەڕیان کردبوو. لۆرێنس لە وڵامدا وتی کە " بەڵێ بەڵام خاچپەرستان شکستیان خواردبوو و هێرشەکانی خاچپەرستان سەریان نەگرتبوو."٩٠٠

فەڕەنسەیەکان، کە لەوە دەترسان بەریتانیەکان فەیسەڵ بەکاربێنن بۆ لاوازکردنی پەروەندەکەی خۆیان بۆ سووریە (بە واتەی دیپلۆماتێکی فەڕەنسەیی " ئیمپریالیزمی بەریتانی لەگەڵ دەسرەوکڵاوی عەرەبی")، هەرگیز نەیاندەویست ئەو یان لۆرێنس لە فەڕەنسە ببینن و ئەگەر بەوەختی خۆی بینانزانیایە ئەوانیان لە بەیرووت بەربەست دەکرد. بەڵام ئەوان لەوە دەترسان فەیسەڵ لە مارسیلی دوورخەنەوە؛ هەمیشە بە کەمیش بووبێت هەست بەوەدەکرا کە ئەو لەوانەیە ڕۆژێک لە بەریتانیەکان داببڕێت. فەیسەڵ بەدروستی پێشوازی لێکرا بەڵام پێشوازیەکی سارد و ئاگادار کرایەوە کە ئەو هیچ پێگەیەکی فەرمی نیە و ئەوە کە لە پێکهێنانی ئەم سەفەرەدا زۆر بە خراپی ڕاوێژی لەگەڵ کراوبوو. ئەویان بە بیانووی سەردانی چەند گۆڕەپانێکی جەنگی بۆ ماوەیەک لە پاریس دوورخستەوە و تەنیا کاتێکە ئەو هەرەشەی ڕۆیشتنی کرد ڕێگەی دانیشتنێکی ڕەسمی لەگەڵ پۆینکارێی پێدرا. هاوڕێ لەگەڵ ئەوە فەڕەنسەیەکان لێژیۆن دی ئانێریان[ گرووپێکی سەربازی] بڵاوکردەوە، کە فەیسەڵ، بەپێی چارەنووس، لە ژەنەڕاڵ هێنری گۆراود وەریگرت، کەسێک کە دواتر ئەوی لە سووریە لەسەر تەخت لابرد.٩٠١

کاتێکە فەیسەڵ گەیشتە لەندەن پێشوازیەکی گەرمی لێکرا بەڵام هەندێک شەپۆلی بن گۆم ئەویان ناسەقامگیر و نیگەران دەکرد. بەریتانیەکان پێشنیاریان پێکرد کە ڕەنگە باشتر وابێت ئەو دەسەڵاتداریتی فەڕەنسەیەکان لە سووریە قەبووڵ بکات. بێجگە لەوە داوایان لێکرد کە ڕازی بێ بەوە کە فلستین بەشێک لە سووریە نەبێت، ئەوجۆرەی کە عەرەبەکان داوایان دەکرد، و لەگەڵ چایم ویزمان، ڕێبەری ڕێکخراوەی جیهانی زایۆنیست، ڕێکەوتنامەیەک واژۆ بکات و ئامادەبوونی زایۆنیست لەوێ بە فەرمی بناسێت. فەیسەڵ لە جیهانێکی نامۆدا هەستی بە تەنیایی دەکرد و سەری لێ شێوابوو. ئەو لەبەرانبەر دوژمنایەتی فەڕەنسەیەکاندا پێویستی بە پاڵپشتی بەریتانیەکان بوو. ئەو لە سەرەتای مانگی ژانویەدا واژۆی کرد؛ یاسایی بوونی ئەو بەڵگەیە، وەکوو زۆربەی ئەو بەڵگانەی کە پێوەندیان بە ڕۆژهەڵاتی ناڤینەوە هەیە، لەو کاتەوە هەر قرەی لەسەرە.٩٠٢

کاتیکە کۆڕی ئاشتی دەستی بە کارەکانی خۆی کرد، فەڕەنسەیەکان هەوڵیان دا لەنێوان فەیسەڵ و بەریتانیەکاندا پوازێک داتاشن. ناوی ئەو لە لیستەی نوێنەرانی فەرمی قرتێندرا. کاتێکە فەیسەڵ کەوتە گلە و گازندەکردن، مەقامێکی ڕەسمی وەزارەتی دەرەوەی فەڕانسە بەڕاشکاوی پێی وت: "تێگەیشتنی زۆر ئاسانە. تۆ بەڕاشکاوی کەوتوویەتە بەر گاڵتە و

جەفەنگ: بەریتانیەکان سەریان شۆڕ کردووی. ئەگەر بتوانی خۆت لەگەڵ ئێمە ڕێکخەی ئەوا ئاسانکاریت بۆ دەکەین." دوائەوەکە بەریتانیەکان دەنگی ناڕەزایەتیان بەرزبۆوە، فەڕەنسەیەکان بەنابەدڵیەوە ڕێگەیان بە فەیسەڵ دا تا وەک نوێنەرێکی ڕەسمی بەشداری بکات، بەڵام تەنیا وەک نوێنەری باوکی خۆی لە حێجاز. لۆرێنس هەمیشە وەک ئیسکۆرت، وەرگێڕ و، چون فەیسەڵ لە دایرەی دەرەوە سوبسیدی وەردەگرت، مەئمووری بەخشینی پارە لەگەڵی بوو. چاپەمەنیەکانی فەڕەنسە وەک ئالقەلەگوێی بەریتانیەکان کەوتنە کوتانی سەروسەکتی فەیسەڵ؛ سیخۆرانی فەڕەنسەیی نامەکانی ئەویان دەکردەوە و تێلیگرامەکانی ئەویان بۆ ڕۆژهەڵاتی ناڤین دەگەڕاندەوە. هاوڕێ لەگەڵ ئەوە لە مناوەرەیەکی کۆتایی سەرنەگرتوودا، کوای دی ئۆرسای لێژنەی ناوەندی سووریەی تێر و تەسەل کردبوو، لێژنەیەک کە بانگەشەی دەکرد کە بۆ خەڵکانی سووریە لە سەرتاسەری جیهان قسە دەکات و، دەوترا، بەدوای وڵاتێکی سووری گەورەترەوەیە، وەکوو لوبنان، لەژێر چاوەدێری فەڕەنسەیەکاندا. مەبەستی سەرەکی ئەوە بوو کە ناسیۆنالیستەکانی عەرەب لە فەڕەنسەیەکان زیاتر گوماناوی بکات.٩٠٣

لە ٦ی مانگی فەوریەدا، شاندی نوێنەرایەتیەک کە لە حەجازەوە هاتبوو لە ئاکامدا دەرفەتێکی گیر کەوت تا وتارێک پێشکەش بە شۆڕای عالی بکات. فەیسەڵ، بە بەرگی سپی ڕەنگی ڕۆبی کە بە تەڵا ڕازابۆوە، بە شمشێرێک بە نێوقەدەوە، بە عەرەبی قسەی دەکرد و هاوکاتیش لۆرێنس وەریدەگێڕایەوە. دەنگۆی ئەوە هەبوو کە فەیسەڵ تەنیا بە دەنگی بەرز قورئانی دەخوێندەوە و هاوکات لۆرێنس لەبەر دەیخوێندەوە. فەیسەڵ وتی کە عەرەبەکان بەدوای خودموختاریەوەن. ئەو ئامادە بوو ڕێز لە هەڵاواردنی لوبنان و فلستین بگرێت بەڵام پاشماوەی وڵاتانی جیهانی عەرەب بەڕای ئەو دەبێ سەربەخۆیی تایبەت بەخۆیان هەبێت. ئەو داوای لە بەریتانیا و فەڕەنسە کرد تا لەسەر قەول و بەڵێنیەکانی خۆیان بمێنن. هاوکات کە لیۆد جۆرج بۆ نیشاندانی ئەو یارمەتیەی کە عەرەبەکان بۆ سەرکەوتنی هاوپەیمانان دابوویان چەند پرسیارێکی داڕێژراوی ئاراستە کرد، ویلسۆن تەنیا ئەو پرسیارەی کرد کە عەرەبەکان پێیان باشە بەشێک لە ماندێتێک بن یان چەن دانە. فەیسەڵ لە وڵامدانەوە بە پرسیارێکی دژوار خۆی بوارد و جەختی لەسەر ئەوەکردەوە کە عەرەبەکان یەکەمایەتیان بە سەربەخۆیی و یەکگرتووی داوە. ئەو لە قسەکانیدا ئاماژەی بەوەدەکرد کە ئەگەر زلهێزان لەسەر ماندێتەکان بڕیاریان داوە، ئەوا، خەڵکانی وڵاتی ئەو ئەمریکیەکان لە هەموو کەس بە باشتر دەزانن. کاتێکە فەیسەڵ، لەگەڵ لۆرێنس، ویلسۆنیان بانگێشت کرد و بەنهێنی وتوێژیان لەگەڵ کرد، ئەویان ڕادەرنەبڕ و بێ لایەن هاتەبەرچاو، هەرچەند چەندین ساڵ دواتر، کاتێکە بارودۆخ لە بەرژەوەندی

فەیسەڵدا نەگەڕابوو ، ئەو جەختی دەکردەوە کە ویلسۆن بەڵێنی دابوو، ئەگەر سووریە لەڕاستیدا سەربەخۆیی خۆی دامەزراندایە، وڵاتەیەکگرتووەکان پارێزگاری لێدەکرد.١٠٤

وەزیری دەرەوەی فەڕەنسە هەوڵی دا فەیسەڵ بخاتە حەچەڵەوە. چاودێرێکی بەریتانی لەڕووی کین و بوغزەوە لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە" پیچۆن لەبێ ئەقڵی خۆیدا پرسیاری کرد کە فەڕەنسە بۆ یارمەتی ئەو چی کردبوو." لەپڕێکدا فەیسەڵ کەوتە هەڵکوتان بە سەروگوێی فەڕەنسەدا و هاوکات ئاماژەی بە بڕێکی کەم یارمەتی کرد کە فەڕەنسە ناردبوو. " ئەو بەشێوازێک باسی ئەوەی کرد کە کەس نەیدەتوانی دژی بوەستێت و هەڵبەت پیچۆن وەکوو جاران تەواو خۆی گەوج کردبوو."چەند ڕۆژ دواتر فەڕەنسەیەکان بۆ هێرشەکە گەڕانەوە، عەرەبگەلێکیان درووست کرد کە بانگەشەیان دەکرد کە خەڵکی ئەوان، چ مەسیحی چ مسوڵمان لە یارمەتی فەڕەنسەیەکان زیاتر خوازیاری شتێکی تر نین. بەداخەوە، کاتێکە وتەبێژیکی ڕیش-سپی بەناوی لێژنەی ناوەندی سووریە دەستی بە ڕاگەیاندنی وتارێکی دووکاتەژمێری خۆی کرد، پسپۆڕێکی ئەمریکی پەیامێکی خستە بەردەمی ویلسۆن کە ئاماژەی بەوەدەکرد ویلسۆن سی و پێنج ساڵی پێشووی لە فەڕەنسە ڕابواردوە. ویلسۆن دەستی لەگوێ ڕاگرتن هەڵگرت و لەناو ژوورەکەدا دەهات و دەچوو. کلیمینجوو بەتووڕەیەوە بەگوێی پیچۆنی سرکاند: "ئەمە بوا دەکا لەخۆی؟" پیچۆن سەری هێنا پێشەوە و لە وڵامدا وتی" ئەرێ من چووزانم کابرا ئاودەکا لەخۆی." بۆچوونی خودی کلیمینجوو ئاوابوو کە داواکاریەکانی فەیسەڵ هەتابڵێی لەڕادەبەدەر و ناواقیعی بوون، بەڵام ئەو هێشتا هیواداربوو کە نەکا بەشێوەیەکی ئاشکرا و ڕاستەوخۆ بەرەنگاری بەریتانیەکان بێتەوە، بەتایبەت چون وتوێژەکانی تایبەت بە ئەو مەرجانەی کە بە ئەڵمانیا پێشنیار کرابوون خەریک بوون دەگەیشتنە قۆناخێکی توند و هەستیار.١٠٥

هاوڕێ لەگەڵ ئەوانە فەڕەنسەیەکان شاندێکیان هێنابوە ناوەوە کە داوای لوبنانێکی سەربەخۆ لەژێر چاوەدێری فەڕەنسەی دەکرد و بە گۆرانی پێیاندا هەڵدەکوت. ڕێبەری ئەو شاندە وتبووی" پرەنسیپ و ڕێبازەکانی لیبڕاڵی ئەو، داب و نەریتە بەنرخەکانی ئەو، ئەو بەرژەوەندیە نەپسانەوانەی کە لوبنان لە ساتە سەختەکاندا لە ئەوی وەردگەرت، ئەو شارستانیەتی کە بەگشتی بڵاوی دەکردەوە ئەوی لەبەر چاوانی دانیشتوانی لوبنان بەرجەستە کردبوو." لەڕووی مێژووییەوە فەڕەنسە پاریزەری کۆمەڵانی مەسیحی لە سەرتاسەری ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی بوو بەڵام پێوەندی نزیک و تایبەتی لەگەڵ مارۆنایتەکان هەبوو، کەسانێک کە پێدەچوو لە وڵاتی سرووشتی دەوروبەری کێوی لوبنان زۆرینەیان بەدەست بووبێت. لە ساڵی ١٨٦١دا فەڕەنسە عوسمانیەکانی بەهێز کردبوو تا پارێزگارێکی سەربەخۆ لەوێ دامەزرێنێت. مارونایتەکان شان بە شانی خاچپەرستانی فەڕەنسەیی شەڕیان کردبوو؛

ئەوان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد، بەشێوەیەکی زەحمەت، کە لەگەڵ چارلێماگنیَ پێوەندی بنەماڵەیان بووبێت؛ وەکوو کاتۆلیکەکانی فەڕەنسەیی، ئەوان زیاتر چاویان لە پاپی ڕۆم بوو هەتا سەرۆکی ئۆرتۆدۆکس لە کۆنستانتینۆپل؛ و، ڕەنگە لەهەمووی گرنگتر، ئەوان ئەوەندەی خودی فەڕەنسەیەکان بە شان و شکۆی کلتووری فەڕەنسەییاندا هەڵدەکوت. کاتێکە ڕێبەرانی مارۆنایت پلانی لوبنانێکی گەورەتریان ڕشت، کە دۆڵی بێکا و زۆربەی کەنارئاوەکانی تریپۆلی تا سیدۆنی، هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە مسوڵمانانی لەخۆدەگرت، فەڕەنسە هاوسۆزی خۆی دەربڕی.٩٠٦

هەرچەند کلیمینجوو بۆخۆی لە کۆڕی ئاشتیدا بەگشتی بە خەمی ئاسایشی فەڕەنسەوە لە ئورووپا بوو، ئەو نەیدەتوانی بەتەواوەتی واز لە لۆبی کۆلۆنی خۆی بهێنێت. ئەو بە کێر، یاریدەدەری لیۆد جۆرج،ی ڕاگەیاندبوو کە ئەو " بۆخۆی بەتایبەت نیگەرانی ڕۆژهەڵاتی نزیک نەبوو. هەرجۆرێک بێت فەڕەنسە هەمیشە ڕۆڵی گەورەی لەویَ گێڕابوو، و لەڕوانگەی ئابوورییەوە دانووستانێک کە دەرفەتی ئابووری بە فەڕەنسە دەبەخشی زۆر پێویست بوو، بەتایبەت لەو هەل و مەرجە ماڵییەی ئەو دەمەیاندا. ئەو لەدرێژەی قسەکانیدا وتی کە ڕای گشتی فەڕەنسەیەکان چاوەڕوانی دانوستانێکی دەکرد کە لەگەڵ پێگەی فەڕەنسەدا هاوئاهەنگ بێت. ئەو وتی کە ئەو ناتوانیَ هەر دانووستانێک کە لەگەڵ ئەم دۆخەدا ناخوێنێت قەبووڵ بکات." هەروەک لە وتوێژێکی ناسراوی پڕ لە مشت و مڕ و بەرەبەرەکانێدا لە مانگی دیسامری ساڵی ١٩١٨دا ئەو نیشانی دابوو، ئەو ئامادەبوو تا لەپێناو دڵڕاگرتنی بەریتانیەکان ڕێگایەکی دووروودرێژ بڕوات؛ ئەو نەیدەتوانی لە ڕۆژهەڵاتی ناقین هەمووشتێکیان پیَ ببەخشێت.٩٠٧

لە چاپەمەنیەکانی بازەرگانی ئۆرژانسی بەرلەوەی ویلسۆن لە ١٤ی مانگی ژانویەدا بۆ سەردانێکی کورت بگەڕێتەوە بۆ وڵات، سەبارەت بە ناوچەکانی عەرەبنشین هیچ بڕیارێک ڕانەگەیەنرابوو و کێشەکە بەرەو ئاڵۆزی دەچوو. سەرچاوەی سەرەکی کێشەکە لەوەدا بوو کە بەریتانیەکان هێشتا بڕیاری خۆیان لەسەر ئەوە ساخ نەکردبۆوە کە بەدوای چیەوە بوون. ئایا دەبیَ دەست هەڵگرن و بە فەڕەنسەیەکان ڕێگە بدەن خاوەنی سووریە بن، ئەوجۆرەی لە سایکێس-پیکۆت بەڵێنیان دابوو و ئەوجۆرەی دایرەی دەرەوە بە باشی دەزانی؟ لیژنەی ڕۆژهەڵاتی کۆرزۆن و هێزی میلیتاری بەپەلە ئاماژەیان بەو مەترسیانە کرد کە ئەگەر بێت و فەرنسە لە کۆنترۆلکردنی کەرتێک لە ناوچەی تورکیەی پێشوو لە ئەرمەنستانەوە لە باکوور هەتا سنوورەکانی فلستین لە باشوور دەستی هەڵگرتبایە. دواتر کەسانێک هەبوون، وەکوو خودی لۆرێنس، کە هەستیان دەکرد بەریتانیەکان سەبارەت بە عەرەبەکان و بەتایبەت بە فەیسەڵ ئەرکێکیان لەسەر شانە و بەوپێیە نەیاندەتوانی

هەڤاڵاناسان بۆ فەڕەنسەیەکانی بەجێ بێڵن. لیۆد جۆرج حەزی دەکرد ڕازیبوونی خۆی نیشان بدات؛ هەروەک بە شاندی نوێنەرایەتی بەریتانی ڕاگەیاند، " ئێمە ناتوانین بۆ جارێکی تر ڕووبەڕووی ڕۆژهەڵات بینەوە ئەگەر پشت لە باوەڕی خۆمان بکەین."تەنیا کاتێک سووریەی بە فەڕەنسە دەبەخشی ئەگەر هیچ ڕێگەچارەیەکی تری لەبەردەست نەبوایە. بەواتایەکی تر، ئەو لەڕاستیدا نەیدەویست فەڕەنسەیەکان بتارێنێت. وەکوو بابەتەکانی تر، لیۆد جۆرج هەوڵ ئەدا هەڵبژاردەکانی خۆی ئاشکرا بکات. ئەو پاشەکشێکردنی هێزە داگیرکەرەکانی بەریتانی لە سووریە وەدرەنگ دەخست، بەم چەشنە فەڕەنسەیەکانی هان دەدا، ئەگەر پێویستیان بە هاندان هەبوایە، کە بەریتانیەکان بۆ ئەوەنابێ متمانەیان پێ بکەیت. وەک بالفۆر کە گلەیی کردبوو:

ئێمە بەهۆی باسەکەوە بەگشتی کەوتووینەتە زەلکاوێکی سەیرەوە، بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ ناماقووڵی فەڕەنسەیەکان، بەشێکی بۆ هەڵوێستێکی لەبنەڕەت هەڵەی ئێمە بەپێداگری کردن لەسەر داگیرکاری نیزامی وڵاتێک گرتوومانەتە بەر کە لە هیچ حاڵەتێکدا بۆخۆمان حازرنین وەئەستۆی بگرین، کەچی کەسانێک کە دەزانین لە ئاست ئەو کارە دێن دەیانبوێرین، و بەشێکی بۆ تایبەتمەندی ئاڵۆز و ناتەبای ئەو سەرشلووقیە جەماوەرانەی کە بۆخۆمان دۆزیوەتەوە.٩٠٨

هاوکات کە ویلسۆن دوورکەوتبۆوە، بەریتانیەکان پیلانی جۆراوجۆریان دەهێنا و دەبرد، هەرهەموویان بۆ فەڕەنسە هیچیان نەدەهێشتەوە وەکوو گرێبەستی سایکێس-پیکۆت کە هیچیان بۆ نەماوە. لیۆد جۆرج کلیمینجووی هان دا تا فەیسەڵ وەک دەسەڵاتداری سووریە پەسەند بکات و هەڕەشەی لێکرد کە ئەگەر وانەکات، لەوانەیە شەڕێک لە سووریە هەڵگیرسێت. بەریتانیەکان لە فەڕەنسەیەکان زیاتر ڕقیان هەستا کاتێکە پلانێکیان بۆ دانانی دووبارەی سنوورەکانی فلستین دارشت، پلانێک کە ئەوجۆرەی فەڕەنسەیەکان گلەییان دەکرد، نزیک بە یەک سێهەمی ناوچەکانی سووریەی لە باشوور دەگرت. باڵوێزی بەریتانی لە پاریس وتی کە " ئەگەر ئێمە لەباتی هاوپەیمان دوژمن بووینایە ئەو پەیامانەی کە لەلایەن حکوومەتی فەڕەنسەوە دەهاتن ئەستەم بوو لەوە خراپتر بوونایە."

لۆرد میلنێر، ئەمینداری کۆلۆنی بەریتانی کە بەرپرسایەتی کێشەی سووریەی پێ سپێردرابوو، گەیشتە پاریس تا فەڕەنسەیەکان لەوە دڵنیا بکاتەوە کە " ئێمە داوای سووریا ناکەین و بچووکترین ڕەخنەمان لە هەبوونی فەڕەنسەیەکان لەوێ نەبوە." ئەو تەنانەت کلیمینجووشی هاندا، هاوڕێیەکی دێرین، تا چاوی بە فەیسەڵ بکەوێت و بزانێت ئایا ئەوان دەتوانن ڕێگەچارەیەک بدۆزنەوە. بەداخەوە، هەواڵی هەوڵی ترۆری کلیمینجوو لە ١٩ی مانگی فەوریەدا گەیشت، بەرلەوەی کە دانیشتنەکە دەست پێبکات. میلێر، کە بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە نایەوێت کلیمینجوو ئازار بدات، هەرگیز درێژەی نەدایە؛

کلیمنیجوو هیچ کارێکی بە میلنێر نەبوو. چەند حەفتە دواتر، لیۆد جۆرج وادیار بوو کە بۆ سایکێس-پیکۆت گەڕابۆوە، بەڵام سێ ڕۆژ دواتر ئەو نەخشەیەکی تری دانابوو کە لوبنان و بەندەری ئەلێساندریتای لە باکوور بۆ فەڕەنسە و سووریەی سەربەخۆ لەژێر دەسەڵاتی فەیسەڵدا بەجێ دەهێشت. کلیمینجوو گلەییەکی چاکی لای هاوس کردبوو کە گوایە لیۆد جۆرج هەمیشە پەیمان و بەڵێنیەکانی خۆی دەشکێنێت. حکوومەتی فەڕەنسەیی لەلایەن کۆلۆنیالیستەکانی فەڕەنسەیی لەژێر گوشارێکی قورسدا بوو؛ تەنانەت کوای دی کۆرسایش خەریکی ڕاپەڕاندنی کەمپەینێکی چاپەمەنی بۆ داواکردنی ماندێتی سووریە بوو. کلیمینجوو پۆینکارەی دڵنیا کردبۆوە کە " لەمە بەدواوە هیچ شتیک نابوێرم. لیۆد جۆرج دۆدەیە. ئەو وای خەیاڵە من بکاتە مرۆڤێکی "سووری""٩٠٩.

لە ٢٠ی مانگی مارسدا، بە گەڕانەوەی ویلسۆن بۆ پاریس، پیچۆن و لیۆد جۆرج لە شۆڕای چوار یاردا بۆ جارێکی تر بەسەر تەواوی مێژوودا چوونەوە. دوابەدوای ئەوە، ساکێس-پیکۆت وەکوو جۆرێک چایی دەچوو؛ " وێنەیەکی باش لە دیپلۆماسی کۆن." لەو کاتە ساکێس بۆخۆی کۆچی دوایی کردبوو، پەتایەکی گرتبوو و گیانی لەدەست دابوو، و پیکۆت لە بەیرووت بوو، ئازایانە هەوڵی دابوو لەبەرانبەر بەڕێوەبەرایەتی میلیتاری بەریتانیای دوژمن لە بەرژەوەندیەکانی وڵاتی خۆی پارێزگاری بکات. ئالێنبای، کە لە دەمێشقەوە بۆ پاریس بانگێشت کرابوو، هەڕەشەی کردبوو کە عەرەبەکان بەتوندی لەبەرانبەر داگیرکاری فەڕەنسەیەکاندا دەوەستن. ویلسۆن هەوڵی پەیاکردنی سازشێکی دابوو. بەگشتی، وەک خۆی ئاماژەی پێکردبوو، بەرژەوەندی ئەو تەنیا لە ئاشتیدا بوو. بۆ نابێ لێکۆڵینەوەیەکی چڕوپڕ لەسەر داخوازیەکانی عەرەبەکان بکرێت؟ ئەو دەیکوت کۆڕی ئاشتی بەکەڵک وەرگرتن لە فۆرموولێکی گونجاو " بۆ بەستنی ڕێکەوتنامەیەک باشتری بنەمای زانستی دادەنێت." بۆ ئازاردانی بەریتانیەکان، کلیمینجوو بەشێوەیەکی زیرەکانی پێشنیاری کرد کە کۆمیسیۆن سەیری مێزۆپۆتامیا و فلستینیش بکات. بە کەمتەرخەمیەک کە لۆبی کۆلۆنی فەڕەنسەیی دەهری کردبوو، ئەو بە پۆینکارەی ڕاگەیاند کە ئەو تەنیا بۆ ئەوە کە بۆ ویلسۆن چاکەیەکی کردبێت لەگەڵ کۆمیسیۆن ڕێکەوتوە و ئەوەکە، لە هەرحاڵدا، کۆمیساریەکان لە یارمەتیدانی فەڕەنسەیەکان لە سووریە " شوێنێکە ئێمە داب و نەریتی ٢٠٠ساڵەمان لەوێ هەیە." هیچ کارێکی تریان لە دەست نایەت. سەرەک کۆماری فەڕەنسە حەپەسابوو. وەک لە یاداشتەکەی خۆیدا گێڕاویەتەوە" کلیمینجوو پیاوێکی تووش و ڕوو لە کارەساتە؛ ئەگەر نەتوانێ بەرگریان لێ بکات، لەوانەیە دنەیان بدات." لیۆد جۆرج لەگەڵ کۆمیسیۆن ڕێکەوتبوو، بەڵام بەشێوەیەکی نهێنی وەک بیرۆکەیەکی ترسێنەر ناوی لێبردبوو، و کلیمنجووش هەروای کردبوو. کاتێکە دەبوایە نوێنەرەکانی

خۆیان دەستنیشان بکردایە هەردووکیان خۆیان دەدزیەوە و خۆیان نەدەدا بە دەستەوە، لە ئاکامی ئەوەدا ویلسۆن ڕقی هەستا و لە مانگی مەیدا بڕیاری دا تا یەکلایەنە بچێتە پێشێ و کۆمیسارییاکانی خۆی بۆ ڕۆژهەڵاتی ناڤین بنێرێت.٩١٠.

کاتێکە فەیسەڵ هەواڵە سەرەتایەکانی پێگەیشت کە گوایە بڕیار وایە کۆمیسیۆنیک دابین بکرێت، بۆ یەکەم جار لەماوەی ژیانیدا شامپاینی خواردەوە. ئەو دڵنیا بوو، وەکوو لۆرێنسی لەهەمووشوێن حازر، کە ئەوە جەخت لە سەربەخۆیی سووریە لەژێر دەسەڵاتی ئەودا دەکاتەوە. ئەو چەند مانگەی کە لە پاریس تێپەڕین بۆ هەردووکیان تاقەتپڕووکێن و ماندووکەر بوون. هەڵفرینێک بەسەر شاردا شەکەتی و ماندوویەتی هەرکیانی دەرکرد. فەیسەڵ یەک بەخۆی هاواری کرد" جاوەرە بۆمبێک لەگۆڕێدا نەبێت تا بیدەی بەسەری ئەم خەڵکەدا. قەیناکە خۆ سەرین و باڵنج هەردەبێ."لۆرێنس زۆر گۆڕابوو، شۆخی و گاڵتەی زۆر سەیری دەکرد وەکوو ئێوارەیەکیان پارچەیەک کاغەزی دەستبەئاوی لە سەرووی پلیکانەکانەوە حەوادا خواریێ و دای بە سەروو چاوی لیۆد جۆرج و بالفۆردا. لە مانگی ئاڤریلدا، فەیسەڵ و کلیمینجوو کۆبوونەوەیەکی دووردرێژیان پێکەوە بەڕێوەبرد، کە تێیدا ئەوان باسیان لە ئامادەکردنی پلانێکی تر کرد بۆ شێوەیەکی نەرم و نیانتری ماندێتی فەڕەنسەیی، کە لەلایەن پسپۆڕانی بەریتانی و ئەمریکیەوە داڕێژرابوو. کلیمنجوو فەیسەڵی ماقوولتر و گەرم و گوڕتر لەجاران هاتە بەرچاو و لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە فەیسەڵ مەرجەکانی پەسەند کردبوو. لەڕاستیدا، فەیسەڵ لەسەر پێشنیاری لۆرێنس هەر دەمەدەمەی دەکرد. هەتا مانگی مەی، کاتێکە بەتەواوی ئاشکرابوو کە هیچ ڕێکەوتنێک و هیچ کۆمیسیۆنێکی لێکۆڵینەوەی سوورلەسەرمەبەستی هاوپەیمانی لە ئارادا نیە، فەیسەڵ بە سلامەتی بۆ دەمێشق گەڕایەوە.٩١١

لە پاریس دەمەتەقێی نێوان بەریتانیا و فەڕەنسە هەر درێژەی هەبوو، تا لە ئاکامدا لە ٢١ی مانگی مەیدا، لەنێوان کلیمینجوو و لیۆد جۆرج لەسەر ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی بەگشتی دیمەنێکی ئالۆزی لێکەوتەوە. کلیمینجوو ئاماژەی بەوە کردبوو کە فەڕەنسە لەسەر یەکگرتنەوەی سیلیسیا لەگەڵ ماندێتیکی ئەرمەنی لەژێر دەسەڵاتی وڵاتەیەکگرتووەکاندا ڕێکەوتبوو. ئەو وەبیری لیۆد جۆرجی هێنابۆوە کە ئەو مانگی دیسامری پێشوو وازی لە موسڵ هێنابوو. " بەم شێوەیە من وازم لە هوسڵ و سیلیسیا هێناوە؛ من بەبێ ترس و دوودڵی دانم بەو زێدەمافانەدا هێناوە کە ئێوە داواتان لێکردووم، چون ئێوە بە منتان وت کە، لەوەبەولاوە، هیچ کێشەیەک نامێنێتەوە. بەڵام ئەوەی کە ئێوە ئەمڕۆکە پێشنیاری دەکەن من قەبووڵی ناکەم؛ حکوومەتی من ڕۆژی دوایی دەڕووخێت، و تەنانەت

من بۆخۆشم دژی ئەو حکوومەتە دەنگ دەدەم." کلیمینجوو لەسەر پێشنیاری موسڵ هەڕەشەی گەڕانەوەی کرد. ئەوە لەبەردەمی کۆڕی ئاشتیدا نە تەنیا پرسیاری موسڵ بەڵکوو سەرتاسەری ناوچەیەکی درووست دەکرد کە لە باشوورەوە هەتا کەنداوی فارسی دەگرتەوە، ئەمڕۆکە بە ئێراق ناسراوە، کێشەیەک کە بەریتانیەکان لەم قۆناغەدا خۆیان لێدەبوارد.٩١٢

* * * *

مێزۆپۆتامیا- دەستەواژەیەک کە بەریتانیەکان بە شل و ولی بۆ پارێزگاکانی عوسمانی موسڵ، بەغدا و بەسرا بەکاریان دەهێنا- وەک ماندێتێک نەبێ کە دەبوو، بەبۆچوونی هەمووکەس، لەلایەن بەریتانیاوە ڕاگیرێت، زۆر بەکەمی لە کۆڕی ئاشتیدا ئاماژەی پێکرابوو. هێزەکانی بەریتانی کەوتبوونە داگیرکردن، بەڕێوەبەرانی بەریتانی لە هێندەوە ئەوێیان بەڕێوە دەبرد و کەشتیگەلی بەریتانی لەناو چۆمی دجلەدا دەهاتن و دەچوون. لەوەنەدەچوو هیچ هێزێک بتوانێ لەبەرانبەر داخوازیەکانی بەریتانیادا بوەستێت: ڕووسیە و ئێران زۆر لاواز بوون، ولاتەیەکگرتوەکان بێ لایەن بوو. فەڕەنسە، هەتا ئەو دانیشتنە ئالۆزەی شۆڕای چوار یار لە مانگی مەیدا، وادیاربوو کە وازی لە هەر داواکاریەک هێنابوو. کلیمینجوو بەتووڕەیەوە قسەی کردبوو بەڵام دەکرا لەوەش تێگەشتبایە کە لە کاتی خۆشی و شادیدا چ شتێکی گرنگی دۆڕاندوە: نەوت.

خەڵوز سووتەمەنی هەرەگرنگی شۆڕشی پیشەسازی بوو، بەڵام لە ساڵی ساڵی ١٩١٩دا خەریک بوو دەردەکەوت کە نەوت سووتەمەنی داهاتوو بوو. تانکەکان، فڕۆکەکان، لۆریەکان و هێزەکانی دەریایی هەرهەموویان پێویستیان بە نەوت بوو. تەنیا هاوردەکانی بەنزینی بەریتانیا لەنێوان ساڵانی ١٩٠٠ و ١٩١٩ چوار ئەوەندە بوو و زۆربەی ئەو زۆربوونە، بەداخەوە، لە دەرەوەی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیەوە دەهات: لە ولاتەیەکگرتوەکان، مەکزیک، و ڕووسیە و ئێرانەوە. کۆنترۆڵی چاڵگە نەوتیەکان، پالاوگەکان و هێڵەکانی بۆری نەوت ئاشکرابوو کە لە داهاتوودا گرنگیان دەدرایە، وەک لە شەڕی گەورەدا گرنگیان پێدرابوو، ئەو کاتەی کە بەبۆچونی کۆرزۆن " مەسەلەی هاوپەیمانی لەسەر شەپۆلێک نەوت سەکەوتن ڕاگیرابوو." کەس دڵنیا نەبوو لەوەکە مێزۆپۆتامیا تا چ ڕادەیەک نەوتی هەبوو، بەڵام کاتێکە قوڕ و لیتەی ڕەش هاتە سەرعەرز و چوە ناو حەوزەکانی دەوروبەری بەغدا، یان بڵێسەکانی ئاوری گاز لە زۆنگاوەکانی موسڵ دەگەشانەوە، هەمووی گومانەکان ڕەوانەوە. لە ساڵی ١٩١٩دا، هێزی دەریایی بەریتانیا، بەبێ چاوەڕوانی بەڵگەی زیاتر، ڕایگەیاندبوو کە چاڵگە نەوتیەکانی موسڵ لە جیهاندا گەورەترینن و وێنەیان نیە. پێدەچوو ڕێگەی کۆنترۆڵ کردنی هەر بەشێک بە فەڕەنسەیەکان کارێکی بێ ئەقلانە بێت، با ساکێس-پیکوت هەر قسەی بکردایە. وەل لیۆن ئامێری،

یەکێک لە لاوانی ڕۆشنبیری لیۆد جۆرج، نووسیبووی: " گەورەترین چاڵگەی نەوت لە جیهاندا هەمووی ڕێگای سەروو و پشتی شاری موسڵ دەگرێتەوە، و ئەگەرچی وانەبوو ئێمە بەهۆی ئاسایش و هێمنایەتی دەبێ لەبەردەمی چاڵگە نەوتیە حەیاتیەکانی خۆمان زەوی تەواومان هەبێت تا بە دەسپێکردنی شەڕ هەست بە مەترسی لەدەستدانی ئەوان نەکەین."٩١٣

کلیمینجوو، کە کاتی خۆی وتبووی،" کاتێکە پێویستیم بە نەوت دەبێت، لە بەقاڵی پەنادەستی خۆمان دەیکڕم." دەبێ لەو دەمەدا هەستی بە گرنگایەتی سووتەمەنی تازە کردبێت. ئەو بەشێوەی فەرمی کۆنترۆڵی بەسەر موسڵەوە نەمابوو بەڵام لای لیۆد جۆرج پێداگری کردبوو کە دەبێ فەڕەنسە بەشی خۆی لەناو عەرزدا هەرچیەک بێت پێی بدرێت. والتێر لانگ، وەزیری سووتەمەنی بەریتانیا، و هێنرِی بێرێنگێر، هاوتای فەڕەنسەیی ئەو، پیاوێک کە دەیکوت نەوت " خوێنی سەرکەوتنە" خرانە بەرکار. ئەوان ڕێکەوتنامەیەکیان درووست کرد کە بەوپێیە فەڕەنسە یەک چوارەمی کۆمپانیای نەوتی تورکی پێدەبڕا و لەبەرانبەردا ڕێگەی دەدا دوو لوولەی بۆری نەوت لە سەرتاسەری سووریە لە موسڵەوە هەتا دەریا درووست بکرێت. هەردوو لا ڕێکەوتن کە نەهێڵن ئەمریکیەکان، کە خەریک بوون لە نەوتی ڕۆژهەڵاتی ناڤین قازانجێکی باشیان دەکرد، بەزۆری خۆی تێهەڵقورتێنن. بەداخەوە، ئەو دانووستانە ماقووڵانە لە شەڕکردن لەسەر سووریە هەڵوەشایەوە. هێنرِی ویلسۆن لە یاداشتەکەی خۆیدا ئاماژەی پێکردبوو" شەڕە سەگێکی باش ساز بوو کە لەوێدا تایگێر وتی واتێر لانگ بەڵێنی نیوەی نەوتی مێزۆپۆتامیای بە بە فەڕەنسەیەکان دابوو! لیۆد جۆرج پرسیاری لێکردم کە ئایا من تاکوونێستا لەبابەت ئەمەوە شتێکم بیستوە. هەڵبەت کە نا. لە پاشان لیۆد جۆرج کوتوپڕ بۆ تایگێری نووسی و وتی کە تەدارەکەکە هەڵوەشاوەتەوە." دایرەی دەرەوە هەتا چەند مانگ دواتر بەمەی نەزانی، ڕووداوێک کە ئاڵۆزی سیاسی بەریتانیا لەم قۆناغەدا نیشان دەدات. تەنیا لە مانگی دیسامری ساڵی ١٩١٩دا بوو، دوابەدوای ئەوە کە بەریتانیا و فەڕەنسە لە ئاکامدا کێشەی سووریەیان داکووژاندبوو، کە کێشەی نەوت زۆرتر هەر لەسەر ئەو مەرجانەی کە لانگ و بێرێنگێر لەسەریان ڕێکەوتبوون، چارەسەرکرا. وەک بەشێک لە مامەڵەکە، حکوومەتی فەڕەنسەییش ڕازیبوو بۆ هەتاهەتایە واز لە داواکاری فەڕەنسە بۆ سەر وڵاتی سووریە بێنێت.٩١٤

بەریتانیەکان دەیانزانی کە ئەوان نایانەوێت فەڕەنسەیەکان خاوەنی موسڵ بن، بەڵام لەپشت ئەوەوە سیاسەتی خودی ئەوان سەبارەت بە مێزۆپۆتامیا بە دەیان قۆرت و تەنگ و چەڵەمەوە گەشەی دەسەند. کەمپەینی سەرەتایی بەریتانیەکان لە ساڵی ١٩١٤دا داکۆکیکەر ببوو، تەنیا بۆمەبەستی پارێزگاریکردن لە کەنداوی فارس لەبەرابەر تورکەکاندا گەڵاڵەی داڕێژرابوو.کاتێکە ئەوان

پارێزگاکەی خۆیان قایم ڕاگرتبوو، ئەوان بۆ باکوور بەرەو بەغدا ڕاکێشرابوون. ئەفسەرێکی لاوی سیاسی، ئارنۆلد ویلسۆن، لە نامەیەکدا بۆ دایک و بابی نووسیبووی: "تەنیا کاری باش ئەوەیە کە هەتا دەکرێ درێژە بە چالاکی بدە و هەوڵ مەدە زۆر دوور بڕوانیت." چوار ساڵ دواتر بەریتانیەکان لەڕاستیدا زۆر دوور ڕۆیشتبوون، بۆ سەرێ بەرەو ناوچەی کوردنشینەکان لەسەر سنوورەکانی تورکیە، و ویلسۆن لەوکاتەدا سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی بەریتانی بوو.٩١٥

ئارنۆلد ویلسۆن جوانچاک، بەغیرەت، کەلەڕەق و کۆمەڵایەتی بوو. لە گوزارشی قوتابخانەکەیدا هاتبوو:" ئەو بوێرانە بەرەنگاری کەم و کورتیەکانی خۆی بۆتەوە و لەهەموویان خراپتر ڕەنگە چاکخوازی لەڕادەبەدەری ئەو بێت. ئەو بەهرەی لە بەڕێوەبەرایەتی و ڕێکخستندا هەیە و ئەو توانایەکی لەڕادەبەدەری لە کارکردن بۆ خەڵکانی تر و لە خۆنەویستیدا هەیە. کردەوەکانی ئەو دوژمنی سەرسەختی ئەون." ئەو ڕقی لە سەماکردن، قسەلۆک و تەمبەڵی بوو. ئەو بە ئازادی لە کتێبی پیرۆز شتی دەگێڕایەوە؛ قەت قامکی لەسەر ماشە نەدەلەرزی. بەکورتی ئەو تایبەتمەندیەکانی فەرمەندیەکی گەورەی ئیمپراتۆریەتی هەبوو لە سەردەمێکدا کە فەرمەندەکان خەریک بوون باویان نەدەما و زەمەنیان بەسەردەچوو.٩١٦

کاتێکە شەڕ دەستی پێکرد، ویلسۆن لە باکووری تورکیە بوو، نزیک کێوی ئارارات، خەریکی تەواوکردنی پرۆژەیەکی گەورە بوو لەسەر دانانی سنووری نێوان ئێران و تورکیەی عوسمانی. (سنوورەکە بەبێ هیچ گۆڕانکاریەک وەک خۆی ماوەتەوە.) ئەو و هاوکارێکی لەڕێگای ڕووسیە و ئارچانگێل ڕێگای گەڕانەوە بۆ بەریتانیایان گرتەبەر. کاتێکە لە فەڕەنسە خەریک بوو پێوەندی بە ڕەژیمەکەیەوە دەگرت، دەستووری گەڕانەوە بۆ ڕۆژهەڵاتی ناڤینی پێدرا، تا وەک یاریدەدەری سێر پێرسی کۆکس، سەرەک ئەفسەری سیاسی، پێوەندی بە کەمپەینی مێزۆپۆتامیاوە بگرێت. کاتێکە، لە کۆتایی شەڕدا، بانگێشت لە کۆکس کرا تا لەسەر کاروبارەکانی ئێران دانووستان بکات، ویلسۆن جێگری ئاشکرای ئەو بوو. لە مانگی ئاڤریلی ساڵی ١٩١٨ هەتا مانگی ئۆکتۆبری ساڵی ١٩٢٠ ئەو مێزۆپۆتامیای بەڕێوەدەبرد.٩١٧

ویلسۆن، وەکوو زۆربەی بەریتانیەکانی تر لەوێ، لای وابوو بەریتانیا سامانێکی تازە و بەنرخی لەوێ گیر کەوتوە. بە نەوت، ئەگەر موسڵ شیاوی قۆرخکردن و بەکارهێنان بوایە، و گەنم، ئەگەر ئاودێری بەشێوەیەکی لەبار و گونجاو ئەنجام بدرایە، دەسکەوتی تازە دەیتوانی خۆبژێوی تەواو بۆ خەڵکی ناوچەکە دابین بکات؛ لەڕاستیدا، لەوانەیە تەنانەت پارەش بۆ خەزێنەکانی ئیمپراتۆری بگەڕێنێتەوە. ویلسۆن حکوومەتی ناو لەندەنی هان دا تا موسڵ بکات بە بەشێک لە ئامانجەکانی

شەڕی خۆی و، درووست دوابەدوای ئاگربەستی تورکیە، ئەو ئەرخەیان بوو کە هێزەکانی بەریتانی هرووژم دێنن. ئەو دەیکوت کە مووسڵ بۆ پارێزگاریکردن لە بەغدا و لە بەسرە گرنگە.٩١٨ بە ڕووخانی عوسمانیەکان و شۆڕشی ڕووسیە، ئەو شارە گرنگایەتیەکی زیاتری ستراتیژیکی پێدرا. بەریتانیەکان پشتگریان لە هێزەکانی دژەکمونیستی و هەروەها کۆماریە سەربەخۆ بچووکەکان دەکرد کە لە قەزاقستان سەریان هەڵدابوو. ڕێگایەک بۆ گەیشتن بە ئەم ئامانجە، و بەرگریکردنی لە بڵاوبوونەوەی زیاتری بۆلشویزم لە باشوور، کرانەوەی پێوەندیەکان بوو لەنێوان ئێران و قەزاقستاندا، و ئەو خەونە تەنیا لەڕێگای موسڵەوە دەهاتە دی.

ویلسۆن لەبابەت بەڕێوەچوونی ناوچەکە بیروباوەڕی تایبەتی هەبوو. " بەسرە، بەغدا، و موسڵ دەبێ وەک یەکەیەکی تەنیا بۆ ئامانجەکانی بەڕێوەبەرایەتی لەژێر کۆنترۆڵی تەواوی بەریتانیەکان دابێت." لەوەناچێ قەت ئەوەی بۆ هاتبێتە پێش کە یەکەیەکی تەنیا بەشێوازەکانی تر هیچ مانایەکی هەبێت. لە ساڵی ١٩١٩دا شتێک بەناوی خەڵکی ئێراق لە ئارادا نەبوو؛ مێژوو، جوگرافیا، ئایین لەباتی ئەوەی خەڵک لەدەوری یەک کۆکەنەوە لەیەکیان دەکردن. بەسرە لە باشووری دەڕوانی، بەرەو هێندستان و کەنداو؛ بەغدا لەگەڵ ئێران پێوەندی چڕوپڕیان بەیەکەوە بوو؛ و موسڵ لەگەڵ سووریە و تورکیە پێوەندی نزیکتری هەبوو. یەکخستنەوەی سێ پارێزگای عوسمانی و چاوەڕوانی درووستکردنی نەتەوەیەک، بەواتەی ئەورووپیەکان، وەکوو بەهیوابوونی کۆکردنەوەی مسوڵمانانی بۆسنی، کرۆواتەکان، و سێربەکان لە یەک وڵات بەدەوری یەکەوە وابوو. وەکوو ناوچەکانی باڵکان، تێکهەڵچوونی ئیمپڕاتۆریەتەکان و شارستانیەتەکان درز و کەلەبەری قووڵ و لەبننەهاتووی پاش خۆی بەجێ هێشتبوو. نزیک بە نیوەی حەشیمەتەکە مسوڵمانی شیعە بوون و یەکچوارەمیان سوونني بوون، بە کەمینەکانی ترەوە لە جوولەکەکانەوە بگرە تادەگاتە مەسیحیەکان؛ بەڵام جیاوازیەکی تر لەگەڵ جیاوازی ئایین تووشی گێرەوکێشە هاتبوو: هاوکات کە نیوەی دانیشتوان عەرەب بوون، ئەوانی تر کوردەکان (زۆربەیان لە موسڵ)، ئێرانیەکان یان ئاشووریەکان بوون. شارەکان بە بەراورد پێشکەوتوو و جیهانی بوون؛ لە ناوچە گوندنشینەکان، ڕێبەرانی ئایینی و عەشیرەتی پشتاوپشت هێشتا حکوومەتیان دەکرد.٩١٩ بیجگە لە عەرەب هیچ ناسیۆنالیزمێکی ئێراقی لە ئارادا نەبوو. بەرلە شەڕ، ئەفسەرانی لاو کە لە سووپاکانی عوسمانیدا خزمەتیان دەکرد لەپێناو ئۆتۆنۆمیەکی گەورەتر بۆ ناوچەکانی عەرەبنشین زۆریان هەوڵ دابوو. کاتێکە شەڕ کۆتایی پێهات، چەند کەس لەمانە، وەکوو نووری سەیید، سەرەک وەزیری داهاتووی ئێراق، لە دەوری فەیسەڵ کۆببوونەوە. بەرژەوەندی ئەوان لە عەرەبستانێکی گەورەتر دابوو، نەوەک لە وڵاتانی جیاجیا.

ئارنۆڵد ویلسۆن پێشبینی کێشەکانی کۆکردنەوەی حەشیمەتێکی بەو شێوەیە جیاجیای لەناو وڵاتێکی تاکدا نەکردبۆوە. ئەو باوک سالارێک بوو کە لای وابوو بەریتانیەکان بۆ ماوەی چەندین بەرەیتر دەمێننەوە. عەرەب بەگشتی، بێجگە لە تاقمێکی بچووک لە سیاسەتمەدارانی ناشارەزا لە بەغدا، داهاتوو وەک مامەڵەیەکی باش و گەشەکردنی مادی و ئەخلاقی لەژێر چاودێری بەریتانیای گەورە دەبینێت." ئەو حکوومەتەکەی خۆی هاندا تا بەپەلە هەنگاو بنێت: "باشترین ڕێگا بۆ ئێمە ئەوەیە کە بە ئاشکرا ڕاگەیەنین کە مێزۆپۆتامیا بێتە ژێر چاوەدێری ئێمە تا لەو چوارچێوەیەدا هەمووی چینەکان تا ڕادەیەکی زۆر مافی ئازادی و خۆبەڕێوەبردنیان پێ ببەخشرێت کە شیاوی حکوومەتێکی باش و بێ مەترسی بێت." باڵادەستەکانی ئەو لە لەندەن ئەوەیان پەسەند نەکرد. ئەوان کۆنترۆڵکردن بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆیان بەباش دەزانی، شتێک کە بەریتانیەکان لە وڵاتانی میرنشینی هێندستان و میسر بەکاریان هێنابوو. ئەوە لە دەسەڵاتی ڕاستەوخۆ هەرزانتر دەکەوت- حەقیقەتێکی گرنگ، بەتایبەت لە ساڵی ١٩١٩دا. وەک بالفۆر ئاماژەی پێکردبوو، کاتێکە لیژنەی ڕۆژهەڵات بەردەوام باسی ئەو ئەگەرە پیرۆزانەی دەکرد کە دەکەوتنە بەردەمی بەریتانیا: " قازانجی خەڵکانی ڕەسەنی ناوچە، قازانجی پریستیژی خۆمان لای ئێمە گرنگایەتیەکی بەرچاوی هەیە؛ ئەو شتە تایبەتانەی کە پێوەندیان بە تجارەت و بە بازەرگانیەوە هەیە لای ئێمە گرنگیان هەیە؛ بەڵام من پارە و مرۆڤم نەدیوە ئاماژەی پێکرابێت، و ئەوانە بەڕای من لەهەمووشتێک گرنگتر و سەرەکیترن." و دەسەڵاتی ناڕاستەوخۆ لانی کەم ڕێزیان لە خود-موختاری عەرەب و باوەڕی لیبراڵ دەگرت. مەقامێکی ڕەسمی پلەباڵا لە دایرەی هێندستان وتبووی :" ئەوەی کە ئێمە بەدوایەوەین بەڕێوەبەرایەتیەکە لەگەڵ ڕێکخراوەگەلی عەرەب کە دەتوانین بەئارامی دابینێن و هاوکاتیش بەدزیەوە کاروبارەکانی خۆمان جێبەجێ بکەین؛ شتێک کە خەرجێکی زۆر هەڵناگرێت، شتێک کە پارتی کرێکاری دەتوانێ گونجاو لەگەڵ یاساکانی خۆی وەری بگرێت، بەڵام لەو چوارچێوەیدا بەرژەوەندیەکانی ئابووری و سیاسی ئێمە مسۆگر دەبێت.".٩٢

ئەمە بەچاو نزیک بوو بەڵام بەلەش زۆر دوور و گران بوو. ڕۆحیەتێکی تازە خەریک بوو لە جیهانی عەرەب و زۆر ئەولاتریشەوە هرووژمی دەهێنا. لە هێندستان، ناسیۆنالیستەکان بەڕێبەرایەتی گاندی هاتبوونە سەرشەقام و داوای مافەکانی خۆیان دەکرد؛ لە میسر، پارتی وەفد ڕۆژبەدوای ڕۆژ پەرەی دەسەند. ناسیۆنالیزمی عەرەب لە ئێراق هێشتا لاواز بوو، بەڵام لە سووریە و لە میسر هێزێکی پتەوی لێدەرهاتبوو. ئەمیندار و ڕاوێژکاری باوەڕپێکراوی ڕۆژهەڵاتناسی ئارنۆڵد ویلسۆن بەمەی زانیبوو، هەرچەند ئەو بۆخۆی هەستی پێ نەکردبوو.

گێرترۆد بێڵ تەنیا ژنێک بوو کە ڕۆڵێکی هەرە گرنگی بە شان و باهۆی خۆی لە گرێبەستەکانی ئاشتیدا گێڕا. ئەو بە بەزاندنی سنوورەکانی ئاسایی ژیانی ڕۆژانە خووی گرتبوو. باریکەڵە، سوورلەسەرمەبەست بوو و جگەرەی یەک بەدوای یەک دەکێشا و دەنگێکی زیقنی پێوەبوو. ئەو بە ڕۆیشتن بۆ ئاکسفۆرد و وەک یەکەمین ژنێک کە بڕوانامەی پلە-یەکی لە مێژوودا وەرگرت و هەرچەند لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند و لق و پۆپدارەوە هاتبوو، هەمووی یاساکانی ژیانی تایبەت بە چینی خۆی بەزاندبوو وەکوو: شووکردن، منداڵان و کۆمەڵگا. ئەو بە ماتێرنهۆرندا هەڵگەڕا و پێشەنگی ڕێگاگەلی تازە لە ناوچە شاخاویەکانی ئاڵپ بوو. ئەو شوێنەوارناس و مێژوونووسێکی هەڵکەوتە بوو. بێجگە لەوانە ئەو لووتبەرز، کەمدوو و زۆر کاریگەر بوو. لە مانگی نوامری ساڵی ١٩١٩دا، کاتێکە سەرەک فەرمەندەی بەریتانی لە بەغدا ئاهەنگێکی پێشوازیان بۆ هەشتا کەسایەتی ناودار بەڕێوەبرد، هەرهەموویان کورسیەکانیان بۆ جەماوەرێک کە لەگەڵ ئەو بوو بەجێ هێشت.٩٢١

هاوڕێ لەگەڵ خزمەتچیانی خۆی و شارەزایانی کۆمپانیا، گێرترود بێل بەرلە شەڕ بە سەرتاسەری ڕۆژهەڵاتی ناڤیندا گەڕابوو، لە بەیرووتەوە هەتا دەمێشق و لە بەغداوە هەتا موسڵ. ئەو ئاشقی بیابان بوو: " بێ دەنگی و تەنیایی وەکوو پێچەیەکی داپۆشراو هەمووی جەستەت دادەگرێت؛ بێجگە لە چەندین کاتژمێری ئەسپ سواری بەردەوام، هەڵلەرزینی بەیانیان و خەواڵووبوونی دوانیوەڕۆیان، جم و جوڵی خۆکردن بەناو کەمپ دا، وتوێژی دەوروبەری ئاگری موحەمەد پاش خواردنی نانی شەوێ، خەوی مەزنتر لە داهێنانەکانی شارستانیەت، و دواتر گرتنەبەری دووبارەی ملی ڕێگا هەست بە بوونی هیچ حەقیقەتێک ناکرێت."٩٢٢ لە ساڵی ١٩١٤دا، ئەو وەک یەکێک لە بەرپرسانی ناوداری بەریتانیا لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین ناسرابوو. لە ساڵی ١٩١٥دا، ئەو بوو بە یەکەم ژنێک کە بۆ سیخوڕی میلیتاری بەریتانیا خەباتی دەکرد و تەنیا ژنێک کە بەشێوەیەکی فەرمی بوو بە بەشێک لە گەشتی بەریتانیا بەرەو ناوچەی مێزۆپۆتامیا.

ئەو بۆخۆی باوەڕی بە مافی ژنان نەبوو. هەروەها خۆشی لە زۆربەی هاوجنسانی خۆی نەدەهات. ئەو بە دەنگی بەرز لەبەرانبەر بووکەلاوێکی ئینگلیزیدا دەنگی هەڵبڕی و وتی " زۆر جێی داخە کە کوڕانی گەنجی داهاتووگەشی ئینگلیزی لەگەڵ گەوجەژنانی وەکوو ئێوە ژیانی هاوبەشی درووست دەکەن." باشترین هاوڕێیانی ئەو پیاوان بوون: لۆرێنس، ئیس.تی.جان فیلبای (باوکی کوڕێکی ناوزڕاو)، فەیسەڵ و، بۆماوەیەک، ئارنۆلد ویلسۆن. ئەو هەتابڵێی خۆشەویستی دەکرد بەڵام قەت ژیانی هاوبەشی درووست نەکرد. کاتێکە یەکەمین خۆشەویستەکەی بە قومارباز دەرچوو،

باوکی نەیهێشت شووی پێ بکات، و دووهەمین خۆشەویستەکەی ئەو پێشتر ژنی هێنابوو. لە ڕۆژی کریسمەسی ساڵی ١٩٢٠دا ئەو نامەیەکی بۆ باوکی نووسی و تێیدا هێنابووی کە "تۆ باش دەزانی کە من بێ هاوڕێم. من کارم بەسەر خەڵکەوە نیە و هیچ ئازارێکم بۆ کەس نیە، و سرووشتیە کە ئەوانیش هیچ ئازارێکیان بۆ من نیە کاریان بە سەرمەوە نیە. لەگەڵ ئەمانەشدا خۆشی و ڕابواردنەکانی ئەوان منیان دڵتەنگ دەکرد و من پێوەندیان پێوە ناگرم."٩٢٣

ئەو لە مێزۆپۆتامیا خۆی وەبەر کار نا. لە نامەیەکدا بۆ باوکی نووسیبووی: "من باوەڕم وایە کە ئێمە ئێرە دەکەین بە ناوەندی شارستانیەت و گەشەکردنی عەرەب." ئەو لە سەرەتادا ڕای وابوو کە عەرەبەکان لە حکوومەتی خۆیاندا ڕۆڵێکی کەم دەگێڕن. " هەتا بنکەمان لێرە قایم و قوڵتر بێت دانیشتوانی ناوچەکە دڵخۆشتر و کەیفسازترن." ئەو لە ڕۆژانی هەوەڵدا لەگەڵ ئارنوڵد ویلسۆن چاک پێکەوە سازابوون. ئەو لە گوزارشەکەی خۆیدا بۆ دایک و بابی بە گوڕ وتینێکی سەیرەوە هێنابووی کە " بوونەوەرێکی زۆر هەڵکەوتەیە، ٣٤، بەتوانایی سەرسووڕهینەروە، بەهێزێکی هاوکاتی جەستەیی و زەینیەوە کە تائێستا نموونەی نەبوە." ویلسۆن لە تاریفاتی ئەودا وتبووی کە لە کاروباری نووسیندا" ماندووی نەدەناسی و ڕۆژی بە دەم شەوە دەدا." ئەو[ویلسۆن] بە بنەماڵەی خۆی ڕاگەیاندبوو کە ئەو[بێل] " لە زۆر بواردا هەتابڵێی بەهێز و یارمەتیدەر بوو." بەگشتی ئەوان سەبارەت بە ئەو شتانەی کە لە داهاتوودا بەسەر مێزۆپۆتامیادا دەهات چاوەڕوانی وتەیەک بوون لەلایەن باڵادەستەکانی خۆیانەوە. بەڵام ئەو وتەیە هەر نەهات. ویلسۆن وتبووی " من وام دانابوو کە ئەگەر پێشبینیەکانی ئەوان درووست دەرنەدەهات بەهۆی ئەوەوە بوو کە گومان و دوودڵیەکانی ئەوان لەهینی ئێمە تەنانەت زیاتریش بوون." چون چاوەڕوان مابوون، بێل سەبارەت بە ئەو جۆرە حکوومەتەی کە مێزۆپۆتامیا پێویستی بوو بڕیارەکەی خۆی گۆڕی. عەرەبەکان دەبوو ڕۆڵێکی گەورەتر لەوەبگێڕن کە ئەو لە سەرەتادا مەبەستی بوو.٩٢٤

لە مانگی ژانویەی ساڵی ١٩١٩دا، ئارنوڵد ویلسۆن بێلی حەواڵەی قاهیرە، لەندەن و پاریس کرد تا بزانێ خەبەروباس چیە. لە مانگی فەوریەدا، هەتا پاریس دوای کەوت، شوێنێک کە لەبابەت وڵاتێک لە مێزۆپۆتامیا وتارێکی پێشکەش دەکرد. ئەو نامەیەکی پڕ لە هەست و سۆزی بۆ بنەماڵەکەی نووسی و تێیدا هێنابووی کە "بڕیار وایە سبەینێ لەگەڵ بەڕێز باڵفۆر نانی نیوەڕۆ بخۆم کەسێک کە، واهەست دەکەم، زۆری لاگرنگ نەبێت. لەکۆتاییدا هیوادارم بەڕێز لیۆد جۆرجم گیرکەوێت و بتوانم لەدواوە کۆتەکەی بگرم و نەهێڵم دەرچێت، و ئەگەر بتوانم وابکەم لەوانەیە بتوانم داوای هاوسۆزی و پشت گیری لێبکەم. لە هەمان کاتیشدا ناردوومانە بەدوای کۆلۆنێل ویلسۆن لە بەغداوە."ئەو بەدرووستی بەو قەناعەتە گەیشتبوو کە چارەنووسی مێزۆپۆتامیا بە داکووژانی قڕەی تایبەت بە سووریە بەسراوەوە:

ئێمە بەبێ یەکیان ناتوانین ئەوی تریان لەبەرچاو نەگرین، و لەبابەت سووریەوە ئەوە بۆچوونی فەرەنسەیەکانە کە کاریگەری دادەنێت." ئەو ماوەیەکی زۆر لەگەڵ لۆرێنس و فەیسەڵ پێکەوەبوون و لەوکاتەدا ئەویش وەکوو ئەوان هیواداربوو کە بەڵکوو فەرەنسەیەکان هان بدرێن تا فەیسەڵ وەکوو پاشای وڵاتێکی سووری سەربەخۆ قەبووڵ بکەن. ئارنۆڵد ویلسۆن دژایەتیەکی قورسی لەگەڵ ویلسۆن و بۆچوونەکانی ئەو هەبوو: " ئەو هەموو گیانی هەر زیان و نەگبەتی بووە بۆ ئێمە و هۆی هەمووگێرەوکێشەکانی ئێمە لەگەڵ فەرەنسەیەکان دەگەڕێنەوە بۆ ڕاویژ و چالاکیەکانی ئەو."٩٢٥

قسەکردن و وتاربێژی کردن هیچ دەرەنجامێکیان نەبوو. وەک مۆنتاگۆ، وەزیری کاروباری هیندستان، بەڕاشکاوی نامەیەکی بۆ بالفۆر نووسیبوو و هێنابووی کە: " ئێستا ئێمە لە پاریس خاتوو بیل و کۆلۆنێل ویلسۆنمان کۆکردۆتەوە. ئەوان بەڕای من بەرپرسن. ئەوان دێن بۆلای من و دەڵێن 'ئێمە لێرەین. تۆ داوای چی لە ئێمە دەکەی؟' من ناتوانم سەبارەت بەوشتانەی کە خەریکن ڕوو ئەدەن هیچ زانیاریەک بەوان ببەخشم." هاوکات کە ئاشتیکەران خەریکی درۆ و دەلەسە بوون، لە میزۆپۆتامیا ئاژاوە و ئاڵۆزیی خەریک بوون وڵاتیان دەتەنیەوە: لەنێوان کوردەکان و فارسەکان، کەسانێک کە بەدەست دەسەڵتداریێتی عەرەبەکانەوە بە تەنگەوە هاتبوون؛ لەنێوان شیعەکاندا، کەسانێک کە لەژێر کاریگەری سوونیەکاندا ئازاریان دەچەشت؛ لەنێوان ڕێبەرانی عەشیرەتەکان کە لەلایەن دەسەڵاتی بەریتانیەوە گوشاریان دەخرایەسەر؛ لەنێوان ئەفسەرانی پلەباڵا و بۆرۆکراتەکان کە بە ڕووخانی عوسمانیەکان پلەوپایەی خۆیان لە دەست دابوو؛ و لەنێوان ژمارەیەکی ڕوولەزۆربوونی ناسیۆنالیستەکانی عەرەب. بێل زیاتر دڵەراوکێی دەورووپشتی لە دڵدابوو. لە مانگی ئاڤریلدا نامەیەکی بۆ هاوڕێی دێرینی خۆی ئۆبرەی هێربێرت، کەسێک کە ترسی ئاڵبانیای لە دڵدابوو، نووسی و تێیدا هێنابووی کە " بەڵێ بەڕێزم ئەوان دەیانەوێت خاکی ڕۆژهەڵاتی نزیک بە توورەکە بکێشن، من بەدڵنیایەوە پێشبینی دەکەم کە دۆخەکە زۆر لە دۆخی پێش شەڕ خراپتر دەبێت- بێجگە لە میزۆپۆتامیا کە ڕەنگە ئێمە بتوانین لەو ئاڵۆزیانەی بەدوورکەین. وەکوو خەونێکی ناخۆش وایە کە تۆ دەتوانی تێیدا هەمووی ئەو شتە ناخۆشانەی کە بریار وایە ڕوودەن پێشبینی بکەی و ناشتوانی دەستت درێژ کەی و ڕێگایان لێ بگریت."٩٢٦

* * * *

ئەو بەهارە میسر تەقیەوە. میسریەکان قەت بەخۆشی و هەروا بەئاسانی نەچووبوونە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیەکانەوە، هەرچەند بەریتانیەکان هەوڵیان دابوو بە حکوومەتکردن لەرێگای خدیو بیشارنەوە و پووشبەسەری بکەن. کاتێکە شەڕ دەستی پێکرد، میسر بناخەکانی بزووتنەوەیەکی بەهێزی نیشتمانی

ببوو: ڕێبەرانی بەهێزی ئایینی، کەسایەتیە خاوەن ڕێزەکانی ناوچە و چینێکی ڕوولەگەشەی پسپۆڕ، کە خەریکی دروستکردنی پێوەندی لەنێوان خۆیان و دەورووبەریان بوون، لەگەڵ جەماوەری گوندنشینی دیڵتای میسر. شەڕ لەگەڵ خۆی کێشەی تازەی هێنابوو. کاتێکە ئیمپراتۆری عوسمانی، کە هێشتا هەر بەناو ئاغا و باڵەسەری میسر بوو، لە ساڵی ١٩١٤دا دژ بە بەریتانیەکان شەڕی ڕاگەیاند، بەریتانیەکان وەک وڵاتێکی ژێرچاودێری خۆیان میسریان ڕاگەیاند. ئەوە زۆربەی میسریەکانی تووڕەکرد، وەک چۆن هرووژمی هێزەکانی بەریتانی و ئوسترالیایی، و هاوڕێ لەگەڵی بەرزبوونەوەی نرخەکان پێشتر تووڕەیان کردبوون. بەریتانیەکان سەبارەت بە داهاتوو پەیامگەلی دژیەکتر و ناتەبایان دەنارد: لەنێوان ڕای گشتیدا، کۆنترۆڵی ئەوان بەسەر وڵاتدا چڕتر ببوو، بەڵام حکوومەت لە لەندەن زمانی ودرەو ویلسۆنی بەکارهێنابوو. چارەە خاڵەکە هەر بۆخۆیان بەتاسەوتینەوە لە میسر وەرگیرابوون.٩٢٧

لە مانگی نوامری ساڵی ١٩١٨دا، درووست دوابەدوای ئەوە کە ڕاگەیاندنی ئانجلۆ-فەرەنسەیی سەبارەت بە عەرەبەکان هەرهەمان زمانی خود-موختاری بەکارهێنا، ڕۆژنامەنووسێکی بەرجەستەی میسری بەڕێبەرایەتی شاندێک لەگەڵ سێر ڕیگناڵد وینگەیت، سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی لە میسر، قسەی کرد. سەیید زاگلوول پارێزەرێکی ناسراو، پیاوێکی باسەواد و وەزیری پێشووی پەروەردە بوو. ئەو لە بنەماڵەیەکی خاوەن نەریتەکۆنەکانی میسر، لە بنەماڵەیەکی خاوەن کشت و کاڵ و زەوی و زار لە دیڵتاوە هاتبوو، بەڵام بەپاڵپشتی شازادەخاتوونێک لە بنەماڵەی شاوە ئەو بۆ جیهانێکی پێشکەوتووتر و کراوەتری قاهیرە ماڵی گوێستبۆوە. بەریتانیەکان بەگشتی ئەویان وەک یەکێک لە پشتگرانی خۆیان حەساب کردبوو. لۆرد کرۆمێر، یەکەمین فەرمەندەی بەریتانی لە میسر وتبووی: " ئەو دەبێ زۆر دوورکەوێتەوە. ئەو خاوەنی هەمووی تایبەتمەندیە پێویستەکانی خزمەتکردن بە وڵاتی خۆیەتی. ئەو سادقە؛ ئەو بەتوانایە؛ ئەو خاوەن وورە و بیروباوەڕە." لە هەرحاڵدا، لە ساڵی ١٩١٤ بەریتانیەکان زۆر بەتاسەوتین نەبوون؛ زاگلۆل، ڕەنگە بەهۆی ئەوەوە کە نەکرابوو بە سەرەک وەزیر، ڕەنگە بەهۆی ئەوەکە خاوەن باوەڕی ڕەسەن نەبوو، بەرەو کەمپێکی ناسیۆنالیستی هەنگاوی نا.٩٢٨

لە وتوێژێک کە لەگەڵ وینگەیت هەیبوو، زاگلۆل داوای سەبەخۆیی تەواوی بۆ میسریەکان کردبوو. ئەو بە وینگەیتی ڕاگەیاندبوو کە ئەوان " بە ڕابردوویەکی پیرۆزەوە ڕەگەزێکی کۆن و لێهاتوون — زۆر لە عەرەبەکان، سووریەکان و مێزۆپۆتامیەکان، کەسانێک کە بەم تازەیانە خود-موختاریان پێ پێشنیار کراوە، لە بەڕێوەبردنی حکوومەتێکی ڕێک و پێکدا بەتواناترن." ئەو داوای لێکردن ڕێگەی شاندێک بدەن(یان وەفدێک) تا بۆ لەندەن و پاریس سەفەر بکەن و داخوازیەکانی ناسیۆنالیستەکان پێشکەش بکەن. کاتێکە ویگنەیت بەرەنگاری ئەمە بۆوە، میسریەکان زۆر بەتووڕەیەوە نارەزایەتی خۆیان دەربڕی: "هێندیە

نوێنەرەوەکان لەلایەن بەرێز مۆنتاگۆوە ڕێگەی دانیشتنێکیان پێ درابوو؛ ئەمیر فەیسەڵی عەرەب ڕێگای ڕۆیشتن بۆ پاریسی پێدرابوو. ئایا میسریەکان وەفای کەمتریان هەبوو؟ ئەی میسر بۆنا؟"٩٢٩

بە دەستپێکردنی کۆڕی ئاشتی، سەبارەت بە میسر هەر سکاڵانامەبوو کە دەهات و دەچوو؛ هەزاران، بگرە سەدان هەزار سکاڵانامە، واژۆکران. نارەزایەتیەکان ڕەنگ و بۆی بزووتنەوەیەکیان بەخۆوە گرت و بەشێوەیەکی گونجاو بانگێشتی وەفدیان کرد. زاگلۆل خدیوی هاندا تا داوای سەربەخۆیەکی تەواو بکات. لە ٩ی مانگی مارسدا، بەرپرسانی بەریتانی زاگلۆل و سێ ناسیۆنالیستی بەرجەستەی تریان دەستگیرکرد و بۆ ماڵتایان دوورخستنەوە. ڕۆژی دواتر، مانگرتنەکان و خۆپیشاندانەکان سەرتاسەری میسریان گرتەوە. لە هەنگاوێکی کەم وێنەدا، ژنانی چینە-باڵاکان لە تەنیایی و گۆشەگیری خۆیاندا ڕاچەنین و ڕژانە سەر شەقامەکان؛ یەکێک لەو ژنانە وتبووی: "من لام گرنگ نەبوو کە خەریکە بە دەست خۆربردنەوە دەناڵێنم. تاوانی ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ بەرپرسیاریێتی زۆرەملێی بەریتانی."٩٣٠ نارەزایەتیەکان ڕەنگی توندوتیژیان بەخۆوەگرت؛ سیمەکانی تیلێگراف پچڕان و هێڵەکانی ڕێگای شەمەندەفەر هەڵوەشانەوە. لە ١٨ی مانگی مارسدا، لەلایەن چەند کەسێکەوە هەشت سەربازی بەریتانی کوژران. لەپڕێکدا بەریتانیا بەگشتی کۆنترۆڵی میسری لە دەست هاتەدەرێ.

لە حەیبەتدا، حکوومەتی بەریتانی بەپەلە یاسای هاوسەری سەپاند و ئالێنبای حەواڵەکرد تا میسریەکان بێنێتەوە سەر دۆخەکەی جاران. لەندەن کەوتە حاڵەتێکی سەرسوورمانەوە کاتێکە ئەو کوتوپڕ هاتە سەر ئەم ئەنجامە کە دەبێ ڕێبەر ناسیۆنالیستە بەندکراوەکانی ناو ماڵتا ئازاد بکات و ڕێگەیان بداتێ، ئەگەر حەز بکەن، بەرەو دەرەوەی وڵات سەفەر بکەن تا ئەمیش بۆخۆی بتوانێ لەگەڵ میسریەکان دانووستان بکات. زانگلۆل ڕێگای پاریسی گرتەبەر، شوێنێک کە وادیاربوو لە ڕاکێشانی هێزەکانی تر بۆ پشتگیریکردن لەخۆی هیچ سەرکەوتنێکی تێدا بەدەست نەهێنا.٩٣١ لە هەر حاڵدا، ئەو کاری کردە سەر بەریتانیەکان کە پێویستە سەبارەت بە بەڕێوەبردنی میسر هەندێک گۆڕانکاری بێتە ئاراوە. هەرچەند وتوێژەکان چەندین مانگیان خایاند، لە ساڵی ١٩٢٢دا حکوومەتی بەریتانی لەئاکامدا ملی بۆ سەربەخۆیی میسر کەچ کرد. (هەرجۆرێک بێت کۆنترۆڵی کاناڵی سۆئێز و سیاسەتی دەرەوەی گرتە دەست خۆی). زاگلۆل لە ساڵی ١٩٢٤دا بوو بە سەرەک وەزیر.

* * * *

هێندستانیش، بەهۆی ئەوەکە بەریتانیەکان لە میسر مابوونەوە، لە ساڵی ١٩١٩ بەریتانیەکانی نیگەران کردبوو. ناسیۆنالیزمی هێندی تەنانەت لە هینی میسریش پێشکەوتووتر بوو. داواکاریە بەئەدەبەکانی کاتی خۆی بۆ خود-موختاریەکی بەرتەسک ئێستا گۆڕابوون ڕەنگ و بۆی دەسەڵاتی

نیشتمانیان بەخۆوە گرتبوو. لەکاتی شەڕدا، مۆهانداس گاندی لە ئەفریقای باشوورەوە گەیشتبوە بەرەوە و هەڵگری ئامرازەکانی ڕێکخراوەی سیاسی و یاخیبوونی ناوخۆیی بوو کە ئەو وەگەڕی خستبوون تا بەگشتی کۆنگرێسێکی نیشتمانی هێندی تایبەت بە چینی مامناوەندی بگۆڕێ و بیکات بە بزووتنەوەیەکی بەهێزی بەکۆمەڵ. بەرزبوونەوەی خێرای نرخەکان، ڕووخانی تجارەتی هەناردەی هێندستان و ئاشکرابوونی ناکارامەیی نیزامی بەریتانیەکان کە چۆن ژیانی سەربازانی هێندی لە مێزۆپۆتامیا بەفیرۆدابوو تەنانەت خەیاڵی ئەو هێندیانەشی ڕەواندبۆوە کە لایان وابوو دەسەڵاتی بەریتانی دەتوانێ حکوومەتێکی باش دەستەبەربکات. هەرچەند بەریتانیا بەڵێنی بزووتنەوەیەکی هێواشی لە ساڵی ١٩١٧دا بەرەو سەربەخۆیی دابوو، خەریک بوو گەورەدەبۆوە و لەچنگ بەریتانیەکان دەدزرایە دەرەوە.

ناسیۆنالیستەکانی هێندی بەڕێزەوە سەرنجیان دایە باسەکەی سەرەک ویلسۆن لەبابەت خود-موختاریەوە بەڵام یەکەمجار بایەخێکی ئەوتۆیان بە کۆڕی ئاشتی نەدا. هێندستان هیچ داواکاریەکی ناوچەگەری، یان لانی کەم هیچ داواکاریەک کە هێندیەکان بۆخۆیان بەهایان پێدەدا، نەبوو. (ئەفسەرانی بەریتانی لە دایرەی هێندیەکاندا، سەرنەکەوتووانە، هەوڵیان دابوو تا بەشێوەیەکی فەرمی داوای ماندێتەکانی هێندی بەسەر مێزۆپۆتامیا و ئەفریقای ڕۆژهەڵاتی ئەڵمان بکەن.٩٣٢) ئەوێ لەلایەن ڕێبەرانی تایبەت بەخۆی بەڵام لەلایەن مۆنتاگۆ، وەزیری دەرەوەی کاروبارەکانی هێندستان، و دوو کەس هێندی وردهەڵبژێردراوەوە نوێنەرایەتی دەکران: لۆرد ساتیاندرا سینها، دادوەرێکی ناودار کە لە کۆمیتەکان بەکاردەهات، ماهاراجای بیکانیر، کەسێک کە زۆر بەکەمی قسەی دەکرد بەڵام ئێوارەخوانی چاکی دەڕازاندەوە. کاتێکە وردەباسێک- هەڵوەشانەوەی خەلافەت لە کۆنستانتینۆپل- کتوپڕ لە هێندستان بوو بە کێشەیەکی سەرەکی ئاشتیکەران سەرسووڕمان، و بەریتانیەکان ترس کەوتە دڵیان.

مسوڵمانانی هێند، کە لە چواربەش بەشێکی حەشیمەتی هێندستانی بەریانیا بوون، لە دیمەنی کۆتایی هاتنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆماوەیەک خەم دایگرتبوون چون شیمانە دەکرا کۆتایی هاتنی ڕێبەرایەتی ڕۆحانی کە سوڵتان بەسەر مسوڵمانانی جیهاندا بەڕێوەی دەبرد بەدواوە بێت. مزگەوتەکان لە سەرتاسەری هێندستاندا لە چاوپێکەوتنەکانی حەفتانەیاندا وەک خەلیفە دۆعایان بۆ دەکرد. شەڕ مسوڵمانانی هێندستانی بە دوو بەرەدا کێشابوو. کەمینەیەکی بچووک کە بە ئاشکرا پشتی بە عوسمانیەکانەوە بەستبوو و هەربەوهۆیەوە خرابوونە بەندیخانە؛ ئەوانەی تر، مەلوول و نارەحەت، بێ دەنگ مابوونەوە. کاتێکە لە ساڵی ١٩١٩دا لە پاریسەوە بۆ هیندستان دەنگۆی ئەوە

پەیابوو کە گوایە زلهێزان پلانیان ڕشتوە تا ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دابەش بکەن، سوڵتان لەسەر تەخت وەلانێن و خەلافەت هەڵوەشێننەوە، ڕۆژنامەکانی بەریتانی بەربوونە بڵاوکردنەوەی وتار و پاڕانەوە لە بەریتانیەکان تا پارێزگاری لە ئەو بکەن، و کەسایەتیە ناودارەکانی ناوچە کۆمەڵانی تایبەت بە خەلافەتیان پێکهێنا. سکاڵانامەکان بەکۆمەڵ ڕوویان لە بەرپرسانی بەریتانی دەکرد، بەشێوەیەکی نادرووست و هەڵە، بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە گوایە ویلسۆن بەڵێنی دابوو تا پارێزگاری لە خەلافەت بکات. حکوومەتی هێندستان حکوومەتی بەریتانی هاندا تا سوڵتان لە کۆنستانتینۆپل بهێڵێتەوە و دەسەڵاتی شوێنەپیرۆزەکانی مسوڵمانان لە سەرتاسەری ڕۆژهەڵاتی ناڤینی بۆ بەجێ بێڵێت. لە پاریس، مۆنتاگۆ بەردەوام لەبابەت مەترسیەکانی هەڵاواردنی گرووپێکی گەورە لە ئەو هێندیانەی کە وەفادار بە بەریتانیەکان مابوونەوە هاوکارەکانی خۆی ئاگادار دەکردەوە. هەڕەشەکانی ئەو، کەسایەتی تووڕە و تڕۆی ئەو، تەنیا بێزاری و دڵهێشانی دروست دەکرد. لیۆد جۆرج بۆی نووسیبوو: "ئەوەی ڕاستی بێت هەبوونی ئێوە لە سەرتاسەری کۆرەکەدا هچ مانایەکی نەبوە و زیاتر وەک جێگری ئۆرانگزێب دێیتە بەرچاوم تاوەکوو ئەندامێکی کابینەی بەریتانی!"٩٣٣ [ئۆرانگزێب دوایەمین ئیمپراتۆری کاریگەری مۆغۆل لە هێندستان بوو.]

لە ١٧ی مانگی مەیدا لیۆد جۆرج بەنابەدڵیەوە هاتە سەر ئەوە کە شاندێک بۆ شۆڕای چوار یار بنێرێت، کە ئاقاخانی لەخۆگرتبوو، تا داوا بکات کە پارچە زەویەکانی تورکیەی ئیمپراتۆری عوسمانی لەنێوان هێزە جیاجیاکاندا دابەش نەکرێن، و ڕێگە بدرێت خەلافەت درێژە بە ژیانی خۆی بدات. لیۆد جۆرج بۆخۆشی کەوتبوە ژێر کاریگەریەوە: "من لام وایە دابەشکردنی ناوچەکانی تورکیە کارێکی هەروا ئاسان نیە. بەم کارە ئێمە ئاژاوە و پشێوی دەخەینە ناو جیهانی مۆحەمەدیەوە."٩٣٤ بەداخەوە چوار ڕۆژ دواتر، لە ٢١ی مانگی مەیدا، ئەو و کلیمینجوو سەبارەت بە ڕێکەوتنامەی ڕۆژهەڵاتی ناڤین چەلەحانەیەکی باشیان سازکرد و کێشەی سەرەکی، واتە، خەلافەت، بۆ کاتێکی نادیار دواخرا.

لە هێندستان، مسوڵمانان بەردەوام ترس و دڵەڕاوکەیان زۆر دەبوو. کۆمەڵانی ناوچەکان لە کۆمەڵەیەکی ناوەندی خەلافەتدا خۆیان ڕێکخست. ڕێکخراوەی سەرەکی سیاسی مسوڵمانان، کۆمەڵەی مسوڵمانان، شاندێکیان نارد تاکوو چاویان بە لیۆد جۆرج بکەوێت. لەوە جدیتر ئەوە بوو کە گاندی بڕیاری دا تا پشتگری خۆی و کۆنگرێس حەواڵەی پشت بزووتنەوەکە بکات. گاندی بلیمەتێکی شیمانەنەکراوی جیهانی سیاسەت بوو. پیاوێکی باریکەڵە وگۆشەگیر بوو. پێراگەیشتن بەباری ڕۆحی و بەباری جەستەیی عەقڵ و هۆشی ئەویان داگیرکردبوو. هەمیشە گوێڕایەڵی ڕووداوە سیاسیەکان و گوێ لەمستی دڵی شێواوی خۆی بوو. کاتێکە دی خەلافەت تووڕەبوە لە دەرفەت

کەڵکی وەرگرت و بۆ ئەوە کە بەرپرسانی بەریتانی بتۆقێنێت دەستی کرد بە درووستکردنی پردی پێوەندی لەنێوان هێندوەکان و مسوڵمانەکان.

هێندستان تازە کەوتبوە ناو پشێوی و نائارامی. پەتایەکی پیس گیانی ۲۰ملوێن کەسی هێندی گرتبوو (گاندی ئەوەی وەک نموونەیەک لە لێنەهاتوویی بەریتانیەکان ناودەبرد لە دەسەڵاتداریێتی بەسەر هێندستاندا.) مسوڵمانان بەگژ خەلافەتدا هاتبوون، کرێکاران دەستیان بە مانگرتن کردبوو و گوندنشینان سەبارەت بە کرێکانیان دەنگی نارەزایەتیان هەڵبڕیبوو. حکوومەتی هێندستان بە پێشکەشکردنی یاسایەک بۆ پەرەدان بە ئارەزووکاریەکانی خۆی کێشەکانی لەخۆی قووڵتر کردبۆوە. لە مانگی مارس و مانگی ئاڤریلدا، شارە گەورەکان خۆپیشاندانی گەورە و کۆڕوکۆبوونەوەی جەماوەریان بەخۆوە بینیبوو. لە ٦ی مانگی ئاڤریلدا گاندی مانگرتنێکی گشتی لە سەرتاسەری هێندستاندا ڕاگەیاندبوو. هەرچەند لایەنگرانی خۆی هان دابوو کە بەرگری لە توندوتیژی بکەن، بەشێوەی جیاجیا و بەربلاو لە هەندێک شوێن ماڵ دزرابوون و تالان کرابوون. خراپترین ئالۆزی لە پەنجاب هاتبوە ئاراوە ئەو شوێنەی کە، لە ۱۳ی مانگی ئاڤریلدا، لە ئامریتسار، ئەفسەرێکی خەزلاوی بەریتانی بە هێزەکانی خۆی دەستووری تەقەکردنی ڕاستەوخۆی لە جەماوەرێکی گەورە دابوو. ئەو کۆمەڵکوژیە، کە دواتر بە ئامریتسار ناوی دەرکرد، تەنانەت ڕای هێندیە میانڕەوەکانیشی دژ بە بەریتانیەکان ورووژاند. بەریتانیەکان، بەتایبەت ئەوانەی کە لە هیندستان بوون، لە ترسان خەزلابوون و نەیاندەزانی چی بکەن. ڕۆژنامەیەکی ئینگلیزی-زمانی ناوچەکە پرسیاری کردبوو: " بڵێی هەندێک ڕێکخراوەی هەرە مەترسیدار و قین لەدڵ لەژێرەوە دەستیان لەمانەدا نەبێت؟" ئایا هۆکاری ئەو پشێویانە دەگەڕایەوە بۆ بۆلشویکەکان؟ سیخۆران لە میسرەوە؟ یان ڕەنگە پیلانێکی جیهانی مسوڵمانان بێت؟ ڕەنگە ئەوە شتێکی بەرێکەوت نەبێت، شەڕێک درووست لەگەڵ مسوڵمانانی ئەفغانستان سەری هەڵدابوو و لەگەڵ هێزەکانی ئیبن سەعوود، کە بەگشتی لەبزووتنەوەی ئیسلامی ڕەسەنەوە سەریان هەڵدابوو، لە سەرتاسەری دوورگەی عەرەبستاندا خەریکی خۆسازکردن بوون.۹۳٥

ئاژاوەگەلی میسری و هێندی ترسیان خستبوە دڵی بەریتانیەکانەوە و سنوورەکانی دەسەڵاتی زلهێزی بەریتانیایان بۆ ڕایەکی تر بردبۆوە دەورووبەری وڵاتی زێد. هێنری ویلسۆن، سەرۆکی ستافی گشتی ئیمپراتۆریەت، بێ وچان هەوڵی دابوو تا حکوومەتەکەی خۆی لەمە ئاگاداربکاتەوە؛ لە نامەیەکدا بۆ هاوڕێیەکی خۆی لە مانگی ئاڤریلی ساڵی ۱۹۱۹دا هێنابووی کە "هەمووی تواناکانی من خراونەتە گەڕ بۆ هێنانەدەرێی هێزەکانمان لە ئورووپا و ڕووسیە و حەواڵەکردنیان بەرەو ناوەندەکانی ئاژاوەگەری لە داهاتوو، وەکوو ئینگلیز، ئیرلەند، میسر و هێندستان. ئەو شوێنەی کە تۆ

لەویی بەڕێزم." هەرچەند ئەوان هێزەکانیان لە ناوچەکانی وەکوو قەزاقستان و ئێران کێشایە دواوە، هێزی میلیتاری لەوە دڵنیا نەبوو کە ئەوان بتوانن ڕووبەڕووی "ناوەندەکانی توندوتیژی" ببنەوە. سووپاکانی بەریتانیا خەریک بوون دەتوانەوە. تەنیا لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین، ئالێنبای لەماوەی مانگێکی وەرزی بەهاردا نزیک بە ٢٠،٠٠٠ پیاوی لە سووپا هێنا دەرەوە.٩٣٦

ئەو پشێوی و ئاڵۆزیانە بۆ وڵاتانی زێدیش خەرجی بەدواوە بوو. چێرچیل- کە لەوکاتەدا ئەمینداری کۆلۆنیایی بوو- لە ١٢ی مانگی نوامریساڵی ١٩٢١دا نامەیەکی بۆ ئەمینداری نهێنی خۆی لە دایرەی کۆلۆنیەکان نووسیبوو و تێیدا هێنابووی کە "هەر شتێک کە لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین ڕوو ئەدات لەبەرانبەر دابەزینی نرخەکاندا لە پلەی دووهەم دایە." وەک کۆرزۆن بەناڕەحەتیەوە بەدوای وتوێژێکی یەکلانەکراوەی تایبەتی کابینە لە هاوینی ساڵی ١٩١٩دا لای بالفۆر گوزارشی دابوو: " ئەم حەقیقەتە ئاشکرا بوو؛ ئەرکی ڕاگرتنی سووپایەکی ٣٢٠،٠٠٠کەسی ئینگلیزی و هێندی لە بەشە جۆربەجۆرەکانی ئیمپراتۆریەتی تورکیە و لە میسر، یان سووپایەکی ٢٢٥،٠٠٠کەسی بێجگە لە میسر، بە خەرج و مەخاریجی سەرسام ئاوەرەوە، ئەرکێکە کە چیتر ناکرێ دوابخرێت." لیۆد جۆرج، کە بۆ دانانی ڕێکەوتنی ئاشتی بۆ ئیمپراتۆری عوسمانی هەستی بە هیچ پێویستیەک نەکردبوو، لە ئاکامدا هاتە سەرئەوەکە بایەخی بداتێ. لە مانگی ئۆگستی ساڵی ١٩١٩دا، درووست بەرلەوەی کە بچێت بۆ پشوودانێک و دوورکەوێتەوە، بالفۆر کورتەیەکی ئاشکرای لە کێشەکان خستە بەردەمی ئەو هەرچەند هیچ ڕێگەچارەیەکی پێشنیار نەکرد: "حەقیقەتێکی ڕەق.... ئەوەیە کە فەڕەنسە، ئینگلیز و ئەمریکا لەسەر کێشەی سووریە ئەوەندە هەڵوێستێکی ئاڵۆسکاویان گرتۆتەبەر کە هیچ تەوەرێکی دڵخۆشکەر بۆ هیچ کام لە ئەوان لە ئارادا نیە." لیۆد جۆرجیش خەریک بوو ئاگاداری قووڵایی ڕق و قینی فەڕەنسەیەکان دەبۆوە.

بۆ ئاڵۆزترکردنی کێشەکان، فەیسەڵ هەر لەکاتی گەڕانەوەی بۆ سووریە لە مانگی مەیدا سەربەخۆیەکی ناوادەی ڕاگەیاندبوو. لە یەکێک لە یەکەمین وتارەکانیدا لە دەمێشق، ئەو بە بیسەرانی عەرەبی ڕاگەیاندبوو، "ئەوەی کە بۆ ئێوە ماوەتەوە ئەوەیە کە لەنێوان دوو ڕێگادا یەکیان هەڵبژێرن یان کۆیلەتی یان ئاغایەتی و گرتنە دەستی چارەنووسی داهاتووی خۆتان." دەنگۆی ئەوەی لەسەر بوو کە گوایە لەگەڵ ناسیۆنالیستەکانی میسر سەبارەت بە بەرەیەکی جەنگی هاوبەش دژ بە بەریتانیەکان و ناسیۆنالیستەکانی تورکی سەبارەت بە ئەگەری یەکگرتنەوە لەگەڵ تورکیە قسەی کردبێت. بریکارەکانی ئەو لە ناوچەکانی مێزۆپۆتامیا خەریکی کاری پڕۆپاگەندە بوون. لە وتوێژیکدا لەگەڵ ئالێنبای، فەیسەڵ بانگەشەی ئەوەی

دەکرد کە ودرەو ویلسۆن بە ئەوی ڕاگەیاندبوو تا نموونەی شۆڕشی ئەمریکی ڕەچاو بکات: "ئەگەر سەربەخۆییت دەوێت سەرباز بگرە و بەهێز بە." ئەگەر فەیسەڵ بڕیاری دابوو تا ڕێبەرایەتی ڕاپەرینێک بکات، بەرپرسانی نیزامی بەریتانی لە سووریە لیۆد جۆرجیان ئاگادار کردبۆوە، ئەوان نەیاندەتوانی لەگەڵ ئەوە هەڵ بکەن و قەبووڵی بکەن.٩٣٧

لە مانگی سێپتامردا، لیۆد جۆرج، کە دوا ساخکردنەوەی بڕیارەکەی خۆی بەپەلە کەوتە ڕێ، بڕیاری هێنایە سەرئەوە کە بەریتانیا هێزەکانی خۆی لە سووریە بکێشێتە دەرەوە ڕێگە بدا بە فەڕەنسەیەکان تا بخزێنە ناوەوە. دوا چەندین وتوێژی چڕوپڕ، لیۆد جۆرج و کلیمینجوو پێکەوە ڕێکەوتن تا واز لە دەسەڵات بهێنن. (هێشتا کێشەی سنووری نێوان سووریە و فلستین هەروا بەبێ چارەسەری مابۆوە، کە لە ئاکامدا لە ساڵی ١٩٢٢ داکووژا.٩٣٨) ئەمریکیەکان نارەزایەتیەکی هێواشیان دەربڕی و باسی خود-موختاریان کرد، بەڵام ئەوان چیتر هۆکارێکی قورس نەبوون. لە کۆتایی ساڵی ١٩١٩دا کێشە سەرەکیەکانی تری نێوان بەریتانیا و فەڕەنسە داکووژابوو: دەبوایە نەوتی مووسڵ کەم تا زۆر بەدرێژایی ئەو هێڵانەی کە شەش مانگ پێشتر ڕێکەوتن لەسەریان بەسرابوو، دابەش بکرایە.

لە کۆبوونەوەی سان ڕیمۆ لە مانگی ئاڤریلی ساڵی ١٩٢٠دا، شوێنێک کە مەرجەکانی گرێبەستەکە لەگەڵ ئیمپراتۆری عوسمانی پەسەند کرابوون، بەریتانیەکان و فەڕەنسەیەکان، جیاوازیەکانیان بۆماوەیەکی کاتی لەبەرچاونەگیران، ماندیتیان بەخۆیان بەخشی، بەریتانیەکان بۆ فلستین و مێزۆپۆتامیا، فەڕەنسەیەکان بۆ سووریە. هەتا لەلایەن کۆمەڵەی گەلانەوە پەسەند نەکران لە قسە و لە تیئۆریدا هیچ بەهایەکیان نەبوو. جێی سەرسووڕمان نیە، کۆمەڵەیەک کە بەریتانیا و فەڕەنسە بەسەریدا زاڵ بوو لە ساڵی ١٩٢٢دا ئەمەی کرد.

عەرەبەکان ڕاوێژیان لەگەڵ کرا، بەڵام تەنیا لەلایەن ئەمریکیەکانەوە. لێژنەی لێکۆڵینەوەی ویلسۆن، کە کلیمینجوو و لیۆد جۆرج حەزیان نەدەکرد پشتگری لێبکەن، بەجوانی کارەکانی خۆی بردبوە پێشێ. هێنری کینگ، سەرۆکی ئۆبێرلین، و چارلز کرەین، کە لە کێشەی چکسلەواکیادا زۆری یارمەتی دابوو، هاوینی ساڵی ١٩١٩ی بێ پسانەوە بە سەفەرکردن لە فلستین و سووریە تێپەڕاندبوو. ئەوان هەستیان بەوەکرد کە زۆربەی هەرەزۆری دانیشتوانی ناوچەکە خوازیاری ئەوەبوون کە سووریە هەم فلستین و هەمیش لوبنان لەخۆبگرێت؛ هاوڕێ لەگەڵ ئەوە زۆرینەیەکی هاوچەشنی تر خوازیاری سەربەخۆیی بوو. ئەوان هاتنە سەر ئەم ئەنجامە کە " لەوانەیە لە مامەڵەی ناماقووڵانە و خائینانە لەگەڵ ئەم خەڵکە دەستبەجێ مەترسی درووست ببێت، بەڵام هیوای گەورەی ئاشتی و

پێشکەوتن لە ئارادا دەبێت ئەگەر ئەم مەترسیە ڕاشکاوانە و وەفادارانە چارەسەربکرێت."٩٣٩

گوزارشەکەی ئەوان هەتا ساڵی ١٩٢٢، دوا ماوەیەکی دوورودرێژ بەسەر زیانەکەدا، بڵاو نەکرایەوە.

* * * *

لە مانگی سێپتامری ساڵی ١٩١٩دا فەیسەڵ بەشێوەیەکی سادەوساکار ئاگادارکرایەوە کە فەڕەنسە و بەریتانیا سەبارەت بە ڕۆژهەلاتی ناڤین دەستیان بە وتوێژەکانی خۆیان کردبۆوە. بەریتانیەکان لەوەدڵنیا بوون کە ئەو هەتاکاتێکە لیۆد جۆرج و کلیمینجوو ڕەزایەتیان لەسەر نەبووبێت ناگاتە لەندەن. فەیسەڵ نارازی بوو؛ ئەو نەیدەویست ملکەچی دەسەلاتی فەڕەنسەیەکان بێت. بەریتانیەکان، پێدەچوو هاوڕێ لەگەڵ هەندێک ترس و دڵەڕاوکێ بووبێت، ئەویان هاندەدا تەنیا لەگەڵ فەڕەنسەیەکان وتووێژ بکات. لە ئاکسفۆردەوە، کاتێکە حکوومەتەکەی لۆرێنس وازی لە هاوڕێی دێرینی ئەو و عەڕەبەکانی هێنابوو بێجگە لە سەیرکردن هیچی لەدەست نەدەهات. ئەو هەمووجارێک شێعرێکی لەبابەت دەرکردنی ئادەم و حەوا لە باخی عەدەن بۆ چەندین کەڕەت دەخوێندەوە و زۆرجار دەچوو بۆ ماڵی دایکی و ئەویش " دانی بەیانی یەکسەر لەنێوان نانی بەیانی و نانی نیوەڕۆدا لە یەک شوێندا، بەبێ ئەوەی جووڵەیەک بکات، و بە یەک شێوەی هەست دەربڕین" بۆ دەکوتەوە..٩٤٠

لە پاریس، فەیسەڵ بەخێرهاتنێکی ساردی لێکرا. مۆرداک لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی" دوا ئەوەی کە گوڵبارانیان کرد و گۆرانیان پێداهەڵکوت، چاپەمەنیەکانی فەڕەنسە لە قوڕولیتەیان وەردا و هەرچی سووکایەتی و بێ فەزیحەتە پێیان کرد." کلیمینجوو هاوسۆز بەلام ڕژد بوو؛ فەڕەنسەیەکان فەیسەڵیان وەک دەسەلاتداری دەمێشق قەبووڵ کربوو بە مەرجێک کە لەژێر دەستووری ئەوان دەرنەچوایە. هەڵبەت ئەویش لە هەموو تەنگانەیەکدا هانای بۆ فەڕەنسەیەکان دەبرد. فەیسەڵ، لە هەنگاوێکی گەورەدا، ئەسپەکانی خۆی پێشکەش بە کلیمینجوو کرد؛ مۆرداک لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە دوانیان ئەسپی ڕەسەن و جوان بوون، ئەوانی تر نەزۆر چاک و نەزۆر خراپ بوون. هەرجۆرێک بوایە تاگێڕ لە ئەو دوور بوو، و بۆچوونەکانی ڕەسمی فەڕەنسەیەکان، کە قەت خۆیان بە هاوسۆزی ناسیۆنالیزمی عەڕەب نەدەزانی، گوشاریان هێنابوو. دەسەلاتی فەڕەنسەیەکان لە سووریە پێویستی بە پاڵپشتی هەبوو، بەتایبەت بە هێرشکردنی ناسیۆنالیستەکانی تورکی بۆسەر هێزەکانی فەڕەنسەیی لە سیلیسیا. حکوومەتی تازە لە فەڕەنسە، کە لە نوامری ساڵی ١٩١٩دا هەڵبژێردرابوو، زۆر زیاتر لە حکوومەتەکەی کلیمینجوو هۆگری ئیمپڕاتۆریەت بوو. جێگری پۆئینکارە وەک سەرەک کۆمار، پائۆڵ دیسچانێڵ، دواتر دەبوایە

شاندێک لە هاوڕێیانی کۆلۆنیستی ئەرخەیان بکردایە کە مەدیتەرانە و ڕۆژهەڵاتی ناڤین بەردەبناخەکانی سیاسەتی فەرەنسەیەکان بوون. (ماوەیەکی کورت بەدوای ئەم ڕووداوەدا لە کۆشکی ئەلیسی بینرابوو کە لەگەڵ دارەکان وتویێژی دەکرد.) هەرچەند فەیسەڵ هەتا مانگی ژانویەی ساڵی ١٩٢٠ ماوەیەکی زۆر لە پاریس مایەوە، نەیتوانی ڕێکەوتنامەیەکی قورسوقۆڵ لەگەڵ فەرەنسەیەکان درووست بکات. ئەو گەڕایەوە بۆ وڵات بۆ دەمێشق، نەک تەنیا لە فەرەنسەیەکان بەڵکوو لە بەریتانیەکانیش هیوابڕ ببوو؛ بە واتەی خۆی" ئەو دەست وپێ بەستراو درابوو بەدەست فەرەنسەیەکانەوە."٩٤١

لە دەمێشق، فەیسەڵ هەستی کرد کە کەش و هەوایەکی ئاڵۆزتر بەسەر وڵاتدا زاڵە. کۆمیسارییای عالی فەرەنسەیەکان، ژەنەراڵ گۆرۆد، پیاوێک کە لە ڕۆژانی شادی و خۆشیدا میداڵیای شەرەف و ڕێزلێنانی بە فەیسەڵ بەخشیبوو، لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە هەتا لەبەرانبەر عەرەبەکاندا توندوتۆڵ بێت کەمە. ناسیۆنالیستەکانی عەرەب ڕۆژ لەدوای ڕۆژ هەست و سۆزی شەڕکەرانەیان زیاتر دەبوو، نموونەی وەکوو دیئانۆنزیوو لە فیووم لەلایەکەوە وورەی پێدەبەخشین، کەسێک لە بەرەنگاریکردن لەبەرانبەر زلهێزەکان سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو. لە دۆڵی بەرینی بێکا بە شاری گەورە و ڕووخاویەوە لە بالبێک، ئاژاوەگەرانی عەرەب تەقەیان لە هێزەکانی فەرەنسەیی کردبوو. (لە دەیەکانی ساڵی ١٩٧٠دا، گەریلاکانی ڕادیکاڵ لە سەرتاسەری جیهان هەستیان بەوەکرد کە ئەو دۆڵەش لەبار و گونجاو هەڵکەوتوە.) لەپشت ڕووداوەکان، گوشارێکی قورس کەوتبوە سەرشانی فەیسەڵ تا سەربەخۆیی ڕابگەیەنێت، تەنانەت ئەگەر ئەوە بەمانای شەڕکردن لەگەڵ فەرەنسە بوویێت. فەیسەڵ وەک نەبای دیبێ و نە بۆران زۆر بە کەمتەرخەمیەوە لەپەنای ڕووداوەکان تێپەری. لە ٧ی مانگی مارسی ساڵی ١٩٢٠دا، کۆنگرێسی سووریە ئەوی وەک شای سووریە ڕاگەیاند، نەوەک سووریەیەکی دیاریکراو کە بەریتانیا و فەرەنسە ڕایان لەسەربوو، بەڵکوو سووریەیەک لەچوارچێوەی " سنووره سرووشتیەکانی" ئەو وڵاتەدا، کە لوبنان و فلستین و ناوچە کەنارئاوەکانی هەتا ناوچەکانی دەوروبەری فۆرات دەگرتەوە. لەگەڵ هێزەکانی فەرەنسەیی شەڕ و تێکهەڵچوون هاتە ئاراوە. ماوەیەکی کورت بەدوای ئەو ڕووداوەدا، کۆنگرێسێکی تر کە بانگەشەی دەکرد بەناوی مێزۆپۆتامیەکان قسە دەکات لە دەمێشق بەسرا. ئەو کۆنگرێسە سەربەخۆیی ڕاگەیاند، برای فەیسەڵی وەک شا عەبدوڵا ڕاگەیاند، و داوای کرد کە بەریتانیەکان کۆتایی بە داگیرکاریەکانی خۆیان بهێنن.٩٤٢

ئەوەی ڕاستی بێت، تەنانەت لە چوارچێوەی سووریەشدا، فەیسەڵ پشتگریەکی تەواوی لێ نەدەکرا. مەسیحیەکانی لوبنان، کە نەیاندەویست تێکەڵاوی شەڕوقڕە لەگەڵ فەرەنسە بن، لە

کۆبوونەوەیەکی گەورەی ٢٠ی مانگی مارسی ساڵی ١٩٢٠دا سەربەخۆیی جیاوازی خۆیان ڕاگەیاند، و سێ ڕەنگی ئاڵای فەڕەنسەیی لەگەڵ داری سنەوبەری لووبنانی لە ناوەڕاستدا وەک ئاڵا هەڵبژێردرا.٩٤٣ لە هەمان کاتدا، عەرەبە ڕادیکاڵەکان فەیسەڵیان بە زۆرگوێلەسمتبوونی فەڕەنسەیەکان تاوانبارکرد. لە مانگی ژوولایدا، گۆرۆد ئۆلتیماتۆمیکی بۆ فەیسەڵ نارد، هاوڕێ لەگەڵ شتی تر، داوای قەبووڵکردنی بێ گرێ و گۆڵی ماندێتی فەڕەنسەیی بەسەر سووریەدا و سزادانی کەسانێک کە هێرشیان کردبوە سەرفەڕەنسەیەکان کردبوو. فەیسەڵ هانای هێنابوە بەردەمی زلهێزانی تر، ئەوانیش لە وڵامدا بەحاڵ و دووبەڵا لێیان بە هاوسۆزی و هاوخەمیدا هێنابوو. لە ٢٤ی مانگی ژوولایدا، لەسەر جادەی دەمێشق، هێزەکانی فەڕەنسەیی هیزێکی لاوازی سووپای عەرەبیان ڕامالیبوو. فەیسەڵ و بنەماڵەکەی بەرەو فلستین و دواتر بەرەو ئیتالیا دوورخرابوونەوە.

بۆ ئەوە کە سووریە بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە، فەڕەنسەیەکان بچووکیان کردبۆوە. ئەوان بە زۆرکردنی سنوورەکانی کێوی لوبنان لەگەڵ دۆڵی بیکا، بەندەرەکانی مەدیتەرانەی تایرێ، سیدۆن، بەیرووت و تریپۆلی، و ناوچەی باشوور، باکووری فلستین، هاوپەیمانانی مەسیحی خۆیان خەڵات کردبوو. لەوکاتەدا هەزاران مسوڵمان پێوەندیان بە وڵاتێکەوە گرتبوو کە مەسیحیەکان بەسەریدا زاڵ بوون. ئاکامەکەی سووریەیەک بوو کە تەنانەت دوائەوە کە فەڕەنسەیەکان چۆڵیان کردبوو هێشتا هەرلەبیری نەچووبۆوە کە چی دۆڕاندوە، و لوبنانێک کە لەنێوان قەیرانگەلی ڕەگەزی و ئایینیدا لەسەرکۆشی ئەم و ئەو هەڵدەپەڕا. لە دەیەکانی ١٩٧٠دا، لوبنان تەقیەوە؛ کەس لای سەیر نەبوو بیانیەکان نەبێت کاتێکە حکوومەتی سووری لە دەرفەت کەڵکی وەرگرت و هێزەکانی خۆی خزاندە ئەوێوە، کە هەر لەوکاتەوە لەوێ ماونەتەوە.

لای عەرەبەکان، ساڵی ١٩٢٠ ساڵێکی پڕ لە کارەساتە: فلستین لەدەست چوو، دواتر سووریە، لوبنان و لە ئاکامدا مێزۆپۆتامیا. لە هاوینی ساڵی ١٩٢٠دا، شۆڕش و ڕاپەڕین لە نزیک بە یەک سێهەمی مێزۆپۆتامیا، سەر و خوارەوەی چۆمی فۆڕات و ناوچە کوردنشینەکانی موسڵ سەریام هەڵدا. بێڵ، کە بۆماوەیەکی دوورودرێژ هەڵگری ئەم بیرۆکەیە بوو کە مێزۆپۆتامیا پێویستی بە حکوومەتێکی خود-موختار و سەربەخۆ هەیە، سەبارەت بەمە هۆشداری دابوو. ئارنۆڵد ویلسۆن، کە چیتر ئەو دۆستایەتیەی جارانی لەگەڵ نەمابوو، هەمووی ئەو تاوانەی دەخستە ئەستۆی ئاژاوەچیانی دەرەوە و کاریگەری چاردەخاڵە هاوناوەکەی خۆی.٩٤٤ هێڵەکانی ڕێگای شەمەندەفەر پچڕان و شارۆچکەکان گەمارۆدران؛ ئەفسەرانی بەریتانی کوژران. بەریتانیەکان بەپەلە کەوتنەخۆ، بۆ سەرتاسەر ناوچەکە گەشتگەلی سزادەریان نارد تا گوندەکان بسووتێنن و بەزۆری یارمەتیان لێوەرگرن. لە تاکتیکێکی تازە بەڵام زۆر کاریگەردا، ماشێنی جەنگی فڕۆکەوانی ئەوان لە ئاسمانەوە تەقەیان دەکرد و وڵاتیان بۆمباران دەکرد.

لە کۆتایی ساڵدا، پشێوی و ئاڵۆزی نەمابوو و ویلسۆن لەلایەن مامۆستای ئامۆژگاریکەری دێرینی خۆیەوە، کۆکسی بە بەراورد دیپلۆماتیکتر، جێگۆڕکێ کرابوو.

ڕووداوەکانی ناو مێزۆپۆتامیا حکوومەتی بەریتانیان پیس لەرزاندبوو. چێرچیل وتبووی " داروديوار بکەین ناتوانین تاقە سەربازێک بدۆزینەوە." ڕخنەگران پرسیاریان دەکرد کە ئایا مێزۆپۆتامیا شیاوی ئەو هەموو خەرجە هەیە. کۆرزۆن، چێرچیل و لیۆد جۆرج هەرهەموویان خوازیاری ئەوەبوون کە ئەوەندەی لە دەستیان دێت ئەو ناوچەیە ڕاگرن. تەنیا ڕێگە چارەی هەرزان و بەکردەوە، کە بێل و کۆکس لەسەری سووربوون، دۆزینەوەی دەسەڵاتدارێکی گوێڕایەڵی عەرەب بوو. کەسێکی چاک و لەباریان بۆ ئەو مەبەستە پێ شک دەهات کە ئەویش فەیسەڵ بوو و بە لەونێک خۆشیان بە قەرزداری ئەو دەزانی. لە کۆبوونەوەیەکدا لە قاهیرە لە مانگی مارسی ساڵی ١٩٢١دا، چێرچیل، وەک ئەمینداری کۆلۆنیایی، ڕەزایەتی دا تا ئەو بکەن بە شا. وەک خەڵاتێکی دووهەم، برا گەورەکەی ئەو عەبدوڵڵا، " پیاوێکی هەتابڵێی تەوەزەل و هەوەساوی و بێکارە"، وڵاتی بچووکی ترانسجۆردانی پێدەبرا. دەستبەجێ فەیسەڵیان بۆ مێزۆپۆتامیا بانگێشت کرد، شوێنێک کە شاندێکی بەڕێوەبەر بە سەرۆکایەتی کۆکس و بێڵ داوایان لێکرد تا وەکوو شای ئەوان بمێنێتەوە. ئیس.تی.جان فیلبای، کە پشتگری لە کۆماریەک دەکرد و بە دەنگی بڵیند ئەمەی دەکوتەوە، بە باروبنەوە حەواڵەی ئەوێ کرا. هەڵبژاردنێک هاتە ئاراوە لە سەدا ٩٦ی دەنگەکان بۆ فەیسەڵ بوو. بێل ئاڵای تایبەتی بۆ دانا، تاجی لەسەر نا و مەقامی پاشایەتی پێ بەخشی. ئەو ئاخێکی هەڵکێشا و وتی" شەرت بێ بۆنەیەکی تایبەت بۆ بارەگای فەیسەڵ دامەزرێنم." لە ٢٣ی ئۆگستی ساڵی ١٩٢١دا، بەیانی زوو لە کەش و هەوایەکی ساردا، فەیسەڵ تاجی پاشایەتی شوێنێکی خرایە سەر کە لەوە بەدواوە بە "وڵاتیکی باش ڕیشەداکوتاو" ناوی دەرکرد: ئێراق. بێل لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە " دیتنی هەمووی ئێراق، لە باکوورەوە بەرەو باشوور، هەرهەمووی بەگشتی شتێکی سەرسوورهێنەر بوو. ئەوە یەکەم جارە لە مێژوودا شتی وا ڕووی دابێت."٩٤٥

گێرترۆد بێل لە سەرەتاوە هەر لەگەڵ فەیسەڵ بوو، کاتێکە ئەزموون و باوەڕبەخۆی زۆربوو، ئیتر ڕاوێژی هەڵنەدەگرت.٩٤٦ ئەو بەگشتی نیشانی دابوو کە زۆر کەلەڕەقترە لەوەی کە بەریتانیەکان بەتەمابوون. ئەو بۆ سەربەخۆیی وڵاتە تازەکەی خۆی زۆری هەوڵ دا، و لە ساڵی ١٩٣٢دا ئێراق وەک وڵاتێکی سەربەخۆ پێوەندی بە کۆمەڵەی گەلانەوە گرت. ساڵی دواتر فەیسەڵ کۆچی دوایی کرد. کوڕەکەی ئەو، هەوەسبازێکی بەکەیف، لە ساڵی ١٩٣٩دا لە پێکدادانی دوو ئۆتۆمبێلدا گیانی لەدەست دا. جێگری ئەو، نەوەی کوڕی فەیسەڵ، لە کۆدەتایەکی ساڵی ١٩٥٨دا کە ئیراقی کرد بە کۆماری کوژرا. حوسەین، باوکی فەیسەڵ، کە هیواداربوو زنجیرەیەک حکوومەتی پاشایەتی

هاشمیە بۆ دەسەڵاتدارێتی جیهانی عەرەب درووست بکات، یەکەم جار ئەقڵی و دواتریش تەختی پاشایەتی لە حەجاز لە ساڵی ١٩٢٤دا لەدەست دا، هەتا ئیبنی سەعوود لەکۆتاییدا دەستی بەسەرداگرت و شانشینێکی دامەزراند کە ئێستاش هەر هەڵگری ناوی ئەوە. تەنیا شانشینێکی هاشمیە کە ئێستاش هەر دەوامی هەبێت ئۆردۆنە، شوێنێک کە عەبدۆلا، بەگرتنەدەستی دەسەڵاتێکی کارامە، هەمووڵایەکی سەرسام کرد. نەتیجەی عەبدۆڵا ئێستا پاشایە.

تی.ئی.لۆرێنس، کە بەدوای شەڕی ناو بیابان قەت ڕوی خۆشی نەدیەوە، ئەویش هەر لە پێکدادانێکدا، لە ساڵی ١٩٣٥، کاتێکە بە ماتۆڕسیکلێت بەپەلە لایدا و نەیدەویست لە دوو گەنج بدات گیانی لەدەست دا. گێرترۆد بێل لە ساڵی ١٩٢٦دا تووشی خۆکوژی هات. ئارنۆڵد ویلسۆن خزمەتگوزاری کۆماری وەلانا و لەوەبەدواوە بۆ نەوتی ئینگلیز-ئێران ئیشی دەکرد. لە تەمەنی پەنجاوپێنج ساڵیدا وەک تۆپچی هێزی هەوایی بەسەر دۆنکیرک لەکاتی تەقەکردندا کوژرا. پیکۆت، کەسێک کە ڕێکەوتننامەکەی لەگەڵ ساکێس کێشەیەکی وەها ئاڵۆزی لەنێوان فەڕەنسە و بەریتانیادا درووست کردبوو، لە بێ ئابڕووییدا دەستی لە کارەکەی خۆی هەڵگرت. دوا ئەوە کە لە ساڵی ١٩٢٠دا گەڕێندرایەوە بۆ سووریە، بە کەشتی حەواڵەی بۆلغارستان کرا، شوێنێک کە بەبۆنەی نزیکی کردن لەگەڵ ژنێکی ئابڕووچواو ئەوەندیکە ئابڕووی خۆی برد. پۆستێکی تر کە لە بۆنسئایرێس پێی بەخشرا بە نەداینی پسۆلەکانی پارە ئەوەندەی تر بەدناوی پاش خۆی بەجێ هێشت. ئەو لە ساڵی ١٩٣٢دا لە خزمەتگوزاری دیپلۆماتیکی فەڕەنسەیەکاندا خانەنشین کرا و لە مێژوو ناوی سڕدرایەوە.٩٤٧

بەریتانیا و فەڕەنسە بەهۆی ڕۆڵێک کە لە ڕێکەوتنامەکانی ئاشتیدا لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین گێڕابوویان بە ئاکامی کردەوەی خۆیان گەیشتن. فەڕەنسەیەکان قەت نەیانهێشت سووریە ڕووی خۆشی ببینێ، و سووریەش لەبەرانبەردا خەرجی خۆشی دەرنەدەهێنا. بەریتانیەکان هەتا توانیان بەخێرایی لە ئێراق و لە ئۆردۆن پاشەکشەیان کرد، بەڵام هەستیان بەوەکرد کە خەریکن گیرۆدەی فلستین و کەش و هەوایەکی گەلاوی نێوان عەرەبەکان و جوولەکەکان بوون. جیهانی عەرەب بەگشتی قەت خەیانەتەکەی خۆی لەبیر نەچۆوە و دوژمنایەتی عەرەب لەسەر زایۆنیزم لە فلستین وەک نموونەیەک لە خەیانەتی دەم و دەست حازری ڕۆژئاوا کۆبۆوە. عەرەبەکانترووسکەی هیوای یەکیەتی عەرەب لە کۆتایی شەڕیان هەر لەبیرمابوو. دوای ساڵی ١٩٤٥، ئەم وەڕەزبوونانە و ئەم هیوایە باڵی بەسەر ڕۆژهەڵاتی ناڤیندا کێشابوو.

* * * *

# ٢٨

# فلستین

لە کۆتایی مانگی فەوریەی ساڵی ١٩١٩دا کیمیاگەرێکی لێکۆڵینەری نێوان-تەمەنی بەریتانی لە پاریسەوە نامەیەکی بۆ خێزانی نارد و تێیدا هێنابووی: "دوێنێ، ٢٧ی مانگی فەوریە، کاتژمێر ٣:٣٠ پاش نیوەڕۆ لە کوای دیکۆرسای کۆبوونەوەیەکی لەمێژینە هاتە ئاراوە. ساتێکی زۆر سەیر بوو، خۆشترین ساتی ژیانم!." چەیم ویزمەن هاوڕێ لەگەڵ شاندێک لە هەڤاڵە زایۆنیستەکانی خۆی هاتبوو بۆ شۆڕای عالی هەتا بۆمەبەستی کردنەوەی ماڵ بۆ جوولەکەکان لە فلستین بەڵگەی چەسپاو بێنیتەوە. ئەو ڕۆژە ئەو لە پاریس بە کورتی، بە ورە و بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا قسەی کردبوو. ئەو دەستەوداوێنی بەرژەوەندی-تاکی زلهێزان ببوو: بەملوێن جوولەکە لە هەوڵی ئەوەدا بوون تا ئیمپراتۆرە کۆنەکانی ئوتریش و ڕووسیە چۆڵ بکەن. دەیانتوانی بۆکوێ بچن؟ " زلهێزانی گەورە بەشێوەیەکی سرووشتی هەر بیانیەک کە بانگەشەی دەکرد تا هەنگاو دەنێتە ناو وڵاتی ئەوان دەپشکنی، و جوولەکە وەک بیانیەکی بێ خانەولانە سەیردەکران." تەنیا ڕێگاچارەی ئاشکرا ئەوە بوو ڕێگەیان بدرێتێ تا بچنە ناو فلستین؛ ئەوێ چۆڵ و هۆڵ بوو و جێگای باشی هەبوو. بە پارە و بە کارەوە، کە جوولەکەکانی جیهان ئامادە بوون هەرکیان دەستەبەربکەن، ئەوێ دەیتوانی پشتگری لە ملوێنان کەسی تر بگرە زیاتریش بکات. ئەوەی کە پێویست بوو سیگناڵێک بوو لەلایەن ئاشتیکەرانەوە. ئەو داوای ئەمەی دەکرد، ئەو بەشانازیەوە دەیکوت: "بەناوی ئەو خەڵکانەی کە بۆماوەی هەژدە سەدە شەهادەتیان چەشت." کاتێکە کۆتایی بە قسەکانی هێنا، بە خێزانەکەی خۆی گێڕایەوە" سۆنینۆ هەستا سەرپێ و هەر لەوێدا پیرۆزبایی پێوتم و دواتر، بەڕێز باڵفۆر و هەمووی ئەوانی تر وایانکرد، بێجگە لە فەرەنسەیەکان."٩٤٨

شاندی لەوچەشنە لە پاریس یەکجار زۆربوون و داواکاریەکانیشیان هەر زۆر بوون. زایۆنیستەکان کاریگەری یان هێزی چکسلەواکیەکان یان پۆڵەندیەکانیان نەبوو، و لەنێو مێشکی جەماوەردا کێشەیەکی جوولەکە وەک کێشەی ئەرمەنیەکان نەبوو. ئەوان لە شوێنە بەهێزەکاندا هەندێک دۆستیان هەبوو، بەڵام ئەوانیش لەگەڵ دوژمنایەتی و نابەرانبەری ڕووبەڕوو ببوونەوە. بەسەر ئەمانەشدا ویزمان مافی خۆی بوو هەست بە خۆشحاڵی بکات. ئەو دەیزانی کە، هەرچەند فەرەنسەیەکان دوژمن بوون، ئەمریکیەکان و بەریتانیەکان لەپشتی بوون؛ لەڕاستیدا، ئەو پێشتر لەگەڵ ئەندامانی شاندەکانی ئەوان وتەکانی خۆی پشکنی بوو و هەڵەکانیان ڕاست کردبۆوە.٩٤٩ ویزمان و زایۆنیزم لە شوێنە سەرەکیەکانی خۆیان ڕێگایەکی دووریان بڕیبوو و هێشتا ڕێگایەکی دووری تریشیان لەبەربوو کە دەبوایە بیانبڕیایە.

ویزمەن کوڕی دارفرۆشێکی سادە، لەدایکبووی ساڵی ١٨٧٤ لە ڕووسیە، بە واتەی خۆی، گوندێکی تەریک لە یەکێک لە سووچە هەرە دووردەست و تاریکەکانی پەیل ئاف سێتلمێنت بوو." نزیک بە نیوەی جوولەکەکانی جیهان، حەوت ملوێن کەس، لە ڕووسیە دەژیان، زۆربەیان بەزۆر هێنرابوونە پەیل، شوێنێک کە ئەمڕۆکە بەلاڕووسی، ئۆکراین و پۆڵەندی ڕۆژهەلاتی پێدەڵێن. ئەو وڵاتە دەشت و زۆلکاو بوو- بە واتەی نووسەرێکی جوولەکە " دڵتەنگ و هیلاککەر" بوو-زستانانی سارد و هاوینانیشی تاقەت پڕووکێن بوو. جوولەکەکان لە داب و نەریت و بیروباوەڕدا دەوڵەمەند و بەهێز بوون، لە شتەکانی تردا لاواز و دەستەنگ بوون. هاوکات کە ژمارەیان دەچووە سەرێ، زەوی و زارێک کە دەبوایە لەلایەن حکوومەتی تزارەوە پێیان بدرایە هەر لەو ئاستەی جاران دابوو و زیادی نەدەکرد. چاودێرێک وتبووی " وەک کولەی بچووک لەناو قۆرتێکدا کە بە هەزاران دانە کەوتبێت بەسەر یەکدا جوولەکەکانی ڕووسیەش ئاوا لە قەرەباڵغیدا دەژیان." حکوومەتێک کە لەنێوان بێ لایەنی و دڕندەیی ئەم لاو ئەو لای دەکرد، لەبەرانبەر کۆمەڵکوژیەکان و سەرهەڵدانەکانی دژە-جوولەکە هیچ ڕێگەچارە یان شێوەی بەرەنگاریکردن نەبوو. شاعیرێکی جوولەکە وتبووی" ژیان ناخۆش و دژوارە، دوورلە هەر خۆشیەک، دوورلە هەر شان و شکۆیەک، دوور لە هەر تروسکایی هۆمێدێک، ژیانێک کە وەک چێشتی ئاوتام وایە ، بێ خوێ و بی تام."٩٥٠

تەنانەت لەو جیهانەشدا، بیروباوەڕەکان دەبزووتن، بیروباوەڕەکانی سوسیالیزم، دیموکراسی، ناسیۆنالیزم. هەندێک لە جوولەکانی، بە لای شۆڕشدا گەڕان؛ سەدان هەزار جوولەکە ڕوویان کردە ئەمریکا و ئورووپای ڕۆژئاوا. لە ساڵەکانی بەرلە ساڵی ١٩١٤، حەشیمەتی جوولەکەکان لە وڵاتەیەکگرتوەکان لە ٢٥٠،٠٠٠ کەس بۆ ٣ ملوێن کەس تێپەڕی؛ لە بەریتانیا، لە ٦٠،٠٠٠ کەس

بۆ ۳۰۰،۰۰۰ کەس تێپەری. یەکێک لەو جوولەکانەی ڕووسیە کە بەرەو ڕۆژئاوا سەری خۆی هەڵگرت ویزمەن بوو. لە ئوروپای ڕۆژئاوا، ئەو هەستی بە جیهانێکی جیاواز کرد، شوێنێک کە گیتۆکان[شوێنگەلی تایبەت بە کەمینەکان] و جیاوازی کۆنی یاسایی دژ بە جوولەکەکان کۆتاییان پێهاتبوو. جوولەکەکان توانیبوویان وەکوو بەریتانیەکان یان فەڕەنسەیەکان یان ئەڵمانیەکان، بە ئاینێکی تەواو جیاواز لە زۆربەی هاوولاتیانی خۆیان بژین. ویزمەن توانی دەستی بە هاوسەرێک، خوێندکارێکی لاوی بواری پزیشکی، خەڵکی ڕووسیە، و دوو سەوداسەری ژیانی خۆی بگات- شیمی و زایۆنیزم.

یەکەم جار زایۆنیزم- خەبات بۆ ولاتی جوولەکەکان، لەوانەیە دوڵەتێکی جوولەکە، شوێنێک کە جوولەکەکان زۆرینەیان بەدەست دەبوو، شوێنێک کە دوور لە هەر مەترسیەک دەبوون و دەیانتوانی بە شەرەفەوە بژین- سەرنجی تاقمێکی بچووک، تاقمێکی خەیاڵی، بەلای خۆیدا ڕاکێشا. هەتا ساڵی ۱۹۰۰، گۆڕانکاری زۆر هاتبوونە ئاراوە. ناسیۆنالیزم، کە لەخۆیدا لە درووستکردنی زایۆنیزمدا دەستی هەبوو، مەترسی تازەی بۆ جوولەکەکان درووست کردبوو، لەکاتێکدا کە ناسیۆنالیستەکان چاوی گومانیان بڕیبوە کەمینەکانی تری نێوان خۆیان. قینەبەرایەتی ڕەش و کۆنی ئەوروپیەکان سەبارەت بە جوولەکەکان، تەنانەت جوولەکە سێکۆلار و خۆڕێخەرەکانیش بەشێوەیەکی ترسێنەر و خافلێنەر سەری هەڵدابۆوە. باوکی سیگمۆند فرۆید لەسەر ئەوەی کە کەسێکی نەناسیاو نەڕاندبوو" جوولەکە لەسەر شۆستەی شەقام دوورکەوە" کلاوەکەی خۆی لەسەر داکەند. ژمارەیەکی بەرچاو لە فەڕەنسەیەکان، لە کانگای ئازادی، بەرابەری و برایەتی، باوەڕبوونی خۆیان بە تۆمەتێکی نارەوای خەیانەتی نیشتمانی نیشان دا چون ئەفسەرێک کە تۆمەتی لەسەربوو، ئالفرێد درەیفووس، جوولەکە بوو. لە ڤیەنی بەرلەشەڕ، شارەدار دژە-سامیەکی ناوزراو بوو و لە قاوەخانە ڕازاوەکاندا ڤیەنیەکان شۆخی بێ لەزەتی دژە-جوولەکەیان دەکوتەوە. لە ساڵی ۱۸۹۷ تئۆدۆر هێرزڵ، ڕۆژنامەنووسێکی خەڵکی ڤیەن، یەکەمین کۆنگرێسی جیهانی زایۆنیستی بەڕێوەبرد. ویزمەن لەوی تریان، و لە هەر کۆنگرێسێکی تر بەدوای ئەودا بەشداری دەکرد.

ویزمەنی بالابەرز، بە سەری بێ موو، و بە ڕیشی بزنیەوە هەرلە " لنینی باش بەخێوکراو" دەچوو، و تەنانەت لەو کاتەشدا ئیمانێکی سەیری بە خۆی هەبوو. ئەو ڕەخنەی زۆری لە کەسانی پلەبالا لە بزووتنەوەی زایۆنیستی دەگرت و هەرهەموویانی بە ترسەنۆک دەزانی. ئەو لەسەر پیلانێک بۆ کڕینی ئۆگاندا لە حکوومەتی بەریتانی و دامەزراندنی ولاتیکی جوولەکە لەوێ بە ئاشکرا نارەزایەتی خۆی بە هێرزێل ڕاگەیاند. بەڕای ویزمەن- و، بەگشتی، بەڕای زۆربەی زایۆنیستەکان-

بەتایا شوێنی گونجاو فلستین بوو، لەوکاتە پارێزگایەکی بچوکی دواکەتووی ئیمپراتۆری عوسمانی بوو. ئەویێ مەکۆی شوێنە پیرۆزەکان و وەبیرهێنەرەوەی دوایەمین میرنشینی جوولەکە بوو، کە بەدەستی ڕۆمانیەکان ڕووخابوو. کەرەتێکیان لەبابەت هۆی ئەوە کە جوولەکەکان مافیان بەسەر فلستینەوە هەیە چیە زۆر بەئاسانی لەولاَمدا وتی:" ماف لای بیرەوەریەکانە."

ویزمەن بەچاوی سووکەوە سەیری جوولەکە تواوەکان و ئەوانەی کە پشتگریان لە زایۆنیست نەدەکرد دەکرد. ئەوان کویێ بوون؛ لەوە خراپتر، ئەوان نیشتمان پەروەر نەبوون. ئەو سەبارەت بە جوولەکەکانی ئەڵمانیا کە کاتی خۆی وەک خوێندکارێک ناسیبوونی وتبووی " خاڵێکی سەرەکی کە زۆربەی جوولەکەکان لەبەرچاوی ناگرن و هۆی درووستبوونی کاکڵی تراژدیای جوولەکەکانە، ئەوەیە کە ئەو جوولەکانەی کە وزە و مێشکی خۆیان بە ئەڵمانیەکان دبەخشن لەپێناو بەهێزکردنی ئەڵمان و ئەڵمانیەکان ئەو کارە دەکەن نەک لەپێناو بیروباوەڕی جوولەکایەتیدا." وڵاتێکی جوولەکە لە فلستین پێویست بوو. ئەو پێداگری دەکرد کە " فلستین و دامەزراندنی نەتەوەیەک لەوچوارچێوەدا، بە هێزی تایبەت بەخۆیەوە و بە داب و نەریتی تایبەت بەخۆیەوە، پلە و پایەی کۆمەڵایەتی جوولەکەکانی دادەمەزراند، جۆرەمرۆڤیکی ١٠٠%جوولەکەی درووست دەکرد."[٩٥١]

لە ساڵی ١٩١٤دا ویزمەن وەک خوێنەر (مامۆستای یاریدەدەر) لە بواری بیوشیمیدا لە زانکۆ جێگایەکی بۆخۆی کردبوو. بێجگە لەوە لە ڕێکخراوەی زایۆنیستیدا تا ئاستێکی بەرز چووبوە سەرێ، کە لەوکاتە ١٣٠،٠٠٠ ئەندامی جیرەخۆری هەبوو، بەڵام ئەو بەو پێگەیە نەگەیشت کە خۆی بەشیاوی دەزانی. جوولەکەکانی ڕۆژهەڵات لایان وابوو ئەو ڕەنگ و بۆی ئینگلیزیەکانی گرتوە، جوولەکەکانی ئینگلیز لایان وابوو کە ئەو یەکجار ڕەنگ و بۆی ڕووسەکانی گرتوە. ئەو بە ڕەخنەگرتن لە هێرزل دژایەتی زۆربەی هەرەزۆری بەرەی پێشخۆی و بە گاڵتەجاڕی و هەڵنەکردن لەبەرانبەر ئازارەکاندا زۆربەی هەرەزۆری هاووڵاتیانی خۆی کردبوونی بە دوژمنی خۆی. وتارەکانی ئەو هەرهەموویان وانە و دەرس بوون، لە پلاتفۆرمی یەکەمایەتیەکەوە. ئەبا ئیبان، وەزیری دەرەوەی دواتری ئیزرائیل، وەکوو لاوێک ئیشی بۆ ئەو کردبوو: "ئەو ئابووریەکی زانستیانەی لە دەربڕینی هەست و سۆز، مانایەکی سەختی حەقیقەتەکان، و بەگشتی پێداگریەکی سەرسەختانە لەسەر باسکردنی دژواری و ناخۆشی جێبەجێکردنی ئەرکی زایۆنیستی خۆیان بۆ بیسەرانی جوولەکە دەرخست." لە ئاکامدا ویزمەن بوو بە ڕێبەری زایۆنیزم چون کەسی تر نەبوو کە بتوانێت ئەو ئەرکە بەجێ بێنێت. ئەو هەر ڕوولە ناهۆمێدی دەچوو، زۆرجار هەڕەشەی دەست لەکارکێشانەوەی لێدەکرا، بەڵام قەت لە ئامانجی لەمێژینەی خۆی واتە دامەزراندنی وڵاتێکی جوولەکەنشین لە فلستین سارد

نەدەبۆوە. ڕەنگە گەورەترین یارمەتی ئەو بۆ زایۆنیزم توانایی لەڕادەبەدەری ئەو بوویێت بۆ زاڵبوون بەسەر کەسایەتیە ناودارەکاندا، هەم لەچوارچێوەی کۆمەڵەی جوولەکەکاندا و هەمیش لەنێوان ڕێبەرانی جیهانیدا. ئەو لای نەیارێکی خۆی وتبووی: " من چایم ویزمەن، وەک جوولەکەیەک لە پینسکەوە و تەنیا مامۆستایەک لە زانکۆیەکی هەرێمیەوە، لە هیچەوە دەستم پێکرد و توانیومە گوڵی جوولەکەبوون لەپێناو پرۆژەیەک ڕێبخەم کە شیمانەدەکرێ لەلایەن ڕۆسچیلد(لۆرد) و لایەنگرەکانی ئەو وەکوو کارێکی شێتانە سەیر بکرێت."٩٥٢

به دەستپێکردنی شەڕ، ویزمەن دندەیەک چوە سەرێ. بەپێی لێکدانەوەی خۆی نزیک بە ٢،٠٠٠ کۆڕوکۆبوونەوەی لەگەڵ سیاسەتمەداران، خزمەتگوزارانی ناوخۆ، دیپلۆماتەکان بەڕێوە بردوە: هەرکەس کە ڕاکێشانی فلستین بۆ جوولەکەکان بەکارهاتبێت. ئەو دەستبەجێ بەرەنگاری قینەبەرایەتیەک بۆوە کە چینە باڵادەستەکانی بەریتانی سەبارەت بە جوولەکەکان و بیانیەکان بەکاریان دەهێنا و سەرکەوتنی بەدەست هێنا. سیسیل وتی کە مرۆڤ بە سەرسووڕمانەوە " ڕواڵەتی قزێون و هەرە ناشیرینی ئەو لەبەرانبەر سەوداسەربوونی ملکەچی و کاریگەری لەڕادەبەدەری شێوەتێڕوانینی ئەو" لەبیردەکات.٩٥٣ ویزمەن توانی بەسەر سیسیلدا فایەق بێت؛ لەوەگرنگتر، ئەو دوای ساڵی ١٩١٦یەکێک لە ئامۆزاکانی سیسیل بالفۆری کرد بە وەزیری دەرەوە. ئەوە دۆستایەتیەکی سەیر بوو- جوولەکەیەکی بەهێز و بەوەفا لە پەیلەوە و پیاوێکی خوێنشیرین و ناوداری ئینگلیزی کە بە کەیسێکی لەوچەشنەوە لە قۆناخگەلی ژیانیدا ڕامالدرابوو- بەلام بۆ زایۆنیزم و ویزمەن ئەوە زۆر هەستیار بوو.

* * * *

قەت نەدەکرا هەروا بە ئاسانی قسە لە دەمی بالفۆڕ بکێشیە دەرێ: فەیلەسووفێک کە سیاسەتمەداری لێدەرهاتبوو؛ جوانپەرستێک کە ئاشقی تێنیس و گۆلف بوو؛ بێ ڕەحم، وەک ئیرلەندیەکان بەش بە حاڵی خۆیان بۆیان دەرکەوتبوو، بەلام لەبەرانبەر ژێردەستەکانی خۆیدا هەتابلێی بەڕەحم و بەئەدەب بوو. کەرەتێکیان ناوی نووسەرێکی ورووژێنەری لەبیرچووبۆوە بەزاریدا نەدەهات، ئەو تا ڕادەیەک دڵتەنگ بوو. بەنارەحەتیەوە وتی: " هەمیشە هەروابووە، هەر ناسوپاسی و هەر ناسوپاسی." زەردهەڵگەڕاو، بە بەرگی ئاسایەوە، بە زەردخەنەیەک لەسەر لێوانەوە، کەسێک وتبووی، " دەتکوت مانگەشەوە و لەسەر کێلی داوە،" ئەو زۆرکەم هەڵدەکەوت خۆی یان کەسێکی تر بەهەند بگرێت. ئەو وتاربێژێکی گەورەی پەرلەمانی بوو، بەلام زۆر بایەخی نەدەدایە. ئەو بە چێرچیلی وتبوو: " ئەوەی بە زارمدا دێ دەیلێم و لە کۆتایی یەکەمین دێڕی ڕێزمانیدا دەنیشمەوە." ئەو لە

کاتی نانی نیوەڕۆدا وتبووی کە، بەداخەوە، کاتێکە دێتە سەر ئەوەی کە بڕیارێک ڕابگەیەنێت تووشی حاڵەتێکی نائاسایی دەروونی و مێشکی دەبێت: " من هەموو وتوویژێکم دێتەوەبیر، هەمووی قازانجەکان و زیانەکانم دێنەوەبیر، و تەنانەت وتارێکی باش سەبارەت بە تەوەرەکە ڕادەگەیەنم. بەڵام لە دەرەنجام و لە بڕیاری کۆتاییدا دەمێنمەوە و نازانم چی بکەم." داکۆکیکەرەکانی ئەو ئەمەیان ناو نابوو خۆنواندن، درووست وەکوو عادەتی مانەوە لەناو جێدا هەمووی دانی بەیانی کە بەناوی تێکۆشان و هەوڵی بێ وچان ناوی لێدەبرد. کەسانیتر زۆر باوەڕیان نەبوو. چێرچیل وتبووی: " ئەگەر تۆ خوازیاری ئەوە بوویتایە کە کارێک جێبەجێ نەبێت، بۆ ئەو ئەرکە ئەی.جی.بی. بێ گومان باشترین پیاو بوو." کەرەتێکیان لە لیۆد جۆرج سەبارەت بە پێگەی باڵفۆر لە مێژوودا پرسیاریان کرد لە وڵامدا وتبووی:" وەکوو بۆنی دەسرەسڕێکی ناوگیرفان وایە."٩٥٤

لەلایەن باوکیەوە سامانێکی زۆری بەمیرات پێگەیشتبوو کە ئەوی کردبوە دەوڵەمەندترین پیاوی بەریتانیا؛ لەلایەن دایکیەوە، ژنێک بەبیروباوەڕێکی قورسی ئایینیەوە، داب و نەریتی خزمەتی کۆمەڵایەتی و سیاسەتی کۆنەپارێزانەی بنەماڵەی سیسیلی پێگەیشتبوو. وەکوو کۆرزۆن، کە لە دایرەی دەرەوەدا ببوە جێگری ئەو، ئەو ببوو بە بەشێک لە جیهانی گەرم و خۆش و ئاریستۆکراتیک کە تێیدا هەمووی مرۆڤەکان بەشێوەیەک پێکەوە لەپێوەندی دابوون. ئەو بۆ یەکەمین جار کچێکی دیاری کرد، بەڵام ئەوەندەی نەبرد کە بەهۆی تەب و یاوی تیپۆئید گیانی لەدەست دا. ئەو قەت ژنی نەهێنا، و یەکێک لە خوشکە وەفادارەکانی ماڵیکی بۆگرت. ئەو لەگەڵ بنەماڵە و هاوڕێکانی لەپێوەندی دابوو، بەڵام لەڕاستیدا ئەو پێویستی بە ئەوان نەبوو. وەک لە نامەیەکدا بۆ یەکیان نووسیبووی، " ئێوە وەکوو جاری جاران پێویستن- بەڵام چلۆن پێویستیەک؟ چلۆن پێویستیەک هەریەک لە ئێمەمانان بە یەکترمان هەیە؟٩٥٥

ئەو زیرەک بوو، بیرۆکەکان سەرنجیان ڕادەکێشان، و توانایەکی گەورەی لە گرتنی ناوەڕۆکی وتوێژێک هەبوو. بێجگە لەوە ئەو، بەشێوەیەکی ترسێنەرانە، زۆر بێ لایەن بوو. لە هەرەتی زۆربوونی کەرەسەی جەنگی ژێردەریایی ئەڵمانیدا، کە هەڕەشەی خەفەکردنی ئابووری بەریتانیا دەکرد، تەنیا وڵامی ئەو لەبەرانبەر ژمارەی ئەو کەشتیە نووقمکراوەکان ئەمە بوو" زۆر شتێکی ناخۆشە بەلامەوە. ئەم ئەڵمانیانە لەگەڵیان هەڵ ناکرێت." لیۆد جۆر وتبووی کە لە دانیشتنەکانی کابینەدا بالفۆر کەیسێک بە تاوتینێکی تایبەتەوە پێشکەش دەکات و دواتر، دوای وەستانێک، بەڕەوانبێژیەکی هاوچەشن درێژە بە باسەکەی دەدا و لە کۆتاییدا بە ئاخێکەوە دەڵێ: " بەڵام ئەگەر ئێوە لەمن پرسیار بکەن لەوکاتەدا من دەبێ چ جۆرە ڕەوتێکی فکری بگرمە بەر پێویستە بڵێم لەوکاتەدا من هەست بە

ئاڵۆز سەرلێشێواوی دەکەم." کۆرزۆن، کە ئەوی بەجوانی دەناسی، ئەوی وەک شەیتان و پیاوێکی مەترسیدار سەیر دەکرد:

لەدڵەوەنزیکبوونی کردار و ڕەوشتی ئەو، بۆچوونی لەڕادەبەدەر ڕۆشنبیرانەی ئەو، کەمتەرخەمی ئەو لەبابەت وردەباسی کەم بایەخ، توانایی ئەو لە بەڵگە و بیانووهێنانەوە، ڕێبازی لەمێژینە و پرشنگداری ئەو لە خزمەتی کۆمەڵایەتیدا، پووشی بەسەر چاوی هەموولایەکدا کردبوو جگە لەوکەسانەی کە ئەویان لەچوارچێوەی ڕژێمێکی بێ لایەن، کەمتەرخەم و سەرەڕۆدا دەناسی. ئەو قەت وتارەکانی خۆی نەدەخوێندەوە، ئەو قەت لە حەقیقەتەکان سەری دەرنەدەهێنا، لە کابینەدا ئەو زۆر بەکەمی تێلیگرامەکانی ئۆفیسی دەرەوەی بەیانیانی دەخوێندەوە، و ئەو قەت سەیری دواڕۆژی نەدەکرد. ئەو پشتی بە توانایە کەم وێنەکانی سەرپێی چارەسەرکردنی هەرکێشەیەک کە ڕووبەڕووی دەبۆوە و تواناییەکانی دەربازبوون لە قەیرانێک بۆ یەکی تر هەروا بەئاسانی بەستبوو.٩٥٦

ئەوەی کە زۆر جێی سەرسووڕمانە، بەم پێیە، ئەوەیەکە بالفۆر نەک تەنیا خۆی بە قەرزداری زایۆنیزم دەزانی، بەڵکوو پێداگریشی لەسەر دەکرد. یەکێک لە ژێردەستەکانی ئەو لای وابوو کە ئەو لەڕاستیدا سەبارەت بە هیچ شتێکی تر بیر ناکاتەوە. ئایا ئەوە بارهێنانی ئایینی سەرەتای ژیانی ئەو بوو، بە واتەی لیۆد جۆرج، کە زانیاریەکی قووڵی لە مێژووی جوولەکەکان بە ئەو بەخشیبوو؟ یان توانا سەرسووڕهێنەرەکانی ئەو سەبارەت بە جوولەکەکان؟ ئەو بە نیکۆلسۆنی وتبوو کە جوولەکەکان " بەتواناترین ڕەگەزێکن کە تا ئێستا مرۆڤایەتی لەسەردەمی یوونانیەکانی سەدەی پێنجەمەوە بەخۆیەوە دیوە." وەکوو کەرەتێکیان بۆخۆی وتبووی ئایا ئەو لە زایۆنیزم " پارێزەرانی درێژەی نەریتەکانی ئایینی و ڕەگەزی دەدیت کە جوولەکەی خۆڕاگر و نەتواوەیان کردبوو بە هێزێکی گەورەی کۆنەپارێز لە جیهانی سیاسەتدا"؟. لە وتوێژێکدا لەگەڵ هاوس، بالفۆر ئاماژەی کردبوو کە "کەسێک بۆ ئەوی گێڕاوەتەوە، و ئەویش باوەڕی پێ کردوە، کە بەگشتی هەمووی بیروباوەڕی بۆلشویزم و ئاژاوەکانی تایبەت بە سرووشتێکی لەو چەشنە، ڕاستەوخۆ دەگەڕێنەوە بۆ جوولەکەکانی جیهان. ئەوان پێدەچێ سووربن لەسەر ئەوەکە یان بەوەی کە خوازیارین بگەن یان شارستانیەتی سەردەم دڵتەنگ بکەن." هاوکات کە ئەو بیروباوەڕی دژە-سامی بە ڕەشۆکی و دوورلە ئەدەب، تەنانەت، ڕیسوا، دەزانی لەگەڵ ژنەدۆستێکی نزیک بۆڵاندبوو کە گوایە ئەو کۆتایی حەفتەی لەگەڵ تاقمێکی زۆر جوولەکەی ڕابواردبوو: "من ڕام وایە کە هێبرووەکان زۆرینەیەکی واقیعیان بەدەستەوەبوو- و هەرچەند من دژ بە ڕەگەز هیچ دژایەتیەکم نیە (تەواو بەپێچەوانە) من تازە خەریک بووم لە مەبەستی ئەوانەی کە لەبەرانبەر کۆچکردنی بیانیدا دەوەستان تێدەگەیشتم." کارکردنی

پێکەوەی مێشک و دڵی ئەو بۆ هەتاهەتایە وەک نهێنیەک دەمێنێتەوە. ماوەیەکی کورت بەرلەوەی کۆچی دوایی بکات، یەکێک لە خوشکەزاکانی لێی بیستبوو کە وتبووی" بەگشتی ئەو هەستی دەکرد کە ئەوەی کە ئەو توانیبووی بۆ جوولەکەکانی بکات وەک بەنرخترین کارێکە توانیویەتی بەئەنجامی بگەیەنێت ناوی لێدەبرد."٩٥٧

بالفۆر بۆیەکەمجار لە ساڵی ١٩٠٦دا چاوی بە ویزمەن کەوت: "لەو وتوێژە لەگەڵ ویزمەن بوو کە من هەستم کرد شێوەی نیشتمانپەروەری جوولەکەکان شتێکی کەم وێنە و تایبەت بەخۆیانە. خۆشەویستی ئەوان سەبارەت بە وڵاتەکەی خۆیان بەدڵی پیلانەکەی ئۆگاندا نەبوو." لە ساڵی ١٩١٤دا هەردووکیان بۆ جارێکی تر پێکەوە کۆبوونەوە و، بەبۆچوونی ویزمەن، باڵفۆر بە هەست و سۆزێکی ئاشکراوە وتی کە "ئەوە کێشەیەکی گەورەیە کە ئێوە خەباتی بۆدەکەن؛ من حەز دەکەم ئێوە نەک ئەم جارە بگرە دەیان جاری تر بێیەوە."٩٥٨ تەنیا لایەنگری ویزمەن بالفۆر نەبوو. چێرچیل، سایکێس و سی.پی.سکات هەرهەموویان لایەنگرانی ئەو بوون. لەهەمووی ئەمانە گرنگتر، لیۆد جۆرجیش پشتگری لێدەکرد.

وەکوو بالفۆر، لیۆد جۆرج لەگەڵ ئەنجیل گەورە ببوو. " سەبارەت بە مێژووی جوولەکەکان زۆرزیاتر لە مێژووی وڵاتی زێدی خۆم وانەیان پێ وتووم. من ئێستا دەتوانم ناوی یەک بە یەکی پاشاکانی ئیزرائیلت بۆ بڵێم. بەڵام پێم وانیە بتوانم نێوی پاشاکانی ئینگلیزت بۆبڵێم، یان پاشاکانی وێلز پێم وانیە هەموویانم لەبیرمابێت." و وێلزیەکان و جوولەکەکان بەڕاستی وەکوو یەک وانەبوون: لەباری ئایینەوە، بلیمەتی و خۆشەویستی سەبارەت بە زانیاری و فێربوون. کاتێکە هێزەکانی بەریتانیا دەستیان بەسەر جرووسلمدا گرت لیۆد جۆرج بەجارێک ورووژا،" شتێک کە چەندین بەرە لە سوارچاکانی ئەورووپی نەیانتوانیبوو دەستی بەسەردابگرن." ڕەنگە زانیاری ئەو سەبارەت بە جوگرافیای ناوەندی ئورووپا تەواو نەبووبێت بەڵام شارەزایی تەواوی بەسەر وڵاتی پیرۆزدا هەبوو. (لەڕاستیدا، وتەی گشتگرەوەی ئەو بەومانایە کە ماندێتی بەریتانی لەسەر فلستین پێویستە لە " دان بەرەو بییرشیبا" لەخۆبگرێت لە کۆڕی ئاشتیدا قرم و قاڵێکی سەیری درووست کرد و هاوکات کارناسان ئەتڵەسی ئینجیلیان پەستاپەستا دەخستە ڕوو تا هەوڵ بدەن بزانن مەبەستی ڕاستەقینەی ئەو چیە.)٩٥٩

لە سەردەمی خۆیدا وەک وەزیری چەک و کەرەسەی تەقەمەنی لەکاتی شەڕ، لیۆد جۆرج حەزی دەکرد بڵێت کە ئەو بەشێوەیەکی تایبەت بە خۆی بە قەرزداری ویزمەن دەزانی. بەریتانیا بەجارێک ئەسیتۆن، مادەی پێویست بۆ درووستکردنی تەقەمەنیەکانی، لێبڕابوو. بەڕێکەوت، ویزمەن خۆی بە پڕۆسەیەکەوە خەریک کردبوو کە ڕێژەیەکی یەکجار زۆری لەو مادەیە بەرهەم دەهێنا. لە

هەنگاوێکی جوامێرانەدا ئەو بۆ ئەوەی شەڕ نەوەستێت ئەو مادەیەی بۆ دابین کردن و لەبەرانبەردا چاوەڕوانی قرانێکی لێ نەدەکردن. کاتێکە لیۆد جۆرج داوای لە ویزمەن کرد تا شەرەفێک لەلایەن شاوە وەرگرێت، لەولامدا وتی" من هیچ شتێکم بۆ خۆم ناوێت." کاتێکە لیۆد جۆر زۆر پێداگری کرد، ویزمەن داوای پاڵپشتی لە کێشەی زایۆنیست کرد. لیۆد جۆرج لە یاداشتەکانی خۆیدا بانگەشەی کردبوو کە " ئەوە بوو بە هەوێن و سەرەتای ڕاگەیاندنێکی ناسراو سەبارەت بە وڵاتی نیشتمانی بۆ فلستین." (کەچی فەرەنسەیەکان پشتگریان لە بیرۆکەیەکی تر دەکرد؛ بەومانایەکە لیۆد جۆرج ژنەدۆستێکی هەبوە کە خێزانی تاجرێکی ناوداری جوولەکە بووە.)٩٦٠

ویزمەن و ئاسیتۆنەکەی ئەو چیرۆکێکی سەیریان درووست کرد بەڵام سیاسەتمەدارانی بەریتانی، بە هەموو هەست و سۆزێکیانەوە، دژ بە بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا هیچ هەنگاوێکیان هەڵ نەدەهێنا. لە ساڵی ١٩١٧دا، وادیاربوو ئەمانە لەگەڵ ئامانجەکانی زایۆنیست پێکەوە گرێیان خواردبوو. ویزمەن خوازیاری فلستینێکی جوولەکەنشین بوو و، وەک خۆی ئاماژەی پێکردبوو، بۆ چەند ساڵی داهاتوو پێویستی بە پارێزگاریکردن هەبوو. ئەو باوەڕی بە فەرەنسەیەکان نەدەکرد و سەبارەت بە ئەمریکیەکان سارد بوو. بەریتانیا نەک تەنیا بەهێز، بەڵکوو دادوەر و ڕاست بوو؛ بێجگە لەوانە، ئەم ڕاستیە کە ئینگلیز نەتەوەیەکە لەسەر بیروباوەڕی فەرموودەکانی ئینجیل بەڵگەیە لەسەر نزیکبوونی نێوان ئەوان و جوولەکەکان." بە کۆچکردنی جوولەکە، فلستین دەبێت بە "بلژیکێکی ئاسیایی" و یاریدەدەرێکی گرنگ بۆ ئیمپراتۆری بەریتانی. " فلستین درێژەی سرووشتی میسرە و بەربەستێکە کە کاناڵی سوئیز لە....دەریای ڕەش جیا دەکاتەوە."٩٦١ ئەو وتوێژە لای لیۆد جۆرج، لای دایرەی جەنگ، و لای لانی کەم هەندێک کەس لە دایرەی دەرەوە زۆر مانادار بوو. سەد بەبریا ئەو وتوێژە فەرەنسەیەکانی لە فلستین بێ بەش بکردایە، کەسانێک کە لە ڕێکەوتنی سایکێس-پیکۆتدا بەڵێنی ئەوێیان پێدرابوو، ئەو تەگبیرەی سەردەمی شەڕ لەنێوان هاوپەیمانان‌دا بۆ دابەشکردنی ڕۆژهەڵاتی ناڤینی عەرەبەکان. لە ساڵی ١٩١٧ەوە، بە هاندانی لیۆد جۆرج، سایکێس بەشێوەیەکی نهێنی لەگەڵ ویزمەن و زایۆنیستەکانی تر کۆبۆوە. هۆکاری سەرەکی یان بڵێین گرنگترین هۆکاری پشتگری کردنی بەریتانیەکان لە زایۆنیستەکان نانەوەی پڕۆپاگەندە بوو لەنێوان جوولەکەکان، بەتایبەت لە وڵاتەیەکگرتوەکان، کە هێشتا خۆی لە جەنگ دزیبۆوە و نەهاتبوە ناوەوە، و لە ڕووسیە، شوێنێک کە جوولەکەکان بەهۆی ئاشکرا و دیارەوە سەبارەت بە حکوومەتەکەی خۆیان سارد و ناکۆک بوون. کاتێکە دەنگۆی ترسێنەر دەگەیشتە لەندەن کە گوایە ئەڵمانیا دەیەوێت ڕاشکاوانە بە خەڵک ڕاگەیەنێت کە پشتگری لە زایۆنیزم دەکات، حکوومەتی بەریتانی گورج و گۆڵ کەوتەخۆ.

کۆرزۆن کە بەپێچەوانەی زۆربەی هاوکارەکانی خۆی لەڕاستیدا لە فلستین مابۆوە، خەونی زایۆنیستی لا پڕوپووچ بوو. ئەو دەیوت "مێشکی من ناتوانێت قەبووڵ بکات کە کۆمەڵێکی پێشکەوتوو و ڕۆشنبیر تا ئاستی کۆیلەتی بێتە خوارێ و خۆی سووک بکات." بێجگە لەوە ئەو پرسیارێکی زۆر دژواری ئاراستە کرد: " خەڵکی وڵات چیان بەسەردێت؟" دەمەقرِەیەکی گەرم و گوڕ لەلایەن مۆنتاگۆ، وەزیری بەهێزی دەرەوەی هێندستان ساز بوو، کەسێک کە زایۆنیزمی بە " باوەڕی گڵاوی سیاسی دەزانی و لای وابوو لەلایەن تاقە هاووڵاتیەکی نیشتمانپەروەری میرنشینی یەکگرتوو پشتگری لێ ناکرێت". ئەو بۆخۆی لە بیروباوەڕدا جوولەکە بەڵام لە نەتەوایەتیدا ئینگلیزی بوو. ئایا دەبوایە لەوکاتەدا پێی ڕاگەیەندرایە کە وەفاداری ڕاستەقینەی ئەو بە فلستین سەلمێندراوە؟ و ئەوە بۆ مافەکانی جوولەکەکان وەک هاووڵاتیانی وڵاتانی تر چ مانایەکی دەبوو؟ کابینەت بەرهەڵستی ئەم نارِەزایەتیانەی بۆوە و لە کۆتایی ئۆکتۆبری ساڵی ١٩١٧دا لەسەر فۆرموولێک ڕێکەوتبوو. سایکێس بە لەتەکاغەزێک بەدەستەوە لە کۆڕەکە دەڵپەڕیە دەرەوە: " دوکتور ویزمەن، ئەوە کوڕە!" بالفۆر لە نامەیەکی کورتدا بۆ لۆرد ڕاستچیلد، جوولەکەیەکی بەناوبانگی بەریتانی، سیاسەتی بەریتانیای ڕاگەیاند: "حکوومەتی خاوەن شکۆ بە دڵگەرمیەوە سەیری دامەزراندنی ماڵێکی نیشتمانی بۆ جوولەکەکان لە فەلستین دەکات، و ئەوەی لە توانایان دابێت بۆ گەیشتن بە ئەم ئامانجە پیرۆزە دەیکەن." ووشەکان بە سەرنجێکی تایبەتەوە هەڵبژێردرابوون. " ماڵی نیشتمانی"، وەک حکوومەتی بەریتانی بەردەوام پێداگری لەسەر کردبوو، بەمانای وڵات نەبوو. ویزمەن و ڕێبەرانی تری زایۆنیستی وەک یەک ووردبین و بەسەرنج بوون. ئەوان دەیانوت کە مەبەستیان دامەزراندنی خێرای وڵاتێکی جوولەکەنشین نیە. لەوانەیە لە داهاتوویەکی دووردەستدا، کاتێکە جوولەکەی زیاتر ڕوویان لە فلستین کرد، ڕەنگ و بۆیەکی جیاوازتر بەخۆیەوە ببینێت. خەڵکێکی یەکجار کەم موقناع بوون، و پێدەچوو کە چاوەڕوان بکرێت لەوە زیاتر بەقەناعەت بگەن. ڕۆژێک دوای ڕاگەیاندنەکە هەموولایەک وەخەبەر هاتن، لە سەردێڕی تایمزدا هاتبوو، " فلستین هی جوولەکەکانە. هاوسۆزی مەقاماتی ڕەسمی." هەر لە سەرەتاوە، جوولەکەکان و ناجوولەکەکان وەکوو یەک، سیاسەتمەداران، دیپلۆماتەکان و ڕۆژنامەنووسان، باسیان لە وڵاتێکی جوولەکەنشین دەکرد.٩٦١

لە چەند مانگی دواتردا، کاتێکە هێزەکانی بەریتانی لە میسرەوە بەرەو باکوور ڕۆیشتن تا جرووسلم و دواتریش فلستین بەگشتی داگیر بکەن، ئاپۆڕەی جوولەکەکان، بەواتەی هەموولایەک،- یەکەکانی تەفەنگدارانی سەڵتەنەتی کە بەشێوەیەکی تایبەت لەنێوان جوولەکەکاندا دامەزرابوون-

لەگەڵیان ڕۆیشتن. (ڤلادیمیر جابۆتینیسکی، ڕۆژنامەنووسێکی ناودار، چەتوون و توندڕەوی ڕووسی کە بناخەدانەری ئاپۆڕەی جوولەکەکان بوو، وەک ئەفسەرێکی پلە دووهەم لە ڕیزەکانی ئەو ئاپۆڕەیەوە مارشی لێ دەدا.)

کاتێکە ئالێنبای دەستەی بەڕێوەبەرایەتی نیزامی خۆی لە فلستین دامەزراند، یەکەمین بانگەشەی ئەو و هەمووی بەڵگە ڕەسمیەکان بە زمانەکانی هێبروو و عەرەبی وەرگێڕدرانەوە. لە هاوینی ساڵی ١٩١٨دا، بە ڕەزایەتی حکوومەتی بەریتانی، زایۆنیستەکان خانووبەرەیەکیان لە جرووسلم بەسەر تەپۆڵکێکەوە درووست کرد و، بە بەشداری جەماوەرێک کە ئالێنبای و سەرجەم فەرمەندە پلەبەرزەکانی هاوپەیمانی لەخۆگرتبوو، ویزمەن بەردەبناخەکانی زانکۆی هێبرووی دامەزراند. هەروەها هەر لە ساڵی ١٩١٨دا حکوومەتی بەریتانی ڕێگەی دا کۆمیسیۆنێکی زایۆنیستی، بەسەرۆکایەتی ویزمەن، حەواڵەی فلستین بکرێت. هەرچەند دەستووراتی ئەو کۆمیسیۆنە نادیار و ناڕوون بوون-دەبوایە وەک پێوەندی لەگەڵ دەستەی بەڕێوەبەرایەتی نیزامی بەریتانیا و هەروەها ڕێکخستنی جوولەکەکانی ناوچە چالاکی بکردایە - تایبەتمەندی نوێنەرایەتی فەرمی کۆمەڵەی جوولەکەی لە فلستین لەخۆگرتبوو. بێجگە لەوانە، وەک هەندێک جار ئەفسەرانی بەریتانی ڕەخنەیان دەگرت، وەکوو حکوومەتێکە لەحاڵی درووستبوون دابێت چالاکی دەکرد.٩٦٣

ویزمەن بۆخۆی بە ووردبینیەوە هەنگاوی نا. ئەو بەئاسانی لەبەرانبەر گوشاری کەمینەیەک لە ڕادیکاڵەکان دەوەستا، وەکوو جابۆتینیسکی، کەسێک کە داوای وڵاتێکی دەستبەجێی جوولەکەنشینی دەکرد. ئەو مانۆڕی لێ دەدا تا دڵنیا بێت لەوە کە بەریتانیەکان یان ئەمریکیەکان، نەوەک فەڕەنسەیەکان، کە زۆر ئیمپریالیست و زۆر کاتۆلیک بوون، دەبن بە قودرەتێکی زۆرەکی بۆ فلستین. کارەکەی ئەو بە دابەشکردنەکان و بە ڕکابەرایەتیەکانی ناو زایۆنیزم دژوارتر ببۆوە. لە زایەڵەیەکی خودی کۆڕی ئاشتیدا، ئەمریکیەکان لە بزووتنەوەی زایۆنیستیدا بەرەنگاری زاڵبوونی ئەورووپیەکان بوونەوە. شاندی زایۆنیستی ئەمریکی بۆ کۆڕی ئاشتی گلەیی کردبوو کە ویزمەن دیکتاتۆڕ و نادیموکراتیک بوە، ڕەشنووسی یاداشتەکەی لەسەر فلستین "زۆر کەم" بوە. ئەوان داوای "کۆمێنوێلسێکی جوولەکە" و تەنانەت "وڵاتێکی جوولەکە" بە بەڕێوەبەرێک و بە هەبوونی جوولەکەکان لە سەرتاسەری دەستەی بەڕێوەبەرایەتی و زۆرینەیەکی جوولەکە لەناو دەستەی کارگێڕی و یاسادانانداا دەکرد. لای ویزمەن ئەمریکیەکان یاسادانەر و لەباری سیاسیەوە ساویلکە بوون. " من بۆ جارێکی تر ڕادەگەیەنم کە داواکاریەکانی ئێمە نابێ ببێت بە فۆڕموولێک بەدەست کۆڕی ئاشتیەوە، بەڵکوو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ و مانگ بە دوای مانگ دەبێ پێداگرانە و

ماندوونەناسانە وەدوویان کەوین." ئەو ڕێگاکەی خۆی گرتەبەر، بۆ ڕایەکی تر، بەشێکی بە هەڕەشەی دەست لەکارکێشانەوە، و بەشێکی بەهۆی ئەوە کە حکوومەتی بەریتانی دڵنیای کردبوونەوە کە لە هەل و مەرجێکی لەو چەشنەدا ماندێت ناگرێت. لەو قۆناخەدا ئەمریکیەکان ئامادە نەبوون تا ڕاشکاوانە لەبەرانبەر ئەودا بوەستن. وەک فیلیکس فرانک فۆرتێر، قازی دادگەی عالی داهاتوو، ئاماژەی پێکردبوو: " ئەو بەسەر پیاوانی ئینگلیز و بەسەر مەقاماتی ڕەسمی هەتاهەتایی ئینگلیز کۆنترۆڵی هەیە کەسانێک کە درێژە بە بەڕێوەبردنی ئینگلەند دەدەن لە کاتێکدا کە لیۆد جۆرج و بالفۆر چیتر لە ئارادا نابن- وەک چۆن هیچ جوولەکەیەکی تر لە ئینگلیز یان لە سەرانسەری قارەدا ناتوانێت بە ئاسانی بە دەستی بێنێت."٩٦٤

زۆربەی زایۆنیستە ناودارەکان چون بۆ پاریس تا بەشداری لە کۆڕی ئاشتیدا بکەن. ویزمەن وتوێژگەلی ئاسایی خۆی لەگەڵ ناوداران و خاوەن دەسەڵاتان دەستپێکرد. هاوس، وەکوو جاری جاران، هاوسۆز و هاوخەم بوو، ویلسۆن چل خولەکی دایە و بالفۆر دڵنیای کردەوە کە فلستین سنوورگەلی زۆری پێدەبەخشرێت. فەڕەنسیەکان کەمتر هاریکاریکاریان دەکرد. ویزمەن بە ویلسۆنی ڕاگەیاندبوو کە " من بەڕەوانی بە فەڕەنسەیی قسە دەکەم، بەڵام من و فەڕەنسەیەکان بە زمانێکی جیاواز قسە دەکەین." ویزمەن وریای ئەوەبوو کە باس لە وڵاتیکی داهاتووی جوولەکەنشین یان زۆرینەیەکی جوولەکە لە فلستین نەکات. هەرچەند، لە بۆنەیەکدا، ئەو دەستەواژەیەکی بەکارهێنا کە زایۆنیستەکانی زوو زوو وەبیریان دەهاتەوە: دەبێ "وەک چۆن ئینگلەند هینی ئینگلیزیەکانە فلستینیش هینی جوولەکەکان بێت."٩٦٥

کاتێکە مەئموورییەتی زایۆنیستی لە بەردەم شۆڕای عالیدا لە ٢٧ی مانگی فەوریەدا سەری هەڵێنا، ویزمەن تەنیا وتەبێژی ئەوێ نەبوو. هیچ کام لە زایۆنیستەکانی ئەمریکی قسەیان نەدەکرد، بەشێکی بەهۆی ئەوەوە بوو کە وتەبێژی سەرەکی ئەوان لە لەندەنەوە نەگەیشتبوو، بەڵام چەند کەسێکی ئەورووپی گەیشتبوون. نووسەری پۆڵەندی نۆهام سۆکۆلۆف بیسەرانی خۆی لە قەیرانی تۆقێنەری جوولەکەکانی ئورووپای ڕۆژئاوا ئاگادار کردبۆوە.: " کاتەژمێری بەدەستەوەدانی خەڵکە داماوەکەی ئەو لێ یدابوو." ویزمەن، کە بە پێوە سەیری ئەوی دەکرد، و دواتر گێڕابوویەوە کە " من دەمتوانی دم و چاوی سۆکۆلۆف ببینم و بەبێ ئەوەی هەست وسۆز بیگرێت، دەتکوت ڕەنج و ئازاری دوو هەزار جوولەکە لەسەر شانیەتی." مێناچم ئۆسیشکین، جوولەکەیەکی بەهێزی ڕووسی، بە زمانی قسەی دەکرد، زمانێکی کەونارا کە تازە خەریک بوو زیندوو دەبۆوە. وتەبێژانی کۆتایی-ئاندرێ سپیرە، شاعێر و کەسایەتیەکی ناودار لە لە زایۆنیزمی فەڕەنسەییدا، و سیلڤەین لیڤی، توێژینەرێکی

ناوادار- بە پێداگری حکوومەتی فەڕەنسەیی و بەپێی نارەزایەتیەکانی ویزمەن و هاوکارەکانی بە شاندەکەوە لکێندرابوون. ئەوەی کە لێی دەترسان تووشی هاتبوون: لە شوێنێک کە مەئموورییەتی زایۆنیستی بانگەشەی دەکرد کە بەناوی زۆرینەیەکی بەرچاو لە جوولەکەکان قسە دەکات، سپیرە و لێڤی وێنەیەکی ئالۆزتریان خستە بەردەم. ئەوان، زۆر بەدرووستی، ئاماژەیان کرد کە تەنیا کەمینەیەک لە جوولەکەکانی فەڕەنسەیی زایۆنیست بوون. ئەوان بۆخۆیان بە فەڕەنسەیی بوونی خۆیانەوە دەنازین (بە واتەی لێڤی، " لە هەست و سۆزدا، جوولەکە، بەڵام بەگشتی فەڕەنسەیی"). ئەوان خوازیاری ئەوەبوون کە مافگەلی کەونارای فەڕەنسە لە فلستین، کە بریتی بوو لە خەباتکردن وەک پارێزەرێک بۆ کاتۆلیکەکان، پشتگریان لێبکرێت و پێشنیار بکرێت کە فەڕەنسە، وەک نەتەوەیەکی مەدیتەرانەیی و هاندەرێکی گەورەی شارستانیەت لە جیهاندا، بۆ گرتنەدەستی ماندێتێک لەبارترین نەتەوە دەبێت.٩٦٦

مەقاماتی ڕەسمی وەزارەتی دەرەوەی فەڕەنسە بە گەشبینیەوە سەیری داهاتوویان دەکرد. (ویزمەن بەسووکایتیەکەوە وتبووی:" لێڤی دەتکوت هێپنۆتیزم کراوە.) فەڕەنسەیەکان لە بۆچوونی وڵاتێکی جوولەکەنشین لە کاتی شەڕدا پشتگریان کردبوو، زیاتر بۆ مەبەستی کاری پڕۆپاگەندە، بەڵام لە کاتی ئاشتیدا پێویست نەبوو داواکاریەکانی فەڕەنسە لە فلستین بخرێنە پشت گوێ، ئەو داواکاریانەی کە، وەک کۆلۆنیستەکان بەردەوام باسیان دەکرد و ئاماژەیان پێدەکرد، دەگەڕانەوە بۆ سەردەمی خاچ پەرستان. مەقاماتی ڕەسمی فەڕەنسە کە هۆگری داگیرکاری نیزامی لە فلستین بوو وەک دیاربوو دیندار و لەخواترس بوون. پیکۆت بە ڕۆناڵد ستۆرس، بەڕێوەبەری نیزامی لە جرووسلم، ڕاگەیاندبوو کە لەوکاتەوەی کە شاری پیرۆز لەلایەن تورکەکانەوە داگیرکرابوو بەریتانیەکان هەست بەخۆشی کردنیان لە فەڕەنسە لا گرنگ نەبوو. ستۆرس وڵامێکی گورجی دایەوە: " بیر لەوە بکەنەوە ئەگەر ئێمە داگیرمان بکردایە چیمان بەسەر نەدەهات." بەرلەوەی مەئموورییەتی زایۆنیستی پەروەندەکەی خۆی پێشکەش بە شۆڕای عالی بکات، مەقامێکی ڕەسمی پلەبەرز سپیرەی ئاگادارکردبۆوە کە " ئێمە بە تاسەوەین کە ببینین زاینیستێکی فەڕەنسەیی لە بەرژەوەندی زایۆنیزمدا وتارێک ڕاگەیەنێت، بەڵام ئێوە دەبێ هەوڵ بدەن ڕوونی بکەنەوە کە فەڕەنسە پێویستە فلستینی هەبێت."٩٦٧

لانی کەم بەبۆچوونی فەڕەنسەیەکان لێڤی کارێکی زۆر باشتری کردبوو. لە وتارێکی دوورودرێژدا بە توندی ئاماژەی بەوەکردبوو کە ئەو قەت زایۆنیست نەبوە و ناشبێت. ئەو ئاماژەی بەو کێشانە کرد کە دێنە ئاراوە ئەگەر بێت و هەمووی جوولەکەکانی ئورووپای ڕۆژهەڵات، کە ویزمەن بانگەشەی دەکرد تەنیا چاوەڕوانی سیگناڵێکن بۆ ئەوەی بچنە ناو فلستینەوە، بە کردەوە هەر هەمان

کاریان بکردایە. هێشتا وڵات توانایی پشتگیریکردنی لە حەشیمەتێکی گەورەی نەبوو. (لە ڕاستیدا، هەرچەند ئەو بە ئاشکرا دانی پێدا نەدەهێنا، ویزمەنیش لە خەمەدا شەریک بو.) لێڤی پرسیارێکی دژواری ئاراستەکرد: ئایا نیشتمانێکی جوولەکەنشین بۆ جوولەکەکان شتێکی ڕەوا بوو؟ " ئەوە لای ئەو شتێکی زۆر سەیر بوو کە جوولەکەکان ، هێشتا مافگەلی بەرابەری ئەوان لە هەمووی وڵاتانی جیهان بەفەرمی نەناسرابوو، داوای مافگەلی تایبەتیان لە فلستین دەکرد." جوولەکەکانی سەرتاسەری جیهان. بە واتەی پێشنیاری هەندێک لە ڕێبەرانی زایۆنیستی، چلۆن بتوانن لە حکوومەتی فلستین بەشداربن؟ " درووستکردنی نموونەیەک کە تێیدا خەڵکێکی دیاریکراو کە تازە خاوەنی مافگەلی هاووڵاتی بوون لە ولاتێکن بکرێتە سەریان کە مافگەلی تری هاووڵاتی بوون لە وڵاتێکی تازەدا بەڕێوەبەرن و بەکاری بێنن." وەک فەرەنسەیەکی بە ڕەچەڵەک جوولەکە، ئەو لە ئاکامەکان دەترسا." مشت و مڕەکەی ئەو هەر هەمان مشت و مڕ بوو کە مۆنتاگۆ لە هێرشەکەی خۆی بۆسەر ڕاگەیاندنی بالفۆر بەکاری هێنابوو. ویزمەن سەبارەت بە مۆنتاگۆ وتبووی " دیمەنێکی زۆر ناشیرین" و لەوکاتەدا ڕووی کردبوە لێڤی و بە خیخە خیخ وتبوو" جی نی ڤاوس کۆنایس پلاس. ڤاوس ئیتیس ئون ترایتری." (" من لەمەبەولاوە ئەتۆ ناناسم. ئەتۆ خائینی.")٩٦٨

ئەو ڕۆژە، یان بۆ ماوەی چەندین مانگی دواتر، سەبارەت بە فلستین هیچ بڕیارێک نەهاتە ئاراوە، و تەنیا لە دانیشتنە یەک بەدوای یەکەکاندا لە کۆڕی ئاشتی دەهاتە بەرباس. وەک زۆر جاران لە پاریس ڕووی دەدا، کێشەیەک کە ئاڵۆزی بەردەوامی بۆ چەندین ساڵ بەدواوەبوو گرنگی ئەوتۆی نەدەدرایە. ئەفسەرێکی ڕێکخراوەی سیخۆری ئەمریکی لە ساڵی ١٩١٧دا لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە " سەبارەت بە ڕاگەیاندنەکەی بالفۆر فلستینیەکان لەدین دەهری بوون. ئەوان دڵنیان لەوە کە ڕێبەرانی زایۆنیستی ئارەزوو دەکەن کۆمەڵەیەکی جیاوازی جوولەکە دامەزرێنن و ئەوان لەسەر ئەم باوەڕەن کە زایۆنیزم بیسەلمێنێت کە سەردەکەوێت، وڵاتەکەی خۆیان بە ئەوان دەدۆڕێنن تەنانەت ئەگەر مافگەلی سیاسی و ئایینی ئەوان بپارێزرێت."ڕاگەیاندنەکەی بالفۆر بەڵێنی پارێزگاریکردنێکی لەو چەشنەی بۆ شتێک دابوو کە ناوی نابوو " کۆمەڵانی نا-جوولەکەی ئێستا لە فلستین." پیلاندانانێکی سەیر بوو لە حاڵێکدا کە عەرەبە فلستینیەکان، زۆربەیان مسوڵمان بەڵام هەندێک جوولەکەشیان لەخۆگرتبوو، نزیک بە چوارپێنجەمی حەشیمەتێکی ٧٠٠،٠٠٠کەسیان پێک هێنابوو. بێجگە لەوە ڕەنگدانەوەی بۆچوونێک بوو لەلایەن هەم سیاسەتمەدارانی جیهان و هەمیش ڕێبەرانی زایۆنیستی تا فلستین بەشێوەیەک چۆڵ و هۆڵ ببینن. سایکێس بەتوندی وتبووی کە " ئەگەر زایۆنیستەکان نەچن بۆ ئەوێ، کەسێکی تر هەردەچێ، سرووشت لە چۆڵ و هۆڵی بێزارە."

پێداچێ زایۆنیستێکی بەریتانی ئەم دەستەواژەیەی دانابێت کە "وڵاتێکی بێ کەس و کار- بۆ کەس و کارێکی بێ وڵات."٩٦٩

تەنانەت ئەوانەشی کە لێیان حاڵی ببوو کە عەرەبگەلێک هەن کە فلستین دەژین حەزیان دەکرد ئەوان لە چاویلکەی ئیمپریالیزمی ڕۆژئاواوە سەیر بکەن. داگیرکارانی زایۆنیستی کە بەرلەشەڕ دەگەیشتنە ئەوێ زۆر لەوە سەریان سوورمابوو کە وڵاتی تازەی ئەوان ڕەنگ و بۆی تەواو " ڕۆژهەڵاتی" سەرەتایی هەیە. ئەوان و ڕێبەرەکانیان بەهیوا و هۆمێدەوە قسەیان دەکرد، چون زۆربەی ئەوان پێشکەوتووخواز و لیبراڵ بوون، دیانکوت کە هاتنی ئەوان واتە دابڕانی عەرەبەکان لە ژیانی پێچراو بە داب و نەریتە کۆنەکان و بردنی ئەوان بۆ پێشەوە. هێرزێل ئەندامێکی بنەماڵەیەکی ناوداری عەرەبی دڵنیاکردبۆوە کە بەختەوەری و ئاوەدانی سەرتاسەری وڵاتی فلستین دەگرێتەوە. " ئەگەر کەسێک لەم سۆنگەوە سەیری بابەتەکە بکات، ئەویش لەناچاری دەبێ بە دۆستی زایۆنیزم." هیچ پێویست ناکات عەرەبەکان بیر لە دەوڵەتی-سەربەخۆ بکەنەوە. کەچی تەنانەت بەرلەساڵی ١٩١٤ەش، هێماگەلێک هەبوون کە گوایە ناسیۆنالیزم و پشێویەکی هاوچەشن بە هاتنی زایۆنیزم خەریکن لەنێوان عەرەبەکانی فلستین دەست بە ورووژان دەکەن. ویزمەن، کە کاتێکە دەکەوتە باسی فلستینیەکان هەندێک جار وەکوو ئەفسەرێکی ناوچەیی بەریتانیا لە هێندستان دەچوو، لە سەرەتادا لەبەرانبەر ئەمەدا وەستا: "عەرەبەکان، کە بەرواڵەت زیرەک و وریان، تەنیا سوژدە بۆ یەک شت دەبەن، تەنیا شتێک- دەسەڵات و سەرکەوتن،" بێ تاوانی،و تێنەگەیشتن، سەرنج ڕاکێش-و مەترسیدار بوون.٩٧٠

تەنانەت لە ساڵی ١٩١٩ەشدا، بەریتانیەکان لە فلستین خۆیان لەنێوان زایۆنیستەکان و عەرەبەکان گیرخواردوو دۆزیبۆوە. زایۆنیستەکان گازەندەیان دەکرد، بە هەندێک ڕاستیەوە، کە بەرپرسانی میلیتاری لەوپەڕی باشیدا دوور لە هەست و سۆزبوون و لەوپەڕی خراپیشدا دژە-سامی بوون. جابۆتینیسکی، لە ئاپۆڕەی جوولەکەکانەوە، وتی کە بەریتانیەکان دەتوانن لەگەڵ عەرەبەکان دانووستان بکەن، " هەر ئەو 'دانیشتوە ڕەسەنە'کۆنانەی کە ئینگلیزیەکان بۆماوەی چەندین سەدە ڕێبەرایەتیان کردن و حکوومەتیان کرد بەسەریاندا." زایۆنیستەکان شتێکی جیاوازتر بوون: " کێشەیەکی تەواوکێشە، کێشەیەک ئاڵۆزاو و ئاڵۆسکاو لە هەموو بوارێکەوە- بە ژمارە کەم، کەچی بەشێوەیەکی تر بەهێز و کاریگەر، کەم ڕێز سەبارەت بە ئینگلیزیەکان، کەچی تێکەڵاو بە کولتووری ئەورووپی، داواکاریەکانیشیان ئاڵۆز و پێچەڵاوپووچ بوون."٩٧١ (یارمەتی خودی جابۆتینیسکی بۆ کێشەکان بریتی بوو لە ڕێکخستنی سووپایەکی ژێرزەمینی.)

هەڵبەت بەریتانیەکان لەکاتی شەڕدا بە قەول و بەڵێنیگەلێک کە دابوویان کێشەیەکیان بۆخۆیان درووست کردبوو کە لەوکاتەدا نەیاندەتوانی لە ئاستی بێن. لەلایەکەوە ئەوان پشتگریان لە وڵاتێکی دایک بۆ جوولەکەکان لە ناوچەیەک کردبوو کە زۆربەی دانیشتوانەکەی عەرەب بوون، و لەلایەکی ترەوە ئەوان بە بەڵێنی سەربەخۆیی عەرەبەکان ئەوانیان هاندابوو تا دژ بە دەسەڵاتدارانی عوسمانی ڕاپەرن. کاتێکە عەرەبەکان ئاماژەیان بەوەکرد کە فلستین لە وڵاتێک کە بڕیار وابوو بچێتە ژێردەسەڵاتی عەرەبەکانەوە نەقرتاوە، بەریتانیەکان ئەوانیان بە ناسوپاس و بێ سفەت تۆمەتبارکرد. باڵفۆر وتبووی کە " من هیوادارم ئەوە لەبیرنەکرێت، ئەوان ئەو پارەوە بچوکە بە نابەدڵی نابەخشن، چون چیتر باری جوگرافی لەخۆنەگرتوە، بەهەموو بارێکدا مێژوو لەخۆدەگرێت- ئەو پارچە بچووکە لەوەی کە ئێستا ناوچەگەلی عەرەبنشینی پێ دەڵێن بە خەڵکانێک ببەخشرێت کە بۆماوەی ئەم چەند سەد ساڵە لێی بێ بەش کراون."٩٧٢

عەرەبەکان بەنابەدڵیەوە بەخشیان، بەتایبەت عەرەبەکانی فلستینی. ڕاگەیاندنەکەی بالفۆر لە ساڵی ١٩١٧دا و گەیشتنی کۆمیسیۆنی زایۆنیستی لە ساڵی ١٩١٨دا، شەکانەوەی ئاڵای شین و سپی زایۆنیستی لە سەرتانسەری فلستین، داواکاری دوور لە هەستی کۆڕێکی زایۆنیستی لە جافا بەومانایە کە ناوی ناوچەکە خێرا بە ئەرتز ئیزرائیل بگۆڕێت (وڵاتی ئیزرائیل)، هەرهەمووی ئەمانە لەڕادەبەدەر ئەوانیان تووشی ترس و دڵەڕاوکێ کرد. کۆرزۆن سەبارەت بەمە هۆشداری دابوو: " ئەگەر وایدابنێین کە ئێمە خۆمان بە جوولەکە بناساندایە، و هەمووی ئەو هێزە عەرەبیانەی کە لەلایەن فەیسەڵەوە لەلایەکی ترەوە پشتگری دەکران دژ بە ئێمە دنە بدرانایە، ئەوە ئاڵۆزی درووست دەکرد."٩٧٣ وادیاربوو ئاڵۆزی لەڕێ بوو.

لە هەوڵێکدا بۆ بەرەنگاریکردن لەبەرانبەر ئاکامگەلی کردەوەکانی خۆیان، بەریتانیەکان زایۆنیستەکان و ناسیۆنالیستەکانی عەرەبیان هان دا تا پێکەوە ڕێبکەون. کاتێکە ویزمەن لە ساڵی ١٩١٨دا سەردانی فلستینی کرد، دایرەی دەرەوە کردیە سەری کە لەبیری نەچێت " گرنگترین کارێکە دەبێ بکرێت ئەوەیە کە ....گومانەکانی عەرەب سەبارەت بە ئامانجە ڕاستەقینەکانی زایۆنیزم بڕەوێنەوە." کاتێکە ستۆرس، بەڕێوەبەری نیزامی جرووسلم، ئێوارەخوانێکی بۆ میوانانی زایۆنیستی و کەسایەتیەکانی ناوچە بەڕێوەبرد، ویزمەن وتارێکی بەنرخی پێشکەش کرد: "جێگای تەواو هەبوو بۆ هەردک لا تا شان بە شانی یەکەوە دانیشن؛ دەبا بیسەرانی ئەو لە تانەوتوانەجەکان ئاگاداربکرێنەوە کە گوایە زایۆنیستەکان بەدوای قودرەتی سیاسیەوەن- یان دەبا هەردک لا پێکەوە سەرکەون هەتا بۆ سەربەخۆییەکی هاوبەش ئامادە بن." ئەو هاوینە، ویزمەن و فەیسەڵ لە کەمپەکەی فەیسەڵدا نزیک بە کەنداوی عەقەبە کۆبوونەوە. دانیشتنەکە خۆمانە،

نەتـەوەت دۆسـتانەش بـوو، و ویزمـەن دەسرەوکلاوی عـەرەبی لەسـەرکرد تـا پێکـەوە دووبـەدوو وێنەیـەک بـۆ یادگار هەڵگرن. هەرکیان کۆکبوون لەسـەر ئـەوە کـە باوەڕیـان بـە فەرەنسـەیەکان نیـە. فەیسـەڵ سـەبارەت بـە هاتنی زایۆنیستەکان بۆ فلستین ڕەزایـەتی تـەواوی لەسـەربوو بـەڵام هۆشـداری دەدا کـە پێویسـتە ئاگـای لـە ڕای عەرەبەکان بێت. لە هەرحاڵدا، ئەو نەیدەتوانی بەبێ ڕاوێژکردن لەگەڵ باوکی قەولێکی ئەسیح بدات. ویزمەن بەم بۆچوونەوە ئەوێی بەجێهێشت کە فەیسەڵ بایەخێکی گرنگ بە مەسەلەی فلستین نادات: " ئەو بە سووکایەتیەوە سەیری عەرەبەکانی فلستین دەکات کەسانێک کە تەنانەت بە عەرەبیشیان نازانێت!"٩٧٤

دواتر هەر لەو ساڵەدا، دوائەوەی کە شەڕ کۆتـایی پێهـات، ئـەوان دووبـارە کۆبوونـەوە، ئـەم کەرەتـەیان لـە لەندەن. ئەم جارەشیان هەمووشتێک بەباشی بەڕێوە چوو. ویزمـەن فەیسـەڵی دڵنیـاکردبۆوە کـە زایۆنیسـتەکان دەتوانن لە قـودرەتی خۆیـان کـەڵک وەرگـرن تـا پشـتگری ئـەمریکا بـۆلای عەرەبـەکان ڕاکێشـن، و فەیسـەڵ لەبەرانبـەردا نیشـانی دا کـە هـیچ کێشـەیەک سـەبارەت بـە فلسـتین پێشـبینی ناکـات. " ئـەو بـە ویزمـەنی ڕاگەیانـد کـە " زۆر سـەیرە ئەگـەر لـەنێوان جوولەکـەکان و عەرەبـەکان هـەر ناکۆکیـەک بێتـە ئـاراوە." بەگشـتی، زەوی و زارێکـی زۆر لـە ئـارادابوو. لـە ٣ی مـانگی ژانویـەی سـاڵی ١٩١٩، هـەردوولا ڕێکەوتنامەکـەی خۆیـان کـە پـڕ لـە دەربڕینـی هیـوا و هۆمێـد و نیـەت پـاکی بـۆ داهـاتوو بـوو واژۆکـرد: کۆچکردنی جوولەکەکان بۆ فلستین هـان دەدرێت، لـە هـەمان کاتیشدا زایۆنیسـتەکان یارمـەتی خۆیـان بـۆ پەرەدان بە وڵاتیکی سەربەخۆی عەرەبی کە بڕیار وابوو بەوزوانە لەلایەن کۆڕی ئاشتیەوە پلانی بۆبڕێژرێت دەخەنەگـەڕ. فەیسـەڵ بـەخێچ و خـواری مـەرجی ڕێکـەوتنێکی نووسـی تابـەڵکوو ڕەزایەتەکـەی ئـەو ببەسـرێتەوە بـە بردنەسـەری بەڵێنیـەکانی بەریتانیـەکان کـە بـە عەرەبـەکانیان دابـوو. ڕێکەوتنامەکـە، کـە هەمیشـە دوور لـە شـیمانە بـوو، هیچـی پێـوە نـەماوە هـەتا بـوو بـە کەنـداوێکی بـەرین لـەنێوان فەیسـەڵ و بەریتانیەکان و لەنێوان جوولەکەکان و عەرەبەکانی ناو فلستین.٩٧٥

چارەنووسی فلستین بە دەستی زلهێزانی دەرەوە دواخرا، هەروەک چەنـد سـەدە لـەوەوپێش دواخرابـوو، و ئەوە لە ساڵی ١٩١٩دا بەگشتی بەریتانیا و فەرەنسەی دەگرتەوە. ئیتالیا هـەوڵی دا تـا هەنـدێک لـە قەشـەکانی ئیتـالی بـەقاچاخ بـەناوی سـەرباز لـە کـاتی داگیرکـاری نیزامیـدا بخزێنێتـە ئـەوێ تـا لـە مەسیحیەکانی ناو وڵاتی پیرۆز پارێزگاری بکەن. بەڵام نیگەرانی سەرەکی ئیتالیا ئەرخەیانبوون لەوە بوو کە فەرەنسە هەرشتێک کە ئیتالیا بەدەستی نەدەهێنا ئەویش بەدەستی نەهێنێت.

وڵاتەیـەکگرتوەکان، بەپێچەوانـەی ئـەوەی کـە دوای شـەڕی دووهـەمی جیهـانی ڕووی دابـوو، ڕۆڵێکـی کاریگـەری نـەگێڕا. حکوومـەتی ئـەمریکی بـەئارامی ڕاگەیاندنەکـەی بـالفۆری پەسـەند کردبوو و ویلسۆن سەبارەت بە زایۆنیزم خۆی بە هاوسۆزی دەزانی. ئەو بە ڕێبەرێکی ناودار ئایینی

لە نیۆیۆرک ڕاگەیاندبوو کە " بۆ بیرکردنەوە لەوە کە من وەک کوڕی بنەماڵەی قەشەیەک دەبێ بتوانم لە گەڕانەوەی وڵاتی پیرۆز بۆ خەڵکەکەی یارمەتیدەربم." ئەو لای وابوو بە قازانجی جوولەکەکانە کە چێژ لە نەتەوایەتی خۆیان بگرن. ئەو بیری لە ماندێتێکی ئەمریکی بۆ فلستین دەکردەوە، یا بۆماوەیەکی کورتیش بوایە. بەڵام لەوکاتەدا باوەڕی پیرۆزی سەربەخۆیی لە ئارادابوو. بۆچی دەبێ ئاواتەکانی کەمینەیەک لە جوولەکەکان لە ئاواتەکانی ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە عەرەبەکان بایەخی زیاتری بدرێتێ؟ بالفۆر و لویس بانديس، دادوەرێکی دادگای عالی و زایۆنیستی ناوداری ئەمریکی، ڕێگەچارەیەکی داهێنەرانەیان دۆزیەوە. بەکارهێنانی تەنیا " سەربەخۆیی ژمارەیی" هەڵەیەکی تەواو هەڵە بوو: ژمارەیەکی بەرچاو لە دانیشتوانی زێدی جوولەکە لە فلستین هێشتا لە دەرەوەی سنوورەکانی ئەوێ دەژیان. بالفۆر وتی " و زایۆنیزم ڕەوا یان ناڕەوا، چاک یان خراپ،لە نەریتە کۆنەکانی سەردەمانی زوو، لە پێداویستیەکانی ئێستا، لە هیوا و هۆمێدەکانی داهاتوو بە مانایەکی زۆر قوولتر لە ئاواتەکان و بیروباوەری مێشک تەسکانەی ٧٠٠،٠٠٠عەرەب کە ئێستا دانیشتووی ئەو وڵاتە کەونارایەن ڕیشەی داکوتاوە."ئەو ئاماژەی بەوەکرد کە بە واتەی زمانی کۆنی دیپلۆماسی، زلهێزان لە پشت زایۆنیزمەوە بوون. لەگەڵ ئەوەشدا ویلسۆن پێداگری لەسەر ئەوە دەکرد کە لێژنەی لێکۆڵینەوەی ئەو بۆ ڕۆژهەڵاتی ناڤین فلستینیشی خستۆتە بەرنامەی کاری خۆیەوە. هەردوو کۆمیسارياى ئەمریکی، چارلز کرەین و هێنری کینگ، تاجر و پرۆفیسۆر، لە کۆتایی هاوینی ساڵی ١٩١٩دا لە گەڕاندنەوەی گوزارشەکەی خۆیاندا هێنا بوویان کە عەرەبەکانی فلستین " بەگشتی و بەیەکجاری دژی هەمووی پرۆگرامەکانی زایۆنیستین." و پێشنیاریان کردبوو کە کوڕی ئاشتی کۆچکردنی جوولەکەکان کەم کاتەوە و واز لە بۆچوونی کردنی فلستین بە زێدی جوولەکەکان بهێنێت. هیچ کەس تەنانەت سووکە بایەخێکیشیان بەمە نەدابوو.٩٧٦

هەرکات کە پرسی فلستین دەکەوتە بەرباس، کێشەی سەرەکی لەم قۆناخەدا سنوورەکانی داهاتووی ئەوێ بوون. باسی سەربەهەوای لیوّد جۆرج لەبابەت وڵاتێک کە لە دان بەرەو بیرشیبا درێژەی هەبوو فەرەنسەیەکانی خستەبوە ترس و دڵەراوکێ، کەسانێک کە ئەوەیان وەک گەورەکردنەوەی فلستین لە باکوور لەسەر حیسابی سووریە دەبینی. ئایا دان چۆمی لیتانی و بەشەدوورەدەستەکانی سەرووی ئۆردەنی دەگرتەوە؟ ئاو لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین هەمیشە بایەخێکی تایبەتی دەدرایە. زایۆنیستەکان هەوڵی هرووژمبەرانەیان بۆ باشترین سنوور بوو. ویزمەن وتبووی کە " بۆ گەشەی ئابووری فلستین یەکجار پێویستە کە ئەم هێڵە جۆریک دابنرێت کە ناوچەکانی

ڕۆژهەڵاتی ئۆردەن کە توانایی وەرگرتن و ڕاگرتنی کۆمەڵانی سەقامگیری جوولەکەیان هەیە لەخۆبگرێت." سنوورەکانی ئەو بەشێک لە ئۆردۆنی ئەمڕۆکەیان دەگرتەوە. حکوومەتی بەریتانی تەنیا بۆ مەبەستی گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆیان پشتگریان لە ئەو کرد: بۆ کەمکردنەوەی کاریگەری فەڕانسە و بۆ پارێزگاریکردن لە شوێنەکانی ڕێگای شەمەندەفەڕ (هەرچەند هێشتا ڕێگاکانی شەمەندەفەڕ لە ئارادا نەبوون) لەنێوان مێزۆپۆتامیا و مەدیتەرانەدا. کوای دیکۆرسای ناڕازی بوو: فلستین ڕاست بەرەوژوور بۆ ناوگەڕەکە هەژارنشینەکانی دەمێشق درێژەی هەبوو.٩٧٧ کلیمینجوو چیتر حازر نەبوو شان بۆ زایۆنیستەکان شل بکات یان، وەکوو خۆی دەیدیت، بۆ بەریتانیەکان. سنووری نێوان سووریە و فلستین درووست هەر لەوشوێنە هەڵکەوتبوو کە لە ڕێکەوتنامەی سایکێس-پیکۆت دیاری کرابوو. فەڕەنسەیەکا تەنیا شانیان بۆ ئەوە شل کردبوو کە فلستین بتوانێت لە ئاوی زێدەی سووریە کەڵک وەرگرێت؛ ئەوە هەتاکوو ئەمڕۆکەی هەر بۆتە هۆی کێشە و ئاڵۆزی.

لە مانگی ئاڤریلی ساڵی ١٩٢٠دا، لە سان ڕیمۆ، بەریتانیا و فەڕەنسە دوایەمین مەرجەکانی ڕێکەوتنامەکانی خۆیان سەبارەت بە ڕۆژهەڵاتی ناڤین دانا. بەریتانیا ماندێتی فلستینی پێبڕا. (مەرجەکانی بریتی بوون لە جێبەجێکردنی ڕاگەیاندنی بالفۆر.) فەڕەنسەیەکان دوایەمین هەوڵی خۆیان دا بۆ هەڵگرتنی مافە کۆنەکانی خۆیان تا بتوانن پارێزگاری لە مەسیحیەکان بکەن. ئیتالیەکان بە پەرۆشیەوە بۆ مامەڵەی پێشوو لەگەڵ بەریتانیەکان وتیان کە، بە نەمانی ئیمپراتۆری عوسمانی و "نەتەوەیەکی پێشکەوتوو" تا دەست بەسەر فلستیندا بگرێت، چیتر پێویست نەبوو تەدارەکی تایبەت بگیرێت. لە کۆتایی کۆڕەکەدا لیۆد جۆرج وتبووی بە ویزمەن، کە بەپەلە لە فلستینەوە هاتبوو: " ئێستا تۆ هەوسارەکەت بەدەستەوەیە، هەمووشتێک لەژێر رکێفی خۆت دایە."٩٧٨ عەرەبەکانی فلستین لە سان ڕیمۆ نوێنەرایەتیان نەبوو بەڵام لە ئاژاوەکانی دژ بە جوولەکەکان کە لە فلستین دوو حەفتە زووتر سەریان هەڵدابوو هەست و سۆزی خۆیان ڕاشکاوانە دەربڕیبوو.

هەمووی ئەوەی کە مابۆوە دارشتنی وردەکاریەکانی ماندێتەکە و بە پەسەندگەیاندنی لەلایەن کۆمەڵەی گەلانەوە بوو. ئەمە دوو ساڵی تری خایاند، زیاتر لەبەرهۆی ئەوەبوو کە واژۆکردنی گرێبەستێک لەگەڵ تورکیەی عوسمانی شیمانەی لێ نەدەکرا. حکوومەتی بەریتانی، بەپێداگری چێرچیل، کە لەوکاتەدا ئەمینداری کۆلۆنیایی بوو، بە لەبیرمانی بەڵێنیەکانی خۆی سەبارەت بە عەرەبەکان، ماندێتەکەی دووبەش کرد، بەسرانەوەی فلستین بە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ئۆردەن و

ولاتێکی بچووکی تازەی عەرەب بەناوی ترانسجۆردەن لەژێردەسەڵاتی برای فەیسەڵ عەبدوڵا. ویزمەن هیوابڕ ببوو. ئەو لای چێرچیل جەختی کردبۆوە کە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئۆردەن هەمیشە "بەشێکی حەیاتی و ئەساسی بۆ فلستین بوون." خاکەکەی پڕپیت و بەرەکەت بوو، کەش و هەواکەی "لەبار و گونجاو بوو" و ئاوی چاکی هەبوو. ئەو بە گەشبینییەوە هاتە سەر ئەم ئەنجامە کە " سەقامگیرکردنی جوولەکەکان بەبێ هیچ ناکۆکییەک لەنێوان دانیشتوانی ناوچەکە بەرەوپێشچوونێکی یەکجار زۆر بەخۆوە دەبینێت."٩٧٩ هەرچەند زایۆنیستەکان حازر نەبوون لەسەر ئەو کێشەیە بەریتانیەکان لەخۆیان بدتارێنن. دڵنیابوون لەوە کە مەرجەکان لە بەرژەوەندی ئەوان نووسراون گرنگایەتیەکی یەکجار زۆری هەبوو.

ئەمە هەروا ئاسان نەبوو. لەنێوان بەریتانیەکاندا، ئەم هەستە خەریک بوو درووست دەبوو کە ولاتێکی زێد بۆ جوولەکەکان لە فلستین بەمانای ئالۆزی بۆ بەریتانیا بوو. کۆرزۆن لە دایرەی دەرەوە بۆ جەماوەرێکی زۆر قسەی دەکرد کاتێکە بە بالفۆری وت،" من خۆم شەخسەن، دڵنیام لەوەکە ماندێتی فلستین بکەوێتە دەست هەرکەسێک تووشی ئازار و ئەزیەتێکی یەکجار زۆر دەبێت، و ئەوە کە من لەم بەرپرسایەتیە دەست دەکێشمەوە هاوکات کە دەتوانین بچینەپێشێ." زایۆنیزم شتێکی درووست کردبوو کە لەوەپێش هەبوونی نەبوو، ڕای ڕێکخراوی عەرەبی فلستین، کە بەخێرایی فێربوو تا لە نارەزایەتینامە، سکالانامە و زمانی خود-موختاری کەڵک وەرگرێت. لەسەر شەقامەکانی جرووسلم جەماوەر چالاکی ڕاستەوخۆیان دەنواند؛ لە ساڵی ١٩٢٠ بەولاوە بەرپرسانی بەریتانی دەبوایە لەگەڵ سەرهەڵدانەکان بەربڵاوەکانی توندوتیژی لەوێ و لەشوێنی تر دژ بە جوولەکەکان هەڵیان بکردایە. چێرچیل هەمیشە خۆی بە هاوسۆزی زایۆنیزم دەزانی، بەڵام ئەو لیۆد جۆرجی ئاگادارکردبۆوە کە: " ڕاگرتنی فلستین هەر ساڵ ٦ملوێن خەرج بۆ ئێمە دەگرێتەوە. بزووتنەوەی زایۆنیستی دەبێتە هۆی ناکۆکی لەنێوان عەرەبەکاندا. ئەو فەرەنسەیانەی کە لە سووریە بە چوار لقەوە سەرپەنایەکیان درواوەتێ (حازرنین پارەیەکە قەرزداری ئێمەن بیگەڕێنەوە) دژی بزووتنەوەی زایۆنیستین و هەوڵ ئەدەن عەرەبەکان دژ بە ئێمە وەکوو دوژمنی ڕاستەقینە بورووژێنن."٩٨٠

بەریتانیەکان یەک بە دوای یەک مەسڵەحەتیان دەکرد. ڕەنگە باشتر وابێت عەرەبەکان و زایۆنیستەکان پێکەوە دانیشن و دانووستان بکەن. لە هاوینی ساڵی ١٩٢١دا شاندێک لە عەرەبەکانی فلستین بۆ لەندەن سەفەرێکیان کرد. چێرچیل بە هەندێک بێ تاقەتیەوە گوێی بۆ گلەوگازندەی بەتەوژمی ئەوان سەبارەت بە زایۆنیستەکان شل کرد. (ئەو خۆی لە پرسیارێکی دژوار کە لەلایەن ڕێبەرەکەیانەوە ئاراستە کرا بوارد،" ئەم بەڵێنەی کە ئێوە داوتانە چیە و

مانای چیە؟") ئەو بە عەرەبەکان پێشنیاری کرد کە "لەگەڵ بەڕێز ویزمەن وتوێژ بکەن. هەوڵ بدەن بۆماوەی چەند ساڵی داهاتوو لەگەڵی تەکبیرێک بکەن." هیچ کامیان حازر نەبوو بە جدیەتەوە لەگەڵ ئەوی تریان وتوویژ بکات. بۆچوونی ویزمەن " چەتەگەل و ئات و ئەشغاڵی سیاسی" بوو.٩٨١ عەرەبەکان بەئاسانی دووپاتیان دەکردەوە کە ئەوان حازر نین ڕاگەیاندنی بالفۆر و هەرشتێک کە بەو ناوەوە دەکرێ قەبووڵ بکەن.

لەم قۆناغەدا بەریتانیەکان زمانی بەکارهێنانی ماندێتیان کەم کردەوە تا ئەوە بگەیەنن کە ماڵی نیشتمانی جوولەکەکان تەنیا لە فلستین دەبێ هەتاکوو داگیرکردنی هەمووی بەگشتی. لەباتی ئەرکی دەسەڵاتی ماندێتێری بۆ پەرەدان بە کۆمێنوێلسێکی خۆ-بەڕێوەبەر، ئەوان "ڕێکخراوەگەلی خۆ-بەڕێوەبەر"یان دامەزراند. ویزمەن کە بەردەوام لەحاڵی سەفەر کردن، لەسەریەک تێلێگرام و نامەی تووڕەی ناردن، سەرقاڵ بوون بە هەمووی پێوەندیە بەربڵاوەکانی خۆی بوو، لە هەوڵی ئەوەدا بوو تا نەهێڵی حکوومەتی بەریتانی مەرجەکان لاوازتر بکات. ئەو لە ناهۆمێدیدا بۆ ئالبێرت ئەنشتەینی نووسی: "هەمووی کاراکتەرە تۆقێنەرەکانی جیهان خراونەتە گەڕ تا دژ بە ئێمە بوەستن. هەمووی جوولەکە دەوڵەمەندە کۆیلەکان، کۆنەپارێزانی مێشک تەسکی جوولەکە، هاوڕێ لەگەڵ واتیکان، لەگەڵ بکووژانی عەرەب، کۆنەپارێزانی دژە-سامی ئینگلیزی- بەکورتی، هەرهەمووی سەگەلەکە کەوتوونەتە قرووسکە قرووسک." ئەو ئەوەندەی کە خۆی هەستی دەکرد تەنیا و بێ کەس نەبوو. بەردەوام پشتگری لێدەکرا، زۆرجار لەلایەن کۆمەڵەکەسێکی چاوەڕوان نەکراو وەکوو زایۆنیستەکانی ئەڵمانی، قەشەکانی ئانجلیکەن یان کاتۆلیکەکانی ئیتالی. کۆنگرێسی ولاتەیەکگرتوەکان خۆی لە حاڵەتی دوورەپەرێزی و دەروونپشکنینی خۆی هێنایەدەرێ تا لەقازانجی ماڵی نیشتمانی جوولەکەکان چەند بڕیارنامەیەک پەسەند بکات. و هاوپەیمانانی سەرەکی بەریتانی ویزمەن قورس و توند خۆیان ڕاگرت. لە دانیشتنێکی نهێنیدا لە ماڵی بالفۆر لە ٢٢ی مانگی ژانویەی ساڵی ١٩٢١دا، لیۆد جۆرج و بالفۆر ئەویان دڵنیاکردەوە کە "ئەوان هەمیشە مەبەستیان وڵاتێکی شیمانەکراوی جوولەکە بوو."کاتێکە کێشەی دژواری بە قاچاخ ناردنی چەک و تەقەمەنی بۆ فلستین هاتە بەرباس، چێرچیل چاوی trووکاند: " ئێمە گرنگی پێ نادەین، بەڵام قسەی لێ مەکەن و بێ دەنگەی لێ بکەن." هەرهەمووی ئەوانەی کە لەو دانیشتنەدا بەشدار بوون لەسەر ئەم باوەڕە بوون کە شاندی نوێنەرایەتی عەرەبی فلستین هەر تۆق بوون." لیۆد جۆرج بەخۆشحاڵیەوە پێشنیاری کرد کە بۆنابێ بەرتیلیان نەدرێتێ؟ سەرەک وەزیر دنیایەک

بیروبۆچوونی باشی لەمێشک دابوو. ئەو بە بالفۆری ڕاگەیاند" تۆ دەبێ لە کۆلی ئالبێرت سەبارەت بە زایۆنیزم بۆ جارێکی تر وتارێکی مەزن پێشکەش بکەیت."٩٨٢

لە مانگی ژوولای ساڵی ١٩٢٢دا کۆمەڵەی گەلان ماندێتی فلستینی پەسەند کرد کە لەلایەن حکوومەتی بەریتانیەوە خرابوە بەردەمی. لە فلستین، کۆنگرێسێکی عەرەبی ماندێتەکەی بەتەواوەتی ڕەت کردەوە. ویزمەن زۆر کەیفخۆش بوو: ماندێتەکە بەشێوەیەکی فەرمی جوولەکەکانی وەکوو مرۆڤ دەناسی. هەرچەند ئەمە تەنیا کۆتایی یەکەمین بەشی خەباتی جوولەکەکان بوو؛ " ئەگەر ئێمە درێژە بە چالاکیەکانمان لە فلستین بدەین، کاتێکە دەرفەتێکی تری بەخشینی ماندێت بەهای ڕاستەقینەی خۆی بدرێتێ ئەوکاتە کاتی خۆیەتی."٩٨٣ ئەو دەرفەتە بڕیار بوو بەشێوەیەکی ترسێنەر و چاوەڕوان نەکراو بە سەرهەڵدانی هیتلێر و شەڕی دووهەمی جیهانی بێت.

بالفۆر بۆ یەکەمین جار لە ساڵی ١٩٢٥دا لەگەڵ ویزمەن و خێزانی ئەو سەردانی فلستینی کرد. لە جرووسلم، ئەو زانکۆی تازەی هێبرووی بە وتارێکی وروژێنەر کردەوە کە تێیدا ئەو بە شانازیەوە باسی ڕۆڵی خۆی دەکرد کە لە دامەزراندنی وڵاتی جوولەکەنشین گێڕابووی. ئەو لەو پێشوازیەی کە لەلایەن جوولەکەکانەوە لە فلستین لێیکرا سەری سووڕمابوو و نەیدەزانی چلۆن بەرێدابڕوات بەڵام سەرنجی نەدایە عەرەبە ڕەشپۆشەکان و ئەو هەموو دووکانەی کە بەهۆی نارەزایەتیەوە داخرابوون. ئەمینداری نهێنی ئەو سەدان تێلێگرامی توورەی لەلایەن عەرەبەکانەوە لەت و پەت کرد بەرلەوەی کە ئەو چاوی پێیان بکەوێت. کاتێکە ئەو و پارتەکەی بەرەو سووریە وەڕێ کەوتن تا چاوێک بەوڵاتدا بگێڕن، بەرپرسانی فەرەنسەیی بە دەوری ئەو گاردێکیان بەست، ئەمە بووە هۆی نارەحەتی ئەو. لە دەمێشق، هۆتێلەکەی ئەو لەلایەن جەماوەرێکی دوورخراوەی ٦،٠٠٠کەسی عەرەبەوە گەمارۆ درابوو. کاتێکە وورده بەرده چندراوەکان بە ئاسماندا دەهاتن زرێپۆشی فەرەنسەیی تەقەیان دەکرد، بالفۆر سەری لێ شێوابوو. عەرەبێکی لاو کە تاسەباری پارتەکەی بوو هەوڵیدا ڕوونی کاتەوە کە بۆچی سەبارەت بە زایۆنیزم دژایەتیەکی لەو چەشنە دەکرێت. بالفۆر تەنیا وڵامی دایەوە کە ئاکامەکانی تاقیکردنەوەکەی ئەو " بەڕاستی سەرنجڕاکێشن." ئەو بە کەشتی سفینکس گەڕایەوە بۆ ئورووپا.٩٨٤

* * * *

# ٢٩
# ئاتاتورک و تێکشکانی سێڤرەکان

لە سەرەتای مانگی مەی ساڵی ١٩١٩دا، وتوێژە تاوتاوەکان سەبارەت بە ئیمپراتۆری عوسمانی لەلایەن بزووتنەوەکانی ئیتالیەوە لە ئاسیای بچووک تووشی هەژانێکی ناخۆش هات. ئیتالیەکان لە تورکیە بۆ ماوەیەکی کورت لە وەرزی زستاندا هێزەکانی خۆیان لە تورکیە دابەزاند، وادیاربوو مەبەستیان پارێزگاریکردن لە هاوولاتیانی ئیتالی، یان، لە بۆنەیەکدا، لە دەیرێک بوو. لەوکاتەدا هێزەکانیان وادیاربوو لە بەندەرەکانی ئادالیا (ئانتالیا) لە باشوور و لە مەرمەریس، ڕووبەڕووی دوورگەی ڕۆدیس، سەقامگیر کردبێت هەرکیان لە ناوچەیەک کە ئیتالیا لە چوارچێوەی ڕێکەوتنامەکانی سەردەمی جەنگی خۆیدا بانگەشەی بۆ دەکرد. گوزارشەکان لە کەشتیەکی جەنگی ئیتالی لە بەندەری سمیرنا (ئیزمیر) دەهاتن و لە ١١ی مانگی مەیدا ئیلوتیریوس ڤێنیزیلۆس بە شۆڕای چوار یاری ڕاگەیاند کە پارتە کرێکارەکانی ئیتالی خەریک بوون لە سکالا نۆڤا (کووشاداسی)، تۆزێک بەرەوە باشوور، شۆستەکانی بەندەریان دروست دەکرد. بێجگە لەوە ئەو بانگەشەی دەکرد کە ئیتالیەکان لەگەڵ تورکەکان مامەلەیەکی نهێنیان کردبوو. ئاشتیکەران ئامادەیی ئەوەیان هەبوو کە باوەڕ بە خراپترین شت بکەن. ویلسۆن وتبووی " من حەز ناکەم ڕێگە بدەم بە ئیتالیەکان ئەوەی کە لەو بەشە لە جیهان دەیانەوێت جێبەجێی بکەن. من لە نیەت و ئارەزووەکانی ئەوان گومانم هەیە. ئەگەر لە ئەمریکا هەمووی ئەو شتانەی کە ئێمە سەبارەت بە چالاکی و پیلانەکانی ئەوان دەیزانین بلاوم بکردایەتەوە، هەموو شەڕ و شۆڕێکیان لێ هەڵدەگیرسا."٩٨٥

لیۆد جۆرج و کلیمینجوو لە ڕق و تووڕەییەکەی ویلسۆندا شەریک بوون بەڵام گوشاری قەول و بەڵێنەکانی خۆیان لە سەردەمی جەنگ تەنگی پێ هەڵچنیبوون. لە گرێبەستی لەندەن لە ساڵی ١٩١٥، کە ئیتالیای کێشابوە ناو گۆڕەپانی شەڕەوە، ئەوان بەڵێنیان دابوو کە، ئەگەر بێت و تورکیە پارچەپارچە بکرێت، ئیتالیا " بەشێکی بەحەقی" پێ دەبڕێت. زمانەکە مەترسی لێدەکرا و بێ مانابوو ، ئەوەی

دەگەیاند کە ئیتالیا بۆی هەیە بەشێکی گەورەی لە کەنار ئاوەکانی ئاسیای بچووکی پێ ببڕێت، بەدڵنیایەوە پارێزگای تورکی ئادالیا و ناوچەکانی دەوروبەری، و ڕەنگە بەرەو باکوور هەتا سمیرنا و باشوور تا عەدەنە، درووست لەوشوێنەی کە کەنارئاوەکانی ئاسیای بچووک دووبارە بەرەو باشوور دەشکێتەوە. ئەوە بەدڵنیایەوە هەر ئەوەیە کە ئیتالیەکان بۆی چووبوون. لەچوارچێوەی ڕێکەوتنامەی سایکس-پیکۆت لەنێوان بەریتانیا و فەرەنسە، ئەوە شتێکی بێ مانابوو کە فەرەنسەیەکانیش داوای ناوچەیەکی دەوروبەری عەدەنەیان دەکرد. کاتێکە ڕێکەوتنامەکە بەسرا حکوومەتی ئیتالی چاوی پێی نەکەوتبوو، بەڵام ئەوەندەی بیستبوو کە بتوانێ گێچەڵەی بۆ ساز بکات. سۆنینۆ بەردەوام داوای شیکاری دەکرد؛ ئەو لە ئاکامدا لە شارۆچکەی بچووکی ئالپەینی ئس تی.-جین دی-مۆرینی لە مانگی ئاڤریلی ساڵی ١٩١٧دا بە دەستی هێنای. لیۆد جۆرج کۆبوونەوەکانی وەکوو بەفری ماوەی سەرعەرز لەبیر هاتەوە. سۆنینۆ " لە ڕق و تووڕەییدا سوورهەڵگەڕابوو." بەریتانیا و فەرەنسە بەنابەدڵیەوە وازیان لە بەشێکی گەورەی ناوچە تورک نشینەکان هێنا؛ ئیتالیا لەوە دەچوو بەسەر لاکێشەیەکی گەورە لە باشوور کۆرتڕۆڵی ڕاستەوخۆی هەبێت کە بەندەری گرنگی سمیرنای دەگرتەوە، و پوازێکی گەورەی بەرەو باکووری سمیرنا دەبوو بە ناوچەی ژێردەسەڵاتی ئیتالیا. لیۆد جۆرج بەتوندیەوە بە سۆنینۆی وت کە " ئێوە دەتانەوێ ئێمە کارەکە بکەین و لە کۆتایی شەڕدا دوودەستی بیدەین بەدەست ئێوەوە." هەرچەند هەم بەریتانیا و هەمیش فەرەنسە یەک بە دوای یەک بانگەشەی ئەوەیان دەکرد ڕێکەوتنامەکە ناڕەوایە لەسەر ئەوە کە کەوتۆتە دەست ڕازیبوونی ڕووسیە (کە بەهۆی شۆڕشەوە نەهاتەدی)، حکوومەتی ئیتالی پێداگری کرد کە ئێستاش مافی بەسەر بەشی خۆی لە ئاسیای بچوکەوە هەیە.٩٨٦

ناسیۆنالیستەکانی ئیتالی بۆ ئەوەی پشتگری لە داواکاریەکانی خۆیان بکەن ئیمپراتۆری گەورەی ڕۆمانیایان دەهێنایەوە بیر (هەرچەند کاتێکە یوونانیەکان تەنانەت ئیمۆراتۆری کۆنی خۆیان هاتەوە بیر، ئیتالیەکان وەک " نەخۆشی شێتی هێلینیک" ناویان لێبرد و بەهیچیان زانی"). ئەوان ئاماژەیان بە پێویستبوونی ئیتالیا بە کەرەسەی خاو دەکرد (کانزا خەڵووزەکانی ئیریگلی، یان هێراکلیووم وەک ئیتالیەکان ئاماژەیان پێدەکرد، زۆر پێویست بوو) و بە دەرچەکان بۆ وەبەرهێنان و کەل و پەلەکان. ئیتالیا بەگشتی پارێزگاری لە مەسیحیەکان بەتایبەتی دانیشتوانی ئیتالی دەکرد، و تورکەکانیان شارستانی دەکرد. سەرۆکی ستافی گشتی لە ساڵی ١٩١٨دا وێنەیەکی خەیاڵی و ڕۆمانسی لە ناوچەی داهاتووی ئیتالی کێشابۆوە: " کەش و هەوای ئەوێ بۆ کۆچبەرانی ئێمە لەبار و خۆشە، بەپیتی ئەوێ ناوبانگی هەیە، وەک دەڵێن دانەوێڵە یەکی پەنجای لێدەکەوێتەوە؛ لەکۆتاییدا هەبوونی ناوچە بەربڵاوەکانی نەکێڵدراو لەلایەن قەرەباڵغی حەشیمەتەکەیەوە سەلمێنراوە،

کە، لەگەڵ شارۆچکەکان لە حاڵی حازردا کەمتر لە بیست و حەوت کەس لە کیلۆمەترێکی چوارگۆشەدا دەبێت؛ خودی حەشیمەتەکە لەلایەن کۆلۆنایزەیشنی ئیتالیەوە دواتر هەمووشتێکی لەبەردەست دادەبێت تا شت بەرهەم بێنێت و هیچی نابێت تاکوو بیدۆڕێنێت." لەڕاستیدا، زۆربەی ئیتالیەکان وایان بەباش دەزانی کە پارەی خۆیان دوور لە هەر مەترسیەک لە وڵاتی خۆیان وەبەربێنن؛ و کۆچبەران، وەک ئەزموونی چەند کۆلۆنیەکی ئیتالی پیشانی دابوو، ئەمریکیەکانیان بەباش دەزانی. ئۆرلاندۆ دانی بەوەدا هێنابوو کە " ئیتالیەکان بەگشتی سەبارەت بە ئاسیای بچووک هیچ گرنگیەکیان نەدەدا، لەبابەت کۆلۆنیەکانی ناو ئەفریقاشەوە هەر وابوون."٩٨٧

سۆنینۆ بۆچوونێکی ڕاستی گرتەبەر بەومانایە کە ئاسیای بچووک بەشێک لە دەسکەوتەکانی جەنگ بوو و ئیتالیا بەشی خۆی دەگرێت. وەک ئەو ئاماژەی پێکردبوو، یان هەموو زلهێزان شتێکیان گیر دەکەوت یان هیچ کەس هیچی گیر نەدەکەوت. ئەو بە کۆمیسارییای عالی لە کۆنستانتینۆپل ڕاگەیاند کە ڕکابەرانی ئیتالیا لەڕووی فێڵبازیەوە لە دۆکترینی خود-موختاری کەڵکیان وەرگرتوە تا داواکاریەکانی ئیتالیا لەسەر پێوەلکاندن و زیادکردنی ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی خۆیان ڕەت کەنەوە. ئەمە دەبێ بە هاندانی دانیشتوانی ناوچە بۆ داواکردنی پارێزگاریکردنی ئیتالیەکان بەری بگیرێت؛ سۆنینۆ کۆمیسارییای عالی هان دا تا ئەمە بەووردی و بەهێواشی جێبەجێ بکات. هەرچەند نیگەرانی سەرەکی ئەو ئادریاتیک بوو، و ئەو ئامادە بوو تا بەتەواوەتی سەبارەت بە داواکاریە دووهەرەدەستەکان بۆ دەسکەوتی باش نزیک لە وڵات مامەڵە بکات.٩٨٨

هاوکات کە لە کۆتایی مانگی ئاڤریلدا ئاڵۆزی لەگەڵ ئیتالیا لەسەر فیووم و ئادریاتیک بەرەو خراپی دەڕۆیشت، لیۆد جۆرج و کلیمینجوو ئامادە بوون تا لە ئاسیای بچووک وەک دانەخۆرەیەک کەڵک وەرگرن. وەک لیۆد جۆرج بە ویلسۆنی ڕاگەیاند، " ئەوەی کە ڕەنگە بتوانێت ئم.سۆنینۆ بەلای ئێمەدا بکێشێت بەخشینی زێدەمافێک دەبێت لە ئاسیادا." بالفۆر لەبن لچیەوە مرەمرێ دەهات و دەیگوت ئەوە کارێکی مەترسیدارە بەڵام بۆ هێورکردنەوەی ئیتالیەکان شتێکی گرنگە: "بەداخەوە، ئەم پێویستبوونە ڕێ لە هەموو هەنگاوێکی دیپلۆماسی ئێمە دەگرێت." ویلسۆن بەرگری دەکرد، ئەو ئاماژەی بەوەکرد کە " لە بەڕێوەبردنی کۆلۆنیەکان ئیتالیا خاوەنی هیچ ئەزموون و بەسەرهاتێک نیە." هاوڕێ لەگەڵ ئەوانەدا، تورکەکان ڕقیان لە دەسەڵاتی ئیتالی دەبوو. لیۆد جۆرج لەتاوان پەنای بۆ مێژوو برد-" ڕۆمانیەکان بەڕێوەبەرانێکی باش بۆ کۆلۆنیەکان بوون-" و بۆچوونێکی سەرسوورهێنەری تورکەکان وەک" خەڵکێکی ملکەچ، کە قەت ڕێگاکانی شەمەندەفەریان نەپساندبێت، یان هیچ کارێکی لەو چەشنەیان نەکردبێت" بوو. ویلسۆن هیچ هەستی نەجووڵا: "

بەداخەوە ئیتالیایە پێشکەوتووەکان ڕۆمانیەکان نەبوون." بێجگە لەوە ئەو ئاماژەی بەوەکرد کە یوونانیەکان، کە وادیاربوو کە بتوانن لە ئاسیای بچووک هەندێک ماندێت بگرن، ئیتالیەکانیان خۆش نەدەویست: " باوکسالاری کۆنستانتینۆپۆل، کە ڕۆژێک دواتر هاتبوو بۆ دیتنی من، لای من دژ بە ئەگەری دیتنی درواسێبوونی ئیتالیەکان هەستێکی زۆر سەیری دەربڕی."٩٨٩

لەماوەی یەکەمین حەفتەی مانگی مەیدا، لەکاتێکدا کە ئیتالیەکان خەریکی بایکۆتکردنی کۆڕی ئاشتی بوون، بەریتانیەکان و فەڕەنسیەکان سەبارەت بە بۆچوونی لەخشتەبردنی ئەوان بە پارووەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی سارد بوونەوە. لە ٢ی مانگی مەیدا، کاتێکە سێ یاری گەورە کۆبوونەوە، سەبارەت بە بزووتنەوەکانی ئیتالیەکان بەدرێژایی ئاسیای بچووکدا گوزارشی زیاتر بەگوێ دەگەیشتن. لیۆد جۆرج وتی" عەجەب سەرشێتیەکە." کلیمینجوو زۆر سەخت گرتبووی: " ئەگەر بێت و وریای خۆمان نەبین، ئەوان بەربینگمان دەگرن." ویلسۆن هەڕەشەی کرد تا کەشتیەکی جەنگی ئەمریکی یان بۆ فیووم بنێرێت یان بۆ سمیرنا. لیۆد جۆرج وتیبووی کە ڤێنزیلۆس پێشنیاری کردبوو تا کەشتی جەنگی یوونانی بنێرێت.٩٩٠

ڤێنزیلۆس لەو شوێنەی کە دەبوو ببوایە بوو، دژ بە ئیتالیەکان هەست و سۆزی جوولاند و پێشنیاری یارمەتی بە زلهێزان دا. ئەو هەر لە دەستپێکی کۆڕی ئاشتیەوە بە چڕوپڕی هەوڵی دابوو تا داواکاریەکانی یوونان، بە سەرکەوتنێکی هەمەڕەنگەوە، بەرەوپێشەوە بەرێت؛ وەک خۆی هەستی پێکردبوو، قەیرانەکە دەرفەتێکی گەورە بوو بۆ یوونان. هەرچەند ڤێزیلۆس هەوڵی دابوو ئەوە بسەلمێنێت کە کەنار ئاوەکانی ئاسیای بچووک لە ڕەوشتدا دوور لە هەر گومانێک یوونانین، و تورکەکان کەمینەیان بەدەستە، ژمێرەناسیەکەی ئەو هەتابڵێی گوماناوی و نادیار بوو. بۆ ئەو ناوچەیەی ناوەوەی وڵات کە ئەو داوای دەکرد، شوێنێک کە تەنانەت ئەو دەبوایە دانی پێدابێنایە کە تورکەکان زۆرینەیان بەدەستە، ڤێزیلۆس بەڵگەی ئابووری دەهێنایەوە. هەمووی ناوچەکە (پارێزگاکانی تورکی ئەیدین و بروسا[بۆرسا] و ناوچەکانی دەوروبەری داردانیلیس و ئیسمید) یەکەی جوگرافی بوو کە سەر بە مەدیتەرانە بوو؛ ئەوێ گەرم بوو، ئاوی باشی هەبوو، زەوی و زاری بەپیت بوون، بەرەو جیهان کرابۆوە، بەپێچەوانەی فەلاتی ئاسیایی و وشکی دوورە ئاو. ئەو لە یەکەمین دەرکەوتنی خۆیدا لە مانگی فەوریەدا بە شۆڕای عالی ڕاگەیاندبوو " تورکەکان کرێکاری چاک بوون، لە پێوەندیەکانیاندا سادق بوون، و وەک بندەست خەڵکانێکی باش بوون." بەڵام وەکوو دەسەڵاتدار ئەوان پشتگریان لێنەدەکرا و بۆ شارستانیەت مایەی بێ ئابڕوویی و شەرمەزاری بوون، سەلمێنەری ئەم ڕاستیە قەڵاچۆکردنی یەک ملوێن و ٣٠٠،٠٠٠

یۆنانی بوو لەماوەی چوارساڵی ڕابردوودا." بۆ ئەوەی نیشان بدات کە چەندە ماقووڵە، ئەو وازی لە داواکاریەکانی خۆی سەبارەت بە شوێنە دانیشتنەکانی یوونانی کۆن لە پۆنتێس لە کۆتایی ڕۆژهەڵاتی دەریای ڕەش هێنا. ئەو گوێ بۆ سکاڵانامەکانی یوونانیانی پۆینتێ شل نەدەکرد، ئەو یاریدەدەری هاوس، بۆنسالی، دڵنیا کردەوە کە: " من بەوانم ڕاگەیاندوە کە ناتوانم داوای کەنار ئاوی باشوور دەریای ڕەش بکەم، چون دەستەکانی من لە ترەسی و لە ئاناتۆلیا پڕن." لەسەر داواکاریەکانی ئیتالیا ئاڵۆزیەکی بچووک هەبوو، بەڵام ئەو لەوە دڵنیابوو کە هەردووولات دەیانتوانی ڕێکەوتنێکی دۆستانە ببەستن. ئەوان، لەڕاستیدا، تازە کەوتبوونە خۆ و ئاشکرابوو کە هیچکامیان ئامادە نەبوون پاشەکشێ بکەن، بەتایبەت لەسەر سمیرنا.٩٩١

بەندەری ڕوولەگەشەی سمیرنا لە ناودڵی داواکاریەکانی یوونان هەڵکەوتبوو. لە ڕابردووی هێلینیکی گەورەدا یوونانی ببوو، و لە سەدەی نۆزدەهەمدا زۆرینەیەکی یوونانی بۆ ڕایەکی تر باڵی بەسەرداکێشابوو چون کۆچبەران لە وڵاتی دایکەوە هرووژمیان هێنابوو بۆ ئەوێ تا لە ڕێگاتازەکانی شەمەندەفەر کە بەرو زەویە دوور لەئاوەکان دەکێشران و دەرفەتگەل بۆ تجارەت و وەبەرهێنان کەڵک وەرگرن. حەشیمەتی ئەوێ بەرلە شەڕ لانی کەم یەکچوارەمی ملوێنێک دەبوو و یوونانی زیاتر لەوێ دەژیان هەتا ناوخودی ئاتێن. ئەوان بەسەر هەناردەکاندا زاڵ بوون-لە هەنجیرەوە بگرە تا تریاک و فەرش و فرووش- کە لە فەلاتی ئاناتوولی لە ئاسیای بچووک هرووژمیان هێنابوو. سمیرنا شارێکی یوونانی بوو، ناوەندی فێربوونی زمان و ناسیۆنالیزمی یوونانی بوو- بەڵام هاوڕێ لەگەڵ ئەوانەشدا بەشێکی هەستیار لە ئابووری تورکی بوو.

کاتێکە ڤێنزیلۆس گەیشتە سمیرنا و ناوچەدوورلەئاوەکانی ئەوێ، ئەو لەپشت ئەوشتانەی کە لەبواری خود-موختاریدا ڕوون دەکرانەوە باش سەری دەرهێنابوو. هاوڕێ لەگەڵ ئەوە ئەو خەریک بوو یوونانی دەخستە ناو دۆخێکی مەترسیادار و تووشەوە. ئەو جۆرەی ئەو بۆی دەچوو دەستەبەسەرداگرتنی دەر و دۆڵە پڕپیتەکانی ئاسیای بچووکی ڕۆژهەڵات کە بەرەو کوێستانە وشک و قاقڕەکانی ئاناتۆلی هەڵدەکشا بۆمەبەستی پارێزگاریکردن لە کۆلۆنیەکانی یوونان بەدرێژایی کەنارئاوەکاندا پێدەچوو پێویست بووبێت. هەرچەند لە ڕوانگەیەکی ترەوە پارێزگایەکی یوونانی بەژمارەیەکی بەرچاو لە نا-یوونانیەکان و هەروەها هێڵیکی درێژ بۆ بەرگریکردن لە هەر کەسێک کە فکری هێرشکردن لە ئاناتۆلیای ناوەندیەوە لە مێشکی دەدا. ڕکابەری گەورەی ئەو ژەنەراڵ لوەنیس مێتاکساس، دیکتاتۆڕی دواتری یوونان، بەردەوام لەبابەت ئەمەوە هەڕەشەی دەکرد و هۆشداری دەدا: " وڵاتی یوونان ئەمڕۆکە بۆ حکوومەت و چەوساندنەوەی ناوچەیەکی وەها بەرین و بەربڵاو ئامادەیی نیە."٩٩٢ مێتاکساس ڕاستی دەکرد.

کۆمیسیۆنی تایبەت بە کاروبارەکانی یوونان و ئالبانیا، کە چاوەڕوان دەکرا هەڵگری چارەسەریەکی ئاقڵانە بۆ هەمووی داواکاریەکان سەبارەت بە ناوچەی عوسمانی بێت، جێی سەرسووڕمان نەبوو کە نەیتوانی ڕێگەچارەیەک بدۆزێتەوە. ئیتالیەکان بەئاشکرا دژی داواکاریەکانی یوونان و بەریتانیەکان و فەرەنسیەکان هاوسۆز و هاوخەم بوون. پسپۆڕانی ئەمریکی، کە ئامادەبوون هەتا دان بە داواکاریەکانی یوونان لە ئەورووپادا بنێن، هەستیان کرد کە، ویژدانەن، ئەوە لە ئاسیای بچووکدا بکەن. تورکەکان لە ناوچەکەدا بەگشتی زۆرینەیان بەدەست بوو و، هەرچەند سمیرنا یوونانی بوو، لەبواری ئابووریدا دابڕانی ئەویّ لە تورکیە هەڵە بوو. هەر وەک کارناسی ئەمریکی ویلیام لین وێستێرمەن وتبووی، "سمیرنا و بەندەرەکەی چاوان، دەم، و کونەلووتەکانی خەڵکانی ئاناتۆلیان." ئەمریکیەکان ئەو بەڵگەیەشیان قەبووڵ نەدەکرد کە تورکەکان ئەوەندە دواکەوتەبوون کە پێویستیان بە دەسەڵاتی دەرەوە بوە. پسپۆڕێکی ئەمریکی وتبووی: "ئەوە ڕای گشتی مۆژدەدەرانی ئەمریکیە، کە بەتەواوەتی دەیناسن، هینی شوێنەوارناسانی ئەمریکی، بەریتانی و فەرەنسیییە کە سالیانی ساڵ لەگەڵی بوون و کاریان لەگەڵ کردوە، هینی تاجرانی بەریتانیە کە لەگەڵ ئەو تجارەتیان کردوە، هینی سەربازانی بەریتانی کە دژ بە ئەو شەڕیان کردوە، کە تورکی ئاناتۆلی وەکوو هەر کەسێکی تری ڕۆژهەلاتی نزیک سادق و درووست بوە، کە ئەو وەرزێرێکی کۆڵنەدەرە، شەرکەرێکی بوێر و دڵئاوایە، کە هەر لە بنەڕەتەوە بەتوانا و هەڵکەوتەیە."٩٩٣

گوزارشی کۆمیسیۆن بە هاسانی هەردوو بۆچوونەکەی پێشکەش کرد. ویلسۆن لەوانەبوو پشتگری لە هەڵوێستی پسپۆڕانی خۆی بکردایە ئەگەر تووڕەی ئەو لەگەڵ ئیتالیەکان وای نەکردایە لە ئەو کە بیهەوێت گوێ بۆ ڤێنزیلۆس شل بکات، کەسێک کە دڵنیا بوو لەوە کە سێ یاری گەورە، گوزارشگەلی ترسێنەریان سەبارەت بە ڕاستبوونی نادیاری ئەو یوونانیانەی کە لەلایەن تورکەکانەوە کۆمەڵکوژ دەکران و سەبارەت بە شێوازێکە تێیدا ئیتالیەکان، ئەو جۆرەی ئەو دەیگێڕاوە، دەست لەناودەستی یەک پێکەوە لەگەڵ تورکەکان کاریان دەکرد. بەڕای نیکلسۆن، یەکێک لە پسپۆڕانی بەریتانی لەناو کۆمیسیۆندا، ڤینزێلۆس بەخۆەوە دەنازی و دەیکوت: "من لەلایەن لیۆد جۆرج و ویلسۆنەوە ئەرخەیان کراوم و بەڵێنی پشتگری تەواوم پێدراوە." لێۆد جۆرج پێشتر لەسەر ئەوە ڕێکەوتبوو کە ڕاونەرێکی یوونانی دەبێ حەواڵەی سمیرنا بکرێت، و ڤینزێلۆس ئاهەنگێکی کرانەوەی دیت تا وەک بەرگریکەر لەبەرانبەر ئیتالیەکاندا هێزگەلی یوونانی ڕەوانەی ئاسیای بچووک بکرێت. ئەو و ڤینزێلۆس لە سەرەتای مانگی مەیدا ئێوارەخوانێکی نهێنیان

پێکەوە بردە سەر. فرانسیس ستێڤێنسۆن، کە بەشداری دەکرد، لە یادداشتنامەکەی خۆیدا هێنابووی کە " هەردوولا سەیر بە شان و باڵی یەکتردا هەڵ دەڵێن، & دی. لەهەوڵی ئەوەدایە تا سمیرنا بۆ یوونانیەکان مسۆگر بکات، هەرچەند لە سەری لەگەڵ ئیتالیەکان کەوتۆتە کێشە و نارەحەتیەوە."ئەوەی کە ڤێنزیلۆس لە ئێوارەکەدا وەبیری مابوو ئەوەبوو کە لیۆد جۆرج هیواداربوو کە بتوانێت کۆنستانتینۆپلیش بۆ یوونانیەکان مسۆگر بکات.٩٩٤

سەرلەبەیانی ڕۆژی ٦ی مانگی مەی، هاوپەیمانان بەشێوەیەکی نافەرمی بڕیاریان دا تا ڕەوتێک دەستپێکەن ، لەنێوان زۆر شتی تر، خودی سمیرنا، خەونی گەورەی ڤینیلۆس و هاوپەیمانی بەڕێوەبەری لیۆد جۆرج لەناوبەرن. لە شۆڕای چوار یاردا، لیۆد جۆرج گوشاری هێنا تا سەبارەت بە سمیرنا بڕیارێک ساخ بکرێتەوە. ئەو دەیوت ئەگەر ئەوان هەوڵێک نەدەن ئیتالیەکان سەرکەوتوانە پارچەیەک لە ئاسیای بچووک بۆخۆیان داگیر دەکەن. هێزکانی یوونانی حازر و ئامادە لەبەردەست دابوون؛ دەکرا بەوان ڕاگەیەنرێت کە لە هەرشوێنێک هەست بە مەترسی کوشت و کوشتار یان ئاژاوەگەری دەکرێت بمێننەوە. ویلسۆن لەوڵامدا وتی " لەبەرچی پێیان نەڵێین ئێستا بمێننەوە؟ ئایا ئێوە هیچ نارەزایەتیەکتان نیە؟" لیۆد جۆرج وتی "نا". کلیمینجوو هەڵیدایە و کوتی: " منیش هیچ نارەزایەتیەکم نیە. بەڵام ئایا پێویستە کە ئیتالیەکان ئاگادار بکەینەوە؟" لیۆد جۆرج وتی " بەڕای من نا هیچ پێویست ناکات." ئیتالیەکان، کە ڕۆژێک دواتر بۆ کۆڕی ئاشتی گەڕابوونەوە، پێیان ڕاگەیەنرابوو کە بە هاوپەیمانانی ئەوان کرابوە سەریان تا بەنەبوونی ئەوان بکەونە خۆ تا بەرگری لە کوشتوکوشتارێکی نزیکەوڕوودان بکەن. کاتێکە سۆنینۆ پرسیاری کرد کە لەبەرچی زلهێزان نوێنەرانی خۆیان نەناردبوو. کلیمینجوو بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە بردنی ئەوان بۆ ژێر دەسەڵاتی ژەنەڕاڵێکی یوونانی کارێکی زۆر سەخت و دژوارە. ئەو سۆنینۆی لەوە دڵنیاکردەوە کە " ئەمڕۆکە سمیرنا تایبەت بە هیچ کەسێک نیە؛ ئەمە کێشەی دیاریکردنی چارەنووسی ئەو شارە نیە، بەڵکوو کێشەی جێبەجێکردنی ئۆپراسیۆنێکی کاتیە هاوڕێ لەگەڵ ئامانجێکی باش-تاریفکراو." لەڕاستیدا کلیمینجوو بۆماوەیەکی کاتی تەواو کەوتبوە ژێرکاریگەری ڤینزیلۆسەوە: ئەو بە موورداکی ڕاگەیاند کە " ئوولیسێس تەنیا پیاوێکی بچووکە لەپەنای ئەوەوە. ئەو دیپلۆماتێکی تەواو عەیارە، هەتابڵێی هەستیار، ئامادە، زیرەکە، و هەمیشە ئاگاداری ئەوەیە کە بەدوای چیەوەیە."٩٩٥

دوانیوەڕۆی دوا ئەو بڕیارە چارەنووس سازە لیۆد جۆرج داوای لە ڤینزیلۆس کرد بوو تا بەرلەوەی کە شۆڕای چوار یار پێکەوە کۆبنەوە بەپەلە وتوێژێک ڕێک بخەن. ڤینزیلۆس لە یادداشتەکەی خۆیدا هێنابووی کە لیۆد جۆرج بە پرسیارێکی زۆر ئاسانەوە دەستی پێکردبوو:

لیۆد جۆرج: ئایا ئێوە هێزی ئامادەتان لەبەردەستدا هەیە؟

ڤینزیلۆس: بەڵێ. بۆ چ مەبەستێک؟

لیۆد جۆرج: سەرەک ویلسۆن، ئیم.کلیمینجوو و من ئەمڕۆکە بڕیارمان داوە کە دەبێ سمیرنا داگیر بکەیت.

ڤینزیلۆس: ئێمە ئامادەین.

کاتێکە ڤینزیلۆس لەگەڵ سێ یاری گەورە و ڕاوێژکارانی نیزامی ئەوان کۆبۆوە هەتا وردەکاریەکان ڕێک بخات زۆر گەشبین و دڵخۆش بوو. هێزەکانی ئەو ئامادەبوون، تورکەکان پێشنیاری هیچ بەرخودانێکیان نەکرد و دانیشتوانی یوونانی سمیرنا بەخێرهاتنیان لێکردن. لیۆد جۆرج و ڤینزیلۆس ڕێکەوتن کە باشتر وایە هێزەکانی فەڕەنسەیی و ئینگلیزی قەڵاکانی ناو دەروازەی چونەژوورەوە بۆ بەندەرەکەیان داگیرکەن و دواتریش بیانگەڕێننەوە بۆ یوونانیەکان. کلیمینجوو، بە هەندێک نابەدڵیەوە، درێژەی دایە؛ ئەو لەترسان کوتوپڕ سارد بۆوە، بەتایبەت سەبارەت بە تووڕەکردنی ئیتالیەکان هەر لەخۆوە و بەبێ هیچ پێویستیەک. ویلسۆن سەری لێشێوابوو نەیدەزانی چی بکات ئایا لەچوارچێوەی یاسادا هەوڵ بدات یان بەقسەی ڕق و تووڕەیی خۆی سەبارەت بە ئیتالیەکان بکات. لە کۆتاییدا ئەو پشتگری لە داگیرکردن کرد، کە بۆ ١٥ی مانگی مەی پلانرێژی کرابوو. هێنری ویلسۆن، پسپۆڕی نیزامی بەریتانیا نووسیبوو" هەمووشتێک شێواوە و هیچ شتێک لەجێی خۆی نەماوە."٩٩٦

لە خودی سمیرنا دۆخەکە ئاڵۆزتر ببوو. نوێنەرانی حکوومەتی یوونانی هەر لە کۆتایی شەڕەوە لەوێ ببوون، هەوڵیان دابوو هەست و سۆزی ناسراوی خۆیان سەبارەت بە دەسەڵاتی یوونانی دەربڕن. نوێنەرانی بەریتانی و فەڕەنسەیی بە هەست و سۆزەوە چاویان لێبڕیبوون، ئیتالیەکان بە ڕق و نەفرەتەوە. کەمینەی تورکی هەتابڵێی لە ناخۆشی و ناڕەحەتیدا بوون. کاتێکە هەواڵ بڵاوبۆوە کە گوایە یوونانیەکان بەڕێوەن و خەریکن دێن، شار بە خۆپیشاندانەکان تەقیەوە. چەندین هەزار تورک لەکاتی نیوە شەودا لە نارەزایەتیدا بە یەکەوە دەهۆڵیان دەکوتا؛ ژمارەیەکی زۆر زیاتر لە یوونانیانی سەرسووڕماو بەدرێژایی بەراوەکاندا لە بەیانی ١٥ی مانگی مەیدا کۆببوونەوە. بیشۆپی ئۆرتدۆکس حازر و ئامادە ڕاوەستا تا دوعا بۆ سەربازەکان بکات. ئاڵای ئاوی و سپی یوونان لە هەموو شوێنێکدا دەدرەوشایەوە. کاتێکە یەکەمین هێزەکانی یوونانی بە مارشلێدان خۆیان بەناو شارداکرد، جەماوەر لەخۆشیان دەیانقیژاند و دەگریان. هەر لە سەیران و خۆشی دەچوو، هەتا لەپڕێکدا لەلایەن کەسێک لە دەرەوەی سەربازگەی تورک تەقەیەک کرا. سەربازانی یوونانی بە عەرز و بە ئاسماندا گولەیان

دەتەقاند، و کاتێکە سەربازانی تورک لە سەربازگە گەمارۆدراوەکان خزینە دەرێ ویستیان هەڵبێن، یوونانیەکان کەوتنە لێدانیان و هەتا بەرئاوەکان بە قامەی سەرەتفەنگ بەرخۆیان دان و لێیان دان. ڕێبوارانی یوونانی بە حەپەساویەوە پێوەندیان لەگەڵ گرتن. نزیک بە سی کەسی تورک کوژران. لە سەرانسەری سمیرنا جەماوەر ڕاپەڕابوون، کەوتبوونە کوشتوکوشتار و ماڵبڕین. لە کاتی ئێوارەدا، نزیک بە ٣٠٠ یان ٤٠٠ تورک و ١٠٠ یوونانی مردبوون. چەند ڕۆژ دواتر پشێویەکە گەیشتە گوندەکان و شارۆچکەکانی دەورویشت.٩٩٧ ئەوە بۆ یوونانیەکان و داواکاریەکانی یوونانی کارەسات بوو، و هێمایەک بوو لە ڕووداوەکانی دوارۆژ.

لە سەرانسەری تورکیە هەواڵی نیشتنەوەکان بە سەرسووڕمانەوە گەیشتە بەرەوە. لای زۆرکەس ئەوە بەمانای هەنگاوی یەکەم بوو بۆ دابەشکردنی ناوچەکانی تورکیەی عوسمانی. ژنێک کە لایەنگری پێشووی ئاتاتورک بوو گێڕابوویەوە کە " دوا ئەوە کە من سەبارەت بە داگیرکردنی سمیرنا وردەکاریەکانم پێگەیشت، من زمانم لەسەر هیچ تەوەرێک نەدەگەڕا مەگین کاتێکە تەوەرەکە باسی شەڕی پیرۆزی دەکرد کە لەوەدەچوو بێتە ئاراوە." لە کۆنستانتینۆپل، جەماوەر بە ئاڵای ڕەشەوە مارشیان لێدەدا. شاندێک لە ژنانی چینی باڵادەسەت داوایەکی کەم وێنەیان ئاراستەی کۆمیسارییای باڵای بەریتانیا کرد. ژنەوتەبێژی ئەوان وتی: " پارچەیەک لە جەستەی زیندووی ئیمپراتۆری عوسمانی براوە کە وەک ئەندامی هەرەپێویست خەباتی دەکرد." سوڵتان لە کۆشکەکەی خۆیدا کەوتە گریان و شیوەن. وەزیرەکانی ئەو زۆر حەزیان لە دەربڕینی ناڕەزایەتی نەبوو. ئاتاتورک، کە بەرێکەوت ڕێی کەوتە ئەوێ، پرسیاری کرد" ئایا ئێوە پێتان وایە ناڕازیبوونی ئێوە بتوانێ بەریتانیەکان یان یوونانیەکان لەسەرکار لابەرێت؟" کاتێکە وەزیرەکان شانیان هەڵتەکاند، ئەو لەدرێژەی قسەکانیدا وتی کە " پێدەچێ زۆر هەنگاوی توندتر لەڕێدابێت."٩٩٨

ئاتاتورک لەوکاتەدا بڕیاری دا کە کۆشکێک کە لە ئارادابوو لە دیوی ناوەوە بوو، شوێنێک کە هێزەکان و ئەفسەرانی وەفادار بە بیروباوەڕەکانی ناسیۆنالیستی لەوێ بوون. کێشەکە لەوە دابوو کە چلۆن بگەنە ئەوێ. کێشەکەی ئەو لەلایەن بەرپرسانی داگیرکاری بەریتانیەوە بەبێ ئانقەست چارەسەر کرا، کەسانێک کە پێداگریان لەوە دەکرد کە حکوومەت بۆ مەبەستی گەڕاندنەوەی یاسا و دەستوور ئەفسەرێک حەواڵە بکات. ئاتاتورک بڕیاری دا بۆخۆی هەمووی ناوچەی ئاناتۆلیا بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. ئەو دواتر وتبووی کە " هەست دەکەم باڵندەیەکم لەناو قەفەسێکدا و دەرگایان بۆکردوومەوە ئامادەی کردنەوەی باڵەکانی خۆمم هەتا دەتوانم بە ئاسماندا بفڕم." ڕۆژێک دوا ئەوە کە یوونانیەکان لە سمیرنا نیشتنەوە، ئەو کۆنستانتینۆپۆلی بە ویزایەک لەلایەن بەریتانیەکانەوە

بەجێهێشت. چوار ڕۆژ دواتر، لە ١٩ی مانگی مەیدا، ئەو و پارتە بچووکەکەی لە بەندەری سامسۆن لە دەریای ڕەش نیشتنەوە. ئەو ڕۆژە ئەمڕۆکە وەک ڕۆژی پشووی گشتی نیشتمانی لە تورکیەیەک کە ئەو دایمەزراند ناسراوە. کەم کەس لە کۆنستانتینۆپل بۆچوونەکانی ئەویان لاگرنگ بوو، و ئەوە وادیار بوو چەندین مانگ بەرلەوەبوو کە یەکەمین نیشانەکانی شتێک کە لە ئاناتۆلیا خەریک بوو سەرهەڵبدات دەگەیشتە پاریس. لیۆد جۆرج دواتر ڕایگەیاندبوو کە " سەبارەت بە چالاکیەکانی ئەو لە ئاسیای بچووکدا لەبابەت سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی سووپاکانی تێکشکاو و هەپروون بە هەپروونی تورکیە هیچ زانیاریەک وەرنەگیرابوو. ڕێکخراوەی سیخۆری ئێمە قەت ئەوەندە ناووریا و ناووشیار نەبوە."٩٩٩

ئاتاتورک و هاوڕێکانی ئەو قومارێکی سەیریان بردەسەر، قومارێک کە لەوانەبوو سەری نەگرتایە ئەگەر یارمەتیەک نەبوایە کە هاوپەیمانان لە چەند مانگی دواتردا لەڕووی نائاگاهیەوە بەوانیان بەخشی. سیاسەتگەلی هاوپەیمانی ئاڵۆسکاو، ناکارامە و مەترسیداری لێدەرهاتبوو- و هەل و مەرجێکی لەباری بۆ گەشەسەندنی ناسیۆنالیزمی تورکی ڕەخساندبوو. بڕیارێک کە ڕاگەیەنرا بۆ ڕیگەدان بە هێزەکانی ئیتالیایی و دواتریش یوونانی بۆ نیشتنەوە لەسەر کەنارئاوەکانی ئاسیای بچووک، ئەو نیشانگەلەی کە باسی ئەویان دەکرد کە ئەرمەنستان و کوردستان وەک وڵاتگەلی جیاواز دادەمەزرێن، و ئەگەری ئەوە کە هەمووی ناوچەکانی دەورووبەری دەربەندەکان، وەکوو خودی کۆنستانتینۆپل، لە تورکیە دادەبڕێت، ناسیۆنالیستەکانی تورکیەیەی لە هەموو شتێک دڵسارد دەکردەوە. وڵاتەکەی ئەوان ڕوولەنابوودی و پارچەپارچەبوون بوو؛ ئەوان بە بەرخودان هیچ شتێکیان نەبوو هەتاکوو بیدۆڕێنن. هەر وەدواخستنێک لە نانەوەی گرێبەست لەگەڵ ئیمپراتۆری عوسمانی هێزەکانی هاوپەیمانی لاوازتر و ئاتاتورکی بەهێزتر دەکرد.

لە سەرتاسەری فەلاتی هەتاوبردووی ئاناتۆلی ئەو هاوینەی ساڵی ١٩١٩ ئاتاتورک بەبێ وچان لە گەڕان دابوو، هەندێک جار بە سەیارە کۆنەکەیەوە، هەندێک جار بە شەمەندەفەڕ، زۆرجار بە ئەسپسواری، تا ئەفسەرانی هاوبیر سەبارەت بە ئەو لە دەوری یەک کۆکاتەوە و گرووپگەلە سەربەخۆکان کە سەریان هەڵدابوو تا سەبارەت بە داگیرکردنی بنکەی بزووتنەوەی ناسیۆنالیستی لەلایەن هاوپەیمانانەوە نارەزایەتی دەربڕن. ئەو بەڵێنی دا" ئەگەر ئێمە هیچ چەک و تەقەمەنیەکمان پێ نەمێنی هەتاکوو شەڕی پێبکەین، بە چنگ و بە ددان درێژە بە خەباتی خۆمان دەدەین." لە مانگی ژوەندا، ئەو دەسپێکی بەرخودانی نیشتمانی ڕاگەیاند، دژ بە یوونانیەکان لە سمیرنا، فەڕەنسەیەکان لە باشوور و ئەرمەنیەکان لە ڕۆژهەڵات. " پێویستە

لەسەرشانمان پێڵاوە دێهاتیەکانی خۆمان بکەینە پێمان، پێویستە ڕووکەینە شاخ و کێوەکانی دەوروبەری وڵات، پێویستە هەتا دوایەمین تکەی خوێن پارێزگاری لە وڵات بکەین، پێویستە ئاگر بەردەینە هەمووی ماڵەکانی خۆمان، هەمووی سامان و سەروەتێک کە هەمانە؛ پێویستە وڵات بە کاولی و وەک دەشتێکی بەرەهووت بەجێ بێڵین." چون گوزارشەکان لە گەڕانەوە بۆ کۆنستانتینۆپل دەپاڵێوران، بەریتانیەکان گوشاریان خستە سەر حکوومەتی سوڵتان تا ژەنەڕاڵی-چاودێری خۆیان بانگێشت بکەن. کاتێکە لە ۲۳ی مانگی ژوەندا ئاتاتورک دەستووری پێدرا تا بۆ کۆنستانتینۆپل بگەڕێتەوە، ئەو کۆمیسیۆنەکەی خۆی هەڵوەشاندەوە و لە ئەرزەرووم داوای کۆنگرێسێکی کرد، کە شتێکی بڵاوکردە کە دواتر ناوی پەیمانی نیشتمانی بەخۆوە گرت. مەرجی سەرەکی ئەو پەیمانە ئەوە بوو کە ئەو ناوچانەی کە لەلایەن تورکەکانەوە داگیرکرابوون و تییاندا دانیشتبوون، وەکوو کۆنستانتینۆپل، پێویستە وەک گشتێک بمیننەوە.....١

لە مانگی ژوەنی ساڵی ۱۹۱۹ بەم لاوە، چارەنووسی پاشماوەی ئیمپراتۆری عوسمانی کەمتر بە ڕووداوەکانی ناوپاریس بەسرابۆوە و زیاتر  بە بزووتنەوەکانی ئاتاتورک بەسرابۆوە. دوو جیهانی جیاواز-یەکیان بە کۆڕوکۆبوونەوەکانی جیهانی، هێڵەکانی سەر نەقشە، خەڵکانێک کە ملکەچانە بۆ ئەم وڵات و ئەو وڵات دەچوون، و ئەوی تریان بە خەڵکێک کە ڕابردووی عوسمانیان وەلەرزە هێنابوو و وەک نەتەوەی تورکی ڕاپەڕابوون- بەرەو بەیەکداهەڵپڕژان دەچوون. لە پاریس، زلهێزان بە ڕێگای ئەواندا دەڕۆیشتن، بەگشتی نائاگا بوون لەوەی کە بەرەو ڕۆژهەڵات گەشەی دەسەند. مامەڵەی گەرمی ماندێتەکانی گریمانەیی بەخۆشیەوە درێژەیان هەبوو.

لە ۱۳ی مانگی مەیدا، دوو ڕۆژ بەرلە هێرشی یوونانیەکان، هارۆلد نیکۆلسۆن بە نەخشەکەیەوە بۆ ئاپارتمانی لیۆد جۆرج لە ڕوو نیتۆت بانگێشت کرا تا بۆی شیکاتەوە کە ئەو چەندە دەتوانێ بە ئیتالیەکان پێشنیار بکات. ئۆرلاندۆ و سۆنینۆ گەیشتن و میوانیەکە بە دەوری سفرەی شام بەڕێوەچوو. نیکۆلسۆن وتی کە " باشتروایە کولێرەیەکی تازەگەرم بڵاوبکرێتەوە."

ئیتالیەکان داوای ناوچەیەکیان دەکرد بەرەو باشوری سمیرنا. لیۆد جۆرج وتی "حەیە حەی شتی وا چۆن دەبێت! ئێوە بۆتان نیە ئەوەتان هەبێت- ئەوێ لە یوونانی جمەی دێت!" نیکۆلسۆن بە ترس و لەرزەوە هەستی بەوەکردبوو کە لیۆد جۆرج ئەو ڕەنگانەی کە نیشاندەری هێڵە جیاکەرەوەکان بوون بۆ دابەشکردنی حەشیمەت تێکەڵ کردبوون. " لی.جی. ئەم هەڵەڕاستکردنەوە بە ڕوویەکی خۆشەوە جێبەجێ دەکات. ئەو وەکوو مەلێکی ماسیگر گورج و گۆڵە." کاتێکە کەسێک ئاماژەی بەوەکرد کە ماندێتەکان پێویستە بە " ڕەزایەت و ئارەزووی خەڵکانێک بێت کە نیگەرانن" شادی و خۆشیەکی

زۆری لێکەوتەوە. " ڕوومەتە سپییەکانی ئۆرلاندۆ بە پێکەنین و پڕماندن دەجووڵانەوە و چاوە ماسیوەکانی پڕ ببوون لە فرمێسکی خۆشی و شادی."١٠٠١

دواتر هەر ئەو دوانیوەڕۆیە، نەخشەکەی نیکۆلسۆن لەبەردەمی کلیمینجوو کەوتە سەر فەرش، ویلسۆن و لیۆد جۆرج وەک خاوەنی ئەو نەخشەیە لە دەرەوە مەحتەل مابوون و خەریکی خویندنەوەی *وێنەی دۆریەن گرەی* بوون. لەناوەوە، لە ژووری لێکۆڵینەوەی ویلسۆندا، لیۆد جۆرج ماندێتێکی ئیتالیان لە ئاناتۆلیای باشور بە دەستەواژەگەلی ڕازاوە کێشابۆوە: " شوێنێک کە تورکەکان کردبوویان بە چۆڵگە و بەرهووت، ئیتالیەکان دەتوانن جادەگەل، ڕێگاگەلی شەمەندەفەری تێدا دروست بکەن، خاکەکەی بکێڵن و بەرهەمی تێدا بەدەست بێنن." فەڕەنسەیەکان دەیانتوانی دەست بەسەر باکووری ئاناتۆلیا و یوونانیەکان سمیرنا و دەورووبەری ئەوێ، هەروەها دوورگەکانی دۆدێکانیسیان هەبێت، و، لیۆد جۆر جوامێرانە وتی کە ئەو قێبرێسیش بە ئەوان دەبەخشێت. کلیمینجوو، کە بێ دەنگ لەولاوە دانیشتبوو، سەبارەت بە توانایی یوونانیەکان بۆ بەڕێوەبردنی ماندێتێک بە گومان و دوودڵیەوە قسەی دەکرد: " من سەرتاسەری پێلۆپۆنیس گەڕام بەبێ ئەوە کە تاقە جادەیەک ببینم." ویلسۆن لەسەر ئەم باوەڕە بوو کە باشتر وایە دەرفەتێکیان بدرێتێ: " بە نیشاندانی متمانەبوونی خۆمان بە ئەوان ئێمە دەتوانین وزەی تازەیان پێ ببەخشین تا بەباشی کارەکان بەرەوپێشەوە بەرن." ویلسۆنی پێوەبوو تەناەت هیواداری خۆی دەربڕی بەومانایە کە ولاتەیەکگرتووەکان بۆ ئەرمەنستان ماندێت دەگرێت. کلیمینجوو وتی کە ئەو لای وابوە کە ئەرمەنیەکان دواتر دەتوان کۆنستانتینۆپلیش بگرن. نیکۆلسۆن داوای لێکرا کە گوێ بۆ ئامۆژگاریەکان شل بکات. کاتێکە بالفۆر بەمانەی زانی، لە تووڕەیی خۆییدا چاوی چوەپشت سەری: " من سێ پیاوم هەیە هەتابڵێی بەهێز، هەتابڵێی ناشارەزا لەوێ دانیشتوون و خەریکی دابەشکردنی قاڕەکانی جیهانن تەنیا منداڵێکیان لەلایە کە یادداشتەکانیان بۆ هەڵدەگرێت." ئەو لە یادداشتنامەیەکی بەهێزدا بۆ لیۆد جۆرج ئاماژەی بەوەکردبوو کە دابەشکردنی تورکیە چەندە مەترسیدار دەبێت.١٠٠٢

لیۆد جۆر لەلایەن ڕاوێژکارانی نیزامی خۆیەوە، کە بەگشتی و یەکدەنگ دژایەتیان هەبوو، باس و خەبەری پێ دەگەیشت. چێرچیل و مۆنتاگۆ هەر هەمان هەڵوێستیان هەبوو، بەپەلە لە لەندەنەوە خۆیان گەیاندێ تا بۆڕایەکی تر هۆشدار بدەن کە دابەشکردنی تورکیە بەمانای "شەڕی هەتاهەتاییە" لەگەڵ جیهانی ئیسلام، وەکوو شەڕی ناو هێندستان. لیۆد جۆرج ڕازی بوو بەوە کە شاندێکی هێندی میوانداری بکات، بەڵام کاتێکە بەپەلە لە لەندەنەوە بە شەمەندەفەرێکی تایبەت گەیشتنە بەرەوە، زانیان کە سەرەک وەزیر بە گەمیەکی ماتۆڕی ئەوێی چۆڵکردبوو.١٠٠٣

ئەو تەدارکاتەی کە لە ١٣ی مانگی مەیدا گیران بەخێرایی هەڵوەشێنرانەوە. ئیتالیەکان بە سەقامگیرکردن و نیشتەجێکردنی هێزی تازە هەم لیۆد جۆرج و هەمیش ویلسۆنیان تووڕە کرد. لیۆد جۆرج بەتەواوەتی سەبارەت بە ماندێتێکی ئیتالی بۆچوونی خۆی گۆڕی: " بە بڕوای من حەواڵەکردنی ئیتالیەکان بۆ ئاسیای بچووک بەمانای هەڵگیرساندنی ئاوری ئاڵۆزی و پشێوەیی لەوێیە." بێجگە لەوانە ئەو کاریگەری هۆشدارەکانی مۆنتاگۆشی لەسەر بوو. ئەو بە ڕێبەرانی تر کە لە ١٩ی مانگی مەیدا کۆببوونەوە ڕاگەیاندبوو کە " من دێمە سەر ئەم ئاکامە کە دابەشکردنی زەوی و زارەکانی تورکی خەونێکە و قەت نایەتە دی بەم کارە ئێمە مەترسیەکی گەورە دەکەین، ئەویش نانەوەی ئاڵۆزی و پشێویە لە سەرتاسەری جیهانی موحەمەدیدا." ویلسۆن هەستی دەکرد کە مەترسیەکی لەو چەشنە لە ئارادایە. بێجگە لەوە ئەو دەترسا کە ماندێتەکان لەوانەیە وەکوو دابەشکردنی دەسکەوتەکانی جەنگیان لێبێت، و وەک خۆی ئاماژەی پێدەکرد، چون تورکەکان بۆخۆیان ڕوونیان کردبۆوە کە ئەوان تەنیا تاقە وڵاتێکیان دەوێت، ئەگەر لە دابەشکردنی ئاناتۆلیا لەنێوان ماندێتێکی فەڕەنسەیی و ئیتالی هەڵەیان نەکردایە زۆر خراپ دەقەوما. بۆ لەناوبردنی دەسەڵاتی تورکیە هیچ پاساو و بیانوویەک لە ئارادا نەبوو: " من مەجبوورم وەبیری خۆم بێنمەوە کە من، بۆخۆم، ئەم وشەیەم لە چاردە خاڵەکەدا بەکارهێنا، و ئەوە کە ئەمانە جۆرە گرێبەستێک بوون کە ئێمەیان خستۆتە تەنگ و چەڵەمەوە." ئەو پێشنیاری کرد تا بەڵکوو فەڕەنسە بتوانێ بەرپرسایەتی ڕاوێژکردنی وڵاتێکی تورکی بگرێتە دەست، و ئەوان بەشکەم بەرگری لە بەکارهێنانی وشەی " ماندێت" بکەن. ئەوان دەیانتوانی تەنانەت سوڵتان لە کۆنستانتینۆپل بەجێ بێڵن، هەڵبەت بەبێ ئەوەی ڕێگەی بدەنێ هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر دەربەندەکاندا هەبێت. لیۆد جۆرج لە سەرەتادا قایل کرابوو بەڵام دوو ڕۆژ دواتر، دوا دانیشتن لەگەڵ ئەندامانی ترساوی کابینەی بەریتانی، کە واوە هاتبوون بەتایبەت بۆ پاریس، ئەو هاوڕێ لەگەڵ پێشنیارێک بۆ کۆنترۆڵی ئەمریکی، تا فەڕەنسەیی، لەسەر هەمووی ناوچەکانی ئاناتۆلیا، هەروەها دەربەندەکان و ئەرمەنستان گەڕابۆوە.١٠٠٤

ئەمە کلیمینجووی تووڕە کرد، ئەو بە سەرسامیەوە چاوەڕوان مابوو. ئەو تازە لەسەر سووریە لە لیۆد جۆرج تووڕە ببوو. " تۆ دەڵێی کە فەڕەنسە نابێ لە ئاسیای بچووکدا بێت چون ئەوە دەبێتە هۆی عاجز بوونی ئیتالیا: ئایا ئێوە پێتان وایە کە لە فەڕەنسە ڕایەکی گشتی هەبوونی نیە؟ هاوڕێ لەگەڵ ئەوانە فەڕەنسە، لەنێوان هەمووی وڵاتانی ئەورووپیدا، وڵاتێکە کە بە گەورەترین بەرژەوەندیگەلی ئابووری و ماڵی لە تورکیەدا- و لێرەدا ئەو وڵاتە حەوادراوە تا لەپێشدا مۆحەمەدیەکان و دواتریش ئیتالیا دڵخۆش بکات." ئەو و لیۆد جۆرج سەبارەت بە دابەشکردنی نەک تەنیا تورکیە بەڵکوو هەمووی ڕۆژهەڵاتی

ناقین کەوتنە دەمەتەقەیەکی زۆر سەیرەوە. " هەرکیان دەھری ببوون و ئەوەی بێ فەزیحەتی و تۆمەتە ئاراستەی یەکتریان دەکرد. کلیمینجوو لە کۆتاییدا زۆر هەوڵی دا تا بەخۆیدا بێتەوە و خۆی کۆنترۆڵ بکات، و کاتێکە لەیەک جیابوونەوە وتی' ناجسنی وەکوو تۆم قەت نەدیوە". دەگێڕنەوە کە لە قۆناخێکدا کلیمینجوو، کە بەگشتی ئەزموونێکی بەرچاوی لە بابەتگەلی لەو چەشنەدا هەبوو، بە لیۆد جۆرج پێشنیاری کردبوو کە لەنێوان دەمانچە یان شمشێر یەکیان هەڵبژێرێت.١٠٠٥

ویلسۆن هەوڵی دا دۆخەکە هێور کاتەوە. ئەو وتی " پێدەچێ ئەمڕۆکە ئێمە ڕووبەڕووی ناکۆکیەکی زۆر گەورەتر لەوەی کە لە واقیعدا هەیە بووبێتینەوە." بەڵام ئەو ڕێگەچارەیەکی ئەوتۆی پێ شک نەدەهات. ئەو گومانی لەوەبوو کە ولاتەیەکگرتووەکان بتوانێت ماندێتێک بۆ ئاناتۆلیا بگرێت، هەرچەند هێشتا ئەو هەر هیواداربوو کە بەڵکوو ئەو ولاتە بتوانێ بۆ ئەرمەنستان کارێک بکات، و، وەکوو کێشەگەلی تر، پشتی بەست بە هیوا و هۆمێد تابەڵکوو توێژینەوەی زیاتر بتوانێ ڕێگەچارەیەک بخاتە بەردەم. ئاشتیکەرانی هاوڕێی کێشەکەیان لەخۆیان دوورخستەوە: گرێبەست لەگەڵ ئەڵمانیا زۆر پێویستر بوو.١٠٠٦

بەرلەوەی سەرەک ویلسۆن بە دەریادا بگەڕێتەوە بۆ ولاتەیەکگرتووەکان لە کۆتایی مانگی جووندا ئیمپراتۆری عوسمانی تەنیا جارێکی تر وتویژی لەسەرکرا. وتوێژەکە لە ولامی دەرکەوتنی نوێنەرانی حکوومەتی سوڵتان هاتە ئاراوە. پێدەچێ لەکاتێکدا کە زلهێزان بێ کار و بێ بار چاوەڕوانی ولامی ئەڵمانیا بوویێتن، لەگەڵ ئەڵمانیا کارێکیان کردبێت کە پێشتر نەیانکردبوو و ڕێگەیان دابێت بە نەتەوەیەکی تێکشکاو سەردەرهێنێت بەرلەوە کە گرێبەستەکەیان بۆ داڕشتبێت. ئەوە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە زلهێزان چەند بە ئاسانی لەگەڵ چارەنووسی ئیمپراتۆری عوسمانی هەڵس و کەوتیان دەکرد. لە ١٧ی مانگی ژوەندا سێ نوێنەری تورکیەی عوسمانی قسەی بۆ گرووپێک کرد کە لە سێ کەس درووست ببوو کلیمینجوو، لیۆد جۆرج، ویلسۆن و وەزیرانی دەرەوەی ئەوان. دەماد فەرید، سەرەک وەزیری تورک، پیاوێکی ڕووخۆش و دەوڵەمەند کە دەسکەوتی سەرەکی ئەو پێکهێنانی ژیانی هاوسەری لەگەڵ کچی سوڵتان بوو، داوای تورکیەی پێشکەش کرد. ئەو تاوانی لەشەرەوەگلانی تورکیەی و بەرپرسایەتی کوشتاری تۆقێنەری مەسیحیەکانی ئەرمەنی خستە ئەستۆی پێشینیانی خۆی، و ئەو گوێگرانی خۆی دڵنیا کردەوە کە گەورەترین هیوای ئەو بوون بە ئەندامێکی بەکەڵکە لە کۆمەڵەی گەلاندا. ئەو لێیان پاڕاوە کە ئیمپراتۆری عوسمانی وەکوو خۆی دەست لێنەدراو بەجێ بێڵن. بێجگە لەوانە، ئەو بەیاننامەیەکی نووسیبوو، کە، بەداخەوە، زۆر ئامادە نەبوو. کلیمینجوو بایەخێکی ئەوتۆی نەدایە. ئەو وتی: " هیچ نموونەیەک لە ئورووپا یان ئاسیا یان ئەفریقا شک نابەین کە دامەزراندنی

دەسەڵاتی تورکی لە هەر وڵاتیک کەمکردنەوەی گەشەکردنی ماددی، و هاتنەخوارەوەی ئاستی کولتووری بەدواوە نەبوویێت؛ هیچ نموونەیەک شک نابەین کە تێیدا کشانەدواوەی دەسەڵاتی تورکی گەشەکردنی ماددی و بەرزبوونەوەی ئاستی کولتوور و شارستانیەتی بەدواوە نەبوویێت. نە لەناو مەسیحیەکانی ئورووپادا نە لەناو مسوڵمانانی سووریە، عەرەبستان و ئەفریقادا، تورک لە وێرانکردنی هەرشوێنێک کە داگیری کردبێت زیاتر هیچی نەکردوە."١٠٠٧

ئاشتیکەران لەسەر ئەو باوەڕەبوون کە ڕۆڵێک کە داماد گێڕابووی سۆزدار و پڕ هەست بووە. ویلسۆن لای وابوو کە ئەو " قەت ئەوەندە گەمژەیی و گێلی لە کەس نەدیتوە." ئەو پێشنیاری کرد کە شاندەکە بارگەوبنەیان تێک نێن و بگەڕێنەوە: " ئەوان تەواو ئەقڵیان لە دەست دابوو و تێگەیشتنێکی تەواو هەڵەیان سەبارەت بە ڕۆژئاواوە هەبوو." لیۆد جۆرج ئەوەی بە نیشانەی " ناکارامەبوونی سیاسەتی تورکەکان" دەزانی. شاندەکە و یادداشتنامەی هاوڕێی هەمووی هەر گاڵتە و قۆڕیات بوو. کەس نەیدەزانی بە چ شێوەنووسینێک وڵامیان بدرێتەوە باشە؛ ویلسۆن بیری لەوەدەکردەوە کە ئایا هەر پێویستە وڵام بدرێتەوە. لیۆد جۆرج لایەنگری دارشتنی مەرجەکانی ئاشتی بوو کە دوورگەکانی عەرەب، سمیرنا و ئەرمەنستانی لەیەک جیادەکردەوە بەڵام ناوچە تورکنشینەکانی لە ترەیس و ئاناتۆلیای خستە لاوە؛ ئەوانە کاتێک دانووستانیان لەسەر دەکرا کە ئەرمەنیەکان بڕیارەکانی خۆیان لەسەر ئەو ماندێتانەی کە دەیانگرتن ساخ دەکردەوە. ئەو لای وابوو کە ئەمە لە دوو مانگی داهاتوودا دەهاتە ئاراوە. ویلسۆن خۆی بەم وتەیە موقناع کردبوو کە ئەو لەوکاتەدا هاتۆتە سەر ئەم باوەڕە کە تورکەکان دەبێ لە کۆنترۆڵی کۆنستانتینۆپل دوور بخرێنەوە. کلیمینجوو تەنیا مەبەستی ئەمەبوو: " سەبارەت بە شێوازێک کە ئێمە لە ناوچەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی دەست هەڵدەگرین، دوا دوایەمین وتوێژەکانی خۆمان، من پێویستە بڵێم کە من چیتر نازانم ئێمە لەکوێین." هەرسێکیان خۆیان لە باسەکە پاراست، هاوڕێ لەگەڵ ئەم وتەیەی لیۆد جۆرج، " ئەگەر ئێمە بتوانین تەنیا بۆماوەیەکی کورت ئاشتی بنێینەوە و کۆتایی پێبێنین." کلیمینجوو وتی کە " من لەوە دەترسم کە ئەم ڕاستیە نایەتەدی."١٠٠٨

* * * *

لە لەندەن، کەسێک کە زیاتر لە هەموو کەس لە پاریس سەبارەت بە ئیمپراتۆری عوسمانیەوە شارەزایی هەبوو بە ترس و ناهۆمیدیەوە بەگشتی سەیری ئەمەی کردبوو. کۆرزۆن، کە بەنەبوونی بالفۆر بەرپرسایەتی دایرەی دەرەوەی پێسپێردرابوو، کۆمەڵەێک یادداشت و نامەی نارد کە هەڕەشەیان دەکرد وادانانی کۆتایی پێهاتنی تورکەکان مەترسیدارە، و دواخستنی ڕێکەتنامەیەکی هەمەلایەن

هەڵەیەکی تەواو هەڵەیە. لیۆد جۆرج چەندە محەلی لە دیپلۆماتە هەرە کارامەکان دەنا هەر ئەوەندەش لە ئەو. کۆرزۆن زۆر باسی ئەو شتانەی دەکرد کە ڕقی لێیان بوو: بن و بنچینەی ئاریستۆکرات، خاوەن زەوی و زارەکان، بەرهەمی پڕ تین و تاوی ئاکسفۆرد و ژوورەکانی دارِشتنی لەندن. ئەو لای فرانسین ستێڤێنسۆن دانی بەوەدا هێنابوو کە چەندە " ئەو لە دارودەستەی کۆرزۆن و تەواوی ئەو کەسانەی کە ئەو لەپشتیانە قین لەدڵە- سەرلۆمەی شێوازی هەڵس و کەوتی ئەوان، بیروباوەڕەکانیان، داب و نەریتیان، شێوازی ژیانیانی دەکرد." بە مرووری زەمەن قینلەدڵی و سەرلۆمەکردن ڕەنگ و بۆی گاڵتەکردنی بەخۆوەگرت تێکەڵاو لەگەڵ ڕێزێکی تایبەتی بۆ زانیاری و توانایی کۆرزۆن.[١٠٠٩] هەرچەند، لە کۆتاییدا ئەوە کۆرزۆن بوو کە لیۆد جۆرجی لەسەرکار لابرد و هێنایەخوارێ.

و ئەوە کۆرزۆن بوو کە، هاوڕێ لەگەڵ ئاتاتورک و سووپاکانی ئەو، سنوورەکانی تورکیەی پێشکەتوویان دیاری کرد. هەردوو پیاوەکە، سیاسەتمەداری ئینگلیزی و سەربازی تورکی، دوژمنی یەک بوو بەڵام قەت بەیەکەوە دانەنیشتن. هەرکیان کەللەڕەق، زیرەک و لووتبەرز بوون، هەرکیان ساتگەلێکیان هەبوو کە تێیاندا ترس و دڵەڕاوکێی لەڕادەبەدەری خۆیان دەردەبڕی، و هەرکیان زۆر پێچەڵاوپووچتر لەوەبوون کە دەهاتنە بەرچاو. کۆرزۆن، جێگری گەورەی پاشای هێندستان، ئەویش پیاوێک بوو کە لەلایەن هاووڵاتیانی خۆیەوە لە دیلهی هەرِەشەی لێدەکرا چون وێرابووی ڕژیمی بەریتانی بەهۆی کوشتنی هێندیەک سزابدات؛ لووتبەرزێکی ئینگلیزی کە یەکەمایەتی بەسەر هاوسەرانی ئەمریکی بوو؛ سیاسەتمەدارێک کە کاری وێنەکێشان و کەلوپەلی ناومالّی دەپەرستی؛ و ئیمپریالیستێکی بونیادی کە جیهانی نا-ئەورووپی باشتر لە زۆربەی هاوچەرخانی خۆی دەناسی. وەکوو کۆتە فراکیەکانی ئەو ئازاری پشتێکی بریندارى دەشاردەوە و ڕاگرێکی پۆلا کە ئەوی قنج و قیت ڕادەگرت، بەدەعیەبوونەکەشی پیاوێکی دەشاردەوە کە کاتێکە هەستی بریندار دەبوو هۆڕەهۆڕ دەگریا. ئەو باش دەیزانی کە هەندێک کەس ئەویان وەک کاریکاتۆرِ دەهاتە بەرچاو. ئەو دژ بەخۆی چیرۆکێکی گێڕایەوە کە، کاتێکە جەماوەرێک لە سەربازانی ئاسایی لە کاتی حەمامکردندا دیبوو، هەڵوێستیکە گرتبووی بریتی بوو لە" خوایەگیان! قەت نەمدەزانی کە چینە کەمدەرامەدەکان پێستی جەستەیان ئەوەندە سپی و سۆڵە."[١٠١٠]

جۆرج کۆرزۆن لە چینێک لەدایک ببوو کە، لە سالّانی بەرلەشەڕی گەورە، دەسەڵاتی بەسەر بەریتانیا و لەڕێگای بەریتانیاوە بەسەر جیهاندا هەبوو. بنەماڵەکەی ئەو ملکێکیان لە دەربایشیر داگیرکردبوو، و هەرکارێکە لە ژیانیدا پێی خۆش بوایە دەیتوانی بیکات. ئەو کەرەتێکیان وتبووی " باپیرانی من بۆماوەی ٩٠٠ ساڵ کێدلێستۆنیان ڕاگرتوە، بە باوک بە کورِەوە، بەڵام

هێچکامێکیان ئەویان بۆدەرنەکەوتوە کە لە پیاوماقووڵانێکی ئاسایی وڵات هیچ زیاتر نین- ئیم.پی.ئیس.شەریفس، و هینیتر. من بڕیارم دا لەوەبەولاوە هەوڵ بدەم تا خۆم لەو یاسایە ڕزگار بکەم." دایک و بابی، وەک جاران، بەخێوکردنی ئەویان سپارد بە کەسانی ترەوە، بۆ ئەو خاتویەکی بەڕێوەبەر هەبوو کە هەتابڵێی ڕقی لە کەرەسەی یاریکردن بوو بەڵام هەتابڵێی حەزی لە سزادان بوو ئەویش چ سزادانێک، زۆرجار سزا بۆ تاوانگەلی خەیاڵی و چیتر نا. لە ژیانی دواتریدا کۆرزۆن بەو ئاکامە گەیشت کە ئەو بێ ئاقڵ بوە. تەنیا لە ئیتۆن بوو کە لەکۆتاییدا دەستی کرد بە گەشەسەندن. ئەو چەندین دۆستی گرت، هەندێکیان بۆ ژیان، و ئەوجۆرەی کە خۆی دانی پێداهێنابوو، "بە حەز و خولیایەکی زۆرەوە بوو بە سەرۆکی کلاس" و هەرچی خەڵاتی بەنرخە بەخۆی تەرخان کرد. کاتێکە ڕۆیی کەسایەتیەکی بەرجەستەی لەخۆی درووست کردبوو: دەرەوشاوە، ناودار، سەرکەوتوو و زیاتر لە مرۆڤێکی لووتبەرز. ئاکسفۆرد تەنیا دانی بەم تایبەتمەندیاندا هێنا، بەڵام لەوماوەی کە لەوێ بوو ئەو فێربوو کە چۆن لەبەرانبەر جەماوەردا وتاربێژی بکات، هەرچەند هەندێک شێوازەکەی ئەویان زۆر بەبرِشت دەزانی. بێجگە لەوانە ئەو وەک کۆنەپارێزێکی بەرجەستە ناوی دەرکرد و بەپەلە لە ژیانی کۆمەڵایەتی هێکتیدا جێی خۆی کردەوە. شکستێک کە ئەو لەپێناو یەکەمیندا لە فیناڵەکان دەیخوارد تەنیا شکستێکی کاتی بوو کە زۆربەی خەڵک لایان وابوو دەسپیکێکی زۆر سەرسوورهێنە بوە.١٠١١

ئەو زۆر توانایی و شتی باش باشی هەبوو. بەڵام لەگەڵ هەمووی ئەمانەشدا ناتەواویەکی هەبوو: توندی، لەوانەیە، کەم ئەقڵی، هاوسەنگی. هەست و سۆزی زۆر بە ئاسانی بریندار دەبوو و بەش بەحاڵی خۆی زوو هەستی ڕەحم و بەزەیی دەجووڵا. ئەو بێ وچان ئیشی دەکرد، بەڵام بەباری پێچەوانەدا. کاتێکە ئاڵۆزیەکی نێونەتەوەیی دەگەیشتە لووتکەی هەرەبەرزی خۆی هەتا شەودرەنگان بەخەبەر دەماوە و کۆگایەک کاغەزی درووست دەکرد.

مۆنتاگۆ، هاوکاری ئەو لە کابینەی شەڕدا، لە نامەیەکدا بۆ ئەو نووسیبووی: " ئەو سەرنجی من ڕادەکێشێت بۆ لای خۆی، دڵگەرمم دەکات، تووڕەم دەکات. هەتابڵێی دانووستان لەگەڵی بەکەیف و خۆشە" کۆرزۆن هەرهەموویانی بە پرسیار و بە نامە بۆمباران دەکرد. " ئەوە ئێوە سەرگەرم دەکات کە لەڕۆژێکدا کاتێکە من دەزانم کە ئەو دوو کۆبوونەوەی سەبارەت بە کابینەی جەنگەوە و کۆبوونەوەیەک سەبارەت بە لێژنەی ڕۆژهەڵات، هەموو کاغەزێک لەپێوەند لەگەڵ هەرسێک لەوانەی کە ئەو خوێندوونیێتەوە، خێزانی من وتی کە ئەوی لە فرووشگاکانی هارۆلد دۆزیەوە کە سەرقاڵی ناونووسیکردن بۆ چایی بوو.!" ئەو بەرنامەی

دەرسی بۆ کچەکانی خۆی دەنووسی و لە پەرستارەکەی ئەوان سەبارەت بە نرخی بەرگی وەرزشی ئەوانەوە پرسیاری دەکرد؛ ئەو پێداگری لەسەر هەڵواسینی وێنەکانی خۆی دەکرد. خزمەتگوزاران ناوی ئەویان خستبوە ناو لیستەی ڕەشەوە.[١٠١٢]

ئەو قەت ئەو شتەی کە خوازیاری بوو بەدەستی نەدەهێنا. دەبێ لە هێندستان کاتێکی پڕشگدار و خۆشی بردبێتەسەر، بەڵام کاتێکە لەلایەن لۆرد کیتچێنێرەوە، سەرەک فەرمەندەی هێندستان، بەزۆری دەرکرا دەبێ کاتەکەی لێ تاڵ بووبێت. تەنانەت کاتێکە ئەو لە ئاکامدا لە پاییزی ساڵی ١٩١٩ بوو بە وەزیری کاروباری دەرەوە، دەبوایە کڵاوی بکردایەتە سەر لیۆد جۆرج. کاتێکە لیۆد جۆرج نەما و لاچوو، لەخۆوە چاوەڕوانی ئەوەبوو کە بۆ سەرەک وەزیری بانگێشت بکرێت. خەڵک، بەتایبەت ژێردەستەکانی ئەو، نەیان دەتوانی تەنانەت بۆ ساتێک لەگەڵی هەڵ بکەن. کەسێک گێڕابوویەوە کە " نەخۆشیەکی سەیری مالیخۆلیای سەبارەت بە زانیاری هونەری خۆی، ملک و ماڵاتی جیهانی خۆی و پێگەی کۆمەڵایەتی خۆی هەبوو: بەڵام من پێمەوە دیوە کە سەبارەت بە خەڵک و بە شتەکانی دەورووبەری زۆر سادەوساکار سەیری دەکردن." ئەو هەتابڵێی نەحەواوە و ناسازگار بوو: " ئەو ڕۆژێکیان وەکوو گیرفانبڕێک خراپەی دەرحەق کردین و دواتر نامەی ڕێزلێگرتنی بۆ دەنووسین."[١٠١٣]

کۆرزۆن ژیانی خۆی تەرخان بە بەریتانیا و ئیمپراتۆریەتی ئەوێ کرد. ئەو هەرکیانی بە باش دەزانی بۆ جیهانی ئەو سەردەمە. وەکوو زۆربەی سیاسەتمەدارانی بەریتانی، ئەو تەنیا کاتێک ئەورووپای بە مەترسیدار دەزانی کە هاوسەنگی قودرەتی ئەوێ هەڵوەشێتەوە. نیکۆلسۆن، کە ئەوی باش دەناسی، وتی " جیهانی ئایدیالی ئەو جیهانێک دەبێت کە تێیدا ئینگلەند قەت دەست لە کاروباری ئەرووپا وەرنەدات و ئەورووپاش قەت دەست لە کاروباری ئاسیا یان ئەفریقا وەرنەدات. ئەمریکا، وەک کێڵگەیەکی دوورەدەست، هەرچەند یاخی، لە هیچ حاڵەتێکدا چاوەڕوانی لێنەدەکرا کە لە کاروباری ئەم و ئەو دەستێوەردان بکات." ئەو قینی لە زۆربەی بیانیەکان بوو، بەتایبەت فەرەنسەیەکان. ئەو، لانی کەم بەشێوەیەکی تەجریدی، یەکەمایەتی بە گوندنشینانی سادە وەکوو تورکی ئاناتۆلیا دەدا، " مرۆڤێکی شایان، هیچ نەزان....کە زیاتر یەکەمایەتی بە ژیانی سادەی گوندنشینی خۆی دوورلە ئەورووپا دەدا." ئەو جیهانی ڕۆژهەڵاتی سۆئێزیشی باش دەناسی؛ ئەو لە ئیمپراتۆری عوسمانیەوە بەرەو ژاپۆن سەفەری کردبوو و سەبارەت بە ئاسیای ناوەندی، ئێران و هێندستان لێکۆڵینەوەی بەربڵاوی بە ئەنجام گەیاندبوو. هاوکارەکانی ئەو لە کابینەدا زۆر جار وەبیریان دەهێنرایەوە کە ئەو تەنیا کەسی بەشداربوو بوو کە لە شوێنێکی دوورەدەست مابۆە. ئەو لە

وتوێژ کردندا، با لەخۆڕازیش بوویێت، کەس دەستی نەدەشکاند؛ لە بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ سیاسەتە کۆنکریتەکان زۆر سەرکەوتوو نەبوو.١٠١٤

ڕووداوە هێواشەکانی ناو پاریس لە ساڵی ١٩١٩دا کۆرزۆنی تەواو شێت کردبوو. ئەو ئیمپراتۆری عوسمانی هەر خۆش نەدەویست بەڵام بەردەوام سەبارەت بە سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزم هۆشداری دەدا:

ئەوە کە تورکەکان دەبێ لە کۆنستانتینۆپل بێ بەش بکرێن، بەڕای من، وەک بەڵگەیەکی چەسپاو لە شکستی ئەوان لە شەڕدا شتێکی حاشاهەڵنەگر و پەسەندکراوە؛ و من لام وایە کە ئەوە لەلایەن جیهانی ڕۆژهەڵاتەوە بە هەموو کەمترخەمیەکی وەڕەزکەرەوە قەبووڵ دەکرێت. بەڵام کاتێکە زانرا کە هەڵاتووان لە کۆڵەکەیەکەوە بۆ کۆڵەکەیەکی تر دەبێ بەرشەپان درێن و ئەوە کە بەکردەوە هیچ ئیمپراتۆرێکی تورک و لەوانەیە هیچ خەلیفەیەک لە دەسەڵاتدا نەمێنن، من پێم وایە بەم کارە ئێمە بەشێوەیەکی زۆر مەترسیدار و زۆر ناپێویست هەست و سۆزی مسوڵمانانمان لە سەرانسەری جیهانی ڕۆژهەڵات ورووژاندوە و لەوانەیە ئەو تووڕەبوونە ڕەنگ و بۆی دڕندەیی و وەحشیگەری بەخۆوە بگرێت.

ئەو بەتوندی دژی بەخشینی ماندێت بوو بۆ وڵاتی ئیتالیا جا چ لە باشووری ئاناتۆلیا یان لە هەرشوێنێکی تر، هەروەها دژی بەخشینی سمیرنا بوو بە یوونان، " وڵاتێک کە ناتوانێت پێنج مایل ئەولا دەروازەکانی سالۆنیکا دەسەڵاتداریێتی خۆی ڕاگرێت." ئەو چەند مانگ دواتر ڕایگەیاند کە نیشتنەوە و موستەقەڕبوون لە سمیرنا " گەورەترین هەڵەیەک بوو کە لە پاریس کرابوو."١٠١٥

هۆشدارەکانی ئەو بەگشتی دەخرانە پشت گوێ، و کۆرزۆن وزە خەفەکراوەکانی خۆی بە سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی ئۆفیسی دەرەوە تەرخان کرد. ئەو مەرکەبی ڕەسمی گۆڕی، ئەمینداراانی فێرکرد کە چلۆن درزەکان بگرن و، هاوڕێ لەگەڵ گەیاندنی زیان و زەرەرێکی قورس بە پەنجە فەرمیەکان، سیستەمێکی نوێی بایەگانی کردنی بە دەرزی گەورە گەورە و تیژتیژ دامەزراند. لە مانگی ئۆکتۆبری ساڵی ١٩١٩دا ئەو لە ئاکامدا بوو بە وەزیری دەرەوە. دەمەقرێی ئەو زیاتر لەسەر دانانی مەرجی سووکی ئاشتی بوو بۆ تورکیە بەڵام ئەو دەبوایە لەگەڵ لیۆد جۆرج و ستافی نهێنی خۆی مشتومڕی بکردایە، کەسانێک کە بەشێکی زۆر لە بەرپرسایەتی کاروباری دەرەوەیان لە دەست دابوو. سەرەک وەزیر هێشتا لەسەر ئەوە سوور بوو کە دەبێ سمیرنا بە یوونان ببرێت و پێدەچوو لەوە زیاتریشی پێ ببرێت، و کۆرزۆن، سەرەڕای ترس و گومانێکە هەیبوو، ئامادە نەبوو تا لەبەرانبەریدا بوەستێت. هەرچەند هەرتاوناتاوێک هەڕەشەی دەست لەکارکێشانەوەی دەکرد، ماوەیەکی زۆر چاوەڕوان مابوو تا بوو بە وەزیری دەرەوە. لیۆد جۆرج بەشۆخیەوە دەیکوت کە کۆرزۆن هەمیشە نامەی

دەست لەکارکێشانەوەی خۆی بە پەیامنێرێکی هێواش دەنارد و پاشگەزبوونەوە لە پێشنیارەکەی خۆی بە پەیامنێرێکی زۆر خێرا و گورج و قۆڵ.١٠١٦

هاوکات کە بەریتانیەکان لەناو خۆیاندا ناکۆک بوون، سیاسەتی هاوپەیمانی لەسەر سەقامگیرکردنی تورکەکان، کە قەت بەشێوەیەکی تایبەت یەکگرتوو نەبوون، بە سەریەکدا شێوابوو. دوا ئەوەی کە ولاتەیەکگرتوەکان نەیتوانی گرێبەستی ڤێرسایلێس ڕاست و پاست کاتەوە، بەئاشکرا لە دەستێوەردانی ولاتانی ئەولا دەریاکانەوە وازی هێنا؛ ماندێتەکانی ئەمریکی بۆ ئاناتۆلیا، دەربەندەکان یان تەنانەت ئەرمەنستان هەر شیمانەشیان نەدەکرا. بەریتانیەکان لەڕووبەڕووبوونەوە لەبەرابەر ئەمەدا تەواو پشتیان هەڵخستبوو، ڕەنگە بەهۆی ئەوە بوویێت کە لیۆد جۆرج بەتەمابوو بۆ ئەوەی یوونان بتوانێت پێگەی خۆی لە ئاسیای بچووکدا بەهێز بکات کاتی بۆبکرێت. لیۆد جۆرج بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە کاتێکە ویلسۆن پاریسی بەجێهێشت، هاوپەیمانان دڵنیابوون کە ئەو دەتوانێت خەڵکی ئەمریکا هان بدا بۆ ئەوە کە دەست بەسەر ماندێتەکاندا بگرن، و بۆیە ئەوان ماتڵ مان. دواتر لە مانگی سێپتامری ساڵی ١٩١٩دا ویلسۆن نەخۆش کەوت. دواتر لیۆد جۆرج گێڕابوویەوە کە " ئێمە نەماندەتوانی بەپەلە شیمانەی مەرگی واقیعی ویلسۆن بکەین چون دڵنیاکەرابووینەوە لە وە کە بەدوای ماوەیەک پشووی تەواو ئەو سەلامەتی خۆی بەدەست دێنێتەوە." هاپەیمانان هەر چاوەڕوان بوون. " ئێمە تووشی ناهۆمێدیەکی تەواو ببووین لەوە کە بەبێ مەترسی تێکچوونی پێوەندی لەگەڵ ئەمریکا چ هەنگاوێک دەتوانین بنێین."١٠١٧

بەرژەوەندی ئیتالیا لە تورکیە، کە قەت بەهێز نەببوو، ڕوولەکزی دەچوو. هێزەکانی ئیتالیایی لەسەر کەنار ئاوەکانی ئاسیای بچووک پێدەچوو جگە لە تێکهەڵچوون لەگەڵ هێزەکانی یوونانی هیچ کارێکی تریان لەدەست نەیەت. هەرچەند ئیتالیا لە مانگی مەی ساڵی ١٩١٩دا، لەژێر گوشارێکی بەرچاوی بەریتانیەکانەوە، بەڵێنی دابوو تا بۆ جیگۆڕینی هێزەکانی بەریتانی لە قزاقستان هێزێک بنێرێت، ئەو ئەوکارەی وەدرەنگ خستبوو. لە ١٩ی ژوەنی ساڵی ١٩١٩دا، حکوومەتی ئۆرلاندۆ ڕووخا، سۆنینۆشی هاوڕێ لەگەڵ خۆی برد. نیتی، سەرەک وەزیری تازە، هەوڵی ئەوەبوو کە لەسەر کێشە ناوخۆیی بەهێزەکانی ئیتالیا جەخت کاتەوە. ئەو بەپەلە گەشتی خەرجهەڵگر و سەرسامکەری بۆ قزاقستان پووچەڵ کردەوە. ئەوەندەی کە ئاسیای بچووک دەهاتە بەرباس، هەم ئەو و هەمیش وەزیری دەرەوە، تیتۆنی، زیاتر بەهایان بە زێدەمافەکان دەدا، بۆ وێنە کانزاکانی خەڵووز، هەتا بە ناوچەکان. تەنیا کاتێکە هیچ کێشەیەک لە ئارادا نەبوایە ئەوان ئامادەبوون پشت لە هێزەکانی ئیتالی لەوێ هەڵکەن.

بەریتانیەکان خەریک بوون گومانی ئەویان تێیدا درووست دەبوو کە ئیتالیەکان لەوبەولاوە لەگەڵ ناسیۆنالیستەکانی تورکی هاریکاری دەکەن.١٠١٨

فەرەنسە هەوڵی دا لە تورکیە بەرژەوەندیەک بۆخۆی مسۆگەر بکات، بەڵام بەهیچ شێوەیەک حازر نەبوو لەگەڵ بەریتانیا ئیش بکات. پرسی سووریە هەر بەرەو ئاڵۆزیی دەڕۆیی، و زۆربەی فەرەنسەیەکان لەوە دەترسان کە بەریتانیەکان لە هەوڵی ئەوەدابن کە لە ناوچەکانی تورکی خەت بە ئەوانیش بدەن. کلیمینجوو هەمیشە لەپشتگیریکردنی خۆی لە یوونان سارد بوو و ئەو لەلایەن سەرمایەدارانی خۆیەوە کەوتبوە ژێر گوشارێکی قورسەوە تا لەگەڵ تورکەکان بەهەرشێوەیەک کەبوە هەڵ بکات. بەرژەوەندیەکانی فەرەنسە لە سەدا ٦٠ی قەرزی عوسمانیان لەخۆگرتبوو؛ ئەگەر تورکیە بەش بەش بکرایە، لەوانەبوو نەیتوانیایە لەچنگ قەرز ڕزگاری بهاتایە.١٠١٩

بە نەبوونی وڵاتەیەکگرتوەکان کۆرزۆن هەستی بەوەکردبوو کە دانووستان لەگەڵ فەرەنسەیەکان لەسەر تورکیە شتێکی حەیاتی و پێویست بوو. لە مانگی نوامری ساڵی ١٩١٩دا ئەو لەگەڵ هاوتای خۆی لە پاریس، پیچۆن، پێوەندی گرت و وتوێژی نهێنی پێ پێشنیار کرد. ئەو دڵنیابوو لەوە کە کات بەرەو کۆتایی دەڕوات. لە مانگی ئۆکتۆبردا ئەفسەرێکی پلە یەکی، ئالفرێد ڕۆلینسۆن، ناردبوو، کەسێک کە ئاتاتورکی زۆر نەدەناسی، تا بزانێت ئاتاتورک چ مەرجەگەلێکی ئاشتی قەبووڵ دەکات. ناسیۆنالیستەکانی تورک لەوکاتەدا زیاتر لە یەکچوارەمی ناوچەکانی ناوخۆیان هێنابوە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە؛ لە کۆتایی ساڵدا، ئاتاتورک پێتەختێکی ڕکابەری لە ئانکارا بۆ کۆنستانتینۆپل درووست کردبوو. کاتێکە بەریتانیەکان، کە بەکەمترخەمیەوە لەلایەن فەرەنسەیەکان و ئیتالیەکان ڕەچاو کرابوون، کۆنترۆڵی تەواوی کۆنستانتینۆپۆلیان لە ١٦ی مانگی مارسی ساڵی ١٩٢٠دا ، بەناوی یاسا و دەستوورگرتەدەست خۆیان و ژمارەیەک لە ناسیۆنالیستە ناودارەکانیان دەستگیر کرد، ئاتاتورک بە دەستگیرکردنی هەمووی ئەفسەرانی هاوپەیمانی، وەکوو ڕاولینسۆنی سیاچارە، و بانگێشتی پەرلەمان لەچوارچێوەی دەسەڵاتی خۆیاندا وڵامی دایەوە. لەوکاتە ناوەندی دەسەڵات بەئاشکرا کەتبوە ناو ئاناکاراوە. کۆرزۆن خەریک بوو دەهاتە سەر ئەو ئاکامە کە باشترین کار ڕەنگە ڕێگەدان بە سەرهەڵدانی تورکیەیەکی تازە بە سەرۆکایەتی ئاتاتورک بێت. بەداخەوە ئەو نەیتوانی لیۆد جۆرج موقناع بکات.١٠٢٠

دوا زنجیرەیەک کۆڕوکۆبوونەوە، کە کۆنفڕانسی مانگی ئاڤریلی ساڵی ١٩٢٠ لە سان ڕیمۆی لێکەوتەوە، لە ئاکامدا ڕەشنووسی گرێبەستەکە پینەکرا و پێشکەش بە نوێنەرانی حکوومەت لە کۆنستانتینۆپل کرا. تورکیە دەتکوت بچووک و ملکەچ کراوەتەوە. هەڵیت و پلێتی کۆنترۆڵکردنەکانی ماڵی دەرەوە لە سەدەی نۆزدەهەم بەم لاوە ڕەنگ و بۆی ئەقلانیان بەخۆوە گرت و

لەڕاستیدا بەهێزتر کرانەوە. هەرچەند تورکەکان وێدەچوو لە کۆنستانتینۆپل بمایەتنەوە، دەربەندەکان خرابوونە ژێر دەسەڵاتی ڕەژیمێکی نێونەتەوەییەوە. فەڕەنسە و ئیتالیا هەرکیان لە ئاناتۆلیا ناوچەی ژێر دەسەڵاتی خۆیان هەبوو؛ بڕیار وابوو سمیرنا و ترەیس بە یوونان ببڕایە. ئەرمەنستانێکی سەربەخۆ دەهاتە ئاراوە (هەرچەند هیچ ئامادەکاریەک بۆ ئەمە نەهاتبوە ئاراوە) و شتێک بەناوی کوردستان لە چوارچێوەی تورکیەدا سەربەخۆیی پێ دەبەخشرا.

* * * *

لەم قۆناغەدا بۆ ئەرمەنستان زۆر درەنگ کەوتبوو. ڕووخانی ڕووسیەی تزاریست و دواتر پاشەکشێی هێزەکانی عوسمانی دەلاقەیەکی کردبۆوە کە خەریک بوو دادەخرا. ئەرمەنستان، داغستان، گۆرجستان و ئازربایجان لە بەهاری ساڵی ١٩١٨دا سەربەخۆیی خۆیان ڕاگەیاندبوو. وڵاتانی تازە، کە بەلەرزۆکی، بەهەژاری، لە هەوڵی ئەوە دابوون لەگەڵ پەنابەران خۆیان بسازێنن تابەڵکوو لەبەرانبەر چەتەکان، ڕاکردووانی سووپاکانی تورک، هێزەسپی پۆشەکانی ڕووسی، نەخۆشی و برسیەتی ڕزگاریان بێت. یان بەڵکوو ئەو جیاوازیانەی کە ئەوانیان بە شەڕ دادابوو لەناو بەرن. یان بەڵکوو بتوانن دەست بەسەر ژەنەڕاڵ دێنیکیندا بگرن، ڕووسیەکی سپی پێست، چون ئەو دەبوایە لەگەڵ بۆلشویکەکانیش دانووستانی بکردایە. ئەوەی کە ئەوان نەیاندەتوانی لەبەرانبەریدا بوەستن یەککگرتنی هێرشێکی جەسوورانەی ڕووسی لە باشورەوە و سەرهەڵدانی دووبارەی تورکیە لە باشوردا بوو.

تەنانەت لەو کاتەشدا، بە هەندێک پشتگری لەلایەن دەرەوە، ئەوان دەکرا تروسکەیەکی هیوایان هەبوایە. لەنێوان هەمووی زلهێزاندا، بەریتانیا باشترین پێگەی بۆ دەستەبەرکردنی یارمەتی خێرا هەبوو. لە کۆتایی ساڵی ١٩١٨دا، هێزەکانی بەریتانی لە مێزۆپۆتامیاوە بەرەو قەزاقستان لە بەرەی دەریای کاسپیەنەوە وەڕێ کەوتبوون تا باکوو و کێڵگەنەوتیەکانی ئەوێ داگیربکەن. سێ تیپی سەبازی تر لەلایەن کۆنستانتینۆپلەوە بە پانتایی دەریای ڕەش حەواڵەی دەرەوە کران تا بەرپرسایەتی کۆتایی ڕۆژهەڵاتی ئەوێ بە بەندەری گرنگی باتووم لە گۆرجستان بگرنە ئەستۆ. لە سەرەتای ساڵی ١٩١٩دا، هێزەکانی بەریتانی دەستیان بەسەر ڕێگایەکی شەمەندەفەڕ داگرت کە بە پانتایی قەزاقستاندا درێژەی هەبوو و هەردوو شارەکەی بە یەکەوە گرێ دەدا. هەرچەند دەبێ بڵێین کە ئارەزووەکانی بەریتانیەکان، تەنانەت بۆ خودی بەریتانیەکانیش، ڕوون و ئاشکرا نەبوون. دەستڕاگەیشتن بە نەوتی دەریای کاسپیەن، پارێزگاریکردن لە جادەیەکی شیمانەکراو بۆ هێندستان، دوورکردنەوەی فەڕەنسەیەکان، پەرەدان بە خود-موختاری: هەمووی ئەمانە هۆکارێک بوون بۆ داگیرکردنی قەزاقستان لەلایەن بەریتانیەکانەوە. لە ساڵی ١٩١٩دا، ترس لە بۆلشویک ڕەنگ و بۆیەکی تری بەخۆوە گرتبوو؛ کۆرزۆ سەبارەت بە

دەسەڵاتی ناوچەکەی "بەدەست تاقمێک مرۆڤی دڕندە و وەحشی کە هیچ قەید و بەندێکیان نەبوو و سووربوون لەسەر بەزاندنی سنوورەکانی یاسا" قسەی دەکرد. بەڵام زۆربەی هاوکارەکانی ئەو لایەنی دوورەپەرێز وەستانیان گرتبوەبەر. بالفۆر پرسیاری کرد چ دەبوو ئەگەر قەزاقستان خراپ بەڕێوەبچوایە؟ کۆرزۆن بە تەشەرەوە وتی " ئەوە ئاڵتێرناتیڤێکی ترە." بالفۆر لە وەڵامدا وتی کە " لێیان گەڕێن با بە ربینگی یەکتر بگرن، من هەر ئەوەم دەویست."١٠٢٢

سەرەڕای پێداگری کۆرزۆن، لە بەهاری ساڵی ١٩١٩دا حکوومەتی بەریتانی خەریک بوو هەستی بەوەدەکرد کە دەستێوەردان لە ناوچەکە لەوانەبێت زۆر گران تەواوبێت. هێنری ویلسۆن بە لیۆد جۆرجی ڕاگەیاند کە " هەرچی زووتر لە قەزاقستان وەدەر کەوین باشترە." لە مانگی ژوەندا کابینە بڕیاری دا تا هەتا کۆتایی ساڵ پاشەکشێ بە هەمووی هێزەکان بکات. بڕیار وابوو دینیکین لەبەرانبەر بەڵێنی کارنەکردنەسەر کۆماریە سەربەخۆکان چەک و تەقەمەنی پێ ببەخشرێت. ئیتالیەکان واحاڵی بوون کە دەستیان بەسەردا دەگیرێت بەڵام، وەک ویلسۆن لیۆد جۆرجی ئامۆژگاری کردبوو، ئەو کارە هەرشیمانەی نەدەکرا.

بڕیارەکە کێشەی بۆ زۆر لایەن درووست کرد. هانکەی، ئەمینداری کابینە، لە نامەیەکدا بۆ لیۆد جۆرج نووسیبووی کە " ئەو هەستە بەسۆزەی کە لەناو زۆربەی بازنەکانی ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا لە بەرژەوەندی ئەمریکیەکان و دژایەتیەکی سرووشتی بوونی هەیە سەبارەت بە سپاردنی چارەنووسی نەتەوەیەک بەوان کە ئێمە لەڕابردوودا زۆرجاران کێشەیەکەیمان ورووژاندوە . ناکرێ ئەوە ڕەد کەینەوە کە لە پاشەکشێکردنی هێزەکانمان لە ترانسکۆکسیا هەست بە بێ ڕەحمیەکی سەیر دەکرێت درووست لە کاتێکدا کە گوزارشمان پێدەگات کە کۆمەڵکوژیەکان لە حاڵی گەشەسەندن دان."١٠٢٣ (لە ناوچەکانی ئازەربایجان و لە خودی ئەمریکا، مسوڵمانانی ناوچە خەریکی سووتاندنی گوندەکانی ئەمریکی و کوشتنی دانیشتوانی ناوچە بوون.)

لەگەڵ ئەوەشدا پاشەکشێی هێزەکانی بەریتانی درێژەیان هەبوو، و، نەوەک دینیکین ناڕەحەت بێت، بەریتانیا لە بەخشینی بەفەرمی ناسینی کۆماریەکانی قەزاقستان جارێ دەستی هەڵگرت. تەنیا لە مانگی ژانویەی ساڵی ١٩٢٠دا، کاتێکە ئاشکرابوو کە ڕووسە سپی پێستەکان کۆتاییان پێهاتوە و بۆلشویکەکان ئامادەکراوەن تا بەرەو باشوور ڕامالدرێن، بەریتانیا لە ئاکامدا وڵاتە بچووکەکانی بەفەرمی ناسی و هەندێک چەک و تەقەمەنی بۆ ناردن. دایرەی جەنگ لە دەرفەت کەڵکی وەرگرت تا کەلاشینکۆفە زیادیەکانی کنەیدیەن ڕاس لەکۆڵ خۆی کاتەوە، لە توانایی بۆ درووستکردنی حەشیمەت تەنانەت لە کەش و هەوایەکی زۆر تەواو و گونجاودا ناسراو بوون.١٠٢٤

لـە هـەمان كاتـدا، هەڕەشـەیەک خـەریک بـوو لـە باشـوور سـەری هەڵـدەدا چـون ئاتـاتورک و هێزەکانی ئەو پێگەی خۆیـان لـە ئاناتۆلیا بـەهێزتر کردبـوو. تورکـەکان قـەت حاشـایان لـە هەڵوێستی جەسـوورانەی خۆیـان سـەبارەت بـە ڕاگرتنـی پارێزگاکـانی ئەرمەنسـتان و گەڕاندنـەوەی بەشـی ئەرمەنسـتانی سـەربەخۆ نـەدەکرد. گەیاندنـەکانی نادیـار و ترسـێنەرانە لـەنێوان بۆلشـویکەکان و ناسیۆنالیستەکانی تـورک تـازە دەستیان پێکردبـوو. ئاتـاتورک بەهیچ شـێوەیەک کمونیسـت نـەبوو بـەڵام بلشـویکەکان ، بەگشـتی، دوژمنـانی بـەریتانیای دوژمنـی ئـەو بـوون. تـەنیا کۆماریـە سەربەخۆکان- ئەرمەنستان، گۆرجستان و ئازەربایجان- نەیاندەهێشت تورکـەکان و بۆلشـویکەکان یـەک بگـرن و بەرەیـەکی هاوبـەش دژ بـە ئیمپریالیسـتەکان درووسـت بکـەن، کەسـانێک کـە لـە هـەوڵی ئـەوە دابـوون تـا هـەردوو وڵاتکـانی ئـەوان لـە یـەک بکـەن و جیایـان بکەنـەوە.١٠٢٥ بۆلشـویکەکان، وەک ئاتاتورکی بێ ڕەحم و بێ بـەزەیی، بـە تاسـەوتینێکی تایبەتـەوە وڵامیـان داوە، و بـە کەشـتی سـووپا و تەڵایان بەرەو ئاناتۆلیا دەنارد.

هاوکـات کـە هاوپـەیمانان لـە سـان ڕیمـۆ ئەرمەنـستانیان تـاو و تـوێ دەکـرد، بۆلشـویکەکان کۆمـاری ئازەربایجانی دراوسێی ئەوێیان دەگرتەوە. یاخیبوانی بەبیروباوەڕی کمۆنیستی ئـاخێنراو لە خودی ئەرمەنستان سەریان هەڵدا. هاوپـەیمانان لەگـەڵ کۆمـەڵەی گـەلان پێوەنـدیان گـرت تـا داوای لێبکـات لـە وڵاتێکـی ئەرمـەنی گـەورەتر کـە ئـەوان بیریـان لـە دامـەزرانـدنی کردبـۆوە پارێزگاری بکات؛ کۆمەڵەی گەلان، کە لەو کاتەدا چەند مانگی سەرەتای خۆی تێپەڕاندبوو، وڵامـی داوە کـە چـون خـودی کۆمەڵەکـە لەڕاسـتیدا هـەبوونی نـەبوو ئـەو نەیدەتوانی وا بکـات. دواتـر هاوپـەیمانان ڕووی قسـەیان کـردە وڵاتەیـەکگرتوەکان، شـوێنێک کـە کێشـەی مانـدێتێکی ئەمریکی بۆ ئەرمەنستان هەر لەکاتی گەڕانـەوەی ویلسـۆن لـە ئوروپـاوە ڕوولـە نـاوچوون بـوو. سـەرەک کۆمـاری پەککەوتـە داواکـەی بـردە کـۆنگرێس، ئـەویش بـە زۆرینەیـەکی بـەرچاو لـە مانگی مەیدا ڕەتی کردەوە. سێناتۆر لـۆج بـە هاوڕێیـەکی وتبـوو: " وامـەزانن مـن سـەبارەت بـە ئەرمەنسـتان خـراپ بیـر ناکەمـەوە. نـەخێر، بـەڵام پێم وایـە لەبەرانبـەر مافێکـە بـەوان بەخشـراوە، مافی سەرلێشەواندنی ئێمە، گرێ پووچکەیەک هەیە."١٠٢٦

لـە دۆزینـەوەی پارێزەرێـک کوردسـتان تەنانـەت لـە ئەرمەنسـتانیش شانسـی کـەمتری هـەبوو. لـە کۆڕی ئاشتی پاریسدا تـەنیا جارێـک ئـەم کێشـەیە هاتبوە بەرباس. ئەوکاتـەی کـە لیـۆد جـۆرج بـۆ یەکـەم جار لیسـتی ماندێتـەکانی شـیمانەکراوی خـۆی بـۆ ئیمپراتـۆری عوسـمانی لـە ٣٠ی مـانگی ژانویـەدا پێشـکەش کـرد، ئـەو هـەر لەبیریشـی نـەبوو تـا ئاماژەیـەکی پـێ بکـات. کاتێکـە بەپەلە

کوردستانی بە لیستەکەی خۆی ئیزافە کرد، ئەو بەخۆشحاڵیەوە دانی بەوەدا هێنا کە جوگرافیاکەی ئەو هەڵەی تێدابوە. ئەو وای بۆچووبوو کە میزۆپۆتامیا یان ئەرمەنستان ئەو جوگرافیایە لەخۆ دەگرن، بەڵام ڕاویژکارەکانی ئەو پێیان ڕاگەیاندبوو کە ئەو هەڵەی کردوە. ئاقڵانە، ئەویش هەوڵی نەدا تا سنوورەکانی ماندێتی تازە دەستنیشان بکات: سەبارەت بە کوردستانیش وەکوو زۆر شوێنی تر، ئەوان هیچ زانیاریەکیان نەبوو.١٠٢٧

کوردەکان زۆر تەریک و دوورەپەرێز هەڵکەوتبوون، لە بەشی ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆری عوسمانی ، و، لەوکاتەدا، نەیانتوانیبوو لەسەر ڕای گشتی جیهانیان شوێنەوارێک دابنێن. مارک سایکێس، کە بەرلە شەڕ سەفەرێکی بۆ ناوچەی کوردستان کردبوو، ئەوانی خۆش ویستبوو چون بەڕای ئەو ئەوان شەڕکەری چالاک و لێوەشاوە و بەزەبر بوون. پسپۆڕی ئەمریکی، کە قەت پێشتر ڕێی نەکەوتبوە ئەوێ، وای نەدەکوت: " لە هەندێک بواردا کوردەکان پیاو دەخەنەوە بیری هێندیەکانی ئەمریکای باکوور...لە خولق و خوودا ئەوان هەڵچوو، تووڕە، تۆڵەسێنەر، ورووژێنەر و خائینن. ئەوان سەربازی باش درووست دەکەن بەڵام لە درووستکردنی ڕێبەراندا کۆڵن. ئەوان تەماحکارن، هەتابڵێی خۆویستن، سواڵکەری بێ شەرم و حەیان، و هەتابڵێی کەیفیان لە دزیکردن و چەتەگەریە."١٠٢٨

کوردەکان دراوسێگەلی مەترسیداریان هەبوو. لەپشت کێوەکانی بەرەو باکوور و ڕۆژهەڵات ڕووسیە و ئێران هەڵکەوتبوون، بەرەو ڕۆژئاوا تورکەکان و بەرەو باشوور عەرەبەکانی میزۆپۆتامیا. لەکاتی شەڕی گەورەدا، سووپاکانی عوسمانی و ڕووسی لە لێواری باکووری ئەوان خەباتیان کردبوو و بەریتانیەکان لە باشوورەوە هەڵکشابوون. ڕەنگە ٨٠٠،٠٠٠ کورد لە سووپاکانی عوسمانی یان بەهۆی برسیەتی و نەخۆشی لەناوچووبێتن.١٠٢٩ لێکدانەوەی ژمارەی کوردەکان هەمووکاتێک کارێکی دژوار و ناخۆش بوە. چون کولتووری کوردەکان لەنێوان کولتووری عەرەبی، ئێرانی، تورکی، تەنانەت ئەرمەنی، تواوبۆوە نەدەکرا ژمارەی ڕاستەقینەی ئەو کوردانەی کە لە ئارادابوون ڕاگەیەنرێت. نزیک بە سێ چوارەمی ئەوان- ڕەنگە یەک ملوێن کەس یان تەنانەت دوو ملوێن کەس بووبێتن- لە ئیمپراتۆری عوسمانیدا دەژیان، زۆرینەی ئەوان لە شوێنێک دەژیان کە دواتر ناوی تورکیەی بەخۆوە گرت، ئەوەی دەماوە لە عەراق، بەشێوەی پرژوبڵاو لە سووریە. بەشێکی تر لە ئێران دەژیان.

ئاماژەکردن بە ژمارەی ڕاستەقینەی کوردەکان هەروا ئاسان نەبوو. ناوی ئەوان هەر لەبنەڕەتدا بەمانای "کۆچەری" بووە. ئەوان خاوەنی مێژوویەکی یەککگرتوو و نەپساوە نەبوون، ئەوەی سەبارەت بە مێژووی ئەوان لەبەردەست دایە بریتیە لە ئەفسانەگەلێک کە لە مانادا یەک ناگرنەوە. هیچ میرنشینێکی گەورەی کوردی نەهاتبوە ئاراوە و سەلاحەددین نەبێت هیچ قارەمانێکی گەورەیان تێدا

هەڵتەکەوتبوو. کوردەکان بە خێڵەکان، بە ئایین (زۆربەیان مسوڵمانانی سوننی بوون بەڵام شیعە و سوننیشیان تێدابوو) ، بە زمان و بەو ڕاستیە کە ئەوان لەنێوان نەتەوەگەلی جۆراوجۆردا پرژ و بڵاو ببوونەوە دابەش کرابوون. ئەوان بە یاخیگەری ناویان زڕابوو. زانایەکی ئەڵمانی لە بواری نیشانەکانی نەتەوەدا داوای لێبوردنی کردبوو: " لەبنەڕەتدا خاڵە لاوازەکانی ئەوان بەگشتی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ژیانە نائارامەی کە ئەوان لە ناوچەیەک تێیان پەڕاندوە کە تێیدا حکوومەتی ڕێکخراو بۆماوەی هەشت سەدە نەناسراو بوون." ئەوان لەگەڵ یەکتر شەڕیان دەکرد،لە دەرەوەی بەرپرسایەتی، جا لە بەرەی عوسمانی یان ئێرانی، و خەڵکانی تر. عوسمانیەکان مسوڵمانانی کوردیان لە کۆمەڵکوژیەکانی ئەرمەنیەکان بەکارهێنابوو. لە کۆتایی شەڕدا، هێزگەلی بەریتانی و هێندی کە ناوچەکەیان داگیرکردبوو بڕیاریان دابوو تا ئاشتیەکی دژوار بنێنەوە.١٠٣٠

بەپێچەوانەی نەتەوەگەلی سەرهەڵداوی تر، کوردستان هیچ پارێزەرێکی ئەدەبی یان هونەری لە پاریس نەبوو، و کوردەکان هێشتا نەیاندەتوانی بەشێوەیەکی کارامە قسە لەخۆیان بکەن. ئەوان سەرقاڵ بە هێرشگەلی ئاسایی ،ئاژەڵەکانی خۆیان، ئافرەت هەڵگرتن، شەڕوشۆڕی عەشیرەتی و چەتەگەری، بە کوشتنی ئەرمەنیەکان یان هەروا بە ئاسانی بە زیندوومانەوە بوون، ئەوان تا ئەو کاتە بایەخێکی ئەوتۆیان تەنانەت بە ئۆتۆنۆمی گەورەتر لە چوارچێوەی ئیمپراتۆری عوسمانی، شوێنێک کە زۆرینەیان لەوێدا دەژیان، نەدابوو. بەرلە دەستپێکردنی شەڕی گەورە، بیروباوەڕی ناسیۆنالیستیەک کە لەنێوان خەڵکانی تری ڕۆژهەڵاتی ناڤین سەریان هەڵدابوو لەلایەن کوردەکانەوە پێشوازیەکی ئەوتۆی لێنەکرابوو. تەنانەت ناوەندی سەرەکی ناسیۆنالیزمی کوردی، وەکوو چەند کۆمەڵگایەکی بچووک و تاقمێک ڕۆشنبیر، لە شاری کۆنستانتینۆپلەوە سەریان هەڵدابوو. تەنیا وتەبێژیکی کورد لە پاریس لە ساڵی ١٩١٩دا، پیاوێکی بەس سەرنجڕاکێش، ئەوەندە لەمێژ بوو لەوێ ژیابوو کە بە نازناوی بیوو شەریف قاویان دەکرد. ئەو ئەوەی لەدەستی هات کردی، هێنانەبەرباسی داواکاریەکانی خۆی کە وڵاتێکی بەربڵاوی دەگرتەخۆ لە ئەرمەنستانەوە (ئەگەر بهاتایەتە دی ) بگرە هەتا دەگاتە خوارێ لای مەدیتەرانە. بەشێکی زۆر لەو ناوچەیە لەلایەن ئەرمەنیەکانیش و لەلایەن ئێرانیشەوە داواکاری لەسەر بوو.١٠٣١

بەریتانیا تەنیا یەکێک لەو زلهێزانە بوو کە حەزێکی بنەڕەتی لە دیتنی کوردستان بەسەر نەقشەوە لەناخ دابوو. وڵاتەیەکگرتوەکان، هاوسۆزی ئەرمەنیەکان، زۆر بایەخی بە کوردەکان نەدەدا. فەڕەنسیەکان بەگشتی وەک کەرسەیەکی مامەڵەکردن داواکاری ماندێتێکیان پێشکەش کردبوو؛ کاتێکە بەریتانیا لە خاوەنداریێتی سووریە لە پایزی ساڵی ١٩١٩ جەختی کردبۆوە، فەڕەنسە هیچ

جۆرگەیەکی بەوە نیشان نەدابوو. هەرچەند دەبێ بڵێین ئەو بە دژایەتی خۆی لەبەرانبەر ماندێتیکی بەریتانی بەسەر کوردستاندا درێژەی دابوو.١٠٣٢

لیۆد جۆرج و ڕاوێژکارەکانی مەبەستی سەرەکیان وەرگرتنی و پارێزگاریکردن لە ماندێتی خۆیان بوون بەسەر مێزۆپۆتامیادا، ناوچەیەک کە بەڵێندەری خەزێنەیەکی گەورەی نەوت بوو؛ ئەوان وایان بەباش دەزانی کە بەڕێوەبردنی بەشێک لە ناوچەکانی عوسمانی بەپانتایی باکووردا نەگرنە ئەستۆی خۆیان. کوردستان قازانجی پارێزگاریکردن لە سنووری باشووری ئەرمەنستانی دەبوو، ئەگەر زیندوو ڕاگیرایە، و بەم چەشنە بەربەستێکی تری لەنێوان بەرژەوەندیەکانی بۆلشویزم و بەریتانیا دادەنا. بێجگە لەوە بەڕێک و پێکی نەیدەهێشت فەرەنسەیەکان لە سووریە و ئاناتۆلیای باشور پەرە بە دەسەڵاتی خۆیان بەرەو باکوور بدەن. بەریتانیەکان لایان وابوو کە کوردستان دەتوانێ زۆر بە هەرزانی بەڕێوە بچێت، لەژێر دەسەڵاتی پیاوماقووڵانی ناوچە، لەسەر نموونەی سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی هێندستان. ئەوان بە بەڵگەوە دەیانکوت کە کوردەکان بۆخۆیان خوازیاری پارێزگاریکردن لەلایەن بەریتانیەکانەوەن؛ کوردەکان لە ساڵی ١٩١٩دا کۆڵنەدەرانە ووزەیەکی زۆریان تەرخان بە سەرهەڵدان دژ بە هێزەکانی داگیرکەری بەریتانی و کوشتنی نوێنەرانی بەریتانی کردبوو.١٠٣٣

لە سەرانسەری ساڵەکانی ١٩١٩ و ١٩٢٠، کاتێکە ئەوان لە هەوڵی ئەوەدابوون گرێبەستی تورکیە دابین بکەن، بەریتانیەکان پارەیان بە گرووپگەلی جۆراوجۆری کوردی دابوو کە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە گوایە ئەوان دەتوانن کوردەکان بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە. مەیجێر نۆئێلیک [سەرگوردێک]، "لۆرێنسی کوردی،" لە هاوینی ساڵی ١٩١٩دا لە ناوچە کوردنشینەکان مەئموریەتێکی پێچەڵاوپووچی لەپێناو ورووژاندنی بزووتنەوەی سەربەخۆیی بردبوە سەر.ئەو تەنیا تورکە ناسیۆنالیستەکان و هاوکارەکانی خۆی توورە کردبوو. وەک ڕاوێژکاری سیاسی بەریتانیا لە کۆنستانتینۆپل گلەیی کردبوو، " ئەمن جوان جوان ڕوونم کردبۆوە کە ئێمە نامانەوێت دژ بە تورکەکان فێڵ و تەڵەکە بنێینەوە، و ئەوە کە من سەبارەت بە داهاتووی کوردستان بەڵێنی بە هەر شێوەیەک کە بوە ڕاناگەیەنم." ١٠٣٤

پاڵپشتی بەریتانیەکان لە ساڵی ١٩١٩دا زۆر بەدڵەوە نەبوو و، تاڕادەیەک، بەسرابۆوە بە وەئەستۆگرتنی ماندێتی ئەرمەنستان لەلایەن وڵاتەیەکگرتوەکانەوە. لە وەرزی پاییزدا ئاشکرا بوو کە ئەوە ئەگەری ڕوودانی زۆر کەمە. ئەوەش ئاشکرا بوو کە تورکەکان بەوزوانە کۆتاییان پێ نەدەهات. ئاتاتورک بەخێرایی دەستی کرد بە دروستکردنی هێزەکانی خۆی لە ڕۆژهەڵات، نزیک بە

ناوچەکوردنشینەکان. هەم لە ڕوانگەی نیزامیەوە و هەمیش ماڵیەوە بیرۆکەی پاڵپشتیکردن لە کوردستانێکی سەربەخۆ و جیاواز جار لەگەڵ جار کزتر دەبۆوە. لە هاوینی ساڵی ١٩١٩دا، هێزەکانی بەریتانی لە ئیمپراتۆری عوسمانی تا ٣٢٠،٠٠٠ کەس کەمیان کردەوە. لە مێزۆپۆتامیا بەرپرسانی بەریتانی لەسەر جێکردنەوەی بەشێک لە ناوچەی کوردی لەناو ماندێتی تازەی عەراقی دەمەقڕەیان بوو. لەڕاستیدا سنوورگەلی پارێزگایی عوسمانی لەو بەشەی جیهاندا قەت ڕووی ئارامشی بەخۆیانەوە نەدیبوو، بەوپێیە دەکرا بەڵگە لەسەر ئەوە بهاتایەتەوە کە پارێزگای کۆنی موسڵ بەرەو کێو و تەلانەکانی کوردەواری درێژەی دەبوو.١٠٣٥

کوردەکان وەک جاری جاران بۆخۆیان بەش بەش کرابوون. ئایا ئەوان متمانەیان بە تورکەکان دەکرد یان بەریتانیەکان؟ هەقیان بۆ ئەرمەنیەکان دەکردەوە؟ داوای یارمەتیان لە بۆلشویکەکان دەکرد؟ هەڕەشەی یوونان، لانی کەم بۆ ماوەیەکی کاتیش بووبێت، یارمەتی زۆر کەسی دا تا بڕیارەکانیان ساخ کەنەوە. لە بەهاری ساڵی ١٩١٩دا ئەو کاتەی کە بۆ یەکەم جار هێزەکانی یوونانی لە سمیرنا نیشتەجێ بوون و دواتر لە هاوینی ساڵی ١٩٢٠دا بەرەو ناوچەکانی ناوەوەی وڵات بۆ گیان ئاتاتورک هێرشێکیان سازکرد، کوردە مسوڵمانەکان، بەگشتی ئەوانەی کە باری ئایینیان زۆر لەسەرەوە بوو، ئەوەیان وەک شەڕی نێوان ئیسلام و مەسیحیەت دەدی. ئاتاتورک، هەست و سۆزی نهێنی خۆی هەرچیەک بووبێت، ئەوەندە زیرەک بوو کە بتوانێت بەناوی ئیسلامەوە لە سەرەک عەشیرەتی کوردەکان نزیک بێتەوە و پشتگری ئەوان بۆلای خۆی ڕاکێشێت. دەنگۆی ئەوە کە گوایە بەریتانیا پلانی داڕشتوە تا دەست بەسەر ناوچەکانی کوردنشین دابگرێت تەنانەت ناسیۆنالیستەکانی کوردی هان دا تا شانسی خۆیان لەگەڵ ئاتاتورک تاقی بکەنەوە.١٠٣٦

لەم قۆناخەدا، کۆرزۆن و لیۆد جۆرج قەزائەن پێکەوە ڕێکەوتن: هاتنەدی بیرۆکەی وڵاتێکی سەربەخۆی کوردی دوور لە ڕاستی بوو، هەرچەند ئەوە بەمانای وازهێنان لە هەندێک ناوچەی کوردنشین لەژێردەسەڵاتی تورکی دابوایە. لە مانگی ئاڤریلی ساڵی ١٩٢٠ لە سان ڕیمۆ، لیۆد جۆرج دانی بەوەداهێنا کە ئەو بۆخۆی هەوڵی دابوو تاکوو بزانێت کوردەکان هەستیان چیە. دوا لێکۆڵینەوەیەک لە کۆنستانتینۆپل، بەغدا و شوێنی تر، ئەو بەو ئەنجامە گەیشت کە دۆزینەوەی نوێنەرێکی کورد کارێکی دژوار و سەختە. هیچ کوردێک نەدۆزرایەوە کە زیاتر لە عەشیرەتەکەی خۆی نوێنەرایەتی بکات....بە واتایەکی تر، پێدەچوو کە کوردەکان هەستیان وابێت کە ئەوان ناتوانن بەبێ پشتگری هیزێکی گەورە پارێزگاری لە کیان و لە بوونی خۆیان بکەن... بەڵام ئەگەر هیچ کام لە وڵاتانی فەڕەنسە و بەریتانیای گەورە ئەم ئەرکەیان نەگرتایەتە ئەستۆ- و ئەو هیواداربوو کە

هیچ کامیان نەیکەن- ئەوان لەوەدەچوو بیر لەوە بکەنەوە باشتر وابێت ئەوان لەژێر دەسەڵاتی تورکیدا بەجێ بێڵن. وڵات بە دەسەڵاتی تورکی خووی گرتبوو، و جیاکردنەوەی ئەویّ لە تورکیە ئەستەم بوو مەگین پارێزەرێکی ئالتێرناتیف بدۆزرایەتەوە.

لە مەرجەکانی ئاشتی کە بۆ تورکیە دانران، پێگەی کوردستان بە هەڵواسراوی مایەوە: ڕەنگە ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی تورکیەدا، ماندێتێک لەژێر دەسەڵاتی زلهێزێک یان سەربەخۆیەکی تەواو. بێجگە لەوانە سنوورگەلی کوردستانیش هەروا بە هەڵواسراوی و بەبێ بڕیارلەسەردان مانەوە تا بەڵکوو لە داهاتوودا لێژنەیەکی هەقیقەت-دۆز بتوانن بڕیاری لەسەر لێبدەن. (بەریتانیەکان لەوەدڵنیابوون کە ئەو ناوچانەی کە ئەوان خوازیاری بوون لە وڵاتی تازەی عێراقدا هەڵکەوتبوون.) هەست بە بەڵێنیەکی کز دەکرا: ڕەنگە، ئەگەر کوردەکان بتوانن کۆمەڵەی گەلان ڕازی بکەن کە ئەوان بۆ سەربەخۆیی ئامادەن ، و لەڕاستیدا خوازیاری ئەوەن، لەوانەبوو ڕۆژێک بیانتوانیایە لەگەڵ هاووڵاتیانی خۆیان لە عێراق یەک بگرن.١٠٣٧

کاتێک وردەکاریەکانی ئەمانە و مەرجەکانی تر لە بەهاری ساڵی ١٩٢٠دا پالێوران و هاتنە دەرێ، دەکرا هەڵوێستی تورکەکان بەتەواوەتی پێشبینی بکرێت. ناردراوی کۆرزۆن بۆلای ئاتاتورک لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە " ئەوان بە گاڵتەکردن و قاقای پێکەنین وەرگیران، و چالاکی ئامادەکاریەکانی نیزامی بەخێرایەکی بەرچاو زۆری کرد." لە ئانکارا، پارلەمانی ناسیۆنالیستی هەم مەرجەکان و هەمیش حکوومەتی سوڵتانی ڕەت کردەوە. جۆگەلەیەکی بەردەوامی ناسیۆنالیستەکان لە کۆنستانتینۆپلەوە سەرڕێژ بوو و بۆ ناوەوەی وڵات بەرەو هێزەکانی ئاتاتورک ملی ڕێگایان گرتەبەر. کۆمیسیاریاکانی عالی هاوپەیمانی پەیتاپەیتا هەڕەشەیان دەکرد کە ڕای تورکی، تازە هەڵچوو، دۆڕاندنی سمیرنا، شوێنێک کە یوونانیەکان سەرقاڵی هەڵکۆڵین بوون، بەو ئاسانیە قەبووڵ ناکات. کۆرزۆن لەمە ترسابوو. وەک لە نامەیەکدا بۆ لیۆد جۆرج نووسیبووی کە " من دوایەمین پیاوێکم کە ئارەزوو دەکەم ئاورێکی باش بەلای تورکەکاندا بدەمەوە... بەڵام من دەمەوێت لە ئاسیای بچووکدا ئاشتی بنێمەوە، و لەگەڵ یوونانیەکان لە سمیرنا، و من دەزانم کە هەوڵی تیپەکانی سەربازی یوونانی بۆ بەئەنجام گەیاندنی دەستوورەکانی ڤێنزیلۆس و مارش لێدان لە دەوروبەری ئاسیای بچووکدا جێبەجێ ناکرێن."١٠٣٨

کاتێک دۆخەکە گرژتر بوو، هاوپەیمانان، یان خراپتر لەوە بەریتانیەکان، لەسەر هەنگاوێک بڕیاریان دا کە لە ئاکامدا بۆ پێگەی ئەوان لە تورکیەدا کوشندە بوو. ڤێنزیلۆس، کە لەوە دەترسا حکوومەتەکەی بڕووخێ مەگین ئەو بتوانێ هەندێک سەرکەوتن نیشان بدات، و هێزەکانی ئەو لەژێر هێرشە بەردەوامەکانی ناسیۆنالیستیدا لە سمیرنا لە حاڵی سڕینەوەدا بوون، لە کۆتاییدا توانی لە

مانگی ژوەنی ساڵی ١٩٢٠دا لەلایەن لیۆد جۆرجەوە ڕەزایەت وەرگرێت تا بەرەو ناوخۆی وڵات بکەوێتە ڕێ. وەک جۆرێک قەرەبووکردنەوە، ڤینزیلۆسیش هێزگەلێکی نارد تا پاڵپشتی لە هێزە داگیرکەرەکان لە کۆنستانتینۆپل بکات. شۆڕای عالی، کە هێشتا هەر لە گەڕ دابوو، سەرپۆشێکی ناسکی یاسایی دەستەبەرکرد؛ هێزگەلی یوونانی، بەناوی هاوپەیمانان، بە ئاسانی وڵامی هێرشەکانی تورکییان دایەوە. کۆمیسارییای عالی بەریتانی لە کۆنستانتینۆپل بە تووڕەییەوە بۆ کۆرزۆنی نووسی: " بەم چەشنە، شۆڕای عالی ئامادەیە تا سەرلەنوێ دەست بە شەڕی گشتی بکاتەوە؛ ئەوان ئامادەن تا سەبارەت بە یاساگەلی ڕاگەیەنراوی خۆیان توندوتیژی بکەن؛ ئەوان ئامادەن تا بەشێوەیەکی نەپساوە خوێنڕێژی لە ڕۆژهەڵاتی نزیک هەتاهەتایی بکەن؛ و ئەمە بۆ چ مەبەستێک؟ بۆ ئەوەی پاڵپشتی لە ڤینزۆلۆس بکات تا لە یوونان هەر لە دەسەڵاتدا بمێنێتەوە چون بەپێی ڕەوتی ئاسایی شتەکان ناتوانێت زیاتر لە چەند ساڵێک لە دەرەوە هەڵبکات و درێژە بەژیانی ئاسایی خۆی بدات." کۆرزن بە تەواوەتی لەسەر ئەم باوەڕە بوو: " ڤینزۆلۆس لای وایە کە پیاوەکانی ئەو دەتوانن تورکەکان بەرەو کەژ و کوێستانەکان ڕامالن. من گومانم هەیە لەوە کە بتوانن."١٠٣٩

و بەم چەشنە دوایەمین قۆناخی ئاشتی نانەوە لە تورکیە بە شەڕەوە دەستی پێکرد. هێزەکانی یوونانی بۆ دەرەوەی سمیرنا بە پانتایی سنوورێکی بەربلاو، بەرەو ژوور بۆ ناو دەرودۆڵەکانی سەر لێواری فەلاتی ئاناتۆلیا وەڕێ کەوتن. تورکە ناسیۆنالیستەکان بەرەو ناوەوەی وڵات دێلیان کرد. لە ئورووپا، سووپایەکی تری یوونانی لە ترەیس هێزێکی هەڵوەشاوە و لاوازی بەرخۆی دا. ڤینزیلۆس دڵنیابوونی تەواوی خۆی دەربڕی؛ ئەو ڕووخانی هێزەکانی ئاتاتورک و پرژوبڵاوبوونەوەی دەسەڵاتی یوونانی لەناوەوەی وڵات، بەرەو کۆنستانتینۆپل، تەنانەت لەوانەبوو بەرەو پۆنتووس لە دەریای ڕەش، پێشبینی کرد. بەشێوەیەکی نهێنی، سەرەک وەزیری یوونان چەند ساتێک ترس و دڵەڕاوکێی بردە سەر بەڵام، لەم قۆناخەدا، ئەو بێجگە لە درێژەدان هیچ ڕێگایەکی تری بۆ نەمابۆوە.١٠٤٠ لە مانگی ئۆگستی ساڵی ١٩٢٠دا، یوونانیەکان ٢٥٠ مایل بەرەو ناوەوەی وڵات هاتبوون.

هەر ئەو مانگە، هاوپەیمانان و داماد فەرید، بەنوێنەرایەتی حکوومەتی سوڵتان، لە هۆڵێکی نمایشدا لە کارخانەی پۆرسلینی سێڤرس لە دەوروبەری شاری پاریس گرێبەستێکی ئاشتیانەیان واژۆکرد: شتێکی جوانی تێدا بەدی نەدەکرا، بەڵکوو بەئاسانی تێکشکا. ڕاوێژکارانی نیزامی هاوپەیمانی هۆشداریان دا کە بۆ سەپاندنی ئەو مەرجانە لانی کەم بیست و حەوت تیپی سەربازی پێویست دەبێت، ئەویش ئەوان لێیان بێ بەش بوون. لە تورکیە، ڕۆژێک سەرەخۆشی ڕاگەیەنرا؛ ڕۆژنامەکان هێڵی ڕەشیان پێوە دیاربوو، دووکانەکان داخران و نوێژکەران سەرتاسەری ڕۆژیان بە

دوعاکردن و پاڕانەوە بردە سەر. ئاتاتورک درێژەی بە شەڕکردن دا. لەوکاتەدا ئەو زۆربەی هێزەکانی ناسیۆنالیستی لە تورکیە هێنابوە ژێر رکێفی خۆیەوە، و لە باکوور ئەو و بۆلشویکەکان خەریک بوون بە کۆماریە گێچەڵاویەکانی قەزاقستان کۆتاییان دەهێنا.١٠٤١

لە مانگی سێپتامری ساڵی ١٩٢٠دا، کەمتر لە مانگێک دوا ئەوەی کە گرێبەستی سێڤرس بەڵێنی لکاندنی بەشێک لە تورکیەی بە ئەرمەنستانێکی سەربەخۆ دابوو، هێزەکانی ئاتاتورک لە باشوورەوە هێرشیان کردبوو. سەرەڕای ئەوە کە ئەرمەنیەکان هەموو هەوڵێکی خۆیان خستە گەڕ و لە هێزی بچووکی ئاسمانی سێ فرۆکە کەڵکیان وەرگرت، بەرەبەرە کشانە دواوە و شکستیان خوارد. کاتێکە ئاهارۆنیان، هەڵبەستوانی ئەرمەنی کە بەناوی ولاتەکەیەوە لە پاریس قسەی کردبوو، هەوڵی دا تا لە لەندەن چاوی بە کۆرزۆن بکەوێت، بە نامەیەک ولامی رەدی پێدرایەوە. کۆرزۆن نووسیبووی کە " ئەوەی کە ئێمە ئێستا دەمانەوێت ببینین بەڵگەیەکی چەسپاو و کۆنکرێتە لە هەندێک توانایی بەهێزی بەڕێوەبارایەتی لە ناوەوەی ولاتدا، نەوەک تەنیا سیاسەتێکی دەرەکی لەسەربنەمای پرۆپاگەندە و سوالکەری." لە حەڤدەی مانگی نوامردا، حکوومەتی ئەرمەنی لەگەڵ تورکیە گرێبەستێکی ئاگربەستی واژۆ کرد کە ئەوەش تەنیا بەشێکی زۆر بچووکی لە ولات ئازاد دەهێشتەوە. پێنج رۆژ دواتر، پەیامێک لەلایەن سەرەک ویلسۆنەوە گەیشتە بەرەوە. داوای لێکرابوو کە لە چوارچێوەی گرێبەستی سێڤێرسدا سنوورەکانی ئەرمەنستان دیاری بکات؛ ئەو بڕیاری دا کە ئەو ولاتە دەبێ ٤٢,٠٠٠ کیلۆمەتری چوارگۆشەی لە ناوچەکانی تورکیەی پێ ببەخشرێت.١٠٤٢

سەرەک وەزیری ئەرمەنی دوا ئەوە کە هەستی بەوەکرد کە نەتەوەکەی لەلایەن جیهانیانەوە پشتی تێکراوە و لەنێوان دوو دوژمندا سەرکوت کراوە، وتی: "ئەرمەنستان لە ڕێگایەک زیاتر هیچ نەماوە تاکوو بیگرێتەبەر ئەویش لەنێوان دوو شەیتاندا هەڵبژاردنی ئەوەیانە کە ئازاری کەمتر بێت."١٠٤٣ لە مانگی دیسامردا، ئەرمەنستان بوو بە کۆماریەکی سۆڤیەت؛ کۆمیسارایای بۆلشویکی لە نەتەوەکان، جەوسف ستالین، لە بەچۆک داهێنانی ئەو کۆماریە زۆر چالاک و کارامە بوو. مانگی مارسی دواتر، گرێبەستی مسکۆ لەنێوان تورکیە و یەکیەتی سۆڤیەت لە گەڕانەوەی پارێزگاکانی تورکی کارس و ئارداهانی بۆ تورکیە جەختی کردەوە. (وتوێژکاری بۆلشویکەکان ئیستالین بوو.) هەتا ئەمرۆکەش ئەم سنوورە هەر دەوامی هێناوە.

کوردستانیش کۆتایی پێهات. لە مانگی مارسی ساڵی ١٩٢١دا هاوپەیمانان لەو بەڵێنیە نادیارانەی کە لەگرێبەستی سێڤێرس ڕایان گەیاندبوو پشتیان هەڵکرد. ئەوەندەی باسی کوردستان

دەهاتە ئاراوە، ئەوان دەیانکوت، ئەوان ئامادەن تا گرێبەستەکە بە " مانای سازان و گونجان لەگەڵ حەقیقەتە حازرەکانی دۆخەکە" چاکسازی بکەن و پێیدا بچنەوە.١٠٤٤ "حەقیقەتە حازرەکان" ئەوانەبوون کە گوایە ئاتاتورک ڕاشکاوانە ڕەخنەی لە هەمووی گرێبەستەکە دەگرت؛ ئەو بە سەرکەوتوویەوە توانیبوو بەشێک لە ناوچەکانی ئەرمەنی لەناو تورکیەدا ڕابگرێت؛ و ئەو خەریک بوو خۆی لە گرێبەستێک دەدا کە پاشماوەی ئەو ناوچانە بە یەکیەتی سۆڤیەت دەبەخشی. لەوانەبوو ئەمە دەنگی ناڕەزایەتی کوردەکانی لێ بکەوتایەتەوە، بەڵام هاوپەیمانان چیتر هیچ جۆرە بایەخێکیان بە وڵاتێکی سەربەخۆی کوردی نەدەدا.

سەقامگیری لە ناو قەدەکانی باکوور و ڕۆژهەڵاتی خۆی ئاتاتورکی والێکرد کە بتوانێ لەگەڵ هێرشی یوونانی لە ڕۆژئاوادا دانووستان بکات. لێرەشدا، ڕەوتی بەرەوپێشوەچوونی ڕووداوەکان لە بەرژەوەندی ئەودا بوو. لە مانگی نوامری ساڵی ١٩٢٠دا، شکستخواردنی ڤینزیلۆس لە هەڵبژاردنەکاندا هەموولایەک (تەنانەت خۆشی) تووشی سەرسوورمان کرد. ئەوە ڕێگای بۆ گەڕانەوەی کۆنەدوژمنی خۆی شا کۆنستانتین خۆش کرد، ئەوەش بەنۆبەی خۆی کۆتایی بە پاشماوەی سیاسەتی هاوپەیمانی لە تورکیەدا هێنا. ئیتالیا و فەڕەنسە باسیان لەسەر ئەوەبوو کە ئەوان چیتر خۆیان لە ئاست پشتگیریکردن لە یوونان بە بەرپرس نازانن و ئەوەکە گرێبەستی سیڤێرس پێویستی بە پێداچوونەوە هەیە. ئیتالیەکان ئاماژەیان بەوە دەکرد کە ئەوان خوازیاری ئەوەن کە لەگەڵ ئاتاتورک کار بکەن تا بە مەرجەکانی ئەو گرێبەستەدا بچنەوە و چاکیان بکەن.

گرێبەستەکە لە فەڕەنسەش نەناسراو بوو، شوێنێک کە لۆبی کۆلۆنیایی وەک خەیانەت بەرەنگاری ببۆوە. حکوومەتی فەڕەنسەیی، بەش بە حاڵی خۆی، نەیدەتوانی چیتر ٥٠٠ملوێن فرانک لە ساڵدا بە ناوچەی ژێردەسەڵاتی فەڕەنسە کە بەشی باشووری ئاسیای بچووک ببەخشێت- یان قەرەبووی خەسارەتەکان بکاتەوە. لە دەسپێکی ساڵی ١٩٢٠دا تورکەکان خەریکی دابینکردنی پارەی شەڕێکی کارامەی گەریلایی ڕولەگەشە بوون. تەنیا لە یەکەمین دوو حەفتەی مانگی فەوریەدا نزیک بە ٥٠٠ سەربازی فەڕەنسەیی قوربانی ئەو شەڕە بوون. گوشار خرایە سەر فەڕەنسەیەکان تا یەک بە دوای یەک پۆستەکانیان چۆڵ بکەن و ئەمە لە سووریەوە بەرەو باشور هەڕەشەی کردە سەر دەسەڵاتی ئەوان. لە مانگی ئۆکتۆبری ساڵی ١٩٢١دا، فەڕەنسە لەگەڵ حکوومەتی ئاتاتورک گرێبەستیکی واژۆکرد کە پاشکشێی هەمووی هێزەکانی فەڕەنسەیی لە سیلیسیا لە باشوری لێکەوتەوە. فەڕەنسە زێدەمافی ئابووری گیرکەوت، کەچی ئاتاتورک دەسکەوتێکی زۆر لەوەگرنگتری بە دەست هێنا- بەفەرمی ناسین لەلایەن زلهێزێکی گەورەوە. کۆرزۆن تووڕە بوو: "

دەڵێی گەڕاوینەتەوە سەر جیاوازی کۆنباوی نێوان خۆمان و فەڕەنسە- تا ڕادەی قینەبەرایەتیەکی زۆر-، هەڵگیرساو بە دەست ئامێرێک کە حکوومەتیکی سەرەڕۆ و چاپەمەنی درۆزن دەتوانن پێشنیاری بکەن."١٠٤٥

لە یوونان، گەڕانەوەی کۆنستانتین پالآوتنی ئەفسەرانی لایەنگری ڤینزیلۆس لە سووپادای لێکەوتەوە، و درووست وەک چۆن وەرزی کەمپەینی بەهاری ساڵی ١٩٢١ لە ئاسیای بچووک کرایەوە ئاڵۆزی و پشێوی لەوێ سەری هەڵدا. لەگەڵ ئەوەشدا حکوومەتی تازەی یوونان هەستی بە شانازی دەکرد کە خۆی لەپێناو ڕاگرتنی بەڵێنیەک کە بە یوونان ڕاگەیەنرابوو خستبوە زەحمەتەوە. لیۆد جۆرج، لەسەر نارەزایەتیەکانی کۆرزۆن، یوونانیەکانی بە هەزار ئیما و ئیشارە هان دا و تێگەیاند تا هێرش بکاتە سەر تورکەکان. ئەو هاوینە هێزەکانی یوونانی بۆ ناوەوەی وڵات بەرەو ئانکارا ڕۆیشتنەپێشێ، سەرکەوتنێکی هەرە مەزنی نیزامی بە پانتایی ناوچەکانی بەرەهووت و دوور لە ئاوەکاندا. ئەو دوورترین ڕادەی بەرەوپێشچوونی یوونان بوو، و لەوە زیاتر توانایی ڕاگرتن و بەرێوەبردنی نەبوو. بەدرێژایی ٤٠٠ مایلی سنوورەکانی یوونان، سەربازان هەستیان بەوەکرد کە باش سزادراون. بەهاری ساڵی دواتر وتبوویان" دەبا بگەڕێینەوە بۆ وڵاتی خۆمان و گوو بکەین بە گۆڕی ئاسیای بچووکیشدا."١٠٤٦

حکوومەتی یوونان، کە بەبێ هیچ ئاکامێک دەستەوداوێنی هاوپەیمانان ببوو و داوای پارە و پشتگری نیزامی لێکردبوون، خۆی موقناع کردبوو تا خۆ لە ئاشتیەکی دانووستان لەسەرکراو لەگەڵ تورکیە بدات و واز لە هەندێک لەو ناوچانەی کە خەریکی داگیرکردنیان بوو بهێنێت. لە مانگی ئاڤریلی ساڵی ١٩٢٢ ئاتاتورک بەرەنگاری پێشنیارێک بۆوە کە لەلایەن بەریتانیا، فەرەنسە و ئیتالیا پێشکەش کرابوو. تەنیا بە مەرجێک تورکیە ئاگربەستی قەبووڵ دەکرد کە یوونان گورجوگۆڵ هێزەکانی خۆی لە ئاسیای بچووک ئاش بەتاڵ بکردایە، شتێک کە لەباری سیاسیەوە بۆ حکوومەتی یوونانی جێبەجی نەدەکرا. لە سەرتاسەری هاویندا، ڕێبەرانی سیاسی و نیزامی یوونان دەترسان لەوە کە دواتر دەبێ چی بکەن. لە سەر سنوورەکانی بەرەی جەنگدا، سەربازانی یوونانی قاچیان چەقاندبوو و چاوەڕوان بوون.

لە ٢٦ی مانگی ئۆگستی ساڵی ١٩٢٢دا، لە ئاکامدا دژە هێرشی تورک ڕووی لە سمیرنا کرد. دەستوورەکان سادە بوون. " سەربازان، ئامانجی ئێوە مەدیتەرانەیە."١٠٤٧ هێزەکانی یوونانی هەپروون بە هەپروون بوون و لە ١٠ی مانگی سێپتامردا، ئاتاتورک بە سەرکەوتوویەوە ئەسپی بەرەو سمیرنا لینگ دا. شار لە هەڵاتووان و ئەو ئاوارانەی کە لە گوندەکانی ناوچەکانی ناوەوەی وڵاتی یوونان هاتبوون

جەمی دەهات. لە سەر شۆستەکانی بەندەر جەماوەرێکی زۆر لە هەوڵی ئەوەدابوون خۆ بگەیەننە سەر کەشتیەکان و خۆیان ڕزگار بکەن. لە دواوە لە سەر شەقامەکان و لەناو کۆڵانەکان ، ماڵبرین و کوشتوکوشتار دەستی پێکردبوو. سەربازانی داگیرکەر و تورکەکانی سمیرنا هاتبوون تا تۆڵەکانی ڕابردوو بە ئیشتیای دڵیان بستێنن. وەکوو مامۆستاکانیان لە ڕۆم، پاریس و لەندەن، نوێنەرانی زلهێزانیش ئێستا یوونانیەکانیان بە چارەنووسی خۆیانەوە سپاردبوو. کاتێکە هێزەکانی بیانی لە کەشتیەکانیانەوە سەیریان دەکرد شار خریک بوو دەبوو بە پۆلوویەک ئاگر. لەوانەیە ئاگری یەکەم بە هەڵکەوت هەڵگیرسابێت، بەڵام دواتر شایەتحاڵەکان دەیاندیت کە تورکەکان بە تەنەکەی بەنزینەوە خۆیان دەکرد بە ئاوایەکانی یوونان و ئەرمەنستاندا. ئەفسەرێکی بەریتانی گێڕابوویەوە کە " لە دوورەوە کە سەیرت دەکرد ترس و دڵەڕاوکێ دەیگرتی. دەتوانی بیخەیە بەرچاوی خۆت هاواری کەسێکی بێ دەرەتان. من لام وایە زۆر کەس بەپاڵتێوەنانی جەماوەری نزیک ماڵەکان کە لە هەوڵی ئەوەدابوو خۆیان لە ئاگرەکە دوورخەنەوە کەوتنە ناو ئاو و خنکان." ئاتاتورک بێ ئەوەی متەقی لێوەبێت سەیری بڵێسەی ئاگرەکانی دەکرد. ئەوەی بەزاری داهات ئەمەبوو" پەکوو لەو ڕووداوە سەرسووڕهێنەرە."١٠٤٨ کاتێکە ئاورەکە دامرکا، چیتر سمیرنای یوونان لە ئارادا نەبوو.

ڕووخانی سووپای یوونانی هێزە بچووکەکانی داگیرکاری هاوپەیمانی لە کۆنستانتینۆپل لێکەوتەوە و باسی پارێزگاریکردن لە بەندەرەکان کوتوپڕ هاتە ئاراوە. کاتێکە هێزەکانی ئاتاتورک بۆ باکوور بەرەو دەریای مەڕمەڕە و کۆنستانتینۆپل چوونەپێشێ، حکوومەتی بەریتانی بڕیاری دا کە پێویستە لە چاناک و ئیسمید لە بەشی ئاسیاییدا بە خۆڕاگری خۆی درێژە بدات. داوای یارمەتی لە ئیمپراتۆری عوسمانی و هاوپەیمانەکانی خۆی کرد، بەڵام لە لێبووردن و سەلۆمەکردن زیاتر چیتری پێ نەگەیشت. لە ناوچە ژێر دەسەڵاتەکان، تەنیا نیووزیلەند هاتە ژێر ئاڵاکەوە. ئیتالیەکان بەپەلە ئاتاتورکیان لە بێلایەنی خۆیان دڵنیا کردەوە. فەڕەنسەیەکان دەستووریان بە هێزەکانی خۆیان دا زوو لە چاناک بێنەدەرێ. کۆرزۆن بەپەلە خۆی گەیاندە پاریس و لەگەڵ پۆینکارە، کە لەوکاتەدا ببوە سەرەک وەزیر، بە یەکدا هەڵپڕژان، چون ئەو باسی " پشتێکردن" و " سەنگەرچۆڵکردن"ی هێنایە بەرباس. کاتێکە پۆینکارە نەڕاندی، کۆرزۆن بە چاوانی فرمێسکاویەوە لە ژوورەکە چووە دەرەوە. ئەو خۆی کرد بە باوەشی باڵوێزی بەریتانیدا: " من ناتوانم لەگەڵ ئەو پیاوە گچکە رووتاڵە هەڵبکەم." تەنیا براندیەکی توند توانی ئەو بێنێتەوە سەرخۆ تا دەست بە وتوێژگەلێک بکاتەوە کە هیچ ئاکامێکیان نەبوو.١٠٤٩

لیۆد جۆرج پشتگری لە شەڕ دەکرد، بەڵام سەرەکانی ساردوسڕتر، وەکوو هینی کۆرزۆن و هینی هێزی میلیتاری کە دەم و دەست حازربوون، بەرزبوونەوە. ئاتاورک لە ئاکامدا ئامادەبوونی خۆی بۆ

وتوێژکردن ڕاگەیاند. ئاگربەسی موودانیا لە ١١ی ئۆکتۆبردا، ڕێگەی بۆ تورکەکان خۆش کرد تا دەست بەسەر ترەیسی ڕۆژهەڵاتدا کە لە چنگ یوونانیەکاندا بوو بگرن. لە بەرانبەردا، ئاتاتورک بەڵێنی دا کە هێزەکانی خۆی بەرەو کۆنستانتینۆپل، گالیپۆلی یان ئیسمید نەباتە پێشێ هەتا کۆڕێکی ئاشتی دەتوانێت لەسەر چارەنووسی ئەوان بڕیاربدات.

لە سەرتاسەری ئاسیای بچوک و ترەیسدا یوونانیەکان وەدەر کەوتبوون، ژمارەیان زیاتر لە ملوێنێک دەبوو. دووکاندارانی یوونانی، وەرزێران، قەشەکان، پیرە پیاوان و پیرەژنان، مسوڵمانانی یوونانی، ئەو یوونانیانەی کە وشەیەک لە زمانی یوونانیان نەدەزانی، بەرێکەوت ڕوویانکردبوە وڵاتێک کە نە توانایی دابینکردنی شوێنی نیشتەجێبوونی هەبوو و نە پێخۆری تەواویشی بۆ ئەوان هەبوو. ئێرنێست هێمینگوەی لاو، لە گوزارشەکەی خۆی بۆ ڕۆژنامەی تۆرۆنتۆ، کە دەیدی سەربازانی یوونانی بەرەو ماڵەوە دەچن هێنابووی: " بەدرێژایی ڕۆژدا من چاوم پێیان دەکەوێت، سەرابزانێکی پیس و پەڵۆخ، ڕیش هاتوو، هیلاک و ماندوو، بەدرێژایی تولەڕێیەکانی سەرانسەری ناوچەگوندنشینەکانی ترەیسی قاقڕ و لێژ و هەڵەتدا دەهاتن و دەچوون.. نە دەستەیەک، نە ڕێکخراوەگەلێکی ڕزگاریبەخش، نە شوێنی حەوانەوە و هاوینەهەوار، لە پەتووی چڵکن و ئەسپێواوی، و مێشوولەی شەوانە زیاتر هیچی تری لێ نەبوو. ئەوان دوایەمین سەربەرزیەک بوون کە یوونانی ناو بوو. ئەمە کۆتایی دووهەمین گەمارۆی ئەوانە بۆ سەر ترۆی."١٠٥٠

سەرەڕۆیی یوونان لە ئاسیای بچووک تازە ڤینزیلۆسی لەسەرکار لابردبوو؛ ئێستا پارێزەری گەورەی ئەدەب و هونەری خۆی، لیۆد جۆرجی، لەناوبردبوو. قەیرانی چاناک بۆ حکوومەتێکی لەرزۆکی هاوپەیمانی یەکجار زۆر بوو. کۆرزۆن ژیرانە پشتی لە هاوکارە دێرینەکانی خۆی کرد. کاتێکە حکوومەتێکی تازەی کۆنەپارێز لەژێر دەسەڵاتی بۆنار لۆ لە مانگی نوامری ساڵی ١٩٢٢ دەسەڵاتی گرتە دەست، کۆرزۆن بۆڕایەکی تر وەک ئەمینداری دەرەوە هەڵبژێردرایەوە. ئەو خێرایەکی بەرەو لوسانێ وەڕێکەوت، شوێنیک کە ئاشتی تورکیە لەوکاتەدا دوایەمین قۆناخی جێبەجێکردنی خۆی تێدەپەڕاند.

چەند کەسێک لەوانەی کە لەوێ کۆببوونەوە پێشتر لە کۆڕی ئاشتی پاریس بەشداریان کردبوو- کۆرزۆن بۆخۆی، پۆینکارە، ڤینزیلۆسی ملکەچ، کە لەلایەن حکوومەتی تازەوە بانگێشت کرابوو تا نوێنەرایەتی یوونان بکات، ستامبۆلیسکی بۆلغارستان لەگەڵ وەرگێری دلڕفێنی هاوڕێی، تەنیا ژنی ناو کۆڕەکە. لەناویان چەند کەسێکی غەریبەش هەبوون، وەکوو مۆسۆلینی، بە پێڵاوی سپی و کراسی ڕەشەوە، لە یەکەمین کۆڕی سەرەکی جیهانی خۆیدا هەستێکی پڕ لە ترس و دڵەڕاوکێی

هەبوو، و گۆرجی چیچێرین، کۆمیسارییای کاروباری دەرەوەی سۆڤیەت، بە ڕیشی تەنک تەنکی سووررەنگ و بە" جل و بەرگێکی شڕ و کۆنەوە." لەو کاتەدا تورکیە لەلایەن ناسیۆنالیستەکانەوە نوێنەرایەتی دەکرا، لەلایەن ئینۆنۆ ئیسمیتەوە، ژەنەڕاڵێکی جێی باوەڕی ئاتاتورک، بەڕێوە دەچوو. کاتێکە هاوپەیمانان هەوڵیان دابوو حکوومەتی کۆنستانتینۆپلیس بانگێشت بکەن، ئاتاتورک بە ئاسانی دەسەڵاتی پاشایەتی هەڵوەشاندبۆوە. ئەمریکیەکان، لە حاڵەتی تازەی بێ لایەن مانەوەی خۆیان لە ئەورووپا، تەنیا چاودێرەکانیان ناردبوو: ڕیچارد چایلد، ڕۆژنامەنووسێکی ڕووخۆشی پێشوو، و جەوسف گروو، کە دواتر لە سەردەمی پیرل هاربۆردا لە تۆکیۆ بوو بە باڵوێزی ئەمریکا. گروو سەری لەو هەموو دڵڕفێنیەی کۆرزۆ سووڕ مابوو: " قەت لەماوەی ژیانمدا بە قەد ئەو ئێوارەخوانە سێ یان چوار کەسیانەی کە وادیار بوو ئەویش حەزی پێدەکردن خۆشم ڕانەبواردووە، دوا کۆکردنەوەی خوانەکە شەرابی شیرینیان بۆ دادەنایـن و ئەویش پەیتا پەیتا چیرۆک و بەسەرهاتی خۆشی بۆ دەگێڕاینەوە بەشێوازێک کە تا ئێستا کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەخۆیەوە نەدیوە."١٠٥١

زۆر شت لە لوسانێ هەبوون کە کۆرزۆنیان عاجز دەکرد: خزمەتگوزارە سەرخۆشەکەی، کە شەڵوار و کراسەکەی لێ دەشاردەوە؛ ڕاگری پشتی، کە دەشکا و بە پشتیدا هەڵدەچوو؛ بەگشتی، فەرەنسەیەکان و ئیتالیەکان، " کە لە بەرانبەر تورکەکاندا هەر خەریکی ماستاوچێتی بوون"؛ و هەڵبەت خودی تورکەکان . ئیسمیت، " پیاوێکی ڕەش پێستی کورتەباڵا، کە هەتابڵێی خوێنتاڵ و لە دڵەوەدوور بوو" کەسێک کە " زیاتر لە قەیتانفرۆش دەچوو هەتا ژەنەڕاڵێکی تورک،" و پەیتا پەیتا قسەکانی دەبڕی، خۆی کەڕ دەکرد، و بەشێوەیەکی لاسار داواکاریەکانی خۆی دووپات دەکردەوە. ئەو لەلایەن ئاتاتورکەوە هاتبوو و باش ئامۆژگاری کرابوو: تا سەبارەت بە تورکیەکی سەربەخۆ، دوور لە دەستێوەردانی دەرەوە وتوێژ بکات. وەک سەربازێکی باش ئەو حەزی دەکرد ئەو ئامۆژگاریانە ڕەچاو بکات. کۆرزۆن ڕۆژێکیان خۆی پێ نەگیراو لە ڕق هەستاویدا وتی " ئەوەندەی سەیرت دەکەم لە سندووقی مۆسیقا دەچی. ڕۆژ بە دوای ڕۆژ هەر ئەو تۆنە دووپات دەکەیتەوە ئەرێ تاکەی وەڕەزمانت کرد-سەربەرزی، سەربەرزی، سەربەرزی."کۆرزۆ تەشەری چاکی بۆ وتوێژەکەی ئیسمیت دەهاویشت. ئیسمیت شانی لێ هەڵتەکاند و بێ محەلی کرد. ئەو وتی کۆرزۆن" وەکوو منداڵانی قوتابخانە لەگەڵ ئێمە هەڵس و کەوتی کرد بەڵام ئێمە گوێمان نەدایە. ئەو وەکوو یەک لەگەڵ ئیتالیەکان و فەرەنسەیەکان هەڵس و کەوتی دەکرد." ئێوارانە کابرای تورک بە چارترووسە سەوزە کەیەوە کە زۆری کەیف لێ بوو گۆشەیەکی بەخۆ دەگرت و دەچووە دنیای خۆیەوە؛ یەکێک لەو ئەمریکیانەی کە بێ ئەقڵانە پێوەندی لەگەڵ کردبوو بڕیاری

دا بۆ هەتاهەتایە واز لە خواردنەوە بێنێت. ئەوەی زیاتر کۆرزۆنی سەبارەت بە تورکەکان ماندوو و وەڕەز دەکرد ئەوە بوو کە ئەو هەستی دەکرد لەگەڵ دوژمنێکی نەبینراو کەوتۆتە شەڕەوە. دوور لە ئانکارا، ئاتاتورک بە وردی سەیری کۆڕەکەی دەکرد و دەستوورەکانی خۆی بۆ ئیسمیت بە تێلێگراف حەواڵە دەکرد.١٠٥٢

دوا دەمەتەقەیەکی زۆر و مانگرتنێکی سەرسووڕهێنەر کە لەلایەن کۆرزۆنەوە بۆ گوشار خستنە سەر تورکەکان پلانڕێژی کرابوو، لە مانگی ژوالای ساڵی ١٩٢٣ ئاشتیەک هاتە ئاراوە. ئیسمیت، بە " ئەو هەموو بازنەیەی کە لە بەردەمی خۆیدا دەیدیت"، چرا سەوزێکی بۆ تورکیە نیشان دا تا باڵوێزی بەریتانی لە کۆنستانتیۆپل بۆ بەریتانیا دانێت. گرێبەستی لوسانێ لە ڤێرسایلێس، ترایەنان، ئستی.جێرمەین، نیوولی و سێڤێرس، وەک بەرهەمەکانی کۆڕی ئاشتی پاریس، نەدەچوو. کۆرزۆن لە وڵامدا وتبووی کە" هەتا ئێستا ئێمە گرێبەستەکانی ئاشتی خۆمان سەپاندوە. ئێستا ئێمە خەریکین وتوێژ لەسەر دانیەک لەگەڵ دوژمنێک دەکەین کە سووپای هەیە بەڵام ئێمە هیچمان بە دەستەوە نیە، قۆناخێک کە تا ئێستا بەخۆمانەوە نەدیوە."١٠٥٣

سەبارەت بە مەرجەکانی سێڤێرس شتی وا نەمابۆوە. سەبارەت بە ئەرمەنستان یان کوردستانێکی سەربەخۆ هیچ ئاماژەیەک نەکرابوو و، هەرچەند کۆرزۆن لە هەوڵی ئەوە دابوو بە ئەو گرێبەستە تازەی کە مافی پارێزگاریکردنی بە کەمینەکان دەبەخشی چەند مەرجێکی تری پێوە بلکێنێت، تورکەکان لە بواری دەسەڵاتدارێتیدا بەرەنگار بوونەوە.

ئێستا سنوورەکانی تورکیە نزیک بە هەمووی ناوچە تورکی-ئاخێوەرەکانیان لەخۆ گرتبوو، لە ڕۆژهەڵاتی ترەیسەوە بگرە بەرەو خوار تا دەگاتە سووریە. دەربەندەکان بۆ تورکەکان مانەوە، بەڵام ڕێکەوتنێکی نێونەتەوەیی بەکاری دەهێنان. کاپیتالاسیۆنە[ خۆبەدەستەوەدانە] شەرمەزارکەرەکانی پێشوو کۆتاییان پێهات. پەیماننامەی لۆزانیش بۆ مەبەستی هێنانە سەردینی حەشیمەتەکان، مسوڵمانان بۆ سەر بیروباوەری مەسیحی ڕێگای خۆش کرد. زۆربەی یوونانیەکان تازە تورکیەیان بەجێهێشتبوو؛ ئێستا بنەماڵە مسوڵمانەکان لە کرێتەوە بەرەو سنوورەکانی ئاڵبانیا بە زۆری بنەبڕ دەکران و حەواڵەی تورکیە دەکران، کۆرزۆن هۆشداری دابوو کە " ئەوە ڕێگەچارەیەکی دڕندانە و خراپە کە لە سەد ساڵی داهاتوودا جیهانیان سزایەکی قورسی بە سەردا دەسەپێنن." تەنیا کەسانێک کە، لەرێگای ڕێکەوتنێکی تایبەتەوە، لەو گواستنەوەدا قرتێندرابوون تورکەکان لە ڕۆژهەڵاتی ترەیس یوونانیەکان لە کۆنستانتیۆپل و دوو دوورگەی بچووک. کۆمەڵەکان چەقیان بەستوە و لەمێژە ماونەتەوە، بە دەست کۆمەڵێک یاسای هیچ و پووچ هەراسان کراون و وەکوو بەڵاگەردان بەکارهێنراون هەرکات کە پێوەندیەکانی نێوان یوونان و

تورکیه تووشی ئاڵۆزی بووبێت، وەک چۆن لە دەیەکانی ساڵی ١٩٦٠دا بە سەر قیبرس دا مانەوە و لە هاوینی ساڵی ١٩٩٩ بە سەر کۆزۆڤۆدا مانەوە.١٠٥٤

تەنیا کێشەی چارەسەرنەکراو لە لۆزان لەسەر موسڵ، لە باکووری عیراق، بوو. شاندی نوێنەرایەتی تورکی، لەسەر بەڵگە و بیانوویەک کە حکوومەتگەلی تورکی هەمیشە بەکاریان هێناوە، بانگەشەی بۆ دەکرد، و لەسەر ئەمەش بیانوویان دەهێنایەوە کە کوردەکان لە بنەڕەتدا تورکن. بەگشتی، وتوێژکەری سەرەکی تورک بە سەرکەوتوویەوە دەیکوت کە ئەمە قسەی من نیە و قسەی *ئینسایکلۆپیدیای بەریتانیکایە*. *کۆرزۆن*، کە لەسەر داواکاری موسڵ سوور بوو، بەهۆی نەوتەکەی ئەوێ نەوەک کوردەکانی ئەوێ، پێمل ببوو: " شاندی نوێنەرایەتی تورک بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا بۆی دەرکەوتوە کە کوردەکان لە ڕاستیدا تورکن. کەس تاکوو ئێستا ئەوەی نەزانیوە."١٠٥٥ کێشەی موسڵ لە نزیک هەڵوەشانەوەی کۆڕەکەدا هاتە بەرباس؛ هەردوو لا لەسەر ئەوە ڕێکەوتن کە ئەو باسە هەڵگرن بۆ کۆمەڵەی گەلان، ئەویش لە ساڵی ١٩٢٥دا بە عێراقی بەخشی.

کوردەکان کەوتنە ژێر دەسەڵاتی حکوومەتگەلێکی جیاوازەوە- ئاتاتورک لە تورکیە، ڕەزاشا لە ئێران، و فەیسەڵ لە عێراق- هیچ کامێکیان حازر نەبوون لەگەڵ سەربەخۆیی کوردەکان هەڵ بکەن. لەناو عێراقدا، بەریتانیەکان بۆ ماوەیەک بیرۆکەی بەڕێوەبەرایەتی جیاواز بۆ کوردەکانیان کردبوو بە بووکەشووشە و لەسەر کۆشیان هەڵیان دەپەڕاند و ئەوەشیان بە فەرمی ناسیبوو کە کوردەکان نایانەوێت لەژێر دەسەڵاتی عەرەبدا بمێننەوە. لە ئاکامدا بەریتانیەکان لایان وا مەسڵەحەت بوو کە هەر هیچ نەکەن زۆر باشترە؛ عێراق لە ساڵی ١٩٣٢دا سەربۆخۆیی بە دەست هێنا بەبێ ئەوەی هیچ مزگێنیەکی بۆ کوردەکان پێ بێت. لە تورکیە، ئاتاتورک و ناسیۆنالیستەکان لە بڕیاری پێشووی خۆیان کە جەختیان لەسەر دەکردەوە، یەکگرتووی مسوڵمانان پاشگەز بوونەوە و سەرەڕای پێناخۆشبوونی کوردەکان لەپێناو دامەزراندنی دەوڵەتێکی سێکۆلار و تورکیدا کەوتنە جموجۆڵ. زمانی پەروەردە و حکوومەت دەبوایە بە تورکی بوایە؛ لە ڕاستیدا، لەنێوان ساڵەکانی ١٩٢٣ و ١٩٩١ یەکەمجار زمانی کوردی خرایە پشت گوێ و بێ محەل کرا دواتریش نایاسایی ڕاگەیەنرا. لە ساڵی ١٩٢٧دا، وەزیری دەرەوەی تورکیە باڵوێزی بەریتانی لەوە دڵنیاکردەوە کە کوردەکان وەکوو ئەو جۆرەی ئەو باسی دەکرد " هێندیە سوورپێستەکان" ڕوو لەناوچونن؛ ئەگەر کوردەکان هەر مەیلێکی ناسیۆنالیستیان لەخۆیان نیشان بدایە، تورکیە ئەوانی وەدەر دەنا، درووست وەکوو دەردێکە بە ئەرمەنیەکان و یوونانیەکانی دابوو.١٠٥٦

کوردەکان قەت بە ئارامی و بەبێ دەنگی چارەنووسی خۆیان قەبووڵ نەکردوە، و ناسیۆنالیزمی کوردی، وەک هێزێکی لاواز لە کاتی کۆڕی ئاشتی پاریسدا، لە ماوەی ساڵانی ژێر سەرکوت و زەبر و زەختدا بەهێزتر بوو. بەڵێنیەکان لە پاریس ڕاگەیەنران و بە ئەوە یەکەمین پەیماننامەی سێڤرس بوو بە بەشێک بیرەوەریەکان و هیوا و هۆمێدەکانی کوردی. لە هاوینی ساڵی ١٩١٩دا، ڕێبەری یەکەمین زنجیرەی سەرهەڵدانەکان لە ناوچەی کوردنشیندا قورئانێکی بە سینگی سووپاکەیەوە بەستبۆوە؛ لە سەر لاپەڕەیەکی سپی بەڵێنیەکانی هاوپەیمانی نووسرابوون- یەکێک لەو چاردە خاڵەی ویلسۆنی بەسەروە بوو کە باسی گەشەی سەربەخۆیی بۆ نەتەوەکانی غەیرە-تورک دەکرد.١٠٥٧

ئیسمیت لە لۆزان گەڕایەوە تا وەک قارەمانێک بەخێرهاتنی لێبکەن، و پەیماننامەکە ئێستاش وەک گەورەترین سەرکەوتنی دیپلۆماتیکی تورکیەی پێشکەوتوو دێتە هەژمارکرن. لە پایزی ساڵی ١٩٢٣دا، دوایەمین هێزەکانی دەرەوە کۆنستانتینۆپلیان بەجێ هێشت. سوڵتان ساڵێک پێشتر چووبوە دەرێ، بە ئامبۆلانسێکی نیزامی بەریتانی لە کۆشکەکەی خۆی هاتە دەرێ و بە کەشتیەکی جەنگی بەریتانی بەرەو ماڵتا ڕفێنرا. ئەو لە هاندەران لە سان ڕیمۆ کۆچی دوایی کرد، شوێنێک کە ئەوان بەرەبەرە پارەیەکی کەم کە بۆیان مابۆوە خەرجیان کرد. تاقمێک بچووک ڕێگای گەڕانەوە بۆ تورکیەیان گرتەوە بەر؛ شازادەژنێک هۆتێلێک بەڕێوە دەبات، و شازادەیەکیش لە بەشی ئەرشیڤی کۆشکی تاپکاپی سەرقاڵی ئیش کردنە.

کۆرزۆن لە ساڵی ١٩٢٥دا کۆچی دوایی کرد، لەژێر کاری قورسدا لە کەڵک کەوتبوو. ئاتاتورک لە ساڵی ١٩٣٨دا، بە نەخۆشی سیرهۆسیسی دڵ، گیانی لە دەست دا و ئیسمیت وەک سەرەک کۆمار جێی ئەوی گرتەوە. لە ساڵی ١٩٩٣، لە حەفتاهومین ساڵی پەیماننامەی لۆزاندا، کوڕی ئیسمیت و نەوەی کوڕی کۆرزۆن تاجەگوڵیان بە یەکەوە لەسەر گۆڕی ئاتاتورک دانا.١٠٥٨

# ٣٠

# هۆڵی ئاوێنەکان

لەرۆژی یەکشەممەی ٤ی مانگی مەی ساڵی ١٩١٩دا، شۆڕای چوار یار، دوا سەپاندنی دوایەمین گۆڕانکاریەکان، دەستووری دا تا پەیماننامەی ئەڵمانی بچێتە ژێر چاپەوە. لیۆد جۆرج چوو بۆ فۆنتانیبلوو بۆمەبەستی سەیرانێک، کەسانی تر چوون بۆ پشوودان. دوو رۆژ دواتر، دانیشتنێکی گشتی نائاسایی بەڕێوەچوو تا سەبارەت بە مەرجەکان دەنگ بدەن. چون چاپی کۆتایی ئامادە نەبوو، نوێنەرەکان دەبوایە گوێیان بۆ ئاندرێ تاردیۆ شل کردایە تا کورتەیەکی دووروودرێژی بە زمانی فەرەنسەیی بخوێندایەتەوە؛ زۆربەی ئینگلیزی-ئاخێوەران خەوەنۆچکە بردبوونیەوە. هێنری ویلسۆن لە یاداشتنامەکەی خۆیدا نووسیبوو کە "کەوایە ئێمە هاتووین تا مەرجەکان بدەین بە دەست بۆچێز بەبێ ئەوەی خۆمان لەپێشدا خوێندبێتمانەوە. من پێم وایە شتی وا لە مێژوودا رووی نەداوە." پۆرتەغاڵیەکان گلەییان دەکرد کە گوایە وڵاتی ئەوان هیچ قەرەبوویەکی پێ نەبڕاوە؛ چینیەکان بەو بەندانەی کە زێدەمافی ئەڵمانیان لە چین بە ژاپۆن دەبەخشی ناڕازی بوون؛ و نوێنەری ئیتالی ئاماژەی بەوەکرد کە هاوکارەکانی لەوانەیە سەبارەت بەو بەندانەی کە لە نەبوونی ئەواندا بڕیاریان لەسەر درابوو شتێکیان بۆ کوتن پێبێت. دواتر، هەمووڵایەک سەرسام مان کاتێکە مارشاڵ فۆچ داوای لێکردن کە گوێ بیستی بن. ئەو بۆ دواجار تکای لێکردن کە چۆمی ڕاین لەنێوان فەرەنسە و ئەڵماندا بکەن بە بەربەستێک. کلیمینجوو بە تووڕەیەوە داوای کرد کە لەبەرچی ئەو وا بیردەکاتەوە. فۆچ لە وڵامدا وتی کە "سی ئیتەیت پاور فەیەری ئایسی ئا ماکانشنس." ("لەبەر ئەوە کە ویژدانی خۆم ئاسوودە کەم.") ئەو بۆ *نیۆیۆرک تایمزی* نووسیبوو: " لەبیرتان نەچێ، کەرەتێکی تر ئەڵمانیەکان هەڵە ناکەن. ئەوان خۆدەکەن بەناو باکووری فەرەنسەدا و دەست بەسەر بەندەرەکانی چانێلدا وەک

بنکەیەک بۆ ئۆپەراسیۆنەکانی خۆیان دژ بە ئینگەلترا دەگرن." لەوانەیە بڵێین بەختەوەرانە ئەوە نەمابوو کاتێکە هیتلێر بیست ساڵ دواتر درووست هەرهەمان شتی کردبوو.١٠٥٩

هەڕەشەکانی فۆچ ئاشتیکەرانی ئازار نەدا. فرانسیس ستێڤێنسۆن لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە " پێدەچێ هەموولایەک بە مەرجەکانی ئاشتی خۆشحاڵ بن و هەست بە هیچ ناتەواویەک ناکرێ تێیاندا چون زۆر توند و سەخت نین." ویلسۆن بە شانازیەوە سەیری پەیماننامەی چاپکراوی دەکرد: " هیوادارم لەوماوەی کە لە ژیانمدا ماوە کاتی ئەوەم هەبێ کە ئەم بەرگە بەگشتی بخوێنمەوە. ئێمە توانیومانە لە کەمترین کاتدا گەورەترین کارێک کە لە ئاستی توانایی چوارکەس دێت بکەین." کلیمینجوو خۆشحاڵ بوو. " لە هەر حاڵدا، ئەمە ئەوەیە کە دەبێ ببێ؛ بەگشتی ئەمە بەرهەمی مرۆڤە و، بۆیە دەتوانین بڵێین کارێکی تەواو نیە. ئەوەی لە دەستمان هات بۆ خێرا جێبەجێکردنی کارەکە کردمان." کاتێکە ویلسۆن لە ئەو پرسیاری کرد کە ئایا ئەوان بۆیان هەیە لە دانیشتنەکەیان لەگەڵ ئەڵمانیەکان کڵاو بکەنە سەریان، کابرای پیر لە وڵامدا وتی: "بەڵێ، کەڵاو لەگەڵ پەڕ."١٠٦٠

لە ڤێرسایلێس، لە هۆتێلی سارد و دڵتەنگی دیس ڕیزیرڤۆیرس، نوێنەرانی ئەڵمان، کە ژمارەیان دەگەیشتە ١٨٠ پسپۆڕ، دیپلۆمات، ئەمیندار و ڕۆژنامەنووس، بە تاسەوتینێکی سەیرەوە چاوەڕوان بوون. وەک چاودێرێکی ئەمریکی هۆشداری دابوو ئەوان لە" چوارچێوەیەکی زەینی ترساو و نائاساییدا"، لە ٢٨ی مانگی ئاڤریل لە بەرلینەوە دەستیان بە سەفەرەکەیان کردبوو و دڵنیا بوون لەوە کە وەکوو پارایەکان[pariahs] هەڵس و کەوتیان لەگەڵ دەکرێت؛ هەڵس و کەوتێکە لە فەڕەنسە لەگەڵیان کرا زۆری دڵتەنگ کردن. کاتێکە ئەوان گەیشتنە ناوچە جەنگیەکان فەڕەنسەیەکان شەمەندەفەڕەکانی ئەوانیان هێواش کردبوو؛ ئەڵمانیەک وتبووی کە ئەوە " کۆستێک بگرە وێشوومەیەکی گەورەیە. کەوایە بەرپرسی سەرەکی ئەم چوار ساڵ و نیو شەڕ و هەرایە خۆمانین و بەس." کاتێکە ڕۆژێک دواتر گەیشتنە بەرەوە بەخێرایەکی زوو سواری پاسەکان کرابوون و لەژێر چاودێریەکی قورسدا حەواڵەی جێرسایلێس کرابوون؛ دوو لە هەر تەشریفاتێک باروبنەکەیان خرابوە ناو حەوشەی هۆتێلەکە و بەبێ ڕێزیەوە پێیان وترابوو کە لەگەڵ خۆیان بیانبەنە ژوورەوە. خودی هۆتێلەکە شوێنێک بوو کە ڕێبەرانی فەڕەنسەیی لە ساڵی ١٨٧١دا مابوونەوە و لەگەڵ بیسمارک وتوێژیان کردبوو. فەڕەنسەیەکان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە لەوکاتەدا بۆ مەبەستی پاراستنی گیانی ئەڵمانیەکان دەوروبەری ئەو هۆتێلە بە حەسار گیرابوو. ئەڵمانیەکان گلەییان دەکرد کە گوایە ئەوان وەکوو " دانیشتوانی گوندێکی نێگرۆ هەڵس و کەوتیان لەگەڵ کراوە."١٠٦١

ڕێبەری شاندەکە وەزیری دەرەوەی ئەڵمان، ئۆلریچ ڤان بروکدۆرف-رانتزۆ، بوو. ئەو هەڵبژاردەیەکی ئاشکرا بوو. ئەو لە کاروباری دیپلۆماتیکی ئیمپراتۆری کۆندا خزمەتیکی بەرچاوی لەخۆی نیشان دابوو، بەڵام بە پێچەوانەی زۆربەی هاوکارەکانی خۆی، ئەو دەستووری تازەی قەبووڵ کردبوو و لەگەڵ ئەو سوسیالیستانەی کە تازە دەسەڵاتیان گرتبوە دەست پێوەندی باشی دامەزراندبوو. ئەو لە کاتی شەڕدا بە توندی ڕەخنەی لە سیاسەتەکانی ئەڵمانیا دەگرت و لەسەر دانووستانێکی ئاشتیانە پێداگری دەکرد. بێجگە لەوانە ئەو هەڵبژاردەیەکی خراپ بوو. لەڕێکی خۆبەزلزان، یەک چاویلکە لەچاو، بەڕواڵەت دوور لە هەر تاوان و گوناهێک، دەتکوت تازە لە بارەگای قەیسەر هاتۆتەدەرێ. (لەڕاستیدا، برا دوانەکەی ملک و ماڵاتی قەیسەری بەڕێوەدەبرد.) بنەماڵەک ناسراو و دێرین بوو: ڕانتزۆس لە دانیمارک؛ ئەڵمانیا؛ تەنانەت، لە سەدەی حەڤدەهەمیشدا، لە فەڕەنسە خزمەتی کردبوو. دەنگۆی ئەوە هەبوو کە مارشاڵ ڕۆنتزۆیەک باوکی ڕاستەقینەی لویسی XIV بوویێت. کاتێکە ئەفسەرەکە سەبارەت بەوە لە برۆکدروف-رانتزو پرسیاری کرد، کۆنت لە وڵامدا وتی: " ئەها بەڵی، لە بنەماڵەی مندا لە ماوەی سێ سەد ساڵی ڕابردوودا باربۆنەکان وەکوو زۆڵ و حەرامزادە سەیر کراون." ئەو قسەخۆش، دڵڕەق و حولحولی بوو، و زۆربەی خەڵک لێی دەترسان. ئەو تا ڕادەیەکی یەکجار زۆر حەزی لە شامپاین و براندی بوو. سەرۆکی ڕاسپێردراوی نیزامی بەریتانیا لە بەرلین لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە ئەو مادەی سڕکەری دەکێشا.١٠٦٢

وەکوو زۆربەی هاووڵاتیانی خۆی لە ساڵی ١٩١٩دا، براکدۆرف-ڕانتزوو بە ئەمریکیەکان ئیمانی بەستبوو. ئەو لای وابوو کە، لە درێژخایەندا، وڵاتەیەکگرتوەکان هەست بەوە دەکات کە بەرژەوەندیەکانی ئابووری یان سیاسی ئەو وڵاتە خۆیان لە ئەڵمانێکی بووژاوەدا دەدۆزنەوە. ڕەنگە باشتر وابێت هەردووکیان لەگەڵ بەریتانیا، یان تەنانەت فەڕەنسە بۆ بەربەستکردنی بۆلشویزم لە ڕۆژهەڵات پێکەوە خەبات بکەن. و ئەگەر بەریتانیەکان و ئەمریکیەکان پشتیان هەڵبکردایە، چۆن زۆر شیمانەی ئەوەیان لێدەکرا، وڵاتەیەکگرتوەکان گرنگیەکی تایبەتی بە ڕاکێشانی ئەڵمانیای بەهێز بۆ لای خۆی دەدا. وەکوو زۆربەی هەرەزۆری ئەڵمانیەکان، برۆکدروف-ڕانتزۆف لای وابوو سەرەک ویلسۆن لەوە دڵنیا دەبێت کە مەرجەکانی ئاشتی نەرم و دوور لە هەر زەخت و زۆرێک دەبن. بەگشتی، ئەڵمانیا وەک خودی ویلسۆن پێشنیاری کردبوو ئەو کارەی کردبوو و ببوو بە کۆماری. هەر ئەوە تەنیا خۆی نیاز پاکی ئەو وڵاتەی دەگەیاند.

زۆربەی ئەڵمانیەکان لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە وڵاتەکەی ئەوان بەو قەناعەتە گەیشتوە چارەد خاڵەکە دەبێ بە بنەمای گرێبەستی ئاشتی. ئەلیس درێسل، دیپلۆماتی نێردراوی

ئەمریکی بۆ بەرلین، لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە " خەڵکیان هێنابوە سەر ئەم باوەڕە کە ئەڵمانیا بەداخەوە لە شەڕێکی قورسدا بەتەواوەتی تێکشکێنراوە، بەهۆی کاریگەری خراپی بلۆکەیەک لەسەر ڕەوشتبەرزی وڵات، و ڕەنگە هەندێک پلانی دووردەستی ڕێبەرانی ئەو وڵاتە، بەڵام ئەوە بەخۆشحاڵییەوە سەرەک ویلسۆن دەکرا دەستەوەداوێنی بوایەتەوە، و دانووستانێکی ئاشتیانەی دادەمەزراند کە بەردڵی ئەڵمانیا بوایە." گومان لەوەدا نیە کە وڵات دەبوایە هەندێک لە خەسارەتەکانی بدایەتەوە، بەڵام سەدبارەت بە خەرج و مەخارجی شەڕ هیچی لە سەر شان نەبوو. دبوو بە ئەندامێک لە کۆمەڵەی گەلاندا. کۆلۆنیەکانی خۆی ڕادەگرت. و یاسای خود-موختاری لە بەرژەوەندی ئەو وڵاتەدا کاری دەکرد. باشتر وایە ڕێگە بە ئوتریشی ئەڵمان بدریێ تا بۆخۆی بڕیار بدات کە ئایا پێوەندی بە ئامۆزاکانی ئەڵمانیا بگرێت یان نا. هەڵبەت ناوچەکانی ئەڵمانی-ئاخێوەر لە پڕاشا و سیلیسیای ڕۆژئاوا، هەر ئەڵمانی دەمانەوە. لە ئالساسی-لۆرەین، ئەو ناوچانەی کە زۆربەیان ئەڵمانی بوون ئەوانیش دەیانتوانی سەبارەت بە داهاتووی خۆیان دەنگ بدەن.١٠٦٣

لە یەکەمین مانگەکانی ئاشتیدا ئەڵمانیەکان وەک کەڵەکی ڕزگارکەر پڕیان کرد بە چاردە خاڵەکەدا، بەبێ ئەوەی لەوە تێبگەن کە سەرکەوتوانی ئەوان لەوانەیە بۆچوونێکی هاوچەشنیان نەبێت. زۆربەی نیشانە گرنگەکان - قەیسەر، سووپا، بۆرۆکراسی- لەناوچووبوون. ئەوە ترس و هیوایەکی ناسەقامگیری لەگەڵ خۆی بە دیاری هێنا. وڵات تەمەنی لە پەنجا ساڵ کەمتر نەبوو؛ بۆ دەبێ باشتر وابێت کە دریژەی بە ژیانی خۆی بدات؟ باڤاریەکان، و هەروەها خاوەن زەوی و زارەکانی نزیک چۆمی ڕاین، بیریان لە سەرلەنوێ بەدەستهێنانەوەی سەربەخۆییەک دەکرد کە لە ساڵی ١٨٧٠دا دۆڕاندبوویان، ئەوکاتەی کە ئەڵمانیا درووست ببوو. لە ناوچە دووردەستەکانی بەشی چەپی وڵات، شۆڕشگێڕان خەونی شۆڕشێکی تری ڕووسییان دەدی و بۆ ماوەیەک، چون سەرهەڵدانەکان بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو لە یەک دوو شار هەڵگیرسابوون، لەوەدەچوو کە ئەوان بتوانن بە ئاواتەکانی خۆیان بگەن. تووماس مەن باسی لە کۆتایی هاتنی شارستانیەت هاوڕێ لەگەڵ شتێک نزیک بە بووژانەوە دەکرد. پارتە سیاسیەکان لە هەموو قوژبنێکەوە کەوتبوونە شلپ و کوت و لە هەوڵی ئەوەدا بوون تا سەرلەنوێ خۆیان بناسێننەوە. ترسێک هەمووی وڵاتی داگرتبوو کە گوایە کۆمەڵگای ئەڵمانیا کۆتایی پێهاتوە؛ ئیستاندارده کۆنەکانی ڕەوشتبەرزی هەڵوەشابوونەوە. لەگەڵ ئەمانەشدا هەستێکی کەمتەرخەم بوون سەبارەت بە داهاتوو، بەتایبەت داهاتوویەک کە خەریک بوو لە پاریس لە کڵ دەردەهات، باڵی بەسەر وڵاتدا کێشابوو. بەبۆچوونی درێسێل " خەڵک بەگشتی

سەبارەت بەو پرسانەی کە پێوەندیان بە ئاشتیەوە هەیە زۆر گوێنەدەر و کەمتەرخەمن. لە هەموو شوێنێک هەست بەوە دەکرێت کە گۆڕوتینێکی گشتی بۆ لەبیرکردنی کێشەیەک کە لەکاتی ڕابواردن و خۆشی دا هاتە ئاراوە لە ئارادایە. تئاترەکان، هۆڵەکانی سەماکردن، ژوورەکانی قومارکردن، و شوێنەکانی پێشبڕکێ سابقەی نەبوە ئەوەندە قەرەباڵغ بووبێتن." لێکۆڵێنەرێکی ناوداری ئەڵمانی وڵاتی خەون و خەیاڵی سەردەمی ئاگربەستی" وەبیری خەڵک دەهێنایەوە.١٠٦٤

چەند ئەڵمانیەک بیرکردنەوە لەو ڕووداوانەی کە لە سەردەمی چاوەڕوانکردن لە پاریس هاتبوونە ئاراوە کردبوو بە پیشە. دایرەی دەرەوە لەسەر چاپەمەنیەکانی هاوپەیمانانی دەکۆڵیەوە، دەگەڕا بەدوای نانەوەی دووبەرەکی لەنێوان سەرکەوتوان دا. هەندێک پێوەندی ڕاستەوخۆ لەگەڵ هاوپەیمانان هاتبوونە ئاراوە، لە وتوێژەکاندا باسی لابردنی بۆلکەکان یان باسی مەرجەکانی ئاگربەست کرابوون. هەرتاوناتاوێک نوێنەرانی ئەڵمانی باسی کێشەی گەورەتریان دەکرد. ئەفسەرێکی دەزگای سیخۆری ئەمریکی، کۆلۆنێل ئارتۆر کۆنگێر، ئەوەی گەیاند کە گوایە ئەو لە پاریس بەدوای دەسەڵاتێکی بەرزترەوەیە. کۆنگێر وەک دەرچوویەکی پسپۆڕ لەبواری زمان و وێژەی ڕۆمان و یوونانی کۆن، بیروباوەڕەکانی ئایینی و مووزیکی ڕۆژهەڵات، سەبارەت بە ئالۆزیەکانی نێوان ئەمریکیەکان و فەڕەنسەیەکان لەسەر ئاگربەست قسەی بۆ هاوتا ئەڵمانیەکانی خۆی کردبوو و ئەوانی دڵنیاکردبۆوە کە ویلسۆن دژ بە داواکاریە لەڕادەبەدەرەکانی فەڕەنسەیی دەوەستێت. هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ئامۆژگاریەکی باشی ئەڵمانیەکان کردبوو. ئەگەر ئەوان دەیانەوێت یاسای بنەڕەتی تازە دامەزرێنن و بە سەرەک کۆمار دەسەڵاتی ئەوتۆ ببەخشن باشتر وایە مۆدێلی ئەمریکی ڕەچاو بکەن. دایرەی دەرەوەی ئەڵمانیا دەستبەجێ ئەمەی خستە بەردەم گەڵاڵەدارێژەرانی ئەوەی کە دواتر ناوی یاسای بنەڕەتی ویماری لێنرا. لە مانگی مارسی ساڵی ١٩١٩دا، پرۆفیسۆر ئیمیل هاگۆنین، وەک دیپلۆماتێکی پلە-خوار دەهاتە بەرچاو بەڵام لە ڕاستیدا سەرۆکی خزمەتی نهێنی فەڕەنسە لە سویس بوو، لە بەرلین چەند وتوێژی نهێنی لەگەڵ کەسایەتیە ناودارەکانی ئەڵمانیای بەڕێوەبرد. ئەو هەستێکی چەواشەکەری پاش خۆی بەجێهێشت کە گوایە فەڕەنسەیەکان ئامادەیی ئەوەیان هەیە تا لەسەر سیلیسیا و قەرەبووەکان میانڕەو بن بەمەرجێک کە ئەڵمانیا بە دەسەڵاتداریێتی فەڕەنسەیەکان بەسەر کانزاکانی سائێر و داگیرکاری ڕاینلەند قایل بێت.

حکوومەتی ئەڵمانی هەوڵی دا تا لەو جۆرە پیاوانە وەک پەیامهێنەر کەڵکیان لێ وەرگرێت. کاتێکە لە مانگی ئاڤریلی ساڵی ١٩١٩ درێسێلی ئەمریکی بە برۆکدۆرف-ڕانتزووی ڕاگەیاند کە پێویستە ئەڵمانیا دەسەڵاتداریێتی فەڕەنسە بەسەر سائیر و شارێکی ئازادکراو لە دانزینگ قەبووڵ

بکات، ئەڵمانیەکان تەقانەوە. " بە هیچ لەونێک ئەمن حازر نیم گرێبەستی ئاشتی واژۆ بکەم." ئەو لە درێژەی قسەکانیدا ئاماژەی بە شتێک کرد کە لەوکاتەدا هەڕەشەیەکی ناسراو بوو: " من لام وایە ئەگەر ئاتتتێ پێداگری لەسەر ئەم کەش و هەوایە بکردایە، بۆلشویزم لە ئەڵمانیا بەرگری لێنەدەکرا." وەکوو کەسانیتر لە ئورووپا لە ساڵی ۱۹۱۹دا، ئەڵمانیەکان دیۆەزمەی شۆڕشیان وەک ئامرازێک بۆ گوشار خستنەسەر ئاشتیکەران بەکەڵک زانی. بەڵگەکان ئەوە دەسەلمێنن کە گوایە حکوومەتی ئەڵمانیا بۆخۆی هەڕەشەکەی بە هەند وەرنەگرتوە.۱۰۶۵

ئەوەی کە بە هەندی وەرگرتبوو ئامادەکاریەکانی ئەو حکوومەتە بوو بۆ پێکهێنانی کۆڕێکی ئاشتی چاوەڕوانکراو لەگەڵ هاوپەیمانان. لە مانگی نوامری ساڵی ۱۹۱۸دا، حکوومەت ئاژانسێکی تایبەتی ئاشتی دامەزراند کە سەرتاسەری ئەو زستانە خۆیان خستبوە زەحمەتەوە و کۆگایەکی گەورە لە توێژینەوە، نەخشە، یاداشتنامە، بەڵگە و دژە بەڵگەیان بۆ نوێنەرانی ئەڵمانیا درووست کردبوو تا لە کاتی خۆیادا بەکاریان بێنن. کاتێکە شەمەندەفەڕەکانی تایبەت بەرەو ڤێرسایلێ خولێربوونەوە، ئەوان هەڵگری سندووقگەلێکی داپێچراو بوون کە بە کەرەسەگەلی تایبەت بۆ وتویژکردن خنەدرابوون کە ئەڵمانیا هەرگیز بەخۆیەوە نەدیبوو.

هەتا ئەڵمانیەکان زیاتر لە ڤێرسایلێس دەمانەوە چالاکی و تێکۆشانیان بەگوڕتر و توندتر دەبوو. چون ئەوان لەوەدڵنیابوون کە فەڕەنسەیەکان خەریک بوون بەدزیەوە گوێیان شل دەکرد، هەمووی کۆڕوکۆبوونەوەکانی ئەوان هاوڕێ لەگەڵ مۆسیقا بەڕێوە دەچوو، یەک بە دوای یەک نوێنەران نۆبەیان دەکرد و یەکێک لە ڕاپسۆدیەکانی مەجاری یان " پیلگریم ئاف کۆرس"یان لە *تانهاسورەوە* دەژەنی یان گرامافۆنگەلێکیان هەڵدەکرد کە بەشێوەیەکی تایبەت لە بەرلینەوە هاتبوون. لە چوارچێوەی ئەڵمانیای تازە دیمۆکراتدا، ئەندامانی شاندەکە لەسەر سفرەی دووردرێژدا پێکەوە ژمەکانیان دەکرد، دەربەگەکان لە پەنای سوسیالیستەکانی چێنی کرێکاردا دانیشتبوون، ژەنەڕاڵەکان لە تەنیشت پرۆفیسۆرەکانەوە بوون. ئەوان هاتبوون تا هەرهەموویان پێکەوە ڕۆژی مەی بکەن بە جەژن. چاپەمەنی فەڕنسە هەڵگری گوزارشگەلێکی سەیر و تۆقێنەر بوون: ئەڵمانیەکان بە تەغار پرتەقاڵیان دەخوارد؛ ئەوان داوای شەکری زۆریان دەکرد.۱۰۶۶

لە دەرەوەی هۆتێلەکە، جەماوەرێکی لاپرسەن لە فەڕەنسەیەکان چاوەڕوان بوون تا چاویان بە دوژمن بکەوێت. جارجارە دەیانپڕماند و فیکەیان دەکرد، بەڵام بەگشتی ئەوان بێ دەنگ و تەنانەت هاوڕێ و دۆستیش بوون. ئەڵمانیەکان بەو سەیارانەی کە لەلایەن فەڕەنسەیەکانەوە ئامادەکرابوون بۆ گەشت و سەیران چوونە دەرەوە بۆ دووکانەکان لە ڤێرسایلێس یان بۆناوخۆی وڵات. ئەوان لە پارکی

ترایانانـدا پیاسـەیان دەکـرد. ئەنـدامێکی دایـرەی دەرەوە بـۆ خێزانەکـەی خـۆی نووسـیبوو کـە " دارەکۆنـەکانی مـەگنۆلیاس و سـێوە سـەحرایەکان تـەواو گوڵیـان کـردوە و بـەو زوانـەش گوڵـە ئەرخەوانیەکان و یاسەکان دەپشکوێن." چۆلەکەکان، فیسقەکان، ڕیشۆڵیەکان پیاو لە دیتنیان سەری سووڕدەما. " بـەڵام لـە پشت هـەمووی ئـەم خۆشەویستیەوە سێبەری چارەنووس، وادیارە ڕووی لـە ئێمەکردوە، و هەتادێت و لێمان نزیک دەبێتەوە ڕەش و ڕەشتر دەنوێنێت."١٠٦٧

* * * *

لە ئاکامدا، دوائەوەی کە ئەڵمانیەکان لە ماوەی حەفتەیەکدا خۆیان گەیاندە ڤێرسایلێس، لە هۆتێل پالاسی ترایانان بانگێشت کردن بۆ کۆبوونەوەیەک ڕاگەیەنرا. لـە حەوتی مـانگی مەیدا (ساڵیادی، ڕەنگە بەرێکەوت بووبێت، نـوقم بوونی *لۆسیتانیا*) هاوپەیمانان مەرجەکانی ئاشتیان پێشکەش دەکرد. ئەڵمانیەکان دوو حەفتە مۆڵەتیان هەبوو تا بۆچوونەکانی خۆیان بەشێوەی نووسراوە پێشکەش بکەن. ئەو شەوە تا درەنگانێک، هەتا دووی نیوەشەو، و دووبارە بەیانی ڕۆژی دواتر هۆتێل دیس ڕیزێرڤۆیرس لە مشتومڕەکانی تایبەت بە چۆن هەڵس و کەوتکردنی نوێنەرانی ئـەڵمانی دەزرینگایەوە. برۆکدۆرف-ڕانتزۆ، کـە دەبـوو بـە وتـەبێژی سـەرەکی، سـوور بـوو لەسـەر ئـەوە کـە هەڵنەستێتە سـەرپێ؛ ئـەو لـە ڕۆژنامـەکانی فەڕەنسەیی ژووری کۆبوونەوەکە دایەگرامگـەلێکی دیبـوو کە ئاماژەیان دەکرد بۆ ئەو کورسیانەی کە بۆ ئەڵمانیەکان وەک حەوزی پاپۆڕی زینـدانیان خرابوونە لاوە. لـەوە دژوارتر بڕیاردان لەسەر ئەوە بـوو کـە ئـەو دەبێ چی بڵێت. ڕەنگە ئەمە تـەنیا دەرفەتێک بووبێت کـە ئـەو دەیتـوانی ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی ئاشتیکەران قسەبکات. شاندەکە تازە چەندین ڕەشنووسی یـەک بە دوای یەکی بۆ وتارەکان ئامادە کردبوو. کاتێکە برۆکدۆرف-ڕانتزۆ لە ٧ی مانگی مەیدا لەناو پارکەکەدا سەیارەی لێدەخوڕێ، دوو تێکستی لەگەڵ خۆی پێبوو، یەکیان زۆر کورت و بێ لایەن، ئەوی تریان زۆر درێژ و داکۆکیکەر. ئەو بڕیاری نەدابوو کە لە کامیان دەبێ کەڵک وەرگرێت.١٠٦٨

ژوورەکـە ئامـادەکرابوو: نوێنـەران لـە هـەمووی نەتەوەکانـەوە، ئەمینـداران، ژەنەڕاڵـەکان، ئەدمیراڵـەکان، ڕۆژنامەنووسـان هەرهـەموویان هـاتبوون. ڕۆژنامـە نووسـێکی ئـەڵمانی وتبـووی کـە" لـەنێوان ڕەگـەزەکانی جیهانـدا تـەنیا هێندیـەکان و ئوتریشیە ڕەسـەنەکان شـوێنیان چۆڵ بـوو. هـەموو شـێوەڕەنگ پێستێکی لێبـوو: زەردی هـەرە کـەم ڕەنـگ، قـاوەیی قاوەڕەنـگ، ڕەشـی قـەتران." لـە ناوەڕاستی ژوورەکەدا، ڕوبەڕووی زلهێزەکـان، مێزێکـی گـەورە بـوو کـە بـۆ ئەڵمانیـەکان دانـدرابوو. کاتێکە ئەوان هاتنەژووری هەمووی چاوەکان لە درگاکە برابوو، "قەیافەی پەشۆکاو و داگیراو." شایەتحاڵێک وتبووی کە برۆکدۆرف-ڕانتزۆ "لە نەخۆش، ڕەنگ پەڕیوو و تـوورە دەچو." و تـەواوی

کیانی سەر ئارەق کەوتبوو. کورتە نیگەرانیەک باڵی بەسەر هەستی جەماوەردا داگرت و دوایی، وەک ڕیزگرتنێک لە جیهانی بزربووی ساڵی ١٩١٤، جەماوەر هەستایە سەرپێ. براکدۆرف-ڕاتزۆ و کلیمینجوو کرنۆشیان بۆ یەکتر برد.١٠٦٩

کلیمینجوو دەستی کرد بە داوا یاسایەکان. ئەو لەسەرخۆ قسەی کرد بێ ئەوەی بچووکترین دڵەڕاوکێی لە دڵ دابێت، و پووختەی سەردێڕە سەرەکیەکانی پەیماننامەکەی پێشکەش کرد. ئەو بە ئەڵمانیەکانی ڕاگەیاند کە " کاتی ئەوە هاتوە تاکوو ئێمە ئەو ئەرکە قورسەی کە لەسەر شانمانە بیهێنینە دی. ئێوە داوای ئاشتیتان لە ئێمە کردبوو. ئێمە لێرەدا هاتووینەتە خزمەتان تا ئەو ئەرکە بۆ ئێوە بەجێ بێنین." یەکێک لە نوێنەرانی ئەڵمانی وتبووی کە ئەو وتەکانی دەهاویشتە دەرەوە " وادیاربوو تووڕەی و گرژیان پێوە دیاربوو، و....هەر لە سەرەتاوە، بۆ ئەڵمانیەکان، هیچ ولامێکی نەهێشتبۆوە." کاتێکە وەرگێڕان کۆتاییان بە چاپە ئینگلیزی و فەڕەنسیەکان هێنا، کلیمینجوو پرسیاری کرد کە ئایا کەسێکی تر قسەیەکی بۆ وتن هەیە. براکدۆرف-ڕانتزۆ دەستی هەڵێنا..١٠٧٠

ئەو وتارە دووردرێژەکەی هەڵبژارد. هەرچەند ئاماژەی بە زۆر شتی قایلکارانە کرد، ناکارامەبوونی وەرگێڕەکانی، بڕیارەکەی خۆی لەسەر ئەوە کە دەبێ بمێنێتەوە و دەنگی زیقن و ناخۆشی ئەو هەستێکی ناخۆش و تۆقێنەری پاش خۆی بەجێ هێشت. کلیمینجوو لە ڕقی خۆی سوور هەڵگەڕا. لیۆد جۆرج کارت کاگەزیە ڕەنگ عاجەکەی دەستی دوولەت کرد. ئەو دواتر بۆ خەڵکی گێڕابۆوە کە بۆ یەکەمین جار هەستی بە ڕق و نەفرەتێک کرد کە فەڕەنسیەکان سەبارەت بە ئەڵمانیەکان لەخۆیان نیشان دابوو. ویلسۆن وتبووی کە " ئەمە ناخۆشترین وتارێکە کە تاکوو ئێستا بە گوێی خۆم بیستوومە. بەڕاستی ئەڵمانیەکان خەڵکێکی گەوجن. هەمیشە هەڵەکاریان کردوە." لیۆد جۆرجیش لەسەر ئەو باوەڕە بوو: " بەڕاستی حەیف بۆ ئەوە کە ڕێگەی قسەکردنمان پێدا." تەنیا بالفۆر، بێ لایەن وەک جاران، لەو ڕق و تووڕەییە بێ بەش بوو. ئەو بۆ نیکۆلسۆنی گێڕابۆوە کە سەرنجی هەڵس و کەتی براکدۆرف-ڕانتزۆی نەدابوو. " من عادەتم وایە کاتێکە کەسێک تووشی تووڕەیی و پەشۆکاوی هاتوە هەر سەیری نەکەم." کاتێکە ئەو هۆتێلی ترایانان پالاسی چۆڵ کرد، براکدۆرف-ڕاتزۆ بۆ ساتێک لەسەر پیپلیکانەکان وەستا و وەک نە بای دیبێ و نە بۆران جگەرەیەکی داگیرساند. تەنیا کەسانێک کە لە ئەوەوە نزیک بوون سەرنجیان دابوو کە لێوەکانی خەریک بوون دەلەرینەوە.١٠٧١

لە دواوە لە هۆتێلەکەیاندا، ئەڵمانیەکان کەوتبوون بەسەر کۆپلەکانی گرێبەستەکەیاندا. بەشە جیاجیاکان لەت و پەت کران و دران بە دەست تیمەکانی وەرگێڕانەوە. لە بەیانیدا، چاپێکی ئەڵمانی

هاتبوە دەرەوە و حەواڵەکرابوو. نوێنەرێک بە ئاماژە بە خاڵە سەرەکیەکان تەلەفوونێکی بۆ بەرلین کردبوو: " حەوزی ڕووباری سەئر...پۆڵەندا، سیلیسیا، ئۆپێلن...١٢٣میلیارد خەرج هەڵدەگرێت و لەبەرانبەر هەمووی ئەمانەدا پێدەچێت ئێمە بڵێین ' زۆر سپاس.' ئەو ئەوەندە بەرز قسەی دەکرد کە خزمەتگوزاری نهێنی فەڕەنسە زۆر بە کەمی دەیتوانی سەر لە وشەکان دەربێنێت. کاتێکە ئەڵمانیەکان لە نیوەشەودا بۆ ژەمێکی بەپەلە لە دەوری یەک کۆبوونەوە، ژووری نانخواردن بە دەربڕینی بۆچوونگەلی جیاواز هەر گیزەگیزی دەهات: "گشت کۆلۆنیەکانی ئێمە"؛ " ئەڵمانیا دەبێ لە دەرەوەی کۆمەڵەی گەلان بمێنێتەوە"؛ " نزیک بە هەمووی کەشتیگەلی تجاری"؛ "ئەگەر ئەوە هەر ئەوە بێت کە ویلسۆن بانگەشەی بۆدەکات دەبێتە هۆی دروستبوونی دیموکراسی." نوێنەرێک، یەکیەتیخوازێکی پێشووی تجاری، بە شەلەشەل خۆی کرد بەناو ژوورەکەدا: " ئاغایان، ئەمن سەرخۆشم. ڕەنگە ئەوە پرۆلیتاری بێت، بەڵام لای من هیچی تری بۆ نەماوەتەوە. ئەم پەیماننامە شەرمهێنەرە پشتی منی لە عەرز داوە، چون تاکوو ئەمڕۆکە من باوەڕم بە ویلسۆن بوە." (لە دەنگۆکاندا کە ناوبەناوی پاریس دەگەڕان ئەم ڕووداوە زۆر گەورەکرابۆوە: "نوێنەران، ئەمینداران، و وەرگێڕان سەرخۆش کەوتبوون بەلادا، هەندێک بە جل و بەرگەوە و هەندێکیش بەبێ جل و بەرگەوە، لە ژوورەکان و تەنانەت لە پیپلیکانەکانی هۆتێلەکەشدا.) بانکدارێک بەناوی ماکس واربێرگ وتبووی" گلاوترین هەوڵی چەتەگەری لە جیهاندا کە تا ئەم ساتە لەژێر ئاڵای دووڕوویدا هاتبێتە ئاراوە." براکدۆرف-ڕانتزۆ بۆخۆی بە نیگەرانیەکی تەواوەوە وتبووی: " هیچ پێویست بە ئەم بەرگە گەورە نەبوو. دەکرا هەمووی ئەم شتانە لە دێڕێکدا بەکورتی ئاماژەیان پێبکرایە- 'لئالماگن ریناونس ئا سان ئیگزیستەنس." ("ئەڵمانیا پشتی لە هەمووی ئەو داواکاریانە کردوە کە تاکوو ئێستا هەی بوە.")١٠٧٢

ئەم تەنگەژەیە لە سەرانسەری ئەڵمانیا دەنگی دایەوە. بۆدەبێ ئەڵمانیا لە سەدا ١٣ی ناوچەکانی خۆی و لە سەدا ١٠ی حەشیمەتەکەی خۆی لەدەست بدات؟ لە هەر حاڵدا، ئایا ئەڵمانیا شەڕەکەی دۆڕاند؟ هەر لە سەردەمی ئاگربەست بەم لاوە، هێزی میلیتاری و هاوسۆزکانی ئەو هێزە بەردەوام سەریان بە دارشتنی بنەماکانی بیرۆکەی خەنجەر-لەپشتەوەدان قاڵ بوە: ئەوە کە ئەڵمانیا نەک لە گۆڕەپانەکانی شەڕدا بەڵکوو لە خەیانەتێک کە لەناوخۆی وڵات پێی کرابوو تووشی شکست هاتبوو. بۆدەبێ بەتاقی تەنیا ئەڵمانیا پێمل بە چەکداماڵین بکرێت؟ بۆدەبێ، و ئەمە بوو بە مەکۆی قینی ئەڵمانیا لە پەیماننامەکە، ئەڵمانیا تەنیا وڵاتێک بێت کە بەرپرسایەتی شەڕی گەورەی خستبێتە ئەستۆی خۆی؟ ئێستاش کە ئێستایە زۆربەی ئەڵمانیەکان سەرهەڵدانی شەڕوشۆڕەکانی

ساڵی ١٩١٤ وەک داکۆکیەکی پێویست لەبەرانبەر هەڕەشەی سڵاڤە ڕەش و ڕووتەکان بۆ سەر ڕۆژهەڵات سەیر دەکەن. فیلیپ سچێدەمەن، وەک ڕاوێژکار، وتبووی کە بۆ ئەوە نەدەبوو پەیماننامەکە بەگشتی پەسەند بکرێت. " بۆنابێ ئەو دەستەی کە ئەم زنجیرەی لەخۆی و لەئێمە هاڵاند لەبندا نەبڕدرێت؟" بەڵێنیەکانی ویلسۆن چیان بەسەر هاتوە؟ گاستاف نۆسکێ، وەزیری سەرسەخت و کەللەڕەقی جەنگ، بە ڕۆژنامەنووسێکی ئەمریکی وتبوو کە "کەوایە، من بە ئێوە هەندێک دیپلۆماسی کراوە دەبەخشم. ئێوە ئەمریکیەکان بچنەوە ماڵێ و لە ویلسۆنی خۆتان گۆڕتان گوم کەن." ویلسۆنێک کە هەتا ئەم کاتە وەک ڕزگاریکەری ئەڵمانیا خۆی نیشان دابوو، لە نیوەشەودا گۆڕا و بوو بە دووڕوویەکی چەپەڵ و گڵاو. کاتێکە لە ساڵی ١٩١٤دا کۆچی دوایی کرد، باڵوێزخانەی ئەمریکی، بە تاقی تەنیا لەنێوان هەمووی باڵوێزخانەکانی تری ناو واشنگتۆن، ئاڵاکەی خۆی نەهێنا خوارەوە.١٠٧٣

ئەوی کە لەم قۆناغەدا سەرنجڕاکێشە ئەتک و -سەرسوورمانە. دایرەی دەرەوە لە ئامادەکاریەکانی خۆیدا بۆ دانووستانی ئاشتیانە زۆربەی مەرجەکانی پێشبینی کردبوو: چەکداماڵین؛ لە حاڵەتی نیزامی هێنانەدەرەوە و داگیرکردنی ڕاینلەند؛ لەدەستدانی کەمترین کانزاکانی سائیر؛ لەدەستدانی بەرچاو، پێدەچێ دانزینکیش بگرتایەتەوە، لە سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانیا؛ و قەرەبووکردنەوە خسارەتەکان بەبڕی لانی ١٦٠بیلیۆن مارک. باشترین ڕوونکردنەوە لەسەر کاردانەوەیەکی نارِوون و نادیار لەلایەن چاودێرێکی ئەمریکیەوە ئەنجام دراوە کە لە مانگی ئاڤریلی ساڵی ١٩١٩دا وتبوو: " ئەڵمانیەکان لە هیوا و هۆمێد زیاتر شتێکی تریان بۆ نەماوەتەوە. بەڵام تەنیا ئەوەیان بۆماوە تا خۆی پێوە هەڵواسن- هیوا بەوە کە ئەمریکیەکان شتێکیان بۆ دەکەن، هیوا بەوە کە مەرجەکانی کۆتایی ئەوەندەی کە ئاگربەست نیشانی دابوو توند و زەخت نەبوون و هتد. لەڕووی نائاگاهیەوە، من لام وایە ئەڵمانیەکان زۆر گەشبینترن لەوەی کە هەستیان پێکردبێت." و، ئەو بەشێوەیەکی پێشبینیکەرانە لەدرێژەی باسەکەیدا هێنابووی کە " کاتێکە ئەوان مەرجەکان لە چاپێکی سارد و سڕدا دەبینن، تووڕەیی و نەفرەت و نائۆمێدیەکی یەکجار زۆری بەدواداديێت."١٠٧٤

لەو حاڵەتەدا بوو کە شاندی نوێنەرایەتی ئەڵمانی تێبینیەکانی خۆی لەسەر مەرجەکانی ئاشتی ئامادەکرد. هەتا کۆتایی مانگی مەی چەندین لاپەڕە لە ڕەخنەگەلی ئەقڵانی و دژەپێشنیاری پێشکەش کردبوو. ڕەخنەی گشتی ئەوەبوو کە پەیماننامەکە ئەوجۆرەی هاپەیمانان بەڵێنیان دابوو ئەوەندە دادپەروەر و عادیلانە نەبوو. لەو ناوچەیەی کە خەریک بوو لە ئەڵمانیا دەستێندرایەوە، ئەڵمانیەکان خەریک بوون لە مافی خود-موختاری بێ بەش دەکران. براکدۆرف-ڕانتزۆ لەسەر

بەدواداچوونی ستراتیژیەکی تایبەت بڕیاری دابوو کە پێدەچوو ئاکامگەلی زۆر مەترسیداری لێبکەوێتەوە. ئەو پێداگری لەسەر ئەوە دەکرد کە ئەڵمانیا حازر نیە هەمووی تاوانەکانی جەنگ بۆسەر خۆی قەبووڵ بکات. ئەو لە ترایانان پالاس بە دانیشتوانی خۆی ڕاگەیاندبوو کە " دانپێدانانێکی لەو چەشنە لەزمان منەوە درۆیە." بەڵام نە لە ئەو و نە لە ئەڵمانیاش داوا نەکرا کە مل بە دانپێدانێکی لەوچەشنە بکات. بەندی ناوزڕاوی ٢٣١ی پەیمانانمەکە، کە ئەڵمانیەکان بە درووستیەوە ناوی بەندی "تاوانی جەنگ"یان لێنا، بۆ مەبەستی بەرپرسیارکردنی ئەڵمانیا بۆ قەرەبووی خەسارەتەکان ناوی هاتبوو. لەو پەیماننامانەی کە لەگەڵ ئوتریش و مەجارستان بەسترابوون بەندگەلی هاوچەشن بەدی دەکران؛ ئەوانە هەرگیز نەبوون بە کێشەیەک، زیاتر بەهۆی ئەوەوە کە حکوومەتگەلی بەرباس نەیاندەهێشت ئەوان کاری وابکەن.١٠٧٥

هەڵوێستی ئەڵمانیەکان جیاواز بوو بەشێکی بەهۆی ئەوەوە بوو کە ئەوان بۆماوەی چەندین مانگ بە دڵەڕاوکێوە پێشبینی تۆمەتبارکردنەکەیان کردبوو. لیبراڵەکان، کە لە کاتی شەڕدا ڕەخنەیان لە حکوومەتەکەی خۆیان گرتبوو، قرەیان لەسەر ئەوەبوو کە ئەڵمانیا هیچ پێویست ناکات باری تاوانەکە بخاتە سەرشانی خۆی. کۆمەڵناسی گەورە ماکس وێبێر و گرووپێک لە پرۆفیسۆرانی ناودار مەنیفیستۆیەکی گشتیان بڵاوکردەوە: " ئێمە بەرپرسایەتی ئەوانەی کە لەکاتی جەنگ و بەرلەجەنگ لە دەسەڵات دابوون ڕەت ناکەینەوە، بەڵام ئێمە لەسەر ئەم باوەڕەیین کە هەر هەمووی زلهێزانی ئەورووپا لە سەردەمی جەنگدا تاوانبارن."١٠٧٦ کاتێکە مەرجەکانی ئاشتی هاتنە دەرەوە، ئەڵمانیەکان بەگشتی بە هەر بیروبۆچونێکی سیاسیەوە هەستیان بەوەکرد کە ترس و دڵەڕاوکێکانیان خەریکە بۆ ئەم و ئەو دەردەکەوێت.

هەرچەند حکوومەتەکەی خودی براکدۆرف-ڕانتزۆ گومانی لە ژیری و زانایی ئەو حکوومەتە هەبوو، ئەو بە توندی هێرشی کردە سەر بەندی ٢٣١، بەشێکی بۆ ئەوە کە پەروەندەی هاوپەیمانی بۆ مەبەستی قەرەبووی خسارەتەکان بخاتە پشت گوێ بەڵام بەگشتی بۆ ئەوە کە کەم ڕێزیان پێبکات. لە ١٣ی مانگی مەیدا ئەو نامەیەکی بۆ هاوپەیمانان نووسی و تێیدا هێنابووی کە "خەڵکی ئەڵمانیا حەزیان لە جەنگ نەبوە و قەت هەوڵیان نەداوە تا شەڕێکی دوژمنکارانە بنێنەوە." ئەو جارلەگەڵجار ئاماژەی بە پرسێک دەکرد کە لە یادداشتنامەیەکی دووروودرێژی تردا باسی لەسەرکرابوو. هاوپەیمانان تەنیا پێیان دەچەقاند و چیتر نا. لیۆد جۆرج لە بیرەوەریەکانی خۆیدا هێنابووی کە " من نەمدەتوانی بەبێ ئاشکراکردنی پەروەندەی چوونەناو جەنگ بەگشتی بۆچوونی ئەڵمانی قەبووڵ بکەم." ویلسۆن بە ڕقهەستاویەوە وتی کە " لە وڵامدا هەر ئەوەندە بەسە کە بڵێین ئێمە باوەڕمان بە

ناقە وشەیەک لە وتەکانی حکوومەتی ئەڵمان نیە." کلیمینجوو بەناوی شۆڕای چواریارەوە وتبووی کە ئەڵمانیا دەستدرێژی و بەرپرسایەتی خۆی قەبووڵ کردبوو کاتێکە کون بەکون بەدوای ئاگربەستدا دەگەڕا. " تازە زۆر درەنگە و بۆ ئەوە نابێت ئەمڕۆکە ئەوان ڕەت بکەینەوە." و بەم پێیە بەندی ۲۳۱، بەندێک کە ژان فۆستێر دۆلیسی لاو یارمەتیدا تا وەک دانووستانێک لەسەر قەرەبوی خەسارەتەکان ڕەشنووسی لەسەر بنووسێت، بوو بە هێمایەکی گرنگ لە نابەرانبەری و نادادوەری پەیماننامەی ڤێرسایلێس لە ئەڵمانی ویمار، لە بەشێکی زۆر لە مێژووی دواتردا- و لە وڵاتی ئینگلیزی-زمان.۱۰۷۷

* * * *

لە کاتەژمێر چواری بەرەبەیانی ۷ی مانگی مەیدا، ئەو ڕۆژەی کە ئەڵمانیەکان مەرجەکانیان وەرگرت، هێربێرت هۆڤێر، بەرێوەبەرێکی یارمەتیدەری ئەمریکی، لەلایەن هەواڵنیرێک کە هەڵگری کۆپلەیەک لە پەیماننامەکە بوو کە تازە لە چاپەمەنیەکاندا بڵاوکرابۆوە ڕاچەنیبوو. وەکوو هەمووکەسی تر، ئەو پێشتر بەگشتی هەرگیز چاوی پێی نەکەوتبوو. مەودای بێ لێژایی، کاریگەری یەکجێی سەرجەم بەندەکان، ئەوی تووشی ترس و دڵەڕاوکێ کردبوو. هەر کە ڕۆژ دەبۆوە ئەو دەردەپەڕیە دەرەوە و بۆ سمووتس و ژان مەینارد کەینیس دەچوو. چەند ساڵ دواتر هۆڤێر لەو بیرەوەریەدا گێڕابوویەوە کە " ئێمە لەسەر ئەوە کۆک بووین کە کاردانەوەکانی زۆربەی بەشەکانی پەیماننامەی پێشنیارکراو لە ئاکامدا ڕووخان و لەناوچوونی بەدواوە دەبێت."۱۰۷۸

بڵاوبوونەوەی پەیماننامەکە پشێوی و ئاڵۆزی لەنێوان زۆربەی ئاشتیکەراندا نایەوە بەڵام ئایا ئەوە هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ خودی مەرجەکانی ئاشتی، سرووشتی کۆڕی ئاشتی، داهاتووی جیهان، یان داهاتووی خۆیان، ئێستاش کە ئێستایە نەمانتوانیوە ڕوونی کەینەوە. لانسینگ، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا، کە لە کەنارەوە بەبێ ئارامی دانیشتبوو، هەستی بەوەکرد کە لەناو پەیماننامەکەدا هەست بە ترس و دوودڵیەکی سەیر سەبارەت بە ویلسۆن وەک وتووێژکەر دەکرێت. ئەو بەپەلە یادداشتنامەیەکی پڕلە تووڕەیی و ڕقی نووسی: " بەراورد ناکرێت کە مەرجەکانی ئاشتی چەندە توند و شەرمەزارکەر هاتوونەتە بەرچاو، و زۆربەیان ناتوانن بێنە بواری جێبەجێکردنەوە." بۆلیت، کە ئێستاش بەدەست شکستخواردنی دیپلۆماسی ڕووسی خۆیەوە ئازار دەچەشێت، کۆڕێکی بە بەشداری ئەندامانی لاوی نوێنەرایەتی ئەمریکی لە کریلۆن ڕێکخست. ئەو وتبووی کە " ئەمە پەیماننامەیەک لە ئاشتی نیە." پێویستە کە ئەوان هەرهەموویان دەست لە کاربکێشنەوە. نزیک بە دوازدە کەس لەسەر ئەو باوەڕە بوون. بۆلیت دێکۆراسیۆنەکانی سەرمێزەکەی بە یەک دادا و گوڵەسوورەکانی بەو کەسانە بەخشی کە پێوەندیان بەوەوە گرتبوو و گوڵەزەردڕەنگەکانی یاسەمەنی

بەو کەسانە کە پێوەندیان نەگرتبوو. نامەکانی دەستلەکارکێشانەوە باسیان لە نائۆمێدی دەکرد، لەوە کە چۆن یاسا پڕبایەخەکانی ویلسۆن و بیروباوەڕی خەیاڵپەرستی ولاتەیەکگرتوەکان کرابوون بە قوربانی و لەخزمەت بەرژەوەندیەکانی ئەورووپیە چاوچنۆکەکاندا بوو. بۆلیت دڵنیابوو لەوەکە نامەکەی ئەو ڕاستەوخۆ ڕوولە چاپەمەنیەکان دەکات.١٠٧٩

لە شاندی نوێنەرایەتی بەریتانی، ولامدانەوە بەشێوەی هاوچەشن بوو. نیکۆلسۆن وتی کە " ئێمە بە دڵنیاییەوە هاتین بۆ پاریس بەومانایە کە دەستووری تازە لەوەدا بوو کە دابمەزرێت؛ ئێمە وەک قوتابی پەرۆش گەیشتینە قوتابخانەی سەرەک ویلسۆن؛ ئیمە وەک لەدین هەڵگەڕاوە ئەویمان چۆڵ کرد." بەریتانیەکان داوای لێبوردنیان دەکرد لەوە کە "ئاشتیەکی ئیمپریالیستی"ان دامەزراندوە؛ ئەو تاوانەکە بەگشتی دەگەڕێنێتەوە بۆ ئیتالیەکان و فەڕەنسەیەکان. لە بەریتانیا، هەست و سۆزی هەڵبژاردنی "خاکی" مانگی دیسامری پێشتر ولاتی داگرتبوو و سەبارەت بە ئەڵمانیا هەست و سۆزی زیاتر هەڵکردن خەریک بوو سەریان هەڵ ئەدا. ئارچبیشۆپی کانتێربێری سەبارەت بە پەیماننامەکە "بێزاری" خۆی دەربڕی. ئەو وتی کە بۆ "بەدەنەیەکی گەورەی ناوەندی قسەدەکات کە بەشێوەیەکی گشتی بێ دەنگ و لە کاناڵ ئاسایەکانی چاپەمەنیدا هیچ نوێنەرایەتیەکی نیە."١٠٨٠

هەڵبەت هەڵوێستی فەڕەنسەیەکان جیاواز بوو. ڕەخنەگران گازندەی ئەوەیان دەکرد کە گوایە پەیماننامەکە زۆر لاوازە و لە هەندێک لە چەپخوازان کە زۆر بە وشک و ڕەقی دەبینن دوورە. گلە و گازندەکانی ئەوان کاریگەریەکی یەکجار کەمی لەسەر جەماوەر بەگشتی دانا. زۆربەی فەڕەنسەیەکان لایان وابوو کە کلیمینجوو باشترین مەرجەکانی بەدەست هێناوە: بە واتەی ڕۆژنامەنووسێک " شکۆدار و خەم ڕەوێنی دڵ" بوە. لە هەر حاڵدا، بۆ سەرلەنوێ دەستپێکردنەوەی وتوێژەکان هەست بە هیچ ئارەزوویەک نەدەکرا. دوا ئەوەی کە ئەڵمانیەکان دژەپێشنیارە ورددارێژراوەکانی خۆیان لە ٢٩ی مانگی مەیدا حەواڵەکرد، چاپەمەنیەکانی فەڕەنسە وەک سەگ کەوتبوونە وەڕین: "مانۆمێنتی هەرچی ڕەفتاری ناشیرین و ناحەزە." "سەرچاوەی هەرچی گاڵتەجاڕی و هیچ و پووچیە." "لووتبەرزی و بەفیزی پێوەدیارە." لیبراڵێکی ناودار ڕایگەیاندبوو کە تەنیا وشەیەک ئەو دەتوانێ بۆ تێبینی ئەڵمانیا بیدۆزێتەوە " بێ ئابڕوویی و بێ ویژدانیە."١٠٨١

لەبەرانبەر ئەمەدا ئەمریکیەکان و بەریتانیەکان کارکرابوە سەریان. هێنری ویلسۆن، کە هیچ دۆستایەتیەکی لەگەڵ ئەڵمانیەکان نەبوو، لە یاداشتنامەکەی خۆیدا هێنابووی: " بوچەکان هەر ئەوەیان کردوە کە من بەدرووستی پێشبینیم کردبوو- ئەوان مەرجەکانی ئێمەیان لە بەرچاو نەگرتوە، و دواتریش کۆمەڵێک مەرجی تایبەت بەخۆیان لەسەربنەمای چاردە خاڵەکە پێشکەش کردوە، کە زۆر

لە هێنەکانی ئێمە یەکگرتووترن." لەو ساتەدا، جیاخوازانی ناوچەی ڕاینلەند، بە پشتگری لەلایەن هەندێک لە میلیتاری فەڕەنسەیەکان، پێشنیارێکی بێ دەرەنجامیان بۆ سەربەخۆیی پێشکەش کرد. لە ١ی مانگی ژوەندا لە چەندین شار بەدرێژایی چۆمی ڕاین لافیتەکان [پلاکاردەکان] هەڵدران. خێرا لەلایەن جەماوەری تووڕەوە لەت و پەت نەکران، لەگەڵ بێدەنگیەکی سەرسام ڕووبەڕوو بوونەوە. هەوڵەکانی دەستبەسەرداگرتنی دایرەکانی حکوومی بەشێوەیەکی ئابڕووبەرانە تووشی شکست هاتن. هەرخێرا براکدۆرف-ڕانتزۆ ناڕەزایەتیەکی توندی سەبارەت بە کلیمینجوو دەربڕی. لە ٢ی مانگی ژوەندا ویلسۆن و لیۆد جۆرج ئەو گوزارشاتەیان بە کلیمینجوو نیشان دا کە ئەوان لە ژنەڕاڵەکانی خۆیان لە ناوچەکانی ڕاینلەند وەریان گرتبوو کە تێیاندا گلە و گازندە لەبابەت پیلانگێڕیەکانی فەڕەنسەیەکان هەبوو. لیۆد جۆرج پێشنیاری کرد کە لەوانەیە هاوپەیمانان مەجبوور بن سەبارەت بە داگیرکاری پازدەساڵەی خۆیان لە ڕاینلەند بچنەوە.١٠٨٢

لەڕاستیدا لیۆد جۆرج خەریک بوو سەرلەنوێ بیری لە هەمووی گرێبەستەکە دەکردەوە. ئەو جوان ئاگادار بوو لەوە کە، لە درێژخایەندا، ئەوە لە بەرژەوەندی بەریتانیادا نیە کە ئەڵمانێکی لاواز کە شیمانەی شۆڕشگێڕی لێدەکرێت لەناودڵی ئورووپادا بهێڵێتەوە. بێجگە لەوە لەونەدەچوو ئەوە بەرژەوەندی سیاسی ئەویشی تێدابێت. لە هەڵبژاردنێکی ناسەرەکیدا لە سەنتراڵ هۆڵ، پاڵێوراوێک کە پاڵپشتی لە "ئاشتیەکی باش، زوو وەخت و بێ تۆڵەسێنەر" دەکرد هێرشی کردە سەر پاڵێوراوی هاوپەیمانی. نزیکترین هاوکارەکانی ئەو هۆشداریان دەدا کە جەماوەری بەریتانی پشتگری لە پەیماننامەیەکی توند ناکات. بۆچوونە وورد داڕێژراوەکانی ئەڵمانی لەسەر پەیماننامەکە، کە هاوپەیمانان لە ٣٠ی مانگی مەیدا وەریان گرتبوو، ڕەنگدانەوەیەک بوو لە زۆربەی ئەو نیگەرانیانەی کە لیۆد جۆرج لەگەڵ هاوکارە بەریتانیەکانی باس و خواستی لەسەر کردبوون. جێگری سەرەک وەزیر، بۆنار لۆ، هەستی بەوەکرد کە ناڕەزایەتیەکانی ئەڵمانی " لە زۆر بواری تایبەتدا وڵامدانەوەیان هەروا ئاسان نیە." لێۆد جۆرجیش لەسەر ئەو باوەڕە بوو. لە ڕاستیدا ئەڵمانیەکان بە هاوپەیمانانیان ئاوا دەکوت: " ئێوە کۆمەڵێک یاساتان بۆ خۆتان داناوە، کاتێکە بەرژەوەندی خۆتانی تێدا بێت بەکاریان دێنن، بەڵام کاتێکە بەرژەوەندی ئێمەیان تێدا بێت، لێیان پەشیمان دەبنەوە."١٠٨٣

ڕەخنەگری هەرە ڕەوان و کارامە سمووتس بوو. ئەو نووسیبووی کە " لەوە کە دەبینم ئاکامی سیاسەتزانیەکەی ئێمە ئاوای بەسەر هاتوە هەست بە دڵتەنگیەکی لەڕادەبەدەر دەکەم." و پەستا پەستا وشە بە زاری دادەهات: "ئاشتیەکی نەشیاو، تێگەیەنراو لەسەر بنەمایەکی هەڵە." "سیاسەتی وەحشیانەی ئێستامان." "سەرسوورهێنەر." "کاریگەر." " ئەڵمانیا بەکردەوە ناتوانێت

بەندەکانی پەیماننامەکە جێبەجێ بکات." پارستەکانی قەرەبووی خەسارەتەکان نەدەهاتنەدی "و پێویستە ئەو قازە بکووژن کە بڕیارە هێلکەی تەلایی بکات." (کەچی ئەوە سمووتس بۆخۆی بوو کە دایەگرامی قەرەبووەکانی بە زیادکردنی مووچەی بێوەژنان و هەتیوانی سەربازانی هاوپەیمانی بردبوە سەرەوە.) داگیرکردنی ڕاینلەند و بەدەستەوەدانی ناوچەکانی ئەڵمانی بە پۆڵەندا " بۆ داهاتووی ئورووپا ترس و دڵەڕاوکێیان بەدیاری دەهێنا." ئەو زۆر گومانی هەبوو و نەیدەتوانی بەو ئاسانیە پەیماننامەکە بەو جۆرەی کە بوو واژۆ بکات. لیۆد جۆرج بەتوندیەوە داوای ئەوەی لێدەکرد کە ئایا ئەفریقای باشور حازرە بە هەمان ڕۆحیەتی ئاشتیگرانە ئەفریقای ڕۆژئاوای باشووری تایبەت بە ئەڵمانیا بگەڕێنێتەوە. وڵام درایەوە کە" لەم پرۆژە گەورەی بازەرگانیەدا ئەفریقای ڕۆژهەڵاتی باشوور لە هاوسەنگی بەراوردکراو لەگەڵ ئەو ئەرکانەی کە ئێستا هاتوونەتە سەرشانی جیهانی پێشکەوتوو هەر ئەوەندە تۆزاویە."١٠٨٤ بەڵام سمووتس پێشنیاری ئەوەی نەدەکرد کە وازی لێ بێنێت.

لیۆد جۆرج کە باش بەم ئەرکەوە ئاڵۆزابوو، لە ١ی مانگی ژوەندا شاندی نوێنەرایەتی ئیمپراتۆری بەریتانی لە دەوری یەک کۆکردەوە. چەندین وەزیری سەر لەلایەن حکوومەتی بەریتانیەوە، وەکوو ئاستین چامبرلین، وەزیری دارایی؛ مۆنتاگۆ، وەزیری دەرەوە بۆ هێندستان؛ و چێرچیل، وەزیری دەرەوە بۆ جەنگ، کە لە لەندەنەوە شەوی پێشتر هاتبوو، لە کۆبوونەوەکەدا بەشداریان کرد. سمووتس وتارێکی بەسۆزی پێشکەش کرد. مەرجەکانی ئاشتی " بۆ بەرەیەک لە ئەورووپا قەیرانی سیاسی و ئابووری دروست دەکەن و لە درێژخایەندا ئەوە ئیمپراتۆریەتی بەریتانی دەبێت کە پێمل دەبێت تا تاوانی ئەوانە بداتەوە." ئەو لە درێژەی قسەکانیدا وتی کە " زۆربەی هەرە زۆری داواکاریەکان لە ناو ئەو ڕێکەوتنامەیەدا فەرەنسەیین." هەست بە منجەمجێک لە ڕازیبوون دەکرا. چێرچیل وتی کە " قین لەدڵبوونی فەرەنسە لە ئەڵمان سنووری مرۆڤایەتی بەزاندبوو." ژەنەراڵ بۆتا، سەرەک وەزیری ئەفریقای باشور، کە زۆر بە کەمی قسەی دەکرد، ساڵوەگەڕی ئەو ڕۆژەی وەبیر ئەوان هێنایەوە، حەفتا ساڵ لەوەپێش، ئەوکاتەی کە ئەو و لۆرد میلنێر ئاشتیەکیان واژۆ کردبوو کە کۆتایی بە شەڕی بۆئێر هێنابوو. " لەو بۆنەیەدا ئەوە میانڕەویی بوو کە ئەفریقای باشووری بۆ ئیمپراتۆری بەریتانی ڕزگار کردبوو، و ئەو هیواداربوو کە ئەو لەم بۆنەیەشدا هەر میانڕەویی جیهان ڕزگار بکات." کۆڕەکە بەتێکڕای دەنگ بەرپرسایەتیان خستە سەرشانی لتۆد جۆرج تا بگەڕێتەوە بۆ شۆڕای چوار یار و داوای پێداچوونەوە و چاکسازی مەرجەکان لەسەر سنوورەکانی ئەڵمانیا لەگەڵ پۆڵەندا، لەسەر قەرەبووی خەسارەتەکان، لەسەر داگیرکردنی ڕاینلەند و لەسەر ژمارەیەکی بەرچاو

کەلەکەری ڕقهەستاو بکات." بێجگە لەوانە، ئەو داوای بەڵێنیەکی بۆ ئەڵمانیا دەکرد کە بەشکەم بتوانێت بەزوانیَ بەشداری لە کۆمەڵەی گەلاندا بکات.١٠٨٥

ڕۆژی دواتر لیۆد جۆرج بە شۆڕای چوار یاری ڕاگەیاند کە هاوکارەکانی بۆ واژۆکردنی پەیماننامەکە بەشێوازی ئێستا ئەو ناکەن بە سەرپشک؛ بێجگە لەوە حازریش نین ڕێگە بدەن بە سووپای بەریتانیا تا بەرەو ئەڵمانیا بە مارشی سەربازیەوە بڕوات یان هێزی دەریایی بەریتانیا سەرلەنویَ دەست بکاتەوە بە گەمارۆدانەکەی خۆی. ویلسۆن و کلیمینجوو بە دیمەنی سەرلەنویَ دەستپێکردنەوەی کارێک کە کاتی خۆی بە ئێش و ئازارێکی زۆرەوە جێبەجیَ کرابوو تۆقابوون. هەرکیان هاتنە سەر ئەو ئەنجامە کە لیۆد جۆرج ئەقڵی لە دەست داوە. لیۆد جۆرج بە شاندی نوێنەرایەتی ئەمریکی ڕاگەیاند کە " ئێستاکوونیَ کە دەبینم خەڵک دێن و دەڵێن کە ئەوان لەوەدەترسێن کە ئەڵمانیەکان واژۆی نەکەن بەوە ماندوو دەبم، و ترسەکەی ئەوان لەسەر بنەمای شتگەلێکە کە ئەوان لە کاتی نووسینی پەیماننامەکە پێداگریان لەسەر دەکرد." بەشێوەیەکی نهێنی، ئەو وتی کە لیۆد جۆرج لەوەدەچوو کە" لەسەر هیچ یاسا یان پرەنسیپێکی تایبەت بەخۆی نەبوو، واتە ئەو بەپێی پێشنیاری دوایەمین کەسێک لەگەڵی قسەی کردبوو هەڵوێستی دەگرت: هەلپەرستی تەنیا ئەستێرەی ڕێنوێنیکەری ئەو بوو."ویلسۆن، بەهۆی گومانەکانی پێشووی خۆی، حازر نەبوو هیچ جووڵەیەک بکات یان تەکانێک بخوات. کلیمینجوو تەنیا گوێی بە وردەباس نەدەدا. وەک بۆخۆی لە شۆڕای چوار یاردا ئاماژەی پێکردبوو، لەگەڵ خەڵکەکەی خۆشی شەڕی کردبوو تا بە ئەم قۆناغە بگات؛ ئەگەر ئەو هەر سازشێکی تری بکردایە حکوومەتەکەی دەڕووخا. بۆچوونی لیۆد جۆرج، لانی کەم وەک خۆی لە بیرەوەریەکانی خۆیدا گوزارشی کردبوو، ئەوە بوو کە ئەو پێشنیاری گۆڕانکاری سەرەکی نەکردوە، تەنیا گۆڕانکاریەکی پێشنیارکردوە کە بتوانیَ پەیماننامەکە لەگەڵ یاساکانی خودی ویلسۆن یەک بخات.١٠٨٦

دوو حەفتە وتوێژی گەرم و گوڕ یەک بە دوای یەک بە درێژەیان هەبوو. (لە قۆناخێکدا گوزارش دراوە کە گوایە ویلسۆن بە لیۆد جۆرجی وتبێت کە " تۆ منت نەخۆش خستوە!") لە کۆتاییدا، لیۆد جۆرج زێدەمافێکی هەرەگرنگی بەدەست هێنا: بڕیار لەسەر ئەوەدرا کە خەڵکی سیلیسیای سەروو بەکۆی دەنگ بڕیار دەدەن کە ئایا لەگەڵ ئەڵمانیا بمێننەوە یان پێوەندی بە پۆڵەندەوە بگرن. بەواتایەکی تر، ئەو لە تووڕەکردنی هاوپەیمانەکانی خۆی شتێکی ئەوتۆی بەدەست نەهێنا. سەبارەت بە داگیرکاری ڕاینلەند، کە ئەو پێشنیاری کرد تا کورت بکرێتەوە، ئەو لەگەڵ دژایەتیەکی قورسی کلیمینجوو ڕووبەڕوو بۆوە، کەسێک، وەک خۆی بە هاوسی ڕاگەیاندبوو، کە تەنانەت بە چاردە ساڵ

و ٣٦٤ رۆژیش ڕازی نەدەبوو. لە ئاکامدا بۆ هێورکردنەوەی ناکۆکی نێوان هێزە داگیرکەرەکان و بەڕێوەبەرایەتی ئەڵمانی و خەڵکانی سیڤیل هەندێک گۆڕانکاری ورد هاتنە ئاراوە. لەناو کۆمەڵەی گەلاندا، هاوپەیمانان تەنیا ئەڵمانیایان لەوە دڵنیا کردەوە کە ئەوان تەنیا کاتێک دانی پێدا دەنێن کە وڵاتی ناوبراو بەشێوەیەکی ڕێک و پێک هەڵس و کەوت بکات.١٠٨٧

لیۆد جۆرج سەبارەت بە بەندەکانی تایبەت بە قەرەبووەکان پێشکەوتنێکی ئەوتۆی بەدەست نەهێنا، بەشێکی بەهۆی ئەوەوە کە ئەو بۆخۆشی نەیدەزانی کە بەڕاستی بەدوای چیەوەیە. ئەو کاتی خۆی لە ڕابردوودا دژ بە دانانی بڕەپارەیەکی چەسپاو لەناو پەیماننامەکەدا بەشێوەیەکی چڕوپڕ دەمەقرێی خۆی کردبوو. ئێستا دوودڵ بوو. لەوە دەچوو ئاماژە بە بڕێک پارە بکرێت بۆ ئەوە کە مووچەکانی خانەنشینی و هتد لەخۆ بگرێت، و ئەڵمانیەکان دەیانتوانی قەرەبووکردنەوەی خەسارەتەکانی بلژیک و فەڕەنسە بگرنە ئەستۆی خۆیان. یان لەوانەیە ئەڵمانیەکان بتوانن بڵێین کە چاکسازیەکان چەندە هەڵدەگرن و دواتریش هاوپەیمانان پێیان بڵێن ئەگەر هاتوو پارەکە تەواو نەبوو. ئەو لانی کەم بیری لەوە دەکردەوە کە ئەوان باشتر وایە بۆ جارێکی تر سەیری بکەن. ویلسۆن، کە تەنیا لەبەرانبەر دژایەتیکردن لەلایەن فەڕەنسەیەکان و بەریتانیەکان وازی لە بڕەپارەی چەسپاو دەهێنا، بە بەیکەر، ئەمینداری چاپەمەنیەکانی خۆی، ڕاگەیاند کە لیۆد جۆرج خۆبەزلزانە و بۆ ئەوە نابێت ساتێک لەگەڵی هەڵ بکەی.١٠٨٨

لەگەڵ ئەوەشدا کۆمیسیۆنی تایبەت بە قەرەبووی خەسارەتەکان داوای لێکرا تا بۆ جارێکی تر بە سەرجەم بابەتەکەدا بچێتەوە. بۆ جارێکی تر کۆمیسیۆنی ناوبراو ناڕازیبوونی خۆی دەربڕی. فەڕەنسەیەکان و بەریتانیەکان هەستیان بەوەکرد کە ناتوانن بڕەپارەیەک بچەسپێنن؛ ئەمریکیەکان پێشنیاری ١٢٠ بیلیۆن مارکی تەلایان کرد و تەنانەت ڕەشنووسی بانقەنۆتێکیان دا بەدەست ئەڵمانیەکانەوە. ویلسۆن بە توندی وتی کە حەق وایە ئەڵمانیەکان بارێکی قورس بخەنە سەر شانی خۆیان، بەڵام پێویست ناکات هاوپەیمانان ئابووری ئەڵمانیا تووشی قەیران و ئاڵۆزی بکەن. لیۆد جۆرج وتی کە " من حەزم لە قەراخ و قوراخ و ساسی کۆلێرەکەیە نەوەک هەویرەکەی." ویلسۆن لە وڵامدا وتی کە " پێویستە زگت بۆ هەویرەکەش ئامادە کەی لە کاتێکدا کە دەتوانێت درێژە بە ژیانی تۆ بدات." لیۆد جۆرج وتی کە بەدڵنیایەوە بەڵام مەرجێکی هەیە: " ئەویش ئەوەیە کە ئێوە بڕێکی باشم بۆ بنێرن." کلیمینجوو قسەکەی هەڵبڕی و وتی" و بەتایبەت، من حەز دەکەم لەوە دڵنیابم کە ئەوە ناچێتە زگی کەسێکی ترەوە." لیۆد جۆرج چەندین پلانی ورداڕێژراوی پێشنیار کرد تا کاریگەری لەسەر دانانی بڕەپارەیەکی چەسپاو دابنێت بەبێ ئەوەی لەڕاستیدا ناو لە دایەگرامێک بەرێت. ویلسۆن

بەناباوەڕییەوە وتی کە " ئەمە وڵامی ئێوەیە بۆ پێشنیاری ئەمریکی سەبارەت بە چەسپاندنی دایەگرامێک. ئایا ئێوە بەشەکانی تری گوزارشی ئەمریکیتان خوێندۆتەوە؟"١٠٨٩ بەندەکان ئەو جۆرەی کە بوون هەروا مانەوە.

*   *   *   *

لە ١٦ی مانگی ژوەندا ئەڵمانیەکان ئاگادار کرانەوە کە ئەوان بۆ پەسەندکردنی پەیماننامەکە سێ ڕۆژ مۆڵەتیان هەیە (دواتر دوامۆڵەت هەتا ٢٣ی مانگی ژوەن پەکخرایەوە)- دەنا هاوپەیمانان هەنگاوی پێویست دەنێن. براکدۆرف-ڕانتزۆ و ڕاوێژکارانی سەری هاوڕێی ئەو شەوە بەرەو ویمار وەڕێ کەوت. کاتێکە سەیارەکانی ئەوان بەرەو وێزگەی ڕێگای شەمەندەفەڕ وەڕێ کەوت جەماوەرێکی تووڕە بە فیکەکردن و گاڵتەکردن پێشوازیان لێکردن. یەکێک لە ئەمینداەرکان بە خڕکە بەردێک وەلاکەوت و هەڵنەستاوە. بەرپرسانی فەرەنسەیی لە کارێکە کردبویان پەشیمان نەبوون- یەکێک لە گوزارشەکان وتبووی کە ئەوەی کە ئەڵمانیەکان لەبەرانبەر بلژیکدا کردیان لەبیر نەکەن- هەرچەند ئەوان دواتر بڕەپارەیەکی باشیان بە ژنێکی لێقەوماو، کە قەت چانەبۆوە، دابوو.١٠٩٠

بەپێی ئەو گوزارشانەی کە لەلایەن هاوپەیمانانەوە دەهات زۆر شیمانەی ئەوە دەکرا کە حکوومەتی ئەڵمانی پەیماننامەکە ڕەد بکاتەوە. خەڵکی ئەڵمان بەتوندی دژایەتی واژۆکردنی دەکرد، هەرچەند ئەوەی بۆ ڕوون نەبووبۆوە کە ئایا ئامادەیی ئەوەی هەبوو کە شەڕ بکات یان نا. براکدۆرف-ڕانتزۆ، وەک هاوپەیمانان لە تێلێگرامە ڕاگیراوەکانەوە دەیانزانی، لەسەر ڕەتکردنەوە پێداگری دەکرد و شاندی هاوڕێشی پشتگری لێدەکرد. کلیمینجوو لە شۆڕای چوار یاردا وتی کە " ئەگەر بێت و ئەڵمانیا بەرەنگاری بکات من هێرشێکی بەهێزی نیزامی کە دەتوانێ واژۆکردنەکە بسەپێنێت بەباش دەزانم." ویلسۆن و لیۆد جۆرج بەبێ هیچ دوودڵیەک ڕازی بوون. لە ٢٠ی مانگی مەیدا، فۆچ، وەک فەرمەندەی عالی هاوپەیمانی، دەستووری بە هێرشێکی بەهێز لەلایەن چل و چوار تیپی سەربازی بۆ سەر ئەڵمانیای ناوەندی دا. بەریتانیەکان ئامادەبوون تا سەرلەنوێ گەمارۆدانی هێزی دەریایی زیندوو کەنەوە.١٠٩١

دوو ڕۆژ بەرلە دوامۆڵەتەکە ڕووداوێک هاتە ئاراوە کە هاوپەیمانی ئەوەندەی کە لەسەر مەبەستەکەی خۆی سوور کرد. زۆر لەولا پاریسەوە، لە سکاپا فلەو، ئەفسەرانی کەشتیگەلی ڕاگیراوی ئەڵمانی بە دڵتەنگیەکی زۆرەوە گوێیان بۆ هەواڵەکانی پاریس شل دەکرد. ئەو زستانە هەتابلێی دووروودرێژ و دڵتەنگ بوو. دەستەی دەریاوانان ڕێگەیان پێ نەدرابوو تا بەرەو کەنارەکان بڕۆن، ناهۆمێدیەک بەتایبەت بۆ سەربازانی ڕادیکاڵ کە بەشێوەیەکی فیداکارانە هاتبوون تا بەرەو بەریتانیا

پەرە بە شۆڕش بدەن. سەربازانی یاخی و ماندوو تەنیا دوا وتوویژێکی دوورودرێژ ملیان بۆ دەستووراتی ڕۆژانە کەچ دەکرد و کەشتیگەلێک کە کاتی خۆی بۆ هێزی دەریایی ئەڵمان جێی شانازی بوون ئێستا پیس و بۆگەن بوون. ئەدمیراڵی بەرپرس سووربوو لەسەر ئەوە کە پاشماوەی سەروەری هێزی دەریایی ئەڵمانیا ڕزگار بکات. لە نیوەڕۆی ٢١ی مانگی ژوەندا سەربازانی بەریتانی هەستیان بەوەکرد کە هەمووی کەشتیە کانی دوژمن هاوکات ئالای ئەڵمانیایان هەڵداوە. کاتێک کە یەک بە دوای یەک ڕووخێنەرەکان و تێکدەرەکان ڕیزبوون، ئاشکرابوو کە چ شتێک دەیەوێت ڕووبدات. بەریتانیەکان زۆر درەنگیان کردبوو و توانیان تەنیا چەند کەسێک ڕزگار بکەن؛ تا کاتەژمێر پێنجی ئەو دوانیوەڕۆیە، ٤٠٠،٠٠٠ تۆن باری تەقەمەنی کەشتیەکان لەناوچووبوون. (زۆربەی دەریاوانانی ئەڵمانی بەرەو بەلەمەکانی ڕزگاریکردن ڕاگوێزران بەڵام کاتێکە بەریتانیەکان تەقەیان لە کەشتیەکانی ئەڵمانی دەکرد لە دوایەمین هەوڵ بۆ ئەوەی نووقمی ئاو نەبن دە کەس کوژران.) ئەڵمانیەکان دڵخۆش بوون؛ و هاوسیش هەر وابوو، لە یاداشتنامەکەی خۆیدا هێناویەتی کە " ئەوەی دەیبینی بە ئەدمیراڵێتی بەریتانیا پێدەکەنێ." ئاشتیکەران تووڕە ببوون. لیۆد جۆرج وتی کە "گومان لەوەدا نیە کە نووقم بوونی ئەم کەشتیانە لەڕووی بێ ئیمانیەوەیە." ویلسۆنیش لەسەر ئەو باوەڕە بوو: " ئەویش ترس و دڵەڕاوکێی بەڕێز لیۆد جۆرجی بەتواوەتی لە دڵ دابوو، و ئەویش باوەڕی بە ئەڵمانیەکان نەبوو."وەک حکوومەتی ئەڵمانی بە پێویستی زانیبوو لەوزیاتر نەدەبوو دوامۆڵەتەکە وەدرەنگ بخرێت. لە ڕاستیدا، هەست بە هەندێک دڵڕاحەتبوون دەکرا لەوە کە بناخەی ناکۆکی نێوان بەریتانیا و ولاتەیەکگرتوەکان بنەبڕ کرابوو.١٠٩٢

لە ئەڵمان کەش و هەوایەکی نالەباری سیاسی باڵی بەسەر ولاتدا کێشابوو. حکوومەتی ئەڵمانی لەسەر ئەوە کە ئایا پەیماننامەکە واژۆ بکەن یان نا دووبەرکی تێدا درووست ببوو. ڕێبەرانی سیاسی لە ڕۆژئاوا، بەدرێژایی ڕێگای هێرشی هاوپەیمانی، بە هەر قیمەتێک بوایە پشتگریان لە ئاشتی دەکرد، وەکوو سەرۆکانی زۆربەی ولاتانی ئەڵمانی، کە بە ئەرکیان دەزانی تا لەگەڵ سەرکەوتوان پەیماننامەی جیاجیا ببەستن. ناسیۆنالیستەکان بە وورەوە باسیان لە داکۆکیکردن دەکرد بەبێ ئەوەی سەبارەت بە بەکردەوەدەرهێنانی ئەوە هەرپێشنیارێکی بەکەڵک درووست بکەن. لەنێوان هێزی میلیتاریدا، پیلانی سەیرسەیر دەهات و دەچوو: دامەزراندنی ولاتێکی تازە لە ڕۆژهەلات کە دەبوو بە قەلایەک لەبەرانبەر هاوپەیماناندا؛ سەرهەڵدانێکی بەکۆمەڵ لەلایەن ئەفسەرانەوە دژ بە حکوومەت؛ یان کوشتنی لایەنگرێکی ناوداری واژۆکردن، سیاسەتمەداری ناوەندخواز ماتیاس ئێرزبێرگێر.١٠٩٣

ئێرزبێرگێر وەک کوڕی پۆستەچیەکی ناودێ لە باشووری کاتۆلیک، پیاوێکی بەجەرگ بەکەیف و بەکردەوە بوو. لە کاتی شەڕدا، دەنگی ئەو بۆ ئاشتیەکی میانڕەوانە و دانووستان

لەسەرکراو لە هەمووی دەنگەکانی تر بەهێزتر بوو. دوژمنانی ئەو، کە ژمارەیان زۆر بوو، بەهۆی سەرووچاوی سوورکارە و چاوە بچووکەکانی، زەردەخەنەی بێزارکەر و عادەت بە وتنی چتگەلێک کە بیری لێ نەدەکردنەوە نکۆڵی ئەویان دەکرد. براکدۆرف-ڕانتزۆ، دوژمنی ئەو لە هەموو بوارێکەوە، هەر نەیدەتوانی بەڕێزەوە سەیری ئەو بکات. لە ساڵی ١٩١٩دا، ئێرزبێرگێر کۆمیسارییای ئاگربەستی ئەڵمانیا بوو. ئەو دڵنیا بوو لەوە کە ئەڵمانیا نەیدەتوانی بۆ جارێکی تر شەڕ دەستپێکاتەوە. بە هۆی ئەو هەموو خۆپیشاندانەی کە لەلایەن ناسیۆنالیستەکانەوە هاتبوە دی لەوەدەچوو ڕای گشتیش لەگەڵ ئەو بوویێت. کەچی، ئەو بە هاوکارەکانی خۆی لەناو کابینە ڕاگەیاندبوو، پەیماننامەکە ئەرکی زۆر قورس دەخاتە سەرشانی خەڵکی ئەڵمان؛ و بەڵێ، حەقی خۆی دەبێت کە کودەتایەکی نیزامی بێتە دی. بەڵام دەرفەتێک بۆ ئەڵمانیا دێتە پێشێ تا زیندوو بمێنێتەوە. دوا ئەوە کە حاڵەتی جەنگ کۆتایی پێهات، کارخانەکان دەست دەکەن بە بەرهەمهێنانی دووبارە، ڕێژەی بێکاری دێتەخوارێ، هەناردەکان بەرز دەبنەوە و ئەڵمانیا دەتوانێ لە ئاست هاوردەکان بەربێت. " بۆلشویزم ئیتر ئەوەندە نایەتە بەردڵانەوە." ئەگەر هات و ئەڵمانیا واژۆی نەکرد، ئەوا دیمەنێکی تەواو جیاوازترمان دەبێت. هاوپەیمانان ڕۆهێر، ناودڵی پیشەسازی ئەڵمانیا داگیر دەکەن؛ پێشچوونی ئەوان بەرەو ڕۆژهەڵات وڵات دەکات بە دوو لەتەوە؛ لەوانەیە پۆڵەندیەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە هێرش بکەن؛ ئابووری و سیستەمی ڕاگواستن دەڕووخێت. " کوشت و کوشتار و ماڵبڕین دەبێت بە کاری ڕۆژانە." ئەڵمانیا وەک لێفەیەکی شڕ و پینەکراو پارچەپارچە دەبێت"، هەندێک لەژێر دەسەڵاتی بۆلشویکدا، ئەوانی تر لەژێر دیکتاتۆریەتی باڵی ڕاستدا. پێویستە کە ئەڵمانیا واژۆ بکات.١٠٩٤ ئەوە ئەو شتە نەبوو کە براکدۆرف-ڕانتزۆ دەیدیت. ئەو بەبێ هیچ بەڵگەیەکی چەسپاو جەختی دەکردەوە کە هاوپەیمانان هەر خەریکی تەفرەلێدانن. ئەوان نەیاندەویست بەزۆری ئەڵمانیا داگیر بکەن. ئەوان سوور بوون لەسەر ئەوە کە زێدەماف وەرگرن، تەنانەت بەشێوەیەکی جیددی وتوێژ بکەن، ئەگەر تەنیا ئەڵمانیا خۆڕاگر بوایە. لەوەدەچوو بەریتانیا و وڵاتەیەکگرتووەکان لە فەڕەنسە هەڵبڕێن. شاندەکەی ئەو پێشنیارێکی یەکدەنگیان دەرکرد: " بارودۆخی ئاشتی ئێستاش ناسەقامگیرە، چون ئەڵمانیا ناتوانێ قەبووڵی بکات و وەک نەتەوەیەک بە شانازیەوە درێژە بە ژیانی خۆی بدات." هێزی نیزامیش هەر هەمان بۆچوونی هەبوو. فیلد مارشاڵ پائۆل ڤان هیندێنبێرگ وتی کە ئەو ناتوانێت دژ بە هاوپەیمانان پشت بە هیچ هیوایەک ببەستێت، "بەڵام من وەک سەربازێک شکستێکی سەربەرزانە بە باشتر دەزانم تا ئاشتیەکی سەرشۆڕانە." کابینە، کە بەلای قەبووڵکردنی مەرجەکان داشکابۆوە، تووشی وەستان هات و لە ٢٠ی مانگی ژانویەدا دەستی لەکار کێشایەوە. براکدۆرف-ڕانتزۆ وەک سەرۆکی شاندی ئەڵمانی

دەستی لە کار کێشایەوە و بەیەکجاری پشتی لە سیاسەت کرد. (لە ساڵی ١٩٢٢دا ئەو وەک باڵوێز بۆ مۆسکۆ گەڕایەوە، شوێنێک کە ڕەفتاری بەزەبری ئەو کاریگەریەکی تەواوی لەسەر بۆلشویکەکان دانا و شوێنێک کە ئەو بە سەرکەوتنێکی بەرچاوەوە لەپێناو پێوەندیە نزیکەکانی نێوان وڵاتەکەی و یەکیەتی سۆڤیەت خەباتی کرد.)

ئەڵمانیا ئێستا ئیتر وتەبێژ و حکوومەتی نەبوو. سەرەک کۆماری نەبوو، بەڵام ئێبێرت هان درابوو کە دەبێ وەک ئەرک بمێنێتەوە. دواموڵەتی کاتژمێر حەوتی پاش نیوەڕۆی ٢٣ی مانگی ژوەن هەر نزیک و نزیکتر دەبۆوە. لە ٢٢ی مانگی ژوەندا، ئیبیرت لە کۆتاییدا بڕیاری دا تا حکوومەتێک دامەزرێنێت. دوا وتویژیکی دووروودرێژ، ئەنجومەنی نیشتمانی لەپێناو واژۆکردندا دەنگی دا، بە مەرجێک کە ئەڵمانیا ئەو وتارانە بە فەرمی نەناسێت کە سەبارەت بە گەمارۆدان و دادگایی کردنی کەسانێک کە بەرپرسی جەنگ و بەندی "تاوانی جەنگ" بوون نووسرابوون. بەخێرایی لە پاریسەوە وڵام درایەوە: "پێویستە حکوومەتی ئەڵمانیا واژۆکردنی پەیماننامەکە لەماوەیەکی دیاریکراودا، بەبێ هیچ درۆدەلەسەیەک، یان قەبووڵ بکات یان ئەوەتا ڕەتی بکاتەوە." لە ویمار کەش و هەوایەکی تووش و ئاڵۆز باڵی بەسەر وڵاتدا کێشابوو. زۆربەی نوێنەران و وەزیرانی کابینە بۆ وڵات گەڕابوونەوە، ئەرخەیان بوون لەوە کە ئەرکەکەیان بەجێهاتوە. حکوومەتی ئەڵمانیا داوای وەدواخستنی دواموڵەتەکەی لە پاریس کرد و دواتر سەرتاسەری ئەو شەوە بەبێ ئەوەی بە ئەنجامێک بگەن کۆبوونەوە و باسوخواستیان کرد. سەرلەبەیانی ٢٣ی مانگی ژوەن لە پاریسەوە هەواڵ گەیشت کە دواموڵەتەکە لەوەزیاتر وەدرەنگ ناخرێت. لە کاتژمێر یازدەدا، دوائەوە کە سووپای ئەڵمانیا ئاشکرای کرد کە حازرە پەیماننامەکە واژۆ بکات، حکوومەت بڕیاری دا لەڕێگای ئەنجومەنی نیشتمانیەوە ڕێگەچارەیەک پەسەند بکات. زۆربەی ناسیۆنالیستەکانی باڵی ڕاست، نەیارانی پڕ هەراوهۆریای واژۆکردنەکە، بەشێوەیەکی نهێنی دڵیان لە بڕیارەکە حەوایەوە. لە ڕێگەچارەیەکی تری پەڕلەمانیدا ئەوان دەنگیان دا کە هیچ گومانێکیان لە نیشتمانپەروەربوونی ئەوانەی کە پشتگریان لە حکوومەت کردوە نەبوە. کۆبوونەوەکە بە وتەیەکی سەرۆکی ئەنجومەن کۆتایی پێهات " لەخوا داوا دەکەین بە ڕەحم و کەرەمەتی خۆی وڵاتی هەژار و داماوی ئێمە بخاتە ژێر چاوەدێری خۆیەوە."١٠٩٦

ئاشتیکەران بەدڵەڕاوکێیەکی زۆرەوە چاوەڕوانی دوایەمین وتەی ئەڵمانیەکان بوون. لە نزیکەو کاتژمێر ٤:٥ی پاش نیوەڕۆ ئەمینداریک بەپەلە خۆی بە شۆڕای چوار یاردا کرد تا بڵێت کە

ولامی ئەڵمانیەکان لەڕێدایە. کلیمینجوو وتی کە "خولەک بەخولەک چاوەڕوانم. لە کاتژمێر ٥:٤٠ پەیامەکە گەیشتە بەرەوە. سیاسەتمەداران لە دەوری ئەفسەرێکی فەرەنسەیی کۆببوونەوە کە لە زمانی ئەڵمانیەوە وەریدەگێڕایەوە. لیۆد جۆرج بزەیەکی هاتێ، ویلسۆنیش زەردەیەک بردیەوە و کلیمینجوو بەپەلە دەستوورێکی بۆ فۆچ نووسی تا لە بەرەوپێشچوونی خۆی بەردەوام بێت و بۆ هێزی نیزامیشی نووسیبوو کە تەقە لە تفەنگەکانیان هەستێنن. ئەو ڕۆژە لە کۆڕی ئاشتی هیچ کارێکی تر ئەنجام نەدرا.١٠٩٧

* * * *

ڕێوڕەسمی واژۆکردنەکە بۆ ٢٨ی مانگی ژوەن، ساڵوەگەڕی تیرۆری دووکی گەورە و خێزانەکەی لە سارایەڤۆ، دیاری کرا؛ شوێنەکە هۆڵ ئاف مێررس[ هۆڵی ئاوێنەکان] لە کۆشکی ڤێرسایلێس بوو، شوێنێک کە لە ساڵی ١٨٧١دا ئیمپراتۆری ئەڵمانی لەوێ ڕاگەیەنرابوو. کلیمینجوو بەرپرسایەتی تەدارەکەکانی گرتە ئەستۆی خۆی. لەو پەڕی شۆخی و پێکەنیندا میوانەکانی بەناو ژوورە گەورە ڕەسمیەکانی کۆشکەکەدا دەگەڕاند، و بە گەندەڵیەکانی سەردەمانی زووی پاشایانی فەرەنسە سەرنجی ڕادەکێشان. ئەو بە ئاماژەکردن بە ویلسۆن و بالفۆر دەیچپاند و دەیکوت: " سوێند دەخۆم هەرخەریکی قۆڕیات هەڵڕشتنن؛ سەیر کە بالفۆر شێوەی پیاوێکی حەشەری کۆنی لێنیشتوە." ئەو دەستووری دا تا کەرەسەی نایاب و گوڵدۆزیەکان بێننەگۆڕێ تا مەزنی وگەورە ببەخشن و مەرکەبێکی هەڵچرژاو دوورخەنەوە. (مەقاماتی ناوداری ڕەسمی فەرەنسە بە دەوری مۆزەخانەکان و کۆگاکانی کەرەسەی کۆنی پاریسدا دەگەڕان تا دانەیەک بدۆزنەوە بەڵکوو بەدڵی ئەو بێت.١٠٩٨)

زۆربەی دەسەڵاتدارە گشتیەکانیش لەو دووکانانە بوون کە شتی کۆنیان دەفرۆشت، بەدوای مۆرگەلێک لە جنسی ئاسن، بەرد، هەرشتێکە بیانتوانیایە بیدۆزنەوە دەگەڕان . (ئەوەکە مۆرەکان دەبێ ئیستامپی تاکییان هەبێت نەریتێکی دیپلۆماتیک بوو.) هاچێزی ئوسترالیا دەبوایە باسی دانەیەکی بۆ بکرایە کە هێراکیلۆسی لەحاڵی سەربڕینی ئەژدیهایەک نیشان بدایە؛ ئەو لە ئاکامدا لە دوگمەی یوونیفۆرمێکی سووپای ئوتریشی کەڵکی وەردەگرت. (هەڵبەت ئەو ڕێگاکەی خۆی بە وێنەیەکی دەقاودەقی مەرمەڕی چوار-پێی بڵیندی ڤینیس دیمیلۆ بڕی کە ئەو بۆ یاریدەدەری لەمێژ-ئازارچەشتووی خۆی کڕیبوو.) لیۆد جۆرج وای بەباش دەزانی کە لە پۆندێکی تەلایی کەڵک وەرگرێت. کلیمینجوو وتی کە " کەوایە بۆمنی دانێن. من هیچی ترم نیە." لیۆد جۆرج لەولامدا وتی کە " ئەوان هەرهەموویان بۆ ئەمەریکا چوون." لە٢٧ی مانگی ژوەندا، کاتێکە

ئەمیندارێک بەسەرنجەوە مۆمی لەناو ڕەحەتیەک چرژاندبوو، دەسەڵاتدارانی گشتی لەکاتی خۆیدا بۆ ئامادەبوونی واژۆکردنی ڕۆژی دواتر مۆرەکانیان بە پەیماننامەکەدا نابوو.١٠٩٩

هاوکات لەگەڵ ئەوانەشدا ڕاوڕاوی بلیتەکان بوو. هەریەک لە پێنج یاری گەورە لەناوی هۆڵی میرێرس شەست شوێنیان هەبوو. ویلسۆن وتی کە " بەڕاستی کە ژمارەیەکی نەحسە. ئەگەر تا دە ژمارە بڕۆیشتبایە هەڵبژاردنەکە زۆر ئاسان دەبوو، بەڵام ئەگەر بێت و کەسێک مەجبوور بێ شەست هەڵبژێرێت ئاشکرایە کە دڵسووتانی زۆری لێدەکەوێتەوە." تاجرێکی گەورەی ئەمریکی بڕیاری دا بەبیانووی ئەوە کە سووتووی سیگارەکەی وەک نیشانە بە کۆتی وەبەرهێنەری چەک و تەقەمەنیەکانەوەیە بچێتە شوێنەکانی دەرەوەی هۆتێلەکە. نووسەری دڵڕفێنی قژسوور بەناوی ئیلینۆر گلین لیۆد جۆرجی هەڵفریواند تا بەناوی گوزارشگەر بچێتە ژووری و لە کۆڕەکەدا بەشداری بکات. باس باسی چوونەسەرەوەی نرخی شوێنەکان بوو.١١٠٠

دەنگۆی تری سەیر و سەرسوورهێنەر دەهاتن و دەچوون. لە بەرلین، کۆمەڵێک لە سەربازانی ئەڵمانی دەستیان بەسەر ئالاکان لە شەڕی فرانکۆ-پراشندا گرتبوو تا بەڵکوو بگەڕێندرێنەوە بۆ فەڕەنسە و لەبەرانبەر مۆنۆمێنتی فریدریکی گەورەدا بسووتێندرێن و هاوکات لەگەڵ ئەوە جەماوەر سروودگەلی نیشتمانی بڵێنەوە. ئایا ئەڵمانیەکان دەیانتوانی بەرەنگاری واژۆکردنەکە ببنەوە، تەنانەت لەم کاتەدا؟ لە ٢٥ی مانگی ژوەندا، فەڕەنسەیەکان گوزارشیان دابوو کە شاندی سەرەکی ئەڵمانی لە هۆتێل دیس ڕیزیرڤۆیرس لەو پەڕی خۆشی و کەیفسازی دابوون: تەنیا مەقاماتی ڕەسمی پلە-خوار بۆ واژۆکردنی پەیماننامەکە دەناردران. کاتێکە شۆڕای چوار یار ڕاسپێردراوێکی بۆ کاری توێژینەوە نارد، شاندی بەرپرس گوزارشی دا کە حکوومەتەکەی ئەو لە دۆزینەوەی هەر وەزیرێک کە بەرپرسیارێتی واژۆکردنەکەی دەگرتە دەست کێشە هەرە گەورەی دەبێت. لە ٢٧ی مانگی ژانویەدا بوو کە هەواڵی لەرێدابوونی دوو نوێنەر گەیشتە بەرەوە: وەزیری تازەی دەرەوە، هێرمەن موولێر، و جۆهانیس بێڵ، وەزیری گواستنەوە، نوێنەرانی ئەڵمانی، وا گەشتێکی هێواشی ئاسایی بە شەمەندەفەڕ لەناو گۆڕەپانەکانی جەنگدا لە کاتەژمێر سێی بەرەبەیاندا گەیشتنە بەرەوە، دەنگۆی تازە دەورادەوری پاریسی تەنیبۆوە: هەرکیان واژۆی دەکەن، بەڵام دوایی خۆیان دەکووژن، ڕەنگە لیۆد جۆرج و کلیمینجووش هەروا بکەن، یان لەوانەیە هەروا بە ئاسانی بۆمبێک حەوادەن.١١٠١

بیست و هەشتەمی مانگی ژوەن وەک ڕۆژێکی پیرۆزی هاوین هەڵهات. ئەو بەیانیە، گارانتی ئانگلۆ-ئەمیریکەن بۆ مەبەستی هاتن بۆ داکۆکیکردن لە فەڕەنسە ئەگەر هات و لەلایەن ئەڵمانەوە

هێرش کرایە سەری شکڵ و شێوازێکی ڕەسمی پێ بەخشرا کاتێکە فەڕەنسەیەکان پەیماننامەی جیاجیایان لەگەڵ بەریتانیەکان و ئەمریکیەکان واژۆکرد. ئەو گارانتیە چەندە گرنگی پێدەدرا باسێکی تر بوو. هاوس لەوە گوامانی هەبوو کە ئەو گارانتیە بتوانێ ڕەزایەتی ناوبراو بەدەست بێنێت: ئەو هەمیشە وەکوو ڕێگرێکی بەکەڵک لەبەرانبەر فەڕەنسەیەکاندا دیتبووی، نەک وەک ئەرکێکی جەسوورانە. ویلسۆن پێی خۆش بوو رازیبوونی خۆی نیشان بدات: ئەو بە کۆڕێکی چاپەمەنی ڕاگەیاندبوو کە " ئێمە تاڕادەیەک خۆمان بەدەستەوەدا تا بە ئەم شێوەتێڕوانینەی فەڕەنسەیەکان بگەین." ئەو بەدڵنیایەوە چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد کە کاتێکە کۆمەڵەی گەلان کەوتەکار، زۆر بەر لەوە کە ئەڵمانیا بۆ ڕایەکی تر مەترسی لێبکرێت گارانتیەکە هەست بەپێویستبوونی ناکرێت.١١٠٢

سەیارەکان ئاشتیکەرانیان بەرەو ڤێرسایلێس ڕاگواست. (ئەمیندارانی مێینە لە شاندی بەریتانیەوە بەختەوەریەکی کەمتریان هەبوو؛ ئەوان وەکوو" ماسی ساردین" خرانە ناو لۆریەکانەوە.١١٠٣) ڕێگای یەک-مایلی لە دەروازەکانەوە بەرەو خودی کۆشکەکە هێزی زرێپۆش ڕاوەستاوی فەڕەنسەیی لە یۆنیفۆڕمی شین و کڵاوئاسنی پۆڵا ریزیان بەستبوو، و ئاڵا سووره وسپیەکان بە سەرەنێزەکانەوە بە شنەی با دەشەکانەوە. لە حەوشەوە، کە لە هێزی سەربازی جمەی دەهات، بانگێشتکراوان پەیژەی مەزنیان تێپەڕاند و ئەندامانی گاردی ڕیپابلیکەن بە شەرواڵی سپیرەنگ، چەکمەی ڕەش، کۆتگەلی شینی پڕرەنگ و کڵاوئاسنی نوقرەیی بە یاڵی درێژی ئەسپەوە دەورەیان دابوو، و وەک ڕێلێنان شمشێرەکان لەسەرەوە ڕاگیرابوون.

لە هۆڵی مێررس، جەماوەر- سیاسەتمەداران، دیپلۆماتکاران، ژەنەڕاڵەکان، گوزارشەهەڵگران، تاقمێک سەربازی ئاسایی کەم ئەندام (سەربازانی فەڕەنسەیی بە دەست برینی قورسەوە دەیانناڵاند)، کۆمەڵێک ژن- کاتێکە لەسەر کورسیە سووررەنگەکانی پەرلەمانی جێگیربوون هەر ویزەویزیان دەهات و مشت و مڕیان بوو. دەستەی ڕاگەیاندن لە سووچێکی زوورەکە پاڵیان بەیەکەوە دابوو. ئەمە یەکەمین جار بوو کە پەیماننامەیەکی سەرەکی فیلمی لێهەڵدەگیرا. فرانسیس ستێڤێنسۆن زویر ببوو: " چۆن دەکرێ هۆشت لەسەر بابەتێک بێ و هاوکاتیش چەند کەس بە کامێراوە هەر یەکەو لە سووچێکەوە خەریکی فیلم هەڵگرتن بن، ئەویش مەبەستی سەرەکی ئەوان ئەوەندەی کە دەتوانن نزیکبوونەوە لە کەسایەتیە ناودارەکان بێت؟" چەندین کەسایەتی جێگایان دیار بوو. فۆچ چووبوو بۆ بارەگای گشتی لە ڕاینلەند. ئەو قەت کلیمینجووی نەبەخشیبوو: " ویلیامی دووهەم شەڕی دۆڕاندبوو...کلیمنجووش ئاشتی." کورسیەکانی چینیەکان چۆڵ بوون چون چین حازر نەبوو پەیماننامەکە واژۆ بکات؛ لە ناڕازیبوون دژ بە بڕیاری بەخشینی شانگتۆنگ بە ژاپۆن.١١٠٤

یەک بە دوای یەک کەسایەتیە ناودارەکان هاتنە ژوورەوە و کورسیەکانی خۆیان لە پشت مێزێکی هەرە گەورە بە دوو مێزی کورتر لە ناوقەددا دۆزیەوە. کلیمینجوو کەیفخۆش بوو. ئەو بە لانسینگی وتبوو کە " ئەمە رۆژێکی گەورەیە بۆ فەڕەنسە." کۆپلەیەک لە پەیماننامەکە لە بوخچەیەکی چەرمی تایبەتدا بەسەر مێزێکی بچووکی لۆویسی XV داندرابوو. لە سەرەوە وێنەکانی لۆویسی XV-وەک ئیمپراتۆری ڕۆمانیا، دەسەڵاتداری گەورە و سەرکەوتوو بەسەر هێزە بیانیەکان-کورتە ئاماژەیەک بوو لە دوایەمین بەشی شەڕی دووروودرێژی نێوان فەڕەنسەیەکان و ئەڵمانیەکان. لە کاتەژمێر سێی دوانیوەڕۆدا، دەرگاوانان داوای بێدەنگیان کرد. کلیمینجوو دەستووری دا " ئەڵمانیەکان بهێننە ژوورەوە." گاردێکی هاوپەیمانی لە دەرگاکەوە هاتە ناوەوە و لە پشتیانەوە دوو نوێنەری ئەڵمانی بوو بە جل و بەرگی ڕەسمیەوە. نیکۆلسۆن لە گوزارشەکەی خۆیدا هێنابووی کە " ئەوان هەتابڵێی ڕەنگ زەرد و ترساون." ئەوان لە نوێنەرانی میلیتاریتزمێکی دڵڕەق ناچن." زۆربەی دانیشتوان، وەکوو خودی نیکۆلسۆن زۆر بەداخەوە بوون بۆیان.١١٠٥

کلیمینجوو بە کورتە بەیاننامەیەک دەستپێشخەری کرد. نوێنەرانی ئەڵمانی بەرەوپێشەوە هەنگاویان نا، هەزار جووت چاویان لە بەردەمی خۆیان دەبینی. ئەوان ڕەواننووسیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو تا نەکا پێویستیان بەو پێنووسانە بێت کە لەلایەن کۆمەڵانی نیشتمانپەروەری فەڕەنسەییەوە ئامادەکرابوون، و بە دەستی لەرزۆکەوە پەیماننامەکەیان واژۆ کرد. بەڵام هیچ جووڵەیەکیان نەکرد. سیگناڵێک لە ژوورەکەوە بۆ جیهانی دەرەوە نیشاندرا. لە سەرانسەری ڤێرسایلێس تەقە هەستا و کاتێکە تفەنگەکانی تر لەگەڵ ئەو تەقەیە هاوئاهەنگ بوون تا فەڕەنسە ڕوویی. هاوپەیمانان و زلهێزە گەورەکان یەک بە دوای یەک پەیماننامەکەیان واژۆ کرد و دواتر ڕیزیان بەست تا دوو ڕێکەوتنامەی تر واژۆ بکەن، پرۆتۆکۆلێک لەسەر بەڕێوەبەرایەتی ڕاینلەند و پەیماننامەیەک لەگەڵ پۆڵەندا.١١٠٦

پائۆل کامبۆن هەمووی ئەو کارەی لا قزێون بوو. " ئەوان تەنیا مووزیک و کچە سەماکەری بۆلیتیان نیە، تا بە سەماکردن، بۆ واژۆکردن پێنووس بدەن بە دەست دەسەڵاتدارانی گشتی. لۆویسی XV حەزی لە بۆلیتەکان دەکرد، بەڵام تەنیا وەک پشوودانێک؛ ئەو لە ژوورەکەی خۆیدا پەیماننامەکانی واژۆ دەکرد. دیموکراسی لە پاشای مەزنیش شیرینترە. " هاوس ئەوەی زیاتر وەکوو سەرکەوتنێکی ڕۆمانی سەیر دەکرد، بە ڕاکێشانی شکستخواردووان بەدوای ئەرابەکانی سەرکەوتوان: " بەبۆچوونی من ئەوە لەگەڵ ئەو سەردەمە تازەی کە ئێمە وەک حەزێکی بەتەوژم بۆ گەشەکردن بانگەشەی بۆ دەکەین یەک ناگرێتەوە. خۆزگەی بکرایە لەو ئاسانتر بوایە و سیستەمێکی

سوارچاکی لە گۆڕێدا بوایە، کە بەگشتی لێی بێ بەش بوو. ڕەوشەکە بەگشتی بە ووردی پەرەی سەندبوو و ئەوەندەی کە دەیتوانی سووکایەتی بە دوژمن دەکرد." لاوێکی ئەمریکی گەشبینانەتر لەوە بیری دەکردەوە و لای وابوو کە بازنەی کۆنباوی تۆڵەساندنەوە و تۆڵەساندنەوەی زیاتر لە ئورووپا کۆتایی پێهاتوە و چیتر باوی نەماوە.١١٠٧

لە سەرەتادا دانیشتوان بە بێدەنگیەکی پڕ لە ڕێز و حورمەتێک سەیریان دەکرد، بەڵام دواتێپەڕبوونی چەند چرکە دەنگەدەنگی وتوێژەکان بەرزبۆوە. ئەو نوێنەرانەی کە کۆتاییان بە واژۆکردنەکە هێنابوو پیاسەیان دەکرد و لەگەڵ دۆستان وتوێژیان دەکرد. کەسانی تر کۆپلەیان لە پرۆگرامەکانی خۆیان واوە دەهێنا تا واژۆ بکرێن. ئەڵمانیەکان دوورەتەریک دانیشتبوون تا لە ئاکامدا بۆلۆڤیایەکی ئازا، و دواتریش دوو کەنەدایی، پەیابوون تا داوای واژۆکانیان لێبکەن. دوا تێپەڕبوونی چل و پەنج خولەک داوای بێدەنگی کرا و کلیمینجوو کۆتایی هاتنی کۆڕەکەی ڕاگەیاند. ئەڵمانیەکان بەباشی ئیسکۆرت دەکران موولێر سوێندی خواردبوو کە وەک بازاڕیەک هەڵس و کەوت بکات: " من دەمەویست دوژمنانی ئێمە لە ئێش و ئازاری خەڵکی ئەڵمان هیچ تێنەگەن، خەڵکێک کە لەم قۆناخە تووشەدا من نوێنەریان بووم." لە گەڕانەوەدا لە هۆتێل ئەو بەجارێک تێکشکا. " ئارەقێکی سارد کە قەت بەخۆمەوە نەم دیبوو سەرتاسەری وجوودمی داگرت – وڵامدانەوەیەکی جەستەیی کە بەدوای گوشارێکی لەڕادەبەدەری دەروونیدا درووست ببوو. و لەوکاتەدا، بۆ یەکەم جار، من هەستم کرد کە ناخۆشترین کاتی ژیانم خەریکە ڕووبەڕووم دەبێتەوە." ئەو و پاشماوەی پارتەکەی لەسەر ئەوە پێداگریان کرد کە هەر ئەو شەوە بەرەو ئەڵمانیا وەڕێکەون.١١٠٨

ئاشتیکەران بەپێیان بەرەوخوار بۆ هەیوانێک چوون کە دەیڕوانیە باخە ڕەسمیە گەورەکان و هاوکات پڕیشکەی تاڤگەکان دەگەیشتە ئاسمان. جەماوەرێکی گەورە و پڕتاسە و تین تەموورەی ئەوانیان دابوو. ویلسۆن خەریک بوو حەوا درێتە ناو یەکێک لە تاڤگەکان. لیۆد جۆرج ڕزگاری بوو، لەلایەن تاقمێک سەربازەوە تووڕە و پەشێو کرابوو. ئەو بە دیپلۆماتێکی ئیتالی ڕاگەیاندبوو کە " شتی وا هاوچەشن لە ئینگلەند قەت ڕووی نەداوە. و ئەگەر ڕووی بدایە کەسێک دەبوایە تاوانەکەی بدایە." بەدوای ئەوەدا لیۆد جۆرج، سەرەڕای ئەوە کە زۆری پێ نارەحەت بوو، ناچارکرا تا دانیشێت و نامەیەک بۆ پاشا بنووسێت و پێی ڕاگەیەنێت کە لەسەر ئاشتی بڕیاریان ساخ بۆتەوە.١١٠٩

ئەو شەوە ویلسۆن بە شەمەندەفەڕ بۆ لی هاڤرێ و وڵاتەیەکگرتوەکان وەڕێ کەوت. کلیمنیجوو هات تا چاوی بە ئەو بکەوێت و، بەبۆچوونی گوزارشگەرێک، بە هەست و سۆزێکی نائاساییەوە وتی کە" واهەست دەکەم کە یەکێک لە باشترین هاوڕێکانی خۆمم لە دەست داوە." جەماوەرێکی

بچووک چەند هات و هاوارێکیان کرد تا ئەمریکیەکان لەسەر ڕێگای خۆیان وەبەر خۆیان دەن. لە هۆتێل مەجێستیک بەریتانیەکان ئێوارەخوانێکی تایبەتیان بۆ سازکرا، بە ژەمێکی زیاتر لە جاران و شامپاین بەخۆڕایی. بەدوای ئەوەدا کۆڕی سەماکردن هاتن، یەکیان بۆ ستافی هۆتێلەکە و ئەوی تریان بۆ میوانەکان.

سمووتس، ڕەنگبێ وەک نارەزایەتیەکی تر دژ بە پەیماننامەکە، پێوەندی بە کۆڕی سەماکردنی ستافەکەوە گرت. خودی پاریس بوو بە میوانداریەکی گەورە، چون شەقامەکان لە خەڵکانێک کە گۆرانیان دەکوت و سەمایان دەکرد جمەی دەهات. بەدرێژایی بۆلوارەکانی گراندس چراکانی ماڵەکان شۆقیان دەداوە و سەیارەکان تۆپی بەردهاوێژی ئەڵمانیان بەگوریس ڕادەکێشا و واوە دەیانهێنا. (چەندین ڕۆژی خایاند تا بەرپرسان توانیان بۆ جارێکی تر کۆیان کەنەوە.) دواتر هەر ئەو شەوە، دوا ئەوەی کە لانسینگ ژمێریاری ئەو ڕۆژەی کۆتایی پێهێنا، هێشتا هەر دەنگی جەشن و خۆشیەکانی لە دەرەوە دەبیست.١١١٠

❊ ❊ ❊ ❊

هاوکات کە پاریس شادی دەکرد، ئەڵمانیا شینی دەکرد. لە شار و شارۆچکەکانی ئەو وڵاتە ئاڵاکان بەشێوەی نیوەهەڵدراو هەڵدرابوون. تەنانەت ناسیۆنالیستە باشەکانیش لەو کاتەدا باسی " ئاشتیەکی خوێڕیانە"یان دەکرد. زۆر لەولاترەوە لە بالتیک، شوێنێک کە گیانفیدایانی ئەڵمانی دژ بە بیروباوەڕی بۆلشویزم (و بۆ سەرلەنوێ سەپاندنی دەسەڵاتی ئەڵمان) شەڕیان دەکرد، هەواڵەکان وەکوو هەورە تریشقە بەگوێ دەگەیشت. نەفەرێک گێڕایەوە کە " ئێمە لەبەر سەرمای بێ کەسی خۆمان دەلەرزاین. ئێمە باوەڕمان وابوو کە وڵاتەکەمان قەت پشتمان تێناکات."ناسیۆنالیستەکان خائینانێکن کە لە پشتەوە خەنجەریان لە ئەڵمانیا دابوو، و ئەنجوومەنێکی حکوومیان کە پەیماننامەکەی واژۆکردبوو سەرلۆمە دەکرد.

کۆماری ویمار قەت ئەو بارە قورسەی لەسەر شانی سووک نەبوو. ناسیۆنالیستەکان بەڕووی خۆشەوە بەڵێنیەکەی خۆیان لەسەر گومان نەکردن لە نیشتمانپەروەری کەسانێک کە دەنگیان بە پەیماننامەکە دابوو شکاندبوو، و بۆ بێ ئابڕووکردنی ئەوان لەبەردەم خەڵکی ئەڵمانیا ئەوەی لەدەستیان هات کردیان. لە ساڵی ١٩٢١، کاتێکە بۆ پشوودان چوو بوو بۆ بلەک فارێست، ئیرزبیرگیر لەلایەن دوو ئەفسەری سووپای پێشووەوە ترۆر کرا. ڕۆژنامەیەکی ناوداری ناسیۆنالیستی وتبووی" پیاوێک کە هێشتا ڕۆحەکەی هەر بەنارەحەتیەوە لەنێوان زۆربەی دایرەکان و یاساکانی حکوومیدا باوی هەیە، لە ئاکامدا سزایەکی ئەوتۆی بۆ خائینێک مسۆگر کرد." بکووژەکانی ئەو بۆ مەجارستان هەڕایان

کرد بەڵام کاتێکە هیتلێر دەسەڵاتی گرتە دەست وەک "دادوەرانی ئیزینبیرگ" بە سەرکەوتوویەوە بۆ ئەڵمان گەڕانەوە. لە ئاکامدا هەرکیان دوای شەڕی دووهەمی جیهانی دادگایی کران.١١١١

هاوکات لە ئینگلەند، ژان ماینارد کەینیس سەیری داهاتووی خۆی دەکرد. ئەو لە سندووقی گەنجینە دەستی کێشابۆوە بەرلەوەی پەیماننامەکە واژۆ بکرێت لەڕووی ڕق و قینەوە پاریسی چۆڵ کردبوو. ئەو لە ٥ی مانگی ژوەندا بۆ لیۆد جۆرجی نووسیبوو کە " من بەتەمابووم تەنانەت لەم چەند حەفتە ناخۆشەی دواییشدا ئێوە بتوانن بۆ ئەوەی ئەم پەیماننامەیە بکەن بە بەڵگەیەکی بەسوود و ڕاست و درووست ڕێگەچارەیەک بدۆزنەوە. بەڵام وادیارە تازە زۆر درەنگ کەوتووە. شەڕەکە دۆڕاوە." کەینێس حاڵەتێکی نائاسایی هەبوو. ئەو بە ڤیرجینیا و ۆلفی ڕاگەیاند کە " ئورووپا، بەتایبەت ئەو چینە دەسەڵاتدارانەی کە ئەو بەشێک لەوانە بوو، چارەنووسیان دیاری کرابوو، کەچی ئەو لەنامەیەکدا بۆ هاوڕێیەکی تری نووسیبوو کە ئەو یەکجار بە گەڕانەوەی بۆ کەمبریج خۆشحاڵ دەبێت. لەباری تاکەکەسیەوە ئەو هەتابڵێی هەم لەباری کۆمەڵایەتیەوە و هەمیش لەباری پیشەیەوە سەرکەوتوو بوو، بەڵام سەبارەت بە ڕۆڵی خۆی لە جەنگدا دوا ئەوە کە زۆربەی هەرەزۆری هاوڕێیانی بلووزمبێری ئەو ئاشتیخوازیان لێدەرهاتبوو هەستی بە تاوانباربوون دەکرد. ئەوانیش بەنۆبەی خۆیان گاڵتەیان بە سەرکەوتنی جیهانی ئەو، هاوڕێیانی تازەی ئەو، ئەزموونەکانی ئەو لە هەستی خۆشەویستی بەرانبەر بە ڕەگەزی جیاواز دەهات. پێدەچێ *ئاکامگەلی ئابووری ئاشتی* هەوڵێک بووبێت لەپێناو چاکسازی و قەرەبووکردنەوەدا. پێدەچێ بە واتەی لامۆنت، پسپۆڕی ئەمریکی لەسەر قەرەبووەکان " کەینیس لەوە عاجز بووبێت کە چون ئەوان گوێیان بۆ ڕاوێژەکانی ئەو نەگرتوە، ئەویش ئاگری تێبەربوە و شوێنەکەی چۆڵ کردوە."١١١٢

کەینیس زۆربەی ئەو هاوینە خۆی بە نووسین خەریک کرد. لە مانگی ئۆکتۆبردا ئەو بۆ جارێکی تر چاوی بە ناکێری ئەڵمانی مێلچۆیر لە کۆڕێکدا لە ئامستێردام کەوت. ڕەشنووسێکی بۆ خوێندەوە؛ مێلچۆیر زۆر کاری تێکرابوو. ئەمە جێی سەرسووڕمان نەبوو، چون کەینیس ڕەنگدانەوەی بەشێکی زۆر لەو بۆچوونانە بوو کە خودی ئەڵمانیەکان سەبارەت بە پەیماننامەی ڤێرسایلێس هەیانبوو. *ئاکامەکانی ئابووری* ئاشتی درووست بەرلە کریسمەسی ساڵی ١٩١٩ دەرکەوت و هەر لەو کاتەوە چاپ کراوە. نزیک بە ١٠٠،٠٠٠ کۆپلەی لێفرۆشرا و هەر لە یەکەم ساڵی دەرکەوتنی بە یازدە زمان وەرگێڕدرایەوە، یەکێک لەوانە زمانی ئەڵمانی بوو. لە سێنای ئەمریکا لەلایەن ڕکابەرێکی ناوداری پەیماننامەکەوە چەند بابەتێکی لێوەرگیرا و خوێندرایەوە. کتێبەکە لە ئەڵمانیا سەرکەوتنێکی بەرچاوی بەدەست هێنا، و لە جیهانی ئینگلیزی-زمان توانی ڕای گشتی بکات بە دوژمنی ڕێکەوتنامەکانی ئاشتی و دوژمنی فەرەنسیەکان.

لە ساڵی ١٩٢٤، یەکێک لە وەزیرەکانی کابینە لەناو حکوومەتی کرێکاریدا لە بەریتانیا بەم شێوەی ژێرەوە ئاماژەی بە پەیماننامەکە کرد " پەیماننامەیەک لە خوێن و لە ئاسن کە دوژمنایەتی لەگەڵ هەر یاسایەک کە سەربازانی ئێمە خەباتیان لەپێناو دەکرد هەبوو."١١١٣

دوا ئەوە کە بیرەوەریەکانی بارووذۆخێکی نالەبار و تووش لە ساڵی ١٩١٩دا وردە وردە لە مێشکدا نەمان ئەم باوەڕە قاوی پەیاکرد کە ئەگەر تەنیا سیاسەتمەدارانی لاواز و بەرتیل خۆر پێداگریان بکردایە ئەڵمانیا دەیتوانی لەبەرانبەر مەرجەکانی ئاشتیدا بوەستێت. وەک لە گۆرانیەکدا دەکوترایەوە پەیماننامەکە " تەنیا کاغەزێک" بوو و بەس. لە ساڵی ١٩٢١دا، دیپلۆماتێکی فەرەنسەیی لە گوزارشێکدا بۆ پاریس هێنابووی کە " هەڵمەتێکی توندوتیژ بە کەڵک وەرگرتن لە ڕاگەیاندن، پۆستێر و کۆڕوکۆبوونەوە لە ئەڵمانیا لەڕێدایە تا بنەمای یاسایی پەیماننامەی ڤێرسایلێس پێشێل بکات: تاوانی ئەڵمانیا لە جەنگ." دایرەی دەرەوەی ئەڵمانیا بەشێکی تایبەتی بەناوی "تاوانی جەنگ" دامەزراند کە لێکۆڵینەوەی ڕەخنەگرانەی دەدا دەرەوە لە هۆڵەکانی بیرەی باڤاریا، هیتلێری لاو بە جنێو و هەراهەرای وەکوو "ئاشتی شەرمویێنانە" جەماوەری لە دەوری خۆی خڕ دەکردەوە.١١١٤

ڕای گشتی لە بەریتانیا و لە ولاتەیەکگرتووەکان جارلەگەڵجار لەسەر ئەم بۆچوونە زیاد دەبوو کە گوایە ڕێکەوتنامەکانی ئاشتی لەگەڵ ئەڵمانیا هەتابڵێی ناڕاست بوون. لەماوەی دەیەی دواتردا، بیرەوەریەکان و ڕۆمانەکانی وەکوو *بێدەنگیەکی گشتی لەسەر سنووری ڕۆژئاوا* (کە هەر لە یەکەمین ساڵی چاپی ئینگلیزیەکەیدا ٢٥٠،٠٠٠ کۆپلەی لێفرۆشرا) نیشانیان دا کە سەربازانی هەردوو لاوە وەکوو یەک بەدەست ترس و وەحشەتی شەڕی ناو قۆرت هاتبوونە وەلئامان. بڵاوبوونەوەی دۆکیۆمێنتی تایبەتی و نهێنی لە ئارشیڤەکانی پێش جەنگ ئەم بۆچوونەوە کە ئەڵمانیا بە تاقی تەنیا بەرپرسی دەستپێکردنی شەڕ بوە لەبەرچاو ناگرێت. کتێبگەلێک سەبارەت بە سەرەتاکانی جەنگ بەگشتی تاوانی جەنگیان دەخستە ئەستۆی ڕەژیمگەلی لەناوچوو لە ڕووسیە یان مەجارستان-ئوتریش، بەرهەمهێنەرانی چەک و تەقەمەنی یان بەگشتی کاپیتالیزم.١١١٥

لە خودی ئەڵمانیا، سکالاکان لەلایەن ژمارەیەکی یەکجار زۆری گرووپگەلی ناسیۆنالیستیەوە تازەکرانەوە کەسانێک کە بەشێکی زۆر لەم حەقیقەتەیان پێکهێنابوو کە گوایە بەملوێن ئەڵمانی-ئاخێوەر لەوکاتەدا هەستیان بەوەکردبوو کە لە سوودێنتلەندی چکسلەواکیا، لە پۆڵەندا و لە شاری ئازادی داسنزیگ کەوتوونەتە ژێر دەسەڵاتی بیانیەکانەوە. بەندەکانی تایبەت بە چەکدامالین وەکوو دووڕوویی و لەمپەری سەرڕێی یەکگرتنەوەی ئەڵمانیا و ئوتریش وەک پێشێلکردنێکی ئاشکرای یاسای خود-موختاری سەیر دەکران. قەرەبووەکان "سزادەرانە" و

وەحشیانە" بوون، ئەم نابەرانبەریە لەگەڵ ئەم حەقیقەتە تێکەڵ ببوون کە ئەڵمانیا دەبوایە پەیماننامەی ڤێرسایلیسی واژۆ بکردایە بەبێ ئەوە کە بزانێت ڕێژەی کۆتایی چەند دەبێت. لە ئەڵمانیا دیکتەیت ("پەیماننامەی داسەپاو") تاوانی هەمووی ئەو هەڵانەی کە ئابووری دەگرتەوە دەخستە ئەستۆی خۆی: بەرزبوونەوەی نرخەکان، حەقدەستی کەم، بێکاری، ماڵیات، زۆربوونی پارە. بەبێ ئەرکی قورسی قەرەبووەکان، ژیان دەگەڕایەوە بۆ قۆناخی ئاسایی خۆی؛ خۆرەتاو دەکەوت و لە باخە بیرەکان، ژێرزەمینگەلی شەراب و پارکەکان دوانیوەڕۆیانێکی شاد و خۆش بەسەر دەبران. ئەڵمانیەکان حاشایان لەم ڕاستیە دەکرد کە خەباتکردن لە شەڕی گەورەدا زۆر گران تەواو بوە، و ئەوەکە دۆڕاندنی ئەو شەڕە بەومانایە بوە کە ئەوان نەیانتوانیوە خەرجەکان بۆ سەر شانی کەسانی تر بگوێزنەوە.١١١٦ وەکوو زۆربەی خەڵک لەوکاتەدا، ئەوانیش لەوە تێنەگەیشتوون کە پارەی قەرەبووەکان قەت بەو ڕادە زۆرە نەگەیشتوە کە لە وتوێژەکانی خەڵکدا باسی لێ دەکرا.

تابلۆی کۆتایی لە ساڵی ١٩٢١دا لە لەندەن بڕی ١٣٢ بیلیۆن مارکی تەڵای نیشان دا. (نزیک بە ٦.٦بیلیۆن پۆند یان ٣٣بیلیۆن دۆلاری ئەمریکی). لەڕاستیدا، لەڕێگای سیستەمێکی داهێنەرانەی پۆند و بەندگەلی پێچەڵاوپووچ، ئەڵمانیا بەوە پێمل کرا کە کەمتر لەنیوەی ئەو بڕەپارەیە بدات. ئەویتریشی تەنیا کاتێک دەیداتەوە کە هەل و مەرجەکە هێور ببێتەوە، وەکوو چاکسازی لە ڕادەی هەناردەکانی ئەڵمانیا. ئەڵمانیاش بودجەی باشی بۆ داینی پارە بەشێوەی دەستی یان بەشێوەیەک کە تازە دەستی پێکردبوو پێبەخشرابوو، وەکوو گەڕاندنەوەی ئەو کتێبانەی کە لە کتێبخانەی لۆڤەین لە بلژیک لە سەرەتای جەنگدا هێزەکانی ئەڵمانی سووتاندبوویان، یان بوودجە بۆ ڕێگاکانی شەمەندەفەری ئەڵمانی لە ناوچەکانی سەرسنووری پۆڵەندا. (ئەو وڵاتە سەرنەکەوتووانە داوای ئەو کەشتیانەی کردبوو کە لە سکاپا فلەو نووقمی ئاو ببوون.) هەرچەند بۆ چەندین کەڕەت بە پلانەکانی تایبەت بە دانەوەی پارە چوونەوە، کەچی، ئەڵمانیەکان سەبارەت بە قەرەبووەکان هەر بۆبۆڵەبۆڵیان دەهاتێ و ناڕازی بوون. بە یەکدەنگیەکی کەموێنە لە سیاسەتی ویماردا، ئەڵمانیەکان هەستیان بەوەکرد کە پارەیەکی زۆر خەریکن دەبەخشن. ئەڵمانیا بەشێوەیەکی ئاسایی لەسەر دانەوەی پارەکان بۆ دواجار و بە ئێگجاری لە ساڵی ١٩٣٢دا کەمترخەمی دەکرد. ئۆرلاندۆ لە ساڵی ١٩١٩ سەبارەت بەمە هۆشداری دابوو، لەوکاتەدە ابوو کە وتی توانایی دایینی پارە بەسراوەتەوە بە ئیرادەی قەرزدەرەکە. ئەو لە درێژەی قسەکانیدا هێنابووی کە " قەبووڵکردنی پێکهاتەیەک کە بێ ئیمانی و نەکرکاری لێدەبێتەوە زۆر مەترسیدارە."١١١٧

له لێکدانەوەی کۆتاییدا، لە سەردەمی نێوان ساڵەکانی ١٩١٨ و ١٩٣٢دا ئەڵمانیا دەبێ نزیک بە ٢٢بیلیۆن مارکی تەلای بووبێت(١.١بیلیۆن پۆند، ٤.٥بیلیۆن دۆلاری ئەمریکی). ڕەنگە ئەوە تۆزقاڵێک کەمتر لەو ڕادەیە بێت کە فەڕەنسە، بە ئابووریەکی یەکجار بچوکترەوە، دوابەدوای شەڕی فرانکۆ-پڕاشنی ساڵەکانی ١٨٧٠-٧١ بە ئەڵمانیای بەخشی.١١١٨ لە ڕوانگەیەکەوە تابلۆکان گرنگایەتیان هەیە؛ لە ڕوانگەیەکی ترەوە هەتابڵێی ناپەیوەستن. ئەڵمانیەکان بەو قەناعەتە گەیشتبوون کە قەرەبووەکان خەریکن ئەوان لەبەین دەبەن. ئەگەر ئەڵمانیا ئامادە نەبوایە تا قەرەبووەکان بداتەوە، هاوپەیمانان نەیاندەتوانی ئیرادەی خۆیان داسەپێنن. هاوکات کە پەیماننامەی ڤێرسایلێس بواری بۆ گەمارۆکان خۆش دەکرد-بەتایبەت، درێژکردنەوەی ماوەی ڕاینلەند- هاوپەیمانانیش دەبوایە ئەوانیان بەکار بێنایە. لە دەیەکانی ١٩٣٠دا نە بەریتانیەکان و نە حکوومەتی فەڕەنسەیی ئامادەیی ئەوەیان نەبوو لەسەر قەرەبووەکان یان هەرشتێکی تر ئەو کارە بکەن.

* * * *

لە ساڵی ١٩٢٤دا، ئەندامیکی بەریتانی لە کۆمیسیۆنی کۆنترۆڵی هاوپەیمانی-جیهانی، کە لەلایەن پەیماننامەی ڤێرسایلیسەوە بۆ مەبەستی چاودێریکردنی پابەندبوونی ئەڵمانیا بە مەرجەکانی نیزامی دامەزرا، وتارێکی بڵاوکردەوە کە تێیدا ڕەخنەی لە میلیتاری ئەڵمانیا گرتبوو و هێنابووی کە میلیتاری ناوبراو بەشێوەی سیستەماتیک ئاستەنگی خستۆتە سەر چالاکیەکانی خۆی و ئەوە کە بەشێوەیەکی بەربڵاو بەندەکانی تایبەت بە چەکداماڵینی پەیماننامەکەی پێشێل کردوە. لەناوەوەی ئەڵماندا ئەم بوختانە نارەزایەتیەکی بەربڵاوی لێکەوتەوە. (چەند ساڵ دواتر، دوائەوەکە هیتلێر دەسەڵاتی گرتەدەست، ژەنەراڵەکانی ئەڵمانی دانیان بەوەداهێنا کە وتارەکە ئەوەی کە درکاندوویەتی ڕاستە و هەڵەی تێدا نیە.١١١٩) ئەڵمانیەکان دەیانوت کە ئەو چەکداماڵینە گشتیەی کە بەربڵاو باسی لێدەکرا لەکوێیە؟ بۆ دەبێ ئەڵمانیا یەکەمین نەتەوەیەک لە جیهان دابێت کە چەکداماڵێ؟ ئەمریکیەکان، کە بە ڕەدکردنەوەی داخوازیەکانی کۆمەڵەی گەلان بە ئاشکرا لە کاروباری جیهانی پاشەکشێیان کردبوو، نەیاندەتوانی ناڕازی بن. بەریتانیەکانیش هەر وابوون. دوا ئەوەی کە فەڕەنسەیەکان ڕەخنەیان لەوەگرت کە ئەڵمانیا بەندەکانی میلیتاری لەبەرچاو نەگرتوە هەستیان بەوەکرد کە جارلەگەڵ جار خەریکن تەریک و دوورەپەرێزتر دەکەون.

لەوکاتەدا ڕادەی پێشێلکاریەکان تەنانەت بۆ فەڕەنسەیەکانیش بەتەواوەتی نەناسرابوو. یانەکانی هەڵفڕین لەپڕێکدا ناوبانگیان پەیاکرد و ئەوەندە کارامە بوون کە تەنانەت کاتێکە

هیتلێر بوو بە سەرەک وەزیران توانی لە ماوەیەکی یەکجار کەمدا هێزی هەوایی ئەڵمانیا دامەزرێنێت. هێزی پۆلیسی پرۆشا، گەورەترین هێز لە ئەڵمانیا، لە ڕێکخراوەیی و بارهێنانی خۆیدا تەواو میلیتاری لێدەرهاتبوو. ئەفسەرانی هێزی ناوبراو دەیانتوانی بە ئاسانی بەرەو سووپای ئەڵمانیا وەڕێ کەون، و هەندێکیان هەر وایان کرد. فرەیکۆرپسی خۆ-دامەزراو، کە لە ساڵی ١٩١٨دا سەری هەڵدابوو، هەڵوەشایەوە و ئەندامەکانیشی بەشێوەیەکی داهێنەرانە بەناوی چەتەگەلی کرێکاری، ئاژانسگەلی بایسیکیل، سیرکگەلی گەشتیاری و نووسینگەی پۆلیسی نهێنی چاکسازی کران. هەندێکیان بۆکۆمەڵ چوونە ناو سووپاوە. پەیماننامەی ڤێرسایلێس ژمارەی ئەفسەرانی ناو خودی سووپای بۆ ٤،٠٠٠ کەم کردەوە بەڵام سەبارەت بە دەرەجەدارەکان هیچی نەدەرکاند. بەم پێیە سووپای ئەڵمانی ٤٠،٠٠٠ گرووبان و سەرجووخەی هەبوو.١١٢٠ فۆچ ڕاستی دەکرد؛ سووپایەکی فیداکەر دەیتوانی بۆ پێشکەوتنێکی خێرا بڕبڕەی پشت دەستەبەر بکات واتە هەمووکارێکی لەدسەت دەهات.

کارخانەگەلێک کە کاتی خۆی تانکیان بەرهەم دەهێنا ئێستا لەڕادەبەدەر تراکتۆری قورسیان دەدا دەرەوە؛ لێکۆڵینەوەکە بۆ داهاتوو گرنگی هەبوو. لە کابارەکانی بەرلین، ئەوان سەبارەت بە کرێکارێک نووکتەیان دەگێڕایەوە کە گوایە ناوبراو پارچەگەلی کارخانەیەکی درووستکردنی کالیسکەی منداڵی بەقاچاخ بردبوو بۆ منداڵە تازەلەدایکبووەکەی خۆی تەنیا بۆ ئەوە بزانێت ئایا ئەو دەتوانێ کاتێکە پارچەکانی خستەوە سەر یەک ڕەشاشەیەکایان پێ درووست بکات. لە سەرانسەر ئورووپا، لە وڵاتانی بێلایەن و دوور لە مەترسی وەکوو نیدیرلەندس و سوئید، ئەو کۆمپانیگەلەی کە خاوەنداریێتی سەرەکی ئەوان لەدەست ئەڵمانیەکان دابوو کاریان لەسەر تانکەکان و ژێردەریایەکان دەکرد. باشترین شوێن، دوور لە چاوانی کۆمیسیۆنی چاودێری، یەکیەتی سۆڤیەت بوو. لە ساڵی ١٩٢١دا هەردوو نەتەوەی دابڕاوی ئەورووپا هەستیان بەوەکرد کە شتێکیان هەیە بۆ ئەوەی بە یەکتر پێشنیاری بکەن. لەبەرانبەر شوێن و نهێنی بۆ ئەزموونەکانی تایبەت بە تانکەکان، فرۆکەکان و گازی ژەهراوی، ئەڵمانیا یارمەتی تەکنیکی و بارهێنانی دەستەبەر کرد.١١٢١

کاتێکە مێژوونووسان، وەک هەمیشە کردوویانە، سەیری وردەکاریەکانی تریان دەکەن، دیمەنی ئەڵمانیایەک کە بە دەست ئاشتیەکی تۆڵەسێنەرانەوە لەناوچووە ناتوانێت دەوام بێنێت. ئەڵمانیا ناوچەکانی خۆی لەدەست دا؛ ئەوەش ئاکامی وازلێنەهاتوانەی دۆڕاندنی شەڕ بوو. ئەگەر وڵاتی ناوبراو شەڕەکەی ببردایەتەوە، نابێ لەبیرمان بچێت، بەدڵنیایەوە بلژیک، لوکزامبۆرگ، ناوچەگەلێک لە باکووری فەرەنسە و بەشێکی زۆری لە نیدرکەندس دەگرتەوە. پەیماننامەی برێست-

لیتوڤیسک ئارەزووەکانی فەرماندەیی عالی ئەڵمانی سەبارەت بە سنوورەکانی ڕۆژئاوا نیشان دا. سەرەڕای ئەوە کە ئەڵمانیا ناوچەکانی خۆی لەدەست دا وەک گەورەترین وڵات لە ڕۆژئاوای ئەورووپای یەکیەتی سۆڤیەت لەنێوان دوو شەڕەکەدا مایەوە. هەڵوێستی ستراتیژیکی ناوبراو زۆر لە هەڵوێستێکە بەر لەساڵی ١٩١٤ هەیبوو باشتر بوو. بە دووبارە سەرهەڵدانەوەی پۆڵەندا، ئێستا لەمپەرێک لەنێوان وڵاتی ناوبراو و وەیشومەی ڕووسیەی کۆن درووست ببوو. لەباتی ئوتریش-مەجارستان، ئەڵمانیا تەنیا زنجیرەیەک وڵاتی لاوازتر و پڕ لە هەرا و کێشەی لەسەر سنووری ڕۆژهەڵاتی خۆی بەدی دەکرد. وەک ساڵەکانی دەیەی ١٩٣٠ نیشانیان دا، ئەڵمانیا باشی بۆ کەوتبوو تا پەرە بە پێشکەوتی سیاسی و ئابووری خۆی لەنێوان ئەواندا بدات.

جیابوونەوەی ئەڵمانی ڕۆژهەڵات لە بەشەکەی تری ئەڵمانیا بێزاری بەدواوە بوو، بەڵام جیابوونەوەیەکی لەو چەشنە لە مێژووی ئەڵمانیادا شتێکی سەیر و تازە نەبوو، وڵاتێک کە ئەوەتا هەبوو وەکوو پینەی دیار و ناشیرین لە چەندین ناوچەی ناجۆر درووست ببوو. ئایا جیابوونەوەیەکی لەو چەشنە پێویستە ئاڵۆزی بەدوادا بێت؟ ئالاسکا لە پاشماوەی وڵاتەیەکگرتووەکان بە پارچەیەکی قەبە بەناوی کەنەدا جیاکراوەتەوە. دوایەمین جارێک کە واشنگتۆن و ئۆتاوا سەبارەت بە مافگەلی گواستنەوە ڕەخنەیان ئاراستەی یەکتر دەکرد کەی بوو؟١١٢٢ کێشەی ڕاستەقینە لەگەڵ کۆریدۆری پۆڵەندی لەوەدا بوو کە زۆریەک، یان لەوانەیە بڵێین، زۆربەی هەرە زۆری ئەڵمانیەکان لە ساڵەکانی سەردەمی شەڕدا، لەبەر هۆکارگەلێکی جیاواز لەپێوەند لەگەڵ بۆچوونگەلێک لەبابەت پۆڵەندیەکان و تووڕەبوون لە پەیماننامەی ڤێرسایلێس، ئەوەیان قەبووڵ نەدەکرد. ئەگەر پێوەندیەکانی نێوان پۆڵەندا و ئەڵمانیا باشتر کرابایەوە، ئەو ناوچە ڕێگرە نەدەبووە هۆی دروستبوونی گێرە و کێشە. دانزیگ بوو بە شارێکی ئازاد، بەڵام هێشتا لەبەرانبەر وەبەرهێنانی ئەڵمانی و کەشتیرانی ئەڵمانیدا دەرگای ئاوەڵا بوو.

لە ڕۆژئاواش، ئەڵمانیا لەگەڵ کەش و هەوایەکی سوودبەخش ڕووبەڕوو ببۆوە. شەڕ و شۆڕ فەڕەنسەی بەجارێک هەڵوەدا و ماڵوێران کردبوو، و لە ساڵەکانی دەیەی ١٩٣٠دا، وای لێهاتبوو کە نەیدەتوانی لەبەرانبەر ئەڵماندا بڕیاری خۆی ساخ بکاتەوە. گارانتی لەلایەن وڵاتەیەکگرتووەکان و بەریتانیاوە هیچ بایەخێکی نەبوو دوائەوە کە سێنای ئەمریکا نەیتوانی پەسندی بکات. هەوڵەکانی فەڕەنسە بۆ دروستکردنی هاوپەیمانی لەگەڵ نەتەوە لاواز و پڕ لە شەڕوشۆڕەکانی ناو ئورووپای ناوەندی هەنگاوێک بوون بۆ جیاکردنەوەی خۆی. لەلایەن بەریتانیەکانەوە یارمەتیەکی ئەوتۆی پێنەگەیشت، کەسانێک کە لەوە دڵنیا بوون کە ئیمپراتۆریەتی ئەوان لە هەمووشتێک بۆ ئەوان

گرنگتره. ئاشکراترین بەڵگە لەبابەت ئەوە کە ئاشتیکەران نەیانتوانیوە ئەڵمانیا یەختە بکەن بەدوای ساڵی ۱۹۳۹دا دەرکەوت.

بە ڕێبەرایەتیەکی جیاواز لە دیموکراسیەکانی ڕۆژئاوا، بە دیموکراسیەکی بەهێزتر لە ئەڵمانیای ویمار، بەبێ هیچ زیانێک لەلایەن دیپرێشنەوە[ خەمۆکی]، لەوانەیە بەسەرهاتەکە بە بارێکی تردا بگەڕایە. و بەبێ ئەوەی کە هیتلێر لەسەر دنەدانی توورەیەکانی ئەڵمانیە ئاسایەکان بڕیار بدات و کایە بە ویژدانی تاوانباری زۆر کەس لە دیموکراسیەکان بکات، لەوانەبوو ئورووپا گوزوگومەت بەدوای شەڕی یەکەمدا تووشی شەڕێکی تر نەبوایەتەوە. بۆ ئەوە نابێ سەرلۆمەی پەیماننامەی ڤێرسایلێس بکەین. چون قەت بەشێوەیەکی نەپساوە نەسەپاوە، یان تەنیا ئەوەندە بوە کە ناسیۆنالیزمی ئەڵمانی بهەژێنێت بەبێ ئەوەی لە دەسەڵاتی ئەڵمانی کەم بکاتەوە و نەهێڵێت ئاشتی ئەورووپا بشەوێنێت. بە سەرکەوتنی هیتلێر و نازیەکان لە ساڵی ۱۹۳۳دا، ئەڵمانیا حکوومەتێکی هەبوو کە لەسەر لەناوبردنی پەیماننامەی ڤێرسایلێس سوور بوو. لە ساڵی ۱۹۳۹دا، ڤان ڕیبین ترۆپ، وەزیری دەرەوەی ئەڵمانیا، بە ئەڵمانیە سەرکەوتوەکانی لە دانزیگ ئاوا ڕاگەیاند: " فوهرێر بێجگە لە سارێژکردنەوەی ئاکامە هەرە توندەکان هیچی تری نەکردوە ئاکامگەلێک کە ئەم دیکاتاتۆرە هەرە کەلەرەقەی کە مێژوو تاکوو ئێستا بەخۆیەوە نەدیوە بەسەر نەتوەیەکدا سەپاندویەتی و، لەڕاستیدا، بەسەر گشت ئورووپادا، بەواتایەکی تر خراپترینی هەڵەکانی چاکردۆتەوە کە لەلایەن سیاسەتمەدارانی دیموکراسیەکانی ڕۆژئاواوە تووش هاتوون."۱۱۲۳

# دەرەنجام

بە واژۆکردنی پەیماننامەی ڤێرسایلێس لە ٢٨ی مانگی ژوەنی ساڵی ١٩١٩دا، حکوومەتی پاریس هەڵوەشایەوە. ویلسۆن هەر ئەو شەوە ڕۆیی، لیۆد جۆرج و ئەوەی کە لە شاندی نوێنەرایەتی ئیمپراتۆری بەریتانی مابۆوە بەیانی ڕۆژی دواتر بە شەمەندەفەرێکی تایبەت ئەوێیان چۆڵ کرد. (حکوومەتی بەریتانی دواتر باپێشی ناخۆش بوویێت بۆی دەرکەوت کە فەرەنسەیەکان بیلێکی قەبەیان بۆ شەمەندەفەرەکە ناردبوو.) ئۆرلاندۆ، کە حکوومەتەکەی ئەویش ڕووخابوو، پێشتر ئەوێی چۆڵ کردبوو. کلیمینجوو، بەتاقی تەنیا لەنێوان چواریاری گەورەدا، لە پاریس مایەوە. ئەو ئەو هاوینەی بە چاودێری کردنی پەیماننامەکە لەڕێگای ئەنجومەنی نیشتمانییەوە و بە سەرپەرشتی کردنی ئامادەکارییەکانی ڕۆژێکی جەشنی نیشتمانی لە مانگی ژوولای تێپەڕاند. تەنیا پشووی ئەو سەردانێک کورت بوو بۆ ناوچە وێرانکراوەکانی باکوور. دوا ئەوەی کە ڕۆژنامەنووسان و نوێنەران گەڕانەوە بۆ ماڵێ هۆتێلەکانی پاریس لەبۆ کاروباری ئاسایی خۆیان سەرلەنوێ کرانەوە. ژنانی لەشفرۆش لەوە گلەییان دەکرد کە بازاڕیان بەسەرچوە.١١٢٤ لە کۆتایی مانگی هاویندا، بەریتانیەکان لە ماجیستیک[ زۆر مەزن] وازیان هێنابوو. دوو دەیە دواتر، ئەوێ بوو بە ناوەندی شاندێکی تری دەرەوە، ئەم جارەیان سووپای ئەڵمانی لە پاریس کەوتبوە داگیرکاری.

کۆڕی ئاشتی هەتا مانگی ژوولای ساڵی ١٩٢٠ درێژەی بە کارەکانی خۆی دا، بەڵام وەکوو بەرهەمێکی شانۆگەری لێهاتبوو کە ئەستێرەکانی نەمابوون. وەزیرانی دەرەوە و دیپلۆماتەکان بۆڕایەکی تر دەسەڵاتیان گرتەوە دەست بەڵام لەسەر پێوەندیەکانی دەرەوە قەت نەیانتوانی ئەو پێگەیەی جاران بەدەست بێننەوە. هەمیشە بڕیارە گرنگەکان دەگەڕێندرانەوە بۆ باڵادەستە سیاسیەکانی ئەوان لە ڕۆم یان واشنگتۆن یان لەندەن و کێشە ئاڵۆزەکان لە کۆڕوکۆبوونەوەی تایبەتدا تاو و توێ دەکران، بۆ نموونە لیۆد جۆرج بە تاقی تەنیا لەنێوان ساڵانی ١٩١٩ و ١٩٢٢دا لە سی و دوو کۆڕدا بەشداری کرد.

لەنێوان مانگەکانی ژانویە و ژوەنی ساڵی ١٩١٩دا، ئاشتیکەران دەسکەوتی زۆر گرنگیان بەدەست هێنابوو: کۆمەڵەی گەلان و ڕێکخراوەی جیهانی کار، بەخشینی ماندێتەکان، کۆتایی هاتنی پەیماننامەی ئەڵمانی، پەیماننامەگەلێک کە لەگەڵ ئوتریش، مەجارستان، بۆلغارستان و تورکیەی عوسمانی بەسرابوون- بەڵام زۆر کار بە ناتەواوی مابوونەوە. سنوورەکانی ڕووسیە هێشتا هەر لە کەمبوون و زیادبووندا بوون و ڕوون نەکرابۆوە کە کام یەک لە وڵاتەکانی ڕووسیە بەدرێژایی ناوچەکە سەربەخۆیی خۆیان هەڵدەگرن. فەنلاند؟ ئۆکراین؟ گۆرجستان؟ ئەرمەنستان؟ لە پاشماوەی ئیمپراتۆریەکانی ناوەندی ئورووپا سنوورەکان هێشتا هەر لە حاڵی هەڵوەشانەوەدا بوون. و بڕیارێک کە بەهێواشی ساخکرایەوە تا ڕێگە بە یوونانیەکان بدات لە سمیرنا نیشتەجێ بن زنجیرەیەک تەقینەوەی لێکەوتەوە کە هەتا ساڵی ١٩٢٣ کۆتاییان پێنەهات.

بێجگە لەوانە، هەندێک لە کێشە گەورەکان کە بە دەسپێکی کۆڕی ئاشتی ڕووبەڕووی ئاشتیکەران ببۆوە تەنیا دواخرابوون و بەس. بۆلشویزمی ڕووسی ڕاگیرابوو، بەڵام شەڕی دووردرێژی نێوان ڕۆژئاوای کاپیتالیستی و ڕۆژهەڵاتی کمۆنیستی تازە خەریک بوو دەستی پێدەکرد. پرسی ئەڵمانیا هێشتا کێشەی بۆ ئورووپا درووست دەکرد. سەرکەوتنی هاوپەیمانی زۆر یەکلاکەرەوە نەبوو و ئەڵمانیا زۆر بەهێز مابۆوە.

ناسیۆنالیزم، هیچ لە حاڵی شکست و ڕووخان دا نەبوو، خەریک بوو بەخۆی دادەهات و باڵ و پەری درووست دەکرد. لە ناوەندی ئورووپا و زۆر لەولاترەوە، لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین و لە ئاسیا سووتەمەنیەکی باشی بۆ سووتان لێبوو. لە زۆر بواردا ئاشتیکەران خۆیان لەگەڵ کاری کراودا دەبینیەوە. یۆگۆسلاڤیا، پۆڵەندا و چکسلەڤاکیا هەرهەموویان بەر لەوە کە کۆڕی ئاشتی دەستپێبکات هەبوون. باشترین کارێک کە ئاشتیکەران دەیانتوانی ئەنجامی بدەن ئەوە بوو کە هەوڵ بدەن کە نەهێڵن ئورووپا و ڕۆژهەڵاتی ناڤین هەڵوەشێنەوە و لەسەر بنەمای نەتەوەیی بوون بەش بەش بکرێن و ئەوەندەی کە دەکرێ سنوورەکان لەڕووی ئەقڵەوە دیاری بکرێن. داواکاری بۆ وڵاتانی-نەتەوەیی لەسەر بنەمای تاقە نەتەوەکان خۆی لەخۆیدا لە جیهانی ساڵی ١٩١٩دا نەتەوەیی نەبوو. واتە نەدەکرا هەمووی پۆڵەندیەکان لە وڵاتی پۆڵەندا و هەمووی ئەڵمانیەکان لە وڵاتی ئەڵمانیا لە دەوری یەک خر بکرێنەوە. بە تاقی تەنیا لە ئورووپا، ٣٠ ملوێن خەڵک لە وڵاتانێک بەجێ مابوون کە کەمینەی ڕەگەزی بوون، لە ناوەی وڵات بە گومانەوە سەیر دەکران و لە دەرەوەی وڵات لەلایەن هاووڵاتیانەوە بە ئاواتەوە.١١٢٥

لەو زستانە تووش و ناخۆشەی ساڵی ١٩١٩دا، دیپلۆماتێکی لاوی ئەمریکی لە ڤیەن شاندێک لە پیاوانی ڕیش-سپی لە سلۆڤینیاوە لە ڕۆژهەڵاتی باکووری ناوچەکانی باڵکانی میوانداریتی کرد. ئەوان بە

زمانی ئەڵمانی قسەیان دەکرد. شارۆچکەی ٦٠،٠٠٠ کەسی ئەوان نزیک بۆ ٧٠٠ ساڵ دەبوو کە بە زمانی ئەڵمانی قسەیان کردبوو. لەوکاتەدا سلۆڤینیا خەریک بوو دەبوو بە بەشێک لە وڵاتی تازەی چکسلەواکیا. ئەوان پێیان خۆش نەبوو لەلایەن کەسانێک کە هەستیان دەکرد لە چینێکی خوارترەوەن بەڕێوەبەرایەتی حکوومی بکرێن. ئایا وڵاتەیەکگرتووەکان بە لکاندنی ئەوان خۆشحاڵ دەبوو؟ نیکۆلاس ڕۆزڤێڵت، ئامۆزایەکی لاوی تێدی گەورە، داواکاریەکی پێشکەش بە باڵادەستەکانی خۆی کرد بەڵام هیچ وڵامێکی وەرنەگرت.١١٢٦ هەرچەند نە ڕۆزڤێڵت و نە ئەڵمانیە دێرینەکان هیچ زانیاریەکیان لەو بابەتەوە نەبوو، کۆمەڵگاکەی ئەوان، وەکوو زۆر کۆمەڵی تر، دوا ئەوەی کە ئەڵمانیەکان بەدوای شەڕی دووهەمی جیهانیدا بەزۆر لە بەشێکی زۆر لە ناوەندی ئورووپا دەرکران ڕوو لەناوچوون بوون.

لە ساڵی ١٩١٩دا جیهانیان هێشتا بە دەرکردنی کەمینەکان ژاکابوون و لە تواندنەوەی داسەپاو گرژ ببوون. لەوە دەچوو ئەوە تەنیا هەڵکردن لەگەڵ کەمینە لەلایەن زۆرینەوەی لێکەوتبایەتەوە، شتێک کە لە زۆربەی وڵاتان هەستی پێ نەدەکرا. ئاشتیکەران بۆ ئەوە کە حکوومەتەکان لەگەڵ کەمینەکانی خۆیان باش هەڵس و کەوت بکەن هەرچی ئەرکە بەسەریاندا سەپاندیان. وڵاتانی تازە و هەندێک لە دەسەڵاتە بچووکەکان لە ناوەندی ئورووپا دەبوایە پەیمانگەلێکیان واژۆ بکردایە کە دەیانکردە سەریان تا لەگەڵ کەمینەکان بەشێوەیەکی یەکسان و هاوچەشن مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت، تا لەگەڵ بیروباوەڕی ئاینی ئەوان هەڵ بکەن و بە ئەوان مافگەلێک وەکوو بەکارهێنانی زمانی تایبەت بەخۆیان پێ ببەخشرێت. هەم ڕۆمانیەکان و هەمیش یوگۆسلاڤەکان دەنگی ناڕەزایەتیان دەربڕی. شازادە ماریای ڕۆمانی لە ویلسۆن پرسیاری کرد ئەی کۆمەکی هاوچەشن بۆ ڕەشپێستەکان لە وڵاتەیەکگرتووەکان یان ئیرلەندیەکان لە بەریتانیادا دەبێ چی بێت؟ براتیانۆ، سەرەک وەزیری ڕۆمانیا، داوای کرد کە بۆچی وڵاتەکەی ئەو بەم شێوەیە خەریکە دەخرێتە پەراوێزەوە؟ ئیتالیا چەندین کەمینەی هەبوو بەڵام داوای واژۆکردنی لێ نەدەکرا. کلیمینجوو لەڕووی داماویەوە بە ئەوی ڕاگەیاند کە ئورووپایەکانی ڕۆژهەڵات لەوە جیاواز بوون. هەرچەند هەم ڕۆمانیا و هەمیش یوگۆسلاڤیا لە ئاکامدا واژۆیان کرد، ئەوە دەسپێکێکی مزگێنی هێنەر نەبوو.١١٢٧

پەیماننامەگەلی کەمینەکان لەبەرانبەر شۆڤینیزمی لەحاڵی گەشەی نیشتمانیدا جووڵەیەکی لاواز و نادیار بوون. لە ساڵی ١٩٣٤دا کۆمەڵەی گەلان لە هەوڵدان بۆ چاودێریکردنی ئەوان وازی هێنا و زلهێزانیش لە پەنای کەمینە نادیارەکان زۆر شتی تریان هەبوو کە دەبوایە خەمیان لێ بخواردنایە. چەند هێمایەکی دڵخۆشکەر بەدی دەکران: ئیستۆنی بچووک بەشێوەیەکی فیداکەرانە ئۆتۆنۆمی بە کەمینەکانی خۆی بەخشی. بەدوای ساڵی ١٩١٩دا دوورگەکانی ئالاندی بەگشتی سویدی-ئاخێوەر

لەژێر دەسەڵاتی فینلاندیەکان مانەوە، بەڵام پەیماننامەیەکی تایبەت گارانتی هەم زمان و هەمیش کولتووری دەکرد. کەچی شەڕی دووهەمی جیهانی و کاریگەریەکانی ئەو شەڕە ڕێگەچارەیەکی تری خستەڕوو- دەرکردن و قڕکردنی کەمینە نەخوازریاوەکان. نزیک بە دوازدە ملوێن ئەڵمانی بەرەو ڕۆژئاوا وەڕێکەوتن و حەوت ملوێن پۆڵەندی، چکی، سلۆڤاکی و ئۆکراینی بەزۆ گەڕێندرانەوە بۆ شوێنگەلێک کە لەوکاتەدا وڵاتی زێدیان پێ دەگوتن. تەنیا چەند کەمینەیەکی نیشتمانی هەرە بچووک لە ئورووپا مابوونەوە، کە بەگشتی لە سەدا ٣ی حەشیمەتی ئەوێیان پێک دەهێنا. خود-موختاری، ئەو شتە ڕەسەن خەیاڵی و ئایدیالە، کاتێکە لەگەڵ ناسیۆنالیزمی ڕەگەزی ژیانی هاوبەشی پێک هێنا وەچەیەکی تۆقێنەریان لێ کەوتەوە.١١٢٨

* * * *

ئاشتیکەران لە ساڵی ١٩١٩دا هەستیان بەوەکرد کە ئەوەی لەدەستیان هاتوە کردوویانە، بەڵام هیچ کەڵکەڵەیەکیان بە مێشکدا نەدەهات بەومانایە کە هەمووی کێشەکانیان چارەسەر کردبێت. کاتێکە ویلسۆن لە ٢٨ی مانگی ژوەندا پاریسی بەجێ هێشت، بە خێزانەکەی خۆی وتبوو کە " زۆر چاکە، کیژۆڵەکە، هەمووشتێک کۆتایی پێهات، و، چون کەس ڕازی نیە، ئەوە من والێدەکات کە بەوە هیوادار بم کە ئێمە ئاشتیەکی درووستمان ناوەتەوە؛ بەڵام ئەمە بەگشتی کەوتۆتە دەست خواکان."١١٢٩ هەروەها ئەوە کەوتبوە دەست ئەوانەی کە هاتبوون و شانبەشانی ئەوان جیهانیان ڕیبەری دەکرد، هەندێکیان لە پاریس بوون- وەکوو شازادە کۆنۆی ژاپۆن و فرانکلین دیلانۆ ڕۆزڤێلت- هەندێکیان لە دوورەوە سەیریان دەکرد. لە ئیتالیا، مۆسۆلینی بەخێرایی لەناو سیاسەتی ناسیۆنالیستیدا سەری هەڵدابوو، چون دەستووری لیبرالی کۆن بە هێرشەکانی پیاوانی وەکوو دی ئانۆنزیۆ کەوتبوە بەر لەقە. ئادۆڵف هیتلێری لاو هەر لەو مانگی ژوەندا لە موونیخ بوو، خەریک بوو لەسەر سەربەرزیەکانی مێژووی ئەڵمانیا و شەیتانەکانی سەرمایەی جیهانی جوولەکەکان وانە فێر دەبوو. ئەو پێشتر هەستی بەوەکردبوو کە وەک ئایدۆلۆگ و وتاربێژیک خاوەن بیروهزری تایبەتە.

لیۆد جۆرج بۆ سێ ساڵی تر دەسەڵاتی لە دەست دابوو. دوا ئەوە کە لە مانگی نوامری ساڵی ١٩٢٢دا ناچارکرا دەست لە کار بکێشێتەوە قەت بۆ ڕایەکی تر دەسەڵاتی نەگرتەوە دەست، هەرچەند تا کۆتایی ژیانی لە ساڵی ١٩٤٥ وەک ئەندام پەڕلەمانێک مایەوە. بیرەوەریەکانی ئەو لەسەر کۆڕی ئاشتی، کە لە ساڵی ١٩٣٨دا بڵابوونەوە، سەرنجڕاکێشن، زۆر وردبین نین، و لەسەر هەرشتێک کە بەلارێدا ڕۆیشتبێت فەرەنسەیەکان یان ئەمریکیەکان سەرلۆمە دەکەن. کلیمینجوو

بەشێوەیەکی ناژیرانە لە کۆتایی ساڵی ١٩١٩دا هەوڵی دا ببێتە سەرەک کۆماری فەڕەنسە. چاوەڕوانی پێداهەڵکوتانی دەکرد، بەڵام کاتێکە ئاشکرابوو کە لەگەڵ دژایەتی ڕووبەڕوو دەبێتەوە بە تووڕەییەوە پاشەکشێی کرد. هەر خێرا بە دوا ئەوەدا ئەو فەڕەنسەی چۆڵ کرد و چەند ساڵی دواتری بە سەفەرکردن ڕابوارد. ئەو درێژەی بە نووسین دا، بەرهەمێکی قەبە و دووبەرگی لەسەر فەلسەفە و لێکۆڵینەوەیەکی کورت لەسەر وتاربێژی دێرینی ئاتێنی بەناوی دێمۆشتێنیس بە ئەنجام گەیاند، کەسێک کە بە هاووڵاتیانی شارستانی کراو و عاشق بە خۆش گوزەرانی هۆشداری دەدا کە ئەوان لەلایەن فیلیپی بەربەری مەقدوونیە لە مەترسیدا دەژین. ئەو نەیدەویست بیرەوەریەکانی خۆی بنووسێت و زۆربەی وتارەکانی خۆی لە ساڵی ١٩٢٨دا لەناو برد. ئەو بە ڕۆژنامەنووسێکی بەریتانی ڕاگەیاندبوو کە ئەو یارمەتی خۆی بە مێژوو بەخشیوە، بەڵام ئەو سەبارەت بە تاووتوێکردنی ڕابردوو عاجز بوو. دوا ئەوەی کە بە بڵاوکردنەوەیەکی پاش مەرگی هێرشێک لەلایەن فۆچەوە چزووی لێهەستا، لە ئاکامدا دەستی بۆ پێنووس برد و لەسەر داکۆکی کردن لە بەرهەمەکەی خۆی لەکاتی شەڕ و لە کۆڕی ئاشتیدا ڕەشنووسێکی ئامادە کرد. ئەو لە مانگی نوامری ساڵی ١٩٢٩دا کۆچی دوایی کرد، بەر لەوەی بتوانێ کۆتایی بە کارەکەی بێنێت. ئەو هەموو نهێنیانەی کە سەبارەت بە کارەکانی ناوخۆی کۆڕی ئاشتی لە دڵی دابوو لەگەڵ خۆی ئەوانیشی بردە ناوگۆڕ.١١٣٠

کۆتایی ویلسۆن لە هەموویان ناخۆشتربوو. دوا ئەوەی کە لەلایەن کۆڕی ئاشتیەوە لە هەناسە کەوت، لەگەڵ سێنا لەسەر پەسندکردنی پەیماننامەی ڤێرسایلێس و، بەتایبەت، کۆمەڵەی گەلان کەوتە شەڕێکی تووش و ناخۆشەوە. هەم لایەنگرانی ئەو و هەمیش دژبەرانی ئەو کاتێکە ئەو لە گۆڕێ دا نەبوو سەریان قاڵ بوو. کۆمەڵەی گەلان بۆ مەبەستی سەپاندنی ئاشتی بە هێز و وزەیەکی تایبەتەوە پاڵپشتی لە پەسندکردنەکە دەکرد. ویلسۆن، بەداخەوە، زۆر بەهای بە ئەوان نەدەدا، حەسابی "شوانە قەل" و" شوانە بزنی" بۆ دەکردن. کۆمەڵەی گەلان بۆ پارێزگاری کردن لە سەربەخۆیی ئەمریکی کە، وەک زۆر جار دەوترا، لەلایەن هەڕەشە بەردەوامەکانی جۆرج واشینگتۆن و تووماس جێفێرسۆن دژ بە هاوپەیمانانی هەتاهەتایی یان تووش هان دەدرا و ئیلهامی وەردەگرت، ئەوەی لە دەستی هات بۆ بەرەنگاربوونەوەی سەرەکۆمار کردی. وەک بۆ نەوەدوشەش ئەندامەکەی سێنا، ئەوە دەرکەوت ئەوان بە چوار گرووپ دابەش ببوون. لانی کەم شەش کەس لە کۆماریەکان کۆمەڵەی گەلانیان بە هیچ شێوەیەک قەبووڵ نەدەکرد- ئەوان بە ئاشتنەبۆوەکان ناویان دەرکرد. ڕەنگە چەند دیموکراتێکی بێ سەرەوبەرە دەنگیان بەوان بدایە. نزیک بە نۆ کەس لە کۆماریەکان مەرجخوازی مامناوەندی بوون بەومانایە کە بە مەرجێک کە مەرجەکانی ئەوان بۆ پارێزگاریکردن لە

دەسەڵاتداریێتی ئەمریکی پەسند بکرایە ئەوان کۆمەڵەی گەلانیان قەبووڵ دەکرد. (مەرجەکان بریتی بوون لە بەکردەوە دەرهێنانی دیپلۆماتیکی باش-دامەزراوی قەبووڵکردنی ڕێکەوتنامەیەکی جیهانی لەگەڵ کارامەیەکان؛ هەتا کاتێکە هەمووی پارتەکان لەسەر پەیماننامەکە کۆک بوونایە، مەرجەکان بە قوەتی خۆیان باقی دەمان.) ئەمە سێ دەستە لەو کۆماریانەی کە هێشتا بەتەواوەتی خۆیان بە ئەرکدار نەدەزانی دەهێشتەوە.) کەچی بەسەر ئەوەشدا زۆربەی دیموکراتەکان ڕەچاوی سەرەک کۆماریان دەکرد، هەرچەند زۆریەک بەنهێنی هیوادار بوون کە ئەو لەگەڵ مەرجخوازانی مامناوەندی دانووستان بکات. ئەگەر ویلسۆن دانووستانی بکردایە، دەرفەتێکی باش بوو بۆ ئەوەی کە پەیماننامەکە پەسند بکرێت دەنگی تەواو بە دەست بێنن. ئایا هێزەکانی ئەورووپی مەرجەکانیان قەبووڵ دەکرد؟ لیۆد جۆرج لە بیرەوەریەکانی خۆیدا هەمیشە بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە ئەوان هەمیشە چاوەڕوانی ئەوە بوون کە ڕەنگە ئەوان لەناچاری وابکەن. بەڵام ئەوان هەرگیز نەخرانە بواری تاقیکردنەوە و بەکردەوە دەرهێنان.١١٣١

ویلسۆن دەیتوانی هاوپەیمانی تایبەت بە خۆی دامەزرێنێت. کۆماریەکان لە سێنادا تەنیا زۆرینەیەکی دووکەسیان بە دەستەوە بوو و ئەو دەیتوانی بە قەبووڵکردنی هەندێک لە مەرجەکان تاقمێک لە میانەڕەوەکانی بەلای خۆیدا بکێشایە. کاتێکە لانسینگ کردیە سەری تا دانووستان بکات، سەرەک کۆمار متەقی نەکرد: " ڕوخساری ئەو هەر ئەو حاڵەتە کەلەڕەقی و شەڕانیەی بەخۆوە گرتبوو کە لە کاتێکدا بەخۆوەی دەگرت کە کەسێک حەقیقەتێکی پێ دەکوت کە لەگەڵ پلانەکانی ئەو دژایەتی هەبوو." ویلسۆن بە کەسێکی نزیکی خۆی وتبوو کە نەیارانی ئەو بە غەریزە هەرە گڵاوەکان دەجمێن. "ئەوان وادیارە دەیانەوێت ناوگەلی هەرە بێ قیمەت و هیچ و پووچەکانی مێژوو لە خۆیان بنێن."١١٣٢

سەرەک کۆمار لە ٨ی مانگی ژوولای ساڵی ١٩١٩ لە نیوەشەودا گەڕایەوە بۆ واشینگتۆن. جەماوەرێکی ١٠٠،٠٠٠کەسی، کە بۆ ئەو ڕۆژگارە یەکجار زۆر بوو، لە وێستگەی شەمەندەفەر مەحتەل مابوون. دوو ڕۆژ دواتر ئەو پەیماننامەی ڤێرسایلێسی، بە پەیماننامەی کۆمەڵەی گەلان لە دەسپێکدا، بەشێوەیەکی تاکەکەسی بە سێنای پێشکەش کرد. ئەو پرسیاری لێکردن " ئایا ئێمە دەوێرین ڕەتی بکەینەوە و دڵی هەمووی جیهان بشکێنین؟" گلایەک لەسەر ئەوە کۆک بوون کە وتارەکەی ئەو لاواز بوە. بەشێوەیەکی نایاسایی، ئەو چەند بەشی لە وتارەکەی دەخوێندەوە و لە چەند شوێندا شیرازەی قسەکانی بەجێ دەهێشت. واشینگتۆن، و وڵات، خۆیان بۆ هەنگاوی دواتر ئامادە کردبوو.- گرنگی دانی سێنا بە پەیماننامەکە.١١٣٣

له سەرەتادا ویلسۆن بڕیاری دا بەگشتی لەپشت ڕووداوەکاندا چالاکی بکات، کۆبوونەوە لەگەڵ سیناتۆرەکانی کۆماری لە هەوڵێکدا بۆ هاندانی ئەوان بەومانایە کە سەربەخۆیی ئەمریکی بە ئەندام بوون لە کۆمەڵەی گەلان یان بە فلانە وتار، بەتایبەت، کە دڵی هێمنایەتی گشتی بوو سازشی لەسەر نەدەکرا. (ئیمزاکەران بەڵێنیان دا "تا دژ بە دەستدرێژی دەرەوە لە یەکگرتوویی ناوچەیی و سەربەخۆیی سیاسی هەمووی ئەندامانی کۆمەڵەی گەلان پارێزگاری بکەن و ڕێزیان لێ بگرن.") ئەو بە دیپلۆماتێکی بەریتانی ڕاگەیاندبوو کە ئەو لەوە دڵنیایە کە پەیماننامەکە لە سێناوە تێپەڕ دەبێت. ئەو دووپاتی دەکردەوە کە ئەو ئامادە نیە تا هەموو گۆڕانکاریەک قەبووڵ بکات؛ پێویستە پەیماننامەکە هەر بەو شێوەیە پەسند بکرێت کە لە پاریس ئەوان نووسیبوویان.١١٣٤

لە کۆتایی یەکەمین حەوتوویدا لە واشینگتۆن، ویلسۆن بە بەلەمێکی سەرەک کۆماری خۆی لە گەرمای هاوینە دەرباز کرد و بۆ گەشتێکی دەریایی چوو بۆ ناوچەی پۆتۆماک. شەڕی چاوەڕێکراوی پەیماننامە تەنیا کێشەیەک نەبوو کە ئەو هاوینە ڕووبەڕووی حکوومەتەکەی ئەو ببۆوە. نرخەکانی خواردەمەنی بەشێوەیەکی توندوتیژ خەریک بوون بەرز دەبوونەوە؛ تەنگەژەکانی ڕەگەزی خەریک بوون دەتەقینەوە و دەبوون بە قەیرانگەلی ڕەگەزی؛ یەکیەتیە سەرەکیەکان هەڕەشەی مانگرتنیان دەکرد. بە چەند هەورە تریشقەیەک هەواکە گۆڕا و سەرەک کۆمار بۆ ماوەی چەندین ڕۆژ لەجێدا کەوت. ئەدمرال گرەیسۆن لە وڵامدا وتی کە ئەوە تەنیا زگچوونێکە و بەس. زۆر لەسەر ئەوە کۆڵدراوەتەوە چون لەڕاستیدا ئەوە دەرکەوتوە کە سەکتەیەکی نادیار هێرشی پێکردبوو. لە هەر حاڵدا، ئێمە قەت ئەوەمان بۆ دەرناکەوێت، ویلسۆن ئەو ویلسۆنەی کە دەبوا ببوایە نەبوو. ئەو زۆر بە ئاسانی گێژ دەبوو و ئەو شتانەی کە دەبوایە لەبیریدا بمایەتنەوە لەبیری دەچوونەوە. ئەو زۆر جار لەسەر شتی هیچ و پووچ حاڵەتی ئاسایی خۆی لەدەست دەدا و دەشێوا. پێدەچێ سلامەتی زەینی و جەستەیی ویلسۆن هۆکارێک بووبێتن بۆ ئەوە کە ئەو ڕووبەڕووی ئەم حەقیقەتە نەدەبۆوە کە ئەو دەنگی ئەوەندەی نەبوو تا پەیماننامەکە ئەو جۆرەی کە لەڕێگای سێناوە وەستابوو بەدەست بێنێت و هەروەها نەیدەتوانی کەلەڕەقی ناسراوی خۆی وەکوو ڕژدیەکی کوێرکوێرانە بناسێنێت. گرەیسۆن و خاتوو ویلسۆن، کە دڵسۆز و پارێزەری هەڵەکانی ئەو بوون، هەموو هەوڵێکیان دا تا هانی بدەن بەڵکوو پشوویەک بدات.١١٣٥ بێجگە لەوانە ئەوان ئەو کێشانەی کە پێوەندیان بە سلامەتی ئەوە بوو بە کەم دەزانی.١١٣٥

لە ١٤ی مانگی ژوولایدا دیموکراتێک کە پشتگری لە پەیماننامەکە دەکرد یەکەمین وتارێکی لەو پێنج مانگ وتاربێژیەی ناو سێنای ڕاگەیاند. لە ٣١ی مانگی ژوولایدا لێژنەی

پێوەندیەکانی دەرەوەی سێنا کە بە سەرۆکایەتی لۆج دەستی کرد شەش مانگ گوێگرتنی دەست پێکرد. جێی سەرسووڕمان نیە، کە پرسیارگەلێک کە لەلایەن زۆرینەی کۆماریەکانەوە ئاراستە دەکران لەسەر پەیماننامەی کۆمەڵەی گەلان جەختیان دەکردەوە، بەتایبەت لەوکاتەدا لەسەر وتاری ناوزڕاویX. لە ١٩ی مانگی ئۆگستدا، دوا ئەوە کە کونێکی گەورە لە پەیماننامەکە درووست بوو، ویلسۆن لەبەردەم لێژنەکەدا دەمودەست حازر بوو. ئەو هیچ نیشانەیەک لە ئامادەبوونی خۆی بۆ دانووستانکردن دەرنەخست. چوار ڕۆژ دواتر، لێژنەکە دەنگی خۆی بە یەکەمین شتێک کە دواتر بە چاکسازیەکان و مەرجەکانی تایبەت بە پەیماننامە ناویان دەرکرد ڕاگەیاند. تەوەرێک کە ئەوان هەڵیان بژارد شانگتۆنگ بوو- وەک خەڵات بەخشینی بە ژاپۆن و گەڕاندنەوەی بۆ چین. ویلسۆنی ڕقهەستاو هەستی بەوەکرد کە کاتی ئەوە هاتوە تا لەولا سێناتۆرەکانەوە خۆی بە خەڵکی ئەمریکا بگەیەنێت.١١٣٦

لە ٢ی مانگی سێپتامبری ساڵی ١٩١٩دا، ئەو بۆ کورتەسەفەرێک بە سەرتاسەری وڵاتدا واشینگتۆنی بەجێهێشت. ڕاوێژکارانی هەرە نزیکی ئەو لێی پاڕانەوە کە نەڕوات. بەڵام ویلسۆن ڕژد و کەلەڕەق بوو. پێویستە ئەو پەیماننامەیە بپارێزرێت، تەنانەت ئەگەر ئەوە پێویستی بە دانانی ژیانی ئەو هەبوایە. ئەو بە ئەوانی ڕاگەیاند کە " بە هەبوونی کارەساتێکی گەورە کە ئێستا ڕووبەڕوی جیهان بۆتەوە هیچ پیاوێکی ژیر پێشبینی داهاتوویەکی خۆش ناکات."١١٣٧ گرەیسۆن بە ترسەوە گوێی بۆ بڕیارەکە شل کردبوو: " هیچم لە دەست نەدەهات بیکەم بێجگە لەوە کە لەگەڵی بڕۆم و ئەوەندەی دەتوانم ئاگام لێی بێت." کاتێکە ویلسۆن سواری شەمەندەفەڕی تایبەت بوو، ئەو سەبارەت بەو سەرئێشە ناخۆشانەی کە لەگەڵی ببوون دەردەدڵی کردبوو. نزیک بۆ ماوەی یەک مانگ ویلسۆن یەک بە دوای یەک وتاری پێشکەش دەکرد، جاری وابوو دوان، یان تەنانەت سیانیش لە ڕۆژێکدا. ئەو لەسەر چەند تەوەرێک دەڕۆیی. پەیماننامەکە بەڵگەیەکی گرنگ بوو بۆ ئاشتی و بۆ مرۆڤایەتی، بەرهەمی خوێنی ئەو هەموو لاوە ئەمریکیە بوو کە بۆ شەڕکردن بۆ ئورووپا چوبوون. ئەوانەی کە لە گەڕانەوەدا لە واشینگتۆن دژی دەوەستان پارتیزانەکان، مێشک تەسکەکان، خۆبەزلزانەکان، نەزانەکان بوون. " کاتێکە بۆ دواجار لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ئەوان لە سێدارە دەدرێن. بە داخ و حەسرەتەوە دەڵێن کە بریا پەتی سێدارەکە ئەوەندە درێژ نەبوایە." ئەو لە ئیس.تی لویس بە جەماوەرێکی ڕاگەیاندبوو کە زۆر بەوە خۆشحاڵە کە لە پایتەخت دوور کەوتۆتەوە. " لەو شارە نامۆیەدا دەنگە ڕاستەقینەکانی خەڵکی بەشەرەفی ئەمریکا جارجارە نەبێ ئەویش خامۆش و هەستپێنەکراو هەر بەگوێش ناگەن!" کاتێکە ڕووی دەکردە ڕۆژئاوا جەماوەر زۆر زۆرتر دەبوو و

بەتاسەو تینێکی تایبەتەوە سەیریان دەکرد. لایەنگرانی پەیماننامەکە کەم تاکورتێک لەوە دڵنیا بوون کە پەیماننامەی ناوبراو پێشکەوتن بەخۆوە دەبینێت ئەگەر تەنیا ویلسۆن هەندێک لە مەرجە مامناوەندیەکان قەبووڵ بکات.١١٣٨

سەرئێشەکانی ویلسۆن هەتا دەهات خراپتر دەبوون و هیلاکی و شەکەتی بەرووخساریەوە دیار بوون. لە واشینگتۆنەوە هەواڵی ناخۆش ناخۆش بەگوێ دەگەیشتن. لە پاڵپشتیکردنی مەرجەکان هەتا دەهات هەست و سۆز زیاتر دەبوو. ویلیام بۆلیت کە هێشتا ئێشی ڕەدکردنەوەی سەفەرەکەی بۆ ڕووسیە لە دڵ دابوو، ئێستا هاتبوو تا تۆڵەی خۆی بستێنێت، لەبەردەم کۆبوونەوەکانی سێنادا لە پاریس یەک بە دوای یەک هەڵەی گەورەی لێدەکەوتەوە. خراپتر لەوانە، ئەو وتی کە لانسینگ، وەزیری کاروباری دەرەوە، لەگەڵ ڕەخنەکانی ئەوە. ویلسۆن لەپڕێکدا هاواری کرد" خوایەگیان قەت وام بیر نەدەکردەوە کە لانسینگ بەم چەشنە هەڵس و کەوت بکات." گرەیسۆن بە ترسەوە سەرنجی دابوویە کە سەرەک کۆمار زەرد هەڵگەڕاوە و تفی لە دەمدا وشک بوە. لە سان فرانسیسکۆ، ویلسۆن بە هاوڕێیەکی دێرینی خۆی، ژنێک کە کاتی خۆی زۆر لە یەک نزیک بوون، ڕاگەیاندبوو کە هێرشەکان بۆسەر پەیماننامەکە کەسی بوون و شتێکی وانەبوون. " ئەگەر من هیچ کارێکم بە کۆمەڵەی گەلان نەبوایە، درووست هەر وەکوو ئەوە دەچووە پێشێ!"١١٣٩

لە ٢٥ی مانگی سێپتامبردا ویلسۆن لە ئۆرلاندۆ بوو. لەوکاتەدا بەردەوام دەقۆخی و گرەیسۆن ئەوەی دەگەڕاندەوە بۆ نەخۆشی ئاسم[ تەنگەنەفەسی]. ئەو شەوانە خەوی لێنەدەکەوت و کەمتر لە دوو کاتژمێر دەخەوت. ئەو دوانیوەڕۆیە لە پۆلیبلۆ قسەی دەکرد، چلومین وتارێک بوو کە لە ماوەی بیست و یەک ڕۆژدا پێشکەشی دەکرد. ئەو سەبارەت بە نەیارانی کۆمەڵەی گەلان وتبووی کە " هەرهەموویان خائینن". قەت دانووستانیان لەگەڵ ناکەم، هیچ مەرجێک بۆ پەیماننامەکە قەبووڵ ناکەم."١١٤٠

ویلسۆن قەت بۆ ڕایەکی تر لە بەرانبەر جەماوەردا قسەی نەکرد. بەیانی ڕۆژی دواتر، خاتوو ویلسۆن گرەیسۆنی لە خەو هەستاند. ئەو سەرەک کۆماری لە حاڵەتێکی بەسزمانیدا دی، نەخۆش، تەنگەنەفەس، و ماسوولەکانی دم و چاوی لە حاڵی لەرینەوەدا. ویلسۆن بەو لاوزایەشەوە پێداگری دەکرد و دەیکوت کە دەبێ درێژە بە کارەکانی بدات. خێزانەکەی و دوکتوورەکەی بەسەردا دەخوڕین. ویلسۆن بە چاوانی پڕ لە فرمێسکەوە بە ئەمیندارەکەی خۆی ڕاگەیاند کە " دوکتوورەکە ڕاست دەڵێت. قەت من لە حاڵەتێکی وەهادا نەبووم، دەڵێی گیانم دەرچوو." گرەیسۆن لە ڕاگەیاندنێکی جەماوەریدا وتبووی کە سەرەک کۆمار بە دەست هیلاکی جەستەیی و نەخۆشی دەروونیەوە دەناڵێنێت

و هەر ئەوانەش کاریگەری خراپیان لەسەر گەدەی داناوە. چیتر نەیانهێشت درێژە بە سەفەرەکەی بدات و شەمەندەفەڕی سەرەک کۆمار بەرەو واشینگتۆن گەڕایەوە.١١٤١

لە ٢ی مانگی ئۆکتۆبردا، لە کۆشکی سپی، ویلسۆن سەکتەیەکی توندی کرد کە تاڕادەیەک لای چەپی لەکار کەوت و ئیفلیج بوو. هەرچەند دوای ماوەیەک تۆزێک باشتر بۆوە، نە لەباری جەستەیەوە و نە لەباری مێشکیەوە ئەو پیاوەی جاران نەبوو. ئەو قەت نەیتوانی وەکوو سەرەک کۆمار ئەو کاریگەریەی جارانی هەبێت، هەرچەند هێشتا هەر لەسەر پەیماننامەکە لە نەخۆشخانەوە کاریگەری هەر دادەنا. خاتوو ویلسۆن و گرەیسۆن بەخۆیان بڕیاریان دابوو کە نەخۆشیەکەی ئەو بەتەواوەتی نەخەنەڕوو و ئاوەتەکانی ئەو بەجێ بێنن. لە حەفتەکانی سەرەتادا بەدوای سەکتەکە، کاتێکە هێشتا ڕوون نەبوو کە ئایا ویلسۆن زیندوو دەمێنێتەوە یان نا، ئەوان نەیاندەهێشت هیچ کەس بێجگە لە کچەکان و پەرستارانی سەرەکی و دووکتەرەکانی ویلسۆن چاویان پێی بکەوێت. ڕێبەری دیموکراتەکانی سێنا، گیلبێرت هیچکۆکی نێبراسکا، کاتێکە لە ئاکامدا لە ٧ی مانگی نوامردا چاوی بە ویلسۆن کەوت سەرسووڕما. " دیتم کە لەسەر جێ کەوتوە و سەرینی ژێر سەری ڕایگرتوە و دەستە بێ هێزەکانی لەژێر لێفەدا شارابوونەوە. هەستم کرد کە پیرەپیاوێکی ڕەنگزەرد دەبینم بە ڕیشێکی سپی و تەنک کە هاتبۆوە و بۆیان نەتاشیبوو."١١٤٢

پەیماننامەکە لە پاشماوەی مانگی ئۆکتۆبر و مانگی نوامری ساڵی ١٩١٩دا لە سێنا ڕێگای خۆی گرتە بەر بەرەو پێشەوە چوو. چاکسازیەکان، کە بەگشتی دوازدە بەند بوون، لەلایەن یەکیەتی دیموکراتەکان و کۆماریە میانڕەوەکان تووشی شکست هات. لە هەر حاڵدا لۆج بڕیاری دا تا زۆربەی کۆماریەکان لە دەوری یەک کۆکاتەوە، و دەنگەکانی ئەوان، هاوڕێ لەگەڵ دەنگی چەند دیموکراتێک کە بەرەنگاری باوەڕەکانی پارتی ببوونەوە، بۆ دانانی چەند مەرجێک لەناو پەیماننامەکە بەس بوون. ئاڵۆزترینی ئەو مەرجانە ئەوە بوو کە وتاری Xی لەخۆ دەگرت؛ وڵاتەیەکگرتوەکان لەپێناو پارێزگاریکردن لە یەکگرتوویی ناوچەیی یان سەربەخۆیی هەرکام لە ئەندامانی کۆمەڵەی گەلان خەباتی دەکرد هەتا کۆنگرێس پەسندی دەکرد. لۆج پێشنیارێکی لەسەر پەسندکردنی دانانی مەرج پێشکەش کرد. کاتێکە هیچکۆک بۆ جاری دووهەم لە ١٧ی مانگی نوامردا چوە پاڵ تەختەکەی ویلسۆن تا ئەمە تاووتوێ بکات، ئەو سەرەک کۆماری وریاتر و سوورتر لە جاران هاتە بەرچاو. ویلسۆن لەبەرانبەر دانانی مەرج بە هەر شێوەیەک کە بوایە سەرسەختانە دەوەستا. " ئەوە جەرگی پەیماننامەکە کون دەکات." ئەو بە هیچکۆکی ڕاگەیاند تا ڕێگە بە کۆماریەکان بدات تا بەرپرسایەتی تێکشکانی پەیماننامەکە بگرنە ئەستۆ؛ ئەوان دەبوایە وڵامی

خەڵکی ولاتەیەکگرتووەکانیان بدایەتەوە. ڕۆژی دواتر خاتوو ویلسۆن نامەیەک کە بەدەستووری ویلسۆن نووسیبووی حەواڵەی هیچکۆکۆی کرد. مەرجەکانی سێناتۆر لۆج و هاوڕێ نزیکەکانی ئەو بوون بەهۆی پووچەڵکردنەوەی پەیماننامەکە. ویلسۆن بەپانەوە وتبووی کە " من بە دڵێکی پاکەوە ئارەزوو دەکەم کە خۆزگە هاوڕێیان و لایەنگرانی کۆمەڵەی گەلان دژ بە چارەسەری پەسندکردنی لۆج دەنگیان بدایە." ڕۆژی دواتر سێنا لەسەر پێشنیارەکەی لۆج دەنگی دا. پێشنیاری ناوبراو لەلایەن کۆمەڵێک لەو دیموکراتانەی، زۆرینە، کە هێشتا هەر ڕەچاوی دەستووراتی ویلسۆن و کۆماریە ئاشتنەبۆوەکانیان دەکرد تووشی شکست هات. چوار حەفتە دواتر، ویلسۆن ئاگادارکرایەوە کە ئەو براوەی خەڵاتی ئاشتی بوە.١١٤٣

کۆماریەکان و دیموکراتیە میانڕەوەکان بۆ بەدەستهێنانی دانووستانێک دوایەمین هەوڵی خۆیان خستە کار. لە کۆشکی سپیەوە ویلسۆنی تووڕەکراو بۆ بەربەستکردنی ئەوان ئەوەی لە دەستی هات کردی. تەنانەت میانەڕەوەکانیش نزیک بوونەوە؛ کاتێکە سێنا بۆ دواجار لە ١٩ی مانگی مارسی ساڵی ١٩٢٠دا لەسەر بڕیارێکی تازەی ڕەسمی بۆ پەسندکردنی پەیماننامەکە، هاوڕێ لەگەڵ هەندێک مەرجی نەرمی هەمووارکراو، دەنگی دا بڕیاری تازەی ڕەسمی پەسند کرا. بیست و سێ کەس لە ئەندام دیموکراتەکان نەیانهێشت سەرەک کۆمار لەوپێناوەدا دەنگ بدات. هەڵبەت دوو-سێهەمی زۆرینەی پێویست لە گۆڕیدا نەبوون بۆیە سێنا ڕەزایەتی خۆی بە پەیماننامەکە ڕانەگەیاند. ئەو شەوە ویلسۆن بە گرەیسۆنی وت کە " دوکتور شەیتانەکە کابرایەکی سەرقاڵە."١١٤٤

ئەو هێشتا لەسەر بۆچوونەکەی خۆی بەومانایە کە مافی خۆی بوە کە دانووستانەکەی ڕەد کردۆتەوە هەر سوور بوو. دواتر ولاتەیەکگرتووەکان لەگەڵ ئەڵمانیا، ئوتریش و مەجارستان پەیماننامەگەلێکی جیاوازی واژۆ کرد، بەڵام قەت پێوەندی بە کۆمەڵەی گەلانەوە نەگرت. ویلسۆن، کە بۆ ڕایەکی تر بۆماوەیەکی کورت کەوتبوە فکری سەردەمێکی تری سەرەک کۆماری، تواني تا ساڵی ١٩٢٤ دەوام بێنێت. خاتوو ویلسۆنیش تەمەن مەودای پێدا تا بتوانێ لە ساڵی ١٩٦٠دا لە بۆنەی گرتنەدەستی دەسەڵاتی جان ئیف.کینیدیدا بەشداری بکات.

هەوڵەکانی ویلسۆن، و زۆربەی ئاشتیکەرانی تر کە لەگەڵ بیروبۆچونەکانی ئەو بوون، هە ڕهەموویان نەبوون بە ڕەنجی قالۆنچە. پەیماننامەی ڤێرسایلێس، و پەیماننامەگەلێکی تر هاوڕێ لەگەڵ شکستخواردوان کە وەک مۆدێلێک سەیریان دەکرد، بەدڵنیایەوە سەبارەت بە ناوچەکان و ئەو قەرەبوانەی کە لە سەدەکانی پێشتردا دەبوا بنووسرانایە هەندێک بەند و مەرجیان لەخۆ گرتبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا تیکەڵاو بە ڕۆحیەتێکی تازە کرابوون. لە دەسپێکدا پەیمانی

کۆمەڵەی گەلان هاتە ئاراوە، نەک وەک پاش بیریێک، و دواتر خودی کۆمەڵەکە هەندێک بەندی تێئالا کە سەرپەرشتی ئاگربەستیان دەکرد، سار و دانزیگیان ڕێبەرایەتی دەکرد، و چاودێری ماندیتەکانیان دەکرد. ئەو مەرجانەی کە بۆ ڕێکخراوەی جیهانی کار، بۆ پەیمانگەلێک لەپێناو پارێزگاریکردن لە کەمینەکان، لەپێناو دانانی دادگایەکی هەتاهەتایی دادپەروەری یان لەپێناو داداگایی کردنی پیاوانێک وەکوو قەیسەر بەهۆی ئەو تاوانانەی کە دژ بە ڕەوشتبەرزی مرۆڤایەتی تووشیان هاتبوون، هەرمەمووی ئەمانە لەسەر ئەم بیرۆکەیە جەخت دەکەنەوە کە هەندێک شتی دیاریکراو هەبوە کە هەمووی مرۆڤایەتی لەسەریان کۆک بوون و ئەوە کە لەپشت بەرژەوەندیە خەستوخۆڵەکانی نیشتمانی دەکرا هەندێک ئیستاندارد و پێوەرەی جیهانی درووست بوونایە. و کاتێکە ئەو پەیماننامانە لە سالآنی سەردەمی شەڕدا هێرش کرایە سەریان بەگشتی بەهۆی ئەوە بوو کە ئەوان ئەو پێوەرانەیان نەدەگرتەوە.

دواتر سەرلۆمەکردنی هەر هەڵەیەک کە ئاشتیکەران لە دەیەکانی ١٩٢٠ و ١٩٣٠ تووشی دەهاتن و ئەو ڕێکەوتنامانەی کە لە پاریس لە ساڵی ١٩١٩دا بەستیان بوو بەهایەکی یەکجار کەمیان پێدرا، درووست وەک چۆن هەروا بە ئاسانی دەست لە دیموکراسی هەڵگیرا. بەقامک ئاماژەکردن و شان هەڵتەکاندن لەڕووی نائۆمیدیەوە بۆ خۆبواردن لە بەرپرسایەتی شێوازگەلێکی کارامەن. هەشتا ساڵ دواتر تۆمەتە کۆنەکان سەبارەت بە کۆڕی ئاشتی پاریس هێشتا هەر وێردی سەر زماننانن و دێن و دەچن. ئێکۆنۆمیست لە تەوەرێکی تایبەت بە هەزارەی خۆیدا ڕایگەیاندبوو کە " دوایەمین تاوان پەیماننامەی ڤێرسایلێس بوو، پەیماننامەیەک کە مەرجە توند و ڕەقەکانی بۆ هێنانەدی شەڕی دووهەمی جیهانی ڕێگەخۆشکەر بوون." ١١٤٥ ئەوە بەمانای لەبەرچاونەگرتنی چالاکیەکانی گلایەک لە ماوەی بیست ساڵی نێوان ساڵی ١٩١٩ و ١٩٣٩بوو- ڕێبەرانی سیاسی، دیپلۆماتەکان، سەربازان، دەنگدەرانی ئاسایی-.

هیتلێر بەهۆی پەیماننامەی ڤێرسایلێسەوە خەرجی شەڕی نەدەدا، هەرچەند ئەو هەبوونی پەیماننامەی ناوبراوی بە خەلآتێکی ئاسمانی بۆ کاری پرۆپاگەندی خۆی دەزانی. هەرچەند ئەڵمانیا سنووورە کۆنەکانی خۆی بۆ مابۆوە، هەرچەند ڕێگەی پێدرابوو چەندە هێزی نیزامی دەویست پێی ببرێت، هەرچەند ڕێگەی پێدرابوو تا لەگەڵ ئوتریش پێوەندی بگرێت، کەچی بەسەر ئەوانەشدا داوای شتی زیاتری دەکرد: لەبەینبردنی پۆڵەندا، کۆنترۆڵکردنی چکسلەواکیا، بەگشتی دەستبەسەرداگرتنی یەکیەتی سۆڤیەت. ئەو بەدوای جێ و ڕێ بۆ خەڵکی ئەڵمانیا بوو تا گەشە بکەن و دوژمنانی خۆیان لەناو بەرن، جا جوولەکەکان بوونایە یان بۆلشویکەکان. سەبارەت بەوە لە پەیماننامەی ڤێرسایلێسدا هیچ شتیک نەدرکابوو.

هەڵبەت، ئاشتیکەرانی ساڵی ١٩١٩ هەڵەیان کردبوو. بە دەستێوەردانی دەستبەجێ لە جیهانی دەرەوەی ئەورووپا، ئەوان خراپەکاریەکیان کردبوو کە ئێستاش کە ئێستایە ڕۆژئاوا تاوانەکەی دەدات. ئەوان لەسەر سنوورەکانی ناو ئەورووپا خۆیان تووشی دەرد و مەینەتی کرد، هەرچەند دیاریکردنی ئەو سنوورانە پێخۆشبوونی هەموانی بەدواوە نەبوو، بەڵام لە ئەفریقا ئەوان دەستیان کردبوو بە کۆنە کاری بەخشینی ناوچەکان بۆ ئەوەی خۆی لەگەڵ زلهێزانی ئیمپریالیستی یەک بخات. لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین، بەتایبە لە ئێراق، ئەوان خەڵکیان بە یەکدا دەدا، کەسانێک کە هێشتا بڕیاریان نەدابوو تا خۆیان لەگەڵ کۆمەڵگایەکی سیڤیل یەک بخەن. ئەگەر بیانتوانیایە کارێکی باشتر ئەنجام بدەن، بەدڵنیاییەوە چی خراپە ئەوەیان دەکرد. ئەوان، تەنانەت کلیمینجووی پیر و گاڵتەجاریش، لە هەوڵی ئەوە دابوو دەستوورێکی باشتر دابمەزرێنن. ئەوان نەیاندەتوانی پێشبینی داهاتوو بکەن و ئەوان بەدڵنیاییەوە نەیاندەتوانی کۆنترۆڵی بکەن. ئەوە کەوتبوە سەر شانی جێگرەکانیان. کاتێکە لە ساڵی ١٩٣٩دا شەڕ ساز بوو، ئاکامی شەڕی ناوبراو دەگەڕایەوە بۆ بیست ساڵ بڕیاردان یان بڕیار نەدان، نەوەک ئەو تەکبیرانەی کە لە ساڵی ١٩١٩دا گیرابوون.

هەڵبەت ئەگەر ئەڵمانیا بەتەواوەتیەکی زیاترەوە تێکشکابایە لەوانەبوو دۆخەکە بە بارێکی تردا گەڕابایە. یان ئەگەر وڵاتەیەکگرتوەکان بەدوای شەڕی یەکەمی جیهانیدا وەکوو دوای شەڕی دووهەم بەهێز بوایە- و خوازیاری بەکارهێنانی ئەو دەسەڵاتە بوایە. ئەگەر بەریتانیا و فەرەنسە بە شەڕ زۆر لاواز نەبوونایە- یان ئەگەر ئەوەندە لاواز بوونایە کە وڵاتەیەکگرتوەکان بە ئەرکی بزانیایە و خۆی لە شەڕەکە هەڵقورتاندایە. ئەگەر ئوتریش-مەجارستان لەناو نەچووبایە. ئەگەر وڵاتانی جێگری ناوبراو لەگەڵ یەک تووشی شەڕ و کێشە نەهاتنایە. ئەگەر چین زۆر لاواز بوایە. ئەگەر ژاپۆن زیاتر باوەڕی بە خۆی هەبوایە ئەگەر وڵاتان کۆمەڵەی گەلانیان بە دەسەڵاتدارانی ڕاستەقینەوە قەبووڵ بکردایە. ئەگەر جیهان بە شەڕ ئەوەندە کاول بکرایە کە بەدڵ لە فکری ڕێگەچارەیەکی تازەی بەڕێوەبردنی پێوەندیەکانی نێونەتەوەیی بوایە. لە هەر حاڵ، ئاشتیکەران دەبوایە لەگەڵ حەقیقەت ڕووبەڕوو بوونایەتەوە. نەک بزانن چی بەسەر جیهاندا دێت. ئەوان لەگەڵ پرسیارگەلێکی گەورە و دژوار ڕووبەڕوو ببوونەوە. ئارەزووگەلی دوورلە ئەقڵی ناسیۆنالیزم و ئایین بەرلەوە کە ببنە هۆی زیان و زەرەر دەبێ چۆن لەگەڵیان مامەڵە بکرێت؟ ئێمە چۆن دەتوانین شەڕ نایاسایی بکەین؟ ئێمە ئێستاش کە ئێستایە هەر ئەو پرسیارانە لە خۆمان دەکەین.

* * * *



١.    گەیشتنە بەرەوەی سەرکەوتوانەی ودرەو ویلسۆن بۆ پاریس بەر لە دەسپێکردنی کۆڕی ئاشتی. بەڵێنی ئەو بۆ دامەزراندنی کۆمەڵەی گەلان بۆ مەبەستی کۆتایی هێنان بە شەر و ڕێگەدان بە نەتەوەکانی جیهان تا خود-موختاری بە دەست بێنن لە ئورووپا و زۆر لەولا کێڵگەکانی ئەورووپاشەوە چاوەڕوانی زۆریان درووست کرد، بەڵام بەدوای ئەوەدا بێ باوەڕی و نائۆمێدی درووست بوو.



۲.    جۆرج کلیمینجوو (نێوەڕاست) و دەیڤید لیۆد جۆرج (ڕاست)، سەرەک وەزیرانی فەڕەنسە و بەریتانیا بەپێیان لەپەنای پاسەوانانی ڕێزلێنانەوە تێدەپەڕن. (ئەو پیاوماقووڵەی کە لەگەڵیانە ڕەنگە لۆرد بیڤێر برووک بێت.) ئەو دوو پیاوە هەرکیان لە کاتی شەڕدا دوو وڵاتەکەی خۆیان یەک خستبوو. ئەوان بە پشتگریەکی گشتی بەڵام بە بارێکی قورسی چاوەڕوانیەوە هاتبوون تا لە کۆڕوکۆبوونەوەکانی ئاشتیدا بەشداری بکەن.



٣. دەیڤید لیۆد جۆرج (نێوەڕاست) و شاندی نوێنەرایەتی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا، کە لە کۆڕی ئاشتیدا ئەویان تووشی گێرە و کێشەیەکی یەکجار زۆر کرد. ژەنەراڵ ژان ئیسمووتس، وەزیری کارامەی دەرەوەی ئەفریقای باشور، لە ڕیزی پێشەوە لە چەپەوە دووهەمین کەس ئەوە. لە تەنیشت لیۆد جۆرج ئارتۆر بالفۆر، وەزیری دەرەوەی ئەو،(چەپ)، و بیلی هاچێزی خەمناکی ئوستراڵیا(ڕاست) وەستاون. وینستۆن چێرچیل لە تەنیشتی ڕاستی مێزەکەوە وەستاوە، و هێنری ویلسۆن، ڕاوێژکاری قۆشمەچی لیۆد جۆرج لە کاروباری نیزامیدا لە پشتەوە لە شانی چەپی ئەو وەستاوە.



٤.   پلانی کورسی دانان لە کۆڕی ئاشتیدا. بیست و دووڵات، لە وڵاتانی شەڕفرۆش و وڵاتانی بێ لایەن، بانگێشت کرابوون تا نوێنەر بۆ پاریس بنێرن. کۆڕی ئاشتی بە بەشداری تەواوی ئەندامان تەنیا هەشت کەڕەت بەڕێوە چوو، ئەویش بۆڵەبۆڵێکی زۆری هێزە بچوکەکانی لێکەوتەوە.



٥.   کاری ڕاستەقینەی کۆڕەکە لەلایەن کۆمیسیۆنگەل و لێژنەگەلی تایبەت یان لەلایەن ئەم چوار پیاوە هاوڕێ لەگەڵ ڕاوێژکارەکانیان بەڕێوە دەچو. *لە چەپەوە بۆ ڕاست:* دەیڤید لیۆد جۆرج (بەریتانیا)، ڤیتیریۆ ئۆرلاندۆ (ئیتالیا)، جۆرج کلیمینجوو (فەڕەنسە) و ودرەو ویلسۆن (وڵاتەیەکگرتوەکان). هەتا مانگی مارس بە یەکەوە، هاوڕێ لەگەڵ وەزیرانی دەرەوەی خۆیان و دوو نوێنەری ژاپۆنی (ژاپۆن وەک ڕێزلێنان حەسابی یەکێک لە زلهێزەکانیان بۆ دەکرد.) وەک شۆڕای عالی یان شۆڕای دە کەسی دانیشتنیان هەبوو.




٦. ڕکابەری نێوان ئاشتیگەری و شۆڕش. هەندێک لە دوانبێژان، هەرتاوناتاوێک، لەسەر ئەوە ڕۆیون کە ترس لە بۆلشویزمی ڕووسی هەژێنەری سەرەکی ئاشتیکەران بووە، بەڵام ئەوەش زۆر هاسان گرتنی بابەتەکەیە. ئاشتیکەران زیاتر نیگەرانی بڵابوونەوەی گێرەشێوێنی و قەیرانی ئابووری لە ناوەڕاستی ئورووپا بوون، بەڵام ئەوان لە هەمان کاتیشدا باوەڕێکی سەیریان بە توانایی خۆیان بۆ ڕاستکردنەوەی جیهان هەبوو.



٧.     ودرەو و ئیدیت ویلسۆن لە پێشبڕکێکانی ئەسپسواری لە ئیس تی.کلاود. هەرچەند کۆڕی ئاشتی ئەرکێکی قورس لەسەر شانی هەموان بوو، کاتی حەسانەوە و پشوودانیش هەبوو.



٨.   جۆرج کلیمینجوو، مێشەکەرانەی توندڕەو باوکی سەرکەوتنی لێهات. لە تەمەنی حەفتاو حەوتساڵیدا، ئەو لە هەمووی ئەندامانی چوار یاری گەورە بە تەمەنتر بوو. هەرچەند لە هەوڵێکی تیرۆریستی لەسەر دوو ڕێیەک لە کۆڕی ئاشتیدا ڕزگاری بوو، هەندێک کەس لایان وابوو کە ئەو قەت ئەو پیاوەی جارانی لێدەرنەهاتەوە.



**٩.** مارشاڵ فێردیناند فۆچ، سەرەک-فەرمەندی فەڕەنسەیی و فەرمەندەی عالی هاوپەیمانان. ئەو هێرشی کردە سەر کلیمینجوو بەهۆی دانووستانی زۆر لەسەر مەرجەکانی ئەڵمانی و بەتایبەت بەهۆی قەبووڵکردنی گارانتیەکی ئانگلۆ-ئەمەریکەن بۆ مەبەستی داکۆکیکردن لە فەڕەنسە دژ بە هێرشێکی داهاتووی ئەڵمانیا لەباتی پێداگریکردن لە دەسەڵاتداریێتی فەڕەنسەیەکان بەسەر ناوچەکانی ئەڵمانیا لە ڕۆژئاوای چۆمی ڕاین.



١٠. هەڵگرتنی شێوەی جەماوەرێک لەلایەن هونەرمەندێکەوە کە لە دەرەوەی وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسە لە کوای دیکۆرسای چاوەڕوانن تا بەڵکوو سیلەچاوێک بدەنە ئاشتیکەران.



١١.  شۆفیرەکانی ئاشتیکەران



١٢.  ئەو کاتەی ودرەو ویلسۆن لە کورتە سەفەرێکی خۆی بۆ وڵاتەیەکگرتوەکان لە مانگی مارسی ساڵی ١٩١٩ گەڕایەوە و دەیڤید لیۆد جۆرج لە لەندەن هاتەوە، بڕیار درا تا بە کەمکردنەوەی شۆڕای دە کەسی بە گرووپێکی نافەرمی و بچووکتر خێرایی بە کاری کۆڕی ئاشتی ببەخشن. شۆڕای چوار یار، هەموو ئاگاداربوون، بەگشتی لە ژوورەکەی ویلسۆن کۆدەبوونەوە. *لە چەپەوە بۆ ڕاست:* ئۆرلاندۆ، لیۆد جۆرج، کلیمینجوو، ویلسۆن.



١٣. ئاشتیکەران لەلایەن سکاڵانامەبەدەستانەوە گەمارۆ درابوون. یەکێک کە لە هەموان دڵڕفێنتر بوو شاژن ماریای ڕۆمانیا بوو، کە هاوڕێ لەگەڵ جەماوەرێکی زۆر، چەمەدانێکی گەورەی جل و بەرگ و کۆمەڵێک داواکاری بۆ نزیک بە نیوەی مەجارستان گەیشتە پاریس.



١٤.  یەکێک لەو خەڵکانەی کە چاویان بڕیبوە کۆڕی ئاشتی بۆ ئەوە کە شکاتەکانی خۆیان سەرلەنوێ پێشکەش کەنەوە پۆڵەندیەکان بوون، کەسانێک کە وڵاتەکەیان لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا لەلایەن دراوسێکانیانەوە پارچەپارچە کرابوو. ڕووخانی ڕووسیە، ئەڵمانیا و ئوتریش-مەجارستان لە ساڵی ١٩١٨دا دەرفەتێکی باشی بۆ پۆڵەندا ڕەخساند. ئیگناس پادێرێویسکی، پیانۆژەنی گەورە کە بوو بە یەکەمین سەرەک وەزیری وڵاتی تازە پێگرتوو، زۆر هەوڵی دا تا پاڵپشتی زلهێزان بۆ وڵاتەکەی خۆی ڕاکێشێت.



۱٥.  هاوکات کە پادیریڤیسکی لە پاریس چالاکی دەکرد، ژەنەڕاڵ ژۆسیف پیلسۆدیسکی لە قۆرشەو لە هەوڵ و خەبات دابوو تا سەرلەنوێ وڵاتێکی پۆڵەندی دروست بکاتەوە و سوپایەکی پۆڵەندی دامەزرێنێت. هەرچەند خولیاگەری ناوچەگەری ئەو قەت نەگەیشتە ئاستی هەندێک لە نیشتمانپەروەرانی هاوڕێی، کەچی دەستی بەسەر هەندێک لە ناوچەکانی لیتوانیای باشوور داگرت و بەرەو ڕۆژهەڵات بۆ بیلارووس و ئۆکراین پێشڕەوی کرد، و لەو دەوروبەرەدا بوو کە لەگەڵ بۆلشویکەکان تێکگیرا.



١٦. بێلاکۆن، کمونیستی مەجاری کە گرتنەدەستی دەسەڵاتی بووداپێست لەلایەن ئەووە لە مانگی مارسی ساڵی ١٩١٩ لە پاریس ترس و دڵەڕاوکێی خستەوە. ژەنەڕاڵ سمووتس، کە لەلایەن ئاشتیکەرانەوە بۆ هەندێک کاری لێکۆڵینەوە ناردرابوو، هاتە سەر ئەم دەرەنجامە کە کۆن لەوەن اچێ بۆ ماوەیەکی زۆر لە دەسەڵاتدا بمێنێتەوە. لە مانگی ئۆگستی ساڵی ١٩١٩دا، کابرای مەجاریان ناچار کرد هەڕاکات چون دوژمنەکانی دژ بە ئەو پیلانگێڕیان کردبوو و دراوسێکانی مەجارستان وەکوو چکسلەواکیا و ڕۆمانیا دەستیان بە داگیرکردنی ناوچەگەلی مەجاری کرد.



١٧. شاندی نوێنەرایەتی عەرەب لە کۆری ئاشتیدا: شازادە فەیسەڵ *(لەپێشەوە)*، کە بەهیوای وڵاتێکی سەربەخۆی عەرەبی لەژێر دەسەڵاتی بنەماڵەی خۆیدا بوو، و، لە تەنیشتی چەپی ئەو، ت.ئی.لۆرێنس دەسرەوکڵاوی عەرەبی لە سەردا شتێک کە فەرەنسەیەکان زۆری پێ قەڵس بوون. سەرەڕای ئەو هەموو قەوڵ و بەڵێنەی کاتی شەڕ کە دابوویان، نە بەریتانیەکان و نە فەرەنسەیەکان حازر نەبوون دەست لە کۆنترۆڵکردنی ڕۆژهەڵاتی ناڤین هەڵگرن، و عەرەبەکانیش کۆڕی ئاشتییان بە خەیانەتێکی تر لەلایەن زلهێزانی ڕۆژئاواوە دەزانی.



١٨. سەرەک وەزیری ئیتالیا، ڤیتۆریۆ ئۆرلاندۆ، گۆچان بەدەست، کۆڕی ئاشتی چۆڵ دەکات. لە مانگی ئاڤریلی ساڵی ١٩١٩دا، ئیتالیەکان لەگەڵ هاوپەیمانانی خۆیان لەسەر داواکاریەکانی ئیتالیا لە ئادریاتیک، بەتایبەت لەسەر بەندەری فیووم(ڕیژەکا) تووشی گێرە و کێشە هاتن. ویلسۆن بە هیچ جۆرێک شانی بۆ دانەدان. مانگرتنی ئیتالیەکان هەڕەشەیەک بوو بۆ سەر کۆری ئاشتی بەگشتی، چون ئەڵمانیەکان لەوەدابوون کە بۆ وەرگرتنی مەرجەکانی خۆیان بانگێشت بکرێن.



**١٩.** فیووم، بەندەرێکی بچووک لە ئادریاتیک شوێنێک کە ژمارەی سلاڤەکان خەریک بوو بەرە بەرە لە ژمارەی ئیتالیەکان زیاتر دەبوو، لە ئیتالیا بوو بە بابەتێکی سەرەکی ناسیۆنالیستی. دوا گرتنەوەی شار لە مانگی سێپتامری ساڵی ١٩١٩، گابریەل دیئانزینۆی شاعیر بۆماوەی پازدە مانگ لەوێ ماوە، بەرەنگاری حکوومەت دەبۆوە و وتارگەلی دوورودرێژی ناسیۆنالیستی پێشکەش دەکرد. مۆسۆلینی، دیکتاتۆری داهاتووی ئیتالیا، لە نموونەی ئەو زۆر شت فێر بوو.



٢٠.  ئیلۆتیریۆس ڤینزیلۆس، سەرەک وەزیری یونان، کە خەونی یونانێکی گەورەتری دەدی کە بەشێکی یەکجار زۆری لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەخۆ دەگرت. لەدڵەوەنزیک بوونی ئەو کابرایە بووە هۆی پشتگریکردنی لە پاریس، بەتایبەت لەلایەن لیۆد جۆرجەوە. لە ئاکامدا، یونان دەستی بەسەر پاشماوەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە ترەیس گرت و ڕێگەی پێدرا تا بۆ مەبەستی داگیرکردنی بەندەری زۆرینەی یونانی نشینی سمیرنا(ئیزمیر) لە سەر کەنارئاوەکانی ئاسیای بچووک سووپایەک حەواڵە بکات.



**٢١.** ئاشتیکەران پەیماننامەیەکی سزادەرانەیان لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەست، لە سیڤێرس لە ساڵی **١٩٢١** واژۆ کرا، بەڵام هێزی ڕاپەڕاوی ناسیۆنالیزمی تورکی لەبەرچاو نەدەگرت، کە لەوکاتەدا لە ژەنەڕاڵێکی ناسراو بەناوی کەماڵ ئاتاتورک ڕێبەرێکی بۆخۆی درووست کردبوو.



٢٢. شادی و خۆشی جەماوەری تورکی لە هێنانەدەرێی سمیرنا لەژێر دەستی یوونانیەکان لە ساڵی ١٩٢٢دا، کە نیشانەی کۆتایی هاتنی خەونەکانی ڤینزیلۆس و دانیشتنی یوونانیەکان لە شوێنێک کە تورکیەی مۆدێرنی لێدەرهات.



**٢٣.** لۆرد کۆرزۆن، وەزیری دەرەوە دوای مانگی سێپتامری ساڵی ١٩١٩، کە بە ترسەوە سەیری پشتگریکردنی لیۆد جۆرج لە ئاواتگەلی یوونانیەکان دەکرد و دواتر دەبوایە بۆ مەبەستی دانانی پەیماننامەیەکی تازە لەگەڵ تورکەکان لەباتی پەیماننامەی لەبەینچووی سیڤێرس دانووستانی بکردایە.



٢٤. شاندی نوێنەرایەتی تورک بۆ لۆزان لە ساڵەکانی ١٩٢٣-١٩٢٢. ژەنەڕاڵ ئیسمیت، گۆچان بەدەست، نوێنەری باوەڕپێکراوی ئاتاتورک بوو؛ ئەو بە نەگۆڕینی هەڵوێستی وتوێژکەرانەی خۆی سەرنجی کۆرزۆنی بۆ لای خۆی ڕاکێشا. لە ئاکامدا پەیماننامەیەک لە ساڵی ١٩٢٣ واژۆ کرا کە تورکیەی لە حاڵەتی ئێستای خۆی دانا.



٢٥. کۆڕی ئاشتی لەگەڵ هێزە شکستخواردووەکانی وەکوو ئوتریش، بۆلغارستان، مەجارستان و تورکیەی عوسمانی پەیماننامەگەلێکی بەست، بەڵام لەگەڵ ئەڵمانیا تووشی گێرەوکێشە هات. بەهۆی ئەو ناکۆکیانەی کە لەنێوان هاوپەیمانان دروست بوو، ئەو دانیشتنە سەرەتاییەی کە بەر لە وتوێژکردن لەگەڵ دوژمن بەڕێوە چوو بەرەبەرە ڕەنگ و بۆ کۆڕی ئاشتی بەخۆیەوە گرت. مەرجەکانی ئەڵمانی هەتا مانگی مەی ساڵی ١٩١٩ ئامادە نەکران. کۆنت ئۆلریچ برۆدۆرف-ڕانتزۆ _لە ڕاستەوە سێهەمین کەس) وەزیری دەرەوەی ئەڵمانیا و ڕێبەری شاندی ئەو وڵاتە بوو. ئەڵمانیەکان هاوپەیمانانیان قەت لەبەر هۆی سەپاندنی مەرجەکانیان و بەهەند نەگرتنی وتوێژەکان نەبەخشی.




٢٦. خۆپیشـاندانێکی گـەورەی نارەزایـەتی لـە بـەرلین. ئەڵمانیـەکان لـە مەرجـەکانی ئاشـتی تۆقابوون، ئەو مەرجانەی کە ئەوان وەک شکاندنی قەولێکیان دەزانی کە لە کاتیی ئاگربەستدا لـە هاوپەیمانیان وەرگرتبوو: واتـە ئاشـتی لەسـەربنەمای دیپلۆماسـی تـازەی ویلسـۆن، بـە تۆڵـەی بەرابـەر، دانووستانی لەسەر بکرایە. درووشمی سەر بەیداخەکە داوای "تەنیا چاردە خاڵەکەی ویلسـۆن"، دەکات کە ئاماژەیەکە بە وتارە ناسراوەکەی ویلسۆن.



**٢٧.** ئاشتیکەران لە وڵامی نارەزایەتیەکان و پێشنیارەکانی ئەڵمانیەکان تەنیا چەند گۆڕاکاریەکی بچووکیان لەسەر مەرجەکان دانا. هاوکات لەگەڵ ئەوانەش ئەوان دوامۆڵەتێکی واژۆکردنیان بۆ حکوومەتی ئەڵمانی دانا، ئەویش بەنۆبەی خۆی ئەڵمانیای تووشی قەیرانێکی ئاڵۆزی سیاسی کرد. لە پاریس، ئامادەکاریەکانی هاوپەیمانی بۆ واژۆکردنی پەیماننامەکە یان سەرلەنوێ دەستپێکردنەوەی شەڕ بەرەوپێش چوون. لێرەدا، سەربازانی فەرەنسەیی لە کۆشکی گەورە لە ڤێرسایلێسدا لە ئامادەکاری بۆ واژۆکردن خەریکی ڕاگواستنی کەرەسەکانن.



٢٨. لـه ٢٣ى مـانگى ژوەنـى سـاڵى ١٩١٩دا، ماوەيـەكى كـەم بەرلـە كۆتـايى پێهـاتنى دوامۆڵەتى هاوپەيمانى، حكوومەتى ئەڵمانى لە كۆتاييدا لەسەر واژۆكردنى پەيماننامەكە بڕيار دەدا. بەرنامـەى ڕێوڕەسـمەكە بـۆ ٢٨ى مـانگى ژوەن ديـارى كـرا و بـۆ وەرگرتنـى بليتـەكان پاڵەپسـتۆى يەكتريان دەدا. هەندێک لەو كەسانەى كە نەياندەتوانى بچنە ناو هۆڵى ئاوێنەكان[هۆڵ ئاف مێررس] لە ناچارى لە پشت پەنجەرەكانەوە سەيريان دەكرد.



**٢٩.** دیمەنی ناو هۆڵی ئاوێنەکان[ هۆڵ ئاف مێررس] ئەوکاتەی کە پەیماننامەی ڤێرسایلیس واژۆ کرا. ئەو شوێنە گرنگیەکی تایبەتی بۆ فەڕەنسەیەکان هەبوو چون لەوێدابوو کە بەدوای شکستی فەڕەنسە لە شەڕی فرانکۆ-پڕاشنی ساڵەکانی ٧١-١٨٧٠ نەتەوەی تازەی ئەڵمانیا ڕاگەیەنرابوو.



٣٠. کۆشک و دەورووبەری ڤێرسایلێس لە ٢٨ی ژوەنی ساڵی ١٩١٩، فەوارەکان خرانە کار و تەقە لە تفەنگەکان هەستا تا بە جەماوەری حازر و چاوەڕوانکراو ڕاگەینرێت کە پەیماننامەی ئەڵمانی واژۆ کراوە. هەرچەند کۆڕی ئاشتی هەتا مانگی ژانویەی ساڵی ١٩٢٠ درێژەی هەبوو، ئەمە نیشانەی کۆتایی هاتنی گرنگترین دەورەی ئەو کۆڕە بوو. ویلسۆن هەر ئەو شەوە بەرەو وڵاتەیەکگرتوەکان گەڕایەوە، و لیۆد جۆرجیش ماوەیەکی کورت بەدوای ئەوەدا بۆ بەریتانیا گەڕایەوە.

* * * *

# پەڕتووک

# چاردە خاڵەکەی ودرەو ویلسۆن

١. ڕێکەتنامەگەلی کراوەی ئاشتی، بە ئەنجام گەیشتوو بەشێوەیەکی کراوە، بەدوایاندا نابێت هیچ جۆرە تێگەیشتنێکی نهێنی جیهانی لەگۆڕێدا بێت بەڵام دیپلۆماسی هەمیشە بەشێوەیەکی کراوە و لەبەردەمی جەماوەردا ڕەوتی خۆی دەگرێتە بەر.

٢. ئازادی تەواو بە کەشتیرانی لەسەر دەریاکاندا، لە دەرەوەی ئاوەکانی ناوچەیی، چ لە کاتی ئاشتیدا و چ لە کاتی شەڕدا بە یەک شێوە، مەگین دەریاکان بەگشتی یان بەشێوەی پارچەپارچە لەلایەن چالاکی نێونەتەوەییەوە بۆ مەبەستی بەهێزکردنی ڕێکەوتنامەگەلی جیهانی داخرێن.

٣. ئەوەندەی کە دەکرێ تەنگ و چەڵمەکانی ئابووری لەبەین بەرن و بەرابەریەکی هەل و مەرجی تیجاری لەنێوان هەمووی ئەو نەتەوانەدا دا دابمەزرێت کە لەسەر ئاشتی ڕێکەوتوون و بۆ ڕاگرتنی ئەو ئاشتیەش لەپێوەندی دابن.

٤. ئەوەندە گارانتی ببەخشرێت و وەرگیرێت کە چەکدارکردنی نەتەوەیی تا ئاستێک کەم کرێتەوە کە لەگەڵ ئاسوودەیی ناوخۆییدا گونجاو بێت.

٥. ڕێکەوتنێکی ئازاد، کراوە، و تەواو بێ لایەنی هەمووی داواکاریەکانی کۆلۆنیایی، لەسەر بنەمای چاودێریەکی توندوتۆڵی یاسا، بەو مانایەکە لە ناسینی هەموو پرسیارگەلێکی دەسەڵاتداریێتی لەو چەشنە، بەرژەوەندیگەلی ئەو حەشیمەتانەی کە دەکەونە بەرباس پێویستە هاوڕێ لەگەڵ داواکاریگەلی بەرانبەری حکوومەتێک کە بڕیارە بناسرێت قورسایی بەرانبەریان هەبێت.

٦. چۆڵکردنی هەمووی ناوچەگەلی ڕووسی، و هەمووی کێشەکان وەها داکووژێن کە وابێ کارکەنە سەر ڕووسیە تابەڵکوو باشترین و ئازادترین هاوکاریکردنی نەتەوەکانی تری جیهان بەلای ئەو وڵاتەدا ڕاکێشرێت و دەرفەتێکی وای بۆ بڕەخسێنن کە بتوانێ بە سەربەخۆیی سیاسی و ئابووری خۆی بگات و دڵنیا بکرێتەوە کە باوەشی گەرم و گوڕی کۆمەڵگای نەتەوە ئازادەکان لە

چوارچێوەی ڕێکخراوەگەلێک کە خۆی هەڵیان دەبژێرێت بۆ ئەو ئاوەڵایە؛ و، لەو باوەشە گەرمتر، یارمەتیدانێک دەبێت کە لەوانەیە ئەو بۆخۆی پێویستی پێی هەبێت و لەوانەیە بۆخۆی حەزی لێبێت. ڕەفتارێک کە لەلایەن دەستە خوشکەکانی ڕووسیەوە لەگەڵی کرا سەنگی محەک دبن بۆ نیازپاکی ئەوان، بۆ تێگەیشتنی ئەوان لە پێداویستیەکانی ئەو وڵاتە جیاواز لە بەرژەوەندیەکانی خودی خۆیان، و بۆ هاوخەمی ڕۆشنبیرانە و خۆنەویستانەی ئەوان.

٧. هەمووی جیهانیان لەسەر ئەوە کۆکن کە بلژیک دەبێ چۆڵ بکرێت و ببووژێندرێتەوە بەبێ ئەوە لەسەر ڕێی درووستکردنی پێوەندیەکانی ئەو وڵاتە لەگەڵ هەموو نەتەوە ئازادەکانی تر تەگەرەیەک دابندرێت. بۆ بووژاندنەوەی متمانەبوونی هەموو نەتەوەکان بە یاساگەلێک کە خۆیان بۆ حکوومەتی پێونەندیەکانی خۆیان لەگەڵ یەکتر دایانمەزراندوە و دابینیان کردوە هیچ هەوڵێکی تر وەک ئەم هەوڵە خزمەت ناکات. بەبێ ئەم هەوڵە سارێژکەرە گشت پێکهاتە و ڕەوابوونی یاسای نێونەتەوەیی بۆ هەتاهەتایە زیان دەبینێت.

٨. هەمووی ناوچەکانی فەڕەنسە دەبێ ئازاد بکرێن و ئەو شوێنانەی کە هێرش کراوەتە سەریان بگەڕێندرێنەوە، و ئەو هەڵەکاریەی کە لەلایەن ئەڵمانەوە لە ساڵی ١٨٧١ لەسەر باسی ئالساسێ-لۆرەین دەر حەق بە فەڕەنسە کراوە، کە ئاشتی جیهانی بۆ ماوەی نزیک بە پەنجا ساڵی شێواند، دەبێ ڕاست بکرێنەوە، تابەڵکوو بۆ ڕایەکی تر لە بەرژەوەندی هەموان ئاشتی باڵ بەسەر وڵاتدا بکێشێتەوە.

٩. پێویستە سنوورەکانی ئیتالیا بەدرێژایی هێڵە ڕوون دیاریکراوەکانی نەتەوایەتی سەرلەنوێ دیاری بکرێنەوە.

١٠.خەڵکانی ئوتریش-مەجارستان، کەسانێک کە ئێمە بە ئاواتەوەین ژینگەکەیان پارێزراو و ئاسوودە لە هەر مەترسیەک بێت، پێویستە ئازادترین دەرفەتی پێشکەوتنی سەربەخۆییان بۆ دابین بکرێت.

١١. پێویستە ڕۆمانیا، سێربیا، و مۆنتێنێگرۆ چۆڵ بکرێن؛ ناوچە داگیرکراوەکان بگەڕێندرێنەوە؛ سێربیا ئازادانە و دوور لە هەر مەترسیەک مافی دەستپێڕاگەیشتنی بە دەریا پێ ببەخشرێت؛ و پێوەندیەکانی چەندین وڵاتی باڵکان لەگەڵ یەکتر پێویستە لەڕێگای شۆڕای دۆستانە بەدرێژایی هێڵە لەمێژینە دامەزراوەکانی نەتەوایەتی و دەرەبەگایەتی دابین بکرێن؛ و پێویستە گارانتیگەلی جیهانی سەربەخۆیی ئابووری و سیاسی و یەکگرتوویی ناوچەیی چەندین وڵاتی باڵکان لە بەرچاو بگیرێن.

١٢. ناوچەکانی تورکیەی ئیمپراتۆریەتی ئێستای عوسمانی پێویستە دەسەڵاتداریێتیەکی مسۆگریان پێ ببەخشرێت، بەڵام نەتەوەکانی تر کە ئێستا کەوتوونەتە ژێر دەسەڵاتی تورکیەوە پێویستە ژیانێکی ئاسوودە دوور لە هەر مەترسیەک و دەرفەتێکی زۆر لەبار بۆ پەرەسەندنی سەربەخۆییان بۆ دابین بکرێت، و پێویستە داردانێلەکان بۆ هەتاهەتایە وەک ڕێگایەکی ئازاد بۆ کەشتیەکان و تجارەتی هەمووی نەتەوەکان لەژێر گارانتیەکانی جیهانیدا بکرێنەوە.

١٣. پێویستە وڵاتێکی سەربەخۆی پۆڵەندی دروست بکرێت و هەمووی ئەو ناوچانە لەخۆ بگرێت کە دانیشتوانەکەیان لە خەڵکی پۆڵەندی دوور لە هەر گێرەوکێشەیەک پێکهاتوون، و پێویستە دەستپێڕاگەیشتنێکی ئازاد و هێمنانەیان بە دەریا بۆ مسۆگر بکرێت، لەلایەن ڕێکەوتنامەی جیهانیەوە سەربەخۆیی سیاسی و ئابووری و یەکگرتوویی ناوچەییان بۆ گارانتی بکرێت.

١٤. پێویستە لە چوارچێوەی ڕێکەوتنامەگەلێکی تایبەت بۆ مەبەستی بەخشینی گارانتیگەلی دوولایەنەی سەربەخۆیی سیاسی و یەکگرتوویی ناوچەیی بە وڵاتانی بچووک و گەورە وەک یەک ئەنجوومەنێکی گشتی نەتەوەکان دابمەزرێت.

❊ ❊ ❊ ❊

# Bibliography

ABBREVIATIONS

FRUS *Papers Relating to the Foreign Relations of the United States: The Paris Peace Conference 1919*

PWW *The Papers of Woodrow Wilson*

UNPUBLISHED SOURCES

Bodleian Library, Oxford

Alfred Milner Papers

British Library, London

Arthur Balfour Papers

George Nathaniel Curzon Papers

Edwin Montagu Papers

Churchill College, Cambridge

Archives of Lord Hankey of the Chart

Winston S. Churchill Papers, Charwell Group

Alan Leeper Papers

House of Lords Record Office

Lloyd George Papers

Library of Congress, Washington, D.C.

The Ray Stannard Baker Papers

George Louis Beer Collection

Tasker H. Bliss Papers

Ministère des Affaires Etrangères, Paris

Jules Cambon Papers

Paul Cambon Papers

Georges Mandel Papers

André Tardieu Papers

Série à Paix, 1914-1920

Europe, 1918-1929

Ministère de la Défense, Archives d'Armée de Terre, Château de Vincennes

Clemenceau Papers

National Archives of Canada, Ottawa

Oliver Mowat Biggar Papers

Robert Laird Borden Papers

Loring Christie Papers

National Library of Australia, Canberra

Frederic William Eggleston Papers

William Morris Hughes Papers

J. G. Latham Papers

R. R. Garran Papers

Public Record Office, London

Cabinet Papers, CAB 29/Peace Conference and Other

International Conferences

Scottish Record Office, Edinburgh

Lothian (Philip Kerr) Papers

St. Antony's College, Oxford

Neill Malcolm Papers

University Microfilms International

Sidney Sonnino Papers

Yale University Library, New Haven

Gordon Auchincloss Papers

Edward Mandel House Papers

Charles Seymour Papers

Sir William Wiseman Papers

OTHER SOURCES


Adam, M. "France and Hungary at the Beginning of the 1920s," *War and Society in East Central Europe*, ed. B. K. Kiraly, P. Pastor and I. Sanders, vol. 6, *Essays on World War I: Total War and Peacemaking, A Case Study on Trianon*, ed. B. K. Kiraly, P. Pastor and I. Sanders. New York, 1982.

Adamthwaite, A. *Grandeur and Misery: France's Bid for Power in Europe, 1914-1940*. London,

Adelson, R. *Mark Sykes: Portrait of an Amateur*. London, 1967.

Ahmad, F. "The Late Ottoman Empire," *The Great Powers and the End of the Ottoman Empire*, ed. M. Kent. London, 1984.

Alastos, D. *Venizelos: Patriot, Statesman, Revolutionary*. London,1942.

Albrecht-Carrie, R. "Fiume: Nationalism versus Economics," *Journal of Central European Affairs* (1942).

----------, *Italy at the Paris Peace Conference*. Hamden, Connecticut,1966.

Alcock, A. "Trentino and Tyrol: From Austrian Crownland to European Region," *Europe and Ethnicity*, ed. S. Dunn and T. G. Fraser. London, 1996.

Aldcroft, D. H. *From Versailles to Wall Street, 1919-1929*. London,1987.

----------, "The Versailles *Legacy," History Review*, 29 (December1997).

Aldrovandi Marescotti, L. *Guerra diplomatica: ricordi e frammenti didiario*. Milan, 1936.

----------, *Nuovi ricordi e frammenti di diario per far seguito a "Guerra diplomatica" (1914-1919)*. Milan, 1938.

Allizé, H. *Ma mission a Vienne*. Paris, 1933.

Almond, N, and R. H. Lutz, eds. *The Treaty of St. Germain: A Documentary History of Its Territorial and Political Clauses*. Stanford, California, 1935.

Ambrosius, L. E. *Woodrow Wilson and the American Diplomatic Tradition: The Treaty Fight in Perspective*. Cambridge, Massachusetts, 1990.

Amery, L. S. *The Leo Amery Diaries*, ed. J. Barnes and D. Nicholson, 2 vols. London, 1980.

Anderson, M. S. *The Eastern Question, 1774-1923: A Study in International Relations*. London, 1966.

Andrew, C. M., and A. S. Kanya-Forstner. *France Overseas: The Climax of French Imperial Expansion, 1914-1924*. Stanford, California, 1981.

Antonius, G. *The Arab Awakening: The Story of the Arab National Movement*. New York, 1965.

Apponyi, A. *The Memoirs of Count Apponyi*. London, 1935.

Armstrong, H. F. *Peace and Counterpeace: From Wilson to Hitler: Memoirs of Hamilton Fish Armstrong*. New York, 1971.

Ashmead-Bartlett, E. *The Tragedy of Central Europe*. London, 1923.

Azan, P. *Franchet d'Esperey*. Paris, 1949.

Baerlein, H. R *The Birth of Yugoslavia, 2* vols. London, 1922.

Bailey, T. A. *Woodrow Wilson and the Lost Peace*. Chicago, 1963.

Baker, R. S. *What Wilson Did at Paris*. New York, 1919.

----------, *Woodrow Wilson and World Settlement: Written from His Unpublished Material, 2* vols. London, 1923.

----------, *Woodrow Wilson: Life and Letters*, 8 vols. Garden City, New York, 1927-39.

Banac, I. *The National Question in Yugoslavia: Origins, History, Politics*. Ithaca and London, 1984.

Bandholtz, H. *An Undiplomatic Diary by the American Member of the Inter-Allied Military Mission to Hungary, 1910-1920*. New York,1966.

Barcsay, T. “The Kڵrolyi Revolution in Hungary, October 1918-March 1919,” unpublished DPhil. thesis. University of Oxford,1971.

Barker, E. *Austria 1918-1972*. London, 1973.

Bartlett, V *Behind the Scenes at the Peace Conference*. London,1920.

Baruch, B. M. *The Making of the Reparation and Economic Sections of the Treaty*. New York, 1920.

Bauer, O. *The Austrian Revolution*. London, 1925.

Beadon, R. H. *Some Memories of the Peace Conference*. London,1933.

Beaverbrook, Lord. *The Decline and Fall of Lloyd George*. London,1963.

Beers, B. F. *Vain Endeavor: Robert Lansing’s Attempts to End the American-Japanese Rivalry*. Durham, North Carolina, 1962.

Bell, P.M.H. *France and Britain 1900-1940: Entente and Estrangement*. London and New York, 1996.

Bennett, G. *Cowan’s War: The Story of British Naval Operations in the Baltic, 1918-1920*. London, 1964.

Bessel, R. *Germany After the First World War*. Oxford, 1993.

----------, “Why Did the Weimar Republic Collapse?” *Weimar: Why Did German Democracy Fail*?, ed. I. Kershaw. New York, 1990.

Birdsall, P. *Versailles: Twenty Years After*. London, 1941.

Block, R. “City of the Future,” *New York Review of Books*, June 9, 1994.

Boemeke, M., G. D. Feldman, and E. Glaser, eds. *The Treaty of*

*Versailles: A Reassessment After 75 Years*. Cambridge and Washington, 1998.

Bonsal , S. *Unfinished Business*. Garden City, New York, 1944.

----------, *Suitors and Suppliants: The Little Nations at Versailles*. New York, 1946.

Borden, R. L. *Robert Laird Borden: His Memoirs*, ed. H. Borden, 2 vols. London, 1938.

Borsanyi, G. *The Life of Communist Revolutionary, Béla Kun*. Highland Lakes, New Jersey, 1993.

Bosworth, R.J.B. "Italy and the End of the Ottoman Empire," *The Great Powers and the End of the Ottoman Empire*, ed. M. Kent. London, 1984.

Bothwell, R. *Loring Christie*. New York and London, 1988.

Boyce, R., ed. *French Foreign and Defence Policy, 1918-1940: The Decline and Fall of a Great Power*. London and New York, 1998.

Brecher, F. W. "French Policy Towards the Levant, 1914-18," *Middle Eastern Studies*, 29/4 (1993).

Bridge, F. R. "The Foreign Policy of the Monarchy 1908-1918," *The Last Years of Austria-Hungary*, ed. M. Cornwall. Exeter, 1990.

Brown, J. M. *Gandhi's Rise to Power*. Cambridge, U.K., 1972.

----------, *Gandhi: Prisoner of Hope*. New Haven and London, 1989.

Brown, R. C. *Robert Laird Borden, 2* vols. Toronto, 1975-80.

Brownell, W, and R. N. Billings. *So Close to Greatness: A Biography of William C Bullitt*. New York and London, 1987.

Bruun, G. *Clemenceau*. Cambridge, Massachusetts, 1943.

Bunselmeyer, R. *The Cost of War, 1914-1919: British Economic War Aims and the Origins of Reparation*. Hamden, Connecticut,1975.

Burgwyn, H.J. *Italian Foreign Policy in the Interwar Period, 1918-1940*. Westport, Connecticut, 1987.

----------, *The Legend of the Mutilated Victory: Italy, the Great War, and the Paris Peace Conference, 1915-1919*. Westport, Connecticut, 1993.

Burnett, P. M. *Reparation at the Paris Peace Conference from the Standpoint of the American Delegation, 2* vols. New York, 1965.

Burns, M. “Disturbed Spirits: Minority Rights and New World Orders, 1919 and the 1990s,” *New European Orders, 1919 and 1991*, ed. S. F. Wells and P. Bailey Smith. Washington, D.C., 1996.

Busch, B. C. *Mudros to Lausanne: Britain's Frontier in West Asia, 1918-1923*. Albany, 1976.

----------, *Britain, India and the Arabs, 1914-1921*. Berkeley, 1971.

Butler, H. *The Lost Peace*. London, 1941.

Butler, J.R.M. *Lord Lothian, Philip Kerr, 1882-l940*. London, 1960.

Cairns, J. C. “A Nation of Shopkeepers in Search of a Suitable France: 1919-1940,” *American Historical Review*, 3 (1974).

Calder, K. J. *Britain and the Origins of the New Europe*. Cambridge,U.K., 1976.

Callimachi, A.-M. *Yesterday Was Mine*. New York, London and Toronto, 1949.

Callwell, C. E. *Field Marshal Sir Henry Wilson: His Life and Diaries, 2* vols. London, 1927.

Cambon, P. *Correspondance, 1870-1924*, 3 vols. Paris, 1946.

*Cambridge History of Japan, 6* vols. Cambridge, 1989.

Campbell, F. G. “The Struggle for Upper Silesia, 1919-1922,” *Journal of Modern History*, 42/3 (September 1970).

Campbell, J. *F. E. Smith, First Earl of Birkenhead*. London, 1983.

Cannadine, D. *The Decline and Fall of the British Aristocracy*. New Haven and London, 1990.

Carls, S. D. *Louis Loucheur and the Shaping of Modern France, 1916-1931*. Baton Rouge and London, 1993.

Carsten, F. L. *Revolution in Central Europe, 1918-19*. Berkeley and Los Angeles, 1972.

Carton de Wiart, A. *Happy Odyssey: The Memoirs of Lieutenant-General Sir Adrian Carton de Wiart*. London, 1950.

Cecil, *R. A Great Experiment: An Autobiography*. London, 1941.

----------, *All the Way*. London, 1949.

Chernow, R. *The Warburgs*. New York, 1993.

Chi, M. S. *China Diplomacy, 1914-1918*. Cambridge, Massachusetts, 1970.

----------, "Ts'ao Ju-lin (1876-1966): His Japanese Connections," *The Chinese and the Japanese: Essays in Political and Cultural Interactions*, ed. A. Iriye. Princeton, New Jersey, 1980.

Chow, T. *The May Fourth Movement: Intellectual Revolution in Modern China*. Cambridge, Massachusetts, 1960.

Chu, P.*V.K. Wellington Koo: A Case Study of China's Diplomat and Diplomacy of Nationalism, 1912-1966*. Hong Kong, 1981.

Churchill, W. S. *The Aftermath*. New York, 1929.

----------, *Great Contemporaries*. London, 1959.

Cienciala, A. M. "The Battle of Danzig and the Polish Corridor at the Paris Peace Conference of 1919," *The Reconstruction of Poland, 1914-23*, ed. P. Latawski. London, 1992.

----------, and T. Komarnicki. *From Versailles to Locarno: Keys to Polish Foreign Policy, 1919-1925*. Lawrence, Kansas, 1984.

Clemenceau, G. *Grandeur and Misery of Victory*. Toronto, 1930.

Clogg, *R. A Concise History of Greece*. Cambridge, U.K., 1992.

Cohen, W. I. *The American Revisionists: The Lessons of Intervention in World War I*. Chicago and London, 1967.

Connors, L. *The Emperor's Advisor: Saionji Kinmochi and Pre-war*

*Japanese Politics*. London, 1987.

Constant, S. *Foxy Ferdinand: Tsar of Bulgaria*. London, 1979.

Cook, G. L. “Sir Robert Borden, Lloyd George, and British Military Policy, 1917-1918.” *Historical Journal, 14/2* (1971).

Coolidge, H. J., and R. H. Lord. *Archibald Cary Coolidge*. Boston and New York, 1932.

Cooper, J. M. *Breaking the Heart of the World: Woodrow Wilson and the Fight for the League of Nations*. Cambridge, U.K., and New York, 2001.

Cornwall, M. “The Dissolution of Austria-Hungary,” ed. M. Cornwall, *The Last Years of Austria-Hungary*. Exeter, 1990.

Craig, G. A., and F. Gilbert, eds. *The Diplomats: 1919-1939*. New York, 1963.

Crampton, R.J. *A Short History of Modern Bulgaria*. Cambridge, U.K., 1987.

Crozier, A. J. “The Establishment of the Mandates System, 1919-25,” *Journal of Contemporary History*, 14/3 (1979).

Cruttwell, *C.R.M.F. A History of the Great War, 1914-1918*. London, 1982.

Curry, G. “Woodrow Wilson, Jan Smuts and the Versailles Settlement,” *American Historical Review*, 66/4 (July 1961).

Curry, R. W. *Woodrow Wilson and Far Eastern Policy, 1913-1921*. New York, 1968.

Czernin, F. *Versailles 1919*. New York, 1964.

Darwin, J. *Britain, Egypt and the Middle East: Imperial Policy in the Aftermath of War, 1918-1922*. New York, 1981.

Davies, N. “Great Britain and Polish Jews, 1918-1920,” *Journal of Contemporary History*, 8/2 (April 1973).

----------, “Lloyd George and Poland, 1919-20,” *Journal of Contemporary History, 6/3* (1971).

----------, *White Eagle, Red Star: The Polish-Soviet War, 1919-1920*.

London, 1972.

----------, *God's Playground: A History of Poland, 2* vols. New York, 1982.

Deak, F. *Hungary at the Paris Peace Conference: The Diplomatic History of the Treaty of Trianon*. New York, 1942.

Debo, R. K. *Revolution and Survival: The Foreign Policy of Soviet Russia, 1917-18*. Toronto and Buffalo, 1979.

Department of External Affairs, Ottawa. *Documents on Canadian External Relations*, vol. 2, *The Paris Peace Conference*. Ottawa, 1969.

Department of State. *Papers Relating to the Foreign Relations of the United States: The Paris Peace Conference 1919*, 13 vols. Washington, D.C., 1942-47.

----------, *Papers Relating to the Foreign Relations of the United States: The Robert Lansing Papers, 1914-1920, 2* vols. Washington, D.C., 1939-40.

----------, *The Treaty of Versailles and After*. Washington, D.C., 1947.

Desmond, R. W. *Windows on the World: World News Reporting, 1900-1920*. Iowa City, 1980.

Deutscher, I. *The Prophet Armed: Trotsky: 1879-1921*. New York, 1965.

Dillon, E. J. *The Inside Story of the Peace Conference*. New York and London, 1920.

Dingman, R. *Power in the Pacific: The Origin of Naval Arms Limitations, 1914-1922*. Chicago, 1976.

Dockrill, M. L., and J. D. Goold. *Peace Without Promise: Britain and the Peace Conferences, 1919-1923*. Hamden, Connecticut, 1981.

Dockrill, M. L., and Z. Steiner. "The Foreign Office at the Paris Peace Conference in 1919," *International History Review*, 2/1 (January 1980).

Dominian, L. *The Frontiers of Language and Nationality in Europe*. New York, 1917.

Dontas, D. V "Troubled Friendship: Greco-Serbian Relations, 1914-1918," *The Creation of Yugoslavia*, ed. D. Djordjevic. Santa Barbara and Oxford, 1980.

Dragnich, A. N. *Serbia, Nikola Pašić, and Yugoslavia*. New Brunswick, New Jersey, 1974.

----------, "The Serbian Government, the Army and the Unification of Yugoslavs," *The Creation of Yugoslavia, 1914-1918*, ed. D. Djordjevic. Santa Barbara and Oxford, 1980.

Duchene, *F. Jean Monnet: The First Statesman of Independence*. New York, 1994.

Dugdale, *B. Arthur James Balfour, 1906-1930*. New York, 1937.

Dunn, S., and T. G. Fraser, eds. *Europe and Ethnicity: The First World War and Contemporary Ethnic Conflict*. London, 1996.

Durham, M. E. *Twenty Years of Balkan Tangle*. London, 1920.

Duroselle, J.-B. *Clemenceau*. Paris, 1988.

Duus, P. *The Rise of Modern Japan*. Boston, 1976.

Dyer, G. "The Turkish Armistice of 1918: 1-The Turkish Decision for a Separate Peace, Autumn *1918," Middle Eastern Studies*, 8/2 (May 1972).

----------, "The Turkish Armistice of 1918: 2-A Lost Opportunity: The Armistice Negotiations of *Moudros," Middle Eastern Studies*, 8/3 (October 1972).

Dziewanowski, M. K. *Joseph Pilsudski: A European Federalist, 1918-1922*. Stanford, 1969.

Eban, A. *An Autobiography*. New York, 1977.

Eckelt, F. “The Internal Policies of the Hungarian Soviet Republic,” *Hungary in Revolution, 1918-19*, ed. I. Volgyes. Lincoln, Nebraska, 1971.

Egerton, G. W. “Britain and the ‘Great Betrayal’: Anglo-American Relations and the Struggle for United States Ratification of the Treaty of Versailles, 1919-1920,” *Historical Journal*, 21/4 (1978).

----------, *Great Britain and the Creation of the League of Nations*. Chapel Hill, North Carolina, 1978.

----------, “The Lloyd George Government and the Creation of the League of Nations.” *American Historical Review*, 79/2 (April 1974).

Ekmecic, M. “Serbian War Aims,” *The Creation of Yugoslavia*, ed. D. Djordjevic. Santa Barbara and Oxford, 1980.

Elcock, H. *Portrait of a Decision: The Council of Four and the Treaty of Versailles*. London, 1972.

Elon, A. *The Israelis: Founders and Sons*. New York, 1972.

Epstein, K. *Matthias Erzberger and the Dilemma of German Democracy*. New York, 1971.

Esposito, D. M. “Imagined Power: The Secret Life of Colonel House,” *Historian*, 60/4 (Summer 1998).

Eubank, K. K. *Paul Cambon: Master Diplomatist*. Norman, Oklahoma, 1960.

Eyck, E.A. *A History of the Weimar Republic, 2* vols. New York, 1970.

Farnsworth, B. *William C. Bullitt and the Soviet Union*. Bloomington and London, 1967.

Farwell, B. *The Great War in Africa, 1914-1918*. New York and London, 1986.

Ferguson, N. “Keynes and German Inflation,” *English Historical Review*, 110/436 (April 1995).

----------, *The Pity of War*. New York, 1999.

Fifield, R. H. “Disposal of the Carolines, Marshalls, and Marianas at

the Paris Peace Conference," *American Historical Review*, 51/3 (April 1946).

----------, *Woodrow Wilson and the Far East: The Diplomacy of the Shantung Question*. New York, 1952.

Figes, O. *A People's Tragedy: The Russian Revolution, 1891-1924*. London, 1996.

Fischer, L. *The Soviets in World Affairs: A History of the Relations between the Soviet Union and the Rest of the World, 1917-1929*. New York, 1960.

Fisher, J. *Curzon and British Imperialism in the Middle East, 1916-19*. London, 1999.

Fitzhardinge, L. F. "Hughes, Borden, and Dominion Representation at the Paris Peace Conference," *Canadian Historical Review*, 49/2 (June 1968).

----------, *The Little Digger, 1914-1952: William Morris Hughes. A Political Biography, 2* vols. London and Sydney, 1979.

----------, "W. M. Hughes and the Treaty of Versailles, 1919," *Journal of Commonwealth Political Studies*, 5 (July 1967).

Fitzherbert, M. *The Man Who Was Greenmantle: A Biography of Aubrey Herbert*. London, 1983.

Floto, I. *Colonel House in Paris: A Study of American Policy at the Paris Peace Conference, 1919*. Princeton, New Jersey, 1973.

Foch, F. *The Memoirs of Marshal Foch*. Garden City, New York, 1931.

Fogelsong, D. S. *America's Secret War Against Bolshevism*. Chapel Hill and London, 1995.

French, D. " 'Had We Known How Bad Things Were in Germany, We Might Have Got Stiffer Terms': Great Britain and the German Armistice," *The Treaty of Versailles: A Reassessment after 75*

*Years*, ed. M. Boemeke, G. D. Feldman and E. Glaser. Cambridge, U.K., and Washington, D.C., 1998.

Fried, A., ed. *A Day of Dedication: The Essential Writings and Speeches of Woodrow Wilson*. New York, 1965.

Friedman, I. "The McMahon-Hussein Correspondence and the Question of Palestine," *Journal of Contemporary History*, 5/2 (1970).

----------, *The Question of Palestine, 1914-1918: British-Jewish-Arab Relations*. Oxford, 1973.

Fromkin, D. *A Peace to End All Peace: The Fall of the Ottoman Empire and the Creation of the Modern Middle East*. New York, 1989.

---------, *In the Time of the Americans: FDR, Truman, Eisenhower, Marshall, MacArthur-The Generation That Changed America's Role in the World*. New York, 1995.

Fry, M. G. *Lloyd George and Foreign Policy, 2* vols. Montreal and London, 1977.

Garnett, D., ed. *The Essential T. E. Lawrence*. New York, 1951.

Garran, R. *Prosper the Commonwealth*. Sydney, 1958.

Geddes, D. "The Mandate for Yap," *History Today* (December 1993).

Gelfand, L. E. *The Inquiry*. New Haven, Connecticut, 1963.

Genov, G. P. *Bulgaria and the Treaty of Neuilly*. Sofia, 1935.

George, A. L., and J. L. George. *Woodrow Wilson and Colonel House: A Personality Study*. New York, 1964.

Gerson, L. *Woodrow Wilson and the Rebirth of Poland, 1914-1920: A Study in the Influence on American Policy of Minority Groups of Foreign Origin*. Hamden, Connecticut, 1972.

Gidney, J. A. *A Mandate for Armenia*. Kent, Ohio, 1967.

Gilbert, M. *Winston S. Churchill*, 8 vols. London, 1966-88.

----------, *Sir Horace Rumbold: Portrait of a Diplomat, 1869-1941*.

London, 1973.

Gilmour, D. *Curzon*. London, 1994.

Glazebrook, G. P. de T. *Canada at the Peace Conference*. London, Toronto and New York, 1942.

Glyn, A. *Elinor Glyn*. London, 1968.

Gokay, B. “Turkish Settlement and the Caucasus, 1918-20,” *Middle Eastern Studies*, 32/2 (April 1996).

Goldstein, E. “Great Britain and Greater Greece, 1917-1920,” *Historical Journal*, 32/2 (1989).

----------, *Winning the Peace: British Diplomatic Strategy, Peace Planning, and the Paris Peace Conference, 1916-1920*. Oxford, 1991.

Gollin, A. M. *Proconsul in Politics: A Study of Lord Milner in Opposition and in Power*. London, 1964.

Grayson, C. T. *Woodrow Wilson*. Washington, D.C., 1960.

Gregory, J. D. *On the Edge of Diplomacy: Rambles and Reflections, 1902-1928*. London, 1928.

Grew, J. C. *Turbulent Era: A Diplomatic Record of Forty Years, 1904- 1945*. Boston, 1952.

Grigg, J. *The Young Lloyd George*. London, 1973.

----------, *Lloyd George: From Peace to War, 1912-1916*. London, 1985.

----------, *Lloyd George: The People’s Champion*. Berkeley and Los Angeles, 1978.

Griswold, A. W. *The Far Eastern Policy of the United States*. New Haven, Connecticut, 1938.

Groueff, S. *Crown of Thorns*. Lanham, Maryland, 1987.

Guhin, M. A. *John Foster Dulles: A Statesman and His Times*. New York and London, 1972.

Guiral, P. *Clemenceau et son Temps*. Paris, 1994.

Hall, H. D. *Mandates, Dependencies and Trusteeship*. London, 1948.

Hancock, W. H. *Smuts: The Sanguine Years, 1870-1919*. Cambridge, U.K., 1962.

----------, and J. Van der Poel, eds. *Selections from the Smuts Papers*, 7 vols. Cambridge, U.K.,

Hankey M. P. *The Supreme Control at the Paris Peace Conference 1919: A Commentary*. London, 1963.

Hardach, G. *The First World War, 1914-1918*. Berkeley and Los Angeles, 1977.

Hardinge, C. *Old Diplomacy: The Reminiscences of Lord Hardinge of Penshurst*. London, 1947.

Harington, C. *Tim Harington Looks Back*. London, 1940.

Harris, H. W. *Peace in the Making*. London, 1920.

Harrod, R. F. *The Life of John Maynard Keynes*. London, 1951.

Haskins, C. H., and R. H. Lord. *Some Problems of the Peace Conference*. Cambridge, Massachusetts, 1920.

Headlam-Morley, J. *A Memoir of the Peace Conference 1919*, ed. A. Headlam-Morley, R. Bryant and A. Cienciala. London, 1972.

Heater, D. *National Self-Determination: Woodrow Wilson and His Legacy*. New York, 1994.

Hecksher, A. *Woodrow Wilson*. New York, 1991.

Helmreich, P. C. *From Paris to Sèvres: The Partition of the Ottoman Empire at the Peace Conference of 1919-20*. Columbus, Ohio, 1974.

Henig, R. B., ed. *The League of Nations*. New York, 1973.

Hess, R. L. “Italy and Africa: Colonial Ambitions in the First World War,” *Journal of African History* (1963).

Hiery, H. J. *The Neglected War: The German South Pacific and the Influence of World War I*. Honolulu, 1995.

